# ئینسكلۆپیدیا
# پارێزگەها دهۆكێ

سەرنڤیسەر و سەرپەرشتێ گشتێ

**موسەدەق تۆڤی**

هاریكارێ سەرنڤیسەرێ
خالد سالح

## بەرگێ سیێ
## دیرۆكا نوو، دیرۆكا هەڤچەرخ، ژیانا ئایینی

٢٠١٧ ز ٢٧١٧ ك ١٤٣٩ مش

# ناڤەرۆك

## دیرۆکا هەڤچەرخ ............................................................ ٣٧٣



## ژیانا ئایینی ............................................................ ٤١١

# مەهدیێ گوندێ کەڤرە سۆرێ

پ.د. زرار توفیق صدیق
وەرگێران: محەمەد ئیبراهیم ئامێدی

ژ دەستپێکا پەیدابوونا ئایینێ ئیسلامێ هزرا هاتنا کەسەکی ب ناڤێ مەهدیێ ئاخر زەمانی وەك ڤێراگەهـ و رزگارکەر و کەسەك تەناهیێ و وەکهەڤیێ و دادپەروەریێ ل جیهانێ بەلاڤکەت کەتیبە بەر ئاخفتنێ و گەنگەشێ و بوویە مژارەکا گەرم د ناڤبەرا دەستەك و مەزهەب و گرۆپ و پێکهاتەیێن ئیسلامی و بوویە جهێ بگروڤەکێشان. شارەزایێن شەریعەتێ و فیقهزانا بۆچوون و رایێن جودا ل سەر بابەتی هەبووینە و گەلەك جاران ژی ئەو بۆچوونە دژیەك بوون، هندەکان ب یەکجاری ب نەوەیی دەرێخستییە و رەتکرییە و ب بیدعە و چێکری دایە نیاسین و چەندین فەرموودەیێن راستەقینەیێن پێغەمبەری (س) ل سەر ئینانیە و ژ مێژ وەرە ب دەهان کتێب و نامیلکە ل سەر هاتینە نڤیسین.

(عبدالعليم عبدالعظيم البستوی) دماستەرنامەیا خۆدا دووڤچوونا ڤێ مژارێ کرییە و پشتی گەریانەکا هوور د ناڤ دەڤاندا گەهشتییە وێ ئەنجامی کو بابەتێ مەهدی د ئایینێ ئیسلامێدا بابەتەك راست و دروستە و نە بیدعەیە و نە ژی چێکری یە، هەشت فەرموودەیێن راست و یازدە بەلگە و نیشان ل سەر دەرکەتنا مەهدیێ ئاخر زەمان بەرچاڤکرینە[1].

## بیرۆکا دەرکەتنا مەهدی ل کوردستانێ:

د راستیدا بیرۆکا دەرکەتنا کەسەکێ ڤێراگەهـ و رزگارکەر نە تنێ داهینانەکا ئیسلامی و گرێدایی یە، بەلکی بیرۆکەکا دیرۆکی و هندی بێژی د دیرۆکا مرۆڤایەتیێ دا کەڤن و دێرینە و مللەتێن خودان شارستانیەت وەك چینی و فیرعەونی و هندی و ئیرانییاندا، ب هەمان شێوە د ئایینێن ئاسمانی دا وەك جوهیاتی و مەسیحییەت و زەردەشتیدا هەبوویە و هەر هەموو ژی چاڤەرێ مەهدیەکی نە وەك مەهدیێ ئیسلامێ کو خەلکی ژ دەست زۆرداریێ و ستەم و بەلەنگازکرنێ رزگار بکەت، هەتاکو مەغۆل و تەتەران ژی چاڤەرێی زڤرینەڤا جەنگیزخان و تەیمۆرێ لەنگ دکر دا کو وان ژێردەستی و زۆرداریا مللەتێن دی رزگارکەت[2].

کورد ژی مینا مللەتێن دی یێن مووسلمان چاڤەرێبوونە مەهدیێ ڤێراگەهـ و رزگارکەر وەك نیشانا ئاخر زەمان بهێت، ب تایبەت ژی کوردان گەلەك نەخۆشی و زۆرداری و ئەشکەنجەدان ژ دەست دەولەتێن زۆردار و داگیرکەر یێن نە باوەری ب سونەتێ هەی و نە ژی باوەری ب شەریعەتی هەی دیتینە، د ڤی سەروبەریدا رەشبینی و بێ هیڤیبوونێ

گوندێ کەڤرەسۆرێ یێ نها



خۆ ب سەرڤی خەلکیدا گرتییە و د ئەنجامدا پتر ل هیڤییا دەرکەتنا مەهدییەکی بوونە وان ژ تەنگاڤی و نەخۆشییان رزگارکەت، ئەڤ چەندە ژی بوونە هۆکار چەندین کەس ل کوردستانێ ژی خۆ وەك مەهدی بدەنە نیاسین و ئیدیعا مەهدیياتیێ بکەن.

## مەهدیێ گوندێ کەڤرە سۆرێ:

کەڤرە سۆرێ هەتا نها گوندەکێ مەزن و ئاڤایە، رەز و چەم و بیستانێن زۆر لێ هەنە، دکەڤیتە دەستێ راستێ یێ رێکا ناڤبەرا مرێبا- ئەتریش کو هەردو سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤەنە، پشتی دەمەکێ کێم ژ پەیدابوونا کەسەکی یێ ل سەدسالییا هەڤدێ زایینی ل دەڤەرا شارەزوورێ خۆ وەك مەهدی راگەهاندی[3]، ل ڤی گوندی کەڤرە سۆرێ کەسەك ب ناڤێ عەبدوللا پەیدابوو، وی کورەکێ سنیلە ب ناڤێ محەمەد هەبوو، وی ئەڤ کورێ خۆ ئینا و وەسا راگەهاند کو ئەو کور مەهدیێ چاڤەرێکرییە.

رەحمەتی مەلا ئەنوەرێ مایی هندەك زانیاری ل دوور ڤی مەهدی بەرچاڤکرینە و دبێژیت: ناڤێ وی ئەحمەد کورێ شێخ محەمەدێ فادلۆنی یە، ئێك ژ شێخێن رێبازەکا سۆفیاتیێ یە، شیا خەلکەکێ زۆر ل دۆرێن خۆ کۆمبکەت هەتا شیایی هێزەکا پێنج هزار کەسی بەرهەڤبکەت و دەست ب سەر چەند گوند و کەلایێن دەڤەرا ئاکرێ و ئامێدیێ دا بگریت، ئەو بوو قوباد بەگێ (١٦٦١- ١٦٧٦)ێ میرێ ئامێدیێ لێ هاتییە دەست و لەشکەرەك ب سەرکردایەتییا برایێ خۆ بۆداغ بەگی هنارتە شەرێ وی، بەلێ ئەڤ لەشکەرێ وی نەشیا بەرسینگێ وی بگریت و میرێ ئامێدیێ نەچاربوو هەوارا خۆ ببەتە بەر والیێ مووسلێ و شەرەکێ خویناوی دناڤبەرا هەردو ئالییاندا روودا و چەند مەهەکان شەر یێ بەردەوام بوو.

پاشتر ئەو لەشکەرێ خۆ ب مەهدی ناڤکری بەرامبەر لەشکەرێ هەڤپشکێ ئامێدیێ- مووسلێ

شکەست، مەهدی خۆ ب دەستڤە نەدا و رەڤی چوو ستەنبۆلێ و خۆ گەهاندە خزمەتا سولتانێ ئوسمانی محەمەدێ چوارێ، وی ژی رێز لێ گرت و پێشوازی لێکر و هێلا د خزمەتا خۆدا[٤].

بەلێ محەمەدێ کورێ بابە رەسولی بەرزنجی کو ئەو بخۆ هەڤدەمێ دەرکەتنا مەهدیێ کەڤرە سۆری بوو دبێژیت: ناڤێ وی عەبدوللا بوو، خۆ ب شەریفێ حوسێنی ددا نیاسین، ئانکو خۆ ب سەید و نەڤیێ حوسێنێ کورێ عەلی دهژمارت، وی کورەکێ سێلەیێ دووازدە سالی هەبوو ب محەمەد ناڤکربوو و نازناڤێ مەهدی دابوویێ و دگۆت ئەڤە مەهدیێ چاڤەرێکرییە، خەلکەکێ زۆر ل دۆرێن وی کۆمببوون و شیابوو هژمارەکا کەلایان بگریت، پشتی شکەستنا وی بەرامبەری لەشکەرێ مووسلێ ڤی مەهدیێ دەرەوین و محەمەدێ کورێ وی خۆ گەهاندنە ستەنبۆلێ و سولتانێ ئوسمانی ل وان خۆشبوو بەلێ نەهێلا بزڤرنە وەلاتێ خۆ و هەر ل وێرێ مرینە[٥].

د راستیدا د شیاندایە گۆتنا محەمەدێ کورێ بابە رەسولی ب راست وەرگرین چونکو ئەو هەڤدەم بوویە دگەل وی مەهدی و هەر وەسان دبیت ناڤێ وی عەبدوللا بیت و ناڤێ کورێ وی محەمەد بیت، چونکو وەك ژێدەر ئاماژە پێدکەن یەك ژ نیشانێن مەهدی ئەوە ناڤێ وی و بابێ وی وەك ناڤێ پێغەمبەری (س) و بابێ وی بیت ئانکو محەمەدێ کورێ عەبدوللا بیت. هندی پەیوەندی ب دیرۆکا سەرهلدانا ڤی مەهدی ڤە هەی ئەنوەر مایی دبێژیت: (سالا ١٠٦٦مش/ ١٦٥٦ز دەرکەتییە، بەلێ محەمەدێ کورێ بابە رەسولی دبێژیت: بەری دانانا ڤی کتێبا من (الاشاعة لاشراط الساعة) ب دەمەکێ کێم ئەڤ کوردە پەیدابوویە و پرۆپاگندا مەهدیاتیێ بۆ خۆ کرییە، هەر وەك ئەم دزانین محەمەد کورێ بابە رەسولی ل داوییا سالا ١٠٧٦مش/ ١٦٦٥ز کتێبا خۆ ل باژێرێ مەدینێ نڤیسییە، لەوما دبیت ئەڤ مەهدی یە دناڤبەرا ١٦٦٤- ١٦٦٥ یێدا دەرکەتبیت.

دەربارەی چارەنڤیسێ وی ئەنوەر مایی دبێژیت: ل شەڤەکا سالا ١٠٧٨مش/ ١٦٦٨ز هندەك کەسێن نەهاتینە نیاس ژ نشکەکێڤە هێرش برییە سەر وی مەهدی و کوشتییە، بەلێ وەك محەمەد بابە رەسول دبێژیت یێ مری.

بەری مەهدیێ کەڤرە سۆری ب چەند سالەکێن کێم کەسەکێ دی ل دەڤەرا شارەزووێ ئیدیعا مەهدیاتیێ کرییە و خەلکەکێ کێم ل دۆرێن خۆ کۆمکرینە بەلێ نەشیایە جهێ پێ خۆ قاهیم کەت و هەر زوو دەستەلاتدارێن دەڤەرێ هێرش کرییە سەر وی و تاگرێن وی بەلاڤکرینە و زانایێن ئایینی یێن دەڤەرێ ژی دژایەتییا وی کرینە و فەتوا دژی وی داینە[٦].

بەروڤاژی دگەل مەهدیێ شارەزووری مەهدیێ کەڤرە سۆری ناڤودەنگەك بۆ خۆ پەیداکرییە و سنوورێن کوردستانێ دەربازکرینە و ل دەڤەرێن جودا یێن دەولەتا ئوسمانی بەلاڤبوویە و ژێدەران ژی ئاماژە پێکرییە، هەتا کو محەمەدێ کورێ بابە رەسولی وی دەمی ل مەدینەیێ بوو گوهـ ل نووچەیێ دەرکەتنا وی بوویە، هەر وەسان ژێدەرێن ئوسمانی ژی ل دۆر وی پەیڤینە، ب تایبەت ژی کو مەهدیێ کەڤرە سۆری نە تنێ ب پرۆپاگندان بۆ خۆ راوەستیایە بەلکی لەشکەرەك بەرهەڤکرییە و بزاڤێ هندێ کرییە ب چەکی و شەری راستی و دروستییا خۆ کو ئەو مەهدیێ ئاخر زەمانییە ب خەلکی ب سەلمینت.

ئەڤ مەهدی یە بوویە جهێ ئاخفتنێ و پویتەپێکرنێ د ناڤبەرا زانایێن دەولەتا ئوسمانی و گفتوگۆ ل سەر کرینە، ژ بەر ڤێ چەندێ زانایێ ناڤداری کورد ئیبراهیمێ کورێ حەسەنێ گۆرانی (١٦٨٩ز مرییە) ل دووڤ داخوازا هەڤالەکێ خۆ نامیلکەیەك ل ژێر ناڤێ (المسلك القريب الى سؤالات الحبيب) نڤیسییە و تێدا تەکەز ل سەر درەوینییا وی مەهدی و نەبوونا نیشانێن مەهدیاتیێ ل جەم وی کرییە، هەژییە بێتە گۆتن هەتا نها ئەو نامیلکەیە مایە و دکتۆر عیماد عەبدولسەلامی ل بەرە بەلاڤبکەت[٧].

هەر ل دەڤەرا بەهدینان پشتی سیهـ سالەکان کەسەکێ دی پەیدابوویە و خۆ ب مەهدی دایە نیاسین، بەلێ پێزانین ل سەر ڤی مەهدی دکێمن، تنێ

د پەرتووکخانەیا مفتیێ ئامێدیێ دا بەلگەنامەیەك هاتیە دیتن و تێدا گۆتیە کو ل سالا ١١١٧مش/ ١٧٠٥- ١٧٠٦زایینی مەهدیەکێ دەرۆین دەرکەتیە و شەرێ داسنیان کریە، د چەند دەستنڤیسەکێن دیتر دا ژی ئاماژە ب ڤی مەهدیێ درەوین هاتیەکرن[٨].

## جیۆڤانی باتیستا بویتی ژ تەبشیرێ بۆ مەهدیاتیێ:

نە تنێ خەلکەکێ کورد و مووسلمان ل کوردستانێ پرۆپاگندا مەهدیاتیێ کریە، بەلکی خەلکەکێ نە مووسلمان ژی وەسان دیارکریە کو مووسلمان بووینە و بزاڤکرینە خۆ وەك مەهدی بدەنە نیاسین، و خەلکەکێ سادە و هەژار و خۆشباوەر ژی ل بازێر و گوندان باوەری پێ ئینانە، یەك ژ ڤان کەسان کەسەکێ ئیتالی بوو ب ناڤێ جیۆڤانی باتیستا بویتی (١٧٤٣- ١٧٩٨)، ل مونتیکارلو هاتیە سەر دونیایێ، هێژ زارۆك دایکا وی مریە، بابێ وی ژنەکا دی ئینایە، ئەو ژن دگەل جیۆڤانیێ نەڤسیێ خۆ گەلەکا خراب بوو، ئەو ژی رەڤیە و ب کۆلانا کەتیە، دەمەکی بوویە سەرباز، پاشتر چوویە ناڤ کەنیسێ و گەلەك موغامەرە کرینە، ژ ڤی سەری چوویە سەرێ دی هەتا هاتیە بەغدا و پاشتر چوویە ستەنبۆلێ هەتا داوی جار گەهشتیە خواندنا تەبشیریا دۆمنیکان ئەوا ل سالا ١٧٤٨ز ێ ل مووسلێ هاتیە دامەزراندن.

چیرۆك و سەرهاتیا جیۆڤانی باتیستا بویتی د گۆڤارا (مراة الشرق) دا هاتیە بەلاڤکرن، پاشتر حەسەن حوسنی الگویرانی (١٨٥٠- ١٨٩٧) د گۆڤارا خۆ (الانسان) هژمارە (٤) سالا یەکەم ١٣٠١مش/ ١٨٨٤ز دا ل ژێر ناڤونیشانێ (غرائب تاریخیە) بەلاڤکریە، هەژیە بێژین ئەڤ گۆڤارە ل ستەنبۆلێ ب زمانێ عەرەبی دهاتە بەلاڤکرن، وەك نڤیسکار دبێژیت: کورتیا سەرهاتیا ڤی کەسێ ئیتالی ژ گۆڤارا (مراة الشرق) وەرگرتیە.

د وی سەردەمی دا دەڤەرێن رۆژهەلاتێ مووسلێ ب تایبەت ئامێدیێ بنگەهێ میرگەها بەهدینان بوو، دەڤەرەکا گرنگ و جهێ گرنگیپێدانا موبەشرێن مەسیحی بوو، خواندنگەها دومەنیکان بەردەوام سەخمەرات بەلاڤکرنا مەسیحیەتێ و راکێشانا خەلکێ وان دەڤەران بەرێ موبەشرێن خۆ ددا وێ دەڤەرێ، د ڤی سەردەمی دا ل دەستپێکا رەمەزانا سالا ١١٩٨مش/ ١٧٨٤ز ێ بەرەڤ ئامێدیێ دچیت و مژوولی کارێ تەبشیرێ دبیت[٩].

بەروڤاژی موبەشرێن دی ئەڤ کەسە رێکەکا دی دگریتەبەر و خۆ دکەتە مووسلمان و ناڤێ خۆ دکەتە شێخ مەنسوور و وەسان خۆ دیاردکەت کو سەیدە و نەڤیێ پێغەمبەرێ مووسلمانانە، ئەو بخۆ ژی زەلامەکێ بەژن بلند و خودان سەنگ و هەیبەت بوو، خەلکێ سادە ژی نیشانێن نۆرانیێ و دینداریێ د روویێ وی دا دیت، بێی کو بزانن کیە و کورێ کێیە و هەلگرێ چ ناسنامەیەکێیە و چ کاردکەت، بێی دو دلی باوەریێ پێ دهینن و ل دۆرێن وی دجڤیێن، ب تایبەت دەمێ هەست دکەن کو ئەڤ مرۆڤە بەردەوام یێ ل مزگەفتا ئامێدیێ و مژوولی زوهد و خودێ پەرستیێ یە و ب جوانی و هووری ل دووڤ روکنێن ئیسلامێ دچیت، ئەڤ سەرەدەریا وی بۆ ئەگەرێ هندێ خەلك گیروودەی وی ببیت.

ل رۆژێن داویێ ژ رەمەزانێ ئەڤ کەسێ غەریب خەلکی کۆمدکەت و خوتبەکێ بۆ دخوینت و دبێژیتێ ئەو هنارتیێ پێغەمبەری وەك مونزیر و مەهدیێ چاڤەرێکریە و ئینجیلێ بۆ وان دخوینت، ژ بەر رەوانبێژیا وی د ئاخفتنێ دا و زیرەکیا وی د خوتبە خواندنێدا خەلکی ب دروستی باوەری ب وی ئینا، هەتا ل رۆژا بیستی مەها نیسانا سالا ١٧٨٥ێ ب هزاران ژ خەلکی ل دۆرێن وی جڤیان و ل دووڤ داخوازا وی بریارا جیهادێ ددەن، جیۆڤانی پەیمانا سەرکەتنێ و مزگینیا گەهشتنێ ب ئارمانجان ددەتە وی خەلکی، ژ ئامێدیێ بەرەڤ ئاسیا بچووك ددەنە رێ، دەست ب سەر زاخۆ و خاپوور و بدلیس و مۆشێ دا دگرن، دەڤەرێن بەرفرەهـ ژ کوردستانێ دئێخنە ژێر دەستەلاتێ خۆ، پاشتر دەست ب سەر دەڤەرەکێ ب ناڤێ ئاغالسبك دگرن، د وی دەمی دا شەشسەد سەربازێن تورك پارێزگاری ل وی

جهی دکر و سەرژمێرییا وی ژ سیهـ هزار کەسان پێکدهات و ژ ویری بەرەڤ ئەرزەرۆمێ دچن و دەست ب سەر وێ ژی دا دگرن، ب ڤی رەنگی پاشتر دەست ب سەر چەند باژێرێن دی ێێن دەولەتا ئوسمانی دا دگرن، ترس و دەنگڤەدانا چالاکیێن شێخ مەنسووری دگەهیتە ستەنبۆلێ، دەستەلاتدارێن ئوسمانی دڤیا مفا ژ ڤی مرۆڤی و کوردێن سەرداچوویی وەرگریت و بێختە ژێر دەستەلاتێ خۆ و ل شوونا هندێ شەرێ دەستەلاتدارێ ئوسمانییا مووسلمان بکەت بەرێ وی بدەتە شەرێ دەولەتا رووسیا قەیسەرێ.

بزاڤا دەولەتا ئوسمانی د ڤی واری دا یا سەرکەتی بوو، جیۆڤانی و ب هزاران کوردان دگەلدا هێرشێ دبەنە سەر دەڤەرێن قەفقاسیا و دکەڤنە شەرێ دەولەتا رووسیا، شێخ مەنسوور سەرکەتنێ ل سەر ژەنەرالەکێ رووسی دا دئینت و لەشکەرێ وی دشکێنیت، دەولەتا رووسیا ب مەرەما درێژەپێدانا شەرێ هێزەکا دی بۆ هاریکارییا لەشکەرێ خۆ دهنێریتە مەیدانا شەرێ، د ئەنجامدا رووس شیان هێزێن شێخ مەنسووری بشکێنن، ل دووڤ ژێدەران ئەڤ شەرە ل سالێن ١٧٨٧- ١٧٩١ێ بەردەوام بوون، جار لەشکەرێ شێخ مەنسوور و کوردان و جار ژی لەشکەرێ رووسیا سەرکەتن ب دەستڤە دئینا.

ل داویێ رۆژ ل دووڤ رۆژێ هێزێن شێخ مەنسووری لاواز دبن و ل کێمیێ ددەن، د ئەنجامدا کوردێن دۆر شێخ مەنسووری هندەك هاتنە کوشتن و هندەکان ژێ مەیدانا شەرێ بەردا و بەلاڤەبوون، شێخ مەنسوور ژی ب دیلی کەتە دەستێ رووسان، بەلێ ژنە ئیمبەراتۆرا رووسیا ئەو نە کوشت، بەلکی ئەو دوورئێخستە دەڤەرا سۆڤانتس و سالانە سەد هزار فرانك وەك مووچە بۆ وی ڤەبرین، شێخ مەنسوور بۆ دەمێ پێنج سالان ما ل سرگۆنیێ ل دێرەکا ئەرمەنێن کاسۆلیك هەتا ل رۆژا ١٧٩٨/٩/١٥ێ وەغەرا داویێ کری[١٠].

کوردناسا ئیتالی میریلا گالیتی د گۆتارەکێدا دەربارەی کوردناسییا ئیتالی ب کورتی دەربارەی شێخ مەنسووری دنڤیسیت و دبێژیت: د ناڤبەرا سالێن ١٧٨٥- ١٧٩٠ێ سەرۆکاتییا دەهـ هزار چەکدارێن کورد دکر، شیا بدلیس و سێرت و ئەرزەرۆمێ بێختە ژێر دەستەلاتێ خۆ پاشتر بەرەڤ قەفقاسیا کەتە رێ و چەند سەرکەتن ب سەر رووساندا دەستڤە ئینان، بەلێ ل داویێ رووس شیان ل سەر وی زال ببن و سەرکەتنێ ب دەستڤە بینن و هاڤێتنە د زیندانیدا ل دێرا ئەرکەنجیل پشتی بیست سالان مر[١١]. هەژییە ل داویێ بێژین هەتا ڤان سالێن داویێ ژی خەلکەکی وەك مەهدی ددا نیاسین و هەتا نها ژی ئەڤ دیاردەیە

## ژێدەر


١. المهدي المنتظرفي ضوء الاحاديث والاثار الصحيحة واقوال العلماء وآراء الفرق المختلفة، دار ابن جزم، (بيروت: ١٩٩٩).
٢. المهدي المنتظرفي ضوء الاحاديث والاثار الصحيحة واقوال العلماء وآراء الفرق المختلفة، دار ابن جزم، (بيروت: ١٩٩٩).
٣. الاشاعة لاشراط الساعة، ص ٢٣١- ٢٣٢.
٤. انور مايي، الاكراد في بهدينان، (-)، ص١٣٤.
٥. الاشاعة لاشراط الساعة، ص ٢٣٢.
٦. الاشاعة لاشراط الساعة، ص ٢٣٢.
٧. د. عماد عبدالسلام رؤوف، المعجم التاريخي لأمارة بهدينان، مطبوعات الاكاديمية الكردية، ص٢٤- ٢٥.
٨. الاكراد في بهدينان، ص١٣٤، هامش (١)؛ المعجم التاريخي، ص٣٥٨؛ محەمەد عەلی قەرەداغی، بووژاندنەوە مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی دەستخەتەکانیانەوە، ٣/ ١٣٦.
٩. یاسین بن خیراللة العمری، ب کورتی دەربارەی ڤی مەهدیی سەختە ئاخفتییە، عجائب الاثر، ص١١٠.
١٠. گۆڤاری الانسان، العدد (٤)، السنة الاولی، ص٨٨- ٨٩.
١١. التراث الكردي في مؤلفات الايطاليين، ص٢٤١.

# هەلویستێ دەولەتا ئۆسمانی ژ کوردێن ئێزدی ل دەڤەرا بەهدینان د سەدسالییا نۆزدێ زایینی دا

**د. سەعید خودیدە**
**زانکۆیا دهوك-کولیژا زانستێن مرۆڤایەتی**

سیاسەتا دەولەتا ئۆسمانی بەرامبەر کوردێن ئێزدی ل دەڤەرا بەهدینان د سەدساڵییا نوزدێ دا دیاردبت، ب هنارتنا چەندین هەوێن لەشکەری بۆ سەر دەڤەرێن وان، ئەو هەوێن د پرانییا جاراندا ب سەرکردایەتییا والیێن ویلایەتێن ئۆسمانی بوون، هندەك جاران ژی ب سەرکردایەتییا راستەوخۆ یا سەرکردەیێن ژ (الباب العالي) بوون. ئەڤ هەوێن لەشکەری ب بیانوویێن جودا جودا دهاتنە ئەنجامدان، ژ ئالیەکیڤە ئێزدی ب خودێنەناس ل قەلەمددان و ژ ئالیەکێ دیڤە ئەگەرێن سیاسی و ئابووری ژی هەبوون.

دیسان دەولەتا ئۆسمانی چەندین ڕێکێن دی ژی بکارئینانینە دژی ئێزدییان ژبۆ هندێ وان ژ بیروباوەرێن وان دوورکەت و کەلتورێ ئێزدییان ژ ناڤ ببەت ئەو ژی ب هنارتنا مەلا و مامۆستایێن دینی یێن مووسلمان بۆ دەڤەرێن وان و هەروەسان هەولدان ژ بۆ ئاڤاکرنا مزگەفتان ل دەڤەرێن ئێزدییان.

## کورتییەك دەربارەی ئێزدیاتییێ وئێزدییان:

ئێزدیاتی دینەکێ کەڤنێ کوردی یە، نە دینەکێ مزدەبەرە (تبشیری)، ژ لایێ گەلەك مێژوونڤیسانڤە پێزانینێن نە دروست هاتینە بەلاڤکرن دەربارێ رەهـ وریشالێن ئێزدیاتیێ، هەلبەت ئەڤ چەندە ژی ب پلا ئێکێ دزڤرتە هندێ کو وان مێژوونڤیسان نکاریە ژ نزیکڤە تێکستێن دینێ ئێزدییان ببینن، ژ بەرکو ئێزدییان ئە و تێکست ژ بەر زۆلم و زۆرداریا ل وان دهاتەکرن د سینگێ خۆدا دپاراستن و باوەری نەبوو وان تێکستان بۆ کەسانێن بیانی بدەنە خۆیاکرن، ئەڤجا هەر ڤەکولینەك ل سەر فەلسەفە و بیروباوەرێن ئێزدییان بێتە نڤیسین ئەگەر نڤیسەر شارەزای تێکستێن دینێ ئێزدییان نەبت دێ کێماسیێن خۆ هەبن[1].

ئێزدی باوەریێ ب خودێ دئینن و د فەلسەفا ئێزدیاتییێدا پەیڤا (ئێزی) ناڤەکە ژ ناڤێن خودێ هەروەکی ژ تێکستێ (قەولێ) هەزار و ئێك ناڤدا دیاردبت[2]:

**سلتان ئێزی ب خۆپادشایە**
**هەزار وئێك ناڤ ل خۆدانایە**
**ناڤێ مەزن هەر خودایە**

ئێزدییان فەلسەفا خو بۆ دورستبوونا دونیایێ و

هەروەسان بۆ خێرێ و شەری هەیە[٣]، و ئێزدی باوەرێ ب(كراس گوهۆڕین)ێ دئینن ئانكو دەمێ كەسەك دمرت روحا وی نامرت و دزڤرتەڤە و دچتە دبەر قالبەك یان كەسەك دیتر دە[٤].

دەربارەی جڤاكێ ئێزدییان ژ سێ چینێن سەرەكی ( پیر- شێخ - مرید) پێكدهێت، وهەر چینەكێ ژ ڤان چینان ئەركێن خۆ دناڤ جڤاكێ ئێزدییان دا هەنە، و ژنئینان دناڤبەرا ڤان چیناندا چێنابت.

پەرستگەها لالش جهێ پیرۆزێ ئێزدییانە كو (٤٥كم) ژ باكوورێ باژێرێ مووسل دوورە، و گەلەك رێ و رەسمێن ئایینی لێ دهێنە گێران[٥]. و ژ هەژییە بێتەگۆتن كو ئێزدی ل هەر چوار پارچێن كوردستانێ هەنە و هەروەسان ل رۆسیا و ئەرمەنستان و گورجستانێ و رەڤەندەكا مەزن ل ئەوروپا ژی هەیە، ب تایبەت ل وەلاتێ ئەلمانیا. د ڤێ ڤەكولینێ دا سیاسەتا ئۆسمانییا بەرامبەر ئێزدییان ل ویلایەتا مووسل ل سەر دەمێ سولتانێ ئۆسمانی عەبدولحەمیدێ دووێ (١٨٧٦-١٩٠٩)ێ دێ هێتە ڤەكولین.

## هەلویستێ والیێن ویلایەتا مووسلێ وبەغدا ژ كوردێن ئێزدی ل میرگەها شێخان:

ئەو ئالۆزبوونا كەفتییە د رێڤەبەریا ویلایەتا مووسل دا، ب ئەگەرێ لاوازبوونا دەسەلاتا پاشایێن وێ و لاوازبوونا دەسەلاتێ بخۆ، بۆ ئەگەرێ هندێ كو هندەك بنەمالێن ناڤخۆ كۆنترۆلێ ل باژێری بكەن، و بنەمالا (جەلیلی)[١] ئێك ژ وان بنەمالان بوو كاری دناڤبەرا سالێن (١٧٢٦-١٧٣٤ز)ێ كۆنترولێ ل ویلایەتا مووسل بكەت. هندەك دبێژن ئەو خزمەتێن ڤێ بنەمالێ بۆ دەولەتا ئۆسمانی پێشكێشكرین، دەمێ كو ئۆسمانییا ل سالا (١٧٢٣ز)ێ بریاردای هێرشێ ببەتە سەر ئاخا ئیرانێ، پشتی كو ئەڤغانییا كۆنترۆل ل سەر كری، ئۆسمانی هاندان رێڤەبەریا ڤێ ویلایەتێ بكەنە د دەستێ میرەكی ژ میرێن بنەمالا جەلیلییاندا ئەوژی میر (سمایل كورێ عەبدولجەلیلی) بوو ل سالا (١٧٢٦)ێ[٧].

د ماوەیێ حوكومداریا جەلیلییاندا ئێزدی تووشی گەلەك هێرشێن لەشكەری بوون، ئەوژی ب بیانوویا پاراستنا رێكێن بازرگانی، ئەوێن كو تووشی هێرشێن ئێزدییان دبوون، و پرانییا هێرشێن جەلیلییان ب پشتەڤانییا والیێن ویلایەتا بەغدا بوون، چونكی هەموو خەونا وان ئەوبوو جارەكا دی كۆنترۆلا ویلایەتا مووسل بكەن[٨]، ئەڤە و زێدەباری دەولەمەندییا دەڤەرێن ئێزدییان ب ژێدەرێن چاندنێ و ئابووری ئەوێن كو ویلایەتا بەغدا پێدڤییەكا زۆر پێ هەی[٩]، د ماوەیێ حوكومرانییا جەلیلییاندا ئێزدیێن شێخان تووشی دو هێرشا ببوون، ددەمەكیدا كو ئێزدیێن شنگالێ تووشی هێرشێن بەردەوام دبوون.

وەسا دیارە جهێ میرگەها شێخان ل چیایێ مەقلووبی، ل سەر سنوورێ دناڤبەرا ویلایەتا مووسل و میرگەها بەهدینانێدا، ببوو ئەگەرێ هندێ كو میرێن وێ بكارن قەوارەیێ خۆ بپارێزن بەرامبەر هەردو هێزێن سیاسی یێن دراوسێ، د دەمەكیدا دا كو میرگەهـ ژ ئالیێ فەرمیڤە سەر ب ویلایەتا مووسل بوو، لێ ژ ئالیێ دەسەلاتێ ڤە سەر ب میرێن ئامێدیێ ڤە بوو، ژ بەر هندێ ئێزدییان كاری بخۆ مفای ژ سیاسەتا هەڤسەنگی یا هێزی دناڤبەرا هەردو هێزێن دراوسێ یێن هەڤركدا وەربگرن، لێ رەفتار دگەل ئێزدیێن شنگال یا جودا بوو، ژ بەركو دەركەفتنا جهێ جوگرافیێ ئەڤێ دەڤەرێ كاریگەری ل سەر هەڤسەنگییا سیاسی یا هێزێن دراوسێ، دەرفەتا هندێ ژ دەست خودا كو پشتا خو بدەنە هەڤپەیمانەكا ب هێز و گونجای، هەروەسا زالبوونا وێ ب سەر هندەك رێكێن بازرگانی ئەوێن كو مووسل دگەل ولاتێ شامێ و ئەنادۆل دا گرێددەت وەسا لێكر ببتە ژێدەرەكێ ترسناك و بەردەوام ل سەر ئابووریا هەموو عیراقێ[١٠].

ئێزدی ل میرگەها شێخان دووچاری هەوەكا لەشكەری بوون ژ ئالیێ والیێ مووسل نەعمان پاشایێ جەلیلیڤە ل سالێن (١٢٢٢-١٢٢٣مش)، پوختەیا ئەڤێ هەوا لەشكەری یا سالا (١٢٢٣ مش-

١٨٠٨ز) ئەوبوو نەعمان پاشایێ جەلیلی میرێ هۆزا عەسكری یا كوردی ل دەڤەرا بەهدینان ل سێدارێ دا، ڤێجا كورێن ڤێ هۆزێ رابوونە سەر خۆ و دەست ب تالانكرنا مووسلییان كر، والیێ مووسل نەعمان پاشا ژی نامەیەك بو میرێ ئامێدیێ زبێر پاشا (١٨٠٧-١٨٣٣ز) هنارت، تێدا داخوازێ ژێ دكەت كو ب سەر وان كوردان دا زالبت، لێ زبێر پاشا ئەڤ چەندە رەتكر و وی ژی فەرمان دا كو خەلكێ مووسل تالانبكەن، ژ بەر سێدارەدانا میرێ وێ هۆزا كوردان، ئێزدیێن شێخان ژی خۆ دانە دگەل میرێ ئامێدیێ ب دژی والیێ مووسل جەلیلی[١١]، ژ بەر هندێ بەرپرسایەتییا ڤان كاران كەفتە ستویێ ئێزدیێن شێخان و پتر ژ میرێ سەختی دناڤبەرا هەردو ئالییان دا دروست بوو و ئەو نەچاربوون خۆ ملكەچی دەسەلاتێ كرن، ئەڤ چەندە ژی بوو ئەگەرێ نالەباریا بارێ كارگێری و ئابووری ل شێخان و زیانەكا مەزن ب خەلكێ وێ كەفت ژ ئەنجامێ وان كریارێن خراب و ویرانكەر و كاڤلكرنا گوندان و دزی و تالانكرنێ یێن كو لەشكەرێ والیێ جەلیلی پێ رابووین، هەروەسا هاتن و چوون ژی دناڤ وان دا هاتە برین و چالاكیێن چاندنێ و بازرگانی راوەستیان و برس و ئاژاوە دناڤبەرا خەلكێ بێ گوندنەهدا بەلاڤبوو[١٢].

ل دوماهیكا سەدسالییا هەژدێ و دەستپێكا سەدسالییا نوزدێ زایینی، نیشانێن لاوازبوون و ژناڤچوونێ ل حوكمرانییا جەلیلیان ل ویلایەتا مووسل دیار بوون، ڤێجا هەر ژ وی دەمی دا هێز و دەسەلاتا ئێزدیێن شنگال ب سەر رێكێن گرنگێن دناڤبەرا مووسل و شامێدا زێدەبوو، والییێن مووسل ژی نكارین سنوورەكی بۆ دەسەلاتا وان دانین، ژ بەر هندێ والییێن بەغدا بۆ نەهێلانا ڤێ مەترسیێ مایا خۆ تێكر[١٣]، دەسەلاتا ئێزدیێن شنگال گەهشتە گومبەتێ خۆ ل سەردەمێ ئەحمەد پاشایێ جەلیلی ئەوێ كو حوكمرانییا ویلایەتا مووسل ل سالا (١٨١٣ز)ێ كەفتییە د دەستی دا، تاكو ب سەر هەموو رێكێن بازرگانیدا زالبووین، و كۆمەلێن وان ل سەر وان رێكا بەلاڤبوون ئەوێن كو دچنە مووسل و مێردینێ و هەر كۆمەلەك ژ وان ژ چەند كەسەكان پێكدهات، ب گۆرەی ئاخفتنا لونگریكی رێڤینگێن ئەوروپی نەچاردبوون د ڤان رێكانرا هاتن و چوونێ نەكەن، ئەحمەد پاشای ژی نەدكاری دوبارە ڤان رێكان كۆنترۆل بكەت[١٤].

ل سالێن داویێ ژ فەرمانرەوایا جەلیلی ل مووسل ژ بەر كێشا بەلاڤبوونا ئاژاوێ ل هەموو رەخ و رووێن وێ ژ بەر نەبوونا تەنایێ دنالی، هەلبەت ئەگەرێن وێ چەندێ ژی د ناڤخۆیی و دەرەكی بوون، ئەگەرێن ناڤخۆیی ناكۆكیێن خێلەكی بوون ل رەخ و رووێن بازێری و پەیدابوونا هەڤركیێ دناڤبەرا خێزانێن مووسلدا و ب تایبەت هەڤركی دناڤبەرا بنەمالێن - عومەری و جەلیلیدا. ئەگەرێن دەرەكی ژی وەكی پەیدابوونا مەترسیا بەرفرەهبوونا میسرێ بوو ل وەلاتێ شامێ ب سەركردایەتییا پاشا كورێ محەمەد عەلی حاكمێ میسرێ، ئەوێ بزاڤ دكر عیراق و وەلاتێ شامێ دگەل میسرێ بكەتە ئێك ب ئومێدا پێكئینانا دەولەتا عەرەبی یا هەڤگرتی، دوان سالاندا ناڤێ محەمەد ئینجە بەیرەقدار[١٥] دیاربوو ئەوێ ل سالا (١٨٣٤-١٨٤٤ز)ێ بوویە والیێ مووسل پشتی كو ب سەرخێزانا جەلیلیدا زالبووی[١٦].

ئەركێ محەمەد ئینجە بەیرەقدار نەبتنێ موكومكرنا دەسەلاتا ئۆسمانییا بوو ل مووسل، بەلكو ئەركێ وی زڤراندنا كوردستانێ بوو داكو ببتە بنگەهەك بۆ هێرشكرنێ بۆ سەر هێزێن میسرێ ل شامێ ئەوژی ب هەڤكاری دگەل لەشكەرێ ئۆسمانی ئەوێ ل دیاربەكر كۆمبووی، بۆ ئەڤی چەندێ ژی دڤیا كوردستانێ كۆنترۆل بكەت و میرگەهێن وێ ملكەچی دەسەلاتا خۆ بكەت، چونكی لەشكەرێ ئۆسمانی ژ ئالیەكیڤە گەفبوون[١٧]، ڤێجا سولتان مەحموودێ دووێ فەرمانەك بو والیێ سیوەسانس (رەشید محەمەد پاشا) دەرئێخست كو تێدا هاتبوو پێدڤییە ئەو سەركردایەتییا هەوەكا لەشكەری بۆ سەر كوردستانێ بكەت داكو ب سەر میرگەهێن كوردیدا زالبت[١٨]، هەروەسان ب گۆرەی وێ فەرمانێ دڤیا والیێ مووسل محەمەد ئینجە بەیرەقدار هەموو پشتەڤانی و هاریكاریان بۆ رەشید محەمەد پاشا

پێشکێش بکەت، ژ بەر هندێ هێرش دا ئامێدیێ و پشتی دۆرپێچەکا توند کاری داگیر بکەت، لێ میرێ وێ خو نەدا دەست. محەمەد ئینجە بەیرەقدار ژێ پشتی کاروبارێن ئامێدیێ رێکخستین، هێزەکا لەشکەری لێ هێلا و زڤرییە مووسل، و ب رێڤە ل گوندێ (گر محەمەد عەرەب) لەشکەرێ خو دانا و چادرێن خو ڤەدان و هنارتە دووڤ میرێن ئێزدییا و مەزنێن ئێلا و دیندارێن وان را و داخواز ژێکر بچنە دیدارا وی د ئوردوگایێ ویدا و سوز دایێ چ خرابییا دگەلدا نەکەت، لێ سوزا خو بجهـ نەئینا و دەمێ ئەو گەهشتینە ئوردوگایی بێ دلۆڤانی دەست ب کوشتنا وان کر و قرکرن و ژن و زاروکێن وان هنارتنە مووسل[19]. والیێ مووسل محەمەد ئینجە بەیرەقدار پشتی تەلەعفەرا پاخیبووی ملکەچ کری، شنگال ژێ بێ دەنگ کر و قرکرن، زەلام سەرژێدکرن و سەرێت وان هنارتنە مووسل داکو خەلك ژێ بترسن و بخو پەندا ژێ وەربگرن[20].

وەسان دیارە ئەگەرێن ئەڤێ چەندێ ژێ گەلەك بوون، ژوانا ئەوبوو ئێزدییان پێگیری ب لەشکەرگیرییا ب زۆرێ نەدکر ئەوا کو محەمەد ئینجە بەیرەقدار ل ویلایەتا مووسل د چەسپاند، گەهشتە وی رادەی رووبرووبێ بەرگرییەکا سەخت بوو ژ ئالیێ ئێزدییانڤە، ئەوژی نەچار بوو ب توپ بارانکرنێ گەف ل وان کرن داکو رازی ببن ل سەر لەشکەرگیرییا ب زۆرێ[21]، چونکی ئێزدییان خزمەت دناڤ رێزێن لەشکەرێ ئوسمانیدا نەدکر و ل شوونا وێ خزمەتێ دراڤێ کاش (٥٠) لیرێن تورکی دادان[22]. ئەگەرا دووێ ئەوبوو محەمەد ئینجە بەیرەقدار داخوازا هاریکاریێ ژ ئێزدییان کربوو د هەوا خودا بۆ سەر میرگەها ئامێدیێ لێ ئێزدییان ئەو داخوازە رەتکربوو، چونکی ئێزدییان نەمازە یێن میرگەها شێخان خو دهژمارت وەلاتیێن سرۆشتی د میرگەها بەهدینانیدا[23]. سەبارەت ئێزدیێن شنگال و پەیوەندیێن وان دگەل میرگەها بەهدینان، جەلیلی جەلیل دبێژت: (شنگالییان پەیوەندیێن هەڤالینی دگەل میرێن بەهدینان ل بنگەهێ وان کو ئامێدیێ یە، هەبوون)[24]، لێ ئەگەرێ ژ هەموویان گرنگتر ئەوژی ئەگەرێ ئابووری بوو، دڤیا ئێمناهیێ بۆ رێکێن بازرگانی پەیدابکەن، چونکی هۆزێن عەرەبان و کوردان بەردەوام هێرش دبرنە سەر کاروانێن بازرگانان، ب تایبەت ئەوان کاروانێن رێکێن ناسیار دگرتنە بەرخو وەکی: مووسل- دیاربەکر- حەلەب و مووسل -تەلەعفەر- وەلاتێ شامێ[25].

ل ٣ی چریا دووێ (١٨٣٩)ێ پلانا شەریف گولخانە دەرکەفت کو ب پێنگاڤەك ژ پێنگاڤێن چاکسازیێ دهێتە هژمارتن، مەبەست ژێ دوبارە رێك و پێککرن و رێکخستنا یاسا و سیستەمێ سەرەکیێ دەولەتا ئوسمانییان بوو ل سەر بنەمایێن نوو، هەروەسان کارکرن ژبۆ چاککرنا سیستەمێ فەرمانرەوایی و کارگێری د پایتەختێ دەولەتێ و ویلایەتێن ویدا[26].

یاگرنگ د ئەڤێ مەرسوومیدا ئەو بوو بریار هاتە دان رەفتار دگەل مووسلمان و نەمووسلماناندا ب وەکهەڤییەکا تەمام بێتەکرن، تێدا هاتبوو (هەر کەسەکێ سەر ب دەولەتا مەڤە بیت ژ مووسلمانان و هەر مللەتەکی دی، دێ هاریکارییا وان بێ جوداهی کەین)[27].

لێ ب راستی ئەوا د مەرسوومیدا هاتی نەهاتە پراکتیککرن، مامەلەیا خو دگەل ئێزدییان چاك نەکر، هەرچەندە د مەرسوومیدا هاتبوو دڤێت مامەلە دگەل ئێزدییان وەکی هەر لایەنەکی دی بێتەکرن، چونکی ب شێوەیەکێ سەرەکی داکۆکی ل وەکهەڤییێ دکر بەرامبەر یاسایێ، لێ بەروڤاژی ڤێ چەندێ دیاردبت و ژێدەرێن مێژوویی دوویات دکەن و دبێژن: پشتی دەرکەفتنا ئەڤێ مەرسوومێ والیێ مووسل محەمەد شەریف پاشا بخۆ سەرکردایەتییا هەوەکا لەشکەری بۆ سەر شنگالێ کر و ب کوشت و کوشتارەکا بێ شوومار رابوو، گوند و مالێن وان کاڤل و وێرانکرن پاشی تاراج و تالانکرن و دبێژن ئەڤ هەوە بۆ سەر شنگالێ گەلەك توندتر و سەختتر بوو ژ هەوا محەمەد ئینجە بەیرەقدار[28].

والیێن مووسل درێژی ب هەوێن خو بۆ سەر ئێزدییان دان داکو دەسەلاتا خو ب سەر واندا موکومبکەن و وان ملکەچی رێکخستنێن ئوسمانی یا بکەن ب

تایبەت لەشکەرگیریێ، هەروەسان بۆ ب دەستکەفتا بەرووبۆمێن چاندنێ و پارە و پووڵان کو وان پێدڤی پێ هەبوو .. ژ بەر هندێ ئێزدیێن شنگالێ ل سالا (١٨٤٥)ێ جارەکا دی تووشی هەوەکا ڤرکرنێ بوون، مەحەمەد پاشا گریدلی (١٨٤٥-١٨٤٦) سەرکردایەتیا ئەڤێ هەوێ کر(٢٩)، سەرەرای بەرخۆدان و بەرسینگگرتنا خەلکێ چیای بۆ ئەڤێ هەوێ، والی کاری کوشتن و ئازاردانەکا مەزن بگەهینتە وان(٣٠)، ل ڤێرە رۆلێ ئێك ژ ناڤدارترین کەسایەتیێن ئایینێ ئێزدییان و هەلویستێ وی ژ ئەڤێ هەوێ دیار دبت، ئەوژی بابێ شێخ (شێخ ناصر ١٨٠٧-١٨٨٩)(٣١) بوو ئەوێ کو ب دژواری بەرسینگێ ڤێ هەوێ گرتی ب هنارتنا هژمارەکا زۆر ژ ئێزدیێن سەرێ خۆ د رێکا دینێ خۆدا بۆ شنگال داین، ژ بەر هندێ دەسەلاتدارێن ئۆسمانییا بریارا گرتنا شێخ ناصر دا و بۆ جێبەجێکرنا ڤێ بریارێ هێزەکا لەشکەری هنارتە جهێ ئاکنجیبوونا وی ل گوندێ ئێسیان(٣٢)، لێ ئێك ژ مریدێن وی ب ناڤێ (سێنو) گۆتە لەشکەری ئەزم شێخ ناصر، ڤێجا گرتن و برە مووسل و ل شوونا شێخێ خۆ ئازار و ئەشکەنجەدانەکا مەزن دیت و نهێنیا شێخی ئاشکرانەکر بۆ پاراستنا رۆمەتا شێخ ناسر و جهێ وی یێ رۆحانی دناڤ ئێزدییاندا(٣٣).

دەمێ تەیار پاشا ل سالا(١٨٤٦ز)ێ بوویە والیێ مووسل شێخ ناسر چوو جەم حسێن بەگێ میرێ ئێزدییان و قایل کر کو بچتە لایێ هنری لایاردی بریتانی و کریستیان رەسام جێگرێ قونسولێ بریتانی ل مووسل و داخواز ژێ کر سەرەدانا گوندێ ئێسیان بکەن، رەسامی داخوازا لێبورینێ ژێ کر ژ بەر مژوولبوونا وی ب گەلەك کاران ڤە، لێ هنری لایارد داخوازا وی قەبوول کر و رازیبوو سەرەدانا گوندێ ئێسیان بکەت، دەمێ هاتی، شێخ ناسر بارودۆخێن ئێزدییان ژێرا رۆن و ئاشکرا کرن، هەروەسان ئەو کوشت و کوشتار و هەوێن ڤرکرنێ یێن کو ئێزدی تووش دبنێ و گەفێن لێ دهێنەکرن هەمەوو ژێرا دانە خویاکرن و داخواز ژ لایاردی کر کو ناڤبژیوانیێ ل جەم والی (تەیار پاشا) بکەت، لایاردی ژی ئەڤ چەندە قەبوول کر و داخواز ژ شێخ ناسر کر داکو سەرەدانا باعەدرێ و پەرستگەها لالش بکەت(٣٤)، و ل پەرستگەها لالش دا لایاردی داخواز ژ شێخ ناسر کر داکو دەستووریێ ب دەتێ ئەو سەرەدانا شنگال بکەت، شێخ ناسر ژی ئەڤ چەندە ب دەرفەت زانی و نامەیەك نڤیسی و دا لایاردی بۆ مەزنێن مهرکان(٣٥)، تێدا داخواز ژێ کر بوو کو هاریکاریا لایاردی بکەن و پشتا خۆ ب دەنێ داکو ناڤبژێوانیێ ژوانرا ل جەم دەسەلاتدارێن ئۆسمانیان ل مووسل بکەت، هەروەسان شێخ ناسر داخواز ژ لایاردی کربوو داکو ئەوژی ژ لایێ خۆڤە ناڤبژیوانیێ ل جەم تەیار پاشا بکەت بۆ کێمکرنا باجا، تەیار پاشا ژی بۆ ئەڤی چەندێ قایل بوو(٣٦).

د سەدسالیا نۆزدێ دا چەندین جارا ئێزدی تووشی هێرشێن ویلایەتا بەغدا بووینە وب تایبەتی دەمێ داود پاشا (١٨١٧-١٨٣١) بوویە والیێ بەغدا، لێ هێرشێن وان بو سەر دەڤەرا شنگالێ بووینە(٣٧).

پشتی هەوا داود پاشا بۆ سەر ئێزدیێن شنگال، ماوەیەکی ئارامی و بێ دەنگی کەفتە دناڤبەرا ئێزدییان و والیێن بەغدا دا، سەبارەت ڤێ چەندێ د.عەبدولعزیز سلێمان دبێژیت: (سەبارەت دەنگوباسێن ئێزدییان ژێدەر بێ دەنگ دبن هەروەکی چیا ب تەنایەکە ڤەگر شابووینە ب درێژیا سالانێن پشتی (١٨٥٠ز)ێ تاکو سالا (١٨٦٣-١٨٦٤)ێ دەمێ ئێزدییان جارەکا دی دەست ب تاراج و تالانکرنێ کری). هەروەسان پێڤە دچت و دبێژیت: (دوورنینە والیێن بەری مەدحەت پاشا یاخیبوونا ئێزدییان فەرامۆش کربیت)(٣٨) لێ ئەگەرا سەرەکی بو دابرینا دەنگ و باسێن ئێزدییان و دابرینا هەوێن لەشکەری بۆ سەر وان چ ئەوێن ژ ئالیێ والیێن مووسل و بەغدا یان ئەوێن راستەوخۆ ژ ئیستەنبۆل دهاتنە ئەنجامدان ئەو فەرمانەبوو یاکو سولتانی ب هاریکاریا لایاردی ئەوێ کو شاندێ ئێزدییان ل ئیستەنبۆل خۆ گەهاندبێ-دەرئێخستی و تێدا هاتی دڤێت ئێزدی ژ قەیدێن یاسایێ و فرۆتنا زارۆکێن وان وەك کۆلە بهێنە رزگارکرن(٣٩).

دەمێ مەدحەت پاشا بوویە والیێ بەغدا (١٨٦٩-١٨٧٢ز)ێ دەست هاڤێتە خووندنا بارودۆخێن عیراقێ، ژ

هەموو ئالیانڤە، سەبارەت ئێزدییان ژی مەدحەت پاشا ڤیا زەلامێن باش بۆ لەشکەرێ بگرت و ملکەچی یاسا و سیستەم و فەرمانێن دەولەتێ بکەت[40]، ئەڤجا هێرش دکەتە سەر دەڤەرا شنگالێ دەمێ هێز گەهشتییە شنگال ئێزدی بەر ب ئاسێگەهێن چیای چوون و خۆ تێدا حەشاردا، پشتی زانین داواکراو بتنێ تاوانبارێن رابوون دانەدەست مەدحەت پاشا[41].

## سیاسەتا ئیستەنبۆلێ بەرامبەر کوردێن ئێزدی:

دەولەتا ئۆسمانی هەر ل دەستپێکا فەرمانرەوایا سولتان مەحموودێ دووێ (١٨٠٨-١٨٣٩ز) ڤیا ب سەر هەموو بزاڤێن جودایی خوازدا زالبیت و کارکر ژ بۆ جێبەجێکرنا ڤی ئەرکی[42]، ئێکەمین پێنگاڤا وان د ڤی بواریدا ئەو بوو ڤیان سەرخۆبوونا ئۆتونۆمی یا ئێزدییان ل دەڤەرا سێرتێ ب سەرکردایەتییا شێخ میرزا نەهێلن و ب سەردا زالبن، چونکی شێخ میرزا گەلەك جاران هەولدابوو ل رۆژانێن شەرێ رۆسی - تورکی (١٨٢٨-١٨٢٩) پەیوەندیێ ب سەرکردایەتییا لەشکەرێ (رۆسی) ل قەفقاس بکەت، ل داویێ د هەولا خۆدا سەرکەفت و کاری پەیوەندیێ ب سەرکردەیێ بەرەیا باسکێفج ل دەڤەرێ بکەت و ڤیانا خۆ و کوردێن دگەلدا ژێرا دا خویاکرن کو وان دڤێت هاریکاریا هێزێن رۆسی بکەن بۆ رزگارکرنا وێ دەڤەرێ ژ دەسەلاتدارێن ئۆسمانییان. ڤی هەلویستێ شێخ میرزا نیازێن کوردێن ئێزدی بۆ دەسەلاتدارێن ئۆسمانی ئاشکەراکرن ئەوژی رزگارکرنا وێ دەڤەرێ بوو ژ بن کۆنترۆلا وان، ژ بەر هندێ دەسەلاتدارێن ئۆسمانی ڤیا هەوەکا لەشکەری ببەنە سەر وان، تێکچوونا بارودوخێن هێزێن وان دوی دەمیدا بوونە ئەگەرێ هندێ ئەو مەرەما وان بئێتە جێبەجێکرن[43].

یا شێخ میرزا دڤیا بجی نەهات و هیڤیێن وی بای برن ب تایبەت پشتی کو هەردو ئالییان (رۆسیا و ترکیا) پەیمانا ئاشتیێ ب هەڤرا ل سالا (١٨٢٩ز) ێ گرێدای، لێ د سەر هندێ را پەیوەندیێن شێخ میرزا و باسکێفج هەر د بەردەوام بوون و نامە گهۆڕین دناڤبەرا واندا هەر هەبوو. سەبارەت خەباتا کورد و ئەرمەنییا یا هاوبەش ل دەڤەرێ و هەلویستێ دەسەلاتدارێن ئۆسمانی بەرامبەر ڤێ خەباتێ: قەشێ ئەرمەنییا (خاجا دور ئابوڤیان) دبێژیت: پشتی بوورینا دەمەکی د سەر رووداناندا را ژ ترسا دەسەلاتدارێن ئۆسمانی ل دەڤەرێ[44]، کەس نەدوێریا بەحسێ مێرانی و ئازایەتییا سەرکردەیێ ئێزدییان (شێخ میرزا) و قەشێ ئەرمەنیا (بوکس)ی بکەت ژ ئەنجامێ وێ زولم و زورداری و خرابییا دەسەلاتدارێن ئۆسمانی ل کوردێن ئێزدی کری، گەلەك ئێزدی نەچار بوون بوونە مووسلمان، یێن مایێن ژی هزرکرن وەلاتێ خۆ بهێلن و بەر ب دەڤەرێن سنووری باکوور- سنووری رۆسیا- بچن، لێ دەمێ ژ نەچاری دەڤەرێن خۆ هێلان و ب مەرەما رزگاربوون ژ دەسەلاتدارێن ئۆسمانییا و پاراستنا داب و نەریت و بیروباوەرێن خۆ بەر ب دەڤەێن سنوورێ رۆسیا چووین، دەسەلاتدارێن ئۆسمانی هەوەکا مەزن برە سەر و هژمارەکا زۆر ژێ کوشت، ئەو ژێ ڤورتالبوون ئەوێن کارین خۆ بگەهیننە ئیرانێ یان باکوورێ رۆژهەلاتێ ترکیا و پاشی بەرەف ئەرمینیا سۆڤیەتی چووین ئەوژی هژمارەکا گەلەك کێم بوون[45].

دەولەتا ئۆسمانی بۆ وێ چەندێ ب سەر میرگەهێن کوردیدا زالبیت محەمەد رەشید پاشا بخۆ هاتە راسپاردن کو سەرکردایەتییا هەوەکا لەشکەری بۆ سەر کوردستانێ بکەت[46]، ژ بەر کو سیاسەتا ئۆسمانی یا بنگەهی دخواست ب سەر هێز و دەسەلاتێ ئێزدییاندا زالبت، لەوما دێ بینین هەر ل دەستپێکا هەوا خۆ یا لەشکەری محەمەد رەشید پاشا بەر ب باژێرێ سێرتێ - دەڤەرا رودوخان- چوو، چونکی پرانییا خۆجهێن وێ دەڤەرێ ئێزدی بوون. و گەلەك ژ ئێزدی و ئەرمەنیێن وێ دەڤەرێ ب دەستێ لەشکەرێ وی هاتنە کوشتن[47].

پشتی هنگی دەولەتا ئۆسمانی بریاردا ب سەر میرگەها سۆران و میرێ وێ میر محەمەد رەواندۆزیدا زالبت، دیارە ژ بەد بەختییا ئێزدییان بوو پێنگاڤێن دەستپێکێ بۆ ئەنجامدانا وی کاری ئەو بوون هۆزێن

ل رەخ و روویێن میرگەهێ بوون بێنە ئێشاندن و ستاندن، ب کریار ژی ئەڤ چەندە هاتەکرن و دەولەتا ئۆسمانی گورزێ ئێکێ داوەشاندە ئێزدییێن شێخان، چونکی ئەو ل رەخ روویێن میرگەهێ بوون و ل ژێر دەسەلاتا محەمەد پاشایێ رەواندوزی بوون پشتی کو وی میرگەها بەهدینان ل سالا (١٨٣٣ز)ێ ستاندی[٤٨].

پشتی کو میر محەمەدێ رەواندوزی ملکەچی دەسەلاتا ئۆسمانییان بوویی، محەمەد رەشید پاشا ل سالا (١٨٣٦ز)ێ هەوەکا لەشکەری یا مەزن برە سەر ئێزدییێن شنگال و زۆرداریەکە مەزن ئینا سەرێ وان[٤٩]، ژ نەچاری خەلك رەڤیا چیای بەلکی ژ دەستێن لەشکەرێ وی قورتالبن، سەبارەت ڤێ هەوێ لایارد دبێژیت: (دەمێ رەشید پاشا و حافز پاشا چووینە شنگال، ئێزدی رەڤیانە ناڤ چیا و خۆ د شکەفت و ئاسێگەهێن چیایدا حەشاردان، بەلکی ژ دەستێن وان قورتالبن، لێ ئەو چەندە ژی یا بێ مفابوو، چونکی گەلەك ژ وان ب دوکێلا ئاگری فەتسین و گەلەکێن دی ژی ب تۆپ و تڤەنگا هاتنە کوشتن، د وێ هەویدا نێزیکی سێ چارێکێن وان براندن)[٥٠].

هەوا حافز پاشا بۆ سەر ئێزدییان ب خرابترین کارەسات دهێتە هژمارتن چ ژ ئالیێ مروڤایەتیڤە یان ژ ئالیێ ئابووری، چونکی سەرەرای وێرانکرن و کاڤلکرنێ و تاراج و تالانکرنێ، هژمارەکا زۆر ژ زارۆك و کەچ و ژنێن وان ژ دەستا چوون، ژ بەر دژواریا ڤێ هەوێ و کاریگەریا وێ ل سەر دەروونێ ئێزدییان هەبوو و هەتا نها د سترانێن واندا ناڤێ حافز پاشا دهێت.

ئێزدییان دڤیا دەرگەهەکی بۆ خۆ ببینن تێرا ژ هەوێن لەشکەری ئەوێن دهاتنە سەر وان قورتال ببن، چ ژ ئالیێ والیێن بەغدا و مووسلڤە یانژی ئەوێن راستەوخۆ ژ ئیستەنبولێ دەردکەفتن و داکو خزمەتێ د لەشکەرێ ئۆسمانیدا نەکەن دگوتن دگەل بیروباوەرێن مە ناگونجیت ئەم خزمەتێ دناڤ رێزێن لەشکەرێ ئۆسمانیدا بکەین، چونکی جل و بەرگێن وان یێن لەشکەری د رەنگ شینن و گونەهە ئەم جل و بەرگێن ژ ڤی رەنگی دبەرخۆ کەین. هەروەسان دگوتن د بیروباوەرێن مەیێن دینیدا هندەك جۆرە خوارن ژی گونەهن لێ ئەو چەند یا بێ بها بوو[٥١]، پاشی مەزنێن ئێزدییان هزرکر باشترین رێك بۆ رەڤینێ ژ خزمەتا لەشکەری و رۆنکرنا بارودۆخێن خۆ گەهاندنا وێ چەندێ بە بۆ سولتانی ل ئیستەنبولێ، ئەوە خۆ بگەهینە خودان دەسەلاتێن ئینگلیز و ب کریار ئێزدی د وێ چەندێدا سەرکەفتن و پەیوەندییێن هەڤالینیێن موکوم دگەل لایاردی گرێدان پاشی قەوال یوسف - دیارە هنگی سەرۆکێ قەوالا بوویە - هاتە راسپاردن بچتە ئیستەنبولێ، و ل ئیستەنبولێ گەهشتە لایاردی- ئەوێ کو ل دوماهیکا تەباخا (١٨٤٧ز)ێ گەهشتیێ و دگەل شاندێ ئێزدییان روونشتی کو ب سەرۆکایەتیا قەوال یوسف بوو، ڤێجا لایاردی ب لەز ئەو کێشە گەهاندە بالیۆزێ بریتانی (سترانفورد دکانك) وی ژی ب رۆلێ خۆ راپۆرتەك ل سەر ئێش و ئازارێن ئێزدییان نڤیسی و پێشکێشی (باب العالي) کر[٥٢]، ل پەی گۆتنا لایاردی ژ ئەنجامی وێ ناڤبژیوانیێ فەرمانەك دەرکەفت ئێزدی ژ زنجیرێن نا یاسایی و فرۆتنا زارۆکان ئازادکرن، هەروەسان جۆرە ئازادیەکا پەرستنێ دایێ و سۆزدایێ کو دگەل دیانەتێن دی د یەکسان بن، دیسان ڤێ فەرمانێ سۆزدا ئێزدییان، وان ژ یاسایا لەشکەرێ یا ب زۆری قورتالبکەن[٥٣]، ب وێ چەندێ ئێزدی ئارام و تەنابوون و دەمێ لایارد و قەوال یوسف ژ ئیستەنبولێ زڤرینەڤە ل سالا (١٨٤٩ز)ێ ب گەرمی ژ ئالیێ ئێزدییانڤە هاتنە پێشوازیکرن[٥٤]. ب ڤێ چەندێ بۆ مە خۆیادبیت کو ئێزدییان دڤیا ب ئێکجاری ژ کێشا خزمەتا لەشکەری و باجا رزگار ببن.

ژ ئەنجامێ وێ نەخۆشیا ل سەر دەستێن ئۆسمانییان ب سەرێ ئێزدییان هاتی و چەوساندنا ئێزدی تووش بووینێ چ ژ ئالیێ ئایینی یان نەتەوەیڤە، هۆسان ل ئێزدییان هات کو د ئامادەبن بەشداریێ د هەر بزاڤەکا ئازادیخوازا کوردیدا بکەن، ژ بەر هندێ دێ بینین دەمێ سەرهلدانا ئێزدین شێر (١٨٥٤-١٨٥٦ز)ێ بەرپابووی و بەرفرەهبوویی و ل سالا (١٨٥٥ز)ێ ل دەڤەرێن باشوورێ دەریا وانێ تاکو مووسل بەلاڤبوویی،

ئێزدییان بەشدارییەكا كاریگەر تێدا كر و ئەڤ چەندە ژی ب شێوەیەكێ رۆن و ئاشكرا خۆیا دبیت دەمێ میرێ ئێزدییان (حسێن بەگ) هێزەكا توركی یا مەزن كو ژ (٥٠٠٠) شەركەران پێكدهات شكاند و تێكــو پێكدا و ل مووسل دەست ب سەر كارخانەكا چەكی و كۆگەهەكا مەزن یا تۆپ و تەقەمەنیاندا گرت زێدەباری گەنجینا بازێری، ڤێ چەندێ ژی هێز دا سەرهلدانێ ژ ئالیێ خۆ بەرهەڤكرنێ و بلندكرنا ورەیێن شۆرەشگێرانڤە، ئەوێن كارێن هەر د وێ سالێدا دەست ب سەر بازێریدا بگرن[55]، لێ دەسەلاتدارێن ئۆسمانییان و ب هاریكاریا ئینگلیزان كارین سەرهلدانا ئێزدێن شێر ب تەمامی ل چریا دووێ (١٨٥٥ز)ێ دابمركینن[56].

ژێدەرێن مێژوویی ئاماژێ ب وێ چەندێ ددەن پشتی دامركاندنا سەرهلدانا ئێزدین شێر چەند سەرهلدانەكێن دی بەرپابوون - وەكـ دیار هەر درێژەپێدەرێن سەرهلدانا ئێزدین شێر بوون - ل سالا (١٨٥٦)ێ ل دیاربەكر دەنگڤەدانا خۆ ل دەڤەرێ هەبوو، پاشی دەڤەرا دێرسم یا چیایی رابەری و شەر و پێكدادان دناڤبەرا خەلكێ دەڤەرێ و هێزێن ئۆسمانی دا ل (باشلك و مۆش و وان و ئەرزەرۆم) چێبوو: (ڤان شەر و پێكدادانا خەلكێ باشلك بایزید شرۆڤە دكەن، كو كوردێن مووسلمان و ئێزدی چاڤەرێنێن هێزێن رۆسی بوون) و ئەڤـ چەندە بەلگەنە بۆ وێ چەندێ خەلك تا چ رادەی ژ ئۆسمانییا و كرێارێن وان بێن لەشكەری و چەوساندنا وان بۆ كوردان تەنگاڤ ببوون، ژ بەر هندێ چاڤەرێ بوون رۆسی بهێن ب هـیـڤـیـا هندێ كو وان ژ زولما ئۆسمانییان ڤورتالبكەن[57].

پشتی دامركاندنا سەرهلدانا ئێزدین شێر دەنگوباس ل سەر ئێزدییان و نەخۆشی و پێكدادانێن هندەك دەڤەرێن كوردی بێ دەنگ دبن تاكو مەدحەت پاشا دبتە والیێ بەغدا دناڤبەرا سالێن (١٨٦٩-١٨٧٢)ێ ئەوێ هەولدایی سەربازیكرنا ب خورتی ب سەر خەلكیدا بسەپینیت، لـــێ ل دووڤ وێ چەندێ یا ژێدەرێن مێژوویی ئاماژە پێدایی ئێزدییان هەولدایە ژ جێبەجێكرنا خزمەتا لەشكەرێ رزگـار ببن و داخوازنامەك ب رێكا (رەئووف پاشا والیێ بەغدا - ئەوێ كو پشتی مەدحەت پاشا هاتی) ئاراستەی ئیستەنبولــێ كرن، ئەوێن ئەو داخوازنامە گەهشتیێ ل ٢٨ شواتا (١٨٧٢)ێ دبێژن ئەركێن وان یێن دینی و داب و نەریتێن وان رێ نادەنێ خزمەتێ دناڤ رێزێن لەشكەرێ ئۆسمانیدا بكەن و داخوازێ دكەن كو دراڤی ل شوونا زەلاما بدەن هەروەكی كریستیان و جهویا و میرێ ئێزدییان حسێن بەگ و ناسرێ بابێ شێخ سەرۆكێ روحانیێ ئێزدییان دگەل كۆمەلەكا ریهسپی و ماقوولێن ئێزدییان ل سەر داخوازنامێ ئیمزاكربوو[58].

## میرگەهێن بەهدینان و سۆران كوردێن ئێزدی ١٨٠٨ - ١٨٧٦

ژ بەركو دەڤەرێن كوردێن ئێزدی لێ ل دەوروبەرێ میرگەهێن كوردیێن ب هێز و مەزن بووینە و دگەل ئێك هەڤ سنووربووینە و ب تایبەت دناڤبەرا هەردو میرگەهێن - سۆران وبەهدیناندا - ژ بەر هندێ هەر پێشداچوونەكە ناڤخۆیی یان یا دەرڤە ب هەر شێوەیەكی هەبت كاریگەریا خۆ ل سەر پەیوەندیێن دناڤبەرا كوردێن ئێزدی و ڤان میرگەهاندا هەبوو.

سەبارەت پەیوەندیێن ئێزدییان وبەهدینانییان، ب درێژیا چەرخێ هەژدێ دخورت بوون ژ بلی چەند حالەتەكا، لێ ل دەستپێكا سەدسالییا نۆزدێ ئەڤ پەیوەندییە ب شێوەیەكی رۆن و ئاشكرا تێكچوون، ئەو ژی پشتی كو ئێزدیێن شێخان ژ ئالیێ والیێ مووسل نەعمان پاشاڤە ل سالا (١٨٠٨)ێ دو چاری هەوەكا لەشكەری بووین، چونكی میرگەها بەهدینان د ڤێ هەوێدا چ هاریكاری بۆ ئێزدیێن شێخان نەكر و د ئەنجامدا باوەری دناڤبەرا هەردو ئالییاندا نەما. میرگەها شێخان ژی نەچاربوو سیاسەتا خۆ بگوهۆرت و دەست ژ ستراتیژییەتا كەڤن بەردەت بۆلایەنگریا میرگەها بەهدینان و ڤێ جارێ ڤیا خۆ دگەل هەردو هێزا بگونجینت ئانكو میرگەها بەهدینان ومیرگەها مووسل - بەلگەژی بۆ ڤێ جەندێ ئەوە دەمێ والیێ بەغدا داخواز ژمیرێ شێخان حەسەن بەگ كرێ ل

سالا (١٢٢٤مش/ ١٨٠٩)ێ كو هەڤدژیا میرگەها مووسل بكەت، حەسەن بەگ رەتكر و دەمێ برایێ وی عەبدی بەگ ڤیای داخوازێن بەغدایێ جێبەجێ بكەت، میرێ ئێزدییان حەسەن بەگ داخوازا لێبورینێ ژ مەحموود پاشایێ جەلیلی كر و ل دووڤ داخوازا وی برایێ خۆ دەرئێخست. برایێ وی چوو شنگال و خۆ هاڤێتە ناڤ خەلكێ وێ یێ ئێزدی وانژی رێز لێگرت، پاشی میرێ ئامێدیێ (زێبر پاشا) بانگهێشت كر و بێی والیێ مووسل حەواند، هەروەسان دنادیێن شێخان ژێ لایەنگریا خۆ یا بەرێ بۆ میرگەها بەهدینان هێلا و دەمێ زێبر پاشا میرێ میرگەها بەهدینان داخواز ژێكری كو هەڤدژیا خەلكێ مووسل بكەن، ئێلا دنادی ئەڤ داخوازە جێبەجێ نەكر و ب توندی رەتكر، ب ڤی ئاوای میرگەها شێخان بەردەوامی ب ڤێ سیاسەتا خۆ دا تاكو فەرمانرەوایی یا جەلیلیا ب سەر ویلایەتا مووسلدا لاواز بووی و كوتایی پێ هاتی[59]. هۆسان بۆ مە خویادبت كو متمانە و باوەری و پەیوەندیێن موكوم ئەوێن دناڤبەرا هەردو میرگەهاندا - شێخان و بەهدینان - ل سەدسالیا هەژدێ، ل دەستپێكا سەدسالیا نۆزدێدا لاوازبوون و دوبەرەكی د هوندور خێزانا میرێ میرگەها شێخاندا پەیدابوو، دەمێ عەبدی بەگ ملكەچییا فەرمانێن والیێ بەغدا كری، حەسەن بەگ هەولدا خۆ دگەل هەردو میرگەهاندا - بەهدینان و مووسل - ب گونجینت ب ڤێ چەندێ بۆ مە خویادبت كو میرگەها بەغدا مایتێكرنا خۆ د كاروبارێن هەرسێ میرگەهان - مووسل، شێخان و بەهدینان - دا دكر و بۆ وێ چەندێ سیاسەتا گەلاجیێ دگەل هەرسێ میرگەهاندا بكاردئینا و هەر سێ هێز بەر ددانە هەڤ، هۆسان ژێرا هەلدكەفت و مایا خۆ د كاروبارێن وان یێن ناڤخۆیی دا دكر، نەمازە بازنێ هەڤركیێ دناڤبەرا هەردو میرگەهێن - مووسل و بەغدا - دا بەرفرەهببوو ل دەستپێكا سەدسالیا نۆزدێ د ماوەیێ حوكمرانییا سلێمان پاشایێ بچووك یێ كو گرنگیا باژێرێ مووسل یا لەشكەری و ئابووری بۆ ویلایەتا بەغدا دزانی، ئەگەر دەست ب سەر مووسلدا گرت، ئەڤە هندێ دگەهینت كو بابانییان ل سلێمانیێ و ئێزدییان ل شنگال دێ شكێنت و ب سەرواندا دێ سەركەڤت بێ كو پشتا خۆ ب پاشایێن مووسل ژێ ژ لایێ جەلیلیان گەرمكەت و پێدڤی ب هاریكاریا وان نابن بۆ هەوێن خۆ یێن لەشكەری دژی بابانییان، چونكی گەلەك جارا وان سۆز ددا ویلایەتا بەغدا و ئەو سۆز نەدهاتنە جێبەجێكرن، و ئەڤە زێدەباری وێ چەندێ كو ویلایەتا مووسل د وی ماوەیدا تا رادەیەكی یا مەزن بوو و پێدڤی بوو مفا ژ هێزا وێ یا مرۆڤان هاتبا وەرگرتن، سەرەرای بازرگانییا وێ یا گەشەپێدای چونكی دگەل بەغدا یا گرێدایی بوو[60]. ل جهەكی ژ ڤێ ڤەكۆلینێ مە گۆتبوو كو میرگەها شێخان دانپێدان ب جەلیلییان نەدكر و دڤیا سەر ب میرگەها بەهدینانڤە بن، چونكی ژ ئالیێ رەگەزی و زمانیڤە خۆ دادنا بەهدینانی، ژ بەر هندێ میرگەها بەهدینان ل سەر میرگەها شێخاندا هەر یا زالبوو، هەر چەندە ب شێوەیەكی فەرمی سەر ب مووسلڤە بوون. ئەو چەندە ژێ بوو ئەگەرەك كو هەڤركی دناڤبەرا هەردو میرگەهێن- مووسل و بەهدیناندا ـ پەیدابت چونكی میرگەها شێخان ب بەروبوومێن خۆیێن چاندنێ یا دەولەمەندبوو هنگی ئێزدییان ئەو ئەردە دچاند ئەوێ كو ژ گوندێن هەردو ئالیێن زێی مەزن (زێی بەهدینان) ژ رۆژهەلاتی درێژ دبت تاكو شێخان و ئەلقۆش و رەخ ورووبێن رووبارێ دیجلە ل رۆژئاڤا، كەواتە هەڤركی پرانییا جاران ئابووری بوویە، زێدەباری وێ چەندێ كو هەموو لایەنان دڤیا بخۆ مفای ژ شیانێن داسنییا یێن شەری ببینن[61].

میرێن میرگەها بەهدینان ئێزدی بۆ مەرەمێن خۆ بكاردئینان، سەبارەت ڤی بابەتی شاكر فەتاح دبێژت: (میرێن مووسلمان گوننەهـ و تاوانێن خۆ دكرنە بەر ئێزدییان چونكی وان ئێزدی پاڵدان كو دزیا و كوشتنێ بكەن)[62]، لێ (عەبدولفەتاح عەلی یەحیا) دبینت بكار ئینانا ئێزدییان ب وی رەنگی ژ بەر هەڤدژی و نەرێكییا دناڤبەرا میرێن بنەمالا دەسەلاتدار دا بوو ، هەروەسان ژ بەر نەرێكییا وان میران بوو دگەل مزووریا و لایەنگریا وان بۆ مووسل و بەغد[63].

ل ڤێرە ئەم دێ بەحسێ وێ چەندێ كەین كا

چاوا میرگەها بەهدینان ئێزدی دژی مزووریا بزڤاندن و چاوا ئەو چەندە بوو بیانوویەك بۆ میرگەها سۆران داکو ئێزدیان بچەوسینن و ئارمانجا خۆ یا گرنگ جێبەجێ بکەن ئەو ژی زاڵبوون بوو ب سەر میرگەها بەهدینان‌دا.

ئەو دەمەك بوو پەیوەندیێن دناڤبەرا میرگەها بەهدینان و مزووریاندا تێکچووبوون، گەهشتە وی رادەی دەمێ ل سالا (١٨٢٤)ێ (محەمەد سەعید) کورێ (محەمەد تەیار پاشا) بوویە میرێ بەهدینان ئێدی ڤێ هۆزێ باج نەدانە میرگەهێ، ئەوژی ژ بەر شەر و ناکۆکیا دناڤبەرا وی و برایێن ویدا رووداى و ژ بەر سیاسەتا وی بەرامبەر هۆزێن کوردی یاکو بوویە ئەگەرێ هندێ کو ئاژاوە و ئاخوران و بخوران دەڤەرا بەهدینان هەمووێ ڤەگرت و مەزنێن هۆزا دەست ژ ئێکودو بەردا و نەچاربوون پەنایێ ببەنە بەرئاسێگەهێن خۆیێن خێلەکی، عەلی ئاغایێ بالەتەیی سەرۆکێ ئێلا ئەرگۆشیا و کورێ وی سنجان ژ دەسەلاتا میرگەها بەهدینان یاخیبوون و کار گەهشتە وی رادەی ئەو دچوونە گوندێن دەشتێ و باج کۆمدکرن و دانا باجێ ب سەر وێ دەڤەرێدا دسەپاند ئەوا دکەفتە دناڤبەرا چیای و رووباری خازردا، خەلکێ وێ دەڤەرێ ژی ژ مزووریا و ئێزدیان گلی و گازندێن خۆگەهاندنە میرێ بەهدینان، ئەوی ژی هنارتە د دووڤ وانرا ودبێژن پلانەك بۆ کوشتنا وان دارشتبوو لێ نەویریا ژ بەر ئەنجامێن خراپتر و بتنێ ئەو ل سەر وان کاران سەرزەنشتکرن، هەروەسان دبێژن عەلی ئاغایێ ئەرگۆشی ل جڤاتێ رسواکر و ویژی بەرسڤا وێ رسواکرنێ دا و ب تورەییڤە ئامێدیێ بجهـ هێلا، دەمێ هەولێن ئوجاخ زادا بەیهۆدە چووین ژبۆ چاککرنا وان[٦٤]، میرێ بەهدینان (محەمەد سەعید پاشا)دیت یا باش ئەوە ب رێکا ئێزدیان ژ عەلی ئاغایێ ئەرگۆشی قورتالبت. دیارە میرێ بەهدینان ل ڤێرە ڤیایە وێ خووندارێ و دوژمنایەتیا دناڤبەرا ئێزدیان و مزووریاندا یاکو هەر ب ئەگەرا میرێن بەهدینان پەیدابوویی ب دەرفەت بزانن و ئێزدیان هاندەن بۆ کوشتنا عەلی ئاغایێ ئەرگۆشی، سەرەرای وێ چەندێ کو ئێزدی ژ کار و کریارێن عەلی ئاغا ژ بەر ئێرشێن وی بۆ سەر دەڤەرێن وان و کۆمکرنا باجا تەنگاڤ ببوون ژ بەر هندێ میرێ بەهدینان (محەمەد سەعید پاشا) میرێ ئێزدیان (عەلی بەگ کورێ حەسەن بەگ کورێ چۆل بەگ) بانگهێشت کر و گۆتێ من دڤێت هوون عەلی ئاغایێ ئەرگۆشی بکوژن! لێ میرێ ئێزدیان ئەڤ چەندە ژ بەر جۆش و خرۆشانا مزووریا و تەڤایا مووسلمانان رەتکر نەکو فەرمانەکا ڤرکرنێ ل ئێزدیان راکەن و داخواز ژ میری کر کو لێ ببۆرت چونکی نکارت دەست تێوەردانێ د کاروبارێن مزووریان یێن ناڤخۆییدا بکەت، لێ میرێ ئامێدیێ هەر ل سەر وێ چەندێ یێ رژدبوو و پەیمان دایێ کو ئێزدییان ب هێزێن خۆ یێن لەشکەری و دەسەلاتا خۆ ل جەم والیێ مووسل و بەغدا ب پارێزن[٦٥].

ل داویێ میرێ ئێزدیان قایلبوو کو ئارەزوویا میرێ ئامێدیێ جێبەجێ بکەت، نەمازە پشتی زانی کو هندەك مزووری دێ هاریکاریا وی کەن و بەشداریێ د جێبەجێکرنا وێ کریارێدا کەن ڤێجا میر(ئیسماعیل پاشا) میرێ ئاکرێ و ب فەرمانا برایێ خۆ میرێ ئامێدیێ، داخواز ژ میرێ ئێزدیان (عەلی بەگ) کر کو دگەل مزووریا پێکبێن داکو چ نەخۆشی و ناکۆکی دناڤبەرا هەردو ئالییاندا نەمینن و رەهێن گەلاجیێ ژی بینە برین، میرێ ئێزدیان ژی رازیبوو، ڤێجا برەکا دیاری و خەلاتێن گرانبەها دگەل خۆ هەلگرتن و ب یاوەریا میر (ئیسماعیل پاشا) سەرەدانا (عەلی ئاغا) ل گوندێ (بالەتە)ی کرن، میر (ئیسماعیل پاشا)ژی داخواز ژ عەلی ئاغا کر کو ئەو ژی سەرەدانا میرێ ئێزدیان ل باعەدرێ بکەت، لێ عەلی ئاغا ئەڤ چەندە رەتکر (عەبدولفەتاح عەلی یەحیا) دبێژت: دیارە عەلی ئاغا ب وێ داڤێ حەسیایە یا کو میرێن ئامێدی ژێرا ڤەدای[٦٦]، لێ (ئیسماعیل پاشا) و ئێك ژ ئوجاخ زادێن مزووریا دگۆتنێ (وەیسی ئاغا) شیاینە وی رازیکەن کو داخوازا عەلی بەگێ قەبوول کەت و ب هەلکەفتا شاهیا سونەتکرنا کورێ وی سەرەدانا باعەدرێ بکەت ب بیانوویا هندێ کو میر دێ کورێ خۆ د کۆشا ویدا سونەت کەت و دێ کەتە کریڤێ خۆ یێ

خوونێ[٦٧]. هەردیسان دیارە کو داخوازیا سونەتکرنێ ژی هەر ژ هزرێن میرێ ئامێدیێ بوویە داکو عەلی ئاغا نەچاربت سەرەدانا باعەدرێ بکەت، هۆسان کارینە ئێك ژ گرنگترین و پاکترین داب و نەریتێن ئێزدیاتیێ بۆ بەرژەوەندیێن خۆ یێن کەسی بکاربینن، چونکی کریڤاتیێ رێز و بەهایەکی تایبەت ل جەم ئێزدییان هەیە و رێکەکە بۆگرێدان وبەستنا پەیمان و بەلێنان.

هۆسان دیار دبت کو بۆ کوشتنا عەلی ئاغایێ ئەرگۆشی میرێن ئامێدیێ ب پشکداریا هندەك ئوجاخ زادێن مزووریا پلانەك دارشتبوو، ل داویێ کارین عەلی بەگ قایل بکەن و وێ پلانێ جێبەجێ بکەن یاکو بوویە شەرمەزاریەکا مەزن بۆ وی ب شێوەیەکێ تایبەت و بۆ هەموو ئێزدییان ب شێوەیەکی گشتی هەر چەندە ئەو پلانە یا کوشتنا عەلی ئاغا، میرێن ئامێدیێ و هندەك ئوجاخ زادێن مزووریا دانابوو. ب ڤی رەنگی عەلی ئاغایێ ئەرگۆشی داخوازا میرێ ئێزدییان جێبەجێکر و رابوو دگەل کورێ خۆ سنجان و ژمارەکا زەلامێن وی باوەرییەکا مەزن پێ هەی سەرەدانا باعەدرێ کر بێی کو بزانت ئەنجامێن وێ سەرەدانێ چنە[٦٨]. د وێ سەرەدانێدا عەلی ئاغا و کورێ وی سنجان دگەل هندەك زەلامێن وی ل سەردەستێ عەلی بەگ و زەلامێن وی ل زڤستانا (١٨٣٢)ز)ێ هاتنە کوشتن. هەژی گۆتنێ یە کو عەلی ئاغایێ ئەرگۆشی مامێ زانایێ ئایینی یێ مەزن (مەلا یەحیایێ مزووری) بوو، مەلا یەحیا ڤیا تۆلا مامێ خۆڤەکەت[٦٩]، رابوو چوو جەم (محەمەد سەعید پاشا) میرێ ئامێدیێ لێ میرێ ئامێدیێ چ ئاخفتنێن ب دلێ وی نەگۆتن، چونکی ئەو بەرهەڤکەر و نەخشەکێشێ ئێکێ بوو د کریارا کوشتنا مامێ ویدا، پشتی هنگی مەلا یەحیا نەراوەستا چوو ئاکرێ جەم (میر ئیسماعیل پاشا) لێ هەر دیسان یا بێ مفابوو، چونکی ئیسماعیل پاشا ژی نەڤیا هاریکاریا وی بکەت، هۆسان ژێرا خۆیابوو کو کوشتنا مامێ وی ل دووڤ داخوازا میرێن بەهدینان بوویە و هەر ئەو بەرهەڤکەرێن پلانا کوشتنا وی بوون. ژ بەر هندێ مەلا یەحیایێ مزووری بریاردا جهێ خۆ و دەسەلاتا خۆ ل کوردستانێ بکاربینت داکو تۆلا مامێ خۆ ژ میرێن بەهدینان و لایەنگرێن وان میرێن شێخان ڤەکەت. بەرێ هنگی ناکۆکییا دناڤبەرا سەعید پاشایێ میرێ بەهدینان و برایێ وی میر موسا دا سەرا حوکمرانیێ هەبوو، مەلا یەحیایێ مزووری ئەو چەندە ب دەرفەت زانی و خۆ گەهاندە میر موسا و ب شێوەیەکێ نهێنی د گەلدا رێککەفت کو بچتە جەم میر مەحەمەدێ رەواندزی و هاریکاریێ ژێ بخوازت داکو میراتییا میرگەهێ ژێرا بزڤرینت[٧٠].

سەبارەت پەنابرنا مەلا یەحیایێ مزووری بۆ میرگەها سۆران (عەبدولفەتاح عەلی یەحیا) دبێژت: گومان تێدا نینە هۆزا مزووریا کو مەزنترین و ب هێزترین هۆزا بەهدینان بوو، ب کریار د کارێ تۆلێ ژ بکوژا ڤەکەت، لێ دیارە ئەڤ هۆزە هنگی یا پارچە پارچە بوویە و کوشتنا ب هێزترین سەرۆکێ وێ ئەو نەکرینە ئێك و نە بزڤاندینە، و کوشتنا وی ژی ب رەزامەندیا هندەك لایەنێن وێ هۆزێ بخۆ بوویە، ئەرگۆشیا بخۆ هەست ب وێ چەندێ کرییە کو نکارن هێزەکا مەزن بۆ تۆلڤەکرنێ کۆمبکەن، مەلا یەحیایێ مزووری بخۆژی نە کارییە هەستێ هۆزێن دەوروبەرێ خۆ یێ ئایینی بێخیتە جۆش و خرۆشێ داکو هاریکاریا وی بکەن و هەست ب لاوازێ کرییە بەرامبەر هەڤپەیمانیا میرێن ئامێدیێ و شێخان، هەتاکو والیێ مووسل ژی نە ڤیایە پێشوازیا وی بکەن و فەرمان دایە وی دەربێخن، ئەوژی هەر ب هاندانا میرێن ئامێدیێ بوویە، هەر وەسان (عەبدولفەتاح عەلی یەحیا) دبێژت: دوژمنکاریا سۆران وداسنیان ل سالا (١٥٣٤)ز)ێ دەستپێنکرییە، هنگی سولتان سلێمان قانوونی کارێ شەر و ناکۆکیێ دناڤبەرا واندا پەیدابکەت، دەمێ وی (ئێزدین شێر) میرێ سۆران کوشتی و جهێ حسێن بەگێ داسنی ل هەولێر دانایی، ڤێجا بۆ دەمەکێ درێژ شەر دناڤبەرا هەر دو ئالییاندا یێ بەردەوام بوو تاکو ل داویێ میرگەها سۆران سەرکەفتی و حسێن بەگێ داسنی ژ هەولێر دەرئێخستن و هەزارەها خێزانێن داسنییا ئاوارەبوون و ژ سۆران کۆچکرنە بەهدینان[٧١]، لێ میرێ سۆران یێ بەرخواز نە یێ پێدڤی وێ هاندانێ بوو چونکی ئەو چەندە دگەل ئامانجێن وی یێن

بەرفرەهبوونا سنوورێن دەسەلاتداریا وی دگونجان، ئەڤەژی ل دووڤ گۆتنێن (عەبدولفەتاح عەلی یەحیا)، و (جەمال نەبەز) ژی ل سەر ڤێ جەندێ دگەل وی رێكدكەڤت دەمێ كوشتنا عەلی ئاغایێ ئەرگۆشی ب هۆكارەكێ نە یێ گرنگ دادنێت بۆ هێرش كرنا میرێ سۆران بۆ سەر میرگەها بەهدینان و ئێزدییان و سەبارەت ڤێ چەندێ دبێژت: ئەز دبینم تۆلڤەكرنا عەلی ئاغایێ ئەرگۆشی ژ ئێزدییان هۆكارەكێ لاوەكی بوو كو میر مەحەمەد هێرشێ ببەتە سەر ئێزدییان، پالدەرێ سەرەكی بەرخوازیێن وی یێن بەرفرەهبوونێ بوون د چارچۆڤێ كوردستانێدا ئەڤەژی ئەنجامێن هەر دەولەتەكێ یان میرگەهەكێنە دەمێ خۆ دبینت یا ب هێز و چ هێزێن دی د سەر خۆڕا نەبینت، هەروەسا (عەبدولفەتاح عەلی یەحیا) دبێژت: بارودۆخ بۆ میرێ سۆران د گونجای بوون، چونكی دەولەتا ئوسمانی ب قەیرانا مەحەمەد عەلی پاشایێ والیێ میسرێڤە یا مژوول بوو یێ كو گەف ل قەوارێ ئیمپریاتوریەتا ئوسمانی ل سالێن (١٨٣٢- ١٨٣٣ز) دكرن [٧٢]. د ئەنجامدا میرێ سۆران ب كاریگەری و رژدیا هەڤالێ خۆ مەلا یەحیایێ مزووری داخواز ژ زانایێ خۆ یێ ئایینی (مەحەمەد مەلا خەتی) كر كو فەتوایێ ب دەتێ داكو هێرشێ ببەتە سەر ئێزدییان، مەلاخەتی ژی فەتوا دەرئێخست و كوشتن و تالانكرنا ئێزدییان حەلالكر [٧٣].

د پەرتووكا (الاكـراد فـي بهدینان) دا هاتییە: (هاندانا مزووری بۆ میرێ سۆران داكو هێرشێ بكەتە سەر ئێزدییان خۆشی ئێخستە د دەروونێ میریدا نەمازە پشتی مەلایێ خەتێ فەتوا دایی، لێ دڤیا ئەو ل دەستپێكێ هێرشێ ببەتە سەر ئێزدییان، ئەگەر میرێن بەهدینان هاریكاریا وان كر، هنگی میری ماف هەیە شەرێ وان ژی بكەت چونكی میرێن بەهدینان یێ هاریكاریا دوژمنان دكەن [٧٤].

میرێ سۆران خۆ بەرهەڤكر و ڤیا بەهدینان و ئێزدییان بشكێنت، لەشكەرەكێ چل هەتا پێنجی هەزار كەسی دگەل چەك و هەموو پێدڤیێن دی ئامادەكر و ل پاییزا (١٢٤٨مش/١٨٣٢ز)ێ ژ هەولێرێ ب رێ كەفت، ژ رووبارێ زێی مەزن دەربازبوو، و د گوندێ (كەلەك)را یێ كو دبێژنێ گوندێ (دەواس) كو ئێكەمین گوندە ل سەر رێكا بۆ شێخان دچت خەلكێ گوندی هەموو بێ جوداهی كوشتن و ژ گوندەكی بۆ یێ دی دچوون و یا ب سەرێ گوندێ كەلەك ئینای ب سەرێ وان ژی دئینا و چ بەرەڤانییا هوسان ژی نەبوو، ژ بەر هندێ بەرەو ئاسێگەها میرێ ئێزدییان ل باعەدرێ چوون وی ژی كارێ خۆ كر و خۆ بەرهەڤكر دەمێ زانی ئەو هێزا مەزن یا بەرەڤ وان دئێت [٧٥]. دەمێ ئەو هێزا مەزن نێزیكی باعەدرێ بوویی، عەلی بەگ زانی نكارت وان بشكێنت، رابوو داخوازەك بۆ میرێ بەهدینان (مەحەمەد سەعید پاشا) فرێكر داكو هێزەكا لەشكەری ل هاوارا وان بهنێرت، ئەو بوو میرێ بەهدینان ئێكسەر هێزەكا لەشكەری ل ژێر سەركردایەتیا ئێك ژمرۆڤێن خۆ كو دگۆتنێ (یونس ئاغایێ گیلی) هنارت و فەرمان دا برایێ خۆژی دادوەرێ ئاكرێ داكو هاریكاریێن لەشكەری بۆ میر عەلی بەگ پێشكێشبكەت [٧٦].

ل پازدەی ئاداری (١٨٣٢ز)ێ هێزێن میرێ سۆران هێرش برە سەر هێزێن عەلی بەگ و یونس ئاغا، هەر چەندە میرێ ئێزدییان عەلی بەگ دەستپێشخەرییەكا پێكهاتنێ پێشكێشی وی كر بوو لێ وی فەرامۆشكر و بۆ دەمێ دو رۆژان شەر دناڤبەرا واندا یێ بەردەوام بوو، د ئەنجامدا میرێ سۆران سەركەفت، ئیسماعیل پاشا دگەل هێزێن خۆ د هاوارا عەلی بەگ دچوون دەمێ دەنگوباسێن شكەستنا هێزێن عەلی بەگ و یونس ئاغا گەهشتینێ، ئەو دگەل هێزێن خۆ زڤرییە ئاكرێ [٧٧]. د وی شەریدا هژمارەكا زۆر ژ ئێزدییان هاتنە كوشتن و گەلەك ژێ پەرت و بەلاڤ و دەربەدەربوون، هندەكان ژی خۆگەهاندە ئاسێگەهێن چیایێ جۆدی و هندەكێن دی ژی رەڤینە چیایێن تۆر عابدین و شنگال و ل ئاسێگەهـ و كۆیێن واندا ژ ترسا لەشكەرێ سۆران خۆ حەشاردا [٧٨]. نێزیكی دەهـ هەزاران ژی قەستا مووسل كر داكو خۆ لێ بپارێزن لێ والیێ مووسل پر ژ سەر رووبارێ دیجلە ژ ترسا لەشكەرێ سۆران راكر نە وەك ل دووڤ وان بچت و بچتە د هوندوری باژێریدا،

ئەو ئێزدی نەچاربوون چوونە (تل قوینجق) کو نێزیکی میلەکێ ژ مووسل دوورە، ل وێدەر لەشکەرێ سۆران گەهشتێ و د (تل قوینجق)دا بۆ دەمێ چەند رۆژەکان دۆرپێچ کرن و هەموو کوشتن[79]، و دبێژن عەلی بەگ ژی ب دیل گرت و هنارتە رەواندۆزێ[80]. ئێزدی ل سەر وێ زیانا ب وان کەفتی و ب دیل گرتنا میرێ وان و هنارتنا وی بۆ رەواندۆزێ بێ دەنگ نەبوون، رابوون هێرشەك ب سەرکردایەتیا خێزانا میر عەلی بەگ برە سەر لەشکەرێ سۆران و هژمارەکا سەربازان ژێ کوشت، وەك بەرسڤەك بۆڤێ چەندێ میرێ سۆران هێزەکا لەشکەری هنارتە شنگال، هنگی پێلیا ئێزدییان گەهشتبوو نێزیکی مووسل، شەر و پێکدادان و کوشتارەکا مەزن دناڤبەرا هەردو ئالییاندا بەرپابوو، و د ئەنجامدا دیسان ئێزدی شکەستن و نێزیکی (٧٠٠) هەفت سەد کەس ب دیل هاتنە گرتن و میرێ سۆران چوو د هوندوری شنگال دا[81].

ئەوا هاتییە سەرێ ئێزدییان ژ ئەنجامێ وێ هەوا لەشکەری گەلەکا مەزن بوو، نێزیکی (١٠٠،٠٠٠) سەد هەزار زەلام هاتنە کوشتن زندەباری ژن و زارۆك کەچێن وەکو دیل برین[82]، هەر وەسان بارێ ئابووری ژی ل دەڤەرێن ئێزدییان ژ ئەنجامێ کوشتن ودزین و رووخاندنا بەنداڤا و ویرانکرنا بیرێن ئاڤێ و برینا داران و سۆتنا گوندان ل دەڤەرێن ئەلقۆش و شێخان و باشیکێ و باعەدرێ و شنگالێ و خەتارا مەزن و گەلەك دەڤەرێن دی ب ئێکجاری تێکچوو[83].

## سیاسەتا سولتانێ ئۆسمانی عەبدولحەمیدێ دووێ ١٨٧٦-١٩٠٩ بەرامبەر کوردێن ئێزدی ل دەڤەرا بەهدینان

کوردێن ئێزدی ل سەر دەمێ دەولەتا ئۆسمانی تووشی گەلەك هەوێن لەشکەری بووینە، ژ ئەنجامێ وێ چەندێ ژی گوندێن وان هاتینە تالانکرن و ویرانکرن وخەلکەکێ زۆر د ڤان هەواندا هاتییە کوشتن و زیانێن ئابووریێن مەزن ب دەڤەرێن ئێزدییان کەفتینە زێدەباری زیانێن دەروونی. لێ ل سەردەمێ سولتانێ ئۆسمانی عەبدولحەمیدێ دووێ (١٨٧٦-١٩٠٩)ێ دەولەتا ئۆسمانی جینوسایدێ ب دژی ئێزدییان کر و نەخشە و پلانێن تایبەت ژ لایێ دەسەلاتا ئۆسمانیڤە هاتنە دارشتن ژ بۆ حەلاندنا ئێزدییان دناڤ جڤاکێ ئۆسمانی یێ مووسلماندا و دەمێ سەرکەفتن ب دەستڤە نەدئینا هەوێن لەشکەریێن مەزن دبرنە سەر دەڤەرێن وان، ئانکو ئارمانجا دەولەتا ئۆسمانی د ڤی دەمی دا ژناڤبرنا ئێزدییان بوویە، لەوما ب بەشەکی مووسلمانان دهاتنە ناسکرن و دگۆتن دینێ خو ژ دەست داینە و فەرە جارەکا دیتر بزڤرنە سەر دینێ خۆ یێ بەرێ و ژ بۆ ڤێ مەرەمێ ژی خەرجیێن مەزن هاتینە مەزاختن و نەخشە و پلانێن گرنگ هاتینە دارشتن.

بەری سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ (١٨٧٦-١٩٠٩)ێ دەسەلاتا دەولەتا ئۆسمانی وەربگرت، کوردێن ئێزدی ژ خزمەتا لەشکەری بەرامبەر دانا (٥٠) لیرێن ئۆسمانی هاتبوونە بەخشین[84]، لێ پشتی هاتنا سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ بۆ سەر دەسەلاتێ و سیاسەتا (الجامعة الاسلامية) پەیرەوکری جارەکا دی خزمەتا ب زۆری یا لەشکەری ل دەولەتێ هاتە چەسپاندن و سولتانێ ئۆسمانی ڤیا ئێزدییان ژی نەچاربکەت داکو خزمەتا لەشکەری بکەن، هەڤدەم هندەك پیاوێن ئایینی بانگا وێ چەندێ دکر کو کوردێن ئێزدی نابت مامەلەیا وان مینا مللەتێن خودان پەرتووکێن دینی بهێتەکرن و ددانە خۆیاکرن کو ئێزدی بەشەکن ژ ئیسلامێ لێ دینێ خۆ هێلایە، ئەڤجا فەرە ب هەر رێکەکا هەبت وان بزڤریننە سەر دینێ ئیسلامێ و خزمەتا لەشکەری بکەن[85]. هەروەسان سولتان عەبدولحەمید ژی هێزا دەولەتێ د هێزا ئایینی ئیسلامێ را ددیت و دگۆت: (تاکە هێزا کو وەسا ل مە دکەت ئەم ل سەر پێن خۆ راوەستین ئیسلامە... ب مەرجەکی ئەم د وەفادارین بۆ ئەڤی ئایینی).

پشتی ب دوماهیك هاتنا شەرێ رۆسی-ئۆسمانی (١٨٧٧-١٨٧٨)ێ و ئەو هەموو خوسارەتێن دەولەتا ئۆسمانی تووش بوویێ، دەولەت ئێخستە ژێر مەترسییا لاوازبوون و ژ ناڤچوونێ ئەڤجا

سولتانێ ئۆسمانی ئالایێ (جامعەیا ئیسلامی) بلندکر کو ب شێوەیەکی رێکوپێك هاتبوو دارشتن ژ بۆ بدەستڤەئینانا چەندین ئارمانجان ژ وان ژی: سولتانێ ئۆسمانی ڤیا پشتەڤانیا مووسلمانێن دەولەتا ئۆسمانی بدەستڤە بینت ژ بۆ ب هێزکرنا دەسەلاتا خو یا سیاسی وەك خەلیفەیێ مووسلمانا و بکارئینانا وێ پشتەڤانیێ دژی وان کەسێن داخوازا پراکتیککرنا ژیانا دەستووری دکەن و هەروسان ژی ب مەرەما ب هێزکرنا دەولەتێ و دانانا سنوورەکی ژ بۆ مایتێکرنا دەولەتێن رۆژئاڤا د دەولەتا ئۆسمانیدا[86]. وەسان دەزگەهێ لەشکەری یێ دەولەتێ نەشیایە مفایی ژ کوردێن ئێزدی ببینت و ب دیتنا سولتانێ ئۆسمانی ژی ئەو مینا بەشەکێ مووسلمانانە کو دینێ خۆ ژ دەست داینە، ئەڤجا حکۆمەتا ئۆسمانی ل سالا (١٨٨٥ز)ێ بریاردا مامەلە دگەل ئێزدییان مینا مووسلمانان د بیاڤی خزمەتا لەشکەری دا بهێتە کرن[87].

## هنارتنا شاندێن ئایینی و ڤەکرنا خواندنگەهێن ئایینی:

د سەردەمێ سولتان عەبدولحەمیدی دا حکۆمەتا ئۆسمانی رێکێن جۆراوجۆر بکارئینان ژ بۆ مووسلمانکرنا ئێزدییان و هەروسان نەچارکرنا وان کو خزمەتا لەشکەری بکەن، و ئێکەمین پێنگاڤا حکۆمەتا ئۆسمانی ژ بۆ پەیرەوکرن و چەسپاندنا سیاسەتا خۆ بەرامبەر ئێزدییان، هنارتنا شاندێن ئایینی بوو بۆ دەڤەرێن وان داکو دەست ژ بیروبۆچوونێن خۆ بەردەن و ببنە مووسلمان و ئێکەمین هەوا وان ب سەرکردایەتیا نەقیبێ دیاربەکر حاج مەسعود ئەفەندی و ئەندامەتییا شێخ سەلیم خالدی و هندەك زانایێن ئایینی و سەرکردەیێن لەشکەرێ سولتانێ ئۆسمانی بوو ل سالا (١٨٨٧ز)ێ، ژ بۆ هندێ ئێزدییان بکەنە مووسلمان، ئانکو پلانەکا ب رێکوپێك هاتبوو دارشتن ژ لایێ حکۆمەتا ئۆسمانیڤە ژ بۆ ژناڤبرنا کوردێن ئێزدی ئەوژی ب رێکا پیاوێن ئایینی[88]. لێ ئۆسمانییان نەشیا بگەهنە ئارمانجا خۆ و ئێزدییان بکەنە مووسلمان چونکی ئێزدییان قەبوول نەدکر ئەو پیاوێن ئایینی کارێ خۆ ل دەڤەرێن وان ئەنجامبدەن، و سەبارەت هەلویستێ ئێزدییان ژ ڤان هەوان سەدیق دەمەلوجی دبێژت[89]: (ئەڤ هەوە دهاتن و دچوون بێ کو بشێن تشتەکی بکەن و ئێزدییان نەدهێلا ئەو بهێنە دناڤ واندا).

دەولەتا ئۆسمانی زۆر هەولدان کو کوردێن ئێزدی ژی مینا هەموو مووسلمانان خزمەتا لەشکەری بکەن، بەلگەنامەیەکا ئۆسمانی کو دزڤرتە سالا (١٨٨٨ز)ێ دوویات دکەت کو یاسایا خزمەتا لەشکەری ئێزدیێن ئاکنجیێن ویلایەتا مووسل بخۆڤە ناگرت، چونکە نە مووسلمانن، لێ ژ بەر کو ئەڤ یاسایە هێشتا نەهاتییە جێبەجێکرن ئەڤجا هەموو ئەو کەسێن خزمەتا لەشکەری نەکرین مینا کەسانێن ژ خزمەتا لەشکەری رەڤین دێ مامەلە دگەل هێتەکرن و ژ بەرکو بارێ وان یێ ئابووری یێ خرابە بەشەك ژ وان پەنا برییە رۆسیا و نێزیکی ٤٠ هزار کەسێن دی ژی ب کوژمێ ئەلتەرناتیڤا لەشکەرییێ دەیندارن و هزردکەن بچنە رۆسیا، ئەڤجا دڤێت هەموو ئەو کەسێن خزمەتا لەشکەری نەکرین ئەلتەرناتیڤا لەشکەری بدەن[90]. لێ دیارە حکۆمەتا ئۆسمانی پێدڤییەکا مەزن ب لەشکەری هەبوویە و بزاڤێن مەزن کرینە کو دڤێت ب هەر رێکەکا هەبت ئێزدییان نەچار بکەت داکو خزمەتا لەشکەری بکەن، دەربارەی ڤێ چەندێ بەلگەنامەیەکا ئۆسمانی ل ١٤ شباتێ (١٨٨٩ز)ێ دەرکەفتییە ئاماژێ ب هندێ ددەت ئەگەر ئێزدییان تا نها ئەلتەرناتیڤا لەشکەری ژی دابت دڤێت بو ماوەیێ (٥) هەیڤان خزمەتا لەشکەری بکەن و ئەڤ بریارە فەرە ل سەر هەموو ئێزدییان بهێتە بجهئینان[91] و ب گۆرەی بەلگەنامەیەکا دی یا ئۆسمانی ل (١٨٩٠ز)ێ نابت بیروباوەرێن وان ببنە رێگرێن بجهئینانا خزمەتا لەشکەری بەلکو پێدڤییە ل سەر وان ئەو دینێ خۆ بگهۆرن بۆ وێ چەندێ خزمەتا لەشکەرێ دەولەتا ئۆسمانی بکەن[92].

دەولەتا ئۆسمانی بەردەوام بوو ل سەر هەوێن خۆ ژبۆ مووسلمانکرنا ئێزدییان، بەلگەنامەیەکا دیترا

ئوسمانییان کو مێژوویا وێ دزڤرته ٨ کانوونا دووێ (١٣٠٦مش/ ١٨٩١ز)ێ، کو پلانەك ژ لایێ مەشیخا ئوسمانی هاتییە دارشتن کو ئارمانجا وان یا سەرەکی ئەوە ئێزدییان بکەنە مووسلمان و ژ بو ڤی چەندێ چەندین ماموستا و راوێژکارێن ئایینی هاتنە دەست نیشانکرن ژ بو هندێ ئێزدییان ل ویلایەتا مووسل فێری بنەمایێن ئیسلامێ بکەن و دەرمالەیێن تایبەت ژی بو وان کەسان هاتبوونە مەزاختن.

ئێك ژ هەوێن دی یێن سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ ژ بو مووسلمانکرنا ئێزدییان ئەوبوو ل بەهارا (١٨٩١ز)ێ شاندەکێ دی ژ ئیستەنبولێ هنارتە دەڤەرا شێخان ل مووسل کو ژ چەند ئەفسەر و دو مەلایان پێکدهات و شاندێ ناڤبری نامەیەك ژ سولتانێ ئوسمانی عەبدولحەمیدێ دووێ بو ئێزدییان ئینابوو، ناڤەروکا وێ ئەو بوو دڤێت ئێزدی بزڤرنە سەر دینێ ئیسلامێ، لێ ئێزدییان ئەڤ نامە رەتکر و مەزنێن ئێزدییان دووپاتکر کو دینێ وان ب چەندین سالان بەری ئیسلامێ یە[٩٣].

پشتی ئەڤی هەلویستێ ئێزدییان، والیێ مووسل عەبدولقادر کەمال پاشا نڤیسارەك ئاراستەی حکومەتا ئوسمانی کر ژبو هندێ سەرکردەیەکێ لەشکەری بهنێرنە دەڤەرێ دا کو ئێزدییان ب زوری بکەنە مووسلمان، هەر ژ بو ڤێ مەرەمێ ژی فەریق عومەر وەهبی پاشا بو دەڤەرێ هاتە هنارتن و ل تەمموزا (١٨٩٢ز)ێ گەهشتە مووسل و ژ لایێ سولتانێ ئوسمانی هاتبوو راسپاردن داکو سەرپەرشتیا ویلایەتا مووسل بکەت. هەلبەت عومەر وەهبی پاشا بو چارەسەرکرنا (کێشا ئێزدییان) دو رێك بکار ئینان ئەوژی ب رێکا هنارتنا ماموستا و پیاوێن ئایینی بو دەڤەرێن ئێزدییان و رێکا دی ژی هنارتنا هەوێن لەشکەری بوو، پشتی رێکا پێشین ئەنجام بدەستڤە نەئینایێن[٩٤].

ل دەستپێکێ دەمێ عومەر وەهبی پاشا گەهشتییە مووسل و ئاگەهداربووی کو کوردێن ئێزدی ماموستا و رێبەرێن ئایینی ژ دەڤەرێن خو دەرئێخستینە، ل تەباخا (١٨٩٢ز)ێ داخواز ژ مەزنێن ئێزدییان ل دەڤەرا شێخان کر ل مووسل ئامادەبن، هەلبەت ژ ترس و هەیبەتا عومەر وەهبی گەلەك ژ رێهـ سپی و مەزنێن ئێزدییان بەرەف مووسل چوون ژ وان ژی میرێ ئێزدییان میرزا بەگ وبرایێ وی بەدیع بەگ کو نەدزانین ئارمانج ژ ئەڤێ داخوازکرنێ چی یە، عومەر وەهبی دگەل پیاوێن ئایینی و رێهسپیێن دەڤەرێ و هێزێن لەشکەری و تیپا موزیکێ یا لەشکەری پێشوازیا ئێزدییان کرن[٩٥]، وە دیارە مەرەما عومەر وەهبی پاشا ژ ڤێ پێشوازیێ ئەوبوویە کو خو دیارکەت کەسانەکێ ب هێزە و هیچ لایەنەك نەشێت سەرپێچیێ ل سەر بریارێن وی بکەت، ئانکو مەبەستا وی ئەوبوو کارتێکرن و گڤاشتنێ ل ئێزدییان بکەت.

پشتی کوردێن ئێزدی گەهشتینە مووسل و پێشوازی لی هاتییەکرن، عومەر وەهبی پاشا کومبوونەك دگەل وان ئەنجامدا و داخواز ژ وان کر کو بیروباوەرێن خو بهێلن و ببنە مووسلمان و دەمێ ئەڤ چەندە هاتییە رەتکرن ژ لایێ ئێزدییانڤە ئەو ژ لایێ عومەر وەهبی ڤە هاتنە ئەشکەنجەدان و چەند کەسەکان گیانێ خو ژدەست دا، ئەڤجا ژبو پاراستنا ئێزدییان میرێ وان میرزا بەگ و بەدیع بەگ و دو کەسێن دی ئیسلامبوونا خو راگەهاند و ژ بەرکو عەلی بەگ برایێ مەزنێ میرزا بەگ رەتکر دینی خو بگوهورت هاتە زیندانکرن و پاشی بو سیواس دوورئێخستن[٩٦]. رەنگە ئەڤ چەندە ئێك ژ رێکێن گڤاشتنێ بت ل سەر ئێزدییان کو دینی خو بهێلن یان ژی دا عەلی بەگ نەزڤرتە ناڤ ئێزدییان وەك قارەمانەك کو بریارا فەریق عومەر وەهبی پاشا بجهـ نەئینای، رەنگە ببتە ئەگەرێ هندێ ئێزدی ل دور وی کومڤەبن و دژایەتیا عومەر وەهبی بکەن چونکی عومەر وەهبی دزانی تا چ رادەی مەزن و میرێن ئێزدییان رێز و قەدر و کاتێکرنا خو دناڤ جڤاکێ ئێزدییاندا هەیە، هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ژی عومەر وەهبی پاشا بریاردا کو ئەو کەسێن مووسلمان بوونا خو راگەهاندین و ژوانا میرێ ئێزدییان و برایێ وی جلکێن لەشکەری بکەنە بەرخو و داخوازێ ژ ئێزدییان ژی

بکەن خزمەتا لەشکەری دناڤ لەشکەرێ ئۆسمانیدا بکەن، لێ ئەڤ چەندە ژ لایێ میرێ ئێزدییانڤە هاتە رەتکرن ب بیانوویا هندێ ئەو نکارت ڤی چەندێ ل سەر ئێزدییان بسەپینت[٩٧].

ل ٧ تەباخا (١٨٩٢ز)ێ عومەر وەهبی پاشا نڤیسارەك ئاراستەی ئیستەنبولێ کر و تێدا دا خواکرن کو وی شیایە(٢٠) هەزار ئێزدییان بکەتە مووسلمان و داخواز ژ دەسەلاتا ئۆسمانی کر داریێن رێزلینانێ بۆ میرێ ئێزدییان میرزا بەگ و برایێ وی بەدیع بەگ بهنێرن چونکی دەستپێشخەربووینە بۆ راگەهاندنا مووسلمانبوونا خۆ هەروەسان داخواز کر کو مامۆستا و راوێژکارێن ئایینێ ئیسلامێ بهنێرنە گوندێن ئێزدییان ل دەڤەرا شێخان[٩٨]. ژ بەرکو ئەڤ چەندە دگونجا دگەل سیاسەتا عەبدولحەمیدێ دووێ ژ بەر هندێ داخوازێن فەریق عومەر وەهبی پاشا بجهئینان و ناسناڤێ (پاشا) دانا سەر میرزا بەگ و برایێ وی بەدیع بەگ و مووچەیەکێ هەیڤانە بۆ وان هاتە تەرخانکرن کو ٢٠٠٠ قرشێن ئۆسمانی بوون[٩٩].

بەردەوامی دان ب پرۆژێ (ئیسلامکرنا ئێزدییان) عومەر وەهبی پاشا کۆم بوو دگەل جڤاتا کارگێریا ویلایەتا مووسل ل تەباخا (١٨٩٢ز)ێ ژبۆ گەنگەشەکرنا (ئاریەشیا ئێزدییان) و چاوانییا ئیسلامکرنا وان ب هندەك رێکێن دی و ل دوماهیکا کۆمبوونا جڤاتێ هندەك پێشنیار هاتنەدان و ژوانا: ڤەکرنا خواندنگەهێن دینی ل گوند و دەڤەرێن ئێزدییان، ئاڤاکرنا مزگەفتان ل هندك گوندێن ئێزدییان، دەستنیشانکرنا مامۆستا و راوێژکارێن دینی بۆ خویندکارێن ناڤبری، بەلگەنامەیێن ئۆسمانی دووپاتدکەن کو دام ودەزگەهێن ویلایەتا مووسل و دەسەلاتێ ل ئیستەنبول گرنگییەکا زۆر ب وان پێشنیاران کر و هاریکاریا عومەر وەهبی پاشا کرن ژبۆ بەردەوامیدانا وی ل سەر ڤی کاری[١٠٠]، دەربارەی ڤێ چەندێ نڤیسارا ویلایەتا مووسل ژمارە (٦٤) ل ٧ موحەرەما سالا (١٣١٠مش)ێ ئاماژێ ب رازیبوونا سەدرولئەعزەم دکەت ل دۆر ئاڤاکرنا خواندنگەهـ و مزگەفتان ل ١١ گوندێن ئێزدینشین[١٠١]. هەمان جڤاتا ناڤبری پێشنیارکر خواندنگەهەکا دینی ل پەرستگەها لالش ژی بهێتە ڤەکرن، هەلبەت مامۆستایێن ئایینی و مەلایێن مزگەفتان بەرهەڤیا خۆ دیارکرن ئێزدییان فێری پرەنسیپێن ئایینێ ئیسلامێ بکەن، هەژی گۆتنێ یە کو خواندن ل وان خواندنگەهێن دەڤەرا شێخان هاتینە ڤەکرن ب زمانێ عەرەبی و کوردی بوو و فەربوو ئەو کەسێ ببتە مامۆستا ل وان خواندنگەهان هەروەسان مەلایێ مزگەفتێ ژی شارەزای داب ونەریتێن خەلکێ دەڤەرێ با[١٠٢].

پلانەکا ب رێکوپێك ژ لایێ عومەر وەهبی پاشا ڤە هاتە دارشتن بۆ ئەنجامدانا پرۆژەیێ ناڤبری و دەسەلاتا ئۆسمانی ل سەر ئاڤاکرنا خواندنگەهـ و مزگەفتان ل ١١ گوندێن ئێزدییان، بۆ نموونە جهێن هاتینە دەستنیشانکرن ژبۆ وی پرۆژەی کو خواندنگەهـ و مزگەفت لێ بهێنە ئاڤاکرن وەکی: باشیکێ، بەحزانێ، باعەدرێ، خەتارا مەزن، گرێ پانێ، ئێسڤنێ (شێخان)، و خەرجییێن هەر ئێکێ ژوان ژی (٢٠٠٠٠) و گۆژمێ هەمموویان (١٢٠٠٠٠) قرش بوون، و مووچەیێ هەیڤانە بۆ ستافێ وان خواندنگەهان ژی ب ڤی شێوەیێ ل خوارێ دیارکری هاتە دەستنیشانکرن:

- مدرس ١٠٠٠ قرش
- مامۆستایێ ئێکێ ٤٠٠ قرش
- ماموستایێ دووێ ٢٠٠ قرش
- خویندکار ١٠٠ قرش
- پاقژکەر ٣٠ قرش[١٠٣].

ژبۆ بدەستڤەئینانا هاریکاریا حکۆمەتا ئۆسمانی بۆ پرۆژەیێ (ئیسلامکرنا ئێزدییان) عومەر وەهبی پاشا نڤیسارەکا دی هنارتە ئیستەنبۆل، تێدا گرنگیا رازیبوونا دەسەلاتا ئۆسمانی هاتە خۆیاکرن و پلانا پرۆژەیێ پەروەردەیی ئەوێ پێشنیارکری بۆ دەڤەرێن ئێزدییان دگەل نڤیسارا خۆ هنارتە ئیستەنبۆل. رازیبوونا سولتانێ ئۆسمانی عەبدولحەمیدێ دووێ ل سەر پرۆژەیێ ناڤبری هەر زوو هات و ل ١٦ ئەیلوولا (١٨٩٢ز)ێ سولتانێ ئۆسمانی هەموو بەرهەڤیێن خۆ دیارکرن ژبۆ جێبەجێکرنا وێ پلانێ چونکی ئەو چەندە دگەل سیاسەتا کۆمکارا ئیسلامی ئەوا ژ لایێ سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ دهاتە پەیرەوکرن دگونجا[١٠٤].

هەر ل ١٦ ئەیلوولا (١٨٩٢)زێ دەسەلاتا ئۆسمانی رازیبوو ل سەر ڤەكرنا خواندنگەهەكا ئایینی ل پەرستگەها لالش وەكو جهێ سەرەكیێ دینێ ئێزدییان، و ئەمین ئەفەندی قەرەداغی هاتە دەستنیشانكرن وەك مامۆستایێ وێ خواندنگەهێ و مووچەیەكی هەیڤانە بۆ وی و خویندكارێن وێ هاتە تەرخانكرن كو هندەك ژ وان خویندكاران خەلكێ گوندێن دەوروبەری لالشێ بوون و هندەكێن دی ژێ ژ بنەمالێن فەقیرێن باژێرێ مووسل بوون[١٠٥]، ژ هەژی گۆتنێ یە كو پووتەكا مەزن ژ لایێ سولتان عەبدولحەمیدی دووێ ب ڤێ خواندنگەهێ دهاتەدان[١٠٦].

لێ عومەر وەهبی پاشا سەركەفتن بدەستڤەنەئینا وپرۆژەیێ وی (ئیسلامكرنا ئێزدییان) ئەو ئارمانجێن بۆ هاتینە دەستنیشانكرن هەموو بجهـ نەهاتن، چونكی پتریا ئێزدیێن ئیسلامبوونا خۆ راگەهاندین جارەكا دی زڤرینە سەر بیروباوەرێن خۆ یێن ئێزدیاتییێ، ژ بەر كو ئەو ژێ هاتبوونە نەچاركرن هەتا بووینە مووسلمان، دەربارەی ڤێ چەندێ سەدیق دەمەلووجی دوویات دكەت(مووسلمانەتیا وان گەلەك ڤەنەكێشا، چونكی پشتی ماوەیەكی كێم زڤرینە سەر دینێ خو یێ كەڤن)[١٠٧].

## هێرشێن لەشكەری بۆ سەر دەڤەرێن ئێزدییان ل بەهدینان:

حكومەتا ئۆسمانی ل سەردەمێ عەبدولحەمیدێ دووێ پشتی ژێرا دیار بووی كو ب رێكا هنارتنا مامۆستایێن ئایینی و ڤەكرن و ئاڤاكرنا خواندنگەهێن دینی و مزگەفتان نەشێن كوردێن ئێزدی بكەتە مووسلمان، زڤرییە وان رێكێن كلاسیكیێن كەڤن، ئەو ژێ هنارتنا هەوێن لەشكەری بوو بۆ سەر دەڤەرێن ئێزدییان ژبۆ بجهئینانا مەرەمێن خۆ. ل سالا (١٨٩٠)زێ ئەیوب بەگ هاتە راسپاردن ژ لایێ (باب العالي) ل ئیستەنبۆل داكو سەركردایەتیا هەوەكا لەشكەری بۆ سەر ئێزدیێن شنگالی بكەت[١٠٨].

ل ئەیلوولا (١٨٩٢)زێ عومەر وەهبی پاشا هەوەكا لەشكەری ب سەركردایەتیا كورێ خۆ عاصم بەگ هنارتە دەڤەرا شێخان، گوندێن ئێزدییان ل دەڤەرێ هاتنە تالانكرن و ویرانكرن و گەلەك ژ خەلكێ وان گوندان هاتە كوشتن، ژوان گوندان وەك میناك گوندێن (بێبانێ و دۆغاتا و خەتارێ) و مەزارگەهـ ونیشانگەهێن ئێزدییان هاتنە هەرفاندن، دەربارەی هەوا عاصم بەگ و كارێن لەشكەرێ وی ل گوندێن دەڤەرا شێخان سلیمان صائغ مووسلی دبێژت: هاتنە تالانكرن و تەرش و تەوالێن وان برن و ئافرەتێن وان ژێ برن و زارۆكێن وان هاتنە سەرژێكرن و گەلەك زەلامێن وان كوشتن و ئاگر بەردانە چوار گوندێن دنایی یا... ب خەلك و تەرش وتەوالڤە هاتنە سۆتن. هەر د ڤێ هەوێدا گەلەك كارێن نەجوان ل پەرستگەها لالش ژێ هاتنە ئەنجامدان، دیسان خەزنا رەحمان ل باعەدرێ هاتە تالانكرن و هەموو تاوس و سنجەق و نیشانێن ئێزدییان هاتنە دەستەسەركرن و ڤەگوهاستنە باژێرێ مووسل و پاشی برنە بەغدا و ل خەزنا لەشكەرێ شەشێ یێ ئۆسمانی هاتنە پاراستن. پشتی هنگی لەشكەرێ عاصم بەگ بەرەڤ بەعشیقە و بەحزانی چوو وەك سەنتەرێن كوردێن ئێزدییان نزیكی مووسل و مەزار و نیشانگەهێن ئێزدییان ل وێدەر ژێ هاتنە هەرفاندن و جلكێن عەرەبان ل سەر وان هاتنە بەلاڤكرن و زۆری ل خەلكێ دەڤەرێ كر داكو مووسلمان بن[١٠٩].

هەلبەت ژ ئەنجامێ وێ هەوا لەشكەری بۆ سەر دەڤەرا شێخان خەلكەكی زۆر هاتە كوشتن و ئێزدییان نەشیان بەرەڤانیێ ژ خۆ بكەن چونكی دەڤەرا شێخان پتریا وێ دەشتە و هەروەسان لەشكەرێ ئۆسمانی ژێ یێ رێكخستی بوو و ژ هەموولایانڤە ژ ئێزدیێن خەلكێ گوندان ب هێزتربوو. و پشتی باعەدرێ هاتییە ویرانكرن لەشكەرێ عاصم پاشا ب رێكا (گەلیێ باندەوا) بەرەڤ دەڤەرا ڤاییدیا (كومەلگەها شاریا یا نها) كەفتە رێ و دەمێ خەلكێ دەڤەرێ ب وێ چەندێ ئاگەهداربووی خۆ ل سەرێ چیایێ داكا حەشاردان و ڤیان بەرەڤانییێ بكەن، لێ ئێزدییان نەشیان بەرسینگێ لەشكەرێ

عاصم پاشا بگرن و وەسان خەلکەکێ زۆر هاتە کوشتن و عاصم پاشا بریاردا هەر کەسەکێ ئێزدی ئەگەر ئیسلامبوونا خۆ رانەگەهینت بێتە کوشتن و سەرێ وی ژ لەشێ وی بێتە ڤەکرن و ببەنە سەرێ چیایێ داکا جهێ عاصم پاشا و دەربارەی ڤێ هەوێ ئێك ژ کەسانێن دانعەمرێن دەڤەرێ دبێژت: گەلەك ئێزدی هاتنە سەرژێکرن و سەرێ وان برنە سەرێ چیایێ داکا و ب چقێن وێ دارا ل سەرێ چیایی ڤە هاتنە دالەڤاندن... و هەمان کار ل گوندێن دیترێن ئێزدییان هاتە ئەنجامدان[110].

پشتی دەولەتا ئۆسمانی دیتی کو ئێزدی د رژدن ل سەر دین و بیروباوەرێن خۆ و پشتی دەولەتێ ژێ ژ هەموو لایانڤە ب ئەگەرێ وێ سیاسەتێ دگەل ئێزدییان خسارەت داین و نەشیاین ئارمانجێن خۆ پێن سەرەکی ب دەست بێخن، ئەڤجا هەر ژ سالا (١٩٠٤ز)ێ دەولەتا ئۆسمانی هندەك پێنگاڤ هاڤێتن ژبۆ خۆشکرنا پەیوەندییان دگەل کوردێن ئێزدی ژوان ژێ رازیبوون ل سەر پێشنیارا والیێ مووسل (١٩٠١-١٩٠٤) کو بەدەلا لەشکەری مینا بەری هنگی ل جیاتی خزمەتا لەشکەری ژ ئێزدییان بهێتە وەرگرتن [111]، هەروەسان ئەو خواندنگەها ل پەرستگەها لالش هاتییەڤەکرن جارەکا دی نوری پاشا دائێخست و پەرستگەها لالش بۆ ئێزدییان ل سالا (١٩٠٧ز)ێ زڤراندەڤە[112].

## ئەنجامێن ڤەکۆلینێ

- سیاسەتا دەولەتا ئۆسمانی بەرامبەر کوردێن ئێزدی ژ دەستپێکا سەدسالیا نۆزدێ تا (١٨٧٦ز)ێ دیاردبت، ب هنارتنا چەندین هەوێن لەشکەری بۆ سەر دەڤەرێن وان، ب سەرکردایەتیا والیێن ویلایەتێن ئۆسمانی و هندەك جاران ژی ب سەرکردایەتیا راستەوخۆ یا سەرکردەیێن ژ (الباب العالي) بوون و ئەڤ هەوێن لەشکەری ب بیانوویێن جودا جودا دهاتنە ئەنجامدان.
- دسەدسالیا نۆزدێ دا پەیوەندیێن ئێزدییان دگەل میرگەهێن کوردی وب تایبەت بەهدینان وسۆران تێکچوون ژ بەر چەندین هۆکارا و هەلبەت ڤێ چەندێ ژێ کارتێکرنەکا نەرێنی یا مەزن ل ئێزدییان کر.
- سیاسەتا عەبدولحەمیدێ دووێ بەرامبەر کوردێن ئێزدی ب جینۆساید دهێتە هژمارتن، چونکی ئارمانجا سەرەکی ژ ڤێ سیاسەتێ نەهێلان و ژناڤبرنا ئێزدییان بوو ب هەر رێکەکە هەبت و هەروەسان ئارمانجا وێ ژناڤبرن و نەهێلانا کەلتووری ئێزدییان بوو، کو بەشەکێ گرنگ و کەڤناری کەلتووری کوردی یە، هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ژێ رێکێن جۆراوجۆر هاتینە پەیرەوکرن ژبۆ گەهشتن ب وان ئارمانجان، چونکی ل سەردەمێ سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ گەلەك کێمە نەتەوە و کێمە ئایین ل ناڤ دەولەتا ئۆسمانی هەبووینە، ئەڤجا وێ ڤیاییە دەولەتا ئۆسمانی ژ هەولێن کێمە نەتەوا بۆ سەرخۆبوونێ بپارێزت ب مەرەما کێمکرنا مایتێکرنا دەولەتێن بیانی د دەولەتا ئۆسمانیدا ب رێکا ڤان کێمە نەتەوان و کێمە ئایینان و ژ بەر ڤێ چەندێ دروشمێ (مووسلمانێن جیهانێ هەڤبگرن) ژ لایێ عەبدولحەمیدیڤە هاتە بلندکرن.
- ژ ئەنجامێ هەوێن لەشکەری بۆ سەر دەڤەرێن ئێزدییان، زۆرداریەکا مەزن ل ئێزدییان هاتەکرن و گەلەك ژ وان هاتنە کوشتن و سەرژێکرن و ئافرەتێن وان ژ لایێ لەشکەرێ ئۆسمانیڤە هاتنە رەڤاندن، هەلبەت ئەڤ چەندە ژێ جینوسایدەکا رێکخستی بوو ژ لایێ دەولەتا ئۆسمانیڤە ل سەردەمێ سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ.
- دەڤەرێن ئێزدییان ژ لایێ ئابووریڤە زۆر زەرەرمەندبوون، دەرامەتێن وان دهاتنە پۆچکرن و مالێن وان هاتنە وێرانکرن و سۆتن و تەرش و تەوالێن وان و پیرۆزیێن وان هاتنە تالانکرن و پەرستگەها پیرۆزا لالش ژ لایێ ئۆسمانیانڤە هاتە دەستەسەرکرن و بۆ ماوەیەکی دبتە خواندنگەهەکا ئایینی.
- دەولەتا ئۆسمانی جنوسایدەکا کەلتووری یا ب رێکوپێك دژی ئێزدییان پەیرەوکر و حەز دکر ئایین

و رەوشەنبیریا ئیسلامی ل سەر ئێزدییان بسەپینن و ئەڤ چەندەژی ئێك ژ ئارمانجێن سیاسەتا (الجامعة الاسلامیة) بوو ئەوا ژ لایێ سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ ڤە هاتییە پەیرەوکرن.

- میر و مەزنێن ئێزدییان هاتنە ئیهانەکرن و هندەك ژ وان بۆ دەڤەرێن دوور هاتنە سەرگونکرن.
- ژ ئەنجامێ سیاسەتا دەولەتا ئوسمانی ئێزدی نەچار بوون تێکەلیێن خۆ دگەل خەلکێ دیتر کێمبکەن و بتنێ ل دەڤەرێن خۆ بمینن و ئەڤ چەندە ژی بۆ ئەگەرێ هندێ خەلك ب چاڤەکێ کێم تەماشەی ئێزدییان بکەت.
- دیمۆگرافییا دەڤەرێن ئێزدییان ژی ب ئەگەرێ دەستەسەرکرنا مووسلمانان ل سەر عەردێن ئێزدییان هاتە گوهارتن، یانژی ب ئەگەرێ گوهارتنا ئایینی ژبۆ پاراستنا ژیانا خۆ.

## ژێدەر:


١. بۆ پتر پێزانینان دەربارەی ئێزدییان بنێرە: د. خلیل جندي. نحو معرفة حقیقة الدیانة الایزیدیة، منشورات رابون، (السوید: ١٩٩٨).

٢. عزالدین سلیم باقسري، مەرگەهـ الایزدیة الاصل، التسمیة، الطقوس، المراسیم والنصوص الدینیة، (دهوك: ٢٠٠٣)، ص٢٧.

٣. بنێرە: المهندس عزالدین سلیم باقصري، الخلیقة و التكوین لدى الایزیدیة، مجلة لالش العدد (٩) (دهوك شباط: ١٩٩٨).

٤. ینظر خدر بیر سلیمان، التقمص. تناسخ الارواح. ترجمة عیدو باباشیخ. مجلة لالش العدد ٥ (دهوك اب ١٩٩٥)، ص٣٤ و مابعدها.

٥. دەربارەی پەرستگەها لالش بنێرە: داود مراد الختاري، معبد لالش والمراسیم الدینیة الایزدیة، (بغداد: ٢٠١١).

٦. بنەمالا جەلیلیا ب ئەڤێ ناڤێ هاتییە ناڤکرن ژ بەر پێشیێن وان کو ناڤێ وی (عەبدولجەلیل کورێ مەلك) بوو و د بنەرەتدا نەیێ مووسلی بوو، خەلکێ دیاربەکرێ بوو، و بازرگانییەکا بەرفرەهـ دناڤبەرا مووسل و دیاربەکردا دکر، بارودۆخێن گونجای پەیدابوون بۆ ئەڤێ بنەمالێ کو فەرمانرەوایا میرگەها مووسل بکەفتە دەستێ واندا (١٧٢٦-١٨٣٤)ز؛ علي شاكر علي، تاریخ العراق في العهد العثماني (١٦٣٨-١٧٥٠)، منشورات مكتبة نینوى، (الموصل: ١٩٨٥ )، ص ١٥٨. د. سیار كوكب علي الجمیل الموصل خلال الحكم الجلیلي (١١٣٩-١٢٤٩ / ١٧٢٦-١٨٣٤ ز)، موسوعة الموصل الحضاریة، دار الكتب للطباعة النشر، ط ١، مج٤، (جامعة الموصل : ١٩٩٢)، ص٣٣.

٧. هەمان ژێدەر، بپ٣٢ .

٨. علاء موسى كاظم نورس، حكم الممالیك في العراق (١٧٥٠-١٨٣١)، دار الحریة للطباعة والنشر، (بغداد: ١٩٧٥)، ص١١٣، عدنان زیان، ولایة الموصل والكورد الایزدیة (١٧٢٦-١٨٣٤) مجلة لالش، العدد (١١)، (دهوك: ١٩٩٩)، القسم الاول، ص٢٨.

٩. سیار الجمیل، زعماء وافندیة، الباشوات العثمانیون والنهضویون العرب، البنیة التاریخیة للعراق الحدیث، (الموصل نموذجا) ،ط ١، ( الاردن: ١٩٩٩)، ص١٢٢.

١٠. عماد عبدالسلام رؤوف، الموصل في العهد العثماني، فترة الحكم المحلي ( ١٧٢٦-١٨٣٤)، مطبعة النجف، (النجف: ١٩٧٥)، ص ١٧٤.

١١. یاسین خیراللة الخطیب العمري، غرائب الاثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر، نشرة: محمد صدیق الجلیلي، (الموصل: ١٩٤٠)، ص ٨٨ .

١٢. القس سلیمان صائغ الموصلي، تاریخ الموصل، ج١، (مصر:١٩٢٣)، ص٩٤. صدیق الدملوجي، الیزیدیة، مطبعة الاتحاد، (الموصل: ١٩٤٩)، ص ٤٦.

١٣. عبدالعزیز سلیمان نوار، داود باشا والي بغداد، دار الكاتب العربي، (القاهرة: ١٩٦٨)، ص ١١٩.

١٤. ستیفن هیمسلي لونكریك، اربعة قرون من تاریخ العراق الحدیث، ترجمة: جعفر الخیاط، ط ٦، (بغداد: ١٩٨٥ )، ص ٢٩١.

١٥. محەمەد ئینجە بەیرەقدار: ب نەژاد تورکی بوو، ژ باژێرێ باتین، ل میسرێ و وەلاتێ شامێ و کەرکووکێ خزمەتا لەشکەرێ کرییە، زەلامەکی رێڤەبەر و بیروقراتی یێ ب هێز بوو، سالا (١٨٤٣)زێ کۆچا داویێ کرییە، پشتی کو نێزیکی (١٠) سالان

فەرمانرەوایيا مووسل كرى بۆ پتر پێزانینان بنێرە: د. سيار كوكب علي الجميل، تكوين العرب الحديث (١٥١٦-١٩١٦)، ط ١، (الموصل: ١٩٩١)، ص٣٦٠؛ القس سليمان صائغ الموصلي، المصدر السابق، ص ٣٠١.

١٦. علي شاكر علي، الموصل وحركة التنظيمات العثمانية (١٨٣٩-١٨٧٦)، موسوعة الموصل الحضارية، دار الكتب للطباعة والنشر، ط١، مج٤، (جامعة الموصل: ١٩٩٢)، ص١٧٥.

١٧. د. عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث من نهاية حكم داود باشا الي نهاية حكم مدحت باشا، (القاهرة: ١٩٦)، ص٨٥ .

١٨. صديق الدملوجي، اليزيدية.... ص ٤٩٨؛ سعدي عثمان حسن، كوردستان والامبراطورية العثمانية، دارسة في تطورها السياسي (١٥١٤-١٨٥١) رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة صلاحالدين، ١٩٩٥، ص ٢٨.

١٩. كاوة فريق احمد شاولي ئاميدي، اماره بادينان (١٧٠٠-١٨٤٢) دراسة سياسية اجتماعية ثقافية، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين ١٩٩٨، ص ١٣١؛ القس سليمان صائغ الموصلي، المصدر السابق، ص ٣١١؛ محمد امين زكي بك، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان من اقدم العصور التاريخية حتى الان، ترجمة وتعليق: محمد علي عوني، ط ٤ ،ج١، (بيروت:١٩٩٦)، ص ٢٣١ .

٢٠. صديق الدملوجي، اليزيدية...، ص ٤٩٩ .

٢١. د. عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث ....، ص ٨٦ .

٢٢. سعيد خديدة، السلطان عبدالحميد الثاني وسياسته تجاه الكورد الايزدية في ولاية الموصل، مجلة لالش، العدد (١٢)، (دهوك: ٢٠٠٠)، ص٨٨ .

٢٣. كاوه فريق احمد شاوەلی ئامیدی، المصدرالسابق، ص٩٣ .

٢٤. جليلي جليل، من تاريخ الامارات الكردية في الامبراطورية العثمانية، ط ١، (دمشق: ١٩٨٧)، ص٣٠.

٢٥. محمد فريد بك المحامي، تاريخ الدولة العلية العثمانية، دار الجيل، (بيروت: ١٩٧٧)، ص٢٣٧.

٢٦. د. جميل موسى النجار، الادارة العثمانية في ولاية بغداد من عهد الوالي مدحت باشا الي نهاية الحكم العثمانية (١٨٦٩-١٩١٧)، ط٢، (بغداد: ٢٠٠١)، ص ٣١.

٢٧. محمد فريد بك المحامي، المصدر السابق، ص ٢٥٥.

٢٨. د. عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث،... ص١٣٢؛ صديق الدملوجي، اليزيدية... ، ص٤٩٩.

٢٩. د. عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث ....، ص ١٣٢.

٣٠. صديق الدملوجي، اليزيدية... ، ص ٤٩٩.

٣١. ئێك ژ كەسایەتیین بەرز و خودان دەسەلات بوو د مێژوویا كوردین ئیزدیدا ، ل سالا (١٨٠٧)ێ ل بنەمالەكا چاك كو ژ شێخین ئێزدیان بوو هاتییە سەر دونیایێ، بۆ پتر پێزانینان بنێرە: د. صلاح، من مشاهير الكورد، بابا شيخ ناصر، مجلة لالش، العدد (١٦) (دهوك: ٢٠٠١)، ص٩٦.

٣٢. ئێكە ژ گوندێن ئێزدیان دكەفتە روژهەلاتێ قەزا شێخان ب دووراتییا (١٠-١٢كم) نوكە یێ ئاڤایە.

٣٣. د. صلاح، المصدر السابق، ص٩٧.

٣٤. ل دۆر سەرەدانا هنری لایارد بۆ پەرستگەها لالش بنێرە: جورج حبيب، اليزيدية بقايا دين قديم، مطبعة المعارف، (بغداد: ١٩٨٧)، ص ١١٣.

٣٥. ئێكە ژ هۆزێن مەزن یێن ئێزدییانە ل چیایێ شنگالێ و ژ گەلەك تایا پێك دهێت، بنێرە: صديق الدملوجي، اليزيدية...، ص ٢٣٤-٢٣٥.

٣٦. د. صلاح، المصدر السابق، ص ٩٨ .

٣٧. حسين ويس يعقوب المولى: سنجار في العهد العثماني، دراسة سياسية ادارية اقتصادية (١٢٤٩-١٣٣٦مش/ ١٨٣٤-١٩١٨ز)، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب جامعة الموصل: ٢٠٠٠، ص٢٠.

٣٨. د. عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث ....، ص ١٣٣.

٣٩. نورا كوبي، الطريق الى نينوى، ترجمة: د. سلسل محمد الطائي، ط١، (بغداد: ١٩٩٨)، ص٣٢٩؛ د. عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث ...، ص ١٣٢.

٤٠. د. جميل موسى النجار، المصدر السابق، ص ١٣٥؛ جاسم محمد حسن، العراق في العهد الحميدي، رسالة ماجستير غير منشوره، كلية الاداب، (جامعة بغداد: ١٩٧٥)، ص٤٢.

٤١. المحامي عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٧، (بغداد: ١٩٥٥)، ص١٧٣.

٤٢. د. محمد عبداللطيف البحراوي، حركه الاصلاح العثماني في عهد محمود الثاني ١٨٠٨-١٨٣٨، ص ٢١٥.

٤٣. د. جەلیلی جەلیل، كوردەكان ئیمپراتوریەتی عوسمانی، وەرگێرانی: د. كاوس قەفتان، (بەغدا: ١٩٨٧)، بث ١٦٧-١٦٩

٤٤. هەمان ژێدەر.

٤٥. هەمان ژێدەر.

٤٦. سعدى عثمان حسن، المصدر السابق، ص١٢٨ ، صديق الدملوجى، اليزيدية ...، ص ٤٩٨ .

٤٧. د. جەلیلی جەلیل، كوردەكان .... بث ١٦٧-١٦٩ .

٤٨. د. عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث ....، ص ١٣١.

٤٩. Johins Guest The Yezidis Astudy in survival ( London : 1987 ) p226

٥٠. صديق الدملوجي، اليزيدية...، ص ٤٩٩ .

٥١. د.عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث...، ص١٣٢.

٥٢. نورا كوبى، المصدر السابق، ص٣٢٩؛ د.عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث....، ص١٣٢.

٥٣. هەمان ژێدەر.

٥٤. نورا كوبى، المصدر السابق، ص ٣٣٠.

٥٥. جليلي جليل واخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ترجمة: د.عبدي حاجي، (بيروت: ١٩٩٢)، ص٢٤.

٥٦. كونى رەش، انتفاضة يزدان شير البوطاني (١٨٥٤-١٨٥٥)، مجلة متين، العدد، (٥٧)، (دهوك: ١٩٩٦)، ص٧٤

٥٧. جليلي جليل واخرون، الحركة الكردية...، ص٢٦.

٥٨. صديق الدملوجي، اليزيدية...، ص١٣٥-١٣٩.

٥٩. عماد عبدالسلام رؤوف، الموصل في العهد العثماني، فترة الحكم المحلي (١٧٢٦- ١٨٣٤)،(النجف: ١٩٧٥)، ص١٧٧.

٦٠. علي شاكر علي، علاقة الموصل بالولايات العراقية الأخرى ٩٢٢-١٣٣٦ ك/١٥١٦-١٩١٨ز، موسوعة الموصل الحضارية، ج٤، (جامعة الموصل: ١٩٩٢)، ص٢٨.

٦١. عبدالفتاح علي يحيى، الملا يحيى المزوري وسقوط إمارة بادينان، مجلة كاروان، العدد(٤٢)، (أربيل: ١٩٨٦)، ق٢، ص١٥١.

٦٢. شاكر فتاح، يەزيدى يەكان و ئايينى يەزيدى، (سليمانى:١٩٧٠ )، بث١١١.

٦٣. عبدالفتاح علي يحيى، الملا يحيى المزوري وسقوط إمارة بادينان، مجلة كاروان، العدد(٤٢)، (أربيل:١٩٨٦)ق٢، ص١٥٤.

٦٤. عبدالفتاح علي يحيى، الملا يحيى المزوري وسقوط إمارة بادينان، مجلة كاروان ، العدد (٤٣)، (أربيل : ١٩٨٦)، ق٣، ص١٤٩.

٦٥. المصدر نفسه، ص١٤٩.

٦٦. عبدالفتاح علي يحيى، الملا يحيى المزوري وسقوط إمارة بادينان، مجلة كاروان، العدد (٤٣)، (أربيل: ١٩٨٦)، ق٣، ص١٥٠.

٦٧. صديق الدملوجي، اليزيدية...، ص٤٦١.

٦٨. المصدر نفسه، ص٤٩٢.

٦٩. عبدالفتاح علي يحيى، الملا يحيى المزوري وسقوط إمارة بادينان، مجلة كاروان، العدد (٤٣)، (أربيل: ١٩٨٦)، ق٣، ص١٥٤.

٧٠. المصدر نفسه، ص١٥٤.

٧١. المصدر نفسه، ص١٥٤-١٥٥.

٧٢. المصدر نفسه، ص١٥٤.

٧٣. كاوة فريق أحمد شاولي ئاميدي، المصدر السابق، ص١١٤.

٧٤. أنور المايي، الأكراد في بهدينان، (الموصل: ١٩٦٠ )، ص١٦٨.

٧٥. صديق الدملوجي، اليزيدية...، ص٤٦٣.

٧٦. كاوة فريق أحمد شاولي ئاميدي، إمارة بادينان (١٧٠٠-١٨٤٢)، دراسة سياسية أجتماعية ثقافية، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الأداب، جامعة صلاح الدين ١٩٨٨، ص١١٥-١١٦.
٧٧. جليلي جليل، في تاريخ الأمارات الكردية في الأمبراطورية العثمانية، (دمشق: ١٩٨٧)، ص٧٨.
٧٨. محمد أمين زكي بك، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان من أقدم العصور التاريخية حتى الأن، ترجمة وتعليق: محمد علي عوني، (بيروت: ١٩٩٦)، ص٢٢٩.
٧٩. د.عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث من نهاية حكم داود باشا الي نهاية حكم مدحت باشا، (القاهرة: ١٩٦٨)، ص١٣٠.
٨٠. كاوة فريق أحمد شاولي ئاميدي، المصدر السابق، ص١١٦.
٨١. المصدر نفسه، ص١٢٦.
٨٢. د.عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ العراق الحديث من نهاية حكم داود باشا الي نهاية حكم مدحت باشا، (القاهرة: ١٩٦٨)، ص٤٠.
٨٣. عبدالفتاح علي يحيي، الملا يحيي المزوري.... ق٣، ص١٥٥.
٨٤. محمد عبد الرحمن يونس العبيدي، السلطان عبد الحميد الثاني والجامعة الاسلامية ١٨٧٦-١٩٠٩، رسالة ماجستر غير منشورة، كلية التربية جامعة الموصل، ٢٠٠٠، ص٩٤، عبد الرزاق الحسني، اليزيديون في حاضرهم وماضيهم، (بغداد: ١٩٨٠)، ص١٥٢.
٨٥. عدنان زيان فرحان، الكرد الايزديون في اقليم كردستان، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، (السليمانية: ٢٠١٤)، ص١٤٣.
٨٦. محمد عبد الرحمن يونس العبيدي، المصدر السابق، ص٢٨-٣٠.
٨٧. عبد الرزاق الحسني، المصدر السابق، ص١٥٢.
٨٨. عبد المنعم الغلامي، بقايا الفرق الباطنية في لواء الموصل، (الموصل:١٩٥٠)، ص٥٠، حسن ويس يعقوب المولى، المصدر السابق، ص٣٩.
٨٩. صديق الدملوجي، اليزيدية....ص٥٠٦.
٩٠. فەرماندەیيا بلندا لەشكەرى، ٦ چريا ئێكێ ١٨٨٨. بنێرە دەقێ بەلگەنامێ بزمانێ عەرەبی و كوردی، داود مراد الختاري، الايزدية في الوثائق العثمانية، (دهوك: ٢٠١٠)، ص ٢٨.
٩١. BOA.A.MKT.MHM ٤٩٩\٢، ١٣ Ca.١٣٠٦(١٤ February ١٨٨٩)بنێرە دەقێ بەلگەنامێ، داود مراد الختاري، الايزدية .... ص٣١-٣٢.
٩٢. BOA. Y.PRk.BSK ٢٢\٥٧، Z.١٣٠٨.٩(١٦ July ١٨٩٠) بنێرە دەقێ بەلگەنامێ، داود مراد الختاري، الايزدية .... ص٤٧.
٩٣. ابو داسن، بانوراما الحملات المدمرة التي حلت على الايزدية، مجلة روز، عدد(٦)، (مطبعة مەرگەهـ: ١٩٩٨)، ص٥.
٩٤. د.عدنان زيان وقادر سليم شمو، مأساة الايزيديين، (دهوك: ٢٠٠٩)، ص١١٥.
٩٥. عبد الرزاق الحسني، المصدر السابق، ص١٤٣؛ عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٨، (بغداد: ١٩٥٦)، ص١١٩.
٩٦. John S. Guest. The yezidis a study in survival . (London: 1987).P.130.
٩٧. عبدالفتاح بوتاني، السلطان عبدالحميد والايزدية، مجلة متين، العدد(٨٢)، (دهوك، ١٩٨٨)، ص١٠٣-١٠٤.
٩٨. ينظر نص الوثيقة في: د.عدنان زيان وقادر سليم شمو، مأساة .... الملحق ٨، ص٢١٧.
٩٩. John S. Guest. op. cit.P .١٢٠.
١٠٠. محمد عبد الرحمن يونس العبيدي، المصدر السابق، ص١٠١.
١٠١. ينظر: كاميران عبد الصمد احمد الدوسكي، بهدينان في اواخر العهد العثماني، (اربيل: ٢٠٠٧)، ص٤١٥.
١٠٢. محمد عبد الرحمن يونس العبيدي، المصدر السابق، ص ١٠١، كاميران عبد الصمد احمد الدوسكي، المصدر السابق، ص ٤١٦.
١٠٣. داود مراد الختاري، الايزدية.... ص٩٧.
١٠٤. محمد عبد الرحمن يونس العبيدي، المصدر السابق، ص١٠١.
١٠٥. ينظر نص الوثيقة في: الموصل وكركوك في الوثائق العثمانية ١٥٢٥-١٩١٩، ترجمة خليل علي مراد وعلي شاكر علي، جامعة الموصل، ارشيف مركز دراسات الموصل، وثيقة رقم ٤٣ مؤرخة في ١٦ ايلول ١٣٠٨ رومي، ص١٤٧. نقلا عن: محمد

عبد الرحمن يونس العبيدي، المصدر السابق، ص١٠١.

١٠٦. عبد الرزاق الحسني، المصدر السابق، ص١٥٤. ينظر ايضا: زهير كاظم عبود، لمحات عن الايزدية، (مكتبة النهضة، بغداد)، ص٨٦.

١٠٧. عبد الرزاق الحسني، المصدر السابق، ص١٤٣؛ د.عدنان زيان وقادر سليم شمو، مأساة الايزيديين...، ص١٢٣.

١٠٨. صديق الدملوجي، اليزيدية... ، ص٤٧١.

١٠٩. سر وليس بدج، رحلات الى العراق،ج٢، ترجمة: فؤاد جميل، (بغداد: ١٩٦٨)، ص١٠٨؛ حسن ويس يعقوب المولى، المصدر السابق، ص٤٠.

١١٠. صديق الدملوجي، المصدر السابق، ص٥٠٧؛ خدري سليمان، گوندياتی، (بەغدا: ١٩٨٥)، بپ٣٢؛ س. سلو، ئەها ئوسا فەريق عمر وهبي باشا د بيكولينا نەهێلانا ئيزدياتيێ دە روسار بوويە، رۆشنبيری نوی، ژمارا (١٢١)، ١٩٨٩، بپ١٨٩.

١١١. داود الجلبي الموصلي، مخطوطات الموصل، (بغداد: ١٩٢٧)، ص٢٥٢.

١١٢. عدنان زيان فرحان، الكرد الايزديون ....، ص١٦٤.

# کارگێرییا ئوسمانی ل دهۆکێ
## ١٨٤٢-١٩١٨ز

پ.د. خەلیل عەلی مراد
زانکۆیا سەلاحەدین- کولیژا ئاداب
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی

هەر ئاخفتنەك دەربارەی کارگێرییا دەولەتا ئوسمانی ل پارێزگەها دهۆکێ ب سنووری وێ یێ نهاڤە، ئانکو ئاخفتن ل سەر کارگێرییا ئوسمانی ل پرانییا دەڤەرا بەهدینان د سەردەمێ حوکمدارییا راستەوخۆیا ئوسمانی (١٨٤٢- ١٩١٨)، لەوما ژی د ڤێ ڤەکۆلینێدا دێ ئاماژە ب دەڤەرا بەهدینان هێتەکرن وەك دەربرین ل سەر وان دەڤەران یێن نها دکەڤنە سنووری پارێزگەها دهۆکێ.

پشتی هەرفاندنا میرگەها بەهدینان ب دەستێ هێزێن لەشکەرێ ئوسمانی ل سالا ١٨٤٢ێ دەڤەرا بەهدینان کەتە ژێر حوکمدارییا راستەوخۆیا ئوسمانی، دەستەلاتدارییا راستەوخۆیا ئوسمانی ل ڤێ دەڤەرێ هەتا داوییا شەرێ جیهانیێ یەکەم ل سالا ١٩١٨ێ یا بەردەوام بوو. میرگەها بەهدینان وەك میرگەهێن دی یێن کوردان یێن ئوسمانییان ب (حکومەت) ناڤدکر[١]، رەنگە سەربەخۆییەکا ناڤخۆیی د کاروبارێن خۆیێن ناڤخۆییدا د چوارچوڤێ دەولەتا ئوسمانیدا هەبوو. پشتی نەمانا میرگەهێ دەڤەرێ ئەو تایبەتمەندییا خۆ ژ دەستدا و دەولەتا ئوسمانی دەست ب چەسپاندنا سیستەم و پێکهاتێن خۆیێن کارگێری وەك هەموو دەڤەرێن دی یێن سەر ب ڤێ دەولەتێڤە ل ڤێ دەڤەرێ ژی کر. هەژی گۆتنێ یە کو د وێ قوناغێدا و د چوارچوڤێ وێ بزاڤا چاکسازیێدا یا ب (التنظیمات) هاتییەناڤکرن دناڤبەرا ١٨٣٩- ١٨٧٦یدا گەلەك گورانکاری د قانوون و سیستەم و پێکهاتێن کارگێرێن جودایێن دەولەتا ئوسمانی دا هاتنەکرن، د سەردەمێ دەستەلاتێ سولتان عەبدولحەمیدێ دوێ ١٨٧٦- ١٩٠٩ و سالێن پاشتردا، ل دووڤ گۆتنا هندەك ڤەکۆلەران دەولەتا ئوسمانی ب چەند قوناغەکان و ب بەرچاڤوەرگرتنا سەروبەرێ هەر ویلایەتەکێ دەست ب چەسپاندنا وان چاکسازێن کر. ل عیراقێ ل هەردو ویلایەتێن بەغدا و بەسرا ل سالا ١٨٤٤ێ دەسپێکر، بەلێ ل ویلایەتا مووسلێ کو پرانییا دەڤەرا بەهدینان سەر ب وێ ڤە بوو ل سالا ١٨٤٨ێ دەسپێکر، ب هەر رەنگەکێ هەبیت جێبەجێکرنا چاکسازی و قانوون و سیستەمێن نوو هێدی هێدی ب رێڤەدچوو و ئاستەنگ و گەلەك ئاریشە دکەڤتنە بەر سنگێ وێ، لێ پێنگاڤێن گرنگ ژ بۆ جێبەجێکرنا وان چاکسازیان ل سەردەمێ والیتییا مەدحەت پاشای ل عیراقێ ١٨٦٩- ١٨٧٢ هاتنەهاڤێتن و هەر ڤێ چەندێ رێك خۆشکرن عیراق بچیتە د قوناغا نوودا ژ دیرۆکا خۆ[٢].

د شیاندایە سیمایێن بەرچاڤێن کارگێرییا ئوسمانی ل دەڤەرا بەهدینان د چەند تەوەرەکاندا بێنە دیارکرن، ئەو ژی تەوەرێن پێکهاتا کارگێری، رێڤەبرنا یەکەیێن کارگێری، جڤاتێن کارگێری ل قەزا و ناحیان، دادوەری و دادگەهـ، خزمەتگوزارییێن گشتی، پێکهاتێن لەشکەری و تەناهیێ، پاشتر ژی تێبینی ل سەر سیمایێن گشتییێن کارگێرییا ئوسمانی ل دەڤەرێ و دیارترین نەرێنییێن وان و باندۆرا وان نەرێنییان ل سەر خەلکێ دەڤەرێ بێنەبەرچاڤکرن.

## ١- پێکهاتا کارگێری

پێکهاتا کارگێری ل دەولەتا ئوسمانی ل سەر بنیاتێ ویلایەتان (بەری راگەهاندنا قانوونا ویلایەتان ل سالا ١٨٦٤ێ ب ئەیالات- ایالات دهاتنەنیاسین) هاتبوو ئاڤاکرن، هەر ویلایەتەك ل سەر چەند یەکەیێن کارگێری کو دگۆتنێ سەنجەق یان لیوا هاتبوو لێکڤەکرن، هەر لیوایەك ژی ژ چەند یەکەیێن کارگێری (قەزان) پێکدهات، ناحیەك یان چەند ناحیەك سەر ب هەر قەزایەکێڤە بوون، هەر ناحیەکێ ژی چەند گوندەك سەر ب وێ ڤە بوون. یەکەیێن کارگێری ژ لیوایێ هەتا ناحیێ دهاتنە پولێنکرن بۆ سەر سێ پلان، وەسان دیارە ئەڤ پولێنکرنە ژی پشتگەرما رووبەرێ یەکەیا کارگێری، هژمارا خەلکێ وێ و جهێ وێ یێ جوگرافی بوو[٣]. ل سەر بنیاتێ ڤێ پولێنکرنێ مووچەیێ فەرمانبەرێن سەرەکیێن پێکهاتا کارگێری وەك والی، موتەسەرفێ لیوایێ، قائیمەقام، رێڤەبەرێ ناحیێ، رێڤەبەرێن فەرمانگەهان و یێن دی ژ جهەکی بۆ جهەکێ دیتر جودابوون[٤]. هەژیە بێتەگۆتن سنوورێ پێکهاتێن کارگێری و پولێنکرنا وان نە بەردەوام یێ بنەجهبوو بەلکی ژ دەمەکی بۆ دەمەکێ دیتر دهاتەگۆهارتن، ئەڤە ژی د ڤەکۆلینا دابەشکرنێن کارگێرییێن ئوسمانی ل دەڤەرا بەهدینان بۆ مە دیاربیتن.

د سەردەمێ دەستەلاتدارییا راستەوخۆیا ئوسمانی دەڤەرا بەهدینان ل سەر چەند قەزا و ناحیەکان هاتبوولێکڤەکرن، دگەل بوونا جوداهیێ د گرێدانا کارگێرییا ڤان قەزا و ناحیان دگەل ویلایەتێن مووسل و بەغدا و وان و هەکاری، بەلێ ل دەهکێ داویێ ژ سەدساڵییا نوزدێ هەموو ئەڤ قەزا و ناحیەیێن بەهدینان د سنوورێ ویلایەتا مووسلدا هاتنەرێکخستن و ئەڤ سەروبەرە هەتا ژ ناڤچوونا حوکمدارییا ئوسمانی ل سالا ١٩١٨ێ یێ بەردەوام بوو.

د سالناما دەولەتا ئوسمانی یا سالا ١٢٦٦مش/١٨٤٩ز و پەرتووکا ((سیاحتنامە حدود)) ئەوا ژ ئالیێ محەمەد خورشید پاشاڤە ل نیڤا سەدساڵییا نوزدێ هاتییەبەرهەڤکرن ئاماژە ب دابەشکرنێن کارگێرییێن ئوسمانی ل دەڤەرا بەهدینان هاتییەکرن. ژ وێ دابەشکرنێ دهێتەزانین کو قەزایێن ئاکرێ، داودیێ، زاخۆ و مزووری ژ ئالیێ کارگێریڤە دگەل لیوا مووسلێ مەلبەندێ ویلایەتێ هاتبوونەگرێدان، بەلێ قەزا ئامێدیێ د ناڤ سنوورێ ویلایەتا وانێ دا بوو و ژ ئالیێ کارگێریڤە سەر ب لیوا هەکاری یا ڤێ ویلایەتێ بوو[٥]. ل سالا ١٨٥١ێ دەولەتا ئوسمانی ب باشتردیت مووسلێ بێختە دسنوورێ کارگێریێ ویلایەتا بەغدادا، ئەڤە ژی ل سەر وێ بنیاتی بوو کو د شیاندایە ئەو ئاریشێن ل عیراقێ تووشی ئوسمانییان دبن ل ژێر حوکمدارییەکا یەکگرتی ب رەنگەکێ باشتر بهێنەچارەسەرکرن[٦]. ب ڤی رەنگی قەزا و ناحیێن دەڤەرا بەهدینان ژ بلی قەزا ئامێدیێ کەتنە د سنوورێ ویلایەتا بەغدادا کو د وێ سەردەمێ پرانییا دەڤەرێن عیراقێ ڤەدگرت، بەلێ پشتی چەند سالەکێن کێم گورانکاریەکا دیترا کارگێری هاتییەکرن، ژ سالناما دەولەتا ئوسمانی یا ١٢٧٤مش/١٨٥٨ز دهێتەزانین کو لیوا مووسلێ و یێن سەر ب وێ ڤە ژ قەزا و ناحیە و عەشیرەتێن دەڤەرا بەهدینان کەتینە دناڤ سنوورێ ویلایەتا وانێ دا[٧]. بەلێ سەروبەر وەك خۆ لێ هاتەڤە و مووسل و دەڤەرێن وێ دوبارە دگەل ویلایەتا بەغدا هاتنەڤە گرێدان، زێدەباری هاتنێ ناڤێ قەزا ئامێدیێ د ناڤ قەزایێن سەر ب لیوا مووسلێ[٨] ل سالا ١٨٧٩ێ مووسل ژ بەغدا هاتەجوداکرن و بوو ویلایەتەکا

سەربەخۆ یا پێکهاتی ژ هەرسێ لیوایێن مووسل و کەرکووك و سلیمانیێ، بەلێ قازا ئامێدیێ و ناحیێن داودیێ، بەرواری بالا، بەرواری ژێری و نێرەووەرێکان (ب شاشی د سالنامەیێدا ب شبروە هاتییەناڤکرن) دگەل لیوا هەکاری یا ویلایەتا هەکاری هاتنەگرێدان[9]. ل دەسپێکا سالێن نوتان ژ سەدسالییا نوزدێ سەر ژ نوو قەزا ئامێدیێ دگەل ویلایەتا مووسل هاتەگرێدان و بوو یەك ژ قەزایێن سەر ب لیوا مووسلێ ڤە[10]. ل دووڤ دوا سالنامەیا ویلایەتا مووسل یا ل سالا ١٣٣٠مش/١٩١٢ز هاتییەبەلاڤکرن بەهدینان پێنج ژ قەزان پێکدهات، ئەو ژی قەزا: ئامێدیێ (ناحیێن وێ داودیێ، بەرواری بالا، بەرواری ژێری و نێروەرێکان)، و قەزا زاخۆ (ناحیێن وێ سلێڤانەیی و سندی گولی)، و قەزا ئاکرێ (ناحیێن وێ زێبار و سورچی) و قەزا دهۆکێ (تنێ ناحیەك هەبوو ئەو ژی ناحیا مزووری بوو)[11]. زێدەباری ئەڤێن ئاماژەپێکری دو ناحیێن دیتر هەبوون د سنوورێ دەڤەرا بەهدینانداندە، بەلێ ب قەزا مەلبەندییا مووسلێ ڤە هاتینەگرێدان ئەو ژی ناحیا حەفت عەشیرەتان (بەردەرەش) و ناحیا شێخانن هەروەکی د سالناما ویلایەتا مووسل یا سالا ١٣٢٥مش/١٩٠٧ز دا هاتی[12].

هژمارەکا مەزنان گوندان د ناڤ هەر قەزایەکێ و ناحیەکێدا هەبوون، ل دووڤ سالناما ویلایەتا مووسل ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز هژمارا گوندێن قەزا دهۆکێ ٢٢٥ گوند بوون (٩٩ ژ وان سەر ب مەلبەندێ قەزایێ و ١١٦ سەر ب ناحیا مزووری ڤە بوون). و هژمارا گوندێن قەزا ئامێدیێ ٣٦٦گوند بوون (٤٣ سەر ب مەلبەندێ قەزایێ، ١٣٥ سەر ب ناحیا داودیێ، ٦١ سەر ب ناحیا بەرواری بالا، ٣٥ سەر ب ناحیا بەرواری ژێری، ٥٧ سەر ب ناحیا رێکان و ٣٥ سەر ب ناحیا نێروە ڤە بوون). و هژمارا گوندێن قەزا ئاکرێ ٢٠٤ گوند بوون (٧٨ ژ وانا سەر ب مەلبەندێ قەزایێ، ٤٥ سەر ب ناحیا سورچی و ٧٢ سەر ب ناحیا زێبار ڤە بوون. و ١٨١ گوند سەر ب قەزا زاخۆڤە بوون (ژ وانا ١٠٩ سەر ب ناحیا سلێڤانەیی و ٧٢ سەر ب ناحیا سندی گولی ڤە بوون. بەلێ ٧٨ گوند سەر ب ناحیا حەفت عەشیرەتانڤە بوون[13].

سەروبەرێ کارگێری و پولێنکرنا پلێن یەکەیێن کارگێری ئەو ژی روو برووی گوهۆرینان دبوو، ب نموونە ل سالا ١٨٧٨ێ دەولەتێ بریار دا سەروبەرێ کارگێریێ ناحیا زێبار بۆ قەزایێ ب گوهریت (کو مەلبەندێ وێ بیرا کەپرا بیتن) و ناحیا شێروان دگەل وێ قەزایا نوو گرێدەت[14]. هەروەسان پاشتر ناحیا مزووری بالا ژی دگەل هاتەگرێدان، بەلێ پشتی دو دەهسالییان ئەم دبینین کو سەروبەرێ کارگێریێ قەزا زێبار هاتییەگوهارتن و هەروەك د سالناما ویلایەتا مووسل یا سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز و ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز دا هاتی بوویە ناحیەکا سەر ب قەزا ئاکرێ ڤە و هەردو ناحەیێن شێروان و مزووری بالا داینە د گەل قەزا رەواندزێ[15]. نموونەکا دیتر ل نیڤا سەدسالییا نوزدێ مزووری قەزا بوو و دهۆکێ ناحیە بوو، بەلێ پاشتر سەروبەر هاتییەگوهارتن و دهۆك بوویە قەزا و مزووری بوویە ناحیە هەروەك بەری نها مە ئاماژە پێکری.

هندی پەیوەندی ب پولێنکرنا قەزایێن دەڤەرا بەهدینانڤە هەی قەزا ئامێدیێ پلە ئێك، زاخۆ پلە دو، بەلێ دهۆك هەروەسان ئاکرێ پلە سێ بوون[16]. ل دووڤ قانوونا ئوسمانی قائیمەقامێ پلە ئێك ٢٥٠٠ قرش، یێ پلە دو ١٧٥٠ قرش و یێ پلە سێ١٢٥٠ قرش وەك مووچە وەردگرتن[17].

## ٢- رێڤەبرنا یەکەیێن کارگێری:

هەروەك د بەریەرێن چوویدا دیاربووی دەڤەرا بەهدینان ل سەر چەند یەکەیێن کارگێری ژ قەزا و ناحیان و گوندێن سەر ب وانڤە هاتبوو لێکڤەکرن، ژ نهاڤە دێ بزاڤێ کەین ب تیری ستراکچەرێ کارگێری و فەرمانبەرێن تێدا کاردکرن و دەستەلاتێ وان بەرچاڤبکەین:

### أ- ستراکچەرێ کارگێریێ قەزایێن بەهدینان:

چ جوداهی د ناڤبەرا رێڤەبرنا قەزایێن دەڤەرا بەهدینان و قەزایێن دیترێن دەولەتا ئوسمانی دا نەبوو ب تایبەت پشتی راگەهاندنا قانوونا ویلایەتان یا سالا

١٢٨١مش/ ١٨٦٤ز. ڤێ قانوونێ بنەمایێن لێکڤەکرنا کارگێری ل دەولەتێ دەسنیشانکربوون، هەروەسان ب بەرفرەهی چاوانییا ستراکچەرێ ڕێڤەبرنێ ل ویلایەتان و دەستەلاتێ هەریەك ژ کارمەندێن وان ل سەر ئاستێ ویلایەت و لیوا و قەزا و ناحیێ دیارکربوو، دەرچوونا ڤێ قانوونێ دەسپێکا سەردەمەکێ نووبوو ل ویلایەتێن ئوسمانی و هەتا داویهاتنا دەولەتا ئوسمانی وەك بنەمایێ حوکمداریێ و ڕێڤەبرنێ ما. و ئەڤ قانوونە وەك ڕێکەك بۆ دامەزراندنا کارگێرییەکا ڕێکخستی و خودان شیان ل ویلایەتان و سڤککرنا سیاسەتا مەلبەندییا دەولەتێ کو بەرێ وێ قانووونا نوو دهاتەپەیرەوکرن، ئەڤە ژی ب ڕێکا بەرفرەهکرنا دەستەلاتێ والییان بوو[١٨]. هەروەسان ڤێ قانوونێ ب ڕەنگەکێ ڕێژەیی دەرگەهـ ل بەر پشکداریکرنا خەلکێ خۆجهی د ڕێڤەبرنێدا ڤەکر ئەو ژی ب پشکداریکرنا وی خەلکی د جڤاتێن کارگێریێن ویلایەتان و ل مەلبەندێن لیوا و قەزایان، بجهئنانا ڤێ چەندێ ل قەزایێن بەهدینان دێ بەرچاڤکەین.

قائیمەقام سەرێ ستراکچەرێ کارگێری بوو ل هەر قەزایەکێ، سەرۆکێ وی یێ ڕاستەخۆ موتەسەریف (متصرف- پارێزگار)ێ لیوایێ بوو یا قەزا دکەفتە د ناڤ سنوورێن وێ دا، بەردەوام هەموو قەزایێن بەهدینان سەر ب لیوا مووسلێ ڤە بوون ژبلی قەزا ئامێدیێ کو بەری دگەل مووسلێ بێتەگرێدان بۆ هەیامەکا درێژ سەر ب لیوا هەکاری بوو هەروەك ئاماژە پێ هاتییەکرن. و فەرمانا دامەزراندنا قائیمەقامی ژ حکۆمەتا مەلبەندی ل ستەنبۆلێ دەردکەفت[١٩]، ئەو بەرپرس بوو ژ هەموو کارووبارێن شارستانی (مولکی) و دارایی و هێزێن پارێزڤانیێ ئانکو پولیس و جەندرمە کو ب (الضابطة) دهاتنە ناڤکرن، ئەرکێ قائیمەقامی بوو هەموو  فەرمان و ڕێنماییێن وێ ویلایەتێ و لیوایێ ب جهبینیت یا قەزا سەر ب وێ ڤە، هەروەسان ئەو هاتبوو ڕاسپاردن ب کارێ کۆمکرنا داهاتی ژ باج و خویکان ل قەزایێ رابیت و بهنێریتە مەلبەندێ لیوایێ، هەروەسان ل سەر وی پێویست بوو وان حوکمان بجهبینیت یێن ژ دادگەهێن قەزایێ دەردکەتن ل دووڤ دەستەلاتێ وی هەی و رازیبوونا موتەسەرفی وەرگریت بۆ بجهئینانا یێن نە د دەستەلاتێ وی دا[٢٠]. قائیمەقام سەرۆکاتییا جڤاتا کارگێرییا قەزایێ دکەت، هەروەسان سیستەمێ کارگێرییا سەرانسەرییا ویلایەتان (ادارە الولایات العمومیە) یێ ل سالا ١٢٨٧مش/١٨٧١ز دەرکەتی دەستەلات داینە وی ڕێڤەبەرێن ناحیێن سەر ب وی ڤە هەلبژێریت و کارگێرییا ناحیێ بینتە مەلبەندێ قەزایێ پشتی وەرگرتنا دەستوورییا موتەسەرفێ لیوایێ[٢١].

دەستەلاتدارێن ئوسمانی گرنگی ب هەلبژارتنا قائیمەقامان ددا و داکوکی ل سەر هندێ دکریێ خودان پەسنێن باش و شارەزایی بیتن ژ بەرکو قائیمەقام بنیاتێ ستراکچەرێ کارگێری یە[٢٢]. ل سالا ١٨٧٨ێ هێژ قەزایێن بەهدینان و مووسلێ سەر ب ویلایەتا بەغدا ڤە بوون، کارگێرییا حکۆمەتێ ل ڤێ ویلایەتێ بزاڤدکر شیانێن قائیمەقامێن قەزایێن ویلایەتێ بلندتر لێ بکەت ئەڤە ژی ب ئەنجامدانا ئەزموونێ بۆ وان ب مەرەما هێلانا یێن دەرچووی د ئەزموونێدا و بلندکرنا ڕاسپاردەیان (توصیات) بۆ حکۆمەتا مەلبەندی ل ستەنبۆلێ دەربارەی قائیمەقامێن سەرنەکەتی د ئەزموونان‌دا و یێن بکێر وی ئەرکی نەهێن[٢٣] هەروەسان ئەگەر هەر زێدەگاڤیەك یان بەدرەوشتیەك ژ ئالیێ قائیمەقامانڤە هاتبا دیتن یان ژی شکیاتەك لێ هاتباکرن، ڤەکۆلین دگەلدا دهاتەکرن و پێرابوونێن پێدڤی لێ دهاتنەکرن، بەلێ گەندەلییا بەربەلاڤا ناڤبەرا فەرمانبەر و بەرپرسان هەردەم ئاستەنگ بوویە بەرامبەری سزادانا وان. جێگرێ کۆنسۆلێ فرەنسی ل مووسلێ ڤەدگێریت یەك ژ قائیمەقامێن ئاکرێ یێ بەدرەوشت و ل دووڤ بایێ خۆ دچوو، خەلکێ شکیات لێ کرن و ب دزینا مالێ گشتی تاوانبار کر، ب مەرما ڤەکۆلینێ دگەلدا هاتە گازیکرن بۆ مووسلێ. هەروەسان والیێ مووسلێ یەك ژ ئەندامێن جڤاتا کارگێرییا ویلایەتێ ژ بۆ ڤەکۆلینێ ل دور وان گونەهان یێن خەلکی داینە پال قائیمەقامی هنارتە ئاکرێ، بەلێ قائیمەقام شیا

ب دانا بەرتیلێ (رەشوێ) راپۆرتەكێ دەستڤەبینیت كو یێ بێ گونەهە ژ وان هەموو گونەهێن داینە پال وی و هاتەڤە زڤراندن بۆ سەر كارێ وی[٢٤].

د روودانەكا دیتردا قازیێ دهۆكێ و ئەندامێن جڤاتا كارگێری و ماقوولێن وی ل سالا ١٨٩٩ێ شكایەتەك ل جەم والیێ مووسلێ ژ قائیمەقامێ دهۆكێ محەمەد عەلی بەگی كر ژ بەر سەرەدەریا كارگێریا وی یا خراب و گەندەلیێ و زێدەبوونا روودانێن دزیێ و ئاریشەیان ل سەردەمێ قائیمەقامیا وی، والی ل دووڤ شكایەتا وان هات و قائیمەقام بۆ ڤەكولینێ دگەلدا گازی كرە مووسلێ و محەمەد ئەفەندی كورێ مفتیێ مووسلێ هنارتە دهۆك دا ب وەكالەت كارێ قائیمقامیێ ب رێڤەببەت. ب هەررەنگەكێ هەبیت ڤەكولین نەگەهشتە چ ئەنجامان، ژ بەركو ڤەكولین ژ ئالیێ والیێ مووسلێ ب وەكالەت حەمدی ئەفەندی ڤە دهاتەكرن و ئەو ب خۆ ب گەندەلیێ یێ ناڤدار بوون، د ئەنجامدا شكایەتا دژی قائیمەقامێ هاتیەتوومارکرن ب چ نەچوو ب وێ مهانەیێ كو درەو بوو[٢٥].

پرانیا زانیاریێن مە ل سەر ناڤ و هژمارا قائیمەقامێن قەزایێن بەهدینان ژ سالنامێن دەولەتا ئوسمانی زێدەباری ژێدەرێن دی هاتینەوەرگرتن، ئەو ژی تایبەتن ب دەهسالێن داویێ ژ سەدسالیا نوزدێ. هەژبە بێژین سالنامە و ژێدەرێن دیتر تنێ ناڤێ كەسێ ئێكێ یێ كەسی دئینن[٢٦]. ل دووڤ وان زانیاریان ئەڤێن ژێری ژ وان ناڤان بوون یێن ل دهۆكێ قائیمەقامی كری:

- محەمەد خالم {؟} ئەفەندی ١٢٩٨مش/١٨٨٠ز
- مستەفا ئەفەندی ١٢٩٨مش/١٨٨٠ز
- مستەفا سالم ئەفەندی ١٣٠٨مش/١٨٩٠ز
- شاكر ئەفەندی١٣١٠مش/١٨٩٢ز
- محەمەد ئەفەندی مفتی زادە ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز
- ئاصف ئەفەندی ١٣١٦مش/ ١٨٩٨ز
- محەمەد ئەفەندی(ب وەكالەت)١٣١٧مش/ ١٨٩٩ز
- محەمەد عیزەت ئەفەندی ١٣١٩مش/ ١٩٠١ز
- ئیبراهیم ئەفەندی ١٣٢١مش/ ١٩٠٣ز
- ئیبراهیم نەجاتی ئەفەندی١٣٢٢-١٣٢٦مش/ ١٩٠٤-١٩٠٨ز
- سلێمان بەگ ١٣٢٨مش/ ١٩٩٠ز
- مستەفا مەخزومی ئەفەندی ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز

هندی قەزا ئامێدیێ یە ئەڤێن ژێری ژ وانن یێن قائیمەقامی لێكری:

- عیزەت پاشا ١٢٦٥مش/ ١٨٤٩ز
- عەلی بەگ مێردینی
- خەندان ئاغا ١٢٧٣مش/ ١٨٥٧ز
- شكری بەگ
- عومەر ئەفەندی ١٢٩٤مش/ ١٨٧٧ز
- مستەفا ئەفەندی ١٢٩٩مش/ ١٨٨١ز
- ئوسمان نوری ئەفەندی١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز
- مستەفا سالم ئەفەندی ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز
- محەمەد عەلی ئەفەندی ١٣١٦مش/ ١٨٩٨ز
- عەبدوللا پاشا ١٣١٧مش/ ١٨٩٩ز
- ئەحمەد توفیق ئەفەندی ١٣٢١مش/ ١٩٠٣ز
- عەبدولكەریم ئەفەندی ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز
- ئەحمەد توفیق ئەفەندی ١٣٢٦مش/ ١٩٠٨ز
- عەلی فەهمی ئەفەندی ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز

هندی قەزا زاخۆ یە ئەڤێن ژێری ژ وانن یێن قائیمەقامی لێكری:

- سلێمان ئەفەندی ١٢٩٤مش/ ١٨٧٧ز
- تاهر بەگ ١٢٩٨مش/ ١٨٨٠ز
- ئیبراهیم ئەفەندی١٣٠٦- ١٣٠٧مش/١٨٨٨- ١٨٨٩ز
- سەعید بەگ ئەفەندی ١٣٠٨مش/ ١٨٩٠ز
- ئیسحاق حەقی ئەفەندی ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز
- ئیبراهیم سدقی ئەفەندی ١٣١١مش/ ١٨٩٣ز
- سالح خلوصی بەگ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز
- كامل ئەفەندی ١٣١٧مش/ ١٨٩٩ز
- شەریف بەگ ١٣١٩مش/ ١٩٠١ز
- خورشید بەگ ١٣٢٠مش/ ١٩٠٢ز
- ئەحمەد توفیق ١٣٢٢مش/ ١٩٠٤ز
- خورشید بەگ ١٣٢٣مش/ ١٩٠٥ز
- نیهاد بەگ ١٣٢٣مش/ ١٩٠٥ز
- توفیق بەگ ( ب وەكالەت) ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز
- سەفوەت بەگ ١٣٢٦مش/ ١٩٠٨ز

- عەلی نیازی ئەفەندی ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز

هندی قەزا ئاکرێ یە ئەڤێن ژێری ژ وانن یێن قائیمەقامی لێکری:

- عەلی یاوەر ئەفەندی ١٢٩٤مش/ ١٨٧٧ز
- عەبدولوارس ١٢٩٨مش/١٨٨٠ز
- دەرویش ئەفەندی ١٣٠٦مش/ ١٨٨٨ز
- تاهر بەگ ١٣٠٨مش/ ١٨٩٠ز
- یەعقوب ئەفەندی ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز
- قەدری ئەفەندی ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز
- سالح پاشا ١٣١٧مش/ ١٨٩٩ز
- عەبدولرەزاق ئەفەندی ١٣٢٠مش/ ١٩٠٢ز
- توفیق بەگ ١٣٢٢مش/ ١٩٠٤ز
- ئاسف ئەفەندی (ب وەکالەت) ١٣٢٣مش/ ١٩٠٥ز
- رەفعەت ئەفەندی ١٣٢٣مش/ ١٩٠٥ز
- سالح بەگ (ب وەکالەت) ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز
- محەمەد سولتان ئەفەندی ١٣٢٦مش/ ١٩٠٨ز
- عەبدولعەزیز ئەفەندی ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز

هەروەسان بەری کو زێبار ببیتە ناحیە ئەڤێن ژێری پلا قائیمەقامی لێ وەرگرتییە:

- مستەفا ئەفەندی ١٣٠٨مش/ ١٨٩٠ز
- حاجی سەعید ئەفەندی ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز
- مستەفا توفیق ئەفەندی (ب وەکالەت) ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز
- عەبدولرەحمان بەگ ١٣١٣مش/ ١٨٩٥ز
- عەبدوللا بەگ ١٣١٦مش/ ١٨٩٨ز
- محەمەد خلوصی ئەفەندی ١٣١٧مش/ ١٨٩٩ز
- محەمەد عەلی بەگ ١٩٠١- ١٩٠٢ز

هەروەسان رێڤەبەرێ دارایی (مال مدیری) ژ فەرمانبەرێن هەرە بەرچاڤێن کارگێریا مەدەنی بوون ل هەر قەزایەکێ، ب تایبەت پشتی دەرچوونا قانوونا کارگێریا سەرانسەریا ویلایەتان ل سالا ١٨٧١ز. ژ بەرکو قانوونا ویلایەتان یا سالا ١٨٦٤ێ کاروبارێن دارایی ل قەزایێ دابوونە دگەل قائیمەقامی، لێ قانوونا ١٨٧١ێ کاروبارێن دارایی ژ قائیمەقامی جوداکرن و دانە دەست فەرمانبەرەکێ تایبەت ئەو ژی رێڤەبەرێ دارایی بوو کو یێ بەرپرس بوو ژ کاروبارێن دارایی و گرێدایی ژمێریارێ لیوایێ بوو. ئەرکێن وی ژی د دیارکریبوون د چوارچوڤێ بجهئینانا پێرابوون و سیستەمێن دارایێن پەیوەندی ب کاروبارێن قەزایێ ڤە هەی و رێنمایێن ژ ژمێریایێ قەزایێ دگەهشتنە وی[٢٧]. چەند فەرمانبەرەکان دگەل رێڤەبەرێ دارایی کاردکرن کو ئەم دکارین ب دەستەکا دارایی ل قەزایێ ناڤبکەین، ئەڤە دگەل بوونا هندەك جوداهیێن کێم ژ قەزایەکێ بۆ یا دن، بۆ نموونە ل قەزا ئامێدیێ دەستەکا دارایی ژ رێڤەبەرێ دارایی و هاریکارێ وی و گەنجینەداری و فەرمانبەرێ داهاتی (تحصیل اموری) و نڤیسکارەکی پێکدهات. هەروەسان سالناما ویلایەتا مووسل یا ئوسمانی ئاماژە ب دەستەکا داهاتی (الهیئە التحصیلیە) ل قەزا ئامێدیێ دکەت کو یا پێکهاتی بوو ژ (ویرکو کاتبی) یێ ناحیا داودیێ و دو ژ باجوەرگرێن سوارە (سواری تحصیلدار) و نڤیسکارێ خویکان یێ ناحیا بەرواری ژێری و دو ژ باجوەرگرێن پەیادە (بیادە تحصیلدار)، پلا باجوەرگران ل سالا ١٣١١مش/ ١٨٩٣ز هاتەداهینان، ئەڤ کەسە دهاتنە ژێگرتن ژ ئالیێ لیژنەکا پێکهاتی ژ قائیمەقامی و رێڤەبەرێ دارایی و رێڤەبەرێ عەقاری (یان نڤیسکارێ تاپۆیێ) و فەرماندێ هێزا جەندرمێن خۆجهی، ئەرکێ وان یێ سەرەکی وەرگرتنا باجێن گیروبووی و گرتنا وان کەسان یێن خۆ ژ دانا باجان ڤەددزن[٢٨].

هندی پەیوەندی ب قەزا زاخۆڤە هەی دەستەکا دارایی ل ڤێ قەزایێ ژ رێڤەبەرێ دارایی، هاریکارێ وی، گەنجینەدار، فەرمانبەرێ باجێ و نڤیسکاری خویکان پێکدهات[٢٩]. ل ئاکرێ ئەڤ دەستەکە ژ رێڤەبەرێ دارایی و هاریکارێ وی، فەرمانبەرێ داهاتی، نڤیسکار، گەنجینەداری، دو ژ وەرگرێن باجان (تحصیلدار) ئێکێ پەیادە و ئێکێ سوارە، دگەل نڤیسکارێ خویکێن سورچیان (سورچیە ویرکو کاتبی) پێکدهات[٣٠]. ب هەررەنگەکێ هەبیت پێکهاتا دەستەکا دارایی یا جێگیر نەبوویە، هەروەك ژ سالنامێن ئوسمانی دهێتەزانین ژ دەمەکی بۆ یێ

دن یا جودابوو. ل قەزا دهۆکێ دەستەکا دارایی ل دووڤ سالناما سالا ١٣٠٨مش/ ١٨٩٠ز ژ رێڤەبەرێ دارایی، گەنجینەدار، نڤیسکارێ خویکان و هاریکارێ وی و فەرمانبەرێ عومبارێ (انبار ماموری) پێدکهات. بەلێ دسالنامێن ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز دهێتەزانین کو دەستەکا دارایی ل دهۆکێ ژ رێڤەبەرێ دارایی، گەنجینەداری، هاریکارێ رێڤەبەرێ دارایی و هەڤالێ وی(دبیت مەرەم ژێ هاریکارێ وی بیتن و کەسەکێ دی یێ تایبەت ب پیڤانا دەخل و دانی (کیال) پێکدهات، بەلێ ل سالناما ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز هەمان پێزانین دوبارە دبنەڤە دگەل زێدەبوونا فەرمانبەرێ عومبارێ و فەرمانبەرێ عومبارا ئەلقوشێ پشتی کو کەسێ تایبەت ب پیڤانا دەخل و دانی ژ دەستەکێ هاتییەلادان. بەلێ ل سالناما ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز دەستەکا دارایی ژ رێڤەبەرێ دارایی، گەنجینەدار، نڤیسکارێ خویکان یێ باژێرکی (باژێرکێ دهۆکێ)، نڤیسکارێ خویکان یێ ناحیێ و چوار باجوەرگران (تحصیلداران) دوێن پەیادە و دوێن سوارە پێکدهات. و د سالناما ١٣٣٠مش/١٩١٢ز دا کو دوا سالنامەیە ویلایەتا مووسلێ بەلاڤکری هەمان دەستەکا دارایی ژ رێڤەبەرێ دارایی و هاریکارێ وی، گەنجینەداری، فەرمانبەرێ داهاتی و نڤیسکارێ کتان (کاتب مفردات) پێکدهات[31].

نڤیسکارێ نڤیسکارییان (کاتب التحریرات - تحریرات کاتبی) د سیستەمێ کارگێریێ قەزاییدا پشتی رێڤەبەرێ دارایی دهێت و ئەرکێ وی رێکخستنا هەموو کاروبارێن نڤیسکاریێ یە ژ هنارتی و هاتی و نڤیسارێن ناڤبەرا قەزایێ و لیوایا قەزا سەر ب وێ ڤە و ناحیێن سەر ب قەزایێ ڤە و پاراستنا وان نڤیسارانە، سالنامێن ویلایەتا مووسلێ ئاماژە ب نڤیسکارێن نڤیسکاریێ ل هەموو قەزایێن دەڤەرا بەهدینان کرییە و پرانییا جاران ژێ ناڤێن وان ئینناینە[32].

هژمارەکا دیترا فەرمانبەرێن بچووک د ناڤ ستراکچەرێ کارگێریێ قەزایێن بەهدینان دهێنەدیتن وەك کارمەندێ سەرژمێریێ (مامور النفوس) ئەرکێ وی یێ دیارێکریبوو ب توومارکرنا بوون و مرنان د توومارەکا تایبەتدا و نڤیسکارەکی ژێ هاریکارییا وی دکر، هەروەسان کارمەندێ تاپۆیێ ب ئەرکێ توومارکرنا مولکیەتا عەردی و ئاڤاهییان و چەسپاندنا خودانان رادبوو، هەروەسان کارمەندێ ئەوقافێ. هندەك فەرمانبەرێن دیتر هەبوون تنێ ل قەزایەکا دیارکری ئاماژە ب بوونا وان هاتییەکرن، وەك نموونە ل سالناما ویلایەتا مووسلێ یا سالا ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز ئاماژە ب بوونا فەرمانبەریەکا دیتر ل ئاکرێ ب ناڤێ (املاك امیریە معاونی) هاتییەکرن[33]، ئەڤ فەرمانبەرە یێ تایبەت بوو ب کاروبارێن مولکێن ئەمیری ل ئاکرێ بەلێ سالناما چاوانیا کارێ وی دەسنیشان نەکرییە. بەلێ ژ سالنامێن ویلایەتا بەغدا دهێتەزانین کارگێرییا مولکێن ئەمیری (ادارە الاملاك الامیریە) ناڤەکێ هەڤمانایە بۆ ناڤێ لیژنا عەردێن سەنی (أراضي سنیە قومسیوني) کو یا تایبەت بوو ب رێڤەبرنا عەردێن سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ ل عیراقێ کو ب عەردێن سەنییە دهاتنەناسن کو ب باشترین و ب خێروبێرترین عەردێن چاندنێ بوون و ل دەڤەرێن جودایێن عیراقێ دبەلاڤەبوون. هندی پەیوەندی ب دەڤەرا بەهدینانڤە هەی وەسان دیارە بوونا ڤی فەرمانبەری ل قەزا ئاکرێ دزڤریتەڤە بۆ توومارکرنا هژمارەکا مەزنا گوندێن بەردای ب ناڤێ سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ ڤە ل سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز[34]. ل دووڤ سالناما ویلایەتا مووسل یا سالا ١٣١٢مش/١٨٩٤ز تنێ ل زاخۆ کارمەندێ پەیوەندیێن ب برووسکان (تەلەگرافێ) هەبوو[35]. ل سالا ١٨٩٢ێ وەزارەتا ناڤخۆیا ئوسمانی رازیبوو خیچا تەلەگرافێ ل زاخۆ بێتەدانان و بۆ ڤێ مەرەمێ فەرمان دانە والیێ مووسلێ. و ل سالا ١٩٠٢ بەرپرسێ فەرمانگەها پوستە و تەلەگرافان ل زاخۆ حەمید ئەفەندی بوو، ل سالا ١٩١٢ێ بەرپرسێ وێ مەدحەت ئەفەندی بوو، بەری شەرێ جیهانیێ یەکەم خیچا تەلەگرافێ د ناڤبەرا مووسل و ئاکرێ دا هاتەکێشان، هەروەسان فەرمانگەهەکا تەلەگرافی ل سێمیلێ و فەرمانگەهەکا پوستە و تەلەگرافێ ل باستکێ

ژی هەبوو، هەروەسان ل سالا ١٩١٥ێ نڤیسارێن پێویست هاتنەهنارتن بۆ كێشانا خێچا تەلەگرافێ د ناڤبەرا مووسلێ و شنگالێ دا[٣٦].

## ب- رێڤەبرنا ناحیە و گوندێن سەر ب وانڤە:

كارگێریا ناحیێن بەهدینان كارگێرییەك سادەبوو، كارگێریا هەر ناحیەكێ ژ رێڤەبەر و نڤیسكاری ناحیێ پێكدهات، رێڤەبەری ناحیێ ژ ئالیێ والی ڤە دهاتەدامەزراندن و پێدڤی بوو وەزارەتا ناڤخۆیی پەسەندبكەت، هەروەسان پێدڤی بوو بەرێزار بۆ ئەركێ رێڤەبەری ناحیێ خودان رابردوو و رەوشتەكێ باش بیت و ژیێ وی ژ بیست سالیێ دەرباز ببیت و خواندن و نڤیسینێ بزانیت. ئەركێ رێڤەبەری ناحیێ بریتی بوو ژ بەلاڤكرنا قانوون و سیستەمێن دەولەتێ و گەهاندنا فەرمانێن وێ بۆ ناحیێ و گوندێن سەر ب وێ ڤە و ئاگاداركرنا قائیمەقامێ قەزایێ ب وان زانیارێن ژ موختارێن گوندان دگەهنێ سەبارەت بۆیەرێن بوون و مرنێ و دۆزێن میراتی و پرسگرێكێن عەردی. هەروەسان ئەركێ رێڤەبەری ناحیێ بوو سەرپەرشتییا هەلبژارتنا موختار و دەستەكا ئیختیاریا گوندێن ناحیێ و چاڤدێریا كار و كریارێن وان بكەت، و ڤەكۆلینێ ل دور وان گازندە و شكایەتان بكەت یێن خەلكەكێ ژ موختار و دەستەكا ئیختیاریێ و باجوەرگران دكرن و ئاگاداركرنا قائیمەقامی ژ ئەنجامێن ڤەكولینێ بێی كو رێڤەبەری ناحیێ ماف هەبیت پێرابوونەكێ بەرامبەری وان بكەت، هەروەسان رێڤەبەری ناحیێ سەرپەرشتییا كۆمكرنا باج و خویكان و داهاتێن دی یێن دەولەتێ و هنارتنا وان بۆ مەلبەندێ قەزایێ دكر[٣٧].

دەولەتا ئوسمانی ل هندەك ناحیێن بەهدینان وەك ناحیێن بەرواری ژووری و بەرواری ژێری و نێروە و رێكان سەروبەری دەڤەری بەرچاڤوەردگرت و رێڤەبەرێن ناحیان ژ مالماڤویل (مالێن خانەدان) ژێ دگرتن[٣٨]. سالنامێن ویلایەتا مووسلێ ئاماژە ب ناڤێ هندەك ژ وان رێڤەبەران كرییە و ژ وان ناڤان دهێتەزانین كو ئەو ژ خەلكێ دەڤەرێ بوون. وەك نموونە محەمەد رەشید بەگ رێڤەبەری ناحیا بەرواری ژووری ب وەكالەت ل سالا ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز، حسێن ئاغا رێڤەبەری ناحیا بەرواری ژێری و و سەدیق بەگ رێڤەبەری ناحیا نێروە و تاهر بەگ رێڤەبەری ناحیا رێكان هەر ل وێ سالێ و فەخری عەبدی ئاغا رێڤەبەری ناحیا سندی گوللی سالا ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز و تەتەر ئاغا رێڤەبەری ناحیا رێكان (ب وەكالەت) سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز و یێن دی[٣٩].

ل دووڤ پێدڤیاتیێن كاری و قەبارێ ناحیێ و گوندێن وان هندەك جاران میلاكێ ناحیێ ژ رێڤەبەری و نڤیسكاری دبووری، بۆ نموونە ل هەریەك ژ ناحیێن داودیێ و بەرواری بالا كو سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤەبوون دگەل رێڤەبەری و نڤیسكاری گەنجینەدار ژی هەبوو[٤٠]. هەروەسان ل ناحیا زێبار یا سەر ب قەزا ئاكرێ ڤە نڤیسكارێ تاپۆیێ ژی دگەل رێڤەبەری و نڤیسكاری هەبوو[٤١].

هندی پەیوەندی ب گوندێن د ناڤ سنووری ناحیێ دا موختاری و جڤات یان دەستەكا ئیختیاریا گوندی سەرپەرشتییا كاروبارێن وان دكر. قانوونێ مەرجێن كو پێدڤی بوون د وی دا (ئانكو موختاریدا) هەبن دەستنیشانكربوون، كو دڤێت ژیێ وی ژ سیهـ سالان كێمتر نەبیت و ژ رەگەزناما (تەبەعیا) ئوسمانی بیتن و باجەكا نە كێمتر ژ ١٠٠ قرشان د سالێدا بدەت. موختار دهاتە هەلبژارتن د ناڤبەرا خەلكێ گوندی دا ئەوێن ژیێ وان ژ هەژدەسالیێ كێمتر نەبیت و دەمێ موختاریێ تنێ سالەك بوو و دشیاندا بوو بێتەڤە نووكرن. هندی دەستەكا ئیختیاریا گوندی یە ژ ٣-١٢ كەسان پێكدهات و ژ ئالیێ خەلكێ گوندی ڤە دهاتنەهەلبژارتن و ئەركێ ڤێ دەستەكێ پەیڤین بوو ل سەر هەموو كاروبارێن پەیوەندی ب گوندی ڤە هەی و بلندكرنا راپۆرتان ل سەر پێدڤیاتیێن گوندی و ئاگاداركرنا رێڤەبەری ناحیێ ل سەر هەر زێدەگاڤیەكێ یان بەدرەوشتیەكێ ژ ئالیێ موختاری گوندی ڤە داكو ئەو ژی بگەهینتە قائیمەقامێ قەزایێ[٤٢].

ژ ئەڤا چوویی دیاردبیتن كو موختار نە فەرمانبەری حكومەتێ بوو، بەلكی وەك وەكیل یان

باوەرپێكرییەكی بوو رێژەیەك ژ وی دراڤی وەردگرت یێ حكومەتێ ئەو ب ئەركێ كۆمكرنێ رادسپارد، یان ژ وی دراڤی یێ هاریكاریا باجوەرگران دكر د وەرگرتنێدا. هەروەسان ئەركێ موختاری بوو خەلكێ گوندی ژ رێنمایی و پێزانینان ئاگاداركەت و فەرمانێن ئامادەبوونا وان كەسان بگەهینیت یێن رێڤەبەرێ ناحیێ داخوازا ئامادەبوونا وان دكر، و موختاری ژێ ب ئەركێ خۆ رێڤەبەرێ ناحیێ ژ هەموو وان كاروبار و دۆزێن پەیوەندی ب گوندی ڤە هەی و یێن ل گوندی روودان(٤٣).

## ج- فەرمانبەرێن فەرمانگەهـ و سازیێن نە حكۆمەتیێ:

ل هندەك قەزا و ناحیێن دەڤەرا بەهدینان هندەك فەرمانبەر هەبوون بۆ فەرمانگەهـ و سازیێن دەرڤەی سیستەمێ كارگێریێ فەرمیێ دەولەتا ئوسمانی كاردكرن، ئەو فەرمانگەهـ و سازیە ژێ: كارگێریا قەرێن (قەرزێن) گشتییێن ئوسمانی (دیون عمومیە ادارە سی) و سازیا پاوانكرنا توتنێ (رێجی) بوون، یا بەراهیێ ل سالا ١٨٨١ێ هاتەدامەزراندن پشتی كو دەولەتا ئوسمانی ژ سالا ١٨٧٥یڤە نەشیای قەرێن خۆ یێن دەرڤە و ناڤخۆیی بدەت. كارگێریا قەرێن گشتییێن ئوسمانی نوونەراتییا خودانێن سەنەدێن قەرێن ئوسمانی ژ خودان سازیێن دراڤی و بانكێن ئەوروپی دكر زێدەباری مەزنە پارەگوهۆر و سەرمایەدارێن مەزنێن وەلاتیێن ئوسمانی ئەوێن قەر داینە حكومەتا ئوسمانی، ئەڤ سازیە هاتبوو راسپاردن هندەك باج و خویكێن دەسنیشانكری ژ ناڤ دەولەتا ئوسمانی وەرگریت داكو سەنەدێن قەرێن ئوسمانی پێ بدەت، ڤێ سازییێ لقێن خۆ ل پرانییا ویلایەتێن ئوسمانی هەبوون و ب هزاران فەرمانبەران ل جهم وێ كاردكر و گەهشتبوو ئاستەكی ب وەزارەتا دارایيا دووێ یا ئوسمانی دهاتەناڤكرن(٤٤). هندیكە سازیا (رێجی) یە ئەڤ پەیڤە كورتكرنا ناڤێ:

Societe de Regie Cointereressee des Tabacs des L. Empire Ottoman

یە سازیێن بانكیێن ئەوروپی پشكداری د سەرمایەیێ وی دا كربوو، و ژ سالا ١٨٨٣یڤە كرێن و فرۆشتن و چێكرنا توتنێ ل دەولەتا ئوسمانی پاوانكربوو و وەك كارگێریا قەرێن ئوسمانی لقێن وی ل گەلەك ژ ویلایەتێن ئوسمانی هەبوون(٤٥).

هندی پەیوەندی ب قەزا و ناحیێن دەڤەرا بەهدینانڤە هەی، د سالنامەیێن ویلایەتا مووسلێ دا چەند ئاماژەیەك هەنە كو مەئمور یان فەرمانبەرێن ڤان دو سازیان ل ڤێ دەڤەرێ هەبوون، ل قەزا ئامێدیێ فەرمانبەرەكێ كارگێریا قەرێن گشتی هەبوو، ئێكێ دیێ سازیا رێجی دگەل چوار پالە و نوبەداران (قولچی) لێ هەبوون(٤٦) ل ناحیا بەرواری بالا ژی فەرمانبەرەكێ رێجی دگەل هەشت پالە یان نوبەرداران هەبوون(٤٧). هەروەسان ل قەزا زاخۆ فەرمانبەرەكێ كارگێریا قەرێن گشتی دگەل ئێكێ سازیا رێجی هەبوون(٤٨)، هەروەسان ل قەزا ئاكرێ ژی(٤٩). هەروەسان ل قەزا دهۆكێ دو فەرمانبەرێن وەك وان و ئێكێ دیترێ كارگێریا قەرێن گشتی ل ئەلقوشێ كو سەر ب دهۆكێ ڤە بوو هەبوون. یا جهێ سەرنجراكێشانێ ل سالناما ویلایەتا مووسل یا سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز ئاماژە ب بوونا بریكارێ مەئموورێ كارگێریا قەرێن گشتی ل دهۆكێ دكەت، بەلێ ئاماژە ب بوونا مەئموورێ رێجی ناكەت، د دەمەكیدا كو د سالناما ١٣٣٠مش/١٩١٢ ز ئاماژە ب بوونا مەئموورێ رێجی دكەت بەلێ ئاماژە ب بوونا مەئموورێ كارگێریا قەرێن گشتی ناكەت(٥٠). هەژیە بێتەگوتن مەئموورێن كارگێریا قەرێن گشتی سەر ب لقێ مووسلێ كارگێریا قەرێن گشتی یێن ئوسمانی بوو، وەكی چاوان مەئموورێن رێجی و سەر ب لقێ ریجی یێ وێرێ بوون(٥١).

## ٣- جڤاتێن كارگێری ل قەزا و ناحیان:

چاكسازیێن كارگێری یێن ئوسمانی ل سەردەمێ رێكخستنان (التنظیمات)دا داكوكی ل سەر پشكداریا خەلكێ خۆجهێ ویلایەتان د رێڤەبرنا یەكەیێن كارگێری د چوارچوڤێ جڤاتێن كارگێریدا

دکرن. قانوونا ویلایەتان یا سالا ١٨٦٤ی داکوکی ل سەر دامەزراندنا جڤاتێن کارگێری ل سەر ئاستێ ویلایەت و لیوا و قەزایان دکر، هەروەسان سیستەمێ کارگێریا گشتیا ویلایەتان یێ سالا ١٨٧١ی داکوکی ل سەر پێکئینانا هەمان جڤاتان ل ناحیان ژی دکر[٥٢]. وەك بەری نها مە ئاماژەپێکر کو دەستەکێن ئیختیاریێ ل گوندان ژی هەبوون، لەوما ل ڤێرێ دێ تنێ ل سەر جڤاتێن کارگێرێن قەزا و ناحیان پەیڤین.

ل هەر قەزایەکا دەڤەرا بەهدینان جڤاتەکا کارگێری ب سەرۆکاتیا قائیمەقامی و ئەندامەتیا ٨ یان ٩ ئەندامان هەبوو، ئەندامەتی د ڤان جڤاتاندا دو جۆر بوو، ئەندامێن ئاسایی ئەو ژی قائیمەقام (سەرۆکاتیا جڤاتێ دکر) و قازی و ڕێڤەبەرێ دارایی و نڤیسکارێ نڤیسکاریێ (کاتب التحریرات) (هەروەك ژ سالنامێن ویلایەتا مووسلێ دیاردبیت ل هەریەك ژ دهۆك، ئامێدیێ و ئاکرێ مفتی ژی ددانە دگەلدا). جۆرێ دووێ ئەندامێن هەلبژارتی بوون سێ یان چوار ژ وانا کەسایەتیێن بەرچاڤ و ماقوولێن سنووری قەزایێ بوون ژ مووسلمان و نە مووسلمانان، ناڤێن ئەندامێن وان جڤاتان د هەموو سالنامێن ویلایەتا مووسلێ دا بەرچاڤکرینە، لەوما ژی دێ ئاماژە ب ناڤێن هندەك ژ وانا دەین. ل دووڤ سالناما ١٣٠٨ مش/ ١٨٩٠ز ئەندامێن ئاسایێن جڤاتا کارگێریا قەزا ئاکرێ قائیمەقام تاهر بەگ، قازی سلێمان فائق بەگ، مفتی عەبدولرەحمان خانی ئەفەندی، ڕێڤەبەرێ دارایی ئەسعەد ئەفەندی و نڤیسکارێ نڤیسکاریێ یوسف ئەفەندی بوون. بەلێ ئەندامێن هەلبژارتی عەبدولرەزاق ئەفەندی، ئوسمان ئەفەندی، مەنسوور ئەفەندی و ساسۆن ئاغا بوون[٥٣]. هەروەسان ل سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز ئەندامێن ئاسایێن جڤاتا کارگێریا قەزا ئامێدیێ قائیمەقام عەبدولکەریم ئەفەندی، قازی مستەفا ئەفەندی، مفتی ئەسعەد ئەفەندی، ڕێڤەبەرێ دارایی شەفیق ئەفەندی و نڤیسکار خالد ئەفەندی بوون و ئەندامێن هەلبژارتی ژی شەعبان ئاغا، ئیسماعیل ئاغا، توما ئاغا و خواجە دانیال بوون[٥٤]. سالا ١٣٣٠مش/١٩١٢ز ئەندامێن ئاسایێن جڤاتا کارگێریا قەزا دهۆکێ قائیمەقام مستەفا مەخزومی ئەفەندی، قازی مەعروف وەهبی ئەفەندی، مفتی محەمەد سالح ئەفەندی، ڕێڤەبەرێ دارایی محەمەد ئەفەندی و نڤیسکار عەلی ڕەزا ئەفەندی بوون. ئەندامێن هەلبژارتی ژی حەیدەر ئەفەندی، سالح ئەفەندی، میخا ئەفەندی و ناحوم ئەفەندی بوون[٥٥].

جڤاتا کارگێریا قەزایێ ژ جڤاتێن بەردەوامێن وێ بوون، گرنگترین ئەرکێن وێ ژی پشکنین و هووربینیکرنا داهات و خەرجیێن قەزایێ و چاڤدێریکرنا سندوقێن کاری یان پرۆژێن گشتی و ڤەگوهاستنا دراڤێن ڤەگوهاستی و نەڤەگوهاستیێن حکومەتێ و دابەشکرنا باجێن سەپاندی ب بریارا جڤاتا قەزایێ ل سەر تاخ و گوندان بوون و هەروەسان سەرپەرشتیا کاروبارێن ساخلەمیێ و چێکرنا ڕێکێن ناڤبەرا گوندان و کارێن دیتر د چوارچوڤێ ئەرکێن جڤاتێ بوون[٥٦].

هندیکە جڤاتا کارگێریا ناحیانە ژ ڕێڤەبەرێ ناحیێ وەك سەرۆکێ جڤاتێ و هندەك کەسان کو نوونەراتیا دەستەکێن ئیختیاریێن گوندان دکرن ب مەرجەکی ژ چوار کەسان زێدەتر نەبن پێکدهات و ئەڤ جڤاتە نە جڤاتەك هەردەم بوو بەلکی سالێ چوار جاران ل دووڤ دیارکرنا والی ل مەلبەندێ ناحیێ کۆمدبوون. ئەرکێن سەرەکیێن جڤاتا ڤەکۆلینا وان کار و پرۆژەیێن گشتی بوو یێن جڤاتێ ئارەزوویا چێکرنا وان هەی ئەو ژی ب ڕێکا کۆمکرنا هاریکاری و بێشان ژ خەلکێ گوندان، هەروەسان هووربینکرنا وان بریاران بوو یێن ژ دەستەکێن ئیختیاریێن گوندان دەردکەتن[٥٧]. د سالناماندا چ پێزانین ل سەر جڤاتێن کارگێرێن ناحیان ز دەستەکێن ئیختیارێن گوندێن دەڤەرا بەهدینان نینن.

## ٤- دادوەری و دادگەهـ:

ل دەهسالیێن بەراهیێ یێن حوکمداریا ڕاستەوخۆیا ئوسمانی دادگەهێن شەرعی ئەوێن ژ ئالیێ قازی ڤە دهاتنەبرێڤەبرن تاکە دادگەهێن دەڤەرا بەهدینان بوون، ئەرکێن قازیێ دادگەها شەرعی

و دەستەلاتێن وی د بەرفرەهـ بوون، جێبەجێکرنا حوکمێن شەرعی د ناڤبەرا خەلکیدا و گوهداریکرنا دۆزێـن جـەزائی و مافی کارووبارێن کەسایەتی و دەرنخستنا بریاران ل دور وان، توومارکرنا گرێبەست و وەسیەتان، پاراستنا مالێ ئێتیمان و کەسێن بەرزە، سەرپەرشتیا ئەوقافێ، چاڤدێریا بهایێن بازاری، مووروکرنا دەفتەرێن کارمەندێن باجوەرگرتنێ و خویکان و توومارکرنا وان ل دادگەهێن شەرعی و گەلەکێن دیتر ژ ئەرکێن قازیێ ئاماژەپێکری بوون، دادگەهێن شەرعی نە تنێ تایبەت بوون ب مووسلمانان بەلکی ناکۆکیێن د ناڤبەرا مللەتێن نە مووسلمان ژی برێڤەدبرن[58]. قازی حوکمێن خۆ ل دووڤ ژێدەرێن شەریعەتێ ئیسلامی کو قورئانا پیروز و سونەتا پێغەمبەر (س)یە، و ژێدەرێن مەزهەبێ ئیمامێ حەنەفی کو مەزهەبێ فەرمیێ دەولەتا ئوسمانی بوو د دان، زێدەباری ئەوا ب (قانوونامە) دهاتەناڤکرن، کو ژ کۆمەکا فەرمان و مەرسومان پێکدهات یێن ژ ئالیێ سولتانێن ئوسمانیڤە دەردکەتن، قانوونامەیێ پەسنا شەریعەتێ ئایینی نەبوو بەلکی پەسنا (عورف)ی هەبوو[59].

سیستەمێ دادوەریێ ئوسمانی ل نیڤا دووێ ژ سەدسالیا نوزدێ گورانکاریێن گرنگ ب خۆڤە دیتن. یەك ژ وان گورانکاریان ژی راگەهاندنا کۆمەکا قانوونێن نوو بوو ل ژێرکارگەریا قانوونێن ئەوروپی و گرنگترینا وان ژی قانوونا سزایێن هەمایونی (قانون الجزاء الهمایوني) بوو ئەوا ل سالا ١٢٧٢مش/ ١٨٥٨ز هاتیەراگەهاندن، گەلەك ژ بەرگەیێن ڤێ قانوونێ ل ژێر باندۆرا قانوونا سزایێن فەرنسی بوون، و چەندین قانوونێن دیتر کو ل پاشتر هاتبوونە راگەهاندن و هەموو ژی تایبەت بوون ب رێکخستن و هەیکەلیەتا دادگەهێن نوو (دادگەهێن دەولەتی (المحاکم النظامیة) و ڤان قانوونا ئەڤ دادگەهە گەلەك وەك یێن فرەنسی لێ کریوون[60].

هندی پەیوەندی ب دادگەهێن یەکەیێن کارگێریێن بچووك (قەزا و ناحیان)ڤەهەی قانوونا ویلایەتان یا سالا ١٨٦٤ی داکوکی ل سەر هندێ کریوو کو ل هەر قەزایەکێ دادوەرەك هەبیت بۆ چارەسەرکرنا دۆزێن تایبەت سەر ب دادگەهێن شەرعیڤە، هەلبژارتن و دامەزراندنا وی دادوەری ژی ژ دەستەلاتێ مفتیێ مەزن (شیخ الاسلام)ێ دەولەتا ئوسمانی بیتن. و ل هەر قەزایەکێ ژی جڤاتەك هەبیت ب ناڤێ جڤاتا دۆزان (مجلس الدعاوی) و ژ سێ ئەندامێن مووسلمان و نە مووسلمان پێکبهێت پەسنا ممیز هەبیت ل ژێر سەرپەرشتیا دادوەرێ دادگەها دادوەریێ بیتن، ل دووڤ ئەوا د سالناما بەغدا یا سالا ١٢٩٢مش/ ١٨٧٥ز دا هاتی ل هەریەك ژ قەزایێن دهۆك، ئامێدیێ، زاخۆ و ئاکرێ جڤاتەکا دۆزان(مجلس الدعاوي) هەبوو، ژ قازی یان دادوەری و سێ ئەندامان ژ خەلکێ خۆجە پێکدهات کو سالنامان ب (الممیز- کەسێن بژارە) داینە نیاسین، هەروەسان گەنجینەدارێ قەزایێ ل هەر قەزایەکێ ئەندامێ وێ جڤاتێ بوو[61]. جڤاتا دۆزان دووڤچوونا وان دۆزێن (الجنح) و کرێتیان دکر نە یێن دۆزێن جنائیی (الجنائیە)، هەروەسان نێرینا دۆزێن تایبەت ب مووسلمانان دکر ئەوێن پێدڤی ب دیتنا وان بوو ژ ئالیێ دادگەها شەرعیڤە هەروەسان دۆزێن نەمووسلمانان ئەوێن ب دیتنا کارگێریا روحانیا وان دکر، هەروەسان ڤێ جڤاتی ل دۆزێن بازرگانیێن خۆرو دنیری (الصرفە). قائیمەقامی حوکمێن ڤێ جڤاتی پەسەند دکرن و ئەوێن نە د دەستەلاتێ وی دا بۆ موتەسەرفێ لیوایێ بلنددکرن. ل سالا ١٢٨٦مش/ ١٨٦٩ز سیستەمێ حوکمێن دادوەری (نظام الاحکام العدلیة) دەرکەت و داکوکی ل سەر وان برگەیان کر یێن د قانوونا ویلایەتان یا سالا ١٨٦٤یدا و تایبەت ب جڤاتا دۆزان ل قەزایان هاتین[62].

ب راگەهاندنا قانوونا بنەمایێن دادگەهێن مافپەروەریێ (اصول المحاکمات الحقوقیە) و قانوونا پێکئینانا دادگەهێن مەدەنی ل مەلبەندێن ویلایەت و لیوا و قەزایان ل سالا ١٨٧٩ز پێنگاڤا هەرە گرنگ د ستراکچەرێ دادگەهێن ئوسمانی دا هاتەهاڤێتن. ل دووڤ ڤێ چەندێ دادگەهێن مەدەنی (کو ب النظامیة دهاتنەناڤکرن) سێ جۆر بوون: دادگەهێن دەسپێکی (محاکم البداء) ل مەلبەندێ

(ویلایەتێ و لیوا و قەزایان)، دادگەهێن تێهەلچونێ (محاکم الاستئناف) ل مەلبەندێ (ویلایەتی و لیوایێ) و دادگەهێن پێداچوونەڤێ (محکمة التمییز) ل (پایتەختێ دەولەتێ ستەنبولێ)، و ناڤێ جڤاتا دۆزان (مجلس الدعاوی) ل قەزایان ب دادگەها دەسپێکیا قەزایێ (محکمة بداء القضاء) هاتەگوهارتن. هەروەسان جڤاتێن کارگێری ل ناحیان و دەستەکێن ئیختیاریێ ل گوندان وەك دادگەهێن پێکئینانێ (محاکم صلح) هژمارتن کو ماف هەبیت ل دۆز یان گونەهێن بچووك بنێرن و هندەك سزایێن دراڤیێن بچووك ل سەردانن و چارەسەریێ بۆ ناکۆکیێن خۆجهیێن بچووك ب رەزامەندییا هەردو ئالیان ببینن، بەلێ بریارێن ڤان جڤاتان نە د ڤەبر بوون و ئالیێن ناکۆك ماف هەبوو دۆزێن خۆ ل دادگەها دەسپێکیا قەزایێ بەرچاڤ بکەن. پشتی راگەهاندنا قانوونا دادوەرێن ئاشتبوونەڤێ یا بەروەخت ل سالا ١٣٣٢مش/ ١٩١٢ز رێك هاتەڤەکرن بۆ دامەزراندنا دادگەهێن ئاشتبوونەڤێ ل ویلایەتان، بەرامبەر ڤێ چەندێ ژی داکوکی ل سەر شیانێن دادوەران دهاتەکرن، کارمەندێن دادگەهێن مەدەنی ئەو بوون یێن ل خواندنگەهێن ئاینی یان خواندنگەها قازیێن شەرعی ئەوا ل سالا ١٨٥٥ هاتییەدامەزراندن یان خواندنگەها قانوونا مەدەنی ئەوا ل سالا ١٨٧٨ێ خواندین، پشتی سالا ١٩٠٨ێ دەستڤەئینانا باوەرناما خواندنگەها مافان (الحقوق) مەرج بوو بۆ وی کەسی یێ دڤێت وەك قازی ل دادگەهان بێتەدامەزراندن، ژ سالا ١٩١٣یڤە پێدڤی بوو ل سەر هەرکەسەکێ یێ پێشکەشدکر وەك قازی ل دادگەهان بێتەدامەزراندن پشکداریێ د ئەزموونەکا نڤیسکی و زاردەڤ بەرامبەر لێژنەکا تایبەتمەند ژ دادوەران و سەرۆکێ نوونەراتییا گشتیدا (رئیس النیابة العامة) بکەت[١٣].

سەروبەری ژ گورانکارێن چوویی دروستبووی پێدڤی کر ئەرك و دەستەلاتێ دادگەهێن د نێرینا کاروبارێن کەسایەتیدا (الاحوال الشخصیە)بێتە سنووردارکرن، بەلێ دۆزێن دیتر کەتنە بەرۆکا دادگەهێن مەدەنی یێن ل دووڤ قانوونێن نوو کاردکرن، دبیت ژی قازییەکی د یەك دەمدا ئەرکێ ب رێڤەبرنا دادگەها شەرعی و دادگەها دەسپێکی ل قەزایێ دگرتە دەست، ئەڤە ژی ل سالێن بەری شەرێ جیهانیێ یەکەم ل قەزایێن دەڤەرا بەهدینان بەرچاڤدبیتن.

سالنامێن ویلایەتا مووسلێ پێزانینێن باش دەربارەی دادگەهێن دەڤەرا دهۆکێ و کارمەندێن وا بەرچاڤ دکەن. ل دووڤ وان سالناماں ل هەر قەزایەکا وێ دەڤەرێ دادگەهەکا دەسپێکی هەبوو، بەلێ سالناما سالا ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز ئاماژە ب دادگەها دووێ ل وان قەزایان دکەت کو دادگەها شەرعی بوو و رێڤەبرنا هەردو دادگەهان ژی د دەستێ قازیەکیدا بوو. هندیکە میلاکێ وان دادگەهانە، میلاکێ دادگەها شەرعی ژ نڤیسکارەکی (باش کاتب) و نڤیسکارێ دووێ و بەرهەڤکاری (محضر) ئەرکێ وی گازیکرنا کەسێن ناکۆك (ئالیێن دۆزێ) و شاهیدان بوو بۆ دادگەهێ[١٤]. د هەمان دەمدا میلاکێ دادگەهێن دەسپێکی گەلەك پتر بوو ژ ڤێ هژمارێ، بۆ نموونە میلاکێ دادگەها دەسپێکی ل قەزا ئامێدیێ وەك سالنامە ب دەستەکا دادوەریێ (عدلیە هیئەتی) ناڤدکەت ژ دادوەرێ دەسپێکی وەك سەرۆك و دو ئەندام ژ خەلکێ خۆجهـ ئەو ژی مستەڤا ئەفەندی (وەك ڤەکۆلەر- مستنطق- محقق کاردکر) و موشێ ئاغا و هاریکارێ ڤەکۆلەری(معاون محقق) ب ناڤێ محەمەد ئەفەندی و نڤیسکارێ ئێکێ و نڤیسکارێ دووێ دو کەسێن دی (وەك مبلغ کاردکرن و ئەرکێ وان وەك یێ بەرهەڤکاری بوو ل داگەهێن شەرعی) و دەرگەڤان (اوطە چی). هەمان میلاك ل دادگەها دەسپێکی یا زاخۆ ژی بەرچاڤ دبیتن، بەلێ ل دادگەها دەسپێکی یا ئاکرێ تنێ جوداهی نەبوونا ڤەکۆلەر (محقق)یە و تنێ هارکارێ ڤەکۆلەری (معاون محقق) هەیە، هەوەسان ناڤێ دەرگەڤانی تێدا نینە، و ئەڤە هەمان سەروبەرێ دادگەها دەسپێکی یا دهۆکێ یە[١٥]. تنێ هەردو سالنامەیێن ویلایەتا مووسلێ یێن سالێن ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز و ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز ئاماژە ب بوونا کارمەندەکێ دیتر د ناڤ میلاکێ هەمان دادگەها دهۆکێ دا دکەن ئەو

ژێ بریكارێ هاریكارێ داخوازكەرێ گشتی (المدعی العمومی) یە[66].

هێژ مژارا مە ل دور دادگەهان و دادوەرێن ل دەڤەرا بەهدینان ب داوی نەهاتی پێدڤیە بێژین ل هەر قەزایەكێ ژ قەزایێن بەهدینان مفتییەك هەبوو و د قەرقودێ فەرمانبەرێن كارگێرێن ئوسمانی ل قەزایان پشتی قازی دهات، و هەروەك ئاماژە پێ هاتییەكرن مفتی ژ ئەندامێن ئاسایێن جڤاتا كارگێریا قەزایێ بوو. هەروەك دهێتەزانین ئەركێ مفتی دانا فتوایان بوو د كاروبارێن شەرعیدا، دبیت ژێ د ڤی واریدا هاریكاریا قازیێ دادگەها شەرعی كربیتن. د سالنامێن ویلایەتا مووسلێ دا ئاماژە ب ناڤێن وان كەسان هاتییەكرن یێن ئەركێ مفتیێتیێ ل قەزایێن دهۆك و ئامێدیێ و ئاكرێ گرتیە دەست[67]. بەلێ ئاماژە پێنەكرییە كانێ ڤان مفتییان ل دووڤ كیژ مەزهەبی فتوا ددان، هەروەك ئەم دزانین مەزهەبێ حەنەفی مەزهەبێ رەسمیێ دەولەتا ئوسمانی بوو بەلێ پرانییا كوردێن سنی ل دووڤ مەزهەبێ ئیمامێ شافعی بوون.

## ٥- خزمەتگوزاریێن گشتی

سەدسالییا نوزدێ زایینی گوهۆرینێن باش هەرچەندە رێژەیی بوون د وارێ خزمەتگوزاریێن گشتی و كارگێریا واندا بخوڤە دیت، ڤان خزمەتگوزاریان وارێن فێركرنا نوویا فەرمی، دامەزراندنا بازێرڤانیێن نوو، خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ، رێكێن هاتنوچوونێ، ئامرازێن پەیوەندیان و یێن دیتر ڤەدگرتن. دەولەتا ئوسمانی بۆ ڤان كاران هژمارەكا زۆرا قانوون و رێنماییان راگەهاندن. هندیكە فێركرنا نوویە ل سالا ١٢٦٣مش/ ١٨٤٦ز لیژنەك ژ بۆ بەرچاڤكرنا راسپاردەیان د وارێ فێركرنا نوودا هاتەپێكئینان، ل دووڤ راسپاردەیێن ڤێ لیژنێ ل سالا پاشتر دیوانا زانیاریێن گشتی (دیوان المعارف العمومیة) ئەوا سالا پاشتر بوویە وەزارەتا زانیاری (وزارة المعارف)هاتە دامەزراندن. و پێنگاڤا گرنگا پاشتر د ڤی واریدا هاتییەهاڤێتن راگەهاندنا سیستەمێ زانیاریێن گشتی (نظام المعارف العمومیة) ل سالا ١٢٨٦مش/ ١٨٦٩ز ئەوا تایبەت ب كاروبارێن فێركرنێ ل دەولەتا ئوسمانی[68].

هندیكە وارێ بازێرڤانییانە ل سالا ١٢٨٥مش/ ١٨٦٨ز سیستەمێ بازێرڤانیان (بلدیة نظامنامة سي)یێ كو كاروبارێن بازێرڤانییان و جڤات و ئەركێن وان بخۆڤەگرتی هاتەراگەهاندن، هەروەسان سیستەمێ سەرانسەریێ كارگێریا ویلایەتان یێ ل سالا ١٨٧١ێ هاتییەراگەهاندن داكوكی ل سەر وێ چەندێ كریوو كو ل هەر بازێرەكی و بازێركەكی جڤاتەكا بازێرڤانی بێتەدامەزراندن و ئەندامەتیيا وێ و ئەركێن وێ دەستنیشانكربوون، دووڤ وێ را ژێ ل سالا ١٢٩٤مش/ ١٨٧٧ز قانوونا تایبەت ب بازێرڤانییان هاتەراگەهاندن ((الاتصالات)[69]. هندیكە گەهاندنە (الاتصالات) ل سالا ١٢٧٦مش/ ١٨٥٩ز سیستەمێ تەلەگرافێ ( تلغراف نظامنامە سي) هاتەراگەهاندن، ل دووڤرا سالا ١٢٨٦مـــش/١٨٦٩ز سیستەمێ تایبەت ب فەرمانگەهێن پوستەی و خزمەتگوزاریێن پوستەی (پوستە نظامنامە ســی)[70] هاتەراگەهاندن. هەروەسان ل سالا ١٢٨٨مـــش/١٨٧١ز سیستەمێ سەرانسەریێ كارگێریا ساخلەمیێ یێ تایبەت ب خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ هاتەراگەهاندن[71]. ب هەررەنگەكێ هەبیتن ئەو دراڤێ كێمێ بۆ ڤان رەنگە خزمەتگوزاریان هاتییەتەرخانكرن و نەبوونا هژمارەكا پێویست ژ كادرێن خودان شیان بۆ ئەنجامدانا ڤان خزمەتگوزاریان، زێدەباری باندۆرا سەروبەرێ سیاسی و گەندەلیا كارگێری بوونە ئەگەرێ گیروبوون و بجهنەئینانا ڤان خزمەتگوزارییان ل گەلەگ دەڤەرێن سەر ب دەولەتا ئوسمانی ڤە، دەڤەرا بەهدینان ژێ ژ وان دەڤەران بوو یا هەژار د وارێ پێشكەشكرنا گەلەك رەنگێن خزمەتگوزاریێن گشتی.

سەرەرای رەنگە پێشڤەچوونەكا بەرچاڤ د كەرتێ فێركرنا فەرمیدا ل دەولەتا ئوسمانی ژ سەردەمێ رێكخستنان (عهد التنظیمات) و سەردەمێ سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ پاشتر ژێ سەردەمێ دەستەلاتداریا ئیتحادیان (مەرەم ژێ كۆمەلا ئیتحاد و تەرەقی یە) ل سەر دەولەتا ئوسمانی ژ سالا ١٩٠٨-١٩١٨ز، ژ بلی دامەزراندنا چەند خواندنگەهەكێن

سەرەتایی ل داویا سەدسالیا نوزدێ و دەسپێكا سەدسالیا بیستێ گرنگیەكا وەسان بەرچاڤ ب ڤی كەرتی ل دەڤـەرا بەهدینان نەهاتییەدان، خواندنگەهێن زارۆكان (حوجره، الكتاتيب، صبيان مكتبي) و خواندنگەهێن ئایینیێن ئیسلامی دگەل خواندنگەهێن تایبەتێن كۆمێن مەسیحی و جوهی (یهودی)یان د بەردەوام بوون و وان پشكا مەزن ژ خزمەتگوزاریێن فێركرنێ دابینكرن. ئەو بوو خواندنگەهەكا سەرەتایا فەرمی ل ناحیا سندی گلی سالا ١٨٩٥ێ هاتەدامەزراندن، ل دووڤرا ژی سالا ١٩٠٠ێ ل هەریەك ژ دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ و ئاكرێ خواندنگەهەكا سەرەتایی هاتەدامەزراندن[٧٢]. ل دووڤ ئامارێن وەزارەتا زانیاریا گشتی (وزارة المعارف العمومية) یێن سالا ١٩١٣- ١٩١٤ێ گورانكاریەك گرنگ و هەژی ئاماژەپێكرنی د سەروبەرێ فێركرنا فەرمی ل دەڤەرا بەهدینان نەهاتییەگۆهارتن، چنكو ل قەزا دهۆكێ و ناحیێن وێ دو خواندنگەهێن سەرەتایی هەبوون و ٥١ خویندكارێن كور لێ دخواند، دو ژی ل زاخۆ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە هەبوون ٧٥ خویندكارێن كور لێ دخواند، ل ئاكرێ ژی خواندنگەهەك هەبوو ١٧ خویندكاران لێ دخواند و ل دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە ژی دو خواندنگەهـ هەبوون لێ ئاماژە ب هژمارا خویندكارێن وان نەهاتییەكرن. ل ئامێدیێ ژی خواندنگەهەك هەبوو و ٤٥ خویندكارێن كور لێ دخواند، بەلێ ل دەڤەرا زیبارێ دامەزراندنا خواندنگەهێ گیروو بوو هەتا ل سالا ١٩١٥ێ یەكەمین خواندنگەه لێ هاتییەدامەزراندن. هەژیە بێتەگۆتن وەزارەتا زانیاریا گشتیا ئوسمانی باوەری ب هندێ ئینایە كو ب چاڤ هژمارا زارۆكێن گەهشتینە ژیێ خواندنێ ل سالا ١٩١٣- ١٩١٤كێماتییەك مـەزن ب هژمارا خواندنگەهاندا هەیە، و د وێ سالێدا قەزا دهۆكێ پێدڤی ب ٩٦ خواندنگەهان و قەزا زاخۆ پێدڤی ب ٧٥ خواندنگەهان و قەزا ئاكرێ پێدڤی ب ٥٦ خواندنگەهان و قەزا ئامێدیێ پێدڤی ب ١٦٥ خواندنگەهان و دەڤەرا زیبار پێدڤی ب ٧٢ خواندنگەهان بوون. زێدەباری ڤێ كێماتیيا مەزن د هژمارا خواندنگەهان ل دەڤەرا بەهدینان، كێماتییەك مەزن د میلاكێ فێركرنێدا هەبوو، هەر خواندنگەهەكێ تنێ مامۆستایەك هەبوو ژ بلی خواندنگەها ئامێدیێ كو دو مامۆستا هەبوون، ئەڤە ژی ل سالا خواندنێ ١٩١٣- ١٩١٤ێ ل دووڤ ئامارێن وەزارەتا زانیاریا گشتیا ئوسمانی[٧٣]. چ زانیاری نینن دەربارەی كارگێریا فێركرنا فەرمی ل قەزایێن دەڤەرا بەهدینان یا گرێدایی دگەل لیوا مووسلێ مەلبەندێ ویلایەتا مووسلێ، بەلێ سالناما ویلایەتا مووسلێ یا ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز ئاماژە ب بوونا لیژنا زانیاری (معارف قومسيونى) ل قەزا ئامێدیێ ب سەرۆكاتیا روشدی ئەفەندی و ئەندامەتیا هەریەك ژ حەجی خدر ئەفەندی رێڤەبەرێ خواندنگەها سەرەتایا ئامێدیێ و سێ مودەریسان (مەبەست ژ مودەریس ئەون ئەوێن ل خواندنگەهێن ئایینی دەرس دگۆتن) ئەو ژی توفیق ئەفەندی، جواد ئەفەندی و حاجی مستەفا ئەفەندی نە[٧٤]. بەلێ چ پێزانین دەربارەی ئەرك و دەستەلاتێ ڤێ لیژنێ ل بەردەست نینن، هەژی ئاماژەپێكرنێ بە دوا ئەندامێ ڤێ لیژنێ ئەندامی جڤاتا باژێرڤانیا ئامێدیێ بوو.

هندی پەیوەندی ب باژێرڤانیانڤە هەیە، دامەزراندنا وان ل عیراقێ دزڤرینەڤە سالا ١٨٦٩ێ سەردەمێ والیتیا مەدحەت پاشای (١٨٦٩-١٨٧٢ز)، د وێ سالێدا ل هەریەك ژ بەغدا، مووسل و بەسرا فەرمانگەهێن باژێرڤانی هاتنە دامەزراندن، پشتی وێ چەند سالەكان ل باژێر و قەزایێن دی یێن سەر ب ویلایەتا بەغدا و د وی سەردەمیدا جڤاتێن باژێرڤانی هاتنەدامەزراندن، ژ وان ژی قەزایێن دەڤەرا بەهدینان، ل دووڤ سالناما ویلایەتا بەغدا سا سالا ١٢٩٢مش/ ١٨٧٥ز جڤاتا باژێرڤانی ل دهۆكێ ژ سەرۆك و دو ئەندام و نڤیسكارەكی پێكدهات، ل ئامێدیێ ژ سەرۆك و سێ ئەندامان پێكدهات، ل زاخۆ ژ سەرۆك و پێنج ئەندام و نڤیسكارەكی پێكدهات و ل ئاكرێ ژی ژ سەرۆك و شەش ئەندام و نڤیسكارەكی پێكدهات[٧٥]. بەلێ سالنامێن ویلایەتا مووسلێ تنێ ئاماژە ب بوونا جڤاتێن باژێرڤانیان ل قەزایێن ئامێدیێ و زاخۆ و ئاكرێ

دکەن، ل ئامێدیێ سالا ١٨٩٢ سەرۆکێ باژێرڤانیێ سەعدوللا ئاغا بوو، ل سالا ١٩٠٧ێ شەعبان ئاغا بوو و نڤیسکارێ وی خالد ئەفەندی بوو، بەلێ ل سالا ١٩١٢ێ ناڤێ شەعبان ئاغای وەك سەرۆکێ شانازیێ باژێرڤانیێ دوبارە بوویەڤە و نڤیسکار ژی هەر خالد ئەفەندی بوو زێدەباری دو ئەندامێن دیتر ئەو ژی حاجی حامد ئەفەندی و حاجی مستەفا ئەفەندی بوون[٧٦].

بەلێ ل زاخۆ سالا ١٨٩٠ێ باژێرڤانییا وێ ژ عارف ئاغا وەك سەرۆك و چوار ئەندامان: تاهر ئاغا، حەسەن ئاغا، خواجە ئیشو و خواجە ئیلیا پێدهات. ل سالا ١٨٩٢ێ میلاکێ هەمان باژێرڤانیێ ژ عەبدولقادر ئاغا وەك سەرۆك و سلێمان ئەفەندی نڤیسکارێ باژێرڤانیێ پێکدهات. ل سالا ١٨٩٤ێ هەردو ناڤێن چوویی دوبارە بووینەڤە زێدەباری ناڤێ چوار ئەندامان ئەو ژی تاهر ئاغا، حەسەن ئاغا، مەلکو ئاغا و شلێول ئاغا. بەلێ ل سالا ١٩٠٧ێ سەرۆکێ باژێرڤانیا زاخۆ حاجی ئاغا زادە محەمەد ئاغا بوو و نڤیسکارێ وێ مەولود ئەفەندی بوو، ئەندام ژی حەسەن ئاغا، حەجی سالح ئاغا و یوسف ئاغا بوون. بەلێ سالناما سالا ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز ژبلی ناڤێ محەمەد ئاغایێ سەرۆکێ باژێرڤانیێ و محەمەد ئەفەندیێ نڤیسکار نەکرییە[٧٧]. هندیکە ئاکرێ یە ل سالا ١٨٩٢- ١٨٩٤ێ حەجی محەمەد شەریف ئاغا سەرۆکێ باژێرڤانیێ و یونس مەحموود ئاغا، حەجی مستەفا ئاغا، حەجی ئەمین چەلەبی، خواجە مەنسوور و خواجە سیدو ئەندام بوون. ل سالا ١٩٠٧ێ عەبدولقادر ئەفەندی سەرۆکێ باژێرڤانیێ و سەیفەدین ئەفەندی نڤیسکارێ باژێرڤانیێ و مستەفا ئەفەندی، عەزیز ئەفەندی، مەنسوور ئەفەندی و عیدو ئەفەندی ئەندام بوون. و ل سالا ١٩١٢ێ حەجی حەسەن ئاغا سەرۆکێ باژێرڤانیا ئاکرێ و سەیفەدین ئەفەندی نڤیسکار بوون و ئەندام ژی حەجی محەمەد عەلی ئەفەندی، عەبدولرەحمان ئەفەندی و خواجە خەنو ئەفەندی بوون[٧٨]. ب هەر رەنگەکێ هەبیتن ژێدەرێن بەردەستێ مە ئاماژە ب چ پێزانینێن بەرچاڤ دەربارەی کارێن باژێرڤانیێن قەزایێن بەهدینان نەکرینە. تنێ ل سالناما ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز ئاماژە ب بوونا ژێدەرێن نەفتێ ل دەوروبەرێن زاخۆ هاتییەکرن کو جڤاتا باژێرڤانیا زاخۆ بزاڤێن پارزینا وێ کرینە بەلێ دەست ژ وێ بزاڤێ بەردایە[٧٩].

هند ژێدەرێن دیرۆکی ل بەردەست نینن ئاماژە ب رەنگە باشبوونەکا بەرچاڤ د خزمەتگوزارێن ساخلەمیێدا ل قەزایێن دەڤەرا بەهدینان د وێ قۆناغێدا هەبیت، ژ بلێ تنێ ئاماژەکێ ب بوونا بنگەهەکێ ساخلەمیێ (مستوصف- خستەخانە) ل قەزا دهۆکێ[٨٠] چ تشتەکێ دیتر ل بەردەست نینە. هەروەسان هندەك ژێدەر ئاماژە پێ دکەن کو ئالیێن پەیوەندیدار ل دەسپێکا سەدساليیا بیستێ چەند هەوەکێن هشیارکرنا ساخلەمیێ ئەنجامداینە و داکوکی ل سەر کوتانێ دژی هندەك نەخۆشییان وەك خوریکان (الجدری) کرییە، زێدەباری ڤێ چەندێ ئاماژە ب پشکنینێن ساخلەمیێ هاتینەکرن بۆ وان کەسان ئەوێن دبرنە خزمەتا لەشکەریێ هەروەکی سالا ١٩٠٥ێ ل دهۆکێ و ئامێدیێ رووداى[٨١]. هندیکە خزمەتگوزارێن پوستە و تەلەگرافێ نە بەری نها ئاخفتن ل سەر هاتەکرن.

بەری کو ژ بابەتێ خزمەتگوزارێن گشتی ب داوی بهێین دێ باش بیتن ئاماژە ب بوونا لقێ بانکا چاندنێ (زراعت بانقە سی) ل دەڤەرا بەهدینان بکەین و ڤێ بانکێ قەر بۆ گەلەك ژ جوتیاران دابیندکرن. ئەڤ بانکە ب فەرمانەکا سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ ل ٢٧ تەباخا ١٨٨٨ێ هاتییەدامەزراندن. دامەزراندنا ڤێ بانکێ ب مەرەما دیتنا چارەیان بوو بۆ وان پرسگرێکێن کارگێری و دارایی ئەوێن سازیێن قەردانێ یێن بەری وان دروستکرین وەك: سندوقێن شاهنشینیێ (صناديق المملكة) ئەوا مەدحەت پاشایێ والیێ ویلایەتا دانوب ل سالا ١٨٦٣ دامەزراندی و پاشتر ل پرانییا ئالیێن دەولەتا ئوسمانی بەلاڤەبوو، هەروەسان سندوقا مفاداریێ (صناديق النافعة) ئەوا ل سالا ١٨٨٣ هاتییەدامەزراندن و هندەك پرسگرێکێن سندوقێن شاهنشینیێ چارەسەرکرین[٨٢]. بانکا چاندنێ پتر ژ ٤٠٠ لقان ل سەرانسەری دەڤەرێن سەر ب دەولەتا

ئوسمانی ڤەڤەكرن، دكۆمتێ كارگێرییێ هەرلقەكیدا رێڤەبەر و هاریكارێ رێڤەبەری هەبوون ل ستەنبۆلێ ب مووچەیەكێ هەیڤانە دهاتنەدامەزراندن، و چەند كارمەندەكان ژ خەلكێ خۆجە بەرامبەری مووچەكێ هاریكاریا وان دكرن[٨٣]. بانكا چاندنێ دو هۆبە ل بەهدینان هەبوون، یەك ل قەزا دهۆكێ و یا دیتر ل ئاكرێ، هەر هۆبەكێ رێڤەبەر و نڤیسكارەك و گەنجینەدارەك و پارەوەرگرەك (محصل) هەبوون، زێدەباری چەند ئەندامەكێن خۆجهـ كو هژمارا وان د ناڤبەرا ٣- ٥ ئەندامان بوو[٨٤]. بانكا چاندنێ قەر ددانە جوتیاران بەرامبەری١٪ كرێیا خزمەتگوزاری زێدەباری رێژەیا ٦٪ سالانە[٨٥]. هژمار ل بەردەست نینن هژمارا وان جوتیارێن بەهدینان یێن مفا ژ ڤان قەران وەرگرتی چەندە، بەلێ دادگەهێن مووسلێ گەلەك بریار داینە بۆ دەست بسەرداگرتنا ئەو عەرێن چاندنێ ل دەڤەرا بەهدینان یێن خودانێن وان نەشیاین قەرێن بانكا نابری بدەن[٨٦].

## ٦- لەشكەر و جەندرمە:

ژ بۆ كونترۆلكرنا وان دەڤەرا یێ د دەمێ خۆدا ژ ئالیێ میرگەهێن كوردی ڤە دهاتنەرێڤەبرن كو بەهدینان ژی یەك ژ وان دەولەتان بوو دەولەتا ئوسمانی تووشی ئاریشەیێن مەزن و دژواریـوو، د راستیدا ژ ناڤچوونا میرگەهێن كوردی بوو ئەگەرێ دروستبوونا ڤالاهیەكێ كارگێرییا ئوسمانی نەشیا ب ساناهی وێ ڤالاهیێ پركەتەڤە، دەولەتا ئوسمانی كەتەبەر ئاریشەكا راستەڤینە ژ بۆ زالبوونێ ل سەر عەشیرەتان و ناچاركرنا وان كو خۆ ژبۆ دەستەلاتێ دەولەتێ بچەمینن، هەروەسان كارێ كومكرنا باج و خویكان نەیا بساناهی بوو، زێدەباری ئالوزی و نەسەقامگیرییا ژ ئەنجامێ شەرەنیخ و ناكۆكیێن جار جاران ناڤبەرا وان عەشیرەتان ب خۆ دروستدبوون[٨٧]. ژبۆ بەرسنگگرتنا وان ئاستەنگ و ئاریشەیان دەولەتا ئوسمانی پشتگەرما لەشكەری و زەبتیێ (الضبطیة) بوو، كو ژ سالا ١٨٧٩یڤە ب جەندرمە هاتبوو ناڤكرن[٨٨].

هەژیە بێتەگۆتن سەردەمێ رێكخستنان (فترة التنظیمات) گوهۆرینێن گرنگ د وارێ پێكهاتێن لەشكەری و تەناهیێدا ل دەولەتا ئوسمانی ب خۆڤە دیتن، لەشكەرێ ئوسمانی سەر ژ نوو د چەند سوپا (الفیلق)یەكێن بەلاڤكری ل دەڤەرێن جوداێن ئوسمانی دا هاتەرێكخستن. بەغدا بارەگایێ لەشكەرێ (الجیش) شەشێ یێ ئوسمانی (التنجي اوردوي همایوني) بوو، سنوورێ كریارێن لەشكەریێن ڤی سوپای ویلایەتێن بەغدا و بەسرا و مووسلێ ڤەدگرت[٨٩]. بەری دەسپێكرنا شەرێ جیهانیێ یەكەم سەر ژنوو پێكهاتەیا لەشكەرێ ئوسمانی هاتەڤە رێكخستن و دو سوپا(الفیلق)یان ((قول اوردو) شوونا سوپایێ شەش گرت، سوپایێ ١٢ بارەگایی وی ل مووسلێ و سوپایێ ١٣ بارەگایێ وی ل بەغدا بوو[٩٠]. ب ڤێ چەندێ یەكەیێن لەشكەریێن ل دەڤەرا بەهدینان بوونە سەر ب سوپایێ ١٢ێ یێ مووسلێ ڤە. هندیكە سەرباز و دەرەجەدارێن سوپایێ شەشێ نە مەدحەت پاشایێ والی گرنگی ب وێ چەندێ ددا كو خەلكێ خۆجهـ د رێزێن وی دا بن، ل دووڤ هندەك ژێدەران نێزیكی سێ ژ چوار پشكێن سوپایێ شەشێ ل سالا ١٨٧١ كورد بوون، لێ پشتی هاتنا عەرەبێن هەردو ویلایەتێن بەغدا و مووسلێ ب رەنگەكێ بەرفرەهـ بۆ ناڤ ڤی سوپای رێژەیا كوردان ل كێمێ دا هەتا گەهشتیە نیڤا پێكهاتا وی سوپای، د دەمەكیدا كو پتریا ئەفسەرێن ڤی سوپای كەسێن نامو (غەریب) بوون ژ ڤی وەلاتی[٩١]. دەمێ خزمەتا لەشكەری دووڤ قانوونێن پشككێشانێن لەشكەری یێن سالێن ١٨٤٨ و ١٨٧١ز بلەشكەركرن (التجنید) د رێكا پشككێشانێدا دهاتەئەنجامدان، دەمێ خزمەتا لەشكەریا نەچاری (الالزامیة) و خزمەتا یەدەك (الاحتیاط- الردیف) د لەشكەرێ ئوسمانیدا سالێن درێژ ڤەدكێشا، پاشتر هاتەكێمكرن، هەتا هێدی هێدی ژ پێنج سالان گەهشتیە دو سالان، بەلێ یێن یەدەك ئانكو ئەوێن خزمەتا خۆ ب داوی دئینا و دزڤرینەڤە سەر جهێن خۆ هەر سالێ جارەكێ بۆ دەمێ هەیڤەكێ دهاتنەگازیكرن بۆ مەشقكرنێ و

ڤێ گازیکرنێ حەفت سالان ڤەدکێشا، پاشتر ئەڤە ژی هاتەکێمکرن بۆ هەر دوسالان هەیڤەکێ[92]. موچەیێن لەشکەران ب رێکوپێکی و ل دووڤ یەك نەدهاتنەدان و هندەك جاران ژی بۆ دەمێن درێژ هەر ژ بنی نەدهاتنەدان، ئەڤێ چەندێ ژی لەشکەر هاندان ژ خزمەتێ برەڤن و قەچاخکەن، هندەك جاران ژی ژبۆ دابینکرنا پێدڤیاتیێن خۆ زێدەگاڤی دکرن و کارێن دزی و تالانکرنێ دکرن[93].

دووڤــرا یەکەیێن هێزێن پاراستنێ (قــوات الضبطیة) هاتنەدامەزراندن، پشتی کو قانوونەکا تایبەت ل ١٤ حزیرانا ١٨٦٩ێ ب ناڤێ سیستەمێ لەشکەریێ پاراستنێ (عساکر ضبطیة نظامنامة سی) هاتیبەراگەهاندن[94]. لەشکەرێن پاراستنێ کو ب جەندرمە ژی دهاتنەناڤکرن سەر ب وەزارەتا شەری بوون کو ئەفسەرێن لەشکەرێ ئوسمانی کار لێدکر، پرانیا پێکهاتا وان ژی هێزێن یەدەك (الردیف) ێن لەشکەرێ ئوسمانی بوون، هەتا سالا ١٩١٢ێ کو تێدا قانوونا وەزارەتا ناڤخۆیی هاتیبەراگەهاندن جەندرمە سەر ب وەزارەتا شەری ڤە بوون، د ڤێ سالێدا کەتنە سەر میلاکێ وەزارەتا ناڤخۆیی، هەروەسان ل سالا ١٩١٣ێ قانوونەکا دیترا تایبەت ب مفا وەرگرتنێ ژ لەشکەرێن نەچاران (المکلفین) د هێزێن جەندرمەیدا دەرکەت، هەر د ڤێ قانوونێدا ئەو هژمارا سالانە د دەمێ پشکێشانێدا ژ نەچاران بۆ ناڤ هێزێن جەندرمان دبرن[95].

پرانیا یەکەیێن لەشکەریێن ئوسمانی ل قەزا و ناحیێن دەڤەرا بەهدینان ژ هێزێن یەدەك (الردیف) بوون، بەلێ سالنامێن ئوسمانی ئاماژە ب هژمارا وان و بەتالیۆن (کەتیبة) و لقێن وان و میلاکێ ئەفسەرێن وان نەکرییە، بۆ نموونە ل قەزا دهۆکێ ل سالا ١٣٠٨مش/ ١٨٩٠ز دو لق (السریة)یێن یەدەك لێ هەبوون، بەلێ ل سالا ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز قەبارێ ڤێ هێزێ پتر لێ هات و ژ بەتالیۆنا چوارا هێز (فوج) یەدەك هژمار (١٠٣) پێکدهات، بەتالیۆنا ئاماژەپێکری ل ژێر سەرپەرشتیا راگر- سەرتیپ (عمید- میر الای) بوو و ئەفسەرەکێ ب پلا پێشکار (مقدم)

هاریکاریا وی دکر و نڤیسکارەك ژی هەبوو. ئەو بەتالیۆنە ژ ٤ لقان پێکدهات و ئەفسەرەکی ب پلا پێشەنگ (نقیب- یوزباشی) و دو ئەفسەرێن هاریکار یەك ب پلا جیدارێ ئێکێ و یێ دی ب پلا جیدارێ دووێ سەرپەرشتیا هەر لقەکی دکر. بەلێ ل سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز هێزێن یەدەك ل دهۆکێ ژ بەتالیۆنا ئێکێ یا هێزا یەدەك (٩٥) ل ژێر فەرماندارپا پێشکار (مقدم)ەکی ب هاریکاریا پێشرەو (رائد- قول أغاسی)ەکی پێکدهات، ئەڤ بەتالیۆنە ژ چوار لقان پێکدهات و میلاکێ هەر سریەکێ ٢- ٣ ئەفسەران ب پلا جیدارێ دووێ - پێشەنگ پێکدهات، زێدەباری بوونا سێ هوستایێن چاککرنا تڤەنگان (جخسی- تفکجی اسطة سی) ل هەر یەك ژ لقێن دو و سێ و چوار[96]. قەزا ئامێدیێ ل سالا ١٣١٠مش/ ١٨٩٢زبارەگایێ بەتالیۆنا ئێکێ ژ هێزا (فوج) یەدەك (١٠٣)بوو کو ل ژێر فەرماندارپا ئەفسەرەکێ بوو ب پلا سەرهەنگ و ئەفسەرەکێ دی ب پلا پێشرەو (رائد- قول أغاسی) هاریکاریا وی دکر، ئەو بەتالیۆنە ژ چوار لقان (سریة) پێکدهات و میلاکێ هەر سریەکێ ژ وانا وەك میلاکێ لقێن بەتالیۆنا چوارا دهۆکێ بوون د وێ سالێدا، هەروەسان بەتالیۆنەك ژ هێزێن یەدەکا ناحیا داودیێ یا سەر ب قەزا ئامێدیێ ژی هەبوو[97]. ل قەزا زاخۆ سالا ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز ئاماژە ب ئەفسەرەکی ب پلا پێشەنگ (نقیب) و ئێکێ دیتر ب پلا جیدارێ ئێکێ دهێتەکرن بێی کو ئاماژە ب یەکەیا لەشکەرێ بێتەکرن، بەلێ وەسان دیارە ئەو یەکەیە ژ لقەکی پتر نەبوو، بەلێ دیارە ئەو هژمارە ل سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز زێدەبوویە و بەتالیۆنا چوار ژ هێزا یەدەك (٩٦) ل زاخۆ جهێ خۆ گرتیە و ژ چوار لقان پێکدهات[98]. بەلێ ل قەزا ئاکرێ ئاماژە ب ناڤێن ئەفسەرێن فەرمانگەها هێزێن یەدەك (قوات الردیف- عساکر شاهانە ردیف دائرە سی)دهێتەکرن و هژمارا وان ل سالا ١٣٠٨مش/ ١٨٩٠ز ٩ ئەفسەر و ل سالا ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز ١٢ ئەفسەر بوون و ل سالا ١٣٢٥مش/١٩٠٧ز بەتالیۆنا چوار ژ هێزا یەدەك (٩٤) ل ئاکرێ یا جێگیربوو[99].

زانیارێن مە ل سەر پێکهاتێن جەندرمەیان ل دەڤەرا بەهدینان ژ پێکهاتێن لەشکەری باشتر نینن، سالنامێن ویلایەتا مووسلێ ئاماژە ب ناڤێن ئەفسەرێن جەندرمەیان ل قەزایێن بەهدینان کرییە، د هەمان دەمدا ئاماژە ب بوونا لقێن پەیادە و یێن سوارە ل دەڤەرێ دکەن(١٠٠). گەرۆکێ فرەنسی هێنری بێندیە ئەوێ ل سالا ١٨٨٥ێ د دهۆکێ را بووری دبێژیت هژمارا جەندرمەیان ل دهۆکێ ٢٠ کەس بوون(١٠١). بەلێ سدیق دەمەلوجی دیاردکەت کول هەریەك ژ قەزایێن بەهدینان هژمارەکا زەبتییەیان (یان جەندرمەیان) کو ژ ٣٠ کەسان نەدبووری هەبوون و ل هەر ناحیەکێ ژی دو یان سێ یان چوار جەندرمە هەبوون، ژبۆ ڤەگوهاستن و ئینان و برنا نڤیسارێن فەرمی و گازیکرنا کەسێن فەرمانگەهێن حکومەتێ داخوازا وان دکر مفا ژێ دهاتەوەرگرتن، ئەڤ جەندرمەیە ژی د سەروبەرەکێ هەژاری و بەرتەنگییێدا دژیان ژ بەر کو هەریەك ژوان دسالێدا تنێ دو یان سێ مووچە وەردگرتن(١٠٢).

## ٧- پەسنێن سەرەکیێن کارگێرییا ئوسمانی

ژ نیڤا سەدسالییا نوزدێڤە پرانییا سازی و فەرمانگەهێن دەولەتا ئوسمانی گورانکاریێن گرنگ ب خوڤە دیتن، ئارمانج ژ ڤان گورانکاریان ئەو بوون سازی و فەرمانگەهێن ناڤبری کاراتر و باشتر ئەرکێن خو بڕێڤەببەن و سنوورەکێ بو وێ بەرەلایی و گەندەلییا هەبی دانن. ب هەررەنگەکێ هەبیتن وان گورانکاریان ب دروستی ئارمانجێن خو بجهـ نەئینان، ب تایبەت ژی ل دەڤەرێن دوور ژ پایتەختی ستەنبولێ و سەنتەرێ ویلایەتان ئەڤە ژی ژ بەر وان ئەگەرێن بەری نها ئاماژە پێ هاتییەکرن، و کارگێرییا ئوسمانی ل وان دەڤەران ژ وان ژی دەڤەرا بەهدینان گەلەك کێماسی و نەرێنی ب خوڤە دیتن. دبیت گرنگترین نەرێنی ژی زۆرییا باج و خویکان بوو، بەلگەنامەیەك ل سەر سەروبەرێ داهاتێ ویلایەتا مووسلێ یێ سالا ١٢٦٩مــش/ ١٨٥٢- ١٨٥٣ز ل بەردەستە تێدا ئەو باج و خویکە بەرچاڤ دکەڤن یێن ل دهۆکێ و ئاکرێ و مزووری و داودیێ و زاخۆ (وی دەمێ ئامێدیێ سەر ب هەکاری ڤە بوو) ل سەر پەزی و مالاتی و کرین و فرۆشتن و ئەنجامدانا پیشەیان ل بازاران هاتینەسەپاندن(١٠٣). ئەڤە زێدەباری ئەو باجێن ل سەر عەردی و بەرهەمێ چاندنێ هاتینەسەپاندن، ب تایبەت باجا دەهێك، هەروەسان باجا دراڤێ کاش (البدل النقدي) ژ نەمووسلمانان دهاتەستاندن بەرامبەر ئەدانەکرنا خزمەتا لەشکەریێ. کریارا دوبارە سەروبەرکرنا باج و خویکان ل سەردەمێ رێکخستنان گرانییا باج و خویکان سڤکتر لێنەکر بەلکی جۆرێن وان پتر لێکرن(١٠٤)، و هەموو کەسەك نەدشیان ڤان باج و خویکان بدەنە دەولەتێ. یا هێژ پشتیێ خەلکێ گرانکری ئەو زێدەروویە بوو یا ژ ئالیێ وان مەئمووراندڤە دهاتەکرن ئەوێن کارێ وەرگرتنا باج و خویکان دکر، هەروەسان گەندەلییا کارگێرییا دارایی هێژ پشتیێ وی خەلکی گرانتر لێدکر، ل دووڤ ئەوا ژ کەسەکی یێ ب چاڤێن خو دیتی هاتییەڤەگێران کارگێرییا دارایی ئامرازەك بوو بۆ تالانکرنا مالێ خەلکی، هەمان دیدەڤان ڤەدگێریت: رێڤەبەرێن دارایی ئاستێن ئەندازەیی د رەشوە و بەرتیلکرنێدا بۆراندبوون، وان جهێن خو ژ دەفتەرداری {ئانکو بەرپرسێ دارایی}یێ ویلایەتێ دکرین(١٠٥). هندەك جاران گەندەلییا کارگێری و دارایی ئاستەنگ بوو ل بەر ڤەکۆلین و سزادانا وان کەسان و ل دادگەهان ئەو بێ گونەهـ دەردئێخستن و دزڤرینەڤە سەر کریارا خۆیا بەرێ. گەلەك ژ ئەفسەر و کارمەندێن لەشکەری ژی دوورنەبوون ژ ڤان رەنگە گەندەلی و زێدەگاڤیێ ل سەر خەلکی، و دەولەتێ ژی پشکەك ژ بەرپرسیارییا ڤێ گونەهێ هەلدگرت ژ بەرکو گەلەك جاران ب هەیڤان مووچەیێ وان نە ددا، بەلکی ئەو فەرمانبەرێن گەندەل ل هندەك دەڤەران ب ڤەگوهاستنێ بۆ کوردستانێ سزا دادن و دبوونە ئەگەرێ نەرێنییان ل کارگێرییا ڤێ جهی(١٠٦).

ژ سیمایێن دی یێن کارگێرییا ئوسمانی گرنگی نەدانا وێ بوو ب خزمەتگوزاریێن گشتی ل دەڤەرێ ب تایبەت ژی گرنگی نەدان بوو ب وارێ فێرکرنێ و خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ وەك ئاماژە پێ هاتییەکرن.

د هەمان دەمدا ئەو کارگێریە نەشیا بوو تەناهیێ و ئارامیێ بۆ وەلاتیان ل دەڤەرێ دابین بکەت، دەستەلاتێ دەولەتێ یێ لاواز بوو و دەستەلات دەستەلاتێ خودان هێزان ژ سەرۆکعەشیرەتان بوو، د ڤی سەروبەریدا زرتەکی و زیدەگاڤی د زۆر بوون و سەر و سامانێ خەلکێ توشی زێدەگاڤی و ستەملێکرنێ دبوون[107]، بەلکی دەستەلاتدارێن ئوسمانی پەردەپوشی ل گەلەك ژ وان کەسان ژ سەرۆکعەشیرەتان دکر یێن زێدەگاڤی ل سەر خەلکی دکرن. نموونە ل سەر ڤێ چەندێ حاجی ئاغایێ سەرۆکێ عەشیرەتا ئەرتوشی یێ کو پلا سەرتیپ (قائمەقام)ی د هێزێن سوارێن حەمیدی دا هەی، ئەڤە ژی ئەو میلیشیایە بوون یێن ل سالا ١٨٩١ ب مەرەما خزمەتا ئارمانجێن سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ و مفاوەرگرتنێ ژ هێزا کوردان بۆ بەرژەوەندیێن وی هاتینەدامەزراندن، هەژیە ل ڤێرێ بێژین عەشیرەتێن دەڤەرا بەهدینان ب گشتی د دووریـوون ژ وان هێزێن سوارێن حەمیدی. حاجی ئاغای ئەڤ چەندە ب دەلیڤە دیت و د ناڤبەرا سالێن ١٨٩٧ - ١٨٩٨ێ هێرش برنە سەر عەشیرەت و گوندێن دەوروبەرێن دهۆکێ و دەست ب تالانکرنا وان کر، ژ بەر جهـ و دەستەلاتێ وی د هێزێن سوارێن حەمیدی دا دشیانێن کەسەکی ژ فەرمانبەرێن لەشکەری و مەدەنییێن ئوسمانی دا نەبوو دژی وی راوەستن ژ بەرکو زەکی پاشایێ فەرماندێ لەشکەرێ چوارێ ئوسمانی ل ئەنادۆلێ پشتەڤانی ل وان عەشیرەتان دکر یێن سەر ب سوارێن حەمیدی[108].

د ڤی سەروبەریدا کارەکێ نامۆ نەبوو خەلك حەز ژ (رۆمی)یان ئانکو فەرمانبەرێن حکۆمەتا ئوسمانی نەکەت و لەعنەتان لێ ببارینن[109]. هەروەسان ڤان خرابکاریێن حکۆمەتێ هژمارەك ژ سەرۆك و زانایێن ئایینی یێن کوردان ل دەڤەرێ پالدان داخوازا ئەنجامدانا چاکسازیێن بنەرەتی د کارگێریا ئوسمانیدا ل دەڤەرێ بکەن. د دەمەکیدا ژ سالا ١٩٠٧ێ یان سالا ١٩٠٨ یێدا کۆنگرەکێ گرنگێ شێخ و سەرکێن کوردان ب سەرکردایەتیا شێخ نور محەمەدێ بریفکانی شێخێ رێبازا قادری ل دهۆکێ هاتەگرێدان، شێخ عەبدولسەلامێ دووێ یێ بارزانی یێ کو پشتی مرنا بابێ خۆ شێخ محەمەدی ل سالا ١٩٠٢ێ شێخاتیا بارزان گرتیەدەست یەك ژ ئامادەبوویێن ڤی کۆنگرەی بوو، شێخ عەبدولسەلام ل پشت وێ بەلگەنامەیا دیرۆکی بوو ئەوا ژ وی کۆنگرەی دەرکەتی، و شێخ عەبدولسەلامی دانەیێن وێ زێدەباری کەسایەتیێن بەرچاڤێن کورد بۆ ئالیێن بەرپرس ل ستەنبۆلێ هنارتن. کورتییا داخوازێن د وێ بەلگەنامەیێدا هاتین پێکهاتبوو ژ: زمانێ کوردی ل قەزایێن دهۆك، ئامێدیێ، ئاکرێ، زاخۆ و شنگالێ زمانێ فەرمی بیتن هەروەسان فێرکرن ل دەڤەرا بەهدینان ب وی زمانی بیتن، خواندنگەهـ بێنەڤەکرن و رێك بێنەچێکرن، ئەو کارمەند و فەرمانبەرێن کارگێری بێنەدامەزراندن یێن ب باشی زمانێ کوردی دزانن، زێدەگاڤی ژ ئەوێ ئەوا شەریعەت بریارێ ل سەر ددەت د وەرگرتنا باجاندا نەهێتەکرن، تایبەتمەندیا هندێ بەرچاڤبێتەوەرگرتن کو پرانییا کوردان شافعی مەزهەبن و د دەمێ دانا قازی و مفتییان ل دەڤەرا بەهدینان ئەو کەسە بێنە دانان یێن ژ وی مەزهەبی بن[110].

ل شوونا هندێ کو دەولەت ڤان داخـوازان بەرچاڤبکەت و ل دووڤ وان داخوازان بهێت پارتیا یەکێتی و پێشکەتن (الاتحاد و الترقی) ئەوا پشتی کودەتایا سالا ١٩٠٨ێ ل ستەنبۆلێ دەستەلات گرتیەدەست ب چاڤێ کەسەکێ (ژ دەولەتێ پشتەرێ بووی)[111] بەرێ خۆ دا شێخ عەبدولسەلامی و ل دەلیڤەکێ دگەریا وی ژناڤببەت، هەتا ئەڤ چەندە دەستڤەهاتی و پشتی کو شێخ عەبدولسەلام گرتی و ل دەسپێکا کانوونا ئێکێ ١٩١٤ێ ل مووسلێ ل سێدارێ دا[112]، ئانکو پشتی کێمتر ژ هەیڤەکێ ژ چوونا دەولەتا ئوسمانی بۆ ناڤ شەرێ جیهانیێ یەکەم ل ٥ چریا دووێ. سالێن شەرێ جیهانی دەسپێکا قۆناغەکا نوویا پڕی دژواریا خەلکێ دەڤەرێ بوو ژ دەستەلاتێ کارگێریا ئوسمانی، ڤێ کارگێریێ کاودانێ شەری بۆ خۆ ب دەلیڤەدیت باجان ل سەر خەلکی زێدەبکەت، و ب مهانەیا دابینکرنا پێدڤیاتیێن شەری دەست ب سەر ئەرزاق و پەز و کەوال و رەشمالێ واندا بگریت،

هەروەسان د وان سالاندا گەندەلییا دارایی و وەرگرتنا بەرتیلێ ب رەنگەکێ بەرچاڤ ب چاڤ سالێن پێشتر زێدەبوو، بەلکی بەرتیل بۆ رەنگەکێ تالانکرنی، و پێن پتر ئەڤ چەندە کری جەندرمە و ئەفسەرێن پەدەك بوون ل جهێن گوهنەرم (الامکنة المطیعة)[113]، ئەڤ سەروبەرە هەتا شکەستنا دەولەتا ئوسمانی د شەرێ جیهانیێ یەکەمدا و ب داویهاتنا دەستەلاتێ وێ یێ بەردەوام بوو.

# ژێدەر:


١. میرگەهێن کوردی ئەوێن پشتی سەرکەتنا سولتان سەلیمێ ئێکێ(١٥١٢- ١٥٢٠) د شەرێ چالدیران یێ سالا ١٥١٤ێ دا ئالیکرییا خۆ بۆ دەولەتا ئوسمانی دیارکری سەربەخۆییەکا مەزن د رێڤەبرنا کاروبارێن خۆیێن ناڤخۆییدا هەبوو، میرگەها بادینان ل ئامێدیێ یەك ژ ڤان میرگەهان بوو، ل دووف (قانوونامە)یا سەردەمێ سولتان سلێمانێ قانوونی (١٥٢٠-١٥٦٦) ئەو حکومەتێن کوردان (مفروزة القلم و مقطوعة القدم) ئانکو کریارێن رووپیڤی و توومارکرنێ یێن دەولەتا ئوسمانی ئەنجامددان ژێ وان نەدگرت، و چ بەرپرس یان فەرمانبەرەکێ دەولەتا ئوسمانی ل وان میرگەهان نەبوو و هەموو داهاتێ وان ژێ هەر بۆ وان دهاتەترخانکرن، بنێرە: Orhan kilic، Yurtluk- Ocaklik ve Hukumet Sancaklarri Uzerine Bazi Tespitler.، OTAM.Sayi. 10، Ankara 1999، s 120.

٢. فاضل مهدي بيات، الدولة العثمانية في المجال العربي (بيروت- مركز دراسات الوحدة العربية- ٢٠٠٧) ص ص ٢٩٥- ٢٩٦.
Gokhan Cetinsaya،Ottoman Administration of Iraq 1890-1908(London- Routledge- 2006) pp.6- 10.

٣. جميل موسى النجار، الادارة العثمانية في ولاية بغداد من عهد الوالي مدحت باشا الى نهاية الحكم العثماني ١٨٦٩- ١٩١٧ (بغداد- دار الشؤون الثقافية-٢٠٠١) ص ١٢٧.

٤. بۆ پتر پێزانینان ل دور جوداهیا مووچەیان ل دووف پولێنکرنا یەکەیێن کارگێرێن دەولەتا ئوسمانی، بنێرە: غانم علي محمد، النظام المالي العثماني في العراق ١٨٣٩- ١٩١٤م، رسالة ماجستير- كلية الاداب-جامعة الموصل-١٩٨٩، الملحق رقم (٢).

٥. بیات، ژێدەرێ بەرێ، بپ٣٩٢، Mehmed Hursid ..Pasa..Seyahatname-I Hudud، Cevrimyazi: Alaatin Eser، (Istanbul- Simurg- 1997) ss.218،232.

٦. Cetinsaya، op.cit،p.6.

٧. سالنامه (دوليت علية عثمانية)، ١٢٧٤هـ ، ١٢ دفعه (استانبول- تقويم خانه عامره ده طبع اولنمشدر-١٢٧٤هـ) ص ١١٣.

٨. سالنامه (دوليت علية عثمانية)، ١٢٨٦هـ ٢٤ دفعه (استانبول- دار الطباعة العامرة- ١٢٨٦ هـ) ص ٢٠٣.

٩. سالنامه (دوليت علية عثمانية)، ١٣٠٥هـ قرق اوجنجى دفعه (در سعادت- محمود بك مطبعه سى -١٣٠٥ هـ) ص٥٣.

١٠. موصل ولايتى ايجون ايكنجى دفعه اوله رق ترتيب اولنان سالنامةدر، ١٣١٠هـ/١٨٩٢م، ترتيب ايدن حسن توفيق (موصل ولايت مطبعه سى- ١٣٣٠هـ) ص١٣٩.

١١. موصل ولايت سالنامه رسميسيدر ١٣٣٠هـ دفعه ٥ (موصل ولايت مطبعه سى- ١٣٣٠هـ/ ١٩١٢م) ص ص ١٩٥، ٢٠٢، ٢٠٩ و ٢١٧.

١٢. موصل ولايتى سالنامه رسميسى ١٣٢٥هـ سنه سى، دفعه ٤، ترتيب ايدن صفوت (موصل- مطبعه ى ولايت- ١٣٢٥هـ) ص ٢٠٦.

١٣. سالنامة ولاية موصل الموصل لسنة ١٣٣٠هـ/ ١٩١٢م، ص ص ١٩٥، ٢٠٩، ٢٧٦ و ٢٧٨.

١٤. مختارات من كتاب الموصل و كركوك في الوثائق العثمانية، ترجمة و تعليق خليل علي مراد (السليمانية- مطبعة شفان- ٢٠٠٥) ص ص٢٥- ٢٧.

١٥. سالنامة ولاية الموصل لسنة ١٣٢٥، ص ٧٧، ٢٠٢ ؛ سالنامة ولاية الموصل لسنة ١٣٣٠هـ ص ص ١٩٠- ٢١٤.

١٦. سالنامة ولاية الموصل لسنة ١٣٢٥، ص ص ١٩٤- ٢٠٣.

١٧. علي،ژێدەرێ بەرێ، پاشبەند (٢).

١٨. Stanford J Shaw &Ezel Kural Shaw ، History of the Ottoman Empire and modern Turkey ، vol. 2 ،(U.KCambridge University Press- 2002) p.89.

١٩. الدولة العثمانية، الدستور، ترجمة: نوفل نعمة الله نوفل (بيروت- المطبعة الادبية- ١٣٠١ هـ) المجلد الاول، ص ١٨٩.

٢٠. هەمان ژێدەر، بپ ٣٨٩- ٣٩٠.

٢١. هەمان ژێدەر، بپ ٤٠٧.

٢٢. كاميران عبدالصمد الدوسكي، بهدينان في اواخر العهد العثماني ١٨٧٦-١٩١٤، (دهوك-مطبعة خاني- ٢٠٠٧) ص ٢٠١.

٢٣. النجار، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٩١.

٢٤. بير دى فوصيل، الحياة في العراق منذ قرن ١٨١٤- ١٩١٤م، ترجمة اكرم فاضل (بغداد- ١٩٦٨) ص ٦١.

٢٥. Cetinsaya ، op ، cit ، pp. 83- 84.

٢٦. ناڤێن كەسێن ل قەزايێن بادينان ب ئەركێ قائيمەقاميێ رابووين ژ گەلەك بەرپەرێن جوداێن سالناميێن دەولەتا ئوسمانی و سالنامێن ويلايەتا مووسلێ دا هاتینە. دا كو پشتی پەراوێزان ب هژمار و بەرپەرێن سالنامەيان گران نەبیتن مە ب باش زانی ئاماژە ب وان ژێدەران بكەين يێن ئەو ناڤە كۆمكرين و يێن د واندا نەهاتين لێ زێدەكرينە، ئەو ژێدەر ژى: د. عبدالسلام رؤوف، الاسر الحاكمة و رجال الادارة و القضاء في العراق في القرون المتاخرة (بغداد- دار الحكمة للطباعة و النشر- ١٩٩٢)ص ص ٢١٣، ٢١٦، ٢١٩، ٢٢١؛ نسيبة عبدالعزيز عبدالله الحاج علاوي، الادارة العثمانية في ولاية الموصل، ١٨٧٩، رسالة ماجستير، كلية الاداب- جامعة الموصل، ٢٠٠٢م، ص ص ٤١، ٤٤، ٤٧، ٥٠، ٥٧ ؛ الدوسكي، المصدر السابق، ص ص ٢٠١- ٢٠٣، ٢٠٥، ٢٠٧- ٢٠٨.

٢٧. الدستور، المجلد الاول، ص ٤٠٧ ؛ عبدالعزيز محمد عوض، الادارة العثمانية في ولاية سورية١٨٦٤- ١٩١٤ (مصر- دار المعارف- ١٩٦٩) ص٩٩.

٢٨. ژبۆ ميلاكێ دەستەكا دارايى ل قەزا ئامێدیێ بنێرە: موصل ويلايتى سالنامە سى ١٣١٢هـ دفعة ٣، ترتيب ايدن مكتوبي ولايت صادق افندي (موصل- ولايت مطبعە سى ١٣١٢هـ) ص ١٤٩ ؛ سالنامات ولاية الموصل لسنة ١٣٢٥هـ ص ١٩٥ ؛ وسالنامة ولاية الموصل لعام ١٣٣٠هـ ص ٢٠٥. بۆ ئەركێ باجوەرگرى (تحصيلدار) بنێرە: الدستور، المجلد الاول، ص ٤٠٩.

٢٩. موصل ويلايتى ايجون برنجى دفعة اولە رق ترتيب اولنان سالنامە در ١٣٠٨هـ سنە سى (١٨٩١م)، ترتيب ايدن حسن توفيق (موصل- ولايت مطبعە سى- ١٣٠٨هـ ص ص ١٠٨- ١٠٩، سالنامات ولاية الموصل لعام ١٣١٠هـ ص ص ١٥٦- ١٥٧، و لعام ١٣١٢هـ ص ص ١٥١- ١٥٢ ؛ و لعام ١٣٢٥هـ ص ١٩٧ ؛ و لعام ١٣٣٠هـ ص ص٢١٢- ٢١٣.

٣٠. سالنامات ولاية الموصل لعام ١٣٠٨هـ ص١١٥ ؛ و لعام ١٣٢٥هـ ص ٢٠١ و لعام ١٣٣٠هـ ص ١٩١.

٣١. Cengiz Eroglu ve digeri ، Osmanli Vilayet Salnamelerinde Mosul ،Ikinci Baski (Ankara- Golbal Strateji Enstitusu- 2008) ss. 253، 272، 304، 335، 367.

٣٢. بۆ نموونە بنێرە سالنامێن ويلايەتا مووسل يێن ساليێن ١٣٠٨ مش، بپ ١٠٨، ١١٠، ١١٥، ١٢١؛ و سالا ١٣١٠مش، بپ ١٥٦، ١٥٨- ١٥٩، ١٦٥- ١٦٦، ١٧٣؛ و يا سالا ١٣١٢مش، بث ١٤٨- ١٤٩، ١٥١، ١٥٣، ١٥٦؛ و يا سالا ١٣٢٥مش، بث ١٩٧، ١٩٤، ٢٠١؛ و يا سالا ١٣٣٠مش، بپ ١٩٠، ١٩٤، ٢٠٤.

٣٣. Eroglu ve digeri ،Adi Gecen Eser، s. 367.

٣٤. هژمارا گوندێن ل هەردو قەزايێن ئاكرێ زێبارا (راكرى) داينە دگەل مولكێن سولتان عەبدولحەميدێ گەهشتبوو ٥٤ گوندان كو دكەفتنە د ناڤبەرا قەزا ئاكرێ و قەزا زێبار يا هەلوەشياى دا، بۆ زانينا ناڤێن وان گوندان بنێرە: مختارات من كتاب الموصل و كركوك.... ص ص ١١٥- ١١٧.

٣٥. سالنامة ولاية الموصل، لعام ١٣١٢هـ ص ١٥٠.

٣٦. الدوسكي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٣٠؛ مختارات من كتاب الموصل و كركوك...... ص ص ١٣٣- ١٣٤.

٣٧. بۆ پتر پێزانينان بنێرە: الدستور، المجلد الاول، ص ص ٤٠٧- ٤٠٩ ؛ النجار المصدر السابق، ص ص ١٩٦- ١٩٧.

٣٨. سالنامة ولاية الموصل، لعام ١٣١٠هـ، ص ١٧٥.
٣٩. بۆ پتر پێزانینان ل سەر ناڤێن رێڤەبەرێن ناحیێن دەڤەرا بادینان بنێرە: سالنامێن ویلایەتا مووسلێ وەك، سالناما سالا ١٣٠٨مش/١٨٩٠ز، بث ١١١ ؛ سالناما سالا ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز، بث ١٦٠، ١٧٤، ١٧٧ ؛ سالناما سالا ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز، بث ١٥٠- ١٥٢، ١٥٤، ١٥٦ ؛ سالناما سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز، بث ١٥، ٢٠٢، ٢٠٤، ٢١٧.
٤٠. سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣٢٥هـ/ ١٩٠٧، ص ١٩٥.
٤١. سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣٣٠هـ/ ١٩١٢م، ص ١٩١.
٤٢. الدوسكي، ژێدەرێ بەرێ، بپ، ٢١٣- ٢١٤.
٤٣. علي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٧ ؛ النجار، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠٠.
٤٤. بۆ پتر پێزانینان ل سەر کارگێریا قەرێن گشتیێن ئوسمانی بنێرە: علي، ژێدەرێ بەرێ، بث ٦٥- ٦٦ ؛ سعيد حمادة النظام الاقتصادي في سورية و لبنان (بيروت- ١٩٣٦) ص ٤٣٤ ؛ فلاديمير لوتسكي، تاريخ الاقطار العربية الحديث، ترجمة العفيفة البستاني (موسكو- دار التقدم- ١٩٧١) ص ص ٣٨٤- ٣٨٥.
٤٥. بۆ پتر پێزانینان ل سەر سازیا رنجی بنێرە: الكسندر اداموف، ولاية البصرة في ماضيها و حاضرها، ترجمة هاشم صالح التكريتي، ج١ (البصرة- مركز دراسات الخليج العربي- ١٩٨٢) ص ص١١٦- ١١٩.
٤٦. سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣١٢هـ/ ١٨٩٤م ص١١٠ ؛ سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣٢٥هـ/ ١٩٠٧م، ص ١٩٤.
٤٧. سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣٢٥هـ/ ١٩٠٧م، ص ١٩٥.
٤٨. سالنامة ولاية الموصل لعام لعام ١٣٠٨/ ١٨٩٠م، ص١٠٩ ؛ سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣١٢هـ/ ١٨٩٤م، ص ١٥٢.
٤٩. سالنامة ولاية الموصل لعام لعام ١٣٠٨هـ/ ١٨٩٠، ص ١١٦ ؛ و لعام ١٣١٢هـ/ ١٨٩٤م، ص ١٤٧ ؛ و لعام ١٣٢٥هـ/ ١٩٠٧م، ص ٢٠٢.
٥٠. Eroglu ve digeri، Adi Gecen Eser، ss 253، 272،304، 335، 367.
٥١. دەربارەی لقێ کارگێریا قەرێن گشتی و سازیا ریجی بنێرە: علي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٦، ٧٠.
٥٢. علاوي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٨.
٥٣. سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣٠٨هـ/ ١٨٩٠م، ص ١١٥.
٥٤. سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣٢٥هـ/ ١٩٠٧م، ص ١٩٤.
٥٥. سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣٣٠هـ/ ١٩١٢م، ص ١٩٨.
٥٦. الدستور، المجلد الاول، ص ٤١٥.
٥٧. هەمان ژێدەر، بپ ٤١٥- ٤١٦ ؛ النجار، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢٦ ؛ علاوي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٨- ٦٩.
٥٨. عبدالرحن عبدالله محمد الصراف، النظام القضائي في الموصل في العهد العثماني الاخير ١٢٤٩- ١٣٣٧ هـ/ ١٨٣٤- ١٩١٨م، (بغداد- مركز الدراسات و البحوث الاسلامية- ٢٠٠٩) ص ص ٤٩- ٥٢.
٥٩. بۆ پتر پێزانینان ل سەر (قانووننامە)یێ و چاوانیا وی ل دەولەتا ئوسمانی بنێرە، خليل علي مراد، تاريخ العراق الاداري و الاقتصادي في العهد العثماني ١٨٣٦- ١٧٥٠، رسالة ماجستير، كلية الاداب- جامعة بغداد- ١٩٧٦، ص ص ٢٥٣- ٢٥٩.
٦٠. Avi Rubin، Ottoman Nizamiye Courts: Law and Modernity (U.S.A- Palgrave Macmillan-2011)p.32.
٦١. Eroglu ve digeri، Adi Gecen Eser، ss 386- 387.
٦٢. الصراف، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٧- ١٠٨.
٦٣. هەمان ژێدەر، بپ ١١٠، ١١٦- ١١٧ ؛ Rubin، op. cit، p ٣٢- ٣٣.
٦٤. سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣٣٠ه/ ١٩١٢م، ص ص ١٩٠، ٢٠٤، ٢١٢؛ ERoglu ve digeri، Adi Gecen Eser، s367.
٦٥. بۆ نموونە بنێرە سالنامێن ویلایەتا مووسل یێن سالا ١٣٠٨مش/ ١٨٩٠ز، بپ ١٠٨، ١١٦ ؛ سالا ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز، بپ ١٥٦، ١٧٤ ؛ سالا ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز، بپ١٤٦، ١٥٢ ؛ سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز، بپ ٢٠١ ؛ ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز، بپ ١٧٤، ١٩٠، ١٩٨، ٢١٢.
٦٦. Eroglu ve digeri، Adi Gecen Eser، ss 272، 304.

٦٧. دەربارەی ناڤێن گەلەك ژ وان ئەوێن ئەركێ مفتیێتیێ ل قەزایێن دهۆك، ئامێدیێ، ئاكرێ گرتیەدەست و ناڤێن وان د سالنامێن ویلایەتا مووسلێ دا هاتی بنێرە: الدوسكي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠٢، ٢٠٦، ٢٠٧.
٦٨. لمى عبدالعزيز مصطفى عبدالكريم، الخدمات العامة في العراق ١٨٦٩ ١٩١٨، اطروحة دكتوراه، جامعة الموصل- كلية الاداب- ٢٠٠٣، ص ص ٤٣-٤٤.
٦٩. هەمان ژێدەر، بپ ١٣٢- ١٣٣ ؛ النجار، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٣١.
٧٠. النجار، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٩٣، ٣٩٥ ؛ عبدالكريم، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٥.
٧١. الدستور، المجلد الثاني، بث ٧١٣- ٧١٥.
٧٢. فاضل بيات، المؤسسات التعليمية في المشرق العربي العثماني: دراسة تاريخية احصائية في ضوء الوثائق العثمانية (استانبول- ارسيكا- ٢٠١٣) ص ١٩٨.
٧٣. هەمان ژێدەر، بپ ٢٠٣، ٢٠٥، ٢٠٩.
٧٤. سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣٣٠هـ/ ١٩١٢م، ص ٢٠٥؛ خليل على مراد و عبدالفتاح علي يحيى البوتاني، بهدينان في سالنامات الدولة العثمانية (اربيل- الاكاديمية الكردية- ٢٠١٣) ص ٤٢.
٧٥. Eroglu ve digeri، Adi Gecen Eser، ss386- 387.
٧٦. مراد و البوتاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٧- ٣٨.
٧٧. هەمان ژێدەر، بپ ٤٩- ٥٠.
٧٨. هەمان ژێدەر، بپ ٦١ ؛ الدوسكي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٣٢.
٧٩. سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣١٠هـ/ ١٨٩٢م، ص ١٣١.
٨٠. سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣١٢هـ/ ١٨٩٤م، ٢٨٦ ؛ و لعام ١٣٢٥هـ/ ١٩٠٧م، ص ٢٠٤.
٨١. الدوسكي، ژێدەرێ بەرێ، ص ٢٣٤.
٨٢. Osmanli Turkiyesinde Ziraat Banksi ve Ziraat Reformu 1908-Donald Quataert، Gelisim Acmaze: 1888، Ceviren، Salih KIS، Turkiyat Arastirmalari Dergisi، Selcuk Universitesi (konya)، Sayi 29 . 2011، s.465.
٨٣. Ayni Eser، s 466.
٨٤. بۆ نموونە بنێرە: سالنامة ولاية الموصل، W ٣٤٨الموصل لعام ١٣١٠هـ/ ١٨٩٢م، ص ١٦٧، و لعام ١٣١٢هـ/ ١٨٩٤م، ص ١٥٤ ؛ الدوسكي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٤٨.
٨٥. Quataert Adi Gecen Eser، s 467.
٨٦. الدوسكي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٤٨- ٣٤٩.
٨٧. دەربارەی شەرەنیخ و ناكۆكیێن عەشیرەتان د وێ قوناغێ دا بنێرە، ژێدەرێ ژوویی، بپ ٩٨- ١١٣.
٨٨. Mehmet Soyturk، (Modern Devlt ve Guvenlik; Fransa، Avustrya، Macaristan ve Osmanli Imparaorlugunda Jandarma Teskilati)، History Studies، International Journal of History Vol. 4، issue 2 ،July- 2012، s. 312
٨٩. النجار، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٥١
٩٠. Cengiz Eroglu ve digeri ، Osmanli Vilayet Salnamelerinde Bagdat (Ankara- Global Strateji Enstitusu – 2006) s. 27.
٩١. النجار، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦٠- ٢٦١.
٩٢. Erik Jon Zurcher، ( The Otomman Conscription System in Theory and Practic 1844- 1918) ، in Arming the state: Military Conscripition in the Middle east and Central Asia 1775- 1925، edited by Arik J. Zurcher ، (London- I.B. Tauris- 1999) pp. 82- 83

٩٣. النجار، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦١.

٩٤. Ahmet Ozcan ((Osmanli Devletinda Jandama Teskilati Kurulmasinin gundem Ilk Defa Gelisi (1839), Tarih Arastrmalar Dergisi, 2013, s.175.

٩٥. النجار، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٨٢- ٢٨٤.

٩٦. Eroglu ve digeri , Osmanli Vilayet Salnamalarinde Mosul , ss 253, 273, 324- 325.

٩٧. Ayni Eser , ss ٢٥٤، ٢٧٤، ٣٢٤.

٩٨. سالنامة ولاية الموصل لعام ١٣٢٥هـ/ ١٩٠٧م، ص ١٧٦. Ayni Eser , ss ٢٧٢.

٩٩. سالنامة ويلاية الموصل لعام ١٣٠٨هـ/ ١٨٩٠م، ص ١١٦، و لعام ١٣١٠/١٨٩٢م، ص ١٦٧ ؛ ، الدوسكي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٤١.

١٠٠. Eroglu ve digeri ,Mosul , ss250, 253-254, 272- 273, 275, 294- 295, 305, 332- 335.

١٠١. رحلة الى كردستان في بلاد ما بين النهرين سنة ١٨٨٥، ترجمة يوسف حبى (اربيل- دار ئاراس للطباعة و النشر- ٢٠٠١) ص ٤٣.

١٠٢. صديق الدملوجي، امارة بهدينان الكردية او امارة العمادية، الطبعة الثانية (اربيل- ١٩٩٩) ص ٧٤.

١٠٣. T. C. Basbakanlik Devlet Arsivleri Genel Mudurlugu , Osmanli Arsiv Daire Baskanligi , Mosul – Kerkuk ile Ilgili Arsiv Belgeleri 1525- 1919 (Ankara- 1993) ss, 147- 150.

١٠٤. بۆ پتر پێزانینان ل سەر جۆرێن باج و خویکان پشتی کو ل نیڤا دووێ ژ سەدساليا نوزدێ هاتینەڤە رێکخستن و چەندینیا داهاتێ وان ل ویلایەتێن بەغدا و بەسرا و مووسلێ بنێرە، علی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٣- ١٢٨.

١٠٥. الدملوجي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٣.

١٠٦. عثمان علی، الكرد في الوثائق البريطانية (اربيل- مؤسسة موكرياني للبحوث و النشر- ٢٠٠٨) ص ١٠٣.

١٠٧. الدملوجي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٣.

١٠٨. Cetinsaya , op. cit , pp. 83- 84.

١٠٩. الدملوجي، دژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٨- ٤٩.

١١٠. عثمان علي، الحركة الكردية المعاصرة: دراسة تاريخية وثائقية (فرجينيا- المعهد العالمي للفكر الاسلامي- الطبعة الثانية- ٢٠٠٨) ص ٢٥٥.

١١١. عبدالمنعم الغلامي، الضحايا الثلاث (الموصل- مطبعة الهدف-١٩٥٥) ص٣٨.

١١٢. بۆ پتر پێزانینان ل سەر هەلویستێ ئیتیحادیان (دەستەکا ئیحاد و تەرەقی) ژ شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی و سێدارەدانا وی ل کانوونا یەکەم ١٩١٤ێ بنێرە: هەمان بنێرە، بث ٣٨- ٥١ ؛ عثمان علی، الحركة الكردية، ص ص ٢٥٧- ٢٦٥ ؛ الدوسكی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٧- ١٧٩.

١١٣. الدملوجي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٣.

# قەزاكانی بادینان لە كۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا

**نووسینی: كیونێ ڤیتال**
**وەرگێران لە فەرەنسی یەوە: د.نەجاتی عەبدوڵلا**

## پێشەكی

ئەم باسە بەشێكە لە كتێبێكی فرەنسی بە ناوی (تركیای ئاسیایی: جوگرافیای كارگێڕی)، كە ساڵەكانی ١٨٩٠- ١٨٩٥ لە پاریس، بە چوار بەرگی گەورە لە نووسینی كیونێ ڤیتال بڵاوكراوەتەوە. ئەم كتێبە باری جوگرافی و ئاماری زۆر وردی لەبارەی سەرلەبەری ویلایەتەكانی ئیمپراتۆریای عوسمانی تێدایە و نووسەرەكەی لە نزیكەوە ئاگاداری ئامارە ڕەسمییەكانی ئیمپراتۆریای عوسمانی بووە و بۆ خۆیشی زۆربەی دەر و ناوچەكانی ئیمپراتۆریای عوسمانی گەڕاوە. كیونێ جوگرافیناسی فرەنسایی لە لایەن حكوومەتەكەیەوە ڕاسپێردرابوو چاودێری برێك لەناوچەكانی ئیمپراتۆریای عوسمانی بكات، لێكۆڵینەوەكانی مەبەستی ئەوەشیان لەبەرچاوگرتبوو توانای دارایی ئیمپراتۆریای عوسمانی دیاری بكەن لە دانەوەی قەرزەكانی.

ئەم كتێبە ژێدەرێكی گەلێك گرینگە بۆ هەر كەسێك بیەوێ لە مێژووی ئیمپراتۆریای عوسمانی بكۆڵێتەوە. بەشی زۆرترینی بەرگی دووەمی ئەم كتێبە كە (٨٧٥ لاپەڕەیە) بۆ ویلایەتە كوردییەكانی ئیمپراتۆریای عوسمانی كراوە و لەم بەرگەدا گەلێك زانیاری و ئاماری زۆر ورد لەبارەی سەرجەم شار و شارۆچكە و هەرێم و ویلایەتە كوردییەكانی عوسمانی لە دوادواییەكەی سەدەی نۆزدەهەم بەدەستەوە دراون، كە بۆ مێژوونووسیی كورد زۆر گرینگ و پڕ بایەخن. لێرەدا ئەوەی تایبەت بە ویلایەتی مووسڵ بۆ قەزا كوردییەكانی سەر بەم ویلایەتە قەزای ئامێدی كە لەكاتی نووسینی ئەم كتێبە سەر بە ویلایەتی وان بووە نووسراوەتەوە دەیكەینە كوردی.

## قەزای دهۆك*

ئەم قەزایە كەوتۆتە باكووری- ڕۆژئاوای مووسڵ، لەنێوان ناوەندیی- قەزایەك هەر بە هەمان ناو و ناوەندی قەزای زاخۆ، كە لە كۆندا بە مانای تەواوی

* Cuinet Vital, La Turquie d›Asie: g⊠ographie administrative, statistique, descriptive et raisonn⊠e de chaque province de ‹Asie-Mineure, Paris, 1890, p :833-836

وشەکە بەشێك بووە لە مەملەکەتی ئاشوور. قەزاکە یەك ناحیە بەخۆوە دەگرێت کە بریتیە لە ناحیەی (میروەسی) (راستییەکەی مزووری یەـو))[1] و سەد و شێست و حەوت (١٦٧) ئاوایش دەگرێتەوە.

دانیشتوانەکەی پانزە هەزار و شەشسەد (١٥,٦٠٠) کەسە. دهۆك ناوەندی قەزایەکە بە هەمان ناو و هەروەها ناوەندی ماموریەتی مالییەی گشتییە.. بەهەمان شێوە دامەزراوەی تووتن ئەویش مامورێکی هەیە. ئەم شارۆچکەیە کەوتۆتە دەروازەی شێوێك کە رێگەی مووسڵ بۆ وان بەوێدا بەناو هۆزە کورد و نەستووریەکان دەربازدەبێ. رووبارێك بەناوی دهۆك یا رێڤارێ (رویباری. و) بەناو شارەکەدا رەت دەبێ، کە ئەمە رێگەی بە دانیشتوانەکەی داوە کە لە کەناریدا باخچە و میوەهاتی لێوە دروست بکەن. بەڵام شوێنەکە پیس و پۆخلە و تەندورست نییە. قەڵایەکی کۆنی بچووکی وێرانکراوە کراوە بە شوێنی قایمقام.

دانیشتوان- دانیشتوانی شارۆچکەی دهۆك بریتییە لە هەزار و حەوسەد و پەنجا ( ١٧٥٠) کەس بەمشێوەیەی خوارەوە:

| موسڵمان | ٧٥٠ کەس |
|---|---|
| مەسیحی | ٥٠٠ کەس |
| جوهی (یهودی) | ٥٠٠ کەس |
| سەرجەم | ١٧٥٠ کەس |

لە دهۆك یەك مزگەوت، یەك قوتابخانەی ئیسلامی لێ یە، دوو خان، دوو بازاری کراوە و چەندین بالەخانەی جوانی لێیە کە هی خاوەندارە مووسڵاوییەکانە.

کەش و هەوا بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی- ئاو و هەوای قەزای دهۆك هێندە ئاووهەواییەکی لەش ساغ نییە، بە تایبەت لەناو ئەو شوێنانەی کە برنج و کونجی لێوە بەرهەم دهێنن. بەشی زۆری خاکی دهۆك زەوی و زارێکی چیاییە. لە بەرزاییەکانی رەزی مێو، زەردەواڵو، دارسێو، خۆخ، دارهەنار، درەختی بەرداری دیکەی لێ چێنراوە. هەروەها تووتن و پەمۆشی لێ دەچێنن، کە بەهەمان شێوە لە پێدەشتەکانیش سەرکەوتوو بووە. جگە لەم چاندانە، برنج، کونجی، گەنم، جۆ و پاقلە و نیسك بەرهەمەیلی نایاب بەدەستەوە دەدەن.

رووبار، چیاکان- چەندین رووبار ئەم هەرێمە ئاو دەدەن کە سەرەکییەکەیان رووباری دهۆکە، کە بەناو ئەم شارەدا دەروات، مەلتای و دێلیب (مالتایێ[2] و دلبێ[3]. و) دەبڕێ و دەروا دەرژێتە ناو دیجلەوە. لقێکی رووباری دهۆك کە پێی دەڵێن شەخینا دەکرێ ئاماژەی پێ بکرێت. هەموو ناوچە چیاییەکە بووەتە سنووری کوردستان و کوردەکان پێی دەڵێن بەختینا[4] (دەبێت بەهدینا بێت. و)، بەڵام ناوێك تایبەت هەیە بۆ بەشێکی ئەم چیایانە ئەویش پێی دەڵێن چیای (جبل الاسود) یا چیای رەش. بەرزترنی لووتکەی بریتییە لە مار یەعقوب (ماریاقو. و) کە لە لێوارەکەی ئاواییکێك بەهەمان ناو هەیە کە دواتر باسی دەکەین.

مالتای- ئەم ئاواییە شارێکی گەورەیە لە یەکەمین سەدەکانی مەسیحایەتی ناسراوە و ئەمە جێگەی ئەوەیە باوەر بکرێت کە ماوەیەکی زۆر پێشتر، واتە هەر لە دەورانی هەرە کەڤناری نەینەوادا، ئەم شارە رۆلێکی گرینگی گێراوە. مالتای بە زمانی کلدانی واتەی چوونەژوورەوە دەگەیەنێت.(راستییەکەی، بەرێز پلاس دەڵێ ئەو شێوەی کە لەم شوێنە دەکرێتەوە یەکێکە لە دەروازە سەرەکییەکانی چوونە ناو کوردستان. پانیەکەشی لەنێوان ١ تا ٣ کیلۆمەترە و بەپێی لێژبوونەوەیەکی زۆر سووك درێژدەبێتەوە تاوەکو دهۆك کە لەوێدا دوای ئەوەی تەسك دەبێتەوە،

١. Mervesi
٢. Malttai
٣. Delleb
٤. Bakhtina

دەرژێتە ناو جەرگەی چیاکان. پاشاکانی نەینەوا و بابل بۆ راکردن لەدەست گەرمای هاوین چوونەتە کەناری گۆڵی وان و بە پێویستییەوە بەشوێن ئەم ئاراستەیەدا رۆیشتوون).

نارسیس، پزیشکی بەناوبانگی کلدانی، خەنیمی ئیفرامی پیرۆز لە هۆنراوە و رەوانبێژی، لە ماڵتای لە دایك بووە.

گورماڤی[٥] (گەرماڤا. و)- هەروەها بە ناوچەیەکیش دەڵێن لەناو چیا نزیك بە دهۆك، کە بەهۆی سەرچاوە ئاوە گەرم و گۆگرداوییەکەوە خەڵکی سەردانی دەکەن.

مار-یەعقوب[٦] - لە ١٥ سەعاتەرێی باکووری مووسڵەوەیە. شوێنی نیشتەنی مسیۆنێرە دۆمینیکەکان بووە و لە ساڵی ١٨٤٧ دامەزراوە. ئاوایی کلدانیی مار—یەعقوب، لە بیست و پێنج ماڵ پێکهاتووە، کە مێژووی دروستکردنەکەی تازەیە. مار-یەقووب کەوتۆتە سەر نیمچە رێگەی سەکۆیەکی بچووك لە قولایی دۆڵێکی گەورە لە دەروازەی چیاکانی کوردستاندا. ئەم شوێنە پێش ساڵی کۆچی دێرێکی راهیبەکانی لێ بووە کە دواتر ناوەکەی بۆ ئاواییەکە ماوەتەوە و ژوورۆچکەکانی، کە بەرد داتاشراون بە ژمارەی ئەو چەند سەدانەی، کە ئێستا وەکو کۆگا یا عەنبار بۆ ئالیك لە لایەن دانیشتوانی ئەم ناوچەیەوە بەکاردەهێنرێن. ناوچەکە لە شوێنە هەرە دلگیرەکانە وەك ئەوەی رابان-هورمز[٧] (پەرستڤان هورمز) و شێخ مەتێیە[٨] .

دێلێب، سمێل، گویرێپانێ (گرێ پانێ[٩]. و)، گوێرمبارەك (گر مبارەك[١٠]. و) ، تەل-گیورگۆر(گرێ گەورێ[١١]. و) ، ناوچەکانی قەزای دهۆکن بریتین لە


TURQUIE D'ASIE

GÉOGRAPHIE ADMINISTRATIVE

STATISTIQUE
DESCRIPTIVE ET RAISONNÉE DE CHAQUE PROVINCE
DE L'ASIE-MINEURE

PAR

VITAL CUINET

TOME DEUXIEME

PARIS
ERNEST LEROUX, ÉDITEUR
28, RUE BONAPARTE, 28
1891

تەپۆلکەی فرە رەهەند کە رۆژێك دێت سەرنجی زانایانی زانستی ئاشووریناسی رابکێشێت.

## قەزای ئاکرێ*

قەزای ئاکرێ یەك ناحیە، کە ئەویش ناحییەی عەشایر ئەلسەبعەیە و هەشتا و یەك (٨١) گوند دەگرێتەوە. لە باکوور بە قەزای زێبار، لە رۆژهەلات

٥. Guermave
٦. Mar-Yacoub
٧. Raban-Hormouz
٨. Cheik-Matte
٩. Guerepane
١٠. Guerembarek
١١. Tell-Guigor

بە قەزای ڕەواندوز، لە باشوور بە قەزای مووسڵ و لە ڕۆژئاوایش بە قەزای دهۆك سنوور دراوە. بۆسەر پێدەشتی ناڤكۆرێ و بۆسەر یەكەمین زنجیرە بەرزاییەكانی كوردستان درێژدەبێتەوە و كەوتۆتە نێوان گۆمەل[١٢] (مەرەم رووباری گۆملە.م) و زێی گەورە[١٣].

ئاكرێ- عەقرە، ناوەندی مەركەزی ئەم قەزایە و نشینگەی قایمقامە و شارێكی بچووكە و كەوتۆتە داوێنی چیایەك بەناوی شیندار[١٤]، كە شوێنێكی دڵگیری هەیە و چەندین دارودرەختی لێ رواوە و چەندین جۆگەلە ئاوی بۆ دەڕوات، كە بوونەتە مایەی بە پیتی خاكەكەی، كە زۆر بە پیت و فەڕە.

دانیشتوان- ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارە چوار هەزار و حەوسەد كەسە، كە بەمشێوەیە:

| موسڵمان | ٤١٥٠ كەس |
|---|---|
| مەسیحی(كلدانی،یەعقوبی) | ٢٥٠ كەس |
| جوهی (یهودی) | ٣٠٠ |
| سەرجەم | ٤٧٠٠ كەس |

قوتابخانە- قوتابخانەكانی ئاكرێ تەنیا سێ (٣) قوتابخانەن، دووان لەوانە هی موسڵمانەكانن، كە یەكەمیان پەنجا (٥٠) قوتابی هەیە و لە لایەن مامۆستایەك كە لە لایەن حكۆمەتەوە دامەزراوە بەرێوەدەبردێت، ئەوی دیكە قوتابخانەی سەرەتایی مزگەوتە، كە سی (٣٠) قوتابی دەگرێتە خۆ. هەرچی سێیەم قوتابخانەیە سەر بە تایەفەی كلدانییەكانە و تەنیا پانزە (١٥) قوتابی هەیە.

سەرجەم: سێ قوتابخانە و نەوەد و پێنج (٩٥) قوتابی، لەوانە هەشتا (٨٠) قوتابی موسڵمان و پانزە (١٥) قوتابیشی كلدانن.

یەعقوبییەكان قوتابخانەیان نییە، بەهەمان شێوە جوهی (یهودی)وەكانیش.

قوتابخانەكانی ناوچە چیاییەكان هەموویان زیاتر سەرەتاییترین قوتابخانەی لەو جۆرەن. خانەی قوتابخانە كلیسەیە. منداڵەكان بە درێژایی دیوارەكە لەسەر حەسیرێك دادەنیشن و مامۆستاكەش لە ناوەڕاست.

گۆزەیەكی گەورەی ئاو دانراوە ، كە كەرەسەی پێویستی یەكەمە لە زستانان و هاوینان.

دوو شێوەیە بۆ وانە وتنەوە هەیە، یەكەمیان بریتییە لەوەی، كە هەموو منداڵەكان لە یەك كاتدا، هەموو منداڵەكان بەیەكەوە بلێنەوە و یەكێك لەوانە پەیڤ بە پەیڤ وانەكە دەڵێتەوە، ڕستە بە ڕستە تا ئەوكاتەی كە وەریدەگرن بە تەواوی. لە میتۆدی دووەمی وانە وتنەوەدا بە وردی و بە دەنگی بەرز وانەكە دەوترێتەوە لە لایەن دوو قوتابی، كە هەر یەكەیان لەوپەری ئەمسەر و ئەوسەری هۆڵەكە دان، داواكاری و وەڵامەكانی بابەتەكە بۆ فێربوون دوبارە دەكرێنەوە و منداڵەكانی دیكە ئەوانیش بە تایبەت بە خۆیانەوە بە گوێگرتن و وتنەوەی وانەكان بە دەنگی تەواو نزم وانەكە دەڵێنەوە. بەمشێوەیە قوتابییەكان دەتوانن فێری بیست تا سی دێر ببن لە ڕۆژێكدا.

باڵەخانە دینییەكان- موسڵمانەكان لە ئاكرێ حەوت مزگەوتیان هەیە، كلدانییەكان یەك كلیسەیان هەیە، كە بە تەواوەتی بووەتە وێرانە و ڕێورەسمی ئایینی خۆیان لە ماڵێكی تایبەتیدا بەڕێوەدەبەن. یەعقوبییەكان قەشەیان نییە، بەڵام جۆرێك لە شاپێل (نوێژخانە) یان ئەشكەوتێكی لە بەرد داتاشراویان هەیە لەسەر شێوەی مەسیحییەكانی سەرەتایی. هەرچی جوهی (یهودی)ەكانە سیناگۆگیان نییە و وەك كلدانییەكان لە ماڵێكی تایبەتدا كۆدەبنەوە.

١٢. Gomal

١٣. Zab

١٤. Chindar لە دەورو وبەری ئاكرێ چیایەك بەم ناوە نییە، ئەو چیایانەی دەوری ئاكرێ یان گرتووە ئەمانەن: سەرێ ئاكرێ، سەرێ سیدانۆك...

ئـەگـەر بمانەوێ بیرۆکەیەکمان لـەبـارەی کلیسایەکی مەسیحی لەناو ئەم چیایانە هەبێ، ئەوا ژوورێکی نزم و تاریک کە دیوارەکانی ناشرین بن بێنە بەرچاوی خۆت، کە تۆز و خۆڵی لێنیشتبێت و لە قولایی ژوورەکەش برێک تابلۆی نارێك بە خراپی بە ناونیشانی ڕووگەکەوە گەیشتوون و لەسەر ئەم ڕووگەیەش خاچێك بە بزمارێك یان پاڵپشتێك بۆ ڕاستراگرتنی کوتراوە. جگە لەوەش، یەك یان دوو وێنەی کۆن و لە قوژنێکیش یان بە پەرش و بلاوی لە ناوەراستدا، کتێبەکانی وێرد خوێندن شێدار و شروکۆن بوون و ڕەق و توند بوون. ئەوە لێرەوەیە ڕەوشـی کلێسە لە زۆریـەی ئاواییەکانی ناوچە چیاییەکان. هەرچی لەبارەی نەستوریەکانیشە، دەبێ زیاد لەوەی لە پێشدا گوترا ئەوە زیادە بکرێت، کە لە قولایی کلێسەدا زنجیرەیەك گۆچانی درێژ لەسەر شێوەی دارشەق دەبینرێن، کە بەشداربووەکان لەکاتی سرووتە ئاینەکان بۆ یاریدەدانیان سوودیان لێوەردەگرن.

دانیشتوان- دانیشتوانی قەزاکە پانزە هەزار (١١٠٠٠) کەسە، کە بەمشێوە دابەش بوون:

| موسڵمان (کورد و هی تر) | ١٠١٥٠ کەس |
|---|---|
| مەسیحی (کلدانی | ٥٠٠ کەس |
| یەعقوبی | ٥٠ کەس |
| جوهی (یهودی | ٣٠٠ کەس |
| سەرجەم | ١١٠٠٠ کەس |

هـەردوو قەزای ئاکرێ و زێبار ئەمڕۆ تاقە یەك ئەبریشە (ئەسقفنشین)ی کلدانییان هەیە، کە دەوروبەری دە (١٠) ئاوایی هەژاری گرینگ دەگرێتەوە و بەناو هەردوو هەرێمەکە بلاوبوونەتەوە. لە کۆندا هەمان ئەو قەزایانە یەك ئەبریشە (ئەسقەفنشین)ی نەستووریيان پێکدەهێنا بە ناوی مەرگە[١٥]. زۆر گەشەسەندوو هەر وەك ئەوەی لەرێگەی مێژووی دێری بێت-هابێ[١٦]، لە لایەن تۆماس مەرگا[١٧] دا دەیبینین. لەم دێرە هێندە بەناوبانگەدا، کە شوێنەکەی کەوتۆتە تەك ئاکرێ، تەنیا چەند کەلاوەیەکی وێرانەی لێماوەتەوە، کە بۆ خەرمان کوتینەوەی دانەوێلە بەکار دێت. ئەم ئەبریشەیە ژمارەیەکی زۆر دێرە دەگرێتەوە، بە تایبەت قوتابخانە بەناوبانگەکان. دانیشتوانە مەسیحییەکان ڕۆژ بەدوای ڕۆژ لەدوای تەنگ پێهەڵچنینیان کە لە لایەن کوردەکانەوە کراونەتە ئامانج، کە ئاغا کوردەکان بە تایبەتی دەیانچەوسێننەوە و هەتا زۆربەی جار لە گوندەکان کە تێیدا دەژین، وەدەریان دەنێن.

ئاوهەوا- ئـاووهـەوای قەزاکە زۆر گـۆڕاوە، لە ئەنجامدا، بەگشتیی تا ڕادەیەك تەندورست نییە.

بەرهەمی کشتوکاڵی- هەموو موسڵمانەکان قەزاکە، کە کەم تا زۆر سەرجەمی دانیشتوانی قـەزاکـە پێکدەهێنن، کشتوکاڵکارن، تەنیا ژمارەیەکیان نەبێ، لەناو شاری ئاکرێ، کە سەرقاڵی قاچاخچێتین- لەنزیك ڕووباری گومەل، دوای ئەوەی پێدەشتی نیڤکەر (ناڤکۆرێ. و) جیدەهێلێ، دەچێتە ناو چیاياکان کە هۆزی گەورەی کوردی مزووریيەکان دەژیـن، ئەم چیایانە دۆڵ و شیوی جـوان دەبـڕن، بەشێوەیەکی جوان درەختەکان چێندراون، هاوسنوور بە گاشەبەردی نشیوی تیژ، سێبەری دارو درەخت، پڕ بووە بە ئاپۆری درەختی میوە، لەوانە ئەوەی باوە، دارتوو، دارهەرمێ، دار هەنجیر، دارگوێز، زەیتوون، دار هەنار و تێکەڵاو بە کێلگەی گەنم، جۆ، سماق و لۆکە چاندن، برنج، تووتن، کە بەرهەمە سەرەکییەکانی ناوچەکەن. دەگمەن نییە گوێت لە دانیشتوانەکە بێت، هەروەها ئەوانەی کە لە دۆڵە هاوسێکانی قەزای

١٥. Marga
١٦. Béit-Habé
١٧. Thomas de Marga

زێبار و لە ویلایەتی وان دا دەژین، کە دەگەڕێنەوە بۆ دۆڵە دەوڵەمەندەکانی بەرواری[۱۸] و ساپنای[۱۹] (سپنە. و) هاوسێیان بلێین، کە وڵاتەکەیان بەهەشتێکە بۆ خۆی و لە هیچ شوێنێك هاوتای نییە، قسەی دیکە لەمشێوەیە.

عەشایر ئەلسەبعە- لەناحیەی ئاکرێ ژمارەیەك هۆز هەن، کە لەناو ئاواییەکانی (گوندەکانی) عەشایر ئەلسەبعە (حەوت هۆزەکە)دا دەژین، دانیشتوانەکەی بە تایبەت خەریکی کشتوکاڵی دانەوێلەن، بەتایبەتی گەنم و جۆ.

بەردەڕەش- ناوەندی قەزای ئەم ناحیەیە، ئاواییەکە، کە نشینگەی مودیرە و بەردەڕەش بەتەواوی بێبەشە لە مزگەوت و قوتابخانە، وەك تەواوی ناوچەکە، لەگەڵ ئەوشدا دانیشتوانێکی ۵۰۰۰ کوردی تێدا دەژیت، کە هەر هەموویان موسڵمانن.

ڕووبارەکان- دوو ڕووباری تا ڕادەیەك گەورە، گۆمل و خازر[۲۰]، قەزای ئاکرێ ئاو دەدەن.

# قەزای زێبار

ئەم دەڤەرە بریتییە لە یەك ناحیە ئەویش ناحیەی شێروانە و هەمووی ٣٦ ئاواییە. لە باکوورەوە بە سنجاقی هەکاری، لە ڕۆژهەلات بە قەزای ڕەواندوز و لە باشوور بە قەزای ئاکرێ و لە ڕۆژئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ قەزای ئامێدی. زێی گەورە بەناو ئەم قەزایەدا دەڕوات تا ئەو جێگایەی کە ئەم ڕووبارە پێنج دەکاتەوە و چیای بەرزبەرزیش دەوران دەوری قەزاکەی داوە.

زێبار وەکو شێروان ناوێکە بە گشتی بەسەر هەموو ئاواییەکانی ئەم قەزایە دەبردرێت، زێبار ناوی دەڤەرەکەیە.

دانیشتوانی قەزاکە. دانیشتوانی گشتیی قەزاکە، کە بریتییە لە ٦٠٠٠ کەس، بەمشێوەیە دابەش بوون

| موسڵمان (کوردی) | ۵٢۵٠ کەس |
|---|---|
| مەسیحی (کلدانی) | ۵۵٠ کەس |
| جوهی (یهودی) | ٢٠٠ کەس |
| سەرجەم | ٦٠٠٠ کەس |

بەرهەمی کشتوکاڵی:- دانیشتوانی قەزاکە بەشێوەیەکی گشتی هەموویان سەرقاڵی چاندنی ترێ، سێو، قەیسی، هەنارن، کەمێکیش گەنم و جۆ و گەنمەشامی، بەڵام بەرهەمی دانەوێلە بەشی پێداویستییەکانی دانیشتوان ناکات و ناچارن لە هەرێمەکانی هاوسێوە هاوردەی بکەن.

دانیشتوانی تاقە ناحیەی قەزاکە گەنم و جۆ ناچێنن، بایەخی زیاتر بە باغەوانیی دەدەن، هەموو چیاییەکان بە ئاردی داربەڕوو تێکەڵاو لەگەڵ گەنمەشامی دەژین.

سەر-ئاگوویی.- سەر ئاگوویی Sar-Agui ناوێکی کوردییە و بە مانای (سەری کانی) دێت و شوێنی نیشتەنی قایمقامە. هەندێکجار ناوی دیکەشی پێی دەڵێن، وەك باراگوریزا Baraguiran و پرا کەپرا-Pira kapra (بیرەکەپرا. و).

ڕووبار.- قەزای زێبار دوو ڕووباری پێدا دەڕووات: ڕاو-کوچكRaou-kojak (ڕووکۆچك)، کە دەڕژێتە ناو سەرووی زێی گەورە، لە نزیك ناوچەیەك بەناوی ڕێزان و هەروەها ڕووباری شێروان.

چیا.- ناوچەی شێروان بە چیایێك دەوردراوە بەناوی ئافراز-کوشووAfrar-Kouchu ، سەری لیرانی -Sari Lirani و سەری مەزنا(مەزنێ.. و)Sari-Mizna .

شوێنەوار.- لەناو زۆربەی ئاواییەکانی قەزای زێبار کەلاوەی شارە کلیسەیی دەبینین کە ژمارەیان نزیکەی ٤٠ دەبێ و بەگوێرەی هەموو شیمانەکان ئەو کەلاوانە دەگەڕێنەوە بۆ یەکەمین دانیشتوانە مەسیحەییەکانی ئەم وڵاتە.

۱۸. Berouari
۱۹. Sapma
۲۰. Ghazir
۲۱. Hézel

## قەزای زاخۆ

ئەم قەزایە كۆتایی باكووری-ڕۆژئاوای ویلایەتی موسڵ پێكدەهێنێت، كە لە هێزبل (هیزل. و) [21]، لقە ڕووباری بچووكی خاپوور لە چوار سەعاتی زاخۆ دەوستێ. ئەم قەزایە یەك ناحیەی هەیە، كە ناحیەی (سلێڤان)ە (سلێڤانەیی. و) و نەوەد و پێنج (٩٥) گوند دەگرێتەوە.

زاخۆ ناوەندی ئەم قەزایەیە، دانیشتوانەكەی دوو هەزار و پێنجسەد (٢٥٠٠) كەسە و بەمشێوەیەی خوارەوە دابەشبوون:

| موسڵمان | ٩٠٠ كەس |
|---|---|
| مەسیحی (كریستیان | ١٠٠ كەس |
| جوهی (یهودی | ١٥٠٠ كەس |
| سەرجەم | ٢٥٠٠ دانیشتوان |

ئەم شارۆچكەیە كەوتۆتە ناو دوورگەیەكی بچووك كە لەلایەن خابووری بچووكەوە پێكهاتووە. لەسەر كەناری ئەم ڕووبارە چاندنی برنج، لۆكە، گەنم، جۆ، گەنمەشامی و سەوزەی لێ دەكرێت.

زاخۆ بارەگای قایمقام و مامووریەتی مالیەی گشتیی و دامەزراوەی تووتنی لێیە- لە نزیك شارۆچكەكە كەلاوەكانی كۆشكێكی بەهێز دەبینرێت، كە جاران بەناو بانگ بووە و گلكۆی لیۆپۆلد سۆلدینی [22]، یەكێك لە دامەزرینەرانی مسیۆنی كوردستانی لێیە.

لە زاخۆ زمانی عەرەبی بازار، كوردیی و كلدانی بازاری یان فەلەیی، زمانی فەلەكان قسەی پێدەكرێت.

دانیشتوانی قەزاكە بە دانیشتوانی ناو ناوەندی قەزاكەشەوە دوانزە هەزارە و دووسەد و سی (١٢٢٣٠) كەسە كە بەمشێوە دابەش بوون:

| موسڵمان (كورد و هی تر | ٨١٥٠ كەس |
|---|---|
| مەسیحی ( كلدانی | ٢٥٠٠ كەس |
| ئاسووری | ٨٠ كەس |
| جوهی (یهودی | ١٥٠٠ كەس |
| سەرجەم | ١٢٢٣٠ كەس |

ئاو و هەوا، بەرهەمی كشتوكاڵی- ئاوو هەوای ئەم قەزایە مام ناوەندی و تەندوروستە. بە زۆری گەنم، جۆ، برنج، تووتن هتد لێ دەچێندرێت. درەختە میوەییەكانی وەك دارهەرمێ، دارقەیسی، دارهەنار زۆر بەچاكی لەناو چیاكان سەوز دەبن و لەوێدا هەروەها بەزۆری گوێزی گاڵ كۆدەكرێتەوە و ڕەزی مێو بەرهەمێكی چاك بەدەستەوە دەدات.

بازرگانی- بازرگانی خوری، خوری مینۆرس و گوێزی گاڵی ئەم هەرێمە بووەتە سۆنگەی چالاكیەكی گەورەی بازرگانی.

نزیك لە قەزای زاخۆ، لە قەزای جەزیرە، چیاكانی هەربۆل [23] یان هاربۆل [24] (هەرەكول) هەن، كە بریتین لە كۆمەڵێكی گەورەی ڕەژووی زەوی تێكەڵاو لەگەڵ قیر كە دەرهێنانی لە دوارۆژ دەبێتە بەرهەمێكی پرفرۆش بۆ وڵات. ئەوە چەند ساڵێكە دەبینین بۆ ماوەیەكی دریژ لەسەر زەوی، لەناو ئەم چیایانەدا برووسكەی شین كە دەپرژێتە سەر شەقارەكانی سەرزەوی و هەمووی پڕ دەكات لە كەرەسەگەلی قیراوی.

لەسەر ڕێگەی كاروانەكان، لە نیو سەعاتە ڕێی زاخۆ، ئاواییەكی بچووكی بیست ماڵی بەناوی (بیدارۆ) [25] (بێدارێ. و) هەیە، كە شوینی نشینگەی ئاسایی ئارشیڤێكەكانی زاخۆیە. لەگەڵ بەرەو پێشەوەچوون بۆ ناو شیوەكە، یەك لە دوای یەك

٢٢. Léopold Soldini (١٧٦٠ - ١٧٧٩)
٢٣. Herbol
٢٤. Harbol
٢٥. Bidaro

ئاوابیەکانی:

بەرسیڤا[٢٦](بێرسڤێ.و)، چێرناز[٢٧]، مەرسی[٢٨] (مێرسیسێ. و)، یاردە[٢٩]، هونا[٣٠]، ئەسناکلی[٣١]، بیلوون[٣٢]، بیجون[٣٣]، مەرگە هتد دەبینرێن، کە کەموزۆر هەموویان ئاوایی مەسیحییەکانن و بەشێوەیەکی نایاب دروستکراون.

کوردەکانی ئەم قەزایە سەر بە دوو هۆزی سندی و سلێڤانی-ین.

چیاکانی جودی، کە لە باکوورەوە حەوزێك دروست دەکەن کە قەزای زاخۆی تێدا هەڵکەوتوو، ئاراراتی وڵاتن. گێرانەوەکانی ناوخۆیی ئەوە دەگێرێتەوە کە لەسەر لووتکەی ئەم چیایە کەشتی نوح نیشتووتەوە. ڕاستییەکەی لەسەر ئەم چیایە لە سەدەی چوارەم، دێرێك هەبوو، کە چ بە لاتینی و چ بە کلدانی پێیان ووتووە دێرەی کەشتی. لە پێدەشتەکەدا بەرەو جەزیرە، شاری کەونارای تومانیۆم دەبینرێت، کە چەندان نووسەر بانگاشەی ئەوە دەکەن لە ئەو هەشت کەسەوە بیناکراوە کە لەناو کەشتیەکە بوون( گوندێك لەم دەڤەرە بە ناوی هەشتییان هەیە بە دووری نابینین هەمان ئەم گوندە بێن کە نووسەر باسی دەکات. م)، چونکە وشەی (تمانی)یش بە عەرەبی بە واتەی هەشت دێت. هەندێکی دیکە ئەوە زیاد دەکەن کەوا پێدەشتی شنگال- سنجار (سەنگارا)ی کۆن، هەر پێدەشتی سێنارە بووە. بیرورا لەبارەی وەستانی کەشتییەکە لەسەر چیاکانی جودی و بنچینەی تومانیۆن (یان پمانیوم) لە لایەن مێژوونووسی عەرەب ئەلمەکین[٣٤](جرجیس بن العمید)، لە سەدەی هەشتەم هاتووە و وادیارە ئەوکات هیچ جیگەی گومان نەبووە.

## قەزای ئامێدی[٣٥]

کەوشەن و سنوور.- قەزای ئامێدی کەوتۆتە باشووری سنجاقی هەکاری. لەباکوورەوە لەگەڵ قەزاکانی چاڵ و ئۆرەمار، لە ڕۆژهەڵاتەوە قەزای شەمدینان، لە باشوورەوە ویلایەتی مووسڵ و لە ڕۆژئاواشەوە لەگەڵ قەزای بەتولشەباب هاوسنوورە.

دابەشبوونی ئیداریی.- لەڕووی ئیدارییەوە ئامێدی دابەشکراوە بەسەر پێنج ناحیە و سێ سەد و شەست (٣٦٠) ئاوایی بەخۆوە دەگرێت.

دەسەڵاتەکان.- دەسەڵاتی کارگێریی لە ڕێگەی قایمقام، یاریدەدەری فەرماندار و پێنج (٥) مودیر، بەڕێوەبەرانی ناحیەکان بەڕێوەدەبردرێت. یەك قەشەی کلدانی لە ئامێدی هەیە.

دانیشتوان.- دانیشتوانی تەواوی قەزای ئامێدی بریتییە لە ٢٣,٩٤٠ (بیست و سێ هەزار و نۆ سەد و چڵ) کەس بەمشێوەیەی خوارەوە:

٢٦. Berseve
٢٧. Cheranaz
٢٨. Maras
٢٩. Yerda
٣٠. Honna
٣١. Esnakli
٣٢. BELLOUN
٣٣. Bedjoun
٣٤. Elmacin
٣٥. قەزای ئامێدی کە جاران سەر بە ویلایەتی مووسڵ بوو، جارێکی دیکە لە نوێوە بەم ویلایەتە (ویلایەتی وان ن.ع) بەسترایەوە.

| تورکی عوسمانی | ٨٦٠ کەس |
|---|---|
| کورد | ١٣,٦٨٠ کەس |
| ڕەعیەتکەلی نەستووری | ٣,٠٠٠ |
| کلدانی | ٣,٠٠٠ |
| جوهی (یهودی) | ١,٩٠٠ |
| ئێزیدی | ١,٥٠٠ |
| سەرجەم | ٢٣,٩٤٠ کەس |

ناوەندی قەزا.- ئامێدی، ناوەندی-قەزایە و شوێنی نشینگەی ڕەسمیی قایمقام، یاریدەدەری فەرماندار و بارەگای چەندین داوەزگای هەمەچەشنەی گشتییە، دادگەی بیدایەت (دادگەی سەرەدەمیی) و دادگەی شەریعەت (قانوونی ئیسلامی)، - ئەسقەفییەکی کلدانی لێیە و مسیۆنی باوکە دۆمینیکەکان لە مووسڵ، کە هاتوون هاوین لەوێدا بەسەر بەرن، بارەگەی گشتیی مەفرەزەیەکی پیادەی نیزامی (سوپای کارا) و دەستەیەکی چکۆڵەی زەپتییە[٣٦] (ژاندەرمری) لێیە، - شارێکی چکۆڵەیە کەوتۆتە سەر بانێکی بەپێت، بەرزاییەکەی نزیکەی ٤٠٠ مەتر دەبێ، بەسەر دۆڵێکی جوان، پڕ دار و درەخت، فێنك و پڕ لە دارستان و ڕەز و باغ، کە ناو و ناوبانگی بەناو هەمووو وڵاتدا ڕۆیشتووە.

دانیشتوان.- دانیشتوانەکەی، لەناو ئەو ژمارە دایە، کە لەسەرەوەدا لەناو ژمارەی سەرجەمی قەزاکەیە ڕاگەیەندرا، دانیشتوانەکەی ٥,٠٠٠ (پێنج هەزار) کەسن بەمشێوەیە:

| تورکی عوسمانلی (کارمەند و ئۆردو) | ٤٠٠ کەس |
|---|---|
| کورد | ٢,١٠٠ کەس |
| کلدانی | ٦٠٠ |
| جوهی (یهودی) | ١,٩٠٠ |
| سەرجەم | ٥,٠٠٠ کەس |

شوورەکانی قایمکاری، مێژووەکەی کۆنە، بەڵام تا ڕادەیەك باش ماونەتەوە، بە شوورەکەیەوە هەموو فلاتی شارەکەی بەخۆوە گرتووە. دەرگایەك ڕووی لە شارەکەیە کە لەوێدا هیچ باڵەخانەیەکی گشتی لێ نییە جگە لە کۆناك[٣٧] یان سەرای حکوومەت و بازاڕ، بە لق و چڵەدار سەربانیان گیراوە و لە هەشتا (٨٠) دوکان پێکهاتوون. گەرما لە ماوەی هاوین لەناو شاردا زۆر بەرزە و لەوانەیە لەگەڵ پلەی گەرمای مووسڵ بەراورد بکرێت، بەڵام زستانان تێیدا زۆر فێنکە، هەرگیز بەفری تێدا نابینرێت. بەم شێوەیە دانیشتوانی ئامێدی تەنیا ئەم وەرزەی کۆتایی نەبێ تێیدا ناژین. هاوینان شارەکە چۆل و هۆڵە، تەنیا بازرگان و جوهی (یهودی)ەکان تێیدا دەمێننەوە. دەسەڵاتکاران خۆشیان و ئۆردووی شارەکە لە سەرما لەناو دۆڵەکە، لەناو باخچەکان جێنشین دەبن، مانەوەیەکی ئاوەها دڵگیر وەك ئەوەی ئامێدی کە لەوکاتە ئامێدی دڵنشین نییە.

ئەم شارە لە ١٥٠ کیلۆمەتری باشووری شاری وان، ناوەندی ویلایەت دایە، لە ٦٥ ی کلۆمەتری جولەمێرگ، ناوەندی سنجاق و لە ٨٠ کیلۆمەتری باکووری موسڵ دایە. پێوەندییەکانی بەزۆری ئەو پەیوەندییانەن، کە هەموو ساڵێك لەڕێگەی کاروان، لە پاییزان لەگەڵ باش قەلا (باشکالا و. وەرگێر) دایە کە ئەو شارە دوورابیەکەی ١٢٥ کیلۆمەتری دووری نێوانییانە.

بەرهەمە سەرەکییە کشتوکاڵییەکانی قەزای ئامێدی، هەروەها ئەو بەرووبوومانەی کە لە دارستانەکان دەچندرێنەوە، دەگوێزرێنەوە و بەو کاروانانە دەفرۆشرێن لە بازاڕی باش-قەلا، یەکێك لەو بازاڕانەی، کە زۆر لە لایەن بازرگانە رووس و ئێرانییەکان سەردانی دەکرێت. ئەو بازرگانانەی دوایی (ئێرانییەکان) بەتایبەتی زۆر بە دوای مێوژی ئامێدی، هەروەها هەنجیری وشك، هەنار، هەنگوین، سماق، گوێزی گاڵ و کاڵای دیکەدا دەگەڕێن.

٣٦. zaptiés

٣٧. Konak

قەزای ئامێدی، ئەوەیش بە نزیکەیی بە هەمان ئەندازە پێدەشتی بەپیتی تەواو ئاودراو و چیای داپۆشراوی هەیە بە دارستانی جوان، هەروەها گەنم، جۆ، گەنمەشامی، هەرزن، برنج بەرهەم دەهێنێت. داری زەیتوون و دار توو تێدا گەشە دەکات، بەهەمان شێوە باهیڤ، خۆخ، دار قەیسی، زەردئاڵو و ئالو، هەرمێ و داری سێو. لۆکە و تووتنێك كە زۆر خواستی لەسەرە لە ئێران بەرهەم دەهێنێت. ئاماژە بەوە دەکرێت کە دانیشتوانی قەزاکە تەواو ملکەچن بۆ حکوومەت و بەوەی بە رێك وپێکی باجی خۆیان دەدەن.

## زێدەر:


- Cuinet Vital, La Turquie d›Asie، géographie administrative, statistique, descriptive et raisonnée de chaque province de ‹Asie-Mineure, Paris, ١٨٩٠, p :٨٤٢-٨٤٦
- Cuinet Vital, La Turquie d›Asie، géographie administrative, statistique, descriptive et raisonnée de chaque province de ‹Asie-Mineure, Paris, ١٨٩٠, p :٨٣٩-٨٣٨
- Cuinet Vital, La Turquie d›Asie، géographie administrative, statistique, descriptive et raisonnée de chaque province de ‹Asie-Mineure, Paris, ١٨٩٠, p :٨٣٨-٨٣٦
- Cuinet Vital, La Turquie d›Asie، géographie administrative, statistique, descriptive et raisonnée de chaque province de ‹Asie-Mineure, Paris, Tom ١٨٩١ ,٢, p : ٧٦٠-٧٥٨

# كاودانێن رەوشەنبیری ل میرگەها بەهدینان

**د.عەبدولرەحمان مزوری**
**ئەندامێ كارایێ ئەكادیمیا كوردی**

## بەراهییەكا مێژوویی:

ب هزرا ئبن فەزلوللا ئەلعومەری (١٣٠١-١٣٤٩ز) بەرێ بنواشا میرگەها بەهدینان ل ئامێدیێ، مرۆڤەكێ دبێژنێ عومەرێ كورێ عەلی دانایە. پشتی وی كورێ وی حاجیێ كورێ عومەر فەروەری وەرگرتییە، فەروەریا وی تاسالا ٧٤٠ك/١٣٣٩ز كێشایە. هەیامەكێ پشتی وی (عیمادەدین، ناسناڤە) ئیسماعیل كورێ مەجلی كورێ موسا كورێ بەهائەدین فەروەری وەرگرتیە[١].

ابن ناظر الجیش، عەبدولرەحمان كورێ محەمەد ئەلحەلەبی، خودانێ پەرتووكا (تثقیف التعریف بالمصطلح الشریف) نێڤبەرا ٧٠٩-٧٧٨ك/١٣٠٩-١٣٧٦ز، ل رێڤەبەریا (دیوان الانشاء) ل وەلاتێ مسرێ كارمەندبوو. نڤێسییە، نامەیێن خودانێ (میرێ) ئامێدیێ یێ نهو (سال نه دیارە)، عیمادەدین ئیسماعیل كورێ مەجلی كورێ موسا گەهشتن. بەری وی كورێن حاجیێ كورێ عومەر بوون. نامەیێن وی حاجیێ كورێ عومەر سالا ٧٤٠ك خودانێ (میرێ) ئامێدیێ گەهشتن (وكان بها اولاد حاجي بن عمر، ووردت مطالعته كذلك، حاجي بن عمر صاحب العمادية في سنة اربعين وسبعمائة)، ٧٤٠هـ[٢].

زانیارێن ئبن فەزلوللا ئەلعومەری و ابن ناظر الجیش سەبارا سەردەمێ میراتیا حاجی كورێ عومەر ئێك دگرن، ئەڤە ژی پڕ گرنگە، چمكی هەڤچاخێن وان بویەرا بوون. دیسان سەبارا میرێ پشتی حاجی، عیمادەدین (ناسناڤێ وی یە) ئیسماعیل كورێ مەجلی كورێ موسا كورێ بەهائەدین ئێك دگرن.

قەلقەشەندی زانیاریێن ئبن فەزلوللا ئەلعومەری وابن ناظر الجیش بۆ پەرتووكا خو ڤەگوهاستینە، نڤێسیە: حاجی بن عومەر سالا ٧٤٠هـ(١٣٣٩ز) خودانێ ئامێدیێ بوو. پشتی وی فەروەری كەتە دەستێن كورێن وی[٣].

د شەجەرەكێ دندا ل سەر میرێن ئامێدیێ، كو ل سەردەمێ بەهرام بەگێ دا(١٦٧٩-١٦٨٢ز) دەسەدسالییا هەڤدێ زاینیدا هاتییەنڤێسین[٤]، ئورگینالا وێ دپەرتووكخانا هێژا محەممەد شوكری موفتیێ ئامێدیێ دا هاتییەدیتن[٥]. تێدا هاتییە:

میر هاجی (حاجی) ومیر ئیسماعیل كورێن میر مەجلی كورێ عەلائەدین، میر هاجی یە(حاجی یە) ئامێدیێ ژمەلك طاوی ستاندی ومیراتی لێكری. دوڤدا میر ئیسماعیل، پاشی میر بەهائەدین... هتد، فەروەری گێڕایە[٦].

وەسا دیارە ئەڤە دارا درستا میرێن ئامێدیێ یە.

بەرپەرەك ژ دارا بنەمالا میرێن ئامێدیێ ل سەر دەمێ بەهرام بەگێدا هاتییە نڤیسین، ژ پەرتووکخانا موفتیێ ئامێدیێ محەمەد شکری ئەفندی


وامير هاجي وامير اسماعيل كانا ابني امير يحيى ابن امير علاء
الدين والذي اخذ العمادية من ملك التتاري هو امير هاجي
وتولى الامارة بها ثم بعده تولى الامارة امير اسماعيل ثم الى امير
بهاء الدين ثم الى محمد ثم الى امير زين دين ثم الى امير بهاء الدين
ثم الى امير سيف الدين ثم الى ابنه حسن بك سبعون سنة ثم الى اخيه سلطا
حسين ثم الى ابنه ابنه سلطان شهرين ثم الى حسن بك المذكور ثم
الى ابنه سلطان حسين ثم الى ابنه قباد بك ثم الى ابنه سيد خان بك ثم
الى ابنه مراد خان شهرا ثم الى اخيه سلطان حسين ثم الى اخيه عبدال
خان ثم الى اخيه حسن بك ثم الى اخيه سلطان حسين ثم الى ابنه سلطان
حسين ثم الى اخيه قباد بك ثم الى اخيه عثمان بك ثم الى ابن اخيه
بهرام باك

مخابن هنەك ژ پێشـیـیا وێ کێمە، زانیارێن وێ دگەل زانیارێن ئبن فەزلوللا ئەلعومەری، ابن ناظر الجیش و قەلقەشەندی ئێك دگرن.

میرێن ئامێدیێ ئەوێن ناڤێن وان بەری سالا ٧٤٠ك/١٣٣٩ز هاتین، نە جهێ باوەرێ نە. بەلگە وژێدەرێن مێژوویی پشتەڤانییا هەبوونا وان ناکەن.

میرگەهـا ئامێدیێ دسەدسالییا چاردێ زاینیدا، ل سەر دەستێ حاجیێ کورێ عومەر هاتییەئاڤاکرن، تا سالا ١٢٥٨ك/١٨٤٢ز درێژی کێشایە. دڤێ سالێدا هێزێن میرێ ئامێدیێ سماهیل پاشایێ دووێ، د

شەڕێ گوندێ (هێتیت)دا نێزی دهۆك، بەرانبەر هێزێن ئوسمانلی، ب قومانداریا محەمەد پاشا ئینجە بایرەقدار شكەستن[٧].

فەروەریا میرگەها بەهدینان نێزی٥٠٠ سالا كێشایە، تێدا بیست وشەش میران فەروەری گێڕایە، مینا مێژووڤان ئەنوەرێ مایی نڤێسی[٨]، بیست وچاران مینا عەباس ئەلعەزاوی نڤێسی[٩]. هەتا مرۆڤ بارێ چاند وروەوشەنبیریا میرگەها بەهدینان چاك بزانیت، پێدڤی بە هنەك ل سەر ڤێرگەهێن دینی بێن وی سەردەمی هاتینەئاڤاكرن، پەرتووك ونامیلكێن تێدا هاتینەنڤێسین، زانایێن تێدا دەرس ووانە دخاندن، هۆزانڤان و هزرڤانێن ژ وان ڤێرگەهان پێدگەهشتن، پەرتووك ونامیلكێن دپەرتووكخانێن وان ڤێرگەهاندا، یان دمالێن تایبەتیێن زانا وهزرڤانادا خرڤەدبون... هنەك راوەستین.

لەوان مە بابەتێ خۆ هۆسان دابەشكر :

ئێك: ڤێرگەهێن دینی (مزگەفت) ل میرگەهێ.

دو: زانا و هزرڤانێن میرگەهێ.

سێ: نڤیسەر و هۆزانڤانێن میرگەهێ.

چوار: پەرتووكخانێن میرگەهێ.

## ئێك : ڤێرگەهێن دینی (مزگەفت) ل میرگەهێ:

ئاشكارە میرێن بەهدینان گەلەك ڤێرگەهێن دینی ل باژێرك و گوندێن میرگەهێ، بۆ بەلاڤكرنا زانست وزانینێ، ئاڤاكربون. پێدڤی بە بێژین هەر ڤێرگەهەكا پەرتووك یان نامیلكە تێدا نە هاتبنەدانان ونڤێسین، ڤێرگەهەكا خرشە، رۆلێ خۆیێ چاندی نەدیتیە، لەوان دێ ب پشت گوهڤە هێتەهاڤێتن .

### ١. ڤێرگەها عومەرانی/ عومەرانیە :

یاقوت ئەلحەمەوی نڤێسیيە، عومەرانیە كەلهەكە وگوندەكێ مەزنە ب تەنشت شوشێ ڤە، رۆژهەلاتێ مووسل[١٠]. گەلەك پەرتووك دسەدساليیا هەڤدێ زاینیدا ل ڤێ ڤێرگەهێ هاتینەنڤێسین، ئەوێن گەهشتینە مە، وەك پەرتووكا: (التصریح بمظمون التوضیح یاخالد الازهری)، هێژا محەمەد عەبدولباقی ئەلدوستەكی سالا ١٠١١ك/١٦٠٢ز نڤێسیيە. پەرتووكا: (شرح التصریف العزی یاسەعدەدین ئەلتەفتازانی)، ئەڤە ژی ب خەتێ دوستەكیێ ناڤبری سالا ١٠٣٧ك/١٦٢٧ز هاتیەنڤێسین. پەرتووكا (شرح المیبدی (الامیر حسین) علی هدایە الحكمة فی المنطق، هێژا مەلا سلێمانێ زێباری سالا ١٠٥٠ك/١٦٤٠ز نڤێسیيە[١١].

### ٢. ڤێرگەها شابانیێ :

شابانیێ كەلەكا مێژوویی یە، دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ باتوفا، دەڤەرا زاخۆ. ناڤێ وێ دسەدساليیا چاردێ زاینیدا ل جەم ئبن فەزلوللا ئەلعومەری (٧٠٠-٧٤٩ك/١٣٠٠-١٣٤٨ز)، ئانكو دسەردەمێ كەڤنترین میرێ ئامێدیێدا حاجیێ كورێ عومەر، ئەوێ سالا ٧٤٠ك/١٣٣٩ز فەروەری دگێڕا، خۆش تێ[١٢].
ژ پەرتووكێن ل ڤێ ڤێرگەهێ هاتینەنڤیسین وەك دەستنڤیسا حوسێن كورێ خالدێ سندی، تێدا هنەك بویەرێن مێژوویی یێن دەڤەرا بەهدینان سالا ١٠٠٠ك/١٥٩١ز ل سەردەمێ سۆلتان سەیدی خان (١٥٨٥-١٦٢٩ز) توومارکرینە. لبەك ژێ دپەرتووكخانا تایبەتا هێژا (ئەحمەد ئەلبەغدادی) دا، ل بەغدا هەیە[١٣]. پەرتووكا: فرائض منهج الطلاب یازەكەریا كورێ محەمەد ئەلئەنساری، ب خەتێ ئیسماعیل سالح ومحەمەد خۆشناو، سالا ١٠١٩ك/١٦١٠ز هاتیەنڤێسین [١٤].

### ٣. ڤێرگەها قوبەهان:

سۆلتان حوسێنێ وەلی (١٥٣٤-١٥٧٦ز) ل رووباری ژێریا كەلا ئامێدیێ ئاڤاكرییە[١٥]. ب ئاخفتنەكا دن ئەڤ ڤێرگەهە دسەدساليیا شازدێ زاینیدا هاتیەئاڤاكرن و ڤەكرن[١٦]. نەمازە مێژووڤان ئەنوەر مایی دبێژێ، سەردەمێ سۆلتان حوسێن سەردەمێ زێرینێ میرگەها بەهدینان بوو[١٧]. ب هزاران پەرتووكێن دەستنڤیس دپەرتووكخانا وێدا هەبوون،

وەك پەرتووكا: (المفصل في صناعة الاعراب) یا جارەللا ئەلزەمەخشەری، دسەدسالییا هەژدێ زاینیدا هاتییەنڤێسین. پەرتووكا: (تفسير سورة الفاتحة) یا مەلا مەحمود ئەلكوردی ئەلبەهدینی، دیسان دسەدسالییا هەژدێدا هاتییەنڤێسین ... هتد[18].

هنەك ڤەكۆلەران نڤێسیە، پێوەندیێن چاندی وزانستی دنیڤبەرا فێرگەها قوبەهان ومزگەفتا ئەزهەر ل قاهیرە هەبوون[19]. لێ مخابن نە ئەوان ژێدەرێن خو نڤێسینە، نەمە ژێدەرێن جهێ باوەریێ ل سەر ڤێ چەندێ دیتن .

ژپەرتووكێن ل فێرگەها قوبەهان هاتینەنڤیسین وەك: (المفضل في صناعة الاعـراب) یاجارەللا ئەلزەمەخشەری، مەلا عەلی كورێ سەید تاها سالا ١١٩٢ك/١٧٧٨ز، ل سەردەمێ سماهیل پاشایێ ئێكێ نڤێسیە. (علم الكلام) نڤێسەرێ وێ نە هاتییەزانین، خودانێ وێ شێخ تاهر ئەلخالدی ئەلنەقشەبەندی ئەلرادەكی یە، بابیرێ شێخ بەهائەدینێ نەقشەبەندیێ بامەرنی، سالا ٩٦٢ه/١٥٥٤ز ل فێرگەها قوبەهان هاتییەنڤێسین[20]. پەرتووكا (الحاشيه طجك على شرح الشمسيه) یاسەید شەریف (ناڤەكی یە)، سالا ٩٦٢ك/١٥٥٤ز، حەسەن كورێ عەبدوللا ئەلجەلی ل ڤێ فێرگەهێ نڤێسیە.

پەرتووكا: (كتاب روزنامه الاشهر بالعربيه والتركيه)، مەلا عەبدوللا كورێ مەلا ئەحمەدێ مامیسیێ رێكانی ژ تركی وەرگێڕایە فارسی، سالا ١١٩٢ك/١٧٧٨ز ل فێرگەها قوبەهان نڤێسیە، دەسنڤیسا وێ ژ ٢٣ بەرپەڕان پێكهاتییە، لبەك ژێ دپەرتووكخانا ئەندازیار بلند محەمەد شوكری دا ل ئاكرێ هەیە[21].

## ٤. فێرگەها مزگەفتا مەزنا ئامێدیێ:

ئەڤ فێرگەهە پشكەك بوو ژ مزگەفتا ئامێدیێ . وەسا دیارە سوڵتان حوسێنێ وەلی دەمێ مزگەفتا ناڤبری نوكری و منارا وێ بلندكری[22]، ئەڤ فێرگەهە ژی ل ئالێ راستێ مینبەرا وێ زێدەكر. ژ پەرتووكێن ل ڤێ فێرگەهێ هاتینەنڤێسین وەك :

پەرتووكا: منهاج العابدين یا ئەبو حامد ئەلغەزالی، ب خەتێ ئەبوبەكر كورێ داوود، سالا ٩٩٦ك/١٥٨٧ز هاتییەنڤێسین [23].

## ٥. فێرگەها مزگەفتا مەزنا ئاكرێ :

ب هزرا داوود ئەلجەلەبی سوڵتان حوسێنێ وەلی (١٥٣٤-١٥٧٦ز) ئەڤ فێرگەهە ئاڤاكرییە[24]. ژ زانایێن دەرس لێ گوتین وەك: مەلا محەمەدێ كورێ حەسەنێ زیارەتی، دسەدسالییا هەژدێدا ژیایە، سالا ١٧٨١ز چوویەبەر دلوڤانییا خودێ. مەلا جەرجیسێ كورێ محەمەدێ ئاكرەیێ (ئەربیلی ومووسلی)، دسەدسالییا هەژدێدا ژیایە، سالا ١٧٩٢ز چوویەبەر دلوڤانییا خودێ[25]. ژ پەرتووكێن لێ هاتینەنڤێسین وەك:

پەرتووكا: تنبيه الغافلين یائەبو ئەللەیس (ابو الليث) ئەلسەمەرقەندی، ب خەتێ حەیدەر كورێ حاج عەلی ئەلمەكی، سالا ٩٧٦ك/١٥٦٨ز هاتییەنڤێسین. پەرتووكا: شرح الجزريه في التجويد یامحەمەد عیسام ئەلشەتی، ب خەتێ ئەحمەد (ناڤەكی) خەلكێ گوندێ (بلێ) سالا ١١٩٢ك/١٧٧٨ز هاتییەنڤیسین[26]. پەرتووكا: حاشية السيوطي على الفية ابن مالك، ب خەتێ سالح كورێ شێخ جبرائیل، سالا ١١٩٨ك/١٧٨٣ز، ل سەردەمێ فەروەریا فەتحوللا كورێ عەبدولرەحمان بەگێ هاتییەنڤێسین. لبەكا دەستنڤێسا وێ دپەرتووكخانا ناڤەندا ئەوقافا مووسلێ دا هەیە. پەرتووكا: الرياض لاعدام الامراض یاعەلی كورێ ئوسمان ئەلفرغانی ئەلئوشی، ب خەتێ نەسر ئەلباشقالی ئەلعەقری ل مزگەفتا ئاكرێ سالا ١١٩٧ك/١٧٨٢ز هاتییەنڤێسین[27].

## ٦. فێرگەها مایێ:

گوندێ مایێ دكەڤیتە دەڤەرا بەرواری ژوریا، شەش كیلومەتران نێزی سنورێ نیڤبەرا تركیا وعیراقێ. ئەڤ فێرگەهە میرێ ئامێدیێ قوباد بەگ كورێ سوڵتان حوسێنێ وەلی، دسەدسالییا شازدێ زاینیدا

ئاڤاکرییە[٢٨]. ڤێ داویێ رەوشەنبیریا وێ ل سەردەمێ شێخ تاها عەبدولرەحمان مایی وبرایێ وی محەمەد تاهر عەبدولرەحمان مایی گەش و برسقی. مخابن پرانیا دەستنڤیسێن وێ بێن کەڤن ل سالا ١٩٢٤ ژ لایێ هێزێن تیاریان وئنگلیزی ڤە هاتنەسوتن[٢٩]. ژ پەرتووکێن ل ڤێ فێرگەهێ هاتینەنڤیسین وەك:

پەرتووکا: المختصر في العقائد والالهيات یا ئەلسوبحانی، ب خەتێ عەبدولقادر کورێ مەلا عومەر بێدوهیێ مایی، سالا ١١٩٠ك/١٧٧٦ز هاتییەنڤیسین. لبەك ژێ دپەرتووکخانا ئەندازیار بلند محەمەد شوکری ئاکرەیی دا هەیە[٣٠].

## ٧. فێرگەها بریفکا:

بریفکا گوندەکێ مزوریانە سەر ب دەڤەرداریا ئەتروش. ئەڤ فێرگەهە میرێ ئامێدیێ سەیدی خان (١٥٨٥-١٦٢٩ز) دسەدسالیا هەڤدێ زاینیدا، بۆ شێخ شەمسەدینێ ئەخلاتیێ قوتب ئاڤاکرییە. ژ خویندکارێن ناڤدارێن وێ شێخ نورەلدینێ بریفکی یە، ئەوێ نێڤبەرا ١٢٠٧-١٢٦٨ك/١٧٩٢-١٨٥١ز) ژیای. ژ پەرتووکێن زانایێن ڤێ فێرگەهێ نڤیسین وەك :

پەرتووکا ارشاد السالكين فى طريق العارفين یاعەبدولحەمید کورێ شەمسەدین کورێ ئەحمەدێ بریفکی، سالا ١٢٥٩ك/١٨٤٣ز نڤیسی، ئانکو سالەکێ پشتی کەتنا میرگەها بەهدینان هاتییەنڤیسین. دەستنڤیسا ئورگینالا وێ دپەرتووکخانا دار المخطوطات العراقية دا، ل بن نەمرە: ٥٠٠٨ هاتییەپاراستن[٣١]. پەرتووکا: منهاج العابدين یائەحمەد کورێ محەمەدحەسەنێ بریفکی، ژ نەڤیێن شەمسەدینێ ئەخلاتی یە، نڤێسەر سالا ١٢١١ك/١٧٩٦ز دژیانێدا بو. ئانکو دسەدسالیا هەژدێ زاینی دا ژیایە. لبەکا وێ ب خەتێ محەمەد کورێ مەلا عەبدوللا ئەلمەوسلی، سالا ١٢٧٠ك/١٨٥٣ز، ل گوندێ بریفکا هاتییەنڤیسین. دەستنڤیسا وێ دپەرتووکخانا ددار المخطوطات العراقية، نەمرە: ١٧١٧٤ پاراستییە[٣٢]. پەرتووکا: حاشیە محەمەد ئەمین ئەلبریفکی، ناهێتە زانین ئەڤ زانایە کەنگی ژیایە. لێ نڤیسەرێ وێ (ناسخێ وێ) عەبدولحەمید شەمسەدین کورێ ئەحمەدێ بریفکی یە، پەرتووك سالا ١٢٥٩ك/١٨٤٣ز نڤێسیە. بێگومان دانەر (محەمەد ئەمین ئەلبریفکی) بەری هینگێ ژیایە. لبەکا دەستنڤیسا وێ دپەرتووکخانا دار المخطوطات العراقيه، ل بن نەمرە: ١/٥٠٠٨ پاراستییە[٣٣].

## ٨. فێرگەها رەبەتکێ:

رەبەتکێ گوندەکێ مزوریانە دکەڤیتە دەڤەرا بەرواری ژێریا، سەر ب دەڤەرداریا ئەتروشە . فێرگەها وێ میر حەسەن بەگ کورێ میر سێڤدینێ ئامیدی دسەدسالیا شازدێ زاینیدا ئاڤاکریە[٣٤]. ژ پەرتووکێن ل ڤێ فێرگەهێ هاتینەنڤیسین وەك :

**نمونا خەتێ مەلا یەحیا مزووری،د راڤەکرنا ویدا ل سەر هوزانا (موغبەچەیێن مەی فرۆش...) یا جزیری**



(رسالة في أداب البحث)، ب خەتێ محەمەد کوڕێ عەلیێ بەرواری سالا ١١٥٦ک/١٧٤٣ز هاتیبەنڤێسین. (رسالة في علم الهيئة) یامەحمود کوڕێ محەمەد ئەلجەخمینی، ب خەتێ عەلی کوڕێ ئەحمەد سالا ١٢٢١ ک/ ١٨٠٦ز[٣٥].

## ٩. فێرگەها سەیدی خان:

میر سەیدی خان کوڕێ قوباد بەگێ کوڕێ سۆلتان حوسێنێ وەلی سالا ١٠٢٤ک/١٦١٥ز ئاڤاکریە[٣٦]. پشتی هێژا مەلا یەحیا کوڕێ خالدێ مزوری ددەستپێکا سەدسالیا نوزدێدا، ل فێرگەهێ بوویە سەیدا، ناڤێ وێ بۆ فێرگەها نوو (المدرسة الجديدة) هاتەگوهورین. پاشی بو فێرگەها مەلا یەحیایێ مزوری[٣٧]. ژ پەرتووکێن د ڤێ فێرگەهێدا هاتینەنڤێسین وەك :

(الرسالة الحنفية، الرسالة الحاشية)، ئەڤە دو پەرتووکن ژ دانانا عەبدولەتیف کوڕێ ئلیاس کوڕێ شێخ مەحمود، سالا ١٠٧٥ک/١٦٦٤ز نڤێسینە[٣٨]. پەرتووکا: الاعلال یاعەبدوللا کوڕێ ئلیاس ئەلکەلکوری، سالا ١٠٩٩ک/١٦٨٧ز نڤێسیە. پەرتووکا: (حدائق الدقائق) یاتاها کوڕێ موسا کوڕێ شێخ عوبەید ئەلکەلی رمانی سالا ١١٥٨ک/ ١٧٤٥ز نڤێسیە[٣٩]. پەرتووکا: (علم الكلام)، ژ نڤێسینێن عەبدولغەنی ئەلنابلسی ومحەمەد کوڕێ عومەر کوڕێ عەبدولجەلیل ئەلبەغدادییە، ب خەتێ یوسفێ بەنستانیێ رادەکی یە (رێکانی یە)، سالا ١٢٢٦ک/١٨١١ز هاتیبەنڤێسین[٤٠].

ڤەکۆلەرەك ل وێ هزرێ یە جهێ فێرگەها سەیدی خان یاکەڤن، نهو جهێ فێرگەها سۆلاڤا کچانە ل ئامێدیێ[٤١].

## ١٠. فێرگەها موراد خان:

ئەڤ فێرگەهە موراد خان بەگێ ئێکێ(١٦٣٢-١٦٦٢ز) دسەدسالیا هەڤدێ زاینیدا ئاڤاکریە. فێرگەهـ نێزی دەرگەهێ رۆژهەلات، دەرگەهێ زێبار، هاتیبەئاڤاکرن[٤٢] حەیا ڤێ داویێ فێرگەهـ یائاڤابو، موفتیێ ئامێدیێ شوکری ئەفەندی کوڕێ عوبەیدولاهێ ئامێدی، دەرس ووانەیێن دینی تێدا گۆتینە[٤٣]. ژ پەرتووکێن ل ڤێ فێرگەهێ هاتینەنڤێسین وەك :

پەرتووکا: (النكاح في شرح المنهاج)، دبێژنێ (تحفة المحتاج يا ابن حجر المكى الهيتمي)، مەلا عەبدولرەحمان (ناڤەکی) بو سەیدایێ خو فەقی حەجی کوڕێ مەلا محەمەد کوڕێ مەلا ئەحمەدێ بەنستانیێ رێکانی (باڤێ شێخ تاهرێ نەقشەبەندی)، سالا ١١٩٩ک/١٧٨٤ز ل ڤێ فێرگەهێ نڤێسیە[٤٤].

## ١١. فێرگەها مزگەفتا مەزنا دهۆك :

ناهێتەزانین کەنگە ئەڤ فێرگەهە هاتیبەئاڤاکرن، دوورنیە ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان‌دا هاتبیتە ئاڤاکرن، نەمازە ل سەدسالیا هەڤدێ وهەژدێ زاینیدا پەرتووك تێدا هاتینە نڤیسین. کەڤنترین زانایێن دەرس لێگۆتین ناڤێ محەمەد کوڕێ ئەحمەدێ دهۆکیێ کوردی هاتیبە. ناڤێ وی ل سەر دەستنڤیسا: (المقصد في القراءات) وەك خودانێ پەرتووکێ (مالکها) نە نڤێسەرێ وێ، سالا ١١١١ک/ ١٦٩٩ز ل مزگەفتا دهۆك هاتیبە. لبەکا دەستنڤیسا وێ دپەرتووکخانا ئەوقافا سلێمانیێ‌دا هەیە[٤٥]. دیسان پەرتووکا: الفنارى یامحەمەد بن حەمزە ئەلفەناری، ب خەتێ ئەحمەد بن مەلا عەلی باجروری (باجلوری) سالا ١١٣٨ک/ ١٧٢٥ز ل ڤێ فێرگەهێ هاتیبەنڤێسین[٤٦]. ژ زانایێن ناڤدێرێن ڤێ داویێ دەرس ل مزگەفتا مەزنا دهۆك گۆتین، مێژووڤان محەمەد سەعید کوڕێ مەلا یاسینێ بریفکی یە، خودانێ پەرتووکا فضلاء بهدينان[٤٧].

## ١٢. فێرگەها گەلیێ رمان:

گوندێ گەلیێ رمان زۆر نێزی بریفکایە، دکەڤیتە باکوڕێ وێ ب دو کیلومتران، ئەڤ فێرگەهە شێخ ئەحمەدێ گەلیێ رمانی، ئێك ژ نەڤیێن شەمسەدینێ ئەخلاتی، دسەدسالیا هەژدێدا

ئاڤاکریە[٤٨]. شێخ ئەحمەد سالا ١١٥٠ك/١٧٣٧ز چوویەبەر دلوڤانییا خودێ. ل ڤێ فێرگەهێ پەرتووکا: ملخص علم الهيئة یا مەحمود ئەلجەخمینی، ژ لایێ عەبدولقەهار (ناڤەکی) سالا ١١٩٢ك/١٧٧٨ز هاتییەنڤێسین[٤٩].

## ١٣. فێرگەها ئەتروش:

ئەتروش کەڤنترین دەڤەرداریا پارێزگەها دهۆکە، سالا ١٨٥١ز یابویە دەڤەرداری (ناحیە)[٥٠]. ل سەردەمێ میرێ ئامێدیێ بەهرام پاشایێ مەزن (١٧٣٢-١٧٦٨ز) دسەدسالییا هەژدێدا، ١١٧٥ك/١٧٦١ز فێرگەهەکا زانستێن دینی، دگەل تەکیەکا سۆفیان لێ هاتنەئاڤاکرن[٥١]. لووکا زانستییا ڤێ فێرگەهێ گەلەك دەنگ ڤەدا پشتی زانایێ ناڤدێر مەلا یەحیایێ مزوری (١٢٥٤ك/ ١٨٣٨ز مربیە) دەرس لێ گۆتین. دیسان پشتی هێژا عەبدولحەمید خان خەلیفە و زاڤایێ شێخ نورەدینێ بریفکی، فێرگەها بریفکا هێلای و ل ئەتروش ئاکنجیبوی[٥٢]. هێژا محەمەد ئەلکەزنی نڤێسیە، شێخ نورەدینێ بریفکی پشتی سالا ١٢٣٩ك/١٨٢٣ز هەیامەکێ ل ئەتروش ژیایە[٥٣]. ئەڤە بۆچونەکا نەبەر ئەقلە، چمکی بریفکی تا سالا ١٢٤٣ك/١٨٢٧ز ل گوندێ (هێتیت) ژیایە، ژێ دوور نەکەتییە. پاشی ئەو وبرایێ خو محەمەد ئەمین ژ ئەگەرا بەلاڤبوونا کولا رەش (طاعونێ) ل دەڤەرێ، مالا خو دبەنە بریفکا. ئەڤ چەندە دێ درێژکێن داهاتیدا پتر هێتە روونکرن. دبە بریفکی ب سەرەدان چوبیتە جەم کچا خۆ (فاتمایێ) و خەلیفە و زاڤایێ خۆ شێخ عەبدولحەمید خان ئەتروشی[٥٤]. ل گوندێ ئەتروش هۆزانەك یان نامەیەك نڤێسیبیت، جهـ و رێکەفتا نڤێسینێ دانابیت، لەوان (ئەلکەزنی) دبێژێ ل وێرێ ژیایە!

ژ پەرتووکێن ل ڤێ فێرگەهێ هاتینە نڤیسین وەك:

پەرتووکا: (شرح المحرر) یاعەبدولکەریم ئەلرافعی، ب خەتێ مەحمود ئەورامی بن ابی الغار، سالا ١٠٧١ ك/١٦٦٦ز نڤێسیە، پەرتووکا: (شرح نظم الكافى) یاعەبدوللا کورێ محەمەدێ بێتوشی، ب خەتێ حسێن بن درباس ئەلرەبەتکی، سالا ١١٧٩ك/ ١٦٧٤ز هاتییەنڤێسین[٥٥].

## ١٤. فێرگەها هێتیت:

هێتیت گوندەکە جاران پێنج کیلومتران دکەفتە رۆژهەلاتێ دهۆکێ، نهو بویە پشکەك ژ بازێری. ناهێتەزانین ئەڤ فێرگەهە کەنگی هاتییەئاڤاکرن. شێخ نورەدینێ بریفکی ژ زاروکینیا خو تاسالا ١٢٤٣ك/١٨٢٧ز لێ ژیایە. دڤێ سالێدا ئەو وبرایێ خۆ محەمەد ئەمین ژ بەر بەلاڤبونا کولا رەش، مینا دسەرمەرا بوری، چوونە بریفکا[٥٦]. ئەوی گەلەك بەرهەمێن خو ل هێتیت نڤێسینە، ل گوور زانینا مە (حەفت) پەرتووکێن خو ل وێدێ نڤێسینە، وەك پەرتووکا: (نظم الدرر لاسماء النبى المفتخر)، سالا ١٢٣١ك/١٨١٥ز نڤێسیە[٥٧]. پەرتووکا: (تعليقات على القصيدة البائية المسماة بكرب الحال من ذى الجمال والجلال)، سالا ١٢٣١ك/١٨١٥ز نڤێسیە، لبەك ژێ دپەرتووکخانا شێخ مەمدوح بریفکی دا ل دهۆك هەیە. پەرتووکا: (ابراز دقائق الحقائق فى شرح القصيدة الحائية)، سالا ١٢٣٣ك/١٨١٧ز نڤێسیە. پەرتووکا: (شرح القصيدة الهمزية)، سالا ١٢٣٦ك/١٨٢٠ز نڤێسیە. ئەڤ پەرتووکە ب خەتێ شێخ نورەدینی، ل پەرتووکخانا (دار المخطوطات العراقية) دا، ل بن نەمرە: ١٩٩٧٦ پاراستیە. پەرتووکا: (ذخره السالكين)، سالا ١٢٣٦ك/١٨٢٠ز نڤێسیە، لبەك ژی دپەرتووکخانا شێخ مەمدوح بریفکی دا ل دهۆك هەیە. پەرتووکا: (البدور الجلية)، ئێك ژ پەرتووکێن هەرە گرنگێن وی یە، هەمو ل هێتیت دنێڤبەرا ١٢٣٠-١٢٣٨ك/١٨١٤-١٨٢٢ز نڤێسیە. لبەکا دەسنڤێس دپەرتووکخانا نەڤیێ وی ئەندازیار مەئمون نور محەمەد بریفکی دا هەیە. پەرتووکا: حجة اللهجة، سالا ١٢٣٩ك/١٨٢٣ز نڤێسیە، لبەکا دەسنڤێس دپەرتووکخانا تەکیا تالەبانیان دا ل کەرکوك هەیە. پەرتووکا: (الظروف) یامەلا یونسێ ئەرقەتینی، ب خەتێ محەمەد ئەمین کورێ مەلا محەمەد، ل فێرگەها هێتیت سالا ١٢١٢ك/١٧٩٧ز هاتییەنڤێسین[٥٨].

## دو.زانا و هزرڤانێن میرگەهێ

ئاشكاره فێرگەهێن دینی یێن مە هژمارتین، کوومەکا زانایێن مەزن وهزرڤانان دسەردەمێ میرگەها بەهدینانێدا پێگەهاندینە. هەر زانایەکێ خرشێ بێ بەرهەم، چ پەرتووك، نامیلکە ونڤێسار ... نە نڤێسیبن، دێ دڤێ ڤەکۆلینێدا ب پشت گوهڤە هێتەهاڤێتن.

### ١. عەبدولرەحمانێ کواشی:

کەلا کواشێ دکەڤیتە زنجیرا چیایێ سپی هنداڤی دەشتا سلیڤانەیا، ئێکەمین جار مێژووڤان ئبن ئەلئەسیری (١١٦٠-١٢٣٢ز) ناڤێ وێ بریيە[٥٩]. گوندێ کواشێ دکەڤیتە ژێریا کەلێ، ئاشكاره کەلێ ناڤێ خو ژناڤێ گوندی وەرگرتییە. کواشی پەرتووکا: خصوص الحکم نڤێسیە، سالا ٨٠٦ك/١٤٠٣ز چوویەبەر دلوڤانییا خودێ[٦٠].

### ٢. محەمەد کوڕێ ئەحمەدێ گرگاشی:

ئەڤ زانایە بێ (کوولە) ناڤدارە، نێڤبەرا ٦٨٣-٧٤٣ك/١٢٨٤-١٢٤٢ز ژیایە. ژ بەرهەمێن وی: کتاب الزیج والهیئة[٦١].

### ٣. حەسەن کوڕێ نوحێ قومریێ بەرواری :

دسەدسالییا پازدێ زاینیدا ژیایە. ژ بەرهەمێن وی پەرتووکا: مصطلحات الطب. سالا ٨٦٢ك/١٤٥٧ز چوویەبەر دلوڤانییا خودێ[٦٢].

### ٤. شێخ محەمەدێ خورکی:

خورکی گوندەکێ مزوریانە، سەر ب دەڤەرداریا ئەتروش. ژ بەرهەمێن وی: رسالة فی الحساب، پەرتووکا: الزیج والهیئة، پەرتووکا: الاسطرلاب. سالا ١٠٦٠ك/١٦٥٠ز چوویەبەر دلوڤانییا خودێ[٦٣].

### ٥. عەبدولرەحمان کوڕێ عیماد ئەلدینێ ئامێدی:

دسەدسالییا هەڤدێدا ژیایە. ژ پەرتووکێن وی : الری الصادی فی فتاوی العمادی. دەسنڤێسەکا وێ دپەرتووکخانا ئەوقافا مووسل دا هەیە، ب خەتێ محەمەد بن حەسەن ئەلئوستەوانی، سالا ١١٠٤ك/١٦٩٢ز هاتییەنڤێسین. ئامێدی سالا ١٠٥١مش/١٦٤١ز چوویەبەر دلوڤانییا خودێ[٦٤].

### ٦. عومەر کوڕێ ئەحمەدێ چەلیێ مایی:

ئەڤە باپیرێ مەزنێ هۆزانڤان بەهائی یە (شێخ تاها عەبدولرەحمان مایی)[٦٥]. دسەدسالییا هەڤدێدا ژیایە، ١٠٤٥-١١٢٢ك/١٦٣٥-١٧١٠ز. ژ بەرهەمێن وی، وەك: حاشیە علی البهائیە فی الحساب، ئەڤە دەهمەنن ل سەر پەرتووکا: الخلاصة في الحساب یابەهائەدین محەمەد کوڕێ حەسەن ئەلعاملی. لبەکا دەسنڤێسا وێ دپەرتووکخانا ناڤەندا ئەوقافا مووسل دا هەیە، سالا ١١٣٩ك/١٧٢٦ز هاتییەنڤێسین[٦٦]. پەرتووکا: حاشیە علی الحاشیە فی الاداب، لبەکا دەسنڤێسا وێ دپەرتووکخانا ناڤەندا ئەوقافا مووسل دا هەیە. لبەکا دن ب خەتێ هەیبەتوللا کوڕێ محەمەد سەعید میهری نەڤیێ مەلا یەحیایێ مزوری یە، سالا نڤێسینێ ناهێتەزانین، دپەرتووکخانا نەڤیێ مزوری، ئەندازیار بلند محەمەد شوکری ئاکرەیی دا هەیە. پەرتووکا: فی علم الکلام ب زمانێ عەرەبیە، دەسنڤێسە ب خەتێ هەیبەتوللا موفتی یە، دهەمان پەرتووکخانا (ئاکرەیی دا) هەیە. هنەك تێبینی (تعلیقات) ل سەر پەرتووکا: اشکال التأسیس فی فن الهندسە، ل سەر تێبینی یان نڤێسیە: لابن ئەلمائی ئەلجەلی. دەسنڤێسە ب خەتێ هەیبەتوللا موفتی کوڕێ محمد سەعید میهری یە، سالا ١٣٢٢ك/ ١٩٠٤ز هاتییەنڤێسین، لبەکا دەسنڤیسا وێ دپەرتووکخانا ئەندازیار بلند محەمەد شوکری ئاکرەیی دا هەیە[٦٧].

### ٧. محەمەدێ شەرانشی:

گوندێ شەرانش دکەڤیتە دەڤەرا سندیا، ژووریا زاخۆ. نێڤبەرا ٩٨٨-١٠٦٠ك/١٥٨٠-١٦٥٠ز ژیایە، ئانکو دسەدسالییا هەڤدێدا ژیایە[٦٨]. ژ پەرتووکێن وی: تعلیقات علی کتاب الجامی، کتاب شرح الشمسیة[٦٩]، حاشیە علی شرح الجرجانی علی

الرسالة الوضعية، لبەکا دەسنڤیس ژ ڤێ پەرتووکا داوێ دپەرتووکخانا ناڤەندا ئەوقافا مووسل دا هەیە [٧٠].

## ٨. مزوری باڤێ ئیسحاق:

هێژا د.مەسعود کتانی ناڤێ وی هۆسا نڤێسییە[٧١]. دوورنیە ناڤێ وی ئیبراهیم بە، دبێژن ئیبراهیم پێغەمبەر دو کوڕ هەبون، ئیسحاق و ئیسماعیل. دسەدسالییا هەڤدێ زاینیدا ژیایە، پرانییا ژیانا خو ل مزگەفتا نەبی جەرجیس ل مووسل بریەسەر. ژ بەرهەمێن وی: پەرتووکا حاشية على شرح الشمسية یا قطب ئەلدین ئەلرازی، حاشية على شرح العقائد النسفية یاسەعەدئەلدین ئەلتەفتازانی. سالا ١٠٩٤ك/١٦٨٢ز چوویەبەر دلوڤانییا خودێ [٧٢].

## ٩. حوسێنێ شیفکی:

شیڤکێ گوندەکێ مزوریانە، دکەڤیتە دەشتێ، رۆژهەلاتێ قەسروکێ ل سەر رووبارێ خازرێ. دژێدەراندا ناڤێ شیڤکی (حەسەن) ژی هاتییە[٧٣]. ب هزرا من (حوسێن) راسترە ژ بەر:

أ‌- ڤەکۆلەران حەمدی عەبدولمەجید ئەلسەلەفی وتەحسین ئیبراهیم ئەلدۆسکی ناڤێ وی (حوسێن) دانایە[٧٤]، هەردو دبەیاڤێ کەلەپۆرێ کوردیدا دمەلەڤانن.

ب ـ د فەروزەکا ویدا (حاشیەکا ویدا) ل سەر فەتوایەکا شێخ الاسلام ئەبو ئەلسعود ئەلعمادی ناڤێ وی حسێن شیڤکی هاتییە[٧٥].

ناڤێ شیڤکی د پەرتووکا : اليمانيات المسلولة دا یازەینولعابدین کوڕێ یوسفێ گورانی هاتییە، ئەڤ پەرتووکە سالا ١٠٦٦ك/١٦٥٥ز هاتییەنڤێسین.

سالێن زێد ومرنا شیڤکی ناهێنەزانین. ب مگرتییەکا مەزن دسەدسالییا هەڤدێ زاینیدا ژیایە، ژ بەر:

ئێك. نڤیسەرێن پەرتووکا : عقد الجمان ، ڤێ بۆچوونێ د چێترینن.

دو. محەمەد ئەلبەرقەلعی خودانێ پەرتووکا: كلمات في مذهب الطائفه اليزيديه، دسەدسالییا شازدێدا ژیایە. لەوان فەروزا (حاشیا) شیڤکی ل سەر پەرتووکێ پشتی هنگی هاتییەنڤێسین، دوورنیە دسەدسالییا هەڤدێدا هاتبیتەنڤێسین.

ژ پەرتووکێن وی : شرح ديباجه المحرر في الفقه یا عەبدولکەریم بن محەمەد ئەلرافعی ، پەرتووکا: حساب الفرائض ، فتوى في حكم البيع والكنائس في الاراضي الاسلامية[٧٦].

هنەکان نامیلکا: رساله في بيان الطائفه اليزيديه، فەتوایەکە دژی ئێزدیان، ژ دانانا وی زانییە[٧٧].

لێ راستیا ڤێ بوچوونێ تونە. ناڤێ نامیلکێ (فەتوایێ) یێ درست: كلمات في بيان مذهب الطائفة اليزيدية وحكمهم وحكم الاموال الكائنه بايديهم. ئەڤە فەتوا ئەبولسعود ئەلعیمادی یە، ئەحمەد کوڕێ مستەفای[٧٨]، ئەوێ سیهـ سالان ٩٥٢-٩٨٢ك/١٥٤٥-١٥٧٤ز، بوویە شێخولئیسلام وموفتیێ دەولەتا ئوسمانلی[٧٩]. نڤێسینێن محەمەد ئەلبەرقەلعی، سالح ئەلهەکاری، حسێن شیڤکی، عەبدوللا ئەلرەبەتکی ... هەموو تێبینینە (تەعلیقاتن) ل سەر.

## ١٠. مەلا مەحمودێ کوردیێ ئامێدی:

دنێڤبەرا ١٧١٩-١٧٨٧ز ژیایە، ل سەردەمێ بەهرام پاشایێ مەزن موفتیێ ئامێدیێ بوو. پەرتووکەك ب زمانێ عەرەبی، ل سەر تەفسیرا سۆرەتێ (الفاتحة) هەیە، هەمی پەیڤێن وێ دبێ نوقطە بون. لەوان خودانێ پەرتووکا: غاية المرام نڤێسیە: ئەڤە تشتەکێ پر ئەنتیکەیە[٨٠].

## ١١. مەلا یەحیایێ مزوری:

یەحیا کوڕێ خالدێ کوڕێ حوسێنێ بالەتەیی. خوندکارێ وی ئیبراهیم فەسیح ئەلحەیدەری دبێژتێ: زانایێ زانایان، زەریا بێ کنار وهەمو زەریا ب کنارن....

پێڤە دچن ودبێژن: مزوری پشتی ژین وی بوویە نێزی سەدسالان، چوویەبەر دلوڤانییا خودێ[٨١]. شێخ عبدالرزاق البیطار دبێژتێ (علامە الدنیا علی الاطلاق والدین، حجة الاسلام والمسلمین)[٨٢]، ئانکو: زانایێ گش دین ودنیایێ، ژێدەرێ مووسلمانان وئیسلامێ.

ژ بەرهەمێن وی وەك پەرتووکا: ثمانی نصائح[٨٣]، پەرتووکا: حاشیة علی تحفه ابن حجر المکي الهیتمي[٨٤]، پەرتووکا: شرح المسائل الحسابیة فی أخر خلاصة الحساب، پەرتووکا: حاشیة علی شرح عصام الدین علی الرسالة الوضعیه[٨٥]، پەرتووکا: حاشیه علی کتاب الارشاد[٨٦]، رسالة حول بعض نقاط التفسیر والمفسرین، مقالة في مناسك الحج[٨٧].

سەبارا مرنا مەلا یەحیای ژێدەر ئێك ناگرن. عبدالرزاق البیطار د(حلیه البشر)دا، جـ٣ ب١٥٨٨، سالا ١٢٤٥ك دانایە. خلیل مردم بك د(اعیان القرن الثالث عشر)دا، سالا ١٢٥١ك دانایە. عباس العزاوی د(تاریخ العراق بین احتلالین)دا، جـ٧ ب٣٢، ٣٨، د.یحیی الجبوری دتوژاندنا (المسك الاذفر)دا، ب٣١٧، سالا ١٢٥٢ك دانایە. انور المائی د(الاکراد فی بهدینان)دا، ب٨٠ سالا ١٢٥٣ك دانایە. حسین حزنی موکریانی د(مێژووی میرانی سۆران)دا، ب١٢٤، سالا ١٢٥٤ك دانایە. محمد سعید البریفکانی د(فضلاءبهدینان) دا، ب٧٠، محفوظ العباسی د(امــاره بهدینان العباسیه)دا، ب١٧٤، سالێن ١٢٤٩ك، ١٢٥٥ك دانانە. د.سعید محمد احمد د(مدرسه قبهان)دا، ب٢٠٣، سالا ١٢٥٥ك دانایە. دبێژم مەلا یەحیا سالا ١٢٥٤ك چوویەبەر دلوڤانییا خودێ، ب ڤان بەلگەیێن ژێری:

١. نەڤیێ وی محەمەد سەعید میهری کورێ عەبدولرەحمان کورێ مەلا یەحیای، ددەستنڤیسا دیوانا خودا (ب١١)، سالا ١٢٥٤ك دانایە، ب تەنشتێڤە ب حسابا ئەبجەدی ژی ئەڤ نیڤ مالکە بو ڤەهاندیە (وزر یحي ببغداد)، دبیتە ١٢٥٤ك. ئاشکارە ئەو سەبارا مرنا باپیرێ خو ژ خەلکێ دن شەرەزاترە.

٢. هەڤال وهەڤچاخێ مەلا یەحیای، شێخ ئیسماعیل بەرزنچیێ کونەکووتری، هۆزانەك ب مرنا مزوری ڤەهاندیە، دمالکا داویێدا، مرنا وی ب حسابا ئەبجەدی دیارکرییە، دبێژێ:

**سئلت عن اهل الفضل قلت مؤرخا**
**بکوا بعد یحیی لیس للفضل والد ١٢٥٤ك**

٣. مێژووڤان حسین حزنی موکریانی سالا ١٢٥٤ك راست ژتگرتیە[٨٨].

دپەرتووکا (مدرسه قبهان فی العمادیه)دا هاتییە: مزوری سالا ١٢٥٥ك چوویەبەر دلوڤانییا خودێ. ئەڤە راسترین ڤەگێڕانە، چمکی خوندکارێ وی ئیبراهیم فەصیح ئەلحەیدەری نێزیکترین کەسێ وی بو، ئەوی سەیدایێ خۆ بەری ڤەشێرن، شوشتیە[٨٩].

مرۆڤ وەسا دموڤکا بوری دگەهیت، ئیبراهیم فەصیح خوندکارێ مەلا یەحیای وخودانێ پەرتووکا: عنوان المجد ... سالا مرنا سەیدایێ خو ١٢٥٥ك دپەرتووکا خودا نڤیسیە.

مخابن دو چاپێن پەرتووکا ناڤبری ل بەردەستێ مەنە، تشتێ هوسا تێدا تونە[٩٠]. شێخ عبدالرزاق البیطار کەسێن مەلا یەحیا بەری ڤەشارتنێ شوشتین هژمارتینە، ئەڤەنە: زانایێ مەزنێ خودێ پەرست مەلا حوسێن کورێ مەلا حاجیێ (بالەتەیی)، زانا محەمەد ئەمین کورێ عەبدوللایێ حەیدەری، برایێ وی زانا سالح کورێ عەبدوللایێ حەیدەری[٩١]. ناڤێ ئیبراهیم فەصیح ئەلحەیدەری دگەلدا تونە.

خوندکارێ مزوری شێخ نورەدینێ بریفکی، هۆزانەکا عەرەبیا پایەبلند، دپەسنێن سەیدایێ خودا ڤەهاندیە، ددەسپێکێدا دبێژێ :

**یا ربی زد في حیاة الحبر مولانا**
**بحر العلوم و قطب الدین (یحیانا)**

## ١٢. عەبدوللا رەبەتکی:

عەبدوللا کورێ ئەحمەد کورێ حەسەنێ زیزێ رەبەتکی[٩٢]، نێڤبەرا ١٠٦٠- ١١٥٩ك/١٦٥٠-١٧٤٦ز ژیایە[٩٣]. ل ڤێرگەها رەبەتکێ وسپیندارێ خواندیە.

پشتی دزانستێن دینیدا پەلەوان وناڤدار بوی، بنەمالا جەلیلیان خاستە مووسل، دا ل فێرگەهێن وێ دەرسا بێژیت[٩٤]. ئەو ژی هات و ل تاخا (عمو البقال) ئاكنجی بوو، دەرس ل مزگەفتەكا نێزی مالا خۆ دگۆتن، د بێژنێ مزگەفتا (المدرس) كو ناسناڤێ وی هلگرتییە[٩٥]. مخابن ناهێتە زانین كەنگی ڕەبەتكی هاتییە مووسل، دبێژن گوندێ ڕەبەتكێ ژ بەر هەر ئەگەرەكا هەی، هاتە سۆتن، ئەوژی مشەخت بوو. ژ بەهەمێن وی: المنهاج في العشر والخراج[٩٦]، رسالة في بيان احوال الرافضة[٩٧]، زبدة القواعد الفقهية في ضبط الاحكام الشرعية[٩٨]، هدى الحكم الى خير الحكم [٩٩]، رسالة في العبادات[١٠٠]...هتد.

ڕەبەتكی نێزی دەهـ پەرتووكێن دن هەنە، هێژا حەمدی عەبدولمەجید ئەلسەلەفی ناڤێن گەلەكان د پەرتووكا خۆ: رسائل في الرد على الرافضة دا توومار كرینە.

## ١٣. مستەفایێ ئامێدیێ كوردی:

دسەدسالییا هەژدێ زاینیدا ژیایە، سالا ١١٧٧ك/١٧٦٣ز ل ژیانێ بو. ژ پەرتووكێن وی: حاشیە علی حاشیە محمد بن علی الاشیشی، سالا ١٧٦٣ز نڤیسیە، حاشیە علی كتاب جمع الجوامع لعلی بن احمد الشعرانی، هەر دسالا ناڤبریدا نڤیسیە[١٠١].

## ١٤. شێخ یونسێ شوشی:

شوش گوندەكە سەر ب قەزا ئاكرێ ڤەیە. ڕەهێن شوشی دگەهنە سۆفیێ مەزن شەمسەدینێ شوشی، خودانێ پەرتووكا: راحە الفؤاد، كو ل سەر تەسەوفێ یە[١٠٢]. شوشی دسەدسالییا هەژدێ زاینیدا ژیایە، ب گوروڤێ مێژووڤان محەمەد ئەمین بن خەیرولڵا ئەلعومەری، ئەو سالا ١١٨١ك/١٧٦٧ز دیتیە ودگەلدا كەتیە گەنگەشێ[١٠٣]. ئانكو وێكا شوشی یێ ئەختیار وخودان ئەزمون بویە، لەوان ئەلعومەری گەنگەشە د گەل كرییە. ژ بەرهەمێن وی: شرح جمع الجوامع یا تاج الدین السبكی. كوڕێ نڤیسەرێ هۆزانڤان عەبدوللەتیف یونس شوشی (سەیفی)، سالا ١٢٤١ك/١٨٢٥ز ل ئامێدیێ نڤێسیە. لبەكا دەسنڤیسا وێ دپەرتووكخانا دار المخطوطات العراقیە دا، ل بەغد، بن نەمرە : ٢٠٨٦٠ هەیە .

## ١٥. تاهرێ كوڕێ سەید موسایێ گولی:

گولی هۆزەكا كوردایە ل دەڤەرا زاخۆ ئاكنجی یە. تاهرێ گولی دسەدسالییا هەژدێدا ژیایە. ژ بەرهەمێن وی: هوامش تاریخیە فی عهد الامیر اسماعیل باشا الاول، سالا ١١٩٥ك/١٧٨٠ز نڤێسیە. لبەك ژێ دپەرتووكخانا دار المخطوطات العراقیة دا، ل بەغدا، بن نەمرە : ٢٠٨٣٦ هەیە.

## ١٦. مەلا یاسینێ بریفكی:

هێژا محەمەد عەلی قەرەداغی نامیلكەكا مێژوویی ب ناڤێ (كتاب تاریخات)، دپەرتووكخانا دار المخطوطات العراقیة دا، ل بەغدا دیتیە. ئێك ژ مورید وخەلیفەیێن شێخ نورەدینێ بریفكی نڤێسیە، لەوان ناڤێ (دەسخەتێ بریفكی) ل سەر دانی یە. گۆتیە مخابن ئەز نەگەهشتمە ناڤێ درستێ ڤی بریفكی [١٠٤].

ل سەر نامیلكێ (در بیان تواریخها) هاتییە نڤیسین، پەرتووك مینا كرونولۆژیایە (ڕێزكرنا بویەرێن مێژوویی یە ل گوور سالان). ل دەسپێكێ نڤیسییە، وفات حضرت شیخ سید نورالدین البریفكانی قدس سره در سنەء ١٢٦٨[١٠٥]. ئەڤە نەكەڤنترین بویەرە دەسنڤێسێدا، كەڤنترین بۆیەر سالا ١١٢٤ك/١٧١٢ز هاتییەنڤێسین (كشتە گردانیدن زیر بیك و حسن بیك ١١٢٤هـ)[١٠٦]. نڤیسەر چمكی موریدێ شێخ نورەدینی بوو، لەوان وەك ڕێزگرتن وقەدرگرتن ناڤێ ڤی هێژای ل پێشی دانی یە. ئاشكارە نڤیسەر دڤێ سالێدا نە ژیایە، بەلكو بخۆ بۆیەر ژدەهمەن وفەروزێن پەرتووكێن بەری خو ڤەگوهاستینە، تا سەردەمێ خۆ، تا سالا ١٣٠٧ك/١٨٨٩ز بویەر نڤێسینە. مە چ بەڵگە هەنە ئەڤە دەسنڤێسا مەلا یاسینێ بریفكی یە ؟

١- نڤێسەری ناڤـ وسالا ژدێبونا كوڕێ خۆ نڤێسیە،

محەمەد سەعید زێدی ١٣٠٤ك/١٨٨٦ز (تاریخ ولادت پسرم محمد سعید در چاردهم ماه ذی القعده سنەء ١٣٠٤هـ). ئەم د زانین ناڤێ کورێ مەلا یاسینی، محەمەد سەعیدە خودانێ پەرتووکا: فضلاء بهدینان. ئێکانێ دەیبابێن خۆ بو[١٠٧]. لەوان نڤیسەری چ کوڕ و سالێن دن نە نڤێسینە. ل سەر رەگەزناما نفوسا محەمەد سەعیدێ خودانێ : فضلاء بهدینان، سالا ١٨٩٧ز وەك زێدێ وی هاتییە نڤێسین. ل سەر دەفتەرا خزمەتا ویا کاری هەڤۆکا (صحح تولده) هاتییەنڤێسین، ئانکو زێدێ خو راستکریە. ئاشکارە محەمەد سەعید ژیێ خۆ بچوککرییە، بەرئەڤل زێدێ وی یێ راست ١٨٨٧ز/١٣٠٥ك یان ١٣٠٤ك مینا باڤێ وی مەلا یاسینی نڤیسی. بەرمالیا وی ژی (بەرمالیا مەلا یاسینی) هۆزانڤان ساریا مستەفا دۆسکی مینا وی، ژیێ خو بچوککرییە، ژ ١٩٠٢ کریە ١٩١٣ ![١٠٨].

٢- دەسنڤیسا نامیلکا (کتاب تاریخات)[١٠٩] دپەرتووکخانا دار المخطوطات العراقیە دا هەیە. ئەم دزانین هێژا مەسعود محەمەد سەعید بریفکانی نەڤیێ مەلا یاسینی، دەسنڤیسێن پەرتووکخانا بنەمالا وان، پەروە پێشکێشی دار المخطوطات کربون[١١٠].

٣- مەگو نڤیسەرێ (کتاب تاریخات) بویەرێن مێژوویی تاسالا ١٣٠٧ك/١٨٨٩ز نڤیسینە. ئانکو تاڤێ سالێ دژیانێدا بویە و ل سەرخو بویە، پاشی نەشیایە بەردەوام بیت، یان نەساخ کەتیە یان ژی چوویەبەر دلوڤانییا خودێ. مێژووڤان محەمەد سەعید بریفکانی نڤیسیە، باڤێ من مەلا یاسین ل خەستەخانا مووسل نەساخ کەتبو، ل وێدێ سالا ١٩٠٦ چوویەبەر دلوڤانییا خودێ[١١١].

٤- قەرەداغی نڤیسیە، دانەرێ (کتاب تاریخات) موریدێ شێخ نورەدینێ بریفکی بو[١١٢]. هێژا مەلا یاسین کورێ شێخ[١١٣] کورێ لەوەند ... ب رەڤیشتا خو دگەهتە هۆزانڤانێ ناڤدێر مەلا حوسێنێ باتەیی[١١٤]. بنەمالا وان ژ عشقا نورەدینێ بریفکی هەیامەکێ هاتینە بریفکا وئەڤ ناسناڤە هلگرتییە، پاشی ل دهۆك ئاکنجی بوینە. مەلا یاسین وکورێ وی محەمەد سەعید ژمورید وخەلیفێن شێخێ بریفکی تێنەهژمارتن.

٥- نڤیسەرێ (کتاب تاریخات) ب زمانێ فارسی بویەرێن مێژوویێن دەڤەرێ نڤێسینە. دبێژم گش مەلایێن کەڤنێن کورد، فارسی زانبوون، ژ وان مەلا سەعید وباڤێ وی مەلا یاسین ژی. ل گوور بەلگە و گوروڤێن مە هژمارتین، نڤیسەری نامیلکا (کتاب تاریخات) مەلا یاسین کورێ شێخ کورێ لەوەندێ بریفکی یە. سالا ١٧٨٠ز ژ دیبویە، مینا ل سەر رەگەزناما عیراقیا کورێ وی محەمەد سەعید هاتییەنڤیسین. سالا ١٩٠٦ چوویەبەر دلوڤانییا خودێ[١١٥]. مەلا یاسین (٦٢) سالان، ل بن سها میرگەها بەهدینان ژیایە. بابەتێ وی نڤیسی گەلەکێ کێم وپڕ بهایە، کێم نڤیسەرێن میرگەهێ خو ل بابەتێن مێژوویێ کریەخودان.

## سێ: نڤێسەر و هۆزانڤانێن میرگەهێ

ناڤێن نڤێسەر و هۆزانڤانان ل گوور سەردەمێن تێدا ژیاین هاتینەرێزکرن.

### ١. حەمیدی:

وەسا دیارە ئەڤە ناسناڤێ ویێ هۆزانێیە. ناڤێ وی ناهێتەزانین، دیسان ناهێتەزانین ئەوی ناسناڤێ خو ژ باڤ و باپیرێن خۆ وەرگرتییە یان ژ کوردێن حەمیدیێن[١١٦] ناڤدێر ل دەڤەرێ.

هۆزانەکا وی ژ لایێ د.مسعود کتانی ڤە هاتییەبەلاڤکرن. (کتانی) هۆزان دایەپال مەلا حوسێنێ باتەیی[١١٧]. ڤەکۆلەر سەعید دێرەشی ل وێ هزرێیە ئەڤە هۆزانا حەمیدی یە. (حەمیدی) ناسناڤێ خو سێ جاران دهۆزانێدا ئانیە. دسەردەمێ سۆلتان حوسێنێ وەلی دا(٩٤٠-٩٨١ك/١٥٣٣-١٥٧٣ز)

ژیایە، ئانكو ژهۆزانڤانێن شازدێ زایینی یە[118].

ئەڤ هۆزانا (حەمیدی) ب چار زمانان كوردی، فارسی، تركی وعەرەبی هاتییەڤەهاندن. گەلەكا لێكدایە، ب كوردیەكا سڤك ورەهوان هاتییەدارشتن. ئەڤێن ژێری ئەو مالكن ئەوێن ناڤێ (حەمیدی) تێداهاتی:

**مەحمود وخۆش تشتە علم، خاسمە ژبو خەلقێ مەلا**
**مە دڤێ میران دهەیبەت والی بو ئەمنیا شەهسوار**
**فوچلنز مەمە ئەی (حەمیدی) علم ئیلشمن یوقدر**
**ئیلیم عالم ئیچندە ئەلمەك ئولور نامدار**

* * *

**درنجوم و حیكمەت و علمێ مەعانی تا ب شەرع**
**ئەی (حەمیدی) گەرچ صەرافی مەحەك دەرپیشدار**
**ادعی بالعلم فظـــلا من یسمی بـ (الحمید)**
**ایـــن مــــــن یاتی مجیبا باحثا بالاقتدار**[119]

## ٢. بهاری:

هێژا مەسعود كتانی ناڤێ وی بو جارا ئێكێ سالا ١٩٩٨ ئانیە[120]. هۆزانڤان دهۆزانەكا خودا دبێژێ، بهاری ژ بنەمالا پاقژا عەباسییانە، ئامێدیێ ژ گش بازێرێن دن چێترە:

(بهاری) أز وجود دودمان پاك عباسی ست
كە میگویند این ملك (عمادی) بە زشهرانست[121]

نە ناڤێ وی، نەژی سەردەمێ ژینا وی تێتەزانین. دوورنیە ل سەردەمێ زێرینێ میرگەها بەهدینان‌دا، سەردەمێ سۆلتان حوسێنێ وەلیدا ژیابیت، ب گوروڤێ دبێژێ، ملك وجهێ ئامێدیێ ژ گش جهێن دن خۆشتر وچێترە.

## ٣. دەردی:

مێژوووڤان عەبدولرەقیب یوسف بو جارا ئێكێ ناڤێ وی سالا ١٩٨٨ ئانییە[122]. ب بۆچوونا وی (دەردی) ل میرگەها بەهدینان ل سەردەمێ عادل پاشایدا (١٨٠٤-١٨٠٧ز) ژیایە. ب گوروڤێ مینا عەبدولرەقیب دبێژێ، هۆزانڤانی ناڤێ عادل باشای دهۆزانەكا خودا ئانیە وپەسنێن وی داینە:

**حاكمێ عادلێ جەوواز تویی نام، وەلێ والیێ مولكێ سولەیمان تویی، سۆلتانێ قەدیر**[123]

ب هزرا من (دەردی) دڤێ مالكێدا، باسی عادل پاشایێ حاكمێ ئامێدیێ ناكەت، باسی حاكمێ عادل جەوازێ دكە. عادل جەواز[124] Adilcewaz بازێرەكێ باكوورێ كوردستانێیە، سەر ب ویلایەتا بەدلیسێیە، دكەڤیتە سەر كنارێ ژوورێ زەریاچا وانێ، رۆژهەلاتێ ئەخلاتێ[125]. هۆزانڤان دبێژێ ناڤێ تە حاكمێ عادل جەوازێیە، لێ تو والیێ مولكێ سولەیمانی وسۆلتانەكێ هێژایی.

میرێ (دەردی) پەسنێن وی ددە، میرەكێ دەڤەرا سەر حەددێیە. دبێژتێ: تو شێری ژ بنەمالا شێرایی، بیشێ تە سەر حەددە، گورگ وروڤیێن عەجەمان دكەیە دیل وئێخسیر:

ئەسەدی، شێری نەسەب، بیشەئێ سەرحەددە مەكان
گــورگ وروباهێ عەجــــــەم لەو دكـــــرن دیـــــــل وئەســـیر[126]

مە بەلگەیەكێ دن ژی بۆ پشتەڤانییا بۆچوونا خۆ هەیە، ئەوژی پشكداریا میرێ عادل جەوازێیە، دشەڕێن بازێ وسەراندەرێدا. دەردی دبێژێ:

جەنگێ بازێ وسەراندەرێ، عەجەب نینە ژوە
هۆنەر وجۆرئەتەكە، زێدەیە حەق داییە میر[127]

(باز) دكەڤیتە شەمدینان ویلایەتا هەكاری. (سەراندەر/سەرادەر) ژی دكەڤیتە روژئاڤایێ مەلازگردێ ویلایەتا موشێ[128]. ئانكو هەردو جهـ دكەڤنە باكوورێ كوردستانێ، پێوەندی ب میرگەها بەهدینان ڤە تونە. مە ناڤێ وی نڤیسی، بەلكو راستیا وی د پێشەروژێدا بێتەخویاكرن.

## ٤. شەمسەدینێ ئەخلاتی:

شەمسەدین كورێ عەبدولكەریم كورێ موسای ... رەهێن وی دگەهنە شێخ حوسێنێ ئەخلاتی، ئەوێ

سالا ٨٠٨ك/١٤٠٥ز چوویەبەر دلوڤانییا خودێ[١٢٩]. شەمسەدین دسەدساليیا هەڤدێدا، نێڤبەرا ٩٩٧-١٠٨٥ك/١٥٨٨-١٦٧٤ز ژیایە[١٣٠].

ژ ئەگەرا شەڕ و پەڤچونێن دەولەتێن صەفەوی وئوسمانی ئەخلاتی هاتە دەڤەرا هەکاریيا، ل وێرێ ئاکنجی بوو. سالا ١٠٣٠ك/١٦٢٠ز دگەل کوچەرێن ئەرتوشییا تێتە میرگەها بەهدینان. میرێ ئامێدیێ وی سەردەمی سەیدی خان بەگ (١٥٨٥-١٦٢٩ز)، ژێ خواست ل میرگەها بەهدینان ب مینێ، حەفت گوندێن مزوریيان ژی ژێرا بەخشین (بریفکا، گەلیێ رمان، خرابیا، بێگەهـ، رکاڤا، ئالوکا، تلدێبێ). ئەخلاتی رازی بو، تەکیا خۆ ل گوندێ بریفکا دامەزراند[١٣١].

ئەخلاتی هۆزانڤانەکێ پایە بلندە، ل گوور گۆتنا نەڤیێ وی شێخ نورەدینێ بریفکی، ئەوی هۆزان ل سەر هەمو تیپێن ئەلیفبێتکێن عەرەبی ڤەهاندینە[١٣٢]. لێ مخابن پرانییا هۆزانێن وی ژناڤچوون، ئەوێن ماین نەڤیێ وی (زاهد بریفکانی) ل سوید ل سالا ٢٠٠١، هەولێر سالا ٢٠٠٣ چاپکرینە .

## ٥. محەمەد تەیار پاشا:

کورێ میرێ ئامێدیێ سماهیل پاشایێ ئێکێ یە، دو جاران هەر جارەکێ سالەکێ میراتی ل ئامێدیێ کرییە، جارەکێ نیڤبەرا ١٧٩٨-١٧٩٩ز[١٣٣]، جارا دن نێڤبەرا ١٨١٦-١٨١٧ز، دڤێ سالا داویێ دا ١٨١٧ز (١٢٣٣ك) چوویەبەر دلوڤانیا خودێ[١٣٤].

محەمەد تەیار پاشا هۆزان ب زمانێن کوردی وفارسی ڤەهاندینە، ناسناڤێ وێ شعری (غەریبی) یە. باشنڤیسەکێ پەلەوان بوو، دیوانا مەلایێ جزیری سالا ١٢٣١ك/١٨١٥ز ب خەتێ خویێ شرین نڤیسیە. دەستنڤیسا ئورگینالا وێ دپەرتووکخانا شێخ تاها مەزهەر مایی دا، ل دهۆك پاراستیە.

محەمەد تەیار پاشا گەلەك پێنج مالکی ل سەر هۆزانێن هۆزانڤانێن کورد وفارس نڤیسینە وەك: جزیری، پرتو بەگێ هەکاری، مەولانا خالدێ نەقشەبەندی، حافظ شیرازی، عەبدولرەحمان جامی، سەعدی شیرازی، سائیب تەبریزی، هیلالیێ جەغتائی، هومایون، خەیالی ... هتد. ل سەرێ هۆزانێن خۆ دنڤێسە (لراقمە ٩٢) نۆت ودو ب حیسابا ئەبجەدی ناڤێ (محەمەد)ە، ئانکو ئەڤە هۆزانێن محەمەدینە ب خەتێ وی. دەستنڤێسەکا هۆزانێن وی دپەرتووکخانا دار المخطوطات العراقیة دا ل بەغدا، بن نەمرە : ٨١٥٥ هەیە، هێژا محەمەد عەلی قەرەداغی نێزی دەهـ هۆزانان ژێ بەلاڤکرینە[١٣٥].

## ٦. عەبدوللایێ بێزالی:

ددەستنڤێسەکا کەڤنا پەرتووکا: الصواعق المحرقە یائبن حەجەر ئەلمەکی ئەلهەیتەمی، سالا ١١٨٩ك/١٧٧٥ز، ل سەردەمێ فەرەوەریا سماهیل پاشا کورێ بەهرام پاشایێ ئامێدی، هاتیەنڤیسین. نڤیسەرێ وێ گۆتیە: کتبت لاجل الملا عبدالله البازلی[١٣٦] المتوطن فی قریە أسی (عاصی)[١٣٧].

**نمونا پێنج مالکیەکا محمد طه یار پاشا، ب خەتێ وی، ل سەر هۆزانەکا جزیری**



نمونا نەخش و نڤێسینا میرێ ئامێدیێ سماهیل پاشایێ دوێ کورێ محمد طەیار پاشا



ئانکو بۆ مەلا عەبدوللایێ بازەلی، ئاکنجیێ گوندێ ئاسی هاتییەنڤێسین.

مە گو بازەلێ، بێزالێ و بێزەلێ ئێکن، دوور نینە ئاسی/ عاصی هەر گوندێ ئاسیهێ/ ئاسهێ بیت، نەمازە هۆزانەکا وی بێزالی ب زمانێ کوردی هاتییەنڤێسین .

دەسنڤێس سالا ١١٨٩ك/١٧٧٥ز هاتییەنڤێسین، ئەڤە درست ل سەردەمێ میرێ ئامێدیێ سماهیل پاشایێ ئێکێدایە ١١٨٢-١٢١٣ك/١٧٦٨-١٧٩٨ز. ب ئاخفتنەکا دن بێزالی دسەدسالییا هەژدێ زاینیدا ژیایە.

بازەلێ، بێزالێ، بێزەلێ ... وەك ناڤێ گوندەکی، ل گەلەك دەڤەران هەیە. ل دەڤەرێن سەلماس، بالەك، قەلاچوالان، رێکان، بۆتان، ناڤێ وێ هەیە. چمکی هۆزانا مەلا عەبدوللایێ بێزالی ب کرمانجیە، لەوان ژ وان دەڤەران ناڤێن رێکان وبۆتان پڕ گرنگن. لێ بۆچونا (بێزالێ) ل دەڤەرا سلێڤانەیا، ژ بۆچوونێن دنێن وەك رێکان و بۆتان ب هێزترە. ب گوروڤێ هاتنا ناڤێ ئاسی/عاصی/ئاسهێ گوندێ هۆزانڤان بێزالی لێ ژیای. مە گو تنێ چیایێ سپی دکەڤیتە نێڤبەرا بێزالێ وئاسهێ دا، لەوان ب مگرتیەکا مەزن هۆزانڤان عەبدوللایێ بێزالی خەلکێ گوندێ بێزالێ یە، ل گوندی ئاسهێ مەلا بویە وهۆزانێن خو ڤەهاندینە .

ئەڤا ژێری مالکا دەستپێکا هۆزانا بێزالی یە، هێژا محەمەد عەلی قەرەداغی گش هۆزان بەلاڤکریە:

**خاوەر میسالا سوریەری، سنگ صەدەفا مەخمور لباس**
**رۆژەك ڤەخاندم بەردەری، قالت تعال، کەل، من بناس**[١٣٨]

## ٧. عەبدوللایێ مەئالی:

مەئالی سالا ١١١٨ك/١٧٠٦ز ل دەڤەرێن شەبەکێن دەوروبەرێن مووسل ژ دێبویە. ژ هۆزانێن وی خویایە، ل سەر رێیا سۆفیا ( قادری) بویە، ژ خەلیفە وموریدێن شێخێن بریفکا بویە، ئەو دبێژێ :

**کانێ دیار نینا شوخێ بریفکانی**
**هاتن بو سوق و بازار، خەلقێ کەلیرمانی**
**ئەورو قەوی دلریشم، بێ تاقەت وتەشویشم**
**وەکە مەلا وەدرویشم، قەت حالێ ما نزانی** [١٣٩].

هۆزانڤان رەهێن خۆ دگەهینیتە زانایێ ناڤدێر ئەبوبەکر ئەلموسەنیف[١٤٠]. دهۆزانەکا عەرەبیدا دبێژێ:

**أفلا ينظرون سطوة وجدی ؟**
**اذ أبوبکر المصنف جدی**

(مەئالی) هۆزانێن خۆ ب کوردی (گوڤەرێ شەبەکی)، فارسی، ترکی و عەرەبی ڤەهاندینە. هۆسا ناڤێ خو وەڤوکا خو دبە :

**گەر هەممە یار و ویرین، ئەز دل ئاگاه** [١٤١] **و حەزین ب زویانێ (شەبەکی) باچە (مەئالی) غەزەلێ**[١٤٢]

هۆزانڤانێ مە سالا ١١٩٨ك/١٧٨٣ز دژیێ هەشتێ سالیدا چوویەبەر دلوڤانیا خودێ. ئانکو دسەدسالیا هەژدێ زاینیدا ژیایە. ل گورستانا (الباب الصغیر) نێزی (نەبی یونس) ل مووسل هاتییەڤەشارتن[١٤٣].

## ٨. مەلا مەنسۆرێ گرگاشی:

گرگاشێ گوندەکە دکەڤیتە ژوریا رۆژهەلاتێ ئامێدیێ نێزی بیست کیلومتران. گرگاشی هەڤچاخێ مەلا حوسێنێ باتەیی بوو، ب گوروڤێ برێکانیا دنێڤبەرا هەردواندا. گرگاشی دبێژێ:

**سەلاما من سەحەر خیزی**
**ل تە ئەی باتێ هەکاری**
**دبەرسڤێدا باتەیی دبێژێ :**
**ژ لوتفێ و عینایاتێ**
**تۆ یی مەنصوورێ رەحمانی**
**... هتد**[١٤٤].

باتەیی ژی ل گوور داویترین ڤەکولینان دسەدسالییا دوازدێ ك/ هەژدێ زاینیدا ژیایە[١٤٥]. هنەك هۆزانێن گرگاشی ددەستنڤیسەکا سالا ١١٨١ك/١٧٦٧ز هاتییەنڤیسین، هاتینەدیتن[١٤٦]. ئانکو گرگاشی یان دوی سەردەمیدا ژیایە وناڤدێربویە، حەتا هۆزانێن وێ بێنە کوومکرن. یان ژی هنەك بەری وێ مێژوویێ دەهـ - بیست سالەکا ژیایە. ل گوور رێزکێن بوری، گرگاشی دسەدسالییا هەژدێ زاینیدا ژیایە.

کێم بەرهەمێ هۆزانڤانی هاتییەدیتن، بەلکو تنێ (سێ) هۆزانێن وی هاتینەدیتن، هۆزانا: ل روژئاڤا دەمێ ئێڤار، هۆزانا : سوبحان ژشاهێ بێچون، بەرێکانیا وی وباتەیی[١٤٧].

هۆزانێن گرگاشی ژ لایێ کێش وقافیاڤە، مینا هۆزانێن کلاسیکێن کوردن. کێش وقافیا هۆزانا: ل روژئاڤا دەمێ ئێڤار، مینا کێش وقافیێن هنەك هۆزانێن جزیری، فەقیێ تەیران و شەمسەدینێ ئەخلاتی نە. چامێ (قەصیدێ) ئێك قافیا سەرەکی هەیە، دناڤدا قافیە سێ مالك سێ مالك تێتە گوهورین. مینا دبێژێ :

**دەلالا نازکا رەندی**
**شەپالی دێم وەکو فندی**
**ب راستی ئایەتا زەندی**
**بهار و خۆشیا جانی**
**تو داخوازا منی دلبەر**
**ژ من تو چاك بکە باوەر**
**ژ بەهشت وزەمزەم و کەوسەر**

ب تەنهـــا من تویـا زانی[148].

كێش و قافیێن هەردو هۆزانێن دن، دیسان قافیە سێ مالك سێ مالك تێتەگوهورین، دگەل گوهورینا قافیا نیڤ مالكا سنگی (صدر البیت). ئەڤ تەرزێ قافیێ ل جەم بەكر بەگێ ئەرزی وخالد زێباری ژی هەیە. گرگاشی دبێ :

**سەلاما من سەحەر خیزی**
**ل تە ئەی (باتێ هەكاری)**
**ژ شـەهبازان شـەكر دیزی**
**ژ عەقـــدا دوڕ و مـرواری**
**ژ مەوجان فیتنە ئەنگیزی**
**ژ لوطفـــا خالـقێ باری**[149].

هۆزانێن گرگاشی ژ لایێ ناڤەرۆكێ ڤە، ل سەر ئەڤینێ وخورستێ نە .

## ٩. خالد كوڕێ حوسێنێ زێباری:

باپیرێ وی یێ دوور سەلیمێ زێباری دسەدسالییا شـازدێ زاینیدا، ل دەڤـەرا زێبار رۆژئاڤایێ زاخو ژیایە[150]. حوسێن باڤێ خالدی ل سەردەمێ میرێ جزیرێ محەمەد كوڕێ میر شەرەف خانێ ئێكێ دا ١١٦٤-١٢٠٧ك/١٧٥٠-١٧٩٢ز مشەختی دەڤەرا بۆتـان بویە[151]. هۆزانڤانێ مە خالد ل گوندێ زڤنگوك ل بۆتـان سالا ١١٧٠ك/١٧٥٦ز ژ دیبویە، پاشی ل گوندێ (رەشیدیێ) باكوورێ مووسل ئاكنجیبویە. ل ڤی گوندی ئیجازا خۆ یا زانستی ژ ئیبراهیم كوڕێ عوسمان ئەلرەشیدی، یاسۆفیاتیێ ژ ئەحمەد ئەلرەشیدی ئەلقادری وەرگرتینە[152]. پشتی ئیجازە وەرگرتنێ جارەكـا دن ڤەگەریا دەڤەرا بۆتان، ل گوندێ رەشنیە سالا ١٢٢٠ك/١٨٠٥ز چوویەبەر دلوڤانییا خودێ [153].

ژ بەرهەمێن وی وەك: كرامات الشیخ احمد الرشیدی، وصایە الی الحسین (ولـــدە)، بەیتا سیسەبانێ ب كوردی[154].

هنەك ڤەكۆلەران مینا: سادق بەهائەدین ئامێدی ورەشید فندی هزر كرییە ناسـناڤێ وی (لاغەر) ە[155]. من سالا ١٩٨٨ نڤێسیە: پەیڤا زێباری دشعرا لاغەریدا ئەوا ص. ب ئامێدی بەلاڤكری، باسی كچەكا زێباری یە، نە عەشیرەتا شاعری ! .

**ب هەفت ئاڤان بشویی (لاغەری) خۆ**
**مـەكــە دەعــوا ژ ڤێ زێباریــێ قـــــەت**

دیسان نڤێسیە: لاغەر ژ خالد زێباری هۆزانڤانترە![156] ئـەڤ راستیە ژی، پشتی هێژایان تەحسین ئیبراهیم دۆسكی وحوسێن شەمرەخی هنەك ژ دیوانا (لاغەری) بەلاڤكری، چاك بۆ ڤەكۆلەران روون بوو.

د سەرهندێ را ڤەكۆلەر رەشید فندی رازی نەبویە، (زێباریێ) باسی كچەكا زێباری یە، هەر حسابكرییە (لاغەر) ناسناڤێ هۆزانڤـان خالدێ زێباری یە، لەوان سەردەمەكێ دن بو هۆزانڤانێ مە هەلبژارتیە نڤێسیە: الملا خالد ذو الرقم (٤) فی الشجرە، من المرجح انە لاغر ... هو الذي یمكن ان یكون قد عاصر الجزیری[157] (مەلا خالدێ نەمرە : ٤، ئەوە لاغەر و دبە هەڤچاخێ جزیری بیت)! هزر نەكرییە نەخواندنێ پەرتووكا: الاحوال الدریە .... نە هیچ ژێدەرەكێ دن نەگوتیە، ئەڤی مەلا خالدی بەرهەمەكێ نڤێسی ب كوردی یان عەرەبی دانایە.

ڤەكۆلەر هزرڤـان عەبدوللا بێی پشتاخو ب ژێدەرەكی ڤاهیمكە، نڤێسیە: ئەڤ نیڤ مالكە هوسا ژی تێتەخاندن (مەكە دەعوا ژ ڤێ زیبا رویێ قەت)[158]. بو ڤێ بۆچوونێ دبێژم:

أ. بژلی ڤەگێڕانا ص. ب. ئامێدی، ڤەگێڕانێن دنێن ڤێ مالكێ ل جەم مە تونە.

ب. پەیڤا (زیبا رویێ) قافیێ سست دكە. ب گوروڤێ چ پەیڤێن دنێن قافیێ وەك: ژاریێ، ئینكاریێ، سەرداریێ، ئیقراریێ ... هتد. چ (واو) دنێڤبەرا تیپێن رێ ویێدا (رائێ ویائێدا) نینن.

ت. ب ڤەگێڕانا ڤەكۆلەر هزرڤـان ژی (زیبا رویێ) هەر زەرییەكا زێباری یە نەناڤێ عەشیرەتێیە.

ئەم دكارین بو پشتەڤانیا خالدێ زێباریێ مە

هەلبژارتی، ڤێ خالێ ژی زێدەکەین. ڤەکۆلەر هزرڤان عەبدوللا دەسنڤێسەکا (بەیتا سیسەبانێ) دیتیە، سالا ١٢٣٤ک هاتیەنڤێسین. نڤێسەرێ وێ مەلا خدرێ مارینی دبێژێ: ئەڤ کیتابە ژ بەر مە خطوطا ئەسلیا مەلا خالدێ زێباری (قدس الله سره) هاتیەنەقلکرن[١٥٩].

مەلا خالدێ مە هەلبژارتی سالا ١٢٢٠ک چوویەبەر دلوڤانیا خودێ. ئانکو مەلا خدرێ مارینی پشتی چاردە سالان، شیایە ب ساناهی ژ دەسنڤێسا ئورگینالا هۆزانڤانی ڤەگوهێزیت. ئەگەر (زێباری) مینا ڤەکۆلەر رەشید فندی بوچوی، ل سەردەمێ (جزیری) ژیابیت. ئانکو (سالا ١٢٣٤ک) نێزی دوسەد سالان ب سەر مرنا (زێباری) ڤە چوینە، وێکا دکاودانێن کوردستانێدا زەحمەترە، دەسنڤێسا ئەسلیا هۆزانڤانی بێتەدیتن[١٦٠].

بۆچی هۆزانڤانێ مە خەلکێ زێبارا بەر خابوری یە، نە زێبارا بەر زێی بەهدینان ؟ ژ بەر :

١. ئەوی بەیتا سیسەبانێ ب دەڤوکا بوتان نڤێسیە، زێبارا بەر خابوری پڕ نێزی بۆتانە، تنێ خابور دنێڤبەرێدا هەیە، هەما تو چوویە ئالێ دیێ خابوری، ئالێ ژوری، یەکسەر دکەڤیە دەڤەرا بوتان. زێبارا بەر زێی بەهدینان ژ بوتان دوورە .

٢. هۆزانڤانێ مە ل گوورِ زانیاریێن پەرتووکا : الاحوال الدریە ... ژێدەرێ سەرەکیێ ژیانا وی، ژ بەرئاڤا خابوری ودیجلەی دوور نەکەفتیە. زاخو بیت، بۆتان یان رەشیدی یا ژوریا مووسل .

خالد زێباریێ ناڤێ خۆ کریە (محەمەد) وچوویە شوش، مینا محەمەد ئەمین ئەلعومەری دبێژێ، خالدەکێ دنێ بێ بەرهەمە(١٦١). هەکەنا هۆزانڤانێ مە دبەیتا سیسەبانێ دا بێژیت:

**محەمەدێ زێبـــــاری**

**گۆتی کەلامێ مەوزون**

ل شونا: ئەو خالدێ زێباری، گۆتی کەلامێ مەوزون!.

٣. خالدێ زێباریێ مێژووڤان محەمەد ئەمین ئەلعومەری باسکری، ب پشتگوهڤە هاتیەهاڤێتن، چمکی نە ئەلعومەری، نە ژێدەرەکێ دن گۆتیە ئەڤە نڤێسەر بوو(١٦٢). نە چمکی مە نەزانیە هەڤچاخێ هۆزانڤانێ مە بو، مینا ڤەکۆلەر رەشید فندی بۆچووی (١٦٣).

خالد زێباریێ ئەلعومەری باسکری، کەسەکێ جودایە مینا خالدێ شنیێ زێباری، ئەوژی هەڤچاخێ هۆزانڤانێ مە بوو، لێ خرش وبێ بەرهەم بوو.

## ١٠. حەمکێ تۆڤی:

دژێدەرادا ب ناڤێ حەمە کوور ژی هاتیە[١٦٤]. ب هزرا مێژووڤان ئەنوەرێ مایی، تۆڤی دسەردەمێ میر قوباد بەگ کورێ سۆلتان حوسێنێ وەلی دا ژیایە[١٦٥]. قوباد بەگ نێڤبەرا سالێن ٩٧٤-٩٨٢ک/١٥٦٦-١٥٧٤ز میرێ ئامێدیێ بو. مە دڤێ بێژین هەر سترانەکا یان هۆزانەکا حەمکێ، ناڤێ وی تێدا نەهاتبیت، دێ دڤێ ڤەکۆلینێدا ب پشتگوهڤە هێتەهاڤێتن . دسترانەکا حەمکێ دا ناڤێ براهیم پاشا تێ :

**ئـامێـدیــێ ببەریـنـــە**

**زەری گوزەللێ، گوزەللێ**

**دبەردا رویبارێ شینە**

**زەری گوزەللێ، گوزەللێ**

**براهیــم پاشــا خایینە**

**زەری گوزەللێ، گوزەللێ**[١٦٦]

بەرئەڤل ئیبراهیم پاشا دڤێ سترانێدا کورێ بەهرام بەگێ یە، ئەوێ دژی مامێ خو سەعید خان (١٠٩٣-١١١١ک/١٦٨٢-١٦٩٩ز) راوەستای[١٦٧]. ب ئاخفتنەکا دن ئیبراهیم پاشا (بەگ) دنیڤا دوێ ژ سەدسالیا هەڤدێدا، نیڤا یەکێ ژ سەدسالیا هەژدێدا ژیایە. ئەگەر ئەڤ بۆچوونە راست بە، حەمکێ دسەدسالیا شازدێدا نە ژیایە، بەلکو دسەدسالیا هەژدێدا ژیایە.

ڤەکۆلەر مەسعود کتانی ل وێ هــزرێ یە (حەمکێ) سترانەك ب شەرێ گاپێرکی[١٦٨]، ئەوێ نێڤبەرا میرگەها بەهدینان وهەکاریادا سالا

١١١٣ك/١٧٠١ز روداى، ڤەهاندیە. ستران دبێژێ:

**گـاپنێرکـى بدار و بـارە**
**وێـــــرانى بدار و بـارە**
**پێداتێن چەند سـویـارە**
**(چل ڤەدەر) ل پشت دارە**(١٦٩)

مخابن ناڤێ (حەمکێ) دنێڤ مالکێن بەلاڤکریێن ڤێ سترانێدا نەهاتییە. ئەڤە ژى گومانێ ل جەم خاندەڤانى، سەبارا ڤەهینەرێ راستێ سترانێ، پەیدا دکەت. ئەگەر بۆچونا د. مەسعود کتانى راست بە، وێکا (حەمکێ) دسەدسالییا هەژدێدا ژیایە، مینا دسەرمەرا بورى.

(حەمکێ) هۆزانێن ب کێش وقافیە وسەربەست ژى ڤەهاندینە. ژ هۆزانێن وى خویادبە ئەو کورێ حاجى یە، دلاوینیا خودا نەبێ کوورەیە، خاندەڤانە دزانێ ناڤێ خو دگەل هۆزان وسترانێن خو هەلچنیت(١٧٠)، دژیێ ئەختیاریێ دا کوورە دبیت، ئەو ئاماژێ ب کووراتیا خۆ ددە:

**خەریبم ژ نیشـــان و خـــالان**
**مەخمویرا لناڤ گولێت ژورى**
**تە ئاگـــر بەردا شـــــەمالان**
**ژ بەر نالێێت (حەمە کوور)ى**
**ژ تاریـــا زولفـــــان و تـــالان**(١٧١)
**ل (حەمکێ) ژار بو هنگورى**(١٧٢).

د.مەسعود کتانى پەرتووکەکا (٤٤٨) بەربەر ل سەر (حەمکێ) دانایە، دو پشکێن وێ پێوەندى ب حەمکێ ڤە تونە. نۆت وئێك ستران بو حەمکێ هژمارتینە (ب ٢٢٣) ناڤێ وى تنێ دشەش سترانادا (راستر دشەش سەبەڤادا)(١٧٣)هاتییە. ئەڤێن دن دبە کەسەکێ دن ڤەهاندبن وحەمکێ ب ستران گۆتبن. ب ئاخفتنەکا دن ڤەکۆلەرى حەمك ب هۆزانڤـان نەزانیە، ل جەم وى تنێ سترانبێژە! ئەڤەژى شاشیەکا مەزنە. هیڤیدارم د.کتانى تنێ سەبەڤا داویا ڤێ گۆتارێ بخونیت، کو دپەرتووکا ویدا (ب٢٨٢) ب شاشى هاتییە، کانێ هۆزانە یان نە ؟!

مەگو نۆت وئێك ستران بو (حەمکێ) دانینە، ناڤێ وى تنێ دشەش سترانادا هاتییە. بو نمونە سترانا (هاى شەنگە شەنگە، شەکراغا شەنگە) بێ بەلگە وگوروڤ بو حەمکێ دانایە (ب٢٧٩).

سەبەڤێن سترانێ مینا د. کتانى بەلاڤکرین، نەیەکسانن. هنەك نەهـ مالکن، هنەك حەفت، هنەك شەش، هنەك چار، هنەك سێ ...! پاراست هەر سەبەڤەك (سێ مالکن)، دنڤێسینێدا سێ مالك بینە نەهـ شاشیە. ب کورتى مینا مەلا مەحمودێ بایەزیدى (١٧٩٩-١٨٦٧ز) ڤەدگێرە: شەکراغایێ گراڤى دبێژنێ شەکراغایێ شەنگ ژى، مەزنەکێ ناڤدارێ ئەرتوشیان بو. ب دەستێن میرێ هەکاریا ئیبراهیم خان بەگ کورێ محمد خان بەگێ هاتییەکوشتن. میرێ (رۆرەشـێ خو فرۆش) ئەڤـ تاوانا مەزن، بو داگیرکەرێن ئوسمانلى، تایبەتى بو سەرلەشکەرێ ئەرزرۆمێ عەبدوللا پاشایێ چەتەچى کرییە (١٧٤).

ئەڤـ سترانا ب شـەکـراغـاى هاتییەگوتن (حەمکێ) نەگوتیە، دبێژم نە بەرهەمێ وى یە، ب بەلگە وگوروڤێن ژێرى:

١.بویەرێ کوشتنا شەکراغاى ل میرگەها هەکاریان، ل کەلا شاخێ، ژێربا زەرباچا وانێ، رووداىە(١٧٥). پێوەندیا وێ ب میرگەها بەهدینان ڤە تونە، حەتا حەمکێ سترانا پێ ڤەهونێ.

٢. مەلا مەحمودێ بایەزیدى دبێژێ، ژن وکچێن شەکراغاى زاڤـ ستران پێ گوتینە، سترانێن وان دنێڤـ ئەرتوشیان وکوردێن وان کناران دبەربەلاڤن(١٧٦). ئانکو ستران ژهەکاریا هاتییە بەهدینان، حەمکێ گوتبە ژى، سترانا وى نیە.

٣. د. کتانى نەزانیە شەکراغا کیە؟ نڤێسیە: (بەلکو ژ ئاغایێت میرى ئینانە ئامێدیێ بیت، دا هوز وعاشیر گوهێ خو بدەنێ!)(١٧٧). دیارە پروفیسور ژ هندێ بلنترن ژخەلکى بپرسن شەکراغا کیە؟

٤. د. کتانى راست دبێژێ (تفەك) نە زارێ ئامێدیێیە.

باشە پاتە چەوان سترانا (تفەك) تێدا بو حەمکێ دانایە؟ کەکو ستران ب دەڤوکا ئەرتوشیایە، ناڤێ وان تێدا هاتییە (شەکراغا کوشتن ئەرتوشیان خوینە)، (میرو ئەز کوبکم دیوانا تەنگە)(١٧٨) هێڤکە پەیڤا: ئەز کوبکم! مووڕا کوچەرێن ئەرتوشی. ئاشکارە ڤەگوهاستنا (کتانی) کێمە.

## ١١. بەکر بەگێ ئەرزی:

بەکر بەگ کورێ بەهدور بەگێ (دویێ) ئەرزی یە[١٧٩]. (محفوظ العباسی) نڤێسیە، بەکر بەگ میرێ کەلا ئەرزێ بو، مینا ددەسنڤیسا زێوکێدا (المخطوطە الزیوکیە)دا هاتی[١٨٠]. ل گووڕ ڤەکۆلینا د.عیماد عەبدولسەلام ڕەئوف ل سەر دەسنڤیسا ناڤبری کری، ناڤێ ئەرزی وناڤێ بەکر بەگێ تێدا تونە[١٨١]. لبەکا هەمان دەسنڤیسێ د پەرتووکخانا ناڤەندا زانکویا دهۆك دا هەیە، من ناڤێ ئەرزێ وبەکر بەگێ تێدا نەدیت[١٨٢]. ڤەکۆلەر ڕەشید فندی ژی نڤێسیە، ئەرزی میرێ کەلا ئەرزێ بوو، مینا ددەسنڤیسەکا مێژوویا وی سەردەمیدا هاتی[١٨٣]. مخابن ناڤێ وێ دەسنڤیسێ دوی بەرپەڕیدا نەگۆتیە، پێدڤی یە وەك لێکۆلینەکا زانستی گۆتبا. دبەرپەڕێ دووڤدا جارەکا دن نڤێسیە، ئەرزی ل دەوروبەرێ سالا ١٢٠٨ك خوندکارێ (حاکمێ) کەلا ئەرزێ بوو، مینا ددەسنڤیسا (زێوکێدا) هاتی، ئەوا دسالا ناڤبریدا هاتییەنڤیسین[١٨٤]. نەگەلەکا بەلی یە، ئەوی دەسنڤیس دیتی یە یان ژ ڤەکۆلەر تەحسین دۆسکی بێ بێژنگکرن وەرگرتییە. چەوابیت مینا مە بەری نهو گۆتی، ناڤێ بەکر بەگێ ئەرزی ددەسنڤیسا زێوکێ دا نەهاتییە .

ب هزرا مێژووڤـان ئەنوەرێ مایی، زێدی بەکر بەگ سالا ١١٧٩ك/١٧٦٥ز یە، دسەردەمێ سماهیل پاشایێ ئێکێدا ژیایە، گەلەك نێزی پاشای بوو[١٨٥]. ئەرزی مێژوووا ڤەهاندنا هۆزانەکا خو دیارکریە وگۆتیە (ب حیسابا ئەبجەدی، عەین وغەین وفێ وکاف)[١٨٦]، دکەتە سالا ١٧٧٠ك/١٧٥٦ز. لەوان بۆچوونا زێدێ وی سالا ١١٧٩ك/١٧٦٥ز ئێکجار سست دبە .

راستە ئەرزی ل سەردەمێ سماهیل پاشایێ ئێکێدا ژیایە، گەلەك نێزی وی بوویە، لێ ب هزرا ڤەکۆلەر محەمەد ئەمین دۆسکی، ئەرزی رازی نەبویە میراتیێ بکەت، ڤیایە د گەل ژار و زیڤاران، خۆ ب کاروانان ورێنجبەریێ خودانکەت. جارەکێ سماهیل پاشای (١٧٦٨-١٧٩٨ز) زێدەرێ ژیانا وی ژێ پرسیە، دبەرسڤێدا ئەرزی گۆتیە (هنارکا د بەینە دەشتێ، سەریسەر دەینە ب دەخل )[١٨٧].

ئەرزی مێژوویا ڤەهاندنا بەیتا (چول بەگێ) ژی دیارکریە و نڤێسیە: ١٢٢٠ك/١٨٠٥ز دەمێ گۆتی:

**بەکـر ب عەد وهژمـار**
**گوفتوگویـە لدەولەتێ**
**دوسەد وبیست وهزار (١٢٢٠ە)**
**پێت بورین ژ هیجرەتێ**
**ئەڤ حوکمە بویە ئیقرار**
**تاریخە ژ بو نەصحەتێ** [١٨٨]

مێژووڤان ئەنوەر مایی نڤێسیە، ئەرزی بەیتا کەوا سالا ١٢٠١ك/١٧٨٦ز ڤەهاندیە. ڤەکۆلەر محەمەد ئەمین دۆسکی دبێژێ، ل دووڤ دیتنا من (بەیتا سەیرانێ) یەکەمین هەلبەستە ئەرزی ڤەهاندی[١٨٩]. نە گۆتییە بۆچی وچما ؟

ل گووڕ سالێن ئەرزی دیارکرین، سالا ١١٧٠ك/١٧٥٦ز کەڤنترین سالە، ئەم نزانین ئەگەر ئەرزی بەری ڤێ سالێ هۆزان ڤەهاندبن. تا هۆزانڤان شیابیت هۆزانەکا هوسان (بەیتا سەیرانێ) ڤەهونێ، بەرئەقل دڤێ ژێ وی ژبیست وپێنچ سالان کەمتر نەبیت. وێکا ب مکرتیەکا مەزن هۆزانڤانێ مە، دنێڤبەرا ١٧٣١-١٨٠٥ز دژیانێدا بویە، ئانکو ژهۆزانڤانێن سەدسالییا هەژدێ یە. ئەرزی هۆزان مینا پرانییا هۆزانڤانێن کلاسیکێن کورد ڤەهاندینە، چامێ (قەصیدێ) تا داویێ ئێك کێش وقافیە هەیە. دیسان ئەوی مینا مەنصور گرگاشی و خالدێ زێباری تەرزەکێ دنێ هۆزان ڤەهاندنێ هەیە، ئەو ژی قافیا چامێ سێ مالك سێ مالك تێتەگوهورین، دگەل گوهوڕینا

**نمونا خەتێ شێخ نورالدینێ بریفکی، دمووړا ویدا،(سید نورالدین) هاتیە نڤیسین**



قافیێن نیڤ مالکێن سنگی (صدر البیت)، کێش وەکو خو دمینە، مینا دسەرمەڕا بوری .

پڕانییا ناڤەروکا هۆزانێن وی، ل سەر ئەڤینێ، جوانیا خورستێ، بۆیەرێن مێژوویی وخورستیێن دەڤەرا بەهدینانن .

## ١٢. فەق[١٩٠] حامدێ مایی:

حامد کوڕێ عەبدولکەریم کوڕێ عەبدولسەلام کوڕێ عەبدوللا کوڕێ عیمادەدینێ ئەلکێ هەکاریێ مایی.

حامدێ مایی هەڤچاخێ مەلا یەحیایێ مزوری بو، دنێڤا دوێ ژسەدسالیا هەژدێ ونیڤا یەکێ سەدسالیا نۆزدێدا ژیایە. مخابن گش بەرهەمێ حامدی ژ ناڤچوویە، تنێ هۆزانەکا وییا ب فارسی، بو بەرمالیا خو (ئامینایێ) نڤیسی، دیەرتووکخانا رێزدار محەمەد فوئاد بامەرنی دا هاتییەدیتن. مالکا دەسپێکێ دبێژی :

**اشـــکم پی سرو قد دلجـوی تو جوشد**
**وصلت زخدا جستم ودل (أمینه) کوشد**[١٩١]

## ١٣. شێخ نورەدینێ بریفکی:

هوسا ناڤێ خۆ نڤیسیە، ناڤێ من نوری یە، نورەلدین ناسناڤێ منە، ئەز کوڕێ عەبدولجەبار کوڕێ نورەدین کوڕێ ئەبوبەکر کوڕێ زەینولعابدین کوڕێ شەمسەدینێ قوتب خودانێ دیوانەکا ئەنتیکە ب زمانێ کوردی[١٩٢].

زێدی شێخ نورەلدین ل گوندێ بریفکایە. ئەوی د پەرتووکا خو: البدور الجلیە دا نڤیسیە: نورالدین ابن السید عبدالجبار البریفکانی اصلا ومولدا والایتوتی مسکنا[١٩٣]. سەبارا سالا ژ دیبونا وی، پڕانییا مێژووڤانان ل وێ هزرێ نە ئەو سالا ١٢٠٥ك/١٧٩٠ز ژ دیبویە، وەك ئەنوەر مایی، محفوظ العباسی، عەبدولرەقیب یوسف، محەمەد سەعید بریفکانی ... هتد[١٩٤].

هێژا حەسەن بن ئیسماعیل ئەلحەبار ئەلدەرگەزلی موریدێ هۆزانڤانی وخودانێ پەرتووکا: فیض الجمال فی شرح کرب الحال نڤیسیە، شێخ نورەدین هۆزانا خو (نظم الدرر لاسماء النبی المفتخر) ل مزگەفتا ئیتیت/هێتیت سالا ١٢٣١ك/١٨١٥ز نڤیسیە، ویگا ژیێ وی ٢٣ یان ٢٤ سالبون[١٩٥]. ئەڤە ژی حەسەن ئەلدەرگەزلی ژ دەسنڤیسا: نظم الدرر .. ب خەتێ شێخ نورەدین ڤەگوهاستیە. ئاشکارە دێ نڤیسینا نورەدین ژ هەموێن دن راستر بە. لەوان هۆزانڤانێ مە سالا ١٢٠٧ك/١٧٩٢ز یان ١٢٠٨ك/١٧٩٣ز ژ دیبویە[١٩٦].

ل گوور ژێدەران نورەدین ژ زاروکی دگەل مالاخو هاتییە گوندێ هێتیت.ل جەم باڤێ خو شێخ عەبدولجەباری[١٩٧] ل گوندی ناڤبری دژیێ حەفت سالیێدا، دەست ب خاندنا قورئانا پیروز کرییە. دژیێ دەهـ سالیێدا قورئان هەموو ژ بەرکرییە[١٩٨]. بەری باوەرناما خویا سۆفیاتیێ ژهێژا محمود عبدالجلیل

الخضری الکوردی العقری الموصلی سالا ١٢٣٢ك وەرگریت، دوازدە سالان ١٢٢٠ - ١٢٣٢ك ل شکەفت، چول ونهالێن چیایێن گوندێ هێتیت، دکاودانێن خودێ پەرستیێ دابوو[199].

ل گوور ژێدەرێن مێژوویێن ب دەست مە کەتین، نورەدین نێڤبەرا ١٢١٧ - ١٢٤٣ك، ئانکو ٢٦ سالان ل هێتیت ژیایە.

شێخ نورەدین پشتی مرنا باڤێ خو سالا ١٢٣١ك/١٨١٥ز ژ گوندی نەچوویە. ئەو دشعرەکا خودا دبێژێ، سالا ١٢٤٠ك ئەز هێ ل گوندێ هێتیت بوم :

(نوری) ژ چل وئەلفێ دیگەر دوسەد ژهیجرەت ١٢٤٠هـ

حــازر ل قەریە ئەیتوت، مەنزلگەهێ کەلومەت

بەرئەقل ئەو دگەل برایێ خویێ ژوی مەزنتر محەمەد ئەمین عەبدولجەبار سالا ١٢٤٣ك /١٨٢٧ز، ژ بەر گرانیێ وبەلاڤبونا کولارەش (طاعونێ)[200] ل دەڤەرێ، هێتیت هێلایە ومشەختی بریفکا بوینە.

**موور و نمونا خەتێ هوزانڤان محمد سعید میهری (محمد سعید الخالدي النقشبندي)**



سەبارا مرنا وی، پڕانیا مێژووڤانان ل وێ هزرێ نە، ئەو سالا ١٢٦٨ك/١٨٥١ز چوویەبەر دلوڤانیا خودێ. خەلیفێ وی شێخ ئیسلام کورێ عەبدولرەحمانێ شوشی هوزانەکا شینیێ پێ ڤەهاندیە، تێدا گوتیە:

**فرد الملاحه مـذ قد غـاب ارخه**[201]
**(تبك السماء لفقد النور للاسف)**

شێخ نورەدلدین پتر ژ (٣٠) بەرتووکان نڤێسینە، تنێ البدور الجلیه سالا ١٩٨٦ ل هەولێر، ژ لایێ هێژا وەحیدەلدین بریفکانی ڤە هاتییەچاپکرن. ئەڤی هێژای قەفتەکا هوزانێن وی ژی ل هەولێر سالا ١٩٩١ چاپکرینە. دیوانا نورەدین ب کوردی وعەرەبی وفارسی یە، دو جاران ژ لایێ هێژا زاهد بریفکانی ڤە، ل سوید و ل هەولێر هاتییەچاپکرن. پڕانیا هوزانێن وی ل سەر ئەڤینا سوفی وعیرفانێ نە.

## ١٤. محەمەد سەعید میهری:

محەمەد سەعید کورێ عەبدولرەحمان کورێ زانایێ مەزن مەلا یەحیای مزوری یە، میهری ناسناڤێ ویێ هوزانێ یە. محەمەد سەعید سالا ١٢١٠ك/١٧٩٥ز ل ئامێدیێ ژ دیبوویە، ئانکو ژ هوزانڤانێن سەدێ نوزدێ زاینی یە.

میهری دەرسێن قورئانا پیروز ل جەم باپیرێ خو مەلا یەحیای ل ئامێدیێ خاندینە. هنەك ژێدەر دبێژن ئەو پشتی ڤوناخا ئامێدیێ بو خواندنێ چوویە بەدلیس وئەخلاتێ ، ئیجازا خو ژ بازێرێ داویێ وەرگرتییە.

میهری سالا ١٣٠١ك/١٨٨٣ز چوویەبەر دلوڤانیا خودێ. مێژووا مرنا وی کورێ وی هوزانڤان عەبدولرەحمان خاکی[202] دبەریەرێ (٣٥١) یدا ژ دیوانا میهری نڤیسییە: ( توفی محمد سعید افندی حفید یحیی افندی المزوری، المفتی فی العقره فی ٦ من شهر رجب سنه ١٣٠١هـ). ژ بەرهەمێن وی : دیوانەکا هوزانایە پتر ژ ٣٠٠ بەریەرایە، هوزانێن کوردی، فارسی وترکی تێدا هەنە.

بەرتووکا: گلزار هوزانەکا دوتاییا (مەسنەویا) درێژا

فارسی یە، سالا ١٢٨٢ك ڤەهاندیە. دو دەسنڤیسێن وێ دپەرتووکخانا نڤیسەرێ گۆتارێدا هەنە. ئێك ب دەستێ هۆزانڤانی بخو سالا ١٢٨٢ك هاتییەنڤیسین، فوتوکوپە، لبا ئورگینالا وێ دپەرتووکخانا نەڤیێ وی ئەندازیار بلند محەمەد شوکری ئاکرەیی دا هەیە. یادوێ ب خەتێ هۆزانڤان عەبدولرەحمان شەوقیێ بامەرنی یە، سالا ١٣٠٣ك هاتییەنڤیسین .

ژ هۆزانێن (میهری) خویادبیت، ئەو دهۆزان ڤەهاندنێدا خودان شیان وپایە بلندە، هەڤال و هەڤچاخێ وی عەبدولرەحمان شەوقیێ بامەرنی هوسا ل سەر (میهری) دپەیڤە :

( بلبلێ شرین ئاوازێ بیستانێ بەلاغەتێ، توتیێ شەکر ئەزمانێ شەکرستانا فەصاحەتێ، مووما گەشا شەڤێن بێژەر وهۆزانڤانا ... کاژا بلندا مێرگا ڤەهینانێ ورەهوانیێ، شاعرێ ماهر جەنابێ محەمەد سعید میهری ) [٢٠٣].

پرانییا هۆزانێن وی، ل سەر تەسەوفێ نە، پەند وحیکمەتن، چار مالکینە ل سەر هۆزانێن شاعرێن هەڤچاخ وبەری خو. بەرێکانیەکا شیعری نێڤبەرا وی وهۆزانڤان عەبدولرەحمان شەوقیێ بامەرنی کورێ مەلا ئەحمەد بابك دا هەیە، هوسا دەسپێدکە :

**مۆورا سۆلتان حوسێنێ وەلی، قەبارێ مەزنکری**



**مۆورا سۆلتان حوسێنێ وەلی،قەبارێ ئەسلی ژ دەسنڤیسا، الشجرة الزیوکیة**



**میهری :**

**بنــام خداونــد کون و مکــان**
**ازل هست أو تا بأبد جاویـدان حوزنی** [٢٠٤]
**بنـام خدای کـه بخشید جـان**
**بشش روز أندر نهاد این جهان**
**... هتد** [٢٠٥].

## ١٥. سەیفیێ شوشی:

ناڤێ وی عەبدوللەتیفە، کورێ زانایێ ناڤدێر شێخ یونسێ شوشی یە، سەیفی ناسناڤێ ویێ هۆزانێ یە. کەڤنترین هۆزانا (سەیفی) ب دەست مە کەتی، هۆزانەکا فارسی یە، سالا ١١٩٥ك/١٧٨٠ز نڤێسیە[٢٠٦]. تا هۆزانڤانەك دگوندەکێ کوردیدا، ب رێ یا پەرتووکان نە ب رێ یا تێکەلبوونێ، فێری زمانێ فارسی ببیت، وەلێ بێت هۆزانێن جوان وبەدەو پێ بنڤێسیت، ب هزرا من سیە سالەك دڤێن. لەوان دوورنیە زندێ هۆزانڤانێ مە دەوروبەرێ سالا ١١٦٤ك/١٧٥٠ز بیت .

سەیفی سالا ١٢٤١ك/١٨٢٥ز پەرتووکا باڤێ خو (شرح جمع الجوامع) ب خەتێ خو نڤێسییە، لبەك ژێ دپەرتووکخانا (دار المخطوطات العراقیە)

دا ل بەغدا، بن نەمرە: ٢٠٨٦٦٠ پاراستییە [٢٠٧] .

ب مگرتیەکا مەزن سەیفی دنیڤا دوێ ژسەدسالییا هەژدێ ، نیڤا یەکێ ژسەدسالییا نوزدێدا ژیایە. هۆزان ب کوردی، فارسی وعەرەبی ڤەهاندینە، بەرملەکێ وان دیوانەکێدا برایان تەحسین ئیبراهیم دۆسکی ومحسن ئیبراهیم دۆسکی، سالا ١٩٩٩ ل دهۆك چاپکرینە.

ناڤەروکا هۆزانێن سەیفی ل سەر ئەڤینێ، تەسەوفێ و ژیانا کوردەواریێ نە .

## چار. پەرتووکخانێن میرگەهێ.

دڤێ گوتارێدا پەرتووکخانە ل گوور سەردەمێن ئاڤاکرنێ هاتینەرێزکرن. ئێك ژ رویێن گەشێن چاند ورەوشەنبیری پەرتووکخانەنە، گەنجینێن زانستی، ئەدەبی وهزری نە. ژێدەرێن مێژوویی بومە ناڤێن هنەك پەرتووکخانێن سەردەمێ میرگەها بەهدینان پاراستینە وەك:

### ١. پەرتووکخانا فێرگەها قاسم کورێ بەهائەددین میرێ ئامێدیێ:

ل گوورِ بۆچوونا داوود ئەلچەلەبی، ئەڤـ پەرتووکخانە سالا ٧٨٤ك/١٣٨٢ز هاتییەئاڤاکرن. پەرتووکخانەکا ب گەلەك زانستێن وی سەردەمی زەنگین بو. هێدی هێدی دەستنڤیسێن وێ ژخەمساری نەمان و ژ ناڤچون [٢٠٨].

### ٢. پەرتووکخانا فێرگەها قوبەهان ل ئامێدیێ:

ئەڤـ فێرگەهە ب پەرتووکخانەڤە سۆلتان حوسێنێ وەلی (١٥٣٤-١٥٨١ز) ئاڤاکرینە، مینا بەری نهو دسەرمەرِا بوری. ب هزاران پەرتووك ل سەر زانستێن جودا تێدا هەبوون. تا ئیرو (١٩٠٠) [٢٠٩] پتر ژ دو هزار پەرتووکان تێدا ماینە، پرانییا وان وەقفێن سۆلتان حوسێنی نە، موورا وی ل سەرە، هنەك ب زێری تامداینە[٢١٠].

دەلیڤەیە هنەك ل سەر موورا سۆلتان حوسێن باخڤین. د.عیماد عەبدولسەلام رەئوف میناکێ موورەکا وی بەلاڤکرییە، گوایە ژدەستنڤیسێن فێرگەها قوبەهان هاتییەوەرگرتن. تێدا نڤیسییە (الواثق بالملك الناس سلطان حسین بن حسن العباس)[٢١١]. هەر وی دپەرتووکا خو (مراکز ثقافیه مغموره ..) دا، ناڤەرۆکا خەتمەکا بێ میناك بەلاڤکرییە، دبێژێ (الواثق بالملك الناسی سلطان حسین بن السلطان حسن العباسی)[٢١٢].

د.مەسعود کتانی چار جاران ناڤەروکا موورا وی، هەر جارەکێ ب رەنگەکی نڤیسییە. ژێدەرێ ئێك موورێ ژی نەگوتییە. بۆ نموونە نەگوتییە ئەڤ موورە ل سەر فلان پەرتووکێ بوو، ل سەر بێڤان ناڤی یان باوەرنامێ بوو ... پێدڤی یە وەك ڤەکۆلینەکا زانستی ژێدەر گوتبان، میناکێن مووران بەلاڤکربان. تنێ میناکێ موورەکێ بێ خواندن وبێ ژێدەر بەلاڤکرییە. ئەوی ئەڤـ ناڤەرۆکە نڤیسینە :

١. الواثق بالملك الناس سلطان حسین بن حسن العباس[٢١٣].
٢. الواثق بالملك وبالناس سلطان حسین بن حسن العباسی[٢١٤].
٣. الواثق بالملك وبالناس حسین العباسی(٢١٥).
٤. الواثق بالله ورب الناس سلطان حسین العباسی[٢١٦].

جارێ تێبینی ل سەر بەلاڤکرینێ د.عیماد رەئوف :

أ. د موورا بەلاڤکریدا پەیڤێن (الناسی، العباسی) هەردو بێ تیپا (ی-یاء) هاتینە، پەیڤا (سلطان) ژی بەری ناڤێ حوسێن نەحەسەن هاتییەدانین. تۆ بێژی ئەڤە خەتمەکا دن بە، بەرسڤـ نەبەلی یە.

ب. ب هزرا من، میناکێ موورا بەلاڤکری ( المعجم التاریخی، ب ١٢٥) ژدەستنڤیسێن فێرگەها قوبەهان نە هاتییەوەرگرتن، مینا نڤیسەر دبێژێ. بەلکو ئەڤە خەتما ل سەر دەستنڤیسا زێوکێیە. ب گوروڤێن: ئێك. ناڤەرۆکا هەردو مووران ئێکە. دو. پەیڤا ل دوڤـ خەتمێ ددەستنڤیسا زێوکێ دا

(وشیخە) یە، د میناکێ د.عیماد بەلاڤکری دا، برگێ (وش) دیارە، یا دن ژێ هاتیە برین .

سەبارا ناڤەرۆکا چار مووریْن د.کتانی بەلاڤکرین، دبێژین :

أ.١. هەڤوکا (الواثق ... بالناس) دهەرسێ خەتمێن بەراهیێ دا، نە گەلەکا بەرئەقلە. ب گوروڤێ سۆلتانان چ باوەری ب خەلکێ رەش ورووت نەبو، حەتا بنڤێسن (الواثق ... بالناس) ! ب هزرا وان ئەو ژ لایێ خودێ ڤە هاتینەهەلبژارتن، خەلک چیە ؟

أ.٢. ناڤەرۆکا خەتما نەمرە (٤): (الواثق بالله ورب الناس...) راسترین خەتمە، لێ تیپا (واو) یا زێدەیە، (ئەلیف ولاما) تەعریفێ ژی ژ سلطان کێمە! راستیا وێ (الواثق بالله رب الناس السلطان حسین العباسی)، مخابن میناکێ خەتمێ وزێدەرێ وێ کێمە .

ڤەگەرین بابەتێ پەرتووکخانێ. ژێدەرەکێ نڤێسیە، پێنج هزار پەرتووکێن دەسنڤێس دپەرتووکخانێدا هەبون[217]. ئاشکارە پرانییا وان ژناڤچون، ئەوێن ماین ڤێ داویێ گەهشتنە دار المخطوطات العراقیە ل بەغدا، هژمارا وان ٣٩٩ دەسنڤێسن .

## ٣. پەرتووکخانا مزگەفتا مەزنا ئاکرێ:

دکەڤیتە ئاخێ سەرایا میری، نێزی سولاڤێ، سۆلتان حوسێنێ وەلی ئەو ومزگەفت ئاڤاکرینە، گەلەک پەرتووک ژی تێدا وەقفکرینە .

ئاشکارە ل سەردەمێن زانایێن وێ یێن ڤێ داویێ وەك: مەلا جەرجیسێ کورێ محەمەدێ ئاکرەیی (١١٣٦-١٢٠٦ك/١٧٢٣-١٧٩٢ز)، محەمەد کورێ سماهیلێ دبێژنێ المجذوب (١١٩٦- ١٢٥٤ك/١٧٨٢-١٨٣٩ز)، محەمەدێ کورێ حەسەنێ زیارەتی، سالا ١٧٨١ز چوویەبەر دلوڤانییا خودێ .... پەرتووکخانە زەنگین وبەرفرەهبویە. ل سەردەمێ داوود ئەلجەلەبی دا (١٩٢٧) تنێ ١٣٠ پەرتووك/دەسنڤێس تێدا مابون[218]. ئەڤرۆ (٢٠١٠) نێزی سەد پەرتووکان تێدا ماینە[219].

## ٤.پەرتووکخانا فێرگەها مایێ:

دبێژنێ فێرگەها قوباد بەگێ، چمکی وی سالا ١٥٧٦ز ئاڤاکرییە. پەرتووکخانە ل سەردەمێ هەردو برایێن هۆزانڤان ونڤیسەر شێخ تاها عەبدولرەحمان مایی وشێخ محەمەد تاهر عەبدولرەحمان مایی دا گەلەك دەولەمەند بیوو. خودانێ پەرتووکا: فضلاء بهدینان نڤێسیە، پەرتووکخانا وێ یاتژی دەسنڤێس بوو[220]. گەلەك پەرتووکێن وێ تاسالا ١٩٢٤ مابوون لێ پشتی هینگێ نەمان[221]، ب دەستێن ئنگلیزی وتیاریان ژناڤچون[222].

## ٥.پەرتووکخانا فێرگەها سەیدی خان ل ئامێدیێ:

هنەك ل وێ هزرێ نە، ئەڤ پەرتووکخانەیە ل سەردەمێ زاهیدا خاتونا عەباسی سالا ٧٢٢ك/١٣٢٨ز هاتییەئاڤاکرن[223]. ئەڤە بۆچوونەکا سستە، هێڤکە ئەکەرێ سستیا ڤێ بۆچوونێ دبابەتێ فێرگەها سەیدی خان دا، دهەمەنێ نەمرە: ٢ .

سەیدی خان دنێڤبەرا ١٥٨٥-١٦٢٩ز فەرووەریکرییە. ئەوی ئەڤ فێرگەهە ب پەرتووکخانەڤە ئاڤاکرینە. مخابن ناهێتەزانین چەند پەرتووك دسەردەمێ ویدا دپەرتووکخانێدا هەبون. ئەوێن ژ دەستێن زەمانی رزگاربووین ، داوود ئەلجەلەبی دبێژێ، سالا ١٩٢٠ نێزی هزار پەرتووکان بون، ئەو ژی دبویەرێن هاتنا ئنگلیزی دا بو ئامێدیێ نەمان، تنێ ٣٥ پەرتووك مان[224].

## ٦.پەرتووکخانا فێرگەها بریفکا:

میرێ ئامێدیێ سەیدی خان (١٥٨٥-١٦٢٩ز)، بۆ سۆفیێ مەزن شەمسەدینێ ئەخلاتی ئاڤاکربو. ب سەدان زانا ونڤیسەر ژێ دەرکەتینە. د سەردەمێ میرگەها بەهدینان دا، ب هزاران پەرتووك دپەرتووکخانێدا هەبون وەك: پەرتووکا حاشیە محمد ئەمین (ناڤەکی) ب خەتێ عەبدولحەمید کورێ سەید شەمسەدینێ بریفکی، ل بریفکان سالا ١٢٥٩ك/١٨٤٣ز نڤێسیە، لبەك ژێ دپەرتووکخانا شێخ عوبەیدولا محەمەد ئەمین ئەتروشی دا هەیە،

ژ پاشماین پەرتووکخانا مزگەفتا هێتیت هنەك نڤێسینێن حەسەن ئەیتوتی خودانێ پەرتووکا(مسائل في الفقة) ل پێشیا پەرتووکا(لسان العرب يا أبن منظور) دا، هاتینە نڤێسین



لبەکا دن د پەرتووکخانا دار المخطوطات العراقیە دا ل بەغدا، بن نەمرە: ٥٠٠٨/١ هەیە[٢٢٥]. پرانیا پەرتووکێن بریفکا تادەسپێکا شۆرشا ئەیلولێ سالا ١٩٦١ مابون، پاشی پەلاتە وبەلاڤەبون. هنەك گەهشتنە پەرتووکخانا ئەوقافا مووسل، هنەك گەهشتن دار المخطوطات العراقیە ل بەغدا، کت ومات ژی ل جەم مەلا مەنافێ کورێ مەلا قاسمێ بریفکی مابوون.

## ٧. پەرتووکخانا فێرگەها هێتیت:

ناهێتەزانین کەنگی هاتیبەئاڤاکرن. کەڤنترین پەرتووك سالا ١٢١٢ك/١٧٩٧ز تێدا هاتیبەنڤیسین[٢٢٦]. رەوشا وێ ل سەردەمێ شێخ نورەدینێ بریفکیدا گەشتر لێهات. هنەکان نڤێسیە، بریفکی بزاڤا خۆ یا چاندی وزانستی هەشت سالان ل گوندێ ناڤبری بریەسەر[٢٢٧]. یا راست ل گوور بەلگەیێن ددەست مە دا هەین، ئەوی بیست وشەش سالێن ژیێ خویێ چاندی ورەوشەنبیری ل وێرێ برینەسەر. ژ سالا ١٢٣٠ك/١٨١٤ز دەمێ هۆزانا خۆ : نظم الدرر ل گوندی نڤیسی، تا سالا ١٢٤٣ك/١٨٢٧ز دەمێ دگەل برایێ خو محەمەد ئەمینی ژ بەر گرانیێ وکولارەش (طاعونێ) چوینە بریفکا، مینا مە بەری نهو باسکری.

ژ نڤێسەرێن ل ڤێ فێرگەهێ بەرهەم نڤێسین وەك: هۆزانڤان شێخ سالح عەبدولغەنی ئەیتوتی (١٣١٠ك/١٨٩٢ز مریبە)، سەید حەسەن کورێ سەید عەلیێ ئەیتوتی[٢٢٨] خودانێ پەرتووکا: مسائل فی الفقە[٢٢٩]، سالا ١٩٢٨ چوویەبەر دلوڤانیا خودێ. ئاشکارە پەرتووکخانە ل سەردەمێن ڤان هۆزانڤان و زانایان دەولەمەنتر بوویە. پەرتووکخانە ل تەخا ئەردیا فێرگەهێ (مزگەفتێ) بوو، ب زارۆکی من دیتبوو یاتژی دەسنڤێس بوو، مە نەدزانی چنە. پشتی سۆتنا گوندی سالا ١٩٦٣ ژ لایێ لەشکەرێ عیراقێ، ژناڤچوو .

## ٨. پەرتووکخانا محەمەد سەعید میهری ل ئاکری:

مە پێناسا محەمەد سەعید میهری دگەل هۆزانڤان ونڤێسەرێن دەڤەرێ باسکریبە. پشتی ناڤبری ل ئاکرێ ئاکنجی بووی، دەست ب کوومکرنا پەرتووکان ودەسنڤێسان کریبە، گەلەك پەرتووکان موورا وی ل سەرە. موورا وی تێدا (محمد سعید الخالدی النقشبندی) نڤێسیبە. ئاشکارە پەرتووکخانە ل سەردەمێن وی، کور ونەڤیێن وی وەك: هەیبەتوللا ئەفەندی، عەبدولرەحمان خاکی، محەمەد شوکری ئەلموفتی ... زەنگینتر لێهاتیبە.

گەلەك پەرتووكێن وێ ژ ناڤچوینە، ئەوێن ماین نێزی ١٣٨ پەرتووكانن (دەسنڤێسانن)، ل جەم نەڤیێ وی ئەندازیار بلند محەمەد شوكری ئاكرەیی دا پارستینە[٢٣٠].

## ٩. پەرتووكخانا مەلا نەجمەدینێ بامەرنی:

پەرتووكێن وێ دگەهنە باپیرێ وێ مەزن، پیر عیسایێ رادەكی (رێكانی)، ئەوێ سالا ١١٧٥ك /١٧٦١ز چوویەبەر دلوڤانییا خودێ [٢٣١]. ئانكو ل سەردەمێ بەهرام پاشایێ مەزندا (١٧٣٢-١٧٦٨ز ) ژیایە. هژمارا پەرتووكێن ڤێ بنەمالێ دكەڤندا ناهێنەزانین، لێ دسەردەمێ مەلا نەجمەدین دا (١٣٦٩ك/١٩٤٩ز) چوویەبەر دلوڤانییا خودێ، گەهشتینە ٦٨ پەرتووكان (دەسنڤیسان) [٢٣٢].

## ژێدەر:


١. ابن فضل اللة العمری، احمد بن یحیی، مسالك الابصار فی ممالك الامصار، ڤەگوهاستن ژ: عباس العزاوی، العمادیة فی مختلف العصور، تحقیق: حمدی عبدالمجید السلفی و عبدالكریم فندی، مطبعة وزارة الثقافة، اربیل ١٩٩٨،ب ٢٩-٣٠.

٢. ابن ناظر الجیش، عبدالرحمن بن محمد، كتاب تثقیف التعریف بالمصطلح الشریف، منشورات المعهد العلمی الفرنسی للاثار الشرقیة، القاهرة،١٩٨٩، ب٧٧ .

٣. القلقشندي، احمد بن علي، صبح الاعشی في صناعة الانشا، مطبوعات دار الكتب والوثائق القومیة، القاهرة، ٢٠١٠، جـ٧ ب٢٨٦.

٤. ب گوروڤێ بەهرام بەگ ناڤێ داویێ دارێ بە.

٥. محمد الملا عبدالكریم، گوتارا: في الرسائل البابانیة واوراق قدیمة اخری، گوڤارا: كاروان، هژمارا: ١، سالا: ١٩٨٤، ب ١٤٧.

٦. هەمان ئەو ژێدەر.

٧. سلیمان الصائغ، تاریخ الموصل، دار الكتب العلمیة، بیروت، ٢٠١٣، جـ١ب٣٥١. نڤیسەری ناڤێ(هێتیت) ب بەلگە كریە (عین توثا)!

٨. انور المائی، الاكراد فی بهدینان ، مطبعة الحصان، الموصل، ١٩٦٠ ب ١٢٠ و دیفرا .

٩. عباس العزاوی، ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٩ و دیفرا .

١٠. الحموی، یاقوت بن عبداللة، معجم البلدان، دار احیاء التراث العربی، بیروت، ١٩٩٧، جـ٦ ب٣٥١.

١١. د.عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافیة مغمورة فی كردستان، مؤسسة موكریانی للبحوث والنشر، اربیل، ٢٠٠، ب١٢٠.

١٢. ابن فضل اللة العمری، احمد بن یحیی، مسالك الابصار فی ممالك الامصار، المانیا، فرانكفورت، ١٩٨٨، جـ٣ ب٣٦٣.

١٣. د. عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافیة مغمورة ... ژێدەرێ بەرێ، ب ١٠٠.

١٤. هەرئەو ژێدەر.

١٥. عباس العزاوی، ژێدەرێ بەرێ، ب٩٢. دیسان: محفوظ العباسی، العباسیون بعد احتلال بغداد، دار الشؤون الثقافیة العامة، بغداد، ١٩٩٠، ب ٦٥-٧٠.

١٦. كوركیس عواد، خزائن الكتب القدیمة فی العراق، دار الرائد العربی، بیروت، ١٩٨٦، ب ١٧٥.

١٧. انور المائی،ژێدەرێ بەرێ، ب ١٢٩.

١٨. د.عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافیة مغمورة... ژێدەرێ بەرێ، ب١١٧-١١٨.

١٩. كاوە فریق ئامێدی، امارة بهدینان٧٠٠-١٨٤٢، مؤسسة موكریانی للطباعة والنشر، اربیل، ٢٠٠٠، ب٢١٩. دیسان:د.عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافیة مغمورة... ژێدەرێ بەرێ، ب١١٨.

٢٠. د. مسعود الكتانی، المساجد والمدارس فی امارة بادینان، مطبعة هاوار، دهوك، ٢٠١٠، ب ٢١٥-٢٢٥.

٢١. هەرئەو ژێدەر، ب١١٢.

٢٢. انور المائی، ژێدەرێ بەرێ، ب ١٢٩. دیسان:د. عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافية مغمورة ... ژێدەرێ بەرێ، ب ١١٩.
٢٣. داؤود الجلبی، مخطوطات الموصل، مطبعة الفرات، بغــداد، ١٩٢٧، ب٢٥١ .
٢٤. هەرئەو ژێدەر، ب ٢٥٣.
٢٥. سالم عبدالرزاق، فهرس مخطوطات مكتبة الاوقاف العامة فی الموصل، مؤسسة دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٧٥، جـ١ب١٤١. مەلا جەرجیسێ ئاكرەیی پەرتووكا خو: رسالة فتحية ب زمانێ فارسی، سالا ١١٨٦ك/١٧٧٢ز ل ئامێدیێ نڤیسیە. لبەكا دەسنڤیسا وێ دپەرتووكخانا نڤیسەرێ گوتاریدا هەیە .
٢٦. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی میژوویی زانایانی كورد لە رێگەی دەستخەتەكانیانەوە، چاپخانەی السالمی، بەغدا، ١٩٩٩،جـ٢ ب١٢.
٢٧. د.مسعود الكتانی، المساجد والمدارس ... ژێدەرێ بەرێ، ب١١٣.
٢٨. عباس العزاوی، ژێدەرێ بەرێ، ب ٩٣ .
٢٩. انورالمائی، ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٠٩ .
٣٠. د.مسعود الكتانی، المساجد والمدارس ... ژێدەرێ بەرێ، ب ١١٧.
٣١. محمد علی القرداغی، كنوز الكورد فی خزائن دار المخطوطات العراقية، السليمانية، ٢٠١٣، مطبوعات طالب سيد احمد فائز، جـ١ ب ٢١٣ .
٣٢. محمد علی القرداغی، كنوز الكورد ... ژێدەرێ بەرێ، ب ٢١٤ .
٣٣. هەرئەو ژێدەر، ب ٢١٥.
٣٤. د.عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافية مغمورة ... ژێدەرێ بەرێ، ب ٤٠-٤١ .
٣٥. هەر ئەو ژێدەر، ناڤێ پەرتووكا جەغمینی، الملخص فی علم الهيئة يە (الزركلی، خيرالدين، قاموس الاعلام، جـ٧ ب ١٨١)، لێ د ڤێ دەسنڤیسێ دا : رسالة فی علم الهيئة هاتیە. ع.م
٣٦. د هنەك ژێدەرادا زاهیدا خاتونا عەباسی، ئەوا سالا ٧٢٩ك/١٣٢٨ز چوویەبەر دلوڤانیا خودێ، ئەڤ فێرگەهە ئاڤاكریە. ئەڤە بۆچونەكا سستە، چمكی هێ میرگەهـ نە هاتیەئاڤاكرن. میرگەهـ ل گوور ژێدەرێن میژوویێن باوەرپێكری، سالا ٧٤٠ك/١٣٣٩ز پشتراست ل سەر دەستێ حاجیێ كورێ عومەر هاتیەدامەزراندن، ژێدەرێن باوەرپێكری پشتەڤانیا بۆچونێن دن ناكەن.
٣٧. د.عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافية مغمورة ... ژێدەرێ بەرێ، ب ١١٥.
٣٨. د.مسعود الكتانی، المساجد والمدارس ... ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٢٢-٢٢٣.
٣٩. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی میژوویی ... ژێدەرێ بەرێ ب، جـ٣ ب٣٣٦ .
٤٠. د.مسعود الكتانی، المساجد والمدارس ... ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٢٤؛ بەنستان: گوندەكێ دەڤەرا رێكانە. بەدلیسی ناڤێ عەشیرەتا رێكان، رادەكان نڤیسیە (شرف خان بدليسی، شرفنامه، باهتمام: محمد عباسی، مؤسسة مطبوعات علمی، تهران، ١٣٤٣ش، ب١٤٧، ب فارسی). لەوان رادەكی ئانكو رێكانی. ع. م.
٤١. زەكی محمد سعداللی ئامێدی، شوینوارێت ئامێدیێ، گوڤارا : بەیان، هژمار : ٤٧، سال ١٩٧٨، ب٧٦ .
٤٢. محفوظ العباسی، امارة بهدينان العباسية، مطبعة الجمهورية، الموصل، ١٩٦٩، ب١٥٧ .
٤٣. د.سعيد محمد احمد، مدرسة قبهان فی العمادية، منشورات مديرية الطباعة والنشر فی دهوك، دهوك، ٢٠١٣، ب١٢٢.
هنەك ڤەكۆلەران ناڤێ مەلا ئەحمەدێ سەدیقی برییە، گوایە میرەكێ ئامێدیێ ( نە نڤیسییە كیش میری) ژێ خاستیە دەرسان ل ڤێ فێرگەهێ بێژیت (د. عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافية مغمورة ... ژێدەرێ بەرێ، ب١١٨. دیسان: بشير سعيد عبدالرحمن، بهدينان وعشائرها، مطبعة خانی، دهوك، ٢٠٠٦، ب٤٨٢). ئەڤە بۆچوونەكا سستە، ب گوروڤێ ئەحمەد سەدیقی باڤێ مەلا نەجمەدینێ بامەرنی یە، ئەوا سالا ١٩٤٩ چویەبەر دلوڤانیا خودێ. میرگەها بەهدینان سالا ١٨٤٢ز كەتیە، نە بەرئەڤلە نێڤبەرا ژینێ باڤێ وكوریدا ژ سەد سالا پتر بن !. مەلا نەجمەدین بامەرنی هۆسا ناڤێن باپیرێن خۆ نڤیسینە : ملا نجم الدين بن ملا احمد بن ملا عثمان بن عبدالرحيم بن ملا ابوبكر بن ملا عبدالله بن حجی موسی بن پير عيسی الصديقی الرادكی (الريكانی). بنێرە: د.مسعود الكتانی، المساجد والمدارس ... ژێدەرێ بەرێ، ب٢٢٧ .

٤٤. د.مسعود كتاني، المساجد والمدارس ... ژێدەرێ بەری، ب٢٣١؛ محمود احمد محمد، فهرس مخطوطات مكتبة الاوقاف المركزية في السليمانية، بغداد، ١٩٨٢، جـ١ ب٤٧؛
٤٥. محمود احمد محمد، ژێدەرێ بەری، ١٩٨٢، جـ١ ب٤٧.
٤٦. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی میژوویی ... ژێدەرێ بەری ، جـ٤ ب٢٣ .
٤٧. محمد سعيد ياسين البريفكاني، فضلاء بهدينان، تحقيق: مسعود محمد سعيد البريفكاني، مطبعة خبات، دهوك ١٩٩٧، ب٧ .
٤٨. هەر ئەو ژێدەر، ب٨٧، دەهمەنێ نەمرە : ٢ .
٤٩. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی میژوویی ....، ژێدەرێ بەری، جـ٤ ب ١٥.
٥٠. د.خليل علي مراد ود. عبدالفتاح علي البوتاني، بادينان في سالنامات ولاية الموصل العثمانية، منشورات الاكاديمية الكوردية، اربيل، ٢٠١٣، ب١٦ .
٥١. محمد سعيد ياسين البريفكاني، ژێدەرێ بەری، ب٥٨، دەهمەنێ نەمرە:١ .
٥٢. هەر ئەو ژێدەر، ب٣١ .
٥٣. محمد احمد الكزني، الشيخ نورالدين البريفكاني- حياته وآثاره، مطابع الناشر العربي، القاهرة، ١٩٨٣، بث ٣٣ .
٥٤. شێخ نورەدینێ بریفکی کور نەبون، تنێ سێ کچ هەبون، صافیا وفاطمە وفەیروز. صافیا بەری شو بکەت، چویەبەر دلوڤانیا خودێ، فاطمایێ شو ب پسمامێ خو نور محەمەدێ کورێ عەبدولای کریو، فەیروزێ شو ب عەبدولحەمید خان ئەتروشی کریو. ع. م
٥٥. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی میژوویی ....، ژێدەرێ بەری ، جـ٤ب ١٢.
٥٦. هوزانڤان دبێژی: (نوری) ژ چل و ئەلفێ دیگەر دوسەد ژ هیجرت (١٢٤٠هـ) حازر ل قەریە ئەیتوت ، مەنزلگەهێ کەلومەت (دەسنڤیسا دیوانا شێخ نورەدینێ بریفکی، توژاندنا: نفیسەری، پشکا کوردی، ب١٤٢. نورالدین هندێ زارۆ بوویە دەمێ باڤێ وی شێخ عەبدولجەبار هاتیە گوندی (هەر ل گوندی سالا ١٢٣١ك/١٨١٥ز چوویە بەر دلوڤانیا خودێ وهاتیە ڤەشارتن) حەتا میژووڤانەکێ مینا ئەنوەر مایی هزرکریە، ئەو ل وێرێ ژ دیبویە (انور المائي، ژێدەرێ بەری، ب٨٢. هوزانڤان بخو دبێژێ :

**ئەڤ نورە یا ڤی نوری یە، ئەڤ نوری یە (ئیتوتی) یە**
**شعرەك عەجایب گوتی یە، مەقصودە ڤێ تەزییل کەت**

٥٧. حسن بن اسماعيل الحبار الدركزلي، دەسنڤیسا: فیض الجمال في شرح كرب الحال، دەهمەنا بەرپەرێ ئێکێ. لبەکا دەسنڤیسی دپەرتووکخانا تەکیا تالەبانیان دا ل کەرکوك هەیە.
٥٨. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی میژوویی ... ژێدەرێ بەری، جـ٢ ب١٣.
٥٩. ابن الاثير، علي بن محمد الجزري، الكامل في التاريخ، دار صادر، بيروت، ١٩٦٦، جـ٨ ب٥٢٢
٦٠. انور المائي، ژێدەرێ بەری، ب ١٨٩ .
٦١. هەر ئەو ژێدەر، ب٢٠٤.
٦٢. هەر ئەو ژێدەر.
٦٣. هەر ئەو ژێدەر ب ١٩٠-١٩١.
٦٤. د.مسعود الكتاني، المساجد والمدارس ...ژێدەرێ بەری، ب ٣٣٣.
٦٥. دارا بنەمالا شێخ تاها عەبدولرەحمان مایی، نەڤیێ وی عاصم محەمەد مەزهەر مایی، سالا ١٩٧١ نڤیسییە. د دارا بنەمالێدا ناڤێ وی عومەر کورێ مەلا ئیبراهیم هاتیە، ب هزرا من دەسنڤیسا ئەوڤانێ راسترە.
٦٦. د. مسعود الكتاني، المساجد والمدارس ... ژێدەرێ بەری. ب ٣٣٣.
٦٧. هەر ئەو ژێدەر، ب ١١٠، ١١١، ٣٤٦ .
٦٨. د.مسعود الكتاني، المساجد والمدارس ... ژێدەرێ بەری، ب٣٠٠، ٣٠١، ٣٣٤ .
٦٩. انور المائي، ژێدەرێ بەری، بپ ١٩٠. هێژا المائي نڤیسییە، شەرەفخانێ بەدلیسی پەسنێن ڤی زانای د شەرەفنامێدا دانیە.

یا راست شەرەفنامە سالا ١٥٩٧ز هاتییە نڤیسین، وێکا ژێ شەرانشی هەڤدە سالبوون! نە بەرئەقلە بەدلیسی پەسنێن خورتەکێ هەڤدە سالی د بەیاڤێ زانستیدا بکەت. من نە ناڤێ شەرانشی نە گوندێ شەرانش د لبا فارسیا شەرەفنامێدا ، لبا محەمەد عەباسی، دیسان د وەرگێرا عەرەبیا محەمەد عەلی عەونی دا نەدیتن.

٧٠. د .مسعود الكتاني، المساجد والمدارس ... ژێدەرێ بەرێ، ب٣٠٠.

٧١. هەمان ژێدەر، ب١٩٠ .

٧٢. هەمان ژێدەر .

٧٣. صديق الدملوجي، اليزيدية، مطبعة الاتحاد، الموصل، ١٩٤٩، ب ٤٣٤. دیسان: محفوظ العباسي، امارة بهدينان العباسية، مطبعة الجمهورية، الموصل ١٩٦٩، ب١٧٩ .

٧٤. حمدى عبدالمجيد السلفي و تحسين ابراهيم الدوسكي، عقد الجمان فى تراجم العلماء والادباء الكورد والمنسوبين الى كوردستان، منشورات مكتبة الاصالة والتراث، الشارقة، ٢٠٠٨، جـ٢ ب ٦٧٨ .

٧٥. محمد البرقلعي، كلمات فى بيان مذهب الطائفة اليزيدية، دەستڤیسە، سالا نڤیسینێ تونە، لبەکا وێ د پەرتووکخانا حەمدی عەبدولمەجید ئەلسەلەفی دا ل سەرسنك (دهوك) هەیە.

٧٦. حمدى عبدالمجيد السلفي وتحسين ابراهيم الدوسكي، ژێدەرێ بەرێ، جـ١، ب ٦٧٨ .

٧٧. هەرئەوژێدەر، دیسان : صديق الدملوجي، ژێدەرێ بەرێ، ب ٤٣٤ .

٧٨. سەبارا ناڤێ وی و رەڤێنشتا وی، ئامەدی یە یان ئامێدی یە، جوداهی د نێڤبەرا نڤیسەراندا هەیە، هیڤیدارم د نێزدا تشتەکی ل سەر وی و فەتوا وی بنڤیسم . ع. م

٧٩. شمس الدين سامي، قاموس الاعلام، توژاندنا: محمد ئەمین بوز ئەرسلان، دەنگ یاننلەری، ستانبول، ٢٠٠١، ب ١٠٤-١٠٥ (ب تیپێن لاتینی).

٨٠. ياسين بن خيرالله العمري، غاية المرام فى تاريخ محاسن بغداد، دار السلام ، منشورات البصري، بغداد، ١٩٦٨، ب ١٠٨. دیسان: انور المائي، ژێدەرێ بەرێ، ب١٩١ .

٨١. ابراهيم فصيح الحيدري، عنوان المجد فى بيان احوال بغداد والبصرة و نجد، تحقيق: معن حمدان علي، منشورات مصر مرتضى للكتاب العراقي، بغداد، ٢٠١٣، ب ٢١٨-٢١٩.

٨٢. عبدالرزاق البيطار، حلية البشر في تاريخ القرن الثالث عشر، دار صادر، بيروت، ١٩٩٣، جـ٣ ب١٥٨٨.

٨٣. هێژا محەمەد عەلی ئەلقەرەداغی ئەڤ پەرتووکە ل بن ناڤێ: الرسائل المغنية لكل محتاج، ل هەولێر سالا ٢٠٠٩ چاپکرییە.

٨٤. دەستڤیسەکا وێ دپەرتووکخانا مەلا نەجمەلدینێ بامەرنی دا هەیە، ب خەتێ شێخ تاهرێ نەقشەبەندی (د.مسعود الكتاني، المساجد والمدارس ... ب٢٢٨). دەستڤیسەکا دن دپەرتووکخانا نڤیسەرێ گۆتارێ دا هەیە، ب خەتێ حسين المنسوب الى الشيخ ماردين ! سالا ١٢٥١ك/١٨٣٥ز هاتیەنڤیسین.

٨٥. عباس العزاوي، ژێدەرێ بەرێ، ب٨٩.

٨٦. دەستڤیسەکا وێ ل بن ناڤێ: شرح كتاب فى الفقة، د پەرتووکخانا ناڤەنندا زانکویا صلاح الدين دا، ل هەولێر هەیە، پشکا دەستڤیسا نەمرە: ١٩٣.

٨٧. مقالة فى مناسك الحج، دەستڤیسا ئورگینالا وێ ب خەتێ مەلا یەحیای بخویە. لبەك ژێ دپەرتووکخانا نەڤیێ وی ئەندازیار بلند محەمەد شوکری ئاکرەیی دا هەیە. پەرتووکا : رسالة حول بعض نقاط التفسير ... دەستڤیسا وێ د هەمان پەرتووکخانێ دا هەیە.

٨٨. حسین حزنی موکریانی، مێژووی میرانی سۆران، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦٢، ب١٢٤.

٨٩. د.سعيد محمد احمد، مدرسة قبهان في العمادية ودورها في نشر العلوم الاسلامية في كوردستان، منشورات مديرية الطباعة والنشر في دهوك، دهوك، ٢٠١٣، ب٢٠٣، دەهمەنا نەمرە: ١.

٩٠. چاپا قاهرە ١٩٩٩، چاپا بەغدا ١٢١٣.

٩١. عبدالرزاق البيطار، ژێدەرێ بەرێ، جـ٣ ب١٥٩١.

٩٢. محمد امین بن خیرالله العمری، منهل الاولیاء ومشرب الاصفیاء فی سادات الموصل الحدباء، تحقیق: سعید الدیوەجی، مطبعة الجمهوریة، الموصل، ١٩٦٧، جـ١ ب٢٥٠ .
٩٣. المرادی، محمد خلیل بن علی، سلك الدرر فی اعیان القرن الثانی عشر، نسخة مكتبة المصطفی الالكترونیة، جـ٣ ب ٦٠٠-٦٠١. دیسان: محمد امین زكی، مشاهیر الكورد و كوردستان فی العهد الاسلامی، ترجمة: سانحة امین زكی، دار الزمان للطباعة والنشر، دمشق ٢٠٠٦، جـ٢ ب٣٠٧.
٩٤. سعید الدیوەجی، مدارس الموصل فی العهد العثمانی، مطبعة الجمهوریة، الموصل، ١٩٦٤، جـ١ ب٤٨.
٩٥. جاسم عبد شلال، علماء قدموا الی الموصل من الكورد وكوردستان، مدیریة الطباعة والنشر فی دهوك، دهوك ٢٠١٢، ب٨٢.
٩٦. هێژا جاسم عەبد شەلال ئەڤ پەرتووكە توژاندیە، ل بەیروت سالا ٢٠١٢ چاپكریە.
٩٧. هێژا حەمدی عەبدولمەجید ئەلسەلەفی، ئەڤ رسالەیە د گەل كوومەكا نامێن دن، ل بن ناڤێ: رسائل فی الرد علی الرافضة، ل دهۆك، ل سالا ١٩٩٧ چاپكریە.
٩٨. لبەكا دەسنڤیس دپەرتووكخانا هێژا محی الدین ابو الخطاب الموصلی دا هەیە (عبدالله الربتكی الكوردی، رسالة فی بیان كفر طائفة الرافضة، تحقیق: حمدی عبدالمجید السلفی، مطبعة خەبات، دهوك، ١٩٩٧، ب٤.
٩٩. لبەكا دەسنڤیس د پەرتووكخانا ناڤەندا ئەوقافا مووسل دا هەیە، بن هژمارا : ٩/٦٦ مجامیع .
١٠٠. لبەكا دەسنڤیس د پەرتووكخانا ناڤەندا ئەوقافا مووسل دا هەیە، بن هژمارا : ١٨/١١٨ مجامیع .
١٠١. د.مسعود الكتانی، المساجد والمدارس ... ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٩٣ .
١٠٢. لبەكا دەسنڤیسا وێ دپەرتووكخانا شێخ نوری مەمدوح بریفكی دا هەیە، سالا ١٢٨٣ك/١٨٦٦ز هاتیەنڤیسین. ب خەتێ نەڤیێ وێ دوور شێخ ئیسلام كورێ عبدالرحمن شوشی یە.
١٠٣. محمد امین خیرالله العمری، ژێدەرێ بەرێ ، جـ٢ ب٢١١-٢١٢.
١٠٤. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی مێژوووی .... ژێدەرێ بەرێ، جـ ٣ ب ١٧٤-١٩٣.
١٠٥. هێژا قەرەداغی بوبەرا ئێكێ نڤیسی یە: تاریخ ستانیدن قلعة عمادیة از رومیان وكشتەشدن علی آغای زیباری در سنه ١٢٥٧. یا راست ئەڤە بوبەرا دوێ یە د نامیلكێدا. بنێرە: (قەرەداغی، ژێدەرێ بەرێ، ب ١٧٥).
١٠٦. هێژا قەرەداغی نڤیسیە، بریفكی بوبەرێن دەوروبەرێن سالا ١٢٦٠ك/١٨٤٤ز كوومكرینە (قەرەداغی، ژێدەرێ بەرێ، جـ٣ ب١٧٨). یا راست دەوروبەرێن سالا ١١٢٤ك/١٧١٢ز كوومكرینە.
١٠٧. ژ زاردەڤێ كچا وی وەهبیە محەمەد سەعید ونەڤیا وی شەهرناز مەسعود محەمەد سەعید ، رۆژا ٢٠١٤/٢/١٤ .
١٠٨. عەبدولرەحمان مزوری، گۆتارا: دو هەلویست و دو چرا، كوڤارا: دیرۆك، هژمار: ٣، سال : ٢٠١٤، ب١٩، ٢٣ .
١٠٩. بۆ پتر رونكرنێ، دێ ناڤێ نامیلكێ مینا هێژا (قەرەداغی) نڤیسم، نە مینا ل سەر دەسنڤیسێ (در بیان تواریخها) هاتیەنڤیسین. ع.م
١١٠. ژ زاردەڤێ سەیدایێ منێ هێژا مەسعود محەمەد سەعید بریفكی دسالێن هەشتیاندا. دیسان: د. مسعود الكتانی، المساجد والمدارس ..ژێدەرێ بەرێ، ب٢٤٣.
١١١. محمد سعید البریفكانی، فضلاء بهدینان، ژێدەرێ بەرێ، ب٢٥ .
١١٢. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی مێژوویی ... جـ٣ ب١٧٩.
١١٣. د كوردیدا ناڤێ شێخ، شێخو، شێخە ... مشەیە. ع . م .
١١٤. ژ زاردەڤێ هێژا مسعود محەمەد سەعید بریفكی د سالێن هەشتیاندا .
١١٥. ئانكو مەلا یاسین ١٢٦ سالان ژیایە. دبە، لێ نەگەلەكا بەرئەقلە. ئەم نەچارین ژێ وی مینا باوەرناما بنڤیسین، تا بەلگەیێن موكمتر دپێشەرۆژێ دا دەسكەڤن. مەگۆتی دبە، دئیجازا مەلا محەمەد سەلیم كورێ مەلا عەبدولرەحمان كورێ مەلا یەحیایێ مزوری دا هاتیە: شیخ عبدالرحمن بن عبدالاول الفرغانی كان عمرة مائة واربعین سنة (لبەكا ئیجازێ دپەرتووكخانا نڤیسەرێ گوتارێ دا هەیە).
١١٦. كوردێن حەمیدی: ناڤێ وان دچاخێن ناڤەراستدا، ل دەڤەرا نێڤبەرا زێی بەهدینان وخازری خۆش تا، نەمازە دەڤەرا ئاكرێ

وشوشێ. سالا ٢٩٣ك/٩٠٦ز شەرکەرێن حەمیدی وداسنی پشتەڤانیا بزاڤا محەمەد کورێ بیلالێ هەزبانی دژی حەمدانیان ل موصل کر. ئەبو ئەلحەسەن کورێ عیسکانێ حەمیدی دسالێن ٤٤٠ - ٤٤١ك میرێ کەلێن ئاکرێ وشوشێ. کوردێن حەمیدی دەورەکێ بالا د لەشکەرێن ئەیوبیاندا هەبوو. گەلەك ژ وان د خەباتا دژی داگیرکەراندا شەهیدبووینە وەك: نەصر ئەلحەمیدی ل عەکا سالا ٥٨٥ك/١١٨٩ز شەهیدبوویە. هەکندەرێ حەمیدی سەرلەشکەرێ مەلك عەزیز کورێ صلاح الدین. بەدرەدینێ حەمیدی ژ میرچاکێن ئەلمەلك ئەلناصر یوسف. (هێڤکە: ابن الاثیر، علي بن محمد الجزري، الكامل في التاريخ، دار صادر، بيروت، ١٩٦٦، جـ٧ ب٥٤٠، جـ٩ ب٣٥ ـــ ٣٦، ٥٤٩، جـ١١ ب١٤، ٣٣١. التاريخ الباهر في الدولة الاتابكية، دار الكتب الحديثة، القاهرة، ١٩٦٣، ب٤٨، ٨٠. ابو شامة، عبدالرحمن بن اسماعيل المقدسي، ذيل الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، دار الجيل، بيروت، ١٩٧٤، ب١٨٦. د. زرار صديق، القبائل والزعامات القبلية في العصر الوسيط، مؤسسة موكريان للبحوث والنشر، اربيل، ٢٠٠٧، ب٨٣ ـــ ٨٤.

١١٧. د.مسعود کتانی، گوتارا: مەلایێ باتەیی وسۆلتان حوسێنێ بەهدینی ...، کوڤارا: پەیڤ، هژمارا: ٦، سالا: ١٩٩٨، ب٨.

١١٨. سعید دیرەشی، گوتارا: حەمیدی شاعرێ ئێکێ یێ کوردە دیروکا تورەڤانیا کوردیدا، کوڤارا: دیروك، هژمار: ١، سالا: ٢٠١٣، ب٦١ - ٧٢.

١١٩. د.مسعود کتانی، گوتارا: مەلایێ باتەیی ...، ژێدەرێ بەرێ.

١٢٠. د.مەسعود کتانی، چەند هوزانڤانێت کلاسیکیێت نەنیاس، کوڤارا: پەیڤ، هژمارا:٧، سالا:١٩٩٨، ب٢٦.

١٢١. هەرئەو ژێدەر. پەیڤا فارسی (دودمان) دمالکا ناڤبریدا ئانکو: بنەمال، نفش، توخم (فرهنگ عمید، جـ٢ب١١٥٦). خۆشە د.کتانی ئانکویا وێ کریە: کولینا بانی!

١٢٢. عبدالرقیب یوسف، گوتارا: شعرێن چەند شاعرەکێ کەڤن ددەسنڤیسێن مەدرەسا قوبەهاندا، کوڤارا: رۆشنبیری نوێ، هژمارا: ١١٩، سالا: ١٩٨٨، ب٨٠ ـــ ٨٢.

١٢٣. هەرئەو ژێدەر. هێژا عبدالرقیب جارەکێ (حاکمێ عادلێ جەوواز)، جارەکا دن (حاکم عادل جەواز) نڤیسیە.

١٢٤. دبێژنا قابل جەواز، ساسۆن، عەرەبکیر، حەزو ... ژی. شەرەفخانێ بەدلیسی دشەرەفنامێدا، صحیفةء سیيەم، فصل سیيەم، باسی میرگەها وان دکە.

١٢٥. موستراس، سي (C. Mostras)، المعجم الجغرافي للإمبراطورية العثمانية، ترجمة: عصام محمد الشحادات، دار ابن حزم للطباعة والنشر، بيروت، ٢٠٠٢، ب٣٥٧. دیسان: Besim Dorkot, Modern Büyük Atlas, Arkan Kitabevi, Istanbul, 1944, p.35 Hd.

١٢٦. عبدالرقیب یوسف، ژێدەرێ بەرێ، ب٨١. بەدلیسی دبێژی میرێن عادل جەوازێ پسمامێن میرێن بەدلیسێ نە. نفشێ هەمویان ب تایبەتی شیروانیان دگەهتە ئەیوبیان ( شەرەفنامە، لبا عەرەبە، جـ١ ب١٨٨، ١٩٧). ب ئاخفتنەکا دن دگەهنە ئەسەدئەدین شێرکوی مامێ صلاح الدینی، لەوان (دیردی) راست دبێژتێ: ئەسەدی، شێری نەسەب!

١٢٧. هەر ئەو ژێدەر.

١٢٨. RV Reise u.Verkehrs Landkarten, Türkei-Östlicher Teil, Stuttgart, 1989, Ee 102.. نهو ناڤێ سەراندەرێ کرینە یوزباشی Yüzbashi. ع.م

١٢٩. مەمدوح بریفکانی، ڤەگوهاستن ژ: زاهد بریفکانی، دیوانا شێخ شەمسەدینێ قوتب، وەشانێن ئاراس، هولێر، ٢٠٠٢، ب١٠. حوسێنێ ئەخلاتی نامەیەك ب ناڤێ: رسالة فی الجفر الجامع، بۆ کورێ خۆ محەمەدی نڤیسیە: دو دەسنڤیسێن وێ دپەرتووکخانا دار المخطوطات العراقية دا ل بەغدا، بن نەمرێن : ٣٧٣٧٧، ١٣٨٥٥ هەنە (محمد علي القرەداغی، کنوز الکورد ... ژێدەرێ بەرێ، ب ١٢٠-١٢١ .

١٣٠. محفوظ العباسی، امارة بهدينان العباسية، مطبعة الجمهورية، الموصل، ١٩٦٩، ب ١٤٣ .

١٣١. محفوظ العباسی، امارة بهدینان ... ژێدەرێ بەرێ، ب١٤٣. دیسان: زاهد بریفکانی، ژێدەرێ بەرێ، ب١٧. هێژا زاهد بریفکانی ل شونا گوندێ (خرابیا) بازیدکێ نڤیسیە (د ئەسلدا بازێرکێ بە، شاشیا چاپێ یە).

١٣٢. نورالدین البريفكاني، البدور الجلية، تحقيق: وحيدالدين نوری البريفكانی، مطبوعات الامانة العامة للثقافة والشباب،

اربیل، ١٩٨٦، ب ٣٤٦ .
١٣٣. محفوظ العباسی، امارة بهدینان .... ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٩ .
١٣٤. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی میژوووی .... ژێدەرێ بەرێ، جـ٣ ، ب ١٨٨ .
١٣٥. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی میژوووی .... ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب ٢٤٠، جـ٥ ب ٣٣٣-٣٤٦ .
١٣٦. د کوردیدا بازەلێ، بێزالێ، بێزەلێ ... ئێکن. گەلەك جاران تیپا (آ) ب (ێ) تێته خواندن. جزیری دبێژێ (ئێگر) ل شونا (ئاگر)؛ هەمو دارن ژ ئێگررا کرن ریز. ل موکریان وهەولێر : ناو دبیته نێ و ... هتد. بێزەلێ گوندەکە د کەڤیتە دەڤەرا ڕێکان. بێزالێ گوندەکە دکەڤیتە دەڤەرا سلێڤانەیا، نێڤبەرا ئەرمشتێ ودوبانکێ . چیایێ سێ دکەڤیتە نێڤبەرا بێزالێ و ئاسیهێ.
١٣٧. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی میژوووی .... ژێدەرێ بەرێ، جـ٤ ب٣٤٥ .
١٣٨. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی میژوووی .... ژێدەرێ بەرێ، جـ٤ ب ٣٤٥ .
١٣٩. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی میژوووی .... ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب٢٣٠ .
١٤٠. ئەبو بەکرێ موصەنیف ، کورێ هدیە اللە ێ گورانیێ کوردی، زانایەکێ مەزن بو، ژ پەرتووکێن وی: سراج الطریق و ریاض الخلود. هەردو ب زمانێ فارسی نە. سالا ١٠١٤ك/١٦٠٥ چویەبەر دلوڤانیا خودێ (محمد امین زکی، مشاهیر الکورد و کوردستان فی العهد الاسلامی، دار الزمان للطباعة والنشر، دمشق، ٢٠٠٦ ، جـ١ ب٧٨.
١٤١. ئاگەهـ/ئاگاهـ : بیمار و نەساخ (فرهنگ مردوخ، جـ١ ب١٨).
١٤٢. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی میژوووی .... ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب٢٣٠.
١٤٣. هەرئەو ژێدەر، تحسین ابراهیم الدوسکی وحمدی عبدالمجید السلفی، معجم الشعراء الکورد، دار سپیریز للطباعة والنشر، دهۆك، ٢٠٠٨، ب١٢٧.
١٤٤. صادق بهاءالدین ئامێدی، هۆزانڤانێت کورد، چاپخانەی کۆری زانیاری عیراق، بەغدا، ١٩٨٠، ب٢٤٨ .
١٤٥. تەحسین ئیبراهیم دوسکی ومحسن ابراهیم دوسکی، مەلایێ باتەیی ــ ژیان وبەرهەم، دەزگەها سپیریز باچاپ و وەشانێ، دهۆك، ٢٠٠٥، ب ٢٤ .
١٤٦. عبدالرقیب یوسف، دیوانا کرمانجی، چاپخانا الاداب، نەجەف، ١٩٧١، ب ٣-٤ .
١٤٧. صادق بهاءالدین ئامێدی، هۆزانڤانێت کورد، ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٤٥-٢٥٩ .
١٤٨. هەر ئەو ژێدەر، ب ٢٤٨.
١٤٩. صادق بهاء الدین ئامێدی، هوزانڤانێت کورد، ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٤٨ .
١٥٠. دەڤەرا زێبار دبێژنێ بەرزێ ژی، ئەو گوندێن سلێڤانەیانە ئەوێن دکەڤنە بەر رووبارێ خابوری، رۆژئاڤایێ زاخو، ژوریا چیایێ بێخێری، وەك گوندێن : تیان، هێتیان، شیناڤا، قەرەولا، باچیکا، باکرما، چەم کیرك، بێداری، سەلکا ... هتد. ئەڤە ژ دەڤەرا زیبارا دکەفتە بەرزێی بادینان جودایە، ئاشکارە ژ ئالێ زمانی ڤە زێبار، زێبەر، بەرزێ، بارزان... ئێکن . ع.م
١٥١. حمدی عبدالمجید السلفی وتحسین ابراهیم الدوسکی، عقد الجمان فی تراجم العلماء والادباء الکورد والمنسوبین الی کوردستان، مکتبة الاصالة والتراث، الشارقة، ٢٠٠٨، جـ٣ ب٩١٤-٩١٥. میر محمد سالا ١٢٠٧ك/١٧٩٢ز ژ پایسکا بانی کەت وچوبەر دلوڤانیا خودێ (عبدالرحمن مزوری، مقال: بعض الحوادث الهامة فی تاریخ بهدینان، مجلة کاروان، العدد : ٨١، سنة: ١٩٨٩، ب ١٤٨، ١٥٠ ، دەهمەنا نەمرە: ١٥).
١٥٢. حمدی عبدالمجید السلفی وتحسین ابراهیم الدوسکی، عقد الجمان... جـ٣ ب ٩١٤-٩١٥.
١٥٣. محمد شفیق الزیباری، الاحوال الدریة والاخبار المسکیة فی السلسلة الزیباریة، مطبعة ام الربیعین، الموصل، ١٩٣٥، ب١٧.
١٥٤. عەبدالرحمن مزوری، ڤەکۆلینەك د بەیتا سیسەبانا خالدێ زێباری دا، کوڤارا رۆشنبیری نوێ، هژمار: ١١٩، سال: ١٩٨٨، ب ٥٢.
١٥٥. صادق بهاء الدین ئامێدی، هوزانڤانێت کورد، ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٦٤-٢٦٥ . دیسان: رشید فندی، فی ینابیع الشعر الکلاسیکی الکوردی، منشورات المجمع العلمی الکوردستانی، اربیل، ٢٠٠٤، ب ١٦٤-١٦٦.
١٥٦. عەبدالرحمن مزوری، ڤەکۆلینەك د بەیتا سیسەبانا .... ژێدەرێ بەرێ، ب٥١ . بۆ زێدە زانیاریان نڤیسینا پەیڤێن (ژ ڤی زیباریی) د نێڤ مالکا: مەکە دەعوا ژ ڤێ زێباریێ ڤەت. مینا صادق بهاء الدین نڤیسی، شاشە. چمکی د گەل قافیا گش

هۆزانێ لەنگە (ص.ب. ئامێدی، هوزانڤانێت کورد، ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٦٥، دەهمەنا نەمرە: ٢). ڤەکۆلەر تەحسین ئیبراهیم دوسکی راست نڤیسیە: مەکە دەعوا (خۆ – زێدەیە) تو ل زنبارێ ڤەت (تەحسین ئیبراهیم دوسکی وحوسێن شەمرەخی، پارچەیەك ژ دیوانا لاغەری، دەزگەها سپیریز یاچاپ و وەشانێ، دهوك، ٢٠١١، ب٦٧.

١٥٧. رشید فندی، ژێدەرێ بەرێ، ب ٦٤، ٦٦ .

١٥٨. مەلا خالدێ زێباري، سیسەبان، توژاندنا: هزرڤان، وەشانێن ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد، دهوك، ٢٠٠٧، ب٨.

١٥٩. هەرئەو ژێدەر، ب٢٦، ٣١.

١٦٠. بو نمونە دەسنڤیسێن ئەسلیێن دیوانێن: جزیری، ئەخلاتی، حەمیدی، تەیران، خانی، باتەیی ... نەگەهشتینە مە.

١٦١. محمد امین بن خیراللة العمری، ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب ٢١٠-٢١١ .

١٦٢. هەر ئەو ژێدەر.

١٦٣. رشید فندی، ژێدەرێ بەرێ، ب٦٩-٧٠ .

١٦٤. انور المائی،ژێدەرێ بەرێ، ب١٣١. ئاشکارە ئەڤە ژ حەمە کووڕێ موکریانی جودایە .

١٦٥. هەرئەو ژێدەر .

١٦٦. ئەمینێ ئوسمان، ژیان وڤیان، ژبەلاڤکرنا ئەمینداریەتیا رەوشەنبیری ولاوان، هەولێر، ١٩٨٦، ب٦٢ ـــ ٦٥. دیسان: عبدالرحمن مزوری، مقال الشاعر الخالد حمکي التوفی، مجلة : کاروان، العدد : ٤٧ لسنة : ١٩٨٦، القسم الاول، ب ١٥٥، دڤێ سترانێدا هوسا ناڤێ حەمکێ تێ : ئامێدیێ ببەرینە، د بەردا رووبارێ شینە، تژی ڤاز وقومرینە، (کوفي خوار وزەرینە)، یارکا (دوستا) حەمکێ د گەل نینە ... هتد . ع .م .

١٦٧. انور المائی، ێدەرێ بەرێ، ب١٤٨. دیسان: عماد عبدالسلام رؤوف، المعجم التاریخی لامارة بهدینان، مطبوعات الاکادیمیة الکوردیة، اربیل، ٢٠١١، ب١٥ .

١٦٨. گاپنێرکی: چیایەکێ بەرواري ژووریایە، دکەڤیتە ژێرێ کانی ماسێ، ژ رۆژهەلات بەرف رۆژئاڤا درێژ دبیت. سەبارا شەرێ گاپنێرکی بنێرە: انور المائی، ژێدەرێ بەرێ ب ٢٢٩-٢٣٠. دیسان: عبدالرحمن مزوری، مقال : بعض الوقائع الهامة ... ژێدەرێ بەرێ، ب ١٤٧ .

١٦٩. د.مسعود الکتانی، حەمکێ توڤی، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠١، ب ١٤٢، ٢٩٠ . دبەرتووکێدا مالکا، چل قەدەر ل پشت دارە، هوسا هاتیە نڤیسین . ل پشت دارە چ ئانکویا نادە، دبە ( ل پشت دیارە) بیت، ل پشت دارووباری دیارە. ب هزرا من شاشیا چاپێ بە، چل قەدەر: قوماندارێ لەشکەرێ هەکاریا بو، دشەرێدا هاتیەکوشتن (انور المائی، ب٢٢٩-٢٣٠).

١٧٠. عبدالرحمن مزوری، مقال الشاعر الخالد حمکی التوفی ... ژێدەرێ بەرێ.

١٧١. ئەڤ مالکە ل جەم د.کتانی هوسا هاتیە: ژ سپێدێ ب رەونەقتر بوی (حەمکێ توڤی، ب٢٨٣). ئاشکارە قافیا مالکێ هوسا دگەل قافیا مالکێن بەری وێ (خالان، شەمالان) ناگونجیت . ع. م .

١٧٢. صادق بەهائەدین ئامێدی، رێز وسەربەرێت ژنێنانێ وکەڤنە شەهیانە وگۆڤەند، دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٤، ب١٦.

١٧٣. سەبەق: سێ مالك یان چوار مالکێن هۆزانێ نە/سترانێنە. نیڤ مالکێن سنگی ب یەك کێش وقافیەنە، نیڤ مالکێن داوی ژی ب کێش وقافیەکا جودانە. دکارین بێژینێ: موقك، برگە ژی. ئەڤ زاراڤە (سەبەق) ل جەم کوردێن ئێزدی بەربەلاڤە. وەك ڤێ سەبەقا حەمکێ :

(حەمکێ) ببەنە بەر دەری (٧لڤ)

(حەمکێ) مــــن لاوو (٥ لڤ)

لێ برەشینن عەمبـــەری(١) (٧لڤ)

دای گـــــووری داوو (٥لڤ)

دا هەڤال ب چنە سەری(٢) (٧لڤ)

(حەمكێ) مـــن لاوو (٥لف)

(دوبارە)،

دا هەڤال ب چنە سەری (٧لف)

دای گــــووری داوو (٥لف)

١٧٤. د.كتانی: لێ رەشینن (ئاڤا!) عەمبەری (ب٢٥)، ئاڤا زێدەیە. (٢) حەمك زاڤایە دێ چنە سەری (ب٢٥). كێشا شكەستی یە. ئەگەر د. كتانی هوزانڤان نەبا، دا چەوان ڤان مالكا هاوكێش كەت ؟!). ع . م

١٧٥. د. فەرهاد پیربال، مەلا مەحمودێ بایەزیدی، دەزگای چاپ وبلاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠، ب١١١. دیسان: ئەلیكساندەر ژاپا، چیروكێن كرمانجی، ڤەژاندنا: جانكورد، دەزگەها سپیرێز یاچاپ و وەشانێ، دهوك، ٢٠٠٨، ب٧٤ - ٧٥.

١٧٦. هەرئەوژێدەر. بو زێدە زانیاریان كەلەكا شاخێ ل چیایێ جودی ژێ، دەڤەرا بوتان هەیە. ع.م

١٧٧. د. مسعود كتانی، حەمكێ توڤی، ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٧٩.

١٧٨. ئەقیلە رەواندزی، رەوەند وكوچەرەكان بە گشتی ئەرتوشیەكان بە تایبەتی، لە بلاوكراوەكانی یەكێتی ئافرەتانی كوردستان، هەولێر، ٢٠١٠، ب١٦٥. ئەمینێ ئوسمان نڤیسیە، شەكراغا كوشت وئەرگوشیان خوینە(ژیان وڤیان، هەولێر، ١٩٨٦، ب٩٦). ئاشكارە پێوەندیا ئەرگوشیان پێڤە تونە، پاراست ئەرتوشیان خوینە. شەكراغا ئەرتوشی یە، ژبابكێ گراڤی یە، مینا مەلا مەحمودێ بایەزیدی دبێژتێ (ب١١١).

١٧٩. انور المائی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠٦ .

١٨٠. محفوظ العباسی، امارة بهدینان، ژێدەرێ بەرێ، ب١٩٢ .

١٨١. د.عماد عبدالسلام رؤوف، الشجرة الزیوكیة، مكتب التفسیر للنشر والاعلان، اربیل، ٢٠٠٩ .

١٨٢. ئەڤ دەسنڤیسە هەمان دەسنڤیسا محفوظ العباسی یە، وەختێ خو بەحشتی شێخ تاها مایی بو من ژ لبا ئورگینالا وێ، فوتوكوپكربوو. بەری سالا ١٩٩٦ بچمە ئەوروپا من دابو پەرتووكخانا زانكویا دهوك، دەسنڤیس ل وێرێ پاراستیە، نە هاتیە نەمرەكرن.

١٨٣. رشید فندی، ژێدەرێ بەرێ، ج١ بث ١٢٣ .

١٨٤. رشید فندی، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب ١٢٤. بو پتر زانینێ دارا (شەجەرا) بنەمالا حاكمێن ئامێدیێ، بەری سالا ١٢٠٨ك هاتیەنڤیسین. تنێ پەرەكێ وێ دپەرتووكخانا موفتیێ ئامێدیێ رێزدار محمد شوكری دا هاتیەدیتن، سالا نڤیسینا وێ نەخویایە. ڤەكولەر محەمەدێ مەلا كەریم بو جارا ئێكێ بەلاڤكریە (محمد الملا عبدالكریم، گوتارا: فی الرسائل البابانیة واوراق قدیمة اخری، كوڤارا: كاروان، هژمار: ١٩، سال: ١٩٨٤، ب١٤٧). سالا ١٢٠٨ك دبیتە سالا نوكرنا ویا ئێكێ (پاراست سالا تەزویرا ویا ئێكێ) گوایە ذو الفقار (ناڤەكی) راستكریە (وقد صحح نسبهم من ملك خلیل الی آخر خلفاء العباسیة). هێژا د. عماد رؤوف نڤیسیە (وقد صح نسبهم) ب هزرا من شاشیا چاپێیە (د. عماد عبدالسلام رؤوف، الشجرة الزیوكیة، ژێدەرێ بەرێ، ب٨٠).

١٨٥. انور المائی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠٦-٢٠٧ .

١٨٦. محەمەد ئەمین دۆسكی، ئەرزی وبەكر بەگێ ئەرزی، دەزگەها سپیرێ ژ یاچاپ و وەشانێ، دهوك، ٢٠٠٢، ب١١١. بو پتر زانینێ (عەین و غەین و فی و قاف) ژێ، مینا ل جەم سادق بەهائەددین (ب ٤٠٣) وعەبدولكەریم فندی (ب ٥٠) هاتی، د گەل قافیا سەرەكیا بەیتا سەیرانێ (دناف، دراف، حەتاف، كاف، قاف) د گونجن. لێ چمكی (عەین و غەین و فی و قاف) د كەتە ١٢٥٠ك/١٨٣٤ز، وێگا ئەم ژسەردەمێ فەرەوریا سماهیل پاشایێ ئێكێ (مینا مێژووڤان ئەنوەر مایی هەلبژارتی) دەرباس دبین، لەوان مە ئەو بوچون نهو (كاتی) ب پشتگوهڤە هاڤێت. ب هزرا من (عەین و غەین و فی و قاف) دگەل بەیتا (تەرگێ) نینن، هەر دگەل بەیتا (سەیرانێ) نە، ب دو ڤەگێرانا هاتیە، ڤەكولەر عەبدولكەریم فندی راست نڤیسیە، د گەل قافیا بەیتا (تەرگێ) ناگونجن (ب٥٢) .

١٨٧. محەمەد ئەمین دۆسكی، ژێدەرێ بەرێ، ب٧٦. من تێبینیەك تنێ ل سەر بەرسڤا ئەرزی هەیە، ئەگەر ئەڤ بویەرە راست بە، بەرسڤا ئەرزی مینا هێژا دوسكی نڤیسی، نە كوردیەكا رەهوانە، نە ژێ هوزانە. راستیا ڤێ بەرسڤێ مینا من ژ خەلكێ

ئامێدیێ وبامەرنێ بهیستی هوسایە، ئەرزی د بەرسڤا میری دا گۆت:

**مەستێ فنجانــا غممێ مە و ئاشقێ قەهوا تەحــل**

**دێ هنارکــا بەینە دەشتێ، سەربسەر دەینە بەدەخــل**

ڤەکۆلەر عەبدولکەریم فنـدی ژی ئەڤ مالکە بەلاڤکریە، کرینە دو مالکێن هۆزانی، ژ زاردەڤێ مەلا عەبدولمەجید عەبدولغەفور کەلەش ڤەگوهاستینە (عبدالکریم فنـدی، دیوانا بەکر بەگێ ئەرزی چاپخانا الحوادث، بەغـدا، ١٩٨٢،ب ١٤).

١٨٨. سادق بەهائەددین ئامێدی، هوزانڤانێت کورد، ژێدەرێ بەرێ، ب٤٠٨. عەبدولکەریم فندی، ژێدەرێ بەرێ، ب ٧٢. محەمەد ئەمین دۆسکی، ژێدەرێ بەرێ، ب ١٣٢.

١٨٩. محەمەد ئەمین دۆسکی، ژێدەرێ بەرێ، ب٧٤ .

١٩٠. فەق، فەقی، فەقەهـ ... د کوردیدا، کورتکرنا پەیڤا (فەقیە) یاعەرەبی یە. ع. م

١٩١. عەبدولرەحمان مزوری، گوتارا: شەش هۆزانێن نەبەلاڤکرینێن شەش هوزانڤانێن کورد، کوڤارا: رۆشنبیری نوێ، هژمار: ١٢٩، سال: ١٩٩٢، ب ١٢١.

١٩٢. محمد علی بن عبدالحمید خان الاتروشی، تذکرة الخلان فی بیان فضل ذکر الرحمن، دەستڤیسە ب خەتێ محمد طاهر بن مصطفی النوری البریفکی یە، سالا ١٣٢٨ك هاتیەنڤیسین، ب١٠٥. لبەکا فوتۆکوپکری دپرتووکخانا نڤیسەرێ گۆتارێ دا هەیە، ژ پەرتووکخانا شێخ بەشیر محەمەد تاهر بریفکی و رکافی هاتیەوەرگرتن.

١٩٣. نور الدین البریفکانی، البدور الجلیة، تحقیق: وحیدالدین قطب الدین البریفکانی، مطبوعات الامانة العامة للثقافة والشباب، اربیل ١٩٨٦، ب٩٣. بۆ زێدە زانینێ شێخ نورەلدین ددەستڤیسا ئورگینالا پەرتووکا ناڤبریدا، دو جاران باسی بریفکان وەك گوندێ خو کریە. جارەکێ تنێ گۆتیە: اصلا ومولدا. لێ توژەرێ پەرتووکێ وحیدالدین البریفکانی ژنك خو پەیڤا (ومولدا) ل جارا دوێ زێدەکریە، نەمازە پەرتووك مینا ئەو دبێژێ ل سەر لبا ئورگینالا دەستڤیسێ، کو ب خەتێ دانەری یە، هاتیە توژاندن (ب١١). بنێرە : دەستڤیسا پەرتووکا: البدور الجلیة یاشێخ نورەلدینێ بریفکی، ب خەتێ دانەری، سالا ١٢٣٨ك/١٨٢٢ز ل هێنیت، هاتیەنڤیسین، ب١١٠. لبا ئورگینالا وێ دپەرتووکخانا نەڤیێ وی شێخ مەئمون نور محەمەد بریفکانی دا هەیە.

١٩٤. انور المائی ژێدەرێ بەرێ، ب٨٢. محفوظ العباسی، امارة بهدینان، ژێدەرێ بەرێ، ب١٤٣. عبدالرقیب یوسف، دیوانا کرمانجی، ژێدەرێ بەرێ، ب ١٥٠ . محمد سعید بن ملا یاسین البریفکانی، ژێدەرێ بەرێ، ب ٦٧ .

١٩٥. دەستڤیسا دیوانا شێخ نورەدینێ بریفکی، توژاندنا: نڤیسەرێ گۆتارێ، ١٩٧٩، ب٥-٦ . بۆ زێدە زانیاریان سەبارا دەستڤیسا: فیض الحال ... سالا ١٢٧٢ك/١٨٥٥ز هاتیەنڤیسین، لبەك ژێ دپەرتووکخانا تەکیا تالەبانیادا ل کەرکوك هەیە.

١٩٦. هزر بۆ هندێ دچیت، هنەك خەلیفە وموریدێن شێخ نورەدینی، زندێ وی کریە ١٢٠٥ك، دا ژیێ وی تەمەت ژیێ پێغەمبەری (س) لێبێت، بیتە ٦٣ سال، نەمازە شێخ نورەلدین سالا ١٢٦٨ك چویەبەر دلوڤانیا خودێ.

١٩٧. شێخ عەبدولجەبار سالا ١٢٣١ك/١٨١٥ز ل هێنیت چویەبەر دلوڤانیا خودێ. ل گۆرستانا رۆژهەلاتێ گوندی هاتیەڤەشارتن. ع.م

١٩٨. محمد بن جرجیس النوري القادري، دەستڤیسا: تحفة السالکین علی قصیدة الشیخ نورالدین. ب خەتێ محمد بن احمد، سالا ١٢٨٦ك هاتیەنڤیسین، ئورگینالا وێ دپەرتووکخانا ئەوقافا مووسل دا، ل بن نەمرە: ٦١ ــ الجامع الکبیر هەیە. دیسان: وحیدالدین قطب الدین البریفکاني، الاسرار والمعاني للشیخ نورالدین البریفکاني، مطبعة جعفر العصامي، بغداد، ٢٠٠٤، ب٢. دیسان: محفوظ العباسي، امارة بهدینان العباسیة، ژێدەرێ بەرێ، ب١٤٤.

١٩٩. محفوظ العباسي، الامام محمد الرضواني، مطبعة الجمهور، الموصل، ١٩٨٢، ب١٩٣.

٢٠٠. دیوانا محەمەد سەعید میهری، ب خەتێ وی، ب٥٠ . دەستڤیسا ئورگینالا وێ دپەرتووکخانا نەڤیێ وی ئەندازیار بلند محەمەد شوکری ئاکرەیی دا هەیە.

٢٠١. زاهد بریفکانی، دیوانا شێخ نورەدینێ بریفکی، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢، ب٢٥ . هێژا بریفکانی دبێژێت شێخ ئیسلامێ شوشی ئەڤ هوزانە دپەرتووکا: ملحم الاکباد دا نڤیسیە. لبەکا فوتوکوپکریا (ملحم الاکباد) دپەرتووکخانا نڤیسەرێ گۆتارێ دا هەیە، ژ لبا شێخ نوری مەمدوح بریفکی هاتیەوەرگرتن. چاڤێ من تێدا ب ڤێ هۆزانێ نەکەفت. دوور نیە دپەرتووکا: راحة الفؤاد دا یاشێخ شەمسەدینێ شوشیدا هاتبیتەنڤیسین، نەمازە ئەو ژی ب خەتێ شێخ ئیسلامێ شوشی یە و دگەل لبا ئورگینالا (ملحم الاکباد) هاتبوو جزوبەندکرن. مخابن دوەختێ خودا من فوتۆکوپ نەکریە. ع . م

٢٠٢. مه گۆتارەك ل سەر ژیان و بەرهەمێ هۆزانڤان عەبدولرەحمان خاكی د كوڤارا : هاڤیبون، هژمارا : ١، سالا ١٩٧٩، ب ٧٣، بەلاڤكریه .
٢٠٣. دەسنڤیسا پەرتووكا : گلزار، فەهاندنا : محمد سعید میهری، نڤیسینا : عەبدولرەحمان شەوقیێ بامەرنی، سالا ١٣٠٣ك/ ب ٥٤.
٢٠٤. حوزنی: ل ڤێرێ دا ناسناڤێ هۆزانێ عەبدولرەحمان شەوقیێ بامەرنی یە. ئەڤە ژ حوزنێ بریفكی (محەمەد تاهرێ كورێ شێخ مستەفایێ بریفكی) جودایە. ع. م
٢٠٥. عەبدولەحمان مزوری، گوتارا: هوزانڤانێ پایەبلند محەمەد سەعید میهری، كوڤارا: كاروان، هژمار: ١٠، خولی راپەرین، سال: ١٩٩٤، ب ٤-٨.
٢٠٦. تەحسین ئیبراهیم دوسكی ومحسن ئیبراهیم دوسكی، هەلبەستڤان سەیفیێ شوشی وبەرهەمێ وی، چاپخانا خەبات، دهۆك، ١٩٩٩، ب ٦٧ .
٢٠٧. د.مسعود الكتانی، المساجد والمدارس ... ژێدەرێ بەرێ، ب ٢١٦ .
٢٠٨. داؤود الجلبی، ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٥٠. دیسان: د.عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافیة مغمورة ... ژێدەرێ بەرێ، ب ١١٩.
٢٠٩. كوركیس عواد، ژێدەرێ بەرێ، ب ١٧٦ .
٢١٠. سالا ئێكەمین چاپا پەرتووكا: خزائن الكتب القدیمة فی العراق یا كوركیس عواد.
٢١١. د.عماد عبدالسلام رؤوف، المعجم التاریخی ... ژێدەرێ بەرێ، ب ١٢٥ .
٢١٢. د.عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافیة مغمورة ... ژێدەرێ بەرێ. ب ١١٧ .
٢١٣. د.مسعود الكتانی، مدرسة قبهان، مطبعة هاوار، دهوك، ٢٠٠٩، ب ٢٢٢،٢٢٨، ٢٩٥.
٢١٤. د.مسعود الكتانی، مدرسة قبهان، مطبعة هاوار، دهوك، ٢٠٠٩، ب ٢٢٢،٢٢٨، ٢٩٥.
٢١٥. د.مسعود الكتانی، مدرسة قبهان، مطبعة هاوار، دهوك، ٢٠٠٩، ب ٢٢٢،٢٢٨، ٢٩٥.
٢١٦. د.مسعود الكتانی، المساجد والمدراس ... ژێدەرێ بەرێ، ب٢٠٨ .
٢١٧. د.مسعود الكتانی، مدرسة قوبهان، ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٢٢، ٢٢٩
٢١٨. داؤود الجلبی. ژێدەرێ بەرێ، ب ١٣٠.
٢١٩. د. مسعود الكتانی، المساجد والمدارس... ژێدەرێ بەرێ، ب ١٨٤، ٢٠٧.
٢٢٠. محمد سعید یاسین البریفكانی. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢١ .
٢٢١. داوود الجلبی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٥٤ .
٢٢٢. انور المائی. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠٩ .
٢٢٣. كوركیس عواد. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٤ .
٢٢٤. داوود الجلبی. ژێدەرێ بەرێ، ب٢٥١ .
٢٢٥. محمد علی القرەداغی، كنوز الكورد .... ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢١٥ .
٢٢٦. محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژاندنەوەی مێژوووی ... ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب ١٣.
٢٢٧. محمد احمد الكزنی، ژێدەرێ بەرێ، ب ٤٤ . دیسان:
د.عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافیة مغمورة ... ژێدەرێ بەرێ، ب٢٧.
٢٢٨. دەسنڤیسەكا ڤێ پەرتووكێ دسالێن حەفتێیاندا (١٩٧٠-١٩٧٩) دپەرتووكخانا شێخ مەمدوح بریفكی دا هەبوو، نهو چارەنڤیسێ وێ نەدیارە. ع. م.
٢٢٩. سەید عەلیێ ئەیتوتی، هوزانڤانەكێ مللیێ ناڤدێرە، دسەدساڵییا نوزدێدا ژیایە، هیڤیدارم ل ڤان نێزیكا تشتەكێ ل سەر بنڤیسم. ع . م .
٢٣٠. د. مسعود الكتانی، المساجد والمدارس... ژێدەرێ بەرێ، ب ١٠١-١٢٤.
٢٣١. هنەك پەرتوكێن پەرتووكخانا هێژا محەمەد فوئاد بامەرنی .
٢٣٢. د.مسعود الكتانی، المساجد والمدارس... ژێدەرێ بەرێ، ب ٢٢٢، ٢٦٨.

# رەگەزێن هۆنەری بۆ هێماییێن ئارمێ میرگەها بەهدینان

د.عەبدوللا خورشید قادر
وەرگێران: هشیار رێكانی

## دیوانخانا میرگەهێ:

دیوانخانا میرگەهێ د بازێرێن ئیسلامی یێن كەڤندا، ئەو ئاڤاهیە یێ دەستەلاتا سەرەكی ل بازێرێ دحەوینیت و ب رۆلێ دەستەلاتا ب جهئینانێ و سەركردایەتیا سیاسی و رێڤەبەریا بازێری و دەڤەرێن سەر ب بازێریڤە رادبیت ئەو وەكی ئاڤاهیێ پارێزگەهێ یە دچاخێ نویدا و میر یان والی و خێزانا وی و زێرەڤان و هاریكارێن وی دوی ئاڤاهیڤە ئاكنجی دبن و گرنكترین ئاڤاهی ل بازێری پێك دهێن و ل ناڤەندا بازێری وەكی تەوەرێ بازێری یان ژی ل سەر كەلهێ و یا جیاوازە دشێواز و قەبارەدا ل دووڤ جۆرێ حوكمەت و كۆمەلگەهی و ئەو دیوانخانا میرگەهێ ب پلەیا دووێ دهێت ل دووڤ گرنكیێ و دیوانخانە دچاخێن راشدی و ئەمەوی دا دكەڤتە نێزیكی مزگەفتێ یان ژی ب تەنشت مزگەفتێڤە و بەرقبیلە، وەكی پێغەمبەری (س.خ) دەما مالا خۆ ب تەنشت مزگەفتێڤە ئاڤاكری و پاشی مزگەفت ژ دیوانخانا میرگەهێ ل چاخێ عەباسییان هاتە جوداكرن، كۆ جادەیێن بەرفرەهـ دناڤبەرا واندا ژێك جوداكرن بۆ مەوكبێن خەلیفە و والییان ل دەمێ دەردكەفتنە نڤێژێ.

دگەل ناڤەندكرنا پڕانییا دیوانخانێن میرگەهێ ل بازێرێن مەزن لێ بەلێ هندەك كەلهە هەر ب وی رۆلی رابوون، و ژ وانا كەلها هەسنكێف و كەلها هەولێر و زێدەباری بازێر و كەلهێن كوردی كۆ بوونە ناڤەندێن دەستەلاتێ وەكی بازێرێ ماردین و میافارقین و ئامەدێ.

ژ بەر كێمیا پێزانینێن بەردەست ل دۆر دیوانخانا میرگەهێ ل بازێرێن كوردان و ژ وانا ئامێدیێ، ئەم دشێین هەڤسەنگیێ دناڤبەرا دیوانخانا میرگەهێ ل مووسل و دناڤبەرا دیوانخانا میرگەهێ ل بەسرە و كۆفە بكەین. ژ بەر كۆ ئەو ژی وەكی میرگەهێن كوردانە، یا ئاشكرایە كۆ روخسارێ میرگەهێ یێ چوار گوشە بوو و رەنگێ بەرەڤانیێ لێ هەیە وەكی چارچوڤەكرنا وی ب شویرهێن ستویر و برجێن بازنەیی ل سەر هەنە و هەر چوار لایێن وێ ب برجێن دیار دهێنە نژاندن. روخسارێ وێ نیڤ بازنەیی یە و یانژاندی بوو ب كەڤر و خیزی.

حوكم لێ دهاتەكرن ژ بەر كۆ بارەگایێ میری یان والی بوو، كو درێكا وێ را رێڤەبەریا هەمی كاروبارێن پەیوەندی ب كارگێری و دارایی و دادوەریێ ڤە هەی دهانە كرن و ب ڤێ چەندێ دبوو ناڤەندا كارگێریێ و ژێدەرێ هێزا وێ.

**ئاڤاهیێ میرگەهێ ل ئامێدیێ(دار الاماره فی العمادیه)**



ژێدەر: ڤەکۆلەر

## دیوانخانا میرگەهێ ل ئامێدیێ:

دیوانخانا میرگەهێ ل ئامێدیێ دکەڤیتە لایێ باکووری رۆژهەلاتێ ژ کەلهێ ویێ ل تەنشت دەرگەهێ رۆژهەلاتێ ئەو ئاڤاهییە و شوینوارەکێ کەڤنە، خانیەکێ چوار گوشەیە و ژ دو نهۆمان پێکهاتییە و نهۆما ئێکێ یا خزمەتکار و زێرەڤانان بوو و یا دووێ ب ناڤبرەکێ دبوو دو پشك پشکا ئێکێ: جهێ دەستەلاتداریێ و دامودەزگەهێن میرگەهێ کۆ دیوانخانە بوو و بەرامبەری رۆژئاڤا بوو، و بەرسڤەکا مەزن پێشبەری باژێری لێ بوو.

لێ پشکا دویێ: یا بەرهەڤکری بوو بۆ ژنکا و خێزانێن میران و پێشبەری و دەشتیلۆکێ و گەلی و دیکلۆکێ بوو ژ ئالیێ رۆژهەلاتێڤە، گەلەك بەرسڤك هەبوون پێشبەری دۆلێ[1].

یا دیارە کۆ کۆچکا کارگێریێ ل باژێری ب دروستی نەمایە ب تنێ دەرگەهـ نەبیت ئەوێ مایی، کۆ ئارمێ میرگەهێ ل سەرێ دەرگەهی یە، پێکهاتییە ژ وێنەیێ بالندێ سیمەرخێ و دو مارێن مەزن ل بن پێن وێنە کو ب رەنگەکێ دیار ل سەر شەش بارچێن بەرێ حەلانێ سپی ب بلندیا ٤. ٣١م هاتییە نەخشاندن و ئەو پارچا بەری یا وێنەیێ سیمەرخێ ل سەر ب قەبارێ (٥٥سم×٧٥سم)ە و بلندیا ژ ناڤدایا دەرگەهی(٣. ١٨)م و فرەهی (١. ٩٥) م. و ئارم ئێکسەر پێشبەری جادێ یە

ئەڤە گروڤێ وێ چەندێ یە کۆ میرێن ڤێ میرگەهێ وەکی وان ماران ب هێز بوون،

مار هیمایێ ترس و لەرزێ یە ددەرۆنێ مرۆڤیدا و سیمەرخ[٢] ژی خوارنا تێشکێن خۆ دسینگێ خۆدا دهەلگریت و ئەڤە ژی گروڤێ باشییا حوکمەتێ یە و شەڤبێری و دلسۆزییا وێ دگەل خەلکی و مار یێ ب ناڤودەنگە ب زانین و شارەزاییێ و سیمەرخ ژی یا ب ناڤودەنگە کۆ خوارنا تێشکێن خۆ دبەرچیسکا سینگێ خۆدا دهەلگریت ول رۆژێن پەیدابوونا برسێدا ب دمێ خۆ سینگێ خۆ شەق دکەت دا ب خوینا خۆ خوارنێ بدەتە تێشکێن خۆ و ب دلشادی بمریت لێ ئالایێ میرگەهێ ئالایێ رەشێ عەباسییان بوو و ئەڤ ئالایە ژ رەگەزێن سەرەکی و گرنگێن شارستانییا مێزوپوتامیا بوو ئالای گرنگییەکا مەزن دژیانا مرۆڤیدا هەیە هەر ژکەڤن وهەتا نهۆ، ئالا ئانکۆ قەبارێ بچووکێ دەولەتێ یان کۆمەکا مرۆڤان سەر ب وێ دەولەتێڤە.

دیرۆکا وێ: دبیت دیوانخانا میرگەهێ ل سەردەمێ مەلك خەلیل[٣] هاتبیتە ئاڤاکرن و ل سەردەمێ سولتان حسێن وەلی (٩٤٠-٩٨٤مش/١٥٣٤-١٥٧٦ز)

**دەرگەهێ کوچکا میرگەهێ ل ئامێدیێ باب قصر الامارة البهدینانیة في العمادیة**



ژێدەر: ڤەکۆلەر

هاتبیتە نووژەنکرن.

لێ نهۆ یێ ژناڤچووی و ب تنێ دەرگەهـ مایە و ئارمێ میرگەهێ ل سەرە، ل سالا ١٩٥١ز. باژێرڤانیا ئامێدیێ دەست ب خرابکرنا یامایی ژ ئاڤاهیێ میرگەهێ کر و ل جهێ وێ خویندنگەهەکا سەرەتایی ئاڤا کر و ب تنێ دەرگەهـ هێلا، کو دەرگەهەکێ شوینواری یە و داخـواز ژ رێڤەبەرێ ڤەکۆلینێن ئیسلامی یێن هۆنەری کر کۆ سەریەرشتییا خرابکرنا دەرگەهی بکەت و ئەو بەرێن شوینواری یێن پێدڤی چاڤدێریێ بهێنە ڤەگوهاستن بۆ مۆزەخانا مویسل .

یا مایی ژ دیوانخانا میرگەهێ ئەو دەرگەهە و ئارمێ میرگەهێ ل سەرە، و ل هەر دو رەخێن کڤانێ دەرگەهی دو مارێن مەزنن ل سەر مەرمەری (حەلان) هاتینە نەخشکرن و هەر ئێك خۆ تێك دئالینیت بۆ سەری و سەرێن وان ل سەرێ کڤانێ دگەهنە ئێك و دسەردا وێنەیێ سیمەرخەکێ دیارە ل سەر مەرمەری ب قەبارێ (٧٥سم×٥٥سم) یێ هاتییە نەخشکرن و هەر پێیەکێ وێ یێ ل سەر سەرێ مارەکی، زکێ بالندەی و پێن وی وەکی یێن مرۆڤانە، دەمێ مرۆڤ تەماشە دکەتێ وەسا دیارە یێ شەری دکەن.

## رەگەزێن هۆنەری بۆ هێماییێن ئارمێ میرگەهێ:

وێنەیێن مرۆڤ و گیاندارێن چیڤانۆك و راستی ل سەر هندەك دەرگەهێن باژێرێ ئامێدیێ هەنە، وەکی دەرگەهێ رۆژئاڤا (دەرگەهێ مویسل)، و دەرازینکا بلندا دەرگەهێ دیوانخانا میرگەهێ، وێنەیێن گیاندارێن چیڤانۆك ل سەر دەرگەهێ کەنیسا مارحودینی ژی هەنە. دیسان ل سەر مزگەفتا ئیمام باهر و مزگەفتا عومەر ئەلئەسوەد ل باژێرێ مویسل ژی هەنە. و نە تشـتەکێ سـەیرە کۆ ئەڤ وێنەیە ل سەر دەرگەهێ کەنیسا مار حودینی هەبن، چونکوو ئەڤە نە دژی ئۆلێ کریستیانانە، لێ تشتەکێ سەیرە ئەڤ وێنەیە ل سەر دەرگەهێ ئامێدیێ، ژ بەر بنەمایێن دژایەتیا وێنەیان و بوونەوەرێن زیندوو ل نك مووسلمانان.

و هەژی گۆتنێ یە کۆ ئەو وێنەیێن مرۆڤ و گیاندارێن هاتینە بەحسکرن ئەو ب خۆ نە سەربەخۆ نە، لێ پێکڤە رامانا بابەتێن ژێك جودا ددەن، کۆ هندەك ژ وان بوونەوەرێن چیڤانۆکن، لەورا ئەم دێ ڤان بابەتان و بوونەوەران شرۆڤە کەین و دێ دەست ب پێزانینان ل سەر وێنەیێن مرۆڤ و گیانداران کەین و دێ داکۆکیێ ل سەر تایبەتمەندیێن وان و چەوانیا بەلاڤبوونا وان دهۆنەرێن کەڤندا ب رەنگەکێ گشتی و هۆنەرێ ئیسلامی ب رەنگەکێ تایبەت دچاخێن جودا جودا دا و ل سەر بەرمایکێن شوینواری یێن جۆراو جۆر، و ئارمێ میرگەها بەهدینان رەگەزێن وێ یێن هۆنەری ڤەدگەرن بۆ چاخێن دیرۆکی یێن دێرین وەکهەڤن دگەل رەگەزێن هۆنەری یێن سۆمەری یێن چیڤانۆکی و ناڤەرۆکا وان ئێکە. ئارمێ میرگەهێ ئانکۆ سیمەرخا چەنگێن خۆ بەلاڤکرین وەکی ئەلهۆ یا باژێرێ (حەزەر)ە و هەر پێیەك ژ پێن وێ کۆ دانابنە سەر سەرێ مارێن مەزن وەکی مارێن چیڤانۆکی یێن هۆنەری یێن سۆمەرینە. ئەڤا ل خوارێ کورتیەکە ل سەر هەر دو هێمایان:

### ١ - سیمەرخ:

سیمەرخ ژ گیاندارێن کێم وێنەیە دهۆنەرێن کەڤندا. کو ل کوردستانێ هەر ژ چاخێن بەری یێن نوی هاتییە پیرۆز کرن، ل دووڤ دیار کرنا هەلکۆلینێن شوینوارکی ل جهێ زاوی چەمێ[٤] ل تەخا ( B) تەخا شەشێ، ب کویراتیا (١. ٢٥م-١. ٥٠م) کۆ هەستیکێن هژمارەکا بالندێن گۆشخۆر مینا (سیمەرخ، ئەلهو، باز) هاتینە دیتن و ل کوردستانا ترکیا ل جهێ (چەتەل هۆیۆك) هەستیکێن وان بالندان ل بن یان دگەل هەستیکێن مرۆڤان دیتینە.

ل جهێ (نـەمـریـك)[٥] سەرێن وان بالندان نەخشاندی ل سەر بەری دیتینە ئانکۆ سیمەرخ وەسا هاتییە دیتن هێمایەکێ ئۆلی بوو پتر ژ کۆ بالندەکێ ئاسایی بیت و ئەلهۆ دگەل خوداوەند نینوریا هاتییە گرێدان، کۆ هێمایێ سۆلجانێ

## ئارمێ میرگەهێ (شعار امارة بهدينان)



ژێدەر: ڤەکۆلەر

ب سەرێ ئەلهۆیێ و سۆلجانێ ب سەرێ ماری (ئەژدەها) ل سەر عەرەبانێن شەری یێن ئاشۆری دانابنە و وەسا هاتییە شرۆڤەکرن کۆ ئەڤ عەرەبانە تایبەتمەند بوون ب خوداوەندێ جەنگێ ترگال و نینورتا. و وێنەیێ ئەلهۆیێ ل سەر ئالایێ (حەزەر) ب رەنگەکێ دیار و مەزن هەیە کۆ هەر دو چەنگێن خۆ ڤەکرینە و دبیت ئەو ئەلهۆیێ چەنگێن خۆ ڤەکری هێمایەک بیت ژ هێمایێن خوداوەندێ رۆژێ. و ل مصرا کەڤن ئەلهۆ ئانکۆ هێمایێ خوداوەند حورس خوداوەندێ ئەسمانی ب وێنەیێ ئەلهۆیێ چەنگ ڤەکریێ بۆ ئەسمانی دفریت و ئەلهۆ ل سەر هندەک ئەنتیکێن ئیسلامی دیتینە، و ب تایبەتی هەر ژ چاخێ حەفتێ مشەختی و شووندا وەکی ئەنتیکێن کانزایی وئاڤاهیان و مەحفویران دیسان دەرگەهێ زیندانا بازێرێ ئاکرێ ژی هاتبوو نەخشکرن و ل وەلاتێ میزۆپۆتامیا هەسپێ ب چەنگێن ئەلهۆیێ هێمایێ رۆژێ بوو، ئەو هێمایێ دپرانییا شوینوارێن بەهدینانڤدا دهێتە دیتن، لەورا دبیت ئەلهۆ خوداوەندێ پارێزەرێ بازێری بیت و هێمایێ دەستەلاتا وی یا شەڤبێری بیت ل سەر تەناهیا هەڤوەلاتیان و وەسا دهێتە دیتن ئەلهۆ خودان دیمەن و وەسفێن هۆنەری یە و دەربرینێ ژ بزاڤ و پێکۆلا مەزنکرن و زێدەکرنا وێنەیان ب رەنگەکێ زیندوو ب بزاڤ و نێزیکی دۆرهێلێ دکەت و ئەڤ وەسفە نیشانا زیرەکیا هۆنەرمەندانە ل سەر زانستێ شرۆڤەکرن و سروشتێ گیاندارێن جودا جودا یێن کۆ ب هەلکۆلینا وان رابووین.

## ٢-مار (ئەژدەها)[١]:

د هۆنەرێن بەرێ یێن ئیسلامێدا هەیە و دپرانییا وان هۆنەراندا مەبەست ژێ گرۆڤ و هێمایێن تایبەت بوو، هەتا کۆ سروشتێ زوخرفی ژی ببوو تشتەکێ ئێکلایەنی ل هەمبەر گرۆڤ و هێمایان. ل عیراقێ مار دهۆنەرێ سۆمەریدا هاتییە دیتن، وەکی ئێک ژ رەگەزێن هێمایێ مەلک گۆدیا ژێ پێکهاتی. و مار هێمایێ شەری و هێزا بەردکارە. و د چیڤانۆکێن سۆمەریدا پەیوەندی ب چیا و دارستانان ڤە هەیە، دەمێ گلگامش دگەل هەڤالێ خۆ ئەنکیدۆی دئاخڤیت و دبێژیتێ (لارتقین خۆ ل چیایێ ئەرز ئاسێ

كرییە.. و ل دارستانا (خمبابا) یا ب ترس ئاكنجی بوویە دا ئەم پێكڤە وی بكوژین و شەر و بەدكاریێ ل جیهانێ نەهێلین).

مار د میتولوژیا سۆمەری دا ئانكۆ بن دنیا یاكۆ دبێژنێ (KUR) كۆ دزمانێ سۆمەریدا ئانكۆ چیا و دیسان رامانا وێ گۆرە ژی (مرن) كۆ ئەو ناڤەكە ژ ناڤێن بن دنیایێ (جیهانا مریان).

دیسان ئەلهۆیێ پەیوەندی هەیە ب چیڤانۆكێن دی یێن سۆمەری ڤە ژی هەر وەكی چیڤانۆكا گلگامش و دارا خەلبوالتی یاكۆ خوداوەند ئەنانا چاڤدێریا وێ دكەت و بالندێ زۆ بۆ ئیشكێن خۆ هێلین ل سەر چێكری و ماری ژی لایێ بنی كرییە مالا خۆ و ژ بەر خەمباریا خوداوەند ئەنانا گلگامش چوو هاریكاریا ئەنانای و مار ڤەكوشتی و بالندە ژی ژێ دەرئێخستی.

مار د هۆنەرێ ئاشوری دا رەڤۆكە ژ لایێ خوداوەندێ ئەسمانی ڤە لێ دهۆنەرێ بابلی دا ئانكۆ خوداوەندێ مەردۆخ خوداوەندێ نەتەوەیی یێ بابلیان.

دیسان مار د هۆنەرێ (حەزەر) یا عیراقێ دا ژی هەیە ، سەرەرای ئەڤا مەبەحسكری، مار د هۆنەرێن بیانیێن كەڤندا ژی وەكی هۆنەرێ (حثی)، دیسان شارستانیا چینێ ژی مار پیرۆز راگرتیە وەك هێمایێ ئیمپراتۆریێ پیرۆز دیسان د هۆنەرێ كرستیاناناداژی هاتیە و دیسان گەلەك هۆنەر ژێ پەیدا بووینە وەكی هۆنەرێ قبتی ل مصرێ.

دئەڤا بووریدا بۆمە دیار بوو كۆ مار هێمایێ خرابیێ یە دشارستانیا میزۆپۆتامیادا و باشترین گرۆڤە بۆ ڤێ چەندێ چیڤانۆكا نەوروز یا ب ناڤودەنگە دناڤبەرا كورد و پرانیا گەلێن ئاری دا دەما ملێن دەستەلاتدارێ زۆردار (زەحاك) ب هێماییێ دو مارێن هار كۆ تەنا نابن ئەگەر رۆژانە ب خوارنا مەژیێ دو لاوێن كورد نەبیت، لەورا كاوەیێ ئاسنگەر شۆرەشی گێرا و ئەو دەستەلاتدارێ چیڤانۆكێ زۆردار كوشت و دبیت مار د ئارمێ میرگەها بەهدینانداهێمایێ خرابێی و هێزا بەدكار بیت، كۆ خەلكێ ئامێدیێ دناڤبەرا خۆدا سەرهاتییەك چێكرییە ل دۆر ماری ب رەنگەكێ چیڤانۆك و وێنەیێ ماری و سیمەرخێ د ئارمێ میرگەهێدا درێژی پێدانەكا دیرۆكی یە یا چیڤانۆكا ئینانا و ئەلهۆیێ.

ل بازێرێ نینور ئامانەك هاتیە دیتن كەڤناتیا وێ بۆ چاخێ سۆمەریێن كەڤن دزڤریت، وێنەیێ دو ماران ل سەر هاتییە نەخشاندن و سەرێ وان باش یێ دیارە و دناڤ دەڤێ وان یێ ڤەكریدا ددانێن وان دهێنە دیتن.

مار ژ نیشانێن مەلكی بوو ل چینێ لێ ل نك هۆنەرمەندێ مووسلمان د وێنەیێن وی دا نە تشتەكە و ساسانیان ژی ئەڤ گیاندارێ چیڤانۆك ژ چینیان وەرگرتییە، وێنەیێ ماری ل سەر پارچەكا پەرۆكی نەخشاندیە كو ئەو جلك بوو یێ كیسرایێ دووێ دەما ل هەسپێ خۆ سوار دبوو دكرە بەرخۆ و مار ل سەر ئالایێن مەلكێ ساسانی ژی دهاتە وێنە كرن وەك نیشانا هێز و ترس، كۆ ئالایێ ساسانی (درەفشێ گاویان) هەر وەك چیروكێن دیرۆكی دبێژن پێكهاتبوو ژ چاكۆچێ گاوگك (كاوە) كۆ ل چاخێن كەڤنێن چیڤانۆكی خەلكی ب رێبەریا كاوەی شۆرەش دژی مەلكێ زۆردار (زەحاك) بەرپا كری، لێ وەسفێن مایی ژ ڤی ئالایێ مەلكی ل چاخێ دوماهیا دەستەلاتا ساسانی هاتییە دیتن. و ژ كەڤن وەرە چیڤانۆك ل وەلاتێ فارس هەبوون و ب تایبەتی كوشتنا ماری، دەمێ ئەردەشیرێ ئێكێ رادبیت ب رشتنا كانزایا حەلاندی ددەڤێ مارەكی دا ب ناڤێ (هەفتان پوخت) و دجهدا دكوژیت و مەردۆخ ب كوشتنا مارەكی ب ناڤێ (تیامەت) كۆ دەما بێهنا (صرصرا) كرییە دەڤی وی ماری و كوشتی.

رایس (Rice) دبێژیت مار (ئەژدەها) ژ بەرماییكێن شارستانیا میزۆپۆتامیا یا كەڤنە ئەڤە ژ لایێ رەگەزیڤە لێ ژ لایێ شوینواركیڤە هندەك مۆر یێن لۆلەیی هاتینە دیتن كۆ وێنەیێ مارێن تێكەلێك یان مارێن گەلەك سەر ل سەر هاتییە نەخشكرن و ژهەمیا ب ناڤودەنگتر مۆرەكا لۆلەییە كەڤناتیا وێ بۆ نفشێ ئەكەد (هزار سالیا سیێ (پ. ز) دزڤریت كۆ وێنەیێ هندەك پالەوانانە بزاڤا كوشتنا درندەیەكێ حەفت سەر دكەن. دیسان گیاندارێن چیڤانۆك میناكی هێزەكا سێربەندبوون بۆ بەرسینگگرتنا

دوژمنان و زێرەڤانیا دەرگەهێن باژێرێن کەڤن، کۆ ئەڤ گیانداره ل وەلاتێ میزۆپۆتامیا هاتینە نەخشاندن هەر وەکی مەبەحسکرین و ددانانە سەردەرگەهێن باژێران یان ل سەر شویرهێن وان دهاتنە نەخشاندن.

ئەڤ گیانداره درێژەکێ دا گەلەك جاران دوبارە یە و لەشەکێ جوان و ستۆیەکێ درێژ و سەرەکی وەکی سەرێ ماری و خودان شاخ هەیە و ئەزمانێ خۆ کێشایە دەرڤە و پێن وی پێن پێشین وەکێ پێن شێرانە و پێن پاشین وەکی پێن ئەلهۆیانە.

دبێژن نهێنی ددانانا ڤان پەیکەراندا چاندنا ترسێ بوو ددلێ دوژماندا هەتا نێزیکی ڤێ رێکێ نەبن لەورا چین یا ب ناڤودەنگە ب پرانیا ب کارئینانا وێنەیێن ماران د هۆنەرێن خۆ یێن جودا جودا دا و ب رەنگێ ماری دهاتە وێنە کرن و سەرێ گیاندارەکێ درندە وەکی یێ گورگی پێڤە بوو کۆ ددانێن دیار و تیژ پێڤە بوون و هندەك جاران چەنگ ژی پێڤە بوون و پاشی هۆنەرێن رۆژهەلاتا نێزیك ژی پێ کاریگەر بوون کا چاوا وەلاتێ چینێ مار وێنە دکر و جهێ ماری د ئۆلێ کریستیاندا نیشانا غەدر و خیانەتێ یە و ژێدەرێ خرابکاری و شەیتانی یە، و زێدەباری ڤێ چەندێ مار یێ بوویە هێما بۆ هەر کەسەکێ ترسێنەر د جیهانا کریستیاناندا ب تایبەتی.

ل سەردەمێ ئیسلامێدا ل چاخێ ئەمەوییان مار ل سەر قەسرا (عمرە) دیار بوو، و پاشی ل سەر گەلەك پاشماێێن شوینوارکی ژی ژ ئاڤاهیان و یێن هۆنەری مینا مەحفویران و ئامانێن فەرفیری و قاشانی و کانزایان بەربەلاڤبوو و گومان تێدا نینە مووسلمانان ئەڤ وێنەیە ژ هۆنەرێن بەرێ وەرگرتبوون. و وێنەیێ ماری هاتە ڤەگوهاستن بۆ هۆنەرێ ئیسلامی ب رێکا هۆکارێن ئاسیا و چین و وەك جۆرەکێ زوخرفێ ل چاخێ سەلجۆقیێن داویێ ب کارهات، و ئەڤە وەل بۆچوونا هندەك ڤەکۆلەران دکەت کۆ ب کارئینانا ماری ڤەدگەریت بۆ کارتێکرنا سەلجۆقییان ب وێنەیێن کریستیانان کارەکێ نەدروستە و دبیت هندەك ئەگەر هەبن داخوازا گەلەك ب کارئینانا ماری کرین کۆ مار هێمایێ جەنگاوەرێ تورکە کۆ دگۆتێ مارێ ب ترس.

شوینوارەکێ دیار ل سەر دەرگەهێ تلسم هەیە ل بەغدا کۆ دیرۆکا وی بۆ سالا ٦١٧مش/١٢٢٠ز. دزڤریت و ئەو نموونێ هەرە باشترین شوینوارێ سەلجۆقی گەهشتینێ یە، لێ ل سالا ١٩١٧ز. هاتە ژناڤبرن، کۆ تێدا خەلیفێ عەباسی ئەلناسرلدین ئەللاهـ (٥٧٥-٦٢٢مش/١١٧٩-١٢٢٥ز) چارمێرکی روونشتی یە و هەر دو دەستێن خۆ درێژ کرینە ئەزمانێ دو مارێن گرێدای ب رەخ ویڤە و ئەردێ وێنەی زوخرفێن توریقێن تەنگ ل سەر هاتینە نەخشاندن کۆ وێنەیێ دانتلا ددەن کۆ میناکی دوژمنێن ب هێزێن مەغۆلی و شاهـ خوارزمن لێ گومان ل دۆر ڤێ دی ب تنێ هەیە کۆ ئەڤ وێنەیە ب تنێ زوخرفەیە و دبیت گومان ل سەر هەبیت کۆ میناکی تلسمەکێ بیت بۆ پاراستنا بەغدا ژ دوژمنان، لەورا دبێژنێ دەرگەهێ تلسم.

هندەك رامانا ڤێ دکەنە پێڤە عەزماندنا ب رەنگێ سێربەندی بۆ پالدانا خرابێی، دیسان دهێتە شروڤە کرن کۆ دەستەلاتدار دوژمنێن خۆ دترسینیت و هـزرا کەسەك ململانێ دگـەل دو گیانداران دکەت دچیڤانۆکەکێدا کو هەر ژ کەڤندا ل وەلاتێ میزۆپۆتامیا هاتییە زانین (گلگامش ململانێ دگەل شێران دکەت.)

هندەك وەسا دبینن کۆ ئەژدەها ب رێکا هۆنەرێ چینێ بۆ هۆنەرێ ئیسلامی هاتییە ڤەگوهاستن. و وەسا دهێتە دیتن کۆ هۆنەرمەندێن مووسلمان وەسفێن هەڤپشك یێن مارو ئەژدەها ب روخسارێ گیاندارەکێ چیڤانۆکێ لێکدای ژ سەرێ ئەژدەهای و لەشێ ماری وەرگرتی و دگەل زێدەکرنا چەنگان هندەك جاران ل دەرگەهێ (خان) نێزیکی شنگال وێنەیێ گیاندارەکێ چیڤانۆك هەیە لەشێ وی روخسارێ دو مارێن تێکبادایە و مرۆڤەك ل سەر رەنگێ فریشتەیانە ب رما خۆ ململانێ دگەلدا دکەت و دبیت ئەڤ وێنەیە وەك تلسم وەرگرتبیت بۆ پالدانا خرابێی.

پاشی مار و سیمەرخ وەك دروشم بۆ میرگەها بەهدینان هاتنە دیتن، کۆ بابەتێ ڤەکۆلینامە بوو و وێنەیەك ل سەر دەرگەهێ ئامێدیێ یێ رۆژ

ئاڤا (دەرگەهێ مویسل) هەیە كو ئەو وێنە ل سەر كڤانێن دەرگەهێ (خدر ئلیاس) ل چیایێ شنگالێ ژی هەیە، و دیسان ل سەر كڤانێن كەلها حەلەب، دەرگەهێ ژ ناڤدا ژی هەیە.

**پەراوێز:**

١. دەمەكێ دا ڤەكۆلەرەكێ دی دبێژیت كو سێ نهۆم بوون بێ ئەردی زیندان بوو چونكوو ل هەر چوار نكاران هاتبوو ڤیركرن تەماشە بكە: كتانێ. هێشتا وەرپێچەك و گلڤندێن بەرپەرێن ئامێدیێ -كۆڤارا دهۆك هژمارا (٥) كانوینا ئێكێ ١٩٩٨، بپ ١٢.

٢. سیمەرخ: گیاندارەكێ چیڤانۆكە سەرێ وی یێ دیكلی كویڤی یە و و لەشێ وی یێ ئەژدەهایە و پەرێن كوریا وی درێژن، زكی محمد حسن: الصین و فنون الاسلام، ص ٤٦، و (جاحظ) دبێژیت و عنقاء ئانكو عقاب (الجاحظ: الحیوان، ج٣، ص ٤٣٨، پاشی دزڤریت كۆ عەنقاء گیاندارەكێ چیڤانۆكە و هەبوونا خۆ نینە (الجاحظ: الحیوان، ج٧، ص١٠٥، ١٢٠).

٣. كورێ مەلك عزالدین كورێ محمد كورێ مبارك كورێ معتصم بالله، رێكا زاویە دامەزراند و گەهاندن دەستەلاتێ، بو زێدەتر تەماشە بكە: العباسی، محفوف: اماره بهدینان العباسیه (الموصل ١٩٦٩م) ص ٣٦.

٤. زاوی چەمێ: جهەكە دكەڤیتە سەر لێڤا زێیێ مەزن و نێزیكی ٩٢م ژێ دویرە و ب دویریا ٥كم رۆژئاڤا شكەفتا شانەدەر و ب بلندیا ٤٢٥م ایە، دبیت ئەڤ جهە بارەگایێ هاڤینی بیت یێ مرۆڤێ شانەدەر و شكەفت بارەگایێ زڤستانێ، تەماشە بكە: سلیمان، عامرو الفتیان: و مالك احمد: محاضرات فی التاریخ القدیم، الموصل ١٩٧٨٠، ص ٢٠.

٥. نەمریك: جهەكە ل پارێزگەها دهۆك ب دووراتیا ٥٠كم ژ رۆژئاڤا بازێرێ مویسل و دیرۆكا وێ بو چەرخێ نوی دزڤریت، قەبارێ وێ (١٦٠م×١٠٠م)ە، نێزیكی (٥٠م) ژ دۆلا رووباری بلندترە، شاندێ شوینواركی یێ پۆلۆنی ب رێڤەبەریا كوزلوفسكی ل هەر چوار وەرزێن سالێن ٨٥-١٩٨٦ێ هەلكۆلین لێ كرینە، و ئامانێن فەرفوری یێن ئاشۆری یێن ناڤین و كەڤن دتەخێن بلندێن وی جهیدا ڤەدیتینە.

٦. ئەژدەها: گیاندارەكێ چیڤانۆكە و دبێژن كۆ ئەو بابەلیسكە و ئاگر تێدایە و خەلكی دگۆتنێ ئەژدەها (تنین) و ب هێمایێ ماری وێنە كر، تەماشە بكە: الجاحظ: الحیوان: تحقیق و شرح عبدالسلام هارون، ط٣ (بیروت ١٩٦٩م) ج٧، ص١٠٥-١٠٦. و پەیكەرەكێ مەزن ل شویرها كەلها ڤونیە هەیە، وێنەیێ ئەژدەهایە ب لەشێ ماری و ب كوریەكێ ب دوماهی دهێت و سەر ئەژدەهایەكێ دی یە و دبیت دیرۆكا وی بۆ نێزیكی سالا ٦١٨مش ١٢٢١ز ڤەرگەریت، تەماشە بكە: رایس، السلاجقه، لوحه ٣٩.

# ژێدەر


- الاحكام السلطانية في الولايات الدينية، حققة خالد عبدالطيف (بيروت:١٩٩٤).
- ئەنتەرنێت: http://www. ar. wikipedia. org/wiki/
- عبوشي، فرهاد حاجي: المدينة الكوردية من القرن (٤-٧٥/١٠-١٣م) دراسة حضارية (اربيل:٢٠٠٤م).
- البلاذري: فتوح البلدان، عنى بمراجعته و التعليق عليه، رضوان محمد رضوان، دارا الكتب العلمية (بيروت ١٩٩١م).
- منيمنة، سارة: التكوين الوظيفى للمدينة الاسلامية، مجلة الفكرالعربى، العدد(٢٩)(د/م:١٩٨٢م).
- فيبر، ماكس:المدينة معناها و شروط قيامها:ترجمة: رضوان السيد، مجلة الفكر العربى، العدد (٢٩) (د/م:١٩٨٢م).
- محمد غازى رجب: العمارة فى العصر الاسلامى فى العراق، (بغداد، ١٩٨٩م) ص ٩.
- ابن شداد: الاعلاق الخطيرة فى ذكر امراء الشام و الجزيرة، حققة: يحيى عبادة (دمشق، ١٩٧٩م) ج٣، م٢.
- سليمان: عامر و أخرون: محافظة نينوى بين الماضى و الحاضر (الموصل ١٩٨٦م).

- العباسي، محفوظ: امارة بهدينان العباسية (الموصل ١٩٦٩م) ص ١٣٦.
- دهۆك بعد ١١ أذار، ص ٣٠٠، ئامێدیێ، زكى محمد سعدالله: شوینوارێت ئامێدیێ، كۆڤارا بەیان، هژمارا (٤٧)شوبات ١٩٧٨، ل ٧٨.
- فندى، عبدالكريم: دليل محافظة دهۆك، ص ١٣٩، عبدالوهاب، تحسين: المعالم الأثرية فى بەهدينان: محافظة دهوك) مجلة شاندر، العدد (٤) سنة ١٩٩٧، ص ٧٥. ١٣-الدرالمكنون:ج٦:ص٦٦٧، نقلا عن العباسي، امارة بهدينان العباسية، ص ١٣٧.
- الشمس، ماجد عبدالله: الحضر العاصمة العربية (بغداد١٩٨٨).
- كتاب مديرية متحف الموصل المرقم ١٥٥فى ١٩٥١/١٠/٢الى مدير الأثار العامة بغداد.
- كتاب مديرية متحف الموصل المرقم ٣٩٢/١/٧٠/٥فى ١٩٦٧/٧/٤.
- ابن الشداد:الاخلاق الخطير فى ذكر امراء الشام و الجزيرة، تحقيق يحيى عبادة، دمشق، ١٩٧٨.
- العميد، طاهر مظفر:العمارات المدنية فى الحضارة العراقية، بغداد، ١٩٨٥.
- east.Ross(henryjames):Lettersfrom the London١٨٤٣.
- عمادي، د. طارق پاشا: شوینوارێن كوردستانێ ییّن كێم ویّنەو پاراستنا وان ژ خرابكرن و سەرپێچیان.
- كلارك، رندل:الرموز و الاسطورة فى المصر القديم، ترجمة احمد صليحة، مصر، ١٩٩٩. لوركر، مانفرد:معجم المعبودات والرموز في المصر القديمة، ترجمة صلاح الدين رمضان، القاهرة، ٢٠٠٠.

# وێنەیێ میر سەلیم پاشایێ ئامێدی ب رەنگێن ئاڤی ٢٥-٣٠ ی گولانا ١٨٣٩ێ

**د. هوگر تاهر توفیق**
**زانكۆیا زاخۆ-كۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران:سالح یوسف سوفی**

## پێشگۆتن:

دەمێ مرۆڤ خۆ دادهێلیتە ناڤ ڤەكۆلینا دیرۆكێ، وێنەی جهەكێ تایبەت د چێبوونا هزرەكا رۆهن و نێزیكی راستیێ بۆ وی بابەتی هەیە، لێ دشیاندا نینە بێژین كو گرنگییا وێنەیێ دیرۆكی تەمەت وێ گرنگیێ بیت یا بەلگەنامەیا دیرۆكی یا توومارکری (نڤیسكی) هەی، لێ د گەلەك رەوشان دا، وێنەیێ دیرۆكی تێكەهێ نەتمامێ روودانا دیرۆكی تمام دكەت، ژ بەر هندێ، وێنە رۆلەكێ مەزن د تێكەهشتنا دیرۆكێ و روودانێن وێ دا دبینیت، نەخاسمە ژی هەكە بزانین كو نۆكە وێنەی گرنگییەكا چەند مەزن هەیە، بەلكی هەتا گەلەك وێنە هەنە جهێ دانانا پەرتووكەكێ یان ڤەكۆلینەكێ ل سەر مەسەلەیەكا جڤاكی یان ئابووری یان سیاسی یا نۆكە جڤاكێن مرۆڤایەتی تێرا دبۆریت دگریت، نەخاسمە ژی جڤاكێن رۆژهەلاتا ناڤین یا نوو.

ئێك ژ تشتێن گەلەك بەرچاڤ و سەرنجراكێش د دیرۆكا كوردی دا، نەبوونا وێنەیێ دیرۆكییە، ئەڤە ژی دبیت ژ بەر وان رەوشێن سیاسی بیت یێن ل سەدسالییا ١٩ كوردستان تێڕا بووری و ڤان رەوشان كاریگەری ل سەر ڤی بیاڤی هەبوویە، لێ ئەڤە نابیتە بەهانە كو پێنكۆلەكا ب تنێ ژی د ڤی بیاڤی دا نەبیت، كوردان گرنگی نەدایە بەلاڤكرنا وێنەیێن كوردستانا وەلاتێ خۆ پشتی كۆدەتایا ئۆسمانییا سالا ١٩٠٨ێ نەبیت، پشتی وێ كۆدەتایێ بۆ جارا ئێكێ وێنە د رۆژنامەڤانییا كوردی یا ل ناڤبەرا ١٩٠٨-١٩١٤ێ دا د كۆڤارێن (كرد تعاون ترقی، روژكرد، هتاو كرد) دا هاتینە بەلاڤكرن[1]، ژ بەر هندێ، دبینین نەدیاربوونەكا بەرچاڤ د ڤی هۆنەرێ تایبەت دا د دیرۆكا كوردی دا هەیە، ئەم وێنەیێن چ میرێن كورد نابینین هەرچەندە ب دەهان میرێن كورد هەبووینە و هەتا نیڤا سەدسالییا نوزدێ حوكم ل دەڤەرێن بەرفرەهێن كوردستانێ كرینە، هەروەسا وێنەیێن دیارترین رێبەرێن كورد ژی نینن یێن هەتا دەستپێكا سەدسالییا بیستێ ل سەر قادا سیاسی پەیدا بووین.

ل سەر ڤی بنواشەی، دیتنا ڤی وێنەیێ ب رەنگێن ئاڤی هاتییە چێكرن تشتەكێ گەلەك گرنگە

هەرچەندە وێنە نە یێ میرەكێ كوردە دەمەكێ حوكمداری ل میرگەهێ كریە، لێ ئەڤ وێنەیە یێ میرەكێ كوردە كو ئەو ژی میر (سەلیم پاشایێ ئامێدی)یێ برایێ (ئیسماعیل پاشا)یێ میرێ داویێ یێ میرگەها بەهدینانە یێ سالێن ١٨٣٦-١٨٤٢ ێ حوكم ل وێ میرگەهێ كری، هەروەسا دەمێ مرۆڤ پێداچوونێ ب زانیارێن كێم یێن ل سەر میر سەلیم پاشای دكەت، دیار دبیت كو وی دەمی د كاروبارێن دەرڤە یێن میرگەها بەهدینان دا هاریكاریا برایێ خۆ یێ حوكمدار كریە و ئەڤ وێنەیە مزگینیدەرێ (مبشر) ئەمریكی جۆستن پیركنز چێ كریە و دیرۆكا وێنەی ڤەدگەرێتە رۆژێن ٢٥-٣٠ ی گولانا ١٨٣٩ێ.

## ئێك: جۆستن پیركنز JUSTIN PERKINS (١٨٠٥-١٨٦٩)

مزگینیدەرێ ئەمریكی جۆستن پیركنز ب ئێك ژ ناڤدارترین مزگینیدەرێن ل سەدسالیا نوزدێ سەرەدانا كوردستانێ كرین دهێتە هژمارتن، ئەو ئێكەمین مزگینیدەر بوو ل سالا ١٨٣٥ ێ سەنتەرەكێ مزگینیدەریێ پرۆتستانتی یێ ئەمریكی ل ئۆرمیێ ڤەكری، تشتێ وی گرنگتر لێ دكەت ئەوە كو ڤی مزگینیدەرێ ئەمریكی، وی دەمی چەندین جاران سەرەدانا كوردستانێ كریە و رووداو و گەریانێن خۆ توومار كرینە و وی دەمی وەك پەرتووكەك بەلاڤ كریە یان وەك نامە د كۆڤارا رۆژهەلاتناسیا ئەمریكی دا بەلاڤ كرینە[٢] و زانیاری یێن گەلەك گرنگ ل سەر كوردان د نڤیسینێن وی دا هەنە، هەرچەندە هندەك خۆپارێزی (تحفظ) ل سەر هندەك دیتن وبۆچوونێن وی هەنە.

پیركنز ل سالا ١٨٠٥ێ ل نێزیك باژێرێ هۆلیۆك Holyoke ل ویلایەتا ماساشوستس Massachusetts ژ دایك بوویە، ل دەستپێكا ژیانا خۆ گرنگی دایە زانستێ تیۆلۆژی (علم اللاهوت) و ئەو زانست ل خواندنگەهـ و پەیمانگەهێن ویلایەتا ماساشوستس خواندیە هەتا شیای ل دەستپێكا دەهكێن سێ یێن سەدسالیا نوزدێ پلەیا قەشەیێ یێ ب دەستڤە بینیت[٣].

ل سالا ١٨٣٣ ێ ژ لایێ (جڤاتا ئەمریكی یا نوونەرێن شاندێن مزگینیدەری یێن بیانی) (American board of commissioners for foreign missions) ڤە هاتیە دەستنیشان كرن داكو مزگینیدەریێ ل ناڤ مەسیحی یێن باكووری رۆژئاڤایێ ئیرانێ ل باژێرێ ئۆرمیێ (ل رۆژهەلاتێ كوردستانێ، ب دروستی ژی ل ناڤ نەستۆری یێن وێرێ) بكەت، ئەو دگەل هەڤژینا خۆ چارلۆت باس Bass Charlotte ژ گزیرتێ مالتا بەرەڤ قوستەنتینیێ (ستەنبۆلێ) ب رێ كەڤت، پاشی قەستا ئەرمەنستانێ و كوردستانێ و ئیرانێ كر[٤] و ل پاییزا سالا ١٨٣٥ ێ گەهشتە ئۆرمیێ و گەهشتە مزگینیدەرێ دی یێ جڤاتا مزگینیدەری یا ئەمریكی هنارتی كو ئەو ژی دكتۆر ئاشاهیل گرانت Dr. Asahel Grant بوو، هەردوان ل وی سەنتەرێ مزگینیدەریێ ژ لایێ پیركنز ڤە هاتیە دامەزراندن دەست ب كارێ خۆ كرن و هەر وی سەرۆكاتیا شاندێ ئەمریكیێ ل ئۆرمیێ كر، پاشی هەر زوو خواندنگەهێن مزگینیدەری ل ناڤ نەستۆری یێن ئۆرمیێ و دەردۆرێن وێ ڤەكرن و چاپخانەیەك ل گەل خۆ ئینا و یێ گەلەك پەرتووكێن ئایینی چاپ كرن، ل سالا ١٨٤٠ ێ ژی ئێكەمین دەزگەهێ نیگاركێشانێ ل ئۆرمیێ ڤەكر[٥].

پیركنز ئێكەمین هەڤوەلاتیێ ئەمریكی بوو ل ئیرانێ و كوردستانێ بنەجهـ دبیت و ل دۆرێن ٣٥ سالان ل وێ دەڤەرێ ما و د وی ماوەی دا هندەك جاران سەرەدانا ئەمریكا كریە هەتا سالا ١٨٦٩ێ ل باژێرێ چیكۆپی Chicopee ل ویلایەتا ماساشوستس Massachusetts وەغەرا داویێ كری[٦].

ناڤدارترین پەرتووكێن وی، پەرتووكا وی یا ب ناڤێ (هەشت سالان ئاكنجیبوون ل وەلاتێ فارسان ل ناڤ مەسیحیێن نەستۆری، دگەل هندەك تێبینیان ل سەر محەمەدیان) (A residence of eight years in Persia among the Nestorian Christians with noties of the Muhammedans) بوو یا

ل سالا ١٨٤٣ ێ ل ئەندۆڤەر Andover هاتییە چاپ کرن، وی هەمی روودانێن گەڕیان و بنەجهبوونا خۆ ل ئیرانێ و کوردستانێ د ڤێ پەرتووکێ دا توومار کرینە، هەروەسا پەرتووك مشتی زانیارییایە ل سەر نەستۆری یێن ئۆرمیێ و چیایێن هەکاری و پەیوەندی یێن وان یێن وی دەمی دگەل کوردان، ئەڤە ژی ناڤێن هندەك پەرتووکێن وی نە ل سەر گەڕیانا وی ل کوردستانێ و ئیرانێ:

١- A residence of eight years in Persia، among the Nestorian Christians :with ،notices of the Muhammedans، Andover ١٨٤٣

٢- Our country›s sin، a sermon preached to the members and families of the Nestorian Mission، at Oroomiah، Persia، July ٣، ١٨٥٣، Boston، ١٨٥٤

٣- Our country›s sin. A sermon preached to the members and families of the Nestorian mission at Oroomiah، Persia، July ٣، ١٨٥٣، New York، ١٨٥٤.

٤- Missionary life in Persia، being glimpses at a quarter of a century of labors among the Nestorian Christians، Boston، ١٨٦١.

٥- The beloved physician، a sermon occasioned by the death of the Rev. Austin H. Wright، M.D.، preached to the families of the Nestorian Mission at Oroomiah، Persia، Feb. ٨th، ١٨٦٥، New York، ١٨٦٥

پیرکنز نە تنێ گرنگی دایە زانستێ تیۆلۆژی و پرۆسێسا مزگینیدەریێ، بەلکی نیگارکێش (رسام) ژی بوو و ب رەنگێن ئاڤی نیگارێن وان کەسایەتییان چێ دکرن یێن دگەل کۆم دبوو[7] و هندەك ژ وان نیگاران د پەرتووکا خۆ یا ب ناڤێ (هەشت سالان ئاکنجیبوون ل وەلاتێ فارسان ل ناڤ مەسیحی یێن نەستۆری، دگەل هندەك تێبینییان ل سەر محەمەدییان) دا بەلاڤ کرینە، کو ئێك ژ وان وێنەیان وێنەیێ سەلیم پاشایێ ئامێدی یێ برایێ ئیسماعیل پاشایێ میرێ داویێ یێ میرگەها بەهدینانە و وێنە ب رەنگێن ئاڤی هاتییە چێکرن.

## دوو: میر سەلیم پاشا

میر سەلیم پاشا کوڕێ میر محەمەد تەیارێ (١٧٩٨) کوڕێ میر ئیسماعیل پاشایێ ئێکێ (١٧٦٨-١٧٩٨) کوڕێ میر بەهرام پاشایێ مەزن (١٧١٤-١٧٦٨) برایێ ئیسماعیل پاشایێ دووێ (١٨٣٦-١٨٤٢) یێ میرێ داویێ یێ میرگەها بەهدینانە، ژێدەرێن دیرۆکی بەحسێ ژیانا ڤی میری و رۆلێ وی د رۆژانێن داویێ یێن میرگەها بەهدینان دا ناکەن، دبیت ئەڤە ژ بەر هندێ بیت کو ڤەکۆلەرێن د ڤی بیاڤی دا کار دکەن نەشیابن بەلگەیێن دیرۆکی یێن رۆلێ ڤی میری رۆهن دکەن ب دەست خۆ بێخن، بۆ زانین ژی، دوور نینە بەلگەنامەیێن دیرۆکی یێن گرنگ ل سەر ڤی میری د ئەرشیفێ ئۆسمانی دا دپاراستی بن، ڤێجا هەر تشتەکێ ژ ڤی میرێ بەهدینانی دهێتە زانین ئەڤ زانیاریێن ل خوارێ نە:

د دەڤێ ئەرزوحالەکا سالا ١٨٣٤ ێ دا یا ریهسپی و ماقوولێن بەهدینان بۆ سولتان ئۆسمانی مەحموودێ دووێ (١٨٠٨-١٨٣٩) هنارتی و تێدا داخوازا هاریکاریێ بۆ بەرسڤدانا هێرشا میرێ سۆران (میرێ کۆرە) (١٨١٣-١٨٣٦) ل سەر دەڤەرا خۆ یا بهدینان ژێ دکەن[8]، ناڤێ میر سەلیمێ بەهدینانی ژی د وێ ئەرزوحالێ دا هاتییە و تێدا دیار دبیت کو وی ب رێیا وەلاتێ فارسان (عەجەمان) قەستا بەغدا کرییە بۆ داخوازکرنا هاریکاریێ ژ والیێ وێ، چونکی هەمی رێ یێن د مووسل ڕا دچوونە بەغدا، ژ لایێ میرێ سۆران ڤە هاتبوونە کۆنترۆل کرن، ژ بەر هندێ، وی رێیا ئیرانێ هەلبژارت کو بگەهیتە بەغدا بۆ داخوازکرنا وێ هاریکاریێ[9]. نەهاتییە زانین ژی کا ئەرێ میر سەلیم گەهشتییە بەغدا یان نە.

ل دەمێ هێرشا ئۆسمانی ل سەر بەهدینان ب

سەرکردایەتییا: عەلی پاشایێ والیێ بەغدا، محەمەد پاشایێ والیێ مووسل و حافز پاشایێ والیێ سێواس ل سالا ١٨٣٨ ێ و کۆنترۆلکرنا گەلەك دەڤەرێن وێ ژ لایێ لەشکەرێ ئۆسمانی ڤە، د روودانێن وێ سالێ دا ناڤێ میر سەلیم پاشای هاتییە کو ل هەیڤا ئیلۆنا سالا ١٨٣٨ ێ هێرش کرییە سەر زاخۆ[١٠].

پشتی ل داویا سالا ١٨٣٨ ێ و دەستپێکا سالا ١٨٣٩ ێ هێرشا ئۆسمانی ل سەر میرگەها بەهدینان دژوار بووی، ئیسماعیل پاشایێ میرێ بەهدینان خۆ ل کەلا بارزان ئاسێ کربوو، وی میر سەلیم پاشایێ برایێ خۆ ب رێیا شەمدینان هنارتبوو ئیرانێ داکو داخــوازا هاریکاریێ ژ دەستەلاتا ئیرانێ بکەت، دەستهەلاتا ئۆسمانی ژی پێکۆل کر ب رێیا عەلیخان بەگی[١١] وی دەستەسەر بکەت و عەلیخان بۆ وێ مەرەمێ چوو بوو شەمدینان[١٢]، لێ وەسا دیارە میر سەلیم پاشا شیایە خۆ بگەهینیتە ئیرانێ - کو پاشی دێ بەحسێ وی هێتە کرن - لێ دیرۆکا چوونا وی بۆ ئیرانێ ل دویماهییا سالا ١٨٣٨ ێ و دەستپێکا سالا ١٨٣٩ ێ بوویە.

## سێ: جۆستن پیرکرنز و سەلیم پاشا

### ٢٥-٣٠ ی گولانا ١٨٣٩ێ

پیرکنز چ ل سەر میر سەلیم پاشای نەنڤیسییە، ژ بلی دوو بەرپەران ب تنێ د پەرتووکا خۆ دا یا ب ناڤێ (هەشت سالان ئاکنجیبوون ل وەلاتێ فارسان ل ناڤ مەسیحیێن نەستۆری، دگەل هندەك تێبینییان ل سەر محەمەدیان)، ئەڤە ژی دەمێ ل ناڤبەرا ٢٥-٣٠ ی گولانا ١٩٣٨ ێ ل تەورێزێ دگەل میر سەلیم روونشتی.

پیرکنز د وان بەرپەراندا بەحسێ میر سەلیم کرییە و گۆتییە کو هاتییە تەبرێزێ داکو ئیران هاریکاریا وی بکەت و دهەوارا میرگەها وی بهێت ژ هێرشا ئۆسمانی، هەروەسا پیرکنز ب هووری ئەو جلکێن کوردی سالۆخدانە یێن میر سەلیم کربوونە بەرخۆ، وەسا دیارە ژی ڤێ حێبەتیبوونێ ب جلکێن کوردی پیرکنز پالدایە وێنەیێ وی چێ کەت و بکەتە د پەرتووکا خۆ یا ناڤبری دا، ئەڤا خوارێ ژی وەرگێرانا تمام یا وان رێزکایە یێن پیرکنز ل سەر میر سەلیم پاشایێ ئامێدی توومار کرین و دگەل وێنەیێ وی بەلاڤ کرین:

نۆکە رۆژا ٢٥ ی گولانا (١٨٣٩)ێ رێبەرێ کوردێ ئامێدیێ سەلیم پاشا ئەوێ ل دەڤەرێن حوکمداریا خۆ ل سەر دەستێ سەرۆکێ خۆ یێ پاشایێ بەغدا شکەستی و نەچاربووی برەڤیت گەهشتیە ڤێرە (ئانکو تەبرێزێ)، ڤی رێبەرێ کورد بەری سێ سالان هندەك ژ دەمێ خۆ ل ئۆرمیێ بۆراندبوو، هندەك جاران ژی سەرا مە ددا، نۆکە ژی هندەك دیاری بۆ حوکمدارێ دەڤەرێ و میرێ ئازەربایجان و شاهی ئینانە ب وێ هیڤیێ وان هان بدەت هندەك هێزان بدەنێ داکو بشێت دەڤەرا خۆ بزڤرینیت، ئەو دبێژیت کو وەلاتێ ل ناڤبەرا دو رووباران (ب دروستی ژی کوردستانا باشوور) د رەوشەکا نەرحەت دا دژیت و ئەوا وێ چەندێ ژی پشتراست دکەت راپۆرتێن هەڤپێچێن دگەل وی نە، ب راستی ژی تەناهییا سەرانسەری پشکا رۆژهەلاتێ ترکیا (مەبەست ژێ کوردستانا دەولەتا ئۆسمانییە)، ژ تەناهییا هەر پشکەکا دی یا وەلاتێ فارسان کێمترە...

ل رۆژا ٢٧ ی گولانێ مە سەرەدانا پاشایێ کورد کر، ئەو زەلامەکێ گەلەك بیرتیژ و لاوچاکە، هەر بۆ نموونە، ئێك ژ تایبەتمەندیێن بالکێش یێن د جلکێن کوردی دا هەین، فرەهییا هچکێن کراس(قمیص)ێن وانە، فرەهییا هچکێن پاشای ژ لایێ زەندکێ ڤە یاردە و نیڤ بوون، دیمەنێ هچکان ژی د هاڤینێ دا نیشانێ هینکاتی و رحەتیێ بوو، گەلەك جاران مە پرسیار ژێ دکر کا ئەرێ ئەو هچك د شەڕان دا دبنە ئاستەنگ یان نە؟ وی بەرسڤا پرسیارا مە ددا لێ بێی هندێ پەیڤەك ژ دەڤی دەرکەڤیت، ئەو ژی ب رێیا پێچانا لەوەندیێن درێژێن سەرتیژێن ل داویا هەر هچکەکی، پاشی ب زەندکێن خۆ ئاماژە دکر و ب هەردو لەپێن گەف دکر، ئەڤێ ژی هەستەکا رۆهن ل سەر شیان و هێزا زەلامێ توندوتیژێ کورد و پەیوەندییا وێ چەندێ ب رحەتییا تمام یا رێبەرێ کوردێ جوامێر ددا مە،

كراسێ پاشای ژ كتانێ تەنك یێ ئارمیشێ سپی هاتبوو چێكرن، جلكێ وی ژی ئارمیشێ خێچ خێچێ جوان بوو، هەمی جلكێن وی، دگەل خولكێ دێمێ وی یێ جوان و لڤینێن وی یێن خشكۆك و رحسڤكییا وی مەزناهییەك ددایێ، زەلامێن ژ جۆرێ وی ژی، پتریا جاران كەسانێن بیرتیژ و جوامێرن، لێ خودان كەسایەتییەكا گەلەك خاپینۆكن.

سپێدەیا رۆژا ٣٠ گولانێ سەلیم پاشای سەرەدانا مە كر و سێ كورێن حوكمداری دگەل بوون[١٣]، یێ ژ هەمییان بچووكتر ژیێ وی تنێ چوار سال بوون، دوو سەعەت و نیڤان ل نك مە مان و گەلەك یاری و حەنەك ب هزرێن مە یێن فەلسەفی دكرن، چونكی پاشای بەری هنگی تشتەكێ هۆسا نەدیتبوو و نەبهیستبوو، هەروەسا وی یاری ب زەرزەواتێن سەیرێن د باخچەیێ مە دا و ب تایبەت ئەو پتاتا ل سەر عەردی دیار دكر، ئینا پتات هەلگرت و ب چەقۆكا خۆ سپی كر و ب خاڤی خوار... سەلیم پاشای ب گرنگی ڤە بەحسێ ئنجیلێ یا ب زمانێ فارسی كر یا بەری سێ سالان ئەندامەكێ شاندێ مە ب دیاری دایێ و گۆت كو وی خواندییە و هێشتا ل نك وی یا پاراستییە[١٤].

## ژێدەر:


١. بۆ هوورکارییان ل سەر ڤێ وێنەی، بنێرە: دور الصحافة في تطوير الوعي الثقافي الكردي، دار سبيريز للطباعة و النشر، دهۆك- ٢٠٠٧، ص ١٤٥- ٢٠٤.

٢. بۆ هوورکارییان ل سەر ڤان نامەیان، بنێرە:
Journal of ,1852-Gordon Taylor, Deep Waters, 2- Life and Death in the Perkins Family, 1834
73-Assyrian Academic Studies, Vol. 23, no. 1, 2009,pp.64

٣. Gerald H. Anderson, biographical dictionary of Christian missions, Michigan-Cambridge-U.K., 1999, P.528

٤. Abul Kalam Azad, THE LEGACY OF THE AMERICAN PRESBYTERIAN MISSION IN IRAN, .Journal of the Asiatic Society of Bangladesh (Hum.), Vol. 58(1), 2013,p.193

٥. د. عبد الفتاح علي البوتاني، دراسات ومباحث في تاريخ الكورد والعراق المعاصر، دار سبيريز للطباعة و النشر، دهۆك- ٢٠٠٧، ص ٢٦- ٢٧.

٦. HENRY MARTYN PERKINS, LIFE OF REV. JUSTIN PERKINS, D.D; PIONEER MISSIONARY
Gerald H. Anderson, ;97-PP. 5 ,١٨٨٧ ,TO PERSIA, NEW YORK- CHICAGO -TORONTO
biographical dictionary of Christian missions, Michigan-Cambridge-U.K., 1999, P.528

٧. بۆ هوورکاریێن نەخشەیێن وی بنێرە مالپەرێ ئەلیکترۆنی: http://luna.library.wmich.edu.

٨. بۆ هوورکاریێن روودانێن وي ماوەیێ میرگەها بەهدینان، بنێرە: کاوە احمد شاوەلی ئامیدی، امارة بادينان ١٧٠٠-١٧٤٢، دراسة سياسية، اجتماعية، ثقافية، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٠، بەپەرێن ٨٥-١٠١.

٩. تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، سیرەتا خەلکێ بەهدینا ژ ئێرشا میرێ کۆرە د دۆکیۆمێنتەکا دیرۆکی دا، کۆڤارا دیرۆك، هژمارە (٧)، زڤستانا ٢٠١٥، بەرپەرێن ١٢٦-١٤٣.

١٠. سنان هلکان، کورد و بەرخودانەکان ١٨١٧-١٨٧٦، لە بەلگەنامەکانی ئەرشیفی عوسمانیدا، وەرگێران: بەکر شوانی، پیشەکی و پێداچوونەوە: د. جەبار قادر، بلاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠١٢، بپ ١٠٢.

١١. ژێدەرێن بەردەستێن دیرۆکی بەحسێ پێگە و پۆستێ وی دەمی یێ عەلیخان بەگی نەکریە.

١٢. سنان هاکان، ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ١٠٣-١٠٤.

۱۳. ل ڤێرێ پیرکنز ئاماژێ دکەتە ناڤێ حوکمداری، لێ پتر وەسا دهێتە هزر کرن مەبەستا وی (محەمەد شاهێ قاجار بیت ۱۸۳٤-۱۸٤۸) چونکی وی دەمی شوونگرێ وی حوکم ل تەوریز دکر کو هێشتا ژیێ وي نەببوو هەشت سال. بنێرە: د. حسین کریم الجاف، الوجيز في تاريخ ايران: دراسة في التاريخ السياسي من ظهور الدولة الصفوية إلى نهاية الدولة القاجارية، ج۳، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل، ۲۰۰۸، ص ۱۹٤-۲۰۰ و ص ۲۲٦-۲۳۷.

۱٤. Justin Perkins، A residence of eight years in Persia، among the Nestorian Christians ، with notices of the Muhammedans، Andover، 1843، pp.381-382.

# گۆرستانا میرا ل ئامێدیێ

پ.د. عبدالله خورشید قادر ئالەی
وەرگێران: كۆڤان ئیحسان یاسین

نەخشەیێ (١)




نەخشەیێ بازێرێ ئامێدیێ و گرنگترین جهێن وی یێن شوینواری . كارێ ڤەكۆلەری

## ئێك: گۆرستانا سولتان حسێن وەلی

ئێك ژوان بەرماكێن شوینواری یێن بازێرێ ئامێدیێ هەمبێز دكەت، (گۆرستانا میرایە) كو هندەك ڤەكۆلەرا ئەڤ ناڤێ دانایەسەر[١]، یان ژی دبێژنێ (گۆرستانا سولتان حسێن وەلی)[٢] .

ئەڤ گۆرستانە دكەڤیتە رەخێ ژێریێ رۆژهەلاتێ بازێرێ ئامێدیێ (بنێرە نەخشەیێ هژمار ١) دكەڤیتە هنداڤی كەلیێ مرێبكا، رووبەرێ وێ دناڤبەرا (٤٠٠-٥٠٠م٢)، دو گۆمبەتێن دناڤدا، زێدباری بەرماكێن بنیاتێ گۆمبەتەكا دی.

### أ/ گۆمبەتا مەزنە میرێ بەهدینا (سولتان حسێنێ كورێ حەسەن بەگێ)[٣]

گۆمبەت ل سەر شەنكستەكێ هەشت لایی هاتییەدانان، درێژاهییا هەر لایەكی دناڤبەرا (٢،٦٠-٢،٦٤م)یە، بلنداهییا وێ ژی (٤،٤٠م)ە، ژ بەرێن تراشتی و كسلێ هاتییە ئاڤاكرن، پیڤانا بەرێن وێ ژی یا ژێكجۆدایە (نەخشێ هژمار ١)، ل سەر لایێن وێ یێ ژ دەرڤە رێزەكا بەرا هاتییەدانان، روویێ هەر بەرەكی ژوان پویچەكێ یێ خارە، سەری لێڤەكا وی بەری بۆ رەخێ ژدەرڤە دەردكەڤیت، د راستی دا ئەڤ رێزێن ژ بەری

دهاتنە چێكرن زێدەباری رێكا نكراندنا وان، ئارمانج ژێ ئەو بوو كو مەرەمەكا بیناكاری یا هەژی ب جهـ بینیت، كو شیایە ڤی شوینواری گرنگ ژ ئەگەرێن سەقای ب پارێزیت، نەخاسمە بارانا، ل ڤێری ئەندازیار یێ شیای د وێ رێزا بەرا دا بیاڤەكێ باش چێكەت و روویێ بەری نێزیكی (٢٠ سم) بۆ ژدەرڤە دەربێخیت، هوسا یێ شیایی بانەكێ بچویك یان سیڤاندەكێ بۆ ئاڤاهی چێكەت، كو رۆلێ خۆ د پاراستنا ڤی ئاڤاهی ژ بارانێ گێرایە.

ئەڤ رەنگێ ئاڤاهی دناڤ حوجركێن (ژوورەكا بچویك یا ئایینی) ناڤدا یێن قشلا كویسنجەقێ هاتینە دیتن[٤] وێنەیێ/١.

هەژیە بێژین، كو نەخشێ هەشت لایی د

**وێنەیێ (١)**



وێنە ژ لایێ ڤەكۆلەری هاتییە گرتن

ئاڤاهیێن ئیسلامی دا گەلەك د كێمن، نموونا ئێكێ ل (قبە صخرە) (٧٢مش/ ٦٩١زا) دهێتەدیتن[٥] هێلكاری/١ .

بەلێ د ئاڤاهیێن گۆرستانا دا، (گۆمبەتا صەلیبی) ئەوا ل نێزیكی بازێرێ سامەرایێ، كو ل دەستپێكێ خەلیفێ عەباسی مونتەصر بیللا (٢٤٧- ٢٤٨مش/ ٨٦١- ٨٦٢ز) تێڤە هاتبوو ڤەشارتن، وەكی نموونا ئێكێ ژ گۆرێن هەشت لایی د ئیسلامێ دا دهێتە هژمارتن[٦] هێكاری/٤.

ل رەخێ دیوارێن (رۆژهەلاتی و رۆژئاڤای و

**هێلكاری (١)**
**قبە صخرە**



ژێدەر: كریزویل

**هێلكاری (٢)**
**گۆمپەتا صەلیبی**



ژێدەر: (الحضارة العراق)

ژێری) پەنجەركێن لاكێشەیێن بچویك یێن هەین(وێنەیێ/٢)، دووراتیێن وێ (١م× ٧٤سم)، دیارە خاریوونەكا بچویك یا دناڤ چارچۆڤێ ڤان پەنجەركا دا هەی، دبیت بۆ ئاسێكرنا شفشێن ئاسنی بیت، دا كو كەس نەچیتە دناڤ ژوورا گۆری دا، دەرینكێ

وێنەیێ (٢)



وێنە ژ لایێ ڤەكۆلەری هاتییە گرتن

وێ دكەڤیتە رەخێ ژووری، پەحنییا وێ (٧٤سم) و بلنداهییا وێ (١،٢٠م)، كڤانەكا ل سەر هەی كو ژ سێ پارچێن بەرا هاتییە چێكرن، ل سەر دا رێزەكا نڤیسینێ یا بەروار و بەروارا هەی، درێژاهییا وێ (٢،٦٠م) و پەحنییا وێ (٣٥سم)، روویێ د سەر كڤانێ دا پێ هاتییەنەخشكرن، ژ رێزەكا نڤیسینا دەركەڤتی و هەمبز (متداخل) هاتییە چێكرن، ب نڤیسینا (ثلث) یا موستەعصمی هاتییە نڤیسین[7]، دەقێ نڤیسینێ ژی ئەڤەیە: (قال الله سبحانه وتعالى كل شئ هالك إلا وجهه توفي السلطان الأعظم

وێنەیێ (٣)

تیڤەرێزكا نڤیسینێ یا كڤانێ چوونە ژوورا گۆمبەتا سولتان حسێن وەلی پێ هاتییە خەملاندن.



وێنە ژ لایێ ڤەكۆلەری هاتییە گرتن.

الاعدل سلطان حسين بيك في شهر رجب سنه ٩٨١)[8] (وێنەیێ/٣).

هەبوونا دەرینكی ل رەخێ ژووری ل مووسلێ و دەڤەرا ژووری هەر ژ چەرخێ (حەفتێ مشەختی/ سێزدێ زایینی) یا بەربەلاڤ بوو، دبیت كو ئەو بایێ ژ رەخێ ژووریێ رۆژئاڤای دهات، پیچەكێ سەقایێ هاڤینێ هوین كربا[9]، یان ژی میحراب دكەڤیتە رەخێ ژێری ئەڤە ژی جهێ پویتە پێكرنێیە، دبیت هەبوونا پەنجەرك و دەرگەها ل هەمی دیوارێن ڤێ گۆمبەتێ، ئەڤ دیارۆكە یا ل گۆمبەتا صەلیبی ژی هەی، بۆ وێ چەندێ بوو كو گرێدانەك دگەل ژ دەرڤە هەبیت، دا كو هەڤدژی دگەل حەدیسێن پێغەمبەری (س) نەبیت، كو نابیت ئاڤاهی ل سەر گۆرا بهێنە ئاڤاكرن[10]، روویێ كڤانا دەرینكی ژی ب رێزەكا نەخشا هاتییەخەملاندن، پەحنییا وێ (٣٤ سم)، نەخشێن وێ ژ تاك و بەلگێن شینكاتییێن تێكەل و دناڤێكرا پێكدهێن، ئەوا یا دبێژنێ (ئەرابسك یان ژی نەخشێ ئەرەبا)، رەخێن دەرینكی ژی ب رێزەكا نەخشا یا هاتییە خەملاندن، پەحنییا وێ (٢٠ سم) و نەخشێن وێ وەكی یێن سەرییە (وێنەیێ/٣)، دەرینكێ گۆمبەتێ دەرگەهەكێ داری یێ بچویك هەبوو، ژ شەش پارچێن راست دگەل سێ رێزێن بزمارا هاتبوو چێكرن، سەرێن بزمارێن وێ د مەزن و گرۆڤر بوون، ل هەر رێزەكێ شەش بزمار هاتبوونە لێدان، دیارە كوریكەكا ب ئێك ژ وان داراڤە هەی، مەرەم ژێ ئەوە كو دەرگەهی ل سەر ئەردی بنەجهـ كەت،

وێنەیێ (٤)



دەرگەهێ کەڤن یێ هاڤێتیە رەخەکی، ل شوینا وی دەرگەهەکێ نوی یێ ئینای، وەکی یێ کەڤنێ چێکری، دا کو بساناهی بهێتە گرتن (وێنەیێ/٤).

روویێ ژ دەرڤە یێ گۆمبەتێ نیڤ کڤانە، کو ژ بەرێن تراشتی هاتییە ئاڤاکرن، هەمی ب ئاخێ یا هاتییە کوتنەکرن، پاشی بەرێن وەکی ئێك یێن هاتینە دانان، کو رەنگەکێ دی یێ دایێ، ڤێ چەندێ ژی بانێ وێ پیچەکێ یێ ڤەدایە رەخا و ل سەری پیچەکێ یا تیژ بووی، دبیت مەرەم ئەو بیت کو بانێ گۆمبەتێ بهێتەگرتن، دا کو ئاڤا بەفر و بارانا نەچیتە

**وێنەیێ (٥)**

**بانێ گۆمبەتا سولتان حسێن وەلی ژ ناڤ دا**



**وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەری هاتییە گرتن.**

ژناڤ دا (بنێرە وێنەیێ هژمار ١).

بەلێ بانێ گۆمبەتێ ژ ناڤدا یێ ب بەرێن تراشتی یێن بچویك هاتییە چێکرن (وێنەیێ /٥).ب رەنگەکێ ژێهاتی یێن هاتینە دانان، ئەردێ گۆمبەتێ وەکی هەمی ئاڤاهیێن دی یێن شوینواری و کەلتۆری یێن ئامێدیێ ب بەرا هاتبوو رائێخستن. ژ هەژی یە بێژین کو پتریا ئاڤاهیێن ل سەر گۆر و مەزار و مەرقەدا ل ئێراقێ هاتینە ئاڤاکرن هەر ژ چەرخێ (حەفتێ مشەختی/ سێزدێ زایینی) و پشتی هینگێ، گۆمبەتێن سەرتیژ ل سەر هەبوون.

ژ ناڤدا ژی گۆمبەت یا هەشت لایە و ژ بەر و کسلا هاتییەئاڤاکرن، رووبەرێ هەشت رەخێن وێ ل نیڤەکا هەر رەخەکێ وێ (٤،٤٨×٤،٤٨م)ن. ئەندازیاری بۆ مەرەم بنیاتێ وێ یێ ل سەر هەشت لایا دانای، دا بشێت گۆمبەتا خۆ بێ زەحمەت ئاڤاکەت[11].

ئەو پەنجەرکێن بەری نوکە مە ئاڤری پێ کری، هاریکارن کو رۆناهیا پێدڤی بێتە دناڤ گۆمبەتێ دا، دا مرۆڤ بشێت ب کەیفا خۆ دناڤ دا بهێت و بچیت، دیسان هوستای هندەك نەخشێن ل سەر روویێ هەر هەشت رەخا دگەل هندەك جهێن دی نکراندین، دا کو جوانییەکێ بدەتێ و ژ بێزاری و هشکاتیيا دیتنێ دویر کەتن.

ل رەخێ ژێریێ گۆمبەتێ و ل سەر هەردو کوژێن راست و چەپێن پەنجەرکێ هندەك نەخشێن هەین، وەکی وێنەیێن ئەندازیارینە، ژ دو یەکێن وەکهەڤ د دیزاینێ دا پێکدهێن، ئێك ژوانا دکەڤیتە کوژێ راستێ یێ پەنجەرکێ، وێنەیێ وێ وەکی کڤانەکێ تیژە کو د بەری را هاتییە کۆلان، دناڤدا چار سێ کوژی هاتینە نەخشکرن، سێ ل خارێنە و یا دی ژی ل سەرییە، دو ژوان سێ کوژێن ل خارێ، کوژیەکێ وانا یێ راستە (قائمە) یا سێیێ ژی یا ل سەر سەرێ خۆ راوستایە، ب زەخرەفەیێ هاتینەخەملاندن، کو ل خارێ وێنەیێن موعینانە، چەند وێنەکێن دیارکرینە ب رەخەکیڤە دچن نە ل ژێری، وێنەیێ سێگرشەکێ دکەڤیتە هنداڤ، سێ کوژێن درێژ ژی بەر ب خارێ دبەن، ل سەری ژی تیژ لێ دهێت، وێنەیێ وی نێزیکی یێ سەرێ رمی یە، بەلێ سێ کوژیا ناڤەراستێ هندەك هێلێن شکەستی تێرا دبۆرن، ب هندەك موعینێن بچویك ب داوی دهێن، وەکی بەلگێ رمێ یە.

بەلێ سێ کوژیا چارێ ئەوا دکەڤیتە رەخێ سەری، ل سەر شەنگستێ سێ کوژیەکا ڤۆلپاندی ل سەر سەرێ وێ هاتییە دانان، ب نەخشێن سێکوژێن رەخا هاتییە خەملاندن، ل رەخۆدۆرێن وێ دو بەلگێن وەکی گویزا هەنە، بەلێ بستیکێن وان ژێکجۆدایە.

یەکا دویێ ئەوا دکەڤیتە رەخێ راستێ یێ ژێریێ پەنجەرکێ، کڤانەکا ل رەخۆدۆرێن وێ هەی، وەکی کڤانا یەکا ئێکێیە، دیسان چار سێکوژی یێن تێدا هەین، ئەو ژی وەکی یا یەکا ئێکێیە، بەلێ نەخشێن

وێ ژ یێن یەکا ئێکێ د جۆدانە، ئەو سێ کوژێن دکەڤنە رەخێن وێ، ل بنێ وان هندەك سێ کوژێن بچویك هەنە، وەکی ددانێن مشارینە، ل سەرێ وان هندەك سێ کوژێن دی یێن هەین کو سەرێ وان یێ تیژە، بەلێ سێ کوژیا ل نیڤەکێ نەخشێن وێ وەکی یێن نەخشێن یەکا ئێکێنە.

بەلێ سێ کوژیا چارێ ئەوا دکەڤیتە سەر سێ کوژیا ل نیڤەکێ یان یا خارێ دا، نەخشێن وێ چەند هێلەکن کو ژ ناڤەراستێ بەر ب رەخاڤە دچن، وەکی تایێ دارا قەسپێیە. دڤێت بزانین کو هەمی نەخشێن وێ ب رەنگەکێ دەرکەتی یێن هاتینە نەخشکرن، دیسان خاربوونەك یا دناڤبەرا هەردو یەکا دا هەی. ب بلنداهیا (١،٩٠م) ل سەر ئاستێ ئەردی، چەند کڤانەکێن بچویك یێن دەرکەتی یێن هەین، هژمارا

**وێنەیێ (٦)**

**کڤانێن (ئاقدێن) گۆمبەتا سولتان حسێن وەلی بلند**



**وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەری هاتییە گرتن.**

وان (١٦) کڤانن، ل نێزیکی کوژیا هاتینە پشککرن ئانکو هەر لایەکی دو ژ وان کڤانا یێ ڤ بەرکەتین (وێنەیێ/ ٦)، رووبەری وان کڤانا (٤٢×٢٤سم)، وەکی دیار کو ئەڤ کڤانە هاتینە رەسمکرن پاشی پشکێن ژدەرڤە هاتینە نکراندن، هوسا یا دیارە کو پیچەکێ ژ دیواری دەرکەڤتینە[١٢].

دیسان رەنگێن ئاڤی ژی بەختێ خۆ د نەخشکرنا ڤی شوینوارێ جواندا هەبوون، تیڤەرێزەکا نەخشکری دهێتە دیتن، پەحنیا وێ (١١سم)، ل سەر بلنداهیا (٣،٤٠م) ل سەر ئاستێ ئەردی گۆمبەتێ هاتییە

**وێنەیێ (٧)**

**وێنەیێن ب رەنگێ ئاڤی ل گۆمبەتا سولتان حسێن وەلی هاتینە چێکرن .**



**وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەری هاتییە گرتن.**

وێنەکرن، (١٥) وێنەیێن وەکی هرمیکێ یان سێڤێ ل سەر هاتینە نەخشکرن، هەمی ژی ب رەنگێ رەش یێن هاتینە رەنگکرن[١٣](وێنەیێ /٧)

## سندۆقا گۆرێ سولتان حسێنێ کورێ حەسەنی: (وێنەیێ ٨)

تشتێ کو دبیتە جهێ پویتە پێکرنێ دناڤ گۆمبەتێ دا، سندۆقا گۆرێ سولتان حسێنێ وەلییە، کو ژ دارێ ساجی هاتییەچێکرن، درێژاهییا وێ (٢،٨٥م) و فرەهییا وێ (٦٣سم) و بلنداهیا وێ (٩٣سم)، د بنیات دا ژ چار پێنبکا و هەشت دەپێن رائێخستی پێکدهات، دناڤبەرا وان دەپ و پێپکا ب حەشوکرنێ هاتبوو تژیکرن، زێدەباری دو رەخا و ژسەرڤە ژی ب دەپەکی دهاتە نخافتن، سندۆق نوکە (٢٠سم) یا ژ رەخێ ژێریێ گۆمبەتێ دوورە، هندەك نەخشێن ئەندازیاری روویێن وێ سندۆقێ د خەملینن، ڤێ چەندێ گرنگییەکا باش دایە کێلیا رەخێ سەری، کو ب کۆمەکا نەخشێن ئەندازیاری یێن جوان هاتینە خەملاندن، ئەڤ نەخشە ب رێکا حەشوکرنێ یێن

**وێنەیێ (٨)**

**زەخرەفەیێن ئەندازیاری یێن سندۆقا گۆرێ سولتان حسێن وەلی**



هاتینە بجهئینان[14]. ب رێکا (تەعشیقێ)[15] یێن بنەجهـ بووین، ئەو ژی پارچێن دارینە کو پێکڤە دهێنە گرێدان، ب رێکا (نکراندن و ئەزمانکی- مەرەم ئەوە کو ئەو چکۆلکێ ژ داری دەردکەڤیت دبێژنێ ئەزمانك- وەرگێر)، ب رەنگەکێ گشتی نەخشەکێ ژێ چێبووی کو ستێرێن چار سەرن و وێنەیێن وەکی باهیڤکێ و سێکوژیێن وێ جۆداهیا وان نە وەك ئێك، زێدەباری وێنەیێن موعینا و وێنەیێن هەشت لایی.

دەمێ شرۆڤەکرنا وان نەخشێن ئەندازیاری یێن ئێك ژ تەنشتێن وێ د خەملینن، دیارە کو هەر ئێك ژوانا ژ وێنەکێ موعینی یێ مەزن پێکدهێت، ل سەر هەر چار رەخێن وێ ستێرێن چار لا هاتینە پشککرن، دو لاییێن وێ دچنە دناڤ موعینێ دا، دو ژی بۆ ژدەرڤە یێ دەرکەڤتین، هەر لایەکێ ڤان ستێرا رەنگێ باهیڤێ یێ وەرگرتی، ل نیڤەکێ ژێ موعینەکا هەشت لایی یا هەی، دناڤ ڤان موعینا دا هەشت سێکوژی یێن هەین کو سەرێن وان بەر ب نیڤەکا موعینێ دچن، زێدەباری دو هێلا کو موعینێ ل کوژیا دبڕن، ئەڤ

**هێلکاری (٢)**

**زەخرەفەیێن ئەندازیاری یێن ئالیێ پێشیێ یێ سندۆقا گۆرێ سولتان حسێن وەلی خەملینن**



وێنەیێ (٩)

سندۆقا گۆرێ سولتان حسێن وەلی د دەمێ نها دا



یەكە جارەكا دی بۆ چەند لایەكان دوبارە دبنەڤە، (هێلكاری/٢)، دیسان تیڤەرێزەكا بچویك یا هەی كو لیڤێن سلال یێن تەنشتا سندۆقێ دخەملینیت، ئەو ژی سێكۆژێن بچویكن، ئێك ل دووڤ یا دی دهێت و ل سەر سەرێ وان هاتینە دانان، بەلێ پشكەكا ڤێ تیڤەرێزێ یا شكەستیە و بەرزەیە. مخابن كو ئەڤ پارچا سندۆقا داری یا هەڤرویشی وێرانبوونەكا دژوار بووی، گەلەك ژ پشكێن وێ ژ ئەگەرێ ڤێ پشتگۆهاڤێتنەڤە نەماینە، كو ئەڤ شوینوارێ گرنگ پێدڤی هەمی رەنگێن پویتەپێدانێ نە.

بەلێ نەخشێن تەنشتا دویێ (پاشیێ) ل ئاستێ نەخشێن تەنشتا ئێكێ نینن، بەلێ هۆنەرمەندی بزاڤا كری كو تشتەكێ جوان نیشا بدەت، هندەك حەشوێن داری یێن بكارئینایێ، ئەو ژی كۆمەكا نەخشێن بێ نیشانن، كو ژ وێنەیێن لاكێشا و چاركوژیا پێكدهێن، ب رێكا دانانا وان نەخشا و چێكرنا چارچوڤێن وان، نەخشەكێ خشكۆك یێ ژێ چێبووی، كو دبێژنێ نەخشێ دووریێچكری (حصری)، ئەو نەخشە ب رێكا دووریێچكرنا وان حەشوا دناڤ چارچوڤا دا هاتینە چێكرن، كو ب رێكا (نكراندن و ئەزمانكی) هاتینە بجهئینان. دیارە كو هندەك ژ پشكێن ڤێ سندۆقا داری د شكەستینە، هندەك ژی د بەرزەنە، بەلێ دەبێ سەری مینا دەبێ دی یێ سندۆقێ نینە، دبیت یێ نوو بیت[١٦]. هەژیە بێژین كو چ نڤیسین ل سەر وێ سندۆقا داری نینن[١٧].

## دو: گۆمبەتا رەوشەن خانێ[١٨] (وێنەیێ/ ١٠)

(٦كم) یا ژ رەخێ رۆژئاڤایێ گۆمبەتا ئێكێ دوورە، ژ لایێ نەخشە و ئاڤاهی هەردو گۆمبەت وەكی ئێكن، گۆمبەت ل سەر شەنگستەكێ هەشت لای هاتییەدانان (هێلكاری/ ٣).

رەخێن وێ یێن دەرڤە هندی ئێك نینن، دناڤبەرا (٢.٦٠- ٢.٧٣م) بلنداهیا وێ ل سەر ئەردێ نوكە (٢.٦٠م)، ستویراتیا دیوارێن وێ نێزیكی (١.٤٠م)ە.

گۆمبەت دگەل ژوورا گۆری(قەبری) ب بەرێن تراشتی كو پیڤانێن وان د جۆدانە، هاتییەئاڤاكرن، گێچ ژی وەكی مادێ نویساندنێ هاتییە ب كارئینان، دیارە كو گۆمبەت ب رەنگەكێ ئێكسەر ل سەر رەخێن وێ نا رابیتەڤە، بەلكی بیاڤەك دناڤبەرا لیڤێن دیواری و گۆمبەتێ هەیە، كو درێژاهیا وێ(٧٠سم)،كو دبیتە ستویێ گۆمبەتێ، ئەڤ رەنگێ ئاڤاكرنێ هەر ژ سەردەمێ ئەمەویا هەبوو، هەروەكی د ئاڤاهیێ (قبە صخرە ٧٢مش/٦٩١ز)دهێتەدیتن[١٩](بنێرە نەخشێ هژمار ١).

سەرێ گۆمبەتێ ب چ ماددا نەهاتییە نخاڤتن، بەروڤاژی گۆمبەتا سۆلتان حسێنێ وەلی، دا كو ژ ئەگەرێن سەقای ب پارێزیت، قەبارێ گۆمبەتێ مەزنترە ژ یا بەری نوكە مە بەحسێ وێ كری، بازنەیا

وێنەیێ (١٠)

گۆمبەتا رەوشەن خان كچا ئیسماعیل پاشایێ ئێكێ



**هێلكاری (٣)**
**هێلكاریێ گۆمبەتا رەوشەن خانێ**




ژێدەر: ڤەكۆلەر

وێ دگەهیتە (١٦م) و بلنداهیيا وێ ژ بلندترین ئاستێ هەشت رەخێن وێ (٢،٤٠م)ە. ل هندەك رەخێن وێ پەنجەرکێن هەین، پەنجەرکەك یا ل رەخێ وێ یێ رۆژهەلاتی هەی، یا نێزیکی لاکێشێیە، قەبارێ وێ (٩٠×٧٠سم)، وەکی وێ یێن ل رەخێ رۆژئاڤا و ژێری هەین، هندەك کووراتیێن بچویك (کونێن کویر) ل سەر لێڤێن ژدەرڤە یێن پەنجەرکا یێن هەین، دبیت بۆ مەرەما ئاسێکرنا شفشێن ئاسنی بیت، دا کو ژێلی رێکا دەرگەهی، کەس ب چ رێکێن دی نەچیتە دناڤ گۆمبەتێ دا، دەرینکێ وێ دکەڤیتە رەخێ ژووری، رەنگێ وێ لاکێشەیە (١،٢٠م×٧٠سم)، ل سەر دەرینکی کڤانەکا هەی، پەحنیيا وێ (٢٠سم)، ل سەر رووبێ دیواری هاتییە چێکرن و چ ژێ دەرنەکەڤتیە.

رووبەرێ ژوورێ (٤،٦٥×٤،٥٥م)، هوستای رێكەكا ژنهاتی و بەرئاقل بکارئینایە، دیارە کو شەهرەزایی د رێکێن ئاڤاهیێن عەربی یێن ئیسلامی دا هەبوویە، ئەو ژی سێکوژێن خوارن (سێکوژێن کوژیا) کو دناڤبەرا ملێن کڤانا دا هاتینە دووریێچکرن (وێنەیێ/ ١٢)، سێکوژیەکا بەروڤاژی ل هەر هەشت کوژێن ئاڤاهی دهێتەدیتن، ب رێکا وێ یێ شیای کڤانەکێ چێکەت، گۆمبەت برەنگەکێ ب ساناهی یا ل سەر هاتییەدانان، بزاڤا کری کو ئەو سێکوژی پیچەکێ ژدیواری بۆ رەخێ ژناڤدا دەرکەڤتی بن، دا کو رێزێن دیواری ل سەر براوستن، کو ژ وێ خالێ دەست ب زڤرینێ دکەن. ئەو جهێ سەروبنێن وان سێکوژیا تێکەل دبن، هەشت کڤانێن نیڤ بازنەی ژێ چێدبن، کو پویچەکێ د تیژن، هەر کڤانەك ژ وان ل رەخەکێ ئاڤاهی هاتییەدانان، ئەو سێکوژێن دکەڤنە رەخێ راست و چەپێن کڤانێ (رەخێ قیبلێ) ب نەخشێن ئەندازیاری و رووەکی و ئایاتێن قورئانا پیرۆز هاتینەخەملاندن، رەخێ راستیێ یێ سێکوژیێ ئەوێ دکەڤیتە رەخێ چەپێ یێ کڤانێ، ب تیڤەرێزەکا نەخشا هاتییە خەملاندن، کو ژ هێلێن خارۆڤیچ پێکدهێن و وێنەیێن موعینا یێن ناڤ دا، ئەڤ هێلە

**وێنەیێ (١٢)**
**سێكۆشەیێن كڤانی ل گۆرێ رەوشەنخانێ**



ژێدەر: وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەری هاتییە گرتن

د بەردەوامن هەتا دویماهیا رەخێ راستێ، ژ دەرڤە ژی وێنەیێن ئەندازیاری برەنگێ سێکوژێن برەخێکڤە رەخودورێن وێ گرتینە، ئەو ژی سێکوژینە کو وەك دانێن مشارینە، هەتا دگەهیتە ئاستێ نەخشێن

رووەکی.

ل رەخێ چەپێ یێ وێ تیڤەرێزا مە بەحسکری، دو تاك و بەلگێن وەکی رما بەرچاڤ دکەڤن، بستیکێن وان یێ ل خارێ، ل سەر وان کۆمەکا موعینا ب قەبارێن جۆدا یێن هەین، ل سەرێ وان ژی ئەو نەخش و نیگارێن ئەوێن مە بەری نها بەحسێ وان کری. سێکوژیەکا مەزن یا ل سەر سەرێ وێ هاتیەدانان، ب رێکا هێلەکێ یا بوویە دو پشك، پشکا سەری و یا خارێ، پشکا خارێ نەخشێ پێنج بەلگێن همبزن، ب رێکا نکراندنا ژناڤ دا هاتینە کۆلان، ئەو بەلگە هەمی ل رەخێ خارێ لجهەکی دگەهنە ئێك[٢٠]. بەلێ پشکا سەری ژ وێ سێکوژیا مە بەحسکری، سێکوژیەکا ل نیڤەکێ هەی، کوژێن وێ د راستن، ب نەخش و نیگارا هاتیەخەملاندن، نەخشێ وێ سێکوژیەکە کو سەرێ وێ بەر ب خارێ دچیت، بەلێ یا ڤولپاندییە، نەخشێ رەخێن راست و چەپێن ڤێ سێکوژێ وەکی نەخشێن سێکوژیا ل خارێنە، بەلێ ژ لایێ قەبارەیڤە بچویکترن (وێنەیێ/١٣).

ل سەرێ وان نەخشا، تێڤەرێزەکا دی یا نەخشکری هەیە، ئەو ژی ڤۆرمێن دارا و بەلگێن رووەکانە، کو دناڤێکرانە و ل نیڤەکا وەکی گۆلەکێ لێ دهێن، ل رەخێ سەری ژی تێژ دبیت، ل سەرێ وان نەخشێن رووەکی ئەوێت مە بەحسکرین، تیڤەرێزەکا نڤیسی

**وێنەیێ (١٣)**

**زەخرەفەیێن سێگۆشەیا ڤولپاندی ل ئالیێ ژێری یێ گۆمبەتا رەوشەنخانێ**



هەیە، کو ئایەتەکا قۆرئانێیە (إنا فتحنا لك فتحا مبينا * ليغفر لك الله ما تقدم من ذنبك وما تأخر ويتم نعمته عليك ويهديك صراطا مستقيما * وينصرك)[٢١].

بەلێ ئەو سێکوژیا دکەڤیتە رەخێ راستێ یێ کڤانێ، نەخشێن وێ ژی وەکی سێکوژیا بەری نوکەنە، ژبلی تیڤەرێزا نڤیسینێ، ئایەتا بەری نوکە د سێکوژیا بەری نوکە دا تمام دکەت، دەقێ وێ ژی (الله نصرا عزيزا)[٢٢]، زێدەباری ئایەتێن پشتی وێ، ئەو ژی

**وێنەیێ (١٤)**



ژێدەر: وێنە ژ لایێ ڤەکۆلەری هاتییەگرتن.

(إنا عرضنا الأمانة على السماوات والأرض والجبال فأبين أن يحملنها وأشفقن منها)[٢٣]، (وێنەیێ/ ١٤).

ئەندازیاری بزاڤا کری ب رەنگەکێ خشکۆك گۆمبەتێ ژ ناڤ دا دەربێخیت، ئەو ژی پارچێن بەری ب رەنگەکێ ب رێکخستی و ئێك ل دووڤ یا دی یێن ب سەروبەرکرین، ئەردێ ژوورا گۆرا ژی ب بەرێن جۆدا هاتییەرائێخستن، بەلێ گەلەك ژ وان نەمانە. هەژیە بێژین کو چ سندۆقێن داری د ڤی گۆریڤە نینە، وەکی وێ سندۆقا د گۆرێ سولتان حسێنی ڤە هەی، بەلێ دو کێلیێن گۆرا یێن هەین، کو ل کوژیەکێ ئاڤاهینە و ژ بەرێ مەرمەری هاتینە چێکرن.

## كێليا گۆرێ[٢٤] رەوشەن خانێ

بەلێ كێليا گۆرێ ئەوا ل دەڤ سەرێ دهێتەدانان، ژ بەرێ مەرمەرێ شین هاتینە چێكرن: بلنداهیيا وێ (١،١٥م) و پەحنییا وێ (٦٤سم) و ستویراتیا وێ (١٠سم)، رەنگێ وێ یێ لاكیشەییە، كڤانەكا ل سەرێ هەیێ ژ شەش رێزا پێكدهێت، بەلێ پشكا ل سەرێ پویچەكێ یا تیژە، كو ژ شەش رێزێن نڤیسینێ پێكدهێت، ب ڤی رەنگی: (هێلكاری/ ٤).

رێزا ئێكێ: یا ارحم الراحمين

رێزا دویێ: هذا قبر المرحومه

رێزا سیێ: المبروره المغفوره لها

رێزا چارێ: روشن بنت إسماعيل باشا

رێزا پێنجێ: توفیت فی شهر رجب

رێزا شەشێ: سـنه ١٢٠٢.

ب كوردی

رێزا ئێكێ: یا یێ ژ هەمیا دلۆڤانتر

رێزا دویێ: ئەڤە گۆرێ خۆدێ ژێ رازیيا

رێزا سیێ: بێ گونەهـ و خۆدێ ب غەفرینیت

رێزا چارێ: رەوشەنا كچا ئسماعیل پاشای

رێزا پێنجێ: ل هەیڤا رەجەبێ مریە

رێزا شەشێ: سالا ١٢٠٢.

كێليا دویێ ئەوا ددانە رەخێ پییا، ئەو ژی ژ لایێ قەبارە و رەنگیڤە وەكی كێليا ئێكیە، ئەڤ نڤیسین یێ ل سەر هەین: (هێلكاری/ ٥).

رێزا ئێكێ: یا أكرم الأكرمين

رێزا دویێ: أيها الزائر قبری اهدی لی

رێزا سیێ: من كلام الله اجر الفاتحه

رێزا چارێ: قل علیها رحمه من ربها

رێزا پێنجێ: ولها أبواب خير فاتحه

رێزا شەشێ: سـنه ١٢٠٢.

ب كوردی

رێزا ئێكێ: یا خۆدانێ كەرەمێ

رێزا دویێ: ئەی ئەو كەسێ تو دهێیە سەر گۆرێ من، بۆ من بكە دیاری

رێزا سیێ: ژ كەلامێ خۆدێ خێرا فاتحەكێ

رێزا چارێ: بێژە خۆدێ دلۆڤانیێ پێ ببەت

رێزا پێنجێ: دەرگەهێن خێرێ بۆ ڤەكەت فاتحە

**هێلكاری (٤-٥)**







هێلكارێن كێليا گۆرێ رەوشەن خانێ

وێنەیێ (١٥)
كێلیا گۆڕێ ڕەوشەن خانێ و باندۆرا سەقایی ل سەر سەرۆبەرێ وێ



وێنەیێ (١٧)
ئێك ژ كێلێین گورا یێ ل گۆمبەتا نەناسكری هاتییە دیتن



وێنەیێ (١٦)
بەرماكێن گۆمبەتەكا نەناسكری چەند گۆڕەكا هەمبێز دكەت



ژێدەر: وێنە ژ لایێ ڤەكۆلەری هاتییەگرتن.

رێزا شەشێ: سالا ١٢٠٢.

بەلێ مخابن هەردو رەخێن ڤێ کێلیێ یێن خرابببووین، ژ بەرکو ئەڤ ئەنتیکێن ب بها یێن هێلاینە دبن دلۆڤانییا ئەگەرێن سەقایڤە، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو بارانێن هاتینە ژوورڤە، هەر ژ سەری هەتا خوارێ درزەکا درێژ یا ل رەخێ چەپێ کری (وێنەیێ/ ١٥).

ل رەخێ ژووریا گۆمبەتا رەوشەن خانێ، بەرماکێن بنیاتەکی دهێنە دیتن (وێنەیێ/ ١٦)

دبیت ئەڤە ژی یێن گۆمبەتەکێ بن وەکی وان گۆمبەتێن بەری نوکە مە ئاڤری دایێ، بەلێ شەش رەخ بتنێ ژێ ماینە، ژ بەرێن نە تراشتی و کسلێ هاتییە ئاڤاکرن، ئەوا ژێ مای شەنگستێ وێ یە کو بلنداهییا وی (٧٥-٩٥سم) و پەحنییا دیوارێن وێ (٩٣سم)، دبیت دەرینکێ وێ ل ئێك ژ رەخێن وێ یێن نەمای بیت، ژناڤ دا قەبارێ ژوورێ (٤،٥٥×٤،٢٥م)، دناڤ وێ ژوورێ دا بەرماکێن سێ کێلیا هەبوون، دو ژوان د نەخشکری بوون، یێ سێێ هندەك نڤیسین ل سەر هەبوون، بەلێ هەشفت بوون (تشویە) ئەم نەشیاین بخوینین[٢٥] (وێنەیێ/ ١٧).

## ژێدەر:

١. العباسي،محفوظ: إمارة بهدينان العباسية، مطبعة الجمهورية (الموصل،١٩٦٩م). العباسي: المرجع السابق، إحدى صور الكتاب، ص().

٢. ل دویڤ نڤیسارەکا مووزەخانا مووسلێ یا هژمار (٢٩٣) ل رۆژا ١٩٦٧/٧/٤م و هژمار (١٣٢٣) ل رۆذا ١٩٧٢/٨/٢ز.

٣. سولتان حسێنێ کورێ حەسەنێ سەیفەددینی پتریا جارا دبێژنێ (حسێن وەلی)، پشتی مرنا بابێ خۆ دناڤبەرا سالێن (٩٤٠_٩٨١مش/ ١٥٣٣_١٥٧٣ز) دەستەلات وەرگرتیە، ئەڤە ژی ل دووڤ سوزنامەکێ بوو کو ژلایێ سولتان سلێمانێ قانوونێ (٩٢٧_٩٧٤مش/ ١٥٢٠_١٥٧٣ز) هاتبوو سپارتن، جهەکێ تایبەت هەبوو، دهێتە زانین کو ل دەڤ (باب العالي) میرێ کوردا یێ ژ هەمیا وەفادارتر بوو، ل دووڤ داخوازیا دەولەتا ئۆسمانی کۆمەکا ئێرشێن لەشکەری کربوون، شیا سنوورێن میرگەها خۆ بەرفرەهـ کەت، بۆ چەند سالا ژی دەستەلات ل مووسلێ کریە، ژێدەر وەسا دیاردکەن کو ل سەردەمێ وی شۆرشەکا ئاڤاکرنێ چێببوو، دیسان ب (تەقوا) و ڤیانا زانایا یێ ناڤداربوو، ل سالا (٩٨١مش/١٥٧٣ز) وەغەرکریە، (٣٩) سالا ژی دەستەلات کریە، بۆ پتر پێزانینا سەحکە: البدليسي، الامير شرفخان بن شمس الدين بن شرفخان الروزكي (ت١٠١٠هـ/١٦٠١م): شرفنامە، ترجمة محمد جميل الملا احمد الروژبياني، ط٢، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر (أربيل،٢٠٠١م). ص٢٦٢، هامش٢٤؛ المائي، أنور: الأكراد في بهدينان، مطبعة الحصان (الموصل،١٩٦٠م)، ص١٢٨-١٣٠؛ ئامیدي، كاوه فريق: أمارة بادينان (١٧٠٠-١٨٤٢م)، ط١، مطبعة خبات (دهۆك،٢٠٠٠م). ص٣٤. (نەخشێ/٢).

٤. الدراجي: عمارة القلاع، ص ص٨٤-٨٥.

٥. الجمعة، احمد قاسم: العناصر المعمارية والفنية لقبة الصخرة والمسجد الأقصى، دراسات في تاريخ وآثار فلسطين، وقائع الندوة العالمية الأولى للآثار الفلسطينية (جامعة حلب،١٩٨٤م) ص٤٩.

٦. محمد، غازي رجب:العمارة العربية في العصر الإسلامي، مطبعة التعليم العالي والبحث العلمي (جامعة بغداد،١٩٨٩م)، ص٢٠٣.

٧. یاقوتێ موستەعصمی ئەوێ ل سالا ( ٦٩٨مش/١٢٩٦ز) مری، خۆشنڤیسێ ژ هەمیان ناڤدارتر بوو کو ل داوییا سەردەمێ عەباسی و سەردەمێ مەغۆلیا ژیای، بنێرە: (العزاوي، عباس: خطاطو جامع مرجان، مجلة سومر، (١٩٤٧م) مج٣، ج٢، ص٣١٢-٣١٦. ژ سالۆخەتێن نڤیسینا موستەعصمی: پیتێن وێ لێکدای و درێژن، پیتێن راست وەکی ئەلیفێ هند دیار نینن، گەلەك تا ژ داوییا وێ ناچن، گەلەك پێکهاتێن نڤیسینێ یێن تێدا هەین و دیسان گەلەك پێکهاتێن هۆنەری ژی دناڤ دانە، بنێرە: (الجمعة، احمد قاسم:الآثار الرخامية في الموصل خلال العهدين الاتابكي والايلخاني، أطروحة دكتوراه (غير منشورة) مقدمة إلى مجلس كلية الآثار بجامعة القاهرة، (القاهرة، ١٩٧٥م) مج١. ص١٥٥.).

٨. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.

٩. الجمعة، احمد قاسم: مدخل مزار (بنجة علي) في الموصل، مجلة اداب الرافدين، العدد (١٩) لسنة١٩٨٩م، ص٩٩.
١٠. مصطفى، صالح لمعي: القباب، (بيروت،١٩٧٧م)، ص١٠.
١١. مصطفى، صالح لمعي: القباب، (بيروت،١٩٧٧م)، ص١٠.
١٢. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.
١٣. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.
١٤. حەشوە: پارچەکا بچویکا داریە، شکلێ وێ یێ ئەندازیاریە، ب چەند کەرستا دهێنە نەخشکرن و تامدان، وەکی عاج و مینای، هەر ژ سەردەمێ عەباسییا ئەڤ رەنگێ نەخشی هەبوو، بەلێ ل سەردەمێ مەملووکیا گەهشتا گۆپیتکا هووری و جوانیێ، هندەك شکلێن ئەندازیاری یێن ئالۆز هاتنە ناڤدا، ستێر تێکهەلبوون، سێ کوژی و مونحەنی و لاکێشە و چوار کوژی زێدەبوون. بنێرە: وزيري، د.م يحيى: موسوعة عناصر العمارة الإسلامية، الكتاب الرابع، ط١(القاهرة،٢٠٠٠م)، ص٣١.
١٥. تەعشیق (interleave): هۆنەرێ تەعشیقکرنا داری، هۆنەرەکێ خشکۆك و جوانە و دەلیڤا خیالێ و داهێنانێ یا تێدا هەی، رامانا وێ ژی ئەوە کوچەند وێنەیێن ئەندازیاری ل سەر پارچەکا داری بهێنە کۆلان، بێ کو بهێنە نخافتن یان ژی بزمار بهێنە بکارئینان، ئانکو ب رێکا هاڤێتن و نکراندنێ دهێتە بجهئینان، دێ پارچەکێ ژ داری کولی پاشی دێ جهێ داری دی لێ چێکەی و دێ ئێکودو گرن (وەرگێر).
١٦. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.
١٧. د نڤیسارا مووزەخانا مووسلێ یا هژمار (١٥٦/٧١/٥)ل رۆژا (١٩٥٥/٣/١٥) ئەوا بۆ رێڤەبەریا شوینوارێن کەڤن هاتیە هنارتن، دیاردکەت کو موفتیێ ئامێدیێ ئەو هایدارکرینە کو سندۆقەك یا دگۆمبەتێ دا هەی، ژ دارێ ساجی هاتیە چێکرن و نڤیسنێن ئەرەبی ب خەتێ کوفی ل سەر هەنە، زێدەباری نەخش و نیگارا، موفتی دبێژیت کو ئەو یێ شیای چەندەکێ ژێ بخوینیت، ئەو ژی (داود بن يوسف بن أفرا يم المعروف بابن الحزاني توفي سنة٦٩٦هـ)، بەلێ مە چ ژ ژیان و مرنا ڤی کەسێ ل سەری نەزانی، دیارە کو پێزانین بۆ موفتیێ ئامێدیێ ب رێکا کەسێن دی یێن هاتین، یان ژی ئەو سندۆقە یا ژ جهەکێ دی هاتی و یا کریە دناڤ گۆرێ سولتان حسێنێ وەلی، بەلێ راستی ئەو نڤیسینا ل سەر دەرگەهێ گۆری هەی، چ گۆمانێ ناهێلیت کو ئەو گۆرە یێ سولتان حسێنێ یە (ڤەکۆلەر).
١٨. رەوشەن خان کچا (ئیسماعیل پاشایێ ئێکێیە) ئەوێ دناڤبەرا سالێن (١١٨٢_١٢١٣مش/ ١٧٦٨_١٧٩٨ز) دەستەلاتداری کری بەلێ ل سەر ژیانا وێ چ بدەست مە نەکەفتیە، ژبلی کێلیا گۆرێ وێ کو دیاردکەت ئەو کچا (ئیسماعیل پاشایێ ئێکێ یە) و ل سالا (١٢٠٢مش) مریە، وەختێ مە سەرەدانا کەلها شۆشێ کری، دیاربوو کو دەیکا وێ (نائیلە خاتوون) ل وێرێ هاتیە ڤەشارتن (وێنەیێ/ ١١)، (ڤەکۆلەر).
١٩. Fig 20.١.vol.(١٩٥٨ ١st.Pup.Pdican(book.Creswell(E.M.A).Early Muslim Architecture
٢٠. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.
٢١. سورة الفتح، الآية ١-٣.
٢٢. سورة الفتح، الآية ٣.
٢٣. سورة الأحزاب، الآية ٧٢.
٢٤. کێلیا گۆری مەرەم ژێ نیشانەکە ل سەر وی مرۆڤێ هاتیە ڤەشارتن، هندەك جارا ناڤ و ناسناڤێن وی کەسینە، هندەك جارا ژی ژدایکبوون و مرن و هەتا شۆلا وی ژی، ابن الجوزي، ابو الفرج عبد الرحمن بن علي بن محمد بن علي (ت ٥٩٧ هـ/١٢٠٠م):المنتظم في تأريخ الملوك والأمم، دراسة وتحقيق: محمد عبد القادر عطا ومصطفى عبد القادر عطا، ط٢، دار الكتب العلمية (بيروت، ١٩٩٥م)، ج٤، ص٦٣؛ وما اشتهر به أبان حياته علاوة على بعض من آيات القرآن الكريم .ينظر، ابن خلكان، ابو العباس شمس الدين احمد بن محمد(٦٨١هـ/١٢٨٢م): وفيات الأعيان وإنباء أبناء الزمان، حققه: إحسان عباس، دار صادر (بيروت،١٩٧٠م)، ج٣، ط٤ (بيروت،٢٠٠٥م) ج١، ج١٠، ص ص٩٤ ، ٢٨٤. ژ بەر کو ئەڤ کێلیە ل جهەکی یا بنەجهـ نینە، ئەز دویر نابینم کو گۆرێ زەلامەکی بیت، ژ بەرکو ئەڤ ئایەتێن ئیرۆز ل سەر گۆرێ ژنکەکێ ناهێنە نڤیسین، بەلکێ ل سەر گۆرێ سەرکێشەکی دهێنە چێکرن کو چالاکیێن لەشکەری هەبن (ڤەکۆلەر).
٢٥. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.

# ڤەكۆلینەك ل سەر گۆمبەتێن گۆڕستانێن دەڤەرا بەهدینان

كۆڤان ئیحسان یاسین

## گۆمبەت چی یە:

گۆمبەت ب رامانا كڤانكرنا هەر تشتەكی دهێت، خرڤەكرنا رەخێن وێ و ڤێككەهشتنا وێ د بلندیا وێ دا[1]، ل دەڤ ئەندازیارێ ئاڤاهی گۆمبەت ب رامانا گرێیەكا كڤان كری دهێت[2]. ب چەند رەنگا دهێنە دیتن:

- **گۆمبەتا پەیسك:**

ئەڤ رەنگێ گۆمبەتا دەست ب بلنداهیێ دكەتن هەر ژ شەنگستێن خوارێ تا دگەهیتە بلندیا گۆمبەتێ، ئەڤ رەنگێ گۆمبەتا گەلەكێ كەڤنە، بۆ ئێكەم جار ل باژێرێ (ئۆر یێ سومەری) هاتبوو دیتن و بۆ نخافتنا گۆڕێن شاها هاتبوو ب كارئینان.

- **گۆمبەتا نیڤ لولەی:**

كووراتییەكا گرۆڤر یاهەی، بلندییا وێ یا لولەیی یە، ئەڤ میناكە ل چەرخێن میتانی و ئاشوری یێ كەڤن (١٥٠٠-٩١١ب.ز) دەركەفتییە.

- **گۆمبەتا تیژ:**

ئەڤ رەنگێ گۆمبەتێ دەست ب خواربوونێ دكەت هەر ژ شەنگستا تا دگەهیتە خالا داویێ و ب رەنگەكێ تیژ، بۆ ئێكەم جار ئەڤ گۆمبەتە ل سەردەمێ مالباتا ئۆر یا سیێ دەركەفتییە.

- **گۆمبەتا هێلكەی:**

ئەڤ جۆرێ گۆمبەتا رەنگێ هێكێ وەردگریتن، سێ مەلبەندێن هەین و هاتییە بكارئینان ل باكوور و باشوورێن دۆلا دو رووبارا یا كەڤن.

- **گۆمبەتا چەماندی:**

ئەڤ گۆمبەتە نەیا تمامە یان پشكەكا رازاندی یە ژ گۆمبەتێ، دا بشێت گرانیێ ل سەر گۆمبەتا مەزن كێم كەتن.

## پێكهاتا گۆمبەتێ و پشكێن وێ:

١- پێن گۆمبەتێ: ئێكەم بەر یان كەرپێچ دهێتە دانان دبیتە شەنگست یان پیێ گۆمبەتێ، دهێنە دانان ل سەر هەمی رەخێن گۆمبەت ل سەر دهێتە ئاڤاكرن، ب پشكێن دی پێن ئاڤاهی دهێنە گرێدان ڤە .

٢- چوكێن گۆمبەتێ: دبنە پشكا داویێ بەری دەسپێكرنا كڤانێ و دكەڤنە سەر دیواری.

٣- ملێن گۆمبەتێ: ئەو پشكە یا رەنگێ گۆمبەتێ دیاردكەت، ئایا گۆمبەت یا گرۆڤرە یان تیژ یان ڤەكری یان رازایی.

نەخشێ گۆمبەتا میر عەلی خان بەگی



٤- چارچوڤە (صنج- قالب): پارچەكا بەری یان كەرپیچی یە ب رێكا وێ ئەم كڤانا گۆمبەتێ دروست دكەین، دبیتە پشكا بنەرەتی ژ گۆمبەتێ.

٥- كلیل: ئەو پشكا بەری یان كەرپیچی یە دكەڤیتە ناڤەراستا كڤانا گۆمبەتێ.

٦- پشتا گۆمبەتێ: ئەو پەسارێ (انحدار) بلندە ژ سەرڤەیا گۆمبەتێ.

٧- زكێ گۆمبەتێ: ئەو پەسارێ گرۆڤرە ژ ناڤدا بەرامبەری ژێریا گۆمبەتێ[٣].

٨- ستووریا گۆمبەتێ: درێژاهییە دناڤبەرا زكێ گرێیا گۆمبەتێ و پشتا وێ.

٩- بلندیا گۆمبەتێ: درێژاهیا راستە دناڤبەرا گوپیتكا گۆمبەتێ و شەنگستێن وێ.

١٠- فرەهیا گۆمبەتێ: ئەو درێژاهییە دناڤبەرا پێن گۆمبەتێ ژ ناڤدا[٤].

## گۆمبەتا میر عەلی خان بەگی ل زاخۆ (١٧٩٠-١٧٩٧ز)ێ تێكەلا فۆرمێ جەزیرێ و سەلجوقی

دكەڤیتە دناڤ گۆرستانا زاخۆ یا مەزن[٥]. بلندیا گۆمبەتێ دناڤبەرا (٦،١٠م-٦،٢٠م) ژ دەرڤە، لێ ژ ناڤدا بلندیا وێ (٥،٢٠م-٥،٣٠م) ژ بەركو ستووراتییا دیوارێ وێ (٩٠سم)، بلندیا ئەردی تا دگەهتە بنێ پەنجەرا (٣م)، بلندیا پەنجەرا (١،٢٠م) ژپەنجەركێ تا دگەهیتە گوپیتكا گۆمبەتێ (١،٩٠م-٢م)ە، ب ڤی رەنگی دێ بلندیا گۆمبەتێ بیتە (٦،١٠م- ٦،٢٠م) ئەڤەژی بلنداهییەكا نێزیك دروستیێ یە[٦]. -درێژیا هەر رەخەكێ گۆمبەتێ ژ ناڤدا (٢،٩٧م - ٣م)ە، تیرێ وێ دبیتە (٦م) هەر چەندە ل هندەك جها ب ئەگەرێ رابوونا كورتانەی (لەبخێ) دبیتە (٦،١٠م)، ژ بەر ڤێ چەندێ رووبەرێ ژناڤدا دبیتە (٣٦م).

دەرگەهێ گۆمبەتێ دکەڤیتە رەخێ باکووری، بەرامبەر سەرایا دەستەلاتێ (قشلە) بلندیا دەرگەهی (٢م)، فرەهیا دەرگەهی (٩٠سم) ئەڤ چەندە ژی سەخلەتەکێ تایبەتە د ئەڤێ گۆمبەتێ دا. ناڤەراستا هەر رەخەکێ گۆمبەتێ پەنجەرەك هەیە، دووراتیێن وێ (٨٠سم×١.٢٠م) سەرێ هەر پەنجەرکێ نیڤ کڤانە، پشتی بلندیا سێ مەترا ژ ئەردی پەنجەر هاتینەدانان. هەر کوژیەکی ژ ناڤدا نەخشەکێ شەش چەق هەیە، خالا بەراهیێ ژ سەری دەست پێ دکەتن، بلندیا وان نەخشا وەکی بلندیا پەنجەرکایە (١.٢٠م)، ئەندازیاری پتر ڤیایە هەڤسەنگیێ بدەتە نەخش و پەنجەرا.

ئەگەر ئەم نێرینەکێ ل سەر نەخشەیێن مقرنص بکەین، دێ بینین وەکی کڤانێ یە، یان یا درێژە، گەلەك رەنگێن وێ هەنە، چەند رۆلەکا دبینیت، وەکی کارێن ئاڤاهی و زێدەباری رەخەکێ جوانیێ، نیڤشکێ ڤان مقرنەصا مەرەمەکا سوریالی یە (غیر واقعی) هەیە، ئەوە پتر وەکی جەڤەنگێ ئاڤاهی هاتییە بکارئینان، مقرنەص دهێنە بکارئینان دناڤ لێڤێن سەری پێن بانی بەرەڤ خوارێ، دەمێ ئاڤاهییەکێ سێ یان شەش یان هەشت کوژێ بەرەڤ کڤان بوونێ ڤە دچیت، تایبەت دهێنە دروست کرن ل کوژێن ئاڤاهییان[٧].

مقرنەصێن گۆمبەتا میر عەلی، ژ کسلێ هاتبوونە دروستکرن بێ تێکەلکرن دگەل تشتەکێ دی، دەرکەفتنا وان ب رەنگەکێ ئەندازیاری جوان بوو، ئەندازیاری بزاڤ کرییە هەڤسەنگیەکێ بێخیتە دناڤبەرا هەر شەش چەقێن نەخشی، ل خوارێ بنێ هەر ئێك ژ ئەڤان چەقا کربوو نیڤ کڤانەك، هەر نەخشەك ژ ئەڤان ل کوژیەکێ گۆمبەتێ هاتبوو دانان، مەرەم ژێ ڤەگوهاستنا گۆمبەتێ یە ژ شەش کوژێ بو کڤانێ[٨]. دشێین بێژین ئەندازیار یێ سەرکەفتی بوو د ئەنجامدانا ڤی کاری دا، شیایە وێنەیەکێ تمام بدەتە وی کەسی یێ سەحدکەتێ، زێدەباری گەهشتنا روناهیێ بۆ ژوورڤە، تێدا گۆمبەت هاتییە لەبخکرن ب کسلێ، نە دووره نڤیسین (ئایەتێن قورئانا پیرۆز یان دوعا) ب بۆیاغێ ل سەر هاتبنەکرن لێ ب بوورینا دەمی ئەو نڤیسین تێکچووبن، ژ بەر دەستوداریێ سەقای یان دەست درێژیا مرۆڤی[٩].

ب دووراتییا (٤م) ژ کوژیێ باکووری گۆمبەتێ، چوار کوژیەکا ب بەر و کسلا هاتییە ئاڤاکرن، درێژیا رەخێ وێ (٧م)، ل ناڤەراستا وێ گۆرەك هەیە و رەخێن وێ ب کسلێ هاتینە هنین، دەرگەهێ وێ ل کوژیێ باکووری رۆژهەلاتی یە، فرەهیا وی (٨٧سم)، تنێ ئەڤ دیوارە هاتییە دانان بۆ دەستنیشانکرنا جهی و دیارکرنا توخیبا. پاشی ل تەنشتا وێ بو رەخێ رۆژئاڤای لاکێشەیەکا دی هەیە -درێژیا وێ (٦.٨٦م) و پانیا وێ (٦.١٠م) گۆرەکێ رەخێن وی خیزەبەر هەیە ل کوژیێ باشووری رۆژئاڤای هاتییە دروستکرن، ئەم دوور نابینین ئەڤ پشکە ژی پشکەك بیت ژ کۆمەلگەها ئاڤاهی یا گۆرستانێ، ژ بەرکو شوینوارێن کەلەکەکێ ل باکووری پەسارا گرێ گۆمبەت ل سەر هاتییە دانان دیارن، ژ هەژی گوتنێ یە دیوارێن ڤان هەردو (ژوورا) ژ بەری و کسلێ هاتینە دروستکرن و پێدڤی نووژەنکرنێ یە.

سەرێ گۆمبەتا میر عەلی ب گۆزکا هاتبوو ئاڤاکرن. ئەو گۆزکێن هاتینە دیتن بنێ وان یێ راستە، تیرێ وان دناڤبەرا (٩-١٣سم) ژ ئاخەکا سۆر هاتییە دروستکرن، پاشی تووشی سۆتنەکا دژوار بووینە، نە دووره ئێك جهـ (کارگەهـ) بۆ چێکرنا ڤان گۆزکا هاتبنە بکارئینان، ژ روویێ تەکنیکی ڤە چ پویتە پێ نە هاتییە کرن، بەلکی دخوارن و چارچۆڤە (دۆلابا گۆزکا) نەهاتییە بکارئینان، بەلکی بدەست هاتینە دروستکرن، ئەو گۆزك تایبەت بۆ گۆمبەتێ هاتینە دروستکرن، بنێ وان گۆزکا دکەڤیتە ژناڤ گۆمبەتێ دا و ب کسلێ هاتینە لەبخکرن، هندەك نەخشەیێن سادە ل سەر دەردکەڤن ئەوژی (موعینن)، ژ ئەگەرا ڤێکەفتنا دو هێلا ئەو موعینە دروست بووینە[١٠].

هژمارا گۆرێن دناڤ گۆمبەتا میر عەلی دا هاتینە ڤەشارتن دەهـ گۆرن، لێ ئەگەر ئەم بنێرینە چاوانیا دانانا وان گۆرا، دێ چوار گۆرێن سەرەکی بینین، زێدەباری ئێکێ دی دبیت یێ کەسەکێ گرنگێ میرگەهێ بیت، ژ بەر دەرگەهی دەست پێدکەن و بەرەڤ باشووریێ گۆمبەتێ دچن ب ڤی رەنگی:-

١- گۆرێ ئێکێ: ژ بەرێ تەباشیری و کسلێ هاتییە

دانان، بلندیا وی ژ ئەردی (٤٠سم) و پانیا گۆڕی (٥٢سم) و -درێژیا وی (٢.٤٠م) چ نەخش ل سەر نینن.

٢- گۆڕێ دووێ: ئێکسەر ب رەخ گۆڕێ ئێکێ ڤە هاتیە ڤەشارتن، ب رەنگەکێ رێك و پێك ژ بەر و کسلا هاتیە دروست کرن، بلندیا وی ژ ئەردی (٧٠سم) و پانیا وی(٥٤سم) و -درێژیا وی (٢.٦٠م) گەلەك نەخش ل سەر هەنە.

٣- گۆڕێ سیێ: ئەڤ گۆڕە ژ هەردوکێن دی بچویکترە، بلندیا وی (٤٠سم) پانیا وی (٥٤سم) و -درێژیا وی (١.٧٧م) ئەڤ گۆڕە پتر هاتیە ڤەکێشان بو رەخێ رۆژهەلاتێ گۆمبەتێ.

٤- گۆڕێ چوارێ: بلندیا وی (٣٩سم) و پانیا وی (٤٩سم) -درێژیا وی (١.٤٥م) ل دووڤ تیڤەرێزا گۆڕێن ئێك و دو هاتیە دانان[11].

دناڤبەرا هەر گۆڕەکی ژ ناڤدا (٤٠سم) دووراتی هەیە، دڤێت ئاڤرییەکێ بدەینە گۆڕێ هژمارە (٥) ژ بەرکو کێلیا وی یا نەخشاندییە، ئێکسەر پشت سەرێ گۆڕێ هژمارە (٣) هاتیە دانـان، ب هندەك خیزەبەرا ژ دەرڤە هاتیە ئاڤاکرن و قەلافەتەکێ مەزنێ ئەردی ڤەگرتیە.

ژ بەرکو ئەڤی دەمی باندۆرا هۆنەرێ سەلجوقی (مەغولی) و مەملوکی ل دەڤەرێ یێ بەلاڤ بوو، ئەڤ گۆڕە ل دووڤ وێ رێکێ هاتینەدانان، ئەم دبینین ئەو گۆڕێ بلند یێ میر عەلی خان بەگی یە، گۆڕێ ب رەخ وی ڤە ل باکوورێ یێ هەڤژینا وی یە، یا دیارە ئەو گۆڕێ مەزن ئێکەم گۆڕە دناڤ گۆمبەتێ دا هاتیە دانان، ژ بەرکو دکەڤیتە ناڤەراستا گۆمبەتێ و بەرامبەر دەرگەهی، هەردو گۆڕێن هژمارە (٣-٤) نە دوورە بچویکێن وان بن پشتی وانا هاتبنە ڤەشارتن دیسان قەلافەتێ گۆڕێن وان گەلەك د بچویکن[12].

## نەخشەیێن گۆڕا:

راستی هەر کەسێ جارا ئێکێ ڤان گۆڕا بینیت دێ مەندەهوش بیت، دشێن بێژین ئێك ژ جوانترین گۆڕایە د دیروکا میرگەها بەهدینان دا هاتیە دانان، یان ب رەنگەکێ دی ئێك ژ جوانترین گۆڕایە ل دەڤەرێ، ژ بەر و کسلا هاتیە ئاڤاکرن، دەمێ هەرفتنا سەرێ گۆمبەتێ هندەك بەرێن وێ ژ جهـ برینە، ل هەر رەخەکێ گۆڕی سێ بەر هاتینە نەخشکرن، رەخێ باشووری سێ گولێن کوور دبەری را هاتینە نەخشاندن، گولا ئێکێ یا شەش بەلگە، ب رەنگەکێ هۆنەری جوان دەرکەفتییە، دەستوداری وێ یێ شوینواری گەلەك باشە، گولا دووێ دوازدە بەلگە، ئەوژی ب رەنگەکێ جوان وباش مایە، گولا سیێ جهێ داخێیە سەرێ وێ شکەستی یە و گولەکا هەشت بەلگە و دناڤ ستێرەکا هەشت کوژی دا هاتیە گوگراندن، هۆستای بزاڤ کرییە هەمی کوژیا وەکی ئێك تلپە (کتلە) دەرێخیتن، و دکاری خۆدا یێ سەرکەفتی بوویە، کووراتییەك دایە هەر گولەکێ، دا بالا هەر مرۆڤەکی ب کێشیت دەمێ قەستا وی گۆڕی دکەتن.

هۆستای پێکولکرییە ل رەخێ باکووری پتر گۆڕی ب خەملینیت، گولا ئێکێ ب رەنگەکێ ئەندازیاری هویر هاتیە دروستکرن، گولەکا هەشت بەلگە دناڤ ستێرەکا هەشت رەخ دا، دناڤ کڤانەکا گرۆڤر دا هاتیە چارچوڤەکرن، پاشی گولەکا دی یا شەش بەلگی هاتیە نەخشاندن، هەر چەندە ئەڤ گولە گەلەك تێکچوویە لێ دهێتە خواندن، ل رەخێ کێلیا رۆژئاڤای بەرەکێ درێژ هاتیە دانان، درێژیا وی (٦٠سم) تێدا پێنج گول دناڤ دو هێلێن تێك ئالیای هاتینە دانان، دناڤ هەر ڤالاتییەکێ دا گولەکا چوار بەلگ نەخشاندینە، وەکی وان نەخشایە ئەڤێ دەرگەهێ هۆلا خویندنێ ل خواندنگەها قوبەهان هاتینە نەخشکرن بەلێ نە دەرکەفتینە[13].

ئەگەر ئەم هەڤبەرکرنەکێ بکەین دێ بینین ستێرا هەشت رەخ ب روهنی ل منارا مزگەفتا ئامێدیێ دەردکەڤیتن، دناڤ ڤێ ستێرێ دا گولەکا هەشت بەلگ نەخشاندینە[14]. دیسان ل خواندنگەها قوبەهان ل ئامێدیێ ئەم نەخشێ ستێرا هەشت رەخ دبینین، ل داویا سەرێ هەر تیشکەکا ستێرێ

نیڤ کڤانەك هەیە، ئەڤ نەخشە هاتینە دانان دناڤ چارچوڤەکێ گرۆڤر دا، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەم ب دوور نابینین ئەندازیاریا میرگەهێ دگەل باندۆرا جزیرێ ل سەر ڤێ گۆمبەتێ هەبیت، هەر چەندە چاڤلێکرن د هندەك تشتادا هەیە، لێ ب رەنگەکێ گشتی سالۆخەتێن ئاڤاهی-نەخش ل گۆمبەتا میر عەلی خان بەگێ دەردکەڤیتن.

کێلیا رۆژهەلاتێ گۆرێ میر عەلی خان بەگێ تێدا ب گەلەك نەخشەیێن جوانێن ئەندازیاری هاتییە خەملاندن، کێلی (٥٠سم) یا بلندە، کێلی یا سێ کوژییە ژ بەری دولومایت لایمستونێ نەرمە، ل رەخەکێ وی سێ نەخش هاتینەکرن، یێ ئێکێ سێ کوژێن بەرامبەر ئێکن، ژ سەرێ کێلیێ تا دگەهیتە بازنەیێ گرۆڤر بەردەوامن، پاشی بەرامبەر وان سێ کوژیا چەند نەخشەکێن ئەندازیاری هەنە، ژ چەندین موعینا پێکدهێن دگەل دەرکەفتنا نەخشەکێ وەکی پیتا (L) یا ئنگلیزی، ل رەخەکی یا دروستە و ل رەخەکێ دی سەرنشیڤن. پاشی ل ژێر وان هەردو نەخشا کڤانەك هەیە، تێدا چەند سێ کوژی هاتینە خەملاندن، ئەڤە ژی ئێك ژ جوانترین پێکهاتەیێن ئەندازیاری یە وەکی نەخشە دەتە بەردەستێ مە[15].

ل رەخێ دی یێ کێلیێ دیسان سێ کوژێن بەروڤاژی هاتینە خەملاندن، پاشی ل بەرامبەر پیتا (L)یا ئنگلیزی دەردکەڤیت، یا دروستە و ل هندەك جها یا سەرنشیڤە، د ئەنجامدا چەندین وێنەیێن ئەندازیاری دروست بووینە تایبەت موعین.

ل گۆرێ هژمارە (٥) کێلیەك هەیە بلندیا وێ (٨٣سم) و پانیا وێ (٢٧سم) ژ بەرێ کالکالیوس یێ رەق هاتییە نەخشکرن، سەرێ وێ هاتییە کڤانکرن، نەخش ل سەر رەخێن وێ هاتینەکرن، بەلێ جهێ داخێیە چ ژێ نەمایە، یا دیار ب تنێ دو گول ل سەر هاتینە نەخشاندن، یا ئێکێ یا سەری گولەکا (٤) بەلگە، دناڤ چارچوڤەکێ بازنەدا هاتییە نەخشکرن، پاشی گولەکا هەشت بەلگ دناڤ ستێرەکا هەشت رەخ دا هاتییە نەخشکرن، ئەو ژی دناڤ چارچوڤەکێ کڤانکریدا. ئەڤ نەخشە ل سەر هندەك گۆرێن گۆرستانا میرا ل ئامێدیێ دەردکەڤن، بەلێ نەخشەیێن گۆمبەتا میر عەلی خان بەگێ گەلەك هویرترن ژ نەخشەیێن ئامێدیێ، ئەگەرێن ڤێ چەندێ ژی نها ئەم نزانین بەلکی د پاشەرۆژێ دا دیار بیت. ب رەنگەکێ گشتی ئەو نەخشەیێن هاتینە دروستکرن دو مەرەما ب خوڤە دبینن، یا ئێکێ ئەوە بۆ مەرەمێن جوانکاریێ هاتینە ب کارئینان و بۆ کەسەکێ ژێهاتییە، یا دووێ وەرگرتنە ژ خورستی و حەلالیا وێنەیا د بیروباوەرێن ئاینێ ئیسلامێ دا[16].

## گۆمبەتا بەهنینێ ل دەڤەرا باتیفا کەرستەیێ دەڤەرێ و فۆرمێ ئیسلامی

ئەڤ گۆمبەتە دکەڤیتە گوندێ بەهنینێ، باشوورێ رۆژهەلاتێ ناحیا باتیفا، گوند ب خۆ ب پەسارا چیایەکی ڤە هاتییە دروست کرن. دژواریا خۆرستێ ئەردی باندۆر ل سەر مرۆڤێ ڤی گوندی کرییە دا کو بەری ب هەلبژێریت وەکی کەرستەیێ ئاڤاکرنێ، نەخاسمە بەرێ رەقێ دولومایتی[17].

گەهشتن بۆ سەر ڤێ گۆمبەتێ ب رێکا پیپایە، گۆمبەت ب خۆ ژی کەفتییە بەر هەرفتنێ، ژ بەر نە پویتەپێکرنێ، نەخاسمە کەفتییە بەر گەفێن سەقایی، ژ بەرەکێ رەق و کسلێ هاتییەئاڤاکرن. گۆمبەت ب رەنگەکێ چوار کوژی هاتییە چێکرن، درێژاهیا هەر لایەکێ وێ (٣.٥٠م)، دو دەرگەهێن کڤانی ل رەخێ رۆژئاڤایێ گۆمبەتێ هەنە، بلندیا وان (١.٥٠م) و فرەهیا وان (١.٣٠م)، وەسا دیارە کو ژوورەکا دی ژی ب رەخ ڤە بوو بەلێ کەفتییە بەر هەرفتنێ. پشتی بلنداهیا (٢م) ژ دیوارێ راست، ژ نوی گۆمبەت بەرەف کڤانکرنێ ڤە دچیت، ل ڤێرە هۆستایی بزاڤ کرییە چەندەکێ ژ سەرڤە ژ ئاڤاهی بکوژیت و گۆمبەتێ ل سەر ئاڤابکەت. دەرگەهێ گۆمبەتێ یێ نزمە، (٩٤سم×٥٣سم) ئەڤە ژی ژ بۆ خۆ چەماندنێ یە بۆ هەر کەسێ بچیتە دناڤدا، دەرگەهێ وێ ژ فۆرمێ ئوسمانی یە ئەوژی کڤان دناڤ کڤانێ دا[18].

پشکەك ژ گۆمبەتا بەهنینی



دیرۆکا ئاڤاکرنا ڤێ گۆمبەتێ نەیا دیارە، ژ بەرکو ئاڤاهی هەرفتییە و نە دوورە ئەو گۆڕێن دناڤ دا نڤیسین ل سەر هەبن، دیرۆکا وێ یا دروست دیار کەت، بەلێ ئەم دوور نابینین کو ل داوییا چەرخێ نوزدێ هاتبیتە ئاڤاکرن(١٩).

## گۆمبەتا بامەرنێ یا نەقشبەندی داوییا چەرخێ ئوسمانی فۆرمێ دەڤەرێ

جهێ گۆمبەتێ: گۆمبەت ل هنداف بازارێ بامەرنێ هاتییە دروستکرن، ل ناڤ مەزارێ سیکێ، یا دیارە ل بەراهیێ مەزار هەبوویە پاشی گۆمبەت هاتییە دروستکرن، هەر چەندە چ ڤەکۆلینێن شوینواری-ئەکادمییا ل ئەڤێ گۆڕستانێ نەهاتینە کرن، دا بزانین ئایا ئەڤ مەزارە هەبوویە بەری گۆمبەت لێ بهێنە ئاڤاکرن یان نە؟ ئەگەر ئەم راوەستانەکێ بکەین و بنێرینە جهێ جوگرافیێ بامەرنێ، دێ بینین ژ سالۆخەتێن وێ دەرکەفتنا گەلەك مەزار و گۆڕستانایە، تا توخیبەکی هندەك جارا گۆڕستان ب مالباتا ڤە ژی دگرێدانە، قەلافەتەکێ مەزنێ گۆڕستانا ل بامەرنێ هەیە، وەکی گۆڕستانا سەرێ کەندالی و مناسبێ وەرگێرێ..هتد، زێدەباری دەرکەفتنا مەزار و گۆڕێن بتنێ وەکی (مەلا عومەر)ی ل تاخێ گوندی، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەم ب دوور نابینین

ئەڤ جهە گۆرستان بیت، پاشی (شێخ محەمەد تاهرێ نەقشبەندی) گۆمبەت لێ ئاڤاکریت، پاشی ببیتە جهەکێ پیرۆز و گرێدای تەریقەتا دینی ئەو ژی تەریقەتا نەقشبەندییە ل بامەرنێ. ئەگەر ئەم شرۆڤەکرنەکا جوگرافی بۆ جهێ گۆمبەتێ بکەین دێ بینین نێزیکی (٢٠٠م) یا ژ باکوورێ تەکیا نەقشبەندی دوورە، ئەوا ل سالا (١٨٤٦ز)ێ شێخ محەمەد تاهری ئاڤاکری[٢٠]، ئەڤە ژ لایەکی ڤە و کەفتنا وی ل بەرامبەر مالا وی ئەوا دکەڤیتە پشت دوکانێن رۆژئاڤایێ بازاری ژ لایەکێ دی ڤە[٢١]. ئەم ب دوور نابینین شێخێ بژاڤ کربیت هەرسێ جها پێکڤە گرێدەت ژ بەر کۆمەکا ئەگەرا ژ ئەوان:

١- هەلبژارتنا جهەکێ بلند ل هنداف تەکیایێ، نە دوورە ژ هزرا وێ چەندێ هاتبیت هەر کەسەکێ قەستا تەکیایێ بکەتن، گۆمبەتا وی ببینت، هەر چ نەبیتن ل دۆر دینێ ئیسلامێ (فاتحەکێ) ب دەتە سەر، یان ببیتە جهێ گرنگیا وی.

٢- هەلبژارتنا ئەڤی جهی دبیت سێ کوژیەکێ دناڤبەرا گۆڕێ خۆ و تەکیا و مالا خۆ دروست بکەتن، ژ بەر نێزیکبوونا هەرسێ جها، نە دوورە ئەڤی لایێ سۆزێ (عاتفی) باندۆر کربیتە سەر هەلبژارتنا جهی.

٣- شێخی بژاڤ یا کری تایبەتمەندییەکێ بدەتە جهێ ڤەشارتنا خۆ، وەکی کەسەکێ تایبەت و جودا (ئەڤجا وەکی هێز یان دین یان مالبات...) نەدوورە ئەڤە پالدەرەك بیت بۆ ڤەشارتنا وی ل ئەڤی جهێ بلند وهنداڤی دەڤەرێ.

کەنگی ئەڤ گۆمبەتە هاتییە ئاڤاکرن: هەر چەندە چ ژێدەرێن نڤیسی ب دەست مە نەکەفتینە دا بزانین ئایا دیرۆکا ئاڤاکرنا ڤێ گۆمبەتێ بۆ چ سالەکێ ڤەدگەریت، لێ ئەگەر ئەم خواندنەکێ بۆ دیرۆکا (شێخ محەمەد تاهرێ نەقشبەندی) بکەین، دبیت ئەگەر چ نەبیت ئەم نێزیکی دیرۆکا ئاڤاکرنا ڤێ گۆمبەتێ ببین، لێ ئەم دوور نابینین ئەڤ گۆمبەتە بەری مرنا شێخ محەمەدی هاتییە دروستکرن، ئەڤەژی ب رێکا هەبوونا گۆڕێ برایێ وی (مەلا حەیدەرێ کورێ شێخ تاهری)، ل سەر کێلیا گۆڕێ وی دناڤ گۆمبەتا دووێ دا نڤیسییە (ل سالا ١٣٠٧مشەختی چوویە بەر دلوڤانییا خودێ)، ئەگەر ئەم بنێرینە ڤێ دیرۆکێ دێ بینین دکەڤیتە بەرامبەر سالا (١٨٩٠ێ زایینی)، هەر ئەڤ دیرۆکەیە یا شێخ محەمەد تاهر چوویە بەر دلوڤانییا خودێ، ل دووڤ ژێدەرێن دیرۆکی ل سالا (١٣٠٧م-١٨٩٠ز)ێ وەغەرکرییە[٢٢]. ژ بەر ڤێ چەندێ هەردو برا د ئێك سالدا وەغەرکرییە، ئەڤە خالەکا گرنگە بۆ تێگەهشتنا ئاڤاکرنا ڤێ گۆمبەتێ.

ئەگەر ئەم بنێرینێ دێ بینین (شێخ محەمەد تاهر) ل گۆمبەتا بەراهیێ یان باشووری هاتییە ڤەشارتن، مەلا حەیدەرێ برایێ وی ل گۆمبەتا پشتێ یان باکووری هاتییە ڤەشارتن، ئەم ب دوور نابینین پلان بۆ ڤی جهی هاتبیتە دانان بەری ئەڤ هەردو کەسە ب مرن، ژ بەرکو هەردو مرۆڤ ل جهێن تایبەت هاتینە ڤەشارتن، سەرکێشێ تەریقەتێ شێخ محەمەد ل گۆمبەتا ئێکێ و برایێ وی مەلا حەیدەر ل گۆمبەتا دووێ، ئەڤ چەندە مە دبەتە سەر راستییەکا دی ئەوژی هەر ئێك ژ ئەڤان کەسا نەمرییە و ل جهەکی هاتییە ڤەشارتن و پاشی گۆمبەت ل سەر هاتییە ئاڤاکرن، بەلکی یا دروست تر ئەوە گۆمبەت یا هاتییە ئاڤاکرن پاشی ئەو مرۆڤ یێن دناڤدا هاتینە ڤەشارتن[٢٣].

## ئاڤاهیێ گۆمبەتێ و بالەتەبوونا وی:

ئەگەر ئەم بنێرینە ڤی ئاڤاهی ژ لایێ ئاڤاهیڤە دێ بینین گەلەك جەڤەنگ و نەپەنیێن ئاڤاهیێن ئیسلامی تێدانە، ئەگەر ئەم گۆمبەتا ئێکێ وەربگرین، دێ بیتە دو پشك هەر چەندە ئێك دەرگەهـ هەیە، ئەندازیاری بزاڤکرییە بانەکێ سادە بۆ دروست کەتن، پاشی ل ژوورا دی گۆمبەتا سەرەکی هاتییە دروست کرن، درێژییا ڤێ پشکێ ب رەنگەکێ گشتی (٩م) و پانییا وێ (٦،٤٠م)، ئاڤاهی ژ بەر و کسلا هاتییە دروستکرن، ستووراتییا دیوارێن ئاڤاهی (٩٠سم)، دەرگەهێ ئاڤاهی بلندییا وی (١،٣٠م)، پاشی بۆ

رەخێ رۆژئاڤای ژ ئەڤی دەرگەهی، دەرگەهەکێ دی هەیە دچیتە سەر گۆمبەتا سەرەکی، دەرگەهێ ژوورا سەرەکی ب رەنگەکێ ئاڤاهی گەلەك جوان هاتییە دروستکرن، ئەوژی بکارئینانا دو کڤانا تێك دا یان کڤانەك دناڤ کڤانەکا دی دا، ئەڤە ژی سەخلەتەکا ئاڤاهییە ئەم ل خانیێ (کتانی) ل باژێرکێ ئامێدیێ دبینین[٢٤]. دیسان گۆمبەتێ چوار پەنجەرك هەنە دو ل رەخێ باشووری و دو ل رەخێ رۆژئاڤای، بلندیا ڤان پەنجەرکا (٦٨سم) و پانیا وان (٢٦سم)، فرەهیا وان پەنجەرکا ژ دەرڤە و ژناڤدا وەکی ئێکە، ئەڤەژی بۆ گەهاندنا روناهییەکا کێمە بۆ ناڤ گۆمبەتێ، ژناڤدا ئەم دبینین کڤانەك بلندیا (١،٥٠م) دەست پێدکەتن و ل دۆر هەمی رەخێن گۆمبەتێ دزڤریتن، ب رەنگەکێ گرۆڤر ل سەر شەنگستێن گۆمبەتێ هاتییە دانان، ل هەر کوژییەکی خوارکرنەکا جوان هەیە، ئەڤەژی ژ سەخلەتێن ئاڤاهیا کەڤنە، زانا دبێژنێ (چوونەناڤ و دەرکەفتن- طلعات و دخلات[٢٥]، دیسان ل کوژێن باکوورێ ژوورا گۆمبەتا سەرەکی ڤالاتییەکا وەك تەقچکەکێ لاکێشەی هەیە، نە دووره بۆ دانانا قورئانا پیرۆز یان هەر بیروت (تعاوید) و پێرابوونەکا دینی[٢٦].

ئەگەر ئەم ب هویری بەرێ خۆبدەینە ڤی ئاڤاهی دێ بینین چەند سەخلەتەك تێدا هەنە، وەکی دەرکەفتنا سەختەیا ئاڤاهی، ژ بەرکو مرۆڤ ئێکسەر دەمێ ژ دەرگەهێ ئێکێ دبۆریت ناگەهیتە سەر جهێ مەرەمێ یان یێ پێدڤی، مەرەم ژێ جهێ ڤەشارتنا سەرکێشێن تەریقەتا دینی، بەلکو دڤێن مرۆڤ ئێشکەکێ بۆ رەخێ رۆژئاڤای ل خۆ بدەتن، دا بگەهیتە سەر جهێ مەرەمێ، ئەڤێ سەخلەتێ ئەم د گۆمبەتا (شێخ عەلی)دا ل زاخۆ دبینن، دیسان کێم گەهشتنا روناهیێ بۆ ژوورڤە مەرەم ژێ پاراستنا شکو و تایبەتمەندیا کەسێ مری یە، یان دڤێن ئەو کەرامەتا بەری وی دەمی هەی نەهێنە شکاندن، دیسان بزاڤ هاتییەکرن پتر ئەڤ گۆمبەتە بهێنە تێژکرن، دیسان پەنجەرەکا (کولینکەکا- کونەکا) بچویك ل سەری هێلایە دبیت گرێدای بوارەکێ گیانی بیت، ئەگەر ئەم بنێرینە ئەو چکولکێ بلند ل سەرێ گۆمبەتێ دێ بینین یێ شەش تایە، ئەڤەژی سەخلەتەکا ئاڤاهییە و گۆمبەتا (میر عەلی خان بەگێ) ل زاخۆ ل سەر ڤی بنەکۆکی هاتییەدانان، ئەڤ گۆمبەتە ب بەرێن رێك و پێك هاتییە ئاڤاکرن، نە دووره هۆستایێن وێ فەلە و جوهی بن، ژ بەرکو شوین تبلێن وان ل ئەڤی ئاڤاهی دیارن.

گۆمبەتا پاشیێ یان باکووری: ئەڤ گۆمبەتە یا نیساندی یە ب گۆمبەتا سەرەکی ڤە، درێژیا وێ (٦،٤٦م) و پانیا وێ (٧م)، دەرگەهێ وێ دکەڤیتە کوژێ باکوورێ رۆژهەلاتی، بلندیا دەرگەهی (١م) و پانیا وی (٦٠سم)، دیارە جهێ هندەك پەنجەرك لێ هەبە بەلێ هاتینە گرتن، ئەندازیاری دەرگەهێ گۆمبەتێ گەلەك نزم دروستکرییە، مەرەم ژێ خو چەماندنە دەما کەسەك دهێنە دناڤ گۆمبەتێ دا (ئەڤەژی سەخلەتەکێ کەڤنە ژ ئاڤاهیا و دهێنە دیتن د ئاڤاهیێن گۆڕستانا میرا ل ئامێدیێ دیسان دەرگەهێن دێرا ژ کەڤن ب ڤی رەنگی دهاتنە دروستکرن)[٢٧]. ئەڤ گۆمبەتا ژ گۆمبەتا ئێکێ دهێنە جوداکرن ژ بەرکو ل نزماتییەکێ کڤانکرنا ڤێ گۆمبەتێ دەست پێدکەت، یان ئەم دشێن بێژین ژ رەنگێ گۆمبەتێن تیژە ژ ناڤدا، بەلێ گۆمبەتێ ئێکێ کڤانکرنا وێ ل سەر تیڤەرێژەکا گرۆڤر کو ل دۆر گۆمبەتێ ژناڤدا دزڤریت، پاشی گۆمبەت ل سەر هاتییە ئاڤاکرن[٢٨].

ئەو کینە دناڤ ئەڤان گۆمبەتا دا هاتینە ڤەشارتن: ئەگەر ئەم بنێرینە گۆمبەتا سەرەکی ئەڤا ژ دو پشکا پێك دهێنن، دێ بینین پشکا ئێکێ یا بەردەرگەهی ئەڤ کەسێن ناڤێن وان ل خوارێ ژ ژێرێ بەرەڤ ژووریێ (باشوور بەرەڤ باکوور) تێدا هاتینە ڤەشارتن:

١- شێخ محەمەد کورێ شێخ بەهائەدینی (١٨٩٦-١٩٣٦ز).

٢- عائشە خاتون هەڤژینا شێخ بەهائەدینی ل سالا ١٣٧٨مش بەرامبەر (١٩٥٩ز) وەغەرکرییە.

٣- شێخ عەلائەدین برایێ مەزنێ شێخ بەهائەدینی

(١٨٤٢-١٩٢١ز).

ژوورا دووێ یان ژوورا سەرەکی هاتییە تەرخانکرن بۆ سەرکێشێن تەریقەتا نەقشبەندی و ب ڤی رەنگی ژ ژێری بەرەف ژووری (باشووری بەرەف باکووری):

١- شێخ مەسعود کورێ شێخ بەهائەدینێ نەقشبەندی (١٩٢٢- ٢٠٠٥ز).

٢-شێخ بەهائەدین کورێ شێخ محەمەد تاهری (١٨٥٦- ١٩٥٢ز).

٣- شێخ محەمەد کورێ شێخ تاهرێ نەقشبەندی (١٨١٢- ١٨٩٠ز)[٢٩].

ژ هەژی گوتنێ یە ئەڤ ژوورە یا تایبەتمەند بیت ب سەرکێشێن تەریقەتێ، نە دوورە ل دەمێ ڤەشارتنا (شێخ محەمەد تاهری) هزرا ڤەشارتنا کەسەك دو کەسێن دی هاتبیتەکرن ئەڤێن سەرکێشییا تەریقەتێ دکەن، ئەگەر نە ئەرێ بۆچی کەسەکێ بەرکەفتی دناڤ مالباتێ دا وەکی (شێخ غیاسەددینێ نەقشبەندی ١٨٩٠-١٩٤٤ز) ئەوێ بەرێ بابێ خۆ (شێخ بەهائەدینی) چوویە بەر دلوڤانییا خۆدێ دناڤ گۆمبەتێ دا نەهاتییە ڤەشارتن، بەلکی ل بەر دەرگەهێ ژدەرڤە یێ گۆمبەتێ هاتییە ڤەشارتن؟، ئەڤ چەندە ژی راستییەکێ دسەلمینیت ئەو ژوورا سەرەکی یا تایبەتمەند بوو بۆ سەرکێشێن تەریقەتێ هەرچەندە کور و باب و باپیر دناڤدا هاتینە ڤەشارتن، لێ ئەگەر هەر کەسەکێ دی تەریقەت وەرگرتبا دا دناڤ گۆمبەتێ دا هێنە ڤەشارتن زێدەباری وێ چەندێ کو چەندین ئەندامێن خێزانێ دناڤ پارچەیێن دی یێن ئاڤاهی دا هاتینە ڤەشارتن.

گۆمبەتا پاشیێ یان باکووری: تێدا چوار گۆڕ دهێنە دیتن ژ باکووری (بەردەرگەهی) بەرەف باشووری و ب ڤی رەنگی:

١-مەلا حەیدەر کورێ شێخ تاهری برایێ شێخ محەمەدی سالا (١٣٠٧مشەختی بەرامبەر ١٨٩٠ زایینی) وەغەرکرییە[٣٠].

٢- شێخ شامیران (١٨٨٢-١٩٥٨ز) خویشکا شێخ بەهائەدینی یە و هەڤژینا زانایێ ناڤدار (مەلا نەجم الدینی ١٣٦٩مش بەرامبەر ١٩٤٩ ز وەغەرکرییە)[٣١]، ل سەر کێلیا وێ نڤیسییە ل سالا (١٣٧٧مش) دکەڤیتە بەرامبەر سالا (١٩٥٨ زایینی) وەغەرکرییە.

٣-غالیە هەردو کێلیێن وێ ب بەری هاتینە دروست کرن و چ نڤیسین ل سەر نینن، ئەو کچا شێخ تاهری یە و خویشکا شێخ محەمەدی یە، ل سالا (١٨١٣ز) ژ دایك بوویە و سالا (١٨٨٦ز) وەغەرکرییە.

٤-ئەسماء خاتوون(١٨٩٦- ١٩٥٨ز) هەڤژینا شێخ بەهائەدینی یە و ل سالا (١٣٧٧مش) وەغەرکرییە[٣٢].

## گرنگیا ئەڤی ئاڤاهی:

ئەڤ ئاڤاهییە دچیتە دناڤ لیستا جهێن کلتووری و دیرۆکی- دینی، کۆمەکا سەخلەتا لێ هەنە، ژ رەخێ ئاڤاهیڤە میناکەکا سەربەخۆیا ئاڤاهی یە و کۆمەکا سەخلەتێن ئاڤاهی تێدانە، دبنە پیڤەرەك بۆ هەلسەنگاندن و تێگەهشتنا پێشکەفتن و وەرارکرنا ئاڤاهییان ل بامەرنێ، تایبەت ل چەرخەکێ دیرۆکی ئەوژی سەردەمێ ئوسمانی یە و ئاڤاهیێن ڤی هەیامی سالۆخەتێن خۆ هەنە، زێدەباری ڤێ ژی ڤی ئاڤاهی تاما ئاڤاهیێ دینی تێدایە. ژ روویێ دیرۆکی ڤە ژیێ ئەڤی ئاڤاهی پتر ژ(١٢٢ سالایە) و ئەو کەسایەتێن تێدا هاتینە ڤەشارتن گرێدای چەندین رویدانێن دیرۆکیێن گرنگن، زێدەباری گرێدانا وێ ب دیرۆکا تەریقەتەکا دینی ڤە ئەوژی تەریقەتا نەقشبەندی یە بە نێزیکی (١٧٠) سالا یە ل بامەرنێ و بتنێ ژ کلتوورێ وان یێ ئاڤاهییا ئەڤ گۆمبەتە ب ساخی مایە. ژ روویێ دینی و کۆمەلایەتی ڤە بێ دو دلی ڤی جهی وەکی هەر جهەکێ دی یێ دینی ل کوردستانێ تایبەتمەندیا خۆهەیە ژ روویێ دەروونی و روحی و دینی، دبیت ئەو کەسێن د ئەڤی ئاڤاهی دا هاتینە ڤەشارتن گرێدانەکا ب ڤی رەنگی دگەل خەلکی هەبیت، ئەڤەژی بهایەکێ دینی و

كۆمەلایەتی ددەتە ئەڤی جهی، زێدەباری بەردەوام بوونا كاری د ئەڤی ئاڤاهی دا و تێدا بەردەوام مری هاتینە ڤەشارتن ئەڤەژی لایەنەكێ بەردەوامیێ یە و سەخلەتەكا كلتووری یە.

## گۆمبەتا زهێ[٣٣] ل گۆرستانا زاخۆ هویرییا ئاڤاكرنێ و فۆرمێ سادە

ب دووراتییا (٢،٢٠م) ژ كوژیێ باكوورێ رۆژئاڤایێ ژوورا دووێ ژ گۆمبەتا میر عەلی، گۆمبەتەك هەیە دبێژنێ (گۆمبەتا زهێ)، دیار دبیت ئەو ئێكەم قۆناغا ڤەگوهاستنا گۆرستانێ یە ژ گۆرستانا (شێخ عەلی جیران) بو ڤێ گۆرستانێ[٣٤]. بلندییا ڤێ گۆمبەتێ یا دیار نینە، هەر چەندە ل بەراهیێ بزاڤ هاتییەكرن پەسارا ئەردی بهێنە چارەكرن ئەو ژی ب رێكا بەرێن ئاڤی و كسلێ. هەر رەخەكێ گۆمبەتێ ژ دەرڤە (٤،٧٦م) فرەهییا دیوارێن وێ (٨٧سم)، دەرگەهێ گۆمبەتێ دكەڤیتە كوژیێ باكوورێ رۆژهەلاتی، فرەهییا وی (٨٠سم) روویێ ژ دەرڤەیێ گۆمبەتێ ب بەرێن دولومایتێ تەباشیری یێ تراشتی هاتییە دروست كرن، پاشی دیوار ب بەرێن ئاڤی هاتییە داگرتن ، ژناڤدا ب كسلێ هاتییە لەبخكرن، رەنگێ ئاڤاكرنا ڤێ گۆمبەتێ وەكی رەنگێ ئاڤاكرنا قشلا زاخۆیە، وەكی تراشتن و گۆگراندن و نكراندنا بەری، دیسان پیڤانا بەرا ژی دگەل بەرێن قشلێ دگونجن، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەم ب دوور نابینین دهەمان دەمێ قشلێ دا هاتبیتە دروستكرن، وەكی دیار (میر عەلی خانی) قشلا زاخۆ یان جهێ دەستەلاتدارێ ب رەنگەكێ جوان ئاڤاكرییە. ئەم دوور نابینین ئەڤ گۆمبەتە ژ روویێ ئاڤاكرنێ یا هەڤدەم بیت دگەل نوژەنكرنا قشلا زاخۆ ژ رەخێ میر عەلی خان بەگێ د ناڤبەرا سالێن (١٧٩٠-١٧٩٧ز)[٣٥].

دو گۆر د ناڤ ئەڤێ گۆمبەتێ دا هاتینە دانان، گۆرێ سەرەكی ئەوە یێ ل رەخێ باشووری هاتییەدانان، ب بەرێن تراشتی و گۆگراندی هاتییەدانان دگەل كسلێ، بلندییا وی (٧٠سم) و درێژییا وی (٢،٤٠م) و فرەهییا وی (٥٩سم)، ئەم دوور نابینین نەخش ل سەر ئەڤی گۆری هاتبنەكرن، بەلێ جهێ داخێیە ئەو نەماینە ژ بەركو ب بەرێ تەباشیری (دولومایت لایمستونێ چوكی) هاتییە ئاڤاكرن، ئەڤ بەرە ژی باندۆرا سەقای و شهێ زوو ل سەر دبیت، پاشی بۆ رەخێ باكوورێ ڤی گۆری گۆرەكێ دی هەیە و رەخێن وی ب كسلێ هاتینە هنین[٣٦].

## گۆمبەتا سولتان حسێنێ وەلی (١٥٣٤-١٥٧٠ز) ل ئامێدیێ

ل سەر شەنگستەكێ هەشت كوژی هاتییە چێكرن، درێژاهییا هەر رەخەكێ وێ (٢،٦٠- ٢،٦٤م)، بلنداهییا وێ (٤،٤٠م). هاتییە ئاڤاكرن ژ بەرێ تراشتی بەلێ تلپێن وان ژێك جودانە، ژ دەرڤە ل سەر هەر رەخەكی رێزەكا بەرا هاتییە دانان، ل هەر كوژیەكی خواربوونەكا بچویك هاتییەچێكرن، مەرەم ژ ئەڤێ خواربوونێ و چێكرنا هەشت رەخا بۆ خۆ راگرتنا ڤی ئاڤاهییە، نەخاسمە ژ باندۆرا سەقایی، ئەم دبینین نێزیكی (٢٠سم) بەر ژ سەر بانێ وێ دەركەفتیە، وەكی بانەكێ بچویك دیار دبیت، شیایە دیوار و پەنجەرا ب پارێزیت[٣٧]. گۆمبەت ژ ناڤدا یا گرۆڤرە یان پتر ب رەنگێ هێكێ دچیت، بەلێ ژ سەرڤە هەر هەشت رەخێن وێ ل سەری دگەهنە ئێك، فۆرمەكێ ئاڤاهی یێ تایبەتە[٣٨].

ل هەر سێ رەخێن (رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی و باشووری)، پەنجەركەكا بچویكا لاكێشەی هاتییە چێكرن، دووراتیێن هەر ئێك ژ وان (١م×٧٤سم)، ئەم دبینین كو كونێن بچویك ل هەر چوار رەخێن ڤان پەنجەركا هەنە، نە دوورە بۆ مەرەما راگرتنا ئاسنا بیت كو كەس نەشێن بچیتە دناڤ ژوورا گۆرا دا. دەرگەهێ وێ دكەڤیتە پشكا باكووری، پانییا وێ (٧٤سم) و بلندییا وی (١،٢٠م)، د سەردا كڤانەك هەیە كو ژ سێ پشكێن بەری پێكدهێن. ل ڤێرە تیڤەرێزەكا نڤیسینێ هەیە و درێژییا وێ (٢،٦٠م) و پانییا وێ (٣٥سم)، ژ ئێك رێزا نڤیسینێ پێكدهێن، ژ رەنگێ نڤیسینا سێ كوژی یا مستەعصمی[٣٩]. نڤیسین ژی ئەڤەیە (قال الله سبحانه وتعالى كل

شئ هالك إلا وجهه توفى السلطان الأعظم الاعدل سلطان حسين بيك في شهر رجب سنة (٩٨١)[٤٠].

دیسان نەخشەك ل دێمێ كڤانێ دەرگەهی هەیە، پانییا وێ (٣٤سم)، پێكدهێن ژ قورم و بەلگێن دارا ئەڤا دبێژنێ (ئەرابیسك). دیسان هەردو رەخێن دەرگەهێ ب نەخشەیێن ئەرابیسك د خەملاندینە. دەرگەهـ ژ داری هاتبوو چێكرن، ژ شەش پارچا پێكدهات، هاتبوو لێكدان ب هاریكارییا سێ رێزێن بزمارێن مەزن، هەر رێزەكێ شەش بزمار هاتبوونە لێدان، ئەم دبینین كو دەركەفتنەك ل ئێك ژ ڤان پارچا هەیە بۆ مەرەما ئاسێكرنێ بوو[٤١].

بانێ گۆمبەتێ ژ ناڤدا ب بەرا هاتییە چێكرن، نەخاسمە بەرێن تراشتی كو ب رەنگەكێ باش هاتینە دانان. بەلێ ئەردێ وێ ژی ژ ناڤدا ببەرا هاتبوو چێكرن وەكی هەمی ئاڤاهیێن ئیسلامی بوو ل سەر وی دەمی[٤٢]. بەلێ نۆكە چ ژ ئەردێ وێ نەمایە بەلكی یا بوویە ئاخەكا سادە.

ئەو پەنجەركێن لێ هاتینە ڤەكرن، وەكی بەری نۆكە مە ئاڤری داینێ بۆ مەرەما گەهاندنا روناهیێ نە بۆ ژوورڤە، داكو ئەو كەسێ دچیتە ژ ناڤدا بێ رێگری هاتن و چوونێ بكەت. ل ڤێرە ئەندازیاری بزاڤا كری هندەك نەخشا ل سەر هەر هەشت كوژێێن وێ بكەت، داكـو جوانییەكێ ب دەتـێ زێدەباری دوورێخستنا وێ ژ هشكاتی و بێ گیولییا دەروونی.

ئەم ل هەردو كوژێێن رەخێ باشووری بەرامبەری دەرگەهی چەند نەخشەكا دبینین، نەخاسمە نەخشەیێن ئەندازیاری، ژ دو پشكێن وەكی ئێك پێكدهێن، نەخاسمە دیزایینی وان، ئێك دكەڤیتە دەستێ راستێ ژ كوژێ راستێ وەكی كڤانەكا تیژ دیار دبیت، ب رێكا نكراندنا ل سەر بەری هاتینە نەخشكرن، ژ ناڤدا چوار سێ كوژی دروست بووینە، بەلێ قەلافەتێ وان ژێك جودایە، سێ ل خوارێ نە و یا دی ل سەری یە. پاشی هندەك موعین ژ ناڤدا دخەملینن، زێدەباری هێلێن درێژ كو چەند شكلەكێن ئەندازیاری دەنە مە[٤٣].

ل سەر بلنداهییا (١،٩٠م) ژ ئەردی، (١٦) كڤان هاتینەكۆلان، كۆلانا وان یا كێمە ژ بەری را، نێزیكی كوژییا هاتینەنكراندن و هەر رەخەكێ گۆمبەتێ دو كڤان ڤبەر دكەڤن، دووراتیێن وان (٤٢×٢٤سم). دیارە ل دەمێ بجهئینانا ڤان كڤانا بۆ جارا ئێكێ هاتینەرەسمكرن، پاشی هاتینە نكراندن ژ بەركو كووراتییەكا كێم دایە ڤان كڤانا.

رەنگێن ئاڤی پشكا خۆ ژ نەخشەیێن ڤی شوینوارێ جوان دا هەبوویە، ئەم تیڤەرێزەكا نەخشا دبینین كو پانییا وان (١١سم) پشتی بلندیا (٣،٤٠م) ل سەر ئەردێ گۆمبەتێ، وەكی رەنگێ سێڤێ یە و هەمی هاتینە نەخشكرن ب رەنگێ رەش[٤٤].

ژ هەژی گوتنێ یە كو كۆمەكا گۆڕا دناڤ ڤێ گۆمبەتێ دا هەنە، یێ ژ هەمیا ناڤدارتر (سولتان حسێن وەلی ١٥٣٤- ١٥٧٠ز)[٤٥]. زێدەباری تابووتا سولتان حسێن وەلی كو ژ دارێ تویێ و مێوێ هاتییە چێكرن، هەتا ئەڤرۆ یا هەڤركیێ دگەل دەمی دكەت و ب باشی مایە[٤٦].

## گۆمبەتا رەوشەن[٤٧] خاتوونێ ل ئامێدیێ

دكەڤیتە رەخێ رۆژئاڤایێ گۆمبەتا سولتان حسێنێ وەلـی، بتنێ (٦م) یا ژێ دوورە، هەردو گۆمبەت ژ لایێ نەخش و ئاڤاهی ڤە وەكی ئێكن، ئەڤ گۆمبەتە ل سەر شەنگستەكێ(٨) رەخی راوستایە، بەلێ رەخێن وێ ژ دەرڤە نە هندی ئێكن، دناڤبەرا (٢،٦٠م - ٢،٧٣م)، بلنداهییا وێ ل سەر ئەردی (٢،٦٠م)، پانییا دیوارا (١،٤٠م)[٤٨].

گۆمبەت دگەل ژوورا گۆڕا ب بەرێن تراشتی هاتییە ئاڤاكرن، بەلێ قەلافەتێن وان ژێك جودانە، ب كارئینانا گێچێ وەكی ماددەكێ نیسەك.دیار دبیت كو گۆمبەت ئێكسەر ل سەر لێڤێن رەخێن وێ نارابیت، درێژاهییا دناڤبەرا لێڤێن گۆمبەتێ و دیوارا (٧٠سم)،بان ئەڤ دووراتییە دبیتە حەفكا گۆمبەتێ[٤٩].

نۆكە دێمێ گۆمبەتێ یێ ژدەرڤە ب چ كەرستێن ئاڤاكرنێ نەهاتییە ڤەشارتن، داكو بهێنە پاراستن ژ سەقای. ل هندەك رەخێن وێ كولینك هەنە،

قەلافەتێن وان (٩٠×٧٠سم) نەخاسمە ل رەخێ رۆژئاڤای و باشووری، زێدەباری دەركەفتنا كونێن بچویك ل رەخێن وان كولینكا، دبیت بۆ مەرەما راگرتنا پەنجەرا بیت داكو كەس نەچیتە دناڤدا ژبلی ب رێكا دەرگەهی نەبیت. دەرگەهێ وێ دكەڤیتە رەخێ باكووری، قەلافەتێن وی (١،٢٠م×٧٠سم)، كڤانەكا نیڤ گرۆڤر ل سەر هەیە، پانیا وێ (٢٠سم) و ژ دیواری نەدەركەڤتیە[٥٠].

روبەرێ ژوورێ (٤،٦٥×٤،٥٥م)، ل ڤێرە ئەندازیار شیایە رێكەكا باش بكاربینیت بۆ دیتنا گومبەتێ، ئەو ژی سێ كوژی، ل سەر هەمی رەخێن گومبەتێ ژ ناڤدا ب كارئینایە، ئەو ژی سێ كوژێن سەرنشیڤن ل هەر كوژیەكی، ئەڤێ چەندێ گومبەتەكا گرۆڤر دایەمە، پیچەك ئەو سێ كوژیە هاتینە بلندكرن و نۆكە هێدی هێدی ژ بەر دەستوداری سەقای یێ خراب دبن. ژ بەر ڤێككەفتنا هەردو سێ كوژیا ل سەرێ و خوارێ هەشت كڤانێن نیڤ گرۆڤر دروستكرینە، هەر رەخەكی كڤانەك بەركەفتیە. ل هەردو رەخێن كڤانا نەخشەیێن ئەندازیاری و خۆرستی هاتینەچێكرن، زێدەباری ئایەتێن قورئانا پیرۆز، ل رەخێ راستێ یێ سێ كوژیا نەخشێ هێلێن ڤێككەفتی هەیە، ل دەوروبەرێن وێ سێ كوژی و نەخشەیێن خۆرستی چێبووینە.

## ڤەرێژ

دەڤەرا بەهدینان هەر ژ كەڤن بالا مرۆڤی بۆ خۆ كێشایە، گۆڕستانێن وێ ئێك ل سەر یا دی هاتیە ئاڤاكرن، بوویە دیرۆكەكا تایبەت دگەل كەلتوورەكێ تایبەت كو دەڤەرێ بخۆ دایە ڤی مرۆڤی. هەر چاوابیت ئەم دشێین ڤەرێژا ڤێ ڤەكۆلینێ د چەند خالادا رێزكەین:

١- مری و گۆڕستان هەر ژ كەڤن ل دەڤ خەلكێ دەڤەرێ د پیرۆزبوون، نەخاسمە كو لایێ عاتفی گەلەك باندۆر سەر ڤی لایێ جڤاكی كریە.

٢- ڤەشارتنا مریان دناڤ گومبەتا دا بیروباوەرەكا كەڤنە، خەلكێ دەڤەرێ كەڤن ئەڤ كەلتوورە وەرگرتیە و ڤەگوهاستیە ناڤ گۆڕستانێن خۆ، دێ شێین بێژین كو مرۆڤێ بەهدینیێ كەڤن وەكی خۆ گومبەت چێكرینە، هەر چەندە هندەك هزر ژ ڤێرێ و وێراهەنێ ئینانە و ل داویێ تاما خۆ یا دەڤەرێ وەرگرتیە.

٣- پتریا ڤان گومبەتا گرێدایی حاكمێن سیاسی و كەنكەنێن دینی و كەسایەتیێن بەرنیاسن، ژ بەرڤێ چەندێ هەر كەس و ل دووڤ شیانێن وی یێن سیاسی، جڤاكی، ئابووری، گومبەت بۆ هاتیەئاڤاكرن.

٤- دشێین بێژین كو دەڤەرا بەهدینان ئێكە ژ دەڤەرێن زەنگین د راستا گومبەتێن دیرۆكی دا، مە پێ باشە ئەو گومبەتە بێنە نوژەنكرن و ببنە جهێن پیرۆز و گەشتیاری.

# ژێدەر:


١. ابن المنظور: لسان العرب، جزء ١٥، ص ١٦٨.

٢. ئاری خليل مماني: الاقبيه في عماره بلاد الرافدين القديمة، مجلة سوبارتو- القسم العربي، العدد ٣، اربيل، ٢٠٠٩، ص ١٥٦.

٣. كوڤان ئيحسان ياسين: خواندنەك بۆ گومبەتا نەقشبەندى ل بامەرنێ ڤەكولينەك ديرۆكى ومەيدانى و شرۆڤەكرنێ، گوڤارا سيلاڤ، هژمارە ٨٨، (ئامێدێ_تەباخا ٢٠١٣)، بپ ١٨.

٤. ئارى خليل، الاقبيبه، ص ١٥٦.

٥. سعيد حاج صديق زاخويي: زاخو الماضي و الحاضر، مطبعة خاني، ط١، (دهوك_٢٠٠٩)، ص ٢٤. ديسان بنێرە: د.عماد عبدالسلام رؤوف: المعجم التاريخي لاماره بهدينان، مطبعة حاج هاشم، مطبوعات الاكادمية الكوردية، (اربيل_٢٠١١)، ص ٢٨٠.

٦. كوڤان ئيحسان و يێت دى، گومبەت، بپ ٣٨.

٧. هەمان ژێدەر، بپ ٤١.

٨. بۆ پتر پێزانينان ل سەر رەنگێن ئاڤاهيێن ڤى هەيامى،بنێرە: د.زكى محمد حسن: فنون الاسلام، دار رائد العربى، (بيروت_١٩٨١)، ص ١٤٨.و ديسان بنێرە، د.عبدالعزيز حميد: فنون الزخرفيه العربيه الاسلاميه، (بغداد_١٩٨٢)، ص ١٠٠.

٩. كوڤان ئيحسان و يێن دى، گومبەت، بپ ٤٢.

١٠ . هەمان ژێدەر، بپ ٤٧_٤٨.

١١ . كوڤان ئيحسان و يێت دى: گومبەت، بپ ٥٠_٥١.

١٢. هەمان ژێدەر، بپ ٥٣.

١٣. د.عبدالله خورشيد قادر ئالەى: العمارة الاسلامية في العمادية و نواحيها حتى القرن ١١هجرى/١٨ ميلادى، اطروحة دكتورا مقدمة الى جامعة صلاح الدين_ اربيل، (اربيل_٢٠٠٨)، ص ٧٧.

١٤. د.عبدالله خورشيد قادر: مئذنة جامع العمادية، مجلة سوبارتو _القسم العربي، عدد ٤_٥، (اربيل_٢٠١١)، ص ٢٤١.

١٥. كوڤان ئيحسان و يێت دى: گومبەت، بپ ٥٧_٥٨.

١٦. هەمان ژێدەر، بپ ٥٨_٥٩.

١٧. ڤەكولينەكا مەيدانى ل رۆژا ٢٠١٢/١١/٢٩.

١٨. بۆ پتر پێزانينان ل سەر گومبەتا بەهنينێ بنێرە: كوڤان ئيحسان ياسين و يێت دى: گومبەتا مير عەلى خان بەگى ل زاخو (١٧٩٠_١٧٩٧ز) ڤەكولينەكا مەيدانى شرۆڤەكرن و هەڤبەرى كرنێ، چاپخانا خانێ، (دهوك_٢٠١٣)، بپ ٤٠.

١٩. هەمان ژێدەر، بپ ٤٠.

٢٠ . مستەفا نورى بامەرنى: ئەڤەيە بامەرنێ، چاپخانا زانا، (دهوك_٢٠٠٤)، بپ ٦٩.

٢١. ڤەكولينەكا مەيدانى ل رۆژا ٢٠١٣/١/٨.

٢٢ . مستەفا نورى: ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٩.

٢٣ . كوڤان ئيحسان: خواندنەك بۆ گومبەتا نەقشبەندى، بپ ٢٠.

٢٤ . بۆ پتر پێزانيا ل سەر ئاڤاهيێ كتانى ل ئامێدێ بنێرە نڤيسينا مە: كوڤان ئحسان: خاندنەك بۆ ئاڤاهيێت كلتورى ل دەڤەرا بەهدينان، مالپەرێ ئامێدێ/ http://www.amedye.com/index.php?page=articles&idd=676

٢٥. كوڤان ئيحسان: خواندنەك، بپ ٢٠.

٢٦. ڤەكولينا مەيدانى ل رۆژا ٢٠١٣/١/٨.

٢٧. كوڤان ئيحسان: خواندنەك، بپ ٢٠.

٢٨. ڤەكولينەكا مەيدانى ل رۆژا ٢٠١٣/١/٨.

٢٩. مستەفا نوری: ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٩.
٣٠. ڤەكۆلینا مەیدانی ٢٠١٣/١/٨.
٣١. عبدالرحمن بامەرنی: شاعرێت بامەرنێ، وەشانێت زانكۆیا دهۆكێ، (دهۆك- ٢٠١١)، بپ ١٦.
٣٢. كۆڤان ئیحسان: خواندنەك، بپ ٢١.
٣٣. ل دووڤ گوتنێن هێژا سەگڤان یوسفی كو ئەڤ گۆمبەتە ڤەدگەریت بۆ خوشكا میرێ بەهدینان (قوباد پاشای ل سالا ١٢٠٠مش وەغەكریە).
٣٤. سعید حاج صدیق: زاخو، ص ٢٥.
٣٥. كۆڤان ئیحسان و بێت دی: گۆمبەت، بپ ٤٣.
٣٦. دیارە پتریا گۆرێن ڤێ گۆرستانێ ب بەر و كسلا هاتینە چێكرن، ئەم ب دوور نابینین كو هزرێن هەمیا ژ قوبا میر عەلی ڤە هاتبنە وەرگرتن. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: كۆڤان ئیحسان و بێت دی: گۆمبەت، بپ ٤٣.
٣٧. د. عبدالله خورشید قادر: العمارة الاسلامیة في عمادیة و نواحیها حتی القرن ١٢ ه/١٨م، سبیریز للطبع و النشر، مطبعة الروضة، (اسطنبول- ٢٠١٢)، ص ١٩٩.
٣٨. ل سالا (٢٠١٢)ێ رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆكێ رابوویە ب نۆژەنكرنا ڤێ گۆمبەتێ و پشتی هەلشكافتن ل سەر هاتیە كرن گەهشتینە فۆرمێ وێ یێ دروست.
٣٩. د.عبدالله خورشید: العمارە، ص ٢٠٠. دیارە كو (یاقوت مستعصمی ٦٩٨ه وەغەركریە) ناڤدارترین كەس بوو كو ئەڤ نڤیسینە ب كارئینای.
٤٠. ڤەكۆلینەكا مەیدانی.
٤١. د.عبدالله خورشید: العمارە، ص ٢٠١.
٤٢. هەمان ژێدەر، بپ ٢٠١.
٤٣. هەمان ژێدەر، بپ ٢٠٢.
٤٤. د. عبدالله خورشید: العمارە، ص ٢٠٣.
٤٥. بۆ پتر پێزانینان ل سەر گۆرێن ڤێ گۆمبەتێ بنێرە: د.عماد عبدالسلام رؤوف و د.نرمین علی محمد امین: شواهد المقبرە السلطانیة في العمادیة دراستة تاریخیة _اثریة، مطبوعات الاكادمیة الكوردیة، مطبعة حاج هاشم، (اربیل_٢٠١١)، ص ٣٦.
٤٦. ژ هەژی گوتنێ یە كو (رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆكێ) رابوویە ب چێكرنا صندوقەكێ و ب شویشەی سەرێ وێ هاتیە ڤەكرن داكو كەسێ دڤێت بینین ئێكسەر هندەكێ ژ تابووتێ بینین. ڤەكۆلینەمكا مەیدانی.
٤٧. رەوشەن خان كچا میرێ بەهدینا (ئسماعیل پاشایێ ئێكێ یە) مە چ پێزانین د پەرتووك و دەستنڤیسا دا ل سەر نینن، بتنێ كێلیا گۆرێ وێ یێ دیارە كو ل سالا (١٢٠٢ز) مریە، زێدەباری كو دەیكا وێ نائیلە خاتوون ل دەڤەرا شوشێ هاتیە ڤەشارتن.
٤٨. د.عبدالله خورشید: العمارە، ص ٢٠٥. ئەم ب دوور نابینین كو هزرا ڤێ گۆمبەتێ ژ گۆمبەتا سولتان حسینێ وەلی هاتبیتە وەرگرتن، ژ بەركو ئسماعیل پاشا د ئێك سالدا كەڤتە بەر دو درێت مەزن ئەو ژی مرنا برایێ وی (عەلی خان بەگ) و مرنا كچا وی (رەوشەن خاتوون)، ژ بەر ڤێ چەندێ وی بزاڤكریە بۆ هەردوكا گۆمبەتێن جودا دروست بكەت. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: كۆڤان ئیحسان و بێت دی: گۆمبەت، بپ ٢٧.
٤٩. د.عبدالله خورشید: العمارە، ص ٢٠٥. دیارە ژ ناڤەرۆكا خۆ ڤە ئەڤ گۆمبەتە وەكی گۆمبەتا سولتان حسێن وەلی یە بەلێ رهیایە و ب بۆرینا دەمی بەرێن وێ ل جهێن دی هاتینە بكارئینان، د شكلەكێ سالێن چلادا دیار دبیت كو ئەڤ گۆمبەتە یا باشە و هێشتا بەرێن وی ل سەری دیارن. بەلێ پشتی سالێن چلادا هەرفتیە و هەكە نەخشێ وێ یێ رەسەن یێ هوسا نینە. بنێرە: د.عماد عبدالسلام و د.نرمین علی محمد امین: شواهد المقبرە، ص ٢٢.
٥٠. د.عبدالله خورشید: العمارە، ص ٢٠٥.

# ئیچ قەلا ئامێدیێ
# ڤەکۆلینەکا مەیدانی و شڕۆڤەکرنێ

**کۆڤان ئیحسان یاسین**

ئیچ قەلا ئامێدیێ جهەکێ بەرنیاسە و ئێکە ژ کەلایێن شوینواری[1]، دکەڤیتە رەخێ ژێریێ -کەلا ئامێدیێ، نێزیکی (٨٠٠م) یا ژ ناڤەندا باژێری دویرە، دیارە دیرۆکا وێ ژ دیرۆکا ئامێدیێ و شویرها وێ نویترە، پێزانین ل سەر ڤێ کەلایێ د کێمن، ژ بەرکو یا هەرفتی و چ ژێ نەمایە، هندەك پێزانین وەسا دیاردکەن کو ل سالا (١٢٥٠مش/ ١٨٣٤ز)ێ ژ لایێ میر محەمەدێ رەواندۆزی ئەوێ دگۆتێ (میرێ کۆرە) هاتییە ئاڤاکرن[2].

ناڤێ ڤێ کەلایێ دبنیات دا ناڤەکێ ترکیە، مەرەم پێ (کەلا ناڤخۆ)یە، گەلەك ژ خەلکێ ئامێدیێ دبێژنێ (ئیشقەلا) یان (ئیچقەلا)[3].

ئەڤ کەلایە بۆ مەرەمێن بەرەڤانیێ هاتبوو ئاڤاکرن، میر محەمەدێ رەواندۆزی ل سەر کاڤلێن خواندنگەهەکا دینی ل وی وەختی ئاڤاکربوو، کو زانینێن دینی لێ دهاتنە خواندن. بۆچوونەکا دی یا هەی دبێژیت: ئۆسمانییا پشتی هەرفتنا میرگەها بەهدینان ل سالا (١٢٥٨مش/١٨٤٢ز)ێ وەکی جهەکێ لەشکەری ئاڤاکربوو، ئۆسمانییا کەلا ل وان جهێن ستاندین ئاڤاکرن، دگۆتێ (ئیچ قەلا) ئانکو کەلا ناڤخۆ ژ بەرکو کەلا ل ناڤ باژێرا دهاتنە ئاڤاکرن، ناڤەندێن لەشکەری بوون، ئەو والیێ باژێر ب رێڤەدبر لێ دروینشت، زێدەباری کو جهێ لێدانا دراڤی بوو ۆ لەشکەر تێڤە دما. ئۆسمانییا ئەڤ کەلا ل گەلەك باژێرێن عیراقێ ئاڤاکرن[4]، مینا بەغدا و مووسلێ و ئامێدیێ و چەند جهێن دیتر، مەرەم ژ ئاڤاکرنا وێ ئەو بوو کو والی و دووڤەلانکێن وی ژ گەفێن دەرڤە و فتنێن ناڤخۆ ب پارێزن. دناڤ کەلا ئامێدیێ و ل نێزیکی ئیچ قەلایێ ژ لایێ ژووریڤە مەیدانەکا بەرفرەهـ هەبوو دگۆتنێ (مەیدان)، چالاکیێن لەشکەری و کریارێن مەشقدانێ لێ دهاتنە کرن[5].

## نەخشێ ئیچ قەلایێ

پێزانینێن مە ل سەر نەخشێ ئیچ قەلا ئامێدیێ دێ پتر ژ راپۆرتا ڤەدیتنێ بن، ئەوا ژ لایێ (ئەحمەد حاج مەهدی)ڤە ل سالا (١٩٥٢)ێ هاتییە بەرهەڤکرن، بژلی ڤەدیتنەکا مەیدانی کو دێ بزاڤێ کەین چەند رەخەکێن شوینواری ژێ دەینە دیارکرن. ئاڤاهیێ وێ گەلەکێ بەرفرەهـ بوو، درێژاهییا هەر رەخەکێ وێ (٨٠م) بوون، ژ بەرێ نەداتراشتی و گێچێ هاتبوو

ئاڤاکرن، دەرگەهێ وێ دکەڤتە ناڤەراستا رەخێ ژووری، سەرێ دەرگەهی نیڤ کڤان بوو، دو بورجێن بلند ل رەخێن وی هەبوون، ل هەر کوژیەکێ کەلایێ ژی بورجەکێ مەزن هەبوو. دناڤ هەر بورجەکی دا پەنجەرکێن بچویك هەبوون، بۆ شەڕی دهاتنە بکارئینان، ئەڤ پەنجەرکە یێ ل شویرهێن کەلایێن دی ژی هەین. دیوارێن رەخێ ژێری و رۆژهەلاتی یێن هەرفتین، بژلی کۆمەکا بەرا چ ژێ نەمایە، دیوارێ رەخێ رۆژئاڤایی هێشتا یێ مای، بەلێ ژ دیوارێ رەخێ ژووری نزمترە[١]. پشتی مە ڤەدیتنەکا مەیدانی ل سەر وی دیواری کری، دیاربوو کو هێشتا (٤٨م) ژ درێژیا دیواری یێن ماین، زێدەباری کو بلنداهیا وی (٣م) یێن ماین، ژ بەرەکێ نیڤ تراشتی یێ هاتییە ئاڤاکرن. بورجێ وێ یێ کوژیێ ژێریێ رۆژئاڤایی یێ مایی، بورج یێ گرۆڤرە، تیرێ وێ (٤م) هێشتا یێن ماین، بەلێ ل سەر وی بورجی خانییەکێ هاتییە ئاڤاکرن، زێدەباری بورجێ رەخێ ژێریێ رۆژهەلاتی کو ب روهنی دهێنە دیتن، بەلێ ئاڤاهییەك ل سەر وی ژی هاتییە ئاڤاکرن[٧]. ژ دەرڤە و ل رەخێ راستێ یێ دەرگەهی بەرمایکێن مەزەلەکێ یێن هەین، بەلێ وەختێ مرۆڤ دچیتە دناڤ دا بەرمایکێن شوینوارێن دو ژوورێن لاکێشەیی یێن هەین، دووراتیێن وان (٤×٣م)ن، ل کوژیێ رۆژئاڤایێ کەلایێ بیرەکا کویر یا هەی، کونا وێ یا سەری رەنگێ وێ لاکێشەیە، بیرەکا دی ژی یا هەی دکەڤیتە رەخێ رۆژهەلاتێ وێ بیرا مە ئاماژە پێ کری، (٢٠م) یا ژێ دویرە، ئەو ژی یا هاتییە نکراندن، کونا وێ یا گرۆڤرە، تیرێ وێ (١م)، ئاڤ تێ نینە، بەلێ یا تژی ئاخ و لهمیشت بووی، ئەو پشکا ژێ دیار مای کویراتییا وێ (٢م)[٨].

هەکە ئەم سەحکەینە نەخشێ ڤێ کەلایێ، وەکی نەخشێ گەلەك کەلایێن دی یێن ل کوردستانێ، مینا ئیچ قەلا رەواندوزێ و کەلا بوکد ل کۆیێ و کەلا بانەمانێ ل هەڤلیرێ، وەکی دیار کەلایێن چوار کوژی دناڤ ئاڤاهیێن ئیسلامی دا ب رەنگەکێ بەرفرەهـ یێن هەین. ئەو پشکێن ژ ڤێ کەلایێ ماین، ل سالێن پێنجییان دا بەر ب نەمانێ چوون، ل سالا (١٩٥٦)ێ رێڤەبەرییا قەزایێ ب هەرفاندنا دیوارێ وێ رابوو، پشتی دەستویری ژ جهێن شۆلەژێ وەرگرتی، مەخفەرا پولیسێن گومرکێ یێن قەزا ئامێدیێ ل سەر ئاڤاکرن، زێدەباری کو چەند ئاڤاهیێن حکومی و خانیێن فەرمانبەرا لێ ئاڤاکرن[٩].

د. تارق پاشایێ ئامێدی هۆسا سالوخا ئیچ قەلایێ دکەت: ئیشقەلا ئانکو دەرگەهێ بریمزلا، پشتی میرگەها بەهدینان ل سالا (١٨٤٢ز)ێ هەرفتی، ئۆسمانییا وەکی جهەکێ خۆپاراستنێ ئەڤ کەلایە ئاڤاکر، ئەڤ کەلایە ل سەر شویرهێن کەلایەکا کەڤنتر کو میرێن ئامێدیێ دانابوو، هاتە ئاڤاکرن، نەخاسمە ل سەر وی دەرگەهێ دکەڤیتە بەرامبەری نهالا صبنێ بەهدینان. کەلا دکەڤیتە رەخێ ژێریێ باژێرکێ ئامێدیێ، شکلێ وێ یێ لاکێشەیە، دیوارەکێ ستویر یێ ل دۆرماندۆری وێ، جهێ ڤالاهیێن شەڕی یێن لێ هەین، ل هەر چوار کوژیێن وێ بورجێن لۆلویی یێن هاتینە چێکرن ئانکو دکەڤیتە هنداڤی هەر چوار رەخا. دناڤ شویرهێن کەلایێ دا بیرەکا ئاڤێ یا هەی، برێکا تەمباڤەکێ (نفق) دگەهتە سەر شکەفتا جانکا، کو دکەڤیتە دبن کەلایێ ڤە، ئەڤە ژی تەمباڤەکا نەپەنییە کو ب رێکا وێ دشێن های ژ سەروبەرێ دەرڤەی کەلایێ ببن، نەخاسمە وەختێ گەفەك ل سەر ژیانا وان هەبا، د رێکا وێ تەمباڤێ را خۆ دگەهاندە دەرڤە. هەکە ئەم سەحکەینە وێ شکلێ (باخمانی) ل سالا (١٩١٣)ێ بۆ شوینوارێن (کورا سریچێ)[١٠] ل ئامێدیێ گرتی، دێ بینین کو شویرهێ رۆژئاڤایێ کەلایێ دگەل بورجێ کوژیێ ژێریێ رۆژئاڤایی دیارن و چ زەرەر ڤێ نەکەڤتیە[١١].

د. عماد عەبدولسەلام رەئوفی هۆسا سالوخا کەلایێ کرییە: رامانا وێ کەلا ناڤخۆیە، دکەڤیتە دناڤ شویرها ئامێدیێ دا، محەمەد پاشا ئینجە بەیرەقداری والیێ مووسلێ پشتی ئامێدیێ ستاندی ل سالا (١٢٥٨مش/ ١٨٤١ز) یا ئاڤاکری، دا بیتە بارەگەهێ هێزێن ئۆسمانییا. کەلا یا دناڤ رووبەرێ (٣٥٠٠م٢) دا ئاڤاکری، شویرهەکا ئاسێ یا هەی، بلنداهیا وێ (٥م)ن، ستویریا دیوارێ وێ

(١٠٥م). د سالێن پێنجییان دا ژ سەدساليیا بۆری چەند ئاڤاهیێن فەرمی لێ هاتنە ئاڤاکرن، ببوو بارەگەهەکێ لەشکەری، پاشی پشتگوهڤە هاڤێتن. خەلکی بۆ خۆ خانی ل سەر ئاڤاکرن، نۆکە وەکی تاخەکێ بچویك یا لێ هاتی. بژلی بورجێ وێ (ژ بەر و گێچا هاتییە ئاڤاکرن) ئەوێ دکەڤیتە هنداڤی نهالا صپنەی چ ژ دیوارێ وێ نەمایە. دیسان بیرەکا دناڤ دا هەی ب رێکا تەمباڤەکا نەپەنی ب شکەفتا جانکاڤە دهێنە گرێدان[١٢].

## دیرۆکا ئاڤاکرنا ئیچ قەلا ئامێدیێ

هەکە ئەم ڤەخواندنەکا هویر بۆ دیرۆکا ئیچ قەلایێ بکەین و سەحکەینە وان نڤیسار و دەستنڤیسا ئەوێن ل سەر هاتینە کرن، دێ دو بۆچوون دیارین، ئەو ژی:-

**ئێك**:هەکە مە دانا کو ل سەروەختێ میرێ کۆرە (میر محەمەدێ رەواندوزی) یا هاتییە ئاڤاکرن. هەکە ئەم ڤەگەرینە سەر وان رووداننێن وی وەختی، دەستنڤیسەکا گەهشتییە مە کو ب دەستێ (محەمەد سەعیدێ مهری) نەڤیێ (مەلا یەحیایێ مزیری) هاتییە نڤیسین، دبێژیت: ل سالا (١٢٤٨مـش/١٨٣٢ز)ێ میرێ رەواندوزێ ئێرشا خۆ دەستپێکرییە[١٣].

ل دەستپێکێ میرێ کۆرە ئێرشی دەڤەرا زێبارێ کر، ل وێرێ میرێ داوییێ یێ میرگەهێ (ئیسماعیل پاشایێ دووێ) بەرهنگاری وی بوو، بەلێ نەشیا زێدەتر خۆراگریت[١٤]. پاشی ئیسماعیل پاشای و هەڤالێن وی خۆ د کەلا ئامێدیێ ڤە ئاسێکر، بەلێ میرێ کۆرە رێکا خۆ رامالی و گەهشتە ئامێدیێ، وەختێ ئیسماعیل پاشای دیتی نەشێن بەرهنگاری وی بیت، ئەو تاگرێن خۆ ب رێکا تەمباڤەکا ڤەشارتی ژ کەلایێ دەرکەڤتن و بەر ب (کەلا نێروە)ڤە چوو، کەلا وێ ئاڤاکر و خۆ تێدا حسار دا[١٥]. ل ڤێرێ خالەکا گەلەك هێژا ب دەست مە دکەڤیت، هندەك ڤەکۆلەر وەسا هزردکەن کو ئەو تەمباڤا ڤەشارتی ئەوا ئیسماعیل و هەڤالێن خۆ تێرا رەڤین، دکەڤیتە رەخێ دەرگەهێ مووسلێ، هندەك ژی وەسا هزر دکەن کو ئەو تەمباڤ ئەوە ئەوا دکەڤیتە دناڤ ئیچ قەلایێ دا. بەلێ دراستی دا ل هەیڤا (١١) یا سالا (٢٠١٥)ێ ب رێکا دەلیڤەکێ تەمباڤا ڤەشارتییا میرگەها بەهدینان هاتە دیتن، کو درێژاهییا وێ نێزیکی (١٠٠م) و ژ سەرایا میرگەها بەهدینان ل نێزیکی دەرگەهێ زێبارێ دەردکەڤیت.

پاشی جارەکا دی ئیسماعیل پاشایی هێزێن خۆ ب سەروبەرکرن و بەر ب کەلا ئامێدیێ دگەل (١٥٠) شەرکەرا هات، دەرگەهێن ئامێدیێ بۆ ڤەبوون، جارەکا دی ئامێدیێ ژ دەستێ برایێ میرێ کۆرە (رەسوول بەگێ) ئینادەرێ. بەلێ میرێ کۆرە بێدەنگ نەما، جارەکا دی ئەو لەشکەرێ خۆ بەر ب ئامێدیێ ڤە هاتن، ب سەر ئامێدیێ دا گرت. ل دەستپێکێ بۆ دەمێ سێ هەیڤا باژێر دورپێچکر، هەتا میرێ وێ (محەمەد سەعید)ی خۆ تەسلیمی میرێ کۆرە کری، ئەو بوو میری ژی کەربا خۆ ل وان دارێت محەمەد سەعید و دو کورێن وی کوشتن، ئامێدیێ تالانکر و گەلەك ژ خەلکێ وێ کوشتن[١٦].

هەکە ئەم ڤان رووداننان شرۆڤەبکەین، دێ بینین د سالێن هێرشا میرێ کۆرە دا هەمی شەڕ و شیق بوون، جار میرێ کۆرە جار ژی میرێن ئامێدیێ دەستێ خۆ دانا سەر ئامێدیێ، چ تەناهی ڤێنەدکەڤت، ڤێجا چاوا میرێ کۆرە دا شێن کەلایەکا ب ڤی رەنگی یا مەزن ئاڤاکەت، ئەڤە ژ لایەکیڤە، ژ لایەکێ دی ڤە میرێ کۆرە گەلەك زەرەر ل ئاڤاهیێن ئامێدیێ دایە، توپێن وی هەمی جهێن ئامێدیێ ڤەگرتبوون، هەمی وێران کربوو، خۆ ب سەر جهێ میرێن بەهدینان دادا بوو، برایێ خۆ کربوو حاکمێ ئامێدیێ. ڤێجا یا بەرئاقل نینە کو میرێ کۆرە ئیچ قەلا ئاڤاکربیت.

یا دووێ: ل سەروەختێ محەمەد ئینجە بەیرەقداری هاتییە ئاڤاکرن، هەکە ئەم ڤەخواندنەکێ بۆ وی وەختی بکەین، دیارە پشتی هەرفتنا میرگەهێن کوردی ب رەنگەکێ تەڤایی، چ میرگەها بەهدینان بیت یان یا سۆران و بابان بیت، حکومەتا ئۆسمانییا ڤیا خۆ ب سەروبەرکەت و بهێز بێخیت، ئەو بوو

چەند كەلایەكێن ناڤخۆ ل دەڤەرێن جودا جودا یێن كوردستانێ ئاڤاكرن، مینا (ئامێدیێ، داوودیێ، رەواندۆزێ، كویێ، هەتا كو ئێك ل گوندێ سویارێ ژی ئاڤاكربوو)، گەلەك مەرەم ب ئاڤاكرنا ڤان -كەلا هەبوون، ژ وان:-

١- مەرمێن لەشكەری، دا كو پتر لەشكەرێ ئۆسمانی ب هێز بكەڤیت و بشێن وان جهێن ئۆسمانیا لەپێن خۆ دانابنە سەر ب پارێزن، ئەو بوو كەلایێن ناڤخۆ ب رەنگەكێ مەزن و موكم ئاڤاكرن.

٢- مەرەمێن وەرگرتنا خویك و خەراجا ژ خەلكی، ئەڤ كەلا وەكی ناڤەندێن ناحیا هاتنە ئاڤاكرن، دا كارووبارێن بازرگانی تێدا بهێنە ب سەروبەركرن، ل هندەك جها وەكی (خان) ژی هاتنە ب كارئینان، مینا: قشلا داوودیێ كو جهێ مرۆڤ و تەویلخانێن دەوارێن وان ژی تێڤە هەبوون(١٧).

٣- دا رێكێ ل هەر بزاڤەكا ناڤخۆ بگرن، هەكە هات و جارەكا دی بزاڤ هاتەكرن لڤینەك یان سەرهلدانەك یان ژی شۆرشەكا ناڤخۆ بێتەكرن، ئەو كەلایێن ئاڤاكرین ناهێلن سەر بگرن.

پشتی ڤان دیتنا دێ یا بەرئاقل بیت كو ئەڤ كەلا ل سەروەختێ (محەمەد ئینجە بەیرەقداری) والیێ مووسلێ هاتبیتە ئاڤاكرن، نەخاسمە پشتی میرێ داویێ یێ میرگەها بەهدینان (ئیسماعیل پاشا) د شەرێ (ئێتویتێ) دا شكەستی و پاشی ئامێدیێ ژ لایێ ئۆسمانییاڤە هاتییە ستاندن[١٨].

## قۆناغێن هەرفاندنا ئیچ قەلایێ

ئەم دشێین قۆناغێن هەرفاندنا وێ ل سەر سێ قۆناغێن دیرۆكی پشك بكەین، كو ل هەر وەختەكی دربەك ل ڤی شوینوارێ مەزن دایە، قۆناغ ژی ئەڤەنە:-

١- قۆناغا هەیامێ مەلكی ئانكو یا سالێن (١٩٥٦-١٩٥٧)ێ هەروەكی ل دووڤ وان نڤیسارێن فەرمی دیاردبیت كو ل دەستپێكێ ئاڤاهیێ پولیسێن گومركی ل نیڤا ئیچ قەلایێ هاتییە ئاڤاكرن، پاشی جاددە برییە جهێ وێ، ب ڤێ چەندێ دیوارێ ژووریێ ئیچ قەلایێ هاتییە هەرفاندن.

٢- قۆناغا سالێن حەفتییان دا، د ڤێ قۆناغێ دا بزاڤ هاتییەكرن پتریا جهێ ئیچ قەلایێ بێنە خرابكرن. چەند ئاڤاهی ل سەر هاتینە ئاڤاكرن، ژ وان ئاڤاهیێ (دادگەها ئامێدیێ) ل سەر پشكا ژێریا رۆژئاڤایێ كەلایێ هاتییە ئاڤاكرن، هەر دڤێ قۆناغێ دا جاددە هاتییە بەرفرهەكرن، زێدەباری كو ئاڤاهیێ پولیسێن ئامێدیێ یێ نۆكە ل سەر شوینوارێن وێ هاتییە ئاڤاكرن.

٣- قۆناغا پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ، دڤێ قۆناغێ دا گەلەك ئاڤاهی ل سەر شوینوارێن وێ كەلایێ هاتنە ئاڤاكرن، زێدەباری ئاڤاهیێ بەنكا ئامێدیێ، خانیێن ب رەخڤە، ئەو خانیێن ل پشتا جاددێ ژی هاتینە ئاڤاكرن، گەلەك ژ سیما و نیشانێن شوینواری ل ڤێ كەلایێ بەرزەكرن.

## چەند دوكۆمێنتێن دیرۆكی ل سەر ئیچ قەلایێ

كۆمەكا نڤیسارێن فەرمی ل سەر ئیچ قەلایێ هەنە، هەر چەندە پتریا جهێ وێ یێ شوینواری یێ هاتییە ڤەشارتن، چ ئاڤاهی یان ژی جاددە یان ژی دەستدرێژی ل سەر هاتبیتە كرن، بەلێ ل دووڤ ڤان دوكیومێنتا دێ پتر دیار بیت كا كەنگی و چاوا ئەڤ كەلا شوینواری هاتییە هەرفاندن، چ سەدەم بۆ هەرفاندنا وێ هەبوون، كی بوون ل پشت هەرفاندنا وێ راوستاین. ئەڤە ژی دەقێ وان نڤیسارایە كو وەكی وان مە ئینانە خوارێ، بێ كو ئەم دەستكاریێ تێدا بكەین، تنێ مە یێن وەرگێراینە سەر زمانێ كوردی، رێزكرنا وان ژی مە ل دووڤ مێژوویا وان یا كری، دوكیومێنت ژی ئەڤەنە:-

### دوكیومێنتا هژمار (١)

ل رۆژا (١٩٥٢/١٢/٢٢)ێ راگەهاندنا ڤی جهی ژ لایێ شوینواریڤە هاتییە كرن، هژمارا بادەكا وێ (١٤٨٥/

٣٥) د رێڤەبەریا تەڤایا شوینوارا هاتییەڤەیدکرن، د رۆژناما (الوقائع العراقیە) یا هژمار (٣١٩٩) هاتییە بەلاڤکرن. ئەڤ شوینوارە ژ لایێ ڤەکۆلەر (ئەحمەدێ حاجی مەهدی) هاتییە بەلاڤکرن.

د بەرپەرێ ئێکێ دا ئەحمەدێ حاجی مەهدی ئەڤ نێرینە نڤیسینە:

بازێر: دهۆك.

ناحیا: ئامێدیێ.

قەزا: ئامێدیێ.

نەخشەوار: دکەڤیتە دناڤ کوژیا (٣٠) متری دا، نەخشەواری پیڤانێ یێ هژمار (SW/٠-١٣٧).

بلندیا وێ ل سەر ئاستێ (مستوی) ئەردێ رەخودۆرا: ژ ڤێ کەلا بەرفرەهـ کو ژ بەر و کێچا هاتییە ئاڤاکرن، بلندیا دیوارێن وێ دناڤبەرا دو هەتا چوار مەترانە، شکلێ وێ یێ چوارکۆژییە و درێژیا هەر کوژیەکێ وێ (٨٠م)ن. نێزیکی (٨٠٠) مترا یا ژێ دویرە[١٩].

ئەردێ وێ ب ناڤێ (ئەمیری) هاتییەڤەیدکرن. هندەك پرتێن شوینواری یێن ناڤ دا هەین[٢٠]، کو دناڤ کاڤلێ ڤی جهێ شوینواری د بەربەلاڤن، چ جهێن وێ ب کێر خواندنێ ناهێن. بۆ سەروەختێ داویێ یێن ئیسلامی ڤەدگەریت. هەتا نۆکە چ دەستدرێژی ل سەر نەهاتینە کرن[٢١]. د شیان دایە مرۆڤ ب ترۆمبێلێ بگەهیتە سەر شوینوارێن وێ.

## دوکیومێنتا هژمار (٢)

بۆ: رێڤەبەریا تەڤایی یا شوینوارێن کەڤن.

مژار: مەخفەرا گومرکێ یا پولیسێن ئامێدیێ

هژمار: ٥/ ٧١/ ١/ ٤٧٥ ل رۆژا (٩/ ١٠/ ١٩٥٦)ێ.

بۆ هەوە لبەکێ ژ نڤیسارا (ئەشغالا دەڤەرا ژووری) یا مووسلێ ب هژمار (٧٢٣٦) ل رۆژا (١٩٥٦/١٠/٨)ێ دهنێرین، هیڤییە د هایدارین (سەعید دیوەچی - رێڤەبەرێ مۆزەخانا مووسلێ).

## دویومێنتا هژمار (٣)

بۆ: موتەصەرفیا لیوا مووسلێ.

مژار: ئاڤاکرنا مەخفەرا گومرکێ یا پولیسێن ئامێدیێ.

هیڤییە رازی ببن کو دیوارێ ل بەرامبەری مەخفەرا پولیسێن ئامێدیێ بهێنە هەرفاندن، ژ بەرکو روویێ مەخفەرێ یێ ژ مەیدانا بەرامبەر گرتی. (عەبدلنافع حەمودات - ئەندازیارێ ئەشغالا دەڤەرا ژووری). ل رۆژا (١٩٥٦/١٠/١٣)ێ حاشیەك ل سەر وێ نڤیسارێ هاتییە کرن، تێدا هاتییە: پشکا ڤەدیتنێ هەوە پێزانین ل سەر وی دیواری هەنە، ئەرێ وی چ تێکەلی دگەل شوینوارا هەیە.

## دوکیومێنتا هژمار (٤)

بۆ: ئەشغالا دەڤەرا ژووری ل مووسلێ.

مژار: مەخفەرا گومرکێ یا پولیسێن ئامێدیێ.

هژمار: ١٤٨٥/ ٣٥/ ٣٣٢٦ ل رۆژا (١٩٥٦/١٠/١٥)ێ. ئاڤری ب نڤیسارا هەوە یا هژمار (٧٢٣٦) ل (١٩٥٦/١٠/٨)ێ، هیڤییە مە ب جهێ دیواری هایدارکەن ئەوێ د نڤیسارا هەوە دا هاتی، ئەو چ جهێ شوینوارییە دکەڤیتە بەر، دا مە های ژ وێ مەسەلێ هەبیت.

## دوکیومێنتا هژمار (٥)

بۆ: رێڤەبەریا تەڤایی یا شوینوارێن کەڤن

مژار: داخوازا هەرفاندنا دیوارێ ئیچ قەلایێ ل بەرامبەری مەخفەرا پولیسێن ئامێدیێ.

ئاڤری ب نڤیسارا هەوە یا هژمار (١٤٨١/ ٣٥/ ٣٣٢٦) ل رۆژا (١٩٥٦/١٠/١٥)ێ، کو هێژا موتەصەرفێ لیوایا مووسل گۆتبوو رێڤەبەرێ تەڤاییێ شوینوارێن کەڤن، ل دەمێ کۆمبوونێ دگەل سمو میرێ یابانێ، کو پێدڤییە دیوارێ ئیچ قەلایێ ئەوا دکەڤیتە بازێرکێ ئامێدیێ بهێنە هەرفاندن، ژ بەرکو دکەڤیتە بەرامبەری مەخفەرا پولیسێن ئامێدیێ، رێڤەبەرێ تەڤایی ل سەر ڤێ چەندێ رازی ببوو.

پاشی ئەشغالا دەڤەرا ژووری ڤەدیتنەك بۆ مە ب چوار لبا ب بهایێ (٢٥٠/ ٨٥) دینارا هنارتبوو، دگەل نڤیسارا خۆ یا هژمار (٧٣٩٣) ل رۆژا (١٩٥٦/١٠/١٤)

ێ بۆ مە فرێکربوو، داخواز ژ مە کربوو ب وی شۆلی رابین ئانکو وی دیواری ب هەرفینن، هیڤییە مە ب ڤێ چەندێ هایدارکەن. هەژییە بێژین کو ئەو دیوار ژ دیوارێن نوییە و حکۆمەتا ئۆسمانییا یێ ئاڤاکری. (سەعید دیوەچی - رێڤەبەرێ مۆزەخانا مووسلێ).

## دوکیومێنتا هژمار (٦)

بۆ: رێڤەبەرییا تەڤاییا شوینوارێن کەڤن
مژار: دیوارێ ئیچ قەلایێ ل ئامێدیێ.
هژمار: ١٧٤/١/٧١/٥
مێژوو: ١٩٥٦/١١/٢٤

ئاڤرێ ب نڤیسارا هەوە یا هژمار (٣٥٨٧/٣٥/١٤٨٥) ل رۆژا (١٩٥٦/١١/٦)ێ، من ڤەدیتنەك ل سەر دیوارێ ئیچ قەلایێ کر، ئەوێ مەرەما ئەشغالا ژووری ب هەرفینن، ل رۆژا (١٩٥٦/١١/٢١)ێ من ب ترۆمبێلەکا پێکئاپ کو یا رێڤەبەرییا تەڤایی بوو سەرەدانا وی جهی کر،

## ئەڤە ژی هویرییێن وێ ڤەدیتنێنە:

### ١- سالۆخا دیواری و جهێ وی دناڤبەرا ئاڤاهییێن ئامێدیێ دا:

ئاڤاهیێ کەڤن ئەوێ دبێژنێ ئیچ قەلا، بەرمایکێن چوار دیوارانە کو ژ بەرێ نەداتراشتی و گێچێ (بەرێ حەلانی کو نەهاتییە نکراندن) ل هەر کۆژیەکێ وێ زێرەڤانییێن شەری هەنە، ئیچ قەلا دکەڤیتە رەخێ ژێرییێ کەلا ئامێدیێ و دکەڤیتە سەر شویرها وێ یا ژێری. ئەو پشکا کو مەرەم پێ بهێنە هەرفاندن، درێژاهییا وی (٣٠م)ن، بلندییا وێ دناڤبەرا (٣.٥ -٤)م، ل نیڤەکێ دەرگەهەکێ هەی، ل سەرێ دەرگەهی کڤانەك یا هەی، دەرگەهێ وێ ژی یێ ب بەرێ نەداتراشتی هاتییە ئاڤاکرن.

### ٢- دیرۆکا ئیچ قەلایێ:

مە پێزانین ژ سەماحەتا موفتیێ ئامێدیێ (محەمەدێ کورێ شوکری) وەرگرتن کو وی ژ هندەك کەسا کو د وی وەختی دا بوون یێ کەلا هاتییە ئاڤاکرن وەرگرتبوون، دیسان مە پێزانین ژ چەند ژێدەرێن ڤێ داوییێ وەرگرتن کو بەحسێ وی هەیامی دکەن. دیاردکەن کو ئیچ قەلا ل رەخودۆرێن سالا (١٢٥٠مش) ئانکو بەری (١٢٥- ١٢٦) سالا یا هاتییە ئاڤاکرن، کو (محەمەد پاشایێ رەواندۆزی ئەوێ دگۆتنێ میرێ کۆرە) بۆ مەرەمێن لەشکەری و بەرەڤانیێ ئاڤاکربوو. ئەڤە بۆچوونا پترییا خەلکێ ئامێدیێ یە ئەوێن های ژ مەسەلێ هەی. دیسان موفتی دبێژیت: محەمەد پاشای ئەڤ کەلا یا ل سەر بەرمایکێن خواندنگەهەکێ ئاڤاکری کو علۆمێن دینی وی وەختی لێ دهاتنە خواندن.

### ٣- ئاڤاکرنا کەلایێ:

وەکی یا دیار کو ئیچ قەلا بەرمایکێن چەند دیوارانە و یا چوار کۆژیە، دناڤ ڤێ کەلایێ دا بەرمایکێن چ ئاڤاهیێن دیار نینن: ئەوا مایی بتنێ دیوارێن کەلاییێنە و چەند زێرەڤانەك تێدا ماینە. هەروەکی بەری نۆکە مە گۆتی کو ماددێ ئاڤاکرنا ڤێ کەلایێ بەر و گێچن، چ پویتە ب گونجاندنا بەر و گێچا نەهاتییە کرن، دیوارێن وێ ب رەنگەکێ بێ سەروبەر ژ وان بەرا و گێچا هاتییە ئاڤاکرن. چ نڤیسین یان ژی نەخش ل سەر دیوارێن وێ نینن و هەتا ل سەر وی دیواری ژی نینن ئەوێ دێ هێنە راکرن. ئاڤاهی ب رەنگەکێ تەڤایی یێ نوی و زێدەکرییە نەخاسمە ل وی جهێ ل سەر شویرها ئامێدیێ هاتییە ئاڤاکرن.

### ٤- سەدەمێ هەرفاندنا ئیچ قەلایێ ئەوا دکەڤیتە بەرامبەری ئاڤاهییێن ئامێدیێ:

پلانا رێڤەبەرییا ناڤخۆ ئەوە کو ئیستملاکا وی ئەردێ دکەڤیتە رەخێ ژێرییێ کەلا ئامێدیێ، بەری نۆکە پترییا وێ گۆرستانا خەلکێ ئامێدیێ بوو. دا کو جهێن حکۆمی بهێنە ئاڤاکرن و خانی بۆ فەرمانبەرا بێنەئاڤاکرن، دەست ب ئاڤاکرنا مەخفەرا پولیسێن

گومرکی هاتەکرن، ل رەخودۆرێن ئیچ قەلایێ هاتە ئاڤاکرن، جاددەکا ڤێرکری بۆ هاتە راکێشان، دیوارێ ئیچ قەلایێ دناڤبەرا رێکێ و مەخفەرا پولیسا دا گرت بوو، ب چ رێکا مرۆڤ نەدگەهشتە وێ مەخفەرێ.

پاشی حاشییەك ل سەر هاتییە کرن، دبێژیت: وەکی ژ راپۆرتێ دیار کو کەلا ناڤبری بەری (١٢٥) سالا هاتییە ئاڤاکرن، ئەو جهێ کو دێ هێنە هەرفاندن کو دکەڤیتە بەرامبەری جاددێ چ سالۆخەتێن شوینواری تێدا نینن، راکرنا وی دیواری ب رەنگەکێ تەڤایی کێنجا خۆ ل سەر ئاڤاهی هەمیێ ناکەت، هیڤییە بۆچوونا خۆ دیارکەن.

## دوکیومێنتا هژمار (٧)

بۆ: رێڤەبەریا مۆزەخانا مووسلێ.

مژار: نڤیسارەکا موخابراتێ

هژمار: ١٨٩/١/٢.

مێژوو: ١٩٦٥/١٢/٩.

ئاڤڕێ ب نڤیسار هەوە یا هژمار (٥٩٦/١/٢) ل رۆژا (١٩٥٦/١٢/٥)ێ دێ ڤەرێژا ڤەدیتنا مە ل سەر وی دیواری بینن، زێدەباری وێ ڤەدیتنا مە ل سەر گرێ وتێ ل ڤەزا تلەعفەرێ کرین، کو مە لبەکا وێ بۆ رێڤەبەریا تەڤایا هنارتی. ل مە نەگرن ژ بەر وێ سەهوا ل وێ دەڤەرێ چێبووی، دێ د پاشەرۆژێ دا لبێن وان نڤیسارا گەهیننە هەوە ئەوێن دەستپێکێن وان ل دەڤ هەوە. ناڤێ (بەهنام ئەبو صوف- ئەوێ ڤەدیتنێ ل مووسلێ دکەت) هاتییە.

## دوکیومێنتا هژمار (٨)

بۆ: ئەشغالا دەڤەرا ژووریێ مووسلێ

مژار: هەرفاندنا دیوارێ بەرامبەری مەخفەرا پولیسێن گومرکا ل ئامێدیێ

هژمار: ٦٧٦٢

مێژوو: ١٩٥٧/٣/١٢

گەلەکا ب لەزە، نڤیسارا هەوە یا هژمار (١٣٧٥) ل رۆژا (١٩٥٧/٣/٣)ێ.

ئەم د رازینە ل سەر هەرفاندنا دیوارێ کو مە بەحسی وی کری، هیڤییە زوی ئەو شۆل بێنەکرن بەری سالا دارایی ب دویماهی دهێن. (موتەصەرفێ لیوا مووسلێ).

ئەو بۆچوونا بەربەلاڤ ئەوە کو دڤێن پارچەکا دیوارێ ئیچ قەلایێ بهێتەراکرن دا بەروبیاڤی ل بەرامبەری باژێرکی خۆشکەت و ئاڤاهیێن نوی بهێنە ئاڤاکرن.

ل دویماهیێ ئەز دبینم کو ڤی دیواری (دیوارێن دیتر یێن ئیچ قەلایێ) سالۆخەکێ نەمازەیی هەبیت کو بهێنە هژمارتن ئاڤاهییەکێ شوینواری و بهایەکێ هۆنەری هەبیت. هەکە ماژی دێ رێکا ڤێرکری ژ مەخفەرا پولیسا ڤەدەرکەت.

هیڤییە سەحکەنە ڤێ مەسەلێ و بۆچوونا داویێ دیارکەن. (بەهنام ئەبو صوف- ئەوێ شۆلێ ڤەدیتنێ ل دەڤەرا ژووری دکەت).

## ڤەرێژ

هەکە مرۆڤ ب رەنگەکێ هویر سەحکەتە ناڤەرۆکا ڤان نڤیسارا دێ چەند تشتەك بۆ مە دیاربن، ئەڤە ژی ڤەرێژ و نیڤشکێن وێ چەندێنە کا کی بوویە سەدەمێ هەرفاندنا ئیچ قەلایێ ل ئامێدیێ، هەرفاندنا وێ چ زەرەر و زیان ل دیرۆکا ئامێدیێ داینە، ئەو ژی:

١- سەیدایێ سەعید دێوەچی کو وی وەختی رێڤەبەرێ مۆزەخانا مووسلێ بوو، ب رەنگەکێ ب ساناهی و سەرڤەسەرڤە یا سەحکرییە مەسەلا ئیچ قەلا ئامێدیێ، وەکی دیار د راپۆرتا خۆ دا بەحسێ لایێ دیرۆکی و ئاڤاهی یێ کری، چ بها نەدایە وی ئاڤاهیێ گەلەك مەزن، هەکە چ نەبا دڤیابا وی (٥٠٠٠م٢) ب کێم نەدانابان، بتنێ وی بەحسێ ماددێ ئاڤاکرنێ کربوو، دڤیابا وی تەرکیبا (ستراکچەرێ) ئاڤاهی بەرچاڤ وەرگرتبا، ب وی چاڤێ کێم نەسەحکربا مەسەلێ.

٢- ژ بەرکو دیرۆکا وێ ئیچ قەلایێ ب میرێ کۆرە ئانکو محەمەد پاشایێ رەواندۆزێڤە هاتبوو گرێدان، نەدویرە بۆ سەعید دێوەچی هەر چ بها نەبن، ژ بەرکو ئەو کەسەکێ مووسلی

بوو، دیرۆکا کوردا بۆ وی هندا ب قەدر و قیمەت نەبوو، لەوا هەرفاندنا دیوارێ ئیچ قەلایێ ل دەف وی تشتەکێ ب ساناهی بوو، پشتی دیوارێ ئیچ قەلایێ هاتییە هەرفاندن، ئێدی ئیچ قەلا هێدی هێدی نەما.

٣- ئاڤاکرنا مەخفەرا گومرکێ یا پولیسێن ئامێدیێ گاڤا ئێکێ بوو کو تەمەنێ ئیچ قەلایێ ب داوی بهێت، وەکی ژ وان نڤیسارا دیاردبیت ئاریشا وان بۆ هەرفاندنا دیوارێ بتنێ گرێدانا جاددا ڤێرێ ب مەخفەرا پولیساڤە بوو.

٤- سەیدایێ بهنام ئەبو صوف گەلەك ژ بهایێ وی ئاڤاهی کێم کرییە، دەمێ دبێژیت: هەرفاندنا ڤی دیواری و هەمی دیوارێن ئیچ قەلایێ چ بهایەکێ شوینواری نینە ئانکو چ زەرەر ڤ بهایێن شوینواری ناکەڤن. وەکی دیار سەیدایێ بهنام ئێك ژ زانایێن بەرکەتی یێن عیراقێ بوو، کو ل ڤێ داویێ یێ چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ، وی پویتەکێ مەزن ب کاڤلێن فەلا ژێ دا، چاوا وی پویتە ب وی ئاڤاهیێ مەزن و بەرکەتی نەددا!.

## ژێدەر:


١. وەکی دیار بۆ جارا ئێکێ یێ ناڤێ ڤێ کەلایێ د کتێبا خۆ دا ئیناى (محفوظ عباس)ى بوو، بۆ پتر پێزانینا بنێرە: محفوظ العباسي، امارة بهدينان العباسية، مطبعة الجمهورية، ج٢، (موصل: ١٩٥٣)، ص ١٠٨.

٢. عبدالله خورشيد قادر ئالەی، العمارة الاسلامية في العمادية و ضواحيها حتى القرن ١٢هـ/١٨م، اطروحة دكتوراه منشورة مقدمة الى جامعة صلاح الدين_ اربيل، سبيريز لطبع و النشر، مطبعة الروضة، (اسطنبول: ٢٠١٢)، ص ١٤٢.

٣. ڤەکۆلینەکا مەیدانی ل رۆژا (٢٠١٥/١١/١٢)ێ.

٤. عبدالله خورشيد،ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٢.

٥. المصدر نفسه، ص ١٤٣.

٦. عبدالله خورشيد، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٣.

٧. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.

٨. عبدالله خورشيد، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٣.

٩. نڤیسارا مووزەخانا میسلێ هژمار (٤٩٥/١/٧١/٥) ل رۆژا (١٩٥٦/١٠/٢٠)ێ. لبەکا ڤێ نڤیسارێ یا ل دەڤ مە پاراستیە (ك. ئ).

١٠. کورا سریچێ: بەرمایکێن پەرستگەهەکا کەڤنن، هندەك وەسا دیاردکەن کو بۆ سەروەختێ میترائیيا دزڤریت، بەلێ ل سەروەختێ ئیسلامێ وەکی (سریچا ئاڤێ ئانکو عمبارا ئاڤێ) هاتییە بکارئینان. بۆ پتر پێزانینا ل سەر ڤێ جهی، بنێرە: طارق الباشا عمادي، ئاميدي- العمادية اثار و تاريخ، (لندن: ٢٠١٢)، ص ١٧.

١١. طارق الباشا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨.

١٢. د.عماد عبدالسلام رؤوف، المعجم التاريخي لامــارة بهدينان، مطبوعات الاكادمية الكوردية، مطبعة حاج هاشم، (اربيل: ٢٠١١)، ص ٥٣.

١٣. سەعید دێرەشی، کوتاهیا میرگەها بەهدینا و میرێ وێ یێ زانا و وەلاتپەروەر ئیسماعیل ئاشایێ دویێ، گۆڤارا دیرۆك، هژمار (٩)، (دهۆك: هاڤینا ٢٠١٥)، بپ٨.

١٤. هەمان ژێدەر، بپ ٨.

١٥. هەمان ژێدەر، بپ ٩.

١٦. سەعید دێرەشی، ژێدەرێ بۆری، بپ ١٠.

١٧. بۆ پتر پێزانینا ل سەر کەلا داوودیێ، بنێرە نڤیسینا مە: کۆڤان ئیحسان یاسین، قەنتەرە و قشلا داوودیێ و گێزگێزا دویماهیێ، گۆڤارا سیلاڤ، هژمار(١٠٥)، (ئامێدیێ: کانونا ئێکێ ٢٠١٥)، بپ ٢٥.

١٨. بۆ پتر پێزانینا ل سەر شەرێ ئێتویتێ و شکەستنا لەشکەرێ بەهدینان، بنێرە: د.عماد عبدالسلام، المصدر السابق، ص ٥١_٥٢.

١٩. ئەم نزانین مەرەم ژ (٨٠٠م) چییە، دبیت دویراتییا دناڤبەرا دەرینکێ ئامێدیێ یێ وی وەختی و ئیچ قەلایێ دا بیت، نەدویرە ژی مەرەم پێ دویماهییا پەسارا شویرها ئامێدیێ بیت. (ك.ی).

٢٠. مەرەم پێ پرتێت گۆزکانە کو ل وی جهی د بەربەلاڤن. (ك. ی).

٢١. مەرەم پێ ل سالا (١٩٥٢)ێ چ دەستدرێژی ل سەر نەهاتینە کرن.

# ئاڤاهییێن خزمەتگوزاری ل ئامێدیێ تا داوییا سەدسالییا دووازدێ مشەختی/هەژدەی زایینی

**پ.د. عەبدوللا خورشید ئالەیی**
**زانكۆیا سەلاحەدین-كۆلیژا ئەدەبیات**
**وەرگێران: هشیار رێكانی**

هزرا دانانا قەنتەرك[1] و پران دا كو پێ ژ ئاستەنگێن ئاڤێ دەرباز ببن گەلەكا كەڤنە و دزڤریتەڤە كویراتییا چەرخێن دیرۆكی، گرنگییا ڤان دەزگەهان د هندێرایە كو ب هاریكارییا وان دێ شێن ژ جهەكی بچنە جهەكێ دی و گەلەك مفایێن دی. هندەك ئاماژەیێن دیار یێن ل سەر دەقێن مسماری هەیین ئاماژێ ددەنە وێ چەندێ كو عیراقیێن كەڤن پر و قەنتەرك یێن بكارئینایین و ئەو چەندە دناڤ هندەك نەخشەبەرێن واندا دیارن كو كا و سەركەتنێن وان هێلاینە زیندی[2]، و پویتەدان ب دانانا وان رەنگە ئاڤاهییێن خزمەتگوزاری ب درێژاهییا دیرۆكێ یا بەردەوام بوو، یازانا ئەوە كو دەڤەرا ئامێدیێ و پرانییا دەڤەرێن كوردستانێ ب گشتی گەلەك جۆك و رووبار و كانی لێ هەنە ، سەرەرای هەبوونا گەلەك دۆلێن كویر كو ل هەردو وەرزێن زڤستان و بهاران لەهی ژ بەر بەفر و باران لێ رادبوون و گەلەك ئاستەنگ بۆ كاروانێن سەربازی و بازرگانی دروست دكرن، ڤێ چەندێ گەلەك ژ میر وسولتان پالدان كو پر و قەنتەركان چێكەن دا دەڤەر پێكڤە بهێنە گرێدان و بزاڤا هاتن و چوون و ڤەگوهاستنێ ب ساناهی بكەڤیت و ئەو چەند بوونە ئەگەر كو كارێن چاندنێ و بازرگانی ب ساناهی بكەڤن، سەرەرای ئارمانجێن سەربازی.

## یەكەم : قەنتەرك
### أ- قەنتەركا مەزن ل تاخێ قۆجا :

دكەڤیتە ژێرییا تاخێ قۆجا ل سەر وێ نهالا ئاڤا كانییا خاتوینا و كانییا مالا درێژنێ، ژ بلی ئەو ئاڤا ژ گەلێ كانییا سنجێ ب تایبەت ل هەردو وەرزێن زڤستان و بهارا درێژنێ، و ئەو پر دەڤەرێن بەرواری ژووریێ و نێروە ب ئامێدیێ ڤە گرێددەن، و خەلكێ وان دەڤەران دەمێ دهاتنە د بازێری دا ژ وێ پرا ناڤبری درێكا دەرگەهێ زێبار را ژ لایێ رۆژهەلاتیڤە دەرباز دبوون.

ناڤێ قەنتەركا قۆجا یێ ژ تاخێ قۆجا هاتی ، كو قەنتەرك هەر دكەڤیتە وێرێ، و ئەو ب بەرێن برِی یێن كلسی و كسلێ بخۆ هاتییە ئاڤاكرن، درێژاهییا پەیادەرێكا قەنتەركێ (٢٠م) و پانییا وێ(٢,١٠م) پێكهاتییە ژ قەنتەركەكا مەزن و كڤانەكێ نیڤ بازنەیی بخۆڤە دگریت و دكەڤیتە سەر (دنگەكێ

(نەخشێ ١)یێ
قەنتەرا مەزن ل تاخێ قوجا ل بازێرێ ئامێدیێ




مەزن)ژ ئاڤاهی، بلنداهیا كڤانێ وێ ژ قاما ژ ناڤدا ژ سەری تا نزمترین ئاستێ چوونا ئاڤێ (٤,٤٥م) و فرەهیا وی (٤,٢٠م) و بیاڤ د ناڤبەرا لێڤا سەری ژ كڤانی و لێڤا سەری ژ پەیادە رێكێ ب بلنداهیا (٥٥سم)، (نەخشە/ ١).

دناڤ هەردو رەخێن كڤانی یێن بەرامبەری ئێكدا

(وێنەیێ ١)
پرا مەزن ل تاخێ قوجا



(نەخشەیێ ٢)
پیێ قەنتەرا بچووك ل تاخێ قوجا




سێ كولینكێن چوارگۆشەیێن گرتی ب درێژاهیێن (٢٠×٢٤سم) دهێنە دیتن (وێنە / ١) و یا ئەم دبینین ئەو كولینك نە ژ بۆ جوانیێ و خەملاندنێ هاتینە دروستكرن، بەلكی ئارمانج ژێ ئەوە دا هندە ستوینێن داری پێن مەزن ب رەنگەكێ بەرواری تێدا موكم بكەن كو دبیت وان ژێ قالبەكێ داری ب رەنگەكێ نیڤ بازنەیی مینا ڤی كڤانی ل سەرییویە دا ئاڤاكەر هەمی كارێ خۆ ب ساناهی ئەنجام بدەت یان ژێ بۆ هندە كارێن دی پێن ئاڤاكرنێ هاتبنە بكارهینان.

دەربارەی ئەردێ بانێ قەنتەركێ ، ئەو ژێ ب پارچێن بەرا و كلسی پێ رائێخستی بوو ب و ب بۆرینا دەمی گەلەك پێ ژ ناڤچووی، و پشتی هینگێ ب گەلەكێ كارێن چاككرن و نویژەنكرنێ ل سەر ڤێ قەنتەركێ هاتینەكرن و رووبێ دنگان كو قەنتەرك ل سەرە هندە دیوارێن پالپشتێن بەرا و گێچێ دانایە بەر و تێكێن وێ ب چیمەنتوێ گرتینە[٣].

ل سەر دیرۆكا ئاڤاكرنا قەنتەركێ ژێدەرێن دیرۆكی ئاماژە ب چ پێزانینان ل سەر نەداینە و ڤەكۆلەرەكی ئاماژە یا ب وێ چەندێ دای كو ئەڤ قەنتەرە و چەند پرێن دی دبیت ژ كارێن سولتان حسێن وەلی یان بەهرام پاشای بن[٤].

ژ بلی ڤێ قەنتەركا مە ل سەری ئاماژە پێدای قەنتەركەكا دی ژێ ل وی تاخی ب ناڤێ (قەنتەركا كۆلانا قۆجا) یا هەی و تا رادەكی ئەو یا بچویكە و نهو ناهێتە ب كارهینان، درێژاهیا وی نێزیكی (٩م) و پانیا وی (٢,١٥م) پێ پێكهاتییە ژ قەنتەركەكێ و كڤانەكێ نیڤ بازنەیێ كو رەنگە تیژییەك یا تێدا هەی ل سەر ملەكێن مەزنێن بەرا و كسلێ هاتییە دانان(نەخشە/ ٢) و ژ ئەنجامێ پشت گوهێخستنا ڤێ قەنتەركێ گەلەك نشتەیێن ئاخێ و گیایان ل سەر لایێ ژێری ژ پرێ كۆم بووینە كو بلنداهیا كڤانی ژ ئاستێ ئەردێ نهو (١,٣٥م) و پانیا دەرگەهێ وێ (٣م) و ئەم ب دروستی دیرۆكا ئاڤاكرنا وێ نزانین و دبیت هەر ڤەدگەرێتەڤە چاخێ ئاڤاكرنا قەنتەركا قۆجا .

## ب- قەنتەركا عەلی جانگا

دكەڤیتە رۆژاڤایێ قەنتەركا كۆلانا قۆجا ل نێزیكی كانییا شیڤێ، ئەڤ قەنتەركە ب بەرێن برِی و كلسێ هاتییە ئاڤاكرن، پێكهاتییە ژ قەنتەركەكا نیڤ

(نەخشێ ٣) یێ
قەنتەرا عەلی جانکا




کڤانەیی مینا کڤانەکێ نیڤ بازنەیی و پیچەکێ یا تیژە ل سەر دیوارێن مەزنێن بەر و کلسی. بلنداهییا کڤانی (٢,٢٠م) و پانییا فرەهییا وێ (٣,٣٠م)، درێژاهییا بانێ قەنتەرکێ (٤,٥٠م) و پانییا وێ (٢,٣٠م) و ئەو ژی ژ وان قەنتەرکانە کو نهو هاتینە پشتگوهڤە هاڤێتن و دیوارەکێ دی ب درێژاهییا (٦,٣٠م) و بلنداهییا وی (٢م) د کەڤیتە د گەل لێڤا ژێریا قەنتەرکێ، دبیت ئەو وەکی پالپشتەك بۆ لایێ ژێری ژ لێڤا قەنتەرکێ هاتبیتە ئاڤاکرن (نەخشێ ٣).

شێوازێ نەخش و ئاڤاهیێ ڤێ قەنتەرکێ تا رادەکی مینا یێ بەری وی یە و دویر نینە د ئێك چاخدا هاتبنە ئاڤاکرن (وینێ ٢).

## ج- قەنتەرکا قوپا

ژ وان قەنتەرکێن بچویکە کو دکەڤیتە دویراتییا چەند مێترەکێن کێم ژ باشوورێ خواندنگەها قوپەهان و وەکی دیار ڤێ قەنتەرکێ بازێرێ ئامێدیێ و

(وێنێ ٢) یێ پرا عەلی جانکا



خواندنگەها قوپان پێكڤە گریددا و ناڤێ وێ ژی هەر یێ ژ وێ چەندێ هاتی.

قەنتەرك ژ بەرا و كلسی مینا یێن بەری وێ مە ئاماژە پێدای هاتییە ئاڤاكرن، پێكهاتییە ژ ئێك قەنتەرە و ژ بەر هەرفینا قەنتەركێ ب تمامی و چ ژێ نەمایە ب تنێ هەردو رەخێن وێ نەبن كو قەنتەركێ پالپشتی ل سەر دكر ئەم چ ژ شێوازێ كڤانێ وێ نزانین.

درێژاهییا پەیادەرێكا وێ دگەل رەخ و دەورێن وێ (١٠م) و پانییا وێ نێزیكی (٢م) و بلنداهییا یێ مایی ژ هەردو رەخێن قەنتەركێ (٢م) و پانییا وێ (٤م)، خەلكێ دەڤەرێ سەر ژنوو بانێ ڤێ قەنتەركێ ب چیمەنتوی چێكریەڤە دا مفای ژێ ببینن بۆ چوونا ناڤ باغچێن خۆ یێن نێزیك و ئەڤ قەنتەركە ژ قەنتەركێن كەڤنە و دبیت دیرۆكا وێ ڤەدگەرێتەڤە سەردەمێ ئاڤاكرناخواندنگەها قوپەهان، وەكی مە ل بەری هینگێ ئاماژە پێدای[٥].

## دوو: پر

### أ- پرا عیسێ دەلا[٦]

دكەڤیتە دویراتییا (٣كم) ژ باشووری رۆژاڤایێ كەلا ئامێدیێ و ژ وان پرێن كەڤنە كو ل سەر رووبارێ سۆلاڤ هاتینە چێكرن، ئارمانج ژێ ب ساناهیكرنا هاتن و چوونا كاروانێن بازرگانی و سەربازی بوو، كو ژ ئامێدیێ بەرەڤ مووسل د چوون و بەروڤاژی و گەلەك كەلا و خان درێكێ دا هەبوون، مینا خانا بەریانگێ و خانا كۆرێت گاڤانا و گەلەكێن دی ل سەر درێژاهییا رێكێ.

پر ژ بەرێن بری و كلسێ هاتییە ئاڤاكرن، درێژاهییا وێ (٢٦م) و پانییا وێ (٢,٥٠م) و بانێ وێ ب بەرێن راست و گێچێ هاتییە رائێخستن، پر ژ دو قەنتەركان پێكهاتییە، ئێك ژ وان یا مەزنە و یا دی ب قەبارەی خۆ بچویكترە (نەخشێ/٤)، ئاراستەیێ قەنتەركا مەزن ب شێوێ كڤانەیێ نیڤ بازنەییە ل سەر گومتلە ئاڤاهیەكێ مەزن و ژ بەر كەڤنی و ژ بەر هۆكارێن سەقای رەخێن لێڤێن بلند ژ كڤانی یێن شووربووین و دیسان دهێتە دیتن كو رەخێ رۆژاڤایی ژ قەنتەركا ناڤبری مینا وی رەخێ بەرامبەر نینە، لێ پیچەكێ ڤەبیترە بۆ لایێ رۆژهەلاتی و دبیت هەر ژ بەر ئەگەرێ سەری بت.

بلنداهییا كڤانی ژ لێڤا سەری ژ رەخێ ناڤدا هەتا نزمترین خالا كڤانی ل سەر ئاستێ ئەردێ نهو رووبار لێ (٣م) و بیاڤێ دناڤبەرا سەرێ كڤانی و لێڤا پەیادەرێكێ

(نەخشێ ٤)
پرا عیسێ دەلال



**(وێنەیێ ٣) یێ**
**پرا عیسێ دەلا**



نێزیکی (٤٠سم) و پانییا دەرگەهێ کڤانی (٥,٥٠م) و پانییا رەخان کو کڤان ل سەر هاتینە دروست کرن (٢,٥٠م) و دنگەکێ مەزن ب پانییا (٢,٤٠م) دناڤبەرا هەردو قەنتەرکاندا هەیە(وێنە ٣) .

قەنتەرکا دووێ ب قەبارێ خۆ بچویکترە ژ یا ئێکێ، لێ شێواز و نەخشێ ئاڤاکرنێ هەر مینا یێ ئێکێ یە، بلنداهیا کڤانێ نیڤ بازنەیی (١,٣٠م) و پانییا دەرگەهێ وێ (٤م) و بیاڤ د ناڤبەرا سەرێ کڤانی و لێڤا بانێ پرێ ب بلنداهییا نێزیکی (١م) و پاشڤەمایێ هندە کولینکێن گرتی ب رەنگێ چوارگۆشە و بچویك مینا یێن ل قەنتەرکا قۆجا ئاماژە پێ هاتیبەدان دهێنە دیتن و دبیت ئارمانجا وان ژی هەر ژ بۆ وێ ئارمانجێ بیت یا مە بەری هینگێ ئاماژە پێدای .

ئەڤ پرە ژ بەر هۆکارێن سەقای یێن تووشی گەلەك دەرز و هەرفینا بووی، هەر وەسان ژ بەر ئاڤ و لەهیيان هندە تەخێن خیزی یێن ل سەر خرڤەبووین و گیا یێن ل سەر شین بووین (وێنە٤) . کو ئەڤە بووینە ئەگەر هندە شەنگستێن ژێری بن ئاخ ببن و ببنە جهێ مەترسیێ بۆ وان کەسێن ل سەر دەرباز دبن، لەوما حوکمەتێ پرەکا نوییا چیمەنتویێ ل نێزیکی وێ دروستکر[٧].

ئەڤ پرە گەلەك وەکی قەنتەرکا قۆجایە و دبیت دیرۆکا ئاڤاکرنا وێ هەر ڤەدگەریتە وێ دیرۆکا ئەو قەنتەرك لێ ئاڤاکری. هەژیبە بێژین گشت ئەڤ قەنتەرکێن مە ئاماژەپێدابن وەکی شوینوار ل رۆژناما (الوقائع العراقیة) نەهاتینە راگەهاندن و ئەم نزانین ژ بەر چ هۆ .

**(وێنەیێ ٤) قەنتەرا مەزن یا پرا کلیا**



## ب - پرا کەلیا

ئەڤ پرە دکەڤیتە دویراتییا (١٧کم) ژ رۆژهەلاتی بازێرێ ئامێدیێ ل داویا باشووری (گەلیێ رەشافا)، ب دویراتییا (٢کم) ژ ناڤەندا ناحیا دێرەلۆکێ (نەخشێ ١)، ل سەر رووبارێ زێیی مەزن[٨]هاتییە دروستکرن و چیایێ لینکی ژ لایێ رۆژهەلاتیڤە و کومتەکێ زنجیرە چیایێ مەتینی د کەڤیتە هنداڤ.

ئەڤ پرە دهێتە هەژمارتن ژ پرێن شوینوارێن کەڤن[٩]و گرنگییەکا مەزن هەبوو کو هەمی دەڤەرێن رۆژهەلات و باکوورێ رۆژهەلاتێ ئامێدیێ (دەڤەرێن زێبار و بارزان و رێکان) پێکڤە گرێددان، ژ بلی کۆمەکا مەزنا گوندان کو دکەڤنە رۆژهەلاتێ زێیێ مەزن ل رۆژهەلاتێ دەڤەرا (رەشافا) کو ب دەڤەرا ئامێدیێ ڤە دهاتنە گرێدان کو وی دەمی ناڤەندا میرگەها بادینان بوو، گەلەك ژ هۆزێن کۆچەر دەمێ ل هاڤینان دچوونە چیا و ل ئاڤ و چەروانان د گەریان ب تەرش و کەوال ڤە ل سەر ڤێ پرێ دەرباز دبوون و ل زڤستانان جارەکادی ل سەر دزڤرینەڤە، ژ بلی کو ئەڤ پرە ب درێژاهییا چاخان بۆ کارێن بازرگانی و لەشکەری هاتییە بکارهینان .

ناڤێ پرێ یێ ژ ناڤێ گوندێ (کەلیا - نهو نەمایە وەکی گوند) کو دکەتە نێزیکی وێ ل لایێ راستێ ژ رووبارێ زێی یێ هاتییە وەرگرتن .

درێژاهییا ڤێ پرێ (٥٠م) و پانییا وێ دناڤبەرا (٣- ٣,٣٠م) و دهێتە دیتن کو پر ب هێلەکا راست نەهاتییە دروستکرن لێ پیچەکا خوارێ د ئاراستەیا وێ دا بەرەڤ باشوورو پاش بەرەڤ رۆژئاڤا بۆ لایێ دی یێ ئاڤێ ڤە دچیت و ئەگەرێ چێکرنا وێ ب ڤی شێوەی دزڤریتەڤە سروشتێ پێکهاتەیێن وان کەڤرێن پر ل سەر ئاڤاکرین و شەهرەزایێن ئاڤاکرنا وێ پرێ ئەو پێکهاتەیێن ب هێزێن کەڤرین ب دەلیڤە دیتین کو مینا شەنگستا بن و ئەو پر پالپشتیێ ل سەر بکەت، و ئەو ب پارچێن بەرێن حەلانێن برێ یێن جۆرا و جۆر هاتینە ئاڤاکرن، دگەل بکارهینانا گێچێ دا خۆ پێکڤە گرێبدەن .

پر پێکهاتییە ژ پێنچ قەنتەرکان و پێنچ پالپشتان ژ بلی هندە دیواران و ژ وان قەنتەرکان ب تنێ دو ژێ مانە و یێن دی یێن کەتین و چ ژێ نەمانە و نهو دێ سالۆخەتا وی ژ لایێ رۆژهەلاتی بۆ لایێ رۆژاڤایی کەین .

پر ب دیوارەکێ مەزن کو درێژاهییا وی دگەهیتە (١٠,٢٠م) و پانییا وی (٣,١٠م) دەست پێدکەت و ب دنگێ ئێکێ ڤە یێ گرێدایە و ئەوی دیواری قەنتەرکەکا بچویك یاهەی کو کڤانەکێ بازنەیی دناڤدا هەیە، بلنداهییا وی هەر بلنداهییا قەنتەرکێیە کو دبیتە (٢,١٠م) و پانییا دەرگەهێ قەنتەرکێ (٢,٥٠م) و بیاڤ د ناڤبەرا سەرێ کڤانی و لێڤا سەری ژ بانێ پرێ (١,٤٠م)[١٠]. پشتی دیواری دنگێ ئێکێ دهێت کو درێژاهییا وێ (٣,٣٥م) و بلنداهییا ئەڤ پارچا مایی ژێ نێزیکی (٣,٧٠م) و ل سەر ئاستێ درێژاهییا دیوارێ مە

(نەخشێ ٥) یێ
پراکەلیا رووێ باکورێ پرێ



رووێ باكورى يێ پرا كەليا



ئاماژە پێ کری هاتییە ئاڤاکرن (نەخشێ/٥)، روویێ پشتێ ژ ڤێ پالپشتێ کو ل بەرامبەری تەوژمێن ئاڤا رووبارییە ب رەنگێ سێگۆشەکا تیژ هاتییە دروستکرن، درێژاهیا هەر لایەکێ وێ یێ رەخی(٢-٢,٢٠م)(نەخشێ /٦) ئارمانج ژ ڤی رەنگێ ئاڤاکرنێ ئەوە دا فشارا ئاڤێ ل سەر دنگان سست بکەت و دەمێ تەوژمێن ئاڤێ د هێن دێ ڤ سەرێ تیژێ دنگان کەڤیت و ب هێز و فشارەکا سستر دێ دبەر هەردو رەخانرا چیت و ئەڤ شێوازێ ئاڤاهی د ناڤ گەلەك پراندا هەیە، کو دیرۆکا وان ڤەدگەرێتەڤە چەرخێن جودا ل حەزەر[11] و بازێرێ بەلەد(ئەسکی مووسل)[12] و پرا جزیرا بۆتان[13](شکل / ١) و پرا عەباسی ل زاخو و گەلەك پرێن دی دگەل هەبوونا هندەك جیاوازیێن سڤك، کو پیبەکێ کڤانا قەنتەرکا مەزن یێ ل سەر رەخەکێ دنگەی .

قەنتەرکا مەزن تاکە نموونەیە ژ قەنتەرکێن

پرا جزیرا بوتان



ژ پەرتووکا برویسر، المباني الاثرية في شمال بلاد الارافدين

پرا دەلال



ژ پەرتووکا برویسر، المباني الاثرية في شمال بلاد الارافدين

مەزنێن پرێ كو ژێ ماین، یا پێكهاتییە ژ كڤانەكێ نیڤ بازنەیی، بلنداهیا وی ژ ئاستێ ئەردێ نهو (٧م) و پانیا دەرگەهێ قەنتەركێ (٦,٥٠م) و بیاڤ د ناڤبەرا سەرێ كڤانی و ئەوا مای ژ لێڤا سەری ژ بانێ پرێ (٧٠سم) و هەردو ڕوویێن كڤانی ژ هەردو رەخێن باكوور و باشوورڤە ژ بەرێن مەزنێن بری هاتینە چێكرن كریارا ڤەكرن و گرێدانێ (الحل و الشد) د ئاڤاكرنا وێ دا گرتییە بەر (وێنە / ٤).

پارچێن دی یێن د ناڤ كڤانی دا تا رادەكی ب پارچێن بەری یێن بچویكتر هاتینەدانان مینا كەلپیچان ئێك ل سەر ئێكی هاتینە بكارهینان و ئەم ب دروستی نزانین ئەگەرێ چێكرنا وان ب وی رەنگی چیە و بۆ ژ ناڤدا ب بەرێن مەزنێن حەلانێ بری مینا ئەوێن ل بازێرێ (ئەسكی مووسل) و پرا جزیرا بۆتان و پرا زاخۆ دهێنە دیتن نەهاتینە چێكرن و ئەم ب دویر نزانین كو لایەنێ ئابووری و گەلەك مەزاختن بۆ ب دەستڤە ئینانا بەرا و برینا وان و ئاڤاكرنێ ئەگەرێ ڤێ چەندێ بیت (وێنە / ٥).

دناڤ ڤێ كڤانێ دا سێ كولینكێن گرتیێن چوارگۆشە ب درێژاهیا (٢٥×٢٨سم) ل هەردو لایێن كڤانی دهێنە دیتن و دبیت ئارمانج ژێ ئەو بیت دا ستوینێن داری یێن مەزن تێدا موكم بكەن دا هاریكاریا ئاڤاكەری بكەت ژبۆ دانانا پارچێن سەری ژ كڤانی و مە ل برێن بەری ڤێ ئاماژە یا ب ڤێ چەندێ دای.

دنگێ دووێ كو پێیەكێ كڤانێ قەنتەركا دووێ (یێ مەزن) دكەڤیتە سەر رەخەكێ وێ، شێوازێ نەخش و ئاڤاكرنا وێ هەر مینا دنگێ ئێكێ یە، لێ ب قەبارێ خۆ مەزنترە و درێژاهیا ڕوویێ وێ كو د كەڤیتە هنداڤی لایێ باشوورڤە (٤,٥٠) و یێ دكەڤیتە هنداڤی لایێ باكوورڤە كو یێ سێگۆشە و دەركەتییە، هەردو لایێن وێ ئێك ب درێژاهیا (٤م) و یا دی (٣م) و یا مایی ژ بلنداهیا دنگەی (٥م).

قەنتەركا سێێ یا هەرفتییە و دبیت شێواز و نەخشێ ئاڤاكرنا وێ هەر مینا قەنتەركا دووێ بیت لێ تا رادەكێ پانیا دەرگەهێ وێ فرەهترە و د گەهیتە (٧م)، و ل پشت قەنتەركا ناڤبری دنگێ سێێ یێ پرێ دهێت و دیزاینێن ئاڤاكرنا وێ ژێ هەر مینا دنگێ دووێ یە، و دەربارەی درێژاهیا ڕوویێ وێ یێ راست كو د كەڤیتە هنداڤی رەخێ باكوورڤە هەردو لایەنێن وێ كو ل سێگۆشەكا تیژ ڤێك دكەڤن ب درێژاهیێن (٨,٤٥م) و یێ دووێ یێ راست نینە لێ پیچەكا خوارێ ل ناڤەراستا وێ بۆ لایێ رۆژئاڤا ب درێژاهیا (٧,٢٥م) یا هەی و یێ مایی ژ بنكێ وێ ژێ ب بلنداهیا (٥,٢٠م).

دناڤبەرا دنگێ سێێ و یێ چوارێ دا قەنتەركا چوارێ هەبوو كو چ ژێ نەمای و پانیا دەرگەهێ وێ (٣,٤٠م)[14].

هندیكە دنگێ چوارێ یە هەر مینا دنگێن دی یە لێ ب قەبارێ خۆ مەزنترە و درێژاهیا ڕوویێ وێ یێ راست كو د كەڤیتە هنداڤی رەخێ باشوورڤە (٦,٨٠م) و درێژاهیا هەردو لایێن رەخی كو د كەڤنە بەرامبەری ئێك (٤,٤٠م) ل ناڤەراستێ و ئەڤ رەنگێ سێگۆشی ژ رەخێ پشتێڤە یێ پێكهاتییە ژ دو لایان هەردو ل گۆشەكەكا تیژ د گەهنە ئێك، ئێك ژ وان ب درێژاهیا (٥,٦٠م) و یێ دی (٤,٦١م). هەژی گۆتنێ یە كو پشكا سەری ژ رەخێ رۆژئاڤایێ دنگەی یێ ب نەخشەكێ دیار خەملاندییە كو یێك هاتییە ژ مارەكێ مەزن[15] (وێنە/٥)، و ئەم پتر وەسان بۆ دچین كو پرا كەلیا ژ وان پرێن دیار و بەرچاڤە و دبیت ئاڤاكەرێ پرێ ئەڤ پەیكەرێ ماری یێ ل سەر دنگەكی دروستكری دا چاڤێن حەسید و زكرەشان ژ پرێ دویربێخن[16].

(وێنەیێ ٥)



(وێنەیێ ٦)



پشكەكا ئاڤاهیێ ئالیێ رۆژئاڤایێ پرا كەلیا

قەنتەركا داویێ دكەڤیتە پشت دنگێ مە ل سەری ئاماژە پێكری و ئەو ژی یا هەرفتییە و پانییا دەرگەهێ وێ تا رادەكی ژ قەنتەركا دووێ بەرفرەهترە و دبیت دنگەك و قەنتەركەكا دی هەبیت چونكی تا نهو شوینوارێن وێ ل بەرچاڤ د دیارن و ژ بەر مەترسیێن جهی و ئاڤا ب هێز و ب لەز كو دهێتە د ناڤ كەڤراندا ب زەحمەتە مرۆڤ خۆ نێزیك بكەت لەوما ئەم نەشیاین پانی و درێژیێن وان ب دروستی بزانین[١٧].

پشكا داویێ ژ دیوارێ پرێ د كەڤیتە پەراڤا رۆژئاڤایێ رووباری، پێكهاتییە ژ گومتلەكێ مەزنێ دیوارەكی دانایتە سەر بەتەنا چیای، دنگەكێ بلند یێ ل سەر نیڤا وێ دانایە و دهێتە دیتن كو پشكێن سەری ژێ رەنگە خوارییەك بۆ لایێ رۆژهەلاتڤە یا تێدا هەی دبیت د دەمەكی دا پێپكێ كڤانەكێ مەزن ل وێ جهی ل سەر هەبوویە، هەژی ئاماژێ یە كو چوار كولینكێن گرتی ل ناڤەراستا پالپشتا بلند هەنە كو مە ئاماژە پێكریە، دو ژوان ل خوارێ هەر ئێك ژ وان یا چوارگۆشەیە و بچویكە ب قەبارێ خۆڤە، لێ هەردووێن دی د كەڤنە ژووریێ وان هەردو كولینكێن مە ئاماژە پێدای و ب رەنگ بازنەیینە و دەرگەهێ وان پیچەكێ بۆ سەری دچیت (وێنە/٦) و دبیت ئارمانج ژ وان كولینكان ئەو بیت دا ستوینێن دارێن مەزن تێدا

(وێنەیێ ٧)



پرا مەزن(دەلال) ل زاخۆ

موكم بكەن دا هاریكارییا وان بكەت بۆ ئاڤاكرنا وان كڤانان و ئەڤ چەندە د ناڤ گەلەك پرێن بچویك و مەزندا هەبوون كو قەنتەرك و كڤان ژی بخۆڤە دگرتن وەكی مە ئاماژە پێدای.

## دیرۆكا پرێ /

چ ژێدەرێن دیرۆكی ئاماژە نەداینە ڤێ پرێ، هەر وەسان چ بیرهاتنەك ل دوور وێ نەهاتینە نڤیسین كو ببا هاریكار پتر ل دووڤ بابەتی چووباین و گەهشتباینە وێ ئارمانجا مە د ڤێت كو دیرۆكا ئاڤاكرنا پرێ یە و ئەڤە حالێ پرانییا شوینوارانە ب تایبەت ل باشوورێ كوردستانێ كو دیرۆكا ئاڤاكرنا وان د ناڤ جیهانەكا بەرزەدایە.

گومان تێدا نینە كو ئەڤ پرە وەكی مە ئاماژە پێدای ژ پرێن دیرۆكیێن كەڤن و گرنگە و ئەو كریارێن ژبۆ دروستكرنا وی هاتینە كرن هەمی ل دووڤ شێوازێن زانستیێن هویر هاتییە ئەنجامدان، وەكی هەلبژارتنا جهی و نەخش و ئاڤاكرنا وێ كو هەمی بدیتنەكا ئەندازیارییا دیار هاتینە دانان و ئەم ب دویر دبینین ئەڤ كارێ هۆ یێ مەزن كو د وی دەمی دا هاتییە ئەنجامدان ب شیانێن كەسەكی یان كۆمەكا كەسان هاتبیتە كرن[١٨]، لێ ئەڤە ب شیانێن ئابووریێن مەزن بوویە و یا ئەم دبینین ئەڤە ل ژێر سەرپەرشتییا والی و

(وێنەیێ ٨)
پرا باژێرێ بەلەد



سولتانانڤە هاتییە دروستکرن، و یا ئەم دبینین کو دبیت نڤیسین ل سەرڤەنتەرکەکێ یان پالپشتەکێ هەبوویە ب تایبەت ئەوێن ل نێزیکی لێڤا رووباری، لێ دگەل هەرفینا وان پارچان ئەو ژی یا دگەل چووی، هەر چەوان بیت شێوازێ نەخشەو ئاڤاکرنا پرێ کو بابەتێ ڤەکۆلینێ یە تا رادەکێ مەزن مینا هندە پرانە وەکی پرا زاخۆ (وێنە / ٧) و بلد (ئەسکی مووسل) (وێنە ٨/) و پرا جزیرا بۆتان کو ژ کۆمەکا ڤەنتەرکێن مەزن

(وێنەیێ ٩)



دنگێن پرا کەلیا یێن بەرامبەر تەوژما ئاڤێ

(اسکی موصل)(نەخشەیێ ١)




و بچویك پێکهاتییە و کڤانێن نیڤ بازنەیی یان یێن مینا هێکان بخۆڤە دگریت، دگەل چەند پالپشتێن ب ڤەبارەیێن جودا، کو ئەڤ لایێ بەرامبەری تەوژمێن ئاڤێ ب رەنگەکێ سێگۆشە مینا سەرێ تیرێ هاتینە دروستکرن دا فشار ئاڤێ ل سەر پالپشتا سست بکەت و بەرێ ئاڤێ ڤەگوهێزیتە دو رەخانڤە (وێنە / ٩). لایەنێن پشتێ ژ پرێ ب رەنگەکێ نیڤ لۆلەیی یان پیچەکێ تیژ هاتینە دروستکرن[١٩]. ل دووڤ ڤان رۆناهیێن مە بەردانە سەر ڤی بابەتی ئەم پتر وەسان بۆ دچین کو دیرۆکا ڤێ پرێ ڤەگەریتەڤە سەدێ شەشێ یان یێ حەفتێ مشەختی .

## ج- پرا بلبل

دکەڤیتە ژوورێ رووبارێ زێیێ ل نك سنوورێن عیراق و ترکیا، گوندێن (هەلوە) و (چەمێ دێرکێ) دکەڤنە رۆژئاڤایێ وێ ، و گوندێ (بێتکار) ل رۆژهەلاتی وێ و ئەڤ پرە دەڤەرێن بەرواری ژوورێ د گەل دەڤەرێن نێرەو رێکان و چەلێ گرێددەت، (نەخشە / ١). ب دروستی ئەم نزانین کا ناڤێ پرا بلبل ژ کویرێ هاتییە.

درێژاهیا پرێ پترە ژ (١٠٠م) و پانیا وێ (٣م) و بلنداهیا وێ ژ بلندترین خال ژ رووباری (١٠,٥٠م) پێکهاتییە ژ پێنج ستوونێن مەزن لێ یێ ڤالایە ژ ڤەنتەرکان، و پالپشتێن وێ ب رەنگەکێ لۆلەیی ب

(وێنەیێ ١٠)



یەك ژ دنگێن پرا کەلیا

پارچێن بەرا و گێچێ هاتینە دروستکرن، سێ ژ وان ستوونێن ب درێژاهیا سالێ د ناڤ ئاڤێ دانە، لێ هەردووێن دی د کەڤنە بەر لێڤا ئاڤێ و دهێتەدیتن کو تیرا پالپشتان ژ لایێ ژێری تا رادەکێ مەزنترە ژ لایێ ژووری و پالپشتا ناڤین (یا سێ) دهێتە هەژمارتن مەزنترین پالپشت[٢٠] و بیاڤ د ناڤبەرا پالپشتاندا ژ (١٠- ١٥م) ، (وێنە / ١٠) . ل سەر رێکا ئاڤاکرنا پرێ ژی ل بەراهیێ ژمارەکا مەزنا ستوینێن داری کو د هندە جاراندا ژ گوندێ (بیادرێ) ل باکوورێ کوردستانێ درێکا ئاڤێ دا هینانە جهێ پرێ بەرهەڤدکرن، یان هندە جاران ژ گوندێ (سەردەشت) ێ کو د کەڤیتە دویراتییا (٤کم) ژ باشوورێ پرێ کو ب وەریسان گرێددان و بەرەڤ باکوور و دژی تەوژمێن ئاڤێ رادکێشان و دهینانە وی جهی و ئەڤە کارەکێ گران بوو و چەند رۆژ ڤەدکێشان و دەمێ ئەو دار د هەلبژارتن تا رادەکێ باشترین دار بوون ژ لایێ هێزێ و موکمیێ و درێژیێ ڤە و درێژاهییا هندەکان د گەهشتنە (١٠م). د کریارا ئاڤاکرنا پرێ ژی دا سێ ستوین ددانانە سەر پالپشتا ئێکێ پاشی درێژ دکرن تا د گەهشتنە پالپشتا دووێ و دبیت ب وەریسان یان ب دارێن کورت کو ب رەنگەکێ بەرواری (پانی) دادنان و پێکڤە گرێددان، ل دووڤدا ب پارچێن بەراو گێچێ ل سەر ئاڤادکرن، پشتی هشك دبوون و پێکڤە د نیسیان سێ ستوینێن دی ب درێژاهی دادنانە سەر ستوینێن بەری هینگێ و وەسان ب ڤی رەنگی پشکێن پرێ پێکڤە د هاتنە گرێدان[٢١].

قۆناغا دووڤدا یا چێکرنا پرێ ب رێزکرنا پارچێن دارایە ب رەنگەکێ بەرواری ل سەر رویێ ستوینێن داری، ئارمانج ژێ راستکرنا رێکا پرێ بە دا کاروانێن بازرگان و رێبواران بێ ترس و وەستیان ل سەر دەربازببن و بۆ پتر پشتراستکرن رەخێن وێ ژ داری و وەریسان (درابزین) (مینا پەرجانان – تانان)[٢٢] ب درێژاهییا پرێ یێن بۆ چێکرین دا کەس نەکەڤیتە د ئاڤێ دا (وێنە /١١) .

ل لایێ ژووری ژ پالپشتا ناڤین هندە کولینکێن بازنەیێن بچویك و گرتی کو بەرێ سەمتا وان ڤەبوونا پیچەك بەرەڤ سەری ڤە دچن و دبیت دا دارێن بچویك کربانە تێدا کو ستوینێن مەزن د کەتنە سەر کو ئەو ژی ل سەر بنکەکێ بوون .

پر ژ بەر ئاڤێ و لەهیان پتر ژ جارەکێ یا تووشی کەتن و هەرفینێ بووی کو ستوینێن وان یێن داری ژێکڤەدکرن و د شکاندن و دویردئێخستنە جهێن دویر و جارەکادی ژ لایێ هندە مرۆڤانڤە ژ خەلکێن وان گوندێن نێزیك کو شەهرەزایی دڤی بواری دا هەبوون نویژەن دکرنەڤە . دیسان ئەو ستوینێن داری ل سالێن پێنجییان ژ سەدێ بووری ژ لایێ هندە کەسێن نەنیاس ڤە یێن تووشی سۆتنێ بووین و خەلکێ گوندێن دەڤەرا بەرواری ژووریێ و دەڤەرا چەلێ یێن رابووین ب چێکرنا ئەو جهێن زیان ڤێ کەتین .

هەژی ئاماژێ یە هندە ڤەکۆلەر دبێژن ڤان هەر پێنج پالپشتێن بەری ناڤین خۆ یێن تایبەت هەبوون کو ژ لایێ رۆژهەلاتی بۆ لایێ رۆژئاڤایی ڤە ئەڤ ناڤەبوون ل دووڤ ئێك (دێمك، زراڤك، مام شام، مامزدین، دێمك) و دبیت ئەڤە ناڤێن وان هۆستایان

بن یێن ئەڤ پالپشتە ئاڤاکرین[٢٣].

ل سەر دیرۆکا ئاڤاکرنا ڤێ پرێ ژی مینا هەمی پران ناڤێ وێ د چ ژێدەرێن دیرۆکی دا نەهاتییە و کەسێ بیرهاتنێن خۆدا ئاماژە پێ نەکرییە تنێ ئاماژەك ژ لایێ گەڕۆك (هنری لایارد)[٢٤] ڤە یا هاتی کو ئەو یێ ل سالا (١٨٤٥ز) ل سەر ڤێ پرێ بەرەڤ گوندێن (رائۆلێ، کێستی، بێریچێ) دەرباز بووی، لێ هەر چەوان بیت دیرۆکا وێ گەلەك ژ وێ چەندێ کەڤنترە ودبیت ڤەدگەریێتەڤە دەمێ سولتان حسێن وەلی ل سەدسالییا دەهێ مش/ شازدێ . ز .[٢٥]

## ژێدەر پەراوێز

١. قەنتەرك: ژ وان ئاڤاهیيانە کو ل سەر جۆك و رووباران د هێنەدروستکرن و رەنگە گرێدانەك یا دگەل پرۆژێن ئاڤدانێ و چاندنێ هەی.
السعدی، عنان عبدالله: القناطر والجسور فی العراق فی ضوء دراسة قنطرة حربی، رسالة ماجستیر غیر منشورة مقدمة الی مجلس کلیة الاداب، جامعة بغداد (بغداد، ١٩٩٠ م)، ص ١٣.

٢. الراوی، فاروق ناصر: التعبئة واسالیب القتال فی الجیش الاشوری، موسوعة الجیش والسلاح، مطبعة الحریة (بغداد، ١٩٨٨م)، ج ٢، ص ١٣٧.

٣. ڤەکۆلینەکا مەیدانی، هەژی گۆتنێ یە کو ل ڤان داوییان پرەکا نوی یا کونکریتی هاتەئاڤاکرن و رێکا ترومبێل و رێبواران هاتە ڤەگوهاستن بۆ سەر پرا نوو و ڤێ چەندێ ژی بێگومان مفایەك گەهاندە قەنتەرکا قۆجا ئەوا پێدڤی ب سەخبێریکرن و نویژەنکرنێ. (ڤەکۆلەر).

٤. کتانی: حەمکێ توڤی، بث ٦٣؛ لێ بەهرام پاشا کو دبێژنێ(بایرام خان) کورێ مەزنێ سولتان حسێن وەلی بوو، ل سالا (٩٤٥مش/١٥٣٨ز) ژ دایکبوویە و کاروبارێن بادینان ل سالا (٩٨٤مش/١٥٣٨ز) کەتینە دەست و ل سالا ٩٩٣مش/١٥٨٥ز) حوکم ب جهـ هێلایە. بنێرە: العباسی : ژێدەرێ بەرێ، ص ص ٦١- ٦٢.

٥. ڤەکۆلینەکا مەیدانی .

٦. عیسێ دەلا: ژێدەرێن مێژوویی ئاماژە نەداینە ناڤێ بابێ وی و ئەو بخۆ ژ گوندێ (حەمکی دەلا) یی ژ هۆزا سندیان ل قەزا زاخو و هێش یێ بچویك بابێ وی هنارتە ئامێدیێ دا خزمەتا میر زبەیر پاشای کورێ سەعید خان بەگ (١١١٣- ١١٢٦ مش/ ١٧٠١- ١٧١٤ز) و کورێ وی بەهرام پاشای (١١٢٦- ١١٨٢مش/١٧١٤- ١٧٦٨ز) بکەتن و دبێژن میران گەلەك باوەری ب وی هەبوو و راوێژا خۆ ب وی د کر، چونکی خودان زانین و یێ ژیر بوو، دبێژن کو ئەو یێ ل چاخێ سولتان ئیسماعیل پاشایێ ئێکێ(١١٨٢- ١١٨٤مش/ ١٧٦٩-١٧٧٠ز) یێ مری. بنێرە : ئامێدی، محمد عبدالله: عیسێ دەلا و چەند سەرهاتی، گۆڤارا ڤەژین، هژمارا (٢٤)، (دهۆك ، ٢٠٠١ ز)، ل ٩٤. و ئەم نزانین چما ئەڤ پرە ب ناڤێ وی ڤە هاتییە ب ناڤکرن، دبیت مێژوویا پرێ گەلەك کەڤنتر بیت ژ چاخێ ژیانا وی (ڤەکۆلەر).

٧. ڤەکۆلینەکا مەیدانی .

٨. زێ مەزن: د هێتە هەژمارتن مەزنترین تایێن رووبارێ دیجلە و پشکداریێ د ٣٢،٦٤٪ ژ کۆما ئاڤا وێ یا سالانە دکەت، بنێرە، خلف، جاسم محمد : محاضرات فی جغرافیة العراق الطبیعیة والاقتصادیة والبشریة (القاهرة، ١٩٥٩م)، ص ١٧٧؛ ژ چیایێن دەڤەرا هەکاری ل باکوورێ کوردستانا ڤەدزێت و دهێنە د ناڤ ئاخا هەرێمێ دا ل نك گوندێ (چەلێ) باکوورێ باژێرێ ئامێدیێ ب نێزیکی(٢٠کم)، و سەمتا باشووری و باشوورێ رۆژهەلات دگریت دا ببیتە سنوورەکێ ناڤبر د ناڤبەرا هەردو ناحیێن (نێروە و رێکان) و (بەرواری بالا) تا گوندێ(زێە)، و پاشی سنوورەکێ ناڤبر د ناڤبەرا (نێروەورێکان) و دەڤەرا ئامێدیێ دناڤبەرا هەردو گوندێن (زێوە) و (رەشاڤا). رووبار د ڤی لایدا دهێت تا ناحیا دێرەلۆك د ناڤ دەڤەرەکا چیاییا ئاسێ و دۆلێن کویر، پشتی ژ ناحیا دێرەلۆك دەرباز دبیت رووبارێ سپنە ژ لایێ رۆژهەلاتیڤە د گەهیتێ و بەرێ ئاڤێ د کەڤیتە رۆژهەلات و باشوورێ رۆژهەلاتێ دگەل (دەشتا زێ)، و ل لایێن باشوورێ رۆژهەلاتی ژ ڤێ دەشتێ رووبارێ وێ یێ سەرەکی رویێ شین دگەهیتێ و تا ڤێ خالێ درێژاهیيا وی د بیتە نێزیکی (٥٠کم) و پشتی ژ سنوورێ قەزا ئامێدیێ دەردکەڤیت دناڤبەرا دەڤەرێن بارزان و نەهلە هەر دچیت . بنێرە، هروری : جغرافیة مدینة ئامیدی، ص ١٩ .

٩. شوینواریا ڤێ پرێ ل رۆژناما (الوقائع العراقیة)، ژمارە (٣١٩٩) رێکەفتی ١٩٥٢/١٢/٢٢ ز هاتییە راگەهاندن.

١٠. ڤەکۆلیەکا مەیدانی .
١١. انریه، فالتر: وادی الثرثار وجسرة، ترجمة عبدالرزاق كامل ذنون، مجلة سومر (بغداد، ١٩٨٩م)، ص٢٩ شكل(٥).
١٢. الزبيدي، كاظم محمد كاطع : مشروع انقاذ آثار حوض سد بادوش لسنة ١٩٩٤م، تقرير اولى عن اعمال التنقيبات فى جسر مدينة بلد (اسكي موصل)، ص ١٧.
١٣. برويسر: المبانى الاثرية فى شمال بلاد وادى الرافدين، ص ٤٤، اللوح ٣٣؛ پ ژ لایێ وەزیر محەمەد کورێ عەلی ئاڤدار ب ابی المنصور، وەزیرێ ئەتابەگیێ زەنکی ل مووسل کو ل سالا (٥٥٩مش/١١٦٣ز) وەغەر کری هاتییە ئاڤاکرن، کو پشکەك ژ وی دراڤیێ وەك (خەراج) ژ خودان مۆچان وەردگرت ل کارێن ئاڤاکرنێ ژوانان پرێن ژ بەرا دروستکری و ب ئاسنی قایمکرن د مەزاختن، بنیرە، ابو شامة، شهاب الدين ابى محمد عبدالرحمن بن اسماعيل المقدسى الشافعى: الروضتين فى اخبار الدولتين النورية والصلاحية، تحقيق محمد حلمى احمد و محمد مصطفى زيادة (القاهرة، ١٩٦٢) ، ج١، ق٢ ، ص ٣٥١.
١٤. ڤەکۆلینەکا مەیدانی .
١٥. وێنێ ماری د چاخ و جهێن جودا دا هەر دگەل هۆنەرێن مرۆڤی دا بوویە و ئەڤ وێنەیە دناڤ هۆنەرێن پێشی ئیسلامێ ل عیراق و مسرێ هاتینە دیتن، و مەبەست ژێ دناڤ پتریا وان هۆنەران دەربرینێن جەڤەنگی یێن تایبەت بووینە و دناڤ هۆنەرێ گریکی دا هاتییە دیتن و پاشی د ناڤ هۆنەرێ یونانی و رۆمانی و عیلامی و حتی دا هاتییە دیتن. (الجمعة : الاثار الرخامية، ص ١٣٣- ١٣٤)؛ د هۆنەرێ کەنعانی دا (موسكاتي : الحضارات السامية، ص ١٧٤، لوحة ١٣)؛ و یێ ساسانی (كرستينس: ايران فى عهد الساسانيين، ص ١٦٦) ؛ ل سەردەمێ ئیسلامی دچاخێ ئەمەویاندا دناڤ وێنێن دیواری دا ل(قصر الحير الغربي) الباشا، حسن: التصوير الاسلامى فى العصور الوسطى (مكتبة النهضة المصرية (القاهرة، ١٩٥٩م) ، ص ١٦٢) ،و هندەك وەسان دبین کو هەبوونا ماری دناڤ دەستنڤیسین (الترياق) دا ل چەرخێ ئیسلامی ئەوە کو د وێ باوەریێ دا بوون کو مار دێ وان ژ شەروخرابیان دویرئێخیت (الجادر : المخطوطات العراقية المرسومة فى العصر العباسى، ص ٤٧ .
١٦. ڤەکۆلەر .
١٧. ڤەکۆلینەکا مەیدانی .
١٨. ڤەکۆلەرەك ئاخفتنەکا نێزیکی ئاشۆپێ ڤەدگێریت کو کەسەکێ ب ناڤێ(محەمەد بەگێ ساگی) ئەڤ پرە یا ئاڤاکری بێی چ پێزانینان ل سەر کەسایەتیا وی مرۆڤی و مێژوویا دروستکرنا وی ب دەتە مە، بۆ پتر پێزانینان بنێرە: گۆڤارا رەنگین، هژمارا (١٨)، بغداد ، ١٩٨٩ ز)، ل ٣٩.
١٩. ڤەکۆلینەکا مەیدانی .
٢٠. ڤەکۆلینەکا مەیدانی .
٢١. ئەدنی، احمد : پرا (جسر) بلبل . Htt:www.amyade@yahoo.com ٢٠٠٧/٩/٢١
٢٢. درابزين: پەیڤەکا فارسییە، مەبەست ژێ ئەو پەرژانن کو ددانە سەر هەردو رەخین پرێ دا خەلکی ژ کەتنێ ب پارێزن. بنێرە: بشاد، محمد باد شاه متخلص: فرهنگ انندراج (تهران، ١٣٣٦ه) ج ٣، ص ١٧٧١ .
٢٣. ئەدنی، احمد: پرا (جسر) بلبل. Htt:www.amyade@yahoo.com ٢٠٠٧/٩/٢١ ئەم ڤێ بیرۆکێ ب دویر دزانین چونکی هەمی پالپشت ب ئێك دیزاین هاتینە ئاڤاکرن و ئەڤ رەنگە پالپشتە سەربۆرو شەهرەزایی پێ دڤێت و نە ل دووڤ شەهرەزایا کەسەکی وەکی ئەو دزانیت هێتە ئاڤاکرن .
٢٤. ڤەگەرە ......... ص ١٢، پەراوێز (٥).
٢٥. تا نهو شوینواربوونا ڤێ جهی د رۆژناما الوقائع العراقيه نەهاتییە راگەهاندن

# دۆمنیکان و کارتێکرنا وان د گهۆرینا نەخشا ئۆلزایی یا مەسیحیێن دەڤەرا ئامێدیێ دا


**پ.د. فەرسەت مەرعی**

**زانکۆیا زاخۆ- کولیژا زانستێن مرۆڤایەتی**

**وەرگێران: هشیار رێکانێ**


## پێشگۆتن:

ل دوماهییا چەرخێ ئێکێ و دەستپێکا چەرخێ دووێ ئایینێ مەسیحی گەهشتە وەلاتێ کوردان ل دووڤ دیتنا کەنیسێ، لێ ل دووڤ دیتنا رۆژهەلاتناس و زانایێن رۆژئاڤایێن تایبەتمەند ب سریانانڤە ل دەستپێکا چەرخێ سیێ.

ئەو کەسێن چووینە ناڤ ئۆلێ مەسیحییان ژ جوهیێن ل کوردستانێ دژیان یان ژ کوردان یان ژ نەتەوێن دی ئوسقۆفان سەرۆکاتییا وان دکر و ب بازێرێ ئەنتاکیە ڤە گرێدان، لێ گرێدانێن وان دگەلێك نە ل سەر ئاستێ سەرۆکاتییا کەنیسێ بوو، و چ تشتێ هاتییە گۆتن ل سەر رۆلێ کەنیسا (سالیڤ یا مەداین)، ب تنێ ئەو پەیوەندی ل سەر ئاستێ ڤیانا مەسیحی و ئێکەتییا باوەریێ بوو. و هەر ئێك ژڤان کۆمەلێن مەسیحییان خودان سەربەخۆیی بوون هەتا رادەکێ دگەل کۆمەلەکا دی یا مەسیحییان.

پەیدابوونا ئۆلێ مەسیحییان دسەقایێ هلنستیدا یێ کۆ رەوشەنبیریا ئەفریقی ل سەر وەلاتێن رۆژهەلاتێ زال و ژ وانا (مصر) یێ کاریگەر بوو دگەل رەوشەنبیریا وەك میرات بۆ مایی، ئەڤێ هەمیێ باندۆرەکا مەزن ل سەر کارتێکرنا دناڤبەرا باوەریێ و فەلسەفێدا هەبوو، یێ کو ئۆلێ مەسیحییان وەك خۆ هیلای، کۆ ژ باوەریەکا سادە بەرەڤ لاهۆتییا ئالۆزڤە بری، و ژ ئەگەرێ وێ چەندێ گەلەك ئۆلزا (ئایینزا- مەزهەب) و گەلەك دیتن پەیدابوون، ئەڤە هەمی دبوو بزاڤا سڤکاتی پێکرنێ ل سەر سرۆشتێ پەیوەندیێن دناڤبەرا خودێ و مەسیح دا، یان دناڤبەرا باب و کوری دا، و د قۆناغەکا دیدا سڤکاتی پێکرن ل سەر سرۆشتێ پەیوەندیێ دناڤبەرا باب و کوری و رۆحا پیرۆز دا.

ب ئەگەرا ڤێ چەندێ د ئۆلێ مەسیحییاندا گەلەك کۆم و ئۆلزا پەیدابوون و ل دووڤ رێزبەندییا دیرۆکی دێ ب ناڤودەنگترین وان کۆم و ئۆلزایان دیار کەین:

**١ - غنوصی،** ئەون ئەوێن دبێژن کو یەسوٚع مرۆڤە و دمریت و وەحیا بۆ هاتی، ئانکۆ یەسوٚع نە خودێ یە، و هندەك ژ وان دبێژن کۆ مەسیح نەهاتییە خاچدان.

**٢ - جوهیێن مەسیحی،**ئەو ژی کۆمەلەکا خویندکارێن بچویکن ئەوێن پشتی مەسیح مایی، کو مللەتەکێ جوهیان پێکئینا و ئۆلێ پەرستگەهێ پراکتیزە دکر و پێزانینێن وێ ژ بەرکرن، دەما وەپە نی یان بێن نەعیبرانی(جوهی) دهاتنە دگەل واندا دا سیستەمەکی بۆ وان پێشنیاز کەن و ل دووڤ وی سیستەمی دا کۆمبەستا قودسی (مجمع القدس) یاکو ل سالا ٤٩ێ زایینی هاتییە بەستن حەلالکەن کو مەرجێ وێ سونەتکرن بوو (ختان) و ب جهئینانا ستوینێن ئۆلێ جوهیان، و گەلەك جوهیێن مەسیحی رەددا ڤێ خۆ ب دەستڤەدانێ و دابەزینێ کر و ژ (پۆلص)ی جودابوون ب رویمەتیێ و خیانەتێ تاوانبارکر ژ بەر ئەگەرێ کو سونەتکرن و چاڤدێریا رۆژا شەمبی و ئۆلێ پەرستگەهێ ژ کارووبارێن سادە و بێ بهانە، بۆ زانین ئەو ژ جەوهەرێ پێزانین و زانستێ پەیاما کەڤنن (العهدالقدیم).

**٣ - مەرقیۆنی،** ئەڤە ژی ب (مەرقیۆن) هاتینە ناڤکرن، کۆ (مەرقیۆن) ئێك ژ دیارترین مەسیحیێن چەرخێ دووێ زایینی بوو.

مەرقیۆنییان بزاڤ دکر رێککرنەکێ دناڤبەرا (غنوصی - رزگــاری ب رێکا مەعریفەتێ) و مەسیحیێدا چێکەن، کەنیسەکا دی ل شوینا کەنیسا فەرمی دامەزراند، بۆ ماوەیەکێ درێژ ڤەکێشا پشتی مرنا دامەزرێنەرێ وێ ب تایبەتی ل رۆژهەلاتا دەڤەرێن بەلاڤبوونا مەسیحییێ ل ئەرمەنستان و کوردستانێ، ئەڤە ژی پشتی لەزکرنا کەنیسێ دبریاردانا هەر چوار ئنجیلاندا و بنەجهکرنا باوەریا مەسیحی یا فەرمی دشێوازێ خۆ یێ دوماهیێدا ل چەرخێ چوارێ زایینی و ب دروستی کۆمبەستا نیقیە سالا (٣٢٥ز)ێ

**٤ - ئەبیۆنی،** ئەو ژی دو پشکن، پشکا ئێکێ یەسوٚعی ددانن ب تنێ مرۆڤەکێ ئاسایی یە و یێ گەهشتیە پلەیەکا چاکسازیێ ژ کەرەما گەشەکرنا کەسایەتیا وی. یێ ژ مریەمێ و مێرێ وێ پەیدا بووی وەکی هەر زارۆکەکێ دی، یێ رژد بوو ب پێگیریا حوکمێن شەریعەتێ مووسا پێغەمبەری، ئەڤێ کۆمەلێ باوەری ب رزگار بوونێ ب رێکا مەسیح ب تنێ نەبوو، یان باوەری ئینان ب مەسیحی. مەسیح یێ ژ مریەما کچ و روحا پیرۆز پەیدابووی، لێ باوەری ب وێ چەندێ نەبوو کو یەسوٚعی بەری هینگێ ژیان هەبوو، ئانکۆ یەسوٚع نەخودێ یە و یەسوٚع نە پەیڤ و حکمەتە.

**٥ - دۆکیتی،** ئەو ژی ئەو (غنوصی)نە ئەوێن هاتینە نیاسین ب دۆکیتی، چوونە لایێ هەڤدژ ژ ئەبیونیێ، و گۆتن مەسیح نەمرۆڤە، لێ سرۆشتێ خودێنیێ هەیە، ل خواندنگەها ئەفلاتۆن فێربوویە، ل سەر رێزداریا هزرا لۆگۆس (ژیر و پەیڤ) راهاتن.

**٦ - ئاریۆسی،** ئەڤ ئۆلزایە ب ئاریۆسێ لیبی هاتییە ناڤکرن، کو ئاریۆس بەرپرسێ کەنیسەکا ئەسکەندەریێ بوو، ب ناڤێ کەنیسا بۆکالیس. و ل بەردەستێ لۆقیانۆسێ ئەنتاکی خووندکار بوو، یێ کو خودێیاتیا مەسیحی رەدکر، یێ هەڤدژ بوو دگەل پێزانینێن پۆلص یێ کو یەکەمین کەس بانگەوازیا خودایەتیا مەسیحی دای. ئاریۆس ژ لایەکێڤە کەسەکێ کرستیانێ ئەرتۆزکسی یە، هەرتەڤە ل سەر باوەریا مەسیحی ب درێژیا دەهـ چەرخان ژ دیرۆکا وێ مەترسیبوو، ناکۆکیا ئاریۆس دگەل کەنیسێ ل سەر پەیڤەکێ ب تنێ بوو، کۆ ئەو ژی یەسوٚع مرۆڤە و دێ مریت و نە خودێ یە و نەچ تشتەکێ دی ب چ واتایان، ب تنێ فێرکەرە و وەحیا بۆ هاتی.

## پەیدا بوونا رەهبانیێن کاسۆلیکی:

ل چەرخێ یازدێ زایینی ژ ئەنجامێ چاکسازێن کەنیسێ و داخــوازیــا شەرێن خاچپەرستان گەرماتییەکا ئۆلی هاتە دیتن. بزاڤا دێرێ چالاکیێن پێشچاڤ ب خۆ ڤەگرتن. و ب ناڤودەنگترین کۆمێن دێرێ ل چەرخێ سێزدێ زایینی، فرنسیسکان و دۆمنیکان بوون، دگۆتنە دووڤچوویێن وان برایان

(Friars) ژ بەر پەیوەندیێن وان یێن بەردەوام دگەل جڤاکی، و مەبەستا سەرەکی ژ پێکئینانا ڤان هەر دو کۆمان ژ ناڤبرنا کەنیسا کاسۆلیکی بوو ژ بەر ئەگەرێ ناکۆکییا دناڤبەرا پاپایەتیێ و ئیمپراتۆرییا رۆمانی یا پیرۆز و پەیدابوونا داهێنانێن ئۆلیێ (هەرتەقە) و ژ ناڤبرنا رابووراندنێ یاکو هندەك زەلامێن ئۆلی پێڤە مژویل و بۆ رکاربەرییا حەلالکرنێ ژ تیتالێن رەوشتی یێن کەڤنار و ب تایبەتی یێن ئۆلی وی دەمی ل باژێرێن تازە. کو وی دەمی چاخ ل دووڤ دیتنا قەدیس (برنراد ئۆف کلیرفۆ) ی دناڤەراستا چەرخێ دووازدێ زایینی کو دگۆت(جیهان گەهشتە چاخێ مەرگەسات و خرابکاریێ) لەورا خودان باوەران خۆ ژ چارەسەرییا وێ رەوشێ دانە پاش و پرانییا وان تەوفیقی بوون مینا (فرانسیس ئۆف ئەسیسی) و (دۆمنیك).

تشتی ب بابەتێ مەڤە گرێدای و ئەم دێ ل سەر پێناسا (دۆمنیك) کورت کەین.

## رەهبانیا دۆمنیکانی:

قەدیس دۆمنیك Domingo ل باژێرێ کالاروکامی ل هەرێما ڤشتالە یاکو دکەڤیتە باکوورێ ئسپانیا ل سالا (١١٧٠)ێ ژدایکبوویە. ل بەردەستێ مامێ خۆ یێ قەشە پەروەردە بوویە، دۆمنیك پشکداری هەوا خاچپەرستان دژی (ئەلبجنسیین)* بوویە ب رێکا گۆتار خواندنێ و شیرەتان و دەهـ سالان (١٢٠٥-١٢١٦ز)ێ ل وێرێ مایە، کۆما خۆ یاکو ب دانپێدانا پاپا (ئەندریۆسێ سییێ) ب فەرمی ل سالا (١٢١٦ز)ێ هاتە نیاسین و دۆمنیکی رۆما کرە پایتەختێ خۆ و کرە بارەگایێ پاپایەتیێ.

ل دەمێ مرنا دامەزرێنەری ل سالا (١٢١٢ز)ێ کۆمێ کارتێکرنێن مەزن هەبوون، کو ب رۆلێن گرنگ رابوو دبیاڤێن ئۆلیدا دو ژ فەیلەسوفێن مەزن ل ئەورووپا دیار بوون کو (ئەلبرتۆس ماکنۆی) و (تۆما ئەلوینای) بوون.

کۆما دۆمنیکان ل سەرانسەری جیهانێ بەلاڤ بوو، و ب تایبەتی ل ئاسیا، و ڤان دۆمنیکانیان رۆلێن ترسناك دپەیوەندیاندا دناڤبەرا پاپای و مەلکێن خاچپەرستاندا ژ لایەکیڤە وەك مخەولێ خاچپەرستان هەبوون و ژ لایەکێ دیڤە ژبۆ رزگارکرنا خاچپەرستان ل رۆژهەلاتا ئیسلامی. دیسان ژلایەك دیڤە پاپایەتیێ د دادگەهێن پشکنینێدا پشتا خۆ ب دۆمنیکان گەرمکر یێن کو ل قۆناغایێکێ بۆ شەرێ کۆمێن (هەرتەقە) پێکهاتی.

ل دووڤ دیتنا کەنیسا کاسۆلیکی کار گەهشتە وێ چەندێ کو دۆمنیکانیان خۆ وەك سەیێن خودێ (Damini Canes) د نێچیرکرنا هەرتەقەیاندا دیارکر، و بۆ پاراستنا خەلکێ مەسیحی دژی گورگێن زیانبەخش (مەهەرتقی).

## گەهشتنا پەیامبەرێن کاسۆلیکی بۆ کوردستانێ:

پەیامبەرێن کاسۆلیکی بۆ رۆژهەلاتا نێزیك ل دەستپێکا چارێکا دووێ ژ چەرخێ هەڤدێ نەگەهشتنە ئەردێ حەدباء، چونکی ئەردێ رۆژهەلاتی تا رادەیەکی یێ بەرنیاس بوو ل نك مەسیحیێن رۆژئاڤا، هەتا ئەگەر ئەو بەرنیاسین یا تاری ژی بیت، مزگینیدەران (مبەشران) ئەوێن خەلك دکرە مەسیحی ئەردێ رۆژهەلاتێ ب رێکا هندەك راپۆرتێن دیرۆکڤانێن خاچپەرێس و دەنگ و باسێن وان دنیاسی، پەیوەندی د ناڤبەرا وەلاتێن ئەوروپا و باژێرێن وەلاتێن رۆژهەلاتێ دا زڤرین و دگەل چەرخێ شازدێ ب هێزتر لێ هاتن.

تێکەها مزگینیدانێ یاکو ل چەرخێ هەڤدێ پەیدابووی ل سەر بنگەهێ چاکسازییا هەڤدز یاکو کۆمەلگەهێ تریدنتینی (١٥٤٥-١٥٦٣) گەشەکری، ئەوا کۆ پلەیا بەرپرسیارییا پاپای یا چاڤدێری و تەڤگەر ل هەمبەر مەسیحیێن نە کاسۆلیك و جوهی و مووسلمان و وەسەنیان(الوثنیین) بلندکری، چونکوو مزگینیدان بوو رێکەکا باشتر بۆ قایلکرنێ.

رویدانا کەنیسایەتیێ یا ئاشکراتر یاکو هاتیبە دامەزاندن بۆ قۆناغەکا نوی ژ کارێ پەیامبەرییا مزگینیدانێ ل رۆژهەلاتێ ئەو ژی بریارا دامەزاندنا کۆمەلگەها مزگینیدانێ ب باوەریێ بوو Tne) (College for the Propagation of the Foith

ل سالا (١٦٢٢)ێ زایینی.

پاپا (گریگوریۆسێ پازدێ) ل دۆر بریارا دامەزراندنا وێ كۆمەلگەهێ درێكا نامەیا خۆرا بۆ كرادیلان دبێژیت: (ئەركێ بلندێ پاپای هەمی كارێن گرێدای ب بابەتێ رزگاریا دەروونی ڤەدگریت، و ب پلا ئێكێ، گرنگیدان ب باوەریا كاسۆلیكی، ژ بەركو دڤێت كار ب دو ئەركان بهێتە كرن:

یا ئێكێ پاراستنا وێ باوەریێ ژ لایێ باوەردارانڤە، كۆ ئەڤ ئەركە گەلەك ب رژدی هاتە وەرگرتن هەتا هەكەر ب سزادانێ ژی بیت بۆ یێ ب جهـ نەئینیت.

یا دووێ دڤێت ل سەر نەباوەرداران ب مەسیحیەتێ ژی ژ (مووسلمان و جوهی و وەسەنی((الوثنیین)) بهێتە بەلاڤكرن، لەورا بریار هاتە دان ژ لایێ كەنیسا پیرۆزڤە كۆ دووڤچوونا دو رەفتاران بكەن:

یا ئێكێ رێكا یاسایی، كۆ ب رێكا هنارتنا دادگەها باوەریا پیرۆز.

یادووێ خودان سرۆشتەكێ مانەڤی بوو یان باشترە ئەم بێژین پەیامبەری بوو، كو پەیامبەرێن(مزگینیدەر) یێن بەردەوام ژ كاركەران (رەبەنێن خۆشك) دهنارتنە ناڤ وان گەلێن پتر پێدڤی وێ چەندێ).

ل سالا (١٦٢٢ز)ێ ئێستگەهەكا گرنگ هاتە پێكئینان بۆ پالدانا پەیامبەران بەرەڤ رۆژهەلاتێ، لێ بەلێ هنارتنا پەیامبەران نە وەكی شاندێن سنووردای و جودا جودا بوو و بۆ دەمەكێ دیار، لێ بەلێ هنارتنا پەیامبەران بۆ خۆجهیا جێگیر بوو ب پرۆژەكێ پر و چر.

رەبەنێن كبۆشی یەكەمین بوون گەهشتینە وەلاتێن رۆژهەلاتێ و كرملیيان[1] و ئوگستییان[2] و فەرەنسیكان[3] و عازەریيان[4] دا دووڤ و ل دوماهیێ برایێن گۆتار خوینێن (دۆستكییان) دا دووڤ.

## گەهشتنا پەیامبەرێن كبۆشی بۆ كوردستانێ:

رەبەنێن دۆمنیكان هەر ژ چەرخێن سێزدێ و چواردێ گەهشتنە میزۆپوتامیا (وەلاتێ ناڤبەرا دو رووباران) و كوردستانێ و پەیامبەریا خۆ دناڤبەرا نەستۆریان دا پراكتیزە كر، لێ بەلێ پشتی هینگێ دەنگو باسێن وان نەمان، دیسان شاندێن وان یێن مزگینیدانێ بۆ ئەرمەنیان هاتنە ژ ناڤبرن، ئەو ژی ل دەمێ شەر و لێكدانێن ل نیڤا ئێكێ ژ چەرخێ هەژدێ بەرپابووین، لێ پەیامبەرێن كبۆشی بەری هەمیان هاتنە عیراقێ و كوردستانێ، كبۆشیان ناڤەندەك بۆ خۆ ل سالا (١٦٣٢)ێ ل مووسل دامەزراند، و د ماوەیەكێ كورتدا شیان كاكلكێن كاسۆلیكی دناڤبەرا هژمارەكا بنەمالێن مووسلدا دامەزرینن، یێن كو دگەل رۆما هەڤگرتی، ئانكو چووینە ناڤ ئۆلزایێ كاسۆلیكی، دیسان بەترباركێ نەستۆریان (ئیبلیایێ هەشتێ) رێك دا كۆشیان كۆ ئۆلزایێ كاسۆلیكی دناڤ كەنیسێن نەستۆریاندا بەلاڤ بكەن. لێ شوینا كبۆشی دزڤراندنا هەرتەڤییێن نەستۆریدا سەركەڤن ل دووڤ گۆتنا لاهۆتیێن كاسۆلیكی، ئەو شیان كوردەكێ مووسلمان ژ خەلكێ باژێرێ ئامێدیێ نێچیر بكەن كۆ ل دووڤ ئۆلزایێ كاسۆلیكی بوو مەسیحی، و بوو مەزنترین داخوازكەرێ ئۆلزایێ كاسۆلیكی، هەتا پشتی چەندین هاتن و چوون و گەریانان ل گەلەك وەلاتان و خۆ زاناكرن ب زانستێن ئۆلێ مەسیحیان وەك قەشەیەكێ زیرەك بوویە قوربانیێ ڤی كاری ل وەلاتێ حەبەشێ كو ب هزاران كیلۆمەتران ژ وەلاتێ وی كوردستانێ دوور.

## بطرس جیسی یێ ئامێدی دتوومارێن پرۆپاگەنداندا:

ئەبۆنا (شمۆئێل جەمیلێ تلكێفی) پرتووكەك بەلاڤكریە یاكو ب زمانێ ئیتالی ل بن ناڤونیشانێن (پەیوەندی دناڤبەرا كرسی یێ پەیامبەر و سریانێن رۆژهەلاتی دا ) هندەك پەیامبەریێن دناڤبەرا بەتریركێن كەنیسا رۆژهەلاتێ یا نەستۆری و پاپایێن ڤاتیكان دا، و پەیامبەریەكا خۆدا بەلگەنامە ل سەر كەسەكی ب ناڤێ بطرس جیسی ژ خەلكێ ئامێدیێ و ژ دایبابێن مووسلمان یێ بوویە مەسیحی بەلاڤكریە كو ب گەرمی بەرەڤانی ژ ئۆلزایێ كاسۆلیكی كریە، د توومارا خویندكارێن كۆلیجا پرۆپاگەندا ل بەرگێ ئێكێ ژ كۆما بەلگەنامێن سالا (١٦٣٣-١٧٥٣)ێ

بەریەرێ (٥١) دا هاتییە نڤسین: (بطرس جیسی یێ فارسی ژ باژێرێ ئامێدیێ ل كۆلیجا (پرۆپاگەندا) ل ١٧ ی تەباخا (١٦٤٧)ێ هاتەوەرگرتن، هینگێ ژیێ وی نێزیكی (٢٤) سالان بوو (ئانكو سالا بوونا وی نێزیكی سالا ١٦٢٣ێ بوو) ئەو ژی ب كاندیدكرنا كردینال (بربرینۆ) ی و ب بریارا كۆمەلگەهێ ل ٣ێ خزیرانا هەر وێ سالێ و ئەو ژ دابابێن مووسلمان بوو و دبێژیت كو ئەو ژ لایێ خودێ ڤە ل سالا (١٧٤١) ێ ژێ هاتییە خواستن كو بهێتە رۆما داكو ببیتە مەسیحی.

ول٧ێ ئیلوونا سالا (١٦٤٢)ێ مۆنسنیۆر (سكنارۆلا) ی ل كەنیسا خاتوینا چیای دامەزراند، و ئەو ئشبینێ ڕێزدارێ خودان باوەر ئەلكونت جیسی یێ فەرەنسی كورێ بالیۆزی مەلكێ (فەرەنسا) ل قستەنتینیە بوو. ئەبۆنا بطرس جیسی پشتی نامەیا خۆیا كەهنۆنی (ئانكۆ قەشە) زڤری وەلاتێ خۆ كوردستانێ، و گەلەك دپەیامبەری و گۆتار خواندنێدا كار كر و ب تایبەتی ل باژێرێ ئامەد (دیار بەكر).

ڤەكۆلەرێ وێ پرتووكێ دبێژیت ئەڤ كوردێ بوویە مەسیحی نەزڤری باژێر و جهێ ژ دایكبوونا خۆ ل دووڤ گۆتنەكا ئیتالی ژ بەر ترسێن رووداندكا نەچاڤەرێكری، چونكوو د ئیسلامێ دا كەسێن ژ ئیسلامێ ڤارێ دبن سزایێ وان كوشتنە، ب تایبەتی دەولەتا ئۆسمانی یا كو هینگێ دەسەلاتدار و میرگەهێن كوردی ب شەریعەتێ ئیسلامێ دكر، پشتی هینگێ تووماریێن كۆلیجا پرۆپاگەندا بۆدچن كۆ (بطرس) چوو ئەلقووش و بتریركێ نەستۆری مار ئیلیایێ هەشتێ (١٦١٧-١٦٦٠)ز)ێ دیت یێ كو گەلەك دلخۆش بووی ب هاتنا (بطرس) و وەسا دیت كو گەلەك ل سەر باوەریێ یێ ب غیرەتە و ڤیانەكا كویر ب كەنیسێ هەیە و ئێككرتنا وێ دگەل هەمی كەنیسەیان و ب تایبەتی دگەل رۆما یێ كو گەلەك سالان لێ ژیای و ل وێرێ فێری زمانێ ئیتالی بووی و بەرپرسێن دامودەزگەهێن رۆمانی لێ نیاسین، و بەتریركی ئەو دگەل دووێن دی كو ئەبۆنا مەرقس و شەمایی تیسماوی هەلبژارتن و كارێ چوونا رۆما یێ سپارد دا ئاگەهداریا وان ل دۆر رەوشا مەسیحیان ل رۆژهەلاتێ ب رەنگەكێ گشتی و ل كوردستانێ ب رەنگەكێ تایبەت بكەت.

لێ پشتی هینگێ ئەو بەلگەنامە هەوەكا مەزن دژی بطرس دگێرن و ب سەختەكاریێ و بزاڤا دزینا دراڤی تاوانبار دكەن ئەو ژی ب كار ئینانا نیاسینا وی دگەل كەسایەتیێن كاسۆلیكی داكو بگەهیتە هیڤی و ئومێدێن خۆ.

(بطرس)ێ ئامێدی رۆما هێلا و ب رێكا زڤرینێ بۆ كوردستانێ، لێ نەهاتە كوردستانێ و چوو حەبەشە و ل وێرێ ل دووڤ ئولزایێ ئەرسوزكسی ئۆلداریا خۆ یا مەسیحی ب رێڤە دبر، لێ كاهنێن ئەرسوزكس ب رم و بەربارانێ هێرش برەسەر هەتا بەر تژی سەر كەلەخێ وێ بووین، (بطرس) ب ڤیانا خۆ بۆ مەسیح ل سالا (١٦٨٠)ێ ل دووڤ گۆتنا پرۆپاگەندان مر.

## گەهشتنا پەیامبەرێن دۆمنیكان بۆ كوردستانێ:

دەمێ مەسیحیێن كاسۆلیكێن مووسل دوبارەكرنا ڤەكرنا پەیامبەریا گبۆشیدا شكەستین یاكو ل سالا (١٧٢٢)ێ دەرگەهێن وێ گرتین پشتی تووشی دزی و تالانكرنێ بووی و بەرپرسێ وێ ئەبۆنا بەتایێ كبۆش كوشتین.

قەشە خدرێ كلدانی یێ مووسلی خۆ جهێ رۆما هینگێ یێ ژ بەر بتریركێ نەستۆریا رەڤی ژ لایێ پاپا (بندكتسێ چواردێ) ڤە كار پێ هاتەسپاردن كو پەیامبەریەكێ بۆ وان ل ڤی باژێری ڤەكەت. لێ پشتی دو دلیا سەرۆكێ رەبەنێن دۆمنیكان ژ داخوازا پاپای بۆ دوبارە ڤەكرنا پەیامبەریا وان ل میزۆپوتامیا و كوردستانێ ل سالا (١٧٤٧)ێ، ئەو بوو ل ١٧ێ كانوونا دووێ سالا (١٧٥٠)ێ دو پەیامبەرێن ئیتالی كو فرنسیس تۆریانی (Tarriani) و عەبدلئەحەد كودیلنشینی (Codeleoncini) گەهشتن و ب شێوەیەكێ كاتی كرملی لیاندەرد هاتە زندەكرن بۆ قەدیسە سیلیسیا ژ بەر زانینا وی یا زمانێ عەرەبی و ئەو جهێن بریار بوو مزگینی بگەهیتێ.

ڤان هەردو پەیامبەران ب رێکا کارێ خۆ یێ نۆشداری شیان ب کارێ خۆ یێ ئۆلی سەرکەفتنێ دەستڤە بینن، ب تایبەتی وان لایەنگیریەك ژ کاسۆلیکێن مووسل ڤە هەبوو.

دیسان دەنگو باسێن هاتنا وان گەهشتنە میرێ بەهدینان بەهرام پاشایێ ئێکێ کورێ سەعید خان بەگێ دووێ (١٧١٤-١٧٦٨ز)ێ و یێ نەساخ بوو، ژ بەر نەساخیا خۆ و بۆ چارەسەریێ هنارتە دووڤ پەیامبەرێ نۆشدار فرنسیس تۆریانی را، دەما نۆشدار دکارێ خۆدا سەرکەفتی، میر بەهرام پاشای رێك دایێ لقەکا پەیامبەریا دۆمنیکانی ل ئامێدیێ ل سالا (١٧٥٢)ێ ڤەکەت، کو یا گرێدای بیت ب پەیامبەریا مووسل ڤە و ئەرکێ وێ گهۆرینا باوەریا نەستۆریێن هەرێما بەهدینان بوو بۆ کاسۆلیکیێ و یەککر ب تنێ دگەل رۆما.

## نامەیا دۆمنیکی ل ئامێدیێ و گەشەکرنا کاسۆلیکیێ ل وێرێ:

پشتی کۆ میر بەهرام پاشای رێدای لقەك بۆ پەیامبەریا دۆمنیکی ل ئامێدیێ ل سالا (١٧٥٢)ێ بهێتە ڤەکرن، ئەبۆنا عەبدلئەحەدێ ئێکێ (کودیلیسینی) وەك یەکەم پەیامبەر لێ هاتە دامەزراندن، لێ پشتی ئەو ل سالا (١٧٥٣)ێ مری ئەبۆنا (ئیبولدوصولدینی) رێڤەبەریا ئامێدیێ وەرگرت، ئەو گەلەك د زانستا ئەندازیاریێدا یێ شارەزا بوو سەرەرای شارەزاییا وی د کارێ نۆشداریێ دا ژی و سالا (١٧٧٠ز) لەورا ژووری میرێ کورد بەهرام پاشای کێشایێ کۆ کەنیسا گوندێ دێرێ ب دووریا چەند کیلومەترەکا ل باکوورێ رۆژهەلاتێ ئامێدیێ، یا بەرنیاس ب ناڤێ (مار عەبد یەشوع) وەك خەلات دایێ، ئینا پەیامبەرێن دۆمنیکان رابوون ب دامەزراندنا کیروسێ کاسۆلیکی لێ هەر ل دووڤ رێ و رەسمێن رۆژهەلاتێ دچوون نە ل دووڤ یێن لاتینی، دیسان پاشایێ ئامێدیێ مەسیحیێن خۆ هاندان ژ ئۆلزایێ نەستۆری بۆ ئۆلزایێ پەیامبەرێن دۆمنیکان (ئۆلزایێ سۆلیکی) و یەککرتن دگەل رۆما.

ئەڤجا کارێ پەیامبەرێن دۆمنیکان ژ پەیامبەرێن مووسل و ئامێدیێ بۆ ئەگەرێ ڤەگوهاستنا پتر ژ دو هزار کەسان ژ گوندێن مووسل و ئامێدیێ بو ئۆلزایێ کاسۆلیکی هەتا سالا (١٧٧٠ز)ێ سەرەرای قاییلکرنا بەتریرکێ نەستۆریان ئیلیایێ دوازدێ (١٧٧٨-١٨٠٤)ێ بۆ هنارتا وێنەیێ باوەریا خۆ یا کاسۆلیکی بۆ پاپای، دیسان بۆ ئەگەرێ هاتنە رێزا مەتران یوحەننا هرمز بۆ ناڤ ئۆلزایێ کاسۆلیکی.

دیسان ئەبۆنا ئەلموریسی، ل سالا (١٧٦٨)ێ چوو ئامێدیێ بۆ هاریکاریا ئەبۆنا صولدینی، کو پەرتووکەك ل سەر رێزمانێ و فەرهەنگەکا کورت ب زمانێ کوردی نڤیسین و ل چاپخانا بەلاڤکرنا باوەریێ ل رۆما چاپکر، ژبۆ مفایێ پەیامبەران دمزگینیدانێدا ل کوردستانێ. و ل سالا (١٧٧٥)ێ ئەبۆنا صولدینی بەرپرسێ پەیامبەریا ئامێدیێ ل زاخۆ مر و هەر ل وێرێ ڤەشارت. دیسان ل سالا (١٧٦٧)ێ ئەبۆنا فرنسیس تۆریانی ژی ل مووسل مر پشتی بۆ ماوێ ١٧سالان خزمەتا نامەیا دۆمنیکان ل وێرێ کری و هەر ل وێرێ ل گۆرستانا ئال عەبدولجەلیل ل کەنیسا شەمعوونێ صەففافی ڤەشارت.

تشتێ سەیر ئەبۆنا (والنتین) ل سالا (١٧٥٦)ێ هاتبوو پەیامبەریا مووسل و شارەزای نۆشداریێ بوو. لەورا داخواز کرە گزیرتا ئبن عومەر (گزیرتا بۆتان) بۆ چارەسەریا کورێ میرێ بۆتان. لێ ئەبۆنا والنتین دچارەسەریا کورێ میرێ بۆتان دا سەرنەکەفت، دناڤ دەستێن وی دا مر، لەورا میرێ کورد بریاردا کۆ ئەبۆنا والنتین بکوژن و کەلەخێ وی باڤێژنە ناڤ رووبارێ دیجلەی.

ل سالا (١٧٧٥-١٧٨٠)ێ پەیامنێری ل ئامێدیێ هاتە دائێخستن ژ بەر ئەگەرێ ناکۆکیا دناڤبەرا والیێ مووسل سلێمان پاشایێ جەلیلی (١٧٧٥-١٧٩٩)ێ و والیێ ئامێدیێ ئیسماعیل پاشای (١٧٦٨-١٧٩٨) ل دۆر کانێ دێرا رەبان هرمز سەر ب کیرێ ڤەیە و ل دۆر ململانێ یا دناڤبەرا مەسیحیێن مووسل دا ئەوێن بووینە کاسۆلیك و یەککرتن دگەل رۆما کری کو ژ

لایێ میرێن مووسل یێن جەلیلی ڤە هاتینە هاندان و دناڤبەرا میرێن ئامێدیێ یێن کۆ بزاڤ دکرن سەروەریا خۆ ل سەر دێرا رەبان هرمز بپارێزن، کو بارەگایێ بەتریرکێ نەستۆری (ئیشۆ عیاب) و پەیرەوێن وی یێن نەستۆری یێن خۆجهێن گوند و باژێرکێن سەر ب ئامێدیێ ڤە.

لێ پشتی مرنا سلێمان پاشایێ جەلیلی والیێ مووسل، کورێ وی محەمەد پاشا یێ ل سالا (۱۷۸۹) ێ هاتە شوینێ و دگەل ئیسماعیل پاشای (۱۷٦۸-۱۷۹۸)ێ پێکهات و هەر تشت ژ لایێ هەر دوولایانڤە وەك خۆ لێهاتن.

دەما ئیسماعیل پاشا میرێ ئامێدیێ نەساخ دبیت، محەمەد پاشایێ جەلیلی ئەبۆنا مرقص بیانتا بۆ چارەسەریا نەساخییا وی هنارت، دەما چارەسەر بووی، ئیسماعیل پاشای جارەکا دی کەنیسا مار عەبد یەشوع ل گوندێ دێرێ یا مەسیحییێن بووینە کاسۆلیك کرە دیاری بۆ وی.

لێ ئەو مەسیحییێن بووینە کاسۆلیك بۆ دەمەکێ درێژ پیرۆزباهییا ڤێ ئازادیێ نەکر، دەما ل سالا (۱۷٦۹)ێ ئیسماعیل پاشا دمریت، یێ کو خەبات دکر پەیاما دۆمنیکان سەرکەڤیت ل دووڤ ژێدەرێ وان کورێ وی مراد بەگ (۱۷٦۹-۱۸۰٤)ێ دهێتە شوینێ یێ بریارا چەوساندنا کاسۆلیکان دای و ئەزمانێ قەشە (کیسۆیێ مانگێشکی ) بری کو ژ ئەگەرێ وێ چەندێ ئەو قەشە مری، و دگۆتنەکا دی دا ب رەنگەکێ سەیر چارەسەر بووی، و مراد بەگی گەلەك کلدانیێن ئامێدیێ و گوندێ دێرێ کوشتن، و قەشێ وان عەبدولکەریم رەڤی و چوویە مووسل، لێ ئەبۆنا دۆمیکی ئەڤ رویدانە بۆ ئەبۆنا مەنصور سابلاکی هۆسا ڤەگێراند: (ئەوێ ل دووڤ ئیسماعیل پاشای را هاتی کورێ وی مراد بەگ پاشی برایێ وی قوباد بەگ سەر ژێ ستاندی و پاشی جارەکا دی مراد بەگ زڤریەڤە و پاشی برایێ وی عادل بەگ، و ل سالا (۱۷۹۸)ێ نەستۆری ل وەلاتێ ناڤبەرا دو رووباران ب دوماهیك هاتن (ئانکو ل دەشتێ نە ل چیا) و ل سالا (۱۸۰۳)ێ ل مووسل هزار و پێنج سەد بنەمالێن کاسۆلیك باوەری ب نەستۆریێ ئینان.

وەسا دیارە نەوەکهەڤییەك دژێدەرێن مەسیحیاندا هەیە ل دۆر هەلویستێ میرێن نەستۆریان ئەوێن ل بن دەستەلاتا میرێن ئامێدیێ.

ددەمەکیدا وەسڤا هەر دو میرێن ئامێدیێ بەهرام پاشا و ئیسماعیل پاشای دکەن، دهێتە دیتن تاوانا ددەنە پال میر مراد بەگ یێ کۆ ل سالا (۱۷٦۹)ێ دەسەلات ددەستیدا، دڤان سالان دا جیاوازی دژێدەراندا هەیە، کو نەستۆری ل دەشتا مووسل و ئامێدیێ نەمان، ئانکۆ ل هەمی گوندێن ل دەوروبەرێن ئامێدیێ ل رۆژهەلات و رۆژئاڤایێن وێ ل دۆلا صپنەی هەمیا باوەری ب کاسۆلیکیێ ئینا و نەستۆری هێلا لێ بەلێ گوندێن دکەڤنە باکوورێ ئامێدیێ (ئانکۆ گوندێن هۆزا بەرواری ژووری و نێروەرێکان) هەتا نڤیسینا ڤان رێزان ژی باوەرییا ب ئۆلزایێ نەستۆری هەی.

هەر چاوا بیت بەهرام پاشا و کورێ وی ئیسماعیل پاشای رۆلەکێ مەزن هەبوو دگهۆرینا نەخشێ ئۆلزایێن مەسیحیان ل ئامێدیێ و پاشی بۆ وان دزڤریت بۆ باوەری ئینانا گوندێن (دێرێ، بێبادێ، قەدش، بێناتا، ئێنیشکێ، ئەرەدنا، تنێ، داودیێ، هەرماش، ئەزەخ، وگەلەك گوندێن دی بۆ ئۆلزایێ کاسۆلیك و یەککر ب تنێ دگەل رۆما.

## پەراوێز:

* ئەلبجنسیین: تیپەكا كریستیانانە هزرێن خۆ تێكەلكرن دناڤبەرا كریستیان و مانوی دا، لەورا ل سەر زوهدێ و تەقەشفێ وەك رێبازا ژیانا ئەندامێن خۆ پشتراستبوون، ب دژواری و توندی دژایەتیا ڤێ تیپێ ژلایێ پاپایێن رۆما ڤە هاتەكرن.

١. كرملی: ئەو رەبەنێن كاسۆلیكن، ئۆلزایێ وان ل دەستپێكێ ل چیایێ كرمل ل فەلەستینێ پەیدا بوو، پاشی ل سالا ١٢٣٨ێ گەهشتە قبرص و ژ وێرێ بۆ ئەوروپا، تەماشە بكە، غسان دمشقیة لاهوت التحریر، الاهالی الطباعة و النشر، دمشق، الطبعة الاولی ١٩٩٠-ص ١٨٨.

٢. ئوگستینی: ئێك ژ رەبەنایەتیێن كاسۆلیكی یە، ئوگستین دامەزرێنەرێ وێ یە، دووڤچوونێن وێ چوو بوونە هندا رۆژهەلات ل ١٨ێ ئادارا ١٥٧٨ێ و هەر ژ سالا ١٥٧٦ێ ژ ل تەنگاڤا هرمز بوون و پاشی ل وێرێ ل سەردەمێ شاهـ عەباسێ ئێكێ گەهشتنە ئیرانێ، و ڤێ شاهێ صەفەوی باشی دگەل واندا كر.. تەماشە بكە: اوجین تسران: خلاصة تاریخیة للكنیسة الكلدانیة، نقلها الی العربیة القسی سلیمان صائغ، الموصل ١٩٣٩، ص ١٧٦.

٣. فەرەنسیكان، ئەو دووڤچوونێن قەدیسی فەرەنسیسن، دبنە سێ ئۆلزا كۆ ئەڤەنە: رەبەنێن بچووك و كۆشی و دێری، هەر ل دەستپێكێ فەرەنسیكیان پێگیری ب ژیانا هەژار یێ كر و رێك نەدا خۆ ببنە خودان ملكداریا چ تشتەكی و وان ل چەرخێن ناڤین بزاڤەكا زانستی یا ب ناڤ و دەنگ هەبوو.

٤. عازەری: رەبەنیاتیا فەرەنسی بوو و ئوجین بورە دامەزرێنەرێ وێ بوو، و ژلایێ رێڤەبەریا مەعارفێن فەرەنسا و كۆمەلگەها زانستی یا باشنڤیسان و ئەدیبان ڤە ب ئەركەكی هاتە ئیرانێ. تەماشە بكە: تسران: ژێدەرێ بەرێ، ل ١٨٢-١٨٣.

## ژێدەر:


١. فرست مرعي: انتشار المسیحیة فی كوردستان، مجلة الصوت الكلدانی-دهۆك-العدد ١٥ فی ٢٠٠٥م.

٢. الاب البیر ابوونا: تاریخ الكنیسة السریانیة الشرقیة –دار المشرق-بیروت-ج ١.

٣. ادیب نصرالدین:الینابیع فی المسیحیة و الاسلام، بیروت ١٩٩٤.

٤. نهاد خیاطة: الفرق و المذاهب المسیحیة منذ البدایات حتی ظهور الاسلام، الاوائل للنشرو التوزیع، الطبعة الثانیة ١٤٢٥-٢٠٠٤.

٥. موریس بوكای: دراسة الكتب المقدسة فی ضوء المعارف الحدیثة، ترجمة و نشر دار المعارف مصر، بلا تاریخ.

٦. فراس السواح: الرحمن و الشیطان، دمشق ٢٠٠٠.

٧. فیاض و منصوري: النصاری، دار اسامة ١٩٩٨.

٨. محمد عطا الرحیم: عیسی نبی السلام، ترجمة فهمی شما، دمشق ١٩٩٠.

٩. حسني یوسف الاطیر: عقائد النصاری الموحدین بین الاسلام و المسیحیة، مكتبة النافذة، الطبعة الثالثة ٢٠٠٤.

١٠. عبدالقادر احمد الیوسف: العصور الوسطی الاوربیة، مطابع مؤسسة دار الكتب للنشر فی جامعة الموصل.

١١. الاب سلیم دكاش: المسیحیة عبر تاریخها في المشرق: كنائس الشرق الاوسط، بیروت، الطبعة الثانیة ٢٠٠٠م.

١٢. غسان دمشقیة لاهوت التحریر، الاهالی الطباعة و النشر، دمشق، الطبعة الاولی ١٩٩٠-ص ١٨٨.

١٣. اوجین تسران: خلاصة تاریخیة للكنیسة الكلدانیة، نقلها الی العربیة القس سلیمان صائغ، الموصل ١٩٣٩.

١٤. الاب البیرابوونا: تاریخ الكنیسة السریانیة الشرقیة، ج ٣.

١٥. عماد عبدالسلام رؤوف: الموصل فی العهدالعثمانی ، مطبعة الاداب، النجف ١٣٩٧الهجری ١٩٧٥م.

١٦. المطران عمانوئیل دلي: مبادرات الاتحاد بین بطاركة بابل و روما فی القرن السابع عشر، القسم الخامس، مجلة نجم المشرق، العدد ٢٧فی ٢٠٠١.

١٧. یوسف جي: التراث الكوردی فی مؤلفات الایطالیین، مجلة المجمع العلمی العراقي، الهیئة الكوردیة، المجد الثامن ١٩٨١.

١٨. م. ابراهیم: الدومنیكیون نشأتهم - ارسالیتهم و دوْرهم الانسانی و الثقافی و العلمی فی البلاد، مجلة الصوت الكلداني، العدد١٤ السنة ١٩٩٩.

١٩.الاب بطرس نصری الكلدانی: كتاب ذخیرة الأذهان فی تواریخ المشارقة و المغاربة و السریان، دیر الأباء الدومنكیون – الموصل ١٩١٣، ج٢.

# سەرەدانێن پاتریارك یوسف ئودو بۆ گوندێن ل ژێر چاڤدێرییا وی ل باکوورێ عیراقێ کو دناڤبەرا سالێن (١٨٦٧-١٨٦٨)ێ پێ رابووی*

الاب بطرس حداد**
وەرگێران: خالد سالح

## پێشەکی :

پاتریارك یوسفێ شەشێ ئودو (١٨٧٨مریبە) ژ وێ چەندێ مەزنترە کو وی ب دەمە نیاسین [١]، بیرهاتنێن وی ددلێ توخمێ وی دا دساخن و عەیال ژ بابکالان دەنگ و باسێن کار و جیهادا وی د خزمەتا خودێ و کەنیسێ دا ڤەدگوهێزن.

ئەڤ چەند رێزێن بێن ژ دەفتەرا (النثریات-مەزاختیان)، واتە مەزاختیێن رۆژانە یێن پاتریارکییا کلدانی هاتینە هەلبژارتن، من چەند پێزانینێن ب مفا د هەژی بەلاڤکرنێ تێدا دیتینە، نەمازە گوهۆرینێن بنچینەیی ل سەر پتریبا وان گوندێن ناڤێن وان د گۆتارێ دا هاتین، یان ژمارەکا مەزنا وان ل ڤان سالێن داویێ ب ئێکجار نەماینە.

نڤیسین نە ب دەستێ پاتریارکی بخۆ هاتییە نڤیسین، بەلکی ب دەستێ کەسەکێ هەڤرێیێ وی بوویە و ب زمانەکێ سادە و پری شاشی و ل ژێر کارتێکرنا زاراڤێ مووسلێ نڤیسییە، کو مووسل د وی سەردەمیدا بارەگایێ کورسییا پاتریارکی بوویە و ئەم دناڤبەرا ڤان رێزکاندا دبینین چەند خزمەتا مللەتێ خودێ(شعب الله)کرییە و چەند گیانێ ژارێ و خودێ ترسێ کو ژ سادەیا رێکا ئنجیلێ هاتییە وەرگرتن تێدایە .

ئەز دێ ڤێ دەقی وەکی خۆ هینمە خوار و ژبۆ مفای چەند زێدەهی د ناڤبەرا کڤاناندا هەنە کو ژ دەفتەرێ بخۆ هاتینە وەرگرتن، لێ ب مەرەما مفا وەرگرتنێ ژ ڤێرە و ژ وێراهە هاتینە وەرگرتن. و دەفتەرا ناڤبری یا د عومبارا پاتریارکییا کلدانی ل بەغدادا، و ب دەستوێرییا گراڤیێ هێژا پاتریارك مار روفائێل ئێکێ بیداوید (الکلي-لطوبي) خۆشبیت هاتییە وەرگرتن .

## سەرەدانا جهێن ل ژێرچاڤدێرییا وی ل سالا ١٨٦٧ ێ :

نڤیسییە :

ل رۆژا ئێکشەمبی ل ٢٥ تەباخێ سالا ١٨٦٧ێ ؛ ئەم ژ مووسل دەرکەتین، هاتینە دێرا مار گورگیس و ماینە ل وێرێ، و ب شەڤ دگەل رێزداری هاتینە تلکێفێ، و دو رۆژان ماینە ل وێرێ، و ژ تلکێف ئەم هاتینە باتنایێ و رۆژەکێ ل وێرێ ماین، و ژ باتنایێ هاتینە تلسقفێ و رۆژەکێ لێ ماین، و ژ تلسقف هاتینە باقوفە و

رۆژەكێ لێ ماین، و ل باقوفە چووینە دێرا (السیدە - خانم) و دو رۆژا لێ ماین[٢]، و ژ دێرێ هاتینە دهۆكێ و دو رۆژان لێ ماین، و ژ دهۆكێ هاتینە مانكێشكێ[٣]، و چوار رۆژان لێ ماین، و ژ مانكێشكێ هاتینە داودیێ و ئەم نەماینە لێ، لێ ئەم ل ناڤ گەریاین و هاتینە گوندێ دیهێ، و ژ گوندێ دیهێ هاتینە چەلكێ، و ژ چەلكێ هاتینە هلمون؛ ل رۆژا چوارشەمبی ١١ ئەیلولێ ل دانێ ئێڤاری ئەم چووینە د ناڤ هلمون دا، و ل رۆژا ئێكێ ژ چوونا مە بۆ وێرێ گەلەك ژ وان (واتە نستوریێن خرڤەبووی) لێ (ئانكو ل پاتریاركی) خرڤەبوون، ل شەڤا ئێكێ شێست و پێنج نەفەر و ل شەڤا دووێ چل نەفەر ل هێژای خرڤەبوون؛ و ئەم ٢٥ رۆژان ماینە ل گوندێ هلمون؛ و ئەم ل رۆژا دووشەمبی دەركەتین و هاتینە گوندێ ئاروش، و ژ گوندێ ئاروش هاتینە (عین السمك - عین نونی)[٤] - ژ وێرێ هاتینە ئامێدێ و جەندرمە (ضبطیة)[٥] كو ژ لایێ - خەندان ئاغای- ڤە هاتبوونە هنارتن هاتنە پێشوازیا و مە (٢٠ قرش) دانە وان) و ئەم (٢٨) رۆژان ل وێرێ ماین؛ پاشی هاتینە گوندێ هەمزیكێ و دو شەڤان لێ ماین، و هاتینە گوندێ بێناتا و سێ رۆژان لێ ماین، و هاتینە گوندێ ئینشكێ و پێنج رۆژان ل وێرێ ماین، و مە خۆ ڤەگوهاستە گوندێ ئەرەدنا (مە دوسەد قرش دانە قەشێ نوی زەیا كورێ پولسی) و مە كولاڤدەرسۆك و پێلاڤ ب ٤٢ قرشان بۆ كڕین.

(ریشیت ێ[٦] سالا ١٨٦٧ێ :

ئامێدیێ ٣٣ قرش، هەمزیكێ ٥٤، بێناتا ٦٥، ئینشكێ ٧٨، تنێ ١٦٥، داودیێ ١٥٠، ئەرەدنا ٢٤٢، مانكێشك ٥٢٣.

## سەرەدانا جهێن ل ژێر چاڤدێرییا وی ل سالا ١٨٦٨ێ :

### دیسان دخوینین :

(ل دەستپێكا تیرمەها سالا ١٨٦٨ێ [٧]ئەم ژ مووسل دەركەتین، ب شەڤ گەهشتینە گوندێ كرملیس، و حەفت رۆژان لێ ماین، و ب شەڤ ل وێرێ بەرەڤ گوندێ تلكێف دەركەتین و چەند رۆژان لێ ماین ..) (وەسان دیارە ژ بەر كارەكێ گرنگ سەرەدانا خۆ یا راوەستاندی و ڤەگەریایە مووسل، و ل ئەیلولێ ئێكسەر یێ بەرەڤ باتنایێ دەركەتی دا سەرەدانا خۆ یا چاڤدێریێ مینا سالا پێشتر تەمام بكەت ؛ ئەو ل سەر قۆناغێن سەرەدانا خۆ ڤەدگێریت كو وی ژ كەسكاتییان: باجانرەشك و بامی و بەقلی و كرتوپ (پتات)كڕینە، هەر دیسان ناڤێ چەند قەشان كو خزمەتا گوندان دكەن ئینانە، ژ وانان : میخائیل شەمسیە و توما كتولا و حەنا زەهرە ل تلكێف. و قەشە قریاقوس ل باتنایێ. و قەشە حەنا و یوسف و گورگیس ل مانكێشكێ. و قەشە ئەوراها ل تنێ؛ و قەشە یونان ل دهۆكێ و قەشە مەتی رەئیس ل ئەلقوش[٨] ).

## ریشیتا سالا ١٨٦٨ێ:

داودیێ ١٧٢ قرش، تنێ ١٦٤، ئەرەدنا ٢٤٠، ئینشكێ ١٠١، بێناتا ٧٧، هەمزیكێ ٦٠، بلیجانكێ ١٦، مانكێشكێ ٥٥٢.

### ئامارێن سالا ١٨٦٨ێ:

یا ئەز دبینم گرنگترین تشت دڤێ دەفتەرێ دا ئەڤ ئامارا ل خوارێ یە، كو مە ژ بلی ڤێ ئامارێ چ ئامارێن دی نینن دیرۆكا وان ڤەگەریێتەڤە سەدێ بووری. نڤیسییە :

| جهـ | نێر | مێ | خانی |
|---|---|---|---|
| تلكێف | ٢٢٥٣ | ٢٢٠٠ | ٥٠٠ |
| باتنایا | ٤٠٣ | ٤٢٨ | ١٣٢ |
| باقوفە | ١٥٦ | ١٨٢ | ٥٨ |
| تلسقف | ٦٧٠ | ٦٧٩ | ٢٠٣ |
| ئەلقوش(چریا ١) | ١٢٣٨ | ١٢٣٩ | ٤٦٤ |
| مانكێشكێ | ٤٧٦ | ٤٣٢ | ١٧٢ |
| داودیێ(چریا ٢) | ١٢٢ | ٩٢ | ٣٨ |
| تنێ | ١٢١ | ١٠١ | ٣٧ |
| ئەرەدنا | ٢٣٢ | ٢٠٢ | ٧٠ |

| ئینشکێ | ٨٦ | ٦٥ | ٢٣ |
|---|---|---|---|
| بێتانا | ٥٤ | ٤٥ | ١٨ |
| هەمزیکێ | ٣٢ | ٣٤ | ١٠ |
| کومانی | --- | --- | --- |

تێبینی: ناڤێ کومانی هاتیيه بێ چ ئامار دگەلدا بن.

**زێدەهیەك :**

**دیسان نڤیسیيه ،**

ل گوندێ بیرتە مە داهاتێ سالا پێشتر یێ کەنیسێ ژ کورێن بنیامێنی شمعون و هورمز وەرگرتن کو باتمانەکا سابوونێ و چوار منێن تویتنێ بوون، و (٨٠ غروش) و هەر وەسان (١٢غروش) ریشیت ژ ئەڤێن ناڤبری ل گوندێ ئەلقوش ل ٢٥ کانوونا دووێ ل سالا ١٨٦٩ێ .

دبێژم : (من) واتە پیڤەرێ کێشانێ یە و گرانییا وێ ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی یا جودایە ، و باراپتر نێزیکی ٢٥ کگم ، و باتمان پیڤەرەکێ ناڤخوویی یە و کێشا وی ژ گوندەکی بۆ ئێکا دی یا جیاوازە، ل نك هندەکان هندی منێ یە و ل نك هندەکێن دی چوار منە ، و تویتن ئەوە کو بۆ جگاران بکار دهینن و چەند جۆرێن باش ل باکووری عیراقێ دهێنە چاندن .

# ژێدەر:


* د کوڤارا (لمشرق) ژمارە کانوونا دووێ - حزیران ١٩٩٦ دا هاتیيە بەلاڤکرن،کوڤار ژ ئالیێ (دارالمشرق)بیروت-لبنان دهاتە بەلاڤکرن

** پتریاکێ کلدانی - بەغدا

١. ل بنێرە: J. Tankdji ، L Eglise Chaldeenne Catholique autre

٢. بۆ پتر پێزانینان ل سەر گوندێن مەسیحییان بنێرە: j.M.FIEY،O.P Assyrie Chrerienne،Beyrouth،Dar el-Machreq -1965

٣. بۆ پتر پێزانینان ل سەر گوندێن مەسیحییان کو ل پشتی مانکێشکێ دهێن بنێرە: هەمان دانەر :

j.M. FIEY، O.P . Sanctuaires et villages sriaques orientaux de la vallee de la Sapna ، Le Museon، < l. 102-fasc . 1-2 (1989) P. 43 ss

٤. ئەڤرو ب زمانێ کوردی(کانی ماسێ) ب ناڤدکەن کو هەر ب وێ واتایێ دهێت .

٥. (ضبطية) کۆمەکا جەندرمە (پولیسانە) دەردکەڤنە پێشوازییا کەسایەتیێن گرنگ و هەڤرێیا وان دمینن .

٦. ریشیت : خویکا (باجە) سەرانە، واتە بەخشینا بنەمالێن مەسیحییە ل سەر توخمێ نێر بۆ سەرۆکێ وان یێ ناڤخویی و ب دلێ خۆ و تنێ بۆ رەگەزێ نێر دهێتەدان.

٧. ئەم دڤان هەردو سەرەدانا دبینن کو پاتریارك یێ د ڤان دو هەیڤاندا (تیرمەهـ و تەباخ) ژ بەر دژواریا گەرمێ یێ ژ مووسل دەرکەتی و بازێر یێ ب جهـ هێلای و سەڤا گەلەك ل گوندێن باکوور خۆشترە .

٨. پتریا ناڤێ قەشا بێ ناسناڤ یان ناڤێ دەیبابێن وان تێنە گۆتن، لێ یێ داویێ کورێ خۆشکا پاتریارك ئودویە .

# ئەردو گوندێن چاندنێ یێن سولتان عەبدولحەمیدی ل ئاکرێ

**د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی**
**وەرگێران: دەستەکا ئینسکلۆپیدیایێ**

ل سەردەمی ئوسمانی چاندنی جهەکێ گرنگ دناڤ ئابووریێ کوردستانێ دا گرتبوو، تا دەستپێکا سەدساڵیا بیستێ پیشەیا سەرەکیا پتریا خەلکێ بوو، ل داویا حوکمداریا ئوسمانیيان کو بۆ دەمێ (٤٠٠) سالان ل سەر کوردستانێ ڤەکێشای، سەرۆک عەشیرەت و کەسایەتیێن بازێران، ب کریار دەستێن خۆ دانابوونە سەر پتریا ئەردێ کوردستانێ ، و ئاغا و کویخەیا پتریا گوندان ل سەر ناڤێن خۆ توومار کربوون و ئەڤە دژی یاسایا ئەردابوو، کو رێك نەددا گوند ل سەر ناڤێ ئێك کەس بهێنە توومارکرن، لێ یا وەکری کو حوکمەتا ئوسمانی چاڤێن خۆ ل ڤان جۆرە کریاران ب نقینت و ئاغا و کویخە وان ئەردان ل سەر ناڤێن خۆ توومار بکەن ئەوە دا هەر تەناهی ل وان گوندان بمینت، وەسان گەلەك گوند ب ناڤێن کەسایەتی و دەسچوویان ل سنجەقێن (لیوایێن) مووسل و هەولێر و کەرکوك و سلێمانیێ هاتنە توومار کرن.

د چاخێ سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ دا (١٨٧٦-١٩٠٩)، ژ بەر چەندین ئەگەران چاندنێ وەرار بخۆڤە دیت، ژ وانان ڤەکرنا کەنالێ سویس ل سالا (١٨٦٩)ێ، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر کو بهایێ هندە دەرامەتێن چاندنێ بلند ببن، و چوونا عیراقێ و کوردستانێ بۆ ناڤ بازارێ جیهانی، ئێکا هند کر کو سەرۆك عەشیرەت و کەسایەتی و سولتان عەبدولحەمید و دەزگایێن وی ب خورتی دەستێن خۆ داننە سەر پتریا ئەردێن چاندنێ و بێ بەهرکرنا جۆتیاران ژ هەبوونا ئەردان، لێ ئەو جۆتیارێن ئەردێن تایبەت ب خۆڤە هەبین، ژ ترسێن ب خورتی ژێ ستاندنێ نەچار بوون ب دەنە وەقفێ ، هەر چنە بیت دا بمینتە ددەست واندا[1].

سولتان عەبدولحەمید و فەرمانگەها مولکدارێن وی یێن چاندنێ ، کو ب فەرمانگەها مولکێن سنی د هاتە نیاسین (ئەو مولکن کو ب ناڤێ سولتان عەبدولحەمیدی ل عیراق و سوریا و فلستین د هاتنە توومارکرن) گەلەکا خورت بوو بۆ کرینا ئەردێ گوندان و توومارکرنا هەر گوندەکێ خەلکێ وێ ژ بەر دەستدرێژێن عەشیرەتان چۆل کرین .

مولکێن سولتانی سەر ب گەنجینەکا تایبەتا

ئێکسەر گرێدای وی ڤەبوو، کارگێریا وێ کو ب سەرپەرشتییا (مشیرێ فەیلەقێ) ل بەغدا ڤە بوو، یا ب ناڤ و دەنگ بوو ب هێزێ و رێکخستنێ، و مرۆڤ دشێت سولتان عەبدولحەمیدی ب مەزنترین مولکدارێن (ئەردی) ل عیراقا وی سەردەمی سالۆخەت بدەت، هاتیە گۆتن کو ئەو ئەردێن ل ویلایەتا بەغدا ب تنێ ب ناڤێ وی هاتینە توومارکرن دگەهیتە (٥٤٦٢٠٠ هکتارێن چوارگۆشە)*، دهێنە هەژمارتن ژ ب زاخترین ئەردێن چاندنێ. هەروەسان ئەو ئەردێن د کەتنە لایێ چەپێ ژ رووبارێ دیجلە، هەر ژ عمارە و تا عزێر ژ مولکدارییێن وی بوون و ئەردێ وی تا ولایەتا بەسرە ب درێژاهیا (شەتولعەرەب) دچوو. ل ویلایەتا مووسل ژی ئەردێن بەرفرەهـ ل نێزیکی مووسل ڤەدگرتن، ئەو دەشتێن د کەتنە دناڤبەرا دناڤبەرا زێیێ مەزن و زێیێ بچویك و دەڤەرا بەکرەجو ل سلێمانیێ و ئەردێن بەرفرەهـ ل قەزا مەخمور ل هەولێرێ.

ئەڤ ئەردێن سنی (ئەردێن سولتانی) گەلەك ساخلەتێن تایبەت وەکی دەستکەفتی هەبوون، ژ گرنگترین وان ساخلەتان دان و دکاك وەکی قەر ددانە جۆتیاران و نە دهێلان کەس زۆرداریێ ل وان بکەت، هەروەسان جۆتیارێن ڤان ئەردان خزمەتا سەربازیێ و چەند ئەرکێن دی ژێ نە دگرتن و د لێبۆری بوون. ژ بەر ڤێ چەندێ ڤان ئەردان ناڤ و دەنگێن خۆ یێن بەرفرەهـ ب ئاڤەدانیێ و مشەبوونا بەرهەمێ چاندنێ، هەڤبەرکرن دگەل ئەردێن دی هەبوو[٢].

ئەڤ ساخلەتێن وەکی دەستکەفتی ب دەست وان جۆتیارێن ئەردێن سولتانی شێن دکرن کەتین، جۆتیار پتر پالدان کو کار لێ بکەن و هندەکان واستەکاری دکرن دا ئەردێن خۆ بفرۆشنە فەرمانگەها مولکدارییێن سنی، چونکی ژ لایێ کریاری ڤە ئەو ئەرد هەر ل ژێر دەستەلاتێ جۆتیاران بوون، بەرامبەر دانا پشکا تاپویێ و حوکمەتێ پێگڤە بۆ رێڤەبەریا سنی ب رێژەیا ٢٠٪ ژ دەرامەتی بۆ هەردو پشکان و ٤٪ ب ناڤێ (سەرکەرە)[٣].

## مولکدارییێن چاندنێ یێن سولتان عەبدولحەمیدی ل قەزا ئاکرێ

د سەردەمێ سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ دا، بازێرێ ئاکرێ ناڤەندا قەزایەکا سەر ب سنجەقا (لیوایا) مووسل ڤەبوو، ئەو ئەردێن دکەتنە دناڤ سنوورێ وێ یێ کارگێریدا دکەتنە د ناڤبەرا سنوورێن قەزایێن ئامێدیێ و رەواندز و دهۆك و مووسل (ناڤەندا قەزایێ) دا، ئاکرێ ل دەستپێکێ ب تنێ ئێك ناحیە هەبوو، ئەو ژی ناحیا (عشائر السبعە) بوو، پاشی دو ناحیە سەر ب وێ ڤەبوون، ئەو ژی هەردو ناحیێن (سورچی و زێبار) بوون، و سەرجەم ژمارا گوندێن د کەتنە دناڤ سنوورێ قەزایێ دا نێزیکی (٢٠٤) گوندان بوون، (٨٧) گوند سەر ب ناڤەندا قەزایێ و (٤٥) گوند سەر ب ناحیا (سورچی) و (٧٢) گوند سەر ب ناحیا (زێبار) ڤەبوون[٤]، لێ گەلەك ژ وان گوندان ژ مرۆڤان د چۆل و بەردای بوون و ژ بەلگەنامەکا ئوسمانییا فەرمی ب دیرۆکا ٢٤ نیسانا سالا ١٩٠٩ێ وەسان دهێتە تێگەهشتن کو هەژمارا گوندێن چۆل و بەردای دناڤ ناڤەندا قەزا ئاکرێ دا (٥٤) گوندن، خەلکێ وان ژ بەر دەستدرێژیێن عەشیرەتا و نەبوونا تەناهی و ئارامیێ یێن بەردایـن و بریار هاتەدان کو ئەو گوند ژی بێنە سەر مولکێن سولتان عەبدولحەمیدی، دا عەشیرەتا لێ ئاکنجی بکەن و جارەکادی ئاڤەدان کەنەڤە و ئەڤ چەندە ل دووڤ داخوازیەکێ، یان پێشنیازەکێ کو ژ ویلایەتا مووسل ڤە دەرکەتی هاتە ئەنجامدان و دەسەلاتێ رزامەندی ل دووڤ ڤێ نڤیسینا ل خوارێ دیارکری ل سەر دیارکر:

## دانانا مولکدارییا گوندێن چۆل بۆ سەر مولکدارییا هەمایونی (سولتانی)[٥]

قەسرا یەلدز یا هەمایونی

کارگێریا سەرۆکێ نڤیسەران ١٤٠٣

ل دەڤەرا دکەڤیتە د ناڤبەرا قەزا ئاکرێ کو سەر

ب ویلایەتا مووسل ڤەیە و قەزا زێبار یا هەلوەشیای، (٥٤) گوند سەر ب قەزا ئاكرێ هەنە و هندی ڤان كێلگە ژی هەنە، خەلكێ وان ژ بەر دەستدرێژیێن عەشیرەتان تەرا و بەرا بووینە و نهو چ مرۆڤ لێ د ئاكنجی نینن و دانانا وان جهان بۆ سەر مولكێن هەمایونی بۆ جەنابێ سولتانی و ئاڤەدانكرنا وان دڤێت ئەو عەشیرەتێن گەڕۆك كو گەلەك ل وان دەڤەرا هەنە لێ ئاكنجی بكەن دا مژوولی چاندنێ ببن و ژیانەكا خۆش ببەنە سەر. ئەڤ چەندە دێ بیتە ئەگەرێ ئاڤەدانكرن و پێشكەتنا گوندێن نێزیكی وان ژی و ژمارا مووسلمانان ژی هەڤبەر دگەل مەسیحیان دێ پتر لێ هێن[٦] و گەلەك ئەنجامێن دی یێن باش، ژ بەر ڤێ چەندێ ویلایەتا مووسل ئەو چەند بەرچاڤكر و دەستوور ب كرینا وان ژ لایێ گەنجینا تایبەتا مەلەكیڤە دا، و (ئیرادەكا) سنی ب ڤێ چەندێ دەركر كو ئەو چەندا هاتییە داخواز كرن ل دووڤ ئارمانج و دەستووردان و دانا حسابا وان دناڤبەرا هەردو گەنجیناندا جێ ب جێ ببیت، و گەنجینا تایبەتا مەلەكیا هێژا ب ڤێ چەندێ بێتە ئاگەهداركرن و ئەو دەفتەرا ناڤێن وان گوندێن ناڤبری تێدا بێتە هنارتن و ئەمر و فەرمان بۆ ڤێ چەندێ یێن د دەستێ هەوە یێن هێژادا و فەرمان بۆ هەوەیە.

**ل ١١ ربیع الاول سالا ١٣٢٥ مش**
**بەرامبەر ٢٤نیسانا ١٩٠٧**
**نڤیسەرێ تایبەتێ سولتانی**
تەحسین

دەفتەرەكە تێدا ڕووبەر ب دونەما و بهایێ وان گوندان یان كێلگەیان ب دروستی ڤێجار چ د نەچاندی و د چۆل بن نهو، یان ددەفتەرا تایبەتا جەنابێ ویلایەتێ ددەمێ خۆدا یێ بەرنیاس بیت كو گوندێن ڤالانە.

| ناڤێ گوندی یان كێلگەیێ | ڕووبەر ب دۆنەما ئوسمانی= ١٠٠٠م | بهایێ دروست ب قرشا=١٠ فلسن |
|---|---|---|
| خرابە بالا | ٢٩٢٥ | ١٥٠٠ |
| خرابە ژێر | ٥٠٠٠ | ٢٢٠٠ |
| كونە تمورلی | ١٥٠٠ | ٤٥٠٠ |
| حمە كند | ٤٩٣٥ | ١٩٠٠ |
| ملكە حاجی | ٤٠٠٠ | ٢١٥٠ |
| نوادە خرابە | ٣٥٠٠ | ١٠٠٠ |
| الدرش | ٢٥١٦ | ٧٥٠ |
| مام المیان | ٦٠٠٠ | ١٥٠٠ |
| درین خواجە | ٢٠٢٥ | ٦٠٠ |
| باتورە | ٢٠٠٠ | ٠٠٠* |
| كرمكیا | ٢٥٠٠ | ٠٠٠ |
| مام داودە | ٢٠٠٠ | ٠٠٠ |
| كولتنور كادان | ٢٣٧٥ | ٠٠٠ |
| خان كی | ١٢٠٠ | ٦٠٠ |
| باژرە محمود | ٢٥٦٠ | ٧٥٠ |

| ٠٠٠ | ٢٣٢٥ | ركاوه |
| --- | --- | --- |
| ٠٠٠ | ٢٩٨٥ | كومتى |
| ٠٠٠ | ٣٦١٢ | براوه فقى على |
| ٥٠٠ | ٢٦٤٦ | سەروكانى |
| ١٢٠٠ | ٤٥٢٨ | هوريان مام كرد |
| ٢٠٠٠ | ٤٧٥٤ | كوجار |
| ٥٠٠ | ١٤٠٠ | كرمكان محيان |
| ٢٥٠٠ | ٨٩٦٣ | مع بين بى رشك |
| ٦٠٠ | ٣٣٠٠ | نجمى |
| ٣٢٠٠ | ١١٢٧٦ | كيلى بى |
| ١٥٠٠ | ٣٢٠٠ | لالەلى |
| ١٧٠٠ | ٤٥١٩ | كيلى نيسان |
| ٩٥٠ | ٢٥٠٠ | كلول مام كرد |
| ٦٥٠ | ٢٩٠٠ | موكاده |
| ٢٥٠٠ | ٥٠٠٠ | دازين |
| ٤٠٠ | ١٨٠٠ | جمه سيد |
| ١٠٠٠ | ٣١٩٠ | مير باليان |
| ٩٥٠ | ٣١٠٠ | قورشك |
| ٦٠٠ | ٢٥٠٠ | بابوى |
| ٦٠٠ | ٢٠٢٥ | بى ... |
| ١٥٠٠ | ٤٠٠٠ | سبهال |
| ٨٠٠ | ٥٠٠٠ | قوبن درى |
| ٩٥٠ | ٢٠٠٠ | مام خليفه |
| ٦٠٠ | ٣٠٠٠ | جمه سحاق |
| ٤٠٠ | ١٥٠٠ | كشانه |
| ٨٠٠ | ٣١٧٥ | مير كاوه درى |
| ٦٠٠ | ٢٥٠٠ | جلان اربوك |
| ٤٥٠ | ٢٠٦٣ | جلان ێمدين |
| ٣٠٠ | ٧٧٤ | سيلان صالح |
| ٧٠٠ | ٢٥٩٥ | سميلان |
| ١٩٠٠ | ٨٥٢٥ | بنياته |
| ٢٥٠٠ | ٩٩٤٦ | مع كيلى بشمران قلعه دير |
| ٨٠٠ | ٣٠٠٠ | خروز |
| ١٦٠٠ | ٦٠٠٠ | كورانك |

| ٧٠٠ | ٢٥٠٠ | شابا اومر |
|---|---|---|
| ٢٥٠ | ٩٥٠ | ێكل كبير |
| ٦٠٠ | ٢٠٧٦ | كشكان |
| ٤٠٠ | ١٥٠٠ | كافيه |
| ٢٥٠ | ١٢٠٠ | ێكل صغير |
| سەرجەم/ ٥٥٤٠٠ | ١٨٣٨٠٤ | ٥٤ گوند و كێلگە |

ئەڤ بەلگەنامەیا ئوسمانییا ل سەری بەلاڤكری ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ كو (٥٤) گوند و كێلگەیێن خەلكێ وان ژ بەر دەستدرێژییێن عەشیرەتا و نەبوونا تەناهیێ ڤالا كرین، هەروەكی خەلكێ وان گوندان نە ژ عەشیرەتان بوون و ل شوینا دەولەت تەناهیێ بۆ وان دابین بكەت و نەهێلیت دەستدرێژییێن عەشیرەتان بێنە سەر وان، ئەم دبینین دەسەلاتدارێن مووسل و ژ بۆ ئارمانجێن ددلێ وان دا، پێشنیاز دكەن كو وان گوند و كێلگەیان بێخنە سەر مولكدارییێن سولتان عەبدولحەمیدی، واتە ژ مولكدارییا گشتی ڤەگوهێزنە سەر مولكدارییا تایبەت و پاشی عەشیرەتان لێ ئاكنجی بكەن، و بەلگەنامەیێ ئاماژە نەدایە چ عەشیرەتان، نە یێن دەستدرێژی كرین و نە یێن دەستدرێژی ل سەر هاتییە كرن و نە ئەوێن دێ لێ ئاكنجی كەن.

خواندنەك بۆ ئاریشێن ئەردێن چاندنێ ل داوییا چاخێ دەولەتا ئوسمانی وەسان دیاردبیت كو دەسەلاتدارێن ئوسمانییان و ب تایبەت د چاخێ سولتان عەبدولحەمیدێ دووێ دا هاندانا شەر و لێكدانان دناڤبەرا عەشیرەتان دا یێ كری و یێ خۆ دویر ئێخستی و مایێ خۆ تێ نەكرییە، یان ژی ئەگەر مایێ خۆ تێكربیت ژی هەر سەرڤە سەرڤە بوویە و دا كو بەرژەوەندیێن خۆ بپارێزیت و بەردەوامیێ بدەتە مانا حوكمێ خۆ ل كوردستانێ، پشتەڤانییا ل سەر هێزا عەشیرەتێن كوردان كری و فەوج ب ناڤێ (سوارێن حەمیدی) ژ وان هاتینە دامەزراندن، وەسان تشتەكێ سرۆشتی بوو ئەو سەرۆك عەشیرەت یان فەوج هەست ب بهایێ خۆ بكەن و ئەڤ چەندە بۆ مرۆڤی دهێتە راڤەكرن كو وان ب پشتەڤانییا دەستدرێژییێن ل سەر وان عەشیرەتان دهاتنەكرن یێن نە دناڤ (سوارێن حەمیدی) دا كرین، ئەگەر چەوان دا ئەردێن خۆ هێلن و پاراستنا وی ئەردی ب ئەركەكێ پیرۆز مینا شەرەفێ د زانین.

ئەڤ (٥٤) گوند و كێلگەیێن ناڤبری هندە سالۆخەتێن تایبەت هەبوون، كو د نێزیكی رووباران بوون، ب تایبەت ل ناحیا (زێبار) كو مفا ژ ئاڤا زێیێ مەزن وەردگرتن.

یا گرنگ ئەوە پشتی راگەهاندانا دستوریا ئوسمانی ل ٢٣تیرمەها سالا (١٩٠٨)ێ، سولتان عەبدولحەمید نەچاركرن دەست ژ وان ئەردان بەردەت و جارەكادی ڤەگەریان بۆ گەنجینا گشتی و ب ناڤێ (ئەردێن ڤەگەریای) د هاتنە نیاسین .

## ژێدەر


١. جاسم محمد حسن، العراق فی العهد الحمیدی (١٨٧٦- ١٩٠٩). (ناما ماجستیرێ (نەبەلاڤكری)، هاتیبە پێشكێشكرن بۆ جڤاتا كولیژا ئادابێ ). جامعة بغداد، ایار ١٩٧٥، ص ٢٧٦- ٢٧٧ .

*. هكتار = ١٠٠٠٠میترێن چوارگۆشەنە .

٢. بۆ پتر پێزانینان بنێرە ، عماد احمد الجواهري، تاريخ مشكلة الاراضي في العراق، دراسة في التطورات العامة ١٩١٤- ١٩٣٢ (بغداد ، ١٩٧٨) ص ٤٢- ٤٤.

٣. سەركەرە: سەركار پەیڤەكا كوردی - فارسیبە، واتە سەرێ كاری. ل عیراقێ ل شوینا پەیڤا سەركار، پەیڤا (سەركال) یا بەربەلاڤە، و ئەو سەرۆكێ كۆما جۆتیارانە و باراپتر ژی یان شێخەكێ نە گەلەكێ مەزنە، یان ژی سەرۆك هۆز و مرۆڤ و كەسێن نێزیك و خۆشتڤێن وی نە .

٤. بۆ پتر پێزانینان ل سەر قەزا ئاكرێ د چاخێ ئوسمانی دا بنێرە :

د . هەوراز سوار علی (ئاكر (عقره) فی سالنامات ولایة الموصل العثمانیة ١٨٩٠- ١٩١٢) مجلة متین ، العدد (١١٥) دهوك ێ ب ٢٠٠١ ، ص ١٠٤. سالنامێن ویلایەتا مووسل ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ كو هەژمارا گوندێن قەزا ئاكرێ (٢١٤) گوندن.

٥. الجمهوریة التركیة، ارشیف رئاسة الوزراء، وثائق عن الموصل و كركوك ١٥٢٥- ١٩١٩ (انقره ١٩٩٣) ص ٣٠٧ (بالتركیه اللاتینیه). یازانا ئەوە كو سولتان عەبدولحەمیدی ل بەری هینگێ گوندێ هزارجۆت و ئەو كێلگەیێن نێزیكی وان ل دەڤەرا ناوكورێ ل قەزا شێخان (یا نهو) دانابوونە سەر مولكدارێن خۆ یێن چاندنێ .

٦. د وی دەمی دا رێژا مەسیحییان هەڤبەر د گەل یا مووسلمانان یا كێم بوو، سیاسەتا عەبدولحەمیدی ئەو چەند د كر دا نەڤیانێ بێخیتە دناڤبەرا مووسلمان و مەسیحیان دا و دژی وان راوەستن، لێ وێ سیاسەتێ سەرنەگرت، یا سەیر ئەوە دا كو دەستێ خۆ دانیتە سەر ئەردێ گوندێن كوردێن مووسلمان ل دەڤەرێ ئایین ئینا د ناڤدا، دا شەرعیەتێ ب دەتە كارێ خۆ و وەسان خۆ دیار د كر كو گەلەك یێ هشیارە ل سەر بەرژەوەندیێن مووسلمانان .

* نیشانا ... واتە ئەم نەشیاینە بخوینین.

# ساخلەمی ل زاخۆ
# ژ داوییا سەردەمێ ئوسمانی
# هەتا شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ

وەسفیا محەمەد شێخو
ماجستێر د دیرۆكا نوو و هەڤچەرخدا
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی

## پێشەكی

خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ یەك ژ گرنگترین وان خزمەتگوزاریانە یێن دەولەت بۆ جڤاكی و هەر تاكەكێ جڤاكی پێشكەشدكەت، گرنگییا ڤێ رەنگێ خزمەتگوزاریێ د وێ چەندێدایە كو گرێدایی ژیانا مرۆڤی یە، مرۆڤ ژی رەگەزەكێ كارا و خۆدی باندۆرە ل سەر تەبایی جڤاكی و پێشكەتنێن وی د وارێن جودادا، دگەل پەیدابوونا مرۆڤی ل سەر روویێ عەردی پێدڤیاتی ب نۆشداریێ ژی پەیدابوویە، دگەل دروستبوونا جڤاكێن بەراهیێ پێدڤیاتی ب خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ ژی بەرەف زێدەبوونێ بوویە، ئەڤ پێدڤیاتییە د سەردەمێ شەران و بەلاڤبوونا ئێش و نەخۆشییاندا هێژ فەرتر لێ هاتییە، دگەل بۆرینا چەرخان و پێشڤەچوونا ژیانێ د هەموو واراندا رێك و چاوانیا پێشكەشكرنا خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ ژی ب هەردو پشكێن خۆڤە چارەسەری و خۆپاراستن بەرەف پێش چووینە و گەهشتینە ئاستەكێ شیان و شارەزاییا دەولەتێ د پێشكەشكرنا خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ پێڤەرەكێ گرنگێ پێشكەتن و پێشڤەچوونا جڤاكییە. د شیاندایە بێژین كارگێری د هەردەولەتەكێدا رەنگڤەدانا سەروبەرێ دەستەكا حوكمدارە و بۆچوونێن وێ یێن سیاسی و ئابووری و جڤاكییە. هەروەك دهێتەزانین دەولەتا ئوسمانی د قۆناغێن داویێ یێن حوكمدارییا خۆدا كەتبوو د قۆناغەكا لاوازی و بێ سەروبەرییا سیاسی و ئابووریدا، و ڤێ چەندێ ژی باندۆرا خۆ كربوو سەر رەوشا وێ یا كارگێری و ژوێ ژی رەوشا ساخلەمی ل هەموو ئەو دەڤەرێن دكەتنە ژێر دەستەلاتدارییا ئوسمانی ژ وان ژی ویلایەتا مووسل و قەزایێن وی كو قەزایێن نهایێن پارێزگەها دهۆكێ (دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ و ئاكرێ) ب خۆڤە دگرت.

سەرەرای هەموو بزاڤێن ب مەرەما چاكسازیێ هاتینەكرن ل دووڤ وان راپۆرتان یێن دهاتنەبلندكرن بۆ ستەنبۆلێ و تێدا ئاگاداری ل سەر پێدڤیاتیا چاكسازیێ دهاتەكرن و قەبارێ ڤێ گەندەلیێ بەرچاڤدكر لێ پێكهاتا كارگێرییا ئوسمانی پێكهاتەك گەندەل بوو[1]. ژ ئالیێ دیڤە دەولەتا ئوسمانی ئەو گرنگی ب دابینكرنا خزمەتگوزاریێن پێدڤی ژ كەرەستێن خوارنێ و ئاڤێ و خزمەتگوزاریێن

ساخلەمیێ و ڤەكرنا رێكان و یێن دی بۆ وەلاتیێن خۆ نەددا[2]. سەروبەرێ خەلكی ب درێژیا خیچا ناڤبەرا بەغدا و زاخۆ سەروبەرەك پڕ نەخۆش و دژوار بوو[3].

## - سەروبەرێ ساخلەمیێ مرۆڤی ل زاخۆ

ل داویا سالا ١٨٨٨ ئێشەكا مەترسیدار زاخۆ ڤەگرت ئەو ژی ئێشا كولێرا بوو[4]. یا بوویە ئەگەرێ چەندین قوربانییان د ناڤ خەلكێ قەزاییدا[5]. هەروەسان ل سالا ١٩٠٩ێ ئێشا (حبە بغداد اللاشمانیا)[6] گوندێ پێشەبیابویرێ ڤەگرت[7]. ژ ئەنجامێ كێم پویتەپێدانا حكومەتا ئوسمانی ب ئالیێ ساخلەمیێ زێدەباری تێكچوونا سەروبەرێ ساخلەمیێ ل زاخۆ و دەڤەرێن دیترێن كوردنشین ل سەر دەمێ ئوسمانی و شاهینیێ عیراقێ، ژینگەهێ باندۆرەك مەزن ل سەر تێكچوونا سەروبەرێ ساخلەمیێ ل زاخۆ هەبوو، ژ بەركو زاخۆ یا كێم پاقژی بوو و بوونا رووبارێ خابویری و لڤێن وی و گەرێن ئاڤا پەنگیای و زێدەبوونا رێژا شێ (رطوبەتێ) ل نێزیكی رووباری و ڤەمان و خرڤەبوونا ئاڤا بارانێ و گەنی ل بەردەرێ مالێن زاخۆ و دەوروبەرێن وێ و نەبوونا سیستەمێن ڤەرێژا ڤان ئاڤان. هەروەسان هژمارا زۆرا برك و گەرێن ئاڤێ كو پتریا وان ژ ئەنجامێ چاندنا برنجی و دارێن سپینداران كو ب بەرفرەهێ ل دەڤەرێ دهاتنەچاندن[8]، هەروەسان نە شارەزاییا خودانێن چەمان د ئاڤدانا چەمێن خۆدا كو د هندەك جوكێن كویردا ئاڤددان ئەڤەژی د بوو ئەگەرێ ڤەمان و پەنگیانا ئاڤێ د هەمان دەمدا دبوو هاریكار بۆ ڤەژیان و زێدەبوونا پێشـیا مەلاریایێ[9]. ئەڤ فاكتەرە و فاكتەرێن پێشتر ئاماژە پێ هاتیەكرن بوونە ئەگەرێ هندێ زاخۆ ببیتە ماكا نەساخییان ب تایبەت ئێشا مەلاریایێ[10]. زێدەباری ڤێ هەموویێ نەبوونا تۆڕا دابەشكرنا ئاڤا ڤەخوارنێ ل زاخۆ كو هەتا سالێن سیهان ژی حكۆمەتێ چ گرنگی ب پرۆژێن ئاڤا ڤەخوارنێ ل زاخۆ نەددا، ئەڤە ژی ئەگەرێ هندێ بوو خەلك بۆ ڤەخوارنێ ئاڤێ ب رێكێن دەسپێكی ژ رووبارێ خابویری بینیت[11].

هەروەسان نەبوونا سیستەمەكێ رادانا ئاڤێن پیس و تەوالێتان و زێدەبوونا گلێشی و گویفانكان ل ناڤ بازێری، زێدەباری گرنگیدانا خەلكێ ب سامانێ ئاژەلی و خودانكرنا گیانەوەران د ناڤ بازێریدا و تێكەلیا راستەوخۆ یا خەلكی دگەل ئاژەلان رێخۆشكەربوون بۆ بەلاڤبوونا چەندین رەنگێن میكروبان یێن زیان دگەهاندنە بەرهەمێن چاندنێ و پاشتر ژی راستەوخۆ و نە راستەوخۆ زیان دگەهاندنە ساخلەمیا خەلكێ. د هەمان دەمدا پرانیا خانیێن زاخۆ ژ ئاخێ هاتبوونە ئاڤاكرن ئەڤە ژی رێخۆشكەر بوو بۆ ڤەحەویانا مێش و مەگەز و مشك و مووران (الحشرات و القوارض- كرتەكان)ئەڤە هەموو هاندەر بوون بۆ بەلاڤەبوونا ئێشێن ڤەگر ل زاخۆ[12]. زێدەباری ڤێ هەموویێ جهێ وێ د كەفتە سێگوشا سنوورێ عیراقێ- تركیا و سوریا هاریكار بوو بۆ هاتنا چەندین ئێش و نەساخییان كو ب رێكا عەشیرەتێن گەرۆك و كوچەر دهاتنە دەڤەرێ و پاشتر ژی دێ بەرفرەتر ئاماژە پێ كەین.

زێدەباری فاكتەرێ جوگرافی و ژینگەهێ كو باندۆرەك مەزن د خراپبوونا سەروبەرێ ساخلەمیێ یێ زاخۆدا هەبوو، مرۆڤی ب خۆ ژی رۆلەك مەزن د تێكچوونا ڤی سەروبەریدا هەبوو، بۆ نموونە بەرپرسێن كارگێری ب تایبەت قائیمەقام و رێڤەبەرێن ناحیان چ خەم ژ پاقژیا زاخۆ و ناحیێن سەر ب وێ ڤە نەدخوار[13]، د ڤی واریدا راپۆرتەكا حكۆمەتێ یا ل چریا دووێ ١٩٣٧ێ هاتییەبلندكرن بۆ وەزارەتا ناڤخۆیی ئاماژە ب پشتگوهڤەهاڤێتنا گوندێ شەرانشێ و گرنگی نەدانا رێڤەبەرێ ناحیێ ب پاقژیا گوندی كریە و تێدا هاتییە: (ئەوا سەرنجا من راكێشای پیسیا گوندێ شەرانشێ مەلبەندێ ناحیێ و پشتگوهڤەهاڤێتنا كۆلان و مالێن وێ و بەلاڤەبوونا گلێشی بوو ل هەموو جهان... پێدڤی بوو ل سەر رێڤەبەرێ ناحیێ ئەركێ خۆ د پاقژ راگرتنا بەردەوام و سەروبەركرنا گوندی و نەهێلانا شوینەوارێن پشتگوهڤەهاڤێتنا زێدەیا گوندی ب باشی بگێریت...)[14] هەروەسان حكۆمەتێ

گرنگی ب ئاڤاهیێن خواندنگەهان نەددا ب تایبەت ژی ل گوندان کو پرانییا وان مەرجێن ساخلەمیێ تێدانەبوون و بکێر پروسا خواندنێ نەدهاتن[15]. ئەڤە ژی ئەگەرێ هندێ بوو پرانییا خویندکاران توشی نەساخیان ببن.

یا پتر ژی بوویە ئەگەرێ تێکچوونا سەروبەرێ ساخلەمیی ل زاخۆ وەك هەموو دەڤەرێن دیترێن کوردان ب تایبەت د دەهسالیێن بەراهیێ یێن سەردەمێ شاهینیێ عیراقێ ئانکو سەردەمێ ئینتیدابا بریتانی ئاستێ نزمێ فێربوونێ ئانکو نەخویندەوارییا خەلکی بوو، د ئەنجامێ ڤێ چەندێدا چ رەنگەك ژ هشیارییا ساخلەمیێ ل جەم خەلکی نەبوو. هەروەسان هەژاریا ژ ئەنجامێ تێکچوونا سەروبەرێ ئابووری دروستبووی ئەگەرەکێ دیترێ بەربەلاڤبوونا نەخۆشییان بوو[16]. زێدەباری هندەك تیتالێن جڤاکی و نەبوونا چاڤدێرییا جڤاکی و بێ باهربوونا خەلکی ژ خزمەتگوزاریێن ڤەگوهاستنێ و گەهاندنێ و ئاڤاڤەخوارنێ و کارەبێ[17]. هەروەسان کێمبوونا خزمەتگوزاریێن چارەسەریێ بۆ خەلکێ و باندۆرا سەقایێ دەڤەرێ ب تایبەت بلندبوونا پلێن گەرماتیێ ل هاڤینێ ئەگەرەکێ راستەخۆیێ مرنا هژمارەکا زۆرا زارۆکان بوو[18].

هەروەسان هەتا داوییا سالێن چلان ژ‌بلی بنگەهێن ساخلەمیێ ل قەزایێ چ نەخۆشخانە ل زاخۆ نەبوون، نۆشدار (دکتور) ژی تنێ ل مەلبەندێ قەزایێ هەبوو و د پرانییا دەماندا ژی تنێ یەك نۆشدار بوو، ژ بەر ڤێ چەندێ ژی نۆشداریا مللی ل دەڤەرێ یا بەربەلاڤبوو و هەموو پێزانینێن ئەوێن ئەڤ کارە دکرن هندەك زانیاریێن زاردەڤ بوون و ئەڤ پیشەیە ب میرات ژ باب و باپیرێن خۆ وەرگرتبوو. هەژیە ل ڤێرێ بێتەگۆتن کو سێحرباز و فێلبازان ل زاخۆ وەك هەموو دەڤەرێن کوردان ب مەرەما پاراستنا بەرژەوەندیێن خۆ رۆلەك مەزن ژ دوورکرنا خەلکی ژ سازیێن ساخلەمیێ هەبوو [19].

ل دووڤ ئامارێن بۆ نەخۆشیێن ڤەگر یێن بەربەلاڤ ل لیوا مووسل د قۆناغا ل رۆژا ١٧ تیرمەها ١٩٣١ێ ب داویهاتی ژ بۆ نەخۆشیێن بەربەلاڤ ل لیوا مووسلێ هاتینەکرن دو نەخۆشیێن خوریکان (الجدری) هەبوون[20]. پێنج تووشبوویێن نەخۆشییا بنگوهکی (النکاف)[21] ل باژێرکێ زاخۆ هەبوون[22]. ل سالا ١٩٣٢ێ سەگەکێ بەردایێ توشی نەخۆشییا هارییا سەگان[23] بووی هاتە دناڤ گوندێ سەناتێ دا و گەلەك ژ خەلکێ گوندی بریندارکرن و یەك ژ وان ژ ئەنجامێ برینێ مر[24]. ل چریا ئێکێ ١٩٣٥ێ نەخۆشییا مەلاریا و بلهارزیا[25] و خەندەکوك (قورباجە- الخناق) و هندەك نەخۆشیێن کێمێن زهری[26] ل ناڤ باژێرکی بەلاڤبوون، بەلێ توشبوویێن نەخۆشییا زهری ل ناحیا گولی هێژ پتر بوون[27]. هەروەسان راپۆرتێن حکومی یێن ل سالا ١٩٣٧ێ هاتینەبلندکرن بۆ وەزارەتا ناڤخۆیی ئاماژە ب تووشبوونا قەزا زاخۆ ب مەلاریایێ و پێدڤیاتییا گرتنەبەرا کریارێن پێویست بۆ نەهێلانا ڤێ نەخۆشیێ دکەن[28]. هەروەسان ئاماژە پێ دهێتەکرن کو ل مەها تەباخا ١٩٣٨ێ نەخۆشییا زهری د ناڤ خەلکێ قەزا زاخۆ ب تایبەت ناحیا گولی یا بەربەلاڤبوو و تێبینی دهێتەکرن ئەڤ نەخۆشییە ب تایبەت ل جەم وان کەسان هەبوو ئەوێن ژ پشت سنوورێ ژووریێ قەزایێ ڤە هاتین[29].

د سەرژمێریەکێدا کو ب رێکا بنگەهێن ساخلەمیێ ل قەزایێن لیوا مووسلێ بۆ نەخۆشیێن بەربەلاڤ ل قەزا و ناحیە و گوندێن سەر ب لیوا مووسلێ ڤە ل تەباخا ١٩٤٧ێ هاتییەکرن، تنێ ل بنگەهێن ساخلەمیێ یێن قەزا زاخۆ بلندترین رێژا نەخۆشیێن مەلاریا و تراخوما هاتبوونە توومار کرن[30]، بنگەهێ ساخلەمیێ یێ قەزا زاخۆ ١٨٥٥ تووشبوویێن نەخۆشییا مەلاریا و ٥٢١ تووشبوویێن تراخومایێ توومارکربوون، بەلێ بنگەهێ ساخلەمیێ ل ل ناحیا گولی ٢٢٠ تووشبوویێن مەلاریایێ و ٦٢ یێن تراخومایێ توومارکربوون، ئەگەرێ بەلاڤبوونا نەخۆشییا مەلاریایێ ل سنوورێ قەزا زاخۆ زڤراندینەڤە بۆ بوونا برك و گەرێن ئاڤا ڤەمای و ئەگەرێ زێدەبوونا رێژا نەخۆشییا تراخومایێ ژی زڤراندینەڤە بۆ کێمباڤژیێ ل قەزایێ[31].

ل سالا ١٩٤٩ێ تووشبوویەکێ نەخوشییا ئێشا زراف سلێ (التدرن الرئوی)[٣٢] و (٦٣) تووشبوویێن تراخومایێ (٢)یێن مەلاریایێ و (٤)یێن کێمخوینیێ (فقرالدم) ل ناڤ خواندنگەها زاخۆ یا دووێ دا هاتنەتوومارکرن. ل کانوونا ئێکێ ١٩٥٠ێ دو تووشبوویێن کەچەلیێ (القرع سعفە الراس) کو نەساخییەکا ڤەگربوو دناڤ خویندکارێن خواندنگەها سەناتێ هاتنەدیتن و نەخۆشخانا مەلکی ل زاخۆ ژ بۆ چارەسەریێ ئەو هنارتنە نەخۆشخانا مەلکی ل مووسلێ. ل شباتا ١٩٥٢ێ ژ بەر تووشبوونا شەش خویندکارێن خواندنگەها هەوریسکێ ل ناحیا سلێڤانەیی ب نەخۆشییا بنگوهکی و ب مەرەما بەلاڤنەبوونا نەخۆشییێ ل ناڤ خویندکارێن دیتر و زارۆکێن گوندی ئەو خواندنگەهە بۆ دەمێ ١٥ رۆژان هاتەگرتن و خواندنێ ل خواندنگەهێ هەتا ١٢ ئادارا ١٩٥٢ێ دەسپێنەکرەڤە هەتا هەموو خویندکارێن تووشبووی ساخ نەبووینەڤە. هەروەسان ل ئەیلوولا ١٩٥٣ێ هندەك تووشبوویێن کەچەلیێ ل ناڤ خویندکارێن خواندنگەها مارسیس ل ناحیا سندی هاتنەدیتن[٣٣].

هەروەسان ل سالێن ١٩٥٣ و ١٩٥٤ و ١٩٥٥ هندەك تووشبوویێن نەخۆشییا تایا رەش (الحمی السوداء) یان (اللیشمانیا الحشویە)[٣٤] ل دەڤەرا مووسلێ و بەغدا دەرکەتن، تووشبوویێن مووسلێ د بەلاڤەبوون ل گوند و دەڤەرێن دەوروبەران ژ وان ژی پێشییابورێ ل زاخۆ[٣٥]. ل هاڤینا ١٩٥٤ێ ئێشا سورکان (الحصبە) [٣٦]ل سەناتێ بەلاڤەبوو، و بۆ دەمێ سێ هەیڤێن تەواو ڤێ نەخۆشیێ ئەڤ گوندە ڤەگرت بۆ ئەگەرێ مرنا پتر ژ (٣٠) زارۆکان[٣٧]، هەر ب ڤی رەنگی ئەڤ ئێشە ل مەلبەندێ ڤەزایێ ژی یابەلاڤبوو[٣٨].

زێدەباری نەساخیێن مە ئاماژە پێکری د سەردەمێ ئەڤ ڤەکۆلینە ژێ دگریت هندەك نەخۆشیێن دیتر ل زاخۆ د بەلاڤبوون، و هندەك ژ وان ب ناڤێن خۆجهی د هاتنەناسین وەك نەخۆشییا صانجی، ڤولنج، گوگمە، روماتیزم، پشتئێشان و نەخۆشیێن پێستی و یێن دیتر[٣٩].

## -سەروبەرێ ساخلەمییا گیانەوەری ل زاخۆ

گرنگیی نەدان ب ساخلەمیێ ل زاخۆ نە تنێ ژ ساخلەمییا مرۆڤی دگرت بەلکی ژ ساخلەمییا گیانەوەری ژی دگرت،هەرچەند زاخۆ ژ دەڤەرێن دەولەمەند بوو ب سامانێ گیانەوەری بەلێ حکۆمەتا عیراقی چ پویتە ب سامانێ گیانەوەری نەدکر و هەتا سالا ١٩٣٢ێ ئانکو پشتی داویهاتنا ئینتدابا بریتانی ل عیراقێ نە بنکەهەکێ ساخلەمییا گیانەوەری نە ژی کادرەکێ بەیتەری ل زاخۆ هەبوون، دێ پاشتر ئاماژە ب ڤێ هەموویێ کەین.

ژ بەر ڤێ چەندێ ژی تشتەکێ غەریب نینە ئەگەر ئێشێن گیانەوەری ل ڤێ ڤەزایێ بەلاڤببن. بۆ نموونە ل نیسانا ١٩٢٣ێ ئێشا (ابو هـدلان)[٤٠] ل ناحیا سلێڤانەیی بەلاڤبوو و بەلاڤبوونا وێ یا بەردەوامبوو، دهێتەگۆتن ئەگەر بزاڤێن ئەفسەرێ بەیتەریێ مەلکی ڤێرا نەگەهشتبا دا ئەڤ ئێشە بیتە ئەگەرێ زیانێن مەزن بۆ خودانێن تەرش و کەوالان، لێ پشتی ڤاکسیدانان و چارەسەرکرنا سەرکەفتییا (٣٧٩) سەرێن پەزی یێن تووشبووی چ دی چێنەبوو[٤١]. هەمان ئەڤ ئێشا (ابو هدلان) ل دەسپێکا ١٩٢٥ێ ب رێکا عەشیرەتێن کوچەر یێن ل جهێن جودا جودا بەلاڤەبووین ژ رووبارێ هیزل دەرباز بوو و ل زاخۆ بەلاڤەبوو و ژ وێرێ گەهشتە دەڤەرا دهۆکێ و پشکا مەزنا لیوا مووسل ڤەگرت، ٣٠ جاران ئەڤ ئێشە ل مووسلێ بەلاڤەبوو و دئەنجامدا ١٢١٨ سەرێن پەزی کوشتن (٤٨ ژ وانا پشتی ڤاکسینداناێ) و هژمارا سەرێن پەزی یێن ڤاکسینداین گەهشتە ٧٣٧٦ سەران، هاتییەگۆتن ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ گەلەك پێدڤی هاتەدیتن ڤانوونا نەخۆشیێن گیانەوەری بێتەپەسەندکرن[٤٢].

هەروەسان ل گولانا ١٩٣٥ێ هندەك گیانەوەرێن گوندێ نزدورێ ئێشا (البجل) ڤەگرت[٤٣]، هەرچەند کارێن پێدڤی بۆ هاتنەکرن، بەلێ کونترۆل ل سەر نەهاتەکرن و ئێش ل گوندێن دی یێن زاخۆ ل هەر یەك ژ پێشییابورێ و دێرەبوونێ و باجدا بەلاڤەبوو[٤٤].

دهێتەگۆتن د ئەنجامێ ئەو پێرابوونێن فەرمانگەها بەیتەریا مووسلێ ب مەرەما چارەسەریا ڤێ ئێشا گیانەوەرێن زاخۆ ڤەگرتی گرتینەبەر ل ئەیلوولا ١٩٣٥ێ ئەڤ ئێشە هاتەژناڤبرن و شوینەوارێن وێ نەمان[٤٥]. هەروەسان ل سالا ١٩٣٥ ئێشا گوریبوونا زكماك هەسپێن پولیسێن زاخۆ ڤەگرتن[٤٦].

## خزمەتگوزریێن ساخلەمیا مرۆڤی و گیانەوەری ل زاخۆ

هندی پەیوەندی ب خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ ل داویا سەردەمێ ئوسمانی ڤە ل زاخۆ هەی، د سالنامێن ئوسمانیدا چ ئاماژەیەك ب بوونا بنكەهەكێ ساخلەمیێ یان نۆشدارەكی یان كارمەندەكێ ساخلەمیێ ل زاخۆ نینە، ئەڤە ژی نیشانا هندێیە كو ئالیێ ساخلەمیێ ل زاخۆ ژ ئالیێ دەولەتا ئوسمانی ڤە هاتبوو پشتگوههاڤێتن و كێماسیەك مەزن د خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ دا هەبوو. بەلێ د چوارچوڤێ وان پێرابوونان یێن دەولەتا ئوسمانی گرتینەبەر بۆ بەرسنگگرتنێ ل گەلەك ژ وان ئێشان یێن ویلایەتا مووسلێ ڤەدگرت ئاماژەیەك ب بوونا بنكەهەكێ كونترۆلكرنا ساخلەمیێ (حجر صحی) ل زاخۆ هەیە[٤٧]. هەروەسان ل داویا سەردەمێ ئوسمانی نۆشدارێ ئەرمەنی ئیسترجیان ل زاخۆ كاردكر[٤٨]، نۆشدارێ ناڤبری ل كانوونا یەكەم ١٩١٣ێ وەك نۆشدارێ رەسمیێ ویلایەتا مووسلێ هاتییەدامەزراندن[٤٩]. وی نۆشداری سەرپەرشتیا هەرچوار قەزایێن كوردی (زاخۆ، دهۆك، ئامێدیێ و ئاكرێ)[٥٠] دكر و زاخۆ كربوو سەنتەرێ كارێ خۆ[٥١]. بەلێ وی ژی د بیرهاتنێن خۆدا ئاماژە ب سەروبەرێ ساخلەمیێ ل زاخۆ نەكریە.

هندی پەیوەندی ب كارگێریا بریتانی ڤە ل زاخۆ هەی، ئاشكرایە كو پشتی ب داویهاتنا شەرێ جیهانیێ یەكەم عیراق ژ ئالیێ هێزێن بریتانی ڤە یا داگیركربوو ئەوێن ل ١٠ چریا دووێ ١٩١٨ هاتینە د بازێرێ مووسلێ دا[٥٢]. و هەمان هێز ل ٢٠ چریا دووێ ١٩١٨ێ هاتنە د زاخۆ دا[٥٣]. ب ڤێ چەندی و ل ژێر دەستەلاتداریا بریتانیدا زاخۆ بوو یەك ژ حەفت قەزایێن لیوا مووسلێ كو: مووسل (سەنتەرێ ویلایەتی)، ئاكرێ، ئامێدیێ، تەلەعفر، دهۆك، زاخۆ، شنگال بوون[٥٤]. دەربارەی سەروبەرێ ساخلەمیێ ل زاخۆ د ڤێ قۆناغێدا یەكەمین بنكەهێ ساخلەمیێ لێ هاتەڤەكرن[٥٥].

پشتی دامەزراندنا حكۆمەتا عیراقی یا بەروەخت فەرمانگەها ساخلەمیێ دگەل وەزارەتا زانیاری (المعارف- پەروەردە) هاتەگرێدان و وەزارەتێ شیرەتكارەك هەبوو سەرپەرشتیا كاروبارێن زانیاری و ساخلەمیێ پێكڤە دكر. ل ١٢ ئەیلوولا ١٩٢١ێ رێڤەبەریا گشتی ب وەزارەتەكا تایبەت ب ناڤێ وەزارەتا ساخلەمیێ هاتەگوهارتن[٥٦]. ئەوا ل ٨ێ حوزەیرانا ١٩٢٢ێ هاتییە هەلوەشاندن ب ناڤێ رێڤەبەریا گشتیا ساخلەمیێ دگەل وەزارەتا ناڤخۆیی هاتییەگرێدان[٥٧]. هەر لیوایەكێ سەرۆكەكێ ساخلەمیێ هەبوو یێ سەر ب رێڤەبەریا گشتیا ساخلەمیێ ڤە بوو، د دەمێ پێدڤیدا نۆشدارەكی كو ل مەلبەندێ لیوایێ كار دكر جهێ وی دگرت، ل قەزا و ناحیان ژی نۆشدارێن سەر ب سەرۆكاتیا ساخلەمیا لیوایێ سەرۆكاتیا وێ دكر[٥٨].

ژ دەسپێكا دەهسالیا سیێ ژ سەدسالیا بیستێ ڤە ل سەر ئاستێ زێدەكرنا هژمارا نەخۆشخانە و بنكەهێن ساخلەمیێ و چالاكیێن نۆشداریێ ل مووسلێ پێشڤەچوونەكا بەرچاڤ ب خۆڤە دیت، هندی پەیوەندی ب زاخۆ و دامەزراندنا سازیێن ساخلەمیێ ل ڤێ قەزایێ هەی تالب مۆشتاقێ[٥٩] هەڤالبەندێ راگەهاندنێ (المرافق الاعلامی) یێ وەصی عەبدولئیلاهی[٦٠]، د سەرەدانا خۆیا ١٧ تەباخا ١٩٣٩ێ بۆ قەزا زاخۆ ئاماژە ب سازیێن ساخلەمیێ ل مەلبەندێ قەزایێ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە كریە كو: ژ پێنج بنكەهێن ساخلەمیێ پێكدهێن دكتورەك كاروبارێن وان ب رێڤەدبەن و پێنج بیرنپێچ و داپیرك و پشكێنەرەكێ ساخلەمیێ (مفتش صحی) هاریكاریا وی دكەن دگەل دو كرێكارێن ژناڤبرنا پێشوویان و شەش برینپێچێن ژن

و زەلام، د راپۆرتێدا هاتییە ئەڤ سازینێن ساخلەمیێ تێرا پێدڤیاتیا ٣٤ هزار کەسان ژ خەلکێ دەڤەرێ ناکەن و پێشنیازدکەت نەخۆشخانەیەك ل باژێری بێتەڤەکرن و فەرمانبەرەکێ ساخلەمیێ ل میلاکی بێتەزێدەکرن دگەل دابینکرنا بنکەهەکێ گەرۆکێ ساخلەمیێ[٦١] بۆ گوندێن ڤەدەر[٦٢].

ل زاخۆ چەند سازیەکێن ساخلەمیێ د دەمێن جودادا هاتنەڤەکرن: بنکەهەهێ مەلکیێ زاخۆ (سالا ١٩٢٢ێ هاتییەڤەکرن[٦٣])، فەرمانگەها بەیتەریا زاخۆ (سالا ١٩٣٣ێ هاتییەڤەکرن)[٦٤]، بنکەهێ ساخلەمیێ یێ سندی (ل سالا ١٩٣٦ێ هەبوو)[٦٥]، بنکەهێ ساخلەمیێ یێ گولی (سالا ١٩٣٦ێ هەبوو)، بنکەهێ ساخلەمیێ ل هەوریسکێ (سالا ١٩٣٨ێ هاتییەدامەزراندن)، بنکەهێ ساخلەمیێ ل ئاسهێ (سالا ١٩٣٨ێ هاتییەدامەزراندن)[٦٦]، نەخۆشخانا زاخۆ (ل سالا ١٩٤٥ێ رەزامەندی ل سەر دامەزراندنا وێ هاتییەکرن[٦٧] و سالا ١٩٤٨ێ هاتییەڤەکرن[٦٨]) و بنکەهێ ساخلەمیێ ل سەناتێ (سالا ١٩٥٧ێ هاتییەدامەزراندن[٦٩]).

ژ نۆشدارێن(دکتورێن)زاخۆ د قۆناغا ڤەکۆلینا مە ژێ دگریت: جەمیل ئەفەندی (ژ ٢٦چریا یەکەم ١٩٢٥ێڤە بریارا ڤەگوهاستنا وی ژ زاخۆ بۆ سەماوە دەرکەتیە[٧٠])، بابا برهاد[٧١] ژ ٢٦ چریا یەکەم ١٩٢٥ێڤە ب رەنگێ بەروەخت ل بنکەهێ ل زاخۆ شوونا دکتور جەمیلی هاتییەدانان[٧٢])، ئەی جی برۆدی (A. G. Brodi) (ل ١ چریا دووێ ١٩٢٥ێ وەك دکتوری بنکەهێ ساخلەمیێ مەلکی ل زاخۆ هاتییەدامەزراندن)،شاکر فرەنجیە (ل ٥ کانوونا یەکەم ١٩٢٩ وەك دکتور ل زاخۆ هاتییەدامەزراندن)، د. ئیستیفان (ل ٢٠ کانوونا یەکەم ١٩٣٠- ١٩٣٣وەك دکتورێ زاخۆ هاتییەدامەزراندن، عەوەز موقسیدی (ل سالا ١٩٣٢ێ دکتور بوو ل زاخۆ[٧٣])، یوسف شینا (ل سالا ١٩٣٥ێ دکتور بوو ل زاخۆ[٧٤])، شەوکەت ئەفەندی مەهدی (ل سالا ١٩٣٥ێ هاریکارێ دکتورێ بەیتەری بوو ل زاخۆ[٧٥])، جەعفەر محەمەد کەریم[٧٦] (ل سالێن چلان دکتورێ لەشکەری بوو ل زاخۆ[٧٧])، عیسا یوسف (هاریکارێ نۆشداری بوو ل زاخۆ ل ئادارا ١٩٤٩ێ هاتەڤەگوهاستن بۆ شنگالی[٧٨])، بوترس فەرجو(دەسپێکێ وەك دکتورەکێ بەروەخت بۆ دەمێ سێ هەیڤان ل بنکەهێ ساخلەمیێ ل زاخۆ هاتییەدامەزراندن[٧٩]، پاشتر د سالێن ١٩٤٨- ١٩٤٩- ١٩٥٢ وەك دکتور لێ هاتییەدامەزراندن)، مونیر شلومو (ل سالا ١٩٥٣ێ دکتور بوو ل زاخۆ)، تەحسین فرەنکول (د ناڤبەرا ١٩٥٤[٨٠]- ١٩٥٧ێ[٨١] دکتور بوو ل زاخۆ)، هەژیە بێتەگۆتن یەکەمین کەسێ ل زاخۆ مولەتا کارکرنێ د پیشەیا چێکرنا ددانادا ژ ئالیێ رێڤەبەریا گشتیا ساخلەمیێ سالا ١٩٣١ێ وەرگرتی عەبدوللا عەلی عەبدوللا ئاغایە[٨٢]، هەروەسان د وێ قۆناغێدا یا ئەڤ ڤەکۆلینە ژێ دگریت داپیرکێن مولەتدای ئانکو ئەوێن مولەتا فەرمیا کارکرنێ هەی هەبوون ناڤدارترینێن وان: شیتە عەبدوللا (مووسلی بوو ل مەلبەندێ قەزایێ)، توتو شونی (ل گوندێ سەناتێ ناحیا سندی)[٨٣]، ل دووڤ ئامارا ١٩٤٧ێ هژمارا ئەوێن د کارێ نۆشداری و ساخلەمیێ و دەرمانسازیێ[٨٤] ل قەزا زاخۆ کاردکر ل سالا ١٩٤٧ێ ٢٣ فەرمانبەر بوون [٨٥].

د چوارچووڤێ هەولێن حکۆمەتێ ژ بۆ باشکرنا سەروبەرێ ساخلەمیێ ل لیوا مووسلێ حکۆمەتا عیراقێ ل سالا ١٩٣٥ێ بریارا پاراستنا پەزی و موویێ وی ژ نەساخییاندا، بۆ ڤێ مەرەمێ ژی ل چەندین مەلبەندێن لیوا مووسلێ برکێن نقورکرن (تغطیس) ا پەزی دانان، مەلبەندێ نقورکرنا زاخۆ یەك ژ وان مەلبەندان بوو[٨٦]، ل مەها چریا یەکەم ١٩٥٣ێ ٥٧٧٧سەرێن پەزی ل زاخۆ هاتنە نقورکرن[٨٧]، هەروەسان خودانێن پەزی ل ناحیا سندی ژی ل چریا یەکەم ١٩٣٥ێ پەزی خۆ نقورکر.

هەروەسان قائیمەقامێ زاخۆ سالم نامق دگەل نۆشدارێ بەیتەریێ مووسلێ ئەلبرایر (Alberayar) ل تەباخا ١٩٣٦ بۆ دیتنا سەروبەرێ بەیتەریێ گەریانەك ل زاخۆ کرن، هەر دچوار چووڤێ نەهێلانا مەلاریایێ ل چریا یەکەم ١٩٣٦ێ کارێ بنئاخکرنا (ردم) گەرێن پەنگیای ژ ئالیێ لیژنەکا پێکهاتی ژ

قائیمەقام و سەرۆكێ بازێرڤانیێ و ئەندامێن جڤاتا كارگێری هاتەئەنجامدان[٨٨].

ل رۆژا ٢٩ كانوونا دووێ ١٩٣٧ێ لقێ كۆمەلا پاراستنا زارۆكان[٨٩] ل مووسلێ هاتەدامەزراندن، دەستەكا كارگێریا كۆمەلەیێ ژ كۆمەكا هەڤژینێن مەزنە بەرپرسێن دەولەتێ ل مووسلێ هاتەهەلبژارتن، لەتیفا ئەحمەد عیزەت قاسم ئاغا هەڤژینا (سالم القاسم اغا) سالم نامق ێ قائیمەقامێ زاخۆ ئەنداما وێ جڤاتێ بوو[٩٠].

د بەردەوامیا چالاكیێن وارێ ساخلەمیێدا سەرۆكاتیا ساخلەمیا مووسلێ بریار دا دەستەكەك ژ نۆشدارێن نەخۆشخانا مەلكیا مووسلێ د چوارچووڤێ هەفتیەكێدا كو ب (هەفتیا ساخلەمیێ ل لیوا مووسلێ) هاتبوو ناڤكرن و ژ ئێكێ گولانا ١٩٣٧ێڤە دەسپێدكر سەرەدانا قەزایێن (دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ، ئاكرێ و شێخان) وگوندێن سەر ب وانڤە بكەن و د ناڤ بەرنامێ هەفتیا ئاماژەپێكریدا سمینارێن ساخلەمیێ پێشكەشبكەن و نەخۆشان دەرمانبكەن و هندەك نشتەرگەریێن پێدڤی ئەنجامبدەن و زارۆكێن خەلكی و فەرمانبەران سنەت بكەن[٩١].

ژ بەركو ئاڤا بكێرڤەخوارنێ نەهێت ئەگەرێ بەلاڤبوونا چەندین نەخۆشیانە مینا (كولێرا و زكچوونێ)، لەوما ژی سەرۆكاتیا ساخلەمیێ ل شباتا ١٩٤١ گرنگی دا ب دامەزراندنا ئامرازەكێ تافیكرنا ئاڤێ ل عەینسفنێ (شێخان) و بەرفرەهكرنا پرۆژێ ئاڤێ ل دهۆكێ و بانكرنا عمبارا ئاڤا زاخۆ[٩٢]. هەروەسان ل كانوونا یەكەم ١٩٤٢ێ كارانتیا ساخلەمیێ (حجر صحی) ل زاخۆ هاتەدانان ئەو ژی بۆ ئەو كوچەرێن نەخۆشیا خوریكان (الجدری) ڤەگرتین[٩٣].هەوا نەهێلانا مەلاریایێ ل سالا ١٩٤٣ێ سەركەتن دەستڤەئینا ل دووڤچوون و دەسنیشانكرنا جهێن دانا هێكێن پێشیا مەلاریایێ و داگرتنا وان جهان ب ئاخێ[٩٤]. زێدەباری ڤێ هەموویێ سەرۆكاتیا ساخلەمیا مووسلێ دو بنكەهێن ساخلەمیێ یێن گەرۆك ب هەموو پێدڤیاتیێن نوشداری و دەرمانڤە ب مەرەما ژ ناڤبرنا مەلاریایێ هنارتنە زاخۆ و ناحیێن وێ و ب هەمان شێوە هنارتنە دهۆك و ئامێدیێ و گوندێن هاڤینگەهان[٩٥].

ژبەربەلاڤبوونا نەخۆشیا كولێرایێ ل سالا ١٩٤٧ێ ل هندەك گوندێن سوریێ،سەرۆكاتیا ساخلەمیا مووسلێ پێرابوونێن پێدڤی گرتنە بەر ژ بەلاڤنەبوونا ڤێ نەخۆشیێ ل سنوورێ لیوا مووسلێ، ژ پێرابوونێن بۆ ڤێ مەرەمێ گرتینە بەر ڤاكسیندانانێ بۆ خەلكێ گوند و ناحیەیێن سەر سنوورێ سوریێ- عیراقێ و شاندێن ساخلەمیێ یێن پێكهاتی ژێ دكتورەكی و دو كارمەندێن ساخلەمیێ و دو برینپێچان و هاریكارێن وان ژبۆ ڤاكسیندانانێ بۆ خەلكی گوندێن هەردو قەزایێن تەلەعفەر و شنگالێ و ناحیێن شرگات و شورە و حەمیدات و شاندێن ب وی رەنگی هنارتنە قەزا زاخۆ و دەڤەرا پێشخابوێرێ و سلێڤانەیی[٩٦].

د هندرێ پویتەپێدانا حكۆمەتێ ب ساخلەمیا خواندنگەهان و بلندكرنا ئاستێ ساخلەمیێ یێ خویندكار و مامۆستایان، ل چریا دووێ ١٩٤٨ێ برینپێچێ بنكەهێ ساخلەمیێ یێ هەوریسكێ دەرزیكێن دژی نەساخیا خوریكان بۆ ٦٠ خویندكارێن خواندنگەها هەوریسكێ دانان، هەروەسان نۆشدارێ زاخۆ بتروس فرجو ل ١٥ كانوونا یەكەم ١٩٤٨ێ هەمان دەرزیك بۆ ١٧٠ كەسان ژ خویندكار و ستافێ فێركرنێ یێ خواندنگەها زاخۆ یا دووێ دانان، هەروەسان دەرزیكێن دژی نەساخیا تیفوئیدێ[٩٧]بۆ ١٢٦ خویندكارێن هەمان خواندنگەهێ دانان[٩٨]. و ل چریا دووێ ١٩٥٥ێ كارمەندێ ساخلەمیێ یێ ناحیا سندی دەرزیكێن دژی نەخۆشیا ڤۆرباچە (السعال الدیكی)یێ بۆ خویندكارێن خواندنگەها بێرسڤێ دانان[٩٩]، ئەڤە ژی ژ بەر بەلاڤبوونا وێ نەخۆشیێ د ناڤ خویندكارێن وێ خواندنگەهێدا[١٠٠].

هندی پەیوەندی ب كارێ نەهێلانا مەلاریایێ ڤە هەی ل داویا سالا ١٩٥١ێ گوژمێ ٥٠٠ دیناران بۆ پڕكرن و هشككرنا گەرێن ئاڤێ ل زاخۆ هاتنەمەزاختن[١٠١]، ل سالا ١٩٥٤ێ كریارێن نەهێلانا مەلاریایێ ل عیراقێ داكوكی ل سەر دەڤەرێن حەمام عەلی، سەرسنكێ،

شێخان، زاخۆ، دهۆك، ئامێدیێ حەمدانیێ و ئاكرێ ل لیوا مووسلێ دكر[١٠٢].

د چوارچووڤێ چالاكیێن رێڤەبەریا كاری یا دەڤەرا باكوور و جڤاتا ئاڤاكرنێ ل لیوا مووسلێ، هندەك ژ خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ بەر ڤەزا زاخۆ كەتن، ل چریا یەكەم ١٩٤٦ێ فەرمانگەها كاران یا مووسلێ ژوورا دووێ بۆ بنگەهێ ساخلەمیا ئاسهێ ل ڤەزا زاخۆ ئاڤاكر[١٠٣]. هەروەسان فەرمانگەها كاران یا مووسلێ ل تیرمەها ١٩٤٨ێ ئاڤاهیێ نەخۆشخانا مەلبەندی ل زاخۆ دیماهی ئینا و تۆرا وێ یا كارەبێ گرێدا و رادەستی سەرۆكاتیا ساخلەمیا لیوایێ كر[١٠٤]. هەر د ڤی واریدا ل ئادارا ١٩٥١ێ هندەك بنگەهێن ساخلەمیێ ل هەریەك ژ ناحیا گولی، نێروەرێكان و بەرواری بالا هاتنەدانان[١٠٥]. هەروەسان ل ئەیلوولا ١٩٥١ێ خانییەك بۆ دكتورێ نەخۆشخانا زاخۆ هاتەئاڤاكرن[١٠٦]. د بەردەوامیا ڤان كارێن پەیوەندی ب وارێ ساخلەمیێ ڤە هەی ل مەها چریا دووێ ١٩٥٥ێ نوژەنكرنێن پێدڤی دگەل پركرنەڤا هندەك كێماتیێن هەی ل نەخۆشخانا زاخۆ هاتنەكرن و ل كانوونا دووێ ١٩٥٦ێ ئاڤاهیێ بنگەهێن ساخلەمیێ ل هەوریسكێ و ئاسهێ هاتنەنووژەنكرن. و ل كانوونا دووێ ١٩٥٧ێ نەخشێن پێویست بۆ ئاڤاكرنا بنگەهەكێ ساخلەمیێ یێ نوو ل گوندێ سەناتێ هاتنەچێكرن و ل شباتا ١٩٥٧ێ ئاڤاهیێ بنگەهێ ساخلەمیا بەیتەری ل زاخۆ هاتەنووژەنكرن و ل تیرمەها هەمان سالێ باخچێن نەخۆشخانا زاخۆ هاتنە رێكخستن و ب سەروبەركرن[١٠٧].

د ڤەكۆلینا چوویدا دیاردبیت كو حكومەتا عیراقی ل سەردەمێ شاهینی و ژ بەر جهێ وێ یێ ستراتیژی و سنووری رەنگە پویتەپێدانەك دایە سەروبەرێ كارگێریێ زاخۆ و ژ وێ ژی سەروبەرێ ساخلەمیێ، ڤێ چەدێ ژی باندۆرا خۆ ل سەر پێشڤەچوونا ژیانا جڤاكی ئابووری و رەوشەنبیری و سیاسیی ل زاخۆ هەبوویە، هەروەسان د شیاندایە بێژین خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ یێن حكومەتێ ل زاخۆ پێشكەشكرین ب ڤەبارە و چەندێتییا خۆ ل دووڤ وی سەردەم و جهـ و كاودانێ خۆ پێنگاڤێن باش و گرنگبوونە بۆ باشكرنا كاوانێن زاخۆ.

زێدەباری ئەڤا ئاماژە پێ هاتییەكرن و سەرەرای بوونا چەند سازییەكێن ساخلەمیێ ل زاخۆ د ڤێ قۆناغێدا هێژ نۆشداریا مللی وەك كەلەپۆرەكێ ژ بابكالكانڤە مای رۆلێ خۆ دگێرا و نها ژی د شیاندا نەبوو دەست ژێ بێنەبەردان، نۆشداریا مللی رۆلەكێ گرنگ و بەرچاڤ دگێرا وهندەك چارەسەریێن پێ دهاتنەكرن دباشبوون لێ نەزانی و خەرافیاتی خۆ ب سەرهندەكاندا گرتبوو. دشیاندایە نۆشداریا مللی ژی ب سەر چەند جۆرەكاندا دابەشبكەین ژ وانا: ئەو نۆشداریا ژ ئالیێ هندەك كەسێن دان عەمر ژ ژن و زەلامانڤە ل زاخۆ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە دهاتەئەنجامدان و وان ژی ژ بابوباپیرێن خۆ گرتبوو و ژ ئەنجامێ سەربۆر و كار ل سەركرنێ فێربووبێ، ڤانا ئەو دەرمانە بكاردئینان یێن ژ گیایێن سروشتی و هندەك كەرەستێن دیتر ڤەدگرتن، ناڤدارترین ڤان نۆشدارێن مللی (حەكیمان) ا زاخۆ (نەسرین دەرویش)ا حەكیم[١٠٨]، هوستا حەسەن، مەنیجا حەكیم[١٠٩]، وحەلیما حەكیم یا ناڤدار ب (حەلۆكا حوچی) و عەیشا حسێن (عەیشێ مارو)[١١٠]، هندەك نۆشدار (حەكیم)ێن مللی یێن جوهی (یهودی) د وی واریدا هەلكەتبوون ب تایبەت د چارەسەركرنا كەچەلیێ (وەریانا موویێن سەری)دا[١١١]. هەروەسان ژ ناڤدارترین نۆشدارێن مللی یێن د ڤی جۆرێ نۆشداریا مللیدا ل گوند و دەڤەرێن سەر ب زاخۆڤە هەلكەتین وەك: بنەمالا ناصری، ئیبراهیم صادق و تەتەر ئیبراهیم و ئاسیا حسێن عومەر و هندەكێن دی ل گوندێ بۆصەلێ ناحیا سندی و حەكیما (توتو مریەم) ل گوندێ دیرەبوونێ.

جۆرێ دووی ژ جۆرێن نۆشداریا مللی نۆشداریا عەتاران بوو و پرانییا ئەوێن ئەڤ نۆشداریە دكر جوهی (یهودی)یێن زاخۆ بوون وەك شبو و نحوی و یێن دی، هندەكان ژ خەلكی ژ ئەنجامێ كاركرن و سەربۆران هندەك زانیاری ل سەر نۆشداریا عەتاران هەبوون و وان ب خۆ دەرمانێن پێدڤی بۆ نەساخێن خۆ

دەسنیشاندکرن و دهنارتنە جەم وان عەتاران دگەل رێنمایێن خۆ بۆ عەتاران ل دور چاوانییا دەرمانان و بکارئینانا وان.

جۆرێ سیێ ژ نۆشداریا مللی نۆشداریا روحی (باوەری و باوەریپێکرن- الایمان و الاعتقاد) بوو، باوەرییا وی کەسی بوو یێ کارێ نۆشداریا روحی دکر کو ئەو ب هاریکارییا خودێ وی نەخۆشی چارەسەرکەت یان ژ ئێشا وی سڤککەت، و باوەرییا موکما خەلکەکی کو نڤشتی و سەرەدانا مەرقەد و مەزاران دێ وان ژ نەساخییان ساخکەتەڤە. ل زاخۆ سەید عەبدوللایێ کوڕێ سەید ئەحمەدێ نعێمی نڤشتی یێن شەرعی بۆ وان کەسان چێدکرن یێن ژێ دخواستن، هەروەسان سەید عەباس (شێخ عەباس)ی گەلەك کتێب هەبوون و نڤشتی (الحجاب) بۆ خەلکەکی دنڤیسین[112]. هندەك بنەمالێن ناڤدار ل زاخۆ هەبوون کو کارێ نۆشداریا (چارەسەری ب قورئانێ) دکر، بۆ نموونە بنەمالا یوسڤی هەبوون ب خواندنا هندەك ئایەتێن قورئانێ و دگەل بکارئینانا هندەك تشتێن دی بۆ چارەسەرکرنا سەرئێشێ (الصداع النصفي)دگرتنەبەر[113]. هەروەسان سەرەدانا مەزاران ب مەرما چاکبوونەڤێ ژ هندەك نەساخییان ل زاخۆ یا بەربەلاڤبوو و هندەك مەزار هەبوون کو خەلکەکی سەرەدانا وان دکرن وەك مەزارێ شێخ عەلی ل ناڤەندا زاخۆ، مەزارێ ئیبراهیم بەگ وەلی و مەزارێ شێخ عەبدولرەحمانێ تیرکی[114]، و مەزارێ (الاب بۆلدو)[115].

جۆرێ دی ژ نۆشدارییا مللی نۆشداریا نشتەرگەریێ یە، پرانییا کەسێن ل زاخۆ ئەڤ رەنگە نۆشداریا مللی دکرن سەرتراش و کارێ نۆشداریا ڤەگرتنا هەستیکان دکرن سەرتراشێ مووسلی سەید محەمەد وی سەردەمێ ل زاخۆ یێ نیشتەجێ بوو[116] و سەرتراش حەجی ئیسماعیل و ئیبۆیێ حەلاق و حەجی محەمەد عەبدوللا حوسنی و پولص حەنا ل گوندێ دێرەبوونی.

هندی پەیوەندی ب سونەتکرنا زارۆکانڤە هەی کەسەك ب ناڤێ عەبدوللا میدیادی هندەك جاران ب جانتێ خۆڤە یێ ئامرازێن سونەتکرنێ تێدا دهات و دکرە گازی بۆ سونەتکرنا زارۆکان، ئەڤ کەسە د بنیاتدا خەلکێ سێرتێ بوو ل باکوورێ کوردستانێ. بەلێ کارێ دەرئینانا ددانان پرانییا جاران ژ ئالیێ هندەك سەرتراشان و کەسێن تایبەتمەندێن مللی ڤە ب کلبتانی و بێی بەنجکرن دهاتەکرن، ناڤدارترین کەسێن ئەڤ پیشەیەدکر ل گوندێ سەناتێ مەنسوور کمورا بوو، و هەریەك ژ مستەفا محەمەد و ئەحمەد ئوسمانی ل گوندێ سنداڤا ناحیا سندی ئەڤ کارە دکر.

ناڤدارترین کەسێن کارێ ڤەگرتنا شکەستنان (جەباری) ل زاخۆ دکر، جنێد سالح و بیژان ل مەلبەندێ قەزایێ، سالح صلکی ل گوندێ صلکا ناحیا سلێڤانەیی[117]، ئەلیاس ساوا[118] ل بێرسڤێ[119] ، و هەریەك ژ ئوسمان میرزا و ئاڤدەل سلێمان ل ناحیا سندی کارێ سونەتکرنا زارۆکان و ڤەگرتنا شکەستنان دکر[120]،هندی نەخۆشیێن ژنان ژ ئالیێ هندەك ژنان کو ب دادۆك یان داپیرك دهاتنەناڤکرن دهاتنەئەنجامدان و ئەڤ ژنە ژ کەسێن خودان رێزبوون د ناڤ جڤاکیدا، هەموو تشتێ بۆ ژنێن دو جان یان رەنگە نەساخیەکا ژنان هەی ژ ئالیێ ڤان داپیرکانڤە دهاتنەکرن بەری پەیدابوونا نەخۆشخانەیان و ئەڤ کارە پشتی دامەزراندنا نەخۆشخانەیان ژی یێ بەردەوامبوو ب تایبەت بۆ پرانییا وان خێزانان یێن نەدڤیان ژنێن وان ژبۆ زارۆکبوونێ بچنە نەخۆشخانەیان و پرانییا ڤان داپیرکان ژی د ئەنجامێ کارکرنێدا فێری ڤی پیشەی ببون و چ باوەرنامە بۆ ئەنجامدانا ڤی کاری نەبوون..

ب فێربوونەکا زکماکی و ژ ئەنجامێ کارتێداکرنی و دەستڤەئینانا شارەزاییێ هاریکارییا د دەمێ ژانگرتنێدا هاریکارییا ژنان دکرن و ورەیا وان بلندکر[121]. هەرچەندە هندەك داپیرکێن مولەتدای ل زاخۆ هەبوون لێ هندەکێن بێ مولەت ژی ئەڤ کارە دکرز ژ وانا صافیا حسێن ل مەلبەندێ زاخۆ، خاتون گورگیس[122] (ل گوندێ بێرسڤێ ناحیا سندی)[123] و داپیکا سرا (ل گوندێ دێرەبوونێ ناحیا

سلێڤانەیی)[124].

ژ پێداچووناچوویی دیاردبیت کو زاخۆ خودانی تایبەتمەندیەکا بەرچاڤبوو د وارێ نۆشداریا مللی و نۆشداریا شونگر (البدیل) ئەوا پشتگەرم ب زانیاری و شیان و بەردەوام کارتێداکرنێ و بنەکوکا وی ل سەر هندەك توور و باوەری و شارەزایێن بنیاتی ئەوا ل جەم رەوشەنبیرێن جودا هەی و ب مەرەما پاراستنا ساخلەمیا جڤاکی و خۆ پاراستنێ ژ نەخۆشیێن بەدەنی و دەروونی و دەسنیشانکرن و چارەسەرکرنا وان و باشتر لێکرنا سەروبەرێ کەسێن تووشبوی ب نەخۆشیان و ڤێ نۆشداریێ پشکداریەك د راگرتنا ساخلەمیا مرۆڤاندا کریە.

## ژێدەر:


١. نسیبة عبدالعزیز عبدالله الحاج علاوي، الاداره العثمانیة في الموصل (١٨٧٩- ١٩٠٨)، كلیة الاداب، رسالة ماجستیر غیر منشوره، جامعة الموصل، ٢٠٠٢، ص ٩٨.

٢. کامیران عبدالصمد احمد، کارتێکرنا خویکێن ئوسمانی لسەر رەوشا ژیارێ ل کوردستانێ، کۆڤارا زانکۆیا دهۆك)پەربەندا (٦)، ژمارە (٢)، ٢٠٠٣، بپ ٢٦.

٣. مختارات من كتاب الموصل و كركوك فی الوثائق العثمانیة، ترجمة و تعلیق: أ.د. خلیل علی مراد، (السلیمانیه- ٢٠٠٥)، ص ٤٠.

٤. کولێرا ب (االهیضة الاسیویة) ژی دهێتەناڤکرن: گرانترین نەخۆشیێن ڤەگر و بەربەلاڤە، ژ بەرکو بلەز د ناڤ خەلکیدا بەلاڤەدبیت و دئەنجامدا هژمارەکا زۆر پێ دمرن، نیشانێن وێ ب دلرابوونەکا ل دووڤ یەك و زکچوونەکا دژوار بێی ئێش و زکئێشی دەست پێ دکەن و هەموو شلەیێن گیانێ مرۆڤی هشکدکەت و گەرماتیا لەشێ مرۆڤی و خولا خوینێ د لەشێ مرۆڤیدا دئێنتە خوار و دبیتە ئەگەرێ میزنەکرنێ و ڤەمانا میزێ و ل داویێ ژی دبیتە ئەگەرێ مرنێ.، میکرۆبێ نەخۆشیێ د رێکا خوارن و ڤێڤی یێن نەپاقژ و بکارئینانا ئاڤا پیسبووی بەلاڤدبیت. بۆ پتر پێزانینان: بنێرە: ومیض سرحان ذیاب ، موجات الاوبئة و القحط و الكوارث الطبیعیة في العراق ١٨٣٠- ١٩١٧، رسالة ماجستیر غیر منشوره، كلیة التربیة، جامعة المستنصریة، ٢٠١٠، هامش ٥٠.

٥. هەمان ژێدەر، بپ ٦٥.

٦. لاشمانیا(Lishmania Baghdad) نەساخیەکا ڤەگرە پەژیکا (العدوی)وێ ژ تڤا کەسێن تووشبووی ب نەساخیا ئێشا زراڤ (سلێ) دگەهیتە سیهێن مرۆڤاهەروەسان ژ ئەنجامێ ڤەخوارنا شیرێ نەپاقژکری (غیر المعقم) ژ وان چیلان یێن نەساخیا ئێشا زراڤ هەی. بنێرە: نادیه مسعود شریف الجراح، الخدمات الصحیه فی الموصل فی العهد الملكی ١٩٢١- ١٩٥٨م دراسه تاریخیه، رساله ماجستیر غیر منشوره، كلیه الاداب، جامعه الموصل ٢٠١٠، هامش ٩.

٧. هەمان ژێدەر، بپ ٩. پێشپیابوێ (فیشخابور): گوندەکە د کەڤیتە سێگوشا سنوورێ عیراق سوریا ترکیا، دهێتەگۆتن کو ناڤێ بەراهیێ یێ گوندی (فەیروز شاپور)ە داکو ژ جهەکێ یێ هەمان ناڤ هەلدگریت بێتەجوداکرن کو ئەنبار (فەیروز شاپور)ە یێ دکەڤیتە ئالیێ رۆژهەلاتی یێ رووبارێ فراتی ناهێتە زانین ئەڤ ناڤە ئاماژە ب کیژ شاپوری دکەت، دهێتە گۆتن ئەڤ پەیڤە رامانا پرا ل سەر خابویری ددەت. بنێرە: الاب البیر ابونا، فیشخابور، (بغداد- ٢٠٠٤)، بپ ٩- ١١، هندەك دبێژن ئەڤ ناڤە ناڤەك کوردی بە پێشپیابوێ ئانکو بەری خابویری ئان ئەوێ دکەڤیتە بەرسینگێ خابویری. بنێرە، جمال بابان، اصول اسماء المدن و المواقع العراقیة، (بغداد-١٩٧٦) بث ٢٢١، ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتیا ٣٢کم رۆژئاڤایێ زاخۆ. بنێرە: الاب یوسف (لازكین) عبدالاحد، العودة الی الجذور، (دهوك- ٢٠١٠) بث ٥٦- ٥٧.

٨. وصفیة محمد شیخو، زاخو في العهد الملكي ١٩٢١- ١٩٥٨. دراسة اوضاعها العامة، رسالة ماجستیر غیر منشوره، جامعة زاخو- ٢٠١٢، ص ١٠١.

٩. م. م. ن. الدور و التفتیش، تقریر متصرفیة لواء الموصل المرقم (٨٠١٤) في ٢٥ أیار ١٩٣٧، الی وزارة الداخلیة الموضوع/ جولة تفتیشیة في قضاء زاخو، في الملفة ذات الرقم ٢/٤، مركز دراسات الموصل، جامعة الموصل، حیدر حمید رشید، الاوضاع الصحیة في االعراق ١٩٤٥- ١٩٥٨، دراسة في تاریخ الاجتماعیة للعراق المعاصر، (بغداد: ٢٠١٠)، ص ٢٩٣.

١٠. مەلاریا (Malaria) پەیڤەکە ژ زمانێ ئیتالی هاتیەوەرگرتن ئانکویا (هەوایێ پیس) ددەت، تنێ پێشیەك ژ رەگەزێ (ئەنوفولس) دکاریت پەژیکا مەلاریایێ بەلاڤەبکەت، تنێ مێ یێن ڤێ پێشیێ ب مرۆڤی ڤەددەن داکو تێرا پێدڤی خوینێ وەرگریت ووزە و خوارنێ بۆ دابینبکەت داکو هێکا خۆ دناڤدا بکەت، ژ نیشانێن ڤێ نەخۆشیێ زەربوونا دێمێ مرۆڤی دگەل تا و خۆدانەکا دژوار و ئێشانا سەری و گەهان و بکشتی لاوازبوون. بنێرە: حیدر حمید رشید، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٨٨ و یێن پشتی وی.

١١. سعيد الحاج صديق، زاخو الماضي و الحاضر، (دهوك:٢٠٠٩)، ص ٢٠٢.
١٢. وصفيه محمد شيخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٢.
١٣. تنێ قائيمەقام صبحى عەلى خەم ژڤێ چەندێ دخوار فەرماندا خودانێن جهێن فرۆشتنا شيرى و بەرهەمێن شيرى وەك ماستى و پەنيرى، كو تشتێن خۆ ب دانانا پارچەكا قوماشى بنخێڤن دا ژ تۆزێ و مێشان بپنەپاراستن. بنێرە: سعيد الحاج صديق الزاخوبى، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٦.
١٤. م. م. ن الدور و التفتيش، تقرير متصرفية لواء الموصل الرقم (١٩٦٩١) في ٢٥ تشرين الثاني ١٩٣٧، الى وزارة الداخلية، الموضع/ جولة في قضاء زاخو، في الملفة ذات الرقم ٢/٤، مركز دراسات الموصل، جامعة الموصل.
١٥. وصفيه محمد شيخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٢.
١٦. سفانة هزاع اسماعيل الطائي، الموصل في سنوات الانتداب البريطاني ١٩٢٠- ١٩٣٢، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة الموصل، ٢٠٠٢، ص ١٢٦.
١٧. محسن عبدالصاحب المظفر، التحليل المكاني لامراض متوطنة في العراق، دراسة الاسس الجغرافية للتخطيط الصحي، (بغداد: ١٩٧٩)، ص ١٢٦.
١٨. خليل على مراد، الاحوال الاجتماعية في العراق في عهد الانتداب البريطاني في مجموعة باحثين، المفصل في تاريخ العراق المعاصر، (بغداد: ٢٠٠٢)، ص ٥٦٤- ٥٦٥.
١٩. وصفيه محمد شيخو، ژێدەرێ بەرێ، بث ١٠٣.
٢٠. خوريك (الجدري- Smallbox) نەخۆشييەكا ڤەگرە ب رێكا دەستليدانێ (اللمس) بەلاڤەدبيت، ئەڤ نەخۆشييە دبيتە ئەگەرێ مرنێ و كۆرەبوونێ و تێكچوونا سەروسيمايێ مرۆڤى، بنێرە: جريده الموصل، (العدد (١٥٣٠، ٤ تشرين الاول ١٩٢٨.)
٢١. بنگوهك (النكاف Mumps) ژ نەخۆشيێن ڤايروسيێن ڤەگرە گليزێ بنلاما (الغدد اللعابية)دگريت، ئەڤ نەخۆشيە درێكا باى را بەلاڤەدبيت، گەرماتيا لەشى نەساخى زێدەبلنددبيت دگەل ژانەسەر و ئێشانا بنگوهان و وەرمينا (الغده النكفيه)، بنێرە: ناديه مسعود شريف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، پەراوێزێ، بپ ٥٠.
٢٢. سفانه هزارع اسماعيل الطائي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٢.
٢٣. هاراتى (داء الكلب) ئێشەكا ڤەگر و توندە ئامرازێ دەمارێ سەگان و گيانەوەرێن ژ رەگەزێ وان ڤەدگريت، ئەڤ نەخۆشيە ب رێكا تفێ كو دچيتە د برينێدا ژ گيانەوەرى بۆ گيانەوەرى و ژ گيانەوەرى بۆ مرۆڤى بەلاڤدبيت. بنێرە: ناديه مسعود شريف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، پەراوێزێ بپ ٥٢.
٢٤. بۆ پتر زانياريان ل سەر ڤێ بۆيەرێ بنێرە: سعيد شامايا، سناط الفردوس المفقود،(بغداد: ٢٠٠٢)، ص ٨٤- ٨٥ ؛ افرام عيسى يوسف، ازمنه فى بلاد الرافدين ذكريات و احداث ١٨٣٠- ١٩٧٦، ترجمة على ابراهيم، (دهوك: ٢٠٠٩، ص ٩٩ و ما بعدها.
٢٥. بلهارزيا (Bilharzios): ب ميزا خويناوى ژێ دهێتەناڤكرن، ژ ئەنجامێ چوونا هندەك كرمێن بچويك ب رێكا پيستێ پێى بۆ ناڤ لەشى و وەرار و زێدەبوونا وان د ناڤ مێلاكا مرۆڤى دا و دگەل خوينێ دەردكەڤيت، ژ نشانێن ڤێ نەخۆشيێ كێمخوينى و لاوازى دگەل ئێشانەكا بهێز ل پڤدانكا ميزێ و دبيتە ئەگەرێ مرنێ. بنێرە: ناديه مسعود شريف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، پەراوێز ٤٣.
٢٦. نەخۆشيێن سفلس (الامراض الزهريهSyphilis ): ژ نەخۆشيێن بەربەلاڤ و خرابێن سێكسى يە، ئەگەرێ وێ هندەك ميكروبێن ڤەگرن پرانى د ناڤ كەسێن پەيوەنديێن نەشەرعى يێن سێكسى دكەن بەلاڤدبيت و د رێكا مالبچويكى را دگەهيتە كۆرپەلەى. بنێرە: مسعود شريف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، پەراويز ١٣٢.
٢٧. د.ك و. ملفات البلاط الملكي (وزاره الداخليه)، تقرير رئاسة هيئة التفتيشية للمنطقه الاولى الموصل، المرقم (س/١٠٣)، ٢٩/٢٦ تشرين الاول ١٩٣٥، الى الوزراه الداخلية، الموضع/ تفتيش مركز قضاء زاخو، في الملفة ذات الرقم ٣٢٠٥٠/٨٩١٦.
٢٨. م. م. ن. الدور و التفتيش، تقرير متصرفية لواء الموصل، المرقم(٨٠١٤)، فى ٢٥ ايار ١٩٣٧ الى وزاره الداخلية، الموضوع/ جولة تفتيشية في قضاء زاخو، تقرير متصرفية لواء الموصل، المرقم (١٩٦٩١)، فى ٢٥ تشرين الثاني ١٩٣٧، الى وزارة ا لداخلية، الموضوع/ جولة في قضاء زاخو، فه الألفه ذات الرقم ٢/٤، مركز دراسات الموصل، جامعة الموصل.

٢٩. طالب مشتاق، رحلة الامیر، (بیروت، ١٩٤٠)، ج١، ص ٣٩.

٣٠. تراخوما (Trachoma) ئێشەكا دژوار و ڤەگرە، ژ ئەنجامێ ڤەرێژا چاڤێن تووشبووی پەیدادبیتن، دبیتە ئەگەرێ وەرمینا پەردێ پشتچاڤی و دەركەتنا گرمشكان و سووربوونا چاڤێ زێدە رێژتنا رۆندكان و پێكڤەنوسیانا پشتچاڤان، ئەڤ ئێشە ب رێكا دەستلێدانێ، بكارئینانا ڤەدیفك یان دەستەسرێن بكارئینای و مێشان بەلاڤدبیت. بنێرە: بشیر سرسم، التراخوما اعراض المرض و الوقایة منة، جریدة (فتئ العراق)، العدد ١٥٣، ٢٤ ێ‌ب ١٩٣٥.

٣١. نادیە مسعود شریف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٣- ١٠٤.

٣٢. ئێشا زراڤ (التدرن الرئوی، السل الرئوی- Tuberculosis) ئێشەكاڤەگرە ژ تڤا ئەو كەسێن تووشبووی ب ئێشێ بەلاڤدبیت و ب رێكەكێ ژ رێكان دگەهیتە سیهێن مرۆڤی، و ژ ڤەخوارنا شیرێ نە تەعقیمكری ژ چێلا تووشبووی ب ئێشا زراڤا چێلان بەلاڤ دبیت، بنێره عبدالاحد عبدالنور، التدرن الرئوی، جریده (الموصل)، العددان ٨٣٨ و ٨٣٩، ٧ و ٩ تموز ١٩٢٤.

٣٣. وصفیە محمدشیخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٦.

٣٤. اللیشمانیا الحشویه: ب ناڤێ (كالازار Kalazar)ژێ دهێتەنیاسینـ ترسناكترین جۆرێن لیشمانیایە ژ بەركو نە تنێ پیستێ ڤەدگریت بەلكی دگەهیتە هەموو هناڤێن مرۆڤی، مشەخورەكێ تاكشانە پشتی كو خولەكا كورتا ژیانێ د گیانێ مێشێدا ب داوی دئینیت دگەهیتە گیانێ مرۆڤی، (طفیلي) لیشمانیا هێرشێ دبەتە سەر وان شانەیێن ب ئەركێ بەرگریا لەشی ژ میكروب و گیانێن نامو رادبن، ئەڤ نەخۆشیە دبیتە ئەگەرێ تووشبوونێ ب نەخۆشیێن تا و وەرمینا میلاكێ و خالخالكێ و رها نیڤاگەهێن پشتی (نخاع العظمي) و گرێكا لەمفاوی و د بەردەوامیانەخۆشیێ دبیتە ئەگەرێ كێمیا سەنگا مرۆڤی و كێمخوینیێ و ئەگەر زوو نەخوش نەكەڤیتە بەرچارەسەریێ د ئەنجامدا دبیتە ئەگەرێ مرنێ. بۆ پتر بنێرە: جریدة (الشرق الاوسط)، العدد(٨٨٠٥)، ٦كانونالثانی ٢٠٠٣.

٣٥. محسن عبدالصاحب المظفر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٨.

٣٦. سۆرك (الحصبه Measles): نەخۆشییەكا ڤەگر و بەلاڤە ل سەرانسەری جیهانێ، پرانییا جاران وان زارۆكان دگریتن یێن ژێ وان ژ پێنج سالان كێمتر، ژ میكرۆبەكی چێدبیت، نیشانێن وێ بلندبوونا پلەیێن گەرماتییا لەشی و بینژینەكا دژوار و رۆندكێن چاڤان پشتی چوار رۆژان، ئەڤ نەخۆشییە ژ ئەنجامێ دەست لێدانێ بەلاڤەدبیتن. بنێرە: نادیە مسعود شریف الجراح، ژێدەرێ پەراوێزی بپ ٤٣ ؛ ومیچ سرحان ژیاب، ژێدەرێ بەرێ، پەراوێزی بپ ٦١.

٣٧. سعید شامایا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦١ ؛ افرام عیسی یوسف، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٠.

٣٨. سعید الحاج صدیق الزاخویي، لمحات من التراث و الاساطیر في زاخو ١٩٠٠- ١٩٦١، (دهوك، ٢٠١٠)، ص ١٢٢.

٣٩. بۆ پتر پێزانینان دەربارەی ڤێ نەخۆشیێ و نەخۆشیێن دیتر ل زاخۆ بنێرە: مجید حاجی عبدالقادر، گوندێ بوصەلێ ژ لایێ نەخۆشی و نەساخی و ساخلەمیێ ڤە، ل: كۆمەلا پاراستنا كەلتورێ كوردستانێ/ زاخو، گوندێ بوصەلێ، (دهوك:٢٠٠٨)، ل ٧٤ و لدیڤدا ؛ الاب یوسف (لازكین) عبدالاحد، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٨ و لدیڤدا ؛ سعید الحاج صدیق زاخوی، ژێدەرێ بەرێ، پەراوێزی ١١٦ و ل دیڤدا.

٤٠. ابو هدلان: مەرەم پێ كولا رەشا چێلانە (الطاعون البقري) ژ ئەنجامێ خاڤی و سەرچەمیانێ ب (ابو هدلان) هاتییە ناڤكرن. بنێرە : نادیە مسعود شریف الجراح، ژێدەرێ بەرێ پەراوێزی بپ ٥٢.

٤١. جریده (الوقائع العراقیه)، العدد (٥٤)، ١٩ نیسان ١٩٢٣.

٤٢. جریده (الوقائع العراقیه) ، العدد (٢٩٨)، ١١ ایار ١٩٢٥.

٤٣. البجل(Dourine): ژ نەخۆشیێن مشەخورانە، یەك ژ جۆرێن نەخۆشیانە یێن ب (داء المثقبات Try Panosomiais) دهێنە نیاسین، گەلەكا بەربەلاڤە ل جیهانێ و ب رێكا جوتبوونێ بەلاڤدبیت و كێمجاران ب رێكا مێشان بەلاڤدبیت، دبیتە ئەگەرێ هەودانا ئەندامێن زاوزێ و دبیت ببیتە ئەگەرێ كێمخوینیێ ل جەم گیانەوەران و كێمجاران ژێ د بیتە ئەگەرێ (فالنج)ئیفلیجبوونێ بنێرە: نادیە مسعود شریف الجراح، ژێدەرێ بەرێ پەراوێزی بپ ٥٣ ؛ بۆ پتر پێزانینان دەربارەی ڤێ نەخۆشیێ بنێرە، حیدر حمید رشید، ژێدەرێ بەرێ بپ ٣٢٣ و یێن دووڤرا.

٤٤. جریده (فتی العراق)، العدد (١٢٣)، ١١ایار ١٩٣٥.

٤٥. جریده (البلاغ)، العدد(٤٣٢)، ٣ ایلول ١٩٣٥.

٤٦. د. ك. و. ملفات البلاط الملكي (وزاره الداخلية)، تقرير رئاسة الهيئة التفتيشية للمنطقه الاولى الموصل، المرقم (س/١٠٣)، فی ٢٩/٢٦ تشرين الاول ١٩٣٥،الى وزاره الداخليه، الموضوع/ تفتيش مركز قضا زاخو، فی الملفه ذات الرقم ٣٢٠٥٠/٨٩١٦.

٤٧. نسيبه عبدالعزيز عبدالله الحاج علاوي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٧. دەسپێكێن گرنگیدانا دەولەتا ئوسمانی ب خزمەتگوزارێن ساخلەمیێ دزڤرنەڤە سالا ١٨٤٠ێ، دەمێ د ڤێ سالێدا سیستەمێ كەرەنتینە ئانكو پارێزڤانییا ساخلەمیێ (الحجر الصحي) هاتییەراگەهاندن، و تێدا داكوكی ل سەر دامەزراندنا فەرمانگەهێن پارێزڤانییا ساخلەمیێ ل ویلایەتێن ئوسمانی زێدەباری دامەزراندنا چەند فەرمانگەهەكێن پارێزڤانییا ساخلەمیێ ل دەروازێن سنوورێن دەولەتا ئوسمانی و باژێرێن پیروز (العتبات المقدسه). بنێرە: لمى عبدالعزيز مصطفي، الخدمات العامة في العراق ١٨٦٩- ١٩١٨، اطروحة دكتوراه غير منشوره، كلية الاداب، جامعة الموصل- ٢٠٠٣، ص ٣٠٢

٤٨. ئیستارجیان : نۆشدار (گریگور ئەبراهام ئیستارجیان)ێ ئەرمەنی ل ١٧ چریا دووێ ١٨٨٥ێ ل باژێرێ كرمانیك ل دەڤەرا كلیكیا یا تركیا هاتییەسەردنیایێ. خواندنا دواناڤنجی ل باژێرێ رهایێ (ئۆرفە) خواندیە، ل سالا ١٩٠٦ ل كولیژا نۆشداری یا دیمەشقێ هاتییەوەرگرتن، سالا ١٩١٢ێ ب داویئینایە و وەك نۆشدار ل مووسلێ هاتییەدامەزراندن. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: استارجيان، مذكرات دكتور استارجيان ١٨٨٥- ١٩٨٠، ترجمة: طارطين وارتانيان، (طرابلس: ٢٠٠٤)، ابراهيم حليل العلاف، الدكتور استرجيان و قصرة في الموصل، مجلة (الموصليات)، العدد ٢٩، شباط ٢٠١٠، ص ١٠- ١٢.

٤٩. استارجیان، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٥.

٥٠. بۆ پتر پێزانینان ل سەر وان خزمەتێن ئستارجیان ل قەزایێ پێ رابووی بنێرە : ژێدەرێ بەرێ، بپ٣٥-٣٦.

٥١. هەمان ژێدەر، بپ ٦٣.

٥٢. ابراهيم خليل احمد، الاحتلال البريطاني والمقاومة الموصلية (١٣٣٦-١٣٣٩مش)/(١٩١٨-١٩٢١ز)، في موسوعة الموصل الحضارية، (الموصل : ١٩٩٢)، مج٥، ص٢٣.

٥٣. استارجیان، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٤.

٥٤. سيار كوكب على الجميل، النظام الاداري، في: موسوعة الموصل الحضارية، مج٥، ص ١٢٥.

٥٥. المس بي، فصول من تاريخ العراق القريب (١٩١٤- ١٩٢٠)، ترجمة : جعفر خياط، (بيروت : ١٩٧١)، ص١٧٧-١٧٩ .

٥٦. ابراهيم خليل احمد، النشاطات الطبية والخدمات الصحية في العراق ١٢٥٨- ١٩٢١، الموصل : ١٩٨٦)، ص٢٧١ .

٥٧. ژنون الطائي، الاوضاع الادارية في الموصل خلال العهد الملكي ١٩٢١- ١٩٥٨، (الموصل : ٢٠٠٨)، ص١٧٣.

٥٨. وزارة الداخلية، الدليل العراقي الرسمي لسنه ١٩٣٦، (بغداد : ١٩٣٦)، ص٢٢٢.

٥٩. طالب مشتاق : ل سالا ١٩٠٠ێ ل باژێرێ كازمیەیێ بەغدا هاتییە سەر دنیایێ، ژ مالباتەكا مەزن و هەیی و ناڤدارە، چەندین پلەیێن بلند وەرگرتینە، دوا جار بالیوٚزێ عیراقێ بوو ل تركیا (١٩٥٨- ١٩٦٥)، ل سالا ١٩٧٧ێ وەغەرا داویێ كریە. بۆ پتر پێزانینان: بنێرە پەرتووكا وی: اوراق ايامي بغداد و العراق و الوطن العربي، (بغداد: ١٩٨٩)، ص ٣٠٥- ٣٠٧.

٦٠. وەصی عەبدو لئیلاهـ : ل سالا ١٩١٣ێ ل حیجازێ هاتییەسەردنیایێ، هەتا سالا ١٩٢٦ێ خواندنا خۆ ل باژێرێ مەكەهێ خواندیە، پاشتر گەهشتییە دەربارێ شاهی و وەزارەتا دەرڤەیا عیراقێ، ب پشتەڤانیا نوری سەعیدی (زێدەباری مرۆڤانییا وی دگەل مالباتا شاهی كو دبوو خالێ شاهی) وەك وەصی یان وەسیەتدار ل سەر میر فەیسەلی هاتەراگەهاندن هەتا میر فەیسەل دگەهیتە ژیێ وەرگرتنا دەستەلاتێ شاهینی (مەلكی)، ل ١٤تیرمەها ١٩٥٨ێ دگەل مالباتا شاهێن عیراقێ ل كۆچكا رەحاب كوچكا شاهینی یا عیراقێ هاتەكوشتن. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: علاء جاسم محمد الحربي، رجال العراق الملكي، (لندن،٢٠٠٤)، ص ٢٧_ ٣٦.

٦١. بنگەهێن ساخلەمیێ یێن گەروك: ژ هندەك ترومبێلێن ب قەبارەكێ مەزن و تایبەت ب كارێن ساخلەمیێ پێكهاتبوو، سەد دانە ژێ د رێكا هندەك بریكارانرا ژ بریتانیا هاتبوونە كرین، جهێ دەهـ نەخۆشان تێدا هەبوو، ڤان ترومبێلان ب مەرەما پشكنین و چارەسەریا نەخۆشان هەفتیێ دو سەرەدانێن رێكخستی بۆ گوندان دكرن، نەخۆشێن مەترسی ل سەر ژیانا

وان هەی دبرنه باژیران و ل نەخوشخانەین مەزن دنڤاندن؛ بنێرە: عروبة جميل محمد الطائي، موقف الاحزاب السياسية من القضايا الاجتماعية في العراق ١٩٤٦- ١٩٥٨، رسالة ماجستير غير منشوره، كلية الاداب، جامعة الموصل، ٢٠٠١، ص ٦٨

٦٢. طالب مشتاق، رحلة الامير، ج١، ص ٣٩-٤٠ .

٦٣. ذنون الطائي، ژێدەرێ بەرێ، بث ١٧٤؛ محمود الحاج قاسم، تاريخ الطب في الموصل عبر العصور، (د . م . : ٢٠٠٧)، ص٩٥.

٦٤. چوارچووڤێ گرنگیدانا حکومەتا عیراقێ ب سامانێ ئاژەلی و ب مەرەما نەهێلانا بەلاڤبوونا نەخوشیێن ڤەگر و ب ساناهیکرنا هنارتنا ئاژەلی بو دەرڤە و پاراستنا ساخلەمییا ئاژەلی و دانا راپورتێن ساخلەمیێ دو فەرمانگەهێن بەیتەری ل هەریەك ژ شنگال و زاخو دامەزراندن. بنێره جريده البلاغ، العدد ١٦٦، ١٤ كانون الاول ١٩٣٢.

٦٥. الدليل العراقي الرسمي لسنه ١٩٣٦، ص ٢٤٣ .

٦٦. جريده (العقاب)، العدد (٤٧٧)، ٢٠ كانون الاول ١٩٣٨ .

٦٧. جريده (نصير الحق)، العددان (٢٨٩)(٣٢٥)، ٤ ئازار و ٢٦ تموز ١٩٤٥؛ جريده (فتى العراق)، العدد(١٠٥٨)، ٤ تشرين الول ١٩٤٥ ؛ جريده (نصير الحق)، العدد(١٠٤)، ٢ حزيران ١٩٤٦ ؛ جريده (الهلال)، العدد (٤٥٠)، ٢٠ حزيران ١٩٤٦ ؛ جريده (فتى العراق)، العدد (١١٣١)، ٢٠ تموز ١٩٤٦ ؛ ابو هدلان : . بنێره پەراوێزێ هژمار ٤٠ بنێره : ناديه مسعود شريف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، پەراوێز بپ ٥٣ .

٦٨. جريدة (النضال)، العددان (٣٤)(٣٥)، ٢٣ تموز و ٥تشرين الاول ١٩٤٨؛ جريدة (فتى العراق)، العدد (١٣٤١)، ٢٤تموز ١٩٤٨.

٦٩. جميل زيتو عبدالاحد، قريه سناط روضة في بطون الجبال، مجلة (الصوت الكلداني)، العدد ١٠- ٢٠٠٢، ص ٤٨ ؛ افرام عيسى يوسف، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢٧.

٧٠. جريده الوقائع العراقيه، العدد ٣٨٨، ٢٢ كانون الپانى ١٩٢٦ ؛ ناديه مسعود شريف، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٩.

٧١. بابا برهاد، ل سالا ١٨٨٠ێ هاتییەسەر دنیایێ، نوشدارەکێ ژنانێ خودان ئەزموونەکا بەرفرەهە د دەمێ گیروبوونا زاروکبوونێ، ل سەر بنیاتێ ئەزموون و بێی خواندنەکا زانستی فیربوویه باوەرناما مولەتا کارکرنێ د ڤی واریدا نەبوو، نوشدارێ کەنەدی سەروکێ پشکا ژنان ل کولیژا نوشدارییا بەغدا ئەزموون پێکر و د ئەزموونێدا سەرکەت، سالا ١٩٣٩ نورینگەهەکا تایبەت ل مووسلێ هەبوو. بنێره: ناديه مسعود شريف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، پەراوێزێ بپ ٢٩.

٧٢. جريده الوقائع العراقيه، العدد ٣٨٨، ١٢ كانون الپانى ١٩٢٦.

٧٣. وصفيه محمد شيخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٨. ٧٤. الدليل العراق الرسمي لسنة ١٩٣٦، ص ٢٥٠ ؛ محومد الحاج قاسم محمد، تاريخ الطب في الموصل، ص ٩٦.

٧٥. د. ك. و . ملفات البلاط الملكي (وزارة الداخلية)، تقرير رئاسة الهيئة التفتيشية للمنطقة الاولى الموصل، المرقم (س/١٠٣)، فى ٢٩/٢٦ تشرين الاول ١٩٣٥، الى وزارة الداخلية، الموضوع/ تفتيش مركز قضاء زاخو، في المللفة ذات الرقم ٨٩١٦/ ٣٢٠٥٠.

٧٦. جەعفەر محەمەد کەریم، سالا ١٩١٠ ل ناحیا زریاتیه قەزا بەدره لیوا کوت ژ مالباتەکا کوردێن فەیلی هاتییەسەردنیایێ، خواندنا سەرتایی و دواناڤنجی و زانکو ل بەغدا خواندینه، سالا ١٩٣٦ باوەرناما کولیژا نوشداری وەرگرتیه و بوویه دکتور، سالا ١٩٣٩ێ دەست ب چالاکیێن سیاسی کریه و چوویه د رێزێن حزبا (هیوا) و دەمێ پارتی دیمکراتی کوردی هاتییەدامەزراندن وەك ئەندامێ مەکتەبا سیاسیا پارتی هاتییەهەلبژارتن، روژا ١ تەباخا ٢٠٠٠ێ وەغەرا داوییێ کریە. بنێره: مجله (الصوت الاخر)، العدد ٢٩٢، ٢٦ ئیار ٢٠١٠، ص ٢٢.

٧٧. وصفيه محمد شيخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٨.

٧٨. محمود شيخ سين حسو الريكانى، سنجار فى العهد الملكى (١٩٢١- ١٩٥٨)، دراسه تاريخيه، كليه الاداب، جامعه الموصل- ٢٠٠٧، ص ١٦١.

٧٩. جريده (اموصل)، العدد ١٧٩٦٠، ٢٧ شباگ ١٩٤٧.

٨٠. وصفيه محمد شيخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٨.

٨١. جريده (فتى العراق)، العدد ٢٠٥٦، ٢٣ ئیار ١٩٥٧.

٨٢. بنێره دەڤێ باوەرنامێ ل: سعيد الحاج صديق زاخوي لمحات من التراث و الاساطير، ص ١٣٧.
٨٣. وصفيه محمد شيخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٩.
٨٤. هندی پەیوەندی ب ڤەکرنا یەکەمین دەرمانخانە ل زاخۆ هەی دهێتەڤەگێران کو ل سالا ١٩٤٧ێ ژ ئالیێ ئیبراهیم عەبدوللا جەرجیسڤە هاتیەڤەکرن، پشتی نیڤا دووێ ژ سالێن پێنجیان ل پێشانگەها هیلال کو یەك ژ پێشانگەهێن بازرگانیێن زاخۆ بوو دەرمان دهاتنەفرۆشتن. بنێرە: سعيد الحاج صديق الزاخويي، زاخو في الماضي و الحاضر، ص ٢٠٧.
٨٥. بۆ پتر پێزانینان بنێره: وزارة الشؤون الاجتماعية، مديريه النفوس العامة، احصاء السكان لسنة ١٩٤٧، (بغداد، ١٩٥٤)، ج٢، ص ٤٧.
٨٦. وزاره الداخلية، دليل المملكة العراقية لسنة ١٩٣٥- ١٩٣٦، (بغداد، ١٩٣٥)، ص ٣٩٦- ٣٩٧؛ جريدة (الفتى العراق)، العدد ١٦٠، ١٩ ايلول ١٩٣٥.
٨٧. د.ك.و/ ملفات البلاط الملكي (وزارة الداخلية)، تقرير رئاسة الهيئة التفتيشية للمنطقة الاولى الموصل، المرقم (س/١٠٣)، فى ٢٩/٢٦ تشرين الاول ١٩٣٥، الى وزارة الداخلية، الموضوع/ تفتيش مركز قضاء زاخو، في المللفة ذات الرقم ٣٢٠٥٠/٨٩١٦.
٨٨. جريده (الفتى العراق)، العدد ١٧١، ٢٤٩، ٢٦٦، ٢٧ تشرين الاول ١٩٣٥، ١٠ ئ ب ١٩٣٦، ٩ تشرين الاول ١٩٣٦.
٨٩. رۆژا ١٩ ئادارا ١٩٢٨ێ کۆمەلا پاراستنا زارۆکان ل عیراقێ هاتیەدامەزراندن، پاراستنا مافێن زارۆکان و ساخلەمیا وان، دابینکرنا پێدڤیاتیێن هەرەپێدڤی ژ خوارنێ و ڤەخوارنێ و دەرمان و یاریگەهان زێدەباری دامەزراندنا سازیێن ساخلەمیێ و خێرخوازیێ ژ گرنگترین ئارمانجێن وێ بوون. مادێ پێنجی و حەفتێ ژ پەیرەوەێ ناڤخۆییێ کۆمەلێ داکوکیێ ل سەر دامەزراندنا لقێن وێ ل پایتەختێ و لیوایان دکەت، بۆ برێڤەبرنا کاروبارێن خۆ کۆمەلەیا پشتگەرم بوو ب بەخشینێن خێرخوازان و هاریکاریێن حکۆمەتێ و هاریکارێن ئەندامان و پشتگیریێن گشتی. بنێرە: نادیە مسعود شریف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٤- ٨٥.
٩٠. بۆ پتر پێزانینان ل سەر کۆمەلێ بنێرە: ژنون الگائی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦٢- ٢٦٣ ؛ نادیە مسعود شریف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٤- ٨٥.
٩١. نادیە مسعود شریف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٣.
٩٢. جريده (البلاغ)، العددان ٩٥٢ و ٩٥٣، ١٣ و ١٦ شباگ ١٩٤١.
٩٣. جريده (نصير الحق)، العدد ١٠٢، ١ كانون الاول ١٩٤٢.
٩٤. نادیە مسعود شریف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٨.
٩٥. جريده (نصير الحق)، العدد ١٧٣، ٢٧ ئ ب ١٩٤٣.
٩٦. نادیە مسعود شریف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٢.
٩٧. وصفيه محمد شيخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١١.
٩٨. تیفوئید (Typhoid) نەخۆشییەکا ڤەگرە، ئەگەرێ وێ میکروبەکێ تایبەتە هێرشێ دبەرتە سەر ریڤیکێن هوور و دبیت ببیتە ئەگەرێ ژ دەستدانا ژیانا نەساخی. بنێرە: نادیە مسعود شریف الجراح، ژێدەرێ بەرێ پەراویزێ بپ ٩، ژ نیشانێن ڤێ نەخۆشیێ بلندبوونا پلەیێن گەرماتیا لەشێ مرۆڤی دگەل تەمبەلی و خاڤبوونا مرۆڤی و ژ دەستدانا چێژا خوارنێ سەرئێشان و رەجفین و ژانا ماسوولکان و کێمبوونا لێدانا دلی دگەلدا دهێن. ب رێکا ئاڤێ و ئاخێ و جلك و ئامان و کەرەستەیێن نەخۆشی بکارئینایێن بەلاڤەدبیت، مێش ژی نەساخیێ ژ کەسێن نەخۆش ڤەدگوهێزیتە بێن ساخلەم. بنێرە: ومیض سرحان ذیاب، ژێدەرێ بەرێ، پاراوێزێ بپ ٥٤.
٩٩. قورباچه (السعال الديكي- Whooping cough): ژ نەخۆشیێن ڤەگرە زارۆکان دگریت ژ نیشانێن وێ کوخکەکا بهێز و دژوار ب دەنگەکێ مینا دەنگێ دیکلی گەلەك جاران قورباچەیێ خوین دگەلدایە. بنێرە: نادیە مسعود شریف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، پەراویزێ بپ ٤٩.
١٠٠. د.ك. و. ملفات البلاط الملكي (وزارة الداخلية)، تقرير تجوال الموظفين الاداريين، تقرير الاداري لمدير ناحية السندي لشهر تشرين الثاني ١٩٥٥، في الملف ذات الرقم ٩٥٤٠/ ٥٢٠٥٠.
١٠١. د.ك. و. ملفات البلاط الملكي (وزارة الداخلية)، تقرير المفتش الاداري عبدالرزاق شكاره، المرقم ٤، فى ١٠ كانون الثاني ١٩٥٢، الى وزارة الداخلية، الموضوع/ تفتيش مركز قضاء زاخو، في المللفة ذات الرقم ٣٢٠٥٠/٨٣٤٤.
١٠٢. حيدر حميد رشيد، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٩٥، تشتێ سەرنجراکێش ئەوە کو هندەك ڤەدگێرن د دەمێ ڤەکولینێدا شەڤرەڤینك و حاجی رەشك ل زاخۆ د زۆربوون و ب خوارنا وان پێشییان هاریکاریا ژناڤبرنا نەخۆشیا مەلاریایێ ل زاخۆ دکر. بنێرە: وصفيه

محمد شیخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١١.

١٠٣. م. م. ن، املاك الحكومية و تعميرها فى قضاء زاخو، كتاب قائمقامية قضاء زاخو، المرقم ٥٠٦، فى ٢٦ كانون الثاني ١٩٥٥، الى متصرفية لواء الموصل، الموضوع/ بناية مستوصف العاصي في مركز ناحية السليفاني، في الملفة ذات الرقم ٥/١/٢٣، المكتبة العامة، مدينة الموصل.

١٠٤. جريدة (الفتى العراق)، العدد ١٣٤١، ٢٤ تموز ١٩٤٨، جريدة (نصير الحق)، العدد ١٣٤٩، ٢٤ تموز ١٩٤٨.

١٠٥. جريده (نصير الحق)، العدد ٦٨٨، ٢٥ اذار ١٩٥١ ؛ جريدة اللواء، العدد ٢، ١٠ ايلول ١٩٥١.

١٠٦. جريدة (نصير الحق)، العدد ٧٠٤، ١٤ ايلول ١٩٥١.

١٠٧. وصفيه محمد شیخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١٢.

١٠٨. نەسرین دەرویش شارەزا (حەكیمەكا) خودان شیانبوو بۆ پاقژكرنا گەورێ ژ زنربیان (الديدان الشريطية) ئەوێن ب رێكا ڤەخوارنا ئاڤا كانی و بركان دگەهشتنە گەوریا مرۆڤی، ڤێ ژنێ ب رێكا تێكەلكرنا هندەك گیایان دگەل هووركێ لیموندزێ پشتی تێكەلكرنا هەردویان ئەڤ تێكەلەیە دكرەناڤ لەڤەنی و لەڤەن دكره دناڤ دەڤێ نەخۆشیدا پشتی كو پفدكره د لەڤەنیدا ئەڤ كەرەستێ تیر دگەهشتە ناڤ گەوریا مرۆڤی و پشتی دەمەكێ كێم ئەڤ كرمە ژ گەورێ ڤەدبوو و پشتی خوینەكا كێم كو ژ ئالیێ كرمیڤە دهاتەمێژتن دهاڤێژتە دەرڤە. بنێرە: وصفيه محمد شیخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٨.

١٠٩. هەمان ژێدەر.

١١٠. سعيد الحاج صديق زاخوی، لمحات من التراث و الاساطير، ص ١٢٩- ١٣٠.

١١١. هەمان ژێدەر، بپ ١١٨.

١١٢. وصفيه محمد شیخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٨.

١١٣. بۆ زانینا ئەو خێزانێن دیترێن زاخۆ یێن ئەڤ كارە دكر بنێرە: سعيد الحاج صديق الزاخوی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٠- ١٢١.

١١٤. بۆ زانینا ئەو مەزارێن دیترێن خەلكێ زاخۆ سەرەدانا وان دكر بنێرە: سعيد الحاج صديق الزاخوی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١٢- ١١٦.

١١٥. الاب بولدۆ، مزگینیدەرەكێ دومونیكانیێ كەڤن و زانایەكێ گیانیاسیێ و نۆشدار و نشتەرگەرەكێ خودانشیان بوو، سالا ١٧٧٩ ل زاخۆ مریە، دهێتەڤەگێران كو بەردەوام كوردێن مووسلمان و جوهی (یهودی) و مەسیحی ب مەرەما چاكبوونەڤێ ژ تایێ سەرا مەزارێ وی ددا. بنێرە: الاب توماس بوا، معرفه الاكراد، ترجمه باڤێ ئارام، (بيروت:د.ت)، ص ٨٦.

١١٦. خوین بەردان د وەرزێ بهارێدا بۆ هەركەسەكێ هەست ب گێژبوونێ یان گرانییا لەشی یان دلنەچوونە خوارنێ دكر، دا كەسێ پێدڤی ل سەر كورسییەكێ روونتەخوار ژ نیڤا سلالڤە دهاتەرووسكرن، پشتی كو چەڤوكا حەلاقی ب سپیرتوی تەعقیمدكر دو خێچێن بچووك دناڤبەرا هەردو ملێن نەساخی دكرن و كولندەكێ هشكێ ڤالا ددانا سەرئالیەكێ برینێ خوینا ژ برینێ دەردكەت تێدا كۆمدكر و هندەك جاران كولند تژی دبوو و ئەو خوین درێشت جارەكا دی دادنا بەر برینێ هەتا خوین دبریا و نەساخ تەنا دبوو. بنێرە: وصفيه محمد شیخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٩.

١١٧. هەمان ژێدەر.

١١٨. ئەلیاس ساوا: سالا ١٨٩٦ێ هاتییەسەردنیایێ یێ ناڤداربوو ب ڤەگرتنا ئەندامێن شكەستی یێن لەشی، چەند دەهـ سالەكان ئەڤ كارە بێی بەرامبەر ئەنجامددا. بنێرە: الاب يوسف (لازكين) عبدالاحد، بيرسڤێ عبر التاريخ، (د.م:٢٠٠٥)، ص ٤٨.

١١٩. هەمان ژێدەر.

١٢٠. وصفيه محمد شیخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٩.

١٢١. نادیه مسعود شریف الجراح، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٧ ؛ سعيد الحاج صديق الزاخوی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٨.

١٢٢. خاتون گورگیس: سالا ١٩٠٩ێ ل بێرسڤێ هاتییەسەردنیایێ، داپیر الاب يوسف(لازكين) عبدالاحد) و دایكا شەماس (ئیشو بترس)ە، چەند دەهسالەكان كارێ داپیركیێ بێی بەرامبەر ل بێرسڤێ و گوندێن دەوروبەرێن وی دكرن، هەروەسان شارەزایی د وارێن دیترێن نۆشداریا مللی و چارەسەركرنا سوتنان و هندەك نەخۆشیێن سڤك هەبوو. بنێرە: الاب يوسف (لازكين) عبدالاحد، بيرسڤێ عبر التاريخ، بپ ٤٨.

١٢٣. هەمان ژێدەر.

١٢٤. نزار حنا الديراني، ديرابون بين الماضى و الحاضر، (بغداد:٢٠٠٤)، ص ٣٢.

# بەهدینان د رۆژنامەیا (موصل) ١٩٠٢-١٩٠٦ دا

پ. د. خلیل علی مراد
زانکۆیا سەلاحەددین کولیژا ئادابێ

پ. هـ. د. هوگر تاهر توفیق
زانکۆیا زاخۆ- کۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی

وەرگێران: سالح یوسف سوفی

**کورت:**

ب بۆرینا دەمی ژێدەر و سەرەکانیێن دیرۆکێ ژی گوهورین ب سەردا دهێن، دگەل گوهورینا ژیانا مرۆڤایەتی گوهورین دکەڤیتە لایەنێ رۆشنبیری ژی، هۆسا، دیرۆکا کەڤن ژێدەرێن خۆ هەنە و ئەو ژێدەر دجودانە ژ ژێدەرێن سەردەمێن ناڤین و د جهێ خۆدایە ئەڤ تشتە بۆ دیرۆکا نوو و هەڤچەرخ ژی بهێتە گۆتن.

ئەڤرۆ رۆژنامەڤانی بوویە ژێدەرەك بۆ نڤیسینا دیرۆکێ، نەخاسمە ژی بۆ دیرۆکا هەردو سەدسالیێن ١٩ و ٢٠ێ، ڤێجا هەکە رۆژنامەڤانی یا گرنگ بیت ژ بەرکو بوویە ژێدەرەك بۆ دیرۆکێ، پا ئەرێ گرنگیا وێ دێ چەند بیت بۆ دەڤەرەکا دیرۆکەکا نڤیسکی نەبیت و خەلکێ وێ تشتەك ل پاش خۆ نەهێلابیت ڤەکۆلەر پێ بشێت خۆ داهێلیتە ناڤ کویریا دیرۆکا وێ، کو ئەڤ گۆتنە هەتا پلەیەکا بلند ل سەر بابەتێ ڤێ ڤەکۆلینێ ژی دگونجیت.

رۆژنامەیا (موصل) ژی ئێکە ژ وان ژێدەرێن گەلەك کێمێن ل سەر دیرۆکا دەڤەرا بەهدینان نڤیسی کو د فولکلۆرێ وێ یێ زاردەڤ دا ب دەڤەرەکا خودان دیرۆکەکا دێرین دهێتە ل قەلەمدان، لێ دیرۆکا نڤیسکی ڤێ راستیێ پشتڕاست ناکەت راستی ژی یا تەعلە هەروەکی د پەندێن فولکلۆریێن دیرۆکی دا دهێتە گۆتن.

## پێشگۆتن:

ئەوێن ڤەکۆلینان ل سەر دەڤەرا بەهدینان دکەن کو ئەڤ دەڤەرە دکەڤیتە کوردستانا عیراقێ و ل سەر توخیبێ ترکیا[1]، روی ب روی کێشەیەکێ دبن، چونکی تشتەکێ کێم ل سەر ڤێ دەڤەرا مەزن و بەرفرەهـ هاتییە نڤیسین و دیرۆکەکا نڤیسکیا هەژی رۆلێ وێ نینە هەر ژ سەردەمێن بۆری بگرە ئانکو ژ سەردەمێ ئیمپراتۆریا ئاشووری و سەردەمێن ناڤینێن ئیسلامی هەتا دگەهیتە دیرۆکا وێ یا داویا سەردەمێ ئیمپراتۆریا ئۆسمانی و هەتا نۆکە، ئەو

تشتێ ل سەر ڤێ دەڤەرێ هاتییە نڤیسین ژی هژمارکا پەرتووکێن کێمن و دیرۆکنڤیس و ڤەکۆلەران ژ دەڤێن هوورێن دیرۆکی یێن بەحسێ دیرۆکا کوردستانێ و دەڤەرێ ب گشتی دکەن ڤێدانینە و کۆم کرینە، ژ بەر هندێ، هەر تشتەکێ پەیوەندی ب ڤێ دەڤەرێ ڤە هەبیت بهێتە دیتن کارەکێ گەلەك گرنگە، ژ بەرکو دێ ڤالاتییەکێ د دیرۆکا بەهدینان دا پرکەت، چونکی گەلەك جاران بەهدینان و خەلکێ وێ دهێتە عەیبەلۆکرن و وەسا دهێنە ل ڤەلەمدان چ رۆل د دیرۆکا کوردستانێ دا نەبن دەمێ دگەل دەڤەرێن دی یێن کوردی دهێنە هەڤبەرکرن، بۆ زانین ژی، شەرەفخانێ بەدلیسی، ئێکەمین دیرۆکنڤیسێ کورد، ب ئاوایەکێ جیاواز بەحسێ ڤێ دەڤەرێ کرییە و وەسا دیار کرییە کو بەهدینان ل سەردەمێ وی ل سەدسالیا شازدێ دا زایینی دا رووگەها (قیبلەگەها) زانست و زانایێن کوردستانێ بوویە، نەخاسمە ژی ل سەردەمێ حوکمداریا میرگەها بەهدینان کو باژێرێ ئامێدیێ پایتەختێ وێ بوو[٢].

ژ بەر هندێ، بابەتێ ڤێ ڤەکۆلینێ گرنگییەکا مەزن بۆ دیرۆکا بەهدینان هەیە و ژیانا وێ یا سالێن ١٩٠٢-١٩٠٦ێ رۆهن و ئەشکەرا دکەت، ئەڤە ژی ژ وان نڤیسینان دیار دبیت یێن د رۆژنامەیا (موصل) دا هاتینە بەلاڤکرن و ئەڤ نڤیسینە ئەشکەرا دکەن کو ئەڤ دەڤەرە وی دەمی د هاویشبوونەکا رێژەیی دا ژیایە، بەرۆڤاژی هەیاما پشتی کۆدەتایا ئۆسمانی یا سالا (١٩٠٨)ێ، کو بزاڤەکا کوردی ب رێبەریا شێخ عەبدولسەلام بارزانی ل دەڤەرێ هەبوو .

دشیاندا نەبوو هەمی هژمارێن ڤێ رۆژنامەیێ بهێنە پەیداکرن، هەروەسا نۆکە ژی ب زەحمەتە هەمی هژمارێن وێ بهێنە کۆم کرن، چونکی هژمارێن وێ ل ناڤبەرا کۆمەکا ڤەکۆلەر و رۆشنبیرێن عیراقی و کورد بژالە بووینە، لێ ژ خۆشبەختی هێژا (رەفیق سالح) سەرپەرشتێ -بنکەی (ژین) یێ ڤەژاندنا کەلەپوورێ بەلگەنامەیی و رۆژنامەڤانییا کوردی ل باژێرێ سلێمانیێ- شیایە (١٥٠) هژمارێن وێ ب دەست خۆ بێخیت، کو ئەو ژی ژ هژمارا (٦٦٢) یا رۆژا (١٩٠٢/٦/١٩)ێ دەرکەڤتی هەتا هژمارا (٨١١) یا رۆژا (١٩٠٦/٣/٨)ێ دەرکەڤتی نە و ب سوپاسی ڤە رادەستی مە کرن و مامۆستا دکتۆر خەلیل عەلی مراد هەر تشتەکێ د ڤان هژماران دا یێن پەیوەندی ب بەهدینان ڤە هەی وەرگێڕاینە.

رۆژنامەیا (موصل) ب ئێکەمین رۆژنامە دهێتە هژمارتن ل باژێرێ مووسل دەرکەڤتبیت کو ئەڤە رۆژنامەیا فەرمییا ڤێ ویلایەتێ بوو و هەر حەفتیێ جارەکێ ب زمانێ تورکی یێ ئۆسمانی دەردکەڤت، هژمارا ئێکێ یا وێ ل رۆژا ٢٥ی خزیرانا سالا (١٨٨٥)ێ ب چوار بەرپەرێن قەبارەیێ ناڤین (٤٣×٢٧ سم) دەرکەڤتییە، د بەرپەرێ ئێکێ یێ وێ دا و ل بن لۆگۆیێ وێ هاتییە دیارکرن کو ئەڤە رۆژنامەیا فەرمییا ویلایەتێ یە و حەفتیێ جارەکێ دەردکەڤیت رۆژنامەیا (موصل) هەتا هەلبوونا شەرێ جیهانیێ ئێکێ ل سالا (١٩١٤)ێ بەردەوام بوویە، هەروەسا پشتی باژێرێ مووسل ل سالا (١٩١٨)ێ ژ لایێ بریتانیا ڤە هاتییە داگیر کرن، دوبارە رۆژنامە دەرکەڤت و هەتا سالا (١٩٣٤)ێ یا بەردەوام بوو[٣].

ئەڤ رۆژنامە وەك ئۆرگانا حکۆمەتا ئۆسمانی ل ویلایەتا مووسل بوو، ژ بەر هندێ، دێ بینین گەلەك پویتە ب دەنگ و باسان دایە، دەنگ و باسێن دامەرزاندنێ، سەرەدانان، باج وخویکان، کارەساتێن خورستی بەلاڤ کرینە، ل سەر ڤی بنواشەی، مرۆڤ چ خۆشیێ ژ خواندنا وێ نابینیت هەروەکی ژ خواندنا رۆژنامەیێن دی دبینیت یێن هژمارکا بەرپەرێن خۆ بۆ کاروبارێن هزریێن پەیوەندی ب جڤاك و دەڤەرێ ڤە هەین تەرخان دکەن، کو هەر ڤێ مەسەلێ کاریگەریا خۆ ل سەر ڤێ ڤەکۆلینێ ب خۆ ژی هەبوویە، چونکی گەلەك جاران ژ بەر زۆریا دەنگ و باسان د بیاڤەکی دا، خواندەڤان هەست ب بێزاریێ دکەت، لێ دشیانداییە ئەڤ ڤەکۆلینە ببیتە شەنگستە بۆ ڤەکۆلینێن دی یێن پەیوەندی ب ڤێ دەڤەرێ ڤە هەین، چونکی زانیارییێن باش ل سەر دەڤەرا بەهدینان یێن دەستپێکا سەدسالییا بیستێ تێدا هەنە.

ل دووڤ وان زانیارییێن رۆژنامەیا (موصل) بەلاڤ

كرین و هەر ئێك ل دووڤ گرنگیيا وان، مە پلانەك بۆ ڤێ ڤەكۆلینێ دانا و كرە حەفت تەوەر و هەر تەوەرەك ژی بۆ جۆرێن وان دەنگ و باسێن ل سەر بەرپەرێن وێ هاتینە بەلاڤكرن پۆلێن كرن، دشیاندایە ژی ب ڤان پرسیارێن ل خوارێ ب وان تەوەران دا بچین:

وی دەمی ژیان ل بەهدینان یا چەوان بوو؟ ئاوایێ كارگێرییا ئۆسمانی ل وێ دەڤەرێ یا چەوان بوو؟ دیارترین كێشەیێن روی ب روی دەڤەرا بەهدینان دبوون چ بوون ؟ ئایا خەلكێ بەهدینان پشكدارییەكا كاریگەر دناڤ حوكمەتا ئوسمانی دا كرییە ؟ دیارترین كێشەیێن روی ب روی كارگێرییا ئۆسمانی ل دەڤەرێ بووین چ بوون؟ ئۆسمانییان چەوان سەرەدەری دگەل وان كێشەیان دكر؟ ل داویێ ژی، وی دەمی روخسارێ جڤاكێ كوردی یێ چەوان بوو؟

ل دووڤ شیانان ئەڤ ڤەكۆلینە ب ئەمانەت و ب ئاوایەكێ زانستی و ب هویری دێ بەرسڤا وان پرسیاران و هندەك پرسیارێن دی دەت و بۆ بەرسڤدانا وان ژی دێ پشتا خۆ ب وان دەنگ و باسان گەرم كەت یێن د بەرپەرێن ڤێ رۆژنامەیێ دا هاتینە بەلاڤكرن، كو ئەڤە دبیتە ئێكەمین رۆژنامە د دیرۆكێدا ب ئاوایەكێ بەرفرەهـ بەحسێ دەڤەرا بەهدینان كری.

ل داویێ ژی و بەری بچینە د ناڤ وان تەوەران دا، دڤێت دیار بكەین كو نمرا هژمارا رۆژنامەیێ د ناڤەرۆكا ڤێ ڤەكۆلینێ دا نەهاتییە دیار كرن، بەلكی تنێ دیرۆكا دەركەڤتنا وێ هاتییە گۆتن، لێ نمرا هژمارێ د دەهمەنێ دا هاتییە دیار كرن وەك پێكۆلەك بۆ خۆ دویرئێخستنێ ژ دوبارەنەبوونێ، هەروەسا ل ڤێرە تشتێ گرنگ ئەوە دیرۆكا دەركەڤتنا هژمارا رۆژنامەیێ بهێتە گۆتن، نە نمرا هژمارا رۆژنامەیێ ب خۆ.

# ئێك - دامەزراندن و ڤەگوهاستنێن كارگێری ل دەڤەرا بەهدینان:

رۆژنامەیا (موصل) هژماركا باش یا دەنگ و باسێن دامەزراندنا قائیمقام و دادوەران (قازییان)، هەروەسا هەلبژارتنێن جڤاتێن قەزایێن دەڤەرا بەهدینان د ناڤ بەرپەرێن خۆ دا بەلاڤكرینە كو ئەڤ دەڤەرە وی دەمی ژ لایێ كارگێری ڤە سەر ب لیوا مووسل بوو كو ناڤەندا ویلایەتێ بوو[4]، دەمێ پێداچوون ب وان دەنگ و باسان دا دهێتە كرن، گەلەك باش هێلێن كارگێرییا ئۆسمانی ل ڤێ دەڤەرێ ئەشكەرا دبن، ئەڤە ژی دیارترین ئەو زانیارینە یێن رۆژنامەیا (موصل) د ڤی بیاڤی دا بەلاڤ كرین:

## أ - قەزا دهۆك:

دەمێ پێداچوون د ڤێ رۆژنامەیێ دا دهێتەكرن، باش دیار دبیت كو دەنگ و باسێن ل سەر ڤێ قەزایێ كو مەزنترین قەزایا كوردییە ل دەڤەرا بەهدینان هەروەكی وێ رۆژنامەیێ ب خۆ ژی ئەو چەند دیار كری[5]، دەنگ و باس ل سەر دكێمن هەكە بهێنە هەڤبەركرن دگەل قەزایێن دی یێن وەكی: زاخۆ، ئامێدیێ و ئاكرێ، لێ سەرباری ڤێ كێمیێ، رۆژنامەیێ زانیارێن گرنگ ل سەر ڤێ قەزایێ بەلاڤ كرینە و رۆناهی ئێخستییە سەر ناڤێن قائیمقامێن دهۆك و دیارترین كارێن وان و جڤاتێن قەزایێ و دادوەرێن وێ.

ژ دەنگ و باسەكێ هژمارا رۆژا (١٩٠٢/١٠/١٦) یێ یا رۆژنامەیا (موصل) دیار دبیت كو (عزت ئەفندی) قائیمقامێ دهۆك بوویە، د وی دەنگ و باسی دا هاتییە كو ئەو (ئانكو عزت ئەفندی) بۆ وەرگرتا هندەك رێنماییان سەرەدانا ناڤەندا ویلایەتا مووسل كرییە[6]، هەروەسا دەمێ ب هژمارێن رۆژنامەیێ دا دچین ئەشكەرا دبیت كو (عزت ئەفندی) ژ پۆستێ وی هاتییە لادان و (ئیبراهیم نەجاتی ئەفندی) وەك قائیمقام ل شوونێ هاتییە دامەزراندن و د هژمارا رۆژا (١٩٠٣/١١/٥) یێ دا دەنگ و باسەك هاتییە بەلاڤ كرن و تێدا هاتییە: ل دووڤ فەرمانا وەزارەتا ناڤخۆ قائیمقامێ بەرێ یێ قەزا (سروج) كو سەر ب ویلایەتا حەلەبێ بە ل پۆستێ قائیمقامێ دهۆك هاتییە دامەزراندن، پشتی قائیمقامێ وێ (عزت ئەفندی) ژ وی پۆستی هاتییە لادان[7]، رۆژنامەیێ د هژمارا رۆژا (١٩٠٣/١٢/٢٤) یێ دا دیسان بەحسێ ڤێ چەندێ كرییە و تێدا گۆتییە كو (ئیبراهیم نەجاتی ئەفندی)

قائیمقامێ قەزا (سروج) ل ویلایەتا حەلەبێ یێ وەك قائیمقامێ دهۆك هاتییە دامەزراندن، بۆ وەرگرتنا هندەك فەرمان و رێنماییان ژ پێگەهێ والیێ ویلایەتێ و بۆ سووندخوارنێ هاتییە ناڤەندا ویلایەتا مووسل و ل دووڤ فەرمانا برۆسکا وەزارەتا ناڤخۆ ژی د ماوێ دو رۆژان دا دێ ڤەگەرێتە دهۆك بۆ دەست ب کاربوونا خۆ ل وێ قەزایێ[٨].

رۆژنامە هەر د وێ هژمارێدا پێڤەدچیت و دبێژیت کو قەزا دهۆك مەزنترین قەزا ویلایەتێ یە و ژ هەمی قەزایێن وێ ئاڤەدانترە، هەروەسا ناڤبری ئانکو (ئیبراهیم نەجاتی ئەفندی) ژ قائیمقامێن دێرینێن خودان شیانە، ژ بەر هندێ، هیڤیخوازین -هەروەکی رۆژنامە دبێژیت- ب ئاوایەکێ باش رێڤەبەریا قەزایێ بکەت[٩]، هەروەسا د هژمارا رۆژا (١٩٠٣/١٢/٣١)ێ دا رۆژنامەیێ گۆتییە کو (ئیبراهیم نەجاتی ئەفندی) پشتی رێنما و فەرمانێن پێدڤی وەرگرتین، بۆ دەستپێکرنا کارێ خۆ قەستا دهۆك کرییە[١٠].

رۆژنامەیێ ئەڤ دەنگ و باسێن کورت ل سەر پۆستێ قائیمقامێ قەزا دهۆك بەلاڤ کرینە و وەسا دیارە ژی کو (ئیبراهیم نەجاتی ئەفندی) هەتا سالا (١٩٠٦) ێ ل وی پۆستی مایە، چونکی رۆژنامەیێ پشتی هنگی چ دەنگ و باس ل سەر لادان یان ڤەگوهاستن و دانانا کەسەکێ دی ل شوونا وی ل وی پۆستی بەلاڤ نەکرینە.

لێ دەنگ و باسێن رۆژنامەیا (موصل) ل سەر جڤاتا قەزایا دهۆك و ناڤێن دادوەرێن وێ یێن ل دادگەها وێ هاتینە دامەزراندن بەلاڤ کرین ب ڤی ئاوایێ خوارێ نە:

د هژمارا رۆژا (١٩٠٣/١٢/١٨) ێ دا دەنگ و باسەك ل سەر هەلبژارتنا ئەندامێن جڤاتا کارگێڕیا قەزا دهۆك و ئەندامێن دادگەها بەراهیێ (محکمة البداءة) یا وێ هاتییە بەلاڤ کرن و دیار دکەت کو د وان هەلبژارتنان دا هەر ئێك ژ: (شەمدین ئاغا، محەمەد تەها ئاغا، کورۆ ئاغا و ئیلیا ئاغا) بۆ ئەندامەتیا جڤاتا کارگێڕیا قەزایێ و هەر ئێك ژ ئاغایێن خوارێ: (عەبدوللا عەلی و حەننا بدی-

دبیت مەتی یان بەدێ بیت) بۆ ئەندامەتیا دادگەها بەراهیێ سەرکەڤتن ب دەستڤەئینانە[١١]، وەسا دیارە ژی کو کارگێڕیا ویلایەتێ هەر هەیام هەیام هەلبژارتن کرینە، دبیت ژی چ دەمێن دەستنیشانکری بۆ وان هەلبژارتنان نەبن، بەلکی ل دووڤ رەوش وکاودانێن ناڤخۆیی یێن دەولەتا ئۆسمانی تێڕا دبۆری ئەو هەلبژارتن ئەنجام دابن، هەر بۆ نموونە رۆژنامەیێ د هژمارا رۆژا (١٩٠٥/٣/١٦)ێ دا دەنگ و باسەك ل سەر هەلبژارتنا ئەندامێن جڤاتا کارگێڕیا دهۆك و ئەندامەتیا دادگەها بەراهیێ بەلاڤکرییە، ل دووڤ وی دەنگ و باسی، هەر ئێك ژ (محەمەد کوڕێ تەها) و کەسەکێ دی ژ تیرەیا مەسیحییان ب ناڤێ (کاکۆز ئاغا) بۆ ئەندامەتیا جڤاتا قەزایێ و (محەمەد کوڕێ سالح ئاغا) بۆ ئەندامەتیا دادگەهێ زۆرینەیا دەنگان ب دەستڤەئینانە و فەرمانا دامەزراندنا وان ل وان پۆستان ژ ناڤەندا ویلایەتێ بۆ قائیمقامیا قەزایێ هاتییە هنارتن[١٢].

هەکە هوورك ل ڤان هەلبژارتنا بهێتە نێڕین، دیار دبیت کو کارگێڕیا ئۆسمانی ل ویلایەتا مووسل پشتا خۆ ب ماقوولێن دەڤەرێ گەرم کرییە بۆ پڕکرنا کورسیێن جڤاتا قەزایێ و دادگەها بەراهیێ، بەرۆڤاژی پۆستێ قائیمقامی کو پتریا جاران قائیمقامێ دهۆکێ ژ خەلکێ دەڤەرێ نەبوویە، ژ وان دەنگ و باسان دیار دبیت کو پتریا ئەوێن پۆست د جڤاتا کارگێڕیا قەزایێ و دادگەها بەراهیێ دا وەرگرتین ئاغایێن دەڤەرێ بووینە، هەروەسا تیرەیا مەسیحی ژی رۆلەکێ گرنگ د وان پۆستان دا هەبووینە و پشکداری تێدا کرینە.

لێ تشتێ وی دەمی پەیوەندی ب دادوەرێ دهۆك ڤە هەی، کەسەك ب ناڤێ (عەبدلقادر ئەفندی) ل وی پۆستی بوو کو بەرێ دادوەرێ شنگال بوو، ئەڤە ژی پشتی والیێ مووسل ب خۆ فەرمانا دامەزراندنا وی ل وی پۆستی دای، هەروەکی د دەقێ دەنگ و باسێ هژمارا رۆژا (١٩٠٤/٣/٤)ێ دا هاتی[١٣].

سەرباری هندێ، هندەك دامەزراندنێن دی یێن حکومی ژی ل قەزا دهۆك هەبوون، لێ گەلەك دکێم

بوون، وەکی دەنگ و باسێ د هژمارا رۆژا (١٩٠٤/٤/١٤) ێ دا کو تێدا هاتییە: پشتی مرنا (محەمەد ئەفندی) نڤیسەرێ داهاتێن ناڤەندی ل سەنتەرێ فەرمانگەها ژمێریاریا ویلایەتێ، (رەشید ئەفندی) رێڤەبەرێ دارایی یێ دهۆك ل شوونێ هاتییە دامەزراندن، هەروەسا (عەبدوللا ئەفندی) رێڤەبەرێ دارایی ل ئاکرێ وەك رێڤەبەرێ دارایی ل دهۆك هاتییە دامەزراندن[14].

## ب - زاخۆ:

زاخۆ ب ئێك ژ قەزایێن گرنگێن دەڤەرا بەهدینان دهێتە هژمارتن، زاخۆ هەردەم رۆلەکێ مەزن د قوناغێن دیرۆکێ یێن دەڤەر تێرا بۆری دا هەبوویە، ژ بەر هندێ، رووبەرەکێ بەرفرەهێ رۆژنامەیێ بۆ هاتییە تەرخان کرن و گەلەك دەنگ و باس ل سەر پۆستێ قائیمقامی هاتینە بەلاڤ کرن کو پۆستەکێ گرنگێ قەزایێ یە.

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٢/٩/٢٥) ێ دا دەنگ و باسێ دامەزراندنا (خورشید بەگ) قائیمقامێ بەرێ یێ قەزا (بیت الشباب) — کو سەر ب ویلایەتا هەکاری یە — وەك قائیمقامێ زاخۆ بەلاڤکرییە[15]، (خورشید بەگ) ل دۆرێن سێ سالان ل وی پۆستی بەردەوام بوویە و نەهاتییە لادان یان ڤەگوهاستن ژ بەر نەخۆشیێ نەبیت، هەروەکی د هژمارا رۆژا (١٩٠٥/٨/١٧)ێ دا دیار دبیت و پشتی وی پۆستێ قائیمقامێ زاخۆ ب وەکالەت ب عەبدولکەریم (ئەفندی) هاتییە راسپاردن کو باج و خویك ل دەڤەرێ کۆم دکرن[16]، پاشی پشتی دەمەکێ گەلەك کورت ویلایەتا مووسل قائیمقامەکێ نوو بۆ زاخۆ دامەزراند کو ئەو ژی (نیهاد بەگ)ێ قائیمقامێ (مسلاتە) بوو هەروەکی دەنگ و باسێ دامەزراندنا وی د هژمارا رۆژا (١٩٠٥/٩/٢)ێ دا هاتی[17].

هەر دیسان تێدا هاتییە کو پشتی دو هەیڤان ژ دامەزراندنێ (نیهاد بەگ) دەست ب کارێ خۆ یێ نوی کر ئەو ژی ل دووڤ دەنگوباسێ د هژمارا رۆژا (١٩٠٤/٣/٤)یدا هاتییەبەلاڤکرن.[18]

ل سەر جڤاتا قەزایێ و دادگەهان و پۆستێ دادوەرێ زاخۆ، رۆژنامەیێ زانیاری یێن کێم د ڤێ بیاڤی بەلاڤ کرینە، ژ وانا وەکی دەنگ و باسێ د هژمارا رۆژا (١٩٠٢/٦/٢٦) ێ دا هاتی کو تێدا بەحسێ هەلبژارتنا هەر ئێك ژ: (عەلی ئاغا، شالۆم ئاغا) بۆ نیڤا ئەندامەتییا جڤاتا کارگێرییا قەزا زاخۆ و دامەزراندنا (یەحیا ئەفندی) بۆ ئەندامەتییا دادگەها بەراهیێ یا وێ کرییە[19].

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٤/٢١) ێ دا بەلاڤکرییە کو پشتی ب داوی هاتنا دەمێ یاسایی یێ نیڤا ئەندامێن جڤاتا کارگێری و دەستەیا دادگەهێن ئامێدیێ و زاخۆ، هەلبژارتن هاتینە کرن هەر ئێك ژ (حەجی ئەحمەد ئاغا، یۆنان ئاغا) ب زۆرینەیا دەنگان بۆ ئەندامەتییا جڤاتا قەزا زاخۆ و (حاجی عەبدوللا چەلەبی) بۆ ئەندامەتییا دادگەها بەراهیێ یا وێ قەزایێ سەرکەڤتن ب دەستڤەئینانینە[20]، پشتی بۆرینا نێزیکی سالەکێ، رۆژنامەیێ د هژمارا رۆژا (١٩٠٤/٤/٧)ێ دا دەنگ و باسێ دامەزراندنا (میخائیل ئەفندی) وەك ئەندامێ دادگەها بەراهیێ یا زاخۆ بەلاڤکرییە پشتی ناڤبری د هەلبژارتنان دا زۆرینەیا دەنگان ب دەستڤەئینای[21].

ل سەر پۆستێ دادوەری ژی ل زاخۆ، هەرچەندە رۆژنامە پشتراست دکەت کو (سلێمان فائیق) دادوەرێ شەرعی ل زاخۆ بەردەوامە ل پۆستێ خۆ ل دووڤ رێنمایێن ژ ستانبۆلێ هاتین هەروەکی د هژمارا رۆژا (١٩٠٤/١١/٣)ێ دا هاتییە بەلاڤکرن[22]، لێ ئەڤ دادوەرە گەلەك ل سەر کارێ خۆ بەردەوام نەبوویە و د هژمارا رۆژا (١٩٠٥/٨/٣)ێ دا هاتییە کو دادوەرێ شنگال پێکەهێ شێخنشینیێ (مشیخە الاسلام) ل ستانبۆلێ فەرماندایە (سلێمان فائیق)ێ دادوەرێ زاخۆ وەك دادوەرێ شنگالێ بهێتە دامەزراندن و (ئیسماعیل ئەفندی)یێ دادوەرێ بەرێ یێ ئاکرێ وەك دادوەرێ زاخۆ بهێتە دامەزراندن[23].

سەرباری ڤان دامەزراندنان، رۆژنامەیا (موصل) ئاماژە کرییە هندەك دامەزراندن و ڤەگوهاستنێن دی ل قەزا زاخۆ، ژ وانا هەر بۆ نموونە: ل دووڤ داخوازی و رازیبوونا (خالد ئەفندی و محەمەد خرابی ئەفندی)

نڤیسەرێن نڤیسینان ل هەر ئێك ل زاخو و ئامێدیێ جهگوهۆڕین ب هەر ئێك ژ وان هاتیە کرن و ئەڤ چەندە د هژمارا رۆژا (١٩٠٣/٦/٩)ێ دا هاتیە بەلاڤ کرن[٢٤]، هەروەسا (قادر ئەفندی) رێڤەبەرێ دارایی یا زاخو بۆ پۆستێ رێڤەبەرێ دارایی یا شنگال هاتیە ڤەگوهاستن و بریکارێ رێڤەبەرێ دارایی یا ئاکرێ بوویە رێڤەبەرێ دارایی یا زاخۆ هەروەکی هژمارا رۆژا (١٩٠٤/٦/٢٣)ێ ئاماژە پێ دای[٢٥].

## ج - ئامێدیێ:

گرنگییا قەزا ئامێدیێ د دیرۆکا دەڤەرا بەهدینان دا ژ گرنگییا سەرانسەری قەزایێن دی یێن وێ دەڤەرێ کێمتر نەبوویە، ئەم ژ راستیێ دەرناکەڤین هەکە ئەم بێژین: ب درێژاهییا دیرۆکا نوو ئەڤ قەزایە ژ هەمی قەزایێن دی گرنگتر بوویە، ل سەردەمێ ئۆسمانییان ئامێدیێ پایتەخت و ناڤەندا دەستەلاتا میرگەها بەهدینان بوو، لێ پشتی کەڤتنا ڤێ میرگەهێ ل سالا (١٨٤٢)ێ، گرنگییا ڤێ قەزایێ گەلەك کێم بوو و پاشی هێدی هێدی قەزا دهۆك پێگەهێ وێ گرت و بوو ناڤەندا سەرەکییا دەڤەرا بەهدینان.

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/١١/٥)ێ دا بەلاڤکرییە کو (شوکری ئەفندی) یێ وەك قائیمقامێ ئامێدیێ هاتییە دامەزراندن گەهشتییە مووسل و پشتی بێنڤەدانەکا چەند رۆژێ قەستا جهێ کارێ خۆ کرییە[٢٦]، وەسا دیارە ژێ (شوکری ئەفندی) ل دوڕێن سالەکێ ل وی پۆستی مایە و رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/١١/١٠) ێ دا برۆسکەیەك بەلاڤکرییە و تێدا بەحسێ هاتنا فەرمانەکێ ژ وەزارەتا ناڤخۆ بۆ ویلایەتا مووسل کرییە و ئاگەهدارکرنەك ل سەر دامەزراندنا (ئەحمەد ئەفندی) وەك قائیمقامێ ئامێدیێ تێدایە پشتی ناڤبری ژ پۆستێ قائیمقامێ (زەعفەرانبۆلی) هاتییە لادان[٢٧].

هەروەسا رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٥/١/٥)ێ دا- ئانکو پشتی نێزیکی دو هەیڤان-بەلاڤکرییە کو (ئەحمەد ئەفندی) گەهشتییە ناڤەندا ویلایەتا مووسل و پشتی بێنڤەدانەکا چەند رۆژێ قەستا جهێ کارێ خۆ ل ئامێدیێ کرییە[٢٨]، دیسا رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا پشتی وێ دا یا ل رۆژا (١٩٠٥/١/١٩)ێ دەرکەڤتی پشتڕاست کرییە کو (ئەحمەد ئەفندی) قائیمقامێ نوو یێ ئامێدیێ گەهشتییە جهێ کارێ خۆ و دەست ب کارێ خۆ کریی[٢٩].

ل سەر جڤاتا کارگێڕییا نوو یا ئامێدیێ ژی د هژمارا رۆژا (١٩٠٢/٧/١٧) ێ دا دەنگ و باسەکی دا هاتییە کو والی فەرمانەك هنارتییە بۆ دەست ب کاربوونا هەر ئێك ژ (سالح ئەفندی زادە تاهر) و (مریینە)[٣٠] ژ گوندێ (کوانێ) کو زۆرینەیا دەنگان سەرکەڤتن ب دەستڤەئینانینە بۆ وەرگرتنا نیڤا ئەندامەتییا جڤاتا کارگێڕییا قەزا ئامێدیێ و (شوکری ئەفندی) بۆ نیڤا ئەندامەتییا دادگەها بەراهیێ[٣١].

د هژمارا رۆژا (١٩٠٣/٤/٢١) ێ دا رۆژنامەیێ گۆتییە کو د وان هەلبژارتنێن هاتینە کرن دا — پشتی ب داویهاتنا نیڤا دەمێ یاسایی یێ نیڤا ئەندامێن جڤاتا کارگێڕیێ و دەستەیا دادگەهێن ئامێدیێ و زاخۆ — هەر ئێك ژ: (سەعدوللا ئاغا، مۆشێ ئاغا) زۆرینەیا دەنگان ب دەستڤەئینانە بۆ جڤاتا کارگێڕییا قەزا ئامێدیێ و (سیتۆ ئاغا) بۆ ئەندامەتییا دادگەها بەراهیێ یا ئامێدیێ[٣٢]، هەروەسا د هژمارا رۆژا (١٩٠٥/٤/٦) ێ دا رۆژنامەیێ دەنگ و باسێ هنارتنا فەرمانا والیێ مووسل هنارتییە بۆ دامەزراندنا هەر ئێك ژ (سەعدوللا ئاغا) و (هۆج[٣٣] دانیل) ژ تیرەیا جوهییان بۆ ئەندامەتییا جڤاتا کارگێڕییا قەزا ئامێدیێ و (هۆجە مصلۆ ئاغا) بۆ ئەندامەتییا دادگەها بەراهیێ یا وێ ئەڤە ژی پشتی سەرکەڤتنا وان ب زۆرینەیا دەنگان د وان هەلبژارتنێن یێن بۆ ڤێ مەبەستێ هاتینە کرن[٣٤].

ل سەر پۆستێ دادوەری ژی ل ئامێدیێ، تنێ جارەکێ بەحسێ وی هاتییە کرن ئەو ژی د هژمارا رۆژا (١٩٠٦/١/١٨) ێ دایە و تێدا دەنگ و باسەکێ گەلەك بچویك هاتییە و دبێژیت: دامەزراندنا (مەعروف ئەفندی) دادوەرێ بەرێ یێ ئامێدیێ[٣٥].

## د- ئاکرێ:

ئاکرێ ب درێژاهییا سەردەمێن دیرۆکا دەڤەرێ گرنگییا خۆ هەبوویە، لێ رۆلێ وێ ل سەردەمێ ئیسلامیێ ناڤین ب ئاوایەکێ بەرچاڤ دیارترە و ئەڤ رۆلە ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان ل سەردەمێ دەستەلاتا ئۆسمانی کێمتر لێ دهێت، لێ ژ بەرکو گەلەك نێزیکی باژێرێ مووسلە و ژ بەر هەبوونا پەیوەندیێن جڤاکی و ئابووری یێن دیار د ناڤبەرا هەردوان دا، دیار دبیت کو قەزا ئاکرێ بیاڤەکێ بەرفرەهـ د بەرپەرێن رۆژنامەیا (موصل) هەبوویە.

ل سەر پۆستێ قائیمقامی رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٤/٢)ێ دا دەنگ و باسێ هاتنا برۆسکەیەکا وەزارەتا ناڤخۆ بۆ والیێ مووسلێ بەلاڤکرییە و تێدا بەحسێ ڤەگوهاستنا (سالح پاشا)یێ قائیمقامێ ئاکرێ بۆ قائیمقامییا (فاو) ل ویلایەتا بەسرا کرییە، پشتی ڤی دەنگ و باسی ژی دەستەلاتێن ویلایەتا مووسل دیار کرییە کو ل بەرە ئێك ژ ریهسپی و ماقوولێن دەڤەرێ ب ناڤێ (موفتی زادە محەمەد ئەفندی) ب وەکالەت ل قائیمقامییا ئاکرێ دامەزرینیت[٣٦]، وەسا دیارە کو ناڤبری نێزیکی پێنج هەیڤان ب وەکالەت ل پۆستێ قائیمقامییا ئاکرێ مایە هەروەکی د هژمارا رۆژا (١٩٠٣/٩/٢٤)ێ دیار دبیت کو تێدا بەحسێ گەهشتنا ئاگەهدارکرنەکا وەزارەتا ناڤخۆ هاتییەکرن بۆ ڤەگوهاستنا (پەرتۆ ئەفندی)یێ قائیمقامێ قەزا بازیان بۆ قائیمقامییا قەزا ئاکرێ یا ڤالا، ناڤبری ژی هاتییە مووسل و فەرمانا فەرمی ل دۆر ڤێ چەندێ وەگرتییە[٣٧] و ڤی قائیمقامی رۆلەکێ مەزن د چارەکرنا ڤێکنەکرنێن ل ناڤبەرا عەشیرەتێن دەڤەرێ و بنەجهکرنا تەناهیێ دا هەبوویە، کو ئەڤ ڤێکنەکرنە ژ مەزنترین کێشەیێن وی دەمی یێن ئاکرێ بوون، هەروەکی رۆژنامەیا (موصل) ب خۆ ئاماژە پێکری و پاشی دێ هێشتا ل سەر ڤێ مەسەلێ ئاخڤین.

هەر ل دۆر پۆستێ قائیمقامی، دیار دبیت کو ویلایەتا مووسل پشتی بۆرینا پتر ژ سالەکێ (پەرتۆ ئەفندی) گوهۆرییە و ب دروستی ئەگەرێ وێ گوهۆرینێ ناهێتە زانین، لێ دبیت ئەڤە تنێ رێکارەکا فەرمییا کارگێرییا وەزارەتا ناڤخۆ بیت وەکی هەرجار پێ رادبیت. رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/١١/٣)ێ دا دەنگ و باسەك بەلاڤکرییە و تێدا دیار دکەت کو (تەوفیق بەگ)ێ سەرلقێ جەندرمان کو نۆکە ل رەخ ورویێن ئامێدیێ یە بۆ هاریکارکرنێ د کۆمکرنا باج و خویکان دا، ب وەکالەت وەك قائیمقامێ ئاکرێ هاتییە دامەزراندن و ژ بەرکو کەسەکێ ژێهاتی و خودان شیانە و ویلایەتێ ناڤبری ب ڤێ دامەزراندنێ ئاگەهدار کرییە[٣٨]، پاشی رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٥/٣/١٦)ێ دا برۆسکەیەکا وەزارەتا ناڤخۆ بەلاڤکرییە ل سەر دەرکەڤتنا فەرمانا دامەزراندنا (رفعەت ئەفندی)یێ خزمەتا وی ل کارگێرییا ناحیا (ئەرتەق ئاباد) ل ویلایەتا سێواسێ ب داوی هاتی وەك قائیمقامێ ئاکرێ ل شوونا (پەرتۆ ئەفندی) هاتییە دامەزراندن[٣٩].

هەروەسا رۆژنامە د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٥/٤/٢٠)ێ دا دبێژیت کو (پەرتۆ ئەفندی) قائیمقامێ بەرێ یێ ئاکرێ یێ فەرمانا دامەزراندنا وی وەك قائیمقامێ قەزا رانیە ب وەکالەت دەرکەڤتی، فەرمانا فەرمی ل سەر وێ چەندێ وەرگرتییە و ژ مووسل قەستا جهێ کارێ خۆ کرییە[٤٠]، لێ قائیمقامێ ئاکرێ (رفعەت ئەفندی) سالەکێ ل وی پۆستێ خۆ نەمایە هەروەکی د دەنگ و باسێ هژمارا رۆژا (١٩٠٥/١٢/٢١)ێ دا هاتە بەلاڤ کرن کو ژ بەر هندەك رەوشێن پەیوەندی ب (رفعەت ئەفندی)یێ قائیمقامێ ئاکرێ ڤە هەین و ئەو چەند هاتییە پشتراست کرن، ژ بەر پێدڤییا ڤەگوهاستنا وی بۆ ناڤەندا ویلایەتێ، ب پێدڤی هاتە زانین (سالح سەعدی ئەفندی) ئەندامێ بەرێ یێ دادگەها لێزڤرینا (محکمە استئناف) ویلایەتێ ل پۆستێ قائیمقامێ ئاکرێ ب هێتە دامەزراندن[٤١].

ل سەر جڤاتا کارگێرییا قەزایێ و دادگەهان ل ئاکرێ، رۆژنامەیێ هژمارکا دەنگ و باسان ل دۆر ڤی بابەتی ژی بەلاڤکرینە، ژ وانا: رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٢/٧/١٧)ێ دا دەرکەڤتنا فەرمانا والیێ مووسل بەلاڤکرییە ل سەر دەست ب کاربوونا

(حاجی محەمەد عەلی ئەفندی) ئەندامێ جڤاتا کارگێڕیا قەزا ئاکرێ یێ وەك ئەندامێ دادگەها بەراهیێ ل ئاکرێ هاتییە دامەزراندن[٤٢].

هەروەسا رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٢/٩/٢٥)ێ دا دەنگ و باسێ دامەزراندنا (عەبدلرەزاق ئەفندی) وەك ئەندامێ جڤاتا کارگێڕیا قەزایێ بەلاڤکرییە کو ناڤبری ئێکە ژ ماقوولێن ئاکرێ پشتی زۆرینەیا دەنگێن نیڤا ئەندامێن جڤاتا کارگێڕیا قەزایێ وەرگرتین[٤٣]، هەروەسا تشتێ پەیوەندی ب وی بابەتی ڤە هەی، رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/١١/٣)ێ دا دەنگ و باسەك بەلاڤکرییە و تێدا گۆتییە کو هەلبژارتنێن هاتینە کرن بۆ هەلبژارتنا نیڤا ئەندامێ جڤاتا کارگێڕیا قەزایێ و ئەندامەتییا دادگەها بەراهیێ، (حاجی مستەفا ئەفندی و خواجە خەنون) زۆرینەیا دەنگان بۆ ئەندامەتییا جڤاتا کارگێڕی و (حەجی محەمەد عەلی) بۆ ئەندامەتییا دادگەها بەراهیێ ب دەستڤە ئینانە و فەرمانێن تایبەت ب دامەزراندنا وان ڤە دەرکەڤتینە و بۆ قائیمقامییا خۆجهی هاتینە هنارتن[٤٤].

رۆژنامەیا (موصل) تنێ ئەڤ دەنگ و باسە ل سەر جڤاتا کارگێڕیا قەزایێ و دادگەها وێ یا بەراهیێ بەلاڤکرینە، لێ ل سەر پۆستێ دادوەری ل ئاکرێ کو ئێکە ژ پۆستێن گرنگێن قەزایێ، رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٣/٢٦)ێ دا دەنگ و باسێ دامەزراندنا (مستەفا شەفیق ئەفندی) وەك دادوەرێ قەزا شنگال بەلاڤکرییە کو دادوەرێ بەرێ یێ قەزا ئاکرێ بوو[٤٥]، پاشی رۆژنامەیا (موصل) پشتی دەمەکێ درێژ د دەنگ و باسەکێ خۆیێ هژمارا رۆژا (١٩٠٥/٢/٢٣)ێ دا بەلاڤکرییە کو ل دووڤ وی تشتێ ویلایەتا مووسل پێشکێش و پێشنیار کری، بڕۆسکەیەك ژ شێخنشینیێ ل ستانبۆلێ هاتییە بۆ دامەزراندنا (مەولود ئەفندی) وەك قائیمقامێ ئاکرێ کو ناڤبری ئێکە ژ زانایێن هەڤلێر و خزمەتەکا باش ل پۆستێ دادوەری ل گەلەك جهێن کار لێ کری پێشکێش کرییە [٤٦]، سەرباری ڤێ چەندێ، رۆژنامەیێ گەلەك دەنگ و باس ل سەر هندەك دامەزراندنێن دی ل فەرمانگەهێن تاپۆ و گەنجینەیێ و فەرمانگەهێن دی یێن ئاکرێ بەلاڤ کرینە[٤٧].

## هـ - شنگال:

نۆکە ڤەکۆلەر و دیرۆکنڤیسان دیتن و بۆچوونێن جودا جودا ل سەر مەسەلەیەکا گەلەك گرنگ هەنە، ئەو ژی ئەوە: ئەرێ شنگال سەر ب دەڤەرا بەهدینانە یان سەر ب جزیرا فوراتێ و ویلایەتا دیاربەکرێ یە؟

دەمێ بەرێ خۆ ددەینە ژێدەرێن دیرۆکی و جۆگرافی، باش دیار دبیت کو شنگال ژ لایێ جوگرافی ڤە ناکەڤیتە ناڤ دەڤەرا بەهدینان و نێزیکترە بۆ جزیرا فوراتێ و پشکا مەزن یا دیرۆکا وێ ل پتریا سەردەمان د وێ دەڤەرێ را دبۆریت و نە د دەڤەرا بەهدینان را، هەروەسا حوکمدار و میرێن بەهدینان ژی ب درێژاهییا سەردەمێ نوو چ حوکم ل وێرێ نەکرینە هەیامێن گەلەك کورت نەبن، بەرۆڤاژی والیێن دیاربەکرێ و حوکمدارێن کوردێن جزیرا فوراتێ کو هەردەم حوکم د کاروبارێن وێ دەڤەرێدا کرینە، لێ پشتی ب داویهاتنا شەڕێ جیهانیێ ئێکێ و دابەشکرنا کوردستانا ئۆسمانی، دەڤەرا شنگال ب کوردستانا عیراقێ ڤە هاتە گرێدان، ڤێجا ب هەر ئاوایەکێ بیت، راستەوخۆ ب دەڤەرا بەهدینان ڤە هاتەگرێدان، ژ بەر هندێ، د جهێ خۆدایە ل دەنگ و باسێن ڤێ دەڤەرێ ژی بکەڕێین، کو ل سەردەمێ داویێ یێ ئۆسمانی ئێك بوو ژ قەزایێن گرنگێن ویلایەتا مووسل.

ئێکەمین ئاماژەیێ د رۆژنامەیا (موصل) دا بۆ پۆستێ قائیمامێ شنگال هاتییە کرن، د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٣/٣/٥)ێ دا بوویە و تێدا بەحسێ هاتنا بڕۆسکەیەکا وەزارەتا ناڤخۆ هاتییەکرن ل سەر پێکگوهۆڕینا (محەمەد عزەت ئەفندی) قائیمقامێ قەزا هەڤلێر دگەل (ئیبراهیم بەگ)یێ قائیمقامێ شنگال و ویلایەتا مووسل و هەردو ناڤبری ب وێ بڕۆسکێ ئاگەهدار کرینە[٤٨]، پاشی رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٣/١٩)ێ دا پێڤە دچیت و د دەنگ و باسەکێ خۆ دا بەلاڤ دکەت و دبێژیت کو

(عزەت ئەفندی) قائیمقامێ هەڤلێر یێ بەرێ ئەوێ بۆ قائیمقامییا شنگال هاتییە ڤەگوهاستن، ژ هەڤلێر هاتییە مووسل و پشتی بێنڤەدانەکا چەند رۆژی قەستا شنگال کرییە بۆ دەستپێکرنا کارێ خۆ ل وێ قەزایێ[49].

هۆسا وەکی دامەزراندنێن دی، پشتی نێزیکی هەشت هەیڤان جارەکا دی بەحسێ (عزەت ئەفندی) هاتییەکرن و د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٣/١١/٢٦) ێ برۆسکەیەکا وەزارەتا ناڤخۆ بۆ ویلایەتا مووسل بەلاڤکرییە و تێدا هاتییە کو (عـزەت ئەفندی) یێ قائیمقامێ شنگال بۆ قەزا (تۆسیە)یا ویلایەتا (قستمونی) هاتییە ڤەگوهاستن، تێدا هاتییە ژی: ژ بەر وێ ئاگەهدارکرنا ژ نـەزارەت (وەزارەت) ا ناڤخۆ هاتی داکو (عزەت ئەفندی) زوی بگەهیتە پۆستێ خۆیێ نوو و داکو چوونا وی گیرۆ نەبیت، هاتینە ئاگەهدارکرن کو فەرمانەك بۆ دامەزراندنا (محەمەد عەلی بەگ) قائیمقامێ بەرێ یێ زێبار، وەك قائیمقامێ شنگال ب وەکالەت دەرکەڤتییە[50]، پاشی د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٤/٢/٣)ێ دا هاتییە کو مسۆگەر (محەمەد عەلی بەگ) قەستا جهێ کارێ خۆ کرییە و فەرمانا فەرمییا دامەزراندنا خۆ ژی دگەل خۆ بریە[51]، لێ هەر زوی پشتی هنگی وەزارەتا ناڤخۆ کەسەکێ دی ب ناڤێ (نوری بەگ) ل پۆستێ قائیمقامێ شنگال دادمەزرینیت هەروەکی د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٤/١/٢١)ێ دا هاتی[52] و (نوری بەگ) ژی سالەك و هەشت هەیڤان ل پۆستێ خۆ دمینیت و ژ وی پۆستی نەهاتە لادان و ڤەگوهاستن ل سەر وێ داخوازێ نەبیت یا ئاراستەی وەزارەتـا ناڤخۆ کری داکو رێیا وی بهێتە دان کارێ خۆ بهێلیت ژ بەر وێ نەخۆشیا بەرهنگاری وی بووی و بهێتە خانەنشینکرن، ل دووڤ دەنگ و باسێ د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٥/٨/٣) ێ دا هاتی، وەزارەتا ناڤخۆ ل دووڤ داخوازیا وی هاتییە و ل دووڤ راسپاردەیا ویلایەتا مووسل کەسەکێ دی ب ناڤێ (ئاسف ئەفندی) وەك قائیمقامێ شنگال ب وەکالەت ل شوونێ دانایە[53]، پشتی هنگی ب هەیڤەکێ وەزارەتا ناڤخۆ فەرماندایە

(ئاسف ئەفندی) وەك قائیمقامێ شنگال بهێتە دامەزراندن هەروەکی د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٥/٩/٢)ێ دا هاتی[54]، وەسا دیارە ژی ئەڤ قائیمقامێ نوو هاتییە دامەزراندن (ئانکو ئاسف ئەفندی) ل وێرێ گەلەك جهێ رازیبوونێ بوویە ژ بەر کارێن هەژی یێن ل وێرێ کرین هەر ژ وی دەمێ ل وێ قەزایێ هاتییە دامەزراندن و د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٥/١٠/١٩)ێ دا گەلەك پەسنێ وی هاتییە کرن[55].

ل سـەر پۆستێ قـەزایـێ ژی، د هـژمـارا رۆژا (١٩٠٣/٣/٢٦)ێ یا رۆژنامەیا (موصل) دا دیار دبیت کو برۆسکەیەك ژ شێخنشینیێ بۆ ویلایەتا مووسل هاتییە هنارتن ل سەر دامەزراندنا (شەفیق ئەفندی) دادوەرێ بـەرێ یێ ئاکرێ وەك قائیمقامێ قەزا شنگال[56]، وەسا دیارە ژی ناڤبری دەمەکێ درێژ ل وی پۆستی مایە، چونکی رۆژنامەیێ د هژمارێن خۆ یێن پشتی وێ دا بەحسێ چ گوهورینان د وی پۆستی دا نەکرییە.

## گەندەلییا کارگێری:

د رۆژنامەیا (موصل) دا گەلەك ئاماژە بۆ گەندەلییا کارگێری و دارایی ل قەزایێن دەڤەرا بەهدینان هەنە، گەلەك جاران ڤێ رۆژنامەیێ دەنگ و باس ل سەر چوونا لیژنەیێن ڤەکۆلینێ بۆ ڤێ قەزایێ و قەزایا هە بەلاڤ کرینە بۆ ئەنجامدانا ڤەکۆلینان، لێ رۆژنامە سۆروسۆر ئاماژێ ناکەتە جۆرێ وان ڤەکۆلینان[57]، دگەل هندێ ژی، هندەك دەنگ و باس د ڤێ رۆژنامەیێ دا هاتینە و بەحسێ گەندەلییا هندەك کارگێڕان دکەن و ب ناڤ ناڤێ وان دئینیت، نەخاسمە ژی ل هەردو قەزایێن ئاکرێ و شنگال، ل سەر قەزا ئاکرێ دەنگ و باس ل سەر دەڤەرا زێبار هەنە و رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٢/٧/١٧)ێ دا دەنگ و باسەك بەلاڤکرییە و تێدا دبێژیت کو ڤەکۆلین دگەل (ئیسماعیل ئەفندی)یێ رێڤەبەرێ دارایی یا زێبار تمام بوویە کو کارکرنا وی هاتییە راوەستاندن ژ بەر دەستهەبوونا وی د سەختەکاری و ئەنجامدانا گوهورینان د توومارا هویربینیێ یان د پشکنینا پەزێ

قەزا ئاکرێ دا و بڕیار هاتییە دان دوبارە ڤەگەڕێتە سەر کارێ خۆ و دەست ب ڤەکۆلینا دەستپێکی دگەل وان کەسان هاتییە کرن یێن دیار بووین دەست د وێ سەختەکاریێ دا هەبووینە کو ئەو ژی ئەڤەنە: (عەبدولڕەزاق و عەباس) و ڕێڤەبەرێ دارایی یا بەرێ (سلێمان و عەبدوللا) و کەسەکێ دی ب ناڤێ (عەبدوللا) [٥٨]. دەمێ بەرێ خۆ ددەینە ناڤەڕۆکا ڤێ دەنگ و باسی، دیار دبیت کو (ئیسماعیل ئەفندی) چ پەیوەندی ب ڤێ گەندەلیێ ڤە نەبوویە، بەلکی کارگێڕیا بەرێ دەست د وێ چەندێ دا هەبوویە.

لێ ل سەر قەزا شنگال، ڕۆژنامەیێ گەلەك دەنگ و باس ل سەر ڤێ دیاردێ بەلاف کرینە[٥٩]، لێ ب تنێ دێ وی دەنگ و باسی وەرگرین وەکی نموونە یێ ل هژمارا وێ یا ڕۆژا (١٩٠٥/٦/٧)ێ دا هاتییە خوار کو ژ بەر خراب ڕەفتاریا (قەدری ئەفندی) ڕێڤەبەرێ دارایی یا شنگال و ژ بەر زێدەگاڤیێن وی د پۆستێ خۆ دا کرین، ویلایەتێ فەرمانا لادانا وی دایە و (عەباس عاسم ئەفندی) ل شوونێ دانایە، یێ داویێ ژی ئێك بوو ژ وان یێن بەرێ ل ژمێریاریا ویلایەتێ کار کرین، کەسەکێ ڕاست و خودان شیانە (هەروەکی د دەقێ وی دەنگ و باسی دا هاتی) [٦٠].

## دو- دادگەه و تاوانکاری:

دەمێ پێداچوون ب وی سەردەمێ ڕۆژنامەیا (موصل) دا دهێتەکرن، بۆ خواندەڤای دیار دبیت کو ئێك ژ بەرفرەهترین بابەتێن بەربەلاف ل سەر بەرپەڕێن وێ هاتینەبەلاڤکرن بابەتێن گونەهێن تاوانکاری نە ل دەڤەرا بەهدینان، گەلەك جاران ژی دبیت ئەڤە ژ بەر تێکچوونا ڕەوشا ئابووریا دەڤەرێ بیت ب ئاوایەکێ گشتی و نەبوونا ژێدەرێن بنەجهێن ژیارێ ئەگەرێن پەیدابووونا پتریا وان تاوانان بیت و هەردەم دزی ئەگەرێ سەرەکی بیت یێ تاوانکار پالدای وێ تاوانێ بکەت، هەروەکی د هەمی وان تاوانان دا دهێتە تێبینی کرن و ژ دەنگ و باسێن ڕۆژنامەیێ ب خۆ ژی دیار دبیت، چ ئەنجامدەرێن وان تاوانان نەهاتینە گرتن، هەروەسا دەستەلاتێ دادوەری ل ویلایەتا مووسل هۆشداریێ ددەتە وان تاوانکاران خۆ ڕادەست بکەن، هەکە نە، دادگەهـ ب ئاوایێ ئامادەنەبووی (غیابی) دێ حوکمی دانیتە سەر وان.

ئەڤێن خوارێ ژی دیارترین حالەتێن وێ دیاردێ نە ل دەڤەرا بەهدینان یێن ڕۆژنامەیێ ئاماژە پێدای:

### أ- دهۆك:

ڕۆژنامەیا (موصل) گەلەك دەنگ و باس ل سەر قەزا دهۆك ل سەر ڤی لایەنی بەلاڤکرینە و دیار دبیت کو ئێك ژ ئەگەرێن گرنگێن بەربەلاڤبوونا تاوانێ و دزیێ ل ڤێ قەزایێ ژ بەر ڕەوشا ژیارا ب زەحمەتا ل دەڤەرێ بوویە، ئەڤە ژی دیارترین ئەو دەنگ و باسن:

ڕۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا ڕۆژا (١٩٠٢/٧/٣)ێ دا ئاگەهدارییەك ل دۆر کێشەیەکا تاوانکاری بەلاڤکرییە، گونەهبار ژی کۆمەکا کەسانێن کۆچەرێن عەرەبێن ئاکنجی یێن قەزا نسێبینێ نە، ئەو ژی (مشوح و مروح و عەبدولا کوڕێن محەمەد) ن کو ب کوڕێن (المکریص) بەرنیاسن، هەروەسا کەسەکێ دی یە ژی ژ عەشیرەتا (بۆریاش) ب ناڤێ (حسێنێ کوڕێ عەلی)، ئەڤە هەمی گونەهبارن ب تالانکرنا کەل وپەل و تەرش و کەوالێ (حەنا ئیشۆ، ڤەشە پەترس و سلێمان لەتیف) کو خەلکێ دهۆکێ نە، د وێ ئاگەهدارێدا دەستەلاتێن حکومی داخواز ژ وان کرییە خۆ ڕادەست بکەن، هەکە نە، دێ ب ئاوایێ ئامادەنەبووی هێنە حوکمدان[٦١]، وەسا دیارە ژی ئەڤ روودانە ل دهۆك چێ نەبوویە، بەلکی ل نسێبینێ چێ بوویە، چونکی ب درێژاهیا دیرۆکێ، ڤێ عەشیرەتا عەرەبی چ هەبوونا خۆ ل دەڤەرا بەهدینان نەبوویە.

ڕۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا ڕۆژا (١٩٠٢/٧/١٧)ێ دا گۆتییە کو (ئەسعەد ئاغا)یێ نەقیبێ پۆلیسان هەر ئێك ژ (محەمەد خەلیل و سوید ئیبراهیم) ژ عەشیرەتا عەراعیدە (العراعیدە) گرتینە کو کارێن زرتەکیێ و زۆرداریکرنێ ل قەزایا دهۆك ئەنجام ددان نەخاسمە ژی زۆرداریکرن و زیان پێگەهاندنا مەسیحی یێن خەلکێ گوندێ ئەلکویش (القوش)[٦٢] و دێرا وێ و ژ بەر هندێ (هائل ئەفندی)یێ سەرۆکێ دێرێ

سوپاسییا سولتانی کرییە[٦٣].

ئێك ژ وان کێشەیێن رۆژنامەیا (موصل) بەلاڤ کری و پەیوەندی ب دەڤەرا بەهدینان ڤە هەی، کێشەیا چاویش (تەوفیق کەرکوکی)یە یێ دادگەهێ ب کوشتنا (حەجی محەمەد عەلی نعمان) گونەهبار کری کو ئاکنجیێ دهۆکە، دادگەهێ ب ئاوایێ ئامادەنەبووی ب پازدە سالان و کارێن گران حوکمدایە و ملك و مالێ وی دەستەسەرکرینە، هەروەکی د دەنگ و باسێ هژمارا رۆژا (١٩٠٣/١/٣)ێ دا هاتی[٦٤].

رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/٦/٣٠)ێ دا ئاگەهدارییەکا داواکاریێ گشتیێ دادگەها لیژڤرینێ بەلاڤکرییە کو پەیوەندی ب گوندێ (باعەدرێ) ڤە هەیە و تێدا هاتییە کو هندەك گونەهباران ژ ڤی گوندی کو ئەو ژی: (چۆلۆ بەگ کورێ عەبدی، فەقێ حەسەن و حسێن بەگی)نە و ڤان پیێن (حەیدەر و لاسۆ) گرتداینە و ئەشکەنجەداینە، ژ بەر ڤێ کریارا وان، ئەو گونەهبار ب ئاوایێ ئامادەنەبووی هاتینە دادگەهکرن و هەر ئێك ژوان ب پێنج سالێن زیندانکرنێ و کارێن گران هاتینە حوکمدان و ئەڤ زیندانکرنە ژی ژ رۆژا دەستەسەرکرنا وان دێ هێتە هژمارتن، هەروەسا دادگەهێ ئەو ژ مافێن مەدەنی بێ بەهر کرینە و ملك ومالێ وان ژی دەستەسەر کرییە[٦٥].

هەروەسا رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٥/٣/٢٣) ێ دا برۆسکەیەکا قائیمقامییا دهۆك بۆ والیێ مووسل بەلاڤکرییە و تێدا هاتییە کو هەر ئێك ژ: (سەعید کورێ حامد درازی) ژ قەزا دهۆك و (ئیبراهیم کورێ حامد ئاکرەیی) و (مستۆ مەدینە) کو کەسەکێ هارە ژ عەشیرەتا (ئۆرەمار) و هەر ئێك ژ: (بەخش، ئەحمەد عەباس و مستەفا) ژ عەشیرەتا دۆسکی ژووری (دۆسکی بالا) رێککەڤتنەك ل ناڤبەرا خۆ کرییە و دزی ژ هژمارکا مالێن دهۆك کرینە و بەری دەمەکێ کورت ژی مینەك دانابوونە بن دکانا (یونا کۆرێ شەمعۆن)ێ (دبیت یۆنان کورێ شەمعۆن بیت - ص-) مووسلی یێ جوهی کو دکانا وی ل دەرڤەی خانیێ جهێ ئاکنجیبوونا وی یە، وان هەمی کەل وپەلێن وی یێن بەقالیێ و تشتێن دی یێن تێڤە دزینە، لێ ژ بەر رێکارێن کاریگەرێن هاتینە کرن، هەمی تشتێن هاتینە دزین بۆ خودانی هاتینە زڤراندن و هەر سێ کەسێن ناڤێن وان د دەنگ و باسی دا هاتین هاتینە دەستەسەر کرن و رادەستی لایەنێن دادوەری هاتینە کرن، هەروەسا رۆژنامەیا (موصل) ل داوییا ڤی دەنگ و باسی گۆتییە: ویلایەتا هێژا سوپاسییا کار و بزاڤێن قائیمقامی و (شێخ نور محەمەد ئەفندی) د ڤی بیاڤی د بنەجهکرنا تەناهیێ دا دکەت، پاشی رۆژنامەیا (موصل) ب خۆ ژی پەسنێ وێ خەباتێ کرییە یا ئەو کەس پێ رابووین[٦٦].

رۆژنامەیا (موصل) ل ڤێرە و ل جهێن دی ژی (کو پاشی دێ هێنە گۆتن) گەلەك پەسنێ (شێخ نور محەمەد) کرییە، هەروەکی دهێتە زانین ژی ئەو سەرۆکێ تەکیا قادری بوو ل گوندێ بریفکا کو دکەڤیتە باشووری رۆژهەلاتێ باژێرێ دهۆك، لێ ل ڤێرە تشتێ سەرنجراکێش ئەوە رۆژنامەیا (کوردستان)[٦٧] یا عەبدلرەحمان بەدرخان[٦٨] ل جنێڤ ل سویسرا دەردئێخست، دەنگ و باسەك د هژمار (١٥) یا رۆژا (١٨٩٩/٨/٥)ێ دا بەلاڤکرییە و خودانێ وێ تێدا گۆتییە کو نامەیەك ژ خەلکێ مووسل گەهشتیێ و تێدا گازندێ دکەن کو هندەك کورد کارێن شەلاندن و تالانکرنێ ل رەخ وروبێن مووسل ئەنجام ددەن کو ئێك ژ وان (شێخ نور)ە یێ کورێن وی گەهشتینە هندەك زرتەکان و هێرشێ دکەنە سەر مالان و تالان دکەن هەروەکی رۆژنامەیا (کوردستان) دبێژیت[٦٩].

ل داویێ ژی، تشتێ پەیوەندی ب دهۆك ڤە هەی، رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٦/٣/٨) ێ دا راگەهاندنەکا فەرمانگەها پێرابوونێن ویلایەتێ بەلاڤکرییە و تێدا هاتییە: ژ بەر دەستەسەرنەکرنا گونەهبارێ رەڤی (ئەحمەد شارل کورێ عەبدوللا) ژ گوندێ زویتە (زاویتە؟) کو سکالایەك ل دژی وی هاتییە توومار کرن ب گونەهباریا بێسەروشوونبوونا (محەمەد شەریف و مستۆیێ کورێ حسێن)، سەرۆکاتییا دادگەهێ بریاردایە دەلیڤێ بدەتێ خۆ رادەست بکەت، هەکە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێتە دادگەهـ کرن[٧٠].

## ب- زاخۆ:

قەزا زاخۆ ژی بەهرا خۆ د وان دەنگ و باسان دا هەیە یێن رۆژنامەیا (موصل) ل سەر گونەهێن تاوانکاری یێن ل وێرێ هاتینە روودان بەلاڤ کرین و یێن ژ هەمیان دیارتر ئەڤێن خوارێ نە:

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٢/٩/٢٥) ێ دا دەنگ و باسەك بەلاڤكرییە و تێدا هاتییە كو پۆستەیێ ژ ستانبۆلێ هاتی و قەستا بەغدا و مووسل كری، ل ناڤبەرا جزیرا بۆتان و زاخۆ ب دەستێ هندەك رێگرێن عەشیرەتان بەرهنگاری دزینێ بوویە. دەمێ دەنگ و باس گەهشتییە ئامەدێ دەستەلاتێ رێكارێن پێدڤی دەست پێ كرینە و ل دەمێ راهێلانێ ئێك ژ وان رێگران كوشتییە و ئەمانەت و توومارێن هاتینە دزین زڤراندینە. هەر ئەو دەنگ و باس پێڤە دچیت و دبێژیت: ئەو پۆست ب دەستێ هندەك كەسێن عەشیرەتا (شەرابییان) و عەشیرەتێن دی یێن دەڤەرەكا نێزیكی سلۆپی یا نێزیكی قەزا جزیرا بۆتان ب دویریا چوار سەعەتان ژ زاخۆ بەرهنگاری دزیكرنێ بوویە و پۆستەچی رویس و چیلاق و ب پییان قەستا زاخۆ كرییە و دەمێ برۆسكەیەك ل سەر ڤی تشتێ هاتییە روودان گەهشتی، بریكارێ قائیمقامی - ل زاخۆ - هەروەسا ئێك ژ ماقوول و ریهسپی یێن خۆجهی كو ئەو ژی (حەجی یوسف پاشایە) و ل دووڤ رێنما و راسپاردێن ئالیێن بلندێن ویلایەتێ، فەرماندایە هێزەكا حكۆمی دەركەڤیت و ئەڤ هێزە شیا كەل وپەلێن پۆستەی بزڤرینیت و بینیتە ناڤەندا قەزا زاخۆ و هەمی تشتێن وی پۆستەی ژ دراڤ و ئامانەتێن فەرمیێن بازرگانی هاتنە زڤراندن[٧١].

رۆژنامەیا (موصل) د دەنگ و باسەكێ خۆیێ هژمارا رۆژا (١٩٠٣/٢/١٢)ێ دا بەحسێ رەڤینا هندەك كەسێن گونەهبار ب سۆتنا دەخل ودانێ هێتیمێن (عـارف ئاغا)یێ خەلكێ زاخـۆ دكـەت، كو ئەو گونەهبار ژی (غازی) و كورێن وی (ئەحمەد، عیسا و ئیسماعیل)ن ژ گوندێ (حەسەن) كو هەتا نۆكە نەهاتینە گرتن و د توومارێن هەڤپێچێن ڤەكۆلینێ دا چ زانیاری ل سەر خولك و نیشانێن جوداكەرێن وان نینن، ژ بەر هندێ، سەرۆكاتییا دادگەهێ ماوێ دەهـ رۆژان مۆلەت دایێ ل دووڤ ماددێ (٣٧١) یێ یاسایا بنەمایێن دادگەهێن سزادانێ ل بەرامبەری دادگەهێ ئامادە ببن و هەكە د وی ماوەیدا ئامادە نەبن، دێ ب گوهدارینەكرنا یاسایێ هێنە ل قەلەمدان و ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێنە دادگەهكرن و دێ ژ هەمی مافێن مەدەنی هێنە زرپەهركرن و ملك ومالێ وان ژی دێ هێتە دەستەسەركرن، پێدڤییە ژی هەر كەسێ جهێ وان بزانیت، زانیارییان پێشكێش بكەت، هەروەسا پێدڤییە كارمەندێن پۆلیس و دادگەهان ژی وان دەستەسەر بكەن[٧٢].

وەسا دیارە ژی لایەنێن ئاسایێشا زاخۆ نەشیاینە وان دەستەسەر بكەن، چونكی رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٦/٩) ێ دا دەنگ و باسێ دادگەهكرنا وان ب ئاوایێ ئامادەنەبووی بەلاڤكرییە و دادگەهێ هەر ئێك ژ وان ب سێ سالێن زیندانكرنێ و ب كارێن گران حوكم داینە[٧٣].

رۆژنامەیا (موصل) دەنگ و باسەك ل سەر گوندێ (بانكێ) یا دكەڤیتە بەر قەزا زاخۆ بەلاڤكرییە و د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٣/٢/١٩) ێ دا بەحسێ كۆمەكا كەسان هاتییە كرن كو ب ئەشكەرایی هێرش كرینە سەر (محەمەد)ێ موختارێ گوندێ (بانكێ) یا دكەڤیتە بەر ناحیا (سندی ـــ گولی) و ناڤبری هاتییە برینداركرن و مال و پەزێ وی هاتییە تالانكرن و گونەهبارێن ڤێ كێشەیێ رەڤینە كو ئەو ژی ئەڤەنە: (عومەر موختارێ گوندێ كشاف[٧٤]، ئیبراهیم و محەمەد كورێ سلۆ، ئۆسمان كورێ غەفور، عومەر كورێ بیلال، مەكۆ كورێ مستۆ، ئەلۆ كورێ فارس، مەلا تەییب، سەید عەبدلقادر، برۆ زوبێر بار، عەبدوللا كورێ شەهمە، عەبدی كورێ عومەر، عومەر و كەمال و مەغزۆ كورێ عەبدوللا) و دادگەهێ گەف لێ كرن كو دێ ب ئاوایێ ئامادەنەبووی هێنە دادگەهـ كرن هەكە خۆ رادەست نەكەن[٧٥].

ل داویێ ژی رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٥/١٢/٢١) ێ دا ئاگەهدارییەك بەلاڤكرییە و تێدا دبێژیت: كەسانێن گونەهبار د كوشتنا سمیسح

(دبیت سەمیح بیت) كورێ (سالح)ێ خەلكێ زاخۆ سێ كەسێن خەلكێ گوندێ (زێوكێ)نە كو ئەو ژی ئەڤەنە: (مستەفا كورێ محمەد، محەمەد كورێ مستەفا، بنیامین) و دادگەهێ ماوێ دەهـ رۆژان مۆلەت دایێ خۆ رادەست بكەن، هەكە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێنە دادگەهكرن[٧٦].

## ج- ئامێدیێ:

هەكە كێشەیێن تاوانكاری یێن ئامێدیێ دگەل قەزایێن دهۆك و زاخۆ بێنە هەڤبەركرن، جوداهییەكا مەزن ل ناڤبەرا وان ناهێتە دیتن، چونكی رۆژنامەیا (موصل) گەلەك دەنگ و باس ل سەر ڤی لایەنی بەلاڤ كرینە و د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٢/٧/٣)ێ دا دەنگ و باسەك بەلاڤكرییە و تێدا دبێژیت: هەرچەندە هەتا نۆكە گونەهبار (ئلیاس كورێ حاجی)یێ خەلكێ گوندێ (چەمان)ێ (دبیت چەمانكێ بیت كو نها بوویە سەنتەرێ ناحیێ) یێ گونەهبار ب كوشتنا (حەجی ئیبراهیم)ێ خەلكێ گوندێ (بەندان) یا سەر ب ئامێدیێ ڤە و تالانكرنا پارە و كەل وپەلێن هەڤالێن وی نەهاتییە گرتن، سەرۆكاتییا دادگەهێ بریاردایە دەهـ رۆژان مۆلەتێ بدەتە وی خۆ رادەست بكەت، هەكە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێتە دادگەهـ كرن[٧٧].

رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/١/٣)ێ دا ئاماژە كرییە كێشەیەكا دی یا وەكی ڤێ، لێ گونەهبار ب كوشتنێ هاتییە گونەهبار كرن، د وی دەنگ و باسی دا هاتییە: ژ بەركو (ئەحمەد كورێ تەها)یێ خەلكێ گوندێ (زۆرن) كو دكەڤیتە بەر قەزا ئامێدیێ رەڤییە و گونەهبارە ب كوشتنا (خانێ كچا موسای) یا خەلكا گوندێ ناڤهاتی و ژ بەركو نەهاتییە دەستەسەركرن، سەرۆكاتییا دادگەهێ بریاردایە وی ب ئاوایێ ئامادەنەبووی ب پازدە سالان و ب كارێن گران حوكم بدەت[٧٨].

هەر د وێ هژمارێ دا رۆژنامەیێ دەنگ و باسەكێ دی ل سەر گونەهێن تاوانكاری بەلاڤكرییە و تێدا نیڤسییە: ژ بەركو (عەزیز كورێ فەتاح)ێ خەلكێ (بێسڤكێ) یێ گونەهبار ب كوشتنا (حسێن كورێ فەتاحێ عیمادلی) رەڤییە، دەهـ رۆژ مۆلەت بۆ هاتینە دان خۆ رادەست بكەت، هەكە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێتە دادگەهـ كرن[٧٩].

هەروەسا رۆژنامەیێ ئاماژە كرییە كێشەیەكا دی یا كوشتنێ ل دەڤەرێ، رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٢/٣)ێ دا بەلاڤكرییە: ژ بەركو هەر ئێك ژ: (كورێ بی، یوسف كورێ بیتۆ، بەدۆ و دە دۆ) یێن عەشیرەتا (قەسران) و ژ ناحیا (تیاری ژێری) رەڤینە و گونەهبارن ب هێرشكرنێ ل سەر گوندێ (یوسفكا) (دبیت گوندێ ئیسفكا بیت یێ نێزیكی ئامێدیێ) و تالانكرنا پەزێ وی گوندی و كوشتنا (محۆیێ كورێ یونس) ب گوللەیەكێ و ژ بەركو هەتا نۆكە ئەو گونەهبار نەهاتینە گرتن و وان ژی خۆ رادەست نەكرینە، بریار هاتەدان ب ئاوایێ ئامادەنەبووی بهێنە دادگەهـ كرن و حوكمێ سێدارەدانێ ل سەر بهێتە دانان[٨٠].

هەروەسا د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٣/٨/٢٠)ێ دا هاتییە: ژ بەركو ئەوێ ب ناڤێ (گۆرگیس) یێ خەلكێ گوندێ (دیری) (دیارە گوندێ - دویرێ - یە گوندێ مەسیحییان ل بەرواری بالا - ص -) یا دكەڤیتە بەر قەزا ئامێدیێ رەڤییە و گونەهبارە ب كوشتنا (عەبدلرەحمان كورێ ئیسلام)ێ خەلكێ ئامێدیێ و ژ بەركو هەتا نۆكە نەهاتییە گرتن و چ زانیاری ل سەر جهێ ئاكنجیبوون و خولكێ وی نینن، دادگەهێ دەهـ رۆژ مۆلەت دایێ خۆ رادەست بكەت، هەكە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێتە دادگەهـ كرن[٨١].

هەر ل سەر ئامێدیێ، رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/١١/١٩) ێ دا ئاماژە كرییە كوشتنا جەندرمەكێ خەلكێ ئامێدیێ كو ناڤێ وی (عەبدلرەحمان كورێ یوسف)ە و كەسانێن گونەهبار ب كوشتنا وی ژی سەر ب گوندێ (ئۆرەمار)ن كو وی دەمی سەر ب سنجەقا (هەكاری) بوو ئەو كەس ژی ئەڤەنە: (شەبۆ و ئۆسمانێ كورێ وی، تێلی و تاهر كورێ مهرتان، عەبۆ و حەسەن و عەبدلقادر و عەباس كورێ زەینەل، رەشید كورێ حەسەن، جهانگیر) و دادگەهێ دەهـ

رۆژ مۆلەت داینێ خۆ رادەست بکەن، هەکە نە، دێ ب ئاوایێ ئامادەنەبووی هێنە دادگەهـ کرن[٨٢].

هەروەسا د هژمارا رۆژا (١٩٠٣/١٢/٢٤)ێ یا رۆژنامەیا (موصل) دا دەنگ و باسێ هێرشا کۆمەکا کەسان بۆ سەر کەسەکێ مەسیحیێ ب ناڤێ (بیۆ کورێ حەننا)یێ خەلکێ ناحیا (داودیێ) هاتییە بەلاڤ کرن کو ئەو ژی ئەڤەنە: (عەبدلرەحمان کورێ شیری، محەمەد کورێ موسای، موسا کورێ حوماز، محەمەد کورێ شەمدین) کو دەمێ ئەو مەسیحی ژ قەزا دهۆك ڤەگەریای ژ لایێ وان کەسان ڤە هاتییە قوتان و بریندارکرن و هندەك کەل و پەلێن وی ژی دزینە، هەروەکی د دەنگ و باسێن دی دا هاتی، دادگەهێ گەفا خۆرادەستکرنا وان کرییە، هەکە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێنە دادگەهـ کرن[٨٣].

هەروەسا تشتێ دی یێ پەیوەندی ب ئامێدیێ ڤە هەی، رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٥/٧/١٣)ێدا ئاگەهدارییەك بەلاڤکرییە و تێدا گۆتییە کو هەر ئێك ژ (عەبدوللا، عەلی، عیسا و محۆ) کو خەلکێ گوندێ بێسڤکێ نە، (سالح عەبدلرەحمان) کوشتینە و کەسەکێ دی ب ناڤێ (محەمەد) بریندار کرینە و هەردو خەلکێ وی گوندی ب خۆنە، هەروەکی د دەنگ و باسێن دی دا هاتی، دادگەهێ گەفا خۆرادەستکرنا وان کرییە، هەکە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێنە دادگەهـ کرن[٨٤].

## د- ئاکرێ:

ئاکرێ ژی د ڤی بیاڤی دا رووبەرەکێ بەرفرەهـ ژ بەرپەرێن رۆژنامەیا (موصل) ڤەگرتییە و ئەڤێن خوارێ ژی دیارترین ئەو حالەتن یێن ل ئاکرێ هاتینە روودان و رۆژنامەیێ ئاماژە کریێ:

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٢/٧/٣) ێ دا بەلاڤکرییە کو ژ ئەنجامێ لێکەڕیانان (ئیبراهیم کورێ عەبدولخالق) یێ گونەهبار ب تاوانا ئەنجامدانا سۆتنەکێ کو بەرێ ژی ژ گرتیخانا ئاکرێ رەڤی بوو هاتییە دەستەسەر کرن و قائیمقامییا قەزا ناڤبری والیێ ویلایەتێ ب ڤێ چەندێ ئاگەهدار کرییە[٨٥].

هەروەسا د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٢/٧/١٧)ێ دا حوکمەکێ دادگەهێ دەرهەڤێ هەر ئێك ژ: (سادق کورێ حەجی ئەحمەد، تاهر کورێ تاهر) بەلاڤکرییە کو هەردو خەلکێ ئاکرێ نە و دەستدرێژی کرینە سەر (عەزۆیێ کورێ سادق)ێ خەلکێ وێ قەزایێ و دادگەهێ هەردو گونەهبار ب ئاوایێ ئامادەنەبووی ب پێنج سالێن زیندانکرنێ حوکمدایینە[٨٦].

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٢/٨/٧) ێ دا ئاماژە کرییە وێ چەندێ کو دەستەلاتێن حکۆمی شیاینە (محەمەد کورێ نعمەت)ێ خەلکێ گوندێ (هناری) بگرن و حەوالەی دادگەها بەراهیێ یا ئاکرێ بکەن ژ بەرکو ناڤبری ب کوشتنا (مەلا عەبدوللا)یێ پێشنڤێژێ گوندی رابوویە[٨٧]، هەروەسا رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٢/٨/١٤)ێ دا دەنگ و باسێ رەڤینا کۆمەکا مەزن یا کەسان ژ گوندێ بجیلێ بەلاڤکرییە ئەڤە ژ پشتی (ئیسماعیلێ کورێ عەبدلقادر) خەلکێ تاخێ (جوبەتی) (دیارە تاخێ - چوستەیی - یە - ص -) یێ ئاکرێ کوشتی، ژ بەر هندێ، دادگەهێ ماوێ دەهـ رۆژان مۆلەت داینێ خۆ رادەست بکەن، هەکە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێنە دادگەهـ کرن[٨٨].

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٢/٣) ێ دا دەنگ و باسەك بەلاڤکرییە و تێدا دیار دکەت کو هەر ئێك ژ: (سلێمان کرکو و کورێ وی دەروێش و لاسویسۆ، سەید سمۆکە، عەلی مجوێر، پیر ئۆسمان) ژ گوندێ (ئێسفنێ) کەل وپەلێن (مەرعی کورێ حسێن) دزینە و ژ بەرکو هەتا نۆکە نەهاتینە گرتن و وان ژی خۆ رادەست نەکرییە، دادگەهێ بریاردایە ب ئاوایێ ئامادەنەبووی بهێنە دادگەهـ کرن و هەر ئێك ژ وان ب سالەکا زیندانکرنێ و کارێن گران بهێنە حوکمدان[٨٩].

رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٤/٢٨)ێ دا بەحسێ کۆمەکا کەسێن خەلکێ گوندێ (هرت) ێ (گوندێ هەرنێ یە یێ نها سەر ب ناحیا دینارتە) یا ناحیا زێبار دکەت کو ئەو ژی (عەلی و مەسیح کورێن سەلیم خان و ئاڤدەل)ن کو ڤان بەزێ گوندێ

(کوران) دزینە و رەڤینە، ژ بەر هندێ، دادگەهێ دەهـ رۆژ مۆلەت داینێ خۆ رادەست بکەن، هەکە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێنە دادگەهـ کرن[٩٠].

تشتێ پەیوەندی ب عەشیرەتا زێدك یا کوچەر یا ل ئاکرێ ڤە هەی، رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٥/١٢/٢١)ێ ئاگەهدارییەکا فەرمانگەها سزایێن دادگەها ئاکرێ ل سەر کێشەیا کوشتنا (ئیبراهیم کورێ عومەر) و برایێ وی بەلاڤکرییە کو هەردو ژ عەشیرەتا زێدك یا کۆچەرن و هەردو گونەهبارێن رەڤی ژی (رزۆ و یونس کورێن عەبدوللای) خەلکێ گوندێ بالەتە هەتا نۆکە نەهاتینە گرتن، سەرۆکاتییا دادگەهێ دەهـ رۆژ مۆلەت داینێ خۆ رادەست بکەن، هەکە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێنە دادگە کرن[٩١].

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٨/٢٠) ێ دا دەنگ و باسێ کوشتنا ژنەکێ ب ناڤێ (رابیعە کچا ئەحمەدێ کورێ محەمەد سادقێ ئاکرەیی) بەلاڤکرییە و گونەهبارێ رەڤی ژی (محۆیێ کورێ عەبدوللا)یە ژ تاخێ (زێوکە-دروست زێوکی)یێ ئاکرێ، سەرۆکاتییا دادگەهێ دەهـ رۆژ مۆلەت داینێ خۆ رادەست بکەت، هەکە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێتە دادگەهـ کرن[٩٢].

هەروەسا د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٤/١٢/٢٩) ێ دا ئاگەهدارییەکا فەرمانگەها سزایێن دادگەها لێزڤرینێ یا ویلایەتا مووسل هاتییە بەلاڤکرن و تێدا هاتییە: ژ بەرکو هەتا نۆکە هەردوییێن رەڤی (فەتاح و سەلیم خان) کو ژ ئاغایێن زێبارن، و (خان ئاڤدەل[٩٣]، و عەلی و مەسیح کورێن سەلیم خان، کەسەکێ دی ب ناڤێ عەبدولرەحان نەهاتینە گرتن و گونەهبارن ب بکارئینانا چەکی دژی هێزێن سەربازی یێن ئۆسمانی و ئارمانجا وان کوشتن بوو، سەرۆکاتییا دادگەهێ بریاردا دەهـ رۆژان مۆلەتێ بدەتە وان ل بەرامبەری دادگەهێ ئامادە ببن، هەکە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێنە دادگەهـ کرن[٩٤].

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٦/٢/١٥) ێ دا ئاماژە کرییە کێشەیا تالانکرنا پەزی ل قەزا زێبار و هەردو گونەهبارێن رەڤی (عەلی و مسلم) کو خەلکێ وێ قەزایێ ب خۆنە و کەسەکێ دی یە ژی ب ناڤێ (خان ئاڤدەل) گونەهبارن تێدا، سەرۆکاتییا دادگەهێ ماوەیەك مۆلەت داینێ خۆ رادەست بکەن، هەکە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێنە دادگەهـ کرن[٩٥].

رۆژنامەیێ د چەندین هژمارێن خۆ دا دەنگ و باس ل سەر هژمارکا تاوان و گونەهێن بنەمالا خەندان یا قەزا ئاکرێ بەلاڤ کرینە، ئەڤێن خوارێ ژی ئەو دەنگ و باسن یێن رۆژنامەیا (موصل) د هژمارێن بەردەست دا بەلاڤ کرین، ژ وانا:

رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٣/٥)ێ دا دەنگ و باسێ کێشەیەکێ بەلاڤکرییە کو ل تاخێ (قابکێ) ل ئاکرێ هاتییە روودان و د وێ کێشەیێ دا (قادر کورێ خالد) و کەسەکێ دی ب ناڤێ (سەلیم) هاتینە کوشتن و کەسەکێ دی ب ناڤێ (عەبدوللا) بریندار بوویە و کەسێن بەرگومان ژی رەڤینە کو ئەو ژی ئەڤەنە: (خەندان ئاغا ئاکرەیی، برایێ وی حاجی سەلیم، کورێ وی هادی، شتۆ کورێ خەجیك، عەبدلجەبار کورێ کشتۆ، شتکۆ کورێ حسنۆك، حاجی ئیبراهیم کورێ عەبدولخالق، رەشید کورێ حاجی سەلیم)، دەنگ و باس پێڤە دچیت و دبێژیت: ژ بەرکو هەتا نۆکە ئەو نەهاتینە گرتن، سەرۆکاتییا دادگەهێ بڕیاردایە دەهـ رۆژان مۆلەتێ بدەتە وان ل بەرامبەری دادگەهێ ئامادە ببن، هەکە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێنە دادگەهـ کرن[٩٦].

رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٦/٢٥)ێ دا دەنگ و باسەك بەلاڤکرییە و تێدا دیار دکەت کو عەشیرەتا زێدەك هژمارکا سەرێن تەرش و کەوالێ گوندێ (ئۆمەر خۆشان) یا سەر ب قەزا ئاکرێ ڤە تالان کرینە و مولازمێ جەندرمان (سەعید ئەفندی) ب رێکارێن پێدڤی رابوویە بۆ زڤراندنا وی تەرش وکەوالێ تالانکری و شیایە وێ چەندێ بکەت و رادەستی خودانێن وان بکەت[٩٧]، لێ پشتی هنگی دەستەلاتێن دەڤەرێ ئەڤ گونەهبارییە ژ عەشیرەتا زێدك رەت کرییە و رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا رۆژا

(١٩٠٣/٧/٣٠)ێ دا دەنگ و باسەك ل سەر ڤێ رووداني بەلاڤكرییە و تێدا دبێژیت كو عەشیرەتا زندك ئەو دزی نەكرییە، بەلكی دیاربوویە كو (خەندان) و (هادی) یێ كورێ وی و دەست و دارێن وی كو زرتەكێن قەزایێ نە (هەروەكی هۆسا د دەنگ و باسی دا هاتی) و (خان عەبدالێ زێباری) و زەلامێن وی ئەو تەرش و كەوال تالان كرییە[٩٨].

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٨/١٣) ێ دا دەنگ و باسەكێ دی ل سەر ڤێ بنەمالێ هاتییە بەلاڤكرییە و تێدا هاتییە كو ل دووڤ فەرمانێن ژ ویلایەتێ هاتین بۆ دەستەسەركرنا (هادی كورێ خەندانێ ئاكرەیی) یێ گونەهبار و حوكمدای ب گەلەك تاوان و خیانەتكاریان و نۆكە یێ رەڤییە و بەردەوامە ل سەر دەستدرێژیێن خۆ ل سەر رێڤینگان و زیانێ دگەهینیتە وان، میرئالای (ئەنیس بەگ ئەفندی) سەركردێ هێزێن ئاكرێ فەرماندایە مەفرەزەیەك ژ لەشكەر و جەندرمان بهێتە پێك ئینان و ئەو مەفرەزە دگەل نەقیب (عەباس ئەفندی) كارمەندێ جەندرمان ل وێ قەزایێ بۆ گوندێ (كوچەك خمس) هاتییە هنارتن كو ئەڤە ئێكە ژ گوندێن ناحیا حەفت عەشیرەتان (ئانكو بەردەرەش كو نۆكە قەزایە - ص -)، و پشتی ئەنجامدانا كارێن پێدڤی و رێكارێن دووڤچوونێن ژ دل، (هادی كورێ خەندانێ ئاكرەیی) هاتە نەچار كرن چەكێ خۆ دانیت و خۆ رادەست بكەت و پاشی خۆ رادەستی دادگەها سەربازی كر[٩٩]، هەڤدەم حكۆمەتا ویلایەتێ د هژمارا رۆژا (١٩٠٣/٨/٢٠) ێ دا جارەكا دی سوپاسییا میرئالای (ئەنیس بەگ) كر پشتی شیای (وی زرتەكی) - هەروەكی وەسا د رۆژنامەیێ دا هاتی ــــ (هادی كورێ خەندانێ ئاكرەیی) و سێ یان چوار دەست ودارێن وی دەستەسەر بكەت كو ژ لایێ تەناهیێ ڤە ئەو ئێك ژ ئەگەرێن نەرحەتییا قەزایێ بوو[١٠٠]، وەسا دیارە ژی ئەڤێ داویێ جهێ ترس و دوودلییا خەلكی و حكۆمەتا ویلایەتا مووسل ل قەزا ئاكرێ بوو، ژ بەر هندێ دبینین گەلەك پەسنێ وی كەسی هاتییە كرن یێ ئەو گرتی، نەخاسمە ژی پەسنكرنا (ئەنیس بەگ)ێ.

## هـ- شنگال:

شنگال ژی بەهرا خۆ د وان دەنگ و باسێن رۆژنامەیا (موصل) دا هەیە و ل ڤێرە ئاماژە ب دو دەنگ و باسان ب تنێ دهێتە كرن، یێ ئێكێ د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٣/٨/٢٠) ێ دا ل بن ناڤ ونیشانێ (روودانێن ویلایەتێ) هاتییە بەلاڤكرن و ئاماژە ب لڤینا (عزەت بەگ)ێ قائیمقامێ شنگال و (محمود خدر ئاغا) موقەددەمێ هێزێن (سوارێن حەمیدی) هاتییە كرن ب هێزەكا سەربازی بەرەڤ باكوورێ قەزایێ چووینە وەك پێكۆلەك بۆ دەستەسەركرنا كورێن (كەرحە) یێن كو ماوێ ٣٠ سالانە كارێن رێگرییێ ل رێ یێن دەرڤەیی دكەن و ڤێ داویێ بەرهنگاری كاروانەكێ بازرگانی یێ ژ بەغدا دهات ببوون و هەمی پارە و تەرش وكەوالێن وی كاروانی ب دارێ زۆرێ تالان كربوون، ئەڤ هێزە شیا بچیتە ناڤ گوندێ (عمران) و هەروەكی مرۆڤ ژ ڤی دەنگ و باسی تێ دگەهیت ئەڤ گوندە ناڤەندا وێ خێزانا ڤارێ و درندە بوویە - هەروەكی رۆژنامەیێ هۆسا بەحس كری - و ئەڤ هێزە شیا ڤی گوندی و گوندێن سەر ب وی گوندی ڤە كو هەمی ئێزدی نە بینیتە بن دەستەلاتا دەولەتێ و توخیبەكی بۆ كەسانێن ژ یاسایێ دەركەڤتی دانیت[١٠١].

لێ دەنگ و باسێ دووێ، رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٦/٢/١٥) ی دا بەلاڤكرییە و تێدا ئاماژە كرییە كێشەیا كوشتنا ئەندامەكێ جەندرمان كو ناڤێ وی (بەكرێ كورێ حسێن)ە ب دەستێ كەسەكی ب ناڤێ (قاسم كورێ خدر جندۆ) ژ گوندێ (كرسی) كو دكەڤیتە بەر قەزا شنگال و ژ بەركو یێ داویێ نەهاتییە دەستەسەركرن، بریار هاتە دان ب ئاوایێ ئامادەنەبووی بهێتە دادگەهـ كرن و ب پازدە سالێن زیندانكرنێ و كارێن گران بهێتە حوكمدان[١٠٢].

## سێ- ڤێكنەكرنێن عەشیرەتێن بەهدینان:

دیارترین دەنگ و باسێن ڤێكنەكرنێن عەشیرەتێن دەڤەرا بەهدینان یێن رۆژنامەیا (موصل) ئاماژە

کرینێ، ئەو ڤێکنەکرنن یێن ل ناڤبەرا هەردو عەشیرەتێن (ئەرتووشی)یا کۆچەر و (دۆسکی)یا بنەجهـ ل باکوورێ قەزا دهۆك هەین، وەسا دیارە ژی ئەڤ شەرەنیخە ژ بەر وان ئارێشەیانە یێن عەشیرەتا ئەرتووشی هەلدئێخست یا خۆدابوو بن لیوا سوارێن حەمیدی[١٠٣]، ئەڤە ژی دەمێ ئەو عەشیرەت ل جهەکێ عەشیرەتا دۆسکی دچیتە جهەکێ دی بۆ لێگەریانا چەروانا بۆ تەرش وکەوالێن خۆ، دیرۆکنڤیس (سەدیق دەمەلۆجی) ژی دبێژیت کو ڤێکنەکرن ل ناڤبەرا هەردو عەشیرەتان ل سالێن (١٨٩٧-١٨٩٨)ێ دەست پێ کرینە دەمێ عەشیرەتا ئەرتووشی هەشتێ کەس ژ عەشیرەتا دۆسکی کوشتین کو پتریا وان مەزنێن عەشیرەتێ بوون[١٠٤] و ئەڤ شەرەنیخە دۆرێن هەشت سالان بەردەوام بووینە و شەر و هنگامێن سڤك ل ناڤبەرا هەردولا هەتا سالا (١٩٠٥)ێ ژی رانەوەستاینە[١٠٥].

رۆژنامەیا (موصل) د دو هژمارێن خۆ دا ئاماژە کرییە ڤێ ڤێکنەکرنێ، ئەو رۆژنامە د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/١٢/٢٩) ێ دا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (زڤراندنا تالانی) بەلاڤکرییە و تێدا دبێژیت: ژ بەر ڤێکنەکرنێن بەرێ ل قەزا دهۆك ل ناڤبەرا هەردو عەشیرەتێن دۆسکی و ئەرتووشی هاتینە روودان، ئەرتووشییان هژمارکا مەزن یا پەزێ دۆسکییان تالانکرییە و ئەڤە ژی دبیتە رێخۆشکرن بۆ پەیدابوونا روودانێن ب دلێ سولتانی نەبن، هەروەکی ژ ئاگەهدارکرنێن خۆجهی یێن دهۆك و ل دووڤ راسپاردە و راگەهاندنێن ویلایەتا مووسل و ب کار وخەباتێن (ئیبراهیم نەجاتی) قائیمقامێ قەزا ناڤبری و (شێخ نور محەمەد ئەفندی) و عەقیدێ لیوایێن سوارێن حەمیدی (حاجی بەگ)ێ سەرۆکێ ئەرتووشییان، تالانی هاتە زڤراندن و رێ نەدان شەر ل ناڤبەرا هەردو عەشیرەتان بهێتە روودان[١٠٦].

وەسا دیارە ژی ئەڤ شەرەنیخە ب داوی هاتییە هەروەکی ژ وی دەنگ و باسی دیار دبیت یێ د هژمارا رۆژا (١٩٠٥/٥/٤) یێ رۆژنامەیا (موصل) دا بەلاڤبووی کو ب ناڤ ونیشانێن (ئاشتبوون و رێزگرتن)ە و تێدا هاتییە: گەلەك ژ مێژە ڤێکنەکرن و هەڤرکی ل ناڤبەرا هەردو عەشیرەتێن مەزنێن دۆسکی و ئەرتووشی ل هەردو قەزایێن دهۆك و زاخۆ پەیدا دبن، هەرچەندە چەندین جاران بزاڤ بۆ پێکئینانا هەردوان و نەهێلانا ڤێکنەکرنا ل ناڤبەرا وان هاتینە کرن، لێ ئەو ڤێکنەکرن نەراوەستیاینە و چ ژ وان بزاڤان بەرێ خۆ نەبووینە، ڤێجا داکو ئەڤ ڤێکنەکرنە ل پاشەرۆژێ بەرفرەهـ نەبیت و عەشیرەتێن دی ژی ڤەنەگریت و روودان وەسا چێ نەبن ب دلێ حکۆمەتێ نەبن، راسپاردە و راگەهاندنێن توندودژوارێن ژ لایێ ویلایەتێ و قائیمقامییا دهۆك ڤە هاتینە دان و هەروەسا بزاڤێن هەر ئێك ژ: (شێخ بەهائەددین) شێخێ بامەرنێ، (شێخ نور محەمەدئەفەندی) ئاکنجییێ دهۆك کو ئێکە ژ شێخێن هێژا ــــ هەروەکی رۆژنامە دبێژیت -، (حاجی ئاغا)یێ سەرۆکێ عەشیرەتا سلێڤانەیی، ئەڤە بوونە ئەگەرێ ئاشتبوونێ ل ناڤبەرا وان عەشیرەتان، و داکو ئەو ناکۆکییە ژ رەهـ وریشال بهێنە هەلکێشان، هەردولا گوژمێن پارەی و تشتێن دی بۆ ئێك ودوو زڤراندن یێن هەر ئێك ژ وان داخواز دکرن و هەردولا فۆرم (سەنەد)ا ئاشتبوونێ یا ل ناڤبەرا خۆ ئیمزا کر[١٠٧].

رۆژنامەیا (موصل) بەحسێ هندەك ڤێکنەکرنێن دی ژی ل ناڤبەرا عەشیرەتێن بەهدینان کرییە، وێ رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٥/٣/٨)ێ دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (تالیف) ئانکو (ئاشتبوون) بەلاڤکرییە کو بەحسێ ئاشتبوون و پێکهاتنێ ل ناڤبەرا (عەبدی ئاغا) و (عەبدال ئاغا)یێ عەشیرەتێن (سندی - گولی) ل قەزا زاخۆ دکەت، کو ئەڤ ئاشتبوونە ژی ب دەستکاتییا (حاجی ئاغا)یێ سەرۆکێ عەشیرەتا سلێڤانەیی ل زاخۆ و کارمەندێ جەندرمان هاتییە کرن یێ رۆژنامەیێ ئاماژە نەکرییە ناڤێ وی، رۆژنامە پێڤە دچیت و دبێژیت کو قائیمقامییا زاخۆ و ئاغایێ ناڤبری بروسکەیەك بۆ ناڤەندا ویلایەتێ هنارتییە و تێدا ئەو ئاشتبوون رۆنکرییە یا ل ناڤبەرا هەردولا هاتییە ئیمزاکرن، پاشی رۆژنامەیێ دەست ب پەسندانا (حاجی ئاغا) کرییە و دبێژیت:

ناڤبری (ئانكو حاجى ئاغا شەمدين ئاغا زادە) برایێ خودێ ژێ رازی (حاجى يوسف پاشا)يە و وەكى وی كەسەكێ خودان غيرەت و خودان شيان و پشتەڤانێ سۆلتانێ هێژایە و بۆ سەرفەرازيا دەولەتێ و وەلاتی كار وخەباتێ دكەت و خەبات و بزاڤێن وی د ڤی بیاڤی دا جهێ رێزگرتنێ نە[١٠٨].

رۆژنامەیێ دەنگ و باسەك ل سەر عەشيرەتا زێدك و گوندێ (شمتكە؟؟؟)يێ ل دهۆك بەلاڤكرييە و د هژمارا خۆيا رۆژا (١٩٠٥/١/٢٦)ێ دا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونيشانێن (رێزگرتن) نڤيسييە و تێدا بەحسێ هندەك كەسێن عەشيرەتا زێدك دكەت كو هژماركا سەرێن پەزێ گوندێ (شمتكە) يێ دكەڤيتە بەر قەزا دهۆك تالان كرينە و كێم مابوو كارووبار بگەهنە ئاستێ پەيدابوونا روودانێن مەزن ل ناڤبەرا هەردولا، لێ ژ ئەنجامێ رێكار و پێرابوونێن هاتينە كرن پەزێ تالانكرى ب تمامى هاتە زڤراندن و ئەڤە بوو يا د بزوسكا قائيمقاميا ناڤبرى دا هاتى، رۆژنامە پێڤە دچيت و دبێژيت: كار و خەباتێن هەر ئێك ژ: (ئيبراهيم نەجاتى بەگ)ێ قائيمقامێ دهۆك و (زباء ئەفندى)يێ رێڤەبەرێ ناحيا مزوورى و (ميرزا ئاغا عەبدلهادى زادە) جهێ دەستخۆشى و رێزگرتنێ نە[١٠٩].

هەر د چارچۆڤێ ڤێكنەكرنێن ناڤبەرا عەشيرەتان دا رۆژنامەیێ د هژمارا خۆيا رۆژا (١٩٠٥/٤/٢٧)ێ دا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونيشانێن (رێزگرتن) بەلاڤكرييە و تێدا ئاماژە كرييە چێبوونا هندەك كار و روودانان ل ناڤبەرا عەشيرەتێن زێبار، سوورچى و هەركى يا مەزن ل قەزا ئاكرێ و عەشيرەتێن دى يێن پێكهاتن دگەل هەی، داكو ئەڤ روودانە بەرفرەهـ نەبن و رێ نەهێتە دان هندەك روودانێن دى پەيدا ببن و حكۆمەت پێڤە مژويل ببيت، (ئاسف ئەفندى) بريكارێ قائيمقامێ ئاكرێ بزاڤێن خۆيێن ئاشتيانە ب كار ئينانە و (پيرۆت ئاغا)يێ سەرۆكێ عەشيرەتا هەركى ژى هاريكاريا وى كرييە و ب ڤێ رێكێ رەوش هاويش بوويە و تالانى و هەر تشتەكێ دى يێ هەر ئێك ژ وان لايەنان داخوازكرى هاتييە زڤراندن و رادەستى خودانێن وان هاتينە كرن[١١٠].

ب ناڤ ونيشانێن (تاليف بين) (ئانكو گرێبەستا ئاشتبوونێ)، رۆژنامەیێ د هژمارا خۆيا رۆژا (١٩٠٥/٦/٧)ێ دا دەنگ و باسێ هەبوونا ڤێكنەكرنەكا دوو سالى ل ناڤبەرا خەلكێ ناحيا (نێروە) يا قەزا ئامێدیێ و خەلكى ناحيا مزوورى ژوورى (مزوورى بالا)يا قەزا رواندز بەلاڤكرييە و د ئاگەهداركرنەكا قائيمقاميا ئامێدیێ دا بۆ ويلايەتێ هاتييە هنارتن تێدا هاتييە كو پێرابوون هاتينە كرن بۆ چارەكرنا ڤێ ڤێكنەكرنێ و ڤان پێرابوونان بەرێ خۆ هەبوويە و بوويە ئەگەرێ ئاشتبوون و پێكهاتنێ ل ناڤبەرا هەردولا و (ئەحمەد تەوفيق ئەفندى) قائيمقامێ ئامێدیێ رۆلەكێ مەزن د ڤێ ئاشتبوونێ دا هەبوويە[١١١].

رۆژنامەيا (موصل) د دەنگ و باسەكێ هژمارا خۆيا رۆژا (١٩٠٦/١/١١)ێ دا گۆتييە كو قائيمقامێ قەزا شنگال هندەك رێكار ب كار ئينانە بۆ ئيمزاكرنا گرێبەستا ئاشتبوونێ ل ناڤبەرا هەردو عەشيرەتێن (هبابى) و (مەندكان) و هەڤپەيمانا وێ عەشيرەتا (بابا) كو ژ عەشيرەتێن ئاكنجيێن قەزار شنگالن و ژ مێژە دوژمناتى و ئاريشە ل ناڤبەرا وان هەبووينە و بووينە ئەگەرێ پەيدابوونا هندەك روودانێن ب دلێ خودانێ پێكەهێ بلند نەبن - هەروەكى رۆژنامە دبێژيت ـــ بەرێ ڤان پێرابوون و رێكاران ژى ئەو بوو ئەو عەشيرەت ئاشت ببن و پێكبهێن و هەر ئێك ژ وان سۆزدايە جارەكا دى دەستدرێژيێ نەكەنە سەر ئێك ودو[١١٢].

سەربارى وان ڤێكنەكرنێن ل ناڤبەرا عەشيرەتان، هندەك روودان ل ناڤبەرا گوندێن دەڤەرێ چێ بووينە، وەسا ديارە دزى پالدەرێ ڤان روودانان بن، ل ڤێرە دێ ئاماژە ب هندەكان ب تنێ هێتەدان، هەر بۆ نموونە رۆژنامەيا (موصل) د هژمارا خۆيا رۆژا (١٩٠٥/١/٥) يدا ئاگەهدارييەكا فەرمانگەها سزادانێ يا دادگەها لێزڤرينێ يا ويلايەتێ بەلاڤكرييە و بەحسێ هندەك گونەهباران دكەت يێن هێرش كرينە سەر گوندێ (شاخكێ) و چەك ب مەرەما كوشتنێ راكێشايە (تاهر ئاغا) و هەڤالێن وى، گونەهبار ژى ژ گوندێ (پيرۆمەرا)يا ناحيا (داوديێ) نە، رۆژنامەیێ گەلەك

ناڤ بەلاڤکرینە و گۆتییە کو ئەو گونەهبارن ب ڤێ هێرشکرنێ و ویلایەتێ ژی دەهـ رۆژ مۆلەت داینێ خۆ رادەست بکەن، هەکە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێنە دادگەهـ کرن[١١٣].

هەر د وی چارچوڤەی دا، رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا ١٩٠٥/٢/٢ێ دا راگەهاندنەکا فەرمانگەها سزادانێ یا دادگەها لێزڤرینێ بەلاڤکرییە و ناڤەرۆکا وێ ژی ئەوە کو کۆمەکا کەسان ملك و مالێ (ئیبراهیم کورێ ئیسماعیل) و هەڤالێن وی یێن گوندێ (میر کەهل)(دبیت گوندێ مێرگەهەلێ بیت) کو ئێکە ژ گوندێن (بەرواری ژێری) تالان کرینە وهەر ئێك ژ (ئیبراهیم کورێ شاهینی و محەمەد عەلی کورێ تاهای) کوشتینە و (محەمەد کورێ حەسەن) و هەڤالێن وی بریندار کرینە و تووتن و کەل ویەلێن (حسێن ئاغا) دزینە و گونەهبارێن رەڤی یێن ڤێ کێشەیێ خەلکێ گوندێ (سوارێ) نە، رۆژنامەیێ لیستەکا درێژ ب ناڤێ وان گونەهباران بەلاڤکرییە و دادگەهێ ژی بریاردایە هەر ئێك ژ وان ب پازدە سالان و ب کارێن گران بهێنە حوکمدان[١١٤].

ل داویێ ژی رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا ١٩٠٥/٦/٧)ێ دا ئاگەهدارییەك ل سەر کۆمەکا بەرگومانان بەلاڤکرییە کو ب دارێ زۆرێ پەزێ (مەریەما کچا خەواس) ئاکنجییا گوندێ (یوسفکا)یا قەزا ئامێدیێ تالانکرییە و ئەو گونەهبار نۆکە درەڤینە، بەرگومان ژی خەلکێ گوندێ (قەدشێ)نە و ئەو ژی ئەڤەنە: (محەمەد کورێ عەلی، تاهر کورێ عەلی مسارکە، تاهر کورێ عەلی، فەرحۆ کورێ عومەر، ئیبراهیم و پیر موسا کورێن ئۆسمان، حەسەن و کەسەکێ دی یێ ب ناڤێ موسا)، دادگەهێ دەهـ رۆژ مۆلەت داینە وان خۆ رادەست بکەن، هەکە نە، ب ئاوایێ ئامادەنەبووی دێ هێنە دادگەهـ کرن[١١٥].

## چوار- باج:

یێ پێداچوونێ د دەنگ و باسێن رۆژنامەیا مووسل دا بکەت دێ ب رۆهن و ئەشکەرایی بۆ دیار بیت کو دەولەتا ئۆسمانی چ کارێن ئاڤەدانکرنێ یان ئابووری ل دەڤەرێ ئەنجام نەداینە، لێ بەرۆڤاژی هندێ، حکۆمەتا ئۆسمانی ب هویری دووڤچوونا رەوشا وەرگرتنا باجان دکر و پەسنێ فەرمانبەرێن خودان شیانێن بەرپرس ژ باج وەرگرتنێ دکر، ئەڤە ژی نیشانێ هندێ یە کو دەولەتا ئۆسمانی ل سەر ڤان باجان دژیا و تنێ د ڤان باجان را بەرێ خۆ ددا وەلاتیێن خۆ، وەسا دیارە ژی دەولەتا ئۆسمانی وەسا ددیت کو حکۆمەتێ ئەرك ل سەر وەلاتییان هەیە، لێ حکۆمەتێ بەرامبەری ڤی ئەرکی چ بۆ وان نەدکر، ئانکو وەلاتییان چ ماف ل سەر دەولەتێ نینن، دبیت ژی ئەڤە دیارترین خالا لاوازیێ بیت یا ب نیڤا هناڤێن دەولەتا ئۆسمانی کەڤتی، هەروەسا وەلاتییان ژی تنێ وەسا بەرێ خۆ ددا دەولەتا ئۆسمانی حکۆمەتا تالانکرنێ بیت و نە حکۆمەتا کار و ئاڤکرنێ بیت، هەروەکی وی دەمی رۆژنامەیا (کوردستان) ب ئەشکەرایی ئاماژە ب ڤێ چەندێ دا[١١٦].

دشێین بێژین کو حکۆمەتا ویلایەتا مووسل ل دەستپێکا هەر دەمسالەکا نوو، ل پێشیێ داخوازا دامەزراندنا باجگران (شانەیان) دکر، پاشی ژ وان یێن داخوازی پێشکێش دکرن هندەك کەسێن خودان شیان ژێ دگرتن و مووچەیێن وان نوو دکرن و فەرمان دداینێ دەست ب کارێ خۆ بکەن[١١٧]، ئەڤ پرۆسێسە چەندین جاران ل دەڤەرا بەهدینان هاتییە کرن، هەر بۆ نموونە، رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٥/٢٦) ێ دا دەنگ و باسێ دامەزراندنا ڤان کەسێن ناڤێن وان دهێن وەك فەرمانبەرێن باجا دەهێکان (ئانکو رێژا ئێك ژ دەهان) ل دەڤەرا بەهدینان بەلاڤکرییە، ئەڤە ژی پشتی ئەو بۆ وی کاری هاتینە ژێگرتن و ب کرێیەکا ڤەبری ب گوژمێ (٧٥٠) قرشان بۆ هەر ئێك ژ وان کو ئەو ژی ئەڤەنە: (محەمەد عەلی قائیمقامێ بەرێ یێ زێبار بۆ وەرگرتنا باجا دەهێکان ل قەزا شنگال، نەزمی بەگ بۆ ئامێدیێ، عەبدوللا کارمەندێ پەزێ قەزا ئاکرێ بۆ قەزا ئاکرێ و ناحیا زێبار، نڤیسەرێ نهێنی نڤیسێن نامەگوهۆرینێن عەبدلکەریم ئەفەندی بۆ قەزا دهۆك و حکۆمەت هیڤیخوازە د دڤی کارێ خۆ دا دەسەرکەفتی بن[١١٨].

هەروەسا د هژمارا رۆژا (١٩٠٣/٦/٢)، ێ یا وێ رۆژنامەیێ دا دەنگ و باسێ دامەزراندنا (رەزا بەگ) ێ رێڤەبەرێ ناحیا تەلەعفەر هاتییە بەلاڤکرن وەك كارمەندێ وەرگرتن و حەوالەكرنا باجا دەهێكان ل قەزا زاخۆ[119]، هەروەسا (حاجی عەبدلكەریم) رێڤەبەرێ بەرێ یێ دارایی یا رەواندزێ وەك فەرمانبەرێ وەرگرتن و حەوالەكرنا باجا دەهێكان ل قەزا ئامێدیێ هاتییە دامەزراندن[120]، هۆسا حكۆمەتێ هەر دەمسالەكا نوو ئەڤ پرۆسێسە ئەنجام ددا[121].

حكۆمەتا ئۆسمانی ل مووسل ل سەر بەریەرێن رۆژنامەیا (موصل) گەلەك دەستخۆشی ل وان فەرمانبەرێن حكومی كرییە یێن ل دەڤەرێن خۆیێن لێ هاتینە دامەزراندن شیاین مەزنترین هژمارا پارێ باجان كۆم بكەن، هەر بۆ نموونە، حكۆمەتا ویلایەتا مووسل د هژمارا رۆژا (٢٦ /١٩٠٣/٣)ێ دا سوپاسییا (عەبدوللا ئەفندی) كارمەندێ پەزێ ئاكرێ دكەت یێ شیای گەلەك ب هویری باجان كۆم بكەت و نەهێلای چ سەرپێچی د ڤی بیاڤی دا بهێنە كرن[122].

هەروەسا د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٣/٥/٢٦)ێ دا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (سوپاسی و رێزگرتن) ل سەر ئاكرێ هاتییە بەلاڤ كرن و تێدا هاتییە: ئەڤ سالە هژمارتنا پەزی ل قەزا ئاكرێ گەهشتییە (٣٢٥٩٤) سەرێن پەزی [123] و گەلەك باج ژێ ب دەستڤەهاتینە كو سەرجەمێ هەمیان ل دۆرێن (٥٨٨٩٠) قرشایە، ئەڤە ژی بەرێ رێڤەبرن و كار وخەباتێن (عەبدوللا ئەفندی)یێ كارمەندێ پەزی یێ قەزایێ بوویە[124].

د هژمارا وێ یا رۆژا (١٩٠٣/٦/٩)یدا دامكەك ل سەر باجا دەهێكان ل قەزا شنگال بەلاڤكرییە و دیار دكەت كو داهاتێ وێ قەزایێ ل دۆرێن (٣١٧٥٠٠) قرشان ژ پار زێدەترە و ئەڤە ژی ب كار وخەباتێن وێ دەستەیێ بوویە یا قەزایێ بۆ ڤی كاری پێكئینای[125]، لێ رۆژنامەیێ ئێكسەر د هژمارا پشتی وێ دا یا ل رۆژا (١٩٠٣/٦/١٦) ێ دەركەڤتی ئەو دەنگ و باس راستڤەكرییە و گۆتییە كو رێژەیا زێدەبوونێ (٢٥٠٧٠٠) قرش بوویە[126].

وەسا دیارە ژی حكۆمەتا ئۆسمانی ل ویلایەتا مووسل د بیاڤێ وەرگرتنا باجان دا گەلەك گرنگی دایە قەزا شنگال چونكی هژماركا مەزن یا عەشیرەتێن كۆچەر ل وێرێ هەبووینە و وان عەشیرەتان كەرێن مەزنێن پەزی هەبووینە، رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٨/٢٠)ێ بەلاڤكرییە كو ئامارا سەرێن پەزی ل قەزا شنگال بۆ ڤێ سالێ ل دۆرێن (٣٠٠٠) هزار سەران ژ پار زێدەتر بووینە و باجێن دەهێكان بۆ ڤێ سالێ ب رێژا (٨٠٪) ێ زێدە بوویە و ئەڤە هەمی ب كار و خەباتێن (عزەت ئەفندی)یێ قائیمقامێ وێ بوویە[127].

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/٢/٢٥) یدا پێشبینی كرییە رێژەیا باجا پەزی ژ پار زێدەتر بیت ژ بەر وێ پێشبینیا دهێتە كرن هژمارا سەرێن پەزی ب ئاوایەكێ مەزن زێدە ببیت، ئەڤە ژی ب پشكداری و پشتەڤانیا هندەك ماقوولێن خۆجهی بۆ ب ساناهیكرنا كارێ كارمەندێن هژمارتنا سەرێن پەزی و تەرش وكەوالی و ب كار وخەباتێن هندەك قائیمقامێن قەزایێن بەهدینان، ل سەر قەزا زاخۆ ژی د ڤی دەنگ و باسی دا هاتییە كو كارێ هژمارتنا سەرێن پەزی ب (حاجی یوسف پاشا) هاتییە راسپاردن كو پشتەڤانییەكا راست دروست بۆ سولتانی هەیە و ب هندێ بەرنیاسە و خزمەتێن باش و گرنگ بۆ حكۆمەتێ كرینە.

ل ناحیا (سندی - گولی) ژی (عەبدی ئاغا)یێ رێڤەبەرێ ناحیێ كو ئێكە ژ سەرۆكێن بەرنیاس ب راستگۆیی یێ ل ناڤ عەشیرەتان - هەروەكی رۆژنامە دبێژیت ـــ سۆزدایە هاریكاری و خزمەتێ بكەت بۆ ب ساناهیكرنا كارێ هژمارتنا سەرێن پەزی ل ناحیا وێ، هەروەسا (عەقید حاجی بەگ)ێ سەرۆكێ عەشیرەتا ئەرتووشی كو ئەو ژی سەر ب زاخۆیە و سەرۆكێ فەوجا ٥٠ یا هێزێن سوارێن حەمیدی یە، پرۆسێسا ئامار و هژمارتنا سەرێن پەزی و تەرش وكەوالێ عەشیرەتا خۆ دپارێزیت، ژ بەر هندێ، هەر ژ نوكە دهێتە پێشبینی كرن - هەروەكی رۆژنامە دبێژیت - قەزا زاخۆ پلا ئێكێ د هژمارا سەرێن پەزی دا ب دەستڤە بینیت، ل دهۆك ژی شیانێن (ئیبراهیم ئەفندی)یێ قائیمقام و راست و دروستی و رحەتیا كارمەندێن هژمارتنا سەرێن پەزی

و تەرش وکەوالی تێرا هندێ هەنە وێ کێماسیێ چارە بکەن یا پار هاتییە رووداں، نەخاسمە ژی هاریکاریا (شێخ نور محەمەد ئەفندی) د ڤی بابەتی دا وەل مە دکەت هەر ژ نۆکە ب هیڤی بکەڤین بکەهینە وی ئەنجامی - ل دووڤ گۆتنا وێ رۆژنامەیێ - هەروەسا هەکە هندەك ئاستەنگ و ئارێشە ل ئامێدیێ هەبن، شارەزایی یا قائیمقامی و سەرپۆرێن وی و کارمەندێن شۆلەژێ وە ل مە دکەن ب هیڤی بکەڤین داهاتێ باجان دوجارکی ژ پار زێدەتر ببیت، دهێتە چاڤەرێکرن ژی داهاتێ باجان ل ناحیا زێبار گەلەك و گەلەك ژ پار پتر بیت، نەخاسمە ژی دگەل دامەزراندنا کارمەندێن نوو یێن خودان شیان بۆ ڤی کاری و تەناهی و باش رێڤەچوونا کاروباران ژی ل وێرێ دبنەجهن، لێ ل قەزا شنگال کو ڤێکنەکرنێن شەمەر هاتینە چارەکرن و تەناهی و رحەتی ل وێرێ سەروەرە، دهێتە چاڤەرێکرن هژمارتنا پەز و تەرش وکەوالی و داهاتێ ب دەستڤەهاتی دوجارکی یان سێجارکی ژ پار پتر بیت، چونکی (نوری ئەفندی)یێ قائیمقامێ شنگال ژ کارمەندێن شارەزایە - هەروەکی رۆژنامە دبێژیت - ژ بەرکو وی ١٦ سالێن بەردەوام ل ویلایەتا بەتلیس ل وی پۆستی بوویە.[١٢٨]

ل داویێ ژی رۆژنامەیا (موصل) هەر ل سەر ڤێ چەندێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/٧/٧) ێ دا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێ (رێزگرتن) بەلاڤکرییە و تێدا سوپاسیا مەفرەزیەکا جەندرمان و سەرکردێ وێ (حسێن چاویش) و (حاجی بەگ)ێ عەقیدێ سوارێن حەمیدی هاتییە کرن ژ بەر کار و خەباتێن وان د بابەتێ هژمارتنا سەرێن پەزی دا ل قەزا زاخۆ و ل ناڤ عەشیرەتا ئەرتووش[١٢٩].

## پێنج- بێش و بارەبوی (التبرعات والهبات):

رۆژنامەیا (موصل) ئاماژە کرییە گەلەك جۆرێن بێش و بارەبوییان یێن خەلکێ دەڤەرا بەهدینان د هەلکەڤتێن جودا جودا پێشکێشی حکومەتا ئۆسمانی کرین، ل دووڤ وان زانیاری و دەنگ و باسێن د رۆژنامەیا (موصل) دا هاتین، دشێین وان بێش و بارەبوییان ب ڤی ئاوایێ خوارێ پۆلێن بکەین:

### أ- بێش بۆ هێلا ئاسنی یا حیجازێ:

هزرا دانانا (هێلا ئاسنی یا حیجازێ) بۆ سالا (١٨٦٤)ێ دزڤریت، لێ وی دەمی دەستەلاتدارێن ئۆسمانی ژ دل کار بۆ ڤی پرۆژەی نەکر، لێ پشتی ل چارێکا داویێ یا سەدسالیا نۆزدێ سەرهلدان ل یەمەن زێدە بووین، دەستەلاتێن ئۆسمانی دەست ب بجهئینانا ڤی پرۆژەی کر و دوبارە ل سالا (١٨٩٨)ێ ئەو هزر پێشکێش کر کو ئارمانج ژێ گرێدانا دیمەشقێ بوو ب حیجازێ ڤە ب رێیا وێ هێلا ئاسنی داکو ببیتە ئەگەرێ وێ چەندێ دەولەتا ئۆسمانی ڤێ دەڤەرێ ژی بێخیتە بن کۆنترۆلا خۆ، ژ بەر هندێ، سولتانێ ئۆسمانی عەبدلحەمیدێ دووێ (١٨٧٦-١٩٠٩) ل رۆژا ٢ گولانا سالا (١٩٠٠)ێ مەرسوومەکا سولتانی بۆ بجهئینانا ڤی پرۆژەی دەرئێخست، پاشی دەولەتا ئۆسمانی ل ناڤخۆ و ل دەرڤە رێبەرییا هەوەکا جیهانی کر بۆ پشتەڤانی و هاریکاریا ڤی پرۆژەی کو دێ مفایێن ئابووری یێن مەزن بۆ هەمیان هەبن.[١٣٠]

دەڤەرا بەهدینان ژی بەهرا خۆ د پشتەڤانیکرنا ڤێ هێلا ئاسنی دا هەبوو، ئەڤە ژی ل دووڤ وان دەنگ و باسێن رۆژنامەیا (موصل) بەلاڤکرین و تێدا بەحسێ وان بێشان هاتییەکرن یێن ل دەڤەرا بەهدینان بۆ ڤی پرۆژەی هاتینەکۆمکرن، هەر بۆ نموونە رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٤/٢١)ێ دا دەنگ و باسەك بەلاڤکرییە و تێدا دبێژیت کو ل دووڤ داخوازیێن بەری نۆکە ناڤەندا ویلایەتێ بۆ قەزایێن ئامێدیێ و دهۆك هنارتین، گوژمێ (١١٢٨) قرش وەك بێش بۆ پرۆژێ ب ناڤێ (هێلا ئاسنی یا حیجازێ) هاتینە کۆمکرن و ڤێ حەفتیێ رادەستی لیژنا تایبەت ب وی ڤی بابەتی ڤە هاتییە کرن.[١٣١]

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/١٠/٨)ێ دا دەنگ و باسێ بەلاڤکرنا کارتێن تایبەت ب سەر خەلکێ دەولەتا ئۆسمانی بەلاڤکرییە بۆ کۆمکرنا بێشان بۆ هێلا ئاسنی یا حیجازێ، ل ڤێرە تشتێ

پەیوەندی ب دەڤەرا بەهدینانڤە هەی ئەوە ژ کۆما (٢٢٠٠٠) کارتێن تەرخانکری بۆ سنجەقا مووسل، (١٥٢٠٠) کارت بۆ قەزا مووسلن، (١٥٠٠) بۆ قەزا ئامێدیێ، هەر هند بۆ قەزا شنگال، (٢٠٠) بۆ قەزا دهۆك، (٨٠٠) بۆ قەزا زاخۆ و (١٠٠٠) بۆ قەزا ئاکرێ نە[١٣٢].

هەروەسا ئێکسەر د هژمارا دووڤدا یا رۆژا (١٩٠٣/١٠/١٥) ێ، رۆژنامەیا (موصل) دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێ (رێزگرتن) بەلاڤکرییە و تێدا دبێژیت کو ویلایەتا مووسل سۆزدایە بێش و بارەبوویان بۆ پرۆژێ هێلا ئاسنی یا حیجازێ پێشکێشبکەت، بەهرا قەزا دهۆك ژی ژ ڤێ هاریکاریێ (١٥٠٠٠) قرش بوون و لێژنا تایبەت یا ب ڤی کاری رابووی ١٥ قرش زێدەتر کۆمکرن ژ وی گوژمێ بریار ل سەر هاتبوو دان و رادەستی دەستەلاتێ کر، کو (مستەفا شەوقی ئەفندی) بریکارێ قائیمقامێ دهۆك و لێژنا پێکهاتی بۆ ڤێ مەسەلێ رۆلەکێ بەرچاڤ د وێ چەندێ دا هەبوون[١٣٣].

## ب- بێش بۆ لەشکەرێ ئۆسمانی:

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/٢/٢٥) ێدا دەنگ و باسەك بەلاڤکرییە و تێدا دبێژیت کو تەبایا گوژمێ پارەیێ ل قەزا دهۆك بۆ دیاریێن وەرزێ زڤستانێ یێ لەشکەرێ ئۆسمانیێ ل ویلایەتێن رۆم ئیلی (ئانکو ویلایەتێن ئەوروپی یێن دەولەتا ئۆسمانی) خڕڤەبووی ٥٠٠ قرش بووینە و رۆژنامەیێ لیستەکا درێژ ب ناڤێ وان کەسایەتییان بەلاڤکرییە یێن بێش پێشکێشی لەشکەرێ ئۆسمانی کرین[١٣٤]، رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/٤/٧)ێ دا هەر ئەڤ تشتە بۆ قەزا ئامێدیێ ژی گۆتییە و تێدا هاتییە کو بۆ پەیداکرنا دیاری یێن زڤستانێ بۆ هێزێن ئۆسمانی یێن ل رۆم ئیلی خڕڤەبووین، گوژمێ (٣٦٠) قرشان ژ ئامێدیێ وەك بێش گەهشتینە[١٣٥].

ل داویێ ژی هەر ل سەر مەسەلا بێشان بۆ لەشکەرێ ئۆسمانی، رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا (١٩٠٤/١٢/١٥)ێ دا دبێژیت کو کۆمەکا کەسان ل ویلایەتا مووسل بێش پێشکێشی فەیلەقا شەشێ یا لەشکەرێ ئۆسمانی کرینە کو بارەگەهێ وێ فەیلەقێ ل بەغدایە و ئەڤ ناڤێن ل خوارێ د ناڤ لیستا وان ناڤان دا هاتینە یێن ل دەڤەرا بەهدینان بێش پێشکێش کرین:

١- شێخ نور محەمەد ئەفندی ب گوژمێ ٢٧ لیرێن ئۆسمانی بێشداینە.

٢- حاجی ئاغا کو ئێکە ژ ماقوولێن زاخۆ ب گوژمێ ٢٧ لیرێن ئۆسمانی بێشداینە[١٣٦].

## ج- بێش بۆ دەڤەرێن لێقەومی:

وەسا دیارە دەڤەرا بەهدینان پشکداری د هەمی چالاکییێن دەولەتا ئۆسمانی دا کرییە و رۆژنامەیا (موصل) هندەك دەنگ و باسێن دی ل سەر بێشێن خەلکێ دەڤەرا بەهدینان بۆ دەڤەرێن ئۆسمانی یێن بەرهنگاری کارەساتێن سروشتی بووین بەلاڤکرینە ، رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/٣/٣٠) ێ دا دەنگ و باسەك بەلاڤکرییە و تێدا بەحسێ هاتنا بێشێن قەزا دهۆك بۆ خەلکێ (مدیە) [١٣٧]، (اکنە اطە) [١٣٨] و (اختە بولی) [١٣٩] هاتییە کرن کو گوژمێ (٨٠٠) قرشایە و بۆ لێژنا پەیوەندیدار هاتینە هنارتن، قائیمقامییا قەزا ناڤبری ژی لیستەك وەکی ل خوارێ دیار ب ناڤێن وان گوندان رۆهن کرینە یێن ئەو بێش پێشکێشکرین:

قرش

(٤٠٠) ژ خەلکێ خودان خیرەتێ ناحیا مزووری.

(٥٠) گوندێ کانی سپیێ

(١١٥) قەزا دهۆك

(٣٠) گوندێ ئێتویتێ

(٤٠) گوندێ شیزێ

(٤٠) گوندێ قەشەفرێ

(٣٠) گوندێ نەصیری (دبیت گوندێ نسرا بیت - ص -)

(٢٠) گوندێ سێمێلێ

(٢٠) عومەر ئاغایێ سەرۆکێ گەرگەریان

(٣٥) گوندێ سندۆرێ

(١٠) گوندێ باکۆزێ
(٤٠٠) گوندێ بادێ
(٨٠٠) سەرجەم[١٤٠]

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/٤/٧) ێ دا دەنگ و باسەکێ دی ل سەر ڤان بێشێن خەلکی بۆ لێقەومی یێن (اختە بولي) و (اکنة اطه) و جهێن دی بەلاڤکرییە و تێدا هاتییە کو قەزا ئامێدیێ (٤٠٠) قرش کۆمکرینە و بۆ خەلکێ وان دەڤەران هنارتینە[١٤١].

## شەش- دەنگ و باسێن جودا جودا:

رۆژنامەیا (موصل) هندەك دەنگ و باسێن دی ژی ل سەر دەڤەر بەهدینان بەلاڤ کرینە و دشێین د تەوەرێن خوارێ دا کورت بکەین:

### أ- سەربازکرنا ب زۆری (ئیلزامی):

ژ وان دەنگ و باسێن رۆژنامەیا (موصل) گرنگی پێدابن ئەون یێن بەحسێ سەربازکرن (سەربازگیری) یا ب زۆری ل دەڤەرا بەهدینان دکەن، رۆژنامەیێ قەلسی د ڤی بیاڤی دا نەکرییە و هەر تشتەکێ پەیوەندی ب ڤێ چەندێ ڤە هەبیت بەلاڤکرییە و د هژمارێن خۆیێن جودا جودا دا ئاماژە کرییە وان لیژنەیێن تایبەتێن ل قەزایێن بەهدینان دگەڕیان بۆ پشکنین و سەربازکرنێ.

رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٧/٢)ێ دا ئاماژەکرییە پرۆسێسا سەربازکرنێ ل قەزا شنگال و بەحسێ دەست ب کاربوونا لیژنا تایبەت کرییە بۆ پشکنینا وان یێن خزمەتا سەربازی ژێ دگریت و ب رێیا ب پشکهاڤێتنێ هاتینە ژێگرتن[١٤٢].

هەروەسا د هژمارا رۆژا (١٩٠٣/٧/٣٠)ێ دا رۆژنامەیێ دەنگ و باسێن رێکارێن پشکنینێ ل قەزا ئامێدیێ بەلاڤکرینە[١٤٣] و د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/١١/٥) ێ دا ژی ئاماژە کرییە وان رێکارێن پەیوەندی ب سەربازکرنێڤە هەبن ل قەزا ئاکرێ[١٤٤]، سەرباری قەزایێن زاخۆ[١٤٥]، دهۆك[١٤٦] و زێبار[١٤٧] ژی.

### ب- چاندن:

مەسەلا عەردێن چاندنێ و باج و رەهنکرنان (بارمتەکرنان) ژی ئالییەکێ گرنگ د رۆژنامەیا (موصل) دا ب خۆڤە گرتییە و د هژمارێن خۆیێن جودا جودا دا ئاماژەکرییە ڤی لایەنی، نەخاسمە ژی مەسەلا رەهنکرنا عەردی بۆ وەرگرتنا قەرزێ ژ حکۆمەتێ، هەر جار ژی مەسەلا ڤان رەهنکرنان وەسا ب داوی دهات کو حکۆمەت وی عەردی بفرۆشیت، داکو خودانێ عەردی بشێت پێ وی قەرزی بدەت یێ ژ حکۆمەتێ وەرگرتی، ئەڤە ژی هندەك حالەتن یێن رۆژنامەیێ بەلاڤ کرین:

رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٧/١٦)ێ دا گۆتییە کو بانکا چاندنێ هندەك عەرد دەستەسەرکرینە چونکی خودانێن وان ل دەمێ دەستنیشانکری قەرزێن خۆ نەداینە، کو ئەو ژی ژ گوندێن جودا جودانە و ناڤێ ئێك ژ وان (شەریف کورێ یاسین)ە و ئاکنجیێ گوندێ (رۆڤیا)یە و رووبەرێ عەردێ وی یێ دێم (٣١٧٥) دونەمە[١٤٨].

هەروەسا رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا رۆژا (١٩٠٤/٥/١٩) یدا ناڤێن گەلەك ژ وان کەسێن قەزایێن شنگال و تەلەعفەر بەلاڤکرینە یێن عەردێن وان یێن رەهنکری کەڤتینە بەر فرۆتنێ چونکی قەرزێن بانکا چاندنێ نەداینە[١٤٩].

ل زاخۆ ژی کێشەیا ڤان قەرز و رەهنکرنان رووداینە و رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/٩/١) یدا ئاگەهدارییەکا فەرمانگەها سزادانێن زاخۆ بەلاڤکرییە کو پەیوەندی ب فرۆتنا خانووبەران ڤە هەیە ب ئاوایێ سەرێکزێدەکرنێ د ماوێ (١٥) رۆژاندا ژ رۆژا دەرکەڤتنا ڤێ ئاگەهدارییێ، ئەو خانووبەرە ژی یێن (ئیبراهیم مەلا)یێ خەلکێ زاخۆنە، داکو پارێ هێژ مایە ل سەر وی بدەنە (نەجلا)یێ کو ئەو ژی خەلکا زاخۆیە، پاشی وێ ئاگەهدارییێ ناڤێن وان پارچێن عەردی یێن ئێخستینە بەر فرۆتنێ و جهێن وان ل زاخۆ و گوندێن سەر ب وێ قەزایێ ڤە دیارکرینە[١٥٠].

ل دهۆك ژی هەر ئەو ئارێشە هەبووینە و رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/١٢/٢٩)یدا ئاگەهدارییەك

ب ناڤێ (ئاگەهدارییەك ژ بانکا چاندنێ ل دهۆك) بەلاڤکرییە و تێدا هاتییە: بۆ وەرگرتنا گوژمێن پارەی ژ (حەننا کورێ حەنکۆ)یێ خەلکێ بازێرکێ دهۆك و (تۆما عەبدولمەولایێ مووسلی) ژ بانکا چاندنێ یا دهۆك وەرگرتین، بڕیار هاتەدان ئاگەهدارییەك بۆ فرۆتنا خانووبەرەیێ هەردو ناڤبرییان بهێتە بەلاڤکرن کو هەردوان وەك رەهن بۆ قەرزێ ناڤهاتی دانابوون کو ئەو ژی بیستانەکێ ب داروبارە ل بازێرکێ دهۆك ب خۆیە و توخیبێ وی بیستانی ل ناڤبەرا خانووبەرەیێن (مەنسوور)ێ بکر ل رۆژهەلاتێ و (نعمەت) ل رۆژئاڤایێ و (هورمز) ل باکوور و (رووبار) ل باشوورە ب گوژمێ (١٧٠٠) قرشان، ڤێجا هەر کەسێ بڤێت بکڕیت سەرەدانا فەرمانگەهێ بکەت بۆ رێڤەبرنا رێکاران ل دادگەها بەراهیێ یا دهۆك دگەل (رازیبوونێ) ب زێدەکرنا رێژا ٥٪ ێ ژ وی گوژمی[١٥١].

هەر ل سەر دهۆك رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٥/٤/٢٧)ێ دا دەقەك ب ناڤێ (ئاگەهدارییەك ژ بانکا چاندنێ ل دهۆك) بەلاڤکرییە و تێدا هاتییە: بۆ وەرگرتنا گوژمێن (محەمەد کورێ عەلی ئەفندی کورێ مستەفا ئەفندی)یێ ئاکنجیێ تاخێ (باب النبی) یێ مووسل قەرزکرین، بڕیار هاتەدان ئەو خانووبەرەیێ ناڤبری رەهنکری ب گوژمێ (٣٢٠٠) قرشان بهێتە فرۆتن، ئەو خانووبەرە ژی ل گوندێ (سید ظاهر) سەیزاری ل قەزا دهۆك، کو ژ دو پارچێن عەردێ دێم پێکدهێت و رووبەرێ وان (١٠٨) تغارە، ڤێجا هەرکەسێ ڤیانا کرینا وی خانووبەرەی هەبیت دگەل رازیبوونێ ب زێدەکرنا رێژا (٥٪)ێ، سەرەدانا فەرمانگەهێ بکەت بۆ رێڤەبرنا رێکاران ل دادگەها بەراهیێ یا دهۆك[١٥٢].

هەروەکی دیارە ژی، دهۆکێ پتر ژ هەر جهەکێ دی ئەڤ ئارێشە لێ هەبوویە و د رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٥/٥/١٨) ێ دا جارەکا دی پارچەیێن عەردی یێن رەهنکری ل گوندێ (نصیری) نسیرێ یێ قەزا دهۆك ئینانە بەر فرۆتنێ چونکی خودانێن وان قەرزێن ژ بانکا چاندنێ وەرگرتین نەزڤراندبوون و پتریا وان ژی ژ تیرەیا مەسیحی بوون[١٥٣].

## ج- باران:

دەنگ و باسێن سەقایێ بەهدینان ژی جهێ خۆ د رۆژنامەیا (موصل) دا هەبووینە، د گەلەك جهێن رۆژنامەیێ دا ئاماژە ب باران و لەهی و ئاڤرابوونێن دەڤەرێ هاتییە کرن، رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/٤/٧) ێ دا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانەکێ کوردی (باران) بەلاڤکرییە و ل دەستپێکێ سوپاسیا خودێ هاتییە کرن ژ بەر وێ بارانا هەیڤا ئاداری ل هەمی دەڤەرێن ویلایەتێ باری و بەحسێ گرنگیا وێ بۆ دەرامەتێن زڤستانێ هاتییە کرن، هەروەسا ل سەر چیایێن ئاکرێ و ئامێدیێ دهۆکێ ل باکوور ئاخفتییە کو بەفرێن زۆر ئەو چیا نخاڤتینە و بەحسێ گرنگیا وێ بەفرێ بۆ ئاڤا رووبارێ زێی و دیجلەی کرییە[١٥٤].

هەروەسا رۆژنامەیا (موصل) د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٤/٥/١٢) ێ دا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (ئاڤرابوون) ژ راگەهاندنەکا قائیمقامێ دهۆك ڤەگوهاستییە کو بەحسێ بارانێن بۆش کرییە و دبێژیت کو ئەڤ بارانێن بۆش بووینە ئەگەرێ وێ چەندێ ئاڤا رووبارێ د بەر دهۆکێ را دبۆریت گەلەك بۆش ببیت و ببیتە ئەگەرێ تێکدانا پشکەکا بیستان و چەمێن دکەڤنە بەر هەردو رەخێن رووباری و پشکا رەخێ دی ژی ب تمامی راکرییە و ژناڤبرییە، هەروەسا گەلەك تشت و کەل وپەلێن مالان دگەل خۆ برینە و هەتا بارەگەهێ قائیمقامیێ ژی بەرهنگاری ڤێ لەهیێ بوویە لێ چ زیان نەگەهاندینێ[١٥٥].

هەر د وێ هژمارێ دا رۆژنامەیێ بەحسێ گژلۆك (یان تەرگ) بارینێ و ژناڤبرنا دەرامەت و بیستانێن زاخۆ و رەخ ورویێن وێ کرییە[١٥٦]، هەروەسا رۆژنامەیا (موصل) د هندەك هژمارێن دی یێن خۆ دا هندەك دەنگ و باسێن دی ل سەر بەفربارینێ ل دهۆکێ بەلاڤکرینە[١٥٧].

## د- بەلاڤبوونا رۆژنامەیێ:

ژ وان دەنگ و باسێن رۆژنامەیا (موصل) ل سەر ئابوونەیێن خۆ بەلاڤکرین، دیار دبیت کو رۆژنامەیێ

خواندەڤانێن خۆ ل دەڤەرا بەهدینان هەبووینە، لێ دشێین بگەهینە وی ئەنجامی کو رۆژنامە تنێ ب فەرمانگەهێن حکۆمی یێن دەڤەرا بەهدینان یان ب ماقوولێن وێ دهاتە فرۆتن، ئەڤە ژی ب پشتبەستن ب ناسنامەیا لایەنێن پشکدار دگەل رۆژنامەیێ هەروەکی ناڤێن وان د بەرپەرێن وێ دا هاتین.

رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٢/٢٦)یێدا بەلاڤکریە کو قائیمقامیا شنگال ب سوپاسیڤە ئابوونا خۆیا رۆژنامەیا (موصل) هنارتیە چاپخانا ویلایەتێ[١٥٨]، هەروەسا د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٣/٨/١٣) ێ دا ئاماژە کرییە وێ چەندێ کو ئابوونەیێن رۆژنامەیا (موصل) یێن ل نك قەزا دهۆك کو یێن پار و ئەڤ سالەنە و (٨٥٥) قرشن هاتینە وەرگرتن و بۆ رۆژنامەیێ هاتینە هنارتن، رۆژنامەیێ سوپاسیا (مستەفا شەوقی ئەفندی) بریکارێ قائیمقامێ قەزا دهۆکێ کرییە ژ بەر هاریکاریا وی د ڤی بیاڤیدا[١٥٩]، هەروەسا رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا (١٩٠٣/٩/١٧)ێ دا ئاماژە کرییە ئابوونەیا رۆژنامەیێ ل هەردو قەزایێن شنگال و ئامێدیێ و گۆتییە کو گوژمێ (١٠٣٠) قرشان ژ شنگال و پتر ژ (١٠٠٠) قرشان وەك ئابوونەیێن ڤێ سالێ گەهشتینێ، ئەڤە ژی ب هاریکاریا (عزەت بەگ ئەفندی) قائیمقامێ شنگال و (عەبدوللا ئەفندی) قائیمقامێ ئامێدیێ[١٦٠].

ل سەر ئامێدیێ ژی رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٥/٣/٢٣)ێ دا بەحسێ هنارتنا گوژمێ (١٠٨٠) قرشان کرییە وەك ئابوونەیا رۆژنامەیا (موصل) ئەڤە ژی ب هاریکاریا (ئەحمەد بەگ ئەفندی)یێ قائیمقام و (ئەسعەد ئەفندی)یێ رێڤەبەرێ وێ یێ دارایی[١٦١].

ل داویێ ژی تشتێ پەیوەندی ب ئابوونەیێن رۆژنامەیا (موصل) ڤە هەی، د هژمارا خۆیا رۆژا (١٩٠٦/٢/١) ێ دا ئاماژەکرییە وێ چەندێ کو (ئاسف ئەفندی)یێ قائیمقامێ شنگال سۆزدایە د ماوەیەکێ کورت دا ئابوونەیێن رۆژنامەیێ بهنێریت و دێ شیانێن خۆ د وی بیاڤی دا ب کار ئینیت[١٦٢].

## ئەنجام:

ژ خواندن و پێداچوونا ناڤەرۆك و تەوەرێن رۆژنامەیا (موصل) یێن پەیوەندی ب دەڤەرا بەهدینان ڤە هەین ل دەستپێکا سەدسالییا بیستێ، دبیت بگەهینە هندەك ئەنجامان، ژ وانا:

١- رۆژنامەیا (موصل) ب پلا ئێکێ رۆژنامەیا دەنگ و باسان بوویە، چونکی رۆژنامەیا فەرمی بوویە و وی دەمی زمانحالا حکۆمەتا ویلایەتا مووسل بوویە، ژ بەر هندێ رۆژنامە ژ ڤی پەروازی دەرنەکەڤتییە کو بەحسێ بابەتێن هەستیار نەکەت یێن وی دەمی روی ب روی خەلکێ ویلایەتا مووسل ب گشتی و دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی دبوون، ژ وانا هەر بۆ نموونە: خەلکێ ڤێ دەڤەرێ چەوان دژیان؟ ژێدەرێ ژیارا وان چ بوو؟ ئەرێ ل بەهدینان بەرهنگاریا حوکمێ ئۆسمانی هاتییەکرن یان نە؟ لێ بابەتێن دی یێن وەکی ڤەکۆلین و هزری رۆژنامەیا (موصل) نە ژ دویر و نە ژ نێزیك چ بەحس نەکرینە، هەروەسا رۆژنامەیێ گۆتارەکا ب تنێ ژی بەلاڤنەکرییە بەحسێ لایەنەکێ دەستنیشانکرییێ ژیانا خەلکێ بەهدینان کرییت، رۆژنامە ژ وی پەروازی دەرنەکەڤتییە یێ حکۆمەتا ئۆسمانی بۆ دانای.

٢- سەرباری هندێ، دشیاندایە رۆژنامەیا (موصل) ب ئێك ژ ژێدەرێن کێم بهێتە ل قەلەمدان یێن بەحسێ دەڤەرا بەهدینان کرین د سەردەمەکێ وەسا دا کو هەتا پلەیەکا بلند ژێدەرێن نڤیسکی ل سەر دیرۆکا ڤێ دەڤەرێ چ هەبوونا خۆ نەبووینە، تشتێ ئەڤ رۆژنامە ژی پێ دهێتە جوداکرن ئەوە کو ڤێ رۆژنامەیێ ب هویری ل سەر دەنگ و باسێن فەرمی ئاخڤتییە وەکی دەنگ و باسێن: دامەزراندنان، لادانان، باج وخویکان، روودانێن تاوانکاری، کارەساتێن خورستی، کو دبیت ب ئاوایەکێ بەرفرەهـ و د ڤەکۆلینێن بهێت دا مفا ژێ بهێتە وەرگرتن دەمێ ل سەر دیرۆکا ڤێ دەڤەرێ دهێنە نڤیسین و زانیاریێن وێ دگەل یێن دی دهێنە هەڤبەرکرن و ل سەر بنەمایێ

وان زانیاریێن تێدا هاتین ئەنجامەك ب دەستڤە بهێت.

٣- هەروەکی دیارە حکومەتا ویلایەتا مووسل ب رازیکرنا ماقوولێن دەڤەرێ، ب رێیا شێخێن ئایینی و ئاغایێن عەشیرەتان کۆنترۆل ل سەر گەهێن ژیانێ ل دەڤەرا بەهدینان کرییە و ئەڤە رێیا ئێکانە بوو حکومەتا ئۆسمانی ب کار ئینای بۆ کۆنترۆلکرنا خەلکێ دەڤەرا بەهدینان، ڤێجا دەمێ پێداچوون ب وان دەنگ و باسان دا دهێتە کرن یێن رۆژنامەیا (موصل) بەلاڤکرین، دیار دبیت کو حکومەتێ پتریا پۆستێن بلند و گرنگ رادەستی شێخ و ئاغایان کرینە، خۆ هەکە هندەك جاران پۆست رادەستی وان نەکرین ژی، دبینین کو حکومەتێ ئەو ژ دەست خۆ نەکرینە، بەلکی داخواز ژ ڤی شێخی یان ئاغایێ هە کرییە هاریکاریێ د ڤی کار و ئەرکی دا بکەت، حکومەتا ئۆسمانی دزانی کو ب رێیا کۆنترۆلکرنا سەرۆك عەشیرەتێن دەڤەرێ، دێ شێت کۆنترۆلێ ل سەر هەمی گەهێن ژیانا دەڤەرێ ژی کەت.

## پاشبەند:

### پاشبەندا نمرە (١)

رۆژنامەیا (موصل) هژمارا (٧٦٩) یا رۆژا ١٩٠٥/١/٥ێ ئاگەهدارییەك ژ فەرمانگەها سزایێن دادگەها لێزڤرینێ یا ویلایەتێ

رۆژا ١٠ ی کانوونا دووێ یا ١٣١٩ (ئانکو رۆژا ٢٣ ی کانوونا دووێ یا ١٩٠٣ ێ) هژمارکا گونەهباران هێرش کرە سەر گوندێ (شاخکێ)، ب ئنیەتا کوشتنێ ب چەکی خۆراکێشاینە تاهر ئاغا و هەڤالێن وی، گونەهبار ژی خەلکێ گوندێ (پیرومەرا)یا سەر ب ناحیا (داودیێ)نە و ئەو ژی ئەڤێن خوارێ نە: رەشۆ کورێ فندی، عومەر کورێ یوسف، ئەڤدال کورێ یوسف، ئۆسمان کورێ بدی، جبکۆ کورێ سلۆ محەمەد، یەزدین کورێ ئیسماعیل، شەمو کورێ خاتونە، عەبدولرەحمان کورێ جندی، خەنجو کورێ محەمەد، عەلۆ کورێ محەمەد، محەمەد بتیال، ئۆحو کورێ مەسیحی، شتۆ کورێ نزۆ، حاجی کورێ تەمەر، سیسی کورێ خەسلە، جاسم کورێ عیسا، معەز کورێ یەحیا، عەبۆ کورێ نعمەت، حسێن کورێ محەمەد، عەزیز کورێ خەسلە، حسێن کورێ خەسلە، ئیسلام کورێ بدی، یبلك کورێ خەسلە، مستەفا کورێ مەلا نعمان، حەسەن مامێ موختاری و عیسا، سالح کورێ ئیبراهیم، عیسا کورێ عەبێ، نزۆ کورێ ئیبراهیم، عەبدلرەحمان کورد کورێ سلۆ، ئەحمەد کورێ محێ، عومەر کورێ بەدی، عەلۆ کورێ بەدی، محمەد کورێ خاتوینێ، ئیسماعیل کورێ سلۆ، حەسەن کورێ محەمەدێ خاتوینێ، حەسەن کورێ محەمەد، جادر کورێ ئیبراهیم، محمەد برازایێ نزۆ عەبدلرەحمان، ئۆحۆ کورێ سەعدون، قادر برایێ نزۆ، شێخۆ کورێ ئیبراهیم.

گونەهبارێن ناڤبری رەڤینە و هەتا نۆکە نەهاتینە دەستەسەرکرن، هەروەسا د بادەکا ڤەکۆلینێدا چ زانیاری ل سەر خولك و نیشانێن جوداکەرێن وان نینن، ب پشتەڤانیا ماددێ (٣٧١) یێ یاسایا بنەمایێن دادگەهکرنێن سزادانێ(قانون اصول المحاکمات الجزائیه)، سەرۆکاتییا (دادگەهێ) بریاردایە دەهـ رۆژان مۆلەتێ بدەتە وان ل بەرامبەری دادگەهێ ئامادەببن، لێ هەکە وان گوهداری نەکر، دێ ب ئاوایێ ئامادەنەبووی هێنە دادگەهکرن و دێ ژ مافێن مەدەنی هێنە بێ بەهرکرن و ملك و مالێ وان ژی دێ هێتە دەستەسەرکرن، هەڤدەم، هەر کەسێ جهێ وان بزانیت پێدڤییە زانیاریان ل سەر پێشکێش بکەت، پێدڤییە کارمەندێن جەندرمە و دادوەریێ ژی وان دەستەسەر بکەن و ئامادە بکەن و هەر ژ بەر هندێ ئەڤ بریارە دەرکەڤتییە.

### پاشبەندا نمرە (٢)

رۆژنامەیا (موصل) هژمارا (٧٣٦) یا رۆژا ١٩٠٤/٢/٢٥ێ

تەبایێ گوژمێ ل قەزا دهۆك بۆ دیاری یێن وەرزێ زڤستانێ بۆ هێزێن لەشکەرێ ئۆسمانی یێن خرڤەبووی ل ویلایەتێن رۆم ئیلی (ئانکو ل ویلایەتێن

ئۆسمانی یێن ل ئەوروپا):

گوژمێن ل قەزا دهۆك هاتینە کۆم کرن: قرش

(٤٠) قائیمقام ئیبراهیم بەگ.

(٢٥) ریڤەبەرێ دارایی رەشید ئەفندی.

(٢٠) شێخ نور محەمەد ئەفندی.

(٢٠) عەبدولعەزیز ئاغا.

(٢٠) موختارێ کانی سپیێ.

(٢٠) عەبدولعەزیز موختارێ زاویتە.

(٢٠) عومەر ئاغا سەرۆکێ گەرگەریان.

(٢٠) موختارێ گوندێ دلبێ.

(٢٠) موختارێ گوندێ زاوا.

(٤٠) موختارێن ئێتویتێ.

(٢٠) محەمەد ئیسماعیل گەرماوەلی (دبیت گەرماڤی بیت).

(١٥) عەبدلقادر ئەفندی نڤیسەرێ بانکێ.

(١٥) موختارێ فندۆ.

(١٥) حوسنی موختارێ بادێ.

(١٥) موختارێ غزە.؟؟؟؟

(١٢) خەزنەدار عەلی بەگ.

(١٠) نڤیسەرێ نڤیسیکاریێ (کاتب التحریرات)

خورشید ئەفندی.

(١٠) کارمەندێ سەرژمێریێ حسێن ئەفندی.

(١٠) سالح نەعمان ئەفندی.

(١٠) عەبدوللا عەلی ئاغا.

(١٠) محەمەد ئاغا ئەندامێ (جڤاتا) کارگێری.

(١٠) محەمەد نەعمان ئاغا.

(١٠) موختار ئیبراهیم ئاغا.

(١٠) کۆرۆ ئاغا.

(١٠) موختارێ مالتا ئیسلام.

(١٠) محەمەد حسێن.

(١٠) موختارێ مەمانێ.

(١٠) سادق مەرعان تزارکی (دبیت نزارکی بیت).

(١٠) موختارێ ئالۆکا.

(٧) حسێن فەتحی.

(٥) ئەحمەد ئەفندی.

(٥) حەیدەر ئاغا.

(٥) عەلی حسێن بەزاز.

(٥) حاجی مستەفا بەزاز.

(٥) تەحسیلدار جەلال بەگ.

(٥٠٠) سەرجەم.

## ژێدەر:


١. ڤەکۆلینەکا نوو ئاماژێ دکەتە وێ چەندێ کو رووبەرێ دەڤەرا بەهدینان بـ( ١٠٣٢٠ )کم٢ دهێتە تەخمین کرن، بۆ زانیاریێن زێدەتر ل سەر رووبەر و جهێ وێ یێ جۆگرافی و نەوەکئێکیا زانیاریێن ل سەر ڤێ چەندێ د ژێدەران دا، بەرێ خۆ بدە: کامیران عبدالصمد أحمد الدوسكي، بهدينان في اواخر العهد العثماني ١٨٧٦-١٩١٤، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، اربيل، ص٢٧-٣١.

٢. بنێرە: شرفنامة، ترجمة محمد جميل الملا احمد الروژبياني، ط٢، مؤسسة موكرياني للطباعة و النشر، اربيل- ٢٠٠١، ص ٥٣.

٣. بنێرە: فائق بطي، الصحافة العراقية: ميلادها وتطورها، (د.م)، ١٩٦١، ص١٤-١٥؛ د.إبراهيم خليل أحمد، نشأة الصحافة العربية في الموصل، جامعة الموصل، ١٩٨٢، ص٢٠-٢٣.

٤. بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: بادينان في سالنامات ولاية الموصل العثمانية، أ.د.خليل علي مراد و أ.د. عبد الفتاح علي البوتاني، الأكاديمية الكردية، أربيل، ٢٠١٣.

٥. بنێرە: رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٢٩)، ١٩٠٣/١٢/٢٤.

٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٧٧)، ١٩٠٢/١٠/١٦.

٧. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٢٢)، ١٩٠٣/١١/٥.
٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٢٩)، ١٩٠٣/١٢/٢٤.
٩. هەمان هژمار
١٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٣٠)، ١٩٠٣/١٢/٣١.
١١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٢٨)، ١٩٠٣/١٢/١٨.
١٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٧٦)، ١٩٠٥/٣/١٦.
١٣. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٣٧)، ١٩٠٤/٣/٤.
١٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٤٣)، ١٩٠٣/٤/١٤.
١٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٧٤)، ١٩٠٢/٩/٢٥.
١٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٩٤)، ١٩٠٥/٨/١٧.
١٧. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٩٦)، ١٩٠٥/٩/٢.
١٨.رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٨٠١)، ١٩٠٥/١١/٢.
١٩. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٦٣)، ١٩٠٢/٦/٢٦.
٢٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٩٥)، ١٩٠٣/٤/٢١.
٢١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٤٢)، ١٩٠٤/٤/٧.
٢٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٦٤)، ١٩٠٤/١١/٣.
٢٣. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٩٢)، ١٩٠٥/٨/٣.
٢٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٠٢)، ١٩٠٣/٦/٩.
٢٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٥٠)، ١٩٠٤/٦/٢٣.
٢٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٢٢)، ١٩٠٣/١١/٥.
٢٧. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٦٥)، ١٩٠٤/١١/١٠.
٢٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٦٩)، ١٩٠٥/١/٥.
٢٩. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٧٠)، ١٩٠٥/١/١٩.
٣٠. هۆسا د دەقێ دەنگ و باسی دا هاتییە.
٣١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٦٥)، ١٩٠٢/٧/١٧.
٣٢. هەمان هژمار.
٣٣. هۆسا د دەقێ دەنگ و باسی دا هاتییە، دبیت (خۆجە) بیت.
٣٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٧٩).
٣٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٨٠٧)، ١٩٠٦/١/١٨.
٣٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٩٣)، ١٩٠٣/٤/٢.
٣٧. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٧١٦)، ١٩٠٣/٩/٢٤.
٣٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٦٤)، ١٩٠٤/١١/٣.
٣٩. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٧٦)، ١٩٠٥/٣/١٦.
٤٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٨١)، ١٩٠٥/٤/٢٠.
٤١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٨٠٤)، ١٩٠٥/١٢/٢١.
٤٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٦٥)، ١٩٠٢/٧/١٧.
٤٣. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٦٧٤)، ١٩٠٢/٩/٢٥.
٤٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٦٤)، ١٩٠٤/١١/٣.

٤٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٦٩٢)، ١٩٠٣/٣/٢٦.
٤٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٧٣)، ١٩٠٥/٢/٢٣.
٤٧. بنێرە: رۆژنامەیا (موصل)، هەردو هژمارێن (٧٤٣)، ١٩٠٤/٤/١٤ و (٧٥٠)، ١٩٠٤/٦/٢٣.
٤٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٩٠)، ١٩٠٣/٣/٥.
٤٩. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٩١)، ١٩٠٣/٣/١٩.
٥٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٧٢٥)، ١٩٠٣/١١/٢٦.
٥١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٢٦)، ١٩٠٣/١٢/٣.
٥٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٣٣)، ١٩٠٤/١/٢١.
٥٣. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٩٢)، ١٩٠٥/٨/٣.
٥٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٧٩٦)، ١٩٠٥/٩/٢.
٥٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٨٠٠)، ١٩٠٥/١٠/١٩.
٥٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٩٢)، ١٩٠٣/٣/٢٦.
٥٧. هەر بۆ نموونە بنێرە: رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٩٤)، ١٩٠٥/٨/١٧.
٥٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٦٥)، ١٩٠٢/٧/١٧.
٥٩. هەر ئەو هژمار، هەروەسا هژمار (٧٨٦)، ١٩٠٥/٦/١.
٦٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٨٧)، ١٩٠٥/٦/٧.
٦١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٦٤)، ١٩٠٢/٧/٣.
٦٢. هەتا سالا ١٩٠٤ێ ئەلکویش (القوش) سەر ب دهۆك بوو، بەرێ خۆ بدە رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٣٤)، ١٩٠٤/٢/٤.
٦٣. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٦٥)، ١٩٠٢/٧/١٧.
٦٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٨٣)، ١٩٠٣/١/٣.
٦٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٥١)، ١٩٠٤/٦/٣٠.
٦٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٧٧)، ١٩٠٥/٣/٢٣.
٦٧. رۆژنامەیا (کوردستان): ئێکەمین رۆژنامەیا کوردییە، ئێکەمین هژمارا وێ ل رۆژا (١٨٩٨/٤/٢٢)ێ ل قاهیرە دەرکەفتییە و ٣١ هژمار ژێ دەرکەفتینە کو هژمارا داویێ ل رۆژا (١٩٠٢/٢/١٤)ێ بوویە، بۆ زانیاریێن زێدەتر بەرێ خۆ بدە: هوگر طاهر توفیق، دور الصحافة الکوردیة في تطویر الوعي القومي الکوردي ( ١٨٩٨-١٩١٨)، دار سبیریز للطباعة والنشر، دهۆك، ٢٠٠٤، ص ١٣٩-٦٥.
٦٨. عەبدلرەحمان بەدرخان (١٨٦٨-١٩٣٦) کورێ بچویك یێ میر بەدرخان بەگێ یە، رۆژنامەیا (کوردستان) ژ هژمار شەش هەتا هژمارا داویێ کو هژمارا (٣١)ێ یە ل دەڤەرێن جودا جودا دەرئێخستینە، وەکی: جنێڤ، لەندەن، قاهیرە، بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: مالمیسانژ، رۆژنامەنووس و سیاسەتمەداری گەورەی کورد عەبدولرەحمان بەدرخان، وەرگێران : ئارام خدر قەلادزەیی، گوڤاری رامان، ژمارە(١٧)، هەولێر،١٩٩٧، ل١٣١؛ فەرهاد پیربال، رۆژنامەگەریی کوردی بەزمانی فەرەنسی، هەولێر، ١٩٩٨، ل.٤١-١٥
٦٩. رۆژنامەیا کوردستان، بنێرە: هژمارا (١٥) یا رۆژا (١٨٩٩/٨/٥)ێ، د: کوردستان یەکەمین رۆژنامەی کوردی( ١٨٩٨-١٩٠٢)، کۆکردنەوە وپێشەکی : د. کەمال فوئاد، بەغداد، ١٩٧٢.
٧٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٨١١)، ١٩٠٦/٣/٨.
٧١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٧٤)، ١٩٠٢/٩/٢٥.
٧٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٨٧)، ١٩٠٥/٢/١٢.
٧٣. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٠٢)، ١٩٠٣/٦/٩.
٧٤. هۆسا د دۆنگ وباسی دا هاتیە، دبیت گوندێ (کەشانێ) بیت.
٧٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٨٨)، ١٩٠٣/٢/١٩.

٧٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٨٠٤)، ١٩٠٥/١٢/٢١.
٧٧. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٦٤)، ١٩٠٢/٧/٣.
٧٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٨٣)، ١٩٠٣/١/٣.
٧٩. هەمان هژمار.
٨٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٨٦)، ١٩٠٣/٢/٣.
٨١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧١٢)، ١٩٠٣/٨/٢٠.
٨٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٧٢٤)، ١٩٠٣/١١/١٩.
٨٣. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٢٩)، ١٩٠٣/١٢/٢٤.
٨٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٩٠)، ١٩٠٥/٧/١٣.
٨٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٦٤)، ١٩٠٢/٧/٣.
٨٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٦٥)، ١٩٠٢/٧/١٧.
٨٧. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٦٧)، ١٩٠٢/٨/٧.
٨٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٦٦٨)، ١٩٠٢/٨/١٤.
٨٩. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٨٦)، ١٩٠٣/٢/٣.
٩٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٩٦)، ١٩٠٣/٤/٢٨.
٩١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٨٠٤)، ١٩٠٥/١٢/٢١.
٩٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٢٩)، ١٩٠٣/١٢/٢٤.
٩٣. د دەقێ رەسەن دا ب ئاوایێ (اقدل) هاتییە.
٩٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٦٨)، ١٩٠٤/١٢/٢٩.
٩٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٨٠٩)، ١٩٠٦/٢/١٥.
٩٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٩٠)، ١٩٠٣/٣/٥.
٩٧. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٠٤)، ١٩٠٣/٦/٢٥.
٩٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٠٩)، ١٩٠٣/٧/٣٠.
٩٩. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧١١)، ١٩٠٣/٨/١٣.
١٠٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧١٢)، ١٩٠٣/٨/٢٠.
١٠١. هەمان هژمار.
١٠٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٨٠٩)، ١٩٠٦/٢/١٥
١٠٣. سوارێن حەمیدی: سولتان عەبدلحەمیدێ دووێ ل سالا ١٨٩١ێ ئەڤ هێزێن نەنیزامی ژ کوردان پێکئینان و ب ناڤێ خۆناڤکرن و ئارمانج ژێ هەروەکی سولتانی ب خۆ گۆتی، بۆ بەرسینگرتنا رۆسی بوو ل رۆژهەلاتێ ئیمپراتۆریا ئۆسمانی، لێ ئەرمەنی وان هێزان ب وێ چەندێ گونەهبار دکەن کو سولتانی ئەو هێز ل سالێن (١٨٩٤-١٨٩٦)ێ د کۆمکوژێن ئەرمەنییان دا ب کار ئینایە، بۆ زانیارێن زێدەتر بنێرە: ماجد محمد زاخويي، الفرسان الحميدية، دهۆك، ٢٠٠٨؛ هوگر طاهر توفيق، الكرد والمسألة الارمنية، دار اراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠١٢، ص٢٠٨-١٨٣.
١٠٤. صديق الدملوجي، إمارة بهدينان الكردية او إمارة العمادية، تقديم ومراجعة: د.عبدالفتاح علي بوتاني، ط٢، دهۆك، ١٩٩٩، ص١١٢.
١٠٥. كاميران عبدالصمد الدوسكي، المصدر السابق، ص ١٠٧.
١٠٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٦٨)، ١٩٠٤/١٢/٢٩.
١٠٧. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٧٨٣)، ١٩٠٥/٥/٤.
١٠٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٧٥)، ١٩٠٥/٣/٨.
١٠٩. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٧١)، ١٩٠٥/١/٢٦.

١١٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٨٢)، ١٩٠٥/٤/٢٧.
١١١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٨٧)، ١٩٠٥/٦/٧.
١١٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٨٠٦)، ١٩٠٦/١/١١.
١١٣. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٧٦٩)، ١٩٠٥/١/٥، هەروەسا بنێرە تامامیا دەقێ دەنگ و باسی د پاشبەندا نمرە (١)دا.
١١٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٧٢)، ١٩٠٥/٢/٢.
١١٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٨٧)، ١٩٠٥/٦/٧.
١١٦. ل سەر ڤێ بابەتی بنێرە: هوگر طاهر توفیق، دور الصحافة...، بث ٦٨-١٤٠.
١١٧. بۆ نموونە بنێرە: رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٩٦)، ١٩٠٥/١/٥.
١١٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٠٠)، ١٩٠٣/٥/٢٦.
١١٩. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٠١)، ١٩٠٣/٦/٢.
١٢٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٠٣)، ١٩٠٣/٦/١٦.
١٢١. بنێرە رۆژنامەیا (موصل)، هژمارێن (٧٥٣)، ١٩٠٤/٧/١٤، (٧٧٢)، ١٩٠٥/٢/٢، (٧٨٥)، ١٩٠٥/٥/١٨، (٧٩٠)، ١٩٠٥/٧/١٣.
١٢٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٩٢)، ١٩٠٣/٣/٢٦.
١٢٣. حمل = (٥٠٠٠٠٠) قرش.
١٢٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٠٠)، ١٩٠٣/٥/٢٦.
١٢٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٠٢)، ١٩٠٣/٦/٩.
١٢٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٧٠٣)، ١٩٠٣/٦/١٦.
١٢٧. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧١٢)، ١٩٠٣/٨/٢٠.
١٢٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٧٣٦)، ١٩٠٤/٢/٢٥.
١٢٩. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٥٢)، ١٩٠٤/٧/٧.
١٣٠. بۆ زانیاریێن ثتر بنێرە: إبراهیم احمد أبو شوك، خطة سكة حدید الحجاز: المسوغات والآثار والنتائج، مجلة الإسلام في أسیا، الجامعة الإسلامیة العالمیة- مالیزیا، المجلد (٦)، العدد(١)، تموز ٢٠٠٩، ص١-٢٨.
١٣١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٩٥)، ١٩٠٣/٤/٢١.
١٣٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧١٨)، ١٩٠٣/١٠/٨.
١٣٣. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧١٩)، ١٩٠٣/١٠/١٥.
١٣٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٣٦)، ١٩٠٤/٢/٢٥، بنێرە تامامیا دەنگ و باسی د پاشبەندا نمرە (٢) دا.
١٣٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٧٤٢)، ١٩٠٤/٤/٧.
١٣٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٦٧)، ١٩٠٤/١٢/١٥.
١٣٧. دوو جهـ ب ڤێ ناڤێ(Medye) ل دەولەتا ئوسمانی هەنە، یێ ئێكێ قەزا (مەدیە) ل لیوا رۆژهەلاتێ (كلیسة) ل ویلایەتا ئەدرنە (كو ل ڤێرە ئەو مەبەستە)، یێ دووێ: ناحیەكە هەر ب وێ ناڤێ ل قەزا ئەرغنی ل دیاربەكرێ.
١٣٨. (ایكنە اطه): ناحیەكە سەر ب قەزا (دەمیركوی)یە ل لیوا قەرقلەر ئیلی مەلبەندی ویلایەتا ترافیا ل پشكا ئەوروپی یا دەولەتا ئۆسمانی.
١٣٩. (اختة بولي): قەزایەكە سەر ب لیوا (كلیسة)یە ئەدرنە، كو نۆكە ل ناڤ بولگاریایە.
١٤٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٤١)، ١٩٠٤/٣/٣٠.
١٤١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٤٢)، ١٩٠٤/٤/٧.
١٤٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٠٥)، ١٩٠٣/٧/٢.
١٤٣. ل دۆر ڤێ بابەتی بنێرە: رۆژنامەیا (موصل)، هەر چوار هژمارێن (٧٠٩)، ١٩٠٣/٧/٣٠، (٧١١)، ١٩٠٣/٨/١٣، (٧٨٦)، ١٩٠٥/٦/١، (٧٨٨)، ١٩٠٥/٦/٢٢.

١٤٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٢٢)، ١٩٠٣/١١/٥، هەروەسا هژمار (٧٧٦)، ١٩٠٥/٣/١٦.
١٤٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٥٥)، ١٩٠٤/٨/٤، هەروەسا هژمار (٧٧٩)، ١٩٠٥/٤/٦.
١٤٦. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٧٨)، ١٩٠٥/٣/٣٠، هەروەسا هەردو هژمارێن (٧٩١)، ١٩٠٥/٧/٢٠ و (٧٩٢)، ١٩٠٥/٨/٣.
١٤٧. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٨٥)، ١٩٠٥/٥/١٨.
١٤٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٧٠٧)، ١٩٠٣/٧/١٦.
١٤٩. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٤٦)، ١٩٠٤/٥/١٩.
١٥٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٥٨)، ١٩٠٤/٩/١.
١٥١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٦٨)، ١٩٠٤/١٢/٢٩.
١٥٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٨٢)، ١٩٠٥/٤/٢٧.
١٥٣. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٨٥)، ١٩٠٤/٥/١٨.
١٥٤. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٤٢)، ١٩٠٤/٤/٧.
١٥٥. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧٤٥)، ١٩٠٤/٥/١٢.
١٥٦. هەمان هژمار.
١٥٧. بنێرە: هەردو هژمارێن رۆژنامەیا (موصل): (٧٧٢)، ١٩٠٥/٢/٢ و (٨٠٦)، ١٩٠٦/١/١١.
١٥٨. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٦٨٩)، ١٩٠٣/٢/٢٦.
١٥٩. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧١١)، ١٩٠٣/٨/١٣.
١٦٠. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٧١٥)، ١٩٠٣/٩/١٧.
١٦١. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار(٧٧٧)، ١٩٠٥/٣/٢٣.
١٦٢. رۆژنامەیا (موصل)، هژمار (٨٠٨)، ١٩٠٦/٢/١.

# دەڤەرێن پارێزگەها دهۆك ل گوور دیتنێن گەڕوكێن رۆژهەلات و رۆژئاڤا

**د.عەبدولرحمان مزوری**
**ئەندامێ كارا یێ ئەكادیمیا كوردی**

## پێشەهی:

ئاشكارە گەلەك گەڕوكێن رۆژهەلات ورۆژئاڤا، دبەرێدا حەتا ئەڤرۆ سەرەدانا جهێن دەڤەرا دهۆك كرییە، باسی باژێڕ، رووبار، كەلهە، شوینوار، گوند، بەرهەمێن چاندنێ، رێ ورێبارێن وێ ... كرییە. دا ئەم بكارین پتر مافێ بابەتێ خۆ بدەینێ، دێ ل گوور كەڤناریا مێژویی بابەتێ خۆ دابەشكەین، ئانكو دێ ب سەدسالیێن مێژوویی ڤێراهێین. بو نمونە گەڕوكێن دسەدسالییا ئێكێ زاینیدا هاتینە دەڤەرێ، دێ بەری گەڕوكێن دسەدسالییا چارێ زاینیدا هاتین، هێنەباسكرن. دیسان ئەڤ ڤەكۆلینە دێ دەمەكێ مێژوییێ درێژ دەتەبەرخۆ، هەر ژ دەمێن بەری زاینی دەسپێدكەت، حەتا سەدسالییا بیستێ زاینی، درست حەتا سالا ١٩٧٠، سالا داننانا حكۆمەتا عیراقێ ب مافێ ئوتونومیێ مللەتێ كورد.

## سەدسالییا پێنجێ ب.ز:

زەینوفون Xenophon قوماندارێ لەشكەرێ دەهـ هزاریێ یونان بوو، لەشكەرێ بۆ پشتەڤانییا شاهێ ئەخمینی كوروشێ بچووك، دژی برایێ وی داریوشێ دوێ (٤٢٤-٤٠٤ ب.ز) هاتییە ناڤەراستا عیراقێ، دەوروبەرێن بەغدا و فەلوجە. شەڕێ دنێڤبەرا هەردو برادا هاتییەكرن دبێژنێ كوناكسا Kunaxa. داریوش دشەڕیدا سەركەفت، كوروشێ بچووك هاتەكوشتن. زەینوفون لەشكەرێ خۆ دچیاییێن كوردستانێرا زڤڕاندە سەر زەریا رەش و پاشی یونان[١].

زەینوفون دپەرتووكا Anabasis دا، كو سالا ٤٠١ ب.ز نڤێسییە، باسی ڤی لەشكەرێ دەهـ هزاری دكە، ڤی شەڕی، ڤێ زڤڕینێ دكە. باسی مللەتێ كاردوخیKarduchen، Karduchoi كاردو/كوردو دكە[٢]، چەوان دگەلیەكێ تەنگدا، بەر و كەڤر ب سەر لەشكەرێ یونانیدا گرێلدكرن[٣]. هزر بۆ هندێ دچیت، ئەڤ گەلیێ تەنگ گەلیێ زاخۆ بیت، ب ڤان گوروڤان:

١. دخەریتا[٤] دگەل وەرگێڕا ئنگلیزیدا هاتییە بەلاڤكرن (ب ١٤)، رێیا لەشكەری پشتی باژێڕێ میسلا/میسلMescila، دگەل كنارێ رووبارێ دیجلە ناچیت، بەلكو دچیاییێن رۆژهەلاتێ دیجلەدا دچیت. وەرگێڕ دبێژێ، من ئەڤ خەریتەیە ژپەرتووكاA History of Greece یاجون باگنێل بوریJ. B. Bury وەرگرتییە. لەوان ب مكرتییەكا مەزن، لەشكەرێ زەینوفون دگەلیێ زاخۆ را/دگەلیێ سپی را، ل سەر پرا دەلالدا/پرا

کڤانکێشەکێ کورد، ژ پەرتووکا، بازگشت دەهزار یونانی/ب ٣٧٥



گریکی - رۆمانی دەربازبوویە.

٢. دخەریتا دگەل وەرگێرا عەرەبی ژی هاتییەبەلاڤکرن[٥]، دیسان رێ پشتی میسل Mescila، دگەل کنارێ رووبارێ دیجلەی ناچیت، دروژهەلاتێ ویدا دچیت[٦]، ئەڤەژی بۆچوونا مە مکومتر لێدکە.

٣. دلبا فارسی ژیدا، رێ پشتی میسل د رۆژهەلاتێ دیجلەی را دچیت. وەرگێرێ فارسی نڤیسییە: ئەڤ خەریتەیە ژ ئەتلەسا دیدال لابلاشDidal Laplace Atlas یافەرەنسی، هاتییەوەرگرتن[٧]. بەلکو پەرتووکا زەینوفون Anabasis، ئێکەمین ژێدەرێ مێژویی یە، باسی کوردێن دەڤەرا زاخۆ کری.

## سەدساليیا دوێ ز:

لوکیوس فلاڤیوس ئاریانوس L. F. Arrianus سیاسەتڤان ومێژوڤانەك گریکییە، نێڤبەرا ٨٥ ــ ١٤٥ز ژیایە. ژ پەرتووکێن وێن گرنگ: مێژوا هێرشێن ئیسکەندەرێ مەزنە (History of the Expedition of Alexander the Great).

ناهێتەزانین ئاریانوس ل کیڤە گەریایە، ئەوی زانیاریێن خۆ سەبارا شەرێن ئیسکەندەرێ مەزن ل ئاسیا و ئەفریقیا، ژ دو جەنەرالێن بلندێن وی وەرگرتینە. ژ ئەرستوبولوسێ کاسەندەری Aristobulos of Kassandreia وپتولیمیوسێ ئێکێ یێ لاهوتی Ptolemios I Soter ، کو بەردەوام دگەل ئیسکەندەری دگەریان و قادێن شەڕان دابوون، وەرگرتینە.

ئاریانوس نڤیسییە: دارا (داریوشێ سێ) لەشکەرگەها خۆ، ل گاوگامێلا Gaugamela نێزی رووبارێ بومادوسBumadus (ئانکو خازری)، ب دووراتییا ٦٠٠ ستادێن گریکی (١١١ کیلومەتران) دوور ژ ئەربیلا، دانا[٨]. ئاشکارە شەرێ ل ڤێدێ گاوگامێلا/گرگوملی نە هەولێر روودایە[٩].

## سەدساليیا چارێ ز:

ئەمیانوس مارسیلینوس Ammianus Marcellinus ئەفسەرەك ومێژونڤێسەکێ پایەبلندێ یونانی بوو، دسەدساليیا چارێ زاینیدا (٣٣٠- ٣٩٥ز) ژیایە. مێژو وبیرهاتنێن خۆ نڤێسینە. ژپەرتووکێن وی وەك:

1. 96-378The History of Rome
2. The Sections covering the Period 353-378[١٠].

مارسیلینوس دگەل قەیسەرێن رۆمانان پشکداری، دشەرێن دژی فارساندا کرییە و بیرهاتنێن خۆ دپەرتووك خۆدا توومارکرینە[١١].

مارسیلینوس نڤیسییە:

- دسەردەمێ قەیسەر یولیان/یولیانوس دF. C.

Julianus (٣٦١ - ٣٦٣ ز)، بریار هاتەدان رۆمانی دەڤەرا کوردوئینا Corduena داگیرکەن، لێ ژ بەر فارسان ژ بریارا خۆ لێڤەبون[١٢]. هێژا سالم ئەلئالوسی دبێژێ، رامان ژ کوردوئینا دەڤەرا چیاییا زاخۆ و ئامێدیێیە، ژ لیوا موصل[١٣]. یاراست کوردوئینا هەرێما چیایی یە، ئەوا ژ رۆژهەلاتێ ئامێدیێ دەسپێدکە، حەتا رۆژئاڤایێ ئامەدێ/دیاربەکرێ و دکەڤیتە ژێربیا زەریاچا وانێ، مینا دخەریتەبێن گریکی و رۆمانیدا هاتییەخۆیاکرن.

- شاهێ ساسانی شاپورێ دوێ (٣٠٩ - ٣٧٩ ز) ژ قەیسەرێ رۆمانی جوڤیان (٣٦٣ - ٣٦٤ ز) بازێرین: شنگار Singara، نسێبینNasibina ، موکسوئینا Moxoena (موکس)، زوبدیسناZubdicena (بازبدێ) ورەهامیناRehamene (رەها) بۆ ژێر فەروەربیا خۆ، خاستینە. قەیسەرێ ناڤبری رازیبوو ڤان بازێران، بژلی شنگار ونسێبینێ، بدەتە ساسانیان[١٤].

## سەدسالییا دەهێ ز:

١. ئەبو دولف موسەعەر بن موهەلهەل ئەلخەزرەجی، گەرۆکەکێ عەرەبە دسالێن ٩٥١ - ٩٥٢ز ل کوردستانێ گەڕیایە، نڤیسییە:

- عەشیرەتا (جەلالی)[١٥] ب تەنشت بازێرێن ئامێدیێ و ئاکرێ ڤە ئاکنجیبوو. دیسان نڤیسییە، چیایێن (داسن) تا وەلاتێ ئەرمینیا درێژدبن[١٦]. ئاشکارە پرانییا زێدەرێن جیوگرافی و مێژویی دبێژنە هەمو چیایێن ژووربیا موصل، چیایێن دهۆک، ئاکرێ، زاخۆ، ئامێدیێ، چیایێن داسن[١٧].

٢. ئیبن حەوقەل، محەمەد کوڕێ عەلیێ نەصیبی، سالا ٣٦٧ک/٩٧٧ز چوویەبەر دلوڤانییا خۆدێ. ٣٠ سالان ژ رووبارێن پێنجاب و سند بگرە، حەتا مەغربا عەرەبی، حەتا بولگار، ڤولگا و خەزەر ... گەڕیایە. نیڤشکێ گەریانێن خۆ دپەرتووکا خۆ (صورة الارض)دا بەلاڤکرینە.

ئیبن حەوقەل نڤیسییە:

- دەڤەرا مەرگەهێ (المرج) ئەوا دکەڤیتە نێڤبەرا شێخان و ئاکرێ، دەڤەرەکا بەرفرەها تژی چاندنە، پەز و کەواڵە، چێل و گایە، هێستر وبارگیرە. باهەدرا/باعەدرێ تژی دەخل و دان و داهاتە. مالتایێ و پێشابورێ دو هەرێمێن پڕ بهانە، ب چاندنێ، داهاتی و بازرڤانیێ ناڤدێرن[١٨].

٣. ئەلمەقدسی، محەمەد کوڕێ ئەحمەد کوڕێ ئەبوبەکر (٩٤٦ -١٠٠٠ز) ژیایە. ل پرانییا وەلاتێن مووسلمانان وەک: عیراقێ، شامێ، ئاسیا بچووک، نیڤ گراڤا عەرەبی، خۆراسانێ، فارس، پێنجاب ... گەڕیایە. دیتنێن خۆ دپەرتووکا خۆ (احسن التقاسیم فی معرفة الاقالیم)دا کوومکرینە.

ئەلمەقدسی نڤیسییە:

- مەعلتایا/مالتایێ ب پیشەسازیا شیرەمەنی و ب هنارتنا گوشتێ هشککری ناڤدێرە. مزگەفتا وێ ژی، ل سەرێ گرەکی هاتییەئاڤاکرن[١٩].

حەسەنیە ژی ئانکو زاخۆ، ب پیشەسازیا پەنیری، کەشکا، مەئیژا و فیقیێ هشککری، دیسان ب هنارتنا کەوان و چیچەلوکان ناڤدێرە[٢٠].

## سەدسالییا دوازدێ ز:

## ١. یاقوت کوڕێ عەبدوڵایێ حەمەوی (١١٧٨ - ١٢٢٨ز).

بازرگان بوو، ب رێیا بازرگانیێ کەنداڤێ عەرەبی، شام وستانبول ... دیتن. پاشی ئەڤینا گەڕیانێ کەتە دلی، چو ئاسیا بچووک، کوردستانێ، ئیرانێ، خۆراسانێ، ئەفغانستانێ، فەلەستینێ ومصرێ ژی ... هتد. گەڕیانێن خۆ دپەرتووکا خۆ (معجم البلدان)دا توومارکرینە.

یاقوتێ حەمەوی ئەڤ بازێر وکەلهە ... ل دەڤەرا دهۆک نڤێسینە:

- ئاشب: کەلەکا گرنگا هەکاریانە، دکەڤیتە دەڤەرا موصل. (عیمادەلدین) زەنکی کوڕێ ئاق سونقەر (١١٢٧- ١١٤٦ز فەروەری گێڕایە) خرابکر. ل شوونا وێ و نێزی وێ کەلا ئامێدیێ ئاڤاکر، لەوان ناڤێ وی هلگرتیە[٢١].

- ئاکرێ: کەلەکا ئاسێیە، دکەڤیتە چیایێن

رۆژهەلاتێ موصل، دبێژنێ: ئاكرێیا حەمیدیان. ئاكنجیێن وێ كوردن. گەلەك زانا ژێ رابووینە، ژوان هەڤالێ مە محەمەد كورێ فەزلونێ ئاكرەیی[٢٢].

- ئامێدیێ: كەلەكا مەزن و ئاسێیە، دكەڤیتە ژووریا دەڤەرا موصل. سالا ٥٣٧ك/١١٤١ز عیمادەلدینێ زەنگی ئاڤاهیێ وێ نوكر. بەری هنگی ژی كەلەكا كوردان بوو، هندی یامەزن و بەرفرەهـ بوو خرابكر، زەنگی بناڤێ خۆ نوكر، بەرێ ناڤێ وێ ئاشب بو[٢٣].

- ئەردەمشت/ئەرمشتێ: كەلهەكا ئاسێیە، دكەڤیتە رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلە، سەر چیایێ جودی، ژووریا موصل. نهو ددەستێ میرێ موصل (بەدرەدین لولو) دایە. ل ژێریا وێ (یاراست ل رۆژئاڤایێ وێ) دێرا زەعفەران هەیە، ئەوژی كەلهەیە. دبێژنە كەلا ئەرمشتێ كەلا (كواشێ) ژی. نەگەلەك گوند ل بەر بەیاڤا وێنە، تنێ سێ بیستان هەنە. خەلكێ ئەرمشتێ سەردەمێ خەلیفێ عەباسی المعتضد بالله (٨٩٢- ٩٠١ز) یاخیبوون و خۆ دكەلهێدا ئاسێكر. خەلیفە بخۆ هاتێ، خەلكی كەلهە تەسلیمی خەلیفەی كر، ئەوی ژی كەلهە خرابكر. میرێ حەمدانی ئەبو تەغلوب ئەحمەد كورێ حەمدان جارەكا دن ئاڤاكرەڤە. نهو ل سەردەمێ مە (سەردەمێ نڤێسەری) یائاڤایە و ددەستێ بەدرەدین لولو دایە[٢٤].

- دێرا كەلب (دێرا قەشەفرێ): دكەڤیتە دەڤەرا موصل، نێڤبەرا باعەدرێ و جزیرا بۆتان. گەلەك ناووسك، شكەفت[٢٥] و پەرستەر (روهبان) ل وێدێ هەنە. دێرێ گەلەك گوند و زەڤی هەنە[٢٦].

- داسن: چیایەكێ مەزنە دكەڤیتە ژووریا موصل، رۆژهـەلاتـێ رووبـارێ دیجلەی، گەلەك تیرە و تەخلیتێن كوردان لێدژین، دبێژنێ داسنی[٢٧].

- حەسەنیە (زاخــۆ): باژێرەكە دكەڤیتە ژووریا موصل، دووراتی نێڤبەرا وێ وجزیرا بۆتان دو رۆژن ب پیا[٢٨].

- حەبتون: چیایەكە ل دەڤــەرا موصل، ناڤەكێ بیانییە، رەهێن وی دزمانێ عەرەبیدا تونە[٢٩].

- شوش: كەلەكا مەزنا گەلەكا بلندە، دكەڤیتە دەڤەرا موصل، نێزی باژێرێ ئاكرێیا حەمیدیان (عقر الحمیدیە). ژ كەلا ئاكرێ مەزنترە، لێ بها كێمترە. شوش ب هنارێن گوندەكێ خۆ دبێژنێ شەرملە (یاراست شەرمنە) ناڤدێرە[٣٠].

- عیمرانیە: گوندەكێ مەزنە و كەلهەكە ل رۆژهەلاتێ موصل، ب تەنشتا دەڤەرا شوشێ و مەرگەهێڤەیە (دنێڤبەرا واندایە). گەلەك گوندێن ب ترێ ناڤدێر، دكەڤنە بەربەیاڤێ وێ. كەلهە بەرف وێرانیێڤە دچە. شكەفتەك ل وێدێ هەیە دبێژنێ: شكەفتا دائود، خەلك دچنە سەرەدانا وێ[٣١].

- كواشێ: كەلەكا ئاسێیە ل چیایێن رۆژهەلاتێ (یاراست ژووریا) موصل. چ رێ ناچنێ، رێیەكا زراڤا ئێك مرۆڤی نەبیت. ناڤێ وێ یێ بەرێ كەلا ئەرمشتێ بوو، كواشێ ناڤێ وێ یێ نوویە[٣٢].

- مەعلتایا/مالتایێ: باژێركەكە ناڤێ وی دنووچەیێن ڤێ داویێدا، تێ[٣٣]. دكەڤیتە نێزی جزیرا بۆتان، ل دەڤەرا موصل[٣٤].

- هرور: كەلەكا ئاسێیە ل دەڤەرا موصل، نێڤبەرا وێ و موصل ٤٥ فەرسەنگە[٣٥]. ژ كەلهێن دەڤــەرا هەكاریبا. كانێ مومیا[٣٦]و ئاسنی لێهەیە. باژێرەكێ تێر ئاڤە، تێر بەر و بەرهەمە، تێر هنگڤینە[٣٧].

## ٢. بنیامینێ تطیلی Benjamin of Tudela:

بنیامین كورێ یونە تودلیێ ئەسپانی، دسالێن ١١٦٥ - ١١٧٣ز گەریایە. دگەریانێن خۆدا چوویە قوبرس، فەلەستینێ، شامێ، ئاسیا بچووك، كوردستانێ، عیراقێ، نیڤ گراڤا عەرەبی، ئەسیوبیا، مصرێ، فارس، هندستانێ ... تا چینێ. گەریانا خۆ ب زمانێ عبری نڤێسییە، پاشی بۆ زمانێن دن هاتییەوەرگێران.

بنیامین نڤیسییە:

- بیست وپێنج هـزار جوهی ل ئامێدیێ دژین.

جوهیێن دەڤەرێ ب زمانێ تەرجومێTargum[٣٨]، زمانێ ئارامیا رۆژهەلاتی دئاخڤن. گەلەك زانا و تێکەهشتی ژ ناڤ وان رابوینە[٣٩].

- فیتنەیا دائودێ کورێ روحی[٤٠]، ل ئامێدیێ روودایە. ئەڤە کورتیا وێ یە: بەری دەهـ سالان روودایە. دائودی ل بەغدا خاندیە، شەرەزایی د تەوراتێدا، تەلمودێدا، زمانێ مووسلمانادا و گەلەك زانیاریێن دندا، پەیدا کریوو.

دائودی خۆکرە مەسیحێ درەوین، دگو خۆدێ ئەزێ بۆ رزگارکرنا قودسێ هەلبژارتیم. گەلەك جوهیێن ساکار ب دوکەتن، نەمازە ل چیایێن حەبتون[٤١]. دەنگێ پێغەمبەراتیا وی گەهشتە شاهێ عەجەمان[٤٢]، رەشەکێن شاهی ئەو گرت و هاڤێتە د گرتیخانا تەبەرستانێدا[٤٣]، ل سەر رووبارێ قزل ئوزەن. دائود ژ گرتیخانێ رەڤی، خۆ گەهاندە ئامێدیێ. میرێ ئامێدیێ وی دەمی زینەددین عەلی کورێ بەکتەکینێ سەلجوقی، دەهـ هزار دینار بەرتیل دانە خەزورێ دائودی، دا بکوژیت. شەڤەکێ دائودێ نڤستی بو، خەزورێ وی ئەو دجهارا کوشت وخەلك ژ بەلا وی رزگارکر.

## سەدسالیا سێزدێ ز:

مارکو پولو Marco Polo، ژنەمالەکا بازرگان بوو. بابێ وی و مامێ وی گەلەك جاران بۆ بازرگانیێ گەهشتینە بوخارا، جارەکێ ژی گەهشتن پەکین. سالا ١٢٨٩ز پاپای مارکو، بابێ وی نیکولو، مامێ وی ماتیئو، دگەل دو قەشا بۆ چوونا چینێ، هەلبژارتن. باب و مامێ وی ل ئاسیا ناڤەراست، ب رێ‌یا ئاڤرمیشی ڤەگەریان ئیتالیا. مارکو گەهشتە چینێ. پشتی سێ سالان، سالا ١٢٩٢ز مارکو ژچینێ ڤەگەریا بازێرێ خۆ ڤینیسیا ل ئیتالیا. ل جەنەوا هاتەگرتن، دزیندانێدا هەڤالەکێ وی سەرهاتیێن گەریانێن وی سالا ١٢٩٨ز نڤیسین.

مارکو پولو نڤیسییە:

- ل چیایێن موصل خەلکێ کورد دژین. هنەك ژ کوردان کریستیانێن نستوری و یەعقوبینە، هنەك ژی مووسلمانن[٤٤]. ئاشکارە چیایێن موصل، ئانکو چیایێن بەهدینان، چیایێن ئاکرێ، شێخان، دهۆك، ئامێدیێ و زاخۆ.

## سەدسالیا چاردێ ز:

شێخ ئەلرەبوە، محەمەدێ کورێ ئەبو تالبێ دیمەشقی. نێڤبەرا ١٢٥٦- ١٣٢٧ز ژیایە. ل وەلاتێ شامێ، حیجازێ و عیراقێ گەریایە، گەلەك ل باژێرێ صەفەد ل فەلەستین ژیایە، ل وێدێ ژی چوویەبەر دلوڤانیا خۆدێ. ناهێتەزانین کەنگی پەرتووکا خۆ (نخبة الدهر..) نڤیسییە.

شێخ ئەلرەبوە دەڤەرێن باهەدرێ/باعەدرێ، مورج جوهەینە/مەرگەها نێڤبەرا ئاکرێ و شێخاندا، حەسەنیە/زاخۆ ... ژهەرێما موصل هژمارتینە. دیسان نڤیسییە: حەسەنیە ل سەر رووبارێ خابورە، ل سەر خابوری پرەك هەیە، ژ لایێ هۆنەرێ ئاڤاکرنێ وبلندیێڤە، ژ پرێن ئەنتیکەیێن جیهانێ‌یە[٤٥].

## سەدسالیا شازدێ ز:

### ١. موتراقی زادە، نەصوح ئەفندی کورێ عەبدوللا قەرەکوز:

سالا ١٥٦١ز چوویەبەر دلوڤانیا خۆدێ. موتراقی زادە مینا ئەولیا چەلەبی، دگەل لەشکەرێن ئوسمانلی ب قوماندارییا سۆلتان سولەیمانێ قانونی سالا ١٥٣٤ز بۆ گرتنا عیراقێ و شەرێ ئیرانێ، دژێریا کوردستانێ‌را بوریە. سۆلتانی ل وانێ داخوازا هاریکارییا میرێ ئامێدیێ بەهرام بەگێ کورێ سۆلتان حوسێنێ وەلی (١٥٣٣ - ١٥٧١ز) کرییە، ئەوژی دهەوارا سۆلتانی چوویە.

موتراقی زادە دبێژێ، بەهرام بەگ کەسەکێ ناڤدارێ کوردە، خۆدان شیانە، ل پێشییا میرێن مەردە، ستوونا گرگرە و ماقولانە. بەهرام بەگێ ٣٠٠ سوار هنارتنە خزمەتا سۆلتانی. موتراقی زادە دپەسنێن واندا نڤیسییە: سوارێن پەهلەوانن، دهۆنەرێ شەرێدا شەرەزا و چەلەنگن، رم هاڤێژن و گەرناس[٤٦]... ئەڤە بەلگەیە کو لەشکەرێ میرگەها بەهدینان، گەلەکێ رێکوپێك بوو، چاکێ مەشقپێکری بوو، لەوان بوویە جهێ پەسنێن موتراقی زادە.

### ٢.جون کارترایت J. Cartwright ،

گەرۆکەکێ ئنگلیز بوو، سالا ١٦٠٠ز ل گەلەك

دەڤەرێن کوردێن دەولەتا ئوسمانلی وەك مزگینەر Preacher گەڕیایە، دیتنێن خۆ دپەرتووکا خۆدا The Preachers Travels بەلاڤکرینە.

کارترایت باسی عەشیرەتا خالتی Khaliti یا ئێزدی دکە و دنڤێسە: ل بەدلیس، باتمان، شنگار و شێخان دژین. هنەك کەسێن وان رێگر و تالانکەرن[٤٧].

## سەدساليیا هەڤدێ ز:

### ١. سبستیانێ ئیتالی Sebastiani.

دگەڕیانێن خۆدا نێڤبەرا ١٦٥٦- ١٦٦٤ز چار جاران د عیراقێ را هاتیە و چوویە، تایبەتی دەمێ د چو هندستانێ. سبستیانی گەشت بۆ ئەلمانیا و زەریا ئیجە ژێ کرینە. پڕانییا گەشتێن وی بۆ کاروبارێن مزگینەریێ (تەبشیرێ) بوون. ب فەرمانێن کەنیسا کاتولیکیا رۆما گەشتدکرن، گەشتێن خۆ دپەرتووکەکا دو پرتیدا، بن ناڤێ: Speditioni all Indie orientali di monsignor سالا ١٦٦٦ز ب زمانێ ئیتالی، بەلاڤکرینە.

سبستیانی نڤیسیە: نستۆریان پەترەکەك Patriarch ل گوندێ (ئەلقوش) نێزی موصل هەیە. ئەو خۆ ب کاتولیك و بابلی دزانن[٤٨]. ئەلقوشAlcus دکەڤیتە چیایێن کوردان (چیایێ باعەدرێ). ئەو جهێ ناحوم Nahum پێغەمبەری یە، ئەوێ ب ئەلقوشی Elcuseo ناڤدێر[٤٩].

### ٢. ئەولیا چەلەبی

Evliya Chelebi (١٦٥٤ز، ١٦٧٢ -١٦٨٠ز).

کوڕێ دەروێش کوڕێ محەمەد ئاغایێ زیلی یە (ظلی). دنێڤبەرا ١٦١١ ــ ١٦٨٤ زاینیدا ژیایە، گەڕیانێن خۆ دنێڤبەرا ١٦٤٠ ــ ١٦٨٠ز کرینە. مە مفا ژ گەڕیانا سالا ١٦٥٤ز ئەوا بۆ کوردستانێ کری و گەڕیانێن وی یێن بۆ وەلاتێن مصرێ، سودانێ و حەبەشە دسالێن ١٦٧٢ ــ ١٦٨٠ز کرین، نەمازە ژ فەصلێ بناڤێ: دەولەتا عەباسییا کوردی، دیتییە. گەلەك دەڤەرێن دەولەتا ئوسمانی ودەرڤەی وێ گەڕیایە. پڕانییا گەڕیانێن وی، وەکو نڤێسەر هەڤندێ لەشکەرێن دەسەلاتێ بوو. چوویە کوردستانێ، ئەزەربێجانێ، گورجستانێ، ئەرمینیا، نیڤ گراڤا قرم، گراڤا کریت، بلغاریا، بوسنە، هنگاریا، حیجازێ، مصرێ، سودانێ وحەبەشە ... هتد. گەڕیانێن خۆ دپەرتووکەکا دەهـ پرتدا بناڤێ Evliya Chelebi Syahatnamesi کوومکرینە.

ئەولیا چەلەبی نڤیسییە:

- دنێڤ کەلها (ئامێدیێ)دا، دو سەرەکانێن مەزنێن هەین، ئێك ــ سەر کوهنانی مەزرکان[٥٠]. دو ــ کانیا کەهیەخاتون. ئەڤ هەردو ئاڤە ژ چیایێ پەشیش (باراست بشێش Bishesh) دزێن، دبن پرا قوبەخاندا (باراست قوبەهاندا) دچن، (ل گوندێ برەهیم زلا) تێکەلی شەتی دبن[٥١].
- رووبارێ خیزل (هیزل) ژ چیایێن هیزل دزێ، (ل گوندێ چەم کورکی) تێکەلی خابور دبێ، خابور ژێ درێژیتە شەتی (شەتێ دیجلە). ژ چیایێن زاخۆ ب هزاران کانی دزێن، هەمو دبنە رووبارێ خابور، کورد سترانا پێ دبێژن وەك:

**چومە جزیرێ کەلەك بەردانێ**
**چومە خابوری خیڤەت ڤەدانێ**[٥٢]

- ئاڤا کواشێ، ئەرمشتێ، سەلوانە، سندی، زاخۆ ... ژ ئاڤێن ناڤدێرێن دەڤەرێنە. هەکە ئەم باسی ٧٠ کانیێن ژچیایێن کەلا (کواشێ) تینەخارێ بکەین، پەرتووکا مە دێ بیتە:کانی نامە[٥٣].
- سۆلتان سەلیم خان/سەلیمێ ئێکێ (١٥١٢-١٥٢٠ز)، ئامێدیێ دا مەلا ئدریسێ بەدلیسی (وەك والیێ وێ) حەتاحەتایێ، بریار پێ هاتەنڤێسین(ب٣٤).

سالا ٩٢٠ك/١٥١٤ز پشتی شەڕێ چالدیران، سۆلتان سەلیمێ (ئێکێ) بیقولی پاشا و مەلا ئدریسێ ئامێدی[٥٤]، دگەل سەدهزار لەشکەران هنارتنەسەر کەلا مێردینێ. پشتی دانوستاندنا ١١ رۆژان، کوردان کەل بێ شەڕ دادەست. لەشکەر پاشی بەرف شنگار چوو(ب٧٢).

- کوردێن زێباری، خالتی و چەکوانی هاڤینان تێنە زۆزانێن حەزو(ساسون)[٥٥].
- سالا ١٠٤٨ك/١٦٣٨ز یوسف خان فەرووەرێ دەڤەرا

(مزوری)، ئەچوو پیروزباهییا سۆلتان موورادێ چارێ دەمێ بەغدا (١٦٣٨) ستاندی. سۆلتان ژ ڤی کاری گەلەك غەیدی، فەرماندا مەلیك ئەحمەد پاشا لەشکەری ببەتە سەر دەڤەرا (مزوری). ئەولیا چەلەبی ژ زاردەڤێ مەلیك ئەحمەد پاشا، بۆ عەبدال خانێ بەدلیسێ ڤەدگێڕە، من ٧٠٠ کەس ژێ کوشتن، یوسف خان ژی ئەحمەد پاشا گو، من گرت و ب دیلی ئانی دیاربەکر، پاشی من ئازادکر و فەرمانڕەوایا وی زڤراندەڤە (ب١٤٩).

ئەولیا چەلەبی باسی پارێن بەرتیلێ ناکەت، ئەوێن مەلیك ئەحمەد پاشا ژ یوسف خان بەرامبەر ئازادکرنا وی وەرگرتین، کو ١٠٠ هزار کیسێن زیڤی بون(٥٦).

- میرگەها ئامێدیێ ل سەردەمێ سەیدی خان (١٥٨٥-١٦٢٩ز) ٤٠ هزار لەشکەر هەبون(٥٧).

## ٣. سێر پاول رایکوت
## (١٦٢٣-١٦٧٧ز) Sir P. Rycaut

ل گەلەك جهێن ئیمبراتوریا ئوسمانلی گەڕیایە، ل ئەزمیر، بورسە وستانبول ژیایە، پەرتووکەك بناڤێ: The History of the Turkish Empire from 1623-the year 1677 نڤیسییە.

رایکوت باسی ئێزدیێن ژووریا موصل دکەت، دبێژێ ناڤەندا سەرەکییا وان دێرەکا نێزی موصلە یان نەینەوایە، تێدا پەرستن و رێورەسمێن خۆ، ب تنێ و نیهانی دشکەفتەکێ ڤە دگێڕن. ئاشکارە رامانا نڤیسەری ژ شکەفتا دێر پەرستگەها (لالش)ە(٥٨).

## ٤. جێن باپتست تاڤرنێ
## (١٦٣٢ز). J. B. Tavernier

گەڕوکەکێ فەرەنسییە. ل ترکیا، جۆرجیا، ئەرمینیا، ئەزەربێجانێ، کوردستانێ، عیراقێ، ئیرانێ، هندستانێ، یابانێ، ژێریا ئەفریقیا ... گەڕیایە. دیتنێن خۆ دپەرتووکەکێدا بن ناڤێ: Les six Voyages ل پاریس سالا ١٦٧٦ز بەلاڤکرینە(٥٩).

- تاڤرنێ نڤیسییە: ژ جزیرا بۆتان بۆ ئامێدیێ دو رۆژن ب پیا. ئامێدیێ بازێڕەکێ خۆشە، خەلکێ دەوروبەران توتن و مازیێن خۆ دئینن بازارا وێ. بازێڕ دکەڤیتە سەرچیایەکێ بلند، خۆدان ب کێمتر ژ دو دەژمێران سەرناکەڤیتە کومتێ وی. دنیڤا رێ دا سێ ـ چار کانی ژێن کەڤران دزێن، خەلك تەرش و کەوالێن خۆ ل سەر ئاڤددەن، مەشکێن خۆ ژێ پڕدکەن، چمکی ئاڤ ل بازێڕی تونە. بازارەکا مەزن ل نیڤا بازێڕی هەیە، د دکانێن وێدا هەمی رەنگێن پەڕوك وبازرگانان هەنە. بەگەك (یوسف خان بەگ کورێ سەعید بەگێ ١٦٣٢-١٦٣٨ز) فەرمانڕەوایێ بازێڕی یە، دکاریت ٨-١٠ هزار سواران و هێزەکا پەیادان ژهێزێن بەگێن دن پتر، پەیداکەت، چمکی دەڤەرا وی ژخەلکی یاپڕ و هەمبزە(٦٠).

# سەدسالییا هەژدێ ز:

## ١. کارستن نیبور Karsten Niebuhr

نیبورێ ئەلمان دسالێن ١٧٦٥-١٧٦٦یدا، دگەل گرۆپەکا (پێنج) کەسی ژ زانایێن دانیمارك، ئەلمانیا وسوید پێکهاتبوو، ل کیستێ شاهێ دانیمارك فردریکێ پێنجێ، بۆ کاروبارێن ڤەکۆلینان، بەرف دەڤەرا رۆژهەلاتێ ناڤەراست هاتن. نیبور دگەڕیانا خۆدا گەهشتە: مصرێ، یەمەنێ، هندێ، چینێ، ئیرانێ، عیراقێ، کوردستانێ، سوریێ، فەلەستینێ و ئاسیا بچووك... دیتنێن خۆ دپەرتووکەکا دو پرتدا بن ناڤێ: Reisebeschreibung nach Arabien ل کوپنهاگن دسالێن ١٧٧٤-١٧٧٨ دا بەلاڤکرن.

نیبور نڤیسییە:

- ئامێدیێ کەلەکا ئاسێ یە، دکەڤیتە سەر چیایەکێ گەلەك لێژ (سەرنشیڤ)، گرتنا وێ زەحمەتە، ١٨ دەمژمێران (ب پیا) ژ موصل دوورە. میرێ ئەڤرۆ فەرمانڕەوایا وێ دگێڕێ دبێژنێ (بەهرام)(٦١)، ژ بنەمالا بەهدینانە (نڤیسییە Baldinau)(٦٢).
- ئامێدیێ ب ڤێڤێ دەولەمەندە، دهنێریتە دەوروبەرێن خۆ. کانگەهێن ئاسنی و قورقوشمی (رصاصی) لێهەنە، دئینتەدەر و مفایی ژێ وەردگریت (ب٢٩٥).
- ئاکرێ ل ژێر فەرمانڕەوایا میرێ ئامێدیێ یە، بازێڕکەك بچووکە ٧ - ٨ میلێن ئەلمانی(٦٣) ژ موصل

دووره. برنجی ل دەورەوبەرێن وێ دچینن، ب چاندنا وی ناڤدێره (ب٢٩٥).

- زاخــۆ ل ژێــر فەرمانڕەوایا میرێ ئامێدیێ بە. گوندەکێ بچووکە دکەڤیتە درێ یا نێڤبەرا موصل و جزیرا بۆتاندا. هنەك گوندێن دنێن بچووکێن هەین (دکەڤنە ژێر فەرمانڕەوایا ئامێدیێ) وەك: ناڤکور، دهۆك، شێخان، زێبار و سێمێل. پاشی نیبور سەرهاتییا کەسەکێ کورد (ل دەڤەرێن زومار وشنگار) ڤەدگێڕێ (ب٢٩٦، ٢٩٨).

- ئێزدی (داسنی) ل گوندێن عەبدولعەزیز دکەڤیتە سەر کنارێ راستێ زێی بەهدینان، پیر بەنوك، پیر حەلار، بەحزانی، مشرفا، دارهال، تل فسنە، کەسکێ، بێبوز، قەسرون (قەسروك)، بەعشیقە، بابیرێ، باعەدرێ، باهنداوا (باندەوا)، باقاق، بوزان، حەتارە (خەتارێ)، هەسن پیرکان، خانك، خرابوك، دهۆك، دارجوندی (دێرجوندیێ)، زاخۆ وسێمێل ... دژین. ئەم ب کەلەکێن ئێزدییان دەربازی رووبارێ زێ (بەهدینان) بوین. ئێزدی نەشێن ب سەربەستی و ئاشکەرا، رێورەسمێن خۆیێن دینی بکێرن، چمکی ترك سەربەستیێ نادەنە خۆدان دینێن بێ پەرتووکێن ئەسمانی (ب ٣٢٠ - ٣٢١، ٣٢٥، ٣٦٧، ٣٧٣).

## ٢. دومینیکو سیستینی
## D. Sestini (١٧٨١ز).

سیستینی ل ئیتالیا، سەقەلیا، ترکیا، سوریا، عیراقێ ... گەڕیایە. گەڕیانێن خۆ ب زمانێ ئیتالی بن ناڤێ: گەشتەك ژ قوستەنتینیە بۆ بەسرا/Viaggio da Costantinopoli a Bassora ل ئەکادیمییا ئەتروسك، سالا ١٧٨٦ز بەلاڤکرینە.

سیستینی نڤیسییە:

- سپێدێ زوو ئەم گەهشتینە زاخۆ ل سەر رووبارێ کارنیب Karnib. رووبار ل ڤێدێ گراڤەکێ (جـزیـرەکـێ) چێدکە، گوند دکەڤیتە د وێ گراڤێدا[١٤]. زاخۆ جهێ بەگەکێ کوردێ عەشیرەتا بەدیڤا Bediva یە (دوورنیە باتیفا یان بادینا بیت).

کورد، کلدان وجوهی ل زاخۆ دژین، کەلهەکا بچووك وپرەك ژچێکرنا فارسان (یاراست گریکان یا رۆمانیان) لێهەیە. باخ و رەزێن ترێ، هژیران، مژمژە و خۆخان ... ل زاخۆ هەنە. بەگێ کوردێ زاخۆ، ژ هەر دەوارەکێ کاروانییان ٣ قروشان وەك باج وەردگریت[٦٥].

- ل ئامێدیێ ئامانێن ئاخێ (ڤافکی) چێدکەن، خەلکێ موصل بۆ تەزیکرنا ئاڤێ مفایی ژێ دبینن (ب٣٢).

- تلسقوف گوندەکێ نستۆرییە، ژنێن وی شاشکا دکەنە سەرێن خۆ، مینا ڤالبێن شەکرێ نە ل جەم مە ئیتالیا. خەلکێ گوندی ژ دورونا دەخل و دانی خلاسببون، دەست ب ڤوناخا ڤوتانێ و جەنجەرکرنێ دکر. ب دووراتییا فەرسەنگەکی (شەش کیلۆمەتران) ژ موصل، گوندەکێ کوردان هەیە، پەرستگەهەکا پێغەمبەر یونان (یونس) ل وێدێ یە (ب٢٨).

## ٣. گلیوم ئولیڤێ
## G. Olivier (١٧٩٤-١٧٩٦ز).

گەڕوکەکێ فەرەنسییە، ل گەلەك وەلاتێن رۆژهەلاتا ناڤەراست گەڕیایە. هاتییە ترکیا، مصرێ، کوردستانێ، فارس، عیراقێ، سوریا و کریت. گەڕیانێن خۆ د پەرتووکەکا چار پرتیدا بن ناڤێ: Voyage dans i Empire Ottoman، i Egypte et la Perse دسالێن ١٨٠١- ١٨٠٧ ل پاریس بەلاڤکرییە.

ئولیڤێ نڤیسییە:

- رۆژا ١٥ نیسانێ ١٧٩٤ مە رووبارێ خازر بری، ئەم ژ موصل بەرف هەولێر دچووین. ناڤێ رووبارێ خازر دکەڤندا بومادوس Bumadus وبومیلوس Bumellus بوو. بارانێ رووبار بووشکربوو، لوکا ئاڤا وی بلند ببوو، دگەهشتە ٦٦٪ ژ زکێن هەسپان. پشتی دو دەمژمێران ئەم گەهشتینە سەر رووبارێ زێی (بەهدینان)، کو ژ رووبارێ سین (یێ فەرەنسی) زڤستانێ، بووشتر و بلەزترە. فارسێن کەڤن دگوتنێ زاباتوس Zabatus، یونانییێن کەڤن دگوتنێ Lycus لیکوس. کۆمەکا ئێزدییان بارێن مە دانان، بارێن مە ب کەلەکێن خۆ، هەسپێن مە ب مەلەڤانیان، دەربازی لایێ دنێ زێ کرن[٦٦].

- بژلی ئێزدییان کەسێ دن ل کەلەك (ئاسکی کەلەك) ناژیت. گوتنە مە گەلەك گوندێن ئێزدییان ل هەردو کنارێن زێ (بەهدینان) هەنە، هەر گوندەکی ئاغایێ خۆ هەیە. هنەك ژوان ل ژێر فەرووەریا پاشایێ موصل بوون، هنەك ل ژێر فەرووەریا پاشایێ بەغدا (ب٦١).

وان ئێزدییان تیتال وباوەرێن ئێزدیێن شنگار هەنە، چاندنێ دکەن، خۆدان پەز و کەوالن. کارێ گەلەك ژوان ب کەلەکێن خۆ، دەربازکرنا کاروانییانە. ئەو کاروانی ژ ئامێدیێ، جزیرا بۆتان (ئیبن عومەر)، موصل ... تێن و د چنە هەولێر، کەرکووك، شەهرەزور وبەغدا (ب٦١).

- ل ڤێدێ نێزی گوندەکی دبێژنێ گەوگامێلا[٦٧]، شەڕ نێڤبەرا ئیسکەندەرێ مەقدونی (٣٥٦ ــ ٣٢٣ ب.ز) وداریوشێ سێ (٣٣٦ ــ ٣٣٠ ب.ز) سالا ٣٣١ ب.ز رووداییە. دەمێ ئیسکەندەر هێرش بریە سەر داریوش، رووبارێ دیجلە ل لایێ دەستێ راستێ، چیایێن کوردان Gordien ل لایێ دەستێ چەپێ، وی بون (ب٦٢ - ٦٣).

## ٤. دومینیکو لانزا

### D. Lanza (١٧٥٣ - ١٧٧١ز).

ژ لایێ کەنیسا کاتولیکیا رۆماڤە هاتبوو موصل. دو جاران ل موصل ژیایە. جارەکێ نێڤبەرا ١٧٥٣- ١٧٦١، جارا دن نێڤبەرا ١٧٦٤-١٧٧١. بژلی موصل هەر بۆ کارێ خۆیێ دینی چوویە ستانبول، کیسرەوان ل لوبنان، فەلەستین، ئورفا، حەلەب ... هتد. لانزا گەرِیانێن خۆ ب زمانێ ئیتالی بن ناڤێ: مێژوا گەرِیانێن دومینیکو لانزا نێڤبەرا رۆما و رۆژهەلاتی ١٧٥٣-١٧٧١ز[٦٨] بەلاڤکرینە.

لانزا نڤیسییە:

- پار سالا ١٧٦٨ز میرێ کوردان ل ئامێدیێ، بەهرام پاشا چووبەر دلوڤانییا خۆدێ. بەهرام پاشا ب ژیری ومەردیێ ناڤدێر بوو. دەولەتا ئوسمانی دوژمنییا وی دکر، مرۆڤێن وی دژی وی پالددان، گەلەك داڤ بۆ ڤەددان، ئەو ب ژیری و هشیاریا خۆ رزگار دبوو. ئەوی ژی گەلەك دەولەتا ئوسمانلی نەدڤیا، خۆ د کەلها خۆدا ئاسێدکر، گوهێ خۆ نەددا پیلانێن دوژمنان[٦٩].

- پشتی بەهرام پاشا چوویە بەر دلوڤانییا خۆدێ، کورێ وی سماهیل پاشا جهێ وی گرت. ئەڤ پاشایە نە گەلەك ب دلێ خەلکی بوو. ئێك ژ مرۆڤێن وی دبێژنێ بەیرام بەگ[٧٠] دژی وی راوەستا، چو بەغدا بۆ وەرگرتنا هاریکاریێ. ئەڤە سیاسەتا ترکان بوو، پەیداکرنا فەرق و جوداهیێ، دا پتر پارا بخۆن.

پاشایێ بەغدا فەرمانا میراتییا بەیرام بەگ دا دەستی، کاغزەك بۆ میرێ قەلاچولان ژی نڤیسی، هاریکاریا بەیرام بەگ بکەت. هنەك کوردێن مووسلمان و هنەك ئێزدی ژی، دژی سماهیل پاشای راوەستان[٧١] (لێ یاخیبوونا وان هەمیان سەرنەکەفت وبێ ئەنجام بو)[٧٢].

- ئێزدی ل گوور خاندنا من (خاندنا لانزای)، پاشمایێ مانەویانە[٧٣].

## سەدسالییا نۆزدێ ز:

## ١. ئەدریەن دوپرێ

### A. Dupre (١٨٠٧-١٨٠٩ز).

دوپرێ گەلەك زمانێن رۆژهەلاتی دڤیان و فێربوو، ئەڤە بوو ئەگەرا گەرِیانێن وی ل رۆژهەلات. ئەو ل ترکیا، عیراقێ، ئیرانێ، کوردستانێ، ئەرمینیا گەرِیایە. گەرِیانێن خۆ د پەرتووکەکا دو پرتدا، بن ناڤێ: گەرِیانەك بۆ فارسVoyage en Perse ب فەرەنسی، سالا ١٨١٩ز ل پاریس چاپکر.

دوپرێ نڤیسییە:

- شکوهترین میرگەها کوردی، میرگەها ئامێدیێ یە. رەهێن میرێن وێ دگەهنە خەلیفێن کەڤنارێن بەغدا[٧٤].

- چێترین زاراڤێ کوردان، زاراڤێ دەڤەرا ئامێدیێ یە. ئەڤ بازێرە دووراتییا چار رۆژان ب پیا ژ موصل دوورە. پاشایەکێ خۆدان دو توخ[٧٥]، فەرووەریا وی دگێرە، ئەڤە چار سالە فەرووەریا وی خۆسەرە (ب٤٥).

- دەڤەرا مادی/میدی کو ئامێدیێ دکەڤیتێ، دەڤەرەکا شەنگ و ب پیتە. بۆ موصل توتنێ، مەئێزان،

مەیێ، پەرندا، فێقی، هنگفینی و گەزوینێ ... دهنێریت (ب٤٦).

- ناڤێ سەرداری زاخۆ ئەحمەد پاشایە، گرنداێ فەروەریا بەغدایە، تۆخەك هەیە، ئانكو ئالایەك تنێ هەیە، دكاریت ١٥٠٠ شەرکەران بدەتە بەغدا (ب٤٥، ١١٥).

- خازر رووبارەكێ بچووكە، رووبارێ بومادوسەBomadus، ئەوێ ئیسكەندەرێ مەقدونی، پشتی ژ رووبارێ دیجلەی بەرف رۆژهەلات دەربازبوی، برِی. خازر دچیتە سەر زێی بەهدینانLycus. شەرێ ئەربیلا (راستر شەرێ گەوگەمێلا/گرگوملی) یێ كەڤن (٣٣١ ب.ز)، ل دەڤەرا نێڤبەرا بومادوس (خازری) و لیكوس (زێ بەهدینانْدا) روودایە. ئیسكەندەری پشتی لەشكەرێ داریوشێ سێ شكاندی، ب چەند رۆژەكا، ژ نوو شیا بچیتە د بازێرێ هەولێردا (ب ٨٠، ٨٢).

- گوندێ مەقلوبMaghloub گوندەكێ كەڤناربوو، بیڤەلەرزان خرابكر، تنێ شوینوارێن وی ماینە. نێڤبەرا شوینوارێن گوندی و زێ بەهدینان، نیڤ فەرسەنگە (٣ كیلومەترن). زەینوفون دبێژتە زێی بەهدینان، زاباتوسZabatus كو ژ چاپێن كوردوئینGorduiens دزێت (ب٨٠)(٧٦).

- ئێزدی جلكێن كوردی دكەنەبەر، بژلی كراسێ دەر گروڤر. سالا ١٨٠٣ عەلی پاشا هێرشەكا ١٥٠٠٠ شەرکەران برە سەر گوندێن وان، زەحمەتا وی بەلاش چوو، شكەستی زڤری، گەلەك مال و مێر ژێ پەروە تێبرن و پوچكرن (ب٥٨).

- نستۆرییێن(٧٧) كوردستانێ دو پەترەكێن هەین. دبێژنە ئێكی (ئەخنانی) ل قوچانس، نێزی جولەمێرگێ، دەڤەرا بەهدینان دژیت(٧٨). ناڤێ ڤی پەترەكی بەردەوام مار شمعونە. یێ دوێ دبێژنێ: مەتران شەمعون، بنگەها وی ل دێرا رەبان هورمزدە، نێزی گوندێ ئەلقوش.

## ٢. جون كینایەر

John Kinneir (١٨١٣-١٨١٤ز).

دێبلوماسی، ئەفسەر و گەروك بوو. چوویە ئاسیا بچووك، فارس، كوردستانێ، ئەرمینیا، هندستانێ، عیراقێ، قوبرس، روسیا ...هتد. هنەك دیتنێن خۆ د پەرتووكا خۆیا بناڤێ:Journy through Asia Minor .. بەلاڤكرینە.

كینایەر Kinneir بەری سێر مارك سایكس، ئەڤ عەشیرەتێن ئێزدی ل دەڤەرا شێخان هژمارتینە: باستكی، ماموسی، دونبلی، ماسیكی، موسەكان وخەتاری(٧٩).

## ٣. پییێر دی فوسیل

P.de Vaucelles (١٨١٤-١٩١٤ز).

بالیۆزێ فەرەنسی بوو ل عیراقێ. پشتا خۆ ب دیتنێن خۆ، پەیامنێران، نووچەگەهان و بەرپرسێن فەرەنسا ل دەڤەرێ بەستییە.

دی فوسیل نڤیسییە:

- سالا ١٨٥٣ زانایێ شوینوارناسێ فەرەنسی ڤكتور پلاس V.Place ل جهێ خۆرسەباد، ب هەلكەفتا پەیدابوونا كۆمارا فەرەنسی، خوارنەكا مەزن بو گش پالێن خۆ، گش خەلكێ دەڤەرێ ژ ژن و مێر و زارۆكان ... چێكر(٨٠).
- سالا ١٨٧٩ قایمقامێ ئاكرێ ب دزیێ هاتە گونەهباركرن. ئەوی بێگونەهییا خۆ ب كوژمێ نێزی ٧٠٠ فرەنكێێن فەرەنسی كری (ب٨٠-٨١).
- سالا ١٨٨٠ پێلەكا گرانیێ ژووریا عیراقێ (هەمی كوردستانا باشور) ڤەگرت. خەلكی ژ برسادا گوشتێ جانەوەرێن مری دخار (ب٨٣).

## ٤. جێمس سیلك بوكینگهام

J. S. Buckingham (١٨١٦ز).

ژ زارۆكی حەژ گەشتێن زەریایی دكر، هەیامەكێ بوو كارمەندێ كومپانیا رۆژهەلاتێ هندستانێ. د گەریانێن خۆدا چوویە كەنداڤێ عەرەبی، مصرێ،

فەلەستینێ، ئوردونێ، سوریێ، ئیرانێ ... هتد. سالا ١٨١٦ هاتییە عیراقێ وکوردستانێ. دیتنێن خۆ د دو پەرتووکاندا بن ناڤێن: ١.Travels in Mesopotamia، London، ٢ چاپکرییە ١٨٢٧. Travels in Assyria، Media and Persia، London، چاپکرییە ١٨٢٩.

بوکینگهام نڤیسییە:

- رووبـــارێ (خـــەوســـەر)ی هـــەر رووبـــارێ بومادیسە Bumadis یان بومادە Bumade، وەك مێژوڤان وجوغرافیناسێن کەڤنار دگوتێ. ئەڤ خەوسەرە دڕۆژئاڤایێ بازێرێ نەینەوا را دبوریت[٨١].

ئاشکارە رووبارێ خەوسەری نە رووبارێ بومادیسە، رووبـارێ بومادیس/بومادوس رووبـارێ خازری یە. نڤیسەری بخۆ ژی دبەرپەرێ (١١٩)دا، دەهمەنێ نەمرە: ٦٢ ناڤێ وی هازر Hazir نڤیسییە، کو خازرە.

- بوکینگهام نڤیسییە، ئوتەر Otter دبێژێ (جـ١ ب١٤٧-١٤٨): رووبـارێ زێبار دئامێدیێرا دچیت، عەشیرەتا زێباری ناڤێ خۆ ژ ناڤێ رووبـاری وەرگرتییە، چمکی ل کنارێن وی دژین. دوورنینە ئەڤ رووبارە بناڤێن دنژی هاتبیتە نیاسین[٨٢].

- بوکینگهام نڤیسییە، سێر هنری سپێلمان S. H. Spelman (١٥٦٥-١٦٤١ز) دبێژتە مە، لەشکەرێ یونانی نێزی بازێرێ لاریسا دبەر کەلهەکا بەرفرەها پڕ مرۆڤ را بوری. ئەو کەلهە دکەڤیتە نێزی بازێرێ مسپیلا Mtspila، بازێرێ دبەرێدا مادی/میدی Meds تێدا دئاکنجیبوون (جـ١ ب٩١). وەرگێڕێ پەرتووکێ هێژا سەلیم تاها تکریتی نڤیسییە: مسپیلا Mtspila ناڤێ کەڤنارێ موصلێ یە. ژ ڤێ دیاردبیت ناڤێ موصل نە ژچێکرنا عەرەبایە، دەمێ ل سەردەمێ عومەرێ کوڕێ خەتاب موصل ڤەکرین (داگیرکرین)، بەلکو ژناڤێ وێ یێ کەڤنار (مسپیلا) هاتییەوەرگرتن (جـ١ ب١١٥).

- هێرشا قەیسەرێ رۆمانی تراجان (٥٣-١١٧ز)، ئەوا ژ بازێرێ رۆما سالا ١١٢ز دەرکەتی، رووبارێ دیجلە بڕی، شیا دەڤەرا ئەدیاب/حەدیاب، گاوگامێلا/ گرگوملی، هەولێر بگریت، تەیسەفون وسلوقیا ژی دووربێنچکەت (جـ٢ ب١١٨).

## ٥. ولیەم هوید William Heude (١٨١٧ز).

قومانداره‌کێ لەشکەرێ ئنگلیزی بوو ل مالابـار، کنـارێ رۆژئاڤایێ هندستانێ. ل عیراقێ، ئیرانێ، کوردستانێ، ئاسیا بچووك، هنەك دەولەتێن کەنداڤی و هندستانێ گەڕیایە. هنەك دیتنێن خۆ دپەرتووکەکێدا بناڤێ: Voyage up the Persian Gulf سالا ١٨١٩، ل لەندەن چاپکرییە.

هوید نڤیسییە:

- ئەم ژ هزر و باوەرێن ئێزدییان کێم دزانین، چمکی ترك ناهێلن خـۆدان دینێن نەئەسمانی، بیرو باوەرێن خۆ (ب ئازادی) بەلاڤکەن[٨٣].
- هژمارا ئێزدییان ل کوردستانێ مەلیونەك تێهەیە. ل گوور شەریعەتێ وان، بو وان چێنابیت ژنێن خۆ بەردەن (ب١٩٨- ١٩٩).
- چیایێ شنگارێ جهێ ئێزدییانە، ب دارێن ترێ، هژیر و مژمژا ناڤدێرە. زڤستانێ ئێزدیێن دەڤەرێ دشکەفتێن وی چیایدا دژین، هاڤینێ ل دەشتا دبەرچیایدا بەلاڤەدبن (ب ١٩٨- ١٩٩).
- والیێ بەغدا سولەیمانێ مەزن (١٧٨٠- ١٨٠٢ز)، هێرشەك برەسەر ئێزدییان، کارێن وی یێن هوڤ و درندە، بونە ئەگەرا زندەبوونا کەرب و کینا ئێزدییان دژی ترکان[٨٤].

## ٦. کلاودیوس جێمس ریچ C. J. Rich (١٨٢٠ز).

نونەرێ کومپانیا هندستانێ یارۆژهەلات، رێڤەبەرێ ئاکنجیکەها residentship بریتانیا ل بەغدا. ل عیراقێ، ئیرانێ، هندستانێ ... گەڕیایە. گەڕیانێن وی کابانیا وی J. Duncan دپەرتووکەکێدا بن ناڤێ: Narrative of Residence in Kurdistan

سالا ١٩٣٦ ل لەندەن، بەلاڤکرینە.

ریچ نڤیسییە:

- ژنەمالێن فەروەردار (حوکمدار) ل کوردستانێ، بنەمالا بەهدینانە. پایتەختێ وان بازێرێ ئامێدیێ یە. ئەڤ بنەمالە ژ گشێن دن شکوهتر و پیروزترە. چمکی رەهێن وان دگەهنە خەلیفێن (عەباسی)[٨٥]. بو کەسێ نینە ئامانەکی یان قەلونەکا، مینا یێن میرێن ڤێ بنەمالێ، بکاربینیت[٨٦].

- میرێ ئامێدیێ (هەڤچاخی گەشتا ریچ ١٨٢٠، زوبێر پاشایێ دوێ کورێ سماهیل پاشایێ ئێکێ بوو، ١٨٠٨ - ١٨٢٤ فەروەری گێرایە.(ع.م) بزاری خەلیفێن عەباسیێن داویێ دکر. رۆژا خۆ بتنێ دبوراند. بەردەسکێ وی خوارنا ویددانابەر و دەردکەت. دەمێ میر خلاس دبوو، بەردەسکی خوارن تێکەل دکر، دا کەس نزانیت میری چەند خارییە! دەمێ میر ل دیوانێ روودنشت، کویخەیێ وی (وەك سەرۆك وەزیران) داخۆ چەمینیت و سلاڤکەتێ مینا سلاڤا ئیرانییان. پاشی ل جهەکی هنەك ژ میری دوور روونیت. پشتی کویخەی سەروکێ عەشیرەتا مزوریان، دا بتەنشتا کویخەی ڤە رونیت، پاشی سەروکێن عەشیرەتێن دن، ل گوور جهـ و پلەیا عەشیرەتێن وان، دا جهێن خۆ ددیوانێدا گرن[٨٧].

- میرێ ئامێدیێ زوبێر پاشا، شیرەت ل رەحمەتوللا ئاغای پەیکێ/تەتەرێ ریچ کرن: درێیا ئامێدیێ ــ وانێ را نەچیتە ستامبول، چمکی رێ بەکا پر بڤەیە. پەیك رازی نەبوو، میر نەچاربوو هنەك کاغزا، دو ــ سێ کەسێن شەهرەزایێن رێ، دگەل فرێکەت. پەیك پشتی ١٣ رۆژان ب پیا گەهشتە وانێ[٨٨].

- ئامێدیێ دارێن سپیداران دهنێرتە بەغدا، بۆ فروتنێ. دەڤەرا ناڤکورێ نێڤبەرا چیایێ مەقلوب وچیایێن ئاکرێ، دەڤەرەکا گەلەکا ب پیت و دەولەمەندا هەرێما ئامێدیێ یە (ب٧٣، ٢٤٧).

- زاخۆ دکەڤیتە سەر رووبارێ خابور، ئەوێ ژ چیایێن ئامێدیێ دزێت. وی چار سەروکانییێن هەین، ئەو و هیزل ل ژێریا (یاراست رۆژئاڤایێ) زاخۆ ئێکدگرن. دووراتییا زاخۆ وجزیرا بۆتان سێ دەمژمێرن ب پیا (ب٣١٢ - ٣١٣).

- ئەم شەڤەکێ ل گوندێ ئاسکی کەلەك نڤستین، گوندەکێ ئێزدییانە. رووبارێ خازرBumadus ل ژێریا ڤی گوندی، ب دووراتیبا سێ دەمژمێران ب پیا، درێژیتە رووبارێ زێ بەهدینان (ب٢٤٨).

## ٧. ئەلمونشیء ئەلبەغدادی، محەمەدێ کورێ ئەحمەدێ حوسەینی (١٨٢١ز).

ئەڤ گەرۆکە کارمەندێ ئاکنجیگەها Residentship بریتانی بوو ل بەغدا، دگەل

ژن و میرەکێ ئێزدیان شنگار ١٨٢٠،



ژ پەرتوکا، رحلة ریج الی العراق ب ٢٤٩

کلاودیوس جێمس ریچ سالا ١٨٢٠ز ل عیراقێ و ئیرانێ گەڕیایە. دیتنێن خۆ سالا ١٨٢١ ب زمانێ فارسی نڤیسینە، ناهێتەزانین ئەو دیتن ب زمانێ فارسی هاتینەچاپکرن، یانژی تا نهو دەستنڤیسن، مە تنێ وەرگێڕا عەرەبی دیتیە.

ئەلبەغدادی نڤیسیە:

- نێڤبەرا دێرا رەبان هورمزد و باژێرکێ ئەلقوش ئێك فەرسەنگە (شەش کیلومەترن). چیایێ ئەلقوش و نیڤەکا ئاقارێ باژێری، ل ژێر فەرمانرەوا میرێن ئامێدیێ یە، نیڤا دن ل ژێر فەرمانرەوا موصلێ یە[٨٩].

- سالا ١٨٢١ (سێ هزار) کریستیانی ل گوندێ ئەلقوش دژیان (ب١٢٦). پاشی دبێژێ (دو هزار) مالێن کلدانییان ل ئەلقوش دژیان (ب١٣٣). ئەڤە هەڤدژیە، مە نەزانی سێ هزارن یان دو؟

- ئامێدیێ گەلەك تەخلیتێن فێقی بۆ هەولێر دهنێرێ، باخێن فێقی ل هەولێر تونە (ب١٢١).

- ب پال چیایێ مەقلوب ڤە، گوندێ (واتە) تێتەدیتن. گوند نێزی ١٠٠ مالایە، هەمو کلدان و ئێزدینە. چیا ژی بلند، ئاسێ و کەڤرینە، دێرا مارمەتی دکەڤیتەسەر (ب١٣٠ ــ ١٣١).

- دووراتی نێڤبەرا هەولێر وحوسێن کوفتی[٩٠] پێنج فەرسەنگن (٣٠ کیلومەترن). زێی بچووك (یاراست زێی گەورە) گوندی دکەتە دو پارچە/دو گوند، خەلکێ هەردو گوندان داسنینە، ئانکو کوردێن ئێزدینە (١٢٢).

## ٨. جێمس بیلی فرێزەر J. B. Fraser (١٨٣٤ز).

فرێزەر ل ترکیا، عیراقێ، ئیرانێ، کوردستانێ، هندستانێ وچیایێ هیمەلایا ... گەڕیایە. گەڕیانێن خۆ دپەرتووکەکا دو پرتدا، بن ناڤێ: Travels in Koordistan and Mesopotamia ل لەندەن، سالا ١٨٤٠ بەلاڤکرینە.

فرێزەر نڤیسیە:

- دەڤەرا ئامێدیێ دەڤەرەکا چیاییا ئاسێ یە، گەلەکا ب پیت وبەرە. ئەڤ پاشاگەهە (پاشویە) یان دەولەتوکە (دویلە)، جهێ رازیبوون و پەسنێن هەمیان بوو، چەمکی یاجوان، ب پیت و پڕ خەلك بوو. نێزی ١٢ هزار گوندایە، هەر گوندەك ژ ٢٠٠ - ٣٠٠ مالان پێکهاتبوو[٩١].

- فەرمانرەوا ئامێدیێ پاشایەکی دگێڕا، ژنەمالەکا کوردییا ناڤدێر بوو، ژ لایێ سەرۆك وەزیرێن (بابێ عالیێ) دەولەتا ئوسمانی ڤە دهاتەدانان (ب١٥).

- ئامێدیێ[٩٢] دکەڤیتە سەر کەڤرەکێ نیڤ شاقولی (نیڤ ستونی). رێ یەکا تەنگ دچیتێ، تێرا سوارەکی تنێ هەیە، تێرا دو سواران پێکڤە ناکەت. خەلکێ وێ هزردکر، کەلها وان بەرامبەر هیچ هێزەکا دنیایێ ناکەڤیت. لێ پاشایێ ئامێدیێ دسالا دووربێچکرنا باژێریدا، ژ لایێ محەمەد پاشایێ رەواندوزی ڤە، ١٥٠ کوشتی دان، جهێ خۆ بەردا و نەڤیا پتر خەلکی بدەتە کوشتن (ب٢١ - ٢٢).

- شەشێ خزیرانێ سالا ١٨٣٤ پاشایێ ئامێدیێ سەعید پاشا[٩٣]، ژ فەرمانرەوا خۆ هاتەخارێ، دادەستێ موسا پاشای، فەرمانرەوا ئاکرێ ژی دادەستێ سەلیم پاشای (ب٢٢).

## ٩. ولیەم ئف. ئاینسورت Ainsworth، William F (١٨٣٥ - ١٨٤٢ز).

گەڕوك، نۆشدار، جوغرافیناس و جیولوجیناسەکێ ئنگلیزە. هاتیە ئاسیا بچووك، عیراقێ، سوریا، کوردستانێ، فارس، هندستانێ ... هتد. گەڕیانێن خۆ دپەرتووکەکا دو پرتدا، بن ناڤێ: Travels and Researches in Asia Minor .. ل لەندەن، سالا ١٨٤٤ بەلاڤکرینە.

ئاینسورت نڤیسیە:

- ئێزدیێن دەڤەرا شێخان و دەوروبەرێن وێ، دەسپێکا سەدسالیا هەژدێ زاینیدا، بوونە وەلاتیێن میرگەها بەهدینان، ئێك ژ میرگەهێن کوردیێن نیڤ خۆسەر (شبە مستقلە) ل رۆژهەلاتێ دەولەتا ئوسمانیدا[٩٤].

- ئێسفنێ سالا ١٨٣٧ گوندەکە دکەڤیتە ناڤ

هنەك گرێن نزم (ژێریا چیایێ شێخادی)، ژووریا دەشتەکا راست و بەرفرەهە. خەلکێ وی گەلەك رەنگێن کەسکاتی دچینن، سەقایەکێ هوون و فێنکێ هەی، پشتی ئەم ژ موصل دەرکەتین، باشترین جهێ فێنك بوو، ئەم بێهنا خۆ لبن سیبەرا دارێن وی ڤەدەین. خەلکێ گوندی گەلەك پەزی، کەوالی، پەرندان ... بخۆداندکەن، ب پلەیەکا وەسا گەلەك، سەرنجا مە راکێشا[95].

- ل دەشتا شێخان لوکەی و برنجی دچینن. ئاڤێ ژ رووبارێ خازری ب رێ یا جوکان دبەن، یانژی ژکانی وجەلالێن ژ بن کەڤرێن چیایێ مەقلوب دزێن، دبەن[96].

- ل دۆلەکا تژی داروو‌بار، ئاڤاهیێن شەپیوریێن (مەخروتییێن) پەرستگەها شێخادی (لالش) دکەڤن. وەك جهەکێ و شەنگ وئێکانە خۆیادکەن. عەشیرەتێن ئێزدیێن شێخان دسەدسالیا نۆزدێدا ئەڤەنە: قائیدی، شێخان، خالدی/خالتی ... ئەوژی ژعەشیرەتێن بەهدینان تێنەهژمارتن[97].

## ۱۰. جێن پوژولا

**(۱۸۳۷ز).** J. Poujoulat

گەرۆکەکێ فەرەنسیە، هاتیە ئاسیا بچووك، عیراقێ، کوردستانێ، سوریا، مصرێ ... گەریانێن خۆ دیەرتووکەکا دو پرتدا ، ب زمانێ فەرەنسی، بن ناڤێ: J .. Voyage dans L` Asie Mineure پاریس دسالێن ۱۸٤۰ - ۱۸٤۱ دا، چاپکرینە.

پوژولا نڤیسییە:

- دەولەتا ئوسمانلی دگۆتە ئێزدییان سکیزبێکلو sikisbeiklou ئانکو: هەشت سمبێل! وەك سڤك تەماشەکرنا وێ بو ئێزدییان، چمکی دسمبێل بووشن[98].

- دوورنیە ئێزدی پاشمایێن ماردانن Mards ، پاشایێ فارس ئارشاکێ ئەخمینی (ئارشاك کورێ ئەردەشیرێ سێ ۳۳۸ - ۳۳٦ ب.ز) بۆ میزوپوتامیا ڤەگوهاستینە. ئەوان ئێزدیێن ماردی، ناڤێ خۆ دایە باژێرێ ماردینێ/مێردینێ (ب٣٦).

- ئێزدی دبێژنە رووبارێ دیجلەی ئاڤا مەزن، بەس دا نەبێژن شەت. چمکی شین تێدایە. ماری ژی ب جانەوەرەکێ پیروز دزانن (ب٣٨، ٤١).

- شنگار جهێ ئێزدییانە، ئێزدیێن شەرکەر. حافز پاشا شەرێ وان کریە (١٨٣٧). هژمارا وان ل ڤێدێ ٢٠٠ هزار کەسن. دیسان شنگار دەڤەرەکا دەولەمەندە، هەمو رەنگێن چاندنا ڤێقی لێهەنە (ب٣٥).

## ۱۱. جۆرج پی. بادجەر

**(۱۸٤۲ - ۱۸٤۵ز).** George P. Badger

مزگینەرەك ئنگلیزە. هاتیە گراڤێن مالتا

**شێخ ناصرێ بابەشێخ، سالا ۱۸٤۹،**



ژ پەرتووکا، J.Guest. the yezidis

Malta وگوزوGozo د نیڤ زەریا ناڤەراستدا، ل ویدێ زمانێ عەرەبی فێربوویە و پاشی ل بەیروت خاندییە. ژ لایێ كەنیسا كانتربریڤە Archbishop of Canterbury (سێ) سالان ١٨٤٢-١٨٤٥ هاتییە میزوپوتامیا و كوردستانێ. ل ئاسیا بچووك، هندستانێ، یەمەنێ، مصرێ و زنجەبار ... گەریایە. دیتنێن خۆیێن میزوپوتامیا وكوردستانێ دپەرتووكەكێدا بن ناڤێ: Nestorians and their Ritauls سالا ١٨٥٢ ل لەندەن چاپكرینە.

بادجەر نڤیسییە:

- دیمەنێ تو ژ سەرچیایێ مەقلوب دبینی، گەلەكێ بەرفرەهـ و دلڤەكەرە. ل ژووری گرێن بلندێن ئاكرێ، دەهمەنێن دەشتا بەرفرەها ناڤكورێ نە.



ئەی ئیج، لایارد خودانێ پەرتوكێن،
١.nineveh and its remains.
٢.discoveries in the ruins ot ni neveh a babaylon

ل دەشتێ ئاڤا رووبارێ گومل، دگەل رووبارێ خازری (بومادوسێ كەڤن) تێكەل دبیت، رووبارێ تێكەل كو خازرە پاشی دریژتە زێی بەهدینان (ل ژێریا گویر)[٩٩].

- مەترانێ ئامێدیێ سالانە ٥ هزار پیاستەرێن ئەسپانی (قرشێن مصری) ژ مار شەمعون وەردگریت. نهو سالا ١٨٤٥ مار زەیا مەترانێ ئامێدیێیە، پشت سالەكێ ١٨٤٦ مار یوسف ل ویدێ بوو مەتران[١٠٠].
- ئەبرەشیا[١٠١] Parish ئامێدیێ سالا ١٨٤٦ ژ(سێ) دەڤەران پێكهاتبوو:

ئێك. دەڤەرا چیایا دكەڤیتە رۆژئاڤایێ رەبان هورمزد، تێدا (دهۆك) كەنیسەیەك، قەشەیەك و ٥٠ مالێن كریستیانان لێنە. (مالتایێ) كەنیسەیەك، بێ قەشەیە، ٢٠ مالن.

دو. دەڤەرا مزوریان، ژووریا شێخادی. تێدا (دزێ) ٢٠ مالێن كریستیانانە، بێ كەنیسە و بێ قەشەنە. (بێدویل) ٢٠ مالن، كەنیسەیەكا بێ قەشە هەیە. (بێبوزێ) ١٠ مالن، كەنیسەیەكا بێ قەشە هەیە. (مێزێ) ٧ مالن، كەنیسەیەكا بێ قەشە هەیە.

سێ. دەڤەرا سپنەی ودەڤەرا بەهدینان (بەهدینان ل ڤێدێ ئانكو: ئامێدیێ). تێدا (ئامێدیێ) ٣ مالێن كریستیانا هەنە، بێ كەنیسە وبێ قەشەنە. (مانگێش) ١٥٠ مالن، كەنیسەیەك و ٣ قەشە هەنە. (داودیێ) ٣٠ مالن، بێ كەنیسە و بێ قەشەنە. (تنێ) ٣٠ مالن، كەنیسەیەك و قەشەیەك هەیە. (ئەرەدنا) ٥٠ مالن، ٣ كەنیسە و قەشەیەك هەیە. (ئینشكێ) ٢٠ مالن، كەنیسەیەك و قەشەیەك هەیە (ب١٧٤).

- زاخۆ، بێداری و پێشابور دگەل ئەبرەشیا جزیرا (بۆتان) هاتینەهژمارتن. (زاخۆ) ٨ مالێن كریستیانا لێهەنە، بێ كەنیسە و بێ قەشەنە. (بێدارێ) ١٤ مالن، كەنیسەیەكا بێ قەشە هەیە. (پێشابور) ٦٠ مالن، كەنیسەیەك و دو قەشە هەنە (ب١٧٠).
- ئەز باوەرم پەیڤا ئێزدی ژ (یەزدان) هاتییە. یەزدان ل

**لالەش / مەزارگەهێ شێخادی/ ١٨٤٩،**




ژ پەرتووکا، مکتشفات أطلال نینوی، یا ئوستن لایارد، ب ١١٧.

جەم فارسان پەیڤەکا پەهلەوییە، ئانکویا: ئیزەد و خۆدا ددە. بابەشێخ ناصر گوتە من (گوتە بادجەر)، ئەم ئێزدی خۆدێ یەزدان/ئێزدان دپەرێسین (جـ١ ب١١٢) .

- گوندێن شـێخان، بەعشیقە، بەحـزان وباعـەدرێ، ب چاندنا دارێـن زەیتونـان نافدێـرن (جـ١ ب١١٩).

## ١٢. ئاوستن هنری لایارد Austen H. Layard (١٨٤٥ز).

دیتنڤان (موستەکشف)، شوینوارناس و گەڕوکەك ئنگلیزە. ل سیلانێ، هندستانێ، ئیرانێ، کوردستانێ، عیراقێ، کەنداڤێ عەرەبی، ترکیا، سوریا وفەلەستینێ ... گەڕیایە. دسالێن ١٨٤٥-١٨٥١ ل کوردستانێ گەڕیایە. دیتنێن خۆ د دو پەرتووکاندا بەلاڤکرینە. 1. Nineveh and its Remains، With an Account of avisit to the Chaldaean Christians of Kurdistan، and the Yezidis، London، 1849. 2. Discoveries in the Ruins of Nineveh and Babylon، with Travels in Armenia، Kurdistan and the Desert. London، 1853.

لایارد نڤیسییە:

- ئەم گەهشتین (ئێسفنێ) گوندێ ئێزدییان (١٨٤٦) وەستیای و کەرخی. خانیێن وی یێن سپی، گومبەتێن شەیپوریێن بلندێن مەزارگەهان ب تەنشتێن گرێن نزمڤە، دهاتن دیتن. من هزرکر دێ ل ڤێدێ شێخ ناصر سەروکێ دینێ ئێزدییان (ئانکو بابەشێخێ وان) بینم، چمکی

نەبێ حازربوو، من گەشتا خۆ بەردەوامکر. پشتی خوارنێ و مێڤاداریا ژنهاتیبا مەزنێ گوندی، پشتی دو دەمژمێرێن رێڤەچونێ دنیڤا گەلیەکێ دلڤەکەردا، جوهی (یهودی)کێن ئاڤێ ژ چیایێن وی تێنەخار، تەنشتێن وی تەڤ دار وگول و رولان (ژالەنە)، ئەم گەهشتینە گومبەتێن مەزاران، دنیڤێدا گومبەتا سپیبا شێخێ ئێزدییانە (شێخادی)یە[١٠٢].

- کوردێن کەلێنیێ (ئەو دنڤێسە: Kaloni) مزوورینە. خانیێ ئاغایێ وان دنیڤا کۆمەکا خانیێن ساکاردا بوو. ئاغا نەبێ حازربوو، کابانیا وی جوان ب فەرکارێ مێڤانیێ رابوو. دوشەك و مەحفیر ل بن دارەکا تویێ هاتنەرائێخستن. سێنیێن مەزنێن ماست و نیڤشکی، سێنیێن دارێن تژی برنج، سێنیێن هنگڤینی، سەلکێن فیقیێ نوو ... ل بەرمە هاتنەرێزکرن. زەلام ل جهەك باش و هنەك ژمە دوورتر درونشتیبوون، دەملدەست بەرسڤا پسیارێن من ددان[١٠٣].

- پشتی گوندێ (بێبوزیێ) ئەم گەهشتین کەلوکێ (وی نڤیسییە:Cheloki ) و دوفدا چووینە سپیندارێ. سپیندارێ ناڤێ خۆ ژ ناڤێ دارێن سپیدار وەرگرتییە. مە چیایێ گارەیێ بلند و پڕ

قەوالێن ئێزدین سرۆدێن دینی دبێژن، سالا ١٨٤٩،



ژ پەرتووکا: مكتشفات أطلال نينوى، یا ئوستن لایارد، ب ١٣٤.

داروبار بڕی، ئەم کەتین مشارا ئامێدیێ (ب١٤٦).

- نێزی نیڤرۆ بوو، ئەم گەهشتین بەرێن کەڤرێ بلندێ بتنێ، ئەوێ ئامێدیێ و کەلا وێ، ل سەر هاتینەئاڤاکرن. گەلەك گوندێن کوردان و کلدانان دکەڤنە ڤێ مشارێ، ب هزرا من (هزرا لایاردی) ئەڤ گوندە دبەرێدا ژئەڤرۆ مەزنتر و گەشتربوون (ب١٤٧).

- ئامێدیێ بەرێ جهەکێ گرنگ و ب هێزبوو، خەلکەکێ بووشێ پێشکەفتی تێدابوو. فەرووەریا وێ پاشاتیا پشتاوپشت بوو، فیودالی (دەرەبەگی) بوو. ئەڤە پاشمایێ خەلیفێن عەباسیانە بۆ وان مای[١٠٤]، کوردان ب چاڤەکێ ڕێزدار و بلند هێڤدکرێ. ڕێزەك وگرافییەکا مەزن بۆ ژنێن وانژی دهاتەگرتن. پاشایێ داویێ ڤێ پاشاتیا پشتاوپشت ئیسماعیل پاشا بوو. ئەوی گەلەك بەرەڤانی ژ کەلا خۆیا ئاسێکر، بەرامبەر قوماندارێ ترك محەمەد پاشا ئینجەبایرەقدار. دیوارێ کەلێ دجهەکیدا کو کوردان هزردکر ئاسێ و هێمنە، لەشکەرێ ترکان ب سەرکەت وکەل هاتەگرتن. پاشا دگەل کابانییا وی (ئەسماخان) وەك گرتییان، بۆ بەغدا هاتنەدوورئێخستن (ب١٤٨).

- کەلا قومریێ جهێ عەبدولصەمەد بەگێ (بەرواری)، دکەڤیتە سەر کەڤرەکێ بلندێ بتنێ، کەل ل پرانییا مشارا بەرواریان تێتەدیتن. کەلەکا بچووکا ئاخێیە، کورد وەسا لێ دنێڕن، ئەو دشیانێدایە ئاسێتر و بەرفرەهتر لێبێت. دیارە بەگ ئاگەهداری گەهشتنا من بوو، یان هزردکر هاتنا من بو پشکنینێیە. لەوان دەمێ ئەم هنەك گەهشتینە نێزی کەلهێ، ئەو بلەز هندی هەسپێ وی شیای، ژ ڕەخێ دیێ کەلهێ دچووخار. مەلایەکێ ژ جەللادێن خۆ هنارتە بەریکا مە، ل سەر ڕێ دابێژتە مە بەگ نە ل مالە، ڤێ سپێدێ زوو بێ چوویە گوندەکێ دوور (ب١٥٢).

- درێ دا بەرف نستۆرییان (ل هەکارییان)، ئەم دگەلەك گوندارا بورین. (مایێ) دو گوندن، مایێیا ژووری گوندێ مووسلمانایە، یاژێری گوندێ کریستیانایە. ژ وێدێ چووینە (بێدوهێ)، پشتی وێ، دۆلەکێ ئەم گەهاندینە (ئاشیتا) نستۆریان وچووینە مالا یەعقوبی مەزنێ گوندی (ب ١٥٣ - ١٥٥).

- دەمێ ئەم ژناڤ نستۆریان زڤڕین، ئەم دجهێ خۆیێ چونێرا نەهاتین. مە ڕێیەکا دن هەلبژارت. ئەم هاتینە چەلکێ، وەرمێلێ (ئەوی نڤیسییە: ئورمێلێ)، داودیێ، کورێمێ، مانگێشکێ، دهۆك، مالتایێ، ئەلقوش، تلکێف وموصل (ب١٨١).

- ئەز (لایارد) بلەز هاتم پەرستگەها (لالەش)، دبینم پەرستەران (کاهنان) شێخ ناصرێ (بابەشێخ) دووربێچکرییە، ئەو دنیڤا واندا ڕونشتییە. جهـ ژ چرا و شەمالك و لەمپا ڕوونبوویە و هاتییەخەملاندن. گش شێخ ب کنج و شاشکێن خۆیێن سپی ڤە، گش گراڤی وڕێزدار خۆدان ریهێن درێژ، ل لایەکی برێز ڕونشتینە. بەرامبەری وان نێزی ٣٠ قەوالان ب کنجێن خۆیێن ڕەش وسپی ڤە، بلوور وتەمبورێن خۆ دژەنن. دووربێچی وان فەقیر ب کنجێن خۆیێن ڕەشڤە، ژنێن پەرستەر ب کنجێن خۆیێن سپی و گەشڤە، د کوومن. کەسەك نکاریت ڤان دیوارێن مرۆڤان، دەستەکا شێخ ناصری ب برێت (ب٢٠٤).

- (باعەدرێ) گوندەکێ جوان وبچووکە، ب دووراتییا پێنج میلان (میلەك نێزی ١٦٠٠ مەترایە)، دکەڤیتە ڕۆژئاڤایێ شێخان. ل سەر هنەك گرێن نزم هاتییەئاڤاکرن. کەلا میر حوسێن بەگ (کوڕێ عەلی بەگێ مەزن)، ل سەر گرەکێ بلند هاتییەئاڤاکرن. کەل عەلی بەگێ (١٧٩٠ ـ ١٨٣٢) دنیڤا گوندیدا ئاڤاکرییە. دەوروبەرێن کەلا میری، خانیێن بەرایێن خەلکینە، دەوروبەرێن خانیان باخ، بیستان وداروبارن.

- (١٨٤٩) درێ یا جزیرا بۆتاندا بۆ موصل، مە ڕووبارێ خابور ل جهەکی نێزی گەهشتنا وی بۆ سەر دیجلەی، بڕی. بلندییا ئاڤا ڕووباری دگەهشتە زکێن دەواران، ئەم گەهشتین گوندێ (دێرەبون).

گوندەکێ مەزنێ ئێزدیيانە، دکەڤیتە ژێریا چیایێ رۆژئاڤایێ زاخۆ (چیایێ سپی). گەلەك كانی ژبن کەڤرێن چیای دزێن، بیستانێن برنجی پێ ئاڤددەن. دبن دێرەبوندا (ل رۆژئاڤایێ وێ) گوندێ (پێشابورێ) کریستیانایە. ئەم ل دێرەبون ل مالا مەزنەکێ ئێزدی نڤستین، ئێکبوو ژ سوارێن مە ل جزیرا بۆتان دیتی[١٠٥].

- مە دەشتا سلێڤانەیا[١٠٦] بری، ئەم ل سێمێلێ گەهشتین کەلهەکا تەقنێ، ل سەر گرەکێ ئاڤاکری. ئەم کەرخی و وەستیای بەرف کەلهێ چووین. مە خۆدانێ کەلهێ عەبدی ئاغایێ (دنانی) ل بەردەری رونشتی دیت. ئاغایەکێ بەژن بلند و ژنهاتی بوو. داخــوازا لێبورینێ کر، کو نەهاتبوو پێشەوازیا مە، لێ جوان ب فەرکارێ مێڤانیێ رابوو، بەرخەك سەرژێکر وگوڤەندەك گرێدا (ب٨٩ - ٩٠).

- هێ ئەز ل موصل باش ئاکنجی نەبووم، قەوال یوسف و هنەك قەوالێن هەڤالێن وی ژ باعەدرێ هاتن جەم من. داخــوازا میر حوسێن بەگ و بابەشێخ ناصر گەهاند، پشکدارێ دجەژنا شێخادیا سالانەدا بکەم. ئەز و دەستەکا خۆ و هورمزد رەسام بریکارێ قونسولێ بریتانیا ل موصل، ب دەواران چووینە باعەدرێ، درێ دا حوسێن بەگ دگەل سەلەفەکا سواران، هاتبوون پێشەوازیا مە. وێ شەڤێ بووینە مێڤانێن میری، رۆژا پاشتر ئەم چووینە (لالەش) جەژنا شێخادی (ب١١٥).

- رۆژا ١١ ئیلونێ (١٨٤٩)، من موصل هێلا وبەرف چیا ب رێ کەتم. من ڤیا دەڤەرا زێباریا ودۆلا نستۆریان ببینم، بەرف وانێ بچم، شوینوار و نڤیسینێن میخیێن دەڤەرێ سەحکەم. رێ یا مە گرێن نزمبوون حەتا گەهشتینە بەردەرەش، مە هنەك دەمژمێران بێنا خۆ ل وێدێ ڤەدا. نیڤا شەڤێ کەتینە دەشتا دەڤــەرێ، تژی گوندێن کوردانە، چاندنا لوکەی، توتن و برنجی دکەن، ئاشێن چێکرنا زەیتێ ژ گەنموکی دگێرن. پشتی مە دەشت بری، گەهشتین باخ وکانیێن ئاکرێ (ب٤٥٦ - ٤٥٧).

- ئاکرێ دکەڤیتە چیای، د سەرهندێرا جهەکێ گەرمە. خەلکێ وێ هاڤینێ ل سەر بانان دنڤن، دڤی وەرزیــدا ژ خانییان دەردکەڤن، ل ناڤ باخ وبیستانان دنڤن. ئاکرێ نێزی ٦٠٠ مالایە، دەڤەرا وێ ٣٠٠ گوندن، بەرێ وێ هاریکاریەکا ئابووریا باشە بوو پاشاگەها (پاشالقا) ئاکرێ (ب٤٥٩).

- ل سەرێ چیایەکێ بلند رووبارێ زێ (بەهدینان) دیـــارە، ل دۆلــەکــا ب پیت دچــیــت. ژ چیای داکەتینەخارێ گەهشتینە گوندێ (بیرەکەپرا) جهێ مستەفا ئاغای، ئاغایێ کەڤنێ زێبارییان، ئاغایێ نهو دبێژنێ نیعمەت ئاغا، ل گوندێ (هەرنێ) دژیت. نیعمەت ئاغا ژبلی کوردیێ، فارسی وعەرەبی ژی دزانیت، شەرەزایی خەریتا کوردستانێیە، زانیاریێن باش سەبارا دەڤەرێن کوردستانێ دانەمن. دەستەلاتا وی دگەهتە زێبار، شێروان، گەردی، برادوست،ئاکرێ، شەمدینان... حەتا تخوبێن فارسان دچیت (ب٤٦١ - ٤٦٢).

- رۆژا ٢١ هەیڤا تیرمەهێ، ئەم ژدەڤەرا زێبار دەربازبوین گەهشتینە (شێروان). ئاغایێ وێ میران بەگ دگەل سەلەفەکا چەکداران هاتن پێشەوازیا مە. ئەم برینە گوندێ (بیرسیاهـ)ێ مەزن، ئەوێ دکەڤیتە بن کومتەکێ بلندێ چیایێ پیران. ل وێدێ گوڤەندەك بو پێشەوازیا مە گێرا. مە بێنا خۆ ل بن دارێن کویزێن گوندی ڤەدا (ب٤٦٤).

- پشتی سێ دەمژمێران ب پیا، ئەم گەهشتینە گوندێ (هارونێ) ل دەڤەرا برادۆست. بارا پتر ژگوندێن دەڤەرێ ل چیان کەلهێن ئاخێ هەنە. هەر کەلهەکێ ٤ - ٦ ئاسێگەهـ (بورج) تێدا هەنە. ئاغایێن وان دەمێن شەڕ و لێکدانان و تۆل ستاندنێ خۆ تێدا ئاسێدکەن. ژ وێرێ چووینە گوندێ (خانی رەش) جهێ فەیزوللا بەگێ، مەزنێ برادوستییان. بەری بگەهینێ برێڤە مە هنەك خێزانێن جوهییان دیتن، ل دەڤەرێ دگەڕین، زێرنگرێ دکەن یان تشت و مشتان دفرۆشن،

ب تەناهی تێن و دچن كەس چ نابێژتێ، چمكی چەك و كنجێن جوان بو ژنان دئینن (ب ٤٦٤).

- پشتی گوندێ (زێرنینێ) گەردبیان، مە رووبارەكێ بچووك بڕی دبێژنێ (شەمبو)، تایەكێ رووبارێ زێ (بەهدینانە)، نهو ئەم گەهشتین دەڤەرا شەمدینان (ب٤٦٤).

- ئەم ژ شەمدینان ڤەگەریان، نهو گەهشتینە دۆلا بەرواری، درێدا ژ ئامێدیێ بورین، مە كاروانێ خۆ و هەسپێن خۆ، ددەستێن گرۆپا خۆدا هێلان. من و هورمزد رەسام شەڤێ دا رێ، ئێڤارا رۆژا ٣٠ تەباخێ، ئەم گەهشتین موصل. ڤێ گەریانا مە ٧ حەفتێیان كێشا (ب٥٣٢).

## ١٢. ئیلیا نیكولایڤیچ بێرێزین I. N. Beregzin (١٨٤٣ز)[١٠٧].

زانا وگەڕوكەك روسە. ل ئاسیا بچووك، فارس، كەنداڤێ عەرەبی، عیراقێ، كوردستانێ، سوریا، لوبنان، فەلەستینێ و مصرێ ... گەڕیایە. دیتنێن خۆ ب زمانێ روسی د كوڤارا: Magazin zemleviedienii-a، موسكو، ١٨٥٤، پرتا: ٣، ب٤٢٨ - ٤٥٤ دا بەلاڤكرینە.

بێرێزین نڤیسییە:

- پشتی ئەم ژ موصل دەركەتین، مە رووبارێ (خەوسەری) بڕی، ئەم گەهشتین گوندێ (نەرگەزلیێ) ئێزدیبان، ٣٠-٤٠ مالبوون. ئەم دەمژمێرەكا دن رێڤەچووین گەهشتینە گوندێ (ئێسفنێ). ئەڤ گوندە ژی تام ئێزدینە، ٦٠- ٧٠ مالن. ئێسفنێ دكەڤیتە سەر گرەكێ بەرفرەهـ، مە دو ئاش (ئاشێن ئاڤێ) و خاسەكێ (مەزارەكێ) ئێزدیبان، ل وێدێ دیتن. مە شەڤا خۆژی ل وێدێ بوراند. سپێدێ مە دا رێ، ئەم گەهشتن گوندێ (شكەفت هندیان). پشتی ٤٥ خۆلەكان ب پیا، بەرف سمتێ دەستێ چەپێ، ئەم گەهشتین مەزارێ شێخادی، دووراتییا شێخادی ژ موصل ب پیا ١١ دەمژمێرن[١٠٨].

- ژ لایێ راستێ دەرگەهێ پەرستگەها شێخادی (لالەش)، دو بازن (دائیرە) و مارەكێ رەش هاتینەنەخشكرن. ل هنداڤ دەرگەهی میناكێن خەتیرەكێ، بڤرەكی، شەیەكێ مەزن، دو جانەوەرێن مینا سا، هاتینەكێشان (ب٩٦).

- كریستیانێن موصل دبێژن، پەرستگەها شێخادی دبەرێدا دێرەكا وان بوو. ئەژی (بێرێزین) ل وێ هزرێ مە. دبە ئێزدیبان دێر د سەدساڵیا شازدێ زاینیدا، ژ كریستانیان ستاندبیت[١٠٩].

## ١٤. دەروێش پاشا ١٨٥٢ز.

ساڵا ١٨٥٢ سەروكێ لیژنا ئوسمانلی بوو، بۆ دیاركرنا تخۆبێن دەولەتێن ئوسمانی - ئیرانی. ئەو بهوست بهوست ل هەموو دەڤەرێن سەر سنووران گەڕیایە، گەلەك تشت ل سەر كوردێن دەڤەرێن تخۆبان نڤێسینە. بۆ نموونە سەبارا سنجەڤا ئامێدیێ نڤیسییە: سەردەمێ فەروەرێ وێ (حاكمێ

ژنەكا كورد، زارۆك ل ملی، ساڵا ١٨٧٣.



ژ پەرتوكا: رحلة نيقولا سيوفي، ب ٩٣

وێ) سماهیل پاشا (١٧٦٨-١٧٩٨) دەڤەرا بەردەسۆر (بۆتان)، تەرگەڤەر و مەرگەڤەر (هەكاری)، شكاكان، شكەفتیان، برادوستیان ... هەمو ل ژێر فەرووەریا ئامێدیێ بون. گەلەك خاكێ ڤان دەڤەرێن مە هژمارتین، زڤستانێ دهاتنه دەڤەرا ناڤكورێ، ژووریا چیایێ مەقلوب. ئەڤە و كارێزێن خازر و گومل (وەك جهەكێ گەرمیان)، هەموو دكەڤنە هەرێما بەهدینان[١١٠].

## ١٥. جون ئوشەر J. Ussher (١٨٦٤ز).

جوغرافیناسەك ئنگلیزە، ل جۆرجیا، ئەرمینیا، ئاسیا بچووك، كوردستانێ، عیراقێ، ئیرانێ ... گەڕیایە. دیتنێن خۆ دپەرتووكەكێدا بن ناڤێ: A Journey from London to Persepolis .. ل لەندەن، سالا ١٨٦٥ چاپكرییە.

جون ئوشەر نڤیسییە:

- رووبارێ خابور، باژێرێ زاخۆ دكەڤیتەسەر. رووبارەكێ زراڤ و خارو ڤیچە، لێ كوور وبلەزە. ئاڤا وی زەلالە، تژی ماسیێن مەزنە. جهێ چریسەتێیە خەلكێ باژێرێ رۆژەكێ پێكول نەكرییە، وان ماسیان بگرن و مفایێ خوارنێ ژێ وەرگرن (ئەڤە سالا ١٨٦٤)[١١١].
- زاخۆ بۆ مەزنیبا خۆ تەمەت جزیرا بۆتانە (ئیبن عومەر)، لێ ژ بۆتان پێشكەتیتر وگەشترە. خەلكێ وێ كورد وكلدانینە[١١٢].
- (ئوشەر) زاخۆ دهێلیت، بەرف موصل دكەڤیتە رێ، چیایێ سپی دبڕیت ئەو دبێژتێ (زاخۆداغ)، ب هزرا وی نەیێ بلندە. دنڤێسە: ئەز درێ یا دەهـ هزار لەشكەرێ گریكی را دەربازبووم، ئانكو د گەلیێ زاخۆ را (ب١٢٧). ئەڤە تەكەزەكا گرنگە ژ لایێ

كووچكا میرێن ئامێدیێ، سالا ١٨٨٥.



ژ پەرتووكا، سفرنامەء هنري بایندەر، ب ٢٢٨

گەڕوكەكێ ئەوروپی ڤە تێتەكرن، كو زەینوفون و لەشكەرێ وی، دەمێ زڤڕینێ د گەلیێ زاخۆرا بوریبوون[113]. پشتی گەلی (ئوشەر) دكەڤیتە رێ یا دەشتێ، حەتا دگەهیتە تلسقوف.

- ل ئێسفنێ میرێ ئێزدییان حوسێن بەگێ (كورێ عەلی بەگێ مەزن) دبینیت. دبێژیت، ئێزدییان (سێ) تەخێن دینی هەنە: شێخ، قەوال، فەقیر. نابیت ئێزدی ژ ژنەكێ پتر مارەكەن. بەرێ مرینێ خۆ ددەنە ستێرا قوتبی[114]، بەرێ نڤێژان ژی هەمان سەمتە. ب چاڤەكێ پیروز ل رۆژێ دنێرن، دبێژنێ شێخ شەمس (ب١٣٣).

## ١٦. گیلیوم لیجان
## G. Lejean (١٨٦٦ز).

گەڕوكەك فەرەنسیە، ل گەلەك دەڤەرێن ئەوروپا، ئاسیا، ئەفریقیا گەڕیایە. ئاخا دەولەتا ئوسمانی تێكڤەدایە، سالا ١٨٦٦ هاتییە كوردستانێ و عیراقێ، پاشی چوویە هندستانێ.

نڤیسییە: ئەز ل كوردستانێ گەڕیام، من سەرا ئامێدیێ و سەرا دۆلێن خۆش وبەلاڤێن نستۆرییان دا. پاشی چومە زاخۆ بۆ دیتنا شوینوارێن پڕ بهایێن وێ. داویێ گەهشتمە جهێ شەڕێ ئەربیلا[115]. ژ وێدێ بەرف بەغدا، بابل و كەنداڤی ب رێ كەتم[116].

## ١٧. نیقولا سیوفی
## N.Siouffi (١٨٧٣ز).

سیوفی كریستیانێ شامێ یە، رەگەزناما فەرەنسی وەرگرتییە. سالا ١٩٧٣ وەك كارمەند ل بالیۆزخانا فەرەنسی ل بەغدا، هاتەدامەزراندن. ئەڤ گەشتە هاتنا وی یە ب پیا، ژبەیروت بۆ بەغدا.

سیوفی نڤیسییە:

- رۆژا سێشەمبی، ١٤ چریا ئێكێ سالا ١٨٧٣، ئەم گەهشتینە پێشابور، جهێ رووبارێ خابور درێژیتە دیجلەی. بەری هنگی خابور دبازێرێ زاخۆ را هاتییە. مە گوندێ (سێمالكا) دیت، ئانكویا: سێ گوندا ددە[117].
- رۆژا چارشەمبی، ١٥ چریا ئێكێ ١٨٧٣، ئەم گەهشتینە گوندێ خانكێ (ئەوی نڤیسییە: قانق)، گوند دكەڤیتە سەر گرەكێ بلند، خەلكێ وی ئێزدینە (ب٥٢).
- رۆژا پێنجشەمبی، ١٦ چریا ئێكێ ١٨٧٣، ئەم كەهشتینە گوندێ (كەرهولێ)، گوندەكێ مەزنە، پاشی گەهشتینە گوندێ وانكێ (ئەوی نڤیسییە: وانـق) یێ ب چاندنا فێقی دەولەمەند، هنەك پشتی گوندی مە ناعورەك دیت، ئاڤێ ژ رووباری بلندكەت، بو ئاڤدان وچاندنێ (ب٥٤).
- رۆژا ئەینی، ١٧ چریا ئێكێ ١٨٧٣، ئەم گەهشتینە

دێرا رەبان هورمز ل چیایێ ئەلقوش، سالا ١٨٩٠،



ژ پەرتووكا، رحلات الى العراق يا بودج ، ج٢ ب ٣٠٧

گـونـدێ (رەشـيـديـێ)، پشـتـى نيڤرۆ ئەم گەهشتینە موصل (ب٥٥).

## ١٨. ژاك ڕێتورێ
J. Rhetore (١٨٧٨ز).

مزگینەرەكێ فەرەنسییە، هاتییە میزوپوتامیا، ئاسیا بچووك، فەلەستینێ، ئیرانێ، كوردستانێ. بەری بێتە بازێرێن كەركوك و سلێمانیێ، ئەو سالا ١٨٧٦ هاتییە دەڤەرێن زاخۆ، بەعشیقە و هەكاری ... مخابن وەرگێرێ پەرتووكا وی د.نەجاتی عەبدوللا، هێ ئەو گەشتا داویێ نە وەرگێڕایە كوردی.

ڕێتورێ نڤیسییە:

- هەركی عەشیرەتەكا كوچەرن، ب كوردیا دەڤەرا بەهدینان دپەیڤن. هاڤینا ژ بەر گەرمێ دگەل پەزێ خۆ، دچنە شەمزینان، ئەزەربێجان، ئورمێ ل ئیران[118] (زڤستانا دزڤڕن جهێن خۆ ل سۆران و بەهدینان).
- ژ موصل بەرف هەولێر چووین، مە رووبارێ خازری بری، پشتی دو دەمژمێران ئەم گەهشتینە زێی بەهدینان. یونانییان دكەڤندا دگوتە ڤی رووباری لیكیوس. ل ڤر شەرێ ئەربیلا[119] رووداية، دەمێ ئیسكەندەرێ مەزن ب سەر شاهێ فارس داریوش دا سەركەتی (ب٢٤).

## ١٩. هنری بایندەر
Henry Binder (١٨٨٥ز).

گەروكەك فەرەنسیە، ل وەلاتێن ئاسیا بچووك، جۆرجیا، ئەرمینیا، ئیرانێ، كوردستانێ، عیراقێ ...گەڕیایە. دیتنێن خۆ دپەرتووكەكێدا بناڤێ: Au Kurdistan En Mesopotamia et en Perse، Paris 1887 بەلاڤكرینە.

بایندەر نڤیسییە:

- ئامێدیێ دكەڤیتە سەر بانییەكا بلند و تەخت، نێزی ٣٠٠- ٤٠٠ مەتران ژ دەوروبەرێن خۆ بلندترە. باخێن وێ دلڤەكەرن، خەلك هاڤینێ ژ بازێری دەردكەڤیتە ناڤ باخ و بیستانان، تنێ بازرگان وجوهی تێدا دمینن. بازێر دبەرێدا كەلەكا ئاسێ بویە، مینا ژ شوینوارێن وێ خۆیایە[120].
- ژكارێن خەلكێ ئامێدیێ، رستن وچنینا دەستییە. هەمی رۆژان پوستەچییەك پوستێ نێڤبەرا وێ و موصلێدا دهینیت و دبەت (ب٣٤، ٣٦).
- ئەم ژدەرگەهێ رۆژئاڤا (دەرگەهێ موصل) دەركەتین، دەرگەهەك ئەنتیكەیە. كڤانێن دەرڤە جوان ب ئەندازەیی هاتینەئاڤاكرن، ب ئەرابیسكێ (نەخشێن عەرەبی) هاتینەخەملاندن، مارێن تێكئالیای ل سەر دیارن (ب٣٧).
- رووبارێ (سەرنێ) ژگارەی تێنەخارێ ودرێژبتە زێی بەهدینان. گوندێ (ئەرەدنا) گوندەكێ بچووكە، گرنگییا وی هندكە، نێزی ٣٠ مالانە. ل ناڤ باخێن وی تری، حولیك، هنار، كویز و فستەق ... هەنە (ب٣٩).
- رێیا ئامێدیێ - موصل، دگوندێ زاویتەرا، دێرا رەبان هورمزد، ئەلقوش را ... دچیت. نێڤبەرا زاویتە و دهۆك خەلك شەڤێ ژ بەر هرچ وبلنگان، ئاگری هلدكەن (ب٤٢).

## ٢٠. سێر ولیس بودج
S. W. Budge (١٨٩٠ - ١٨٩١ز).

بودج شوینوارناسەك بریتانیە، تنێ ل عیراقێ و مصرێ گەریایە. دیتنێن خۆ دپەرتووكەكا دو پرتدا، بن ناڤێ: By Nile and Tigris ل لەندەن، سالا ١٩٢٠ بەلاڤكرینە.

بودج نڤیسییە:

- رۆژا ٢٩ چریا دوێ ١٨٩٠، ئەم گەهشتینە (خەتارێ) گوندێ ئێزدیان، پاشی مە رووبارەكێ بچووك بری دبێژنێ (شەرەفیێ)، دوفدا رێیا مە كەتە دەشتەكا بەرفرەه، پشتی دەشتێ ئەم گەهشتین گوندێ (ئەلقوش)[121].
- پرانییا خەلكێ ئەلقوش نستۆرینە یانژی كلدانینە، تو هێڤكەیە سەروچاڤێن وان، دێ بوتە دیاربیت نفشێ وان كوردن. رۆژا ٢٠ چریا

دوێ ١٨٩٠، ل ئەلقوش من زیارەتا گووری (ناحوم) پێغەمبەری كر. گوور د ئودەیەكا بچووكدایە، ئەڤە مەزارگەهێ جوهیایە، جوهیێن دەڤەرێ سالانە تێنە پیروزباهییا وی(جـ٢ ب١٣٤).

- ل سەر داخوازا سەرۆكێ دێرا رەبان هورمزد، ئەم بەرف دێرێ هەلباسكی بەتەنێ بوین. دراستیدا دو دێرن، ئێك ل سەر ئێكێ هاتییەئاڤاكرن. رەبەنان (روهبانان) جهێن خۆ د كەڤراندا كولاینە. بەری من گەلەك گەروك و مزگینەران ناڤێن خۆ د ستونەكا دێرا مەزندا كولاینە وەك: ریچ، ماری ریچ، دكتور بێل، جوستن بێركنس ... هتد (جـ٢ ب١٣٤ - ١٣٦).
- رەبان هورمزد (دبێژن ل سەردەمێ بەزدیگوردێ ساسانی ژیایە) حەفت سالان ل دێرا (ئەبراهام ریشە) ل مەرگەهێ، نێڤبەرا ئاكرێ و شێخاندا، ژیایە. دوڤرا چوویە گوندێ (باعەدرێ)، پاشی ل سەر داخوازا ئەلقوشیان چوویە ئەلقوش و دێرا چیای لسەر ناڤێ خۆ، ب بیست هەیڤادا، ئاڤاكر (جـ٢ ب١٣٨ - ١٣٩).

## *سەدسالییا بیستێ ز.

### ١. دەبلیو، ئەی، ویگرام

### W. A. Wigram (١٩١٠ - ١٩٢١ز).

ویگرام پەرستەرەك (كاهنەك) ئنگلیزە. دگەل وەفدێ قەشێن دێرا كانتربوری Canterbury هاتە كوردستانێ، ب درستی هاتە هەكاریان، ب ئەگەرا چێكرنا ڤەكۆلینان ل سەر كەنیسا ئاسوریان. دیتنێن خۆ دپەرتووكەكێدا بن ناڤێ: The Cradle of Mankind ، سالا ١٩٢٢، ل لەندەن بەلاڤكرن.

ویگرام نڤیسییە:

- ئامێدیێ ل سەر بانییەكا تەخت وبلند هاتییەئاڤاكرن، رەخێن لێژێن بانیێ وەك دیوارێن وێ لێهاتینە. هاڤینێ بالیوزێ ئنگلیزی ژ گەرما موصل رەڤی و هاتە جەم من (جەم ویگرام) ل ئامێدیێ. ل وێدێ مە سەرێ مومیاكرێ گایەكێ چولێ دەڤەرا ئامێدیێ دیت، خۆدانێ وی كو خەلكێ ئامێدیێیە، گوتی ئەڤە رەنگەكێ گایێن چولی یە، ل چیایێن دەڤەرێ دژیت، نهو یێ كێمە و بەرف نەمانێیە[١٢٢].
- ئاكرێ باژێركەك چیاییە و مەزنە. ناڤەندا قایمقامێ تركی یە، ب والیێ موصل ڤە گرێدایە. كەسێ ژ لایێ ژێری ڤە بچیتە ناڤ باژێرێ، ئێكسەر دێ جوانی و بەدەویا ئاكرێ بینیت. خان ل باژێری بۆ نڤستنێ نەبوون، زێرەڤانێن مە بۆ نڤستنا شەڤەكێ، ئەم برینە مالا رێڤەبەرێ دارایێ باژێری (ب١٤١).
- ئێسڤنێ دكەڤیتە سەر بانییەكا بلند، هنداڤی دۆلەكێ، ل گوور چیڤانوكێن ئێزدییان، ئەڤە جهێ ئاڤاكرنا كەشتیا نوحی یە (ب١٠٦).
- ئەم گەهشتینە كەلها عەلی بەگێ میرێ ئێزدییان. مالەكا مەزنا ئاسێیە، ب دیواری ژهەمو لایانڤە دوورپێچكرییە. ئاڤەكا چاندنێ ژ كانیەكا ژورتر تێتەخارێ، ل دوور كەلهێ دزڤریت، خانییێن باعەدرێ ل سەر هەردو رەخێن ئاڤێ هاتینەئاڤاكرن. باعەدرێ ل دەڤەرا شێخان، جهەكێ سەرەكیێ ئێزدییانە. عەلی بەگ دژیێ ٤٥ سالیێ دایە، كەسەكێ زەلام باشە مینا هەمو خەلكێ چیان. كوركەكێ رەشێ بزێری تامدای ل سەر ملان بوو، دەرسوكا خۆیا سۆر دسەرێ خۆ پێچابو، چمكی هنەك سەرمایێ گرتبو (ب١٢٠ - ١٢١).
- ئەلقوش ب تەنشتا چیای ڤەیە، هاڤینێ گەلەكا گەرمە. گوورێ (ناحوم) پێغەمبەر ل وێدێ یە، پرانییا شروڤەكەرێن تەوراتێ تەكەزدكەن كو (ئەلقوشا) ناحوم ل گوندەكێ فەلەستینێیە، جهێ وی ئەڤرۆ ناهێتەزانین.
- دێرا رەبان هورمزد دكەڤیتە لایێ ژێریا چیایێ ئەلقوش، دبێژن د سەدسالییا هەشتێ زاینیدا هاتییەئاڤاكرن. رەبان هورمزد نستۆرییە، مارمەتی كو دێرا وی ل چیایێ مەقلوبیە، یەعقوبییە (ب١٣٠- ١٣١).
- عەبدی ئاغا، ئاغایێ (سندی وگولیا)[١٢٣] كەلهەكا

ئاسێ هەیە، لەشکەرێن میری چ جاران نەگەهشتینێ. ئەڤ کەلها ئاسێ بانییەکا بلندە، بانیا (تەنینێ)یە، ل سەر چیایێن بلندێن تژی ئاڤ وداروبار کەتیە(ب٣٢٥).

- گوندێ بارزان دکەڤیتە تەنشتا چیایێ (شرین)، چیا گوندی ژ دو لایانڤە هەمبێزدکەت. شێخ عەبدولسەلام شێخێ بارزان، گەنجە دژیێ ٢٨ سالیێدایە. مینا پرانیا خەلکێ چیا، بەژن ناڤنجیە، نەیێ قەلەوە، ب بزاڤ و لڤلڤینە، خۆدان رویەکێ ب سەهم و گرنژینە. دەستەکا نێزی وی ٣٠-٤٠ کەسانە، دەرسوک سۆرن، پرانیا وان ب تڤەنگێن رەنگێن شنایدەر ومارتینی نە، هەر ئێکی دەوروبەرێ ٢٠٠ فیشەکان دگەلن. هەمو گەلەك رێزا شێخێ خۆ دگرن. شێخ دکارێن خۆدا هیچ جوداهیێ نێڤبەرا کوردێن مووسلمان و کریستیاندا ناکەت، هەمو ل جەم وی وەکهەڤ ویەکسانن (ب١٥١، ١٥٥).

## ٢. ڤلهێلم لیتن

### W. Litten (١٩١٤ - ١٩١٥ز).

ل تەبریز سەرقونسولێ ئەلمانیا بوو. ل ئیرانێ، عیراقێ، ترکیا و کوردستانێ ... گەریایە. دیتنێن خۆ دپەرتووکەکێدا بن ناڤێ: Persishe Flitterwochen ل بەرلین سالا ١٩٢٥ بەلاڤکرینە[١٢٤].

لیتن نڤیسیە:

- رۆژا ١٥ رەشەمەهێ سالا ١٩١٥، ئەم گەهشتینە ناڤ عەشیرەتا بادینە/بادینی ل دەوروبەرێ رووبارێ خازر. ژ رووباری دەربازبووین گەهشتینە گوندێ سێکانی (ل ناڤ کورێ)، خەلکێ وی گەلەك د فەقیر و هەژاربوون. شەڤێ لبن کەپرەکا خراب نڤستین، گەلەك کێچ هەبون، کویخەیێ گوندی ل ویدێ نەبوو، دگەل خۆرت و گەنجێن گوندی چوبونە (جیهادێ)، ئانکو پشکداربیون دشەرێ جیهانیا ئێکێدا، تنێ خەلکێ پیر و کەتی دگوندیدا مابوون[١٢٥].

## ٣. مس جێرترود بێل

### Miss G. Bell (١٩١٧ - ١٩٢٦ز).

پشتی زانکۆیا ئوکسفورد تەڤاڤکری، ئەڤینا گەشت و گەریانان کەتە دلی. خۆ هیکرە زمانێ عەرەبی. بەری جەنگا جیهانیا ئێکێ هاتە نیڤ گراڤا عەرەبی، سوریێ، عیراقێ. دجەنگێدا جارەکا دن هاتە عیراقێ، دنێڤبەرا ١٩١٧- ١٩٢٦ دا لێ ژیایە. باراپتر سکرتێرا کاروبارێن رۆژهەلاتی، د دەزگەها کاروبارێن عەرەبیێن ب بریتانیاڤە گرێدای، بو.

مس بێل نڤیسیە:

- ل داویا چریا دویێ ١٩١٨، کولونێل لیچمان G. E. Leachman سەرەدانا باژێرێن تلەعفر، شنگار، زاخۆ، ئامێدیێ، دهۆك، پیرەکەپرا (گوندە)، ئاکرێ ...کر. دیت ئالایێ ترکان ل ڤان جهان هەمیان بلندکرییە، لەشکەر و کارمەندێن وانژی مایتە. رابو لەشکەر وکارمەند دوورئێخستن، ئالا ژی هەمی ئینانەخار، هاریکارێن فەروەرێن سیاسیێن ئنگلیز، ل وان باژێران هەمیان دامەزراندن[١٢٦].

- د حەفتیا ئێکێدا ژ مەها نیسانێ ١٩١٩، کابتن پیرسون Pearson هاریکارێ فەروەرێ سیاسیێ زاخۆ، ب سەرەدانەکێ بۆ چەسپاندنا تەناهیێ، چوو ناڤ عەشیرەتا گوییا، ب رێڤە گوییان بوسەیەك لبەرڤەدا وکوشتن (ب١٩٥).

- سالا ١٩١٩ لەشکەرێ ئنگلیزی ژ ئامێدیێ ڤەگەریا سوارەتوکا. کابتن ویلی willey هاریکارێ فەروەرێ سیاسیێ ئامێدیێ، ئەفسەر ماکدونالد، عوریف تروپ ب تنێ دگەل هێزەکا کوردی ل ئامێدیێ مان. ئەوێن ژ فەروەریا ئنگلیزی نەرازی ب دەلیڤە زانی، رابوون رۆژا ١٥ تیرمەهێ کارمەندێن ئنگلیز کوشتن، هێزا کوردی ژی گەهشت یاخیبوویا. ئەوێن ئەڤ کارەکری گویی، گولی و بەرواری بوون. رۆژا ٨ تەباخێ لەشکەرێ بریتانی گەهشت ئامێدیێ، بەدکار گرتن، کەسێن عەشیرەتا رەڤینە چیا، ئوپراسیونێن لەشکەری ل ئیلونێ، ب کوتاهی هاتن (ب٢١٩- ٢٢٠).

- پشتی كولونێل لیچمان هاتییەكوشتن، فەروەرییا سیاسیا موصل كەتەدەستێ كولونیل بل.J. H Bill ، ئەو دسەرەدانەكێدا چو ئاكرێ، گوژمەكێ پارا هاڤێتەسەر فارس ئاغایێ زێباری و بابەكر ئاغایێ زێباری، ئەڤە نەرازیبوون پێوەندی ب شێخ ئەحمەدێ بارزانی كر. وی ژی برایێ خۆ دگەل ٢٠ زەلامان، بۆ هاریكاریا وان فرێكرن، هەمی بوونە نێزی ١٠٠ كەسان. بوسەیەك ل گوندێ پیرەكەپرا بۆهەردو ئەفسەران ڤەدا، هەردو كوشتن. پاشی زێباری وبارزانییان بسەرئاكرێدا گرت و تالانكر. پشتی رۆژەكێ یان دوان جوداهی سەرا كەلەپیرتی، كەتە نێڤبەرا هەردو عەشیرەتان، بارزانی ڤەگەڕیان مالێن خۆ. كابتن كیرك.F. C Kirk رۆژا ٩ چریا دوێ، كاودان وەك بەرێ زڤراندن، ئاكرێ ژی رزگاركر، عەبدولقادر ئاغایێ شوشی ژ پشتەڤانێن مەبوو (ئانكو ژ پشتەڤانێن مس بێل بو) (ب٢٢٦- ٢٢٧).
- ل دەڤەرا موصل رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلە، نێڤبەرا رووباری وچیادا، شەبەك و صارلی دژین. دبێژن ئەڤە ژ دینزایەكێ نیهانینە (مەزهەبەكێ سرینە) یان شیعەیێن توندرەون. هنەك پێوەندیێن وان دگەل (ئەهلی حەق)، ئەوێن ل هەردو رەخێن رێیا قەسر شرین و كەرمەنشا دژین، هەنە (ب١٦٣).
- ئێزدی دنفش و زمانێ خۆدا كوردن. ل دەڤەرێ ١٨-٢٠ هزار كەسانە. مەزارگەهێ مەزنێ وان، ئەوێ تركا گەلەك جاران خرابكری، دكەڤیتە (گەلیێ) شێخادی ژووریا موصل. ئێزدی هاڤینێ تێنە زیارەتا وی. سەرۆكێ وانێ دینی و دنیایێ ئانكو (میر) ل باعەدرێ دژیت، پەرستەرێ مەزن (الكاهن الاكبر)[127] ل ئێسفنێ دژیت (ب١٥٧).

### ٤. دەبلیو. ئار. های W. R. Hay (١٩١٨ - ١٩٢٠ز).

ئەفسەرەك ئنگلیزبوو، بەری بێتە عیراقێ چوبو هندستانێ. سالا ١٩١٥ هاتیە عیراقێ، دو سالان بوویە فەروەرێ سیاسیێ باژێرێ هەولێر. سال ١٩٢٠ جارەكا دن وەك فەروەرێ سیاسی ڤەگەڕیایە هندستانێ. دیتنێن خۆ ل كوردستانێ دپەرتووكەكا دو پرتدا، بن ناڤێ:Two Years in Kurdistan سالا ١٩٢٠، ل لەندەن چاپكرینە. های نڤیسییە:

- پەیڤا زاب و زێ پەیڤێن كوردینە، كوردێن باشوور دبێژنە (الزاب الاعلی) زێی بەهدینان، دبێژنە (الزاب الاسفل) زێی كویێ[128].
- عەشیرەتا سورچی عەشیرەتەكا بووشن، نێزی ٤٠ گوندان هەنە، ئەوژی نێزی ٢٥٠ هزار كەسانە. نیڤ كوچەرن، هەیامەكێ ل دەڤەرا ئاكرێ دژین، هەیامەكا دن دچنە دەڤەرا رەواندز (ج١ ب٨٨، ١٠٣).
- رۆژا شەشێ چریا دوێ ١٩١٩، عەشیرەتا سورچی هێرشەك برەسەر باژێرێ ئاكرێ، باژێر گرت. رۆژا ٧ ێ هەمان هەیڤێ، پیشەنگ (نەقیب) لتلدیل، گوندێ بجیل، گوندێ شێخێ سورچییان شێخ عوبەیدوللا، بومبەبارانكر، چمكی دژی حوكمەتێ راوەستابوو (ج٢ ب٢٩، ١٨٦).
- مستر بلBill F. C فەروەرێ سیاسیێ موصل، پیشەنگ كەی. سكۆتK. Scott هاریكارێ فەروەرێ سیاسیێ ئاكرێ، هەردو ل گوندێ پیرەكەپرا، دەڤەرا زێبار، رۆژا ١٢ چریا ئێكێ سالا ١٩١٩ هاتنەكوشتن. پشتی دەمەكێ كورت هێزەكا لەشكەرێ عیراقێ چوونە ئاكرێ، پیرەكەپرا و بارزان. هنەك گوند هاتنەخرابكرن، مە بكوژ نەگرتن، هەرگیز كەسێ كورد، ل وەلاتێ وێ چیایی ناهێتەگرتن (ج١ ب٢٢١، ٢٢٥).
- ئێكەمین كەسێ ئنگلیز ل كوردستانێ هاتییەكوشتن، هاریكارێ فەروەرێ سیاسیێ ئاكرێ، پیشەنگ سی. بیرسونPearson بوو. ئەو مەها نیسانێ ١٩١٩ بێ چەك دنێڤ هنەك عەشیرەتێن زاخۆدا دگەڕیا. بدەستێ عەشیرەتا (گوییا) هاتەكوشتن. دیسان مەها تیرمەهێ، هەمان سالێ، پیشەنگ ویلیWilley هاریكارێ فەروەرێ سیاسیێ ئامێدیێ، هەر بدەستێ (گوییا) هاتەكوشتن(ج٢ ب١٨٥ - ١٨٦).

## ٥. سی. جەی. ئەدموندز
C. J. Edmonds (١٩١٩ - ١٩٢٥ز).

ل كوردستانێ، فارس و عیراقێ گەریایە. نێڤبەرا ١٩٢٠ - ١٩٢٥ ل كوردستانێ ئەفسەرێ سیاسی بوو. ٣٠ سالان كارمەندی ل عیراقێ كرییە، سەردەمەكێ راوێژكارێ ویزارەتا ناڤخۆیا عیراقێ بوو. پەرتووكا خۆ: كورد و ترك و عەرەب، بو هاریكاریا بریتانیا، سەبارا شەرەنیخا دنێڤبەرا وێ و تركیادا، ل سەر ئارێشا ویلایەتا موصل ١٩١٩ - ١٩٢٥ نڤیسییە.

ئەدموندز نڤیسییە:

- دەما ئەز گەهشتیم زاخۆ، ئەز (ئەدموندز) بوومە ئەڤینداری ئاووهەوایێ وێ. نێزی ٤٠٠٠ كەسان ل زاخۆ دژین، نیڤەكا وان جوهینە، چارێكەك كریستیانن، ییێن دن كوردێن مووسلمانن. زاخۆیا كەڤنار دكەڤیتە گراڤا (جزیرا) دنێڤا هەردو تایێن رووبارێ خابوردا. زاخۆ ناڤەندەكێ بازرڤانیێ گرنگە، ب چێكرنا كەلەكان ناڤدێرە. ل ئالێ ژووریا زاخۆیا كەڤن (گراڤێ) هۆستا كەلەكان چێدكەن، وەك شانەیا هنگڤینی دخەبتن. من نێزی دەهـ كەلەكێن تەڤاڤكری ل وێدێ دیتن، مەشكێن وان دپوڤداینە، بارێن وان دارێن سۆتنێنە، د ئامادەنە بەرف موصل بچن. بژلی گەلەكێن دن كو هێ درێیا تەڤاڤكرنێدانە[١٢٩].
- ئەز چوومە دیتنا بەرتراشێن (مەنحوتات) ئاشوریان ل گوندێ مالتایێ، ئەوێن دكەڤنە هنداڤی رووبارێ دهۆك ژ لایێ ژێریڤە. من چار كەڤالێن مەزن ١٨X٦٠پێیان دیتن، نڤێسین ل سەر تونەبوون. میناكێن رێپیڤانەكا دینی بوون، حەفت خۆداوەند ل سەر پشتا جانەوەرێن جودا جودا، ژ پیاڤەبوون. هنەك جانەوەر ئەفسانەیی بوون، شاهـ ل داویا هەر كەڤالەكێ ب رێورەسمێن پەرستنێ رادبوو. دبێژن ئەڤ كەڤالە ل سەردەمێ سەنحاریب ٧٥٠ ـ ٦٨١ ب.ز هاتینەنكراندن. بەری من قونسولێ فەرەنسی ل موصلRouet سەرەدانا بەرتراشێن مالتایێ كربوو. ئەو ئێكەمین ئەوروپی بوو سەرەدانا وێدێ كری و پەسنێن بەرتراشان، د

سێ كاغزێن رێكەفتی ١٨٤٥ دا نڤێسین، دان[١٣٠].

- بازێرێ شێخان (ئێسفنێ) دكەڤیتە ژووریا رۆژهەلاتێ موصل. خەلكێ وی كوردێن مووسلمان، ئێزدی و كریستیانن. تیلیكیTeliky وپاولسPauls رێپیڤانەكا جوان و رێكوپێكا كەشافا گوندێ (ئەلقوش) ل شێخان دیتن. ئەو تایبەتی بو پێشەوازیا وان هەردوان هاتبوون (ب٥٦٦).
- شەبەك كوردێن سنینە، ل ژووریا موصل دژین. ئەو كوردێن قزلباشن (ب٢٧٨).

## ٦. ئارچیبالد میلن هاملتون
A. M. Hamilton
(١٩٢٨ - ١٩٣٢).

ئەندازیارەكێ رێ و پرایێ ئنگلیزە، ل نیوزیلەندا ژدێبوویە. پشتی زانكۆیێ دگەل هێزا زەریایا بریتانیا كاركر. سالا ١٩٢٧ هاتە بەغدا، ١٩٢٨ وەك كارمەند، چو لیوا دیوانیە ل ژێریا عیراقێ. د هاڤینا ڤێ سالێدا بۆ ڤەكرنا رێیا هەولێر - حاجی ئومەران، بۆ رەواندز هاتەڤەگوهاستن. دنێڤبەرا ١٩٢٨ - ١٩٣٢ یدا ئەو رێ ڤەكر. دیتنێن خۆ دپەرتووكەكێدا بن ناڤێ:Road through Kurdistan-Travels in Northern Iraq سالا ١٩٣٧، ل لەندەن چاپكرن.

هاملتون نڤیسیە:

- سالا ١٩٣٢ شەر دنێڤبەرا هێزێن شێخ ئەحمەدێ بارزانی و شێخ رەشید (لولان) رووداـ گوندێ شێخ رەشید نێزی چادرگەها مەبوو. مرۆڤەكێ نەجهێ باوەرێ بوو. چ نەدگۆتە مە، چمكی مرۆڤێن وی مفا ژ دەرمان و دەرمانكرنا خەستەخانا مە ددیت. چ جاران سەرامە نەدایە، زەلامێن وی دهاتن، ئەو نەدهات. ب هزرا وی ئەز (هاملتون) مرۆڤەكێ كافرم![١٣١]
- دڤێ دۆلێدا (هاودیان) عەشیرەتا بارزان دژیت. هێزێن لەشكەرێ عیراقێ (١٩٣١) هاتنەسەر بارزان، شێخ ئەحمەدێ بارزانی بەرەڤانیكر. لەشكەر نەشیا دەڤەرێ داگیركەت. عیراقێ هاریكاریا

ئنگلیزی خازت، هێزا ئەسمانیا بریتانیا دەڤەرا بارزان بۆمبەبارانکر، شێخ ئەحمەد نەچاربوو خۆ تەسلیمی ترکا بکەت (ترکا پاشی شێخ زڤراندە جهێ وی، دەمێ زانی ئنگلیزی دڤێ ئاشوریان ل دەڤەرا بارزان ئاکنجیکەت). هەژی گوتنێیە، د شەڕیدا تەیارا دو فرۆکەڤانێن ئنگلیز ل بارزان کەت. شێخ ئەحمەد گەلەك رێزا وان فرۆکەڤانان گرت و ئازادکرن، ب مەرجێ ئەو چ کارێن دنێن دوژمنکاریێ دژی گوندێن وی و عەشیرەتا وی، نەکەن[132].

- سالەکێ پشتی ئەز (هاملتون) ڤەگەریایم لەندەن، من د رۆژنامێدا خاند: ل گوندێ (سێمێلێ) ٤٠ میلا (٦٤ کیلومەتران) ژووریا موصل، ل گوندێن تژی ژن و زارۆك ... کوشتنەکا گشتیا ئاسوریان، ژ لایێ میریا عیراقێڤە هاتەکرن. ٣١٥ تەرم هاتنەدیتن، ١٤ ئێخسیر ژی، ب خۆنساری هاتنەکوشتن[133].

## ٧. عەلی سەیدو گەورانی (١٩٣١).

سکرتێرێ ئەنجومەنا تەشریعیا ئوردونێ، سالا ١٩٣١ گەشتەکا درێژ، بو باشورێ کوردستانێ کر. دیتنێن خۆ دپەرتووکەکێدا بن ناڤێ: من عمان الی العمادیة .. ل قاهیرة، سالا ١٩٣٩ بەلاڤکرن. گەورانی نڤیسییە:

- مەکی بەگ قایمقامێ دهۆکە، مە فراڤین ل مالا وی خار. دهۆك قەزایە، ب لیوا موصل ڤە گرێدایە. دهۆك ل سەر هنەك گرێن نزم هاتییەئاڤاکرن. هنەك گر دروتن، هنەك ژی ب گژ و گیانە. باخ وبیستان ل دۆلا دهۆك پڕن، ب ئاڤا رووبارەکێ بچووکێ هشك نەبیت، دبێژنێ رووبارێ دهۆك، تێنەئاڤدان. رەزێن تری ل چیا، بانیا و دۆلان هەنە[134].

مەکی بەگێ قایمقام گوت، دهۆك (سێ) دەڤەرداری (ناحیە) هەنە: ١. دهۆك. ژ ١٠٠ گوندان پێکهاتییە. ٢. مزووری. ناڤەندا وێ گوندێ ئەتروشە (٣٠٠ مالن)، ژ ٢٠٠ گوندان پێکهاتییە. ٣. دۆسکی. ناڤەندا وێ گوندێ مانگێشکێیە، ژ ٩٠ گوندان پێکهاتییە.

- کارێن خەلکێ دهۆك چاندن، بازرگانی و رستنا جلکانە. هژمارا وان ٤٠٠٠ کەسن، ٢٥٠ جوهینە، ٣٥٠ کلدانن، یێن دن کوردن (ب١٦٢).

- دو فێرگەهـ ل دهۆك هەنە، فێرگەهەکا شەش پولی بۆ کوران، ئێکا دو پولی بۆ کچان. فێرگەهەك ل مانگێشکێ هەیە، دو ل دەڤەرداریا مزوری، ئێك ل ئەتروش، یادن ل پێدە. فێرگەهەك ژی ل گوندێ سێمێلێ هەیە (ب١٦٢).

- پشتی (سەرسنکی) رێیا ئوتومبێلێ بۆ ئامێدیێ نەبوو، پالا رێ چێدکر، ئەم ب دەوارا چووینە ئامێدیێ. ژ لایێ رۆژئاڤاڤە چووینە ژوور، دەرگەهێ کەڤن بوو، نەخشێن فارسی ل سەر هاتبوونەچێکرن. چووینە مالا قایمقامی ماجد بەگ، د خانیەکێ میرێن بەهدینان ڤە بوو (ب١٦٧).

- ئامێدیێ قەزایە، سێ دەڤەرداری هەنە: ١. ئامێدیێ ژ ١٧٠ گوندان پێکهاتییە. ٢. نێروە ورێکان ژ ٧٩ گوندان پێکهاتییە. ٣. بەرواری بالا ناڤەندا وێ کانی ماسێیە، ژ ٨٣ گوندان پێکهاتییە (ب١٦٨).

- خەلکێ دەڤەرێ ب چاندنێ، نەمازە سێڤا وهرمیکا، خۆدانکرنا تەرشی و مێشێن هنگڤینی .. ناڤدێرە (ب١٧٣).

- ئاکرێ قەزایە، دو دەڤەرداری هەنە: ١. حەفت عەشیرەت (العشائر السبعة) ناڤەندا وێ (بەردەرەشە)، ژ ٢٥٠ گوندان پێکهاتییە. ٢. سورچی ناڤەندا وێ (بجیل)ە، ژ ١٥٠ گوندان پێکهاتییە (ب١٨٣).

- ئاکرێ ب تەنشتا چیایەکێ روتڤەیە، مینا ستادەکا (مەدرەجەکا) رۆمانی تێتەبەرچاڤ ، سولاڤەك دیمەنێ وێ جوانتر لێدکە. ٤٠٠٠ کەس لێ دژین، فێرگەهەکا شەش پولی بۆ کوران هەیە، ب چاندنا برنجی وچێکرنا جل و کنجێن کوردی ناڤدێرە (ب١٨٣).

- شـێخان قەزایە، ژ ٦٨ گوندان پێكهاتییە (مخابـن گەورانی تنێ رێـزەك ل سـەر شـێخان نڤیسـیە، ب١٨٣).
- زاخۆ دكەڤیتە سەر خابورێ دیجلەی(١٣٥)، ئاڤا خابوری بۆ ڤەخوارنێ گرانە، گەلەك كلسا تێدا. ل باژێری رووبار دبیتە دو تا، گراڤەكێ (جزیرەكێ) چێدكەت، زاخۆیا كەڤن دگراڤێدایە. ٥٠٠٠ كەس ل زاخۆ دژین، كورد، جوهی ونستۆرینە (ب١٨٤).
- زاخۆ قەزایە، سێ دەڤەرداری هەنە: ١. سندی ٢. گولی ٣. سلێڤانی. هەمی قەزا ژ ٢٥٠ گوندان پێكهاتییە(ب١٨٤).

## ٨. هنری فیلد H. Field (١٩٣٤ - ١٩٥٠ز).

هنری فیلد سەروكێ دەستەكەكا ئەنتروپولوجی بوو، ل سەركیستێ زانكۆیا هارڤاردا ئەمریكی، دسالێن ١٩٣٤ - ١٩٥٠ دا هاتبوون عیراقێ و كوردستانێ، ب رامانا چێكرنا ڤەكۆلینان ل سەر خەلكێ وان.

هنری فیلد ڤەكۆلینێن دەستەكێ، دپەرتووكەكا دو پرتدا سالا ١٩٥٢، ل چاپخانا زانكۆیا ناڤبری چاپكرن. پرتا دوێ ل سەر ئەنتروپولوجیا كوردستانێیە، بن ناڤێ:The Anthropology of Iraq، part:2، Kurdistan هاتییەبەلاڤكرن.

فیلد نڤیسییە:

- ٦٥،٤١٪ ژ كوردێن دەڤەرا زاخۆ دبەژن ناڤنجینە، تێكراییا بلندیا وان نێڤبەرا ١٦٠ - ١٦٩،٩ سم. ٢٤،٠٦٪ دبەژن درێژن، تێكراییا بلندیا وان ١٧٠ - ١٧٩،٩ سم(١٣٦). سالا ١٩٣٤، ١٥٧٠ ئێزدی ل دەڤەرداریا دهۆك دژیان(١٣٧)، ١١٦ ژێ ل دەڤەرداریا مزوری (ئەتروش) دژیان(ب١٠٩).
- ٥٦٪ ژئێزدیێن شێخان دبەژن ناڤنجینە، تێكراییا بلندیا وان ١٦٠- ١٨٩،٩ سم. ٣٢٪ دبەژن درێژن، تێكراییا بلندیا وان ١٧٠ - ١٧٩،٩ سم (ب١٣٧).
- رەڤێسا Race (رەگەزێ) كوردێن مووسلمان و ئێزدی، قوقازینە - نفشێن (سلالات): ئەرمینوید Armenoid، بانیا ئیرانێ و دەریا ناڤەراست. ئاسوری ژ رەڤێسا قوقازینە - نفشێ ئەرمینوید. بانیا ئیرانێ ودەریا ناڤەراست دگەلدا تونە(١٣٨).

## ٨. دانا ئادەمز شمیدت D. A. Schmidt (١٩٦٢ - ١٩٦٣ز).

رۆژنامەڤانەك ئەمریكیە، پەیامنێرێ رۆژناما (نیویورك تایمس) بوو، دسالێن ١٩٦٢-١٩٦٣ ل كوردستانا باشوور گەڕیایە. دیتنێن خۆ دپەرتووكەكێدا بن ناڤێ:Journy among Brave Men ل بوستن، سالا ١٩٦٤ بەلاڤكرینە.

شمیدت نڤیسییە:

- رۆژا ٢١ ئادارێ ١٩٦٣ حەرەس قەومیێ عیراقێ، هێرشەك ئانی سەر باژێركێ (ئەلقوش)، كورد شیان سەركەفتی بەرامبەر راوەستن، هنەك ژێ كوشتن وهنەك ژێ ئێخسیركرن(١٣٩).
- دبێژنە ئێكەمین شەڕێ مەزنێ كوردا ل رۆژئاڤایێ (باشووری) كوردستانێ كری، شەڕێ گەلیێ زاویتە. شەڕی حەفت رۆژان ڤەكێشا، ژ ٤ چریا دوێ تا ١١ وێ، سالا ١٩٦١. هێزێن بارزانی دو فەوجێن پولیسان نێزی ١٠٠٠ پولیسان، ١٥٠٠ جاشان، پەلخاندن. گەلیێ زاویتە گەلیەك تەنگە، پیچەك دكەڤیتە ژووریا دهۆك(١٤٠)، گەلی ب درێژیا مێژویێ بو دانانا هزار بووسا (كەمینا) هاتییەبكارئینان (ب١٢٣).
- رۆژا ئێكێ نیسانێ ١٩٦٢، ل گەلیێ سپی نێزی زاخۆ، دەمێ ڤەگەڕیانا فەوجەكا ٦٠٠ كەسی بو موصل، ب رامانا خۆ ئامادەكرنا هێرشەكا نوو. كوردان ل گەلی هاڤیتێ، ١٥٠ سەرباز و(ئەفسەرێن مامۆستا)(١٤١) كوشتن. ٤ ئەفسەر، ١٧٣ سەرباز ژێ ئێخسیركرن. گەلەك چەك و ئوتومبێل گرتن، ٣٦ ئوتومبێل سۆتن، چمكی كوردان شوفێر و پانزین نینن (ب١٢٥).
- مە شوینوارێن كەلهەكێ، ل سەرێ چیایێ هنداڤی باژێركێ (تەروانش) دیتن. خەلكێ دەڤەرا دبێژن، ئەو كەلها میرەكێ كوردان بوو، تێدا دژی داگیركەرێن ترك بەرخۆداندكر. پاشی كەلها

خۆ هێلا و بۆ میرێ ئامێدیێ، (مخابن) ئەم ناڤێ میرێ نزانین (ب٢٤٣).

- رۆژا ١٨ خزیرانێ ١٩٦٢، کورد ل بازێرکێ (باتوفا) رۆژئاڤایێ زاخۆ، شیان هێزەکا لەشکەرێ عیراقێ، ژ ٢١ تانکا، ١٢ ئوتومبێلێن شەرکەر، ئێکینەیەکا (بەتاریەکا) تۆپان، ٩٢٠ جاشان پێکهاتبوو، ٢١ رۆژان هاویر و دووڕپێچکەن. لەشکەرێ دووڕپێچکری ژ کوردان هاریکاری خاست، کوردان رێ ڤەکر، پشتی لەشکەری ٢٩٠ کوشتی زیان داین (ب١٢٦ - ١٢٧).

- من (شمیدت) ئێکەمین نۆشدارێ کورد دگەل پێشمەرگەی، ل بارەگایێ (تالەبانی) ل چەمێ رێزان سالا ١٩٦٣ دیت. پاشی من زانی گەلەك نۆشدارێن کورد گەهشتنە رێزێن پێشمەرگەی (ب١٨٨).

- ئێك ژهاریکارێن ئەسعەد خۆشەوی، گەنجەك بۆ دگوتنێ: مەلا حەمدی. ئەڤی شفرێن بێ تێلێن لەشکەرێ عیراقێ ڤەدکرن و دخاندن. مەلا حەمدی ژیرەکێ نە نورمال بوو، شفرێن لەشکەری مینا پەرتووکان نورمال د خاندن. رۆژەکێ ب دەستوریا خۆشەوی دگەل مە هات، سۆحبەتێن وی گەلەك دلێن مە گەشکرن (ب٢٣٢).

## ژێدەر و پەراوێز:


١. Xenophon: The Persian Expedition. transleted by: Rex Warner. Penguin Books Ltd. London. 1952.

٢. دلبا گریکیا ئاناباسیسدا، توژەرێ ئەلمان نفیسییە: کاردوخی ئەڤرو کوردن. رۆژهەلاتا رووبارێ دیجلەی دژین. هێڤکە:
Xenophon: Anabasis-Griechische Klassiker Text. Herausgegeben von: Albert Linnenkigel.F. Schöningh Verlag. Paderborn. 1965. p. 127.

٢. Xenophon: The Persian Expedition. op. cit.. p.135

٣. Xenophon. Anabasis-der Züg der Zehntaüsend. übertragen von: Hans Feix. W. Goldmann Verlag. München. 1964. p.76.

٤. خەریتە، خارتە: وەرگێرانا پەیڤا Karte یالاتینییە، نە عەرەبییە. ل تك من ئەڤە ژ پەیڤا (نەخشە) زانستیترە. ع.م

٥. وەسا دیارە وەرگێرێ عەرەبی هێژا یەعقوب ئەفرام مەنصور چێکریە، ب گورۆڤێ خەتێ دەستییە و لسەر نفیسییە: المعرب.

٦. زینوفون، حملة العشرة آلاف ــ الحملة على فارس، ترجمة: یعقوب افرام منصور، منشورات مكتبة بسام، الموصل، ١٩٨٥، ب٢٩.

٧. گزنفون، بازگشت ده هزار یونانی، ترجمة: حسینقلی عماد السلطنة، انتشارات اساطیر، تهران، ١٣٨٣ش، ب ٣٦٩ (ب فارسی).

٨. فؤاد جمیل وافرام منصور یعقوب، بلاد الرافدین في الكتابات الیونانیة والرومانیة، منشورات المركز الاكادیمي للابحاث، بیروت، ٢٠١٥، ب١٤٧.

٩. دووراتیا نێڤبەرا هەولێر ــ دهۆك ١٥٧ كم، گەوگامێلا ١١١ كم ژ هەولێر (مینا ئاریانوس نڤیسی)، ٤٦ كم ژ دهۆك دوورە. ع.م

١٠. Smith. William: Dictionary of Greek and Roman Biography and Mythology. Little Brown and co.. Boston. 1867. 142-144.

١١. Irmscher. Johannes: Lexikon der Antike. Gondrom Verlag. Leipzig. ١٩٨٦. p. ٣٢.

١٢. امیانوس مارسلینوس، العراق في القرن الرابع المیلادي، ترجمة، فؤاد جمیل، شركة دار الوراق للنشر المحدودة، لندن، ٢٠٠٨، ب٤١.

١٣. هەرئەو ژێدەر، دەهمەنا نەمرە: ١.

١٤. امیانوس مارسلینوس، ژێدەرێ بەرێ، ب ٥٨ ــ ٥٩.

١٥. جەلالی: خێلەکا کوردییا دەستهەل و زەبەردەستە. ژ گەلەك بابکان و بنەمالان پێکهاتییە. پرانییا وێ ل سێکوژیێ نێڤبەرا ترکیا، ئیران و ئەرمینیا د ژیان، ل دەڤەرێن ماکو، بازیدێ، شەهرەزورێ ... د بەربەلاڤن. ئەڤە سەرشەڤین وێ، ب دیدەڤانیا (ئەلخەزرەجی) گەهشتنە ئاکرێ وئامێدیێ ژی (ب هزرا من ئەلخەزرەجی د ناڤێ ئاکرێدا شاشە. رامانا وێ: ئاگری یە، گری داغە، ب رێنڤیسا عەرەبی بویە: ئاکرێ!). دەولەتا ترکیا پشتی شورشا گریداغێ (١٩٢٧ - ١٩٣٠) ئەڤ عەشیرەتە تەراوبەراکر (هێڤکە: هنري فیلد، هوزەکانی کورد، وەرگێرانی: حوسین ئەحمەد جاف، دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٥، ب٨٠. دیسان: د.احمد عثمان ابوبکر وآخرون، عشائر کوردستان، رابطة کاوة للثقافة الكوردية، بیروت، ٢٠٠١، ب٣٨، ٢٣٠).

١٦. ابو دلف مسعر بن مهلهل الخزرجي ورحلته الى كوردستان خلال السنتين ٩٥١ - ٩٥٢م، تحقيق: د.حسام الدين النقشبندي، منشورات مؤسسة زين، السليمانية، ٢٠١٢، ب٣٠، ١٢٢.

١٧. بو نموونە هێڤکە: ياقوت بن عبدالله الحموي، معجم البلدان، جـ٤ ب٥٢٤. ابن الاثير، علي بن محمد الجزري، الكامل في التاريخ، جـ٦ ب٥٠٦،٥٠٧، جـ٧ ب٥٤٠. يوحنا بن كلدون، تاريخ يوسف بوسنايا، ب٥٦، ٨٢، ١٢٩...هتد.

١٨. ابن حوقل، محمد بن علي النصيبي، صورة الارض، مطابع بريل، ليدن، ١٩٨٣، ق١ ب٢١٧.

١٩. المقدسي، محمد بن احمد بن ابوبكر، احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، الدار العربية للموسوعات، بيروت، ١٩٨٧، ب١٢٣، ١٢٨.

٢٠. المقدسي، ژێدەرێ بەرێ، ب ١٢٨.

٢١. ياقوت بن عبدالله الحموي، معجم البلدان، دار احياء التراث العربي، بيروت، ١٩٩٧، جـ١ ب٥٥.

عیمادەلدین زەنگی کەلا ئامێدیێ نەئاڤاکریە. ئامێدیێ کەلەکا خورستییە، کەلێن خورستی وەك: ئامێدیێ، مێردینێ، بەدلیسێ، رەواندز ... ژکەلێن هەرە کەڤنارێن جیهانێ نە. ئاشکارە بەری دەولەتا میدی هەبویە، لێ ناڤێ خو ژ میدیان وەرگرتیە، ئامیدی/ئامیدیان. شوینوارێن ئاشب ئەڤرو دبێژنێ ئاشەوا، دکەڤیتە ژێری و بەرامبەر ئامێدیێ، ل زنجیرا چیایێ گارە.

٢٢. هەر ئەو ژێدەر، جـ٦ ب٣٣٨.

٢٣. هەرئەو ژێدەر، جـ٦ ب٣٤٨. ل ڤێرێ دا (ياقوت) دبێژێ عیمادەلدینێ زەنگی کەلا ئامێدیێ نووکریە نەئاڤاکریە! ئەڤە راستیا دەهمەنێ مە نڤیسی (نەمرە:٢١) دیاردکەت.

٢٤. هەر ئەو ژێدەر، جـ١ ب١٢٣.

٢٥. ياقوت نڤیسیە: ئەلقەلالی. ب هزرا من ناووسك و شکەفتن. ع.م

٢٦. هەر ئەو ژیدەر، جـ٤ ب٣٥٨. د ژێدەرادا ناڤێ وێ (دير الكلب) هاتییە، گوایە نەساخێن شوندەڤێ سەی، ل سەردەستێن قەشە و پەرستەرێن وێ ساخدبن.

٢٧. هەر ئەو ژیدەر، جـ٤ ب٢٨٤.

داسنی: ئێزدینە، ئەڤرۆ ژی کریستیانێن ئارامی دبێژنە وان: داسنائی.

داسن: دژێدەرادا وەك ناڤێ دەڤەرێ نە چیایەکی تنێ! هاتییە. بو نموونە دگەل ناڤێن دەڤەرێن: حەدیاب، زوزان، بیت نوهەدرا، مەرگەهە.. هاتییە. جارنا ناڤێ وێ دەڤەرا داسنا چیایی/مقاطعة داسن الجبلية، یان وەلاتێ داسن/بلاد داسن هاتییە (هێڤکە: توما المرجي، كتاب الرؤساء، تعريب: البير ابونا، المطبعة العصرية، الموصل، ١٩٦٦، ب٤٢، ٨٧، ١٣٨، ٢٣٣. دیسان البير ابونا، تاريخ الكنيسة السريانية الشرقية، دار المشرق، بيروت، ١٩٩٢، جـ١ ب١٥، ١٦٣. جـ٣ ب١٨٥).

٢٨. هەر ئەو ژیدەر، جـ٣ ب١٥٠.

٢٩. هەر ئەو ژێدەر جـ٣ ب١١٢.

حەبتون، حەفتون: دوورنیە حەفتەنون/حەفتەنوین بیت. گوندەکێ گولیانە د کەڤیتە دەڤەردارپا باتیفا. نێڤبەرا گوندێن (گرێ بیێ) ژ رۆژهەلاتیڤە، (کەشانێ) ژ لایێ رۆژئاڤاڤە (هێڤکە، حسن يوسف شيلاني، عشيرة الگلي ــ دراسة في علاقاتها الاجتماعية وتاريخها السياسي، مطبعة خاني، دهوك، ٢٠١٣، ب٢٨ - ٢٩).

٣٠. هەر ئەو ژێدەر، جـ٥ ب١٦٢.

٣١. هەر ئەو ژێدەر جـ٦ ب٣٥١.
٣٢. هەر ئەو ژیدەر، جـ٧ ب١٥٧.
٣٣. نافێ وێ گەلەك كەڤنارە، سالا ١٨٦ ب.ز نافێ وێ دنڤیسینێن میخیدا هاتییە. نافێ وێ مالتایێ Maltai هاتییە، نزانم كەنگی سرینیان كرە مەعلثایا؟ بو نافێ مالتایێ هێڤكە: Böhl, F. M. und Wieder F.: Die Lüke in der Relief grupp III von Maltai, AFO 13, 1939-1941, Tafel N. 33.
Von Eiksteds, Egon F.: Turken, Kurden, und Iraner seit dem Altertum, Gustav Fisher Verlag, Stuttgart, 1962, p. 103.
٣٤. یاقوت الحموي، ژێدەرێ بەرێ، جـ٨ ب٢٨٩.
٣٥. فەرسەنگ: پەیڤەكا پەهلەویە، عەرەبان كرینە (فرسخ). ئێك فەرسەنگ ٦ كیلومترن.
٣٦. مومیا Moumia : پەیڤەكا گریكییە، مادەیەكێ مینا ئەسفەلت و قیری یە. ژێیڤ دەرژێن كەڤران، ب رێیا خورست دەردكەڤە (د. محمد معین، فرهنگ فارسي، مؤسسة انتشارت امیر كبیر، تهران، ١٣٧١ش، جـ٤ ب٤٤٥١ ــ ٤٤٥٢، ب فارسي).
٣٧. یاقوت الحموي، ژێدەرێ بەرێ، جـ٨ ب٤٧٦.
٣٨. تەرجوم Targum: وەرگیرانێن هندەك دەقتەركێن/سفرێن تەوراتێ نە، بو زمانێ ئارامی.
٣٩. رحلة بنیامین التطیلي، ترجمة: عزرا حداد، شركة دار الوراق للنشر، بغداد، ٢٠١١، ب١٨٥ ــ ١٨٦.
٤٠. نافێ وێ درست، دائود مەناحیم كورێ سولەیمان كورێ روحی یە. وەسا دیارە ل ئامێدیێ ژ دێبوویە، چمكی دگەریانێ دا هاتییە: پشتی خاندنا خۆ ل بەغدا تەڤافكری، جارەكا دی ڤەگەریا ئامێدیێ (ثم عاد الى العمادیة ــ ب٢٤٥). هزر بۆ هندێ دچە، ئەڤ بۆیەرە سالا ٥٥٦ك/١١٦٠ز، ل سەردەمێ قطب الدین مەودود حاكمێ موصل، سەردەمێ خەلیفێ عەباسی المقتفی لامر الله روداییت.
٤١. حەبتون: هێڤكە دەهمەنا نەمرە: ٢٧.
٤٢. دوورنیە شاهێ عەجەمان وی سەردەمی سۆلتان ئەرسەلان كورێ توغرلێ سەلجوقی بیت (١١٦٠ ــ ١١٧٥ز)، چمكی هەڤچاخێ بۆیەرایە. ع.م
٤٣. تەبەرستان: دەڤەرەكا میژوییا بەرفرەهە، دكەڤیتە ژێرییا زەریا قەزوین. ئەڤرۆ ئاستانێن مازەندەران، گولستان، گەیلان وژوورییا سەمنان دگریت. میژوڤانێ نافدێر محەمەد كورێ جەریرێ تەبەری خەلكێ وێ دایە. رووبارێ گولان رود (ئەڤرو قزل ئوزەن) ل ئاستانا گەیلان، دەڤەرا تەبەرستان دبریت، ل جەم بازێرێ (كیا شەهر) درێژتە زەریا قەزوین (هێڤكە: عبدالرحمن مزوري، الوزن الجیبولیتیكی لمیاە الانهار في كوردستان، دار سبیریز للطباعة والنشر، دهوك، ٢٠١٢، ب٢٢٩ ــ ٢٤٠).
٤٤. Rübesamen, Hans E.: Die Reisen des Venezianers Marco polo, Wilhelm Heyne Verlag, München, 1963, p. 30.
٤٥. شیخ الربوة، محمد بن ابوطالب الدمشقي، نخبة الدهر في عجائب البر والبحر، تحقیق: غسان داؤود وآخرون، دار نور للدراسات والنشر، دمشق، ٢٠١٣، ب٢٤٢.
٤٦ د.عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقیة في تاریخ الكورد الحدیث وحضارتهم، وزارة الثقافة ــ المدیریة العامة للطباعة والنشر، اربیل، ٢٠٠٨، ب٣٣ ٣٤.
٤٧. Cartwright, John: The Preachers Travels, Thomas Throppe Publishing, London, ١٩١١, p. ٢٠-١.
٤٨. د.بطرس حداد (مترجم)، رحلات سبستیاني الى العراق في القرن السابع عشر، شركة الدیوان للطباعة، بغداد، ٢٠٠٤، ب٦٨ - ٦٩.
٤٩. هەرئەو ژێدەر، ب٩٥. دبێژن ناحوم نێڤبەرا ٧٢٠ ــ ٦٩٨ ب.ز ژیایە، ل گوندێ ئەلقوش دەڤەردارییا شێخان، بویە وژیایە. مخابن ژێدەرێن پشتەڤانییا ڤێ بۆچوونێ دكەن كێمن. پرانیا میژوڤانان ل وێ هزرێنە، ناحوم ل گوندەكێ جەلیل ل فەلەستین ژیایە (هێڤكە: د. بطرس عبدالملك وآخرون، ژێدرێ بەرێ، ب٩٤٤. دیسان: كوركیس عواد، گوتارا: بلدة القوش والنبي ناحوم، كوڤارا: النجم، هژمارا: ٥، سالا: ١٩٣٣، ب٤٠٣ ــ ٤٠٧).

٥٠. ب هزرا من باسی: سەرەكانیا (سەروكەهنیا) مزیركا/مزوركا دكە، كو كانیێن كاسا وحەبیبێ ل ویدێ نە. ع.م

٥١. ئەولیا چەلەبی، سیاحەتنامە ــ كورد لە مێژوی دراوسێكانیدا، وەرگێرانی: سەعید ناكام، لە چاپكراوەكانی كۆری زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٩، ب٥٧.

شەتی: مینا ئەولیا چەلەبی نڤیسی، رامانا وی زێی بەهدینانە، رووبار پشتی ژ قوبەهان دەردكەڤە، دچیتەسەر سپنێ زێی، پاشی ل جەم دێرالوك دریژیتە زێی بەهدینان. ع.م

٥٢. هەرئەو ژێدەر، دئەسلدا (كوردێ چومە) دوورنیە شاشیا چاپێ بیت.

٥٣. هەرئەو ژێدەر.

٥٤. نڤیسییە (عیمادی)، ئەز نەگەهشتم راستیا وێ، دوورنیە هەر ئدریسێ بەدلیسی بیت. ع.م

٥٥. هەر ئەوژێدەر، ب٩٦.

حەزو: ناڤێ وێ بەرێ ساسون بوو، دەڤەرەكا بچووكە دكەڤیتە لیوا موشێ، ویلایەتا بەدلیسێ(امیر شرفخان بدلیسي، شرفنامة، باهتمام: محمد عباسی، مؤسسة مطبوعات علمي، تهران، ١٣٤٣ش، ب١٣، دەهمەنین نەمرە: ٦، ٧، ب فارسی).

٥٦. د.عماد عبدالسلام رؤوف، ژێدەرێ بەرێ، ب٤٦. مێژوڤانان ئەنوەر مایي وبابا مەردوخ روحانی هژمارا كیسكان نە نڤیسییە، تنێ نڤیسییە: كوژمەكێ مەزنێ پارەی! (انور المائي، الاكراد في بهدينان، مطبعة الحصان، الموصل، ١٩٦٠، ب١٣٩. دیسان: بابا مردوخ روحانی، تاریخ مشاهیر كرد، انتشارات سروش، تهران، ١٣٧١ش، بخش دوم،جلد سوم، ب٣٤، ب فارسی).

٥٧. اوليا چلبي، الرحلة الى مصر والسودان وبلاد الحبش، ترجمة: احمد القطوري الصفصافي، منشورات المركز القومي للترجمة، القاهرة، ٢٠١٠، جـ١ ب٢٤٩. هێژا د.عمادعبدالسلام رؤوف نڤیسییە: ٢٠ هزار لەشكەر هەبوون! دوورنیە شاشیا چاپێ بە (د.عماد عبدالسلام رؤوف، ژێدەرێ بەرێ، ب٤٧).

٥٨. John S.Guest، The Yezidis A study in Survival، Routledge a. Paul Publishers، UK، London، 1987، p.43-53.

سەبارا دێربونا لالش: راستییەكا زانسی بۆ تونە. ناڤێ لالەش وەك دێر! د چو ژێدەرێن كەڤنێن ل سەر دێرێن دەڤەرێ ئاخفتین، نەهاتییە. بو نموونە ناڤێ وێ دیەرتووكێن: الديورة في مملكتي الفرس والعرب یا ئیشو عەدناح سەدسالیا شەشێ ز، التاريخ الصغير سەدسالیا حەفتێ ز، تاريخ يوسف بوسنايا سەدسالیا دەهێ ز، الديارات یا علي بن محمد الشابشتي سەدسالیا دەهێ ز، تاريخ ايليا برشينايا سەدسالیا یازدێ ز، الخزل والاديرة یا ياقوت الحموي سەدسالیا دوازدێ ز، البدور المسفرة في نعت الاديرة یا محمد بن محمود سەدسالیا چاردێ ز ... نەهاتییە. تنێ توما المرجي دبێژت: مار ئیسالاها دكووركەكا بچووكا ژووریا گوندێ لالەش پەرستن دكر. هێڤكە: هەڤوكا ژووریا گوندێ لالەش. ئەو كوورك دبە شكەفت با، دبە كونا جانەوەرەكی بە، ل دەوروبەرێن لالەش ... دێر نەبوو. لەوان ئەلبیر ئەبونا نڤیسییە: شوینوارێن دێران ل دەڤەرا لالەش تونە (توما اسقف المرج، كتاب الرؤساء، تعريب: البير ابونا، المطبعة العصرية، الموصل، ١٩٦٦، ب٢٥٧، دەهمەنا نەمرە: ٣).

٥٩. دیەرتووكا: رحله تاڤرنية الى العراق في القرن السابع عشر سنة ١٦٧٦م، چاپا الدار العربية للموسوعات، بيروت، ٢٠٠٦.

سالا ١٦٧٦ ل سەر ناڤێ پەرتوكێ شاشیە! پەرتووك ل پاریس دڤێ سالێدا هاتیەچاپكرن، چەوان گەشتا تاڤرنێ ژی دهەمان سالێدا بوویە؟ دچاپا بەغدادا، چاپخانا المعارف، سالا ١٩٤٤، چ سال ل سەر ناڤێ پەرتوكێ نینن. د.نەجاتێ عەبدوللا سالا گەشتا تاڤرنێ ١٦٣٢ز نڤیسییە، ب هزرا من ئەڤە راسترە (هێڤكە: د.نەجاتی عەبدوللا، كورد وكوردستان لە سەرچاوە فەرەنسیەكاندا، لە بلاوكراوەكانی ئەكادیمیای كوردی، هەولێر، ٢٠٠٩، ب٢٤٠ ــ ٢٤١).

٦٠. جي، بي، تاڤرنيه، رحلة تاڤرنيه الى العراق في القرن السبع عشر، ترجمة: كوركيس عواد وبشير فرنسيس، الدار العربية للموسوعات، بيروت، ٢٠٠٦، ب٨٦.

٦١. بەهرام پاشا كورێ زوبێر پاشا، دنێڤبەرا ١٧١٩ ــ ١٧٦٨ز فەروەری گێرایە.

٦٢. كارستن نیبور، رحلة نيبور الكاملة الى العراق، ترجمة: سعاد هادي العمري وآخرون، دار الوراق للنشر، لندن، ٢٠١٢، ب٢٩٥.

٦٣. ئێك میلێ ئەلمانی ١٦٥٠ مترە.

٦٤. زاخو ل سەر رووبارێ خابوری یە.Karnib شاشیە، دوورنیەKabirn بە، نێزی خابیری یە.

٦٥. دومینیكو سیستینی، رحلة من ستانبول الى البصرة عام ١٧٨١م، ترجمة: د.بطرس حداد، مكتبة البصائر للطباعة والنشر، بیروت، ٢٠١٠، ب٢٤.

٦٦. جلیوم اولیفیه، رحلة اولیفیة الى العراق ١٧٩٤ - ١٧٩٦م، ترجمة: د.یوسف حبي، مطبوعات المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٨٨، ب ٥٨ - ٥٩.

٦٧. شەری ل (گرگوملی)، دەشتا ژووریا چیایێ مەقلوب رۆدایە. ع.م

٦٨. Compendiosa re la zone Istoria de la viaggi gatri da D. Lanza dell Ordino die predicatori da Roma in Oriente dallano 1753 fino al 1771.

٦٩. دومینیكو لانزا، الموصل في القرن الثامن عشر، ترجمة: روفائیل بیداوید، المطبعة الشرقیة الحدیثة، الموصل، ١٩٥٣، ب٦٢.

٧٠. پسمامێ وی بو (انور المائي، ب١٥٦).

٧١. دومینیكو لانزا، ژێدەرێ بەرێ، ب٦٣.

٧٢. ئەڤا نێڤبەرا دو كەڤاناندا، ژ انور المائي، ب١٥٦ هاتییە وەرگرتن. ع.م

٧٣. دومینیكو لانزا، ب٦٣، دەهمەنێ نەمرە: ١.

٧٤. أ. دوبریه، رحلة دوبریه الى العراق ١٨٠٧ ــ ١٨٠٩م، ترجمة: د.بطرس حداد، شركة بیت الوراق للنشر المحدودة، لندن، ٢٠١١، ب٤٤.
سەبارا رەهێن میرێن ئامێدیێ دگەهنە خەلیفێن كەڤنارێن بەغدا، راستیا زانستی بۆ ڤێ بۆچوونێ تونە (بو زێدە مفایی هێڤكە: عبدالرحمن مزوری، گوتارا: كاودانێن رەوشەنبیری ل میرگەها بەهدینان، كوڤارا: دیرۆك، هژمارا: ٥، سالا: ٢٠١٤، ب٥ - ٦).هەمان گوتار د ڤێ ئینسكلۆپیدیایێدا هاتییەبەلاڤكرن .

٧٥. توخTugh : تاجەكە یان ئالایەكە، ژیەرێن تەیران یان بژێێن هەسپان چێدكەن، ددانە قوماندااران یان میرێن میرگەهێن ئوسمانلی (ابراهیم اولغون، فرهنگ تركی ــ فارسی، انتشارات انزلی، ارومیة، ١٣٦٣ش، ب٤٦٣).

٧٦. چیایێ مەقلوب سنوورێ ژێریا میرگەها بەهدینان بوو، زێ بەهدینان سنوورێ رۆژهەلاتی بوو. ع.م

٧٧. نستۆری: تەخلیتەك كریستیانایە، ناڤێ خو ژ نستۆریوس Nestorius وەرگرتییە. نستۆریوس نێڤبەرا ٣٨٠ ــ ٤٥١ز ژیایە، سالا ٤٢٨ز بوو پەترەكێ باژێرێ قوستەنتین پول. ب هزرا وی (مەسیح) مرۆڤە، دەیكا وی مریەم نەدەیكا خودێیە. ئەنجومەنێ ئەفسوسEphese سالا ٤٣١ز ئەو ژ دینێ كریستانی بێ بەهركر، بو كەڤیرا لیبیا هاتە دوورئێخستن (د. محمد معین، فرهنگ فارسی، مؤسسة انتشارات امیر كبیر، تهران، ١٣٧١ش، جـ٦ ب٢١٢٠).

٧٨. نهو قوچانس دەرڤەی دەڤەرا بەهدینانە، دكەڤیتە هەكاریا. ع.م

79. Kinneir، Tohn M.: Journy through Asia Minor، Armenia and Koordistan 1813-1814، John Murray Publishers، London، 1818، p. 459.

٨٠. پییر دي فوسیل، الحیاة في العراق بین ١٨١٤ - ١٩١٤م، ترجمة: د.اكرم فاضل، شركة دار الوراق للنشر المحدودة، لندن، ٢٠٠٦، ب١٣٥ - ١٣٦.

٨١. جیمس بوكینكهام، رحلتي الى العراق سنة ١٨١٦، ترجمة: سلیم طه التكریتي، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٦٨، جـ١ ب١٠١، ١١٧.

٨٢. هەرئەو ژێدەر، جـ١ ب١٠٧.
رووبارێ زێبار: ناڤێ وێ درست رووبارێ زێ یە. زێ د ئامێدیێ را ناچیت، بەلكو ئاڤا رووبارێ ئامێدیێ پشتی د رێژیتە سپنەی، ل دێرالوك تێتەسەر زێ. گەلەك راستە زێباریێن ناڤێ خو ژ رووبارێ زێ وەرگرتییە، بەلكو بارزانیان ژێ. زێبار، زێبەر ئانكو بەرزێ، بارزان ژی بەرزێ یە. ع.م

٨٣. ولیم هوید، رحلة من ساحل مالابار الى القسطنطینیة، ترجمة: د. سعاد محمد خضر، بنكەی ژین، السلیمانیة، ٢٠١١، ب١٩٦.

٨٤. هەرئەو هژێدەر، ب١٩٩.
سولەیمانێ مەزن: هوڤێ مەزن (سێ) هێرش ئینایەنەسەر ئێزدیان دسالێن: ١٧٩١، ١٧٩٤، ١٧٩٥ (هێڤكە: داؤود مراد الختاري، الحملات والفتاوي على الكورد الایزدیین في العهد العثماني، دار سبیریز للطباعة والنشر، دهوك، ٢٠١٠، ب١٢٠ ــ ١٢١).
ب درست ناهێتەزانین هویدW. Heude باسی كیش هێرشا دكە. ع.م

٨٥. هێڤکە: دەهمەنا نەمرە: ٧٤، ژ ڤیێ ڤەکۆلینێ.
٨٦. كلاوديوس جيمس ريج، رحلة ريج الى العراق عام ١٨٢٠م، ترجمة: بهاء الدين نوري، مطبعة السكك الحديدية، بغداد، ١٩٥١، ب١٠٦ ــ ١٠٧.
٨٧. هەرئەو ژێدەر، ب١٠٧، ١٩٧.
٨٨. هەرئەو ژێدەر.
٨٩. المنشىء البغدادي، محمد بن احمد الحسيني، رحلة المنشىء البغدادي الى العراق، ترجمها من الفارسية: عباس العزاوي، شركة دار الوراق للنشر المحدودة، لندن، ٢٠٠٨، ب١٣٣.
٩٠. مەحمود ئەفندي ئەلئالوسی دیەرتووکا خودا: نشوة المدام في العودة الى دار السلام، مطبعة ولاية بغداد، ١٢٩٣ك/١٨٧٦ز، ب٩٨ - ٩٩، ناڤێ ڤی گوندی (یاسین کەلەك) نڤیسییە، گەروکێ ئەلمان نیبور ناڤێ وی (عبدالعزيز) نڤیسییە (ب٣٢٠). نهو ناڤێ وی: کەلەکا یاسین ئاغایە. ع.م
٩١. جيمس فريزر، رحلة فريزر الى بغداد في ١٨٣٤م، ترجمة: جعفر الخياط، دار الرافدين للطباعة والنشر، بيروت، ٢٠١٤، ب١٤.
٩٢. دئەسلدا نڤیسییە (ئاکرێ)، ب هزرا من باسی (ئامێدیێ)یە، چمکی ناڤێ وێ ل داویا موڤکێ تێ. ع.م
٩٣. دئەسلدا نڤیسییە (سەید پاشا) ب هزرا من شاشیا چاپێیە.
٩٤. Ainsworth، William F.: Travels and Researches in Asia Minor، Chaldea and Aramenia، john W. Parker Publishing، London، 1944، Vol. 2، P. 192.
٩٥. Ibid، p ١٨١-٢.
٩٦. Ibid، Vol. 1، p. 119، 181.
٩٧. Ibid، Vol. 1، p.182، Vol. 2، p. 189.
٩٨. جێن پوژولا، گەشتنامەی پوژولا بو کوردستان ١٨٣٧ز، وەرگێرانی: د.نەجاتی عەبدوللا، لە بلاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠٠٩، ب٢٩.
٩٩. Badger، G. P.: The Nestorians and their Ritauls، J. Masters Publishers، London، 1952، Vol. 1، p. 98.
١٠٠. Ibid، p. 171.
١٠١. ئەبرەشی: ژ پارشا Parish گریکی هاتییە، ب ئاکویا: دەڤەر، هەرێم، ئەبرەشیێ مەتران یان ئەسقوف رێڤە دبە، قەشە وشەماشە هاریکاریا وی دکەن. ع.م
١٠٢. Layard، Austen H.: Nineveh and ist Remains، Edited by: H. F. Saggs، F. A. Prager Inc.، Publishers، New York، Washington، 1970، p. 144.
١٠٣. Ibid، p ١٤٥.
١٠٤. سەبارا عەباسیبونا میرێن ئامێدیێ هێڤکە: دەهمەنا نەمرە: ٧٤، ژ ڤیێ ڤەکۆلینێ.
١٠٥. اوستن هنري لايارد، مكتشفات اطلال نينوى وبابل مع رحلات الى ارمينيا وكوردستان والصحراء، ترجمة: شيرين ايبش، مطبوعات هيئة ابوظبي للسياحة والثقافة، ابوظبي، ٢٠١٤، ب٨٩.
١٠٦. لایارد دبێژتێ: دەشتا ئاشور!
١٠٧. ناڤێ وی هوسا دیەرتووکا: الرحالة الروس في الشرق الاوسط، یا بوریس م. دانتسیك دا، ب٢٤١ هاتییە، نڤیسییە: ئەڤە سالا ١٨٤٣ چویە جهێ پیروزێ ئێزدییان (لالەش)، لەوان منژی ناڤێ وی مینا بوریس م. دانتسیك نڤیسی. ع.م
١٠٨. هنري فيلد، جنوب كوردستان ــ دراسة انثروبولوجية، ترجمة: جرجيس فتح الله، دار آراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠١،ب ٩٢ - ٩٤.
١٠٩. هەرئەو ژێدەر، ب٩٩ ــ ١٠٠. سەبارا دیربونا پەرستگەها لالەش هێڤکە: دەهمەنا نەمرە: ٥٨ ژ ڤیێ ڤەکۆلینێ.
١١٠. د.نەجاتی عەبدوللا (وەرگێر): مێژوو کوردناسی، لە بلاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠١٤، ب٦٣ ــ ٦٤.
١١١. جون اوشر وآخرون، رحالة اوربيون في العراق، ترجمة: د.بطرس حداد وآخرون، شركة دار الوراق للنشر المحدودة، لندن، ٢٠١٠، ب١٢٦.

١١٢. هەرژێدەرێ بەرێ.
١١٣. هێڤکە: ڤەکۆلینا ل سەر زەینوفونی دڤێ گوتارێدا وئەنجامێن ڤەکۆلینێ.
١١٤. ستێرا قوتبی Polaris: ستێرەکا گەشا نیڤا ژوورا ئەردیە، نێزی جەمسەرێ ژووریە، نیڤا ستێرێن تەرمێ نحێ یە (الدب الاکبر) وەسا تێ بەرچاف، ئەڤ کۆمە ل دوور (پولاریس) د زڤرن. پولاریس ناڤێ خو ژ Pole وەرگرتییە. ئانکو: ژ جەمسەرێ قوتبی، وەرگرتیە. ع.م
١١٥. یاراست شەرێ گەوگامێلا/گرگوملی، مینا دژێدەرێن کەڤندا هاتی. چەکی هەولێر ژمەیدانا شەرێ دوورە.
١١٦. جون اوشر واخرون، ژێدەرێ بەرێ، ب١٩٥.
١١٧. نیقولا سیوفي، رحلة نیقولا سیوفي عام ١٨٧٣م، نشرها: تیسیر خلف، دار التكوين للترجمة والنشر، دمشق، ٢٠٠٩، ب٥١. سیمالکا، دئەسلدا (سێ مانکا). ب کوردی سێ خانینە، سێ مالن. وەکو گوند دکەڤیتە کناری راستێ رووباری خابور. جاران کیلومترەك ژ زاخو دوور بو، نهو بویە تاخەك ژباژێری.
١١٨. ژاك رێتوری، گەشتنامەی مسیونێرێك بو ناوچەکانی کەرکوك وسلێمانی سالی ١٨٧٨، وەرگێرانی: نەجاتی عەبدوللا، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٨، ب٦٥.
١١٩. سەبارا شەرێ ئەربیلا هێڤکە: دەهمەنێ نەمرە: ١١٥ ژ ڤێ گوتارێ.
١٢٠. هنري بنديه، رحلة الى كوردستان في بلاد مابين النهرين سنة ١٨٨٥م، ترجمة: يوسف حبي، دار آراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠١، ب٣٢.
١٢١. سير وليس بدج، رحلات الى العراق، ترجمة: فؤاد جميل، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٦٨، جـ٢ ب١٣٣.
١٢٢. ويغرام، دبليو، اي و ويغرام، ادغار، تي، مهد البشرية ــ الحياة في شرق كوردستان، ترجمة: جرجيس فتح الله، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠١٢، ب ٦٢، ٢٩٧، ٣٣٩.
١٢٣. عەشیرەتا سندی وگولی تا سەردەمێ سادقێ برو ئێکبوون. دسەردەمێ(سادقیدا) بوونە دو عەشیرەت، سندی جودا وگولی جودا. ع.م
١٢٤. ل چاپخانا Georg Stilke Verlag هاتیەچاپکرن. ناڤێ وێ مینا دبەرتووکا: بیرەوەریەکانی لیتن دا، بەریەرێ شەشێدا هاتي، شاشیە. ع.م
١٢٥. لیتن، ڤیلهیلم، بیرەوەریەکانی لیتن، وەرگێرانی: محەمەد حەمە باقی، لە بلاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠١٤، ب١٥٣.
١٢٦. المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب، ترجمة: جعفر الخياط، مطبعة دار الكتب، بيروت، ١٩٧١، ب١٥٦.
١٢٧. رامانا مس بێل ژیەرستەرێ مەزن، بابەشێخە. ع.م
١٢٨. دبليو، آر، هي، سنتان في كوردستان، ترجمة: فؤاد جميل، مطابع دار الجاحظ، بغداد، ١٩٧٣، جـ١ ب٢٨. پرتا دوێ ژێ (جـ٢) ل هەمان سال وچاپخانا هاتیەچاپکرن.
١٢٩. سي، جي، ادموندز، كورد وترك وعرب، ترجمة: جرجيس فتح الله، دار آراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠١٢، ب٥٦٣ ــ ٥٦٤.
١٣٠. هەر ئەو ژێدەر، ب٥٦٩. هەرسێ کاغزێن روبێت Rouet دکوڤارا: الجمعية الآسيوية الملكية دا، جـ٧، سالا، ١٨٤٦، ب٢٨٠، هاتینەبەلاڤکرن.
١٣١. Hamilton، A. M.: Road through Kurdistan-Travels in Northern Iraq، Tauris P. Paperbacks Publishers، New York، 2010، p. 188.
١٣٢. Ibid، p.164.
١٣٣. Ibid، p. 223-4.
١٣٤. علي سيدو الكوراني، من عمان الى العمادية او جولة في كوردستان الجنوبية، دار آراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠١٢، ب١٦٠.
١٣٥. خابورێ فوراتی ژی هەیە.
١٣٦. هنري فيلد، جنوب كوردستان - دراسة انثروبولوجية، ترجمة: جرجيس فتح الله، دار آراس للطبعة والنشر، اربيل، ٢٠٠١،ب٨٠ - ٨١.

١٣٧. دهۆك وی دەمی قەزابوو، نزانم چما نڤیسییە: ناحیە دهۆك؟دبیت مەرەماوی ناحیا مەرکەزێ دهۆکێ بیت کو وێ سالێ هەبوو.

١٣٨. هنري فیلد، ژێدەرێ بەرێ، ب٧٩ ـ ٨٠، ١٣٩، ١٥٦.

١٣٩. دانا آدمز شمیدت، رحلة الى رجال شجعان في کوردستان، ترجمة: جرجیس فتح الله، دار آراس للطباعة والنشر، اربیل، ١٩٩٩، ب٣٧٣.

١٤٠. دئەسلدا نڤیسییە: نێزی زاخو، ئاشکەرایە شاشیە.

١٤١.درست (ضابط صف)کوردان کریە: ئەفسەرێن مامۆستا! ع.م

# سەروبەرێ کارگێریێ دەڤەرا بەهدینان
# پشتی سەردەمێ میرگەها بەهدینان

موسەدەق توفی

بەهدینان یان بادینان هەردو پەیڤ ب یەك رامان دهێن، بۆ وێ دەڤــەرا جوگرافی دهێتەگۆتن یا ژ سەدسالیا ١٣ز ڤە هەتا نیڤا دووێ ژ سەدسالیا ١٩ز* میرگەهەك ژێ پێكدهات د ژێدەرێن دیرۆكیدا ب میرگەها ئامێدیێ یان میرگەها بەهدینان یان بادینان ئاماژە پێ دهێتەكرن و گەلەك جاران ژی ب میرگەها ئامێدیێ (امارە العمادیة) هاتیەناڤكرن. یا گرنگ بۆ مە كو مژارا سەرەكییا ئینسكلوپیدیا پارێزگەها دهۆكێ یە، پارێزگەها دهۆكێ یا نها هەتا ئاستەكێ مەزن هەمان سنوورێ دیرۆكیێ میرگەها بەهدینان یان بادینانە.

یەكەمین ژێدەرێ تایبەت ب میرگەها بەهدینان هاتییەنڤیسین دەربارەی جهێ میرگەهێ دبێژیت: دكەڤیتە داویا ژووریێ رۆژئاڤایێ عیراقێ رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلە، ل ئالیێ رۆژهەلات و رۆژئاڤایڤە خاكێ كۆمارێ تركیا سنوورێن وێ پێكدئینن كو دبنە پشكا رۆژئاڤای ژ هەكاری یا كەڤن و چیایێن تیاری یێن سەخت وان ژێكجودا دكەت[1].

ژێدەرەك دبێژیت: میرگەها بەهدینان- بادینان ل رۆژهەلاتی دگەهشتە میرگەها سۆران، ل رۆژئاڤای دگەهشتە میرگەها بۆتان، باكووێ وێ میرگەها هەكاری و باشوور ژێ چیایێ مەقلوب و رووبارێ دیجلە بوون[2].

ڤەكۆلەرەك ئاماژە پێ دكــەت ژ دەسپێكا سەدسالیا شازدێ زایینیڤە میرگەها بەهدینان سنوورەكێ ناسكری و باوەرپێكری هەبوویە كو: ب رەنگێ خیچەكا ئاشوپی بوو ژ ئەسكی مووسل بەرەف رۆژهەلاتی درێژدبوو د چیایێ مەقلوب را دەربازدبوو هەتا دگەهشتە لێڤارێن رووبارێ گۆملی، ئەڤ خیچا ئاشوپی بەهدینان ژ ویلایەتا مووسلێ جودا دكر. ل ژێریێ رۆژهەلاتی ژێ رووبارێ زێیێ مەزن (زێی بەهدینان) مینا خیچەكا ئاشوپی سنوورێ ناڤبەرا وێ و میرگەها سۆران بوو، ئەڤ خیچە بەرەف باكووری درێژ دبوو د دەڤەرا برادوست را دەرباز دبوو هەتا ل رۆژهەلاتی دگەهشتە سنوورێ ئیرانێ. ژ ئالیێ باكوورێ رۆژهەلاتیڤە دگەهشتە میرگەها شەمدینا و ل باكووری ژێ دگەهشتە میرگەها هەكاری، زنجیرا چیایێن ئورەمارێ كو ب چیایێن تیاری دهێنەنیاسین سنوورێ ناڤبەرا هەردو میرگەهان بوو. هندیكە سنوورێ وێ یێ ژووریێ رۆژئاڤا و رۆژئاڤایە دگەهشتە

میرگەها بۆتان، خالا پێشسیبابورێ و رووبارێ هیزل و چیایێ شەرنەخێ رووبارێ دیجلە سنوورێ سروشتیێ ناڤبەرا وانە[٣].

ڤەکۆلەرەك دی دەربارەی سنوورێ بەهدینان دبێژیت: دەڤەرەکا بەرفرەهـ ژ باشوورێ کوردستانێ ڤەدگریت، مینا سێ گوشەکێ یە بنکێ ل باکوور و سەرێ وێ ل باشووری، خیچا سنوورێ ترکی - عیراقی یێ د ناڤبەرا هەردو رووبارێن زێی ل رۆژهەلاتی و دیجلەی ل رۆژئاڤای بنکێ سێگوشە ئانکو سنوورێ باکووری یێ بەهدینان پێکدئینن، هەردو لایێن سێگوشەی ژی ل رۆژئاڤای رووبارێ دیجلە و ل رۆژئاڤای رووبارێ زێ نە، گرنگترین باژێرێن وێ ژی زاخۆ و ئامێدیێ و دهۆك و ئاکرێ و بەردەرەش و تلکێف و قەرەقوش و باشیکێ نە هەتا کنارێ چەپێ رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلە ڤەدگریت. هەمان ڤەکۆلەر دیاردکەت بەری کو ل سالا ١٥١٦ میرگەها بەهدینان بکەڤیتە ژێر دەستەلاتێ دەولەتا ئوسمانی سنوورێ وێ دگەهشتە کەلا (الکشاف) خالا گەهشتنا رووبارێ زێی بۆ سەر دیجلەی، بەلێ ل سەردەمێ ئوسمانی سنوورێ وێ ل کێمێ دا هەتا ژ ئالیێ رۆژهەلاتیڤە خۆ ل دەڤەرا چیایی یا مووسلێ ڤەگرتی[٤].

هەمان ژێدەر ئاماژە ب کۆمەکا گوند و باژێرکان دکەت یێن پشتی دەستەلاتداریا ئوسمانی ل دەڤەرێ ژ ژێر دەستەلاتێ میرگەها بەهدینان دەرکەتین وەك قەرەقوش، بەرتەللە، باشیکێ و شێخان (عەینسفنێ) و ناحیا دێر مەقلوب و گوندێن کرملیس، بەحزانێ، خازر، دمرجی، وانکێ، بابنیت، بەرتەللە، کەشاف، باسخرە، خەتارێ، بروانە، قەزی کند، بۆزان، خورسباد، باقوفە، ئومەر قامچی، جەراحیێ تلسقوف، باتنایێ، شرفی، سەلامیێ، گەرماوا و پیرەستەك[٥]. کو هندەك ژ ڤان گوند و باژێرکان نها دکەڤنە د ناڤ سنوورێ کارگێرییێ پارێزگەها دهۆکێ و هندەك ژی دەڤەرێن کوردستانی یێن دەرڤەی کارگێریا هەرێما کوردستانێ نە.

ژ ڤێ پێداچوونێ دیاردبیت کو جوداهییەك وەسان د ناڤبەرا دەڤەرا بەهدینان یا دیرۆکی و سنوورێ نهایێ پارێزگەها دهۆکێ دا نینە و پارێزگەها دهۆکێ بەهدینانا بەری دەستەلاتێ ئوسمانی و پشتی دەستەلاتداریا ئوسمانی ب خۆڤە دگریت.

ل ڤێرێ پێدڤییە بێژین ل سالا ١٨٤٢ێ پشتی شکەستنا لەشکەرێ میرگەها بەهدینان بەرامبەری لەشکەرێ دەولەتا ئوسمانی ل دەڤەرا ئێتوێتێ (تاخێ ئێتوتێ یێ - دهۆکێ)، هێزێن بەهدینان بەرەڤ پاش ڤەکشیان و خۆ ل کەلا ئامێدیێ ئاسێ کر و پشتی چوار هەیڤێن دوورپێچکرنا ئامێدیێ دوا میرێ بەهدینان میر ئیسماعیل پاشایێ دووێ خۆ رادەستی لەشکەرێ ئوسمانی کر و ب ڤی رەنگێ ژیێ میرگەها بەهدینان ب داوی هات و ئەڤ دەڤەرە کەتە ژێردەستەلاتێ راستەوخۆیێ ویلایەتا مووسل یا ئوسمانی[٦].

هەروەك ژێدەر ئاماژە پێ دکەن د سەردەمێ میرگەهێدا ل وان دەڤەرا یێن راستەخۆ ل ژێردەستەلاتێ میرگەهێ چ پێکهاتێن کارگێری مینا قەزا و ناحیەیان نەبوون، و د پرانییا دەماندا کەسەکی ژ مالباتا میرێن ئامێدیی حوکمداری ل وان جهان ب تایبەت باژێرکێن مینا دهۆك، زاخۆ و ئاکرێ دکر[٧]، دەڤەرێن دی یێن ئاماژە پێکری کو ل ژێر دەستەلاتێ ویلایەتا مووسل بوون ئەو سەر ب وێ ویلایەتی بوون و ل دووڤ سیستەمێ کارگێرییێ وی سەردەمی یێ ئوسمانییان دهاتنە برێڤەبرن.

پشتی نەمانا میرگەها بەهدینان تەڤایی دەڤەر کەتە ژێر دەستەلاتێ راستەوخۆیێ ویلایەتا مووسل و ل دووڤ سیستەمێ کارگێریێ ویلایەتێ هاتنە برێڤەبەرن، هەژییە بێژین ل دووڤ وی سیستەمی ویلایەتا مووسل ژ سێ سنجەقان (لیوایان) پێکدهات، سەنتەرێ ویلایەتێ باژێرێ مووسلێ بوو، سێ سنجەق پێکهاتبوون سنجەقا مووسل (مەرکەزی) سەنتەرێ وێ ژی هەر ل مووسلێ بوو، سنجەقا شەهرەزور سەنتەرێ وێ ل کەرکووکێ بوو، سنجەقا سلێمانیی سەنتەرێ وێ ل سلێمانیێ بوو، هەر سنجەقەکێ چەند قەزایەك و هەر قەزایەکێ چەند ناحیەك ب خۆڤە دگرتن[٨].

هندیکە دەڤـەرا بەهدینانە سەر ب سنجەقا مووسلێ (مـەرکـەزی) ڤە بـوو، د دوا سالێن دەستەلاتداریا ئوسمانیدا ژ قەزایێن دهۆك، ئاكرێ، زێبار، ئامێدیێ و زاخۆ پێكدهات، هەردو ناحیەیێن (العشائر السبعە) بەردەرەش و شێخان ئەو سەر ب ناڤەندا قەزا مووسلێ بوون کو ئەو ژی هەر ل بازێرێ مووسلێ بوو[٩].

هەمان ئەڤ سەروبەرێ کارگێری پشتی نەمانا حکۆمەتا ئوسمانی هاتییەڤەگوهاستن بۆ حکۆمەتا شاهیا عیراقێ، د یەکەمین پێکهاتا کارگێریا سەردەمێ حکۆمەتا عیراقێ ژ ئالیێ وەزارەتا ناڤخۆییا عیراقێڤە هاتییەراگەهاندن هەیکەلێ کارگێرییێ دەڤەرا بەهدینان ب ڤێ رەنگی بوو:

- قەزا مووسل ناحییێن: شێخان و عەشائیرسەبعە
- قەزا ئاكرێ ناحییێن: سورچی و زێبار
- قەزا دهۆك: تنێ ناحیا مزووری
- قەزا ئامێدیێ ناحییێن: نێروەوریکان، بەرواری بالا، دۆسکی
- قەزا زاخۆ ناحییێن: سندی و گولی[١٠]

ئەڤە ئەو پێکهاتێن کارگێریێن دەڤەرا بەهدینان بوون یێن ژ دەولەتا ئوسمانی بۆ دەولەتا نوویا عیراقێ مایێن.

ئـەرێ ئـەڤ قـەزا و نـاحـیـەیـە کـەنگی هاتینەدامەزراندن...؟ سنوور و پێکهاتێن وانێن کارگێری و ژێیاتییا وان د چاوا بوون...؟ نها دێ ل بەرسڤا ڤان پرسیاران گەرین، بۆ ڤێ مەرەمێ ژی دێ ڤەکۆلینێ ل سەر چوار پشکان دابەشکەین: پێکهاتێن سەردەمێ ئوسمانی، پێکهاتێن سەردەمێ حکۆمەتا شاهیا عیراقێ، پێکهاتێن سەردەمێ کۆماری و دێ ب سەردەمێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ب داوی ئینین.

**- پێکهاتێن کارگێریێن سەردەمێ ئوسمانی:**

بۆ ڤێ مەرەمێ و د ڤێ قۆناغێدا پێدڤییە هەر قەزایەکێ جودا ژ یا دی بگرین، ژ بەرکو د ڤی سەردەمیدا هەر قەزایەکێ پێکهاتەك جودا و پێکیرییەك و ژێیاتییەك جودا ژ یا دی هەبوو، لەوما ژی دێ ب قەزا ئامێدیێ دەسپێکەین:

- **قەزا ئامێدیێ:** پشتی نەمانا میرگەها بەهدینان مەلبەندێ میرگەهێ ئامێدیێ وەك هەموو بازێرکێن دی یێن میرگەهێ کەتە ژێر دەستەلاتێ راستەخۆیێ دەولـەتا ئوسمانی ل دووڤ سیستەمێ کارگێریێ وێ دەولەتێ سەروبەرێ کارگێریێ ئامێدیێ ب ڤی رەنگی بوویە وەك د پەرتووکا (العمادية في مختلف العصور) دا هاتییە: پشتی ژ ناڤچوونا میرگەهێ ل سالا ١٢٥٢مش (١٨٣٦ز) ئامێدیێ ب ناڤێ قەزا سەر ب مووسلێ بوو، سالا ١٢٦٥مش (١٨٤٨ز) کەتییە دگەل ویلایەتا وانێ و قەزایەکا سەر ب لیوا هەکاری یا وێ ویلایەتێ بوو هەتا سالا ١٢٨٦مش (١٨٦٩ز) سەردەمێ والی مەدحەت پاشای بوویەڤە یەك ژ قەزایێن مووسلێ، ب ڤی رەنگی مایە هەتا سالا ١٣٠٠مش(١٨٨٢ز)، د ڤێ سالێدا جارەکا دی داینەڤە دگەل لیوا هەکاری و هەتا سالا ١٣١٠مش (١٨٩٢ز) ب ڤی رەنگی مایە، د ڤێ سالێدا زڤڕیەڤە سەر کارگێریا مووسلێ و ب ڤی رەنگی مایە هەتا نها (دەمێ نڤیسینا پەرتووکێ)[١١]*. ژێدەرەکێ دی ئاماژە ب ڤێ چەندێ کرییە کو پشتی نەمانا میرگەهێ ل سالا ١٨٤٢ێ ئامێدیێ کەتییە سەر مووسلێ، پاشتر سالا ١٨٤٩ێ داینە دگەل ویلایەتا وانێ، سالا ١٨٩٠ ئەڤ قەزایە داینەدگەل ویلایەتا مووسلێ، سالا ١٨٩٣ێ داینە دگەل لیوا کەرکووکێ، پاشتر ل سالا ١٨٩٤ێ جارەکا دی زڤڕاندینەڤە سەر لیوا مووسلی[١٢]، و ب درێژیا دەمێ مایی ژ ژینێ دەولەتا ئوسمانی مایە دگەل لیوا مووسلێ.

د پەرتووکا جوگرافیا وەلاتێن ئوسمانی یا قۆناغا ئامادەیی یا سالا ١٣١٨مش/ ١٩٠٠ز ئاماژە ب ئامێدیێ وەك یەك ژ قەزایێن لیوا مووسل هاتییەکرن، کو د وێ سالێدا ئەڤ لیوایە (سنجەقە) ژ شەش قەزایان (ئاکرێ، زێبار، دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ و شنگال) دگەل قەزا مەلبەندێ مووسل پێکدهات[١٣].

د پەرتووکا (بەهدینان فی سالنامات ولایە الموصل

العثمانیة)دا هەمان زانیاری دوبارە بووینەڤە و ئەو چەند لێ هاتییەزێدەكرن كو ل دووڤ سالناما ویلایەتا مووسلێ یا سالا ١٣٢٥مش/١٩٠٧ز ئامێدیێ قەزایەكا پلە ئێك بوو و دهەمان دەمدا زاخۆ قەزایەكا پلە دو و ئاكرێ و دهۆك پلە سێ بوون[١٤]. هندی پەیوەندی ب پێكهاتا كارگێرییا قەزا ئامێدیێ ڤە هەی، د ناڤبەرا ١٢٥٢مش نەمانا میرگەها بەهدینان هەتا سالا ١٣١٠ مش قەزا ئامێدیێ ژ پێنج ناحیەیان پێكدهات ئەو ژی: ناحیا مەلبەندێ ئامێدیێ، ناحیا بەرواری بالا مەلبەندێ ناحیێ ل كانی ماسێ بوو، ناحیا بەرواری ژێری وەك د ژێدەریدا هاتی ل داوێ داینە دگەل ناحیا مەلبەندێ ئامێدیێ، ناحیا نێروە مەلبەندێ وێ ل گوندێ بێبۆ بوو و ناحیا رێكان بوو بەلێ دگەل نێروە كرینە ئێك، د هەمان ژێدەردا هاتییە: نێروە عەشیرەتەك (قبیلە) بوو و رێكان عەشیرەتەك (قبیلە) بوو، ناڤێ هەردو عەشیرەتان دانە ناحیان، ب ڤی رەنگی رێكان ناحیەك بوو و نێروە ناحیەك پاشتر بوونە ئێك ناحیە ب ناڤێ نێروە رێكان[١٥]، وەك ژ سالناما ١٣٢٧مش/١٩٠٩ز هاتییەڤەگوهاستن ئامێدیێ ژ پێنج قەزایێن داودیێ، بەرواری بالا، بەرواری ژێری، رێكان و نێروە پێدهات[١٦]. ژێدەرەكێ دی ب هەمان شێوە و بۆ هەمان قۆناغ ئاماژە ب ناحیێن قەزا ئامێدیێ كرییە و ناحیا داودیێ ژی لێ زێدەكرییە و هژمارا گوندێن هەریەك ژ وان ب ڤی رەنگی دیاركرییە[١٧]:

| مەلبەندێ قەزایێ | ٤٣ گوند |
|---|---|
| بەرواری بالا | ٦١ گوند |
| بەرواری ژێری | ٣٥ گوند |
| رێكان | ٥٧ گوند |
| نێروە | ٣٥ گوند |
| داودیێ | ١٣٥ گوند |
| هەمی | ٣٦٦ گوند |

سالنامێن ویلایەتا مووسل یێن سالێن ١٣٢٥مش/١٩٠٧ز و ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز داكوكیێ ل سەر وێ چەندێ دكەن كو پێنج ناحیە سەر ب قەزایا ئامێدیێ ڤە بوون وەك پێشتر ئاماژە پێ هاتییەكرن ٣٦٦ گوند سەر ب وان ناحیان و مەلبەندێ ئامێدیێ ڤە بوون، مەزنترینی وان ناحیان ناحیا داودیێ بوو ١٣٥ گوند بوون و بچویكترینێن وان ژی هەردو ناحیێن بەرواری ژێری و نێروە بوون كو هەریەك ژ وان ٣٥ گوند هەبوون[١٨]. د ئەنجامدا ئەم دكارین بێژین د قۆناغا ناڤبەرا ١٨٤٢- ١٩١٤ و دەسپێكرنا شەرێ جیهانیێ ئێكێ، ئامێدیێ قەزایەكا سەر ب لیوا مووسل یا ویلایەتا مووسل بوو پاشتر بۆ دەمێ نێزیكی ٤٠ سالان سەر ب لیوا هەكاری یا ویلایەتا وانێ بوو، پاشتر زڤریەڤە سەر لیوا مووسل یا سەر ب ویلایەتا مووسلێ و بۆ دەمێ سالەكێ ژی داینە دگەل لیوا كەركووك یا ویلایەتا مووسلی و ب درێژیا ڤێ قۆناغی پێنج ناحیە دگەل ناحیا مەلبەندی ئانكو ئامێدیێ هەبوون و د قۆناغا درەنگتردا هەردو ناحیێن رێكان و نێروە داینە دگەل یەك و ناحیا بەرواری ژێری ژی داینە دگەل ناحیا مەلبەندێ ئامێدیێ. ل ڤێرێ پرسیارەك دهێتەكرن كەنگی ئامێدیێ بوویە قەزا...؟ ل دووڤ ژێدەرێن بەردەست پشتی نەمانا میرگەها بەهدینان ل سالا ١٨٤٢ێ د ناڤبەرا ١٨٤٢- ١٨٦٢ چەند كەسەك ب پلا رێڤەبەر (مدیر) بۆ برێڤەبرنا كاروبارێن ئامێدیێ دامەزراندینە، ل سالا ١٨٥٦ێ بوویە قەزا و یەكەم قائیمەقامێ وێ خەندان پاشا بوو، خەلكێ ئامێدیێ دژی وی سەرهلداینە و حكۆمەتا ئوسمانی ناچار بوویە ئێكێ دی ل شوونا وی ب ناڤێ شوكری بەگ دامەزراندییە و هێزەكا مەزنا جەندرمان دایە دگەلدا داكو دەستەلاتێ راستەوخۆیێ ئوسمانی ل وێرێ ب سەپینیت[١٩]».

د ژێدەراندا ب بەرفرەهی ئاماژە ب دیرۆكا دامەزراندنا ناحیێن دەڤەرا بەهدینان نەهاتییەكرن، تنێ د پەرتووكا (جوگرافیا وەلاتێن ئوسمانیدا) ئاماژە

ب هندەك ژ وان هاتییەكرن وەك: ناحیا داودیێ سالا ١٨٧٩، ناحیا بەرواری ١٣٢٨مش/١٩١٠ز، د جهەكێ دی یێ هەمان ژێدەردا ئاماژە ب عەشیرەتا بەرواری ژووری هاتییە كرن كو سالا ١٨٥٥ێ ناحیەكا سەر ب قەزا مەلبەندێ (مەركەزێ) مووسل یێ سەر ب ویلایەتا وانێ ڤە، ناحیا رێكان سالا ١٨٧٩ و ناحیا نێروە سالا ١٨٧٩ێ هاتینەدامەزراندن، هەمان ژێدەر ئاماژە ب دو ناحیەیێن دی یێن قەزا ئامێدیێ كرییە ئەو ژی ناحیا نهێلێ و ناحیا سپنە نە كو ل سالا ١٨٥٥ێ بووینە ناحیە وی دەمی ئامێدیێ سەر ویلایەتا وانێ بوویە بێی كو ئاماژە ب مەلبەندێ وان دو ناحیەیان و سالا هەلوەشاندنا وان بدەت[٢٠]، وەك پێشتر ئاماژە پێ هاتییەكرن ئامێدیێ د ناڤبەرا ١٨٤٩- ١٨٩٠یدا سەر ب ویلایەتا وانێ بوویە[٢١]، پتر سەلماندنا بوونا ڤان دو ناحیەیان دێ مە نێزیكی سالا ١٨٥٦ێ كەت كو پێشتر مە وەك سالا دامەزراندنا قەزا ئامێدیێ دیاركرییە.

- **قەزا زاخۆ:** زاخۆ ژی یەك ژ باژێركێن گرنگێن سەر ب میرگەها بەهدینان بوو، پشتی نەمانا میرگەهێ ل سالا ١٨٤٢ێ راستەوخۆ كەتییە ژێر دەستەلاتێ دەولەتا ئوسمانی، ژێدەرێن بەردەست ئاماژە نەكرییە سەروبەرێ كارگێریێ ل سالێن بەراهیێ یێن دەستەلاتداریا راستەوخۆیا دەولەتا ئوسمانی، ل دووڤ جوگرافیا ئوسمانی زاخۆ د ناڤبەرا ١٨٥٢- ١٨٥٤ێ سنجەقەكا (لیوایەكا) سەر ب ل ئیالەتا هەكاری بوویە، ل سالا ١٨٦٧ێ بوویە قەزایەكا سەر ب مووسل یا ویلایەتا بەغدا[٢٢]. بەلێ ژێدەرێن ڤێ داویێ ل جەم مە هاتینەنڤیسین پێكهاتینە ل سەر وێ چەندێ كو زاخۆ ل سالا ١٨٦٤ێ بوویە یەكەیەكا كارگێری ب پلا قەزایێ و سەر ب لیوا مووسل یا ویلایەتا مووسل یا ئوسمانی[٢٣]. هندی پەیوەندی ب سەروبەرێ وێ یێ كارگێریڤە هەی ل دووڤ سالناما ویلایەتا مووسلێ یا سالا ١٣٠٨مش/١٨٩٠ز تنێ ناحیەك ب ناڤێ ناحیا سلێڤانەیی سەر ب قەزا زاخۆ ڤە بوو، د سالناما ١٣١٠/ ١٨٩٢ز ئەڤ چەندە دوبارە بوویەڤە و دگەلدا گۆتییە كو زاخۆ قەزایەكا پلە دو بوو، بەلێ ل سالناما ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز هاتییە ئەو ناحیەیا سەر ب قەزا زاخۆڤە ناحیا سندی گولی یە، و ناحیا سندی گولی ل سالا ١٨٩٢ێ كو د وێ قۆناغێدا سەر ب سنجەقا هەكاری ڤە بوو جارەكا دی دگەل قەزا زاخۆ هاتییەڤەگرێدان، بەلی د سالناما ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ و ١٣٣٠مش/١٩١٢ ز ئاماژە ب دو ناحیەیان سندی گولی و سلێڤانەیی هاتییەكرن كو سەر ب قەزا زاخۆ ڤە بوون[٢٤]. د دوا سالنامەدا ئانكو سالناما ١٣٠٠مش/١٩١٢ز ئاماژە ب هندێ كرییە كو ١٠٩ گوند سەر ب باژێركێ زاخۆ و ناحیا سلێڤانەیی ٧٢ گوند سەر ب ناحیا سندی گولی بوون[٢٥]، د ئەنجامدا ئەم دكارین بێژین زاخۆ ژ سالا ١٨٦٤ یان ١٨٦٧یڤە قەزایەكا سەر ب لیوا مووسل ڤە بوو و تنێ دو ناحیا ب ناڤێ سندی گولی و سلێڤانەیی هەبوون و ئانكو سەرانسەری قەزایێ ١٨١ گوند بوون و ئەڤ سەریەرە هەتا داوییا دەستەلاتێ ئوسمانی یا بەردەوام بوو.

- **قەزا دهۆكێ:** دهۆك ژی مینا باژێرك و دەڤەرێن دی یێن میرگەها بەهدینان ژ سالا ١٨٤٢یڤە راستەوخۆ كەتە ژێر دەستەلاتێ ویلایەتا مووسل یا دەولەتا ئوسمانی. ل دووڤ بەلگەنامەكا سالا ١٨٥٠ێ د ڤێ سالێدا دهۆك ناحیە بوو[٢٦]، د ڤەكۆلینێن دیتردا ژی ئاماژە ب وێ چەندێ هاتییەكرن كو ل سالا ١٨٥٠ێ دهۆك بوویە ناحیە[٢٧]، ل سالا ١٢٩٠مش/ ١٨٧٣ز بوویە قەزایەكا سەر ب لیوا (سنجەقا) مووسل[٢٨]، ئەڤە یا بەربەلاڤە ل جەم هەموو وان كەسان یێن ڤەكۆلین ل سەر مێژووا كارگێریا دهۆكێ كرین، بەلێ د ژێدەرەكێ ڤێ داویێ دەست مە كەتی هاتییەدیاركرن كو: دهۆك سالا ١٨٥٥ێ قەزایەكا سەر ب ویلایەتا وانێ و سالا ١٨٦١ێ قەزایەكا سەر ب ویلایەتا مووسلێ بوو[٢٩]. ب ڤێ چەندێ ب قەزا بوونا

دهۆکێ ١٨ سالان دهێته پێش ژ وێ مێژوویێ یا هەتا نها مە دزانی و دێ بێتە یەك ژ یەکەمین باژێرکێن بەهدینان بووینە قەزا. هندی پەیوەندی ب پێکهاتا کارگێریا دهۆکێ ڤە هەی ل دووڤ سالناما ١٣٢٥مش/١٩٠٧- ١٩٠٨ز دهۆك قەزایەکا پلە سێ بوو و ل دووڤ سالناما ١٣٣٠مش/ ١٩١١- ١٩١٢زز تنێ ناحیەك سەر ب دهۆکێ ڤە بوو ئەو ژی ناحیا مزووری بوو کو مەلبەندێ وێ ل ئەتریش بوو. ل سالا ١٣١٢مش/١٨٩٤- ١٨٩٥ز ٩٠ گوند ١٠ ژ وانا د نەئاڤاکری بوون سەر ب دهۆکێ و ١٣٠ گوند ژ وانا ٣٥ گوندێن بەردای سەر ب ناحیا مزووری بوون، ل دووڤ سالناما ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز ٩٠ گوند سەر ب مەلبەندێ قەزا دهۆکێ بوون و ١١٦ گوند سەر ب ناحیا مزووری بوون[٣٠]. ل ڤێرێ پێدڤییە بێژین وەك سالنامان ئاماژە پێکری ناحیا مزووری ژ ناحیێن مەزن بوو و د شیاندایە وەك قەزایەکێ بیت، دڤێت وێ چەندێ ژی بێژین وەك ژێدەرەك ب ڤەگوهاستن ژ بەلگەنامەکا سالا ١٨٥٠ێ دیاردکەت ناحیا مزووری ل نیڤا سەدساڵیا نوزدێ قەزا بوو د دەمەکیدا د هەمان دیرۆکێدا دهۆك ناحیە بوو[٣١].

هندی پەیوەندی ب ناحیا مزووری (ئەتریش) ڤە هەی هاتییەگۆتن کو ل سالا ١٨٧٩ێ هاتییەدامەزراندن[٣٢]، بەلێ چ ژێدەر یان بەلگەنامەکا ب هێز نینە مە ل ڤێ چەندێ پشت راستکەت، بەلێ پشتگەرم ب بۆچوونێن چوویی ئەم دکارێن بێژین مزووری (ئەتریش) ل سالێن پێنجییان ژ سەدساڵیا نوزدێ ناحیە بوویە و دوور نابینین دگەل ب قەزابوونا دهۆکێ ئەو ژی ببیتە ناحیەیا ئێکانەیا سەر ب قەزا دهۆکێ، و دهۆك مایە ب تاکە ناحیا خۆ ناحیا مزووری هەتا دامەزراندنا حکۆمەتا عیراقێ وەك پێشتر ئاماژە پێ هاتییەکرن[٣٣].

- **قەزا ئاکرێ:** ئاکرێ ژی مینا باژێرك و دەڤەرێن دی یێن بەهدینان پشتی نەمانا میرگەهێ راستەوخۆ کەتییە ژێر دەستەلاتێ ئوسمانی، و ژ بەر نێزکییا وێ ژ باژێرێ مووسلێ سەر ب لیوا سەنتەرێ مووسلێ بوو، دەربارەی دامەزراندنا قەزا ئاکرێ ئەوا هەتا دەمەکێ نەدوور دهاتەزانین: ئاکرێ ل سالا ١٨٧٧ێ بوویە قەزا[٣٤]. بەلێ د بەلگەنامەکێدا د ناڤ ئەرشیفێ مالا مفتیێ ئاکرێ هاتییەدیتن دیاردبیت کو ل سالا ١٢٧٠مش/١٨٥٣ز ئاکرێ قەزا بوو[٣٥]، هەروەسان هەلبەستەکا ب زمانێ ترکییا ئوسمانی ژ ئالیێ مفتیێ ئاکرێ عەبدولرەحمان (خاکی ئاکرەیی) هاتییە نڤیسین ل سالا ١٢٨٩مش/١٨٧٢ز بخێرهاتنا قائیمەقامێ ئاکرێ سلێمان ئەلعومەری دکەت، هەروەسان هەلبەستەکا دی یا هەمان شاعری ل سالا پاشتر بخێرهاتنا قائیمەقامێ نوو حەسەن ئەفەندی دکەت[٣٦]. یا پتر مە ل ڤێ چەندێ پشتراستدکەت، د ناڤ جوگرافیا ویلایەتێن ئوسمانیدا ئاکرێ سەردەمەکێ سەر ب لیوا مووسل یا ویلایەتا بەغدا بوو[٣٧]، ئانکو د وێ قۆناغێدا مووسل لیوایەکا سەر ب بەغدا بوو و نە ئەو ب خۆ ویلایەت بوو، د ژێدەراندا ژی هاتییە کو ژ نیڤا سەدساڵیا نوزدێ زایینی هەتا سالا ١٨٧٩ی لیوا (سنجەق)یەکا سەر ب ویلایەتا بەغدا بوو[٣٨]، د ئەنجامدا ئەم دکارین بێژین ل دەسپێکا سالێن پێنجییان ژ سەدساڵیا نوزدێ ئاکرێ قەزایەکا سەر ب لیوا مووسلێ بوویە و ب ڤی رەنگی ئاکرێ یەك ژ دو باژێرکێن بەهدینانە یێن بەری یێن دیتر بووینە قەزا.

هندی پەیوەندی ب پێکهاتا کارگێریا قەزا ئاکرێ ڤە هەی د سالناما ویلایەتا مووسل یا سالا ١٣٠٨مش/ ١٨٩٠ز دا هاتییە قەزایێ تنێ ناحیەك هەیە ئەو ژی ناحیا (العشائر السبعە)یە، هەروەك دیار دبیت د ناڤبەرا سالا ١٨٩٠- ١٩١٢ێدا ناحیا (العشائر السبعە) ژ قەزا ئاکرێ هاتییەڤەقەتاندن و داینە دگەل قەزا مەلبەندی یا مووسلێ، لەوما د سالناما ١٣٣٠مش/١٩١٢ز ئاماژە ب دو ناحیەیان هاتییەکرن ئەو ژ ناحیا سورچی و زێبارن[٣٩]، ل دووڤ سالناما ١٣٣٠مش/١٩١٢ز ٨٧ گوند سەر

ب مەلبەندێ قەزایێ ئاکرێ و ٤٥ سەر ب ناحیا سورچی و ٧٢ سەر ب ناحیا زێبار بوون، سەرجەم ٢٠٤ گوند بوو[٤٠]. هەتا دەسپێکا دامەزراندنا حکۆمەتا عیراقێ ل سالا ١٩٢٢ێ قەزا ئاکرێ تنێ خۆدی دو ناحیەیان (سورچی و زێبار بوو[٤١]، هندیکە ناحیا سورچی یە تنێ ناڤێ وێ د سالناما سالا ١٣٣٠مش/١٩١٢ز دا هاتییە بەلێ د سالناما ١٣٢٧مش/١٩٠٩ز دا ناڤێ وێ نەهاتییە[٤٢]، ئەڤە ژی وێ چەندێ دیاردکەت کو دامەزراندنا ناحیا سورچی بۆ دەوروبەرێن سالا ١٩١٠ێ دزڤریتەڤە.

- **قەزا زێبار:** پشتی دەسپێکرنا دەستەلاتێ راستەوخۆیێ ئوسمانی ل دەڤەرا بەهدینان چەندین جاران ئاماژە ب زێبار وەك قەزایەکا سەربەخۆ و زێبار وەك ناحیە هاتییەکرن، ل نیڤا دووێ ژ سەدسالیا نوزدێ زێبار ناحیەکا سەر ب سنجەق (لیوا) مووسلێ بوو[٤٣]، ل ١٢ شەعبانا ١٢٩٥مش پێشنیازا گۆهرینا ناحیا زێبار بۆ قەزایێ ژ ئالیێ جڤاتا کارگێریا ویلایەتا بەغداڤە هاتییە بلندکرن بۆ جڤاتا شورا یا ئوسمانی، وان ژی پێشنیاز بلندکرییە بۆ سەرۆکوەزیران (صدر الاعظم) و وی ژی بلندکرییە بۆ سولتانێ ئوسمانی یێ ل ١ موحەرەما سالا ١٢٩٦مش/٢٦ کانوونا ئێکێ ١٨٧٨ز رەزامەندی ل سەر پێکئینانا قەزا زێبار دیار کری[٤٤]، ب ڤی رەنگی دامەزراندنا قەزا زێبار بۆ رۆژا ٢٦ کانوونا ئێکێ ١٨٧٨ێ دزڤریتەڤە. قەزا زێبار ژ ناحیا زێبار و ناحیا شێروان هاتییەپێکئینان، هەژییە بێژین ناحیا شێروان هەتا وی دەمی دو بەش بوو: شێروانا ژووری سەر ب قەزا رەواندزێ یا سنجەقا (شەهرەزور) کەرکووکێ بوو و شێروانا ژێری سەر ب قەزا ئاکرێ یا مووسلێ بوو[٤٥].

د سالنامێن ویلایەتا مووسل یا ئوسمانیدا ژ یەکەمین سالنامە ل سالا ١٣٠٨مش/١٨٩٠- ١٨٩١ز هەتا سالناما سالا ١٣٢٥مش/١٩٠٧- ١٩٠٨ز ئاماژە ب زێبار هاتییەکرن وەك قەزایەکا سەر ب لیوا مووسلێ ڤە[٤٦]و بەرێ وێ ژی هەر ژ نیڤا سەدسالییا نوزدێڤە زێبار ناحیەکا سەر ب قەزا ئاکرێ بوو، پشتی هەلوەشاندنا قەزا زێبار ناحیا شێروان و مزووری ژووری دگەل قەزا رەواندزێ هاتییەگرێدان و ناحیا زێبار کو سەنتەرێ وێ گوندێ بیرەکەپرا بوو ل دووڤ سالناما ١٣٢٥مش/١٩٠٧ز و ١٣٣٠مش/١٩١٢ز زڤرییەڤە سەر قەزا ئاکرێ[٤٧]. ب ڤی رەنگی ژیێ قەزا زێبار د ناڤبەرا سالا ١٨٧٨- ١٩٠٧ێ ئانکو دەوروبەرێ ٢٥ سالان ڤەکێشایە و د وێ قۆناغێدا ٨٠ گوند سەر ب ناحیا زێبار و ٦٦ گوند سەر ب ناحیا شێروان و ٣٩ گوند سەر ب ناحیا مزووری ژووری بوو[٤٨]، ئانکو تەڤایێ گوندێ قەزا زێبار ١٨٥ گوند بوون.

دوا دەڤەرێن نها سەر ب کارگێریا پارێزگەها دهۆکێ ڤە و د قۆناغا ناڤبەرا ١٨٩٢- ١٩١٤ێ وەك دو ناحیان راستەوخۆ سەر ب قەزا مەلبەندیا مووسلێ ڤە بوون قەزا شێخان و قەزا بەردەرەش یێن نهان[٤٩].

هندیکە شێخان (عین سفنێ) یە ل سالا ١٨٧٩ێ ناحیەکا سەر ب قەزا مەلبەندیا مووسلێ ڤە بوو[٥٠]، هەروەسان بەردەرەش سەنتەرێ ناحیا (عشائر السبعة) بوو و ئەڤ ناحیە ل سالا ١٨٩٠ێ هاتییەدامەزراندن و ئەو ژی سەر ب قەزا مەلبەندیا مووسلێ بوو[٥١]. هەردو ناحیە ل سالا ١٣٢٧مش/١٩٠٩ز ژی سەر ب قەزا مووسلێ بوون[٥٢] و هەروەك خۆ سەر ب قەزا مەلبەندیا مووسلێ ماینە و هیچ گۆهرینەك ب سەردا نەهاتییە هەتا پشتی دامەزراندنا حکۆمەتا شاهیا عیراقێ هەروەك ١٥ ئوکتوبەرا ١٩٢٢ێ د بەیانا وەزارەتا ناڤخۆیا عیرقێدا هاتی.

## - پێکهاتێن کارگێرییێن سەردەمێ حکۆمەتا مەلکیا عیراقی:

د ڤێ قۆناغێدا کو ژ سالا ١٩٢١- ١٩٥٨ێ چەند گۆرینێن دیترێن کارگێری ل ڤێ دەڤەرێ رووداینە، لێ یا جهێ سەرنجێ ئەوە د درێژیا ڤێ قۆناغێدا سەرانسەری دەڤەر د سنوورێ کارگێریا لیوا مووسلێ دا بوویە، ژبلی گۆهرینەکا کێم کو د

سنوورێ قەزا ئاکرێ دا رووداپە و هندەك ژێ کەتییە سەر لیوا هەولێرێ (ئەربیلێ)، هەروەسان د ڤێ قۆناغێ هزرا ب پارێزگەهکرنا دهۆکێ هاتییەپێش. بۆ پتر رۆهنکرنا گۆهرینێن د ڤێ قۆناغێدا روودایِن، دێ هەریەکەیەکا کارگێری جودا ژ یا دی بەرچاڤکەین و ب هەمان شێوێ قۆناغا پێشتر دێ ب قەزا ئامێدیێ دەسپێکەین.

- **قەزا ئامێدیێ:** ل دەسپێکا دامەزراندنا حکۆمەتا شاهییا (مەلکیا) عیراقێ وەك د ژێدەرێ فەرمیێ عیراقێ (الوقائع العراقیه)دا هاتی قەزا ئامێدیێ ژ ناحیێن نێروەرێکان، بەرواری بالا و دۆسکی پێکدهات[٥٣]، بەلێ پەرتووکا جوگرافی یا خواندنگەهێن عیراقێ یا وی سەردەمیدا هاتییە قەزا ئامێدیێ پێنج ناحیە بەرواری بالا، بەرواری ژێری، نێروە، رێکان هەنە، ٣٦٦ گوندن، ٤٣ سەر ب بازێرکێ ئامێدیێ ڤە، ٦١ سەر ب ناحیا بەرواری بالا، ٣٥ سەر ب ناحیا بەرواری ژێری، ٥٧ سەر ب ناحیا رێکان ٣٥ سەر ب ناحیا نێروە و ١٣٥ سەر ب ناحیا داودیێ ڤە[٥٤]. ئەڤە هەمان ئەو زانیارییەنە یێن د سالناما ویلایەتا مووسلێ یا سالا ١٣٣٠مش/ ١٩١٢ز دا هاتین، پێشتر مە ئاماژە ب ژێدەرەکی کر کو ناحیا بەرواری ژێری داینە دگەل مەلبەندێ قەزایێ ئامێدیێ و ناحیا رێکان و نێروە داینە دگەل ئێك ب ڤی رەنگی تنێ سێ ناحیە دمـــان[٥٥]، ئەڤە هەمان ئەو سێ ناحیەیەنە یێن ژێدەرێ فەرمیێ عیراقێ ل دەسپێکا دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ دا ئاماژە پێکری. ل ڤێرێ هندی پەیوەندی ب ناحیا داودیێ و ناحیا دۆسکی ڤە هەی، ژ سالناما سالا ١١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز- سالناما ١٣٣٠مش/١٩١٢ز ناحیەك سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە هەیە ب ناڤێ ناحیا داودیێ[٥٦]، بەلێ ئەڤ ناحیەیە هێژ کەڤنترە و دامەزراندنا وێ ڤەگەریتەڤە سالا ١٨٧٩ز، وەك دیار بووی د دوا سالناما ویلایەتا مووسلێ یا سالا ١٩١٢ێدا ناڤێ ناحیا داودیێ هاتییە، هەروەسان د دابەشکرنێن کارگێرییێن ویلایەتا مووسلێ یێن سالا ١٩٢١ێ ب ڤەگوهاستن ژ رۆژناما (الموصل) هژمارا ٢٥ شباتا ١٩٢١ێدا ناڤێ ناحیا داودیێ وەك ناحیەکا سەر ب قەزا ئامێدیێ هاتییە. و پشتی دامەزراندنا حکۆمەتا شاهینی یا عیراقێ ل تەباخا ١٩٢١ێ د یەکەم ژێدەرێ فەرمیێ ئاماژە ب پێکهاتا کارگێرییا لیوا مووسلێ یا سەردەمێ حکۆمەتا عیراقێ کری ناڤێ ناحیا دۆسکی ل شوینا ناحیا داودیێ هاتییە و هەر سەر ب قەزا ئامێدیێ بوویە بێی کو ئاماژە ب سەنتەرێ ناحیا دۆسکی بکەت.

د ئەنجامدا ئەم دکارین بێژین دگەل دەسپێکا دامەزراندنا حکۆمەتا عیراقێ و دیارکرنا پێکهاتا وێ یا کارگێری ناحیا دۆسکی شوینا ناحیا داودیێ گرتییە، هەژییە بێژین د ڤێ پێکهاتێدا هەموو ناحیێن بەهدینان ب ناڤێن عەشیرەتان هاتینەناڤکرن. ل ڤێرێ پرسیارەك دی دهێتەپێش ئەرێ ئەڤ ناحیەیا دۆسکی (داودیێ یا پێشتر) کەنگی ژ قەزا ئامێدیێ هاتییەڤەقەتاندن و داینە دگەل قەزا دهۆکێ و ئەڤ ناحیەیا دۆسکی یا نها ب مانگێش دهێتەناسین بەردەوامیا هەمان وێ ناحیێ یە...؟ د بەرسڤێدا دێ بێژین ژێدەرەك یان بەلگەنامەیەك ل بەر دەست نینە بەرسڤەکا ڤەبر و گومان تێدا نەی ل سەر ڤێ پرسیارێ بدەت، تنێ هاتییەگۆتن ناحیا دۆسکی (مانگێش) یا نها ل سالا ١٩٢٧ێ هاتییەدامەزراندن[٥٧]، د ئەنجامدا ئەم دکارین بێژین قۆناغا ڤەگوهاستنا ناحیا دۆسکی یا سەر ب ئامێدیێ ڤە بۆ سەر دهۆکێ د ناڤبەرا ١٩٢٢- ١٩٢٧ێدا بوویە و چەند ئاماژەیەك هەنە کو د ڤێ قۆناغێدا هندەك ئالوگور د نەخشێ کارگێریێ دەڤەرێدا هاتینەکرن، بۆ نموونە ل چریا دووێ ١٩٢٣ێ بریار هاتییەدان چەند گوندەکێن سەر ب قەزا دهۆکێ ژ وێ قەزایێ بێنەڤەقەتاندن و بدەنە دگەل قەزا ئامێدیێ ئەوژی گوندێن: کانیکا، میلبرکان، اشکیران، بیرکان، شیلیمیا، کورەمارکێ، سەیداڤا، ئاشاوا، کازیکا، ستینك،

گوندك و سیارەتویکا و پشتی وان ب دەمەکێ کورت چەند گوندەکێن دی ژ قەزا دهۆکێ هاتینەڤەقەتاندن و داینە دگەل قەزا ئامێدیێ ئەوژی گوندێن: ینباوە، باردین، ئێکمالە، کورمارك و بار بانسك[٥٨]، هەروەسان د پروسا سەرژنوو رێکخستنا یەکەیێن کارگێرییێن لیوا مووسلێ دا یا ل کانوونا دووێ یا ١٩٢٦ێ هاتییەئەنجامدان ناحیا دۆسکی یەك ژ وان ناحیان بوویە یێن ئەڤ سەرژنوو رێکخستنە ژێگرتی[٥٩].

ئەڤ گۆهارتنا گوندان ژ قەزا دهۆکێ بۆ سەر قەزا ئامێدیێ و سەرژنوو رێکخستانا یەکەیێن کارگێرییێن مووسلێ دەرگەهەکی ل بەر مە ڤەدکەت کو بێژین د ناڤبەرا ئانکو ١٩٢٣- ١٩٢٥ێ ناحیا دۆسکی یا ئامێدیێ هاتییەهەلوەشاندن و داینە دگەل قەزا دهۆکێ، ژ بەرکو ئەڤ گوندێن ئاماژە پێکری نێزیکترین گوند بوون بۆ ناحیا دۆسکی (داودیێ)یا کەڤن و سەر ب وێ ڤەبوون، دەمێ ئەڤ ناحیەیە ژ ئامێدیێ هاتییەڤەقەتاندن و داینە دگەل قەزا دهۆکێ و مەلبەندێ وێ ژ داودیێ هاتییە ڤەگوهاستن بۆ مانگێشێ گوندێن ناڤبری زڤراندینەڤە سەر قەزا ئامێدیێ، دیارە د ڤێ قۆناغێدا گورانکاری د سنوورێن قەزا و ناحیەیێن دەڤەرێدا هاتینەکرن و هندەك سنوورێن نوو بۆ وان هاتینەدەسنیشانکرن، هەروەك ل دەسپێکا ١٩٢٤ێ سنوورێن ناڤبەرا قەزا ئاکرێ و ئامێدیێ هاتینەچەسپاندن و بریارا ب قەزا کرنا شێخان و دوبارە ب قەزا کرنا زێبار هاتینەدان[٦٠]. هەتا سالا ١٩٥٥ێ ئامێدیێ تنێ خودانی ناحیا مەلبەندێ ئامێدیێ و هەردو ناحیەیێن نێروەرێکان و بەرواری بالا بوو[٦١]. ب ڤە گوهاستنا ناحیا دۆسکی بۆ سەر قەزا دهۆکێ زڤراندنەڤا چەند گوندێن وێ بۆ سەر قەزا ئامێدیی و پێشتر ژی ناحیا بەرواری ژێری هاتبوو هەلوەشاندن و گوند و دەڤەرێن وێ کەتبوونە سەر ناحیا مەلبەندیا ئامێدیێ سنووری ناحیا مەلبەندی ئانکو ناحیا ئامێدیێ چەندین جاران بەرفرەهتر لێ هات ب رەنگەکێ

ل سالا ١٩٣١ێ ناحیا ئامێدیێ سێ دەڤەرێن مەزن بەرواری ژێری، سپنە و بەرێ گارەی کو ١٧٠ گوند بوون ب خۆڤە دگرت[٦٢]. گومان تێدا نینە کو ڤێ چەندێ بارگرانییەك زێدە ل سەر سەنتەرێ ئامێدیێ دروستکرییە، لەوماژی دیارە هزر ل دامەزراندنا ناحیەکا دیتر هاتییەکرن و ئەو بوو ل سالا ١٩٥٧ێ ب بریارەکا وەزارەتا ناڤخۆیی یا عیراقێ مەلبەندێ ناحیا ئامێدیێ ژ ئامێدیێ هاتییەڤەگوهاستن بۆ گوندێ سەرسنکێ و ب ناحیا سەرسنکێ هاتییەناڤکرن و ١١٣ گوندێن پێشتر سەر ب ناحیا ئامێدیێ داینە دگەل ناحیا سەرسنکێ و ٩٣ گوندێن مایی ژ ناحیا ئامێدیێ داینە دگەل مەلبەندێ قەزا ئامێدیێ[٦٣]، ب ڤی رەنگی قەزا ئامێدیێ بوویەڤە خودانی سێ ناحیان بەرواری بالا، نێروە رێکان و سەرسنکێ زێدەباری دەڤەرێن سەر ب مەلبەندێ قەزایێ.

هندیکە هەردو ناحیەیێن دیترێن قەزا ئامێدیێ نە ناحیا نێروەرێکان کو مەلبەندێ وێ ل گوندێ بێبۆ بوو و ناحیا بەرواری بالا کو مەلبەندێ وێ ل گوندێ کانی ماسێ بوو د قۆناغا ناڤبەرا ١٩٢١-١٩٢٢یدا چ گورانکارییەك د نەخشەیێن واندا نەهاتییەکرن و سنوورێن وان وەك خۆ ماینە.

- **قەزا زاخۆ:** ل دەسپێکا دامەزراندنا حکۆمەتا عیراقێ ل دووڤ پێکهاتا کارگێریا لیوا مووسلێ یا سالا ١٩٢٢ێ هاتییەراگەهاندن پێکهاتا کارگێریا قەزا زاخۆ تنێ ناحیا سندی گولی و ناحیا مەلبەندێ زاخۆ بوون[٦٤]، بەلێ ژێدەرکێ دیدا ئاماژە ب ناحیا سلێڤانەیی ژی هاتییەکرن[٦٥]، بەلێ ئەم دوور نابینین ئەڤ ناحیەیە ل داویا سەردەمێ ئوسمانی یان قۆناغا دەستەلاتداریا راستەوخۆ یا لەشکەرێ ئینگلیزی د ناڤبەرا ١٩١٩- ١٩٢٢ێ ئەڤ ناحیەیە هاتیتە هەلوەشاندن و دەڤەر و گوندێن سەر ب وێ ڤە داینە دگەل ناحیا مەلبەندیا زاخۆ.

هندی پەیوەندی ب ناحیێن سەر ب زاخۆڤە د سەردەمێ شاهییێ عیراقێ ب ڤی رەنگی بوو:

- **ناحیا سندی،** ئەڤ ناحیەیە ل سەردەمێ ئوسمانی ب ناحیا سندی گولی د هاتەنیاسین و د دوا سالناما ویلایەتا مووسلێ یا سالا ١٩١٢یدا و د یەكەم بەیانا راگەهاندنا حكۆمەتا عیراقێ ژی ناڤێ وێ ب هەمان شێوە هاتییە[٦٦]. ل ٢٦ ئەیلوولا ١٩٢٥ێ ب بریارەكا شاهینی ناحیەكا نوو ب ناڤێ ناحیا گولی هاتییەدامەزراندن و ئەڤ ناحیەیە وەك خۆ ب ناڤێ ناحیا سندی مایە، ل بەراهیێ مەلبەندێ ناحیێ ل گوندێ بێرسڤێ بوو و پاشتر هاتییەڤەگوهاستن بۆ گوندێ شەرانشێ[٦٧]، ب درێژیا سەردەمێ شاهی ل عیراقێ چ گورانكاری ب سەر سنوور و جهێن ڤێ ناحیێ دا نەهاتینە.

- **ناحیا سلێڤانەیی،** سەردەمێ دەستەلاتداریا ئوسمانی ئەڤ ناحیەیە یەك ژ دو ناحیێن قەزا زاخۆ بوو، د هندەك دەماندا تاكە ناحیەیا قەزا زاخۆ بوو، د دوا سالناما ویلایەتا مووسلێ دا یا سالا ١٩١٢ێ ناڤێ وێ هاتییە، بەلێ پشتی شكەستنا حكۆمەتا ئوسمانی و داگیركرنا عیراقێ ژ ئالیێ لەشكەرێ بریتانیاڤە و گەهشتنا وان بۆ مووسلێ د قۆناغا سەرژنوو دابەشكرنا كارگێری ل لیوا مووسلێ ل سالا ١٩١٨ێ قەزا زاخۆ تنێ ناحیەك ب ناڤێ گولی سندی هەبوو[٦٨]، هەروەسان د یەكەم پێكهاتا كارگێریا لیوا مووسلێ یا سالا ١٩٢٢یدا زاخۆ خودانا خۆ تنێ ناحیا سندی گولی بوو[٦٩]، بەلێ د جوگرافیا عیراقێ یا سالا ١٩٢٢یدا سلێڤانەیی وەك یەك ژ دو ناحیێن قەزا زاخۆ ئاماژە پێ هاتییەكرن و هژمارا گوندێن وێ ژی ب ١٠٩ گوند هاتییەدیاركرن[٧٠]، ل ڤێرێ پرسیارەك دهێتەكرن ئەرێ ئەڤ ناحیەیە دناڤبەرا ١٩١٢-١٩١٨یدا هاتییەهەلوەشاندن؟ یان ژ ئەنجامێ كاودانێن شەرێ جیهانیێ ئێكێ (١٩١٤- ١٩١٨) ژ كاركەتییە؟ ژ بەركو ژێدەرەك دبێژیت ناحیا سلێڤانەیی ل سالا ١٩٢٣ هاتییەدامەزراندن[٧١].

- **ناحیا گولی،** سێیەمین ناحیا قەزا زاخۆ یە، هەروەك ئاماژە پێ هاتییەكرن د سالێن داویێ ژ دەستەلاتێ ئوسمانی هەتا دەسپێكا دامەزراندنا حكۆمەتا عیراقێ دگەل ناحیا سندی یەك ناحیەبوون ب ناڤێ سندی گولی و ل سالا ١٩٢٥ێ بوویە ناحیە و ل بەراهیێ مەلبەندێ ناحیێ ل گوندێ دێمكا بوو، پاشتر هاتییەڤەگوهاستن بۆ گوندێ بەهنوونە گولی و ل دووڤرا هاتییەڤەگوهاستن بۆ گوندێ باتوفا و هەتا نها ل باژێركێ باتوفایە[٧٢]. ل داویێ ئەم دبێژین ژ دەسپێكا دەستەلاتداریا شاهی(مەلكی) ل عیراقێ و هەتا دەسپێكرنا قۆناغا كۆماری ل تیرمەها ١٩٥٨ێ قازا زاخۆ خودانی خۆ و سێ ناحیەیان سندی، گولی، سلێڤانەیی بوو.

- **قەزا دهۆكێ،** دهۆك یەك ژ حەفت قەزایان بوو یێن لیوا مووسلێ ل دوا سەردەمێن ئوسمانی و دەسپێكا دامەزراندنا حكۆمەتا عیراقێ لیوا مووسل ژێ پێكدهات، و د هەردو قۆناغێن ئاماژە پێكریدا تنێ ناحیەك سەر ب قەزا دهۆكێ ڤە بوو ئەو ژی ناحیا مزووری بوو[٧٣].

- **ناحیا مزووری،** د بەریەرێن چوویدا ب بەرفرەهی ئەم ل سەر دامەزراندنا ناحیا مزووری كو مەلبەندێ وێ ل گوندێ ئەتریش بوو و قۆناغێن تێرا دەربازبووی ل سەردەمێ ئوسمانی ئاخفتین، هندی پەیوەندی ب ڤێ ناحیێ د سەردەمێ حكۆمەتا عیراقێ ڤە هەی، ئەڤ ناحیەیە ل بەراهیێ تاكە ناحیەیا قەزا دهۆكێ بوو، پشتی دامەزراندنا ناحیا دوسك مانكێش یەك ژ دو ناحیەیێن قەزا دهۆكێ بوویە زێدەباری ناحیا مەلبەندیا دهۆكێ، ل سالا ١٩٣١ێ ١٠٠ گوند سەر ب ناحیا مەلبەندیا دهۆكێ و ٢٠٠ گوند سەر ب ناحیا مزووری و ٩٠ گوند سەر ب ناحیا مانكێش بوون. ئەڤ سەروبەرێ كارگێریێ بەردەوام بوویە هەتا سالا ١٩٥٦ێ د ڤێ سالێدا ب بریارەكا شاهینی (ارادە ملكیە) هژمار (٨٠٩) ل رۆژا٢٤ چریا ئێكێ ١٩٥٦ێ ناحیا مزووی ژ قەزا دهۆكێ ڤەقەتاندینە و داینە دگەل قەزا شێخان[٧٤].

- **ناحیا دۆسكی،** وەك هاتییەدیاركرن ئەڤ ناحیەیە ل

بەراهیێ سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە بوو و سەنتەرێ وێ ل گوندێ داودیێ بوو، د ناڤبەرا۱۹۲۳- ۱۹۲۵ێ ناحیا دۆسکی یا ئامێدیێ هاتییەهەلوەشاندن و داینە دگەل قەزا دهۆکێ، ئانکو دۆسکی یا قەزا دهۆکێ کو مەلبەندێ وێ ل باژێرکێ مانگێشێ بوو د ناڤبەرا ۱۹۲۳- ۱۹۲۵ێدا هاتییەدامەزراندن و سالا ۱۹۳۱ێ ۹۰ گوند سەر ب ڤێ ناحیێ ڤە بوون، ل دووڤ ژێدەرێن بەردەستێ مە قۆناغا ناڤبەرا ۱۹۲۵- ۱۹۵۸ێدا چ گوهرین د سەر و بەرێ کارگێریێ ڤێ ناحیێدا روونەداینە. هەتا سالا ۱۹۵۵ێ زێدەباری ناحیا مەلبەندێ قەزا دهۆکێ دو ناحیەیێن مزووری و دۆسکی سەر ب قەزا دهۆکێ بوون[75].

- **ناحیا سێمێلێ**: ل سالا ۱۹۵۷د بەیانەکا وەزارەتا ناڤخۆییا عیراقیدا بریار هاتەدان ب ڤەگوهاستنا مەلبەندێ ناحیا دهۆکێ ل لیوا مووسلێ بۆ گوندێ سێمێلێ و ناڤکرنا وێ ناحیێ ب ناحیا سێمیلێ[76]. ب ڤێ رەنگی ناحیا سێمێلێ هاتەدامەزراندن و شوونا ناحیا مەلبەندییا دهۆکێ گرت و هەموو ئەو گوندێن سەر ب ناحیا دهۆکێ ڤە کەتنە سەر ناحیا سێمێلێ و د دوا سالا سەردەمێ شاهی (مەلکی) قەزا دهۆکێ ما خودانی تنێ دو نایەیان ئەو ژی مانگێش و سێمێل.

- **قەزا ئاکرێ**: وەك پێشتر هاتییە دیارکرن د دوا سالێن سەردەمێ دەولەتا ئوسمانیدا تنێ دو ناحیە سورچی و زێبار سەر ب قەزا ئاکرێ بوون، ل دەسپێکا دامەزراندنا حکۆمەتا عیراقی ل ۱۵ ئوکتوبەرا ۱۹۲۲ێ هەر هەمان دو ناحیە بوون[77]. گەلەك پێڤەنەچوو ب بریارەکا شاهینی (ارادە ملکیە) بریار هاتەدان دامەزراندنا قەزا زێبار ژ هەردو ناحیێن نەهلێ و بارزان و ڤەقەتاندنا هەردو ناحیەیێن زێبار و بارزان ژ قەزا ئاکرێ[78]. ب ڤی رەنگی قەزا ئاکرێ هەتا سالا ۱۹۳۰ێ دمینیتە تنێ ب ئێك ناحیە زێدەباری ناحیا مەلبەندێ ئاکرێ، د وێ دەمیدا ۸۷ گوند سەر ب ئاکرێ و ٤٥ گوند سەر ب ناحیا سورچی بوون[79].

- **ناحیا عەشائیرولسەبعە**: ئەڤ ناحیەیە تها ب بەردەرەش دهێتەنیاسین، ل بەراهیێ مەلبەندێ وێ ل گوندێ بەرازی بوو، پاشتر هاتییەگوندێ جوجر، دووڤرا ل گوندێ بەردەرەش جهگیر بوویە[80]، د سەردەمێ ئوسمانیدا یەك ژ ناحیەیێن سەر ب قەزا مەلبەندیيا مووسلێ بوو[81]، د ناڤبەرا سالا ۱۹۲۲- ۱۹۳۰ ژ قەزا مووسلێ هاتییەڤەقەتاندن و داینە دگەل قەزا ئاکرێ و د وێ دەمیدا ۷۸ گوند سەر ب ڤێ ناحیێ ڤەبوون[82]، ئەڤ ناحیەیە ب درێژییا سەردەمێ شاهینی ل عیراقێ مایە د ناڤ سنوورێ کارگێریێ قەزا ئاکرێ دا.

- **ناحیا سورچی**: وەك ئاماژە پێ هاتییەکرن، سورچی یەك ژ ناحیەیێن سەر ب قەزا ئاکرێ بوو ل داوییا سەردەمێ ئوسمانی، ب هەمان شێوە د یەکەمین راگەهاندنا پێکهاتا کارگێرییا لیوا مووسل یا سەردەمێ شاهی ل عیراقێ ل سالا ۱۹۲۲ێ تنێ دو ناحیە سەر ب قەزا ئاکرێ بوون ئەوژی سورچی و زێبار بوون[83]، گەلەك پێڤەنەچوویە ل سالا ۱۹۲۵ێ زێبار ژێ هاتییە ڤەقەتاندن و قەزا زێبار هاتییەپێکئینان[84]، هەر د دەمەکی نێزیکی ڤێ بریارێ ناحیا عەشائیرولسەبعە داینە دگەل قەزا ئاکرێ و ئاکرێ بوویەڤە خودانا دو ناحیان سورچی و عەشائیرولسەبعە و بوونا ڤان دو ناحیەیان د بەرپەرێن جوگرافیا عیراقێدا ل سالا ۱۹۳۰ێ هاتییەچەسپاندن[85]. ئەڤ سەروبەرە بەردەوام بوویە هەتا ل سالا ۱۹٤٤ێ ب بریارەکا شاهی قەزا زێبار هاتییەهەلوەشاندن و ناحیا بیرەکەپرا ژێ داینە دگەل قەزا ئاکرێ و هەردو ناحیەیێن دی یێن وێ داینە دگەل لیوا هەولیر (ئەربیل)ێ[86]، ب ڤی رەنگی قەزا ئاکرێ بوویە خودانێ سێ ناحیەیێن سورچی، عەشائیرولسەبعە و زێبار و ئەڤ سەروبەرە هەتا داوییا سەردەمێ شاهی ل عیراقێ بەردەوام بوویە[87].

- **قەزا زێبار**: زێبار ئەو قەزایە بوو ئەوا ل سەردەمێ ئوسمانی هاتییە هەلوەشاندن، بەلێ ل سالێن

بەراهیێ یێن دەولەتا عیراقێدا ل ٢٨ كانوونا ئێكێ ١٩٢٤ێ ب بریارەكا شاهی سەرژنوو ژ هەردو ناحیەیێن نەهلە و بارزان هاتەڤە پێكئینان[٨٨] و ژێ ڤێ قەزایێ هەتا ٢٠ كانوونا ئێكێ ١٩٤٤ێ بەردەوام بوو و د ڤێ رۆژێدا ب بریارەكا شاهی ناحیا بیرەكەپرا ژ قەزا زێبار هاتەڤەقەتاندن و دانە دگەل قەزا ئاكرێ و قەزا زێبار ب خۆ ژ لیوا مووسلێ هاتەڤەقەتاندن و دانە دگەل لیوا هەولێر (ئەربیل)ێ[٨٩].

هندی پەیوەندی ب پێكهاتا ڤێ قەزایێ ڤە هەی وەك هاتیبەدیاركرن ژ هەردو ناحیێن زێبار و بارزانێن قەزا ئاكرێ هاتە پێكئینان، پاشتر ب بریارەكا شاهی دو ناحیەیێن نوو ب ناڤێ شێروان و بیرەكەپرا هاتنە دامەزراندن[٩٠]، هەروەسان ل ١ ئەیلوولا ١٩٣٢ێ ب بریارەكا وەزارەتا ناڤخۆیی ناڤێ ناحیا بەرۆژ ل قەزا زێبار هاتەگوهارتن بۆ ناحیا بارزان[٩١].

- **قەزا شێخان،** وەك پێشتر هاتیبەدیاركرن ل سەردەمێ ئوسمانی و هەتا دەسپێكا دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ، شێخان (عەین سفنێ) ناحیەكا سەر ب قەزا مەلبەندیا مووسلێ بوو[٩٢]، ل ٢٨ كانوونا ئێكێ ١٩٢٤ێ قەزا شێخان ب بریارەكا شاهی هاتەپێكئینان و د هەمان بریاردا هاتیبە هەردو ناحیەیێن ئەلقوش و باشیكێ (بعشیقە) ژ قەزا مەلبەندیا مووسلێ بێنە ڤەقەتاندن و بدەنە دگەل قەزا شێخان[٩٣]. هەتا سالا ١٩٣٥ێ ژێ ڤێ قەزایێ تنێ ئەڤ دو ناحیەبە هەبوون[٩٤].

هندی پەیوەندی ب هەردو ناحیەیێن ئەلقوش و باشیكێ ڤە هەی، دیارە هەردو ناحیە نوو هاتینەدامەزراندن، ژ بەركو هەتا ئوكتوبەرا ١٩٢٢ێ جهێ هەردویان د ناڤ پێكهاتا كاگێریا لیوا مووسلێ دا نینە و هەتا سالا ١٩٢٢ێ ئەلقوش گوندەكێ سەر ب قەزا دهۆكێ بوو[٩٥]، ناحیا باشیكێ ل دووڤ بریارەكا شاهی ل ١٢ نیسانا ١٩٣١ێ هاتیبەهەلوەشاندن[٩٦] ١٥ گولانا ١٩٥٥ێ سەرژنوو ئەڤ ناحیەبە هاتیبەپێكئینان و ڤێ جارێ داینە دگەل قەزا مەلبەندیا مووسلێ[٩٧]، ل ١٩٣١ێ بەرەڤ ژوور قەزا شێخان مایە تنێ ب ناحیا مەلبەندیا شێخان[٩٨]. بەلێ دیارە د پاشتردا ناحیا ئەلقوش زڤراندینەڤە سەر قەزا شێخان و ل سالا ١٩٥٥ێ قەزا شێخان ژ دو ناحیێن شێخان و ئەلقوش پێكدهات[٩٩].

د بەردەوامیا گورانكارییێن كارگێریدا ب بریارا شاهینی (ارادة ملكية) هژمار (٨٠٩) ل رۆژا٢٤ چریا ئێكێ ١٩٥٦ێ ناحیا مزووری ژ قەزا دهۆكێ ڤەقەتاندینە و داینە دگەل قەزا شێخان[١٠٠]، ب ڤی رەنگی د دوا سالێن دەستەلاتداریا شاهینی ل عیراقێ پێكهاتا كارگێریا قەزا شێخان تنێ ژ ناحیا مزووری و ناحیا مەلبەندێ شێخان پێكدهات.

## پێكهاتێن كارگێرییێن سەردەمێ كۆماری

د ڤی سەردەمیدا كو ژ تیرمەها ١٩٥٨ هەتا نها ڤەدگریت گەلەك گۆهرین د پێكهاتا كارگێریا بەهدینان دا روودایـنـە، سـەروبـەرێ سیاسی، دەسپێكرنا شۆرشا كوردستانێ ل ئەیلوولا ١٩٦١ێ، پێكهاتنێن ٢٩ حزیرانا ١٩٦٦ێ و ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ د ناڤبەرا حكۆمەتا عیراقێ و سەركردایەتیا شۆرشا كوردستانێ، سیاسەتا حكۆمەتێن عیراقێ د وارێ گۆهارتنا روخسارێ نەتەوەییێ دەڤەرێن كوردستانێ دا و ل داویێ ژی سەرهلدانا ١٩٩١ێ و دامەزراندنا حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ باندۆرەك مەزن ل پێكهاتا كارگێریا دەڤەرێ كریە، لەوما ئەم دێ ڤی سەردەمی ل سەر دو قۆناغان قۆناغا بەری سەرهلدانا ١٩٩١ێ و قۆناغا پشتی سەرهلدانێ دابەشكەین:

### قۆناغا بەری سەرهلدانێ ١٩٥٨- ١٩٩١ێ

ل ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ سیستەمێ دەستەلاتدارێ ل عیراقێ ژ دەستەلاتداریا شاهینی بۆ كۆماری هاتەگۆهارتن، ڤی سیستەمی چەندین گۆرانكاری د سەروبەرێ گشتییێ عیراقێ و خەلكێ وێ دا روودان، ڤان گۆرانكارییان ژ كوردستانێ ژی گرت. ژ گرنگترین

گورانکارییێن کارگێرییێن د ڤێ قۆناغێدا ژ دەڤەرا بەهدینان گرتین دامەزراندنا پارێزگەها دهۆکێ بوو ل ۲۷ گولانا ۱۹٦۹ێ، ژ بەر گرنگییا ڤێ دامەزراندنێ و کاریگەرییا وێ ل سەر تەڤایی سەروبەرێ دەڤەرا بەهدینان دێ ل داوییا گۆرانکارییێن ڤێ قۆناغێدا ئاماژە ب چاوانییا پێکئینان و دامەزراندنا پارێزگەها دهۆکێ کەین، نها وەك قۆناغێن پێشتر دێ گۆرانکارییێن هەر قەزایەکێ جودا بەرچاڤکەین:

- **قەزا ئامێدیێ:** هندی پەیوەندی ب قەزا ئامێدیێ ڤە هەی د ناڤبەرا ۱۹۵۸- ۱۹۷۵یدا چ گۆهرین د پەیکەرێ کارگێرییێ وێ دا نەبووینە ئەو نەبیت کو ئەڤ قەزایە یەك ژ سێ قەزایان بوویە یێن ل ۲۷ گولانا ۱۹٦۹ێ پارێزگەها دهۆکێ ژێ پێکهاتی. بەلێ پشتی شکەستنا شۆرشا کوردستانێ ل ئادارا ۱۹۷۵ێ و دەسپێکرنا سیاسەتا گۆهارتنا رووخسارێ نەتەوەییێ کوردستانێ و مشەختکرنا ب زۆری یا خەلکێ ژ دەڤەر گوندێن وان و ڤالا کرنا گوندان ژ ئاکنجیێن وان، بەری گەلەك دەڤەرێن دی ڤێ سیاسەتێ ژ قەزا ئامێدیێ گرت و دەڤەرێن بەراهیێ یێن ئەڤ سیاسەتە لێ هاتییە بجهئینان دۆسکی ژووری، رێکان، نێروە و بەرواری ژووی بوون کو هەردو ناحیەیێن نێروەرێکان (بێبۆ) و بەرواری (کانی ماسێ) ب خۆڤە دگرتن.

- **ناحیا نێروە رێکان (بێبو)،** پشتی شکەستنا شۆرشا کوردستانێ ب دەمەکێ کورت د چەند قۆناغەکاندا هەموو گوندێن سەر ب ڤێ ناحیێ ب مەلبەندێ ناحیێ گوندێ بێبۆ ڤە هاتنەڤالاکرن و خرابکرن و خەلکێ وان ڤەگوهاستنە کۆمەلگەهێن سیریێ، شیلادزی، باگێرا و جهێن دیتر هەتا داوییا ۱۹۷۸ێ تەڤایی سنوورێن ڤێ ناحیا ڤالا بوون ژ ئاکنجیبیان[۱۰۱]، پاشتر ل دەسپێکا ۱۹۷۹ێ بریار هاتەدان ناحیا نێروەرێکان کو ب کریار نەمابوو ژ مەلبەندێ وێ گوندێ بێبۆ بێتەڤەگوهاستن بۆ گوندێ دیرەلۆکێ و ل دووڤ هەمان بریار چەندین کەرت و گوندێن سەر ب مەلبەندێ قەزا ئامێدیێ ژێ هاتنەڤەقەتاندن و دانە دگەل ناحیا نێروە رێکان[۱۰۲]، ئەڤەژی دەسپێکا ژینا ناحیا دیرەلۆکێ بوو.

- **ناحیا بەرواری بالا (کانی ماسێ)،** هەمان سەروبەرێ ب سەرێ دەڤەر و گوندێن ناحیا نێروەرێکان ئینای پشتی سالا ۱۹۷۵ێ ب سەرێ دەڤەر و گوندێن ڤێ ناحیێ ژی ئینا، بەلێ سەنتەری ما ل جهێ خۆ نەهاتەڤەگوهاستن هەتا ل ۲٦ تەباخا ۱۹۸۷ێ ب بریارەکا کۆماری هاتییەهەلوەشاندن و گشتکەرتێن سەر ب وێ ڤە دانە دگەل مەلبەندێ قەزا ئامێدیێ[۱۰۳].

- **ناحیا سەرسنکێ،** هەرچەندە گەلەك ژ دەڤەر و گوندێن سەر ب سەرسنکێ د ڤێ قۆناغێدا هاتنەڤالاکرن و ڤەگوهاستن، بەلێ پرانییا وان ل سەرسنکێ و کۆمەلگەهێن دەوروبەرێن وێ جڤیان و چ گۆهرین ل سەروبەرێ کارگێرییێ سەرسنکێ روونەدان.

- **قەزا زاخۆ،** د ناڤبەرا ۱۹۵۸- ۱۹۷۳ێ ژ ڤێ قۆناغێ چ گۆهرین د پێکهاتا کارگێرییا قەزا زاخو دا روونەدان، بەلێ ل سالا داوییێ ۱۹۷۳ێ ناحیەکا دی ب ناڤێ ناحیا رزگاری ل ناحییێن زاخۆ هاتەزێدەکرن:

- **ناحیا رزگاری،** ب دروستی ل ۲۸ ئادارا ۱۹۷۳ێ ب بریارەکا کۆماری بریارا پێکئینانا ناحیەکا نوو ل ڤێ قەزایێ ب ناڤێ رزگاری هاتەدان و چەندین کەرت و گوند ژ ناحیا سندی و ناحیا سلێڤانەیی هاتنەڤەقەتاندن و دانە دگەل ناحیا رزگاری[۱۰٤]و ئەڤ ناحیەیە بوو چوارەمین ناحیا قەزا زاخۆ پشتی ناحییێن سندی و گولی و سلێڤانەیی. ژ گورانکارییێن د ڤێ قۆناغێدا ل ڤێ ناحیێ هاتینەئەنجامدان ل رۆژا ۲٦ تەباخا ۱۹۸۷ێ ب بریارەکا کۆماری ئەڤ ناحیەیە هاتییەهەلوەشاندن[۱۰۵]و هەتا سەرهلدانا ۱۹۹۱ێ سەروبەرێ وێ هوسان مایە.

- **ناحیا سلێڤانەیی،** د سالێن ناڤبەرا ۱۹٦۱- ۱۹۷۰یدا ناحیا سلێڤانەیی د ناڤ جەرگێ روودانێن شۆرشا کوردستانێ و شەرێن ناڤبەرا پێشمەرگەی و هێزێن لەشکەرێ عیراقێ دا بوو، مەلبەندێ ناحیێ گوندێ ئاسهێ جار

د دەستێ پێشمەرگەی و جار ژی د دەستێ حکۆمەتا عیراقێدا و جار ژی دەڤەرەکا بەردای بوو، بەلێ ناحیە هەر ب ناڤێ ناحیا سلێڤانەیی و مەلبەندێ وێ ژی هەر گوندێ ئاسهێ بوو[١٠٦]، د ناڤبەرا ١٩٧٠ - ١٩٧٤ێدا سەربەر ل سنوورێ ناحیێ و کارگێریا ناحیێ ئاسایی بوو[١٠٧]. ل ئادارا ١٩٧٤ێ شەری د ناڤبەرا شۆرشا کوردستانێ و حکۆمەتا عیراقێ دەسپێکر، ناحیا سلێڤانەیی ب مەلبەندێ خۆ و گوند و دەڤەرێن سەر ب ناحیێ کەتە د ناڤ جەرگێ رووداناان و بوو بەرۆکا شەری، سەنتەرێ ناحیێ و گوندێن وێ هاتنەبەردان و د گەرماتیا رووداناندا حکۆمەتێ کارێ ئاڤاکرنا چەند کۆمەلگەهان ل دەڤەرێن دەشتێ یێن دووری بنارا چیایێ بێخیری کر، ب داویهاتنا شەری ل ئادارا ١٩٧٥ێ هندەك ژ وان کۆمەلگەهان د قۆناغا داویهاتنێدا بوون[١٠٨]، د ڤی سەروبەریدا ب سێ قۆناغان حکۆمەتێ دەست ب راکرن و کاڤلکرنا گوندێن دەڤەرێ کر، هەر ژ سالا ١٩٧٤ێ ب ڤەگوهاستن و کاڤلکرنا ٧٢ گوندێن دەڤەرا سلێڤانەییان دەست ب قۆناغا ئێکێ کر تنێ مەلبەندێ ناحیێ گوندێ ئاسهێ هێلا ل جهێ خۆ، ل قۆناغا دووێ سالا ١٩٨٣ێڤە چەند گوندێن دی ب مهانا چێکرنا سکرێ مووسلێ هاتنەراکرن، ل قۆناغا سیێ ل سالا ١٩٨٧ێ گوندێن سەر ب ناڤەندا سێمیلێ ڤە ماین دگەل هندەك گوندێن ناحیا زمار و فەیدیی و مەلبەندێ ناحیا سلێڤانەیی و راکرن و بنگەهێ ناحیێ ژ ئاسهێ ڤەگوهاستە کۆمەلگەهێ باتیلێ و ب ڤی رەنگی داوی ب ژیێ ناحیا سلێڤانەیی هات و ناحیا باتیلێ جهێ وی گرت و هەر د سالا ١٩٧٨ێدا دەمێ قەزا سێمیلێ هاتیەپێکئینان ئەڤ ناحیەیە دابوونە دگەل وێ[١٠٩].

- **ناحیا سندی**، وەك ئاماژە پێ هاتیەکرن سندی یەك ژ ناحیەیێن هەرکەڤنێن قەزا زاخۆ یە و هەتا سالا ١٩٥٥ێ مەلبەندێ ناحیێ ل گوندێ دەرکارێ بوو[١١٠]، پاشتر هاتەڤەگوهاستن بۆ گوندێ شەرانشێ، ل سالا ١٩٧٨ێ سەنتەرێ ناحیێ هاتیەڤەگوهاستن بۆ گوندێ دەرکارعەجەم و ب ناحیا دەرکارێ هاتیە نیاسین[١١١]، د قۆناغا ناڤبەرا ١٩٥٨- ١٩٧٠ێدا سەروبەرێ کارگێری نەیێ سەقامگیر بوو، جارنا دەڤەر ل ژێر دەستەلاتێ شۆرشا کوردستانێ بوو و جار ژی ل ژێر دەستەلاتێ حکۆمەتێ بوو، د ناڤبەرا سالا ١٩٦٦- ١٩٧٠ێدا سەرکردایەتییا شۆرشا کوردستانێ رێڤەبەرێ ناحیێ بۆ ناحیا شەرانشێ دانا[١١٢]، د ناڤبەرا ١٩٧٠- ١٩٧٤ێ سەروبەرێ کارگێری ل ناحیێ ئاسایی بوو، بەلێ د هەر کاودانەکیدا بیت ناحیە وەك خۆ مابوو و نەهاتەهەلوەشاندن و مەلبەندێ ناحیێ ژی ل جهێ خۆ مابوو. پشتی شکەستنا شۆرشا کوردستانێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ دەڤەرێن سەر ب هەردو ناحیەیێن سندی و گولی کەتنە بەرهەوەکا ڤالاکرن و خرابکرنا گوندان و ڤەگوهاستنا خەلکێ وان بۆ کۆمەلگەهێن ل دۆرێن سەنتەرێن هەردو ناحیان و نێزیکی زاخۆ هاتینەئاڤاکرن، نە تنێ ئەو خەلکە بەلکێ خەلکێ گوندێن ناحیا کانی ماسێ ژی ل ڤان کۆمەلگەهان ئاکنجیکرن، کو د پشکێن دیترێن ئینسکلۆپیدیایێ ب بەرفرەهی ئاماژە پێ هاتیەکرن.

- **ناحیا گولی**، مەلبەندێ ناحیێ هەتا سالا ١٩٢٧ ل گوندێ دێمکا بوو[١١٣]، پاشێ هاتەڤەگوهاستن بۆ گوندێ بەهنونە گولی، پاشتر هاتیەڤەگوهاستن بۆ گوندێ باتوفا[١١٤]، د سالێن ناڤبەرا ١٩٥٨-١٩٧٠ و ١٩٧٠ - ١٩٧٤ و ١٩٧٥-١٩٩٠ێ سەروبەرێ ناحیا گولی هەمان سەروبەرێ ناحیا سندی بوو.

- **قەزا سێمیلێ**، ژ گۆهرینێن گرنگێن د سەروبەرێ کارگێریێ پارێزگەها دهۆکێ رووداین دامەزراندنا قەزا سێمیلێ بوو، ئەڤ قەزایە ب بریارا کۆماری هژمار ٤٢٧ ل ٢٥ تیرمەها ١٩٧٨ێ ژ هەردو ناحیێن مەلبەندێ سێمیلێ و سلێڤانەیی هاتەدامەزراندن[١١٥].

نەخشەیێ پارێزگەها دهۆکێ بەری سەرهلدانا ۱۹۹۱ێ




- **ناحیا سلێڤانەیی- باعتێلێ،** د بەریەرێن چوویبدا ب بەرفرەهی ئاماژە پێ هاتەکرن.

- **ناحیا فەیدێ،** دهەمان سالا ۱۹۷۸ێ یا قەزا سێمێلێ هاتییە دامەزراندن، ناحیا فەیدێ ژێ هاتییەدامەزراندن و ۳۰ گوندێن دەڤەرێ داینە د ناڤ سنورێ ناحییێدا[116] و سەروبەرێ وێ ب ڤی رەنگی مایە هەتا سەرهلدانا ۱۹۹۱ێ.

- **قەزا ئاکرێ،** د ناڤبەرا ۱۹۵۸- ۱۹۷۰ێ ژ ڤێ قۆناغێدا سەروبەرێ کارگێری ل قەزا ئاکرێ وەك خۆ بوویە و تنێ سێ ناحیەیێن زێبار (نەهلێ) و سۆرچی و بەردەرەش(عەشائیرول سەبعە) سەر ب سنوورێ وێ بوون. ل ۳۱ تیرمەها ۱۹۷۲ێ ب بریارەکا کۆماری ناحیا گردەسین هاتەدامەزراندن و بوو چوارەمین ناحیا سنوورێ قەزا ئاکرێ[117].

د قۆناغا ناڤبەرا ۱۹۵۸- ۱۹۷۵یدا سەرەرای کاودانێن ل دەڤەرێن سنوورێ قەزا ئاکرێ روودایێن چ گۆهرین نەکەتنە د پێکهاتا کارگێریا قەزا ئاکرێ دا ژبلی دامەزراندنا ناحیا گردەسین، بەلێ پشتی ئادارا ۱۹۷۵ێ و دەسپێکرنا پرۆسا خرابکرن و کاڤلکرنا گوندان و ڤەگوهاستنا خەلکێ وان بۆ دەڤەرێن پتر ل ژێر کۆنترۆلا حکۆمەتێ ڤێ چەندێ ژ گەلەك گوندێن سنوورێ ڤێ قەزایێ ب تایبەت سنوورێ ناحیا زێبار (نەهلێ) گرت و کەلا حکۆمەتێ ب ڤێ چەندێ نەرێت، ب بریارەکا کۆماری ل ۱۱ حزیرانا ۱۹۸۷ێ د چوارچوڤێ هەلوەشاندنا ناحیاندا بریارا هەلوەشاندنا هەرسێ ناحیەیێن نەهلێ، سۆرچی و گردەسین ل قەزا ئاکرێ دا[118]، و ئەڤ قەزایە ما خودانا خۆ و تنێ ناحیا بەردەرەش و ئەڤ سەروبەرە هەتا سەرهلدانا ۱۹۹۱ێ پێ بەردەوام بوو.

هندی پەیوەندی ب قەزا ئاکرێ هەژییە ل ڤێرێ ئاماژە پێ بکەین، ل دووڤ بریارا ب لیوا (پارێزگەهـ) کرنا دهۆکێ ئەوا ب بریارەکا کۆماری ل ۲۷ گولانا ۱۹۶۹ێ دەرکەتی ئاکرێ یەك ژ وان چوار قەزایان بوو یێن لیوا دهۆکێ ژێ پێکدهات، بەلێ ل دووڤ برگا چوارێ ژ هەمان بریارێ قەزا ئاکرێ

ب رەنگەکی دەمکی ما گرێدای لیوا مووسلی هەتا ئەو ئەگەرێن کارگێریێن وی چاخی ژ ناڤ دچن[119]. بەلێ ئەڤ بریارە نەهاتەبجهئینان و ب مەرەما دانا رەنگە شەرعییەتەکا یاسای ب ڤێ بجهنەئینانێ ب بریارەکا رۆژا ١٥ نیسانا ١٩٨٠ێ یا جڤاتا سەرکردایەتییا شۆرشێ یا حوکمدار ل بەغدا راپرسییەك د ناڤ خەلکێ ئاکرێ دا هاتەکرن کا وان دڤێت ژ ئالیێ کارگێری سەر ب پارێزگەها دهۆکێ بن یان پارێزگەها مووسلێ، پشتی ئەنجامدانا وێ راپرسیێ هەمان جڤاتا سەرکردایەتییا شۆرشێ ب فەرمی بریاردا قەزا ئاکرێ ب سنوورێ خۆیێ کارگێریڤە بێتەگرێدان دگەل پارێزگەها نەینەوا[120]، ب ڤێ چەندێ برگا چوار ژ بریارا ب پارێزگەهکرنا دهۆکێ هاتەهەلوەشاندن و مژارا گرێدانا کارگێرییا ئاکرێ د بەرژەوەندییا مووسلێ دا هاتەئێکلاکرن.

- **قەزا شێخان،** د دوا ڤۆناغێن دەستەلاتدارییا شاهینی ل عیراقێ قەزا شێخان ژ هەردو ناحیێن ئەلقوش و مزووری زێدەباری ناحیا مەلبەندێ شێخان پێکدهات، ئەڤ سەروبەرە هەتا داوییا سالا ١٩٦٩ێ یێ بەردەوام بوو هەتا رۆژا ٢٠ کانوونا دووێ ١٩٧٠ێ بریارا ب قەزاکرنا تلکێفێ هاتییەدان، ل دووڤ ڤێ بریارێ ناحیا ئەلقوش دانە دگەل ڤێ قەزایا نوو دامەزراندی[121]. پشتی وێ ب چوار رۆژان ئانکو ل ٢٦ کانوونا دووێ بریارا دامەزراندنا ناحیا مرێبا هاتەدان و ئەڤ ناحیەیە کەتە د سنوورێ کارگێریێ قەزا شێخان دا[122].
- **ناحیا مرێبا،** کو سەنتەرێ وێ ل گوندێ مرێبا بوو دگەل ناحیا مزووری و ناحیا مەلبەندێ شێخان پەیکەرێ کارگێریێ قەزا شێخان پێکدئینا هەتا ل رۆژا ١١ حزیرانا ١٩٨٧ێ بریارا هەلوەشاندنا وێ دگەل چەندین ناحیەیێن دیتر هاتییەدان[123].
- **ناحیا مزووری (ئەتریش)،** وەك ئاماژە پێ هاتییەکرن، ژ ناحیێن هەری کەڤنێن پارێزگەها دهۆکێ یە، پشتی نسکویا شۆرشا کوردستانێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ ب دەمەکێ کێم خەلکێ ئەتریش ل سەر مال و مولکێن وان هاتنەراکرن و ڤەگوهاستنە دەڤەرا بەردەرەش و ب زۆری ل وێرێ ئاکنجیکرن و د هەمان دەمدا دۆرێن سەد خانیێن نوو ئاڤاکرن و عەرەب لێ نیشتەجێکرن[124]، دڤۆناغێن ناڤبەرا سالا ١٩٧٥- ١٩٩١ێدا ب تایبەت د ئەنفالێن ١٩٨٨ێدا و بەری وان ژی نە تنێ باژێرکێ ئەتریش بەلکی سەرانسەری گوندێن ناحیا ئەتریش هاتنەخرابکرن و هەرفاندن و هەرئێك ژ خەلکێ وان مشەختبوو جهەکی، تنێ ئەتریش ما ئەوژی هاتبوو بعەرەبکرن[125]، ل ١١ حزیرانا ١٩٨٧ێ ب بریارەکا دی یا کۆماری ناحیا مزووری (ئەتریش) دگەل چەندین ناحیێن دی هاتییەهەلوەشاندن[126]. ب ڤی رەنگی بەری سەرهلدانا ١٩٩١ێ قەزا شێخان ژبلی ناحیا مەلبەندی خودانی دو ناحیەیان مزووری و مرێبا بوو هەردو ژی ل سالا ١٩٨٧ێ هاتبوونەهەلوەشاندن

## ب پارێزگەهکرنا دهۆکێ:

بەروڤاژی دگەل ب پارێزگەهبوونا هەموو پارێزگەهێن عیراقێ و کوردستانێ کو ب بریارەکێ و ژ ئەنجامێ پێدڤیاتییەك تایبەتدا د دەمەك دیارکریدا بووینە پارێزگەهـ، دهۆك ژ ئەنجامێ چەندین پێدڤیاتییان و خەبات و بزاڤ و کارەکێ درێژدا بوویە پارێزگەهـ و دەمەکێ درێژ ڤەکێشایە هەتا دەستەلات ل عیراقێ رازیبووی بریارا ب پارێزگەهکرنا دهۆکێ بدەت.

پێدڤیاتیێن ب پارێزگەهکرنا دهۆکێ گەلەکن، بەلێ ب کورتی دێ ئاماژە ب هندەکان کەین، بەری هەرتشتەکی دێ بێژین دەڤەرا بەهدینان کو نها خۆ د سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ را دبینیت ژ دەسپێکا سەدسالیا سێزدێ زایینی هەتا سالا ١٨٤٢ێ د چوارچووڤێ میرگەها بەهدینان دا رەنگە سەربەخۆییەك هەبوویە[127] و ب درێژیا ڤێ ڤۆناغێدا چ جاران راستەوخۆ نەکەتییە ژێر دەستەلاتێ ویلایەتا مووسلێ یان هەر ویلایەتەکا

دەولەتا ئوسمانی. تایبەتمەندییەك دیترا بەهدینان د زمان و دیالێكت و رەوشەنبیری و مێژووا وێ دایە، ژ ئالیێ زمانی ڤە زمانێ كوردی زمانێ سەرەكییێ خەلكێ بەهدینانە كو وێ ژ زمانێ سەرەكییێ سەنتەرێ ویلایەتا مووسلێ ئانكو باژێرێ مووسلێ جودا دكەت، ژ ئالیێ دیالێكتێڤە ژی هەرچەند بەهدینی تێشكەزارەكا دیالێكتا كرمانجییا ژووری یا كوردی یە لێ ڤێ تێشكەزاری تایبەتمەندیێن خۆ هەنە كو وێ ژ تێشكەزارێن دی یێن كرمانجییا ژووری و دیالێكتێن دی یێن كوردی جودا دكەت، ڤان دو فاكتەران تایبەتمەندییەك رەوشەنبیری كەلتوری دایە دەڤەرا بەهدینان كو وێ ژ دەڤەرێن دی جودا دكەت. ژ ئالیێ ئایینیڤە بەهدینان سێ ئایین مووسلمان و مەسیحی و ئێزدی ب خۆڤە گرتینە و ژ ئالیێ مەزهەبیڤە مووسلمانێن بەهدینان ل سەر مەزهەبێ ئیمامێ شافعی نە دگەل سەنتەرێ ویلایەتا مووسلێ كو پرانی حەنەفی مەزهەبن و دگەل دەولەتا ئوسمانی ب تایبەت تەخا بالادەست و دەستەلاتدار كو ئەو ژی حەنەفی مەزهەبن جودادكەت و ئەڤ جوداهییەژی تایبەتمەندییەك دیتر ددەت دەڤەری بەهدینان. چەند تایبەتمەندیێن دیتر ل دەڤەرا بەهدینان هەنە كو وێ ژ دەڤەرێن دیتر جودادكەن و رێخۆشكەرن كو ئەڤ دەڤەرە ژ ئالیێ كارگێریڤە سەربەخۆ بیت دوور ژ دەستەلاتێ ولایەت یان لیوا مووسلێ بیت. بەلێ پێدڤییە بێژین تایبەتمەندیا هەرەمەزن ئەو بوو كو ئەڤ دەڤەرە دۆرێن شەش سەدسالییەكان د سنوورێ میرگەها بەهدینان‌دا سەربەخۆ بوویە و پشتی ژ ناڤچوونا میرگەهێ و ژ دەستدانا ڤێ سەربەخۆییێ هزرا ڤێ سەربەخۆییێ و زڤراندنا وێ هەردەم د هزرا خەلكێ دەڤەرێدا بوویە ب تایبەت د هزرا كەسانێن هشیار و پێشەنگدا بوویە. زێدەباری ڤێ هەموویێ دڤێت وێ چەندێ بەرچاڤوەرگرین، پشتی ژ ناڤچوونا میرگەها بەهدینان و دروستبوونا دوا پێكهاتا كارگێریا ویلایەتا مووسلێ ل سالا ١٨٧٩ێ ویلایەتا مووسل ژ سێ لیوایان (مووسل، كەركووك و سلێمانیێ) پێكدهات، لیوا مووسلێ كو مەلبەندێ ویلایەتێ بوو ژ شەش قەزایان (قەزا مووسل (مەلبەندێ لیوایێ)، ئامێدیێ، دهۆك، زاخۆ، ئاكرێ و شنگال) پێكدهات[128]، ب سەرنجدانا ڤێ پێكهاتێ دیاردبیت هەردو لیوایێن ویلایەتێ كەركووك و سلێمانیێ و هەر شەش قەزایێن لیوا مووسلێ (ئامێدیێ، دهۆك، زاخۆ، ئاكرێ، زێبار و شنگال) پرانییا كوردی بوون. ب نەمانا دەولەتا ئوسمانی و دامەزراندنا حكۆمەتا عیراقێ ویلایەتا مووسل هاتەهەلوەشاندن و لیوا مووسلێ جهێ وێ گرت، هەردو لیوایێن پرانییا كوردی كەركووك و سلێمانیێ ژێ جودابوون، تنێ قەزایێن كوردی مانە ل ژێر دەستەلاتێ لیوا مووسلێ دگەل قەزا مووسل یا مەلبەندی كو قەزایەكا تێكەل بوو ژ عەرەب، كورد، توركمان و پێكهاتێن دیتر. ب بنەجهبوونا ئەوا ب دەستەلاتێ نیشتمانیێ عیراقێ (الحكم الوطني) و دەستبكاربوونا شاهـ فەیسەلێ ئێكێ وەك شاهـ (مەلك)ێ عیراقێ ل سالا ١٩٢١ی لیوا مووسلێ ما خودانی خۆ و قەزایێن: مووسل (مەلبەند)، ئامێدیێ، دهۆك، زاخۆ، ئاكرێ، شنگال و تەلعفرێ[129]، ل ڤێرێ ژی پێنج قەزایێن كوردی: ئامێدیێ، دهۆك، زاخۆ، ئاكرێ و شنگال مانە ل ژێر دەستەلاتێ قەزا مووسلێ كو دو ناحیێن وێ شێخان و بەردەرەش ژی كوردی بوون.

هزرا زڤراندنا رەنگە سەربەخۆییەكێ بۆ دەڤەرا بەهدینان و پاشتر بەرجەستەبوونا ڤێ هزرێ د ب پارێزگەهكرنا دهۆكێ د زڤریتەڤە دەسپێكا سەدسالییا بیستێ و د داوی دەهسالییا ژیێ دەولەتا ئوسمانی و بزاڤ بۆ بنەجهكرنا ڤێ هزرێ هەتا ٢٩ گولانا ١٩٦٩ێ د بەردەوامبوون:

- ب كوردیكرنا زمانێ رەسمی ل قەزایێن زێبار، ئاكرێ، دهۆك، زاخۆ و ئامێدیێ كو ئەڤرۆ پارێزگەها دهۆكێ دەگەل دەڤەرا بارزان ئانكو قەزا مێرگەسوورا نها پێكدئینن و چەسپاندنا خواندنا كوردی و دامەزراندنا قائیمەقام و بەرپرسێن كورد یان كوردیزان و چەندین داخوازێن دیتر پشكەك بوون ژ وێ داخوازنامێ یا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی و هندەك مەزنێن دەڤەرێ ل سالا ١٩٠٨ێ و ل دووڤ هندەك ژێدەران ل

سالا ١٩١١ێ ل دهۆکێ و ل مالا شێخ نور محەمەدی نڤیسی و بلندکری بۆ دەستەلاتدارێن ئوسمانی ل ستەنبۆلێ[١٣٠]، هەرچەندە د ڤێ داخوازنامەیێدا داخوازا یەکەیەکا کارگێری یان لیوایەکێ ب ناڤێ دهۆکێ یان هەرناڤەك دیتر نەهاتییەکرن بەلێ ئەڤ داخوازنامەیە و برگەیێن وێ رامانا رەنگە سەربەخۆییەکێ بۆ ڤان قەزایان ددەت.

- هزرا ب پارێزگەهکرنا دهۆکێ دگەل دەمەزراندا حکۆمەتا عیراقی ژ ئالیێ (سیر برسی کوکس) مەندوبێ بریتانی ل عیراقێ هاتییەبەرچاڤکرن، وی ل ٦ گولانا ١٩٢٣ێ پێشنیازکربوو لیوایەك ژ قەزایێن سەر ب لیوا مووسلێ زاخۆ، ئاکرێ، دهۆك و ئامێدیێ بێتەدامەزراندن و موتەسەریف و قائیمەقامێن وی ب رەنگەکێ بەروەخت بریتانی بن هەتا فەرمانبەرێن کورد و عەرەبێن کوردی زان و کورد ژێ رازی جهێ وان دگرن و ئەڤ لیوایە بۆ کاروبارێن دارایی و دادوەری دێ سەر ب حکۆمەتا بەغدا بیت و بۆ کاروبارێن ئیداری دێ قائیمەقام گرێدایی موتەسەریفی بن، دامەزراندنێن کارگێری ژی مەندوبێ سامی ب راوێژ دگەل حکۆمەتا خۆجهی دێ پێ رابیت[١٣١]، دیرۆکنڤیس محەمەد ئەمین زەکی ژی د بیرئانینەکێدا کو ل ١٩٣٠ێ بۆ شاهێ عیراقێ بلندکری داکوکی ل سەر وێ چەندێ کرییە کو ل ٦ گولانا ١٩٢١ێ مەندوبێ سامیێ بریتانی ژڤان دابوو کوردان لیوا دهۆکێ دامەزرینیت[١٣٢]. ژ ڤێ چەندێ دیار دبیت کو بەری دەست بکاربوونا شاهێ عیراقێ فەیسەلێ ئێکێ ل ٢٣ تەباخا ١٩٢١ێ ب سێ هەیڤان مژارا ب پارێزگەهبوونا دهۆکێ هاتییە بەرچاڤکرن.

- ل ٢٤ نیسانا ١٩٢٩ێ شەش نوونەرێن کورد د جڤاتا نوونەرێن عیراقێدا داخوازنامەك پێشکەشی سەرۆکوەزیرێن عیراقێ و مەندوبێ سامیێ بریتانی ل عیراقێ کرییە و تێدا دامەزراندنا لیوایەکێ ژ قەزایێن کوردی یێن لیوا مووسلێ: ئاکرێ، زێبار، ئامێدیێ، زاخۆ و دهۆکێ کرییە ب ناڤێ لیوا دهۆکێ و سەنتەرێ وێ بازێرکێ دهۆکێ بیت کرییە[١٣٣].

- یەك ژ داخوازێن شۆرشا بارزان ١٩٤٣- ١٩٤٥ێ یێن ل ٧ کانوونا دووێ ١٩٤٤ێ پێشکەشی نوونەرێ حکۆمەتا شاهیا عیراقی کرین دامەزراندنا لیوا دهۆکێ بوو ژ قەزایێن کوردیێن لیوا مووسلێ[١٣٤].

- دیارە بزاڤێن کوردان بۆ ب لیواکرنا دهۆکێ د بەردەوامبووینە، بەلێ دسەردەمێ مەلکیدا چ پێڤەنەهاتییە هەتا روودانا شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ ل عیراقێ، د سالێن بەراهیێ یێن ڤێ قوناغێدا ئەڤ بزاڤە ب رەنگەکێ دی د بەردەوام بوونە، ئەوژی د چوارچووڤێ وارێ پەروەردێدا، ل سالا ١٩٥٩- ١٩٦٠ێ بۆ یەکەمین جار خواندنا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان قەزایێن کوردی یێن لیوا مووسلێ هاتییە چەسپاندن[١٣٥]، ڤێ چەندێ دەلیڤە ل بەر مامۆستا و رەوشەنبیرێن دەڤەرێ ڤەکرییە ب بەرچاڤوەرگرتنا تایبەتمەندیا بەهدینان و خواندنا کوردی ل دەڤەرێ ب رێکێن رەسمی داخوازا رەنگەسەربەخۆییەکێ د وارێ پەروەردێدا بۆ دەڤەرا بەهدینان بکەن ئەوژی بۆ دامەزراندنا رێڤەبەریا خواندنا کوردی (رێڤەبەریا زانیاریا بەهدینان) کو ل سەنتەرێ دهۆکێ بیت و هەموو خواندنگەهێن کوردی ل دەڤەرێ سەر ب وێ رێڤەبەریێ بن[١٣٦].

- دیارە چەند کورد ب تایبەت خەلکێ دەڤەرێ رژدبوونە ل سەر ڤێ داخوازێ ئاستەنگ ژی بەرامبەری وێ زۆر بووینە، لەوما پشتی دەسپێکرنا شۆرشا کوردستانێ ل ١١ ئەیلوولا ١٩٦١ێ د هەر دانوستاندنەکێ د ناڤبەرا سەرکردایەتییا شۆرشێ و حکۆمەتا عیراقێ یەك ژ داخوازێن شۆرشێ دامەزراندنا لیوا دهۆکێ بوویە، هەربۆ نموونە د دانوستاندنێن ١٩٦٤- ١٩٦٥ێدا یەك ژ داخوازێن شاندێ کوردستانێ ل مەها کانوونا دووێ ١٩٦٥ێ پێشکەشی بەرپرسێن عیراقێ کرین دامەزراندنا لیوا دهۆکێ ژ قەزایێن کوردی یێن لیوا مووسلێ بوو، لێ حکۆمەتا عیراقی ئەڤ خالە دگەل چەند خالێن دی یێن داخوازێن شۆرشێ د بنیاتدا نە پەژراند[١٣٧]. د پێکهاتنا ٢٩ حزیرانا ١٩٦٦ێدا یەك ژ خالێن نهێنییێن پێکهاتنێ دامەزراندنا لیوا دهۆکێ بوو[١٣٨].

- هەرچەندە پێکهاتنا ٢٩ حزیرانێ نەهاتەبجهئینان و ما هەلاویستی هەتا ل ١٧ تیرمەها ١٩٦٨ێ حزبا

بەعس ل عیراقێ دەستەلات گرتیە دەست، ل دەسپێكا ١٩٦٩ێ شەرێن مەزن ل ناڤبەرا پێشمەرگەیێ كوردستانێ لەشكەرێ حكۆمەتا عیراقێ روودان، ب مەرەما خۆشرینكرن و دانا روویەكێ پێشكەتی بۆ دەستەلاتێ خۆ د گەرماتیا ڤان شەراندا حكۆمەتا عیراقێ د ڤیا هندەك پێنگاڤان د بەرژەوەندیا خەلكێ كوردستانێدا و وەك بجهئینانا هندەك بەندێن پێكهاتنا ٢٩ حزیرانێ بهاڤێت، یەك ژ وان پێنگاڤان بریارا پێكئینانا لیوا دهۆكێ، ئەوبوو ل ٢٩ گولانا ١٩٦٩ێ ل دووڤ بریارەكا جڤاتا سەركردایەتیا شۆرشێ یا حوكمدار ل عیراقێ و ئیمزا سەرۆككۆمار ئەحمەد حەسەن بەكر بریارا پێكئینانا لیوا دهۆكێ هاتەدان، ل دووڤ ڤێ بریارێ بریارا كۆماری (المرسوم الجمهوری) هژمار ١٠٦٦ سالا ١٩٦٩ێ هاتەدان، ڤێ بریارا كۆماری د چوار برگەیاندا چاوانیا پێكئینانا لیوا دهۆكێ دا دیاركرن، دبرگەیا ئێكێدا سنوورێن لیوا دهۆكێ ب قەزایێن دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ و ئاكرێ دیاركرن، دبرگەیا دوویدا سنوورێن لیوا مووسل ب قەزایێن مەلبەندێ مووسلێ، شێخان، تەلەعفر، شنگال، حەزەر و شرگات دیاركرن، د برگەیا سێیدا هاتیە ناحیا مزووری ژ قەزا شێخانا لیوا مووسلێ بێتەڤەقەتاندن و بدەنە دگەل قەزا دهۆكێ یا لیوا دهۆكێ، د برگەیا چوارێدا هاتیە قەزا ئاكرێ ب رەنگەكێ بەروەخت دێ مینتە گرێدای دگەل لیوا مووسلێ هەروەسان ناحیا مزووری ب رەنگەكێ بەروەخت دێ مینتە گرێدای دگەل دگەل قەزا شێخان هەتا ئەگەرێن كارگێرییێن نها ژناڤدچن[١٣٩].

هەژیە ل ڤێرێ ئاماژە ب دو خالان بكەین:

١- سەروبەرێ قەزا ئاكرێ و ناحیا مزووری ما گرێدایی لیوا مووسلێ هەتا سەرهلدانا ١٩٩١ێ وەك پێشتر ژی ب بەرفرەهی هاتیەدیاركرن.

٢- هەتا دامەزراندنا لیوا دهۆكێ ل عیراقێ پەیڤا لیوا ل شوینا پارێزگەهـ دهاتەبكارئینان و پشتی دەرچوونا بریارا ب لیوا كرنا دهۆكێ قانوونا پارێزگەهان (قانون المحافظات) ل عیراقێ ل سالا ١٩٦٩ێ دەركەتییە و پەیڤا پارێزگەهـ و پارێزگار (المحافظة و المحافظ) شوینا پەیڤا لیوا موتەسەریف (لیواء و المتصرف) گرتییە.

## قۆناغا پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ی

پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ و ڤەكێشانا كارگێرییێن حكۆمەتا عیراقێ ل باشووری كوردستانێ سەروبەرێ كارگێری د بێ سەروبەرییەك مەزندا بوو، پرانیا ناحیان هاتبوونە هەلوەشاندن و سنوورێن كارگێری هاتبوونە گۆهارتن، چەند یەكەیێن كارگێری كەتنە ژێر دەستەلاتداریا كوردی كو پێشتر نە سەر ب پارێزگەهێن سەر ب دەڤەرا ئوتونومی یا جاران بوو و چەندین پێدڤیاتیێن دیتر پێدڤی دكر دەملدەست پشتی هەلبژارتنێن یەكەمین پەرلەمانێ كوردستانێ ل ٢٦ گولانا ١٩٩٢ی و دامەزراندنا یەكەمین كابینەیا حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ حزیرانا ١٩٩٢ی پەرلەمان و حكۆمەت سەروبەرێ كارگێری راستڤەكەن و یەكەیێن هەلوشاندی بزڤریننەڤە و هندەك یەكەیێن كارگێریێ نوو دامەزرینن، ئەڤ چەندە مل ب ملێ پارێزگەهێن دیترێن هەرێمێ ل پارێزگەها دهۆكێ ژی هاتەئەنجامدان، بۆ بەرچاڤكرنا ڤان گۆهارتنان دێ هەر قەزایەكێ جودا بەرچاڤكەین:

- **قەزا ئامێدیێ:** بەری سەرهلدانێ قەزا ئامێدیێ مابوو تنێ ب سەنتەرێ قەزایێ و ناحیا سەرسنكێ، هەردو ناحیەیێن بەرواری (كانی ماسی) و دیرەلۆكێ یێن سەر ب ڤێ قەزایێ هاتبوونەهەلوەشاندن.
- ل سالا ١٩٩٦ێ سەرژنوو ناحیا دێرەلۆكێ هاتەپێكئینان و ل ١ نیسانا ١٩٩٦ێ یەكەمین رێڤەبەرێ ناحیێ یێ هەرێما كوردستانێ دەست بكار بوو[١٤٠].
- ل سالا ١٩٩٦ێ ناحیا كانی ماسێ (بەرواری بالا یا جاران) سەرژنوو هاتەڤەپێكئینان[١٤١].
- ل ١٩شباتا ٢٠٠٠ێ ب بریارا حكۆمەتا هەرێمێ ناحیا بامەرنێ هاتەدامەزراندن و ل رۆژا ١٩ تەباخا ٢٠٠٠ێ یەكەمێن رێڤەبەرێ ناحیێ دەست بكاربوو[١٤٢].
- ب فەرمانا سەرۆكاتیا هەرێما كوردستانێ هژمار ١٠٤١ل ٢٠ تەباخا ٢٠١٣بریارا دامەزراندنا ناحیەكا دی ل سنوورێ قەزا ئامێدیێ ب ناڤێ ناحیا شێلادزێ هاتەدان[١٤٣].
- ناحیا چەمانكێ: دوا ناحیا سنوورێ قەزا ئامێدیێ یە

## نەخشەیێ پارێزگەها دهوٚکێ پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ ێ




ل ١٩ شباتا ٢٠٠١ێ ب بڕیارەکا حکوٚمەتا هەرێما کوردستانێ هاتیەپێکئینان(١٤٤).

- **قەزا زاخوٚ:** وەك د بەرێ پێشتردا ئاماژە پێ هاتیەکرن د قوناغا ناڤبەرا ١٩٧٥- ١٩٩١ێ ژ سێ ناحیەیێن قەزا زاخوٚ تنێ ناحیا رزگاری هاتبوو هەلوەشاندن هەردو ناحیەیێن دیتر سندی و گولی کو نها پتر ب ناحیا دەرکار و باتووفا دهێنەنیاسین ل جهێ خوٚ مابوون و چ گوٚهرین د سەروبەرێ وانێ کارگێریدا روونەدابوون، تنێ گوندێن وان هاتبوونە ڤالاکرن و خرابکرن خەلکێ وان دگەل خەلکێ گوندێن ناحیا بەرواری ل کوٚمەلگەهێن دەوروبەرێن دەرکارێ و باتووفا هاتبوونە خرڤەکرن، پشتی سەرهلدانێ ل دەسپێکا سالا ١٩٩٨ێ سەرژنوو ناحیا رزگاری هاتیەڤەدامەزراندن و ل ٢٧ شباتا ١٩٩٨ێ یەکەمین رێڤەبەرێ سەردەمێ حکوٚمەتا هەرێما کوردستانێ دەست ب کارێ خوٚ کرییە(١٤٥). ب ڤی رەنگی نها قەزا زاخوٚ سێ ناحیەیێن دەرکار، باتووفا و رزگاری ب خوٚڤە دگریت.

- **قەزا دهوٚکێ:** پشتی دامەزراندنا قەزا سێمێلێ ل سالا ١٩٧٨ێ قەزا دهوٚکێ ما بوو خودانی تنێ دو ناحیەیان مانگێش و زاویتە، ل سالا ١٩٨٦ێ حکوٚمەتا عیراقێ ناحیا مانگێشێ ژی هەلوەشاند

و گوند و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە دانە دگەل ناحیا زاویتە، پشتی سەرهلدانا ۱۹۹۱ێ ل سالا ۱۹۹۵ێ ب بریارەکا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ناحیا مانگێش سەر ژ نوو هاتەڤە دامەزراندن[١٤٦] و هەتا نها قەزا دهۆکێ دو ناحیەیێن زاویتە و مانگێشێ بخۆڤە دگریت.

- **قەزا ئاکرێ:** ئەڤ قەزایە یەك ژ وان چوار قەزایان بوو یێن ل دووڤ بریارا ب لیوا (پارێزگەهـ)کرنا دهۆکێ پارێزگەها دهۆکێ ژێ پێکدهات، بەلێ وەك هاتییەدیارکرن حکۆمەتا عیراقێ هەر ل دەسپێکێ ب مهانەیەکا بێ بنەما ئاستەنگ دانا درێکا گرێدانا ڤێ قەزایێ دگەل پارێزگەها دهۆکێ و پاشتر ژی ئەڤ ئاستەنگە کرە بریارەکا یاسایی و ب یەکجاری ئاکرێ ژ پێکهاتا پارێزگەها دهۆکێ ڤەقەتاند، سەربەر ب ڤی رەنگی ما هەتا سەرهلدانا ۱۹۹۱ێ، پشتی دامەزراندنا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ، ب بریارا ڤێ حکۆمەتێ ل ۱۵ تیرمەها ۱۹۹۲ێ قەزا ئاکرێ دگەل دهۆکێ هاتەگرێدان و ١٤شباتا ۱۹۹۳ێ یەکەمین قائیمەقامێ سەردەمێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ دەست ب ئەرکێ خۆ کر[١٤٧]. وەك ئاماژە پێ هاتییەکرن ئاکرێ خودانی چوار ناحیەیێن بەردەرەش، (نەهلێ) دینارتە ، (سۆرچی) بجیل و گردەسین بوو، ل ۱۱ حزیرانا ۱۹۷۸ێ هەرسێ ناحیەیێن نەهلێ، سۆرچی و گردەسین ب بریارەکا کۆماری هاتبوونە هەلوەشاندن[١٤٨]، پشتی سەرهلدانێ ل سالا ۱۹۹٦ێ ناحیا نەهلێ ب ناڤێ دینارتە و سالا ۱۹۹۷ێ هەردو ناحیا گردەسین و ناحیا سۆرچی ب ناڤێ بجیل سەرژنوو ب بریارا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ هاتنەڤە دامەزراندن[١٤٩].

- **قەزا بـەردەرەش:** گۆرانکاریا گرنگا ل سەردەمێ سەرهلدانا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ل پێکهاتا کارگێریا پارێزگەها دهۆکێ رووداى پێکئینانا قەزا بەردەرەش بوو، پالپشت ب فەرمانا هەرێمی ژمارە (٢) ل رۆژا ۱۵ کانوونا ئێکێ ۲۰۰۷ێ ب فەرمانەکا سەرۆکاتییا جڤاتا وەزیرێن هەرێما کوردستانێ ل ۲۹ نیسانا ۲۰۰۷ێ بریار هاتەدان ناحیا بەردەرەش ببیتە قەزا و سەر ب پارێزگەها دهۆکێ بیت و ناڤەندا وێ ژی گوندێ بەردەرەش بیت و هەرسێ ناحیەیێن روڤیا، دارەتوو و کەلەك سەر ب ڤێ قەزایێ بن[١٥٠].

- **ناحیا کەلەك:** گوندێ کەلەکێ کو ب کەلەکا یاسین ئاغای و ئەسکی کەلەك ژی دهێتەنیاسین و ژ گوندێن ناڤدارێن دەڤەرێ یە، بەری هێرشا میر محەمەد پاشایێ میرێ رەواندزێ ل سالا ۱۸۳۲ێ بۆ سەر میرگەها بەهدینان ب کەلەکا داسنییان دهاتەناڤکرن و ئێزدی لی دژیان[١٥١]. ل ٢٤ شباتا ۱۹۷۰ێ ب بریارەکا کۆماری ئەڤ گوندە بوویە ناحیەکا سەر ب قەزا حەمدانیێ یا سەر ب پارێزگەها مووسلێ و چەند گوند و کەرت داینەدگەل سنوورێ وێ[١٥٢]. ئەڤ ناحیەیە ل ۱۱ حزیرانا ۱۹۸۷ێ دگەل چەندین ناحیەیێن دیتر هاتییەهەلوەشاندن[١٥٣]، پشتی سەرهلدانا ۱۹۹۱ێ ئەڤ ناحیەیە کەتییە د سنوورێ هەرێما کوردستانێ دا و لێ سەروبەرێ وی بێ کارگێری مایە هەلاویستی هەتا ب بریارەکا جڤاتا وەزیرێن هەرێما کوردستانێ هەردو ناحیەیێن (خەبات)ا سەر ب پارێزگەها هەولێرێ و ناحیا کەلەك داینە دگەلێك و ناحیەکا دیتر ب ناڤێ خەبات ژێ پێکئینایە و چەند گوندێن پارێزگەها دهۆکێ دگەل کەلەکێ ژ پارێزگەهێ ڤەقەتاندینە و داینە دگەل پارێزگەها هەولێرێ[١٥٤]. ب پێکئینانا قەزا بـەردەرەش کەلەك وەك ناحیەك زڤرییەڤە سنوورێ ڤێ قەزایێ و پارێزگەها دهۆکێ.

هەردو ناحیێن روڤیا و دارەتوو: گوندێن مەزنێن سەر ب ناحیا بەردەرەش بوون ب قەزابوونا ڤێ ناحیەیێ ئەوژی بووینە دو ناحیەیێن سەر ب قەزا نوو.

- **قەزا شێخان:** بەری سەرهلدانا ۱۹۹۱ێ قەزا شێخان ژبلی ناحیا مەلبەندی خودانی دو ناحیەیان مـزووری و مرێبا بوو هـەردو ژی ل سالا ۱۹۸۷ێ هاتبوونەهەلوەشاندن، پشتی سەرهلدانا ۱۹۹۱ێ سەروبەرەك تایبەت جودا ژ قەزایێن دیتر ل قەزا شێخان هاتەپێش، مەلبەندێ قەزایێ ئانکو باژێرکێ شێخان و پشکەك ژ دەڤەرێن سەر ب قەزایێ مانە ل ژێر دەستەلاتێ حکۆمەتا بەغدا

و پارێزگەها مووسلێ، پشكا دیتر كو هەردو ناحیەیێن هەلوەشاندی مرێبا و (ئەتریش) مزووری نە كەتنە ژێر دەستەلاتێ حكوومەتا هەرێما كوردستانێ، هندی پەیوەندی ب دەڤەرێن سەر ب حكوومەتا هەرێما كوردستانێ، بازێركێ ئەتریش وەك مەلبەندێ قەزا شێخان یا سەر ب پارێزگەها دهۆكێ هاتەدەستنیشانكرن كو هەردو ناحیێن مرێبا و ئەتریش ژی ب خۆڤە دگرتن سەرەدەری دگەلدا هاتەكرن[155]. پشتی نیسانا ٢٠٠٣ێ و رزگاركرنا بازێرێ شێخان و دەڤەرێن دی یێن سەر ب قەزا شێخانڤە كارگێریا قەزایێ ژ ئەتریش هاتەڤەگوهاستن بۆ مەلبەندێ قەزایێ ئانكو بازێرێ شێخان و سەرۆكاتییا جڤاتا وەزیرێن هەرێما كوردستانێ ب بریارا هژمار ٢٣٥١ ل ٢٥ چریا ئێكێ ٢٠٠٥ێ بریارا سەرژنوو ڤەكرنا ناحیا ئەتریش دا[156].

- **ناحیا مرێبا (قەسرۆكێ)**، وەك ئاماژە پێ هاتییەكرن ئەڤ ناحیەیە ل سالا ١٩٨٧ێ هاتبوو هەلوەشاندن، ل ٦ ئادارا ١٩٩٦ێ ئەڤ ناحیەیە سەرژنوو ژ ئالیێ حكوومەتا هەرێما كوردستانێ هاتەڤەدامەزراندن[157]، بەلێ ژ بەركو مەلبەندێ ناحیێ گوندی مرێبا هاتبووڤالاكرن و پرانییا خەلكێ وی ل كۆمەلگەهێ قەسرۆكێ هاتبوونە نێشتەجێكرن و ڤی كۆمەلگەهی پتر پەسنێن مەزنبوونێ و شارستانیێ لێ هەبوون، ناحیە ل ڤی كۆمەلگەهی و ب ناڤێ ناحیا قەسرۆكێ هاتەدامەزراندن.

- **ناحیا باعەدرێ**، بازێركێ باعەدرێ گرنگییەك تایبەت د دیرۆكا دەڤەریدا هەبوو و ئەو گرنگییە هێژ یا بەردەوامە، مەلبەندەكێ سەركییێ ئێزیدخانێ یە، لەوما ژی پێدڤی بوو ژ ئالیێ كارگێریڤە ژ مێژڤە و پتر گرنگی پێ هاتبادان، لێ ژ بەر هەر ئەگەرەكێ ئەڤ گرنگی پێدانە گیروو بوویە، ل ٢٢ نیسانا ١٩٧٠ ب بریارەكا كۆماری بریارا دامەزراندنا ناحیا باعەدرێ یا سەر ب قەزا شێخانڤە هاتییەدان[158]، بەلێ دیارە ژ بەر هەرئەگەرەكێ هەبیت ئەڤ بریارە نەهاتییەبجهئینان و باعەدرێ مایە وەك بازێركەك بێی كو گرنگییا خۆ ژ دەست بدەت، هەتا سەرهلدانا ١٩٩١ێ سەرداهاتی ل رۆژا ١٦ چریا ئێكێ ١٩٩٦ێ حكوومەتا هەرێما كوردستانێ بریارا ب ناحیەكرنا باعەدرێ دا و یەكەمین رێڤەبەرێ ناحیێ بۆ هاتەدانان، بەلێ ژ بەركاودانێن سیاسی دەست بكاربوونا رێڤەبەرێ ناحیێ گیروو بوو هەتا ل ١٦ چریا دووێ ١٩٩٨ێ ب فەرمی دەست بكاربووی[159].

- **ناحیا زیلكان (فاروق)**، هەروەك هاتییەدیاركرن پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ و دامەزراندنا حكوومەتا هەرێما كوردستانێ پشكەك ژ دەڤەرێن سەر ب قەزا شێخان یا وی سەردەمی سەر ب پارێزگاها نەینەوا ڤە مانە ل ژێر دەستەلاتێ حكوومەتا بەغدا و پارێزگەها نەینەوا، ب فەرمانەكا سەرۆكێ دیوانا سەرۆكاتییا عیراقێ ل ١٥ كانوونا ئێكێ ١٩٩٧ێ ب دووراتییا ١٥كم ژ مەلبەندێ قەزا شێخان ناحیەك نوو ب ناڤێ ناحیا (الفاروق) ل گوندێ زیلكان هاتەدامەزراندن[160]. د بنیاتدا دەستەلاتدارییا عیراقێ ب مەرەما بعەرەبكرنێ و زێدەكرنا هژمارا عەرەبان ل قەزا شێخان ئەڤ ناحیەیە دامەزراند و هەر بۆ وێ مەرەمێ ژی كۆمەلگەهێ مەهەتێ یێ كوردێن ئێزدی لێ دژین دانە دگەل سنوورێ ڤێ ناحیێ[161]. پشتی نەمانا حكوومەتا بەعسی ل نیسانا ٢٠١٣ێ ئەڤ ناحیەیە ژی وەك دەڤەرێن دیترێن سەر ب قەزا شێخانڤە كەتە ژێر دەستەلاتێ حكوومەتا هەرێما كوردستانێ و ما وەك دەڤەرا ناكۆكی ل سەر دناڤبەرا حكوومەتا هەرێمێ و حكوومەتا بەغدا، بەلێ حكوومەتا هەرێمێ وەك ناحیەكا سەر ب قەزا شێخان یا سەر ب هەرێما كوردستانێ ڤە سەرەدەریێ دگەلدا دكەت.

**ناحیا كەلەكچی**، دوا ناحیەیە ل پارێزگەها دهۆكێ هاتییەدامەزراندن، سەر ب قەزا شێخانڤەیە، ل ١٩ ئادارا ٢٠١٤ێ ب فەرمانا كارگێری ژمارە (٥٧٤٤) بریارا ب ناحیەبوونا وێ هاتییەدان و ل ٢٧ گولانا ٢٠١٤ بریار هاتییە بجهئینان كارگێریا ناحیێ دەست ب كاركرییە، مەلبەندێ ناحیێ ل كۆمەلگەهێ كەلەكچی یە[167].

# پارێزگارێن دهۆكێ

ژ دامەزراندنا پارێزگەهێ ل ٢٧ گولانا ١٩٦٩ێ هەتا بەرهەڤكرنا ڤێ نڤیسینێ ڤان هێژایان وەك پارێزگار ل دهۆكێ كاركریە:



عەگید سەدیق سەعدوللا ئامێدی
١٩٦٩ -١٩٧٠

محەمەد رەسول گۆیی
١٩٧٠ تنێ حەفت هەیڤان



هاشم حەسەن ئاكرەیی
١٩٧٠- ١٩٧٣

سعاد حەبیب تالەبانی
١٩٧٤ تنێ حەفت



محەمەد عەلی ئەمین گۆران
١٩٧٤- ١٩٧٦



یەحیا محەمەد رەشید جاف
١٩٧٦- ١٩٧٩



نامق رەقیب سوورچی
١٩٧٩- ١٩٨٨



محەمەد پیرۆز رۆستەم
١٩٨٨- ١٩٩١



عەبدولوەهاب ئەترووشی
١٩٩١ تنێ دو هەیڤان



عەبدولعەزیز تەیب
١٩٩٢- ١٩٩٩



نێچیرڤان ئەحمەد
١٩٩٩ - ٢٠٠٥



تەمەر رەمەزان
٢٠٠٥- ٢٠١٤/٦/١٢



فەرهاد ئەترووشی
٢٠١٤/٦/١٢ - هەتا نوکە

## هندەك پێزانینێن پێدڤی

* هەژبە بێژین هەر چەندە ل ١٩٦٩/٥/٢٧ێ بریارا ب پارێزگەهکرنا دهۆکێ دەرکەتیە, بەلێ ل ١/١١/ ١٩٦٩ێ بریار هاتیبە ب جهئینان و یەکەم پارێزگاری دهۆکێ دەست بکارکریە. ل بەراهیێ پارێزگاری ل ئاڤاهیێ کەڤنێ قایمەقامیێ و پولیسێن دهۆکی دەوامکریە, پشتی دەمەکی چوویە ئاڤاهیێ نوو یێ فەرمانگەها تووتنێ (جهێ نها یێ لقێ یەکێ پارتی) هەتا ئاڤاهیێ قایمەقامیێ هاتیبە نووژەنکرن, زڤریەڤە هەمان ئاڤاهی, پاشتر ئاڤاهیێ هنداڤ جادا سەرەکیا دهۆکێ (ئاڤاهیێ بەری دەمەکێ کێم یێ رێڤەبەریا پۆلیسان) بۆ کارگێریا پارێزگەهێ هاتیبە ئاڤاکرن, ل سالێن هەشتێیان ژ سەدسالیا بیستێ ئاڤاهیێ ئەڤرۆیێ یێ پارێزگەهێ هاتیبە ئاڤاکرن و هەتا ئەڤرۆ ل وێرێ کاردکەت.

* پشتی هاشم ئاکرەیی د ئەنجامێ دەرکەتنا وی ژ رێزێن بزاڤا رزگاریخوازا گەلێ کورد ئەرکێ پارێزگاریا دهۆکێ هێلای, ئەحمەد شالی کو قایمەقامێ ئامیدیێ بوو ب وەکالەت ژ چریا ئێکێ ١٩٧٣- شواتا ١٩٧٤ێ ئەرکێ پارێزگاریێ دهۆکێ وەرگرت.

* پشتی تێکچوونا دانوستاندنێن د ناڤبەرا سەرکردایەتیا شۆرشا ئیلونێ و حکومەتا بەغدا دا ژ ئادارا ١٩٧٤ێ - ئادارا ١٩٧٥ێ ئەحمەد شالی وەك پارێزگار ل دەڤەرێن رزگارکری یێن پارێزگەهێ کار دکر.

* رەقیب حسێن مەلا کو هاریکارێ پارێزگارێ دهۆکێ بوو, تنێ بۆ دو هەفتیان ل سالا ١٩٧٤ێ ئەرکێ پارێزگارێ دهۆکێ وەرگرت پشتی تێکچوونا دانوستاندنێن د ناڤبەرا سەرکردایەتیا شۆرشا کوردستانێ و حکومەتا بەغدا دا.

* پشتی سەرهلدانا ئادارا ١٩٩١ێ هاریکاری پارێزگاری حسێن عومەر حاجی ئەرکێ پارێزگاری وەرگرت هەتا ١٩٩١/١٠/٢٣ێ دەمێ حکومەتا بەغدا دەزگەهێن کارگێری ژ هەرێما کوردستانێ ڤەکێشاین.

* خورشید فەیسەل کو جێگرێ پارێزگاری بوو هەتا هەلبژارتنێن هەرێما کوردستانێ ل ١٩ گولانا ١٩٩٢ێ ب ئەرکێ پارێزگارێ دهۆکێ رابوو.

* ل ١٠ ای ئیلونا ١٩٩٢ێ عەبدولعەزیز تەیب وەك یەکەم پارێزگارێ ژ ئالیێ حکومەتا هەرێما کوردستانێ ڤە هاتیبە دانان دەست بکار بوو.

* تەمەر رەمەزان فەتاح ئێکەمین پارێزگارێ هەلبژارتییە کو ژ ئەنجامێ هەلبژارتنێن جڤاتێن پارێزگەهان ل ٢٠٠٥ێ بوویە پارێزگار.

* ژ ئەنجامێ هەلبژارتنێن جڤاتێن ل هەرێما کوردستانێ ل سالا ٢٠١٤ێ فەرهاد ئەترووشی وەك پارێزگارێ دهۆکێ هاتییە هەلبژارتن و ل رۆژا //٢٠١٤ پۆستێ پارێزگارێ دهۆکێ وەرگرتیە.

# ژێدەر:

*. ژ بەرکو بۆچوونێن جودا دەربارەی دەسپێکا دامەزراندنا میرگەها بەهدینان هەنە و د ڤێ ئینسکلۆپیدیایێدا ئەو بابەت ب بەرفرەهی هاتییە بەرچاڤکرن، مە خۆ ب چاوانی و سال یان سەردەمێ دامەزراندنا میرگەهێ ڤە مژوول نەکر و ئەڤ مێژووە کو یەك ژ وان بۆچوونانە بۆ چوونە ناڤ بابەتی مە دانایە.

١. صديق الدملوجي، اماره بهدينان الكردية او اماره العمادية، الطبعة الثانيه(اربيل- ١٩٩٩)، ص٦

٢. انور المايي، الاكراد في بهدينان، الطبعة الثانية، (دهوك- ١٩٩٩)، ص٣٨.

٣. كاوه فريق احمد شاوەلی ئامێدی، اماره بەهدینان ١٧٠٠- ١٩٤٢، (اربيل- ٢٠٠٠)، ص ٢٤.

٤. ا د. خليل علي مراد ا د. عبدالفتاح علي البوتاني، بەهدينان في سالنامات الموصل العثمانية، (اربيل- ٢٠١٢)، ص ٦- ٧.

٥. هەمان ژێدەر، بپ ٧

٦. كاوه فريق احمد شاوەلی ئامێدی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٠- ١٦١ ؛ ا د. خليل علي مراد ا د. عبدالفتاح علي البوتاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩. انور المايي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٤؛ د. طارق الباشا العمادي، معركه ئيتويت، الخاتمه من اجل استقلال اماره اميدي (بەهدينان)، مجله دهوك، (العدد ٢٩- كانون الاول ٢٠٠٥)، ص ١١١- ١١٤.

٧. انور المايي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٦

٨. علي شاكر علي، التشكيلات الاداريه العثمانية ١٥١٦- ١٩١٨، موسوعه الموصل الحضارية، المجلد الرابع، الموصل- ١٩٩٢، ص ١٦٨.

*. هەر د ڤێ ئینسکلوپیدیایێدا ڤەکولینەك بەرفرەهـ ب ناڤێ کارگێرییا ئوسمانی ل بەهدینان ژ نڤیسینا پ. د خەلیل عەلی مراد هاتییەبەلاڤکرن.

٩. ا د. خليل علي مراد ا د. عبدالفتاح علي البوتاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦.

١٠. عبدالله غفور، التشكيلات الاداريه في جنوب كردستان، الطبعة الثانية، (اربيل- ٢٠١٤)، ص ١٨٨.

١١. المحامي عباس العزاوي، العماديه في مختلف العصور، حققه حمدي عبدالمجيد السلفي عبدالكريم فندي، (هولير- ١٩٩٨)، ص ١٦.

* ڤی ژێدەری سالا ژناڤچوونا میرگەها بەهدینان ب سالا ١٢٥٢مش (١٨٣٦ز) دەسنیشانکرییە، بەلێ د راستیدا سالا شکەستن و ژناڤچوونا میرگەها بەهدینان ١٢٥٨مش/ ١٨٤٢ز یە و سال ب سالێن مشەختی دیارکرینە و سالێن زایینی ژ ئالیێ مەڤە هاتینەزێدەکرن

١٢. كاميران عبدالصمد احمد الدۆسكي، بهدينان في اواخر العهد العثماني (١٨٧٦- ١٩١٤)، (اربيل- ٢٠٠٧)، ص ١٩٦.

١٣. علي توفيق، ممالك عثمانية جغرافياسي، (استانبول- ١٣١٨)، ص ٣٤٩.

١٤. ا د. خليل علي مراد ا د. عبدالفتاح علي البوتاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٤- ٣٥.

١٥. المحامي عباس العزاوي، هەمان ژێدەر، بپ ١٨

١٦. علي شاكر علي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٨

١٧. كاميران عبدالصمد احمد الدۆسكي، هەمان ژێدەر، بپ ١٩٦- ١٩٧.

١٨. ا د. خليل علي مراد ا د. عبدالفتاح علي البوتاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٥.

١٩. انور المايي، ژێدەرێ بەرێ، بپ١٥٩ ؛ د. عبدالفتاح علي البوتاني زەڤەر مڤفر سلێمان، ئامێدی قلعه كورد الاصيله عبر مختلف العصور التاريخيه، مجله دهوك، (العدد ٤- ێب ١٩٨٨)، ص ٧٨- ٧٩ ؛ رجب جميل حبيب، ئامێدی (العماديه) ١٩٢١- ١٩٥٨ دراسه في تاريخ السياسي، (دهوك- ٢٠١٢)، ص ٤٢.

*. هەژییە بێژین د پرانیيا ژێدەرێن ئاماژە پێ کریدا ئاماژە ب سالا ١٨٦٢ز وەك سالا ب قەزا بوونا ئامێدیێ هاتییەکرن، هەموویان ژێ ژ ئەنوەر مایی ڤەگوهاستییە کو گۆتییە سالا ١٢٧٣مش/١٨٦٢ز ئامێدیێ کرینە قائیمەقامیە ئانکو قەزا و خەندان پاشا وەك یەکەم قائیمەقام هاتییەدامەزراندن، بەلێ دراستیدا سالا ١٢٧٣مش بەرامبەری ١٨٥٦- ١٨٥٧ زایینی یە و ل ئەیلوولا ١٨٥٦ێ دەسپێدکەت، ب ڤی رەنگی دامەزراندنا قەزا ئامێدیێ شەش سالێن دی دهێتەپێش. بنێرە: فریمان – جرنیفل، التقويمان

الهجری و المیلادی، ترجمه عن الانكليزيه الدكتور حسام محی الدين الآلوسی، (بغداد- ١٣٨٩ه- ١٩٧٩م)، ص ٦٨.
٢٠. Tahir SEZEN,OSMANLI YER ADLARI, Ankara- 2006، p 138، 406، 56، 421،384، 381 و 437
٢١. كاميران عبدالصمد احمد الدۆسكی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٩٦.
٢٢. Tahir SEZEN,OSMANLI YER ADLARI p 545
٢٣. جمال احمد خالد و عبدالفتاح علی البوتانی، نبذه عن تاريخ مدينة زاخۆ، مجلة دهوك، العدد ٢- كانون الثاني ١٩٩٨، ص ١٠٨.وصفية محمد شيخو السندي، زاخو في العهد الملكي ١٩٢١- ١٩٥٨ دراسة تاريخية في اوضاعها العامة، (دهوك- ٢٠١٤)، ص ٤١.
٢٤. ا د. خليل علی مراد ا د. عبدالفتاح علی البوتانی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٧ ؛ وصفيه محمد شيخو السندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤١- ٤٢.
٢٥. ا د. خليل علی مراد ا د. عبدالفتاح علی البوتانی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٧.
٢٦. هەمان ژێدەر، بپ ١٦.
٢٧. رئيس التحرير(د. عبدالفتاح علی البوتانی)، دهوك القرية، المدينة، المحافظة، مجلة دهوك، العدد ١،ايلول ١٩٩٧، ص ٥٥
٢٨. محافظة دهوك، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٨ ؛ رئيس التحرير(د. عبدالفتاح علی البوتاني)، هەمان ژێدەر، بپ ٥٥ ؛ موسەدەق تۆڤی، هەمان ژێدەر، بپ ١٢؛ الدكتور هاشم خضير الجنابي، مدينة دهوك دراسة في جغرافية المدن، (الموصل- ١٩٨٥)، ص ٧
٢٩. Tahir SEZEN,OSMANLI YER ADLARI
٣٠. ا د. خليل علی مراد ا د. عبدالفتاح علی البوتانی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦.
٣١. هەمان ژێدەر، بپ ١٦.
٣٢. موسەدەق تۆڤی ئسماعيل بادی، رێبەرێ پارێزگەها دهۆكێ، (دهۆك- ٢٠١٠)، بپ ١٤٣. زانيارێن مە ژ رێڤەبەريا ناحيێ وەرگرتين.
٣٣. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٨
٣٤. موسەدەق تۆڤی ئسماعيل بادی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٧٧ ؛ سەرۆكاتيا بازێرڤانيا ئاكرێ، ئاكرێ دیرۆك و پاشەرۆژ، (- تيرمەها ٢٠١٢)، بپ نينە.
٣٥. بەلگەنامە ژ ئەرشيفێ مالا مفتيێن ئاكرێ يە ژ ئالێ ئەندازيار بلند مفتی گەهشتيە مە.
٣٦. دەستخەتێ هەردو هەلبەستان ژ بلند مفتی گەهشتيە مە.
٣٧. Tahir SEZEN,OSMANLI YER ADLARI
٣٨. الدكتور ذنون الطائی، الاوضاع الادارية في الموصل خلال العهد الملكي ١٩٢١- ١٩٥٨، (الموصل- ٢٠٠٨)، ص ٢٨- ٢٩.
٣٩. ا د. خليل علی مراد ا د. عبدالفتاح علی البوتاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٨.
٤٠. كاميران عبدالصمد احمد الدۆسكی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٩٨.
٤١. عبدالله غفور، التشكيلات الاداريه....، ص ١٨٨.
٤٢. علی شاكر علی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٨.
٤٣. ا د. خليل علی مراد ا د. عبدالفتاح علی البوتانی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٨.
٤٤. ا د خليل علی مراد، مختارات من كتاب الموصل و كركوك في الوثائق العثمانية، (السليمانية- ٢٠٠٥)، ص ٢٥- ٢٧.
٤٥. هەمان ژێدەر، بپ ٢٥.
٤٦. ا د. خليل علی مراد ا د. عبدالفتاح علی البوتانی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٩- ٧٢.
٤٧. هەمان ژێدەر، بپ ٦٨ و ٧١- ٧١.
٤٨. كاميران عبدالصمد احمد الدۆسكی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠٠.
٤٩. ا د. خليل علی مراد ا د. عبدالفتاح علی البوتانی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦.
٥٠. Tahir SEZEN,OSMANLI YER ADLARI بپ ٤٧٠

٥١. سەعید مەموزینی، بەردەرەش لە نێوان دوێنێ و ئەمرۆ دا، کۆڤارا دهۆک، (هژمار ٦- گولان ١٩٩٩)، بپ ٣٩.
٥٢. علی شاکر علی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٨.
٥٣. عبدالله غفور، التشکیلات الاداریة....، ص ١٨٨.
٥٤. عبدالله غفور، التشکیلات الاداریه....، ص ١٨٨. ژ (الوقائع العراقیه، العدد الاول، ٨ کانون الاول ١٩٢٢، ص ٧- ٨) هاتییەوەرگرتن.
٥٦. رزوق عیسی، مختصر جغرافیه العراق للمدارس، (بغداد- ١٩٢٢)، ص ٢٤٨.
٥٧. المحامی عباس العزاوی، هەمان ژێدەر، بپ ١٨
٥٨. ا د. خلیل علی مراد ا د. عبدالفتاح علی البوتانی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٤- ٣٥.
٥٩. Tahir SEZEN,OSMANLI YER ADLARI, p١٣٨
٦٠. ا د. خلیل علی مراد ا د. عبدالفتاح علی البوتانی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٤- ٣٥.
٦١. ابراهیم خلیل احمد، دراسة في تطوراتها السیاسیة، رسالة ماجستیر، جامعة الموصل، کانون الثاني ١٩٧٥،ص ٦٣٧.
٦٢. عبدالله غفور، التشکیلات الاداریة....، ص ١٨٨.
٦٣. تەحسین ناڤشکی، گرنگییا مانگێش د دیرۆکا دوهی و ئەڤرۆ دا، کۆڤارا دهۆک، (هژمار ١٠- ئیلونا ٢٠٠٠)، بپ ٥٠ ؛ - موسەدەق توڤی ئسماعیل بادی، ژێدەرێ بەرێ.
٦٤. الدکتور ذنون الطائي، الاوضاع الاداریة في الموصل خلال العهد الملکی ١٩٢١- ١٩٥٨، (الموصل- ٢٠٠٨)، ص ١٣١.
٦٥. وصفیه محمد شیخو السندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٥، ژ (الوقائع العراقیه، العدد ٤٢٠، ٣٠ئازار ١٩٢٦) هاتییەوەرگرتن.
٦٦. الدکتور ذنون الطائی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٢- ١٣٣ ؛ عبدالله غفور، التشکیلات الاداریه....، ص ١٠
٦٧. السید عبدالرزاق الحسنی، العراق قدیما و حدیثا، الطبعة الثالثة، (بغداد- ١٩٨٠)، بپ ٩٤ و ٤٥٩.
٦٨. علی سیدو الگورانی، من عمان الی العمادیه، الطبعه الثانیه، (اربیل- ٢٠١٢)، ص ١٦٨.
٦٩. محەمەد عەبدوللا ئامێدی، سەرسنکێ د ناڤبەرا دوهی و ئەڤرۆ دا، کۆڤارا دهۆک، (هژمار ٧- ئیلونا ١٩٩٩)، بپ ٥٠- ٥١ ؛ عبدالله غفور، التشکیلات الاداریه....، ص ١٤٥- ١٤٦.
٧٠. عبدالله غفور، التشکیلات الاداریه....، ص ١٨٨ ؛ وصفیه محمد شیخو، هەمان ژێدەر، بپ٩٢.
٧١. رزوق عیسی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٥١- ٢٥٢.
٧٢. ا د. خلیل علی مراد ا د. عبدالفتاح علی البوتانی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٧ ؛ وصفیه محمد شیخو السندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٢ ؛ عبدالله غفور، التشکیلات الاداریه....، بپ ١٨٨.
٧٣. وصفیه محمد شیخو السندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٣، پەراوێزێ ٤، ژ رۆژناما (الوقائع العراقیه، العدد ٣٥٠، ٤ تشرین الاول ١٩٢٥) هاتییەوەرگرتن
٧٤. د. سیار کوکب علی الجمیل، النظام الاداری، موسوعة الموصل الحضاریة، المجلد الخامس، ص ١٢٥.
٧٥. ا د. خلیل علی مراد ا د. عبدالفتاح علی البوتانی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٧ ؛ وصفیه محمد شیخو السندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٢ ؛ عبدالله غفور، التشکیلات الاداریه....، بپ ١٨٨.
٧٦. رزوق عیسی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٥١- ٢٥٢.
٧٧. ئەدریس حەسەن ئاسهی، ناحیا ئاسیهێ و باتێلێ....، کۆڤارا دهۆک، (هژمار ٢٨- چریا ئێکێ ٢٠٠٥)، بپ ٣٥ ؛ وصفیه محمد شیخو السندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٢.
٧٨. وصفیه محمد شیخو السندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٣- ١٠٤.
٧٩. ا د. خلیل علی مراد ا د. عبدالفتاح علي البوتاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ؛ عبدالله غفور، التشکیلات الاداریة....، بپ ١٨٨ ؛ د. سیار کوکب علی الجمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٥.
٨٠. د. عبدالله غفور، التشکیلات الاداریة....، بپ ٣٢.
٨١. السید عبدالرزاق الحسنی، ژێدەرێ بەرێ بپ ٩٤.
٨٢. د. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٩.

٨٣. هەمان ژێدەر، بپ ١٨٨ ؛ ا د. خليل على مراد ا د. عبدالفتاح على البوتاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٨.
٨٤. د. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠.
٨٥. رزوق عيسى، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٤٠.
٨٦. خسرو گوران، الكورد فى محافظة الموصل، ترجمة و تعليق حازم هاجانى، (اربيل- ٢٠٠٦)، ص ٦١.
٨٧. ا د. خليل على مراد ا د. عبدالفتاح علي البوتاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦ ؛ علي شاكر علي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٨.
٨٨. ا د عبدالفتاح على البوتاني، ثلاث سنوات دراسية في بردەرەش، (دهوك- ٢٠١٥)، ص ٢٠.
٨٩. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٨.
٩٠. هەمان ژێدەر، بپ ١٠.
٩١. ا د عبدالفتاح على البوتاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠ طه الهاشمي، مفصل جغرافيه العراق، (بغداد- ١٩٣٠)، ص ٥٥٤.
٩٢. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٩- ٢٠
٩٣. السيد عبدالرزاق الحسنى، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٤.
٩٤. هەمان ژێدەر، بپ ١٠.
٩٥. هەمان ژێدەر، بپ ١٩- ٢٠.
٩٦. هەمان ژێدەر، بپ ١٢- ١٣.
٩٧. هەمان ژێدەر، بپ ٢١٣.
٩٨. ا د. خليل على مراد ا د. عبدالفتاح على البوتانى، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦ ؛ د. سيار كوكب على الجميل،ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٥
٩٩. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠.
١٠٠. خسرو گوران، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٩. ژ (الدليل العراقى لعام ١٩٣٥) هاتييەوەرگرتن.
١٠١. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٨ ؛ رزوق عيسى، ژێدەرێ بەرێ، بپ .
١٠٢. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥.
١٠٣. هەمان ژێدەر، بپ ٢٧- ٢٨.
١٠٤. على سيدو الگورانى، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٣.
١٠٥. السيد عبدالرزاق الحسنى، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٤ و ٢٥٦.
١٠٦. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٢.
١٠٧. ژ بيرهاتنێن نڤيسكارى.
١٠٨. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٥.
١٠٩. هەمان ژێدەر، بپ ١٢٩
١١٠. هەمان ژێدەر، بپ ٩١- ٩٢.
١١١. هەمان ژێدەر، بپ ١٢٩- ١٣٠.
١١٢. بۆ پتر پێزانینان ل سەر سەروبەرێ دەڤەرێ بنێرە: شيرزاد زكريا محمد، مجلس قيادة الثورة في كوردستان- العراق،١٩٦٤-١٩٧٠،دراسة تاريخية سياسية عامة، (دهوك-٢٠١٠)،ص ١٦٢-١٦٤؛ موسەدەق توڤى ئيسماعيل بادى، رێبەرێ پارێزگەها دهۆکێ .... بپ ١٠٣- ١٠٤
١١٣. وەصفيە محمد شێخو، ژێدەرێ بەرێ بپ ١٠٣-١٠٤.
١١٤. هەمان ژێدەرێ چوويى.
١١٥. درباس مستەفا بلند محەمەد، سێمیلێ د ناڤبەرا دوهی و ئەڤرۆ دا، كوڤارا دهۆك، هژمار ٥- كانوونا ئێكێ ١٩٩٨، بپ ٤٧- ٤٨ ؛ موسەدەق توڤى ئيسماعيل بادى، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١١؛ عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١٤- ١١٥
١١٦. و صفيه محمد شيخو السندى، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٣
١١٧. قرار نقل مركز ناحيه السندى ، رقم ( ١٤٧٩٢ ) ، تاريخ ( ١ / ١ / ١٩٧٨ ) ، وزير الداخليه. من wiki.dorar-aliraq.net ( ).

١١٨. شیرزاد زکریا محمد، مجلس قیادة الثورة في كوردستان- العراق ١٩٦٤- ١٩٧٠ دراسه تاريخيه سياسيه عامه، (دهوك- ٢٠١٠)، ص ١٦٣.
١١٩. السيد عبدالرزاق الحسني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦١ ؛ و صفيه محمد شيخو السندي، ژێدەرێ بەرێ، بپ١٠٣- ١٩٤.
١٢٠. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١٤- ١١٥.
١٢١. خدر دوملی، فەیدی(فايده) و الاسطوره الضائعة، مجلة دهوك، العدد ٢٠- حزيران ٢٠٠٣، ص ٧٥.
١٢٢. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٢- ٩٣.
١٢٣. هەمان ژێدەر، بپ ١٢٦
١٢٤. محافظة دهوك، دهوك بعد الحادي عشر من اذار، (دهوك- ١٩٧٣)، ص ٢- ٣.
١٢٥. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٨- ١٦٩
١٢٦. هەمان ژێدەر، بپ ٧٣.
١٢٧. هەمان ژێدەر، بپ ٧٤- ٧٥.
١٢٨. هەمان ژێدەر، بپ ١٢٦.
١٢٩. احمد بدل خالد، اتروش بلده العلم و الجمال، مجله دهوك، العدد١٢- اذار ٢٠٠١، ص ١٠٠.
١٣٠. عبدالكريم فندى و اخرون، دليل محافظة دهوك، (دهوك- ١٩٩٥)، ص ١٥٩.
١٣١. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٦.
١٣٢. د بەرپەرێن ئینسکلوپیدیایێدا دێ چەندین ڤەکۆلینان ل سەر دامەزراندن و ژناڤچوونا میرگەها بەهدینان خوینی.
١٣٣. علی شاکر علی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٨.
١٣٤. د. سيار كوكب علي الجميل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٦.
١٣٥. زبير بلال اسماعيل، پورات بارزان ١٩٠٧- ١٩٣٥، (اربيل- ١٩٩٧)، ص ٣٦ ؛ صديق الدملوجي، اماره بهدينان الكردية او اماره العمادية، (اربيل- ١٩٩٩)، ص ٨٦- ٨٧.
١٣٦. السيد عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، الجزء الثالث، الطبعة السابعه ٢٠٠٨، ص ٣٠٣ ؛ الدكتور ذنون الطائي، هەمان ژێدەر، بپ ١٣١.
١٣٧. محەمەد ئەمین زەکی، دو تەقەلای بێ سوود، (بەغدا- ١٩٣٥)، چاپا دووێ، چاپخانەی هەلویست، (لەندەن- ١٩٨٤)، بپ ٨٤. سەرجەمی بەرهەمەکانی محەمەد ئەمین زەکی، ئامادەکردنی سدیق سالح، یەکەم بەرگ، (سلیمانی- ٢٠٠٥)، بپ ٤٨.
١٣٨. السيد عبدارزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقيه، الجزء الثالث، الطبعة السابعة، ص ٦٥.
١٣٩. مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكردية، ثورة بارزان ١٩٤٣- ١٩٤٧، (كردستان- ١٩٨٦)، ص ٣٦.
١٤٠. موسەدەق تۆڤی، مێژووا پەروەردە و فێرکرنێ ل پارێزگەها دهۆکێ، نەهاتییەچاپکرن. بنێرە: ڤەکۆلینا مە ل سەر خواندنا کوردی ل پارێزگەها دهۆکێ د ڤێ ئینسکلۆپیدیایێدا.
١٤١. نەقابەی ماموستایانی سلێمانی، کۆنگرەی ماموستایانی کورد لە شەقلاوە؛ د. صدیق ئەتروشی، مافێت زانیارێت مللەتێ کورد، کوڤارا رۆناهی، هژمار ٢- چریا دووێ ١٩٦٠- بەغدا، بپ ٦٠- ٦١.
١٤٢. مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكردية، الجزء الثالث، (اربيل- ٢٠٠٢)، ص ٥٣٥ ؛ شێرزاد زکریا محمد، مجلس قيادة ثورة في كوردستان- العراق ١٩٦٤- ١٩٧٠، (دهوك- ٢٠١٠)، ص ١٠٨- ١١٠ .
١٤٣.؛ شێرزاد زکریا محمد، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣١.
١٤٤. محافظة دهۆك، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١- ٣ ؛ عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٢؛ الاستاذ الدكتور جبار قادر المحامي طارق جامباز، قرارات مجلس قيادة الثورة المنحل الخاصه بالكورد و كوردستان، (اربيل- ٢٠١٣)، ص ٣٦.
١٤٥. موسەدەق تۆڤی ئیسماعیل بادی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٤.
١٤٦. هەمان ژێدەر، بپ ٨٨.
١٤٧. مصطفی نوری بامەرنی، ئەڤەیە بامەرنێ، (دهۆك- ٢٠٠٤)، بپ ٢٣.

١٤٨. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ٢٧٥- ٢٧٦
١٤٩. موسەدەق تۆڤی ئیسماعیل بادی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩١.
١٥٠. موسەدەق تۆڤی ئیسماعیل بادی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٦
١٥١. هەمان ژێدەر، بپ ٧٦.
١٥٢. هەمان ژێدەر، بپ ١٢٨.
١٥٣. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٦.
١٥٤. موسەدەق تۆڤی ئیسماعیل بادی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٩- ١٣٤ز
١٥٥. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦٨- ٢٧٠.
١٥٦. موسەدەق تۆڤی ئیسماعیل بادی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٥.
١٥٧. عبدالله غفور، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٥- ٧٦.
١٥٨. هەمان ژێدەر، بپ ١٢٦.
١٥٩. هەمان ژێدەر، بپ ٢٦٢.
١٦٠. عبدالكريم فندى و ێخرون، دليل محافظة ....، ص ١٥٨.
١٦١. د. عبدالله غفور، التشكيلات الادارية....، ص ٢٤٥- ٢٤٦.
١٦٢. موسەدەق تۆڤی ئیسماعیل بادی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٥.
١٦٣. د. عبدالله غفور، التشكيلات الادارية....، ص ٨٣- ٨٤.
١٦٤. موسەدەق تۆڤی ئیسماعیل بادی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٧.
١٦٥. د. عبدالله غفور، التشكيلات الادارية....، ص ١٨٤
١٦٦. موسەدەق تۆڤی ئیسماعیل بادی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٧- ١٤٩.
١٦٧. راپۆرتا کارگێڕییا رێڤەبەرییا ناحیێ.

# قــــەزا زاخـــۆ د دابەشکرنێن کارگێری یێن ئوسمانی دا ١٨٤٢- ١٩١٨

**د.نزار ئەیوب گولی**
**وەرگێڕان : هێرش کەمال ڕێکانی**

**پوختەیا ڤەکۆلینێ:**

بازێرێ زاخۆ دهێتە هژمارتن ژ بازێرێن گرنگێن کوردستانێ ددەمێ بوری دا، ئەڤ چەندە ژی ژ بەر جهێ ئیستراتیژیێ وێ ئەوێ کو دکەڤیتە نێزیکی هێلا سنووری یا کو بوویە ناڤبر دناڤبەرا دەولەتێن عیراق، ترکیا، سوریادا، و جهێ جوگرافیێ ڤی بازێری بوویە مەڵبەندەکێ ئابووریێ مەزن، کو ئەو دەرگەهێ سەرەکییە بۆ سەرەدەریێن بازرگانی د ناڤبەرا کوردستان و جیهانا دەرڤەیی دا، ئەڤە ژی سەرەرای زەنگینی یا وێ ب سامانێن چاندن و کانزایی.

ژ لایەکێ دیتر ڤە زاخۆ بازێرەکێ کەڤنارە و ژ مەڵبەندێن شارستانی یێن گرنگە ل دەڤەرا بەهدینان دا، کو دیرۆکا ڤی بازێری وەکی پێدڤی گرنگی پێنەهاتییەدان کو هەژی ڕابردوویێ وێ یا کەڤنار و ڕەسەن و جهێ وێ یێ نها.

ئەڤ ڤەکۆلینە بزاڤێ دکەتن ب پشت بەستن ل سەر بەلگەنامەیێن ئوسمانی یێن ڕەسەن و بەلاڤوك و دەرکەفتنێن ئوسمانی یێن فەرمی یێن دیارکرنا پێشڤەچوونێن جهێ زاخۆ د دابەشکرنێن کارگێریا ئوسمانی دا هەر ژ دەمێ کەفتنا میرگەها بەهدینان ل سالا ١٨٤٢ێ تا زالبوونا بەریتانیا ل سەر کوردستانا باشوور و بازێرێ زاخۆ ل سالا ١٩١٨ێ ، و تیرۆژك ئێخستن ل سەر جهێ زاخۆ د ویلایەت و سنجەقێن ئوسمانی دا، و دامەزراندنا قائیمقامیا قەزا زاخۆ و ناحیێن ب وێ ڤە گرێدای.

**پێشەکی:**

بازێرێ زاخۆ دهێتە هژمارتن ژ بازێرێن سەرەکیێن باشوورێ کوردستانێ، و جهێن شوینەواری ئەوێن دناڤ بازێری و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە هەین نیشان و بەلگەنە ل سەر هەبوونا دیرۆکا وێ یا کەڤنار، کو هەتا نها دیرۆکا زاخۆ د چوارچووڤێ ڤەکۆلینەکا زانستی یا بەلگەنامەیی دا نەهاتییە نڤێسین، کو ئەگەرێ پشت ڤێ چەندێ ژی ڤەدگەڕیتەڤە بۆ کێمیا بەلگەنامە و ژێدەرێن دیرۆکی ئەڤە ژلایەکێ ڤە و پشت گوهڤەهاڤێتنا کو بازێر تۆشبوویێ ژ هەمی لایان ڤە و نەخاسمە ژ لایێ دیرۆکی یا شارستانی.

و ل ڤان سالێن داویـێ زانکۆ و مەڵبەندێن زانستی ل دەڤـەرێ دەستپێکرینە ب نڤێسینا ڤەکۆلینێن زانستی ل دۆر دیرۆکا قەزا زاخۆ، بەلێ ئەڤ ڤەکۆلینێن هەنێ ل سەر ڤەکۆلینا دیرۆکا وێ یا هەڤچەرخ بووینە و نەخاسمە دەستنیشانکریا

ماوەیێ گرێدانا کوردستانا باشوور ب دەولەتا عیراقێ یا نوی ڤە ، لەوما بۆ ڤێ چەندێ مە ب فەر دیت نڤێسینا ڤێ ڤەکۆلینێ ل دۆر دیرۆکا قەزا زاخۆ ژ لایێ کارگێری ڤە هەر ژ کەفتنا میرگەها بەهدینان ل سالا ١٨٤٢ێ هەتا داویا زالبوونا ئوسمانی ل سەر زاخۆ و کوردستانا باشوور ل سالا ١٩١٨ێ.

ڤەکۆلین هاتییە دابەشکرن ل سەر دەرازینکەکا دیرۆکی و سێ ڤەکۆلینان، و دناڤ ڤەکۆلینا دەرازینکێ ڤەکۆلین گرنگیێ ب دوویڤچوونەکا ب لەز بۆ جهێ زاخۆ د دابەشکرنێن کارگێری یا ئوسمانی دا ل ماوێ ١٥١٤ تا ١٨٤٢، و هندیکە ڤەکۆلینێن دیترن تیرۆژکن ل سەر کارگێری یا زاخۆ ل ماوێ ١٨٤٢ تا ١٨٥٢ێ، کو سالا داویێ ڤەگوهاستنا زاخۆیە بۆ قەزایێ ب پلا قائیمقامیێ، کو ڤەکۆلین رۆناهیێ ئێخیتە ل سەر قائیمقامیا زاخۆ و زنجیرە و رێزبەندی یا وان قائیمقامێن کو کاربەدەستی یا کارگێری یا قەزا زاخۆ وەرگرتین.

و ژ بابەتێن دیتر کو ڤەکۆلینێ بخۆ ڤە گرتی گرنگیدانە ب بابەتێ ناحیێن گرێدای ب قەزا زاخۆ، و ڤەکۆلینێ بزاڤ کریە کو دیرۆکا ڤان ناحیان و دووڤچوونا پێشڤەچوونێن کارگێری یێن کو ڤان ناحیان بخۆڤە دیتی هەر ژ ماوێ دامەزراندنا وان و هەتا سالا ١٩١٨ێ بکەت.

سەبارەت ژێدەرێن ڤەکۆلینێ، ب شێوەیەکێ سەرەکی پشتبەستن ل سەر بەلگەنامەیێن ئوسمانی یێن رەسەن هاتییە کرن یێن کو دناڤ (دفاتر المهمە) یا ئوسمانی و دناڤ ژێدەرێن دیترێن جودا جودا یێن ئەرشیفێ ئوسمانی دا هەین، هەروەسا پشتبەستن ل سەر وەشان و بەلاڤوکێن فەرمی یێن ئوسمانی و ب شێوەیەکێ دەستنیشانکری (سالنامێن ئوسمانی) هاتییە کرن، و ئەڤە تووماریێن گرنگن کو ژ تێروتەسەلی یا لایەنێ کارگێریێ دەولەتا ئوسمانی د ماوێ ئێك سال دا پێکدهێت، هەر وەسا ڤەکۆلینێ پشتبەستن کریە ل سەر هژمارەکا پەرتووك و نامێن زانکۆیێ ب زمانێن تورکی و عەرەبی و یێن کو گرنگیێ ب ڤەکۆلینا لایەنێن دیرۆکا کارگێری دەدەن بۆ دەڤەرێن کو باژێرێ زاخۆ سەر ب وان ڤە، و ل داویێ ئینان و دەستنیشانکرنا گرنگترین دەرئەنجامانە یێن کو ڤەکۆلین گەهشتیێ و ب دەستڤەئینای.

- **دەرازینك،** کورتیەکا دیرۆکا کارگێری یا زاخۆ هەر ژ زالبوونا ئوسمانی هەتا ١٨٤٢ێ:

گەلەك ل سەر دیرۆکا زاخۆ ل دەستپێکا زالبوونا ئوسمانی ناهێتە زانین، و بەدلیسی دبێژیت:(ئەڤ باژێرە مەڵبەندەك بوویە بۆ میرگەهەکا سەربخۆ بناڤێ (سندیان) کو ڤەگەراندنە بۆ عەشیرەتا سندی، و میر حەسەن کورێ میر سەیفەددین بەهدینانی دەست دانایە ل سەر و زالبوون ل سەرکریە و دایە دگەل خۆ)[1].

ل ماوێ سالێن ١٥٠٧- ١٥٠٨ ێ ئەڤ دەڤەرە کەفتبوو ل ژێر زالبوونا صەفەوی دا و سەرۆبەرێ وێ ژی وەکی سەرۆبەرێن پشکێن دیترێن کوردستانێ بوو، و ل سالا ١٥١٥ێ ئەڤ دەڤەرە کەفتە ل ژێر دەستهەلاتا ئوسمانی دا پشتی (ئێککرتنا) هەر دو میران حەسەن بەهدینانی و کورێ وی سۆلتان حسێن(حسێن وەلی) دگەل میر بەدر بەگ بوختی یێ کو دژمنکارییەکا کەڤن دگەل عەجەمان هەبوو)[2].

هەر چەندە پێزانینێن راستە راست نینن ل دۆر دویڤەلانکی یا میرگەها سندی بۆ ئێك ژ هەر دوو میرگەهان پشتی دوبارە زالبوونا ل سەر زاخۆ، بەلێ یا راستترە کو ئەو وەك میرگەهەکا سەربخۆ بوویە ژ هەر دوکا هەتا نیڤا دویێ ژ سەدێ شازدێ، ژ بەر کو بەدلیسی ل دەمێ نڤێسینا پەرتووکا خۆ دا ئەوا سالا ١٠٠٥مش/١٥٩٧ز گوتیە: (هێشتا کەسەکێ ژ نەڤیێن ڤێ خێزانێ -ئانکۆ سندی- بناڤێ یوسف بەگ دژیانێ دا مایە و سەرڤەکێریا خزمەتگوزاریێن حکومی دکەتن ل دەڤ حاکمێن جزیرێ)[3]، و د راستی دا ل ڤێرێ بەلگەیێن ل سەر ئەڤا هاتییە گوتن یێن هەین هەر وەکی د بەلگەنامەیەکا ل ٨ زیلقیعدە ٩٦٧مش/٣٠ تیرمەها ١٥٦٠ز حوکمەك هاتییە بۆ ویلایەتا دیاربەکر و هندەك میرگەهێن کوردی یێن

سەر ب وێ ڤە و ژ وان ژی میرێ میرگەها سندی[٤]، بەلێ دهێتە تێبینیکرن کو ناڤێ میرێ ئامێدیێ تێدا نەهاتییە و ئەڤە چەندە ژی نیشانە ل سەر نە دویڤەلانکی یا سندی بۆ میرگەها بەهدینان.

و ژ بەلگەیێن دیتر ل سەر ڤێ چەندێ ئەوە کو باژێرێ زاخۆ یا ملکەچ بوو بۆ کریارێن توومارکرنا داهاتی و سەپاندنا باجێ یا کو دەولەتێ دناڤ وان دەڤەرێن ل ژێر حوکمێ وێ یێ ڕاستەوخۆ و نە ڕاستەوخۆ ئەنجام ددا، لێ میرگەها بەهدینان ل ئاستێ (حکۆمەت)بوو[٥]، و ل دووڤ یاسا ئوسمانی ناکەڤیتە دبن ملکەچیا ڤان پێرابوونان، ل سالا ١٥٤٠ و ١٥٧٥ زاخۆ ملکەچ ببوو بۆ ئامارێ و باجا وێ یا سالا ئێکێ ٦٠ هزار ئاقچە بوون و ڤێ ژمارێ ل سالا داویێ بۆ ١٠٠هزار ئاقچەیان زێدەکر[٦].

و پشتی زالبوونا میرێن بەهدینان ل سەر زاخۆ باژێر ژ لایێ ئێك ژ کەسێن خێزانا دەستەلاتدار ل ئامیدیێ ڤە دهاتە ب ڕێڤەبرن و ئەڤ سەروبەرە هەتا کەفتا میرگەهێ ل سالا ١٨٤٢ێ بەردەوام بوو، ل سالا ١٥٧٤ێ میرێ سنجەقا زاخۆ (قوباد بەگ کوڕێ سولتان حسێن بەگ)بوو[٧]، و ل سالا ١٥٧٥ێ (بەهرام بەگ کوڕێ سولتان حسێن بەگ) حوکمێ زاخۆ ڕێڤەدبر[٨]، و ل سالا ١٥٨٤ێ میر(سەیدخان کوڕێ قوباد بەگ)حوکم ل سنجەقا زاخۆ دکر[٩]، و ل سالا ١٥٨٤ێ بەهرام بەگ کوڕێ سولتان حسێن بەگ بۆ جارەکا دیتر حوکم ل زاخۆ کربوو[١٠]، و ل سالا ١٠٢٥مشەختی ناڤێ میرێ زاخۆ (مستەفا بەگ) هاتبوو کو گلەیی ل دەڤ باب ئەلعالی کربوو ژ بەر دەستێوەردانێن میرێ جزیرا بوتان (شەرەف بەگ)دناڤ کاروبارێن سنجەقا وی دا[١١]. لێ ل سالا ١٠٤٩مش/ ١٦٣٩ز روودانەکا سەیر رودا ئەوژی دەمێ دەولەتا عوسمانی حوکمێ زاخۆ بو میرێ عەشیرەتا زێباری (یووسف بەگی) ئاراستە کری[١٢].

ل ڤێرێ تشتەکێ دیتر هەیە فەرە ئاماژە پێبدەین ئەو ژی بەربەلاڤبوونا بکارئینانا ناڤێ (سنجەقا سندی سلێمانی (- سلێڤانی) ل سەر باژێرێ زاخۆ د ماوێ سەدێ شازدێ دا[١٣].

ژ لایێ دویڤەلانکی یا زاخۆ بۆ ویلایەتێن ئوسمانی، پشتی ل سالا ١٥١٥ێ کەفتی بە ژێر دەستەلاتا ئوسمانییان زاخۆ ببوو سنجەقەکا سەر ب ویلایەتا دیاربەکر ڤە هەتا سالا ١٥٣٣ێ، و ل سالا داویێ دا ویلایەتا مووسل هاتە دامەزراندن و سنجەقا (سندی سلێمانی) (نە زاخۆ!) ببوو ئێك ژ سنجەقێن سەر ب ویلایەتا ناڤهاتی ڤە[١٤]، و ل سالا ١٥٣٤ێ مووسل ڤەگەڕیاڤە کو ببیتە سنجەقەکا سەر ب ویلایەتا دیاربەکر ڤە و هۆسا جارەکا دیتر زاخۆ دبیتە سنجەقەکا سەر ب ویلایەتا دیاربەکر[١٥]، و ل سالا ١٥٥١ زاخۆ ببوو سەنجەقەك سەر ب ویلایەتا (لورستان شهرزور) ڤە[١٦]، و ل سالا ٩٩٦مش/ ١٥٨٨ز فەرمان دەرکەفتبوو ب دامەزراندنا سەر ژ نوی یا ویلایەتا مووسل و گرێدانا سنجەقا زاخۆ و هژمارەکا سنجەقێن دیتر ب ویلایەتێ ڤە[١٧]، و دویڤەلانکی یا زاخۆ بۆ ویلایەتا مووسل هەتا سەدێ هەڤدێ بەردەوام بوو، بەلگە ژی بۆ ڤێ چەندێ د ئێك ژ توومارێن کو گرێدای پێزانینێن سالێن ١٦٣١-١٦٤١ز یە تێدا ناڤێ زاخۆ دگەل سنجەقێن ویلایەتا مووسل دا هاتییە[١٨].

ل سالا ١٦٥٦ێ گەرۆکڤانێ تورکی(ئەولیا چەلەبی) سەرەدانا میرگەها بەهدینان کربوو و دیارکربوو کو بەهدینان ئێك ژ سنجەقێن سەر ب ویلایەتا بەغداد ڤەیە، و گوتیە کو زاخۆ ئێك ژ وان شەش سنجەقێن سەر ب میرگەها بەهدینان ڤەیە ئەو ژی (ئاکرێ، دهۆك، زاخۆ، مزووری، کەلا شخۆ، زێبار)[١٩]، و میر قوباد بەگ کوڕێ میر موسەیبدخان حوکمی ل زاخۆ دکەت، و زێدەتر دبێژیت کو زاخۆ ل ئاست (یورتلق یان ئورجاقلق)[٢٠] بوو و دامودەزگەهێن خۆ یێن کارگێری یێن تایبەت هەبوون و ل دەمێ شەران ئالایێ خۆ یێ تایبەت هەلدگرن، لێ میرێ وێ ملکەچی میرێ بەهدینانە ئەوێ ل ئامێدیێ دروینیتە خارێ[٢١]. و ل دەستپێکا سەدێ هەژدێ زاخۆ هێشتا سەر ب ویلایەتا بەغداد ڤە بوو[٢٢]، و ل سالا ١٧٠٢ و پشتی هنگی ناڤێ وێ هاتییە وەك ئێك ژ سنجەقێن سەر ب ویلایەتا مووسل ڤە[٢٣]، و سەرۆبەر هۆسا بەردەوام بوویە هەتا کەفتنا میرگەهێ ل سالا ١٨٤٢ێ.

| بەروار | ناڤ | ویلایەت |
|---|---|---|
| ١٥١٥ | سندی - سلیمانی | دیاربەکر-کوردستان |
| ١٥٣٣ | سندی – سلیمانی | مووسل |
| ١٥٣٤ | سندی – سلیمانی | دیاربەکر |
| ١٥٥١ | سندی - سلیمانی | لورستان |
| ١٥٧٤ | زاخۆ | بەغداد |
| ١٥٨٨ | زاخۆ | مووسل |
| ؟- ١٧٠١ | زاخۆ | بەغداد |
| ١٨٤٢-١٧٠٢ | زاخۆ | مووسل |

## ئێک : جهێ زاخۆ د لیوا و سنجەقێن ئوسمانی دا ١٨٤٢- ١٩١٨:

پشتی کەفتنا میرگەهێ ل سالا ١٨٤٢ێ دەڤەرا بەهدینان چوو دناڤ رەوشەکا ئالۆز و تێکشلقیایی دا ژ هەمی لایانڤە و ڤێ ئالۆزیێ هەر وەسا لایەنێ کارگێری ژی ڤەگرت، بۆ ڤێ چەندێ ژی نەرۆهنییەك کەفتبوو رەوشا کارگێری یا زاخۆ ژی پشتی کەفتنا میرگەهێ.

و ل دۆر گرێدانێن قەزا زاخۆ ب سنجەق و ویلایەتێن ئوسمانی ڤە هەر ژ کەفتنا میرگەها بەهدینان ئەم دشێین پشتبەستنێ ل سەر بەلگەنامە و سالنامەیێن ئوسمانی بکەین. ل سالا ١٨٤٢ێ زاخۆ - ب رەنگەکێ راستەوخۆ- ب ویلایەتا مووسل ڤە هاتبوو گرێدان، و ل سالا ١٨٤٢ێ ناڤێ سەرۆکێ کارگێریا وێ ب (موتەسللم زاخۆ)[٢٤] هاتییە، و موتەسللم ئەو فەرمانبەر بوویە کو جهێ (موتەصەرف)ی دگریت ب وەکالەت[٢٥]، و ل سالا ١٨٤٤ێ ناڤێ (موتەصەرف زاخۆ) هاتییە[٢٦]، و موتەصەرف د سیستەمێ کارگێری یا ئوسمانی دا ل سەر سەرۆکێ یەکەیا بناڤێ (سنجەق یان لیوا) دهاتە دانان[٢٧]، و ژ یا بورى دهێتە دیارکرن و دەرئەنجام کو زاخۆ ل ڤی ماوەی دا گەهشتبوو ئاستێ سنجەقێ کو ئەو ژی ئاستێ وێ ژ قەزایێ بلندترە و ژ ویلایەتێ نزمترە، و ئەڤ سەروبەرە هەتا سالا ١٨٥٠یێ بەردەوام بوو[٢٨].

ژ لایەکێ دیتر ڤە ل ١٤ کانوونا ئێکێ ١٨٤٧ێ ویلایەتەکا نوی بناڤێ (کوردستان)هاتبوو دامەزراندن، و ل سالا ١٨٥٠یێ ژ ڤان سنجەقان پێکدهات: ( وان، مووش، هەکاری، مووسل، دیاربەکر، ماردین، خاربووت، عربگیر، مەلاتیا، بەهسنێ)[٢٩] و زاخۆ دڤی ماوەی دا (قەزا)یەکا سەر ب سنجەقا مووسل ڤە بوو، و هندیکە بەشێن دیترێن میرگەها بەهدینانا کەڤن سەر ب سنجەقا هەکاری بوون[٣٠]، و هەتا سالا ١٨٥٦ێ سنجەقا مووسل و قەزا زاخۆ سەر ب ویلایەتا کوردستان ڤە بوون[٣١].

ماوێ ١٨٥٢- ١٨٥٣ دهێتە هژمارتن ماوەیێ مشە گوهرینان د کارگێریا قەزا زاخۆ دا، ل ٢٢ جەمادیلئاخر ١٢٦٨مش/١٢ نیسان ١٨٥٢پێشنیاز دیار بوو: ب ئەگەرێ بەرفرەهیا جزیرێ پێدڤی یە زاخۆ و خیزان ب سنجەقا ژێگوتی ڤە بهێنە گرێدان، ئانکۆ سێ قائیمقامەیێن سەربخۆ دچارچووڤێ ئێك سنجەقدا ئەو ژی سنجەقا ماردین، و دامەزراندنا کەسەکێ بۆ قائیمقامیا زاخۆ بناڤێ ( حاجی عەبدوللا بەگ)[٣٢]، بەلێ یا دیار دبیت ئەڤ پێشنیازە نەهاتییە قەبویل کرن، دبەلگەنامەیەکێ دا کو مێژوویا وێ ڤەدگەریتەڤە بۆ ٤ صەفەرا ١٢٦٩مش/ ١٦ تشرینا دویێ ١٨٥٢ز تێدا هاتییە ) قەزا حاجی بایرام سەر ب سنجەقا زاخۆ یا سەر ب ویلایەتا کوردستان)[٣٣]، پاشی دبەلگەنامەیا ٢ شەعبان ١٢٦٩مش/ ١١ گولان ١٨٥٣ز هەمان پێزانین هاتییە دیارکرن[٣٤] ، و دبەلگەنامەیەکا دیتر دا کو ڤەدگەریتەڤە بۆ ٢٦ رەمەزانا ١٢٦٩مش/ ٣ تیرمەها ١٨٥٣ز هندەك پێزانینێن دیتر تێدا هاتینە ل دۆر لادانا مدیرێ قەزا (چل ئاغا) سەر ب ( سنجەقا زاخۆ سەر ب ویلایەتا کوردستان)[٣٥]، و هەبوونا قەزایان سەر ب زاخۆ ڤە دووپاتکرنە و بەلگەیە ل سەر ڤەگوهاستنا زاخۆ بۆ ئاستێ سنجەقێ.

ژ لایەکێ دیتر ڤە پێشنیازەکا دیتر ل دۆر ئێککرتنا هەر دو قەزایێن زاخۆ و جزیرێ پەیدا بوویە کو هەر دوو ئێك قائیمقامیە بن، ل جەمادیلئەول ١٢٦٩مش/ ئادار ١٨٥٣ز دنامەیەکێ دا هاتییە کو صەدرلئەعزەم بۆ موشیرێ لەشکەرێ ئەنادۆل و والیێ ویلایەتا

هەكاری ڤریكربوو تێدا دیاركریە كو ئاكنجیێن زاخۆ ڤێ پێشنیازێ لاددەن و بەلگەنامە داخوازا مانا زاخۆ دكەت وەك قەزایەكا سەربخۆ و دوبارە گرێدانا وێ ب سنجەقا مووسل ڤە[٣٦]، و ژ پێزانینێن سالنامەیا ئوسمانی یا سالا ١٢٧٠مش/١٨٥٤ز دیاردبیت كو زاخۆ هاتیە ڤەگوهاستن بۆ سنجەقێ سەر ب ولایەتا هەكاری و ویلایەت ژ ڤان سنجەقان: زاخۆ، جزیرێ، وان، ماردین پێكهاتییە[٣٧].

و یا گرێدانا زاخۆ ب ویلایەتا هەكاری دوویات دكەت ئەوە كو پێزانینێن هەمان سالناما ئوسمانی یا هەمان سال ئاماژە نەدایە زاخۆ وەك ئێك ژ سنجەقێن سەر ب ویلایەتا كوردستان ڤە، و ویلایەتا كوردستان دڤێ سالێ دا ژ ڤان سنجەقان: موش، مووسل، دیاربەكر، خاربوت، عربكیر- مەلاتیە، دێرسم، سێرت پێكدهات[٣٨].

وەسا دیار دبیت كو سەرەرای كو زاخۆ ل ڤی ماوەی ب ئاستێ (لیوا - سنجەق) بوو لێ ئاستێ سەرۆكێ وێ یێ كارگێری (قائیمقام و مدیر)بوویە! و ئەڤ هەر دو ئاستە ژ ئاستێ موتەصەرفی نزمترن!!.

ل سالا ١٨٥٦ێ سنجەقا مووسل ژ ویلایەتا كوردستان ڤە هاتبوو ژێڤەكرن و ب ویلایەتا (وان) ێ هاتبوو گرێدان[٣٩]، و هندیكە قەزا زاخۆ بوویە ژ سنجەقا مووسل هاتبوو ژێڤەكرن و ب سنجەقا ماردین ڤە ئەوا سەر ب ویلایەتا كوردستان ڤە هاتبوو گرێدان[٤٠]، و هەتا سالا ١٨٦٦ێ ئەڤ سەرۆبەرە یێ بەردەوام بوو[٤١]، و پشتی گرێدانا زاخۆ ب سنجەقا ماردین ڤە ناڤێ زاخۆ - وەك قەزا- دناڤ سالنامەیێن ئوسمانی دا دەستپێكریە[٤٢].

گرێدانا قەزا زاخۆ ب سنجەقا ماردین ڤە سەركێشا بو پەیدابوونا ئاریشان بۆ خەلكی (ئاكنجیبوویان) و رێڤەبەرێن وێ، لەوما بۆ ڤێ چەندێ گەلەك داخوازی هاتنە بلند كرن كو فەرە زاخۆ ژ ماردینێ بێتە ژێڤەكرن ئەڤە ژی ژ بەر دویراتییا دناڤبەرا وان دا، و ئێك ژ ڤان داخوازیان ل رەبیع ئەلئاخر ١٢٧٧/ تشرینا ئێكێ ١٨٦٠بوو[٤٣]، بەلێ یا دیار دبیت كو ڤان داخوازیان چ بەرسڤێن ئەرێنی نەبوون چونكە پشتی ڤێ چەندێ ژی بەردەوام ناڤێ زاخۆ دناڤ سالنامێن دەولەتا ئوسمانی دا ب قەزایەكا سەر ب سنجەقا ماردین هاتییە.

ل سالا ١٨٦٧- ١٨٦٨ زاخۆ ژ سنجەقا ماردین ڤە هاتبوو ژێڤەكرن و ب سنجەقا مووسل ڤە هاتبوو گرێدان ئەوا كو گرێدای ب ویلایەتا بەغداد ڤە[٤٥]، و ل ڤێ سالێ سنجەقا مووسل ژ ڤان یەكەیێن كارگێری پێك دهات: ( زاخۆ، ئامێدیێ، تەلەعفەر، زێبار، ئەلقوش، مزووری، سنجار، عەشائر سەبعە، داوودیێ، دهۆك)[٤٦]، و ل سالا ١٨٦٩ێ و ل چارچووڤێ چاكسازیێن والیێ ئوسمانی (مەدحەت پاشا) یدا رێكخستنا ویلایەتا بەغداد دوبارە بوو كو پێكبهێت ژ سنجەقێن (بەسرا، رەواندوز، سلێمانیێ، شەهرەزور و مووسل) و زاخۆ دبیتە ئێك ژ قەزایێن سەر ب سنجەقا مووسل ڤە[٤٧]، و ئەڤ رەوشە بەردەوام بوو هەتا سالا ١٨٧٩ێ كو ل ڤێ سالێ ویلایەتا مووسل هاتە دامەزراندن كو ژ سنجەقێن (كەركووك، سلێمانی، مووسل) پێكدهات و زاخۆ بوو ئێك ژ قەزایێن سەر ب سنجەقا مووسل ڤە یا كو سەر ب ویلایەتێ ڤە[٤٨]و هەتا سالا ١٩١٨ێ ئەڤ سەرۆبەرە یێ بەردەوام بوو.

| ماوەیێ دەمی | سنجەق | ویلایەت | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٨٤٢-١٨٤٩ | زاخۆ | مووسل | |
| ١٨٥٠-١٨٥٢ | مووسل | كوردستان | زاخۆ ژ سنجەقێ هاتبوو ڤە هاتبوو ڤەگوهاستن بۆ قەزایێ. |
| ١٨٥٢-١٨٥٥ | زاخۆ | هەكاری | زاخۆ ژ قەزایێ ببوو سنجەق |
| ١٨٥٦-١٨٦٦ | ماردین | كوردستان | |
| ١٨٦٧-١٨٧٩ | مووسل | بەغداد | |
| ١٨٧٩-١٩١٨ | مووسل | مووسل | |

## قەزا زاخۆ د سنجەق ویلایەتێن عوسمانیدا ١٨٤٢- ١٩١٨

### دوو: قائیمقامیا قەزا زاخۆ :

ژێدەر و بەلگەنامەیێن مێژوویی پێزانینێن باش و تێروتەسەل ل سەر مێژوویا زاخۆ و کاودانێن وێ یێن کارگێری ل سەردەمێ ئوسمانی دا بەرچاڤ ناکەن، و ماوەیێ ١٨٤٢- ١٨٥٢ ژ ماوەیێن بەرتەنگ و دژوارە ژ مێژوویا زاخۆ کو تێدا پێزانینێن کێم یێن دناڤ دا هەین.

بەری بچینە دناڤ بابەتی دا هەژی ئاماژەدانێ یە کو دانانا سیفەتێ (قەزا) ل سەر باژێرێ زاخۆ و هژمارەکا دیتر یا باژێر و باژێرکێن کوردی ڕامانا وێ ئەو نینە کو ئەو ب ڕامانا ئەڤرۆ (قەزا) بوویە[٤٩]، و ئارمانجا ڤێ ڤەکۆلینێ دەستنیشانکرنا وێ دەمی یە یا کو زاخۆ تێدا بوویە قەزایەکا ل ژێر حوکمێ ئوسمانی یێ ئێکسەر کو ژ لایێ فەرمانبەرەکی ب ناڤێ (قائیمقام) دهاتە برێڤەبرن.

ئەڤجا پشتی کەفتنا میرگەها بەهدینان و زالبوونا ئوسمانییا ل سەر زاخۆ، دەولەت ڕابوو ب نوویکرن و دامەزراندنا ئێکەمین ڕێکخستنا خۆە یا کارگێری ل زاخۆ، ل سالا ١٨٤٢ز فەرمانبەرەکێ ئوسمانی بوویە کو دگۆتنێ (ئیبراهیم ئاغا) ب سیفەتێ (موتەسەللم) حوکم ل زاخۆ دکر[٥٠]، و دبەلگەنامەیەکا دیتر یا ئوسمانی دا کو ڤەدگەریت بۆ سالا ١٨٤٤ ناڤێ (سنجەق زاخۆ) و موتەصەرفێ وێ (عوسمان پاشا) هاتییە[٥١]، و ل سالا ١٨٤٧ێ میر عزەددین شێر بەگ سنجەقا زاخۆ ب سیفەتێ (موتەسەللم) برێڤەدبر[٥٢]، و زاخۆ ب سیفەتا (سنجەق) یا بەردەوام بوو هەتا سالا ١٨٥٢ێ.

**خشتەیێ ناڤێن سەرۆکێن کارگێریا زاخۆ ١٨٤٢- ١٨٥٢ز**

| مێژوو | ناڤ | پلەداری |
|---|---|---|
| ١٨٤٢ | ئیبراهیم ئاغا | موتەسەللم |
| ١٨٤٤ | عوسمان پاشا | موتەصەرف |
| ١٨٤٧ | عزەددین شێر بەگ | موتەسەللم |

دەستپێکا ڤەگوهاستنا قەزا زاخۆ بۆ پلا ( قائیمقاملق Kaymakamlik= القائممقامیە) ڤەدگەریتەڤە بۆ سالا ١٨٥٢ێ، ل ١٤ شەوالا ١٢٦٨ مش/ ٣١ تیرمەها ١٨٥٢ ئیرادەیەکا سولتانی دەرکەفت کو تێدا سنجەقا زاخۆ وەك قەزایەکا (قائیمقاملق) سەر ب ویلایەتا (کوردستان)ڤە هاتە نیاسین و ئێك ژ (قاپوچی باشی= سەر دەرگەهڤانێن) باب ئەلعالی بناڤێ (حاجی عەبدوللا بەگ) دهێتە دامەزراندن وەك ئێکەم قائیمقام بۆ قەزا زاخۆ[٥٣]، و مێژوویا ناڤهاتی دهێتە هژمارتن دەستپێکا دامەزراندنا قەزا زاخۆ ب ڕامانا ئەڤرۆ دهێتە نیاسین، و حاجی عەبدوللا بەگ ئێکەم قائیمقامێ ئوسمانی بوویە کو سەرۆکاتیا کارگێریێ ل زاخۆ کری.

پێزانین ل دۆر حاجی عەبدوللا بەگ گەلەك دکێمن ، و هەر چ تشتێ ل بەردەست دو بەلگەنامەیێن ئوسمانینە کو مێژوویا وان ڤەدگەریتەڤە بۆ محەررەما ١٢٦٩مش/ چریا دویێ ١٨٥٢ز ژ (وەزارەتا دارایی/ مالی) کو دەربرینا سوپاسیێ تێدا هاتییە کرن بۆ عەبدوللا بەگ ژ ئەگەرێ کارێن وی ل زاخۆ[٥٤]. و بەلگەنامەیا دویێ فەرمانەکە ژ (جڤاتا بلند - Meclisi Vala)[٥٥]، ل سەر وێ چەندێ ئاخڤتی یە کو قائیمقامێ زاخۆ (سەر ب کوردستان) ڕابوویە ب کارێن (دەرڤە ژ ڕێنمایان)، و وی بخۆ دەستکارکێشانا خۆ داخوازکریە، بۆ ڤێ چەندێ پێدڤی یە کەسەکێ دیتر ل جهێ وی بێتە دامەزراندن(٥٦).

وەرگرتنا کاربەدەستیا قائیمقامیێ پشتی لادانا عەبدوللا بەگ، ل شەعبان ١٢٦٩مش/ گولان ١٨٥٣ز قائیمقامێ بەرێ یێ ماردین (جەمال بەگ کورێ سەیید سەعید پاشا زادە سیواسی) دهێتە دامەزراندن[٥٧]، بەلێ ب لەز ژ کاربەدەستیا وی دهێتە لادان و ل جەمادیلئاخر ١٢٦٩مش/ تەباخ ١٨٥٣ێ (حوسنی محەممەد بەگ)قائیمقامێ قەزا (زاغرا العتیق) ل جهێ وی دبیتە قائیمقامێ زاخۆ[٥٨]، و مێژوونڤیسێ ئوسمانی (محەممەد سورەیا)

دبێژیت: ئەڤی قائیمقامی ماوێ کارگێریا خۆ ل زاخۆ ب شەرێن دگەل کوردان بوراند بوو[٥٩] و دروستتر ئەوە کو مەبەستا وی ب برازا عزەددین شێر بەگە ئەوێ کو د وی ماوەی دا سەرهلدای[٦٠].

ل جەمادیلئاخر١٢٧٠مش/ئادار١٨٥٤ز حوسنی بەگ ژ ئەرکی وی هاتە لادان و (حسێن ئاغا) وەك

**ئیرادەیا سولتانی بۆ دامەزراندنا قەزا زاخۆ**




قائیمقامێ نوی ل زاخۆ هاتە دامەزراندن، و یێ بەردەوام بوو هەتا کو ل رەبیع ئەلئەول ١٢٧١مش/ کانوونا ئێکێ ١٨٥٤ێ چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ ، و (شەمدین ئاغا) وەك قائیمقامەکێ نوی(ب وەکالەت) و ب پلا(مدیر: کو ئاستەکێ نزمترە ژ قائیمقامی) ل زاخۆ هاتە دامەزراندن، و هەژی یە بێژین کو ناڤهاتی ژ مەزنێن ئێك ژ خێزانێن خودان دەستەلات بوو ل باژێری[٦١]، و پشتی ماوەیەکێ کێم قائیمقامەکێ نوی بۆ زاخۆ بناڤێ (مستەفا لامع پاشا) هاتە دامەزراندن و یێ بەردەوام بوو هەتا جەمادیلئەول ١٢٧٥مش، کانوونا ئێکێ ١٨٥٨ز و ل مێژوویا داویێ فەرمانا ڤەگوهاستنا وی دەرکەفتبوو بۆ قەزا (قرە عیسالی)[٦٢]، ل ویلایەتا ئەدەنە[٦٣].

پشتی مستەفا لامع پاشا کەسەکێ دیتر بناڤێ (عەلی بەگ) ب پلا(مدیر) کارێ قائیمقامیێ وەرگرت[٦٤] و ئەڤ قائیمقامە هاتبوو تاوانبارکرن ب گەندەلیێ، لەوما هاتبوو لادان و ب جەمادیلئاخر١٢٧٥مش/ کانوونا دویێ ١٨٥٩ز کەسەکێ دیتر ئەو ژی (حاجی عەبدوللا بەگ قاپوچی باشی) بۆ رێڤەبرنا کارێ قائیمقامیێ ( ب وەکالەت) و هەر وەسا ب پلا (مدیر) هاتە دامەزراندن[٦٥]، و دروستترە کو ئەڤ کەسە هەر ئەو حاجی عەبدوللا بەگ بوو یێ کو وەك ئێکەم قائیمقامێ زاخۆ هاتییە دامەزراندن، و پشتی وی ( یوسف بەگ شێخ زادە) کارگێریا زاخۆ ب پلا مدیر (وەکالەت)وەرگرتبوو، وبێ گومان نزمکرنا ئاستێ سەرۆك کارگێریا زاخۆ بوویە ژ قائیمقام بۆ مدیر ڤەدگەریت بۆ مەسەلەیا ژێڤەکرنا زاخۆ ژ سنجەقا ماردین و گرێدانا وێ ب سنجەقا مووسل ڤە، و ئەو بابەتەك بوو کو نەکەڤتە د بوارێ جێبەجێکرنێ دا - هەر وەکی مە ئاماژە داییێ-.

ژ لایەکێ دیتر ڤە ل محەررەما ١٢٧٨مش/ تیرمەها ١٨٦١ز فەرمانا دامەزراندنا مودیرێ (اصطبلخانە امیریە) (پایەلی مستەفا ئەفەندی) دەرکەفتبوو وەك قائیمقام بۆ زاخۆ[٦٦]، و ل صەفەرا ١٢٧٨مش/ تەباخ ١٨٦١ز یووسف بەگ هاتبوو ڤەگوهاستن بۆ قەزا (چل ئاغا) و ل وێرێ وەك قائیمقام ل سەر قەزایا

ناڤهاتی هاتە دامەزراندن (أصالە- رەسەن)[٦٧].

پشتی سالا ١٨٦١ێ تا سالا ١٨٨٦ێ پێزانین ل سەر قائیمقامیا زاخۆ دکێمن ، و ل ڤی ماوەی دژێدەرێن بەردەست دا بتنێ ناڤێن دو قائیمقامان ب دەست مەدکەڤن ئەو ژی ( سلێمان قادم ئەفەندی)[٦٨]ئەوێ کو ل سالا ١٨٧٥ کاربەدەستی وەرگرتی و نائیبێ وی (ئەحمەد ئەفەندی)بوو ، و (تاهر بەگ) ئەوێ کو ل سالا ١٨٨٠یێ قائیمقامێ زاخۆ[٦٩].

ل سالا ١٨٨٦ێ ناڤێ قائیمقامێ زاخۆ (مستەفا سەلیم ئەفەندی)هاتیە ئەوێ کو هەمان ئەرك ل قەزا شنگالێ وەرگرتی[٧٠]، و ل محەررەما ١٣٠٦ مش/ ئەیلوول ١٨٨٦ز ڤەگوهاستن دناڤبەرا قائیمقامێن زاخۆ و شنگال پەیدا بوو، ئەو ژی کو قائیمقامێ زاخۆ مستەفا سەلیم ئەفەندی هاتە ڤەگوهاستن بۆ شنگال و قائیمقامێ شنگال (ئیبراهیم صدقی ئەفەندی) بۆ قائیمقامێ زاخۆ)[٧١]، و هەتا سالا ١٣٠٦مش/ ١٨٨٨- ١٨٨٩ز یێ بەردەوام بوو، و نائیبێ وی ژی دگوتنێ (ئیبراهیم ئەفەندی)[٧٢].

ل سالا ١٣٠٨مش/ ١٨٩٠-١٨٩١ز سەعید بەگ ئەفەندی کاربەدەستی یا قائیمقامیا زاخۆ وەردگریت و نائیبێ وی مەولود ئەفەندی بوو[٧٣]، و ل ١٣١٠مش/ ١٨٩٢ز (ئیسحاق حەقی ئەفەندی) وەك قائیمقامێ نوی یێ زاخۆ و (صەبری ئەفەندی) وەك نائیبێ وی هاتە دامەزراندن[٧٤]، و ل هەمان سال جارەکا دیتر فەرمانا ڤەگوهاستنا قائیمقامێ شنگال (ئیبراهیم صدقی ئەفەندی) بۆ زاخۆ دەرکەفت و بەلێ یا ب لەز جارەکا دیتر ل محەررەما ١٣١١مش/ تیرمەها ١٨٩٣ز هاتە ڤەگوهاستن بۆ شنگالێ و قائیمقامێ بەرێ یێ زاخۆ (مستەفا سەلیم ئەفەندی) ژی جارەکا دیتر بۆ زاخۆ هاتە ڤەگوهاستن[٧٥].

ل جەمادیلئەول ١٣١١مش/چریا دویێ ١٨٩٣ز فەرمانا ڤەگوهاستنا مستەفا سەلیم ئەفەندی دەرکەفتبوو بۆ قەزا ئامێدیێ و ئیبراهیم صدقی ئەفەندی بۆ جارا سێیێ وەك قائیمقام ل سەر زاخۆ هاتە دامەزراندن[٧٦]، و نائیبێ وی نەسروللا ئەفەندی بوو[٧٧].

ل داوییا سالا ١٨٩٣ێ بۆ جارا سێیێ مستەفا سەلیم ئەفەندی وەك قائیمقامێ زاخۆ هاتبوو دامەزراندن، بەلێ زوی هاتە ڤەگوهاستن بۆ قائیمقامیا ئامێدیێ پشتی لادانا قائیمقامێ وێ عوسمان نووری ئەفەندی ل رەجەبا ١٣١١مش/کانوونا ئێکێ ١٨٩٤ز[٧٨]، و ل هەمان هەیڤ قائیمقامێ قەزا بازیان (ئیبراهیم بەگ) وەك قائیمقامێ زاخۆ هاتە دامەزراندن[٧٩].

پشتی ماوەیەکێ کورت ژ وەرگرتنا وی یا کارگێریێ ل زاخۆ هاتە رەوانەکر بۆ دادگەهێ ب تاوانا گرێدای دزی و گەندەلییا دارایی، و ل محەررەما ١٣١٣مش/ تیرمەها ١٨٩٤ز هاتبوو پێشنیازکرن کو (صالح بەگ کورێ مەحمود پاشا زادە) وەك قائیمقامێ نوی ل زاخۆ بێتە دامەزراندن کو ئەو کورێ ئێك ژ خێزانێن دەستەلاتدار بوو ل سلێمانیێ، کو قائیمقامیا قەزا (مەرگە) سەر ب سنجەقا سلێمانیێ وەرگرتبوو[٨٠].

و ل رەبیع ئەلئەول ١٣١٢مش/ئەیلوول ١٨٩٤ز فەرمانا دامەزراندنا(صالح بەگ) وەك قائیمقامێ زاخۆ دەرکەفتبوو[٨١]، و ل کانوونا دویێ ١٨٩٥ێ کاتبێ تەحریراتێت قەزا سلێمانیێ (سەعید بەگ) وەك قائیمقامێ نوی ل زاخۆ هاتە دامەزراندن[٨٢] بەلێ یا ماوێ کارگێریا وی گەلەك نەڤەکێشا و ژ کارێ وی هاتەلادان و ل بهارا ١٨٩٥ێ (صالح خلووصی) وەك قائیمقام ل قەزا زاخۆ هاتەدامەزراندن و نائیبێ وی ژی (مستەفا موختار ئەفەندی)بوو[٨٣]، و دیاردبیت کو ئەڤ قائیمقامە یێ سەرکەفتی بوویە دکارێ خۆ دا لەوما بۆ ڤێ چەندێ ل شەعبانا ١٣١٢مش/ نیسان ١٨٩٥ێ نامەیا رێزگرتنێ (تەلتیفنامە)بۆ وی دەرکەفتبوو ئەڤە ژی ب ئەگەرێ (غیرەتا وی د کارێ وی دا)[٨٤].

ل رەمەزانا ١٣١٣مش/ شوبات ١٨٩٦ز صالح بەگ ژ کارێ وی هاتبوو لادان و قائیمقامێ (کاباتا)یێ بەرێ (محەممەد کامل ئەفەندی) وەك قائیمقامێ نوی بۆ زاخۆ هاتە دامەزراندن[٨٥]، و نائیبێ وی مستەفا ئەفەندی بوو[٨٦].

ژ لایەکێ دیتر ڤە و پشتی لادانا قائیمقامێ زاخۆ

ین بەرێ (صالح بەگ) ل رەبیع ئەلئەول ١٣١٤مش/ تەباخ ١٨٩٦ز فەرمانا ڤەگوهاستنا وی بۆ قەزا بازیان دەرکەفت و ڤەگوهاستنا قائیمقامێ بازیان (ئەمین بەگ) بۆ زاخۆ[٨٧]، بەلێ یا مانا وی ل زاخۆ گەلەك نەڤەکێشا کو ل ٢٦رەبیع ئەلئەول ١٣١٤مش/ ٥ ئەیلوول ١٨٩٦ جارەکا دیتر فەرمانا ڤەگوهاستنا وی بۆ بازیان هاتبوو دەرێخستن[٨٨].

پشتی ڤێ مێژوویێ کەسەکێ دیتر بناڤێ (عەساف ئەفەندی) کارێ قائیمقامییا زاخۆ وەرگرتبوو کو دیاردبیت ئەڤ کەسە نە یێ سەرکەفتی بوویە دکارێ خۆ دا، لەوما ل محەررەما ١٣١٦ مش/ خزیرانا ١٨٩٨ز فەرمانەك دەرکەفتبوو کو پێدڤی یە قائیمقامێ زاخۆ و هژمارەکا دیتر ژ قائیمقامێن ل ویلایەتا مووسل بهێنە گوهرین[٨٩]، و ل زیلقیعدە ١٣١٦مش/ ئادار ١٨٩٩ فەرمانەك ژ وەزارەتا ناڤخۆ بۆ ویلایەتا مووسل دەرکەفت کو تێدا داخوازکربوون ڤەکۆلین دگەل قائیمقامێ زاخۆ (عەساف ئەفەندی) بێتەکرن ب ئەگەرێ رابوونا وی ب کارۆبارێن دەرڤەی یاسایێ[٩٠].

پشتی عەساف ئەفەندی، هەر ژ گولانا ١٨٩٩ێ کەسەکێ دیتر بناڤێ محەممەد کامل ئەفەندی کارێ قائیمقامیا زاخۆ وەردگریت[٩١]، و هەتا ناڤەراستا سالا ١٩٠٠ێ بەردەوام دبیت، و نائیبێ وی ل سالا ١٨٩٩ێ (عەبدولفەتاح ئەفەندی)بوو[٩٢]، و ل سالا ١٩٠٠ێ مستەفا موختار ئەفەندی نائیبێ وی بوو[٩٣]، ل محەررەما ١٣١٨مش/گولانا ١٩٠٠ێ ژ کارێ وی هاتە لادان پشتی تاوانبارکرنا وی ب تۆشبوونا دکێشەیا گەندەلیێ دا دگەل مدیرێ مالی (نەزمی بەگ) و مدیرێ ناحیا سندی گولی(عەبدی ئاغا)[٩٤]، وقائیمقام و تاوانبارێن دیتر بۆ دادگەهێ هاتنە رەوانەکرن، و ل رەبیع ئەلئەول ١٣١٨مش/ تیرمەها ١٩٠٠ز نامەیەکا وەزارەتا ناڤخۆ دا بۆ والیێ مووسل دیاردکەتن کو دادگەهێ بریارا بێ تاوانییا وان دەرئێخستیە لەورا پێدڤیە دەستویریێ بدەتە قائیمقامی ل زاخۆ دەست بکارێ خۆ بکەتن، لێ محەممەد کاملی دیارکریە کو ئەو نەشێت بەردەوامیێ ب کارێ خۆە بدەت و داخوازا دامەزراندنا کەسەکێ دیتر کریە ل جهێ وی بێتەدانان[٩٥]. و دراستی دا دەستەلاتێن ئوسمانی هەر ل دەمێ لادانا محەممەد کامل ئەفەندی ل گولانا ١٩٠٠ێ کەسەکێ دیتر بناڤێ (ئەحمەد بەگ) وەك قائیمقام بۆ زاخۆ دامەزراندبوو![٩٦].

ل هەمان سال ئەحمەد بەگ ژ ئەرکێ وی هاتە لادان و (حافز بەکر بەگ) وەك قائیمقامێ نوی یێ زاخۆ هاتە دامەزراندن، ل رەبیع ئەلئاخر ١٣١٨مش/ تەباخ ١٩٠٠ز فەرمانا ڤەگوهاستنا وی بۆ قەزا (عوسمانیە)دەرکەفت و قائیمقامێ هیزان (فوئاد بەگ)ب قائیمقامێ نوی یێ زاخۆ هاتە دامەزراندن[٩٧].

هەروەك دیار مەسەلەیا دامەزراندنا فوئاد بەگ ل زاخۆ نەچووبوو د بوارێ جێبەجێکرنێ دا یان دبیت ب لەز ژ کارێ وی هاتبیتە لادان و بەلگە ژی بۆ ڤێ چەندێ ناڤێ (بەکر بەگ) ل شەعبان ١٣١٨مش/ کانوونا ئێکی هاتیە وەك قائیمقامەکێ نوی بۆ زاخۆ، و دبەلگەنامەیا ئوسمانی دا هاتیە کو بەکر بەگ ژ بەر خرابیا رەوشا ساخلەمیا خۆ هەتا نها دەست بکارێ خۆ نەکریە[٩٨]، و ل شوباتا ١٩٠١ێ فەرمانا موتەصەرفێ (سوق الشیوخ) (محەممەد شەریف ئەفەندی) دەرکەفتبوو کو ببیتە قائیمقامێ نوی ل زاخۆ[٩٩] ئەوێ کو ل زیلقیعدە ١٣١٨مش/ ئادار ١٩٠١ دەست بکارێ خۆ کری[١٠٠]، و نائیبێ وی (مستەفا ئەفەندی)بوو[١٠١].

ل کانوونا ئێکێ ١٩٠١ێ فەرمانا ڤەگوهاستنا محەممەد شەریف ئەفەندی دەرکەفتی بۆ قەزا رەواندوز، و ل هەمان مێژوو قائیمقامێ (قرەبنار) (حسێن صەفوەت بەگ) وەك قائیمقامێ نوی بۆ زاخۆ هاتە دامەزراندن[١٠٢]، و ل کانوونا دویێ ١٩٠٢ێ قائیمقامێ (ڤارتو) (عەلی ئەفەندی) ببوو قائیمقامێ زاخۆ[١٠٣]،بەلێ یا دیار دبیت کو ئەڤێ داوێ نەیێ سەرکەفتی بوویە د کارێ خۆ دا، بەلگە ژی بۆ ڤێ چەندێ ل زیلقیعدە١٣١٩مش/ئادار ١٩٠٢ێ فەرمانەك دەرکەفت کو ب پێدڤی زانی یە کو قائیمقامێ زاخۆ بێتە گوهرین و کەسەکێ دیتر یێ گونجای بۆ ڤێ کاربەدەستیێ بێتە هەلبژارتن[١٠٤]، و دبەلگەنامەیەکا دیتر دا کو مێژوویا وێ ڤەدگەریتە

هەیڤا گولانا ١٩٠٢ێ ناڤێ قائیمقامێ زاخۆ مستەفا کامل ئەفەندی هاتییە ئەوێ کو فەرمانا ڤەگوهاستنا وی بۆ قەزا زەیدیە ل ویلایەتا یەمەن هاتی[١٠٥].

ل جەمادیلئاخر ١٣٢٠مش/ ٤ ئەیلوول ١٩٠٢ێ فەرمانا دامەزراندنا قائیمقامێ بەرێ یێ بیت الشباب (خۆرشید پاشا)دەرکەفتبوو کو ببیتە قائیمقامێ نوی ل زاخۆ، و لێژنا هاتییە ڕاسپاردن ب دامەزراندنا قائیمقامێ نوی ل زاخۆ ل ٢٥ محەررەما ١٣٢٠مش/٤ حوزەیرانا ١٩٠٢ز رازی ببوو ل سەر بلندکرنا ناڤێ وی بۆ ستەنبولێ، و ل ٢٥ جەمادیلئاخر ١٣٢٠مش/ ٢٩ تەباخ ١٩٠٢ز فەرمانا سولتانی بۆ ڤێ چەندێ دەرکەفتبوو[١٠٦]، هەتا تیرمەها ١٩٠٥ێ یێ بەردەوام بوو.

د ژێدەرەکێ دی دا هاتییە کو ل سالا ١٩٠٤ێ قائیمقامێ زاخۆ (ئەحمەد تەوفیق ئەفەندی) بوو[١٠٧]،بەلێ ژێدەرێن ئوسمانی دوویات دکەن کو کارگێریا زاخۆ پشتی خۆرشید بەگ هاتبوو ڕادەستکرن بۆ کەسەکێ دیتر بناڤێ (نیهاد ئەفەندی)، لەوما پتر هزر بۆ وێ ئێکێ دچیت کو ئەحمەد تەوفیقێ ناڤهاتی بۆ دەمەکێ کورت ئەڤ پوستە ب (وەکالەت)وەرگرتیە.

ل جەمادیلئەول ١٣٢٢مش/ تیرمەها ١٩٠٤ز خۆرشید پاشای داخواز ژ وەزارەتا ناڤخۆ کربوو کو (ناظر - چاڤدێر)ـەك جهێ وی بگریت ژ بەرکو وی نیازا چوونا جهێن پیرۆزە بۆ بجهئینانا رێورەسمێن حەجێ هەیە[١٠٨]، و ل گولانا ١٩٠٥ێ بریار هاتبوو دان ب دامەزراندنا قائیمقامێ بەرێ یێ قەزا (میلاس) (نیهاد ئەفەندی) وەك قائیمقامێ نوی ل زاخۆ[١٠٩]، و ل هەیڤاجەمادیلئاخر ١٣٢٣مش/ تیرمەها ١٩٠٥ز خۆرشید پاشا هاتبوو خانەنشین کرن[١١٠].

نیهاد ئەفەندی هەتا زیلقیعدە ١٣٢٥مش/ کانوونا دوویێ ١٩٠٧ مابوو دکاربەدەستی یا خۆ دا و نائیبێ وی (ئیسماعیل ئەفەندی)بوو[١١١]، و پشتی ڤێ مێژوویێ فەرمانا ڤەگوهاستنا وی بۆ قەزا هەولێرێ دەرکەفتبوو پشتی ب دەستڤەئینانا بلندکرنا پلەیێ ل هەمبەر خزمەتێن وی ل زاخۆ[١١٢].




دیار دبیت کو پشتی ڤەگوهاستنا نیهاد بەگ دا کارگێری یا زاخۆ دکەڤیتە دناڤ رەنگە ئالۆزیەکێ دا یان نەبوونا سەقامگیرێ، بەلکە ژی بۆ ڤێ چەندێ دسالنامەیا دەولەتا ئوسمانی دا یا سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز ناڤێ قائیمقامێ زاخۆ نەئینایە بەلکۆ بتنێ ناڤێ نائیبێ وی (ئیسماعیل ئەفەندی)ئینایە[١١٣]، و سالنامەیا ویلایەتا مووسل یا سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٧ز دیارکریە کو قائیمقامێ زاخۆ (تەوفیق بەگ) بوویە یێ کو ب وەکالەت ئەو ئەرکە وەرگرتی و نائیبێ وی (ئیسماعیل ئەفەندی)بوو[١١٤].

ل شەعبانا ١٣٢٥مش/ ئەیلوول ١٩٠٧ێ صەفوەت ئەفەندی بۆ زاخۆ ب سیفەت قائیمقام (ڕەسەن/ الاصیل) هاتبوو دامەزراندن، کو ل بەری ڤێ مێژوویێ ئەڤ ئەرکە ل قەزا شارباژێر هەبوو، و پێزانینێن بەلگەنامەیەکا ئوسمانی ئەگەرێ ڤەگوهاستنا وی بۆ زاخۆ ڤەدگەرینەڤە بۆ ئەگەرێن ساخلەمیێ[١١٥]،و

ناڤێ وی دسالنامەیا ئوسمانی یا سالا ۱۳۲٦مش/۱۹۰۸هاتییە و نائیبێ وی ژی محەممەد تەقی ئەفەندی بوو[١١٦]، و ل هەیڤا چریا ئێكێ ۱۹۰۸ێ كاغەزێن ڤی قائیمقامی هاتبوونە پێشكێش كرن بۆ دادگەها مووسل ب ئەگەرێ گەندەلی و سەرپێچییا یاسایان[١١٧]، و ل شەوالا ۱۳۲٦مش/ چریا دویێ ۱۹۰۸ێ بریارا لادانا قائیمقامێ زاخۆ (صەفوەت ئەفەندی)دەركەفت و قائیمقامێ شنگال (عەساف ئەفەندی) ل جهێ وی هاتە دامەزراندن[١١٨].

ل هەیڤا صەفەرا ۱۳۲۷مش/ ئادار ۱۹۰۹ێ ناڤێ حسێن تەلعەت بەگ هاتییە كو رێڤەبەرییا قائیمقامییا زاخۆ كریە (ب وەكالەت)[١١٩]،و ل شەعبانا ۱۳۲۸مش/ تەباخ ۱۹۱۰ فەرمانا دەركەفتبوو ب دامەزراندنا (محەممەد سەعید ئەفەندی) وەك قائیمقامەكێ نوی ل سەر زاخۆ[١٢٠]، و ل زیلقیعدە ۱۳۲۸/ چریا دویێ ۱۹۱۰ قائیمقامێ زاخۆ (عەلی نیازی ئەفەندی)بوو[١٢١]ئەوێ كو ل رەبیع ئەلئەول / شوباتا ۱۹۱۳فەرمانا ڤەگوهاستنا وی بۆ قەزا صەلاحیە دەركەفتی[١٢٢]، و نائیبێ وی ماوێ كارگێرییا وی ل زاخۆ (مستەفا موختار ئەفەندی)بوو[١٢٣].

و ل شوباتا ۱۹۱۳ێ فەرمانا ڤەگوهاستنا قائیمقامێ شنگالێ (عاصم ئەفەندی) بۆ زاخۆ دەركەفت[١٢٤]، پاشی (مەسعوود بەگ) ئەركێ قائیمقامییا زاخۆ وەردگریت ئەوێ كو ل رەجەبا ۱۳۳٤/گولان ۱۹۱٦ێ ژ وی كاری هاتییە لادان[١٢٥].

و ل رەمەزانا ۱۳۳٤مش / تیرمەها ۱۹۱٦ێ

**خشتەیێ دیاركرنا رێزبەندا ناڤێن قائیمقامان و مێژوویا دەست بكاربوونا وان**

| ز | ناڤێ قائیمقامی | مێژوو | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ۱ | حاجی عەبدوللا بەگ | ۱ تەباخ ۱۸۵۲ | قبوجی باشی باب ئەلعالی. |
| ۲ | جەمال بەگ كورێ سەيید سەعید پاشا زادە سیواسی | ئادار ۱۸۵۳ | بەری هنگی قائیمقامێ ماردین بوو. |
| ۳ | حوسنی محەممەد بەگ | تەباخ ۱۸۵۳ | بەری هنگی قائیمقامێ زاغرا العتیق بوو. |
| ٤ | حسێن ئاغا | ئازار ۱۸۵٤ | |
| ۵ | شەمدین ئاغا | كانوونائێكێ ۱۸۵٤ | قائیمقام ب پلا رێڤەبەر وەكالەت. |
| ٦ | میرێ میران مستەفا لامع پاشا | دەستپێكێن ۱۸۵۵ | هاتبوو ڤەگوهاستن بۆ قرە عیسالی. |
| ۷ | عەلی بەگ | ۱۸۵۹/۱۸۵۸ | قائیمقام ب پلا رێڤەبەر |
| ۸ | حاجی عەبدوللا بەگ | ۱۸۵۹ | وەكالەت ب پلا رێڤەبەر، دبیت هەر ئەو قائیمقامێ ئێكێ بیت. |
| ۹ | یووسف بەگ شێخ زادە | ۱۸٦۱/۱۸٦۰ | وەكالەت ب پلا رێڤەبەر، هاتبوو ڤەگوهاستن بۆ قەزا چل ئاغا (ئەصالە). |
| ۱۰ | پایەلی مستەفا ئەفەندی | تیرمەهـ ۱۸٦۱ | بەری هنگی رێڤەبەرێ (اصطبلخانە الامیریە) بوو. |
| ۱۱ | سلێمان قادم ئەفەندی | ۱۸۷۵ | نائیبێ وی ( ئەحمەد ئەفەندی) بوو. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٢ | تاهربەگ | ١٨٨٠ | |
| ١٣ | مستەفا سەلیم ئەفەندی | ١٨٨٦ | بەری هنگی قائیمقامێ شنگال بوو |
| ١٤ | ئیبراهیم صدقی ئەفەندی | تشرینادویێ ١٨٨٦ | هاتبوو ڤەگوهاستن بۆ شنگال بوو، نائیبێ وی (ئیبراهیم ئەفەندی)بوو. |
| ١٥ | سەعید بەگ ئەفەندی | ١٨٩١/١٨٩٠ | نائیبێ وی (مەولود ئەفەندی)بوو. |
| ١٦ | ئیسحاق حەقی ئەفەندی | ١٨٩٢ | نائیبێ وی (صەبری ئەفەندی)بوو. |
| ١٧ | ئیبراهیم صدقی ئەفەندی | ١٨٩٢ | بۆ جارا دویێ. |
| ١٨ | مستەفا سەلیم ئەفەندی | تیرمەه ١٨٩٣ | بۆ جارا دویێ.(هاتبوو ڤەگوهاستن بۆ ئامێدیێ ). |
| ١٩ | ئیبراهیم صدقی ئەفەندی | چرییا دویێ ١٨٩٣ | بۆ جارا دویێ ، نائیبێ وی (مستەفا ئەفەندی) بوو. |
| ٢٠ | مستەفا سەلیم ئەفەندی | دویماهیكا ١٨٩٣ | بۆ جارا سێیێ، (هاتبوو ڤەگوهاستن بۆ ئامێدیێ ). |
| ٢١ | ئیبراهیم بەگ | كانوونادویێ ١٨٩٤ | بەری هنگی قائیمقامێ بازیان بوو. |
| ٢٢ | صالح بەگ كوڕێ مەحمود پاشا زادە | ئەیلوول ١٨٩٤ | ژ ماقوویلێن سلێمانیێ بوو.(بەری هنگی قائیمقامێ مەرگە)بوو. |
| ٢٣ | سەعید بەگ | كانوونادویێ ١٨٩٥ | بەری هنگی كاتب تەحریراتێ سلێمانیێ بوو. |
| ٢٤ | صالح خلووصی بەگ | بهارا ١٨٩٥ | نائیبێ وی ( مستەفا موختار ئەفەندی)بوو. |
| ٢٥ | محەممەد كامل ئەفەندی | شوباتا ١٨٩٦ | بەری هنگی قائیمقامێ كاباتا بوو، نائیبێ وی ( مستەفا موختار ئەفەندی)بوو. |
| ٢٦ | ئەمین بەگ | ناڤەڕاستا ١٨٩٦ | بەری هنگی قائیمقامێ بازیان بوو، زڤریبووڤە بازیان ڤە. |
| ٢٧ | عەساف ئەفەندی | بەری ١٨٩٨-ئادار ١٨٩٩ | |
| ٢٨ | محەممەد كامل ئەفەندی | گولان ١٨٩٩-گولان ١٩٠٠ | بۆ جارا دویێ ، نائیبێ وی ( عەبدولفەتاح ئەفەندی ١٨٩٩ ).( مستەفا موختار ئەفەندی ١٩٠٠) بوو. |
| ٢٩ | ئەحمەد بەگ | گولان ١٩٠٠ | |
| ٣٠ | حافز بەكر بەگ | بەری تەباخ ١٩٠٠ | هاتبوو ڤەگوهاستن بۆ قەزا عوسمانیە. |
| ٣١ | فوئاد بەگ | تەباخ ١٩٠٠ | بەری هنگی قائیمقامێ هیزان بوو، (دروستترە كو وی ئەركێ قائیمقامیێ ب كریار نەوەرگرتبوو). |

| ٣٢ | محەممەد شەریف ئەفەندی | شوبات ١٩٠١ | بەری هنگی موتەصەرفێ سوق الشیوخ بوو، نائیبێ وی(مستەفا مختار ئەفەندی ) بوو، پاشی هاتبوو ڤەگوهاستن بۆ ڕەواندوز. |
|---|---|---|---|
| ٣٣ | حسێن صەفوەت ئەفەندی | کانوونا ئێکێ ١٩٠١ | بەری هنگی قائیمقامێ قره بنار بوو |
| ٣٤ | عەلی ئەفەندی | کانوونا دویێ ١٩٠٢ | بەری هنگی قائیمقامێ ڤارتو بوو |
| ٣٥ | محەممەد کامل ئەفەندی | بەری گولان ١٩٠٢ | بۆ جارا دویێ، ( هاتبوو ڤەگوهاستن بۆ قەزا زەبدیە ل یەمەن). |
| ٣٦ | خۆرشید پاشا | ئەیلوول ١٩٠٢ | بەری هنگی قائیمقامێ بیت الشباب بوو |
| ٣٧ | ئەحمەد تەوفیق ئەفەندی | ١٩٠٤ | راستتر ئەوە کو ئەڤ کارە ب وەکالەت وەرگرتبوو. |
| ٣٨ | نیهاد ئەفەندی | تیرمەها ١٩٠٥-<br>کانوونا دویێ ١٩٠٧ | قائیمقامێ میلاس بوو، پاشی هاتبوو ڤەگوهاستن بۆ هەولێرێ، نائیبێ وی ( ئیسماعیل ئەفەندی)بوو. |
| ٣٩ | ئەحمەد تەوفیق بەگ | ١٩٠٧ | وەکالەت ، نائیبێ وی ( ئیسماعیل ئەفەندی) بوو. |
| ٤٠ | صەفوەت ئەفەندی | ئەیلوول ١٩٠٧ | راستتر ئەوە کو هەر ئەو حسێن صەفوەت ئەفەندی یە، بەری هنگی قائیمقامێ شاربازار بوو ، نائیبێ وی ( ئیسماعیل ئەفەندی)بوو. |
| ٤١ | عەساف ئەفەندی | چریا دویێ ١٩٠٨ | بەری هنگی قائیمقامێ شنگال بوو، بۆ جارا دویێ. |
| ٤٢ | حسێن تەلعەت بەگ | دەستپێکێن ١٩٠٩ | ب وەکالەت |
| ٤٣ | محەممەد سەعید ئەفەندی | تەباخ ١٩١٠ | |
| ٤٤ | عەلی نیازی ئەفەندی | تشرینا دویێ ١٩١٠-شوبات ١٩١٣ | |
| | پشتی هنگی هاتبوو ڤەگوهاستن بۆ صەلاحیە، نائیبێ وی (مستەفا مختار ئەفەندی)بوو. | | |
| ٤٥ | عاصم ئەفەندی | شوبات ١٩١٣ | بەری هنگی قائیمقامێ شنگالێ بوو. |
| ٤٦ | مەسعوود بەگ | هاتبوو لادان ١٩١٦ | |
| ٤٧ | صادق بەگ | تیرمەه ١٩١٦-نیسان ١٩١٧ | بەری هنگی قائیمقامێ صەلاحیە بوو |
| ٤٨ | مەزهەر بەگ | نیسان ١٩١٧ | بەری هنگی قائیمقامێ ئاکرێ بوو. |

فەرمانا ڤەگوهاستنا قائیمقامێ صەلاحیە (صادق بەگ) بۆ زاخۆ دەرکەفتبوو[١٢٦] و هەتا جەمادیلئاخر ١٣٣٥مش/نیسان ١٩١٧ێ بەردەوام بوو ل سەر وی کاری و ل مێژوویا داویێ هاتبوو لادان و قائیمقامێ ئاکرێ (مەزهەر بەگ) شوینا وی گرت[١٢٧] و هەتا سالا ١٩١٨ێ یێ بەردەوام بوو.

## سێ: ناحییێن سەر ب قەزا زاخۆ ڤە:

قەزا زاخۆ ل ماوێ ڤەکۆلینێ دا دوو ناحیان بخۆڤە دگریت ئەو ژی : (سندی گولی) و سلێڤانەی.

## ئێك: ناحیا سندی گولی:

ناڤێ ڤێ ناحیێ ژ ناڤێ هەر دو عەشیرەتان هاتییە وەرگرتن سندی و گولی یێن کو جهوار ل دەڤەرێن دکەڤنە رۆژهەلات و باکوورێ رۆژهەلاتێ قەزا زاخۆ ، و عەشیرەتا سندی عەشیرەتەکا کەڤنە کو ناڤێ وێ د ژێدەرێن ئیسلامی دا هاتی[١٢٨]، و ل سەردەمێ ئوسمانی دا رۆلێ ڤێ عەشیرەتێ زێدەبوویە هەتا وی رادەی کو ناڤێ وێ د هندەك بەلگەنامەیێن ئوسمانی دا کو ڤەدگەرنە سەدێ شازدێ - دگەل عەشیرەتا سلێڤانی- سنجەقەکا ئوسمانی بوویە و مەلبەندێ وێ بازێرێ زاخۆ بوو[١٢٩]، و ل نیڤا دویێ ژ سەدێ هەڤدێ گەرۆکڤانێ ئوسمانی (ئەولیا چەلەبی) ناڤێ وێ (سنجەق عەشیرەت) ئینایە[١٣٠] سەر ب سنجەقا زاخۆ یا بەهدینان[١٣١]، و ل سەر گوتنا کاتب چەلەبی ئەوێ کو پەرتووکا خۆ ل نیڤا دویێ ژ سەدێ هەڤدێ نڤێسی بازێرێ زاخۆ هەتا وی دەمی ژی ب ( ویلایەتا سندیان) دهاتە نیاسین[١٣٢]، و ئەڤ ڤەگێرانە کاریگەریا ئەڤێ عەشیرەتێ ل سەر بازێرێ زاخۆ دیاردکەت.

و هندیکە عەشیرەتا گولی یە ئەوا جهوار ل هەڤسویا عەشیرەتا سندی و هەتا رۆژهەلاتێ وێ، دروستترە کو ئەو لقەك بوویە ژ عەشیرەتا سندی ، و کەڤنترین ناڤ ئینانا وێ ب شێوەیێ ) کوما گولیان(یا سەر ب سنجەقا (سندی سلێڤانی) ڤەدگەریتەڤە بۆ سەدێ شازدێ[١٣٤].

ب شێوەیەکێ دەستنیشانکری دەمێ دامەزراندنا ناحیا سندی گولی ناهێتە زانین و جهێ ڤان هەر دوو عەشیرەتان دناڤ سیستەمێ کارگێری دا ل قەزا زاخۆ ناهێتە زانین، و هەر چ یا بەردەست دناڤ ژێدەران دا پێزانینێن کورت و پرت و بەلاڤن کو وێنەیەکێ رۆهن و ئاشکرا نادەنەمە ل سەر ڤی بابەتی، بۆ نموونە ل سالا ١٨٥٤ێ ناڤێ (فارس ئاغا) سەرۆکێ بەرێ بۆ (ناحیا گولی) هاتییە[١٣٥]،بەلێ پا ب شێوەیەکێ ڤەبڕ ناهێتە زانین ئایا ئەڤ پەیڤا (ناحیە) نیشانەکا کارگێری یە یان بتنێ دەربرینە بۆ ئاماژەدانێ بو دەڤەرەکا دەستنیشانکری.

هەر چەوا بیت هندیکە کەڤنترین ئاماژەدانە بۆ هەبوونا ناحیێ بناڤێ (سندی گولی) ل قەزا زاخۆ سەر ب سنجەقا مووسل ڤەدگەریتەڤە بۆ سالا١٨٨١[١٣٦]، و ئەڤ ناحیە مایەڤە وەك ناحیەکا سەر ب زاخۆ هەتا سالا ١٨٨٤ چونکە ناڤێ وێ دناڤ سالناما دەولەتا ئوسمانی دا هاتی ل سالا ١٣٠١مش/١٨٨٤ز[١٣٧].

ل سالا ١٨٨٥ێ ناحیا سندی گولی ژ قەزا زاخۆ هاتبوو ژێڤەکرن و ب قەزا بیت الشباب ڤە هاتبوو گرێدان ئەوا سەر ب ویلایەتا هەکاری ڤە[١٣٨]، و ب شێوەیەکێ دەست نیشانکری ئەگەرێ گرێدانا ناحیێ ب قەزا بیت الشباب ڤە نەهاتییە زانین، و یا سەیر کو ئەڤ ناحیەیە ژ قەزا زاخۆ یا کو دکەڤیتە ل تەنشتا وێ بێتە ڤەبرین و ب قەزایەکا دیتر ڤە بێتە گرێدان کو ب چەندین کیلومەتران ژێ دویر، و دناڤبەرا وان دا ناڤبرێن سرۆشتی ژ چیا و رووباران هەنە!، لێ بەلگەنامەیەکا ئوسمانی ئاماژە ددەت کو ئەڤ پێرابوونە ژ ئەنجامێ ناکۆکیێ دناڤبەرا مدیرێ ناحیا سندی گولی و بەرپرسێن کارگێرێن زاخۆ پەیدا بوویە، د بەلگەنامەیەکا کو ل رەمەزانا ١٣٠٢مش/ خزیران ١٨٨٥ێ هاتییە نڤێسین تێدا پێزانین ل دۆر گلە و گازندەیێن سەرۆکێ ناحیا سندی گولی (عەبدی ئاغا) ژ هندەك بەرپرسێن کارگێری یێن ل زاخۆ دیار کرینە، و عەبدی ئاغای د گازندەنامەیا خۆ دا داخوازکریە کو ناحیا وی ژ قەزا زاخۆ بێتە ژێڤەکرن و ب قەزا بیت الشباب ڤە بێتە گرێدان[١٣٩].

دسالنامێن ١٣٠٣- ١٣٠٥/ ١٨٨٦- ١٨٨٧ز دا ناڤێن

دوو ناحیان (سندی) و (گولی) ب سیفەتا دو ناحییێن سەر ب قەزا بیت الشباب ڤە یا کو گرێدا سنجەقا هەکاری[140]، بەلێ پا هەڤدژی و نەرێکی د پێزانینێن سالنامەیان دا دیاردبن ئەو ژی دەمێ کو سەحدکەینە ناڤێ ڤێ ناحیێ د لاپەرێن دیتر دا ژ هەمان سالنامەیان هاتییە دیارکرن لێ ڤێ جارێ ئێك ناحیە بوویە ئەو ژی ناحیا(سندی) کو سەر ب قەزا زاخۆ گرێدای سنجەقا مووسل بوویە[141]! و دراستی دا بەلگەنامەیێن ئوسمانی دوویات دکەن کو ئەڤ دەڤەرە ئێك ناحیە بوویە ب ناڤێ (سندی گولی) و هەتا سالا ١٨٩٣ سەر ب قەزا بیت الشباب بوو - هەر وەکی دێ پاشی دیارکەین-.

ل ڤێرێ دیار دبیت کو هندیکە گرێدانا ناحیێ بوویە ب قەزا بیت الشباب ڤە ئەڤێ چەندێ ل دەڤەرێ نەرحەتی و نەئارامییەك بۆ ئاکنجیبوویان و رێڤەبەرێن ئوسمانی پەیداکریە، لەوما بۆ ڤێ چەندێ داخوازی بۆ جڤاتا کارگێری یا ویلایەتا مووسل هاتنە بلندکرن، تێدا داخواز هاتبوو کرن ب دوبارە ڤەگەراندنا گرێدانا ناحیێ ب قەزا زاخۆ ڤە، و ل سەر ڤێ داخوازێ ل رۆژا ٤ رەبیع ئەلئاخر ١٣٠٩مش/ ٦ چریا دویێ ١٨٩١ز وەزارەتا ناڤخۆ داخواز ژ جڤاتا کارگێریا ویلایەتا مووسل کربوو کو ئەگەرێن پێدڤی دیاربکەتن بۆ دوبارە گرێدانا ناحیا سندی گولی ب قەزا زاخۆ ڤە، هەر وەسا داخواز ژێ کربوو پێزانینان ل دۆر جهێ جوگرافیێ ناحیێ و ژمارا خەلکێ وێ و چەندایەتییا بەرهەم و پێچێبوونێن وێ.

د بەرسڤا ڤان پرسیاران، جڤاتا کارگێریا ویلایەتا مووسل دیارکربوو کو هندیکە ناحیا (سندی گولی) یە سێ چارێکێن دەمژمێرێ ژ زاخۆ دویرە، و دویرترین جهێ ناحیێ ژ مەلبەندێ قەزا زاخۆ دناڤبەرا ٥- ٦ دەمژمێرایە، لێ دناڤبەرا٢٠-٣٠ دەمژمێران ژ مەلبەندێ قەزا بیت الشباب دویرە، و ژمارا خەلکێ ناحیا ناڤهاتی ژ رەگەزێ نێر ب شێوەکێ تەخمینکری (٣٠٠٠)کەسن، و بەرهەمێ وێ (٥٤٧٨)قرووشن، و هەر وەکی جڤاتێ دیارکری کو ب ئەگەرێ دویراتیا وێ ژ مەلبەندێ ویلایەتا هەکاری رێڤەبرنا وێ و زالبوونا ل سەر سیستەمێ دناڤ وێ دا یا ب زەحمەتە (و ئەو چ رێکەچارەیەکا دیتر نابینن بۆ چارەسەری یا ئاریشا ناحیێ ژ بلی دوبارە گرێدانا وێ ب قەزا زاخۆ ڤە)[142].

د بەلگەنامەیەکا دیتر دا هندەك پێزانینێن دیتر ل دۆر گرێدانا ناحیا سندی گولی ب قەزا زاخۆ ڤە هاتینەدیارکرن ئەو ژی هەبوونا جوداهیێن سنووری دناڤبەرا کارگێریا قەزایێ و کارگێریا ناحیێ دا ئەو ژی ب ئەگەرێ تێکەلیا دناڤبەرا سنوورێ کارگێریێ هەردو یەکەیان و بۆ چارەسەریا ڤێ ئاریشێ ژی پێشنیازا گرێدانا ناحیێ ب قەزا زاخۆ ڤە هاتەکرن[143].

ل رۆژا ١٩ زیلحیجە ١٣٠٩مش/١٩ تیرمەها ١٨٩٢ دنامەیەکا دیتر دا ژ مدیرێ رێڤەبەریا ئەرکانا شەری (رزا پاشا) رەزامەندی هاتبوو کرن ل سەر بابەتێ دوبارە گرێدانا ناحیا سندی گولی ب قەزا زاخۆ ڤە[144].

ب پشت بەستن ل سەر یا بوری ل رۆژا ٢٦رەبیع ئەلئاخر ١٣١٠مش/ ١٦ چریا دویێ ١٨٩٢ز جڤاتا شورایا دەولەتێ ب سەرۆکاتییا صەدرلئەعزەم (ئەحمەد جەودەت پاشا) بریارەك دەرئێخستبوو کو مورا صەدرلئەعزەم و جڤاتا وەزیران و ئەرکانێن دەولەتێ ژی ل سەرە تێدا هاتبوو دیارکرن کو ناحیا (سندی گولی) ژ قەزا بیت الشباب بێتە ڤەقەتاندن و بێتە گرێدان دگەل قەزا زاخۆ یا سەر ب ویلایەتا مووسل[145]. و ل ٩ شەعبان ١٣١٠مش/ ٢٥ شوبات ١٨٩٣ فەرمانا سولتانی سەبارەت برینا پەیوەندیێ دناڤبەرا ناحیا سندی گولی و بیت الشباب و گرێدانا وێ ب قەزا زاخۆڤە دەرکەفت[146].

ناحیا سندی گولی هەتا سالا ١٩١٨ێ دمینیتە سەر ب قەزا زاخۆ ڤە، بەلێ پا یا سەیر ئەوە کو سالنامێن دەولەتا ئوسمانی هەر ژ ١٨٩٣ تا ١٩٠٩ بتنێ ئاماژێ بۆ ناحیا سلێڤانی دکەن و ناڤێ ناحیا سندی گولی وەك ناحیەکا سەر ب قەزا زاخۆ ڤە نەهاتییە[147]! ئەو نەبیت کو سالنامەیا ویلایەتا مووسل ناڤێ سندی گولی ئینایە یا کو ٧٢ گوندان بخۆڤە دگریت و مدیرێ وێ یێ (فەخری) عەبدی ئاغا بوویە هەر ژ سالا ١٣١٢مش/١٨٩٤ز[148].

دناڤ رووادنێن هەیڤێن نیسان و گولانا سالا ١٩٠٠ێ


١٠٥٩٩

ناڤێ عەبدی ئاغای وەك سەرۆکێ ناحیا سندی گولی هاتییە[149]، و ل جەمادیلئەول ١٣٢١مش/ تیرمەها ١٩٠٣ز عەبدی ئاغای نامەیا رێزگرتنێ (تەلتیفنامە) و نیشان ب دەست خوڤەئینابوو ژ بەر خزمەتگوزارییا وی ل ناحیا سندی گولی[150].

ل سالا ١٩١٥ێ دامەراندنا ناحیا سندی گولی سەر ژنوی هاتەپێکئینان و ٥٥ گوند بخوڤە دگرتن و گوندێ (مارسیس) بۆ مەڵبەندێ وێ، ل ٢٦ رەبیع ئەلئەول ١٣٢٣ مش/ ئادارا ١٩١٥ز د راپورتا بریکارێ والیێ مووسل دا ئەوا بۆ وەزارەتا ناڤخۆ هاتییە ڤرێکرن پێزانین ل دۆر نیازا کارگێریا ویلایەتا مووسل ل سەر دوبارە دامەزراندنا ناحیێن سندی گولی و سلیڤانەی هاتینە، و د راپورتێ دا بریکارێ ژێکوتی ناڤێن ٥٥ گوندان ئینانە کو سەر ب ناحیا سندی گولی بوون و پێشنیاز هاتییە کرن کو گوندێ (مارسیس) ببیتە مەڵبەندێ ناحیێ[151]، و ل هەیڤا جەمادی ئەلئاخر ١٣٣٣مش/ نیسان ١٩١٥ رازەمەندی ل سەر ڤێ پێشنیازێ دەرکەفت[152]، و ناحیە ل سەر ڤێ رەوشێ یا بەردەوام بوو هەتا سالا ١٩١٨ێ.

**خشتەیێ جهێ سندی گولی ددابەشکرنێن کارگێری یا ئوسمانی دا**

| مێژوو | ناڤێ ناحیێ | قەزا | سنجەق | ویلایەت |
|---|---|---|---|---|
| ١٨٨١-١٨٨٤ | سندی گولی | زاخۆ | مووسل | مووسل |
| ١٨٨٥-١٨٨٩ | سندی گولی | بیت الشباب | هەکاری (جولەمێرگ) | هەکاری |


موصل

OSMANLI ARŞİVİ
DH.İ.UM.EK
32 | 23 | 2

| ١٨٨٩-١٨٩٣ | سندی گولی | بیت الشباب | هەکاری | وان |
|---|---|---|---|---|
| ١٨٩٣-١٩١٨ | سندی گولی | زاخۆ | مووسل | مووسل |

## دوو: ناحیا سلێڤانەیی:

ناڤێ وێ ژ ناڤێ عەشیرەتا سلێڤانەی هاتییە وەرگرتن ئەوا کو جهوار ل دەڤەرێن دکەڤنە ل باشوورێ قەزا زاخۆ، سلێڤانەیی ل دەستپێکا سەردەمێ ئوسمانی مەڵبەندەک بوویە بۆ زەعامەتا کوردی، و ناڤێ وێ دگەل عەشیرەتا سندی هاتییە وەک دو عەشیرەتێن سەرەکی دناڤ دەڤەرێ دا[153]، و ل سەدێ شازدێ دگەل عەشیرەتا سندی سنجەقەک پێکئینایە بناڤێ ( سندی سلێڤانی) و مەڵبەندێ وێ باژێرێ زاخۆ بوویە[154]، و ل نیڤا دویێ ژ سەدێ هەڤدێ گەرۆکڤانێ ئوسمانی (ئەولیا چەلەبی) ناڤێ وێ ئینایە و ب دووەم بهێزترین عەشیرەتا زاخۆ هژمارتییە کو ل ئاستێ (عەشیرەت سنجەقی) بوویە سەر ب سنجەقا زاخۆ ڤە[155].

جیاواز ژ عەشیرەتا سندی، پێزانین ل دۆر عەشیرەتا سلێڤانی ل ماوێ ڤەکۆلینێ دا زۆر دکێمن، و ئێکەم ناڤ ئینانا وێ وەک ناحیەکا سەر ب قەزا زاخۆ ڤەدگەریتەڤە بۆ سالا ١٣٠٦مش/١٨٨٩ز[156]، و سلێڤانەی ناحیا ئێکانەبوویە یا سەر ب قەزا زاخۆ هەتا سالا ١٨٩٣ دەمێ ڤەگەراندنا گرێدانا ناحیا سندی گولی ب قەزا زاخۆ ڤە- هەر وەکی مە ئاماژەدایێ- بەلێ یا یا سەیر ئەوە کو سالنامێن ئوسمانی یا دبەردەوام بووینە ل سەر ناڤ ئینانا ناحیا سلێڤانەی وەک ناحیا ئێکانە یا سەر ب قەزا زاخۆ هەتا سالا ١٩٠٩! ودیار کرینە کو ناحیە ژ ١٠٩ گوندان پێکدهێت و ل سالا ١٣٢٧مش/١٩٠٩ هژمارا گوندێن ناحیا سلێڤانەی زێدەبوون بۆ ١١٠ گوندان[157].

بەروڤاژی سالنامێن (دەولەتا ئوسمانی)، سالنامەیا (ویلایەتا مووسل) یا سالا ١٣١٢مش/١٨٩٤ز ناڤێ ناحیا سلێڤانەی نەئینایە و ناڤێ ناحیا سندی گولی ئینایە و ب ناحیا ئێکانەیا سەر ب قەزا زاخۆ هژمارتییە[158]،و ئەڤ چەندە نیشانە بۆ هەبوونا نەرێکی و پەریشانی و نەبوونا هەماهەنگیێ دناڤبەرا ئامادەکەرێن سالنامێن دەولەتێ و سالناما مووسل دا، بەلێ ل ١٣٢٥مش/١٩٠٧سالناما مووسل بەحسێ (سلێڤانەی)کریە و بۆ ئێکەم جار ناڤێ سلێڤانەی دگەل سندی گولی ئینای کو هەر دو ب دو ناحیێن سەر ب قەزا زاخۆ هژمارتیە[159]، و ئەڤە ئێکەم جار بوویە کو ئێک ژ بەلاڤوکێن ئوسمانی بەحسێ هەبوونا دو ناحیێن سەر ب زاخۆ بکەتن و نە ئێک ناحیی بتنێ ! ئانکو هەمی بەلاڤوکێن بەرێ بتنێ ناڤێ ئێک ناحیێ دئینن ئەڤجا چ سندی گولی یان سلێڤانەی[160].

و ل سالا ١٩١٥ێ هەڤدەم دگەل دوبارە دامەزراندنا ناحیا سندی گولی ناحیا سلێڤانەی ژی ژنوی هاتە دامەزراندن، ل ٢٦ رەبیع ئەلئەول ١٣٢٣ مش/ ئادارا ١٩١٥ز د راپورتا بریکارێ والیێ مووسل دا هاتییە ئەوا بۆ وەزارەتا ناڤخۆ هاتییە ڤرێکرن پێزانین ل دۆر نیازا کارگێریا ویلایەتا مووسل ل سەر دوبارە دامەزراندنا ناحیا سلێڤانەی دگەل مانا ب قەزا زاخۆ ڤە هاتینە پێشکێشکرن ، و دراپورتێ دا ناڤێن ٤٤ گوندان هاتینە کو ڤەگەراندی بن بۆ ناحیا سلێڤانەی و هاتییە پێشنیازکرن کو گوندێ (گرشین) ببیتە مەڵبەندێ ناحیێ ،ئەڤ چەندە ژی ژ بەر جهێ وێ یێ گونجایی کو دکەڤیتە ناڤەراستا ئەردێ دەشتایید[161].

و ل هەیڤا جەمادی ئەلئاخر ١٣٣٣مش/ نیسان ١٩١٥ رازەمەندی ل سەر دامەزراندنا ناحیێ دەرکەفت[162]و ناحیە هەتا سالا ١٩١٨ێ ل سەر ڤێ رەوشێ یا بەردەوام بوو.

## دەرئەنجام

پشتی ڤەکۆلینا وەرارا جهێ قەزا زاخۆ ددابەشکرنێن کارگێریا ئوسمانی دا، ڤەکۆلین گەهشتە ڤان دەرئەنجامان:

١- زاخۆ ژ باژێرێن بەهدینان یێن گرنگە و گەهشتبوو ئاستێ (یورتلق و ئوجاقلق) د

چارچووڤێ حكۆمەتا بەهدینان دا، ئانكۆ ئەو سەر ب پایتەختا میرگەهێ ڤە بوو، كو هەر ژ دەستپێكێ ب شێوەیەكێ نەراستەوخۆ ل بن زالبوونا ئوسمانییا دا بوو، بەلكە بۆ ڤێ چەندێ كو دەولەتا ئوسمانی داهاتێ زاخۆ توومار دكر و باج ل سەر دهاتە سەپاندن.

٢- پشتی كەفتنا میرگەها بەهدینان ل ١٨٤٢ زاخۆ مابوو ل ئاستێ سنجەقێ، كو ب شێوەیەكێ ڕاستەوخۆ سەر ب مەڵبەندێ ویلایەتا ئوسمانی ڤە بوو.

٣- زاخۆ هەر ژ سالا ١٨٥٢ ل ئاستێ قائیمقامیێ بوو، كو ئەڤ ئاستە تووشی هەلكێشان و داكێشانێ دبوو، ل سالا ١٨٥٣ێ ئاستێ وێ بلندببوو بۆ ئاستێ سنجەقێ بۆ ماوەیەكێ كورت، بەلێ پا سەرۆكێ كارگێرییا وێ ب سیفەتێ قائیمقام و (هندەك جاران ڕێڤەبەر) بوون، وئەڤ هەردو ئاستە ژ ئاستێ موتەصەرفی نزمتر بوون.

٤-دەولەتا ئوسمانی وەك یەكەیەكا ئێكگرتی ڕەفتار دگەل ئەردێن میرگەها بەهدینان نەدكر ، لەوما زاخۆ ئێخستبوو سەر ب ویلایەتا كوردستان ڤە و پشكێن دیتر ب ویلایەتا وان و هەكاری ڤە گرێداینە، ب هەمان شێوە دەولەتێ ڕەفتار دگەل قەزا زاخۆ ژی دكر، بۆ نموونە ئێك ژ ناحیێن وێ ئەو ژی (سندی گولی) هندەك دەمان و ب قەزایەكا دیتر ڤە هاتبوو گرێدان.

٥- د زنجیرە و ڕێزبەندا قائیمقامێن قەزا زاخۆ دا ماوەیێ كورت یێ ڕێڤەبرنێن وان دهێتە تێبینی كرن، و ئەڤ چەندە بەلگەیە ل سەر هەبوونا نەبوونا بەرقەراربوونا كارگێری دناڤ قەزایێ دا، هەر وەكی ئەڤ چەندە ڤەدگەریتەڤە بۆ ڕەوشا كارگێری یا گشتی یا دەولەتێ یا كو تووشی لاوازیێ كری ژ ئەنجامێ بەلاڤبوونا گەندەلییا یا كارگێری.

## ژێدەر


١. شرفخان البدلیسی، شرفنامە، ترجمە: محمد جمیل الرۆژبیانی،موكریانی،(اربیل: ٢٠٠٢)، ص ٢٥٦.

٢. دار زادە، تواریخێ لعثمان، نسخە مكتبە علی امیری فی استانبول،رقم:٢٠٦، ورقە ٢٨٢؛خوجە, سعدالدین، تاج التواریخ، طبعخانە عامرە، (استانبول: ١٢٧٩)، س٣٠١.

٣. البدلیسی، المصدر السابق، ص ٢٥٨.

٤. فەرمان بۆ والیێ دیاربەكر ل ٨ ژی القعدە ٣٠/٩٦٧ تموز ١٥٦٠. دفتر مهمە رقم: ٣، حكم رقم: ٢٣٤، ص ١٠٠.

٥. حكومت: ئەو سنجەقن كو مەزنترین ئاستێ سەربخویێ هەی ، كو ژ لایێ خێزانێن كوردی یێن حوكمدار ڤە دهێنە ڕێڤەبرن یێن كو لایەنگیرییا خو بۆ دەولەتا عوسمانی ڕاگەهاندی پشتی شەرێ چالدێران، یان یێن كو لایەنگیرییا خۆ دیاركری ل دەمێ هەوێن عوسمانی ل سەردەمێ سۆلتان سلێمانێ قانوونی، و ئەڤ سنجەقێن هەنێ دناڤ دەفتەرێن فەرمی دا بناڤێ (حكومت) دهاتنە توومارکرن و سەرۆكێ كارگێری بۆ ڤان سنجەقان دهاتنە ناڤكرن ب (حاكم). بنێڕە: عینی علی افندی، قوانین ێل عپمان در خلاصە مجامین دفتر دیوان، تصویر أفكار غزتە خانە سی، (استانبول: ١٢٨٠هـ)، ص ٣٠. هەر وەسا بنێڕە: Kiliç, 18 Yüzyilin Ilk Yarisinda Osmanli Devletinin Idari Taksimati (Eyalet ve Sancak Tevcihati), Elaziğ: 1997, s.10.

٦. Ahmet Gunduz, Osmanli Idaresinde Musul, Doktora Tezi, Sosyal Bilimler Enstitusu, Firat Univesitesi, Elazig: 1998, s. 241-242.

٧. فەرمان بۆ میرێ هەكاری زەینەل بەگ ل شوال٩٨١هـ/ كانون الپانی ١٥٧٢م. دفتر مهمە رقم: ٢٣، حكم رقم: ٦٢٨، ص٢٩١.

٨. فەرمان بۆ میرێ جزیرێ بەدر بەگ ل ١٠ جمادی الأول ٩٨٣/ ١٦ ێب ١٥٧٥م. دفتر مهمە: ٢٦، حكم رقم: ٦٥٤، ص٢٢٨.

٩. Kamil Kepeci- Ruus Defteri (KK.d), Defter no. 262, S.128;

۱۰. فەرمان بۆ میرێ زاخۆ بەهرام بەگ ل ۳ ربیع الاول ۹۹٤هـ/ ۳۱ کانون الثاني ۱۵۸۸م. دفتر مهمه رقم: ٦۰، حکم رقم: ٥١٤، ص٢١٧.

۱۱. فەرمانا بو پارێزڤانێ دیاربەکر وەزیر دلاوەر پاشا ل۱۱ ربیع الثانی ۱۰۲۵هـ/ ۲۷ نیسان ۱٦۱٦م. دفتر مهمه رقم:۸۱، حکم رقم:۱۵۸.

۱۲. Abdullah Demir, Osmanli Arşivi Belgelerine göre 16. ve 17. yüzyillarda Zaho tarihi.

۱۳. بۆ نموونە بنێرە : KK.D , no 262, s.128، فەرمانا بۆ میرێ هەکاری زەینەل بەگ ل شوال۹۸۱هـ/ کانون الثاني ۱۵۷۲م. دفتر مهمه رقم، ۲۳، حکم رقم: ٦٢٨، ص۲۹۱.۲٤۱S ,Gunduz, A.G.E. علی شاکر علی، ولایه الموصل فی القرن السادس عشر، أطروحة الدکتوراه، کلیه الآداب، جامعه الموصل: ۱۹۹۲، ص۱۱٤.

۱٤. علی، ژێدەرێ بەرێ، ص ۱۱٤.

۱۵. هەمان ژێدەر.

۱٦. خلیل ساحلی اوغلو، من تاریخ الاقطار العربیة في العهد العثمانی، ارسیکا، (استانبول: ۲۰۰۰)، ص٥٠٤.

۱۷. فەرمانا بۆ والیێ دیاربەکر ل ۹۹٦مش/ ۱۵۸۸ز. دفتر مهمه رقم، ٦٤، حکم رقم، ۲۹۱، ص۱۰۷.

۱۸. Gunduz, A.G.E, s.46-47.

۱۹. Evliya çelebı sıyahatnamesi, hazirlayanlar، Seyit Ali Kahraman, Yucel Dağli, (Istanbul،2000), s.304.

۲۰. (یورتلق وئوجاقلق): ناڤەکە دهێتە دانان ل سەر سنجەقێن ب حوکمێ ویراسی، دژێدەران دا پێناسەیا ڤان سنجەقان ب ڤی رەنگی هاتیە کرن: ئەو سنجەقن یێن کو دهێنە ئاراستەکرن بۆ هژمارەکا ژ میرێن کورد ل دەمێ ڤەکرنێ، ئانکۆ سنجەقێن عوسمانی نە بەلێ جوداهی ئەوە حوکم دناڤ دا ویراسی یە و میرێن وێ ملکەچ نینن بۆ لادان و دانانێ، و ل دەمێ مرنا میری حوکم دهێتە ڤەگوهاستن بۆ ئێك ژ کورێن وی، و دەرگەهێن داهاتێ وێ دهێنە ئامار و توومارکرن، و دناڤ دا زەعامات و تیمار یێن هەین (٦)، ئانکۆ رێنماییێن دەرەبەگایەتیا لەشکەری یا عوسمانی دناڤ دا دهێتە ب جهـ ئینان، وددەمێ شەڕان دا میرێ وێ پشکداریێ دکەت دگەل میرێن سنجەقێن دیتر یێن ل ژێر ئالایێ والیێ ویلایەتێ، و دەمێ میری سەرپێچی یا ڤی ئەرکی کر دەولەت دێ ڕابیت ب لادانا وی و حوکمی دەتە دەستێ کەسەکێ دیتر ژ هەمان خێزان، و دەمێ د حالەتێ کو چ کەس دخێزانێ دا نەبن ، سنجەق دێ هێتە ئاراستەکرن بۆ میرەکێ عوسمانی و دێ سنجەق هێتە ڤەگوهاستن بۆ سنجەقەکا عوسمانی (یا راستەوخو) و دێ هەمی یاسا و پێڕابوونێن عوسمانی دناڤ دا ب شێوەیەکێ ڕاستەوخۆ هێنە جێبەجێکرن. بنێرە، Hezarfen Huseyin Effendi, Telhisul-Beyan Fi Kavanin-i Al-i Osman, Hazirlayan، Sevim Ilgurel, Turk Tarih Kurumu, (Ankara،1998), s.132

۲۱. Eyni Eser, s.305.

۲۲. بنێرە ، Kiliç,Orhan, 18 Yüzyilin ilk yarisinda Osmanli Devletinin Idari Taksimati (Eyalet ve Sancak Tevcihati), Elaziğ، 1997, s.70.

۲۳. Eyni Eser, s.73.

۲٤. Fatih Gencer, Merkezyetci Idari Duzenlemeler Bağlaminda Bedirhan Olayi, Doktora Tezi, Sosyal Bilimler Enstitusu, Tarih Anabilim Dali, Ankara Universitesi, 2010, s.78.

۲۵. Mehmet Zeki Pakalin, Osmanli Tarihi Deyimleri ve Terimleri sozluğu, devlet kitaplari, (Istanbul،1983), Cilt،2, s.639.

۲٦. A-MKT, D.no13, G.no 71.

۲۷. Pakalin. A.G.E, Cilt،2 s.586.

۲۸. ل دۆر رەوشا بەهدینان ل پشتی کەفتنا میرگەهێ بنێرە، کامیران عبدالصمد الدۆسکی، بهدینان فی أواخر العهد العثمانی ۱۸۷٦-۱۹۱٤، بنکەی تۆیژنەوە، (اربیل: ۲۰۰۷)،ص٤٧-٥٠.

۲۹. Kurt Tarihi Arismalari, A.G.E s.100-101.

۳۰. ل سالا ۱۸٤۸ێ ئامێدیێ و ئاکرێ ب ویلایەتا هەکاری ڤە هاتبوونە گرێدان و زاخۆ هەر مابوو سەر ب ویلایەتا مووسل.

بنێرە؛الدۆسكى، ژێدەرێ بەرێ،ص ٤٨.

٣١. ناڤێ زاخۆ ب شێوەکێ ڕاستە ڕاست دهەمی سالنامەیێن عوسمانی دا نەهاتیە هەتا سالا ١٨٥٦ێ، هندیکە هەبوونا سنجەقا مووسل بوویە ل ویلایەتا کوردستان ئەڤە بەلگەیە کو زاخۆ ژی هەر سەر ب ویلایەتا ناڤهاتی بوویە، بنێرە؛Osmanli Kurdistan, s99-108.

٣٢. Irade- Meclisi Vala (I.MVL). D.no.235, G. no.8214.

٣٣. I.MVL. D.no.254, G.no.9273-3.

٣٤. Sararat- Mektubi Meclisi Vala. (A- MKT. MVL), D.no.254, G.no. 9374-1.

٣٥. I.MVL, D.no.259, G.no.30.

٣٦. Sararat- MektubiUmumi Vilayet, (A-MKT. UM). D. no 127, G.no.22.

٣٧. سالنامە دولت عليە، دفعە؛8، سنە ١٢٧٠هـ، ص٨٢.

٣٨. Kurt Tarihi Arismalari, Osmanli Kurdistan, bgst Yay inlari, Istanbul: 2011, s. 105-106.

٣٩. بنێرە؛ سالنامە كوردستان عام ١٢٧٢هـ/١٨٥٦م؛Osmanli Kurdistan , s.109.

٤٠. سنجەقا ماردین ژ ڤان قەزایا پێك دهات؛ مەڵبەندێ ماردین، قوچ حصار، زاخۆ، جزيره العمرية، نصيبين، نواحى عاليات، ازتاور، بوهتان، حاجى بەهرام، مديار، صاور، سورکجى و عمرکان. بنێرە؛سالنامە دولت عليە، دفعە؛١٠، سنە ١٢٧٤هـ/ ١٨٥٧م، ص ١١٣؛ سالنامە دولت عليە، دفعە؛ ١٢، سنە ١٢٧٦هـ/ ١٨٥٩م، ص١١٣.

٤١. Osmanli Kurdistan , s109-126.

٤٢. بۆ نموونە بنێرە؛سالنامە دولت عليە، دفعە؛١٠، سنە ١٢٧٤، ص١١٣؛ سالنامە دولت عليە، دفعە؛ ١٢، سنە ١٢٧٦هـ ص١٤٤.

٤٣. A-MKT, MVL, D.no.120, G.no. 36.

٤٤. هەر ژ سالا ١٨٥٦ێ مووسل سنجەقەکا سەر ب ویلایەتا وان بوو، و ل سالا ١٨٦٧ێ ژ ویلایەتا وان هاتبوو ژێڤەکرن و ب ویلایەتا بەغداد ڤە هاتبوو گرێدان. بنێرە؛ Mehmet Zeydin Yildiz, XIX. Yuzyilinda Hakkarinin Idari Yapisi, s.13.

٤٥. سجى قحطان محمد على، الإدارە العثمانيە فى الموصل ١٨٣٤-١٨٧٩، رسالة ماجستير، كليە الاداب، جامعة الموصل، ٢٠٠٢، ص٥٢.

٤٦. بنێرە؛ سالنامە دولت عليە، دفعە؛ ٢٤، سنە ١٢٨٦هـ ص٢٠٣.

٤٧. هەر وەسا؛جميل موسى النجار، الاداره العثمانية في ولاية بغداد، دار الشؤون الثقافيه العامية، (بغداد؛ ٢٠٠١)، ص١١٧.

٤٨. محمد على، ژێدەرێ بەرێ، ص٥٤.

٤٩. ل ڤێرێ گەلەك بەلگەنامە ل سەر ڤێ چەندێ دناڤ بەلگەنامێن عوسمانی دا یێن هەین، بۆ نموونە بنێرە ؛ قانوننامە السلطان سليمان القانونى لعام ١٥٢٢ ناڤێن هژمارە باژێر و باژێرکێن کوردی تێدا هاتینە وەك (قەزایێن سەر ب ویلایەتا دیاربەکر) بنێرە؛ Çakar, Enver, Kanuni sultan Suleyman Kanun-namesine göre 1522 yilinde Osmanli Imparatorluğunda Idari Taksimati, Firat Üniversitesi Sosyal Bilimleri Dergisi, cilt.12, no.1, (Elaziğ:2002), s277-278.

٥٠. Gencer, A.G.E, s78.

٥١. A.MKT, D.no 13, G.no 71.

٥٢. Gencer, A.G.E, s.176.

٥٣. Sararat- Mektubi Kalami Nazarat ve Devayir, (A.MKT, NZD), D.no.57, G. no.2-1.

٥٤. A.MKT, NZD, D.no.64, G. no.77-1.

٥٥. جڤاتا والا: ل ٢٧ زيلحججە ١٢٥٣مش/ ٢٤ ئادار ١٨٣٨ز هاتبوو دامەزراندن ئەو ژ وان دام و دەزگەهانە یێن کو هاتینە دامەزراندن ل ماوێ ڕێکخستنێن عوسمانی دا و کارێ بنیاتی و سەرەکی دەرئێخستنا یاسایێن نوی بە و دادگەهکرنا فەرمانبەرێن حکومی و ل دەمێن پێدڤی دانا ڕێنما و شیرەتکاریان بۆ دەولەتێ. بۆ زێدەتر زانیاریا بنێرە؛

Başbakanlik Devlet Arşivleri Genel Müdürlüğü, Başbakanlik Osmanli Arşivi Rehberi, Yayın

No.108, Istanbul, 2010, s.223.

٥٦. A.MKT, MVL, D.no.62, G. no.49-1.

٥٧. Sararat- Taşrifat Kalemi, (A, TF), , D.no.15, G. no.52.

٥٨. A.MKT, NZD, D.no.88, G. no.32; ATF, D.no.16, G. no.46.

٥٩. محمد ثریا ، سجل عثمانی یا خود تذکره مشاهیر عثمانی، مطبعه عامر، (استانبول: ١٣٠٨)، ج٢، ص١٧٧-١٧٨.

٦٠. بۆ زێدەتر زانیاریان ل سەر بزاڤا وی بنێرە: سینان هاکان، کورد و بەرخودانەکانی ١٨١٧-١٨٦٧،وەرگێران: بەکرشوانی،ئەکادیمیای کوردی، (هەولێر: ٢٠١٢)، ل ٢٨٨.

٦١. A.MKT, MVL, D.no.70, G. no.36-1.

٦٢. A.MKT, MVL, D.no.104, G. no.66.

٦٣. Tahir Sezen, Osmanli Yer Adilari, (Ankara: 2006), s.279.

٦٤. ناڤێ ویل صەفەرا ١٢٧٧مش/ تیرمەهـ-ئاب ١٨٦٠ز ب «قائیمقامێ‌زاخویێ بەرێ «هاتییە . بنێرە :

٦٥. A. DVN, D.no.156, G. no.15.

٦٦. A.MKT, MVL, D.no.103, G. no.88.

٦٧. A.MKT, UM, D.no.484, G. no.21.

٦٨. A.MKT, MVL, D.no.130, G. no.98.

٦٨. سالنامه ولایه بغداد، دفعه: ١، سنه ١٢٩٢، ص٨٥.

٦٩. ڤەگوهاستن ژ الدۆسكی، ژێدەرێ بەرێ، ص ٢٠٣.

٧٠. Dahiliye Mektubati, (DH. MKT), D.no.1460, G. no.20.

٧١. DH. MKT, D.no.1547, G. no.52.

٧٢. سالنامه دولت علیه، دفعه: ٤٤، سنه ١٣٠٦هـ، ص٤٥٥.

٧٣. سالنامه ولایه الموصل، دفعه: ٤٦، سنه ١٣٠٨هـ، ص١٠٨.

٧٤. سالنامه ولایه الموصل، دفعه: ٤٨، سنه ١٣١٠هـ، ص١٥٦.

٧٥. Babiali Evrak Odasi, (BEO), D.no.238, G. no.17816.

هەر وەسا بنێرە: سالنامه دولت علیه، دفعه: ٤٧، سالا ١٣٠٩هـ، ص ٤٩١.

٧٦. BEO, D.no.334, G. no.24898.

٧٧. سالنامه دولت علیه، دفعه: ٤٧، سنه ١٣٠٩هـ، ص٥٣١.

٧٨. DH. MKT, D.no.183, G. no.30.

٧٩. DH. MKT, D.no.183, G. no.39.

٨٠. DH. MKT, D.no.264, G. no.14.

٨١. DH. MKT, D.no.299, G. no.30.

٨٢. DH. MKT, D.no.327, G. no.31.

٨٣. سالنامه دولت علیه، دفعه: ٥٢، سنه ١٣١٣، ص ٥٧٨؛ سالنامه ولایه الموصل سنه ١٣١٣هـ، ص١٥١.

٨٤. DH. MKT, D.no.343, G. no.52.

٨٥. BEO, D.no.747, G. no.55982.

٨٦. سالنامه دولت علیه، دفعه: ٥٣، سنه ١٣١٤، ص١٠٩.

٨٧. BEO, D.no.844, G. no.63261.

٨٨. I.DH, D.no.1339, G. no.7-3.

٨٩. BEO, D.no.1143, G. no.85714.

.DH. MKT, D.no.217, G. no.88 .٩٠
.DH. MKT, D.no.2108, G. no.10 .٩١
٩٢. سالنامه دولت علیه، دفعه: ٥٦، سنه ١٣١٧، ص٤١٠.
٩٣. سالنامه دولت علیه، دفعه: ٥٧، سنه ١٣١٨، ص٤٥٦.
.DH. MKT, D.no.2339, G. no.113; DH. MKT, D.no.2341, G. no.85 .٩٤
.DH. MKT, D.no.2368, G. no.104 .٩٥
.DH. MKT, D.no.2339, G. no.113 .٩٦
.DH. MKT, D.no.2378, G. no.102 .٩٧
.DH. MKT, D.no.2438, G. no.105 .٩٨
.DH. MKT, D.no.2455, G. no.49 .٩٩
.DH. MKT, D.no.2460, G. no.38 .١٠٠
١٠١. سالنامه دولت علیه، دفعه: ٥٨، ١٣١٩هـ ص ٥٠٤.
.DH. MKT, D.no.2558, G. no.19 .١٠٢
.DH. MKT, D.no.2581, G. no.52 .١٠٣
.BEO, D.no.1793, G. no.134444 .١٠٤
.BEO, D.no.1860, G. no.139471 .١٠٥
.BEO, D.no.1914, G. no.143478-1 .١٠٦
١٠٧. الدۆسکی، ژێدەرێ بەرێ، ص٢٠٣.
.DH. MKT, D.no.881, G. no.27 .١٠٨
.DH. MKT, D.no.967, G. no.51 .١٠٩
.DH. MKT, D.no.999, G. no.42 .١١٠
١١١. سالنامه دولت علیه، دفعه: ٥٤، ١٣١٤، ص١٠٩.
.DH. MKT, D.no.1154, G. no.20; BEO, D.no.2975, G. no.223064 .١١٢
١١٣. سالنامه دولت علیه، دفعه: ٦٤، سنه ١٣٢٥، ص٧١٩.
١١٤. سالنامه ولایه الموصل لسنه ١٣٢٥هـ ص ١٩٧.
.DH. MKT, D.no.1202, G. no.66 .١١٥
١١٦. سالنامه دولت علیه، دفعه: ٦٥، سنه ١٣٢٦هـ ص ٧٢٦.
.DH. MKT, D.no.2632, G. no.29 .١١٧
.BEO, D.no.3436, G. no.257627 .١١٨
.BEO, D.no.3518, G. no.263831 .١١٩
.BEO, D.no.3795, G. no.284623 .١٢٠
.BEO, D.no.3819, G. no.286412 .١٢١
.BEO, D.no.4159, G. no.311873 .١٢٢
١٢٣. سالنامه دولت علیه، دفعه: ٦٧، سنه ١٣٢٧هـ ص٧٩٠؛ سالنامه ولایه الموصل ١٣٣٠هـ ص٢١٢.
.BEO, D.no.4159, G. no.311873 .١٢٤
.BEO, D.no.4414, G. no.331046 .١٢٥
ل ئادارا ١٩١٨ێ مەسعوود بەگ وەك قائیمقامێ ڕەواندوز هاتبوو دامەزراندن، بنێرە: BEO, D.no.4503, G. no.337718.
.BEO, D.no.4422, G. no.331602 .١٢٦

١٢٧. BEO, D.no.4460, G. no.334473.

١٢٨. زرار صديق توفيق، القبائل والزعامات القبليه الكردية في العصر الوسيط، موكرياني، (اربيل:٢٠٠٧)، ص١١٣.

١٢٩. فەرمانا بۆ والیێ دیاربەكر ل ٣ شوال ٩٨١هـ/٢٥ كانون الاول ١٥٧٤م، دفتر مهمه رقم: ٢٣، حكم رقم: ٦٢٧، ص٢٩٠.

١٣٠. عشیرت سنجقی:ئەو سنجەقن یێن كو كارگێریا وان دەدەستێ مەزنێن عەشیرەتێن كوردی دا، و ئەو جۆرە سنجەقە ب سنجەقێن عەشیرەتان (عشیرت سنجقی) دهێنە نیاسین، و ل وان دەڤەران دهێنە پێكئینان یێن كو پێدڤی ڤان مەزنان ژ بۆ كونترۆلكرنا ئێمناهیێ و پاراستنا سیستەمی دناڤ دا، و مەزنێن ڤێ یەكەیا كارگێری دبێژنێ (میر عەشیرەت) و پشكداریێ د شەران دا دكەت ل ژێر ئالایێ وێ سنجەق بەگیا كو ئەو لایەنگریێ دكەت، بەلێ پا دچارچووڤێ عەشیرەتا خۆ دا ب پێچێبوونێن (یورتلق یان ئوجاقلق - حوكمێ بەرەبابی/ ویراسی) هەنە ، و دەمێ مرنا وی حوكم دناڤ عەشیرەتێ دا دهێتە ڤەگوهاستن بۆ كورێن وی یان ئێك ژ نێزیكێن وی. بنێرە: مراد، خليل علي،المفهوم الاداري والجغرافي لمصطلح كوردستان في مصادر العهد العثماني،مجلة ژين،العدد:٥،السنه:٥، (سليماني:٢٠١٣)،ص٣٥.

١٣١. Evliya çeleb ı , A.G.E, Cilt: 4,S.304.

١٣٢. كاتب جلبي، جهان نما (مع ملاحق ابراهيم متفرقه)، مطبعة الاميرية، (القسطنطينيه: ١١٤٥)، ص ٣٦٧.

١٣٣. ل ڤێرێ گەلەك بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ هەین و دبیت بەرچاڤترین ژێ ئەو بیت یا كو زانا حەسەن كورێ ئەبو بەكر سندی خودانێ پەرتووكا دیوارێ عەقیدە و سیرەتێ دا پێ هاتییە نیاسین، هەر وەكی ئەوی بخو نڤیسی یە (حسن ابن ابوبكر النزدوري قريه و الكلي عشيره والسندي قبيله)، مخابن مێژوویا نڤیسینا پەرتووكێ نەهاتییە زانین ب ئەگەرا نەبوونا مێژوویەكێ ل سەر وێ دەستخەتێ، و مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداغی دیاركریە كو ئەڤ پەرتووكە ژ پەرتووكێن كەڤنە. بنێرە: القرەداغي،محمد علي، كنوز الكرد في خزائن دار المخطوطات العراقيه، الاكاديميه الكورديه، (اربيل: ٢٠١٤)، ج٢،ص٧٤.

١٣٤. فەرمانا بۆ میرێ هەكاری زەینەل بەگ ل شوال٩٨١هـ/ كانون الثاني ١٥٧٢م. دفتر مهمه رقم: ٢٣، حكم رقم: ٦٢٨، ص٢٩١.

١٣٥. DH. MKT, D.no.70, G. no.36.

١٣٦. سالنامه دولت عليه ، دفعه ٣٦، سنه ١٢٩٨هـ ص٨٨.

١٣٧. سالنامه دولت عليه، دفعه ٣٢، سنه ١٣٠١هـ ص٥٦-٥٧.

١٣٨. ئەڤ چەندە دبەلگەنامەیەكا عوسمانی دا هاتییە. بنێرە: DH. MKT, D.no.1398, G. no.17.

١٣٩. DH. MKT, D.no.1347, G. no.59.

١٤٠. ناڤێن ناحیێن سەر ب قەزا بیت الشباب هۆسا هاتینە : گولی ، سندی ، كوران ، گویان، مامخوران ، زریكی [=ژیركی]،پروسان. بنێرە: سالنامه دولت عليه، دفعه ٤١، سنه ١٣٠٣، ص٥٥؛ سالنامه دولت عليه، دفعه ٤٢، سنه ١٣٠٤، ص٥٦؛ سالنامه دولت عليه، سالنامه دولت عليه، دفعه ٤٣، سنه ١٣٠٥هـ ص٥٣.

١٤١. ناڤێن ناحیێن سەر ب سنجەقا مووسل ڤە هۆسا هاتینە : تەلەعفەر، شێخان، سندی، عشائر سبعه ، مزوری. بنێرە:سالنامه ١٣٠٣هـ ص٦٦، سالنامه ١٣٠٤هـ ص٦٨، سالنامه ١٣٠٥هـ ص٦٤.

١٤٢. I.DH, D.no.1302, G. no.32-2.

١٤٣. DH. MKT, D.no.2023, G. no.41.

١٤٤. Irade Dahiliye, (I. DH), D.no.1302, G. no.32-1.

١٤٥. I.DH, D.no.1302, G. no.32-2.

١٤٦. DH.MKT, D.no.18, G.no.10-2-2.

١٤٧. ئەڤە هەمی سالنامێن دەولەتێ یێن سالێن١٣١١-١٣٢٧مش ڤەدگریت.بۆ نموونە بنێرە: سالنامه دولت عليه، دفعه ٤٩، سنه ١٣١١، ص٥٣١؛ سالنامه دولت عليه، دفعه ٦٦، سنه ١٣٢٧هـ ص٧٩٠.

١٤٨. سالنامه ولايه الموصل، سنه ١٣١٢هـ ص ١٥٢.

١٤٩. DH. MKT, D.no.2341, G. no.85.

١٥٠. DH. MKT, D.no.881, G. no.27.

١٥١. DH, I,UM.EK, D.no.92, G. no.23-3.

١٥٢. DH, I,UM.EK, D.no.92, G. no.23-2.

١٥٣. فەرمانا بۆ والیێ دیاربکر ل ٢٢ شەعبان ٩٦٧مش/ ١٧ ئەیار ١٥٦٠ز: دفتر مهمه رقم: ٣، حکم رقم ١١٤٢، ص ٥٠٧.
١٥٤. فەرمانا بۆ والیێ دیاربکر ل ٣ شەوال ٩٨١مش/ ٢٥ کانونا ئێکێ١٥٧١ز: دفتر مهمه رقم: ٢٣، حکم رقم: ٦٢٧، ص ٢٩٠.
١٥٥. A.G.E, CILT: 4, s.304.
١٥٦. سالنامه دولت علیه، دفعه ٤٤، سالا١٣٠٦، ص٤٥٥.
١٥٧. بنێرە: سالنامات الدوله العلیه یێن سالێن ١٣١١-١٣٢٧.
١٥٨. سالنامه ولایه الموصل، سالا ١٣١٢، ص١٥٢.
١٥٩. سالنامه ولایه الموصل، سالا ١٣٢٥، ص١٩٧.
١٦٠. دسالنامێن دەولەتێ دا یێن سالێن ١٣٠٦-١٣٢٧مش/ ١٨٨٩-١٩٠٧زبتنێ ناڤێ ناحیا سلێڤانی هاتییە، و دسالنامەیا مووسل یا سالێن١٣٠٨-١٣١٠مش/ ١٨٩٠-١٨٩٢ز ناڤێ چ ناحیێن سەر ب قەزا زاخۆ نەهاتینە، و سالناما مووسل یا سالا ١٣١٢مش/١٨٩٤ز بتنێ ناڤێ ناحیا سندی گولی هاتییە.
١٦١. DH, I,UM.EK, D.no.92, G. no.23-3.
١٦٢. DH, I,UM.EK, D.no.92, G. no.23-2.

# کورتە دیرۆکا باژێرێ ئامێدیێ
# شەرێ میرا، جهوییێن کورد و دەمێن گران

د. برگێت ئامان
وەرگێران: حازم جاسم**

ئامێدیێ[1] هەتا نیڤەکا سەدسالیا ١٩ێ وارگەهـ و ناڤەندا میرگەها بەهدینان بوو، ئێک ژ میرگەهێن هەرە گرنگێن ئیمپراتۆریا ئوسمانی بوو. ژ هەژی گۆتنێیە ئەو هەڤرازیانا ئێتنۆ - ئۆلی یا بەرفرەهـ هەتا سەدسالیا ٢٠ێ بەردەوام بوو، تراژیدیا بنکەتنا ڤێ کەلێ، یا کەسێ باوەر نەدکر کۆ ئێک دێ شێت وێ ستینیت و لاوازیا وێ بنەمالا سەرفەراز ب ئەگەرا شەرێ کەساتی، ناڤخۆیی و سیاسەتا ناڤەندیا سولتانێ ئوسمانی بوو.

ل ژێر عیراقا سەدام حوسێنی و ژ ترسا بکارئینانا چەکێ کێمیاوی، گەلەک کەس ژ باژێری مشەخت بوون، هەرچەندە هێلا پاراستنێ ژ لایێ هەڤپەیمانێن شەرێ کەنداڤیڤە هاتبوو دانان. پشتی داویهاتنا عیراقا کەڤن تەناهی هێدی - هێدی یا دزڤریتە باژێری. خەلکێ وی ب هیڤینە ژ بەر جهـ و دەوروبەرێن وێ یێن جوان و خۆشیا سەقا پاشەرۆژەکا ئابووری ب رەوش پەیدا بیت.

هەتا ئەڤرۆ چ لێکولینێن ب زمانێن ئەوروپی ل سەر ڤێ باژێری یان میرنیشینا کەڤن نینن. ئەڤ لێکولینە ل سەر دیرۆکا باژێرێ ئامێدیێ، گەرەکە ببیتە دەستپێکەک بۆ ڤێ چەندێ. هەرهوسا، وەکی هەمی گاڤا، ل ڤێرە ژی پەیداکرنا ژێدەرێن مێژوویی ل خالا ئێکێ ل سەر دیرۆکا حوکمدارا و رووداێن دلتەزین ئارمانجن. چونکو ئەڤە بناغێن گرنگن بۆ کارێن ئارشولوگی، یێن دیرۆکا هۆنەری، دیرۆکا مللەتان (ئێتنۆلۆگی) و لێکولینێن جڤاکی(سۆسیۆلۆگی) ل سەر ڤێ دەڤەرێ. ئەڤ کارە دێ گەلەک نڤیسینێن گەروکێن ئەوروپییان هەتا دەستپێکا سەدسالیا ٢٠ێ بکارئینیت. هەرهوسا ژێدەرێن کوردی، عەرەبی و ئوسمانی ژی د ناڤدانە[2]. ئەڤ چەندە دێ ئێنە نیشانکرن ب چەند لێکولینێن جهی یێن بەردەوام ژ سالێن ١٩٩١ هەتا ٢٠٠٣ ژ لایێ منڤە هاتینەکرن، دا گرێدانا دیرۆکێ ب ئەڤرۆڤە بهێتە زمان.

## وار و سەقا

ئامێدیێ دکەڤیتە باکوورێ عیراقێ، ل وی جهێ پتریا وان کوردن، نێزیکی دەهـ کیلومەترا دویر ژ سنوورێ ترکیا. ب دویراتیا نێزیکی ٩٠ کیلومەترا ل لایێ رۆژئاڤایێ باشوور باژێرێ دهۆکێ تێتن. ڤی باژێری نێزیکی نیڤ ملیون کەس هەنە. پەیوەندیا ڤان هەردو باژێران گەلەکا موکمە. ل باشوورێ وێ و ب دویراتیا ١٦٠ کیلومەترا و دەرڤەی هێلا پاراستنێ،

(وێنەیێ ١)
باژێرێ ئامێدیێ ژ دویر ل سالا ١٩٩١



وێنەگر: برگێت ئامان

باژێرێ پتر ژ دو ملیون مرۆڤا و سێیەمین باژێرێ مەزنێ عیراقێ مووسلە. پتریا خەلکێ وی ئەڤرۆ کورد و عەرەبن[٣].

ئامێدیێ دکەڤیتە بلنداهییا ١٢٠٠ متران ل سەر رێزا دەریایێ و ل سەر کەڤرەکێ بەری ٤٠٠ مترا بلندە و رەخێن ڤی کەڤری وەکی دیواران تێن خواری[٤]. (بنێرە وێنێ ٢یێ). ئەڤ کەڤرە ل فرەهییا هەشت هەتا دەهـ کیلومەتران د ناڤبەرا هەردو چیایێن بەرامبەرهەڤ گارە و مەتین دایە و درێژیا نهالا زێ یێ مەزنە (بنێرە وێنێ ٣یێ)[٥].

بلنداهیا چیایێن ڤێ دەڤەرێ دگەهیتە سێ هەزار مەتران. سەریانێ ڤی کەڤری ب شێوەیەکێ هێکێ یێ پانە، نێزیکی دو کیلومەترێن چوارگوشەیی[٦]. ب تنێ جادەکا تەنگ رێکێ دبەتە باژێری. هەردو دەرگەهێن کەڤنترێن بناغی یێن باژێری، دەرگەهێ مووسل ل رۆژئاڤایی یان دەرگەهێ سەقاڤا (بنێرە وێنێ ٤ و ٥ێ)، هێشتا یێن ماین و وەکی بەرێ ب پیا یان ژی ب دەواران ب نهالەکا تەنگ ڤە تێنە بکارئینان. ل سالا ١٩٣٠ێ جادەک بۆ ناڤ باژێری هاتە چێکرن. ل نێزیک وێ دەرگەهێ زێباری ل رۆژهەلاتێ بوو، ئەڤرۆ چ نیشانێن وی نەماینە، هەرچەندە ب درستایی جهێ وی یێ زانایە، ب تنێ نیشانێن دیوارێ کەڤن هێشتا هەنە. وێنەیەک ژ سالا ١٨٩٧ دیار دکەت، کو ئەڤ دەرگەهە هێشتا یێ ئاڤایە (بنێرە وێنێ ٦ێ). ل سەر وێنەکێ دی یێ سالا ١٩٤٤ ب تنێ کەڤنە نیشانێن وی تێنە دیتن[٧].

ناڤێن دەرگەهان ب باژێرێ مووسل و عەشیرەتا زێبار بناڤکرینە[٨]، کو برێیا ڤان دەرگەهان دگەهنە دەڤەرێن وان. هەتا دووماهیێن سالێن ١٩٦٠ دەرگەهێ مووسل ب دەرگەهەکێ مەزن ژ داری و ئاسنی دهاتە

**(وێنەیێ ٢)**
**بازێرێ ئامێدیێ ژ دویر ل سەدسالیا ١٩ێ**



**وێنە ئاینسورت ١٨٤٢**

دائێخستن[٩].

ئەڤرۆ ل بازێری خەستەخانەک، چەندین جهێن وەرزشـی و گەنجان، چەندین خواندنگەهێن سەرەتایی، باغچەکێ زارۆکان، پەرتووکخانەک و چەندین مزگەفت و دێرەک هەنە. ژبلی وان ژی چایخانە، خوارنگەهـ و دو بار و هوتێل هەنە، دوکانێن جۆرەوجۆر، دوکانێن کاردەست و بنگەهێن خزمەتگوزاری و رێڤەبەری بانکەک و ئاگرڤەمرەک.

ل دەمێ حوکمێ ئوسمانییا بازێر ب سەر ویلایەتا مووسل ڤەبوو، ئەوا ل ١٩٢٦ ل ژێر ئینتیدابا ئنگلیزی ب عیراقێڤە هاتییە گرێدان. ئامێدیێ دکەڤیتە ناڤ هێلا پاراستنێ، یا ل ١٩٩١ ژ لایێ هێزێن هەڤپەیمان هاتییە دانان. د ڤان ١٤ سالێن چوویی دا، دهێتە هژمارتن ژ ئێمنترین جهێن ل عیراقێ*.

ئامێدیێ قەزا دەڤەرا نێزیک ٢٧٠٠ کیلومەترێن چارگوشەیی یا هەر ب وی ناڤییە[١٠]. (٦) ناحیە هەنە و گرێدایی پارێزگەها دهۆکە، یا نێزیک دەهـ هەزار کیلومەترێن چواگوشەیییە[١١] و ئێکە ژ چوار پارێزگەهێن هەرێما کوردستانا عیراقێ. ل ئامیدیێ ئەڤرۆ نێزیک دەهـ هزار مرۆڤ لێ دژین. چوار هزار ژ وان ل سەر کەڤری و یێن دژی ل دەوروبەرێ بازێری. بازێرێ ل سەر بەرەبانی دابەشکرییە سێ تاخ: تاخێ فەللا، سەردەبکا سەری و تاخێ مەیدانێ[١٢]. ژ بۆ رێڤەبەریێ نەدگرنگن، بەلکو ژ بەر نەبوونا ناڤێن جادان و ژمارێن خانیان د زمانێ وان دا هێشتا ناڤ هەنە، وەکی تاخێ جهویا ب رەخ یا فەللان ڤە، تاخێ رندکا و تاخێ حەماما. پتر ژ نیڤەکا عەردێ ئامێدیێ هەتا نێزیک سالێن ١٩٦٠ پیکهاتبوو ژ گورستانەکێ، یا کو د نیڤەکا سەدسالیا ١٩ هاتییە دانان (بنێرە وێنێ ٧ێ)[١٣]. ئاڤاهی پێکتێن ژ ئاڤاهیێن کو ب سەدان سالا دکەڤنن، ژ بەرێن سروشتی و تەڤنێ یێن هنین و بانێن ئاخێ ل سەر گاریتا هەتا ئاڤاهیێن نوی.

ژ لایێ زمانیڤە ئامێدیێ ل دەڤەرا دیالێکتا باکووره، یا بەهدینان، یا نەوەک سورانی یێ ل باشووری. فورمەکێ زمانێ کوردییا کورمانجییە[١٤].

(وێنەیێ ٣)
هەکار و نهالا زێیێ مەزن




سەقا ل دەڤەرا بەهدینان یا کێشوەرییە. پلێن گەرما هاڤینێ دگەهنە ٤٠ پلان، بەلێ ل زڤستانێ ژی دکەڤنە بن ٠°ێ دا، ل بن سفرێ[15]. بەلێ جوداهیا ئامێدیێ ژ دەڤەرێ ئەوە، کو ئامێدیێ و

(وێنەیێ ٤)
دەرگەهێ رۆژئاڤا دەرگەهێ مووسلێ



ژێدەر: bachmann ١٩١٣

(وێنەیێ ٥)
دەرگەهێ رۆژ ئاڤا




ژێدەر: wigram& wigram ١٩٢٢

دەوروبەرێن وێ ل هەیڤێن هاڤینان هوینترە. ئامێدیێ ب راستی گەلەکا ب ئاڤە، کو ل بهارا و پاییزان هەر یا کەسکە[١٦]. ئەو بیستانێن فێقی یێن چاندی و جوکێن ئاڤێ ل بن ئامێدیێ ل داوییا سەدسالییا ١٦ هاتینە بەحسکرن[١٧]. برزێزوسکی Brzezowski، یێ ل سالا ١٨٦٩ سەرەدانا دەڤەرێ کری، نڤێسییە، کو هەرچەندە هندەک خەلک زەحمەتێ دبینن، ژ خورا پارچەک عەردی پەیدا بکەن، دا فێقی و بنێت مێوان بۆ خۆ لێ بچین و هەر بهوستەکا عەردی بکاردئینن، ل نێزیکی ئامێدیێ زەڤیێن برنجی ژی هەنە، یێن کو گەلەک ئاڤ پێدڤییە[١٨]. بیندەر Binder ژی حەیری مایە ژ ڤی سەقایێ خۆش[١٩]. ژ ئالیەکێ دیڤە دەنگ و باسێن رێڤنگان بەحسی وێ چەندێ کرییە، کو ئەڤ سەقایە ژ بەر زەڤیێن برنجی بۆ تەندرستیێ چەند نەباشە. وەکی کوردۆلۆگێ ئەلمانی ئۆسکار مانOskar Mann ، یێ د گەریانا خۆ دا ل دەستپێکا سەدسالییا بیستێ گۆتی (هەروەکی ئێک هەردەم ل بن ئاڤێ بیت)[٢٠]. ریچ Rich سەقایێ دەڤەرا ئامێدیێ ل نیڤا ئێکێ یا سەدسالییا ١٩ هوسا پەسن دکەت (هەوایێ هەر گەرم و نەساخلەمە)[٢١]. ئەڤ چەندە بۆ ئەرشۆلۆگێ بریتانی هێنری لایارد Henry

(وێنەیێ ٦)
دەرگەهێ رۆژهەلات دەرگەهێ زێبارێ،



ژێدەر warkworth ١٨٩٨

Layard ژی کو، ئەوێ پەسنێن وی بۆ کارل مای Karl May بووینە بنگەهێن سەرەکی بۆ رۆمان و چیرۆکێن وی ل سەر کوردستانێ. دەمێ لایارد ل سالا ١٨٤٦ سەفەرا بازێری کری، ل وی دەمی رەنگە هەمی خەلکێ ریڤەبەریا ئوسمانی ب مالاریایێ یێ نەخۆش بوو[٢٢]. هەرهوسا دختورێ عەسکەری یێ بریتانی داڤید هارریسون David Harrison بەحسی گەلەک رووداێن مالاریایێ ل دەورێ سالێن ١٩٤٠ کرییە[٢٣].

ل دەمێن ئاشتیێ و تەناهیێ ژ بەراهیێ هەتا نوکە ژی بازێر جهێ بهنڤەدانێیە و ئارمانجەکا گوزاریە. رێڤنگێ باڤاری ساندرێچکی Sandreszki ل سالا ١٨٥٠ گروپەکا رێڤنگێن عەرەبا ل دەڤەرێ دیتیە، یێن کو ب تنێ بۆ بێهنڤەدانێ و سەیرانێ هاتینە وێرێ[٢٤]. ژ سالا ١٩٣٠ هەتا ١٩٥٥ بنگەهەکا عەسکەری یا بریتانی ل چیایێن هنداڤ ئامێدیێ هەبوو، کو ل وێرێ سەربازا ل مەهێن هاڤینێ دەمێ خۆ یێ بێهنڤەدانێ دبوراند، لڤێ بنگەهێ گوڵەکا مەلەڤانیا ژی هەبوو. (بنێرە وێنێ ٨ێ)[٢٥].

سەربازێن ئەمریکی ئەڤرۆ سەرەدانا بازێری دکەن ژ بنگەهێ خۆ یێ بیهنڤەدانێ ل نێزیکی وێرێ. د دەمێ تەناهی و ئاشتیێ دا خەلکێ دەولەتێن کەنداڤێ عەرەبی ژی دهاتنە سەیرانان. پشتی نەمانا رژێما بەعسیا بەردەوام ب زێدەبوون خەلک ژ دەڤەرێن عەرەبان و ژ دەولەتێن هەڤسوێ تێنە سەیرانێ ل ڤێ دەڤەرێ.

(وێنەیێ ٧)
دیمەنەك ژ ئامێدیێ هاتییەگرتن ژ سەرێ چیایێ بشیشی، ل گۆرستانا موسولمانان ل گۆلانا ١٩٤٤



ژێدەر envia warda via raf habaniya association,warda 64

## دیرۆکا ئاڤادانکرنێ و بنەمالا میری

ل سەر پرسیارا، کا ناڤێ ئامێدیێ ژ کیرێ هاتییە، بۆچوونێن جودا هەنە. ڕێڤنگێ تورکی ئەولیا چەلەبی دبێژیت، ئەڤ ناڤە ژ ناڤێ حاکمێ وی سەردەمی ئیمدان، کورێ ئەنوشیروانی، ژ دەمێ بەری ئیسلامێ، کو ئێک ژ بنەمالێن ساسانی بوویە، هاتییە[٢٦]. ل دووڤ بۆچوونا شترێک Streck و دەمەلوجی نڤیسەڤانێ عەرەب موستەوفی دبێژیت، ب ناڤێ ئەمیرێ دەیلەمی عیماد الدولة (ل ٩٤٩ مرییە) کرییە. بۆچوونا ژ هەمییا ڕێئالستتر هەر یا نڤیسەڤانێ عەرەب یاقوتە، ئەو دبێژیت، سولتانێ مووسلێ و شنگارێ عیمادالدین زەنگی ئەڤ باژێرە ل سالا ١١٤٢ ئاڤاکرییە و ب ناڤێ وی بناڤکرییە[٢٧].

ئاینسڤورت Ainsworth بەحسی وی ناڤێ ب ناڤودەنگ ئامێدی، باژێری مێدیرا دکەت[٢٨]، ئامێدی یە گۆهورینەکا زمانی یە ژ ڤی ناڤی ژلایێ تورك و عەرەباڤە، دەمەلوجی نڤیسی یە، هێژ ل بن حوکمێ ئاشوریا ناڤێ ڤی باژێری ئامێدی بوو[٢٩]. هەرهوسا هندەک دی ژی وەکی فندی ڤێ چەندێ پەسەند دکەن[٣٠].

بۆچوون ل سەر ئاڤاکرن و گرێدانا وێ ب ناڤیڤە ژی نە وەک ئێکن. شترێک د بۆچوونا خۆدا وەکو نڤێسکارێ عەرەب یاقوت دبێژێت، ئاڤاکرنا باژێری ل سەر دەستێ عمادالدین زەنگی ل سالا ١١٤٢ بوویە[٣١]. زەنگی وارێ ئاشیب ستاند و ل سەر شەرەفا وی ناڤێ عمادیە ل کەلا جەلەب کر[٣٢].

**(وێنەیێ ٨)**
**کەمپا سەر ئامێدیێ ل ستلا ١٩٣٩**



ژێدەر: Wilfred Cross via RAF Habaniya Association. CROSS٩٧

هەتا وی دەمی ئەڤە ئێک ژ کەلێن گرنگ یێن کوردێن هەکاریا بوو، یێن ل نێزیکی ٩٨٠ هاتینە ڤێ دەڤەرێ[٣٣]. ئەو بۆچوونا شاش یا دبێژیت، کو ئامێدیێ ب ناڤێ ئەکبادان ژی هاتییە ناسکرن[٣٤]، وەکو د گەلەک پەسنان دا دیار دبیت، ل جەم بادگەر Badger ب درێژایی یێ هاتییە رەتکرن[٣٥].

گۆتنێن جودا - جودا ژ زاردەڤێن خەلکێ دەڤەرێ دهێنە گێراندن، یێن دویر ژهەڤ. د چێبوونا ڤان گۆتنێن وەک ئەفسانەیی دا، گەلەک موتیڤێن، جارنا یێن ئۆلی ژی رۆلەکێ، مەزن هەنە. هەروەکو ئەوا دبێژیت، کو پێغەمبەر توبیاس بازێر ئاڤاکرییە[٣٦]، بازێر ب ناڤێ دو رەبەنێن فەلە ناڤێن وانە (ئامێ و دیێ) کرییە یان ژی حاکمێ بەری ئیسلامێ ب ناڤی زێرین، هندەک کەسێن دی ژی تێن باسکرن وەک دانایێن ناڤێ ڤی بازێری و خودیێ وی. هەرهوسا گرێدانا ناڤێ ئامێد ب ناڤێ بازێرێ ئامەد، کو دیاربەکرە، ئێک ژ ڤان ئەفسانایە و چ راستی ژ بۆ نینە. چیڤانۆکەک دی موتیڤێن وێ ژ چیرۆکا گەشتا نوحی هاتییە، دبێژن پشتی مرنا هەمی خەلکێ وێ دەڤەرێ ب ئێشا تاعۆن، ب تنێ مالەک ژێ رزگار بوو و ئەو ژی مشەختی ڤێ دەڤەرێ (مەبەست ئامێدیێ) بوو[٣٧].

ناڤدارترین عەشیرەتێن ئامێدیێ مزووری، زێباری، بەرواری، رێکانی، ئورەماری، نێروەیی و هەکاری نە. عەشیرەت ئەڤرۆ رۆلەکێ هوسا یێ مەزن د ژیانا بازێریدا نابینیت. ناسناما ڤان کەسان پتر گرێدایی بازێرییە و نێزیک سەد مالێن بازێری: وەکو کتانی، حەجی شەعبان و پاشا یان ژی رەش[٣٨].

هەروەکو مە ل دەستپێکێ گۆتی، ئامێدیێ هەتا

نیڤا سەدسالیا ١٩ وارگەهـ و ناڤەندا میرگەها كوردی بەهدینان بوو، ئێك ژ گرنكترین میرگەهێن كوردی یێن وی سەردەمی یێن ئیمپراتوریا عوسمانی. میرێن كوردان - هندی وان پشتگیریا ئیمپراتوریا عوسمانی گرتبان - بشێوەكێ فەرمی ل بن فەرمانا پاشایێ بەغدا بوون. ئەو ژی ژ لایێ خۆڤە ل بن فەرمانا سولتانێ عوسمانی ل ئستەنبولێ بوو و ب فەرمانەكێ دەستەلاتا میران رەوادكر. سیلڤەسترێ دو ساسی - Silvestre de Sacy دبێژە، كو میران ژی ماف هەبوو، نافێ پاشا ل خۆ بنێن، بەلێ چ مافێن زێدەتر نەبوون. وان دكاری ژی ئالایەكی بەرز كەن و موزیكژەن هەبن، د شەران دا دگەل وان برێ بكەڤن[٣٩]. دەستەلاتا ئیمارێ یا وی دەمی ل سەر دەڤەرێن ئەڤرۆ یێن پارێزگەها دهۆكێ: دهۆك، زاخو، ئاكرێ، ئامێدیێ، سیمێل و شێخان بوون[٤٠].

د گەلەك راپۆرتێن گەرۆكان دا و هەروەكو د گۆتنێن دەڤكیدا میرێن بەهدینان ژی[٤١] وەكو خەلكی بنەمالێن میران یێن بەتلیس، جزیرێ و هەكاری وەك عەباسی تێنە پەسەنكرن[٤٢]. بەلێ د شەرەفنامێدا، یا دویماهیا سەدسالیا ١٦ هاتییە نڤێسین، نەدیارە، كو مەبەست ژێ عەباسیێ خەلیفەیە یان عەباسەكێ دیە[٤٣].

ئەولیا چەلەبی ب ئاشكەرا دبێژیت، كو پەسنا عەباسی ڤەدگەریت ژ بۆ عەباسێ مامێ (ئیمام) عەلی (هەرهوسا مامێ پێغەمبەر محەمەدی ژی). ئێك ژ كورێن وی (رەنگە عەبدوللا، ئێكەمین خەلیفێن عەباسی بیت، وەكو ئەولیا چەلەبی د پەرتووكا خۆدا بەحس دكەت) ل سەردەمێ خلافەتا عەلی بوو حوكمدارێ ڤێ دەڤەرێ (واتە د ناڤبەرا ٦٥٦ و ٦٦١ دا)[٤٤]. د شەرەفنامێ دا هێشتا گۆتییە، كو نەژادێ میران د بنگەهـ دا ژ دەڤەرا شەمدینان یا ب سەر هەكاریڤە، ئەڤرۆ بنافێ شەمدینلیە، هاتینە[٤٥]. یێ كو بەری هاتنا وی ل كەلا طارون حوكم دكر، ئێكی ژ نەڤی یێن ڤێ بنەمالێ ل ئامێدیێ ب نافێ بەهائەلدین ل نێزیكی سالا ١٢٠٠ مالەك ئاڤا كر و ئەڤ ناڤە لێكر[٤٦]. نافێ بەهائەلدین ل دووڤ گۆتنا شارموی - Charmoy پاشی ژ لایێ قەشەیێن دومینیكانیڤە ماوریزیو گارزونی ـــ Maurizio Garzoni كرییە بەهدینان[٤٧]. یا كو هەتا ئەڤرۆ دەڤەرا كوردێن ب زمانێ كورمانجی ل كوردستانا عیراقێ پەسندكەت. میتوسەكا - Mythos زیدەتر ب ڤی نەژادیڤە هاتە گرێدان، چونكو قەهرەمانێ نەتەوی یێ كورد مەلا موستەفا گۆتییە، د بنیات دا، ژ ڤی نەژادیە[٤٨].

## بەحسكرن بەری دروستبوونا شەرەفنامێ

بازێر مەزن و ب بەرهەمە، چیاییە، جوانە، خەلكەكێ بوشە و بهێزە، ب ساناهی ناهێتەستاندن[٤٩]، ئەڤەنە پەسنێن سەرەكی یێن ل بەر دەست د بەحساندان. هەتا ئەڤرۆ گەلەك رێڤنگان سەرەدانا ئامێدیێ كرییە. رێكەكا ب ناڤ ل وی دەمی د ناڤبەرا جەزیرێ و مووسلێ دا، ئەو بازێرێ ل وی سەردەمی هەر بۆ بازرگانیێ یێ گرنگ بوو، ئەڤ رێكە د ئامیدیێرا دبوری. بەلێ گەلەك كەسان نەبرێیا چیایی، بەلكو برێیا رووباری ب كەلەك[٥٠] د دیجلەیرا دچوون، ژ بەر هندێ ژی ئامێدیێ د بەحسێن وان دان نینە. ئەڤ بەحسێن هەین گەلەك ب رەنگ و درێژیا خۆ ژ ئێكجودانە، هندەكان پتر ژ دو یان سێ لاپەران ب تنێ بەحسی بازێری كرییە، هندەك ژی و بارا پتر ژ وان چەند رێزەك نڤێسینە. هەروەكو دیار، ئەڤ نڤیسەڤانە بازرگان، دیپلۆماسی، لەشكەر، مسیونار و رێبارێن جیهانێ، یێن ب تنێ ئارمانجا وان گەریانە[٥١]. ژ لایەكێ دیڤە گەلەك تشت د ئەرشیفاندان هەنە، گەرەكە ل پاشەرۆژێ بهێنە لێكولین، یێن دێ بەرسڤا گەلەك پرسیاران ل وارێ لێكولینێ دەن.

ئێك ژ كەڤنترین دوكومێنتێن بازێری نڤیسینەكە ل سەر منبەرەكێ، جهێ نڤێژێ، ژ دەمەكێ كورت پشتی دانانا نوییا بازێری ل سەر دەمێ زەنكیا. ئەڤ نڤیسینە دبێژیت سالا ١١٥٣ێ، كو دبیتە سالا چێبوونا ڤی جهێ نڤێژێ ژ داری و نافێ وی كەسی ژی دبێژیت یێ مزگەفت ب خێرا خۆ ئاڤا كری، میر

قاراجە، یێ ل وی دەمی حوکم ل بازێری دکر[٥٢].

بەلێ هەتا نوکە نەهاتییە ئاشکەراکرن، کا ئەو منبەرا نڤێژا ب دروستایی بۆ کیرێ هاتییە چێکرن. چونکو ئەم دزانین، منارا مزگەفتا ئامێدیێ، هەروەکو ژ رەنگێ منارا هێشتا مایی و پەسنا دەرگەهێ داری[٥٣] ئاشکەرا دبیت، کو ل سەدسالییا ١٣ هاتییە ئاڤاکرن. هەر ل سەردەمێ ئاڤاکرنا هەردو کنێشتان، ئەڤێن ئەم ل خوارێ دێ بەحس کەین، هاتینە ئاڤاکرن.

هەتا نیڤەکا سەدسالییا ٢٠ێ هژمارەکا مەزن ژ خەلکێ ئامێدیێ جوهی بوون. ژ بەر ڤێ چەندێ ژی کەڤنترین ژێدەرێ دیرۆکێ ل رۆژئاڤا بەحسی ئامێدیێ کری یا رێبارەکێ جوهی بوو. ناڤێ وی بێنیامین ڤۆن تودەلا (بنيامين التطيلي،Benamin von Tudela) ل سالا ١١٧٠ بەحس کرییە[٥٤]. ل دووڤ نڤێسینێن دیرۆکی یێن جوهییان ئەڤ بازێرە دەمێ مشەختبوونا جوهییان ل بابل هەبوویە. واتە ٥٠٠ سالا ب. ز[٥٥].

ل هندەک دەما هژمارا خەلکێ جوهیێن بازێری دگەل هژمارا خەلکێن مەسیحی گەلەگ بوون و دگەهشتە بەرامبەر خەلکێ مووسلمان یان ژی بەرامبەر مالێن مووسلمانان. زمانێ ڤان جوهییان رەنگەکێ زمانێ ئارامی بوو، یێ نێزیک بوو ژ زمانێ مەسیحی یێن ل گوندێن دەوروبەرێن ئامێدیێ. ئەڤ زمانە هوسا نێزیکی هەڤبوون، کو جوهی و مەسیحی دئێکدو دگەهشتن و د ناڤبەرا وان دا چ گرفتێن زمانی نەبوون. گەلەک ژ وان وەک جوتیار یان شڤان دژین. بەلێ هندەکان ژی کارێن دەستی دکرن یان بازرگان بوون[٥٦]. لێ ژیلی رەوشتێن ئۆلی، کولتورێ ژیانا رۆژانە یا بازێری یێ مووسلمانان پاشی یێ مەسیحییان بوو. ژنئینانێن تێکەل، هەروەکو د ناڤبەرا جوهییان و مەسیحیان دا، نە تشتەکێ نۆرمال بوون. بارا پتر زەلامێن مووسلمان بۆ خۆ کچکێن مەسیحی دئینان و نە بەروڤاژی[٥٧]. د هندەک کاغەزێن مێژوویی دا یێن دەسپێکا سەدسالییا ١٦ بەحسێ جڤاکا جوهییان و کەسێن وان یێن ب ناڤودەنگ ل دەڤەرا ئامێدیێ و دەوروبەرێن وێ دهێتەکرن. دهێتە دیتن، کو هندەک عەشیرەتێن دەڤەرێ، وەکو نێرەوەییان، ئەندامێن مووسلمان و جوهی هەبوون و هژمارا ئەندامێن جوهییان ل ڤێ کومەلگەهێ دگەهشتە چەند هەزار ئەندامەکان[٥٨]. ژیانا رۆژانە یا تێکەل ب درێژی یا بێ گرفت بوو، بەلێ ئەم نکارین ڤێ چەندێ وەکو وەکهەڤ پەسەن بکەین.

گەر ئەم سەرەدانا تودەلای Tudelaی بهژمێرین، دکەڤیتە ٢٨ سالا پشتی دانانا بازێری و نێزیک ٢٥ سالا بەری هاتنا رەگەزێ بەهدینان بۆ دەڤەرێ. ل وی دەمی و ل ژێر دەسەلاتا ئەییوبی‌یان ل مەزوپوتامیا تایێ بنەمالا زەنگی‌یا ل مووسل و ئامێدیێ حوکم دکر. دەمێ عمادئەلدینێ زەنگی ئەڤ دەڤەرە، یا ل پێشیێ هەکاری‌یێن ئاشیبی هاتینێ، یا ستاندی، ئەوی ژ دەستێ (أبولهيجاء)، حوکمدارێ ئەربیل و ئاشیبی‌یان، ستاند[٥٩]. یا ئاشکەرایە، کو زەنگی‌یا بۆ جارا ئێکێ میرێن بەهدینان دانابنە. بەری ناڤێ بەهائەلدین و پاش هاتیێن وی - ب تنێ هندەک گۆتنێن دەڤی هەنە، یێن بێ باوەرن، ناڤێ هندەک میران دبێژن[٦٠] - پتر ژ دو سەد سالان دیرۆکا وان میران یا تاری‌یە.

میر بەدرەددین لۆلۆ، پاشهاتیێ زەنگی‌یا، رۆلەکێ بلند د دیرۆکا بازێری‌دا هەبوویە. ل دەسپێکێ وەک زارۆک هاتییە سەر حوکمی، ل سالا ١٢٢٢ شیایە دەسەلاتەکا سەربەخۆ ب دەست خۆڤە بینیت و ببیتە حوکمدارێ مووسلێ. بەری ڤی دەمی گەلەک شەرێن دژوار ل سەر حوکمی هاتینەکرن. ل ڤان شەران، یێن کو ب ناڤێ سێ شەرێن مووسلێ هاتینە نیاسین، ئامێدیێ چەند جاران ژ دەستێ وی کەتە بن دەستێ عمادئەلدین زەنگی، کورێ نورەلدینی و جارەکا دی زڤری بن دەسەلاتا وی. گرنگییا ئامێدیێ د وێ چەندێ دا دیار دبیت، کو دەمێ حوکمێ بەدرەلدین لۆلۆ عەمبارا دەولەتێ ل ئامێدیێ بوو[٦١]. پشتی سالا ١٢٣٣ لۆلۆی دەرگەهێ مووسلێ، یێ پتر دێ ب سەردا چین، ئاڤا کرییە. ل سالا ١٢٤٨ و هەر ل سەر دەمێ لۆلۆی کنێشتا ئەڤرۆ شوینوار نەمایی یا ئەزەکی (ناڤێ یەهەزقەل ژی دگۆتنێ) ئاڤاکرییە و ل سالا ١٢٨٩ هاتییە فرەهکرن. ئەڤ کنیشتە یا هندەک

خەلكێ دەڤەرێ ناڤێ كەنیشتا سەری لێ دكر، كنێشتا دوێ بوو یا جوهییان ل بازێری. ل كیژان دەمی كنێشتا ئێكێ، یاكو دگۆتنێ كنێشتا ئەزرا هاتییە ئاڤاكرن، كەس نزانیت(٦٢). ئەڤرۆ ژ هەردو كنێشتان چ نیشان نەماینە. ب تنێ جهێ شوینوارێن دو گۆڕا ماینە، یێن ل دووڤ گۆتنێن براوەری Brauer د دەمی دا د ناڤ حەوشا كنێشتێ دا بــوون(٦٣). ئەڤە ژی گۆڕێن هەردو برایان هازان داڤید و هازان یوسفن، یێن ل دووڤ وەرگێرانێن مێژویی كۆمەلگەها جوهییان ل ئامێدیێ ئاڤاكرییە. جوهیێن كورد سەرەدانا ڤی جهی دكر، یێ كو ژ وان را وەك مەزار بوو(٦٤).

لۆلۆی دلسوزییا خۆ بۆ مەنگولییا، برێڤەبەرییا نەڤیێ جەنگیزخانی هولاگوی دیاركر، دەمێ ئەو نێزیكی دەڤەرێ بووین. ئەڤە ژی بەری مرنا وی بوو ل سالا ١٢٥٩(٦٥). مێژوونڤیسێ ئەرمەنی چەمچەیان Tschamtschamean ل وێ بــاوەرێیــە، كو مەنگولیا هێرش نەبرنە سەر دەڤەرێن چیایی(٦٦) هوسا ئامێدیێ ب بەر هێرشێن مەنگولیا نەكەت و نەهاتە وێرانكرن، دەمێ وان ل سالا ١٢٦١ مووسلێ ستاندی(٦٧). هەرهوسا دبێژن زۆری ل مەسیحییان نەهاتەكرن و كەس ژ وان نەهاتە كوشتن، چونكو پارچەك ژ مەنگولییا بیروباوەرێن نەستۆریانی بوون(٦٨). ب ڤی رەنگی ئەو ژی وەك بیروباوەرێن ئۆلی یێن مەسیحییێن دەڤەرا ئامێدیێ ل وی دەمی بوون.

د ژێدەرێن مەملوكی دا بەحسێ پێنج هەزار كوردێن هەكاری تێتەكرن، یێن ل سالا ١٣٤٧ مشەخت بووینە ئامێدیێ(٦٩). McDowall ل وێ باوەرێیە، كو مەنگولیا ل دەمێ تیمورلەنگی ل سالا ١٤٠١ بازێرێ ئامێدیێ ستاندیە. بەلێ وان میر زەینەلدین دانیە سەر حوكمی. پشتی وی كورێ وی سەیفەلدین هاتییە سەر حوكمی و نێزیك سالا ١٤٨٠ كورێ وی حەسەن هاتییە سەر كورسیكێ(٧٠).

حەسەنی رۆلەكا مەزن د دیرۆكا میرگەهێ دا دیتییە، د پشتگیری و ئێكبوونا سیاسی دا دگەل سەفەوییا یان ژی دگەل دوژمنێن مێژوویێن وان ئوسمانییان. ل سالا ١٥٠٠ حەسەنی دەست ژ پشتگیرییا سەدان سالا یا میرگەهێ بۆ توخمێ ئەردەلانی(٧١) كوردی ل بازێرێ سەنەندەج بەردا و دلسوزی بۆ شاهـ ئیسماعیلی كرییە، یێ دەسەلاتا خۆ هەر ب هێز ئێخستییە و هەتا پشتی دو سالا كارییە ب سەر ئاققویونلو یێن توركمان سەركەڤیت(٧٢). ئەڤە ژی وەك پێنگاڤەكا سیاسی گەلەكا گرنگ بوویە. ئاققویونلویان بەری وی دەمی گەلەك هەولدایە ئامێدیێ بستینن(٧٣). پشتی نەمانا ئاققویونلویان ل سالا ١٥٠٢ حەسەنی خۆ دا ناڤ حەوشا شاهـ ئسماعیلێ، كو ب خێر هاتنەكا مەزن لێ هاتەكرن و رێزەكا بلند لێ هاتە گرتن(٧٤). بەلێ حەسەنی ل سالا ١٥١٤ و جارەكا دی ب هژمارەكا گەلەك مەزن ژ چەكداران پشتگیرییا سولتانێ ئوسمانی سولتان سەلیمی كر و بەشداری د جەنگێ چالدران دا كر. پشتی سالەكا دی میرگەها ئامێدیێ جارەكا دی ب نێزیك چل هەزار چەكداران ڤە بەشداری د شەرێ ستاندنا دیاربەكرێ ژ دەستێ شاهـ ئیسماعیلی كر(٧٥). د ڤی شەری دا گەلەك میرگەهێن دن ژی یێن كوردان بەشدار بــوون(٧٦). ئەڤ پشتگیرییە بۆ سولتان سەلیمی و پشتی وی بۆ كورێ وی سولەیمانی ئێككرتنا میرگەهێ دگەل ئیمپراتوریا ئوسمانی گەلەك موكم كر، هەتا میرگەهـ ژ بەر ڤێ چەندێ و دلسوزییا وێ هاتە خەلاتكرن و بۆ دەمەكی ناڤێ ویلایە لێ هاتە كرن(٧٧).

حەسەنی ل سالا ١٥٣٨ و دگەل هندەك میرێن دی یێن كوردان بەشداری د شەری دا كر ل دژی ئەردەلانی ب ناڤێ سولتان سولەیمانی و جارەكا دی دلسوزییا خۆ یا بێ سنوور بۆ ئوسمانییا سەلماند(٧٨). حەسەن ل دووڤ گۆتنێن شەرەفنامێ ل سالا ١٥٤٥ مرییە. پشتی وی كورێ وی حوسەین هاتییە سەر حوكمی(٧٩). حوسەین د شەرەفنامێ دا وەك باشترین و خۆشتڤیترین میرێن ئامێدیێ تێتە پەسەنكرن(٨٠). ل زاردەڤێ خەلكێ دەڤەرێ ژی ڤی تشتی پشتراست دكەن. كێلییا ب رەنگ بورجی یا گۆڕێ حوسەینی ئێكە ژ دو كێلییێن مایی د ناڤ

گورستانا دبێژنێ گورستانا میرا دا[81] نێزیک قەسرا وی ل سەر وی دەمی. راستە حوسەین ژ خۆشتڤیترین میرین ئامێدیێ بوو. ئەوی باندۆرەکا مەزن ل سەر میرێن دی یێن کوردان هەبوویە و ل ژێر حوکم و چاڤدێریا وی گەلەک ئاڤاهی هاتینە ئاڤاکرن[82]. مرنا وی و بەردەوامیا شەرێن دوژمنێن دیرۆکی یێن ئوسمانی و سەفەوییان و هەرهوسا شەرێن عەشیرەتێن کوردان، یێن ل ڤی رەخی یان ژی ل رەخێ دی شەر دکرن، بوونە ئەگەرا لاوازبوونەکا مەزن یا بنەمالا میران. پشتی مرنا وی ل سالا ١٥٨٦ کورێ وی یێ مەزن قوباد، مرۆڤەکێ گەلەکێ دیندار و بێ هێز ل حوکمکرنێ، هاتە سەر حوکمی. قوباد بۆ حەزکرنا راڤ و نێچیران یێ ب ناڤودەنگ بوو[83]. ئەو ب زوری ژ حوکمی هاتە لادان و کوشتن[84]. ل سالا ١٥٨٤ برایێ وی یێ بچویکتر بەیرام جهێ وی گرت[85]. ل ١٥٨٦ێ سەیدی یێ کورێ قوبادی و برازایێ بەیرامی هاتە سەر حوکمی. ئەڤ دەمە دەمێ حوکمێ سولتانێ ئوسمانی مورادێ سێیێ بوو[86] و هەر ل دەمێ حوکمێ وی و ل سالا ١٥٩٦ و ١٥٩٧ێ کارێ مێژوویی پەرتووکا شەرەفنامە، یا هەتا نهو گەلەک جاران هاتییە بەحس کرن، ب قەلەمێ هەڤالێ وی میر شەرەفخانێ بەدلیسی هاتە نڤێسین. د ڤێ پەرتووکێ دا گەلەک بابەت ل سەر ژیانا میران و ژیانا رۆژانە ل ئامێدیێ هەنە، ئەڤ بازێرێ میرگەهـ و وارێ میرێن بەهدینان. ل وی دەمی زمانێ بازێری ژ عەرەبی و کوردی یێ تێکەلە بوو. ل وی بازێری ب تنێ دو کانی هەبوون. ئەڤ کانیکە ب تنێ بۆ خزمەتا میران و رێڤەبەریێن فەرمی بوون. خەلکێ دی ژی ئاڤ ب دەواران ژ دەرڤەی بازێری بۆ خۆ دهینا[87]. پتر ژ نیڤەکا وان ناڤێن عەشیرەتان یێن شەرەفنامە بەحس دکەت، هەتا ئەڤرۆ ژی ئەڤ ناڤە هەنە، وەکو مزووری، رێکانی، زێباری یان ژی بەرواری. شەرەفنامە ب شێوەیەکێ مەزن ژێدەرەکێ جهێ باوەرییێیە، ب تایبەت ل سەر بابەتێن میران و هاتنا وان بۆ سەر حوکمی. ب تنێ هندەک گۆتن ل سەر سالان نە وەکهەڤن. ل سەر دەمێ سەیدی ئەڤ کارێ مێژوویی ب داویهات[88].

## ئەولیا چەلەبی و هندەک چاڤدێرێن دی

ژ بو نفشێن پاشەرۆژێ هێشتا ب زەحمەتترە لێکولینان ل سەر رەهـ و ریشالێن میرێن بەهدینان بکەن، چونکی ئەو ژێدەرێن کێمێن ل بەردەست نەدراستن و گەلەک جاران ژی دژهەڤن. گۆمانبرە کو دەسەلاتا سەعیدی ل سالا ١٦٠٦ ژ ئەنجامێ هێرشا ئەحمەدێ ئەردەلانی بو سەر میرگەهێ ب داویهات[89]. پشتی مرنا میر سەعیدی - دیارە ل سالا ١٦٢٩- پسمامێ وی یوسف، کورێ بەیرامی، دەسەلات گرتە دەستێ خو[90]. ل بارەی وی مێژوونڤیسێ ئیمپراتوریا ئۆسمانی ئەولیا چەلەبی بەحس دکەت، کو ل شەرێ ل سەر دیاربەکرێ ل سالا ١٦٣٨ ژ لایێ ئۆسمانییاڤە هاتییە گرتن و زیندانی کرن. حەفت سەد ژ زەلامێن وی هاتنە کۆشتن و سەرێن وان هاتنە ژێکرن و بۆ سولتانی ل کوستانتینوپولێ (ستەنبۆلێ)هاتنە فرێکرن[91].

ل ژێر حوکمێ میر یوسفی جارەکا دی پشکداریا میرگەهێ هاتەکرن د ستاندنا بەغدا دا ژ لایێ سولتان مورادێ چارێ ڤە ل سالا ١٦٣٨[92]. د ناڤبەرا هەردو نڤیسەرێن کورد شەوالێ ئامێدی و مایی رازیبوون هەیە ل سەر رووداێن وی دەمی هەتا سالا ١٧٠٠ێ. میر موراد، میراتگرێ سەعیدی وەکو مایی دبێژیت، دەسەلات بۆ قوبادی هێلا. پاشی ل پاش وی بەیرام و سەیید هاتن. دەمێ شەوالێ ئامێدی دڤەگێرانا وەختی (مێژویا سالان) دا پیچەکێ یێ قەلسە، ڤەگێرانێن مایی د دروست و بێگۆمان ترن، بەلێ ئەو هەڤدژن دگەل گۆتنێن ئەولیا چەلەبی[93]. ژ بەر ڤێ چەندێ رووداێن سەردەمێ حوکمێ ڤان کەسان ب تنێ دکارن پاشی بهێنە تەخمینکرن. (ل دویماهیا ڤێ لێکۆلینێ بنێرە).

گومانبرە کو ئەولیا چەلەبی د سالا ١٦٥٥ێ دا سەرەدانا ئامێدیێ کریە، و ل وی دەمی چاڤپێکەتن دگەل سەعیدی وەک میر کریە و ئەڤ تشتە بەحس کریە[94]. ئەو دبێژە، ئامێدیێ سەربخۆترین و بهێزترین میرگەها کوردان بوو. وەکی هەمی دەڤەرێن ئۆسمانی ل وی سەردەمی وێ ژی پارچەیێن دن ب

(وێنێ ژمارە ٩)
جلوبەرگێن کوردی.



ژێدەر Reclus 1884

سەر خۆڤە هەبوون، ئەو ڤان ناڤان دبێژیت: ئاکرێ، شێخان، زاخو، دهۆك، مزۆری و زێباری. ئەڤە هەمی حوکمێ میراتگرێ بوون و هەروەکی میرێ ئامێدیێ ژ لایێ سولتانێ عوسمانی ڤە دهاتە دانان، ئاغایێن ڤان دەڤەران ژی ژ لایێ میرێ ئامێدیێ ڤە دهاتنە دانان. هندەک جارا ڤان میران ئاغایێن زێدە ژی بۆ عەشیرەتێن میرگەهێ ددانان. چەلەبی کارکەرێن میرگەهێ پەسن دکە، یێن کو ب جلوبەرگێن خۆ یێن تایبەت دهێنە ناسکرن. هەرهوسا ژی بەحسێ بازرگانان دکە، یێن هەتا بەغدا و باژێر و میرگەهێن دن یێن کوردان بازرگانی دکر. ل داویێ ژی بەحسێ خودان پیشە و خودانێن دوکانان دکە ب جل و بەرگێن وان یێن کو ئەڤرۆ دبێژنێ شەل و شەپک(بنێرە ل وێنێ ژمارە ٩) و بەحسێ ماموستایان یان زانایێن ئۆلی دکە، یێن پر زۆر بوون و هەمیان خەنجەرەکا تویژ و درێژ د چاندکێن ب ستویێن خۆڤە دا هەبوون. چەلەبی هێشتا ئامێدیێ وەکی ناڤەندەکا گرنگ یا کولتورێ کوردی خویا دکە. دیالێکتا ڤێ دەڤەرێ ژی ب زمانێ هەلبەستان ل قەلەم ددە. بەلکی ژی دەستخەتا نڤێسینا نهو ل ئامیدیێ وەک کەڤنترین پارچە هەلبەستا کوردی دەرکەتیە، ژ قەلەمێ وی بیت[٩٥].

بازرگانێ (بەرێن بها) جێئان ـ بابتیست تاڤەرنیر Jean-Baptiste Tavarnier ل سالا ١٦٦٣ سەرەدانا ئامێدیێ کریە. ئەو وی ب (باژێرێ نازک)پەسن دکە، یێ کو جوتیار تیتن و مازیێن خۆ دئیننێ[٩٦]. مرۆڤی پێدڤی ب دەمژمێرەکی هەبوو دا بکاریت ب وێ رێکا چیایی بگەهیتە سەر کەلێ. ل نیڤەکا ڤێ رێکێ چەندین کانیکێن مەزن هەبوون، ژوان خەلکێ ئامێدیێ سپێدەهیا و ئێڤاریا ئاڤ بۆ خۆ دئینا. ئەو هەرهوسا دبێژە، کو میرێ دەڤەرێ دکاری، هەشت هەتا دەهـ هەزار سیارێن شەرکەر کوم بکەت و پتر ژ هەمیا شەرکەرێن پەیا، چونکو خەلکێ وارێ وی ژ خەلکێ هەمی دەڤەرێن کوردستانێ بوشتر بوو[٩٧].

ئۆسمان، برایەکێ سیێ یێ سەعیدی، دەستەلاتا میرگەهێ گرتە دەستێ خو، بەلێ نە گەهشتە سالەکێ، مەجبور بوو کورسیکێ بدەتە برازایێ خۆ زوبەیری، کورێ میر سەعیدی، یێ کو ل وی دەمی نەما بۆ ساخ و هاتبوو کوشتن[٩٨]. زوبەیر ل سالا ١٧٠٢ێ گەهشتە سەر حوکمی، وی ژنەک ژ جەزیرا بوتان مەهرکر و ل سالا ١٧١٤ حوکم دا کورێ خۆ بەهرەمی، و ئەڤە پاشی ب ناڤێ بەهرەمێ مەزن ب ناڤودەنگ کەت.

بەهرەمی د ناڤبەرا سالێن[٩٩] ١٧١٤ێ هەتا ١٧٦٨ێ دەستەلاتا میرگەهێ کر. ل سەردەمێ دەستەلاتا وی لێکولینا ڤەکولەر کارستن نیبوهر Carsten Niebuhr ل ١٧٦٥ێ دەرکەت. نیبوهر ب خۆ چ جاران سەرەدانا ناڤ چیایێن کوردستانێ و ئامێدیێ نەکربوو،

بەلێ هەردەم وە دکر کو هەمی دەنگ و باسێن دەڤەرێ بگەهنە وی. نیبوهر دبێژە بەهرەمێ گەلەک گرنگی ددا هندێ کو میرگەها وی وەک دەڤەرەک سەربخوٚ بهێتە ب نافکرن و دگوٚت، ئامێدیێ چ جاران ناهێتە ستاندن[100]. ئەو ژی وەکی چەلەبی ل سەدسالییا بەری وی یان ژی وەکی سلڤستریٚ دوساجی Silvestre de Sacy پشتی پێنجی سالا ژ وی بەحسێ رەوشا دەستەلاتێ هوسا دکە:

(**کوردان... چ جارا والی و موچەخورێن تورک ژ لایێ پاشای ڤە قەبول نەدکرن، بەلکو وانە ژ ناڤ عەشیرەتێن خوٚ دهەلبژارتن و ئەو کەس د کرنە ئەندامێن حوکمی، یێن وان ب باش دزانین**)[101].

## قەشێن دومێنیکانیێ

هەر ل وەختێ حوکمێ بەهرەمی و ل سالا ١٧٤٨ێ ئێکەمین دێرا مسسیونارێن دومێنیکانیێ ل مووسل هاتە ئاڤاکرن[102]. سلڤستریٚ دوساسی Silvestre de Sacy پشتی شێست سالان دنڤێسینە، کو وان قەشان ب هێجەتا چارەکرنا نەخوٚشان مالێن خوٚ ل وێرێ دانابوون، خەلکێ دەڤەرێ گەلەک یێ ژ وان رازی بوو و رەوشا وان یا خوٚش بوو. هەتا تورکان ژی نەخوٚشخانێن وان ب جهەک ب حورمەت دزانی و ئەو کەسێ چووبا ل سەر بەختێ وان، نەدهاتە گرتن[103]. قەشان ژ خوٚ رە ل ئامێدیێ بنکەهەک ئاڤاکر، کو ب تایبەت ل بارا پتر د مەهێن هاڤینێدا وەخت لێ دبوراند[104]. ئێک ژ ڤان قەشا دومێنیکو لانزا Domenico Lanza بوو. ئەو ژ ١٧٥٣ێ هەتا ١٧٧١ێ ل مووسلێ ژیایە و بەحسێ ئامێدیێ ل وی دەمی دکە، وەک باژێرەک مەزن یێ خودان گەلەک باخچێن فێقی و کەسکاتی یێن چاڤدایی ب بەتەن و ئەڤرازیێن دژوارڤە. هەروەسا بەحسێ ئینانا ئاڤێ ژ رووباری بوٚ ناڤ باژێری دکەت ب وان جوکێن جوان ب دەست چێکری و بەحسێ دێرەکا مەزن و مزگەفتەکا مەزن دکە[105]. ژ سالا ١٧٦٢ێ قەشێ دومێنیکانیێ ماوریزیو گارزونی Maurizio Garzoni ل دووڤ گوٚتنێن وی ب درێژییا ٢٨ سالان ل ئامێدیێ ژیایە[106].

د شەش سالاندا وی فەرهەنگەک کوردی - ئیتالی ژ ٤٦٠٠ پەیڤان دانایە و ب ڤی رەنگی هاریکارییەکا مەزن کرییە، کو زمانێ کوردی وەک زمانەک سەربخوٚ بهێتە ناسین و دانپێدان پێ بهێتە کرن. بەری وی دەمی کوردی ب گشتی وەک دیالێکتەک فارسی دهاتە زانین. وی دیالێکتا زمانێ کوردی ل ئامێدیێ بزمانێ کوردی یێ رەسەن و راست دزانی ل بەرامبەر زاراڤێن دن[107]. بەلێ جهێ داخێیە، کو وی، یێ ب راستی چ زانایێن ئەوروٚپی جهێ وی ناگرن ب زانینا وی، ل سەر دەڤەرا بەهدینان، چ نڤێسینێن ل سەر مێژوویێ و ژیانێ ل میرگەهێ ل دووڤ خو نەهێلاینە. ب تنێ نڤێسینا وی یا کورت ل سەر میراتگریێ ل میرگەهێن کوردان د جهێ خودایە. ئەو دبێژە، کو دەسەلات نە مەرجە پشتی نەمانا بابی بوٚ کوری چووبا، بەلکو پشتی مرنا دەسەلاتدارەکی بوٚ خورترین و چەلەنگترین ئەندامێ بنەمالێ دچوو. ئەگەر هوسا نەبا وەدیارە، کو ئەو ب خیانەت و شەری یێ گەهشتییە دەسەلاتێ. رولەکێ گرنگ بوٚ عەشیرەتان د ژیانا سیاسی دا ل قەلەم ددە. مللەتێ زیرەک و دژوار هەمی خەلکی عەشیرەتان بوو و ژ مێرێن وان هێزێن شەرکەران و لەشکەران پێکدهاتن. هەر عەشیرەتەکێ ئاغایەک هەبوو، یێ ژ لایێ میریڤە دهاتە نافکرن. بەلێ گەلەک جاران ژی هەر ئەڤ عەشیرەتە بوون، یێن ل دژی میری د رابوونە سەرخوٚ. سێ یان چار عەشیرەت دبوونە ئێک و شەر ل دژی میری دکرن. ئەگەر بسەر کەتبانە، وان میرەکێ ب دلێ خوٚ د دانا سەر حوکمی، بەلێ پا هەر ئێک ژ بنەمالا میری بخوٚ. ل وەختێ وی و ل دووڤ گوٚتنێن وی هەر ئێک ژ پێنج میرگەهێن کوردان ل ئیمپراتوریا ئوٚسمانی(بتلیس، جەزیرا بوتان[108]، ئامێدیێ، جولەمێرگێ[109] و قەرەچولان)[110] دوازدەهـ هەزار سیارێن شەرکەر هەبوون[111].

میراتگرێ بەهرەمی کورێ وی ئیسماعیل بوو، یێ ژسالا ١٧٦٨ێ هەتا ١٧٩٨ێ دەستەلاتدار بوویە[112]. ل دەمێ دەستەلاتا وی ئێزدیێن شێخانێ کەتنە بن حوکمدارییا میرگەها بەهدینان. ڤان ئێزدیا گەلەک

نەخۆشی و زۆری ل بندەستێ وی میری دیتی نە[113].

ل دەمێ حوکمێ ئیسماعیلی چەند سەرهلدانەکێن ئێزدیان روودان. ئیسماعیلی ل ١٧٧٩ێ میرێ ئێزدییا چولو و دوانزدەهـ ژ کەساتیێن ب ناڤودەنگ کوشتن و پسمامێ وی خەنجەر دانا جهێ وی. ئەڤە ژی هەر جارا ئێکێ بوو، کو حەکمدارەکێ مووسلمان مایێ خو (دەستێوەردانێ) د کارێ میرێن ئێزدییاندا بکەت. و پشتی سالەکێ وی خەنجەر ژی ئێخست و کورێ چولوی حەسەن کرە میر ل جهێ وی[114].

ل سالا ١٧٧٩ێ میرێ جەلیلیا عەبدولقادری ئامێدیێ دورپێچکر و ستاند. خرابکرنەکا مەزن کەتە بازێری و نێزیکی ٣٠٠ مالێن ئامێدیا ب زۆری هاتنە دویرئێخستنن بۆ بازێرێ مووسلی[115].

ئیسماعیلی شیا ل دژی برایێ خو شەری بکەت و ل سەر حوکمی بمینیت. چونکو برایێ وی ژی داخوازا دەستەلاتێ بۆ خۆ دکر و دەڤەرێن زاخو و ئاکرێ ستاندبوون[116].

پشتی وی و ل سالا ١٧٩٨ێ کورێ وی یێ بچویک محەمەد تەیار بوو میر. دبێژن ژیێ وی ١٦ سال بوون. پشتی وی سێ برایێن وی یێن دن حوکم کرن: موراد ژ سالا ١٨٠٢ێ هەتا ١٨٠٥ێ. بەلی پشتی وی پسمامێ وی بناڤێ قوباد بۆ سالەکێ هاتە سەر دەستەلاتێ ژ ١٨٠٥ێ هەتا ١٨٠٦ێ. بەلێ ژ بەر کو ئەڤ کەسە نەیێ خۆشتڤی بوو ژ هەمی لایان ڤە، هاتە لادان و برایێ سێیێ عادل دانا جهێ وی. بەلێ ئەو ژی پشتی دو سالا ب نەخۆشیا تاعونێ ل ١٨٠٨ێ مر. ژ ڤێ سالێ ڤە زێر[117]، داوی کورێن ئیسماعیلی بوو میر ل ئامێدیێ. تێ گۆتن، کو ئێک ژ کارێن وی یێن دەستپێکێ، کوشتنا میرێ ئێزدییا حەسەن بوو، یێ ژ لایێ بابێ وی ڤە هاتییە دانان و جهێ باوەریا وی بوو[118].

قەشەیێ دومینیکانی یێ ئیتالی ل مووسلێ Guiseppe Campanile، و بەری وی ژی لانزا Lanza، یێ کو گەلەك سالا ل مووسلێ ژیای، بەحسێ سالێن ژ ١٨٠٩ێ هەتا سالا ١٨١٥ێ دکەن. دبێژن ل سەردەمێ دەستەلاتا زێری ئامێدیێ بازێرەکێ ب هێز بوو. حەفت پاشان و وەزیران ل ڤی دەمی پێکول کر ئامێدیێ بستینن، بەلێ نەشیان. ب هێزا هندەک (چەند جوتەک) توپان بازێری شیا هێرشێن لەشکەرێ ئاسیایێ بشکێنیت و خۆ ب پارێزیت. سێ هەزار کەس ل ڤی بازێری دژیان. ژ وان چەند سەدەک فەلێن کاتولیکی بوون، سەد کەس کلدانی بوون، و نێزیکی ٨٠ێ کەسان ژی جهی بوون[119] ڤێ میرگەهێ پتر ژ چوار هەزار گوندان هەبوون. چ کارێن دن ل دەڤەرێ نەدهاتنە کرن ژبلی چێکرنا جلک و ئامانا. ل هەمی جهەا تەمبەل و بێزاری و هەژاری هەبوو[120]. ل سالا ١٨١٥ێ مسیونا (مزگێنبەرێن) دومینیکانی دەست ژ ئامێدیێ بەردا و جارەکا دی ل سالا ١٨٤٠ێ ڤەگەریان. ل سالا ١٨٥٩ێ دومینیکانێن فەرەنسی کارێ مسسیوناری بەردەوامکر[121].

ل داوییا روینشتنا کامپانیلە و ل سالا ١٨١٤ێ جوهن مکدۆنالد کینیر John McDonald Kinneir سەرەدانا میرگەهێ کر. ئەو هوسا بەحسی میری میرگەهێ زێری دکەت:

(پاشایێ ئامێدیێ، یێ کو نهو ئەم ل سەر ئەردێ وی نە، بناڤیڤە دکەڤیتە بن دەستەلاتا پاشایێ بەغدایێ، بەلێ ئەو بهەمی رەنگا میرەکێ میراتگرە، یێ ئازایەو سەربخۆیە. ئەو ئێکسەر ژ نەژادێ بنەمالا مەلەکێ عەباسیە. باپیرێن وی پشتی مرنا خەلیفێ عەباسی ل بەغدایێ هەتا نهو خودانێن دەسەلاتێ نە ل ئامێدیێ. ئەڤ پاشایە ئێکە ژ زەنگینترین و ب هێزترین پاشایێن کوردستانێ. بازێرەکێ وەک بورجەکا خورستی، سێ رۆژا دویر ژ باکوورێ مووسلێ. دەڤەرا وی ژ ٣١ پارچان پێکدهێت. هەمی پارچە دبوشن ژ مرۆڤان و ب بەرهەمن ژ گەنمی و تری و هەمی ژی کوردن، نێستروئانی نە(نسطوری، کلدان و کاتولیکن) [122].

## سەرەدانا رێڤنگێن برێتانی، محەمەدێ کۆرە و شکەستن

ئەم سوپاسییا سەرەدانا رێڤنگێ ئینگلیزی ریچ ی Rich دکەین ژ بۆ وان پەسنێن وی ب درێژی ل سەر دەمێ دەستەلاتێ میر زێری کرین[123]. هەرچەندە

ریچ ژی بخۆ وەکی ئاینسوورت Ainsworth دبێژیت سەرەدانا بازێرێ ئامیدیێ نەکریە[١٢٤]. ریچ بەحس دکەت کو ل سالا ١٨٢٠ێ نێزیک هەزار مالێن مووسلمانان، دوسەد مالێن جوهییان[١٢٥]، پێنجی مالێن نێسترویانی و هندەک یێن یاقوبی و ئەرمەنی دکەت. ئەو دبێژیت، کو بنەمالا میری ژ بەرزترین بنەمالێن میرێن کوردانە. بەحسی میری هوسا دکەت، کو کەس نەوێریت، وەکی سێنیکا وی یان قەلینا وی بکار بهینیت و ئەو هەردەم ب تنێ و بێی کەسەک ب بینیت نانی یان زادی دخوت. وی گەلەک بزاڤ دکر، ئەفسانەکا یێ کەس نەگەهیتێ و کەس نەشێتێ و کەس نابینیت ل سەر خۆ بەلاڤبکەت. د بەحسێ ریچ دا بۆ شێوازێ حوکمێ وی دا هوسا دیارە کو سەرۆکێن عەشیران پوستێ سەرۆك وەزیران دگرت و ئێکودو دڤی پوستی دا دگوهوری. ل دەمێ سەرەدانا وی، ئاغایێ نێروەیی‌یا، عەشیرەتەک پێکهاتییە ژ مووسلمانان و فەلان و جوهی‌یان، پوستێ سەرۆك وەزیران دەستی‌دا بوویە. و پشتی وی یێ نێزیک تر هەر سەرۆك عەشیرەتێ مزووریا بوو[١٢٦].

ئاغایێن هندەک عەشیرەتان مالێن خۆ ل ئامێدیێ هەبوون[١٢٧]. تشتێ بالکێش ژی ئەوە، کا چەوا باج دهاتنە وەرگرتن. میری بخۆ سەرەدانا ئاغایێن عەشیرەتان دکر و ل دووڤ سیستەمێ ئیسلامی باج وەردگرت.

هەروەکی بەری دوسەد سالان چەلەبی بەحس کری، ریچ ژی بەحسی وان شەلوالێن فرەهـ و رەنگاورەنگ و ب خەت دکەت (شەل)، یێن کو هەتا ئەڤرۆ ژی ل دەڤەرا بەهدینان خەلک دکەنە بەرخۆ[١٢٨]. هێشتا ژی بەحسێ راڤ و نێچیرێ دکەت. ل چیایێن دەڤەرێ پەزکێڤی دهاتنە کوشتن، کەو ب هاریکاریا داڤا و بازیا دهاتنەگرتن. هەتا ئەڤرۆ ژی کەیفا خەلکێ ئامێدیێ و دەورو بەرێن وێ ب کەوا دهێت، وەک بالندەکێ کیڤی بۆ نێچیرێ و بۆ بخودانکرنێ د ناڤ مالێدا. ریچ هەرهوسا بەحسی هندێ دکەت، کو هەمی خەلکێ ئامێدیێ ل هاڤینێ دەردکەتنە مێرگێن بلند، کو میری ل وێرێ کوچکەک هەبوو. خەلکێ دی ژی کەپر بۆ خۆ ئاڤادکرن.

ئەڤ ترادسیونە هەتا نهو ژی وەکی بەرێ ل دەڤەرێ یا مایی. بەحسێ ترسا خەلکی ژی ژ هێرشێن فەلێن تیاری ژ دەڤەرا جیران هەکاری ژی هاتییە کرن[١٢٩].

زێبر ل سالا ١٨٢٠ێ مر بێی ئێکی ل جهێ خودابنیت. د ناڤبەرا هەرچوار برازایێن وی: موراد، موسا، سەعید و ئیسماعیلی دا هەڤرکییەکا دژوار ل سەر بدەستێخستنا دەستەلاتێ دەستپێکر[١٣٠]. ئەڤە بوو فاکتەرێ بنگەهین یێ کەتنا میرگەهێ. میرێ داویێ یێ فەرمی ئیسماعیل کورێ تەیاری بوویە. پشتی سالێن ١٨٣٠ێ هەردو میران ئیسماعیل و سەعید پشکداری کرن د سەرهلدانان دا دژی ئۆسمانییا. هەرچەندە نە ژدل وەکی دراوسێ یێن خۆ هەردو میرێن بناڤ و دەنگ وەک میرێ بوتان بەدرخان ل پایتەختا خۆ ل جزیرێ و میر محەمەدێ سوران ل پایتەختا خۆ ل رەواندوزێ[١٣١]، میر محەمەد دهاتە ناسین ب ناڤێ میرێ کورە، چونکو چاڤەکێ وی یێ کورە بوو، ل دەمێ خۆ میرێ هەرە بهێز بوو د ناڤ کوردان دا. د چەند سالان دا وی هەمی میرگەهێن دەوروبەرێ خۆ ستاندن. کەس ب سەر زوریا وی نەدکەت، ب تایبەت د شەرێن خودا ل دژی ئێزدییان، بەلێ هەرهوسا جوهی و فەلێن نێزیک وان[١٣٢]. ژ هەمی مێژونڤیسان ب تنێ لونگریگ ب رەنگەکی پەسنێن ئەرێنی یێن شێوێ دەستەلاتا وی دکەت[١٣٣]. میر ئیسماعیل ب بەردەوامی د شەری دا بوو، ل دژی مرۆڤێن خۆ و د هەر دەمی دا ل دژی هێرشێن میرگەها سوران یێن میر محەمەدێ کورە بۆ سەر خاکێ دەسەلاتا وی. ل سالا ١٨٣١ێ میر ئیسماعیلی ئێدی نەدڤیا یان ژی نەدشیا، ئێزدیێن ل سەر بەختێ خۆ ب پارێزیت ژ هێرشێن میرگەها سوران. ڤێجا ئەو ژی چوونە دەڤ مزووریان و خۆ ب وان ڤە گرێدان. دهێتە گۆتن، کو نێزیکی ١٠٠ هەزار ژن و کچ هاتنە ئێخسیرکرن و پتر ژ ١٥ هەزار مرۆڤ هاتنە کوشتن[١٣٤]. هینری جیمس روس Henry James Ross، دختورەک بریتانییە، ل سالا ١٨٣٣ێ سەرەدانا میرێ سوران محەمەدێ کورە کرییە، دنڤیسینە، کو میرگەها (ئامێدیێ) کو بەری هنگی ژی یا پارچەکری بوو، ب کێمی دو کەسا ژ بنەمالا میری خۆ ب میراتگر دزانی و هەڤرکی و شەر ل بدەستێنانا

کورسیا دەستەلاتێ دکر. ئێک ژ وان سەعید بو کو وەک خشیم و بێهێز و دهاتە ناسکرن، خۆ ل ئامێدیێ ئاسێ کر بوو و یێ دی ژی ئیسماعیل بوو ل ئاکرێ[١٣٥].

ل بهارا سالا ١٨٣٣ێ ئاکرێ ب دەستێ میرێ کورە هاتە ستاندن، ئامێدیێ ژی هەر ل دەستپێکا وێ هاڤینێ پشتی دووریێچکرنەکا درێژ و تۆپبارانکرنەکا دژوار هاتە ستاندن. ب هەزاران قوربانیێن سیڤیل شەرکەرێن بەرەڤانی ژ ئامێدیێ دکر هاتنە کوشتن[١٣٦]. ل ئامێدیێ موسا[١٣٧] و ل ئاکرێ سەلیم وەکی رێڤەبەرێن باژێری هاتنە دانان. ئەو زۆربیا میرێ کورە د وەختێ خۆدا کری و هەتا گرتنا وی ژ لایێ ئۆسمانیا ڤە ل سالا ١٨٣٦ێ[١٣٨] پشتی هنگێ ب چەند نفشاڤە و هەتا نوکە ژی دایک و باب زاروکێن خۆ ب ڤەگەریانا وی دترسینن. ستاندن و ویرانکرنا باژێری و کوشتن و کومکوژیا خەلکێ باژێری کارەساتەکا هوسا یا مەزن بوو، کو باژێر ئێدی ج جارا نەشیا خۆ ژێ رزگار کەت و بزڤریتە سەر هێزا خۆ یا بەرێ. د سەر هندێرا ژی شەرێ ناڤخویی، یێ بنەمالا میران ل سەر دەسەلاتێ و سیاسەتا نوی یا مەرکەزیکرنێ یا سولتان مەحمودێ دوێ (١٨٠٨-١٨٣٩ێ) بوونە ئەگەرێن داویا میرگەهێ.

هەرچەندە ل داویا سالا ١٨٣٨ێ ئیسماعیلی باژێرێ ئامێدیێ و ئاکرێ ژێ ستاندەڤە[١٣٩]، بەلێ پشتی دەمەکێ کێم ژ دەست چوون.

دەمێ ل سالا ١٨٣٩ێ دختور و مسیونەرێ ئەمریکی ئیساهل گرانت Asahel Grant سەرەدانا دەڤەرێ کری، دنڤیسینە، کو کوردەکێ دی هەر ژ وی نەژادی ل ئاکرێ روینشت بوو، وەک رێڤەبەرێ باژێرێ ئامێدیێ و دگەل هێزەکا ژ ٣٣٠ چەتێن ئەلبانی[١٤٠]، چەوا ڤی کەسی گازندە ژ نەمانا نەژادێ خۆ و دەستدان ژ دەسەلاتا پتر ژ ١٢٠٠ گوندان دکرن[١٤١]. ل سەر ئامیدیێ ئەو دنڤیسینە:

**(من باژێر دیت وەکی یێ ب سەر ئێکدا هاتی ژ بەر شەرێن ب سەردا کرنا کوردێن رەواندوزێ، ژ هەزار خانییا ب تنێ دو سەد و پێنجی خانییا مرۆڤ تێدا دژیان. ئەو سێ چار پارچێن دی، وەکی هەمی بازار و دوکانا د خرابکری بوون و جهێ پیساتیێ و دلرابینێ بوون).**

گرانت بەحسێ لەشکەرێ داگیرکەرێن تورک دکەت، ل بەر دەرگەهێ باژێری، یێن گەلەگ پرسیار ژێ کرین. هەرهوسا بەحسێ نێزیکی سەد مالێن فەلان و سەد مالێن جوهییان دکەت[١٤٢].

هوسا دیارە کو دەمێ مسیونەرێ ئنگلیزی ئاینسڤورت ل سالا ١٨٤٠ێ گەهشتییە ئامێدیێ رەوشا باژێری هێشتا خرابتر بوو. ئەو دبێژە ژ هەزار خانی یان ب تنێ دوسەد مالان مرۆڤ تێدا دژیان. نێزیکی چارێکەک ژ بازاری دهاتە بکارئینان. یێن دی د خرابکری و پیس بوون. نێزیکی حەفتێ مالێن جهیا ل باژێرێ بوون و ئەو زێدەهیا خەلکێ باژێری بوون. وان

**(وێنێ ١٠)**
**منارا باژێرێ ئامێدیێ.**



(ژێدەر: Lovat ١٩٩٧)

**(وێنەیێ ١١)**
**پاشمایێن سۆلینا (گۆلا) ئاڤێ -کویرە سەرەجە -(کورا سێچێ)**



**ژێدەر، برگێت ١٩٩٣**

سێ کنیشتە هەبوون. هێشتا هەر دبێژە، کو قەسرا میری یا بەرێ، یا بنێ وێ ب بەرا و سەرێ وێ ب ئاخێ هاتییە ئاڤاکرن، یا ڤالا بوو و کەس تێدا نەدژییا، و بەحسێ ئەو منارا، هەتا ئەڤرۆ ژی دیار (بنێری وێنە ١٠ و ١٦) و مزگەفتەکێ دکەت.

شێست مالێن مووسلمانان هەبوون و پازدەهێن کلدانیا و پێنج مالێن کلدانێن رۆم و پێنج یێن ئەرمەنی و دوسەد زەلاما ژی رێڤەبەری ستاند بوو[١٤٣].

ئاینسوۆرت ئێکەمین رێڤنگە، یێ بەحسێ ئاڤاهییەکێ کری، ئەوا کاڤل و تژی ژ گلێشی کو هەتا ئەڤرۆ ژی دهێتە دیتن ل باژێری (بنێرە وێنێ ١١). ئەڤ کاڤلە بناڤێ کویرە سەرەجە یە(کورا سێرجێ- ل دووڤ گۆتنا خەلکێ ئامێدیێ). سەرەجە دیارە ژ پەیڤا عەرەبی (سەریج-صهریج) هاتییە، ب مانا گولا ئاڤێ یان ژی تانک. گەر ئەڤ ناڤە ل سەر وی دەمی هەبیت و رێڤنگا نەگۆتبیت یان ژی ل ڤێ داویێ هاتبیت، نەیا ئاشکەرایە، هەروەکی ژێ ڤی ئاڤاهی. ل دور ئاڤاهیێ کەڤری و ل دووڤ هندەک ئاڤاهیێن دی ژی گەلەک چیڤانوک و چیروک دهێنە گوتن. خەلکێ باژێری هەر دبێژن، ئەڤ ئاڤاهییە دێرەکا فەللایە یان ژی یا بەری ئیسلامێ یە. سەردابەکا ژ کەڤری، یا کو دیارە پشتی ئاڤاهیێ سەرەکی هاتییە ئاڤاکرن، هێشتا نەزانینێ ل بارەی ئاڤاهی دیار دکەت.

ئاینسڤورت باوەردکەت، کو ئەو ئاڤاهییەکێ ئاگر پەرستێن ساسانییە[١٤٤]. بادگەری کارتەک بوو دانایە و ئەو ئاڤاهیێ ل کەڤری هاتییە دانان ب جوببە (جبة) دزانیت. ئەڤە ژی راستە، چونکو وی گەلەکێن وەکو ڤان ل ئاڤاهییێن بچویکتر ل باژێری دیتینە[١٤٥]. باخمان Bachmann، یێ کو سالا ١٩١١ێ سەرەدانا باژێری کری، گۆتنێن ساندرێجسکی بێی ناڤێ وی بهینیت پشتراستدکەت. ژ لایێ وی ڤە وێنە و

١٢



**(وێنێ ١٢. پارچا A-B یا گۆلا ئاڤێ ل ١٩١١ هاتییە چێکرن. ژێدەر Bachmann ١٩١٣)**

١٣



**(وێنێ ١٣. کارتا گۆلا ئاڤێ ل ١٩١١ هاتییە چێکرن. ژێدەر Bachmann ١٩١٣)**

نەخشەکێ دروست ل بەر دەست هەنە.(وێنەیێن ١٢_١٣)[١٤٦] بوهمەر Boehmer، یێ ل ١٩٧٢ شوینوارێن ئاڤاهی خواندین، تیوریا جوببەی گومانبر دکەت. ل سەر ژورێن گوڕان (قەبران) دبێژە ئەو ل سەدسالیا ٥ێ یان ژێ ٦ێ هاتینە دانان، ئانکو بەری داگیرکرنا عەرەبان ل نیڤەکا سەدێ ٧ێ[١٤٧].

ئاڤاکرنا جوببێ دزڤریتە بەری ڤی وەختی ژی. یا ئاشکەرایە، کو ئەڤە ئاڤاهیێ دێرەکێ بویە، وەکی ژ فورمێ وێ دیارە[١٤٨]. ئاینسڤورت، بادگەر، روس، ساندرێجسکی و سیکیس Sykes پەسنا وێ کەلایێ ژی دکەن یا ل ئالیێ باکوورێ ڤی ئاڤاهی. دیارە کو میرێ کۆر ئەڤ کەلا ب دیوار ل سالا ١٨٣٠ێ ئاڤا کریە و ژ لایێ ئۆسمانییا ژی ڤە هاتییە بکارئینان. ئەڤ کەلە یا چار گوشەیییە و ل سەر هەر گوشەکی قوبەک گروڤر هاتییە ئاڤاکرن. ئەڤە ژی وەکی گورێن گورستانی ل سەر نەخشێ باخمانی د دیارن. (وێنێ ١٢). ئەڤ ئاڤاهییە یان ژی ئەڤ ئاڤاهیێ نوی کری هەتا ئەڤرۆ ژی ژ لایێ لەشکەری ڤە دهێتە بکارئینان. ئاینسڤورت هەرهوسا بەحسی سیلاڤێ دکەت، ئەو جهێ ئەڤرۆ ب ناڤ و دەنگ ل دەڤەرێ ب سەیران و گەریانا دگەل شەلالێن خۆ، یێن ئەڤرۆ ژ بەر چێکرنا جادێ بۆ ئامێدیێ بوینە دو پارچە، یا سەری و یا بنی. هەر هوسا بەحسێ گەلیێ مزیرکا دکەت، یێ پاشی رۆلەکێ مەزن دبەرخودانان دا ل دژی ئنگلیزا دبینیت. هەرهوسا بەحسی سەیرانگەها بنەمالا میری ل ناڤ مێرگان دکەت، یا پشتی ٥ سالان بوویە کاڤل، هەروەکی روسی دیتی[١٤٩].

## حوکمێ ئوسمانییا و شەرێ ل دژی فەلێن دەڤەرێ

ئاینسڤۆرت Ainsworth ل سەرەدانا خۆ ل سالا ١٨٤٠ێ و هەروەسا جوست Just ژی دەمێ جارەکا دی مسیونا دومینیکانی دەستپێکری[١٥٠]، گەلەک خەمێن هندێ خوارن، کو هێرشەک ل دژی فەلێن تیارێ[١٥١] د نیڤەکا ئامێدیێ و جولەمێرگێدا، کو ئەڤرۆ هەکاریە، بهێتەدەستپێکرن[١٥٢]. نیشانێن کارەساتەکا مەزن دیار بوون.

گێۆرک پێرسی بادگەر George Percy Badger، ئەو مسیونارێ ئێرتسبیشۆفێ Erzbischof کانتەربوری، ل سالا ١٨٤٢ێ گەهشتە مووسلێ و نڤێسییە، دیارە فەلە و مسیونار ژ لایێ کوردا ڤە وەکو چەپەرێ بەری ئوسمانییا دهێتەزانین و گەرەگە ئەڤە بهێتەچارەسەرکرن. میرێن بەدرخان ژ بۆتانێ، نورەدین ژ هەکاری و ئیسماعیل ژ ئامێدیێ، ل دووڤ دیتنا وی، هێزێن سەرەکی بوون[١٥٣]. پلانا ب هێز و لێدان ل دژی فەلان رابن، ل دووڤ دیتنا وی، یا هەیی بوو. ب تنێ ئەڤ هێرشە ل بوهارا سالا ١٨٤٢ێ نەهاتەدەستپێکرن، ژ بەر کو میرێ بنکەتی ئیسماعیل هەموو شیانێن خۆتەرخان کربوون، دەڤەرێن وی یێن ژ دەستچوویی، بزڤرینیتەڤە[١٥٤]. دهێت گۆتن، کو ئیسماعیل ل ڤی دەمی ژ زیندانێ رەڤی و ب هاریکاریا بەدرخانییا دێرا رەببان هورموزد تالان کر و رێبەرێ وێ دگەل ١٢ قەشان زنجیرکرن و وەک گەرەو برن[١٥٥]. هەر ل هاڤینا ڤێ سالێ وی جارەکا دی ئامێدیێ ستاند. دوژمنێ وی یێ نوکەبوو محەمەد پاشا، والیێ ئوسمانییا ل مووسلێ، ئەوێ ل سالا ١٨٣٦ێ دوژمنێ ئێکێ یێ میرگەهێ، میر محەمەدێ کورە، بێ دەسەلاتکری. دەمێ ئوسمانیجارەکا دی نێزیکی دەڤەرێ بووین، ئیسماعیلی هیڤی ژ میرێن کوردان و ژ فەلێن نوستەریانی کر، هاریکاری و پشتەڤانییا وی بکەن. مەزنێ فەلان هیڤییا وی رەدکر، ب تنێ هندەک عەشیرەتان پشتەڤانییا میری کرن[١٥٦]. گویست Guest نڤێسیە، فەلەیان بدزیڤەپەیمان دگەل محەمەد پاشای گرێدا. ل هەیڤا ٩ێ یا سالا ١٨٤٢ێ ئامێدیێ ب داوی کەتەبن دەستێن ئوسمانییا. میر ئیسماعیل پشتی گەلەک پێکولا زڤرینا ئامێدیێ کری، ل مووسلێ هاتەگرتن. ژنا وی ئەسما و دگەل مالا وی چوونەسەر بەختێ قونسلێ ئنگلیزی ل مووسلێ[١٥٧]. پاشی مالا وی چوو بەغدا، ئەو جهێ ئیسماعیل ل سالا ١٨٧٦ێ لێ مری و ل مزگەفتا شێخ عەبدولقادر گەیلانی هاتییەڤەشارتن[١٥٨].

پشتی دەمەکێ کێم ژ پیشوازیا بەدرخانی، نورەللای، میرێ کەتی ئیسماعیلی و میر مەحمودێ وانێ بۆ دختورێ مسیونارێ ئەمریکی، ئاساهێل گرانت Asahel Grant، ل ١٨٤٣ێ، د ئێک ژ گەلەک سەرەدانێن وی دا بۆ دەڤەرێ، هاتیبەکرن[١٥٩] و ل هاڤینا ١٨٤٣ێ کۆمکوژیەک ب سەر عەشیرەتێن فەلێن نوستەریانی ل چیایێن تیارێ رویدا. کو پێنج ژ سەدێ ژ خەلکێ دەڤەرێ ـ لایارد بەحسی ١٠ هەزار کوشتییا دکەت ـ بوونەقوربان[١٦٠]. بەلگەهەنە بۆ بەشداربوونا کوردێن ئامێدیێ لڤێ کومکوژیێ[١٦١]. ب کێماسی سێ مالێن مووسلمانان ل ئامێدیێ ئەڤرۆ بەحسی هندێ دکەن، کو باپیرێن وانە د بنیاتدا فەلەبووینە، ئەو ژ ڤێ کۆمکوژیێ قورتال بووینە و بووینە مووسلمان و ل مالێن مووسلمانان هاتینە وەرگرتن و خودانکرن[١٦٢].

دەربارەی باژێری ژی پشتی دەستگیریا ئوسمانییا پری ئاستەنگ و نەخۆشی هەبوون، ب تنێ چەند جارەکا بۆ دەمێن کێم هوسا نەبوو، ئەو ژی دەمێ میر ئیسماعیلی هندەک جارا باژێر دستاندەڤە. د ڤی دەمیدا کەمینەیێن ئۆلی گەلەک نەخۆشی دیتن. ب تایبەت ـ هوسا دهێتە ل قەلەمدان ـ والی محەمەد پاشا گەلەک ب سەختی زورداری ل خەلکی دکر. هوسا وی مرۆڤ بساخی کرینە د دیواراندا و ڤەشارتینە، هندەک جاران وی سەرێن مرۆڤێن ژ سەرژێکری ب سندوقا دهنارتنە مووسلێ[١٦٣]. بادگەر Badger بەحس دکەت، کا چەوا وی ل شوباتا ١٨٤٣ێ ب سەر هندەک جوهیيان هەلبوو، یێن کو ژمارا وان ١٥ کەس بوون و ژ نەچارییا خۆ هاتبوونە مووسلێ، دا گلەییێ ژ والییێ ئامێدیێ بکەن. ئەوی ل وی دەمی ٣٠ مالێن فەلان، ژ وان ٢ مالێن ئارامییا و

(وێنێ ژمارە١٤)
ڤەسرا حاکمی دگەل سەرێ سیمەرخێ.



ژێدەر Binder ١٨٨٧

**(وێنێ ژمارە ١٥)**
**منارا ئامێدیێ و تاخێ کاڤلکری.**



ژێدەر Binder ١٨٨٧)
**(وێنەکێ بێ دلۆڤانی یێ وێرانکرنێ و دیمەنەکێ ژ گۆڕێن کەتی بێ هژمار وەکو زەڤیەکا تەرما)**

نێزیک ٥٠ مالێن جوهییان ل باژێری دیتبوون. ل سەر ژمارا مالێن مووسلمانان وی چ گوتن نەکرینە، بەلێ گەرەکە ژمارا وان ژی گەلەک کێمتر لێ هاتبیت. د وی دەمی دا رێڤەبەریا ئوسمانی هاتووچوون ب گشتی قەدەغەکربوون[١٦٤]. نڤیسینێن رۆس Ross ل سەر بەرتیل و گەندەلیا رێڤەبەرێن ئوسمانی راستبیا بارودۆخی پتر ئاشکەرا دکەن: ل ١٨٤٧ێ دبێژە، رێڤەبەرێ ئوسمانی ل ئامێدیێ بێ دەماغ و بێ نەزانە، وی ب هەموو رەنگان ئابووریا خەلکی دگڤاشت و ب فێل پارە ژ وان چێدکرن[١٦٥]. ساندرێجسکی Sandreczki ژی هوسا بارودۆخێ پەسندکەت: گەلەک جاران بەحسێ هندێ بێ کری، کا چەوا وانەب زوری و بێ مانا پارە (باجە) ژ وانەدستاند و سەختییا زۆر ب تایبەتی ل سەر مالێن فەلان و جویان. هەروەسا بەحسی مرنا ژێرسادا و خوکوژییێ - دا رزگاربن - هاتییەکرن[١٦٦]. ساندرێجسکی دبێژە، مەزنێن کوردان - یێن بچویک - وەک خزمەتکارێن

**(وێنێ ژمارە ١٦)**
**سیمەرخێ سەر دەرگەهی ل سالا ٢٠٠٢ێ**



ژێدەر BGFK)

حوکمەتێ، زۆری ل فەلان دکر و پاشایێن ئوسمانی ژی خۆ ب سەرڤەنەدبر و ب تنێ چاڤێن وان ل هندێ بوون، کا دێ چەوا بەریکێن خۆ تژی کەن[١٦٧]. دەمی لایارد Layard ل ١٨٤٦ێ سەرەدانا باژێری کری، ئەڤ وێنێ ب خەم دیت:

(مەخۆ ل نیڤەکا کۆمێن کاڤلێن حەوشا، بازارا، سەرشویا و خانییان دیت. هەر تشت یێ کەتی بوو و ڤەکری، هوسا کو مرۆڤ دشیا هەموو قولاچکا ببینیت. دیوارێن کەتی ترس بۆ رێڤنگا چێ دکر، کو ئەگەر ئێکی مرۆڤ ل ڤێرە دیتبانە، بەلێ یا هەموو یا ڤالا بوو وەکو بەرییەکێ. مەگەلەک ب زەحمەتی د ناڤ ڤان کاڤلان دا رێیا خۆ بۆ وی کاڤلی دیت، یێ کو دبێژنێ سەرای (قەسر) یان کۆچک)[١٦٨].

سوپاسیا مە بۆ روسییە، یێ هندەک باشتر پەسنا کۆچکێ کری ل سالا ١٨٤٧ێ، پشتی داوین میر ژێ دەرخستی و ئەڤ ئاڤاهییە ژ لایێ تورکانڤە وەکو جهێ رێڤەبەریێ هاتییەبکارئینان، هەر چەندەک هەموو هاتبوو خراب کرن. بەلێ د ناڤ ڤان کاڤلاندان ژی جوانییا وێ یا کەڤن دیار دکر. روس دبێژە، کو دیوارێ دەرڤە، یێ پارچەک ژ دیوارێ باژێری بوو، یێ ل وی دەمی

(وێنێ ژمارە ١٧)
دەرگەهێ رۆژئاڤای (دەرگەهێ میسلێ) ل ٢٠٠٢ێ.



ژێدەر BGFK)

ژی هێشتا مابوو. (بنێرە وێنەیێ١٤) ل هنداڤ ڤی دیواری ـ ب گۆتنێن وی ـ جهێ ژیانا ژنکان بوو و هوسا ژ لایەکیڤە دکەت، بەردەڤێ تۆپێن هێرشکەرا و ژ لایێ دی ژیڤە جوانترین دیتن بۆ دیمەنێن دەوروبەرێن دەڤەرێ و دیتنا هەموو هاتی و رێڤنگ و دەرکەتیا ژ باژێری. کوچک ژ گەلەک ئاڤاهیان پێکدهات، یێن کو چارگوشەکا مەزن د نیڤەکا خۆ دا دهێلا، ئەو ژی بدیوارەکی (ناڤبر) دبوو دو پارچە. ل سەرێ حەوشێدا جهێ ژیانا میری و مێهڤانا بوو و هەروەسا پێشوازیێ، دیوانخانە. ل نیڤا دی ژی ژناڤدا جهێ دبێژنێ، حەرەم، جهێ ژیانا ژنکان بوو. ل جهێن ل سەر عەردی (ب راستیا عەردی) ل هێلا ئێکێ جهێ گوڤێن دەوارا و یێن خزمەتکاران بوو. ل جهێن سەری ژورێن میری و مالا وی بوون. روسی دیت، کو گەلەک یا کەتی بوو، تالانکری و بەرڤ هەرفتنێڤە بوو. بەلێ ب جوانی بەحسێ مەزنییا وێ، بانێن ژ دارێ نەخش کری و جوان دکەت و هەروەسا وان دەرگەهـ و پەنجەرێن ل دوڤ وێنێن فارسی و بابەتێن جوان هاتینەرەسمکرن و هەروەسا ژی وان ناڤبرێن ژ داری د ناڤ ژوران دا[١٦٩]. ئەڤ کۆچکە هەتا سالێن ١٩٦٠ێ ل جهێ خۆمابوو و پاشی وەک دبێژن هاتەپەقاندن[١٧٠].

روس هێشتا وەسفا کانیکەکێ دکەتو ژورا چەکان (چەکێن پەقاندنێ) و تۆپێن جۆراوجۆر هندەک چەکێن دن یێن ستاندییا و داگیرکەرا ژ کوردێن سوران و ئوسمانییا[١٧١]. وەکو لانزا Lanza و ئاینسوورت بەحسی مزگەفتێ و مناری دکەت.

ئەو ئیشارەتێ ب بازارێن ئاسنگەرا دکەت و هوسا ئیشارەتێ دکەتە مانا گرنگ یا هەسپان ل ڤی بازێری د ڤی دەمی دا و دەمێن بەرێ یێن کێم سەختتر[172].
ل ١٨٤٩ێ مسیونارێ بریتانی هێنری شتێرن Henry Stern ل ئامێدیێ مایە. ئارمانجا وی کوردێن جوهی بکەتە فەلە، ژ بەر ڤێ چەندێ ژی نڤێسینێن وی ل سەر وانەنە. ئەو دنڤێسینە، کو خەلکێ جهویێ بەرێ گەلەک بۆش بوو، پشتی داگیرکرنا کوردێن رەواندوزێ و پشتی وان تورکێن ئوسمانی تەو ب تنێ نێزیک ١٠٠ مال ماینە. ئەو کنێشتا مەزن یا هەرفتییە. ئەو بەحسی دو سەرهلدانێن جڤاکێ ب ناڤ دکەت[173].

پشتی سالەکێ ئەڤ ژمارێن هەنێ ل دوڤ گۆتنێن ساندرێجسکی هێشتا کێمتر لێهات: ئەوێ نێزیکی ٦٠ مالێن جهویان و پێنج یان شەش مالێن فەلان دبینیت، ژ وان مالەکا ئەرمەنی. جهویان دو کنیشتەهەنە، نوستەریانیا چ دێر نەبوون، بەلکو مالا قەشێ خۆ بۆ نڤیژا بکارتینا. ساندرێجسکی وەسفا کومێن کاڤلا ل بازێری دکەت، کو ژ بەرێن وان دیارن، د دەمیدا مالێن باش ئاڤاکری بوون.

دەمێ ل ١٨٨٠ێ هێنری بیندەر سەرەدانا بازێری کری، یا دیار بوو، کو بازێری ژ وەستیانێن داگیرکرییێ چ بێهنا خۆنەڤەدا بوو. هەروەکو بەرێ بارا پتر ژ کاڤلێن وێرانکری و لێدانا تۆپان وەکو موخلێ بوو (بنێرە وێنە١٦). ئەو و رێڤنگێن دگەل وی ل مالەکا بەرەخ دومینیکاناڤە نڤستن. ل سەرێ بازێری پتر مالێن جهویان بوون، پتریا خەلکێ دی ژی هوسا دیاربوو، کو د ناڤ باغچان دا بوون ژ بۆ چنین و درینا[174]. بیندەر Binder بەحسی بازارێ دکەت، کو گەلەک یا بچویک بوو، ب رەخ کۆچکا والیڤە، یا بەرێ کۆچکا میری بوو. هەروەسا بەحسی کاڤلێن خانا کاروانییا یا بەرێ دکەت[175].

ئەو دەرگەهێ بیندەری ب ناڤێ دەرگەهێ میری (دەرگەهێ ئیمارەت)ێ کری[176]، هێشتا ل بازێری دهێتەدیتن (بنێرە وێنە١٧)، ژ دو پارچێن بەری یێن مەزن پێکهاتییە و قفلەک ژ بەری. ل سەر ڤانە دو پەنچێن تەیرەکێ نێچیرێ هەنە،د ناڤ وان لەشێ وەکو ئەژدەهار، یێ چەند جار دخۆ ئالییایی[177]. سەر و لەشێن ڤی تەیری یێن رەسەن نەماینە، بەلێ پشتی هنگێ ب کەلەخێ ئەلهویەکی هاتینەچێکرن[178].

مێژویا دروستی نە یادەرگەهێ و نە یا سەرێ وی دهێتەزانین[179]. ژ وێنێ گرتی یێ بیندەری (وێنە١٤) باش دیارە، کو دەرگەهێ هێشتا ئەڤرۆ مایی دەرگەهێ چوونە ژوور یێ کۆچکا کەڤن یا میری بوویە. بیندەر دبێژە، کو وی ژ ڤی دەرگەهی بازێر ب جهێ هێشتییە[180]. روس وەسفا دەرگەهەکی ب فورمێ کڤانەکێ دکەت، کو ل هەردو لایا ژوورێن زێرەڤانێن بازێرینە و د وی دەرگەهی را ئەوچوویە ژورێ د ناڤ بازێریدا[181]. ژ بەر ڤێ چەندێ دیار دبیت، کە دەرگەهێ زێباری[182]، یێ ژ لایێ وارکوۆرت Warkworth هاتییەنەخشکرن و دەرگەهێ ئەژدەهارەکی ب سڤاندەکیڤە ب ئێکڤەگرێدای بوون و هوسا دئێک دەم دەرگەهێ بۆ چوونە ژوورێ د ناڤ کۆچکا میریدا بوو[183].

هەروەکو مەگۆتی دەرگەهێ رۆژئاڤایی یان دەرگەهێ مووسلێ ژی یێ مای. ل دوڤ نڤێسینێن ل سەر ڤی دەرگەهی، ئەڤە ژ لایێ بەدرەدین لولو هاتییەئاڤاکرن[184]. پشتی هەرفاندنا ب تەمامی ل سالێن ١٩٦٠اندا ب دەستێ هێزێن عیراقیڤە، ل سالێن ١٩٧٠یاندا وەکو بەرێ هاتییەئاڤاکرن، بەلێ نە ب دەستێن بسپورا (وێنە١٧). ل دوڤ گۆتنێن خەلکێ دەڤەرێ، یێن د ئاڤاکرنێ دا بەشداری کری، وانە هەولدایە، پارچێن مایی ب هەر رەنگەکی ب ئێک ڤەنێن. دیمەنێ رەسەن یێ ڤی دەرگەهی و فورمێ وی نەماینە بهاریکاریا وێنێن ل سالا ١٩٥٥ێ هاتینەگرتن، هەروەکو مەئیشارەت پێدای[185]. دەرگەهێ کارەکتەرێن بازنی دیار دکەن، پێکهاتییە ژ دو ئەژدەهاران، یێن ب دەڤەکێ ڤەکری و د ناڤ ئێک دو دا ئالییای هەرئێک شەرێ ئێک لەش دکەن، وەکو لەشێ مرۆڤییە[186].

١٨٩٠ێ ئامێدیێ ٥٠٠٠ رینشتی هەبوون، ژ وان ٢١٠٠ کوردێن مووسلمان بوون، ٦٠٠ فەلێن کلدانی

(وێنێ ژمارە١٨)
کاڤلێ ماڵباتا کتانی.



ژێدەر www.wena.xozga.com)

بوون و ١٩٠٠ جهو بوون. زێدەیی وانە٤٠٠ تورکێن ئوسمانی ل رێڤەبەرییێ یان ژی لەشکەر و چەندرمە هەبوون. باژێر جهێ رێڤەبەریا ئوسمانی و قەشێن کلدانی بوون، هوسا دادگەهەک ئۆلی و دادگەهەک دنیایی هەبوون و مسیونا دومینیکانی ژی. ل بازارێ نێزیک ٨٠ دوکانێن بچویک هەبوون. خەلکێ ئامێدیێ و وێ دەڤەرێ وەک خزمەتکارێن بندەستێن نمونەیی بۆ ئوسمانیيا پەسندکرن [١٨٧]، ئەڤە ژی پشتی وان روودانێن ب سەرێ وان هاتین نەتشتەکێ سەیرە یان ژی بکەنییە.

ل ١٨٩٧ێ لورد وارکوورت د ناڤ ئامێدیێ را بوری و وی ژی وەکو ئاینسوورت ب جوانی بەحسی سیلاڤا ئاڤێ کرییە. ل باژێری ب تنێ بەحسێ بازارا وێ یا پیس کرییە. بەلێ ئەوی ئەو وێنێ جوان، یێ ل سەری دیارکری، یێ دەرگەهێ رۆژئاڤایی بەری خراب ببیت، گرتییە و هوسا دیارە ئەڤەتاکە وێنەیە(وێنە٦). ل ١٩٠٢ مارک سیکەسێ Mark Sykes بریتانی سەرەدانا باژێری کرییە و ب تنێ چەند رێزەک نڤێسینە، کو چ تشتێ نوی تیدا نینە [١٨٨].

ب رەخ ڤان گەلەک ئاڤاهیێن جوان ڤە، یێن ژ هەژی دیتنێ نە، گەرەکە ئەم ئیشارەتێ بدەینە کاڤلێن خانییێن بنەمالا کتانی، کو دئێتە ناسین ئێک ژ ب

ناڤ و دەنگترین مالێن ڤی بازێری (وێنەیێ ١٨). د بن بازێری دا ژ لایێ رۆژهەلاتی کاڤلێن قوتابخانا قوباد هەنە، یێن رەنگەل نیڤەکا سەدا ١٦ای لسەردەمی حوکمێ میر حوسێنی هاتییەئاڤاکرن (بنێرە وێنێن ٢٠ و ٢١). ل ١٩٠٢ای ژ لایێ سیکەس ڤەبەحسی کاڤلێن وێ کرینەو ب تشتەک نەیێ سەرنجراکێش ل قەلەمدایە، ژبلی جهێ وێ یێ گەلەک خۆش[١٨٩].

ل سالا ١٩٠٥ای سەدیق دەمەلوجی هاتییە میرگەها کەڤن وەکو رێڤەبەرەکی مەزن و نڤێسەڤانی پەرتووکەکێ ل سەر ئامێدیێ و گەلەک ب تەحلی بەحسی کاڤلان و نەخۆشییا و بازرگانییا خولام و خودامان ژ لایێ داگیرکەرێن تورک دگەل گەنجان و کچکان[١٩٠]. هەروەسا بەحسی سەرهلدانەکێ ل دەڤەرا بادینان دکەت ب دەمەکێ کێم بەری شەرێ جیهانێ یێ ئێکێ[١٩١]. زوی ل سالا ١٩١٤ای و ژ بەر زێدەکرنا باجان هەموو خەلکێ دەڤەرێ رابوو سەرخۆ ل بن سەروەرییا شێخ عەبدولسەلامی. ئەڤێ ژی پەیوەندی دگەل کەسایەتێن میران یێن کوردستانێ ل ستەنبۆلێ هەبووینە، ژ وان شەریف پاشا و ئەمین عەلی بەدرخان، کورێ داوی یێ میرێ بۆتان. ئارمانج ژ ڤێ سەرهلدانێ ئەو بوو ڤێ سەرهلدانێ بەرفرەهـ بکەن، هەتا د ناڤ ئیرانێ دا و دانانا شەریعەتا ئیسلامێ وەک یاسا و دانپێدان ب زمانێ کوردی. سەرهلدان هەر ل هەیڤا شەش ل سالا ١٩١٤ای هاتەشکاندن، شێخ رەڤی چوو ئورمییێ و ل هەیڤا ١٢ای هەر ل وێ سالێ ل مووسلێ هاتەسێدارەدان[١٩٢].

ل ١٩١١ای ل گوندێ بێبادێ، نێزیک ئامێدیێ و ب روخسەتا حوکمەتا ئوسمانی مسیونا ئاسوری

**(وێنێ ژمارە١٩)**
**کاڤلێ مەدرەسا قوبادی ل گولانا ١٩٤٤ای.**



(Envia Warda via RAF Habbaniya Association ژێدەر

(ئاشوری) یا قەشێ كانتەربوری Erzbischof هاتە دامەزراندن و ب کێمی هەتا سالا ١٩٢٠ێ ل وێرێ مابوو[193]. مسیونارێ ئینگلیزی ویلیام ئاینگەر ویگرام William Ainger Wigram، یێ کو سێ سالا ل ویرێ ژیای، ل ڤان سێ سالا بەری شەرێ جیهانێ یێ ئێکێ، چەند نڤێسینەکێن خۆش و پر زانین ب جهـ هێشتینە ل سەر ژیان و پەیوەندیێن د ناڤ باژێری دا و دەوروبەرێن وی[194]. ل سەر روودانێن شەری ل سەر باژێری چ زانین نینن. ل دوڤ گۆتنێن خەلکی دەڤەرێ یێن دبێژن، ژ بەر سوتنا زەڤیان و دەوارێن کوشتی دگەل شەری و ژ بەر زڤستانەکا گەلەك سار برس و نەخۆشی ل دەڤەرێ پەیدا بوون، ب تایبەت ل دەڤەرا دراوسێ ل هەکاری[195].

## مانداتێ(ئینتیداب) بریتانی ل عیراقێ

ل سالا ١٩١٨ێ ئەڤ دەڤەرە ژ لایێ هێزێن بریتانیڤە هاتەداگیرکرن، ل ١٩١٩ێ بریتانیا ماندات وەرگرت، ئەڤ مانداتە هەتا سەربخۆبوونا عیراقێ ل ١٩٣٢ێ بەردەوام بوو. باجەدهاتە وەرگرتن و ئاغایێن عەشیرەتان وەکو هێزێن چەکدار کاردکر و پارە وەردگرتن[196]. ل هاڤینا ١٩١٩ێ ل ئامێدیێ بەرخۆدانەک دەستپێکر، سێ کەس ژ سوپاییێن بریتانی ل سەر بانێ مالێن وان د خەو دا هاتنە کوشتن[197]. ل دووڤ بوچوونێن بریتانی، مایتێکرنا وان د شەرێن د ناڤبەرا دو عەشیرەتێن یان بنەمالێن دوژمن

(وێنێ ژمارە٢٠)
کاڤلێ مەدرەسا قوبادی.



ژێدەر Birgit Ammann)

ل دەڤەرێ ئەگەرێ ڤێ بەرخۆدانێ بوو[198]. ل دووڤ دیتنێن كوردا، ئەگەرێ ڤێ بەرخۆدانێ، نەرازی بوونە بۆ مایتێكرنا بریتانیا د كارێن وانەیێن ناڤخویی دا. زانینا راستیێ ل سەر ڤێ چەندێ نەدیارە. ب هەموو رەنگا ئەڤ كەسێن ئەڤ كارەكری وەک قەهرەمان دهێنە دیتن ل دەڤەرێ. ئەكسیونا تولەڤەكرنێ هەتا هەیڤا ٩ێ سالا ١٩١٩ێ ڤەكێشا. د ڤان شەراندا ب سەدەهان لەشكەرێ بریتانی و چەكدارێن هندی و شەركەرێن كورد ژ هەموو عەشیرەتێن كوردا ل ئامێدیێ و دەوروبەران بەشداربوون. ئەڤ شەرە بەهرا پتر ل گەلییێ مزوركا، دسەر سیلاڤێن سیلاڤێدا روودان و بدیتنا چاڤا ژ ئامێدیێ دویر. ژ لایێ بریتانیا گەلەک پتر ژ سەد كوشتیبا و ژمارەكا هێشتا پتر ژ بریندارا كەتن[199]. چ ژمارە ل سەر خوسارەتییێن كوردان نینن. چەندین مال رەڤینە توركیایێ، ب تنێ بەشەک ژ وانەشیان بزڤرنەڤە پشتی لێبورینەكێ.

ل ڤی دەمی توركان عەبدوللا پاشا، كوردەک ژ رەواندوزێ، دانابوو وەک رێڤەبەر ل ئامێدیێ، ئەوی ب توركی دگەل خەلكی دئاخفت، چونكو تێكەهشتن ژ بەر دیالێكتا یا ب زەحمەتبوو[200]. گرێدانا ب درستی یا هەرێما كەڤن یا توركیایێ، مووسل، ب سەر خاكێ عیراقێڤە ل ١٩٢٦ێ رویدا. بریتانیا پێكولكرن، ڤێ دەڤەرێ ب عیراقێڤەگرێدەت، دەمێ تركیا پرۆپاگەندا دژوار دكر ل دژی فەلێن دەڤەرێ ژ بەر كو هاریكارێن بریتانیا بوون. ب دیتنا بەرپرسێن بریتانی، وەرگرتنا ئامێدیێ ژ بۆ بریتانییا بزەحمەتتر بوو ژ دەڤەرێن دی، وەكو زاخۆ یان شێخان[201].

ل ١٩٤٨ی چ ب كرنەدەرێ یان ب ڤەگەریان بۆ وەلاتی تێكەل دەستپێكر و رەنگەهەموو مالێن جهوییێن دەڤەرێ و ئامێدیێ و كوردستانا عیراقێ بۆ ئیسرائیلێ چوو بن[202]. ژ بەر وێ راستییێ، كو ئامێدیێ سەنتەرێ جڤاكەكا گرنک یا جهویان ل كوردستانێ بوو، یا ب دكومێنت هەشت سەد سالا و رەنگە بەری هندێ ژی ب چەند سەد سالەكان بوو[203]، كوچەربوونا (چوون بۆ جهەكێ دن) جهویان خوسارەتییەكا مەزن بوو بۆ هەردو لایان. ژ بەر گهورینێن سیاسەتا دەرڤە و ڤەكرنا سیاسەتا ناڤدەولەتی یا سەرەكی ب تایبەتا ل كوردستانا عیراقێ، ژ دەستپێكا سالێن ١٩٩٠وەرە دانوستاندنەكا كولتوری و رەوشەنبیری ل سەر ڤی بابەتی چێبوویە. ئەڤە ژی د وێ چەندێ دا دیار دبیت، كو ئێریک براوەرس Erik Brauers پەرتووكەک پر گرنک و ب ناڤەرۆک ل سەر جهوییێن كوردستانێ ل كوردستانا عیراقێ وەرگێرا زمانێ عەرەبی و ل ٢٠٠٢ێ بەلاڤكر. هەروەسا زڤرین و بەردەوام بوونا تێكەلییێ د ناڤبەرا مالێن كوردێن مووسلمان و فەلان دا، كو پتریا وانەژ كوردێن جوهی نەبووینە فەلە، هەروەساكوردێن ئیسرائیلێ و پاشهاتییێن وانە، رۆل كێ مەزن د ڤێ چەندێدا دبینن.

پشتی نەمانا دەستەلاتا مەلكی ل عیراقێ جارەكا دی هیڤیبا وەكهەڤیێ ل عیراقێ د ناڤ كوردان دا بەلاڤبوو، بەلێ وەكو هەرجار ب جهـ نەهات. هەر ل سالا ١٩٦١ێ نڤیسەڤانی ئەلمانییا رۆژئاڤایی لۆتەر شتاین Lother Stein، بەحسی دژایەتیبا پولیسێن عەرەب ل ئامێدیێ دژی رێڤنگ و سەرەدانێن بیانی كرییە و نەب دەمەكی درێژ پشتی هندێ، تۆپبارانكرنا باژێری ژ لایێ هێزێن عیراقێ یێن ئاسمانی، كو ب هزاران كەس بوونەڤوربان[204]. هەروەسا جۆیس بلاو Joyce Blau ژی، یێ ل سالا ١٩٦٧ێ ژ بەر ئەگەرێن لێكولینێ مایە ل باژێری، بەحسی ئاڤاهییێن بوردومان كرییە[205]. شورشگێرێن عیراقێ یێن نوی شەر ل دژی كوردان دكر. ئەحمەد بامەرنی سیاسەتڤانەكێ كورد و خەلكێ دەڤەرێ، وەسف دكەت، چەوا ل سالا ١٩٦٥ێ باژێر ب تەمامی د دەست لەشكەرێن عیراقێ دا بوو. ب شەڤ مرۆڤی گوهـ ل دەنگێ تەقینا و فیشەكا دبوو و ئەگەرێ دەنگ بیان ژی، مالێن دەڤەرێ دترسان. شەركەرێن بەرخۆدانێ ل ڤێ سالێ جادا دچیتە مووسلێ ستاندبوو و هوسا باژێر هاتبوو بێ رێ و سێ هەیڤا چ خوارن نەهاتە باژێری. قویت بۆ لەشكەری برێیا هەلیكوپتەرا دهات، یێن بەردوەام د ناڤبەرا ئامێدیێ و مووسلێ دهاتن و دچوون[206].

ل داوییا سالێن ١٩٦٠ێ ژی هەر شەر جار جار د ناڤ باژێری دا هەبوو و بارودۆخ یێ ئالۆز بوو وەكو

داگیریێ[٢٠٧]. دەرکەتن بۆ ناڤ زەڤی و بیستانا د بن کەلێ یا ب زەحمەت بوو. هەتا بهارا سالا ١٩٧٠ێ پشتی دانوستاندنا و پەیمانێ هێزێن لەشکەری ژ بازێری دەرکەتن[٢٠٨]. بەلێ ئەڤ جارەژی پێکهاتن یا کورت بوو. ل سالێن ١٩٧٩ێیا جارەکا دی بازێر پر ژ هێزێن لەشکەری بوو، ژ سیخور، کۆمگرتن و بەرزەبوونا مرۆڤان. بەرخۆدان یا بەردەوام بوو، بەلێ ئازادییا وان کەسان یان ئەو ب خۆ دبوونەقوربانێن ڤێ چەندێ. ب تایبەت ل سالا ١٩٧٥ێ پشتی ئیرانێ پشتەڤانییا خۆ بۆ کوردان فروتییە عیراقێ و دەست ژ شەرکەرێن کورد بەردای، شکەستنێ دەستپێکر و گرتن و راکرن ژ جهێ ڤەگوهاستن و رەڤین دەستپێکر، ب تایبەت یا پێشمەرگەی و مالێن وان، گەلەک ژ وان چوونە ئیرانێ. ل دەستپێکا شەرێ کەنداڤی، گەنجێن بازێری و پتر خوێندەڤان، یێن کو گەرەکە چووبانە عەسکەرییێ، رەڤین و هاتنە ئەوروپا. هندەکا ژی دگەل رژێما عیراقێ کارکر و بۆ خۆ ناڤەک چێکر و سەرکەتن. ل داوییا شەری کەنداڤی و ژ بەر شەرێن هەوا ئەنفالێ و شەرێ کەنداڤی یێ دوێ ل ١٩٩١ێ هەموو خەلکی بازێری ب تمامی دگەل پتر ژ دو ملیون کوردێن دی بەرڤ ئیرانێ یان ترکیا رەڤین. بازێر ژ لایێ لەشکەرێ عیراقیڤە هاتە تالانکرن، بەلێ پا هەروەسا ژ لایێ خەلکی دەڤەرێ یێ بێ رەهـ بوویی و نەخۆش کەتی. پشتی دانانا هێلا پاراستنێ خەلکی دەڤەرێ زڤرینە بازێری و دەوروبەری، بەلێ پا تا نەو ژی ب هەزاران ل دەرڤە ل ئەورۆپا دژین.

د ڤان چەند سالێن چوویی دا یێن ئاشتیێ و رێڤەبرییا سەربخۆ، بازێرێ ئامێدیێ گەشە ب خۆڤەدیت. شەرێن پشتی ١٩٩٤ێ (شەرێ براکوژیێ) د ناڤبەرا هەردو پارتێن کوردی دا کارتێکرنەک کێم ل سەر بازێری هەبوو. بەلێ ژ بەر نێزیکاتییا سنوورێ تورکی و دەستپێکرنا شەری د ناڤ بەرا لەشکەرێن تورک و چەکدارێن پەکەکێدا ژ سالا ١٩٩٠ێ هەر نەرەحەتی و مەترسی هەبوو. شەر ژ دویراتییا چاڤدیتنێ و گوهـ لێبوونێیە. لەشکەرێ تورکا چەند جاران کەتەناڤ بازێری و چەکدارێن پەکەکێ ژی درەڤین و خۆ ل ناڤ بازێری دڤەشارت.

وەکو مەگوتی، ل بن رێڤەبەرییا کوردان بازێری گەشە ب خۆڤەدیت و بنیاتێن خۆباشکرن. ئامێدیێ جهەکێ خۆش یێ سەیران و سەرەدانایە. پیچ پیچە خەلکێ وێ ژ دەرڤەڤە دگەریتەڤە. لێکولینێن بەردەوام ل سەر بازێری و دەوروبەرێ وێ جهێ دلخۆشیێنە و بێگومان دێ پێزانێن نوی و گرنگ ئیخنەبەر تیروژکا رۆژێ.

**لیستێ ناڤێن میرێن ئامێدیێ[٢٠٩]**

| | |
|---|---|
| زەینەدین | ١٤٠١ ـ ١٤٤٠ |
| سەیفەدین | ١٤٤٠ ـ ١٥٣٤ |
| حەسەن | ١٤٨٠ ـ ١٥٣٤ |
| حوسەین | ١٥٣٤ ـ ١٥٧٣ |
| قوباد | ١٥٧٣ ـ ١٥٨٤ |
| بەیرەم | ١٥٨٤ ـ ١٥٨٦ |
| سەیدی | ١٥٨٦ ـ ١٦٢٩ |
| یوسف | ١٦٢٩ ـ ١٦٤٠ |
| سەعید | ١٦٤٠ ـ ١٦٥٧ |
| موراد | ١٦٥٧ ـ ١٦٦٢ |
| قوباد | ١٦٦٢ ـ ١٦٧٩ |
| بەیرەم | ١٦٧٩ ـ ١٦٨٢ |
| سەعید | ١٦٨٢ ـ ١٧٠٠ |
| ئۆسمان | ١٧٠٠ ـ ١٧٠٢ |
| زوبەیر | ١٧٠٢ ـ ١٧١٤ |
| بەهرەم | ١٧١٤ ـ ١٧٦٨ |
| ئیسماعیل | ١٧٦٨ ـ ١٧٩٨ |
| تەیار | ١٧٩٨ ـ ١٨٠٢ |
| موراد | ١٨٠٢ ـ ١٨٠٥ |
| قوباد | ١٨٠٥ ـ ١٨٠٦ |
| عادل | ١٨٠٦ ـ ١٨٠٨ |
| زوبەیر | ١٨٠٨ ـ ١٨٢٠ |
| ئیسماعیل | ١٨٢٠ ـ ١٨٤٢ |

## چاڤکانی:

Ainsworth, William Francis 1842: Travels and researches in Asia Minor, Mesopotamia, Chaldea and Armenia, Bd. 2. London: Parker.

Ammann, Birgit 1991: »Kurdische Juden in Israel.« In: Berliner Institut für Vergleichende Sozialforschung (Hrsg.): Kurden im Exil. Ein Handbuch kurdischer Kultur, Politik und Wissenschaft. Berlin: Ed. Parabolis, S. 2.3.1-2.3.23.

Ammann, Birgit 2004/2005: »Ser Amadia: Amateuraufnahmen aus der Umgebung des Sommercamps der Royal Air Force im irakischen Kurdistan.« Kurdische Studien 4 + 5, S. 227-238.

Bachmann, Walter 1913: Kirchen und Moscheen in Armenien und Kurdistan. Leipzig: Hinrichs [Reprints: Böblingen: Codex-Verl., 1966 und Osnabrück: Zeller, 1978].

Badger, George Percy 1852: The Nestorians and their rituals. With the narrative (ifttmission toMesopotamia and Coordistan in 1842-1844, and of a late visit to Swse countries in 1850. Also, researches into the present condition ofthe Syrian

Jacobites, papal Syrians, and Chaldeans, and an inquiry into the religious tenets of the Yezeedees, Bd. 2. London: Masters [Reprints: Farnborough, Hampshire: Gregg International, 1969 und London: Darf, 1987].

Bamarni, Ahmed 1999: Au printemps kurde. Moi, peshmerga, je donne mon âme. Paris: Ramsay.

Barb, Heinrich A. 1859: »Geschichte von weiteren fünf Kurden-Dynastien Sitzungsberichte der Kaiserlichen Akademie der Wissenschaften <Wien>. Philosophisch-Historische Classe 15 (1), S. 91-154.

Behrendt, Günter 1993: Nationalismus in Kurdistan. Vorgeschichte, Ent-stehungsbedingungen und erste Manifestationen bis 1925. Hamburg-Deutsches Orient-Institut.

Binder, Henry 1887: Au Kurdistan, en Mésopotamie et en Perse. Paris: Quantin.

Blau, Joyce 1975: Le kurde de 'Amâdiya et de Djabal Sindjâr. Analyse linguistique, textes folkloriques, glossaires. Paris: Klincksieck.

Boehmer, Rainer Michael 1976: »Arcosolgräber im Nord-Irak.« Archäologischer Anzeiger 1976, S. 416-421.

Brauer, Erich 1993: The Jews of Kurdistan. Detroit, Mich.: Wayne State Univ. Pr.

Brifcani, Abdulkader 2000: Mustafa Barzani, leader ofthe modern Kurdish national movement. London: Kegan Paul International.

Bruinessen, Martin van 1997: »Shamdînân.« In: Encydopaedia of Islam. New edition [EI2], Bd. 9. Leiden: Brill, S. 282-283.

Bruinessen, Martin van 2000: »Kurdistan in the 16th and 17th cenruries, as reflected in Evliya Celebi›s Seyahatname.« The Journal of Kurdish Studies 3, S. 1-11.

Bruinessen, Martin van & Hendrik E. Boeschoten (Hrsg.) 1988: Evliya Celebi in Diyarbekir. The relevant section of the Seyahatname. Leiden: Brill (tv y (Celebi›s Book of travels, 1).

Brzezowski, C. de Korab [Karol Brzozowski] 1892: »Itineraire de Soul«« » nieh ä Amadieh (1869).« Bulletin de la Societe de geographie 7. Serie, 13 S. 250-264.

Charmoy, Francois Bernard 1969 [1868]: Cheref-nâmeh ou fastes de la nation kourde,

istan [kurd.]. Suleimania: Sardam.

Gierlichs, Joachim 1995: »Das Mosul-Tor von ‹Amädia im Nordirak.« Baghdader Mitteilungen 26, S. 195-206, Tafeln 17-22.

Gierlichs, Joachim 1998: »Das >Drachenportal< in ‹Amädia.« Baghdader Mitteilungen 29, S. 349-360.

Gottschalk, Hans Ludwig 1958: Al-Malik al-Kämil von Egypten und seine Zeit. Eine Studie zur Geschichte Vorderasiens und Egyptens in der ersten Hälfte des j.li), Jahrhunderts. Wiesbaden: Harrassowitz.

Grant, Asahel 1841: The Nestorians, or, The lost tribes. Containing evidence of their identity, an account of their manners, customs and ceremonies. Together with sketches of travel in ancient Assyria, Armenia, Media, and Mesopotamia, und illustrations ofscripture prophecy. London: Murray [Reprints: Amsterdam: Philo Pr., 1973 und Piscataway, N.J.: Gorgias Pr., 2002; dt. Teilübers. Basel: Bahnmaier, 1843].

Guest, John S. 1993: Survival among the Kurds. A history of the Yezidis. Rev. Ausg. London: Kegan Paul International.

Hajo, Siamend & Eva Savelsberg 2003: »Ein Diavortrag Oskar Manns über seine Kurdistanreise 1906/07.« Kurdische Studien 3 (1 +2), S. 135-186.

Harrison, David Lakin 1959: Footsteps in the sand. London: Benn.

Hay, William Rupert 1921: Two years in Kurdistan. Experiences of political officer, 1918-1920. London: Sidgwick and Jackson [Reprint: Cambridge: Allborough, 1991].

Hoffmann, Georg 1966 [1880]: Auszüge aus syrischen Akten persischer Märtyrer. Nendeln, Liechtenstein: Kraus Reprint [Reprint d. Ausg Le› Brockhaus, 1880].

par Chèref-ou›ddîne, Prince de Bidlîs, dans l›l›ialèt d›Arzeroûme, Bd. 1. Farnborough, Hampshire: Gregg International [Reprint d. Aug-St. Petersburg 1868].

Cuinet, Vital 1892: La Turquie d›Asie. Geographie administrative, statistique, descriptive et raisonnée de chaque province de l›Asie Mineure, Bd. 2: Les provinces arabes Alep, Moussoul, Bagdad, Bassorah. Paris: Leroux [Reprint: Istanbul: Isis, 2001].

Damaludschi, Sadiq 1952: Das kurdische Fürstentum Bahdinan oder A diya [arab.]. Mosul: al-Ittihad al-Dschedid.

Dankoff, Robert (Hrsg.) 1990: Evliya Celebi in Bitlis. The relevant section i Seyahatname. Leiden: Brill (Evliya Qelebi›s Book of travels, 2).

Edmonds, Cecil John 1957: Kurds, Turks and Arabs. Politics, travel and research in north-eastern Iraq, 1919-1925. London: Oxford Univ. Pr.

Findy, Rasheed et al. 1996: A Guide ofDuhok Governorate. Duhok: Islamii Law Press.

Fraser, James Baillie 1840: Travels in Koordistan, Mesopotamia, etc. Includh an account ofparts ofthose countries hitherto unvisited by Europeans. Will Sketches ofthe character and manners ofthe Koordish and Arab tribes, Bd. : London: Bentley [Reprint: Boston, Mass.: Elibron Classics, 2005].

Galletti, Mirella 1995: »The Italian contribution to Kurdology (i3th to 20! Century).« The Journal of Kurdish studies i, S. 97-112.

Galletti, Mirella 2001: »Kurdish cities through the eyes of their European visitors.« Quaderni di Oriente Moderno 20 (3), S. 109-148.

Ghafor, Abdulla 2002: Gazetteer of Kurd-

S. 438-486.

Mohseni-Sadjadi, Chirine 1999: La communaute des refugies kurdes France. Modes de vie et Integration. Paris, Univ., Diss.

Moltke, Helmuth von 1997: Unter dem Halbmond. Erlebnisse in der alten Türkei 1835-1839. Stuttgart: Ed. Erdmann [bearb. Ausg. von n / Zustände und Begebenheiten in der Türkei aus den Jahren 1835- 1839 (Erstausg. Berlin: Mittler, 1841].

Nebez, Jemal-eddin 1970: Der kurdische Fürst Mir Muhammad-i Rawândizi genannt Mir-I Kora im Spiegel der morgenländischen und abendländischen Zeugnisse. Ein Beitrag zur kurdischen Geschichte. Hamburg, Univ., Diss.

Buhr, Garsten 1778: Reisebeschreibung nach Arabien und ändern umliegenden Ländern, Bd. 2. Kopenhagen: Möller [zahlr. Nachdr.].

Nikitine, Basile 1934: »Shamdinän.« In: Enzyklopaedie des Islam [EI1], Bd. 4. Leiden: Brill, S. 325-329.

Özuglu, Hakan 1996: »State-tribe relations. Kurdish tribalism in the 16th-and 17th-century Ottoman empire.« British Journal of Middle Eastern studies 23 (i), S. 5-27.

Patton, Douglas 1991: Badr al-Din Lu'lu'. Atabeg of Mosul, 1211-1259. Seattle, Wash. und London: University of Washington Press.

Rawlinson, H. C. 1841: »Notes on a journey from Tabriz, through Persian Kurdistan to the ruins of Takhti-Solei›män [...] in October and Novem¬ber, 1838.« Journal ofthe Royal Geographical Society of London 10, S. 1-64.

Reclus, Elisee 1884: Nouvelle geographie universelle, Bd. 9: L›Asie anterieure. Paris:

Janabi, Tariq Jawad al-1982: Studies in mediaeval Iraqi architecture. BagH Republic of Iraq. Ministry of Culture and Information. State Organi tion of Antiquities and Heritage.

Joseph, John 1961: The Nestorians and their Muslim neighbors. A study of Western influence on their relations. Princeton, N.J.: Princeton Univ. Pr.

Kinneir, John Macdonald 1818: Journey through Asia Minor, Armenia and Koordistan in the years 1813 and 1814. With remarks on the marches of Alexander, and retreat of the ten thousand. London: Murray [dt. Übers.: Weimar: Verlag des Landes-Industrie-Comptoirs, 1821].

Köhler, Wilhelm 1928: Die Kurdenstadt Bitlis nach dem türkischen Reisewerk des Ewlijä Tschelebi (17. Jahrhundert). München, Univ., Diss.

Layard, Austen Henry 1965 [1849]: Auf der Suche nach Ninive. München: Beck [gekürzte Ausg. d. dt. Übers, von Nineveh and its remains (London: Murray, 1849)].

Longrigg, Stephen Hemsley 1925: Four centuries of modern Iraq. Oxford: Clarendon [Reprint: Farnborough, Hampshire: Gregg International, 1968 und Reading: Garnet, 2002].

Lovat, Francois-Xavier 1997: Kurdistan Irak. Paris: 3 C comunic u. a.

MacKenzie, David Neu 1960: »Bahdinan.« In: Encydopaedia of Islam. New edition [EI2], Bd. i. Leiden: Brill, S. 920.

Mayi, Anwar al- 1999: Die Kurden in Bahdinän [arab.]. Dohuk: Khebat. McDowall, David 1996: A modern history of the Kurds. London: Tauris. Minorsky, Vladimir et al. 1986: »Kurds, Kurdistan.« In: Encydopaedia of Islam. New edition [EI], Bd. 5. Leiden: Brill,

Stern, Henry Aaron 1854: Dawnings of light in the East. With biblical, historical and statistical notices of persons and places, visited during a mission to the Jews in Persia, Coordistan and Mesopotamia. London: Purday.

Streck, Karl Maximilian 1913: »'Amadiya.« In: Enzyklopaedie des Islam [EI1], Bd. 1. Leiden: Brill, S. 340-341.

Sykes, Mark 1988 [1904]: Dar-ul-Islam. A record of a journey through ten Asiatic provinces of Turkey. London: Darf Publ. [Reprint d. Ausg. London: Bickers, 1904]

Tavernier, Jean-Baptiste 1681: gestellt durch Johann Herman Widerholold [frz. Erstausg. Paris: Clouzier, 1676].

Warkworth, Lord [Henry Algernon George Percy] 1898: Notes from a diary in Asiatic Turkey London: Arnold.

Wigram, William Ainger & Edgar Thomas Ainger Wigram 1922: The cradle of mankind. He life in eastern Kurdistan. 2. Aufl. London: Black [Erstausg. 1914].

Wilson, Arnold Talbot 1931: Mesopotamia, 1917-1920. A clash of loyalties. London: Milford; Oxford Univ. Pr.

Yalcin-Heckmann, Lale 1991: Tribe and kinship among the Kurds. Frankfurt/M.: Lang.

Yonan, Gabriele 1989: Ein vergessener Holocaust. Die Vernichtung der christlichen Assyrer in der Türkei. Göttingen: Pogrom.

Zettersteen, Karl Vilhelm 1936: »Lu›-lu›.« In: Enzyklopaedie des Islam [EI1] Bd. 3. Leiden: Brill, S. 43-44.

Hachette.

Rieh, Claudius James 1836: Narrative of a residence in Koordistan, and on the site ofancient Nineveh. With Journal of a voyage down the Tigris to Bagdad and an account of a visit to Shirauz and Persepolis, Bd. i. London: Duncan [Reprint: Farnborough, Hampshire: Gregg International, 1972].

Ross, Henry James 1902: Leiters from the Fast by Henry James Ross, 1837-7-London: Dent.

Andreczki, Carl 1857: Reise nach Mosul und durch Kurdistan nach Urumia, unternommen im Auftrage der Church Missionary Society in London 1850, 4 Teile. Stuttgart: Steinkopf.

Shawalli Amedi, Kawa Fareeq Ahmed 2000: Badinan Emirate [arab. Mit engl. Abstract]. Arbil: Mukriyani.

Silvestre de Sacy, Antoine Isaac 1809: Neueste Beiträge zur Kunde der asiatiatischen Türkei. Weimar: Verlag des Landes-Industrie-Comptoirs [dt. Übers. von Description du pachalik de Bagdad (Paris: Treutter et Würtz, 1809)].

Southgate Horatio 1840: Narrative of a tour through Armenia, Kurdistan, Persia and Mesopotamia. With observations on the condition of Mohammedanism Christianity in those countries, Bd. 2. London: Tilt and Bogue.

Stein, Lothar 1964: Abdallah bei den Beduinen. Durch Städte und Steppen des Irak. Leipzig: Brockhaus.

# ژێدەر

* ئەڤ بابەتە حازمێ جاسم، ژ ئەلمانی کریە کوردی، ژ ژێدەرێ کوڤارا (Kurdische Studien) هژمارا ٤ و ٥ (٢٠٠٤ - ٢٠٠٥)، بپ.١٧٥ - ٢٢٦،د هژمارێن ٢٤ - ٢٦ سالا ٢٠٠٩-٢٠١٠ کوڤارا هاڤیبوون دا بەلاڤبوویە.

- د قۆناغێن دیزاینا ئینسکلۆپیدیایێ ئەڤ ڤەکۆلینە گەهشتە مە، ڤەکۆلینێ دیرۆکا ئامیدیێ ژ سەردەمین کەڤن هەتا نها ڤەگرتییە، هەرچەندە هندەك ژ وان زانیاریان د ڤەکۆلینین دیترین ئینسکلۆپیدیاییدا هاتینە، لێ چەندین زانیارێن نوو ژی ب خۆڤە ڤەگرتینە و بەلاڤکرنا وێ دێ بەرپەرێن دیرۆکا دەڤەرێ ب تایبەت یا ئامیدێ دەولەمەند تر لێ کەت.

١. ناڤێ (العمادیة) ب عەرەبییە، د ناڤ ژێدەرێن کەڤندا تێتە بکارئینان. ئامێدیێ بکوردییە. ژ بەر کو ئەڤ کارە بابەتەکێ دیرۆکییە، من بریاردا پەیڤا عەرەبی بکاربینم. چونکو ئەڤە هوسا ل ئنسکلوپێدیا ئیسلامێدا (شتریک - Streck ١٩١٣: ٣٤٠) هاتییە بکارئینان.

٢. نڤێسینێن گەرۆکێن ئوروپی دێ ب هەمی لایانڤە ئێنە بکارئینان. ژێدەرێن عەرەبی، تورکی و فارسی نەهند گەلەک دێ ئێنە بکارئینان. ب زانینا من چ ژێدەرێن زانستێ ب زمانێ کوردی ل سەر دیرۆکا بازێری نینن. ئەو ژێدەرێ دیرۆکا کوردی یێ ژ هەمیا کەڤنتر (شەرەفنامەیە) ب زمانێ فارسی هاتییە نڤێسین. ل ڤێرە وەرگێرانێن بارب - Barb (١٨٥٩) و شارمۆیی - Charmoy (١٩٦٩) |١٨٦٨| هاتینە بکارئینان. گرنگترین ژێدەرێ تورکی نڤێسینێن ئەولیا چەلەبینە، پەرتووکا سیاحەتنامە ل ڤێرە وەرگێرانێن دانکوف - Dankoff (١٩٢٨)، بروئینسن Bruinessen (٢٠٠٠) بروئینسن و بۆشۆتێن Brruinessen & Boeschoten (١٩٨٨) و کۆهلەر - Köhler (١٩٢٨). هندەک ژێدەرێن عبری و ئەرمەنی ژی کێم تێنە بکارئینان، چونکو نە ژ ژێدەرێن سەرەکینە. ئەز سوپاسییا هەلو سەلام و سیپان رەش، ژ بۆ هاریکارییا وەرگێرانا ژ زمانێ عەرەبی دکەم.

٣. بنێرە بلاو - Blau ١٩٧٥.:١٩٦ غفور ٢٠٠٢: ١٢.

٤. ل دویماهییا سەدسالییا ٢٠ێ ئەڤ نهاڵە د نڤێسینەکێدا هوسا تێتە پەسنکرن: (نهالا سپنە یا بەرفرەهـ ژ باکوورێ نهالا مەتین، یا ژ بەرواریا جو دا دبیت، دەستپێدکەت. ژ باشووری ب چیایێ گارە ل بەرامبەر مەتین ب دویماهیک تێت. (هوفمان - Hoffmann1966 |1880|: 193.

٥. بلاو - Blau 1975.:196 بامرنی ١٩٩٩.: ٣٢:

٦. بلاو - Blau 1975: 196.

٧. بنێرە ئامما - Ammann 2004/ :2005236، وێنە ١٧

٨. وەزیرێ دەرەڤەیێ عیراقێ یێ نهو خەلکێ ڤێ عەشیرەتێیە.

٩. بلاو - Blau ١٩٧٥: ١٩٦. بندەر Binder(1887:196) ب شاشی بەحسی سێ دەرگەهان دکەت: کوینەت - Cuinet (١٨٩٢:٧٥٩) و بلاو - Blau (1975: 196) ژی هوسا دیارە پالپشتیێ ل سەر ئاخفتا وی یا شاش کرینە. بۆ من گەلەک جارا هاتە ڤەگێران، کو دەرگەهێ داری نهو ل موزەخانەکێیە ل مووسل. بەلێ هەتا نهو دەرفەت بۆ من نەبوویە ڤێ گوتنێ بسەلمینم. د تابلویەکێ دا ژ لایێ گویرلیخس - Gierlichs ڤە (١٩٩٥: تابلویێ ١٨، ٢٠٠) یێ کو سالا ١٩٥٥ هاتییە نەخشکرن، هەردوو رەخێن دەرگەهی باش دیارن.

- ئەڤ نڤیسینە ل سالا ٢٠٠٤-٢٠٠٥هاتییەنڤیسین و بەلاڤکرن

١٠. غفور ٢٠٠٢: ١٢.

١١. موحسنی ـ سەجادی ١٩٩٩: ٤١؛ الفندی ئت ١٩٩٦: ٣.

١٢. ئەڤ گۆتنێ یێن رێڤەبەریا بەرپرس ژ سالا ٢٠٠٤ێنە.

١٣. بادگەر - Badger 1852: 199؛ ساندرێجکی - Sandreczki 1857، بەشێ ١ : ٢٧٩. ئەڤرۆ گەلەک کێلیێن گورستانێ د ناڤ مالان یان باغچاندا هەنە. ل سەر ڤان کێلییان نڤێسینا عوسمانی تورکی هەیە.

١٤. هەردوو زاراڤێن بەهدینان یان سوران ڤەدگەرنە سەر ناڤێ وان ئیمارەتان، هەرچەندە ئەڤرۆ دیالێکتا زمانی، ب تایبەتی سورانی، پەیوەندی ب ڤێ چەندێڤە نینە.

١٥. ل دویڤ پەسنا مسیونارێ بریتی ڤ. ا. ڤیگرام - W. A. Wigram ئەڤ نهال بۆ نمونە ل زڤستانا ١٩١٠ - ١٩١١ چار هەفتییان پتر ژ چار مەتران ل بن بەفرێ بوو. (Wigram 1922: 63).

١٦. Findi et al. 1996

١٧. Charmoy 1969 (1868): 208.

١٨. Brzezowski 1892: 263.

١٩. Binder 1887:196.

٢٠. Hajo & Savelsberg 2003: 179.

٢١. Rich 1836:156.

٢٢. Layard 1965 (1849): 116 ff.

٢٣. Harrison 1959: 171.

٢٤. Sandreczki 1857, Bd. 1: 275.

٢٥. بنێره ل سەر ڤی بابەتی گوڤارا (Ammann 2004/2005 ،Kurdische Studien) ل سەر گولا مەلەڤانیا لاپەرێ ٢٣٢ وێنە ٤ و ٥.

٢٦. Bruinessen 2000: 7.

٢٧. Streck 1913: 340; Damaludschi 1952: 9. ابێ عمادالدینی ئاکسونکور دانایێ زەنگیدا بوو، ئێک ژ بنەمالێن دەڤەرێ یێن ئەییوبی. ل دەمێ کورێن وی ئەڤ بنەماله بوونە دوو بەش، ئێک ل سوریایێ و ئێک ل مەزۆپۆتامیا (Gottschalk 1958: 41).

٢٨. Ainsworth 184: 202.

٢٩. Damaludschi 1952: 9.

٣٠. Findy et al. 1996:98. د ناڤ ئێک ژ نڤێسینێن ئارامی دا ژ سالا ١٢٥٠، ئەوا بادگەر (١٨٥٢: ٢٠٢.) بەحسکری،

ناڤێ کەلا بیباکا (Kalaat Bibáka) وەکو ناڤێ بەراهیێ یێ بازێری دهێتە گۆتن. کەلا، ب عەرەبی (قلعة) ل دەڤەرێ اڤێ وان جهان یان بازێرانە، یێن کو ل سەر گرا یان کەڤرانە. ل دەڤەرێن نێزیک بازێری هەتا نهوژی ناڤێ کەلێ بۆ بازێری دهێتە گۆتن. سترانا فلکلوری یا بناڤودەنگ (ئەز چوومە کەلێ) ب ئەز چوومە ئامێدیێ دهێتە تێگەهشتن.

٣١. Streck 1913: 340.

٣٢. Minorsky et al. 1986: 454.

بنێره ل وەرگێرانا شەرەفنامە یا بارب - Barb (1859: 110) و شارومی - Charomy (1969: 208). وەرگێرانا ئەلمانی یا بارب ل ڤێره یا شاشە. هوسا کو بکارئینانا زمانی وێ چەندێ دگەهینیت، کو ئەڤ کەلە پشتی دامەزراندنا بنەمالێ (١١٩٦) هاتیە ئاڤاکرن. (تێبینیا نڤێسەرێ).

٣٣. Encyclopedia of Islam تێدا نڤێسیە کو پێنج هزار کوردێن هەکاری پشتی سەرهلدانەکێ ل ڤێ سالێ ل درێژیا جادا مالتایێ (دکەڤیتە باشورێ رۆژئاڤای ئامێدیێ) برنە مووسلێ و کوشتن. (مینورسکی - Minorsky 1986: 453).

٣٤. بۆ نموونە ل جەم ئاینسڤورت Ainsworth 1842 و ریچ - Rich 1836 و ساندرێجکی Sandreszki ١٨٥٧ وشتریک - Streck 1913

٣٥. هەتا نهو نەدیارە کا چەوا ریچ ل سالا ١٨٣٦ ب سەر ناڤێ ئەکبەکان هلبوویە. Badger 1852: 202.

٣٦. Ainsworth 1842: 202.

٣٧. بەحسێ ئێشا تاعونێ ژ لایێ مایی دهێتەکرن (١٩٩٩: ١٤٢) دەمێ بەحسێ مرنا میر عادل ل سالا ١٨٣١ دکەت. یان سندرێچکی - Sandreszki (1857:1:277) لسالا ١٨٣١. هەرهوسا خەلکێ دەڤەرێ ژی بەحسێ گۆرستانەکێ ب رەخ جادێ ڤە، نوکە باش نەدیارە، دکەن.

٣٨. عصمت کتانی (١٩٢٩ - ١٩٩٢)، یێ کو چەند سالا نوینەرێ عراقێ ل دەڤ نەتەوێن یەککرتی بوو، ژ بنە مالا کتانیيە. ژ بنەمالا پاشا سترانبێژێ ل هەمی کوردستانێ هەر ب ناڤودەنگ تەحسین تەهایە (١٩٤١-١٩٩٥). گەلەک ئەندامێن بنەمالا حەجی شەعبان رۆلەکێ مەزن هەبوون د بەرخودانا وی سەردەمی ل دژی ئنگلیزا دا.

٣٩. Silvestre de Sacy 1809: 87f.

٤٠. Edmunds 1957: 9; Behrendt 1993: 292.

٤١. ژ بەر گەلەک ئەگەران، یێن دەرفەت نینە ل ڤێرێ بەحس بکەین، میران ناسناڤێن/ یان ژی ب رەخ ناڤێن خوڤە ناڤێن وەکو پاشا، خان، میر، ئەمیر و بەی یان بەگ، دهەلگرتن. ئەز دخوازم ل ڤێرێ ب تنێ ناڤێن درست بکاربینم.

٤٢. Rich 1836: 154; Grant 1841: 34; Sandreszki 1857, I,: 277; Bruinessen 2000: 7.

٤٣. Barb 1859: 110

٤٤. Bruinessen 2000: 6f.

٤٥. باژێرەکە ل رۆژئاڤایێ باکووری ئامێدیێ د ناڤ ترکیادا.

٤٦. بارب Barb (١٨٥٩:١٠) شەرەفنامە بەحسی ٤٠٠ سالان حوکمی دکەت. میرێن شەمدینان گەرەکە ژ شەمسەلدین ژ بنەمالا بەگزادە هاتینە. بروئینێسێن (Brinessen 1997:282) د ئینسکلوپێدیا ئیسلامی ٢ دا دبێژیت، ئەڤە بنەمالەکا کوردانە. بەلێ نیکیتینێ ـــ (Nikitine 1934:328) د ئینسکلوپێدیا ئیسلامی ٢ دا دبێژیت، بنەمالەکا عەرەبن. ڤان هەردوو نڤیسەرا نەزانییە، کو بەگزادە پەیڤەکا کوردییە مانا وێ ئەرستۆکرات. بەگزادێ عەبباسی مانا ئەوە، پاشمایێن عاباسیا مەخسەدە.

٤٧. Charmoy 1969: (1868): 132.

٤٨. Brifcani 2000: 53.

٤٩. Fraser 1840: 68.

٥٠. کەلەک پارچەکە ژ نێزیکی سەد پیستێن پڤدایی یێن پەزی، گرێدایی ل بن داران و پێڤە. پەسنەک درێژ ل جەم مۆلتکە هەیە، Moltke 1997 (1841): 154.

٥١. ل سەر دیتنا جیهانێ یا وی دەمی و موتیڤێن رێباران بنێرە Galetti 2001: 110.

٥٢. جنابی ١٩٨٢: ١٩١ ـ ١٩٤، وێنە ١٩٠ـــ ١٩٤. جهێ داخێیە، کو گۆتنێن دیرۆکی یێن جنابی نەجهێ باورینە. ئەو ل جهەکی ل سەر ڤی میری دبێژیت، بەری ١١٤٦ و ل جهەکێ دی پشتی ١١٤٦ (لاپەرێن

١٩٤ و ١٤٩) حوکم کرییە. بەلی بۆ هەمیا یا ئاشکەرایە، کو باژێر ل سەر دەستێ عیماد ئەلدین زەنگی ل سالا ١١٤٢ێ هاتییە ئاڤاکرن و هەر وی ناڤ ل سەر دانایە. هەکە گۆتنێن شەرەفنامە دشاش نەبن، ئەو سەربارک قاراج کورێ عەبدوللایە ژ رەگەزێ بەهدینان بوویە، یێن ل ڤێ داوییێ هاتین. بەلێ چونکو ئەو نە ئەوکەسە یێ پشتی عمادئەلدینی، یێ ١١٤٦ مری، هاتییە سەر حوکمی. بەلکو یێ کورێ وی بوو. پێدڤییە چیرۆکا ڤی کەسی تاری بمینە.

٥٣. جنابی ١٩٨٢: ١٩٤. وێنە ١٩٥ أ و ب. دەرگەهـ و منبەرا نڤێژا ل موزەخانا عیراقێ ل بەغدا بووینە. کا پشتی شەری چ ب سەرێ وان هاتییە، ئەم نزانین.

٥٤. هوسا دیارە بێنیامین ب خۆ چ جار نەچوویە ئامێدیێ و گۆتنێن وی، کو بیست هەزار مالێن جوهیان ل ئامێدیێ هەبوون، جهی نەباوەرێنە. (Brauer 1993: 38).

٥٥. Ainsworth 1842: 198.

٥٦. Ammann 1991: 2.3.10.

٥٧. Binder 1887: 198.

٥٨. Brauer 1993: 66.

٥٩. Minorsky et al. 1986: 454.

٦٠. خلیل عباسی، علاء الدین، مجلی.

٦١. Gottschalk 1958: 92 - 102; Patton 1991: 17 - 31.

٦٢. Brauer 1993: 76, 250, 252.

٦٣. Brauer 1993: 63, 325.

٦٤. Brauer 1993: 62.

٦٥. Zetterstéen 1936: 44.

٦٦. Tschamtschean, وەک Köhler 1928: 18, 36.

٦٧. Sandreczki 1857: B 2: 179.

٦٨. Joseph 1961: 29, Sandreczki 1857: B 2, 179.

٦٩. Minorsky et al. 1986: 455.

٧٠. McDowall 1996: 24; Barb 1859: 112. نە جهێ باوەرییێنە، كا چەوا مایی گەهشتییە هندەك مێژوێین دی ل ڤێ بابەتی (بنێرە مایی ١٩٩٩: ١١٧).

٧١. ل دووڤ گۆتنێن Longgrig (١٩٢٥: ٧)، Brauer (١٩٩٣: ٥٨) گەرەكە میرگەهێ د ناڤبەرا سەدێ ١١ و ١٣ دگەل ئەردەلانی و هوسا دگەل فارسان بووینە.

٧٢. وی دەمێ ئاقڤویونلو یان و قەرەقویونلی یان شەر ل دژی هەڤ ژ بۆ دەسەلاتێ ل وەلاتێ فارسان دكرن.

٧٣. Barb 1859: 112.

٧٤. Barb 1859: 112; McDowall 1996: 23,31.

٧٥. Bruinessen & Boeschoten 1988: 119. ل سالێن ١٥٠٧ و ٨ شاهـ ئیسماعیلی هەمی دەڤەر ژ دیاربەكرێ هەتا بەغدا ستاند. (McDowall 1996: 26).

٧٦. Özuglu 1996: 12.

٧٧. McDowall 1996: 31; Longrigg 1925: 42.

٧٨. Longrigg 1925: 43.

٧٩. ل ڤێرە McDowall شاشی كرییە، دەمێ وی حوسەین ژێبركرییە و نەڤییێ حەسەنی ب كورێ وی دانیت و دبێژیت هاتییە سەر حوكمی. (McDowall 1996: 31)

٨٠. Barb ١٨٥٩: ١١٣.

٨١. دبێژن كێلیپا دووێ یا خانم رەوشەنێیە. گەلەك گۆتن هەنە، كا ئەو كچا كێیە: حوسەین، ئوسمان، ئیسماعیل. گۆتنێن فندی ل سەر سالا مرنا وێ ل سالا ١٢٠٢ جهێ گومانێنە. فندی ١٩٩٦: ٩٩.

٨٢. مایی ١٩٩٩: ١٢٢.

٨٣. Longrigg 1925: 42.

٨٤. Barb 1859: 113.

٨٥. Mayi 1999: 122.

٨٦. Barb 1859: 115; McDowall 1996: 31; Longrigg 1925: 42.

٨٧. Barb 1859: 110.

٨٨. ل سالا ١٩٩٠ دەرگەهێ چوونەژورێ بۆ ناڤ ئامێدیێ هاتە ئاڤاكرن. ل سەر ڤی دەرگەهی ناڤێن گەلەك حاكمێن (میران) جودا - جودا ل سەر هاتنە نەخشكرن. ل بەر ڤان ناڤان چ سال نەنڤێسینە و گەلەك شاشی تێدا هەنە. ل دویڤ گۆتنێن خەلكێ ئامێدیێ ئەڤ ناڤە ل دویڤ لێكولینێن دوو مێژونڤێسان(محەمەد ئەمین زەكی و سادق بەهائەلدین)ی هاتینە كومكرن. مە نەشیپا چ تشتێن دی ل سەر ڤانە كۆم بكەین. هەرهوسا و ل سەر ڤی بابەتی ل ئامێدیێ دوكومێنتەك هەیە، ژ لایێ سەددام حوسەینیڤە هاتییە فەرماندان. ل سالێن ١٩٩٢ و ١٩٩٨ ئەڤ بۆ من هاتییە خاندن. ئەوان ژی گەلەك شاشی یێن مێژویی تێدا هەنە و نموونەكن بۆ گۆتنێن بازاری. ئەڤ دوكومێنتە ژ لایێ عەدنان حەسەن و سەربەست موستەفایڤە هاتییە دانان و ل سەر گۆتنێن دەڤی یێن نێزیك ١٩٠٠ ژدایكبوویی زەینەب فوئاد بامەرنی و حەجی حوسەین سەلیمی دروستبوویە. چ ژ ڤان ژێدەران نە جهێ باوەرییێنە. ل ڤێرە ئەڤ كارە بەس بوو هەڤبەركرن هاتینە بكارئینان. جهێ داخێیە كو هندەك ژێدەرێن دی ژی وەكو فندی یان هندەك تێكستێن فەرمی یان نڤێسینێن ل سەر دەرگەهێ مویسلێ ژ شاشییان دپرن.

٨٩. Longrigg 1925: 45.

٩٠. مایی ١٩٩٩: ١٢٨.

٩١. Dankoff 1990: 158, Köhler 1928: 40.

عەبدال خان، میرێ بەدلیسێ ل سەردەمێ یوسفێ هوسا دنڤیسە.

٩٢. McDowall 1996: 29. مایی ١٩٩٩: ١٣٠.

٩٣. ل دویڤ گۆتنێن شەوالێ ئامێدی (٢٦٩:٢٠٠٠) سەعیدی پشتی ١٦٢٩ حوكم كرییە و پشتی وی یوسف هاتییە و بەحسێ مورادی قەد نەهاتییە.

٩٤. چەلەبی ب ڤێ چەندی گۆتنا مایی رەد دكە، كو سەید، كورێ سەعیدی، ل سالا ١٦٣٢ هاتیە سەر حوكمی. (مایی ١٩٩٩: ٣٠).

٩٥. Bruinessen 2000:7.

٩٦. مازیێن ژ ناڤ دارستانێن داربەریبان یێن بەرفرەهـ ل دەور و بەرێن ئامێدیێ هەتا دەستپێکا چەرخێ ٢٠ێ دگەهشتنە لەندەن و هامبورگ و مارسێلیایێ. ژ وانە حبر، رەنگێ قوماشی و دەرمان بۆ چێکرن و رەنگکرنا پیستی دهاتنە چێکرن. تشتێن دن یێن بازرگانی دگەل تیتنێ وەکو تاڤەرنیر بەحس کری، برنج، کونجی و ئارسەن (شتەک کیمیاوی) (کوڤارا نەمسا ل سەر رۆژهەلاتی، ژمارە ٤٤، سالا ١٨٩٢، لاپەرێن ٢٤٨،٢٥٤،٢٥٦). هەرهوسا ژی هری و هندەک جاران. حەریر. (Brzezowski 1892:263). نیبور ژێ بەحسێ بازرگانی ب تایبەت یا مازیا دگەل ئوروپایێ دکەت (١٧٧٨:٣٣٠). دیتنا پارێن کەڤن دیار دکەن، کو ل نێزیک سالێن ١٧٠٠ پەیوەندی یێن بازرگانی دگەل براندنبورگ، پولونیا و ئەلمانیا قەیسەری هەبون. ل نیڤەکا سەدساليیا ١٩ێ نڤیسەڤان گەلەک مەدحێن مێویژێن ئامیدیێ دکەن(Ainsworth 1842:194, Badger 1852:199,

Sandreczki 1857: Bd. I: 280). ژبلی ڤانە ژی گەلەک بەحسێ هژیر و هنار و هنگڤینێ ئامێدیێ دهێتە کرن (Cuinet 1892:760). هەتا ئەڤرۆ ژی ئەڤ بەرهەمە بو دەڤەرێ گەلەک دگرنگن. نیبوهر (Niebuhr 1778: 332) بەحسێ

چێکرنا رساسی ل دەڤەرێ دکەت. یا ئاشکرایە، کو چیایێن گارەی د زەنگینن ب ماتریالێن بن عەردی وەک ئاسن، رەژی، سفر، رساس و ئورانیوم.(موحسن سەجادی ١٩٩٩:٣٥). ل سەر رێیا دناڤبەرا دەڤەرێ و مووسلێ دا ئاندیگو و کوشەنیلە Indigo, Kochenille ئاسنێ سور ل مالان، شال، ئەتلەس، پارە و ئامیرێن ئاسنی دیتن (Silvestre de Sacy 1809: 80). روس (Ross 1902: 108) بەحسی ل سالا ١٨٤٧ێ دکە، هەرچەندە دوکانێن وی دەمی بێ رەوش بوون، بەحسی کارێ هریێ و دەرسوکا ژ مەنجستەرێ و شالێن ملا ژ گلاسکوو و جلکان ژ دیمەشقێ.

٩٧. Tavernier 1681: 121.

٩٨. مایی ١٩٩٩: ١٣٦.

٩٩. شەوالێ ئامێدی دبێژە ١٧٠١ێ. (٢٠٠٠: ٢٨٦)

١٠٠. Niebuhr 1778: 332.

١٠١. Niebuhr 1778: 329.

١٠٢. بەری هنگێ بنێزیک سەد سالان ل ١٦٣٢ گەرەکە دێرا کەپوتسییێن فەرەنسی بنگەهەک ل میسلێ دانایە.(Yonan 1989: 19) و وانە فەرهەنگەک و رێزمانەک نڤیسییە، بەلێ بەرزەبوینە (Gal letti 1995: 106, 41). ژ دویماهیکا سالێن ١٨٣٠ێ و ب تایبەت پشتی کۆمکوژی و فەرمانا ل دژی فەللان ل سالێن ١٨٤٣ و ١٨٤٦ گەلەک ذیران هەولدان، مسسیونارێن خۆ بشینن کوردستانێ: ل ١٨٥٤ مسسیونارێن ئەمریکی لۆبدەلLobdell و یەرەمیاJeremiah ل نێزیک دەڤەرا ئامێدیێ مالێن هاڤینێ بو خێزانێن خۆ ئاڤا کربون، بەلێ ل سەر وان چ دەنگ و باس نینن. (Guest 1993:117) و ل ١٩١١ ێ ژی مسسیونارا ئێرزبیشوڤێ ژ کانتەربوریErzbischofs von Canterbury ل نێزیک ئامێدیێ بنگەهێ خۆ دانا بو.(Guest: 1993: 171; Yonan 1989: 24; Wigram & Wigram 1922: 321, 395) براستی لێکولینا ئەرشیڤێن دێرێ ل سەر دەڤەرێ گرنگییەکا مەزن بو وێ هەنە.

١٠٣. Silvestre de Sacy 1809: 80.

١٠٤. Galletti 1995: 99.

١٠٥. مایی ١٩٩٩: ١٣٨.

Galetti 1995: 116.

لانزا Lanzaبەحسی گەلەک ئەرمەنییان و یونانییان دکە ل بازێری. ئەرمەنی ژ لایێ هندەک نڤێسەرێن دن ژی دهێنە بەحس کرن (Brzezowski 1892: 263; Badger 1852: 201)، بەلێ بەحسێ یونانییان بتنێ ل لایێ وی هەیە. مرۆڤ نە شێت بێژیت بەلکو ل ڤێرە خەلەتییەک یان گوهورینەک هەیە، جنکو لانزا وەک قەشەکێ کاتولیکی زانایەکێ ئۆلێ خۆ و گروپێن ئۆلێ فەللان بوو. یا سەیر ئەوە، کو ئەو چ بەحسی فەلێن دن یان جهویان ل بازێری ناکەت.١٠٦. بەری وی ژی مسسیونار لیوپولد سولدینیLeopoldo Soldini (ل ١٧٧٩ێ مرییە) پترین ژ وەختێ خۆ ل دەور و بەرێن ئامێدیێ برییە. بەلێ چ نڤێسین ب دەستێ وی نینن. (Galetti 1995: 107, 46)

١٠٧. Galetti 1995: 106.

١٠٨. میرگەها بوتان.

١٠٩. ناڤێ كەڤن یێ باژێرێ هەكاری.
١١٠. ل دویڤ گۆتنێن سلڤستەر دوساسی (Selvester de Sacy 1809: 87) ئەڤ میرگەهە ژ میرگەهێن بابان و سوران پێكهاتبوو.
١١١. Galletti 1995: 107.
١١٢. شاولی ئامیدی ٢٠٠٠: ٢٨٦، مایی ١٩٩٩: ١٤١، لونگریگ ١٩٢٥: ٢٠٩.
١١٣. ل دویڤ گۆتنێن گارزونی، میرا كارێ جەللاد (سەربر) هەرگاڤ ددا ئێزدیان. چنكو دبێژن وانە نەدخاست خوینا موسەلمانا برێژن، ئەڤ كارەژی مسۆگەر نە د خزمەتا ژیانەكا ئاشتییانە بوو د ناڤ بەرا هەردو جوینێن ئۆلیدا. Guest 1993: 59.
١١٤. Guest 1993: 59 ,305.
١١٥. ژبۆ دوژمناتییا د ناڤ بەرا ئامێدییان و جەلیلییان دا بنێرە دملوجی ١٩٥٢: ٢٢, ٣٤.
١١٦. بنێرە: مایی ١٩٩٩: ١٤١. و Badger 1852: 152.
١١٧. مایی ١٩٩٩: ١٤٣. بنێرە شەوالێ ئامیدی ٢٠٠٠: ٢٦٩.
١١٨. Guest 1993: 63; 305.
١١٩. ئەڤ ژمارە نە ددرستن، چونكو چەند سالەكا پشتی هنگێ دو ژێدەرێن دی بەحسێ دووسەد مالێن جهییان دكەن.
١٢٠. Galleti 2001:117.
١٢١. Southgate (١٨٤٠:٢٢٥) بەحسێ كوشتنا دو مسیونارێن كاتولیكی ل نێزیكی ئامێدیێ دكەت.
١٢٢. Kinneir 1818: 603.
١٢٣. Rich 1836: 153.
١٢٤. Ainsworth 1842: 201.
١٢٥. ل سالا ١٨٢٧ێ رێڤنگ داڤید د بێت هیلDavid d'Bet Hill ژی بەحسێ وێ ژمارێ دكەت. (براوەر ١٩٩٣: ٤٣.)
١٢٦. ل نك ریچی مزوری نڤێسایە.
١٢٧. ئەڤە دراستن دگەل گۆتنێن چەلەبی یێ كو د سەرەدانا خۆ دا بەری ٤٥٠ی سالان ل مالا ئاغایێ مزیریا ل نك دەرگەهێ میسلێ ل ئامێدیێ دورنشت. (Bruinessen 2000: 8).
١٢٨. بنێرە وێنی گەنجەك كورد یێ Oskar Müller ل سالا ١٩٠٦ێ د ژێدەرێ (Hajo & Savelsberg 2008 178).
١٢٩. فەلێن عەشیرەتا تیارێ ل دەڤەرا هەكاری دناڤبەرا ئامێدیێ و جولەمێرگێ دا دبەرنیاس بوون ب درندەهییا خۆ و تالانێن خۆ، كو كەس نە دشییا یێ. نیبور بەحسێ نێستوریانێن ل هەكاری دكەت، كو خەما وان نەبتنێ ئەوە، كو بازرگانێن مووسلمان نەهێن جەم وانە، بەلكو پتر دخازن، هندەك ژوانە مالێن خۆ ل جەم وانە دانن. (نیبوهرNiebuhr ١٧٧٨: ٣٣٣). روس (Ross 621902) بەحسێ تالانكرن و مرۆڤكوشتنا وان كرییە، و ناڤێن وان یێ بترس. سوتگاتی (146:1840Southgate) تیارییا، نێستوریانێن جولەمەرگێ ب پەیڤا تێرور (ارهاب) ژ بۆ كوردان ل قەلەم ددە.
١٣٠. مایی ١٩٩٩: ١٤٦.
١٣١. Behrend 1993: 149. Nebez 1970: 50, Damaludschi 1952: 44, Longrigg 1925:285.
١٣٢. دەمەلوجی ١٩٥٢: ١٣٢،
Grant 1841:30; Stern 1854: 255.
١٣٣. Longrigg 1925: 286.
١٣٤. دملوجی ١٩٥٢: ٤٥.
١٣٥. Fraser 1840: 75.
١٣٦. هەروەكی زانا، كو ل دەڤەرێن دووریێچكری ئەفسانە و چیڤانوك دهێنەگۆتن. هوسا ژی دهێتە گوتن كو ژنەكێ (ل دویڤ گۆتنی، كا مووسلمانە یان ژی جهییە) ڤێلەك ل محەمەدێ كورە كر، وەختێ رابووی جوانترین جلكێن خۆ ل بەر خۆ كرین و ژ خوارنێن مایی و كەوێ خۆ یێ كەهی خوارنەكا گەلەكا خۆش دروست كری و بۆ بری، دا بۆ دووریێچەكریا بسەلمینیت، كو حەفت سالێن دووریێچكرنێ چ كار دژیانا باژێری نەكرییە و بێ مفایە ئەو ل سەر ڤێ چەندێ بەردەوام ببن. ل داویێ

ژی خیانەت هاتە کرن و ب تنێ هوسا بازێر کەفت. بنێرە براوەر 68 :Brauer 1993).

١٣٧. هوسا دیارە برایێ ئیسماعیلی یە.

١٣٨. Fraser 1840: 82, دویرێ دا نڤێسینەک کورت ژی هەیە ل سەر بارێ دەرونی یێ میرێ کورە، هاتیە وەرگرتن ژ دەستخەتێن روسی. Guest 1993: 68.

١٣٩. Rawilnson 1841: 26.

١٤٠. رەنگە ئەو ل ڤێرێ بەحسی سەلیمی دکەت، یێ کو فراسەری Fraser ل سەری بەحس کری.

١٤١. Stern 1854: 225. Fraser 1840: 68, هەردوو بەحسی ١٢٠٠ گوندان دکەن، کو ژمارەکا نەیا ریئالستیە. ئەڤ ژمارە ل دووڤ هژمارین فراسەری گەلەکا بەرزە. ل ڤان کولتورا ژمارین وەکی چل رۆژ، حەفت سال یان ١٢٠٠ گوند ب شیوەیەکێ سمبولی دهێنە بکارئینان و نەوەک ژمارە ب خۆ.

١٤٢. Grant 1841: 24.

١٤٣. Ainsworth 1842: 198.

١٤٤. Ainsworth 1842: 200.

١٤٥. Badger 1852: 204.

هەروەکی ل مالێن کەسان و ل جهێن رەسمی، ل دووڤ گۆتنێن خەلکێ بازێری، گەرەکە چەندین کانی هەبووینە. ل حالەتەکی ئەڤرۆ ژی کانیکەکا هوسا ب باشی مایە و دهێتە دیتن.

١٤٦. Bachmann 1913: 2.

١٤٧. Boehmder 1976: 417.

١٤٨. Boehmer 1976،419.

١٤٩. Ainsworth 1842: 204, Ross 1902: 103.

١٥٠. Gallati 1995:100.

١٥١. یۆنان Yonan/ 1989 بەحسی دیرۆکا فەللان ب تایبەتی فەلێن تیاری کرییە. ئەز ل ڤێری بەحسێ هەموو تشتان ناکەم. ژ بۆ جوداهیان ل ناڤبەرا فەلێن نوستریانی(نسطوری)، کلدانی، کالدێرا، یاکوبیان، ئاشوریان و هتد بنێرە یۆزێف Joseph 1961.

١٥٢. Ainsworth 1842:202.

١٥٣. Badger 1852: 184., Joseph 1961: 53, 63.

١٥٤. Badger 1852: 184.

١٥٥. Guest 1993: 89.

١٥٦. Joseph 1961: 56.

١٥٧. Guest 1993:82, 89.

١٥٨. Mayi 1999،154.

١٥٩. Guest 1993: 91.

١٦٠. ل ١٩٥٦ێ ژی کۆمکوژییەکا دی هوسا دەستپێکر بوو. بنێرە لایارد. Layard 1965 (1849): 128; Ross 1902:80, 90; Guest 1993: 98.

١٦١. Grant 1841:32.

١٦٢. نەدیارە کو ئەڤ هزارە ژ خەلکی هاتینەخلاس کرن یان رەڤاندن. ل بازێری سترانەک هەیە بەحسی گەلیێ لازان دکەت. لایارد دبێژیت ل ڤی گەلی و ژ بەر کۆمکوژیێ جوکێن خوینێ چوون. ئەڤ سترانە دبێژیت گەلیێ لازانێ گەلییەکێ کویرە. ئیشارەتێ ددەتەهندێ، کو ب هزاران خەلکێ وان گوندان ل ڤی گەلی ل هنداڤ زابی هاتنە هەشەکرن یان ژی کوشتینە و هاڤێتینە د ناڤ گەلی دا. Layard 1965: 136.

١٦٣. Damaludchi 1952: 51.

١٦٤. Badger 1852: 198, 202.
١٦٥. Ross 1902: 110.
١٦٦. Sandreczki 1857, Bd. 1: 276.
١٦٧. Sandrecski 1857, Bd. 1: 259, 265, 277, 280.
١٦٨. Sandreczki 1857, Bd. 1: 253.
١٦٩. Layard 1965: 117.
١٧٠. Ross 1902: 108.
١٧١. وێنە٩ ل Ammann 2004/2005:234
١٧٢. ل سەر وێنێن بێندەر (وێنە٩) تۆپەکا محەمەدێ کوری دیار دکەت. ئەڤ تۆپە ب دەستێ ئاسنگەرێن وی هاتییە چێکرن و ناڤێ وی ل سەرە. نەو ل موزەخانێیە ل عیراقێ، بەلێ من نکاری ببینم.
١٧٣. Ross 1902: 108.
١٧٤. Stern 1854: 225.
١٧٥. هوسا دیارە، کو خەلکێ جهو زەڤی و رەز نەبوون ل سەر بژین یان کار بکەن، ژ بەر هندێ پرانییا وانە د ناڤ بازیری دا دژیان و کارێ بازێران دکر. ژ بەر هندێ ژی دیتنا ئاینسوورت یا درستە، دەمێ پتر مالێن جهویان ژ یێن فەللان یان مووسلمانان ل بازێری هژمارتین. ل دوڤ ڤان هژماران دیارە مالێن فەللان هەر کێم دبن. ژ بەر چ خەلکێ دەڤەرێ ین مووسلمان زۆری ل جوهییان
نەدکرن، بەلێ پتر ل فەللان دکرن. ئەڤ پرسیارە دێ ل ڤێرە بێ بەرسڤ مینیت. Answorth 1842: 198
١٧٦. Binder 1887: 197.
١٧٧. کارێن یۆئاخیم گیرلیشس Joachim Gierlichs ١٩٩٨ بتنێنە ب درێژی خۆ ب ڤی دەرگەهی مژول کرین. ژ بەر هندێ ژی و بۆ زانستیێ من ناڤێ وی دانابەسەر، دەرگەهێ ئەژدەهار بکارئینا.
١٧٨. د گۆتنێن کولتوری دا ئەڤ دو ئەژدەهارە ب مار تێنەبەحس کرن. ئەژدەهار د زمانێ سەردەڤێ دەڤەرێ نینە. پەیڤا ئەژدەهار، یا فارسی، دهێتەبکارئینان، بەلێ نەبۆ ڤان هەردو ماران ل سەر دەرگەهی. بوو
زانینا سومبولێ ڤان ماران و یێن دەڤەرا هەکاری ژ بۆ کولتوری تورکی و کوردی بنێرەYalcin-Heck
mann 1991: 259.
١٧٩. Gierlichs 1998: 352.
١٨٠. Gerlichs 1998: 350 گیرلیشس ل وێ باوەرییە، کو ئەڤ دەرگەهە پشتی سەدسالییا ١٤ هاتییەئاڤاکرن.
١٨١. Binder 1887: 352.
١٨٢. Ross 1902: 107.
١٨٣. روسس دبێژە دەرگەهێ راوندوزێ و بیندەر دبێژە دەرگەهێ رۆژئاڤایی ب شاشیڤە.
١٨٤. گۆتنێن ژ زاردەڤێ خەلکێ دەڤەرێ دبێژن، کو نڤێسین ل سەر ڤی دەرگەهی هەبوون. ب ناڤێ میر ئۆسمان وەک دانایێ ڤی دەرگەهی. ب دیتنا گیرلیشس ئەڤ دەرگەهە ب ئاڤاهیڤە ل سەدسالییا ١٨ێ یان ١٩ێ نوی ل گەل دەرگە ژێ سەد سالان کەڤن هاتییەئاڤاکرن. هوسا دیارە دەرگەهـ جارەکا دی دگەل کۆچکێ ل ١٧٠٠ یان ژی دەمەکی کورت پشتی هنگێ هاتییەئاڤا کرن. بەری سەرەدانا بیندەری و یا روسسی ل ١٨٤٧ چ ریڤنکا بەحسی دەرگەهی و کۆچکێ ب دەرگەهـڤەنە هاتییەکرن. ژ هەژی گۆتنییە، کو دەمینیکانێن ئیتالی ل دەڤەرێ د ناڤبەرا سالێن ١٧٤٨ هەتا ١٨١٥ێ وەکی گیرلیشس بەحسی ڤی دەرگەهی کرییە و گۆتییە ئەو مرۆڤێ ئەژدەهاران دکوژیت ئەو میکائیلێ پیروزە. گیرلیشس ١٩٩٨: ٣٥٨. نەخشەک هەتا نێزیک بەغدایێ هەیە ل سەر دەمێ خەلیفێ عەبباسی ئەلناصر هەیە. گیرلیشس: ٣٥٨. بەلێ ئەو مرۆڤ ژی هەر ئێک ژ پاشچوییێن میرێن بادینان بوویە
١٨٥. مێژویا ڤی ئاڤاهی د نیڤەکا ١٢٣٣ هەتا ١٢٥٩ێ دایە Gierlichs ١٩٩٥: ١٩٥, ٢٠٢, ٢٠٦. گیرلیشس دبێژەئەڤە بۆ بیرهاتنا

سەركەفتنێ یا لولو پشتی ستاندنا كەلا ئامێدییێ ل ١٢٢٥ێ. وەك نیشانەك بوو موكمكرنا حوكمێ خۆ. Patton ١٩٩١: ٣١.

١٨٦. ل ناڤ گیرلیشس ١٩٩٥: نەخشێ ١٨.

١٨٧. گیرلیشس دبێژە دەرگەهێ مووسلێ كەڤنترە و دەرگەهێ ئەژدەهاران رەنگە ل بەر وی هاتبیتەئاڤاكرن. گیرلیشس ١٩٩٥: ٢٠٦ و ١٩٩٨: ٣٥٩.

١٨٨. Cuinet 1892: 79.

١٨٩. Sykes 1988: (1904) 165.

١٩٠. ژیدەری بەری. دبێژن ئەڤ كەسێ ئاڤاكری كورەك هەبوو ب ناڤێ قوباد. ئەڤ خواندنگەهە جاران ب ناڤێ مەدرەسا قوبهان تێتەناڤكرن واتە خواندنگەها ب قوبیا. هندەك گۆتنێن دەڤی دبێژن زەنگیدا ئاڤاكریە.

١٩١. Damaludschi 1952: 51.

١٩٢. شترێك (Strek ١٩١٣: ٣٤١.) دبێژە، ٥٠٠٠ كەس ل بازێری دژیان پتریا وانە كوردن، بەلێ ١٩٠٠ جهوژی هەبوون. ل هەموو دەڤەرا ئامێدی یێ ل داوییا سەدسالیا ١٩ێ ٢٣٩٠٠ كەس دژیان. ژ وانە١٣٦٨٠ كوردێن مووسلمان، ٦٠٠٠ ئاشوری، ١٩٠٠ جوهی و ٨٦٠ تورك. ( یۆنان ١٩٨٩: ٢١١.) ئەڤ توركە هەموو ب تنێ كەسێن عەسكەربوون.

١٩٣. Damaludschi 1952: 66.

١٩٤. Wigram & Wigram 1922:321, 395.

١٩٥. Wigram & Wigram 1922: Kapitel 15.

١٩٦. د چیایێن د سەر بازێری دا نیشانێن گورستانەكێ هەنە، ب زەحمەت دهێتەدیتن، دبێژن قوربانیێن وی دەمی ل وێرێ هاتینەبن ئاخكرن ل جهێ ڤەشارتنێ. بۆ پتر زانیاریان بنێرە: Behrends 1993: 301.

١٩٧. Hay 1921: 148, 371.

١٩٨. Hay 1921: 366, 371.

١٩٩. Wilson 1931: 149.

رەنگەل ڤێرە بەحسێ شەرێ بەردەوام د ناڤبەرا مالا كتانی و حەجی شەعبانێ دا بیت، كو هەردو خودان ملكن ل دەڤەرێ.

٢٠٠. Wilson 1931: 149; Harrison 1959: 187.

٢٠١. Hay 1921: 37; Edmonds 1957: 430.

٢٠٢. Edmonds 1957: 430.

٢٠٣. Amman 1991: 2.3.3.

٢٠٤. Brauer 1993: 58, 62.

٢٠٥. Stein 1964: 119.

٢٠٦. Blau 1975: 196.

٢٠٧. Bamarni 1999: 32.

٢٠٨. Blau 1975: 3, 196.

٢٠٩. Blau 1975: 196, McDowall 1996: 327. ژبۆ ناڤهرۆكا ڤێ پێكهاتنێ بنێرە

٢١٠. هەروەكو مە ل دەستپێكێ ئاماژەپێكری، ئەڤە لیستەكە وەك پێكولەك بۆ نێزیكبوون ژ راستییێ. راستی و مسوگەریا ڤێ لیستێ ژ بەر نەبوونا ژێدەرا و نەوەكهەڤیا گۆتنێن وانەنینە. ب تایبەت ل سەدەیا ١٣ێ و ١٤ێ. هەروەكو د وەرگێرانا شەرەفنامێ دا گۆتی (هندەك ب خۆبەحسێ خۆناكەن) ١٨٥٩: بپ ١١١.

# زاخۆ د رۆژناما (الموصل) دا ۱۹۲۱-۱۹۳۰

پ.هـ.د. هوگر تاهر تەوفیق
زانکۆیا زاخۆ/ کولیژا زانستێن مروڤایەتی
وەصفیە محەمەد شێخۆ سندی
ماجستێر/ دیرۆکا نوو و هەڤچەرخ
وەرگێران سالح یوسف سوفی

## کورتی:

چ ڤەکۆلەرێن بیاڤێ دیرۆکێ نەشێن رۆل و پێگەهێ رۆژنامەڤانیێ د بیاڤێ پاراستن و تۆمارکرنا پێزانین و هەلویستێن دیرۆکیدا کێم بکەن و ئەگەر رۆژنامەڤانی ژ بۆ مللەتێن دی گرنگ بیت ژ بۆ مللەتێ کورد گەلەك گرنگتر و کوورترە، چونکی کوردان هەتا شەرێ جیهانییێ ئێکێ ژی ژ بەر رەوشا سیاسیا وەلاتێ خۆ- نەشیابوون ژ بلی هندەك پەرتووكێن کێم چ تشتەکی ل سەر دیرۆکا خۆ بنڤیسن، ژ بەر هندێ، رۆژنامەڤانیێ جهێ ڤان پەرتووکان گرت و شیا هندەك لایەنێن دیرۆکا کوردان تۆمار بکەت، ڤێجا ئەڤ رۆژنامەڤانییە یا کوردان ب خۆ بیت یان یا وەلاتێن هەرێمی یان یا بیانی بیت.

ئێك ژ ڤان رۆژنامەیان رۆژنامەیا (الموصل) بوو کو ل مەلبەندێ باژێرێ مووسل ب زمانێ عەرەبی دەردکەڤت و چونکی زاخۆ ئێك ژ باژێرێن سەر ب ویلایەتا مووسل ڤە بوو، لەورا ڤێ رۆژنامەیێ هندەك پێزانینن ب مفا ل سەر قەزا زاخۆ ب گشتی و مەلبەندێ باژێری ب تایبەتی تۆمارکرینە کو د چ ژێدەرێن وی سەردەمیدا پەیدا نابن. لەورا رۆژنامەیا (الموصل) وەك ژێدەرەکێ رەسەنێ دیرۆکا زاخۆ و پێشهاتێن وێ یێن سیاسی د ناڤبەرا سالێن ۱۹۲۱-۱۹۳۰ دا دهێتە ل قەلەمدان.

گرنگیا بابەتی زێدەتر دبیت دەمێ بزانین کو زاخۆ ئێك ژ قەزایێن گرنگ و ستراتیژیێن هەرێما کوردستانا عیراقێ یە و ئەڤ گرنگییە ژ بەر چەندین هۆکارانە کو یا ژ هەمیان بەرچاڤتر جهێ جۆگرافیێ وێ یە کو دکەڤیتە د سێگۆشەیەکا ستراتیژی د ناڤبەرا سنوورێن عیراق - ترکیا - سوریا دا، هەروەسا زاخۆ خەلەکا پێکڤەگرێدانا سێ پارچەیێن کوردستانێ یە ئەو ژی کوردستانا باکوور، باشوور و رۆژئاڤایە، دیسا زاخۆ دەروازەیا سەرەکییە کو کوردستانێ ب تایبەت و هەمی عیراقێ ب گشتی ب وەلاتێن رۆژهەلاتا ناڤینڤە گرێددەت، ئەڤە ژ بلی کەڤناریا دیرۆکا وێ کو د ناڤ جهـ و شوینوارێن مێژوویی یێن وێدا دیار دبیت، لەورا دکارین بێژین کو زاخۆ زادەیا جهێ خۆ یێ جۆگرافی و شیانێن خۆ یێن ئابووری یە.

## پێشگۆتن:

نڤیسین ل سەر دیرۆکا خۆجهی و گەڕیان ل بەلگەنامەیێن وێ ئێکە ژ تایێن گرنگێن دیرۆکێ یێن گەلەك تشتان ل سەر دیرۆکا وان باژێر و دەڤەران دیار دکەن یێن دیرۆکنڤیس ل دووڤ دگەڕیێت، ئەڤ تشتێ مە گۆتی دروستە بۆ قەزا زاخۆ ژی بێتە گۆتن ئەڤە ژی دەمێ خۆ دادهێلینە دیرۆکا وێ قەزایێ د ڤی ماوەی دا، هەروەکی دهێتە زانین، کوردان قەوارەیەکێ خۆسەر یان هەتا نیڤ خۆسەر ژی نەبوویە هەتا بشێن گرنگیێ ب دیرۆکا خۆ، عەشیرەتێن خۆ، داب ونەریتێن خۆ بدەن، ژ بەر هندێ، ڤەکولینێن کوور ل سەر دیرۆکا وان هەتا دەهکێن نەهێ یێن سەدسالییا بیستێ نابینین، هەتا پشتی سەرهلدانا بهارا ١٩٩١ ێ زانکۆ ل باژێرێن جودا جودایێن باشووری کوردستانێ هاتینە ڤەکرن و ڤان زانکۆیان نڤیسینا دیرۆکا کوردی ب ستوویێ خۆڤە گرت کو ڤەکولەر و دیرۆکنڤیسان ژ بیر کریوو (هەکە ئەڤ دەربڕینە یا دروست بیت).

ژ بەر هندێ، ڤەکولین ل سەر هەر بابەتەکی ل سەر دەمەکێ دیرۆکا کوردی یان ل سەر هەر باژێرەکێ باشووری کوردستانێ، خۆ هەکە زانیاری یێن گەلەك کێم ژی د وێ ڤەکولینێدا بن، بێ گومان دێ پەرتووکخانەیا دیرۆکی یا کوردی دەولەمەندکەت، کو پەرتووکخانەیەکا هەژارە هەکە بێتە هەڤبەرکرن دگەل دیرۆکا نڤیسکی یا گەلێن دی یێن هەڤسوویێن وێ ل رۆژهەلاتا ناڤین.

ل دووڤ وی تشتێ مە ل سەری گۆتی، ئارمانجا سەرەکی ژ ڤێ ڤەکولینێ رۆهنکرنا دیرۆکا قەزا زاخۆیە د سالێن ١٩٢١-١٩٣٠یدا هەروەکی د رۆژنامەیا (الموصل) دا هاتی کو ب رۆژنامەیا عیراقی یا ئێکێ د دەولەتا نوی پێکهاتییا عیراقێدا دهێتە هژمارتن، بەلکی رۆژنامەیا (الموصل) درێژەپێدانا رۆژنامەیا (موصل)ە یا پێش وی دەمی ژ ئالیێ دەستەلاتێن ئۆسمانی ڤە ل ویلایەتا مووسل ل دەهکێن هەشتێ یێن سەدسالا ١٩ێ دەردکەڤت، ژ بەر هندێ، ڤێ رۆژنامەیێ هندەك زانیاری یێن باش ل سەر قەزا زاخۆ تێدا هەنە و دبیت هندەك کلیلێن روودانێن دیرۆکی بدەنە ڤەکولەران داکو ببنە بنواشە بۆ ڤەکولینا دیرۆکا قەزا زاخۆ ل سەردەمێ شاهاتیێ (شانشینیێ).

گرنگە ئاماژەیێ بکەینە وێ چەندێ ژی کو مە ڤەکولینا خۆ ل سەر سالێن ل ناڤبەرا ١٩٢١-١٩٣٠ ێ کریە، ئەڤە ژی ژ بەر چەند ئەگەرەکان، ئەو ژی ئەوە کو رۆژنامەیا (الموصل) د سالێن شەڕێ جیهانیێ ئێکێدا راوەستیا بوو و پتریا هژمارێن وێ یێن بەری سالا ١٩٢١ ێ دبەرزە یان د تەڕاوبەڕانە، هەروەسا سالا ١٩٢١ێ هاتە ژێگرتن ژ بەرکو ئەو سالا دامەزراندنا سیستەمێ شاهاتییا عیراقێ یە، ناڤێ زاخۆ د بەریەڕێن وێدا د چارچوڤێ کاروبار و رێکارێن دەولەتا نوو یا عیراقی دا هاتییە، لێ ئەگەرێ ژێگرتنا سالا ١٩٣٠ێ ژ بەر هندێ بوویە کو رۆژنامەیا (الموصل)، هەرچەندە شیاینە پتریا هژمارێن وێ یێن هەتا سالا ١٩٤٧ ێ ب دەست خۆ بێخین، لێ ئەو رۆژنامە پشتی سالا ١٩٣٠ ێ بەحسێ زاخۆ ناکەت، بەلکی تنێ د دو یان سێ دەنگ و باسان دا بەحس کریە، ژ بەر هندێ، زانیاریێن د رۆژنامەیا (الموصل) دا هاتین نەچارکرین سالا ١٩٣٠ ێ ژێ بگرین و ل وێرێ راوەستێین.

ل سەر پلانا ڤەکولینێ ژی، ل دووڤ زانیاری یێن رۆژنامەیا (الموصل) بەلاڤکرین، ڤەکولین بۆ چوار پشکان هاتییە دابەشکرن، پشکا ئێکێ ب ناڤ ونیشانێن (کارگێڕییا حکومی ل زاخۆ ل ناڤبەرا سالێن ١٩٢١-١٩٣٠ێ)یــە و رۆناهی ئێخستییە سەر هەیکەلێ دیارترین سازیێن کارگێڕی ل زاخۆ و دیارترین چالاکی یێن وێ وەکی: قائیمقامی، دادگەهـ، ئەوقاف.. هتد. سەرباری کێمیا زانیاری یێن تێدا ل سەر زاخۆ، لێ ب زانیاری یێن نوو یێن ل سەر دیرۆکا قەزایێ دهێنە ل قەلەمدان و ژێدەرێن دی یێن دیرۆکی بەحسێ وان زانیاریان نەکریە، لێ پشکا دوویێ یا ڤەکولینێ ب ناڤ ونیشانێن (فێرکرن و رەوشەنبیریا گشتی)یە و تێدا ڤەکولینەك ل سەر چالاکییا فێرکرنێ ل زاخۆ هەیە و ناڤێن خواندنگەهێن زاخۆ یێن د رۆژنامەیا (الموصل) دا هاتین هەنە و کا چالاکییا رەوشەنبیری ل باژێری چەوان بوویە کو

هەتا نۆكە ژی ب ئێك ژ دیارترین ناڤەندێن هۆنەری ل باشووریّ كوردستانیّ دهێتە نیاسین، هەروەسا پشكا سیێ ب ناڤ ونیشانێن (رۆژنامەیا الموصل و دەنگڤەدانا رەوشا سیاسی ل عیراقێ ل سەر زاخۆ)یە و ئەڤە گرنگترین پشكا ڤەكۆلینێ یە و زەنگینە ب زانیاری یێن تایبەت ب بابەتێ پەیوەندی ب كێشەیا مووسل ڤە هەی، ئەڤ پشكە رۆناهیێ دئێخیتە سەر وان روودانێن دگەل كێشەیا مووسل پەیدا بووین - كو ئەڤ كێشەیە ئێك بوویە ژ دیارترین كێشەیێن ل ناڤبەرا عیراقێ و تركیا ل سالێن ١٩٢١-١٩٢٥ێ، نەخاسمە وان تشتێن پەیوەندی ب هێرشێن تركی یێن ل سەر زاخۆ ڤە هەین، هەروەسا وان كۆمبوونێن ل ناڤبەرا هەردو حكۆمەتێن عیراقێ و تركیا دهاتنە كرن بۆ نەخشەدانانا سنووریّ ل ناڤبەرا هەردو دەولەتان هەتا سالا ١٩٢٩ێ.

ل داویێ ژی، رۆژنامەیا (الموصل) هندەك دەنگ و باس ل سەر زاخۆ بەلاڤكرینە كو پێدڤییە بێنە بەحس كرن خۆ هەكە ب كورتی ژی بیت و ئەڤ دەنگ و باسە ژی د پشكا سیێ یا ڤەكۆلینێدا هاتینە كو ب ناڤ ونیشانێن (دەنگ و باسێن جودا جودا)یە.

ل سەر ژێدەرێن ڤەكۆلینێ پشتا خۆ پێ گەرمكری، سەرباری هندەك ژێدەرێن نەسەرەكی یێن ناڤێن وان د پەراوێزاندا هاتین، هژمارێن رۆژنامەیا (الموصل) یێن سالێن ١٩٢١-١٩٣٠ێ نە و ئەو ژێدەرێن ئێكێ و سەرەكی یێن ڤێ ڤەكۆلینێ نە، هەروەسا پێدڤییە بێژین كو رۆژنامەیا (الموصل) تنێ دەنگ و باس بەلاڤدكرن بێی هندێ كۆمێنتان ل سەر بدەت یان شرۆڤەبكەت، ژ بەر هندێ، زانیاری یێن ڤێ رۆژنامەیێ یا ب زمانێ عەرەبی دەردكەڤت هەتا رادەیەكێ دهشك بوون و تنێ دەربرین ژ دیتن وبۆچوونا حكۆمەتا عیراقێ و ل پشت وێ حكۆمەتا بریتانی دكر كو وێ دەمی سەرپەرشتیا دەولەتا عیراقێ دكر.

## ئێك ـ كارگێرییا حكومی ل زاخۆ ل ناڤبەرا سالێن ١٩٢١-١٩٣٠ێ:

رۆژنامەیا (الموصل) ب كورتی زانیاری ل سەر رەوشا كارگێریی ل زاخۆ[1] و دیارترین چالاكی یێن وێ د هەمی بیاڤان دا بەلاڤ كرینە، سەرباری كێمیا وان ژی، لێ هزرەكێ ل سەر سەرانسەری ژیانا گشتی یا وێ قەزایێ یا وی دەمی ددەنە ڤەكۆلەری كو د ژێدەرێن دی یێن دیرۆكی دا نەهاتینە.

### أ ـ قائیمقامی:

جڤاتا قەزا زاخۆ و قائیمقامییا وێ جهەكێ گرنگ ل سەر بەرپەرێن رۆژنامەیا (الموصل) هەیە، هەر بۆ نموونە د هژمارەیا رۆژا ٣٠ ئادارا ١٩٢١یدا ناڤێن ئەندامێن جڤاتا قەزا زاخۆ بەلاڤكرینە كو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ نە: (حازم بەگ، حاجی ئەحمەد، میخائیل ئەفەندی و شالۆم كورێ هۆشا)[2]، هەروەسا د هژمارەیا رۆژا ٢ چریا دووێ ١٩٢٤یدا دەنگ و باسەك ل سەر قائیمقامیّ زاخۆ ب ناڤ ونیشانێن (قائیمقامێ نوو یێ زاخۆ) بەلاڤكریە و تێدا هاتییە: (هێژا فەتاح بەگ قائیمقامێ زاخۆ هاتە خانەنشین كرن و وەزارەتا ناڤخۆ هێژا رێڤەبەرێ نڤیسكارییّ(تەحریرات)یێ لیوا مووسل فەخری ئەفەندی ل شوونێ دامەزراندییە[3]، ئەڤ فەرمانبەرێ ب باشترین ئاوا كارێن خۆ ب رێڤەبرین و وەك رێزگرتن بۆ كارێن وی، حكۆمەتێ پۆستێ وی بلندكریە و كریە قائیمقامێ زاخۆ[4]، هەر ل سەر ڤی بابەتی، رۆژنامەیا (الموصل)، د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ١٣ چریا ئێكێ ١٩٢٤یدا دەنگ و باسەكێ درێژ ل سەر ڤێ دامەزراندنا نوو ب ناڤ و نیشانێن (قائیمقامێ نوو یێ زاخۆ) بەلاڤكریە و تێدا هاتییە: (ئێڤاریا رۆژا شەمبی یا بۆری هێژا فەخری ئەفەندی قائیمقامێ مە یێ نوو گەهشتییە زاخۆ و ژ بەر پێگەهێ وی یێ بلندێ ل نك مە، ب گەرمی ژ ئالیێ فەرمانبەر و ریهسپی و ماقوولێن بازێری ڤە هاتییە پێشوازیكرن، پشتی هێژای كاروبارێن قەزایێ وەرگرتین، هەر ئێكسەر دەست ب پشكنینا هەمی فەرمانگەهێن ناڤەندا قەزایێ كر، پاشی قەستا گوندان كر داكو رەوشا قشلە و بنكەهێن پۆلیسان یێن ل سەر توخیبی و كاروبارێن خەلكی و وەلاتیان ل دوورترین دەڤەرێن توخیبێ عیراقێ بزانیت، مە ژ هێژای زانی كو كارێن

پۆلیسان ب سەرکردایەتییا رێپێدراو(مفەوز) یوونس ئەفندی گەلەك ب دلێ وی بووینە کو د وان تەنگافی و دەمێن پڕ مەترسی دا کارێن خۆ ب باشترین ئاوا ب رێڤەبرینە، هەروەسا هێژا قائیمقامێ مە یێ نوو دلخۆش بوویە ژی کو خەلکێ ئاکنجیێ دەڤەرێن سنووری ب رحەتی و تەناهی مژوولی کارێن خۆنە.. ب راستی ژی، قائیمقامێ مە یێ نوو کەسەکێ چالاك و پڕ بزاڤە و ئێکسەر دەمێ گەهشتییە قەزایێ، زەند وباسکێن خۆ هەلدان و بۆ خێرا ڤی وەلاتی ژ دل دەست ب دووڤچوونا کاروبارێن گوندان و رەوشا بنگەهێن پۆلیسان کر و ژ گوندەکی دچوو گوندەکێ دی و کارێن خۆ ب رێڤە دبرن، خودێ سەرکەڤتنێ بدەتێ)[5].

ژ دەنگ و باسێ د هژمارەیا رۆژا ١٣ کانوونا ئێکێ ١٩٢٨ێدا هاتی دیار دبیت کو فەخری ئەفندی ب قائیمقامەکێ دی هاتییە گهورین و تێدا هاتییە: (مستەفا بەگ ئەلعومەری[6] قائیمقامێ قەزا زاخۆ قەستا زاخۆ کر پشتی شەش هەیڤا بوویە موتەسەرفێ دیالا ب وەکالەت کو ئەو پۆست وی دەمی یێ ڤالا بوو، هێژا جەمیل ئەفندی ـ ژ زاخۆ - ئەو دانیاسین و کاروبارێن قائیمقامییا زاخۆ ب وەکالەت ب رێڤە برن)[7].

وەسا دیارە ژی کو بچووکییا قەزا زاخۆ وەلێ کریە جهەکێ دیار و بەرچاڤ ل سەر بەرپەرێن رۆژنامەیا (الموصل) نەبیت، کو هەروەکی دبینین دەنگ و باسێن کێم و ل دەمێن ژێك دوور ل سەر وێ قەزایێ بەلاڤدکەت.

## ب ـ دادگەهـ:

ل سەر دادگەهێن قەزا زاخۆ ژی، رۆژنامەیا (الموصل) تنێ دو دەنگ و باس ل سەر بەلاڤکرینە، یێ ئێکێ: پەیوەندی ب پێکئینانا دادگەهـا زاخۆ ڤە هەیە، بۆ زانین ژی، دەنگ و باس هەتا رادەیەکێ مەزن نە یێ رۆهنە و ب دروستی ئاماژەیێ ناکەتە وێ چەندێ کا ئارمانج ژ بەلاڤکرنا ڤی دەنگ و باسی چییە و ئەو دەنگ و باس د هژمارەیا رۆژا ١٦ کانوونا دووێ ١٩٣٠ێدا ب ناڤ ونیشانێن (پێکئینانا دادگەها مەزن)[8] هاتییە بەلاڤکرن و تێدا هاتییە کو میستەر ویلدن Weldn سەرۆکێ دادگەهێن مەدەنی یێن مووسل و هێژا حوکمدار فرەنسیس ئەفندی ل دادگەهێ ئامادەبووینە بۆ دیتنا دەعوایەکا تاوانکاری(جنائی) ل وێرێ[9]، بێی هندێ چ زانیارێن دی بێنە ئەشکەرا کرن، لێ دەنگ و باسێ دووێ بەرێ وێ دیرۆکێ ل رۆژا ٢٧ ئادارا ١٩٢٩ێ هاتییە بەلاڤکرن و ئاماژەیێ دکەتە دەعوایەکا ل دادگەها ئاشتبوونا زاخۆ (محكمة صلح زاخو) هاتییە توومارکرن و تێدا هاتییە: (ل سەر داخوازییا داخوازکەر یوسف میرزا دادگەها ئاشتبوونا زاخۆ فەرماندا ٤٣ رپی و ١٣ عانە[10] ژ یێ دەعوە ل سەر هاتییە توومار کرن سەید قاسم کورێ سەید عەلی پۆلیسێ بەرێ یێ ل تاخێ دەرگەهێ مزگەفتێ ئاکنجی بێنە وەرگرتن و ژ بەرکو نۆکە جهێ ئاکنجیبوونا وی دیار نینە، بریار هاتەدان ب ڤێ بریارا حوکمی یا دهێتە بەلاڤکرن، پێ بێتە ئاگەهدارکرن و هەر رۆژا بەلاڤکرنێ و هەتا بۆرینا هەشت رۆژان ئەو دشێت سەرەدانا دادگەهێ بکەت و وی مافێ تانلێدانێ ل وێ بریارێ هەیە، لێ هەکە د وی دەمێ دیارکریدا سەرەدان نەکر، ئەو حوکم دێ پلا ئێکلابوونێ(داوییێ) وەرگریت و وەکی خۆ دێ هێتە ب جهـ ئینان)[11].

رۆژنامەیا (الموصل) د وی ماوەیدا تنێ ئەو هەردو دەنگ و باس ل سەر دادگەهێن زاخۆ بەلاڤ کرینە.

## ج ـ بازرگانی:

هەروەسا هندەك دەنگ و باسێن گەلەك کورت ل سەر ڤی لایەنی هەنە، ئەڤە ژی وێ چەندێ دگەهینیت کو بزاڤا بیناسازی ل قەزا زاخۆ گەلەك یا لاواز بوویە، کو ئەڤە ژی دبیت ژ بەر شیانێن ماددی یێن لاوازێن حکومەتێ یان ژ بەر دووربیا زاخۆ و جهێ وێ یێ جۆگرافی بیت ل سەر توخیبێ ترکیا، رۆژنامەیا (الموصل) دەنگ و باسەك د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٢٢ ئیلۆنا ١٩٢١ێدا ل سەر رۆلێ بازرڤانیێ د وان خزمەتگوزارییان بەلاڤکریە یێن پێشکێشی

قەزایێ دكەت و تێدا هاتییە: (بازێرڤانییا زاخۆ پیادەیا رێیا(شوستەیێ) بازارێ زاخۆ ب ئاوایەكێ جوان ب داوی ئینایە و هاتن وچوون ب ساناهی بوویە، بازێركی ژی دیمەنەكێ جوان ب خۆڤە گرتییە و ل وێ باوەرێینە كو بازێرڤانییا زاخۆ تنێ ب سەخبێركرنا ڤێ جاددێ ب تنێ راناوەستێت، مە زانییە كو ل بەرە هندەك سەخبێرییێن دی ژی بكەت وەكی چێكرنا پرەكا نوو ژ گزیرتێ زاخۆ بۆ رەخێ راستێ یێ رووبارێ خابووری و چێكرنا تاخەكێ نوو ل باكوورێ رووباری داكو رووبەرێ بازێركی و رەخ ورووبێن وێ بەرفرەهـ ببن[١٢].

هەروەسا رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارا خۆ یا رۆژا ٦ كانوونا دووێ ١٩٣٠یدا دەنگ و باسەك بەلاڤكرییە و تێدا گۆتییە كو جڤاتا كارگێڕییا لیوا مووسل ل سەر پێشنیازا جڤاتا بازێرڤانییا زاخۆ رازی بوویە بۆ ناڤكرنا وی پرا ل بەرە سەرۆژنوو ل سەر رووبارێ خابوور بێتە ئاڤاكرن و ناڤێ وێ پرێ ببیتە (پرا سەعدون)[١٣] وەك رێزگرتن بۆ بیرهاتنا ژ دەستدایێ وەلاتی (هەروەكی رۆژنامەیێ هۆسا سالۆخدای) عەبدلموحسن سەعدون[١٤]، ئەڤە ل وی دەمێ رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆیا رۆژا ١٤ نیسانا ١٩٣٠یدا پشتراست دكەت كو فەرمانگەها ئەشغال و گەهاندنان ل لیوا مووسل دەست ب دانانا پرەكا دی یا ئاسنی ل زاخۆ كرییە بۆ دەربازبوونا ترۆمبێل و هەمی هۆیێن ڤەگوهاستنێ و پشكا ناڤین یا ڤێ پرێ ئەڤ سالە دێ تمام بیت[١٥]، هەر د وی چارچۆڤەی دا رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆیا رۆژا ٣ چریا ئێكێ ١٩٣٠یدا دیاركرییە كو بنواشەیێ راگرێ ناڤینێ پرا ئاسنی یا زاخۆ هاتییە دانان و هیڤییەكا گەلەك مەزن هەیە ئەڤ پرە ئەڤ سالە تمام ببیت و دێ گەلەك یێ رێك وپێك و باش بیت، كو درێژیا وێ ٢٠٠ پی و پانییا وێ ١٨ پییە[١٦].

## د. ئەوقاف:

هەرچەندە ئەڤ فەرمانگەهە ل سەردەمێ نوو خودان هێز بوویە ئەڤە ژی ژ بەر زۆریا كارمەندێن وێ و ملكداریكرنا گەلەك خانووبەرەیان ل هەمی بازێرێن كوردستانێ و عیراقێ، لێ (رۆژنامەیا مووسل) تنێ د گۆتارەكا گەلەك كورت دا بەحسێ كارێ ڤێ فەرمانگەها زاخۆ كرییە و د هژمارا خۆیا رۆژا ٢٧ خزیرانا ١٩٢١یدا گۆتارەك ب ناڤ ونیشانێن (رێڤەبەرێ ئەوقافا مووسل ل هەردو قەزایێن زاخۆ و دهۆك) بەلاڤكرییە و (رۆژنامەیا مووسل) د وێ گۆتارێدا رەوشا كارگێڕی، ساخلەمی، بیناسازی، گەشتیاری ل زاخۆ سەنگاندییە، هەروەسا پشتەڤانییا خۆ بۆ بەرفرەهكرنا بیناسازیێ ب رێیا هاریكاریا رێڤەبەریا ئەوقافا مووسل دەربڕییە كو ئەو رێڤەبەری هاریكاریێ د وێ بەرفرەهكرنێدا بكەت و پارچەیێن عەردی بدەتە خەلكی و ل سەر كیسێ ئەوقافێ بێنە ئاڤاكرن، د دەڤێ گۆتارێدا هاتییە: (هێژا ئەسعەد ئەفندی عومەری رێڤەبەرێ ئەوقافا مووسل ئەم ل سەر وان تشتان ئاگەهدار كرینە یێن ل دەمێ سەرەدانا خۆ بۆ هەردو قەزایێن زاخۆ و دهۆك دیتین و بەحسێ رێك وپێكیا وان هەردو قەزایان كرییە، وی گۆتییە كو نیشانێن بیناسازیێ ل وێرێ باش دیارن و دێ بینی حوكمدار و سەرۆكێن بازێرڤانییان مژوولی باشكرنا رەوشا هەردو بازێرڤانییان و رێكخستنا بازارێن وانە، ئەڤە سەرباری كو خەلك ژی ب هەمی شیانێن خۆ بزاڤا باشتركرنا رەوشا ژیارا خۆ دكەن و ل سەر پرۆسا ئاڤاكرنا خانیێن خۆ بەردەوامن، هەروەسا رێڤەبەرێ هێژا ئاماژە كرییە رەوشا ساخلەمیێ و پەسنێ وی كەرتی كرییە و گۆتییە كو پاقژی د هەر تشتەكی دا دیار و بەرچاڤە، هەروەسا گۆتییە مە كو دێ ب داهاتێ ئەوقافێ بزاڤا نووكرنا سەرشووا (هەرفتی و خراب بووی) كەت داكو پاقژ و بژوینیا وێ یا پاراستی بیت و ل بەرە ژی پارچەیێن ڤالاییێن عەردێ ئەوقافێ پێشكێش بكەت داكو بێنە ئاڤاكرن و پشكەكا وان ژی ل سەر كیسێ ئەوقافێ بێنە ئاڤاكرن[١٧]، بێ گومانە ژی كو كارەكێ هۆسا دێ رووبەرێ ئاڤاهی ل زاخۆ بەرفرەهكەت و دێ ل سەر مۆدێلا نوو و سەردەم بیت و دێ هەژی هندێ بن ببنە هاڤینگەهـ بۆ وان یێن دڤێن قەست بكەنێ، هەروەسا هێژای ئاماژە

كریە وێ چەندێ ژی كو سیلاڤەك هەیە و دشیاندایە وەك ئامیرەكێ كارەبێ بۆ رۆنكرنا قەزایێ بێتە ب كار ئینان..)[١٨].

## هـ - دامەزراندن و ڤەگوهاستنا فەرمانبەرێن كارگێرییا حكومی ل زاخۆ:

ڤی بابەتی ژی جهێ خۆ د (رۆژنامەیا مووسل) دا گرتیە و د هندەك هژمارەیێن خۆ دا ئاماژە كریە وان دامەزراندن و ڤەگوهاستنێن حكۆمەتا لیوا مووسل د چارچۆڤێ قەزا زاخۆ دا بۆ فەرمانبەران دكرن، هەر بۆ نموونە د هژمارەیا رۆژا ١٠ ی شواتا ١٩٢٩ یدا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (ڤەگوهاستنا رێپێدراوێن پۆلیسێن لیوا مووسل) هاتیە بەلاڤكرن و تێد هاتیە كو رێپێدراو(مفەوز) ئەنوەر ئەفندی مەئمووری مەلبەندێ پۆلیسێن شنگال هەر بۆ وی كاری بۆ قەزا زاخۆ هاتیە ڤەگوهاستن ل شوونا رێپێدراو عەبدوللا وەتاری یێ بۆ بازێرێ مووسل هاتیە ڤەگوهاستن، هەروەسا رێپێدراو مستەفا ئەفندی ژ بازێرێ مووسل بۆ مەلبەندێ پۆلیسێن شرگات هاتیە ڤەگوهاستن ل شوونا شاكر ئەفندی یێ بۆ دێمكا ل قەزا زاخۆ هاتیە ڤەگوهاستن[١٩].

هەر ل سەر ڤی بابەتی، بەحسێ وان ڤەگوهاستن و دامەزراندنان ژی هاتیەكرن یێن د كەرتێ وەزارەتا مەعارف(پەروەردێ) دا هاتینەكرن و (رۆژنامەیا مووسل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٣٠ ی ئیلۆنا ١٩٢٩ یدا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (ڤەگوهاستن و دامەزراندنێن پەروەردێ ل دەڤەرا مووسل)بەلاڤكریە و تێدا هاتیە كو یەحیا ئەفندی نەزهەت رێڤەبەرێ خواندنگەها (باب البیض) بۆ رێڤەبەریا خواندنگەها زاخۆ هاتیە ڤەگوهاستن ل شوونا رێڤەبەرێ وێ سەعید زەكی فندی یێ بۆ خواندنگەهەكا دەڤەرا بەغدا هاتیە ڤەگوهاستن، هەروەسا عەبدلحەكیم ئەفندی ئیبراهیم مامۆستایێ خواندنگەها زاخۆ بۆ خواندنگەها ئامێدیێ هاتیە ڤەگوهاستن[٢٠]، هەر د وێ هژمارێدا دەنگ و باسەك ل سەر دامەزراندنا (دەرچوویێن خانەیا مامۆستایان) هاتیە بەلاڤكرن و تێدا هاتیە كو رێڤەبەریا كارگێرییا مووسل دەرچوویێن خانەیا مامۆستایان ل لیوا مووسل ل هژمارەكا دەڤەران دامەزراندینە و ئەوێ ل زاخۆ هاتیە دامەزراندن خەلیل ئەفندی ئیبراهیم بوویە و ل خواندنگەها زاخۆ هاتیە دامەزراندن[٢١].

هەر د چارچۆڤێ دامەزراندنێ ل كەرتێ پەروەردێ، (رۆژنامەیا مووسل) د هژمارەیا خۆیا رۆژا ٢٢ ئیلۆنا ١٩٣٠یدا دەنگ و باسەك ل سەر دامەزراندنا (دەرچوویێن خانەیا مامۆستایان) بەلاڤكریە و تێدا هاتیە كو هەر هەر ئێك ژ مامۆستا: ئیبراهیم خەلیل، مستەفا حەسەن و سالح ئەحمەد ل خواندنگەها زاخۆ هاتینە دامەزراندن[٢٢].

ژ هەمی زانیاری یێن بۆری وەسا دیار دبیت كو بزاڤا دامەزراندن و ڤەگوهاستنان ل قەزا زاخۆ وی دەمی گەلەك كێم بوویە، ئەڤە ژی دبیت ژ بەر بچووكییا قەبارێ ڤێ قەزایێ بیت كو وەك پێدڤی گرنگی پێ نەهاتییەدان، هەكە بێتە هەڤبەركرن دگەل ناڤەندێن دی یێن مەزنێن دەڤەرێ.

## دوو - فێركرن و رەوشەنبیرییا گشتی:

### أ - فێركرن:

(رۆژنامەیا مووسل) گەلەك بەرپەرێن خۆ بۆ بەلاڤكرنا چالاكیێن فێركرن و خواندنگەهێن لیوا مووسل ژ وانا یێن زاخۆ ژی تەرخانكرینە، هەرچەندە ئەو دەنگ و باس دكورتن ژی، لێ گەلەك تشت ل سەر پرۆسا فێركرنێ یا وی دەمی ل زاخۆ دیار دبن، هەر بۆ نموونە، (رۆژنامەیا مووسل) د هژمارا خۆ یا رۆژا ٣٠ تیرمەها ١٩٢٤یدا دەنگ و باسەك ل سەر بێشا خەلكێ ناحیا سلێڤانەیی ب گوژمێ ٤٢٤ رپییان بۆ ئاڤەدانكرنا خواندنگەها زاخۆ[٢٣] بەلاڤكریە، ئەڤە ل وی دەمێ وێ رۆژنامەیێ د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٢٤ ی كانوونا ئێكێ یا سالا ١٩٢٨ یدا بەلاڤكریە كو حەزەكا زۆر یا فێربوونێ ل زاخۆ هەیە و تێدا هاتیە كو ژوورەكا نوو ل خواندنگەها قەزا زاخۆ ل

سەر ئاڤاهییێ خواندنگەهێ ل زاخۆ هاتییە ئاڤاکرن ژ بەرکو هژمارا خویندکارێن وێ خواندنگەهێ زێدە بووینە[٢٤].

هەروەسا (رۆژنامەیا مووسل) دیار کریە کو حکۆمەت گرنگییێ ددەتە خزمەتێن فێرکرنێ ل زاخۆ و بەردەوام خواندنگەهێن زاخۆ ژ ئالیێ بەرپرسێن کارگێری ڤە دهێنە پشکنین و دووڤچوونا کاروبارێن وان خواندنگەهان دهێتەکرن، هەر بۆ نموونە، وێ رۆژنامەیێ د هژمارا خۆ یا رۆژا ١٠ خزیرانا ١٩٣٠یدا دەنگ و باسەك ل سەر سەرەدانا عاسم بەگ چەلەبی رێڤەبەرێ پەروەردەیا لیوا مووسل دگەل جەمیل بەگ پشکنەرێ یاری یێن وەرزشی بۆ هەردو قەزایێن دهۆك و زاخۆ بەلاڤکریە[٢٥]، وێ رۆژنامەیێ د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ١٤ تیرمەها ١٩٣٠ ێ گۆتارەکا کورت دا ب ناڤ ونیشانێن (ئەنجامێن تاقیکرنێن پۆلێن شەشێ سەرەتایی یێن کوران ل دەڤەرا مووسل) بەلاڤکریە و تێدا ئەنجامێن وان تاقیکرنان سەنگاندینە و تشتێ پەیوەندی ب زاخۆ ڤە هەی، رۆژنامەیێ ئاماژە کریە وێ چەندێ کو دەهـ خویندکارێن خواندنگەها زاخۆ پشکداری د تاقیکرنان دا کربوون و ئەڤ هەر سێ یێن ناڤێن وان ل خوارێ دەرچووبوون: فرەنسیس ئیلیا خوری ٥١٥، خێری ئەمین تۆما ٥٠٨ و سەعید ئەمین تۆما ٥٠٤، هەروەسا پێنج ژی ڤەماینە (موکمل بووینە) کو ئەو ژی ئەڤەنە: سەلیم مۆشێ کابای ٥٠٨، حەننا جەجۆ حەننا ٤٧٤، جەمال حسێن محۆ ٥٣٢، جەمیل دەرویش مستەفا ٤٥٩ و سەبری حەننا هورمز (ئامادەنەبوو)[٢٦]، تێبینیا ل سەر ڤی دەنگ و باسی هەی ئەوە کو هەمی ناڤێن تێدا هاتین ناڤێن مەسیحی نە ژ بلی دو ناڤان، رامانا ڤێ ژی ئەوە کو مەسیحیێن ل ناڤەندا قەزا زاخۆ دژیان و پتر ژ کوردان گرنگی ددانە فێرکرنێ کو وی دەمی کوردان پتر گرنگی ددا خودانکرنا تەرش وکەوالی و چاندنێ.

تشتێ پەیوەندی ب چالاکیا وەرزشی و هۆنەری ڤە هەی ل خواندانگەها زاخۆ، (رۆژنامەیا مووسل) د هژمارا خۆ یا رۆژا ٨ کانوونا ئێکێ ١٩٣٠ێ گۆتارەك ب ناڤ ونیشانێن (فیستەڤالا شەشێ یا دیدەوانیا خواندنگەهێن مووسل یێن میری) بەلاڤکریە و تێدا بەهانەیەکێ بۆ پشکداری نەکرنا وێ خواندنگەهێ د وێ فیستەڤالێدا دئینیت و تێدا هاتییە: (١٣٠٠ دیدەڤانان پشکداری د فیستەڤالێدا کریە و چوونا وان د فیستەڤالێدا ١٢ دەقیقەیان ڤەکێشایە، بڕیار بوو تیپا دیدەوانیا خواندنگەهێن قەزایێن زاخۆ، دهۆك، شنگال، تەلەعفەر وتلکێف ژی پشکدارییێ تێدا بکەن، لێ ژ بەر گوهۆڕینێن نشکاڤەیی یێن سەقای، پشکداریا وان بۆ فیستەڤالا بهێت هاتە پاشێخستن، هەکە زانی با سەقا دێ یێ خۆش بیت، خۆ گیرۆ نە دکر و داهێت پشکدارییێ د فیستەڤالێدا کەت)[٢٧].

(رۆژنامەیا مووسل) ڤەگوهاستنا دەنگ و باسێن فێرکرن و خواندنگەهان و چالاکی یێن خویندکارێن سەرانسەری دەڤەرێن لیوا مووسل ژ وان یێن زاخۆ ژی ب ستۆوێ خۆڤە گرتبوون، هەر بۆ نموونە، وێ رۆژنامەیێ د هژمارا خۆ یا رۆژا ١٨ کانوونا ئێکێ یا ١٩٣٠ێ گۆتارەك ب ناڤ ونیشانێن (گۆتارا خویندکارێن خواندنگەها زاخۆ ل بەرامبەری هێژا موتەسەرفی) و تێدا هاتییە: (هێژا موتەسەرف حەفتیا بۆری سەرەدانا قەزا زاخۆ و دووڤچوونا رەوشا خواندنگەهێ وێرێ کربوو و خویندکارەکێ خواندنگەها زاخۆ یا میری ئەڤ گۆتارە ل بەرامبەری هێژای پێشکێش کربوو: ئەی موتەسەرفێ خەمخۆر، ژ هەمی دلێ خۆ سلاڤان ل تە دکەم، ما چەوان نە و تو بابێ پەروەردێ یی و نموونەیێ هیممەت و مەزنی و بلندیێ یی، گەلەك کەیفخۆش بووم و من هەست ب خۆشی و شانازیێ کر دەمێ من گوهلێبووی هاتینە ڤێرە سەرەدانا جهێن فێرکرن و پەروەردێ ل لیوایا خۆ سەرێ عیراقێ و تانجا وێ یا مەزن دکەن، ب ڤێ هەلکەفتێ، زێدە دلخۆش بووم و هەڤالێن من ژی ژ دل حەز دکەن وە ل ڤێرە ببینن، هۆسا دەمێ دەلیڤە چێ بووی و خواندنگەها مە پێشوازیا وە کری، هەڤالێن من ئەز راسپاردم ژ پێش وان ڤە گەلەك ژ دل سوپاسیا وە یێن هێژا بکەم و هیڤیا سەرکەفتنێ بۆ وە دخوازم و وەلاتێ مە ژی ل سەر

دەستێ كەسێن جوامێرێن وەكی وە و ل بن سیبەرا شاهێ مە یێ مەزن فەیسەلێ ئێكێ و جێنشینێ مە یێ خۆشتڤی بێتە رزگار كرن، هیڤیخوازم ڤێ دەربرینێ ژ من قەبوول بكەی، ل ڤێرە ژی ئەم هەمی دێ ڤێ درویشمی بێژین: هەر بژیت عیراق، هەر بژیت موتەسەرفێ مە یێ خەمخۆر، هەر بژیت زانست[٢٨].

گەلەك جاران بۆ سەردەمێن دیرۆكی دهێتە گۆتن كا چەوان هەر سەردەمەك یێ دی ژ ناڤ دبەت، دەمێ سڤك ل ڤێ گۆتارێ دنێرین، كو ب چ ئاوایان دەربرینێ ژ ژیانا زاخۆ ناكەت، تێبنی دكەین كا چەوان تنێ ناڤ د وان گۆتاران دا دهێنە گوهورین و ناڤەرۆك و رێز ناهێنە گوهورین و گۆتارێن هۆسا ل سەرانسەری دەڤەرێن هەرێما كوردستانێ ل سەردەمێ شاهاتیێ دهێنە دیتن و درویشمان ب ناڤێ شاهی ددەن، پاشی دهێنە گوهورین و درویشمان ب ناڤێ سەرۆك كۆماری.. هتد. ددەن، هەروەكی دیارە ژی گۆتار ژ ئالیێ مامۆستایان ڤە هاتیبە نڤیسین و دارێتن، چونكی گەلەك ب زەحمەتە خویندكارەكێ كوردێ ژ نوو فێری زمانێ عەرەبی دبیت، ب ڤی زمانێ هۆسا ب هێز بنڤیسیت، كو دبیت گەلەك مامۆستا ژی نەشێن هۆسا دارێژن.

## ب - رەوشا رەوشەنبیری:

وەسا دیارە رەوشا رەوشەنبیری دوور ژ كەرتێ فێركرنێ ل زاخۆ گەلەك یا لاواز بوویە، ئەڤە ژی ل دووڤ رۆژنامەیا (الموصل) كو ئاماژە نەكریە چالاكی یێن رەوشەنبیری ل زاخۆ د دو گۆتاران ب تنێدا نەبیت، گۆتارا ئێكێ ب ناڤ ونیشانێن (شانۆ ل زاخۆ)یە و د هژمارەیا رۆژا ٥ ی خزیرانا ١٩٢٩ یدا هاتیبە بەلاڤكرن و تێدا هاتیبە: (پەیڤەك ژ ئاكنجییەكێ زاخۆ گەهشتیبە مە، تێدا بۆ مە دیار دكەت كو شەڤا ئەینی رێكەڤتی ١٩٢٩/٥/٣٠ێ خواندنگەها زاخۆ یا میری رۆمانا سەلاحەددین ئەیۆبی زارڤەكریە و ل دۆرێن ٣٠٠ كەسان ژ فەرمانبەر و خەلكی ب هەمی تەخ وچینێن خۆڤە لێ ئامادە بووینە، ڤێ زارڤەكرنێ گوهورینەكا هزری ل ناڤ خەلكێ زاخۆ پەیدا كریە و حەزەكا مەزن بۆ ڤێربوونێ د دلێ واندا چاندییە، هەتا هەمی وەلێ هاتینە ب چاڤەكێ مەزن بەرێ خۆ بدەنە خواندنگەهێ و مامۆستایێن وێ، ئەڤە هەمی ژی ژ بەر هندێ بوویە كو ئەوێن زارڤەكرن كری، باش ب وی كاری رابووینە و شیانێن ئەدەبی هەبووینە[٢٩].

لێ گۆتارا دووێ ب ناڤ ونیشانێن (بانەیا فەرمانبەران ل زاخۆ) د هژمارەیا رۆژا ٢٧ ی شواتا ١٩٣٠ یدا هاتیبە بەلاڤكرن و تێدا هاتیبە: (ژ ـ ئاگەهدارەكی ـ گەهشتە مە كو هێژا مستەفا بەگ عومەری بانەیەك بۆ فەرمانبەران ل زاخۆ دامەزراندییە بۆ موكمكرنا پەیوەندی یێن دۆستینی و برایینێ ل ناڤبەرا وان و چالاككرنا هزرا جڤاكی و بزاڤ كرن بۆ پێشئێخستنا ئەدەبی و رەوشەنبیری یا هەڤچەرخ ب رێیا خواندن و شەڤبێری و وەرزشییا لەشی و هەر تشتەكێ مفای بگەهینیتە بیناسازیێ، لێ دوور ژ سیاسەتێ، هەروەسا پشتی وەزارەتا ناڤخۆ پەیرەوێ ناڤخۆیێ بانەیێ پەسند كری، هەلبژارتنێن دەستەیا كارگێری هاتنە كرن و ئەوێن زۆرینەیا دەنگان ب دەستڤە ئینایین ئەڤێن خوارێ بوون: حاكم مستەفا ئەفندی قەرەداغی، یەحیا ئەفندی نەزهەت رێڤەبەرێ خواندنگەهێ، حاجی شەمدین سەرۆكێ بازرڤانیێ، نوری ئەفندی رێڤەبەرێ دارایی، حەبیب ئەفندی خەزنەدار، پشتی هەلبژارتن هاتینەكرن رێڤەبەرێ خواندنگەهێ د پەیڤەكا سەرێدا بەحسێ گرنگی و مفایێ بانەیێ بۆ جڤاكی كر و داخواز ژ ئامادەبوویان كر كو پێدڤییە دهاریكار و دلسۆز بن بۆ پێشئێخستنا ڤێ بانەیێ، پاشی دەستەیا كارگێری ئاهەنگەك گرێدا و تێدا هێژا حاكم وەك سەرۆك، رێڤەبەرێ خواندنگەهێ وەك سكرتێر و خەزنەدار وەك ژمێریارێن بانەیێ هاتنە هەلبژارتن و رێڤەبەرێدارایی و سەرۆكێ بازرڤانیێ وەك ئەندامێن دەستەیا كارگێری مان، هەروەسا هێژا قائیمقام وەك سەرۆكێ فەخری یێ بانەیا ناڤبری هاتە هەلبژارتن، هەروەسا دەستەیا كارگێری خانییەكێ ل هنداڤی رووباری و چیای و عەردێن جوان ب كرێ گرت و ناڤمالییەكێ جوان بۆ تمام كر و كۆڤارێن پێشەنگ و رۆژنامەیێن مفادار

بۆ پەیدا کرن، هۆسا، فەرمانبەران دەمێن ڤالاتی و بێنڤەدانا خۆ ل وێرێ ب خۆشی خۆ ب خواندنێ ڤە دبۆرینن، ئەڤە ل وی دەمی کو بەری هنگی ل دیوان و چایخانەیان د تەڕاوبەڕا بوون، ئاگەهدارەکی ب ناڤێ قەزایێ سوپاسییا هێژا قائیمقام و دەستەیا دامەزرێنەرا ڤێ یانەیێ کر بۆ پێشئێخستنا وەلاتی و بزاڤێن بلندکرن و ئاڤەدانکرنا وی[٣٠].

## سێ ـ رۆژنامەیا (الموصل)و دەنگڤەدانا رەوشا سیاسی یا عیراقێ ل سەر زاخۆ:

رۆژنامەیا (الموصل) ب رێیا گۆتار و بەلاڤۆکێن خۆ یێن بەلاڤ کرین، هەر ژ دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ ب ئاوایەکێ هوور و بەرفرەهـ و دووڤچوونەکا بەردەوام ل سەر پێشهاتێن سیاسی یێن عیراقێ کریە، هەروەسا ژ بەرکو رۆژنامە ب پلا ئێکێ رۆژنامەیەکا سیاسی بوویە، ئەو تشتێ پەیوەندی ب زاخۆ ڤە هەی، رۆژنامەیێ بەحسێ پێکەهێ زاخۆ د ناڤ وان پێشهاتان دا کریە و دشێین ب ڤی ئاوایێ خوارێ ب کورتی بەحسێ زاخۆ و پەیوەندییا وێ دگەل پێشهاتێن سیاسی یێن عیراقێ د وێ رۆژنامەیێدا بکەین:

### أ ـ ئاهەنگا دانانا شاهێ عیراقێ:

د ئاهەنگا دانانا شاهـ فەیسەلێ ئێکێدا ل رۆژا ٢٣ ی تەباخا ١٩٢١ ێ ل گۆڕەپانا (برج الساعة) ل بەغدا[٣١]، تنێ نوونەرێن ویلایەتان پشکداری د دەنگدانێدا کرن و چ کەس ژ هەردو ویلایەتێن کەرکوک و سلێمانیێ پشکداری وێ ئاهەنگێ نەبوون، لیوا مووسل شاندەک هنارتە وێ ئاهەنگێ و رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٢٢ تەباخا ١٩٢١ یدا گۆتارەک ل سەر ڤێ چەندێ بەلاڤکریە و تێدا هاتییە: (وەزارەتا ناڤخۆ ٣٥ کورسی بۆ لیوا مووسل د ئاهەنگا دانانا شاهـ فەیسەل وەک شاهێ عیراقێ تەرخان کرینە و حکومەتێ هێژایێن ناڤێن وان ل خوارێ ڤەخواندینە ڤێ ئاهەنگا مەزن: ژ مووسل: دادوەر ئەحمەد ئەفندی فەخری، پێشەنگ عەبدلغەنی ئەفندی.. ژ قەزایان: ژ دهۆک: شێخ نوری، ژ زاخۆ: محەمەد ئاغا.. هندەک ژ هێژایان رۆژا شەمبی و یێن مایی ژی سپێدەیا رۆژا ئێک شەمبی هاتینە...)[٣٢].

### ب ـ جڤاتا دامەزرێنەرا عیراقی (پەرلەمان):

هەر د چارچۆڤێ بابەتێ دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ و پێشهاتێن دگەل دا پەیدا بووین، رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ١٩ شواتا ١٩٢٤یدا ناڤێن کاندیدێن نوونەرێ د جڤاتا دامەزرێنەرا عیراقی دا بەلاڤ کرینە، کو د ناڤ وان ناڤان دا ناڤێن سەرۆک عەشیرەتێن زاخۆ هەبووینە کو ئەو ژی ئەڤەنە: محەمەد ئاغا کورێ شەمدین ئاغا سەرۆکێ عەشیرەتا سلێڤانەیی، جەمیل ئاغا کورێ عەبدی ئاغایێ سەرۆکێ عەشیرەتا سندی، سادق ئیبراهیم ئاغا (سادقێ برۆ) سەرۆکێ عشیرەتا گولی[٣٣].

لێ ئێکسەر د هژمارەیا پشتی هنگی دا، ئانکو د هژمارەیا رۆژا ٢١ شواتا ١٩٢٤ێ رۆژنامەیا (الموصل) دا ناڤێ کاندیدەکی ژ زاخۆ بەلاڤکریە کو ئەو ژی محەمەد ئاغا کورێ شەمدین ئاغایە[٣٤]، ئەڤە ژی نیشانێ هندێ یە کو ژ ناڤ هەر سێ کاندیدان محەمەد ئاغا هاتییە ژێگرتن ل بەغدا نوونەرییا خەلکێ زاخۆ د جڤاتا دامەزرێنەرا عیراقی دا بکەت.

هەر د بابەتێ هەلبژارتنێن جڤاتا دامەزرێنەرا عیراقی دا، رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٤ ئادارا ١٩٢٤یدا گۆتارەک ب ناڤ ونیشانێن (نوونەرێن مووسل د جڤاتا دامەزرێنەرا عیراقی دا) بەلاڤکریە و تێدا هاتییە: (دوهی پشتی نیڤرۆ دەستەیا پشکنەر کۆمبوونەک ب سەرۆکاتییا حەسەن فائق بەگ ل فەرمانگەها باژێرڤانیێ گرێدایە و هەر ئێک ژ بریکارێ دادوەری و سەرۆکێ رۆحانییان ل وێ کۆمبوونێ ئامادە بووینە و دیتن وبۆچوونێن تێدا هاتین د بادەکێن هەمی قەزایێن مووسل، تەلەعفەر، شنگال، دهۆک، ئاکرێ، ئامێدیێ و زاخۆ دا هاتینە پۆلێنکرن، د بادەکەکێدا دیتن وبۆچوون و ناڤێن زۆرینەیا دەنگان بۆ نوونەرێ

د جڤاتا دامەزرینەردا ب دەستڤە ئینایین هاتینە توومارکرن کو هژمارا وان ١٤ نوونەرن ژ کۆما ٤٨٠ هەلبژارتیێن دەستپێکی یێن مووسل، کو ئێك ژ وان محەمەد ئاغا کورێ شەمدین ئاغایێ نوونەرێ زاخۆیە و هژمارا زنجیرەیا وی (٧)ە ئەڤە ژی ل دووڤ هژمارا دەنگێن ب دەستڤە ئینایین کو ٢٩٣ ێ دەنگ بوون[٣٥].

## ج ـ کێشەیا مووسل:

رۆژنامەیا (الموصل) د گەلەك بەرپەرێن خۆ دا بەحسێ کێشەیا مووسل کریە و هێرشکریە سەر داخوازیێن ترکیا کو پرۆپاگەندا وێ چەندێ دکەت ژ هەر ئێکێ دی پتر ماف د (ویلایەتا مووسل) دا هەیە، هەروەکی ئەو رۆژنامە د گۆتارێن خۆ دا پشتراست دکەت زاخۆ ژی جهێ خۆ د کێشەیا مووسل دا هەبوویە، ئەڤە ژی دەمێ بەحسێ ئۆپەراسیۆنێن سەربازی و زێدەگاڤی یێن هێزێن نیزامی و نە نیزامی یێن ترکیا ل سەر زاخۆ دکەت ب درێژیا هەیاما هەڤرکییا تورکی ـ عیراقی ل سەر وێ ویلایەتێ ژ بەرکو زاخۆ ل سەر توخیبێ ل ناڤبەرا عیراقێ و ترکیایە، فەرە بێژین ژی کو ترکیا ژ سالا ١٩٢١ێ و هەتا داوی یا ١٩٢٥ێ پێکۆلکریە کۆنترۆلێ ل سەر ڤێ دەڤەرێ بکەت، لێ د وان پێکۆلێن خۆدا سەرنەکەڤتییە[٣٦]، هەروەسا بریتانیا رۆلەکێ ئێکلاکەر د ڤێ مەسەلێدا هەبوویە کو ئەو ویلایەت بەر عیراقێ بکەڤیت و دەستەلاتا تورکی ژ وان دەڤەران بێتە دوورئێخستن، هەروەسا رۆژنامەیا (الموصل) رۆلێ خۆ د بەحسکرنا هندەك ناڤەرکێن وێ کێشەیێدا و یێن پەیوەندی ب زاخۆ ڤە هەین هەبوویە.

## ئۆپەراسیۆنێن سەربازی ل سالا ١٩٢٤ ێ:

رۆژنامەیا (الموصل) گرنگییەکا مەزن دایە دەنگ و باسێن یەکێن سەربازی و رەوشا ئێمناهیێ ل زاخۆ و دووڤچوونا وێ رەوشێ کریە، چونکی زاخۆ گرنگییەکا سەربازی و ستراتیژی هەیە، ئەڤە سەرباری کو دەڤەرەکا توخیبی یە و بنەجهبوونا تەناهییا وێ دیار دکەت کا کارگێرییا حکومی ل لیوا مووسل چەند یا ب هێزە و چەند دشێت کۆنترۆلێ ل سەر دەری یێن خۆ یێن توخیبی بکەت و ژ زێدەگاڤیێن هێزێن تورکی بپارێزیت، رۆژنامەیا (الموصل) د گەلەك گۆتارێن خۆ دا بەحسێ سیاسەتا دەولەتا ترکیا کریە کو ل دەڤەرا زاخۆ زێدەگاڤیێ ل سەر توخیبێ دەولەتا عیراقێ دکەت، ل دووڤ گۆتنا وێ رۆژنامەیێ.

د ڤی چارچۆڤەی دا رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ١٥ی ئیلۆنا ١٩٢٤ێدا سێ دەنگ و باس بەلاڤکرینە و بەحسێ رەوشا تەناهیێ ل زاخۆ کریە و د دەنگ و باسێ ئێکێدا هاتییە: (ل رۆژا ١٤ی ئیلۆنێ برۆسکەیەك ژ وەزارەتا ناڤخۆ ل سەر رووداننێن ڤێ داویێ یێن زاخۆ گەهشتییە بارەگەهێ موتەسەرفییێ و ئەڤە ژی دەقێ برۆسکێ یە: هندەك هێزێن نە نیزامی زێدەگاڤی کرینە سەر توخیبێ عیراقێ و ل سەر وی شەنگستەیێ کو دڤێت ئاگەهداری ڤان جۆرە زێدەگاڤییان بین و رێ نەهێتە دان ئەڤ دەستدرێژییە ل سەر توخیبێ عیراقێ دوبارە ببن و حکۆمەتێ ب پێدڤی دیت هندەك رێکارێن بەروەخت بێنە ب کار ئینان، فرۆکان هێرش کرینە سەر وان هێزان و پاشڤەزڤراندینە و رەوشا نەئاسایی[٣٧] ل هەردو قەزایێن زاخۆ و ئامێدیێ راگەهاندییە و هەردەمێ ئەو گەف ل سەر تەناهییا دەڤەرا ناڤبری نەمان، ئەو رەوشا نەئاسایی دێ هێتە راکرن).

لێ د دەنگ و باسێ دوویێدا عەبدلعەزیز موتەسەرفێ لیوا مووسل[٣٨] ب هووری بەحسێ وان رووداننان کریە و تێدا هاتییە: (ئەم هاتینە ئاگەهدار کرن (کو مخابن) هندەك مەسیحی هاتینە سەردابرن.. ژ ترسا گۆتگۆتکێن درەوێن هندەك ئاقل تێکچوویێن تورکخوازان بەلاڤ کرین ژ گوندێن زاخۆ دەرکەڤتینە، ژ بەرکو ئەو گۆتگۆتك نە بەرئاقلن و ئاقلێ ساخلەم باوەر ناکەت هەکە حوکم ل سەر بێتە دان.. ب راستی ژی رەوشا نۆکە ل وان جهان گەلەك یا باشە و چ رووداڤ چێ نەبووینە.. هەروەسا

د بەلاڤۆکا وەزارەتا ناڤخۆ دا هاتییە راگەهاندن کو دوهی سەعەت هەشتی سپێدێ فرۆکێن شەرکەر کارێن خۆ ب ئاوایەکێ سەرکەڤتی ئەنجامدابنە.. دەمێ فرۆکان کارێن خۆ ئەنجامدابن و ب شکەستنا دوژمنی پشتراست بووین، ڤەگەریانە زاخۆ، ئەڤە ژی پشتی زیانێن مەزن گەهاندینە دوژمنی و پتر ژ هەشتێ کەسان ژێ کوشتین و بریندار کرین، هەروەسا ژ بەر زۆریا خوینا هەسپ و زەلامێن بریندارێن د بومبەبارانا ئاسمانی دا هاتینە هنگاڤتن رویبارێ هیزل ژی رەنگێ وی هاتە گوهورین و باڤسۆر بوو، د ڤان هێرشان دا چ زیانێن هەژی گۆتنێ نەبوون ژ بلی ب سڤکی بریندارببوونا زەندکا ئەفسەرەکێ فرۆکەڤان و رویدانا کێشەیەکا تەکنیکی د فرۆکەیەکێدا دەمێ دادایە فرینگەها زاخۆ و چ مەترسی نەماینە..)[39].

هەر ل سەر ڤێ چەندێ رۆژنامەیا (الموصل) دەنگ و باسێ سیێ ب ناڤ و نیشانێن (حکۆمەتا مە یا رێبەر نۆبەدارا پاراستنا توخیبی یە) بەلاڤکریە و تێدا هاتییە: (دوهی خەلك ترسیا دەمێ دیتین هندەك کەسانێن بێ جەرگ و ترسنۆك ژ بەر خرابی و کارێن تێکدەرانە یێن هندەك باندێن نەنیزامی یێن زێدەگاڤی کرینە توخیبێ ژووری یێ عیراقێ ل قەزا زاخۆ، ژ زاخۆ دەڤن و قەستا مووسل دکەن، لێ وان بەلنگازان نەزانینە کو کۆنترۆلکرنا وان دەستدرێژیان کارەکێ گەلەك ب ساناهییە، ب راستی ژی حکۆمەتا مە یا رێبەر ـ یا د تەنگاڤییان دا کورێن هەڤپەیمانا راستگۆ حکۆمەتا بریتانیا مەزن پشتەڤانیێ لێ دکەت ـ تنێ رەفەکا فرۆکان ژ مووسل هنارتییە و دەملدەست گەهشتینە زاخۆ و دوژمنێ زێدەگاڤی کری بومبەباران کر و د ماوێ نەهـ خولەکان دا شەپرزەییەکا مەزن ل ناڤ وان باندان پەیدا بوو و تووشی شکەستنێ بوون و خۆڤەکێشان ئەڤە ژی پشتی زیانێن مەزن گەهشتینێ و ئاڤا رووبارێ هیزلی ب خوینا کوشتی و بریندارێن وان سۆر بووی کو هژمارا وان گەهشتبوو هەشتێیان، هەروەسا سوارێن رەڤۆکێن دوژمنی خۆ ل پشت دارووباری ڤەشارتن داکو ب ئاگر و بومبەیێن فرۆکێن بەریتانی نەهێنە هنگاڤتن، هەروەسا وان فرۆکان وی دەمی کارێ خۆ ب داوییئینان پشتی پشتراست بووین کو باندێن دوژمنی تەراوبەرا بوویە و توخیبێ ژووری یێ عیراقێ ژ هەبوونا دوژمنی هاتییە پاقژ کرن و چ بیاڤ بۆ ترسێ نەمایە..)[40].

هەر د وی چارچۆڤەی دا و چونکی بریتانیا بەرپرس بوو ژ بەرەڤانیکرنێ ژ عەردێ عیراقێ دژی هەر گەفەکا دەرڤەیی، ژ بەرکو عیراق ل بن چاڤدێریا بریتانیا بوو، بریتانیا رەفەکا فرۆکێن خۆ هنارتە مووسل و وان فرۆکان هێرشکرنە سەر یەکەیێن زێدەگاڤی ل سەر توخیبی دکرن و د وان هێرشان دا ئالیێ دی ل دۆرێن ٨٠ کوشتییان دان، هەروەسا بەتالیۆنا چوار ژ مووسل لڤی و قەستا زاخۆ کر داکو پشکداریێ د وی ئەرکیدا بکەت یێ ل وێرێ پێ هاتییە سپاردن و پشتی ب داویهاتنا گەفان ل سەر تەناهییا توخیبێ باکوور، رۆژا ١٨ ئیلۆنا ١٩٢٤ێ بریارا راکرنا رەوشا نەئاسایی ل سەر هەردو قەزایێن زاخۆ و ئامێدیێ هاتەدان و رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٢٠ ئیلۆنا ١٩٢٤یدا ئەڤ چەندە پشتراستکریە[41]، ژ لایەکێ دیڤە وێ رۆژنامەیێ د هژمارا خۆ یا رۆژا٢٧ ئیلۆنا ١٩٢٤ یدا گۆتییە کو لۆرد تۆمسن Tomson وەزیرێ بەرەڤانییا بریتانیا د سەرەدانا خۆ دا بۆ مووسل، ل سەر نمایشێن یەکێن سەربازی ل دەڤەرێن ئۆپەراسیۆنێن سەربازی یێن توخیبێ باکوور گەریایە کو زاخۆ ژی ئێك ژ وان بوو[42].

هەر د چارچۆڤێ زێدەگاڤیێن ترکیا و دەستدرێژی یێن وان ل سەر دەڤەرێن توخیبی ژ وان ل سەر زاخۆ ژی، رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٤ چریا ئێکێ ١٩٢٤یدا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (ئستۆلێ ئاسمانییێ بەریتانی بەرسینگێ هێرشەکا دوژمنان ل سەر توخیبێ ژووریێ عیراقێ دگریت) بەلاڤکریە و تێدا هاتییە: (رۆژنامەیا بەغداد تایمز گۆتارەك ل سەر کارێن ئستۆلێ ئاسمانیێ بەریتانی بەلاڤکریە کو وی ئستۆلی بەرسینگێ هێرشەکا باندێن زێدەگاڤی کرینە سەر توخیبێ ژووریێ عیراقێ و دێ ڤێ پەرەگرافێ ژ وێ گۆتارێ وەرگرین: (... ل داویا بهارا سالا ١٩٢٤ێ ترکان هندەك گۆتگۆتك

بەلاڤكرن كو ل بەرن هێرشێ بكەنە سەر جهێن ئاشووریان، ئینا ئاشووری گەلەك ترسیان، لێ ئەڤ ترسا وان داهات پشتی زانین كو ترك گرێدایی پەیمانەكێ نە یا ناهێلیت چ هێرشان بكەن هەتا وی دەمێدان وستاندن ب داوی دهێن.. ل تەباخا ١٩٢٤ێ ژی والیێ ژ نوو بۆ جۆلەمێرگێ هاتیە دامەزراندن كو هژمارەكا كێم یا زێرەڤانان دگەل بووینە، سەرەدانا عەشیرەتەكا كوردی یا ئاكنجیكری یا ب ناڤێ (عەشیرەتا شال) كریە، ئەو رێ یا ئەو تێرا دچوون د ناڤ پشكەكا عەردێ ئاشووریان را دەرباز دبوو و ل دەمێ رێڤەچوونێ ب ناڤێ تركیا نوو گازی دكرن و وەسا دیار دكرن كو وان ل بەرە هێرشێ بكەنە سەر ئاشووریان، ئەڤ گەریانە ب خۆ د ناڤ عەردێ وان را زێدەگاڤی بوو ل سەر پەیمانا لۆزان، ڤێجا ب هاندانا عەشیرەتا شال یا كوردی، ئاشووریان هێرش كرە سەر والی و ئەو و زێرەڤانێن وی ئێخسیر كرن، لێ پشتی دەمەكێ كێم ئازاد كرن، لێ ئەڤە روودانە بوو ئەگەرێ وێ چەندێ تورك پێكۆلا سزادانا هەمی ئێلێن ئاشووری (یێن پشكدار و نە پشكدارێن وێ روودانێ) بكەن، ئینا هێزێن توركی ژ جزیرا بۆتان د رێ یا كوردێن سندی ـ گولی را هاتن و دەست ب سۆتنا گوندێن ئاشووریان كرن یێن ڤێ داویێ دوبارە ئاڤەدانكرین، رێ و پلانێن گەهاندنێن تركیا ل ناڤ توخیبێ ویلایەتا مووسل گەلەك یا ب ساناهی بوو كو ژ رەخێ باكوورڤە حەفت كیلۆمێتران ژ زاخۆ دوورە، ژ بەر هندێ، زێدەگاڤی ل سەر وێ پەیمانێ كرن، هەڤدەم گەف ل باژێركێ زاخۆ ب خۆ ژی كرن، لێ دەمێ فرۆكێن بەریتانی هێرشكرینە سەر هێلێن گەهاندنێ، هێزێن تركیا ل دەڤەرێن چیایی هاتنە دووربێچكرن و وەسا دهێتە بەرهزر كرن كو زیانێن مەزنێن گیانی ڤێ كەڤتبن، هەروەسا شەش مشەختێن ئاشووری ژی قەستا ئامێدیێ كرن و هەوارا خۆ برنە بەر دلۆڤانییا حكۆمەتا عیراقێ..)[٤٣].

رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ١٣ چریا ئێكێ ١٩٢٤ێدا رۆلێ پەیامنێرێ خۆ یێ ل زاخۆ و راستیبێژیا وی د ڤەگوهاستنا دەنگ و باسان دا بلند نرخاندییە و رۆژنامەیێ ل سەر وێ چەندێ گۆتارەك ب ناڤ ونیشانێن (دەنگ و باسێن زاخۆ یێن پەیامنێرێ مە یێ تایبەت ل رۆژا ١٩٢٤/١٠/٩ێ، هەوالدەرێ مە ل دوورترین خالا توخیبێ ژووری یێ عیراقێ) بەلاڤكریە و تێدا هاتییە: (ژ مێژە ئەم پێدڤی هەوالدەرێن ڤاقژ و نەرمرێ بووینە بۆ رۆژنامەیا مە كو راستی یێن قەزایێن باكوورێ ل ناڤبەرا توخیبێ عیراقێ ـ تركیا بۆ مە ڤەگوهێزن، نۆكە ژی گەهشتینە رێككەڤتنەكێ دگەل پەیامنێرەكێ هێژایێ گەلەك جهێ باوەرپێداكو هەیام هەیام بۆ مە وان تشتان ڤەگوهێزیت یێن ل وان دەڤەرێن چیایی دهێنە رویدان، داكو خواندەڤانێن هێژا راستییا كاروبار و روودانان بزانن و خۆ ژ میكرۆبێن درەو و گۆتگۆتكێن چێكری رزگار بكەن یێن دوژمنێن خودان ئارمانجێن چەپەل و خایینێن راستی و نیشتمانی ل ناڤ مە بەلاڤ دكەن[٤٤].

هەر د وێ هژمارەییدا، رۆژنامەیا (الموصل) هێرش كریە سەر بزاڤێن دوژمنكارانەیێن تورك یێن تەناهی و سلامەتییا خەلكێ دەڤەرێن توخیبی ئالۆز و شێلی دكەن و پەسنێ رۆلێ حكۆمەتا عیراقێ د بنەجهكرنا تەناهییا وان دەڤەران دا كریە، ل سەر ڤێ چەندێ رۆژنامەیا (الموصل) گۆتارەك ب ناڤ ونیشانێن (رحەتی و تەناهی ل زاخۆ) بەلاڤكریە و د دەستپێكا گۆتارێدا پشتراست كریە كو: (تەناهی ل زاخۆ بنەجە بوویە و رەوش ب تمامی ل هەمی دەڤەرێن ڤێ قەزایێ هاویش بوویە، لێ بزاڤێن دوژمنكارانەیێن ڤێداویێ ب دەڤێ خەلكی بۆ وە هاتینە ڤەگوهاستن، ب راستی ژی هندەك خرابكار و خایینێن گونەهكارێن ل سەر توخیبی ئاكنجی، پێكۆل كرنە د ئاڤا شێلی دا نێچیرێ بكەن و بۆ خۆ ل دەلیڤەیەكێ دگەرێن تالان و كوشتنێ بكەن دەمێ تورك دەستدرێژیێ دكەتە سەر هندەك عەشیرەتێن ئاكنجی یێن دەڤەرێن وان، ئینا هێرش كرنە سەر خەلكێ گوندێن دەردۆر و دەست ب تالانكرنا ملك ومال و تەرش وكەوالێ وان كرن، لێ حكۆمەتا مە یا عیراقێ یا رێبەر دەملدەست هاتە جهێن مەترسی و گەف لێ هەین و ب فرۆكە و لەشكەرێ خۆ ئەو كارێن تێكدەرانە ژ ناڤبرن و

نەهێلان، ل داویێ ژی ئەڤ گرۆپا تاوانکار پشتی زیانێن مەزن گەهشتینێ نەچار بوو برەڤیت و ب دزیڤە ڤەگەڕیێتە مەلبەندێ خۆ و زانی کو حکۆمەتا عیراقێ (ب پشتەڤانییا خودێ) گەلەك هشیاری خەلکێ وان دەڤەرانە و نۆبەدارییەکا تمام لێ دکەت و وار و توخیبێن وان ژ هەر زێدەگاڤییەکێ یان دەستدرێژییەکێ دپارێزیت و هەمی خرابکار رەڤینە پشت توخیبێ خۆ و چ شوینوارێن وان ل قەزا زاخۆ نەماینە و نۆکە تەناهی لێ بنەجهە و دشێین بێژین کو رحەتییەکا تمام بۆ خەلکێ وێ ڤەگەڕیایە[٤٥].

وەسا دیارە ژی هێزێن ترکیا خۆ ژ دەڤەرا زاخۆ و دەڤەرێن دی یێن بەهدینان ڤەکێشاینە هەروەکی رۆژنامەیا (الموصل) د دەنگ و باسەکێ خۆ یێ ب ناڤ و نیشانێن (دەنگ و باسێن زاخۆ ١٤ چریا دووێ ١٩٢٤ێ ، داکەڤتنا گۆتگۆتك و درەوێن خرابکاران) کو د هژمارا رۆژا ١٧ چریا دووێ ١٩٢٤ێدا هاتییە بەلاڤکرن و تێدا هاتییە: (پیلانگێری و سەردابرنا خرابکاران بۆ وان ب خۆ زڤری ڤە و ماف بۆ خودانان زڤری، زێدە گۆتن نینە ژی هەکە بێژم قەزا زاخۆ تلیلیان ڤەددەت و کەیف و خۆشی ل سەر دێمێ خەلکێ وێ پەیدابوویە، دەمێ دەنگ و باسێ بڕیارا کۆمەلا گەلان گەهشتی کو دڤێت هەڤسویا مە (خودێ لێ نەگریت) بچیتە وی توخیبێ وێ کۆمەلێ بۆ دەسنیشانکری و دەمێ خەلکی گوهـ ل ڤەکێشانا هێزێن تورکی بووی و دوبارە هەر ئێك گەهشتییە مافێ خۆ، پیرۆزباهی ل ئێك ودوو کرن.)[٤٦].

ل دووڤ رۆژنامەیا (الموصل) حکۆمەتا عیراقێ بەردەوام بوویە ل سەر موکمکرن و ب هێزکرنا وی توخیبێ زاخۆ ژ دەڤەرێن تورکی جودا دکەت، وێ رۆژنامەیێ د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٢٦ چریا دووێ ١٩٢٤ێدا ئاماژە کریە (ب جهئینانا پێنگاڤێن بنەجهـ ل سەر ئاستێ بەرفرەهکرنا هژمارا بنگەهێن پۆلیسان ل دەڤەرێن توخیبی یێن سەر ب مووسل ڤە دەمێ تەحسین عەلی سەرۆکاتییا رێڤەبەریا پۆلیسان دکر و وی رێڤەبەرێ پۆلیسان و پشکنەرێ کارگێری راسپاردبوو هژمارەکا بنگەهێن پۆلیسان ل وان دەڤەرێن زاخۆ پێك بینیت یێن ژ ئالیێ هێزێن ترکیا ڤە زێدەگاڤی ل سەر هاتییە کرن کو ئەو ژی بنگەهێن پۆلیسانە ل: هوریزا، شەرانشا مووسلمانان، بەرغ(بەرەخ) و بانکێ)[٤٧].

رۆژنامەیا (الموصل) هێشتا بەحسێ ڤی بابەتی کریە و د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٢٩ چریا دووێ ١٩٢٤ێدا دەنگ و باسەك ل سەر دەستدرێژی یێن ترکیا ل سەر زاخۆ ب ناڤ ونیشانێن (پێکئینانا بنگەهێن نوو یێن پۆلیسان ل دەڤەرا قەزا زاخۆ) بەلاڤکریە و تێدا هاتییە: (ئێڤاریا رۆژا سێ شەمبییا بۆری هێژا تەحسین عەلی بەگ رێڤەبەرێ پۆلیسێن لیوا مووسل هاتە (مووسل) کو دگەل میستەر لۆید Lowid سەرەدانا زاخۆ کریوو بۆ پێکینانا بنگەهێن نوو یێن پۆلیسان ل سەر توخیبێ ناڤبری و ئەم (ئانکو نڤیسەرێ رۆژنامەیا الموصل) و رێڤەبەرێ پۆلیسان ل سەر ڤان بابەتان ئاخڤتین:

**نڤیسەر (رۆژنامەڤان):** رەوشا توخیبی ل زاخۆ چەوایە؟

**رێڤەبەر:** پشتی ڤەکێشانا هێزێن ترکیا ژ جهێن کۆمەلا گەلان بڕیار ل سەر دای، رەوش گەلەك تەنا بوویە، تورك ڤەگەڕیاینە جهێن خۆ یێن بەرێ ژێ هاتین و تنێ هێزەکا کێم یا بەلاڤە ل چیایێن گۆیی یان مایە، لێ رەوشا توخیبی د باشترین رەوشدایە و تەنا و رحەتە، دەمێ مە سەرەدانا وان گوندان کری یێن ترك لێ ئاکنجی بووین، مە دیت خەلکێ وان یێ یێ کەیفخۆش و دلخۆشە کو ڤەگەڕیاینە همبێزا دەیکا خۆ حکۆمەتا عیراقێ یا دلۆڤان، کوردێن وان دەڤەران گەلەك ب گەرمی و رووخۆشی پێشوازییا مە کر و پشتەڤانییا پەیوەندی یێن خۆ یێن تمام ب کورسییا شاهاتییا عیراقێ و حکۆمەتا وێ دەربڕین ئەڤ حکۆمەتا ب چاڤێن مشتی دلپێڤەبوون و دلۆڤانی هەمی بەرژەوەندی یێن وان دپارێزیت، ئالۆزییا ترکیا ل دەڤەرێ پەیداکری، نۆکە وەل کوردان کریە بزانن جوداهی ل ناڤبەرا دادپەروەرییا حکۆمەتا عیراقێ و زۆردارییا حکۆمەتا ستەمکارا ترکیا چەندە، ترکان ل دەمێ خۆڤەکێشانێ ملك و مال و تەرش و کەوالێ

ڤان گوندێن بەلنگاز ژێ ستاندبوون و عەردەکێ رەپ و رویت بۆ هێلابوو، هەقە بێتە گۆتن ژی کو شێخ و ئاغایێن ڤان دەڤەران ب دل و گیان دگەل حکومەتا عیراقێ نە.

**نڤیسەر:** ئەو کیژ بنکەهێن نوو یێن پۆلیسانە یێن وە ل زاخۆ پێك ئینایین؟

**رێڤەبەر:** رۆژا ١٩ ڤێ هەیڤێ، ئەز و هێزا پشکنەرێ کارگێری چووینە قەزا زاخۆ و رۆژا ٢٥ هەیڤێ ژ وێرێ ڤەگەریاین و مە هژمارەکا بنکەهێن پۆلیسان پێك ئینان کو یێن ناڤدارتر خالێن هوریز، شەرانشا مووسلمانان و بەرەغ(بەرەخ) و هندەك خالێن دی نە کو ژ ئالیێ ترکیا ڤە دهاتنە ب کار ئینان دەمێ زێدەگاڤی کرینە سەر توخیبێ ژووری یێ عیراقێ.

**نڤیسەر:** رەوشا مۆرالی و ئابووریا خەلکی چەوایە؟

**رێڤەبەر:** ترس و دوودلی د دلێ خەلکی دا نەمایە و کەس ژ وان ل وێ باوەرێ نینە ترك جارەکا دی بشێن ڤەگەرینە ناڤ عەردێ عیراقێ، ژ بەر هندێ تەناهی و رحەتییەکا تمام و بنەجهـ هەیە، رەوشا ئابووی ژی دەست ب ڤەژاندنێ کریە، نەخاسمە ژی ل دەمێ بارینا بارانێن بۆش و یێن ل ڤێ دەڤەرا باکوور جەژن کرینە دو جەژن و خۆشی کرینە دو خۆشی.

**نڤیسەر:** ئەرێ خەلکێ ڤێ دەڤەرا باکوور دێ پشکداری یێ د هەڤرکییا هەلبژارتنان دا کەت؟

**رێڤەبەر:** ل دووڤ وان فەرمانێن ژ لایەنێن بلند گەهشتینە مە، نەشێین مایێ خۆ د مەسەلێن هەلبژارتنان دا بکەین کو ڤی بابەتی پەیوەندی ب مللەتی ب تنێ ڤە هەیە[٤٨].

## پەیمانێن نەخشەدانانا توخیبێ عیراقێ - ترکیا:

ل رۆژا ٥ خزیرانا ١٩٢٦ێ عیراقێ و ترکیا ل ئەنقەرە پەیمانەك ئیمزا کرن کو ب (پەیمانا عیراقی ـ تورکی ـ بەریتانی)[٤٩] دهێتە نیاسین[٥٠].

ل سەر ڤێ پەیمانێ، رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ١٥ چریا دووێ ١٩٢٨ێدا دیار کر کو کۆمبوونا ئێکێ ل ناڤبەرا عیراقێ و ترکیا ل زاخۆ ل رۆژا ٢٠ چریا ئێکێ ١٩٢٨ێ هاتییە گرێدان[٥١].

هەر بۆ دووڤچوونا وی بابەتی، وێ رۆژنامەیێ هەر د وێ هژمارەییدا گۆتارەك ب ناڤ ونیشانێن (پێشوازیکرن ل سەر توخیبی ل زاخۆ) ل سەر کۆمبوونا پێنجێ یا لیژنا هەردەمییا توخیبی بەلاڤکریە و تێدا هاتییە: (سپێدەیا رۆژا ١٣ چریا دووێ، موتەسەرفیێ شاندەکێ پێکهاتی ژ لیوا سالح بەگ حەمام رێڤەبەرێ پۆلیسان، فەخرەددین بەگ قائیمقامێ ئامێدیێ و محەمەد عەلی بەگ قائیمقامێ مووسل هنارتییە بۆ پێشوازیکرنا شاندێ تورکی ل سەر توخیبی ل خالا دورناق(دورنەخ) و کۆمەکا پۆلیسان سلاڤا سەربازی ل ئەندامێن هێژایێن (شاندێ ترکیا) کر یێن سەعەت یازدەی سپێدێ هاتینە ناڤ توخیبێ عیراقێ و ل بنکەهێ پۆلیسان بێهنا خۆ ڤەدان، پاشی ب ترۆمبێلان بۆ مەلبەندێ زاخۆ هاتنە ڤەگوهاستن و ل وێرێ گەلەك ب گەرمی و گەلەك رێزگرتن ڤە هاتنە پێشوازیکرن و بوونە مێڤانێن قەدرگران و سەعەت و نیڤان ل وێرێ مان[٥٢].

هەر بۆ تمامکرنا ڤێ زانیاریێ، رۆژنامەیا (الموصل) د دەنگ و باسەکێ دیدا و هەر د وێ هژمارێدا گۆتییە کو: (ل دۆرێن سەعەت دووی پشتی نیڤرۆ ترۆمبێلێن وی شاندی ژ بازێرێ زاخۆ دەرکەڤتن پشتی ژ ئالیێ مەزنە فەرمانبەر و خەلکی و زەلامێن لەشکەری و پۆلیسانڤە هاتییە ب رێکرن هەروەکی چەوان ب رێزگرتنڤە پێشواز لێ کربوون، ل نیڤا رێ ژی ل ناڤبەرا زاخۆ و مووسل وی شاندی هێژا موتەسەرف عەبدوللا بەگ سائغ و هێژا رێڤەبەرێ کارگێری مێجەر ویلسۆن دیت و چوونە دەستێ ئێك و پێکڤە چوونە مووسل ل وێرێ ل رەخێ چەپێ یێ پرێ کۆمەکا پۆلیسان و کۆمەکا لەشکەری ب سەرۆکاتییا هێژا سەردار(عەقید) خەلیل زەکی بەگ فەرماندێ دەڤەرا باکوور ل بەندێ بوون[٥٣].

هەر د ڤی چارچۆڤەی و پێشهاتێن رووනشتنێن نەخشەدانانا سنووری دا، رۆژنامەیا (الموصل) د

هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٢٤ گولانا ١٩٢٩یدا گۆتارەك ب ناڤ ونیشانێن (كۆمبوونا شەشێ یا لیژنا هەردەمییا توخیبی) بەلاڤكریە و تێدا هاتیيە: (كۆمبوونا ئێكێ ل زاخۆ بوو، یا دووێ ل جزیرێ، یا سیێ ل مووسل، یا چوارێ ل مێردینێ، یا پێنجێ ژی ل مووسل بوو، لێ كۆمبوونا شەشێ یا لیژنا هەردەمییا توخیبی دێ ل مێردینێ هێته گرێدان، ئەڤرۆ پشتی نیڤرۆ شاندێ عیراقی ژ باژێرێ مە (مووسل) دەركەڤتییە و ئەڤ شەڤە دێ ل خیڤەتكەها شێخ عەجیل بەگ یاوەر بیت، پاشی ب رێیا نسێبینێ دێ قەستا تركیا كەت، شاندێ عیراقی ژ ئەڤێن ناڤێن وان ل خوارێ پێك دهێت: سەرۆكێ شاندی هێژا موتەسەرفێ مووسل عەبدالله بەگ سائغ، پشكنەرێ كارگێری هێژا مێجەر ویلسۆن، قائیمقامێ زاخۆ مستەفا بەگ عومەری، رێڤەبەرێ نڤیسكاری (تەحریرات) سالم ئەفندی نامق، سكرتێرێ پشكنەرێ كارگێری یوسف ئەفندی و تایپست مستەفا ئەفندی)[٥٤].

رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارا رۆژا ٥ خزیرانا ١٩٢٩ یدا ئاماژە كریە ڤەگەڕیانا شاندێ عیراقێ ژ كۆمبوونا مێردینێ كو چ پێ نەڤێت قائیمقامێ زاخۆ مستەفا بەگ عومەری ژ ئێك ژ ئەندامێن وی شاندی بوو[٥٥].

وەسا دیارە ژی رۆژنامەیا (الموصل) ب هووری دووڤچوونا دەنگ و باسێن وان كۆمبوونێن ل ناڤبەرا عیراقێ و تركیا كریە بۆ نەخشەدانانا توخیبێ ل ناڤبەرا هەردو وەلاتان ژ بەركو وی بابەتی پتر پەیوەندی ب لیوا مووسل ڤە هەبوویە، هەر بۆ نموونە، د هژمارا ١٦ چریا ئێكێ ١٩٢٩ێ یا وێ رۆژنامەیێدا گۆتارەك ب ناڤ ونیشانێن (پێشوازیكرن ل دۆرناق ـ دورنەخ ـ و زاخۆ) بەلاڤكریە و ئاماژەكریە كۆمبوونا حەفت یا لیژنا هەردەمییا توخیبی و تێدا هاتیيە: (سپێدەیا رۆژا دووشەمبییا بۆری موتەسەرفیێ قائیمقامێ مەلبەندێی محەمەد عەلی بەگ و قائیمقامێ زاخۆ مستەفا بەگ عومەری هنارتن داكو ل سەر توخیبی ل خالا دۆرناق پێشوازییا شاندێ تركی بكەن، ل وێرێ كۆمەكا پۆلیسان سلاڤا سەربازی ل ئەندامێن هێژابێن وی شاندی كر بێن سەعەت یازدەی سپێدێ هاتینە ناڤ توخیبێ عیراقێ و ل بنكەهێ پۆلیسان بێهنا خۆ ڤەدان، پاشی ب ترۆمبێلان بۆ مەلبەندێ زاخۆ هاتنە ڤەگوهاستن و ل وێرێ ژ ئالیێ كەسێن لەشكەری و پۆلیسان ڤە ب رێزگرتن و ب گەرمی هاتنە پێشوازیكرن، پاشی ل دۆرێن سەعەت دووی پشتی نیڤرۆ ترۆمبێلێن وان ژ زاخۆ قەستا مووسل كرن)[٥٦].

رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٣٠ چریا ئێكێ ١٩٢٩یدا ئاماژە كریە وێ چەندێ كو شاندێ توركی شەڤەكێ ل زاخۆ مایە پاشی ژ توخیبی دەرباز بوویە[٥٧].

## چوار ـ دەنگ و باسێن جودا جودا:

رۆژنامەیا (الموصل هندەك دەنگ و باسێن دی ژی یێن پەیوەندی ب دەڤەرا زاخۆ ڤە هەین بەلاڤكرینە و دشیاندایە د ڤان تەوەراندا كورت بكەین:

### أ ـ سەرەدانێن مەزنە فەرمانبەرێن دەولەتا عیراقێ و بەریتانییان بۆ زاخۆ:

رۆژنامەیا (الموصل) د گەلەك هژمارەیێن خۆ دا گۆتار ل سەر سەرەدانێن مەزنە بەرپرسێن دەولەتا عیراقێ بۆ زاخۆ و باژێرێن دی یێن كوردی بەلاڤ كرینە و د وان گۆتاران دا شرۆڤەیا رەوشا وان باژێران و ئەگەرێ سەرەدانا وان بەرپرسان بۆ وان باژێران و چەوانییا پێشوازیكرنا وان ژ ئالیێ خەلكی ڤە هاتییە كرن، هەرچەندە ژی كو ئەو نیشادان تنێ تشتەكێ كارتۆنی بوویە، ژ بەركو رۆژنامەیا (الموصل) ئاماژە نەكریە ئارمانجا ب راستا یا وان سەرەدانان، لێ وێ چەندێ دیار دكەن كو گرنگی ب ڤێ دەڤەرێ هاتییە دان خۆ هەكە ژ ئالیێ ستراتیژی و سەربازی ڤە ژی بیت.

رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٢٧ ی خزیرانا ١٩٢١ یدا دەنگ و باسەك ل سەر سەرەدانا شیرەتكارێ لیوا مووسل (بێی دیاركرنا ناڤێ وی) بۆ دهۆك و زاخۆ بەلاڤكریە و تێدا هاتیيە: (سوباهی جەنابێ شیرەتكارێ لیوا مووسل دێ قەستا دهۆك،

ژ وێرێ ژی دێ قەستا زاخۆ كەت)[58]، هەروەسا د هژمارەیا رۆژا ٧ نیسانا ١٩٢٤ێدا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (هێژایێ موتەسەرف ل دهۆك و زاخۆ) و تێدا بەحسێ سەرەدانا هێژا موتەسەرف عەبدلعەزیز بەگ قەساب هاتیە كرن كو رۆژا ئێك شەمبیا بۆری دگەل هێژا پشكنەرێ كارگێری میستەر لۆید Lowid و هێژا رێڤەبەرێ پۆلیسێن مووسل تەحسین عەلی بەگ سەرەدانا قەزا زاخۆ كریە، ل وێرێ خەلكێ زاخۆ و سەرۆكێن دام ودەزگەهێن حكومی و كارمەندان ب گەرمی پێشوازیا هێژا موتەسەرفێ خۆشتڤی و هەڤالێن وی كریە، هەروەسا خویندكارێن خواندنگەهان ژی ب سروودێن خۆ یێن نیشتمانی و ب ئاوازێن خۆ یێن خۆش ب خێرهاتنا مێڤانێن هێژا كرن یێن دگەل سەرۆكێن دام ودەگەهێن باژێری و ریهسپی و ماقوولێن وێ كۆمبووین، پشتی رێ ورەسمێن پێشوازیكرنێ ژی پێكڤە ئێك ل دووڤ ئێك گەنگەشە ل سەر كاروبارێن فەرمانگەهێن فەرمی و خواندنگەهان كرن، وێ شەڤێ ژی ژ ئالیێ كورێ محەمەد ئاغایێ بنەمالا شەمدین ئاغا هاتنە مێڤانداری كرن و ناڤبری ب باشترین ئاوا مێڤانداریا وان كر و جهەكێ هەژی پێكەهێ وان یێ بلند بۆ بەرهەڤ كر و سەعەت چواری سپێدەیا رۆژا پاشتر سەرۆكێن حكۆمەتا مە قەزا زاخۆ ب جە هێلان ئەڤە ژی پشتی ئاگەهداری رەوشا وێ یا ماددی و مۆرالی بووین و دلخۆش بوون كو دیتین خەلك یێ ئامادەیە و ژ دل حەز دكەن خزمەتا وەلاتی بكەن و پێشبێخن و گرێدایی حكۆمەتێ نە (خودێ پشتەڤانیێ لێ بكەت) ل بن سیبەرا هێژا شاهێ مە یێ مەزن، پاشی سەرەدانا سارباژگەها نیشتمانی یا ل زاخۆ كرن و ل وێرێ ب گەرمی و ب رێزگرتن ڤە ژ ئالیێ ئەفسەرێن لەشكەری ڤە هاتنە پێشوازی كرن و ئەو ژی دلخۆش دەمێ سەربازگەهـ ب ئاوایەكێ رێك وپێك و هەبوونا ڤیان و دۆستینی یێ ل ناڤبەرا سەرباز و ئەفسەران دیتین، هەروەسا د رێیا خۆ دا سەح وسوییا رەوشا ناحیا سلێڤانەیی كرن و ئاگەهداری رەوشا وان گوندان بوون، ل سێمێلێ ژی ل كاروبارێن وێ ناحیێ نێرین...[59].

رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٢٣ نیسانا ١٩٣٠ یدا بەرپەرەك بۆ گۆتارەكا ل بن ناڤ ونیشانێن (هەردو برایێن عەباسی ل لیوا مووسل) تەرخانكریە و تێدا هاتییە: (ئێڤارییا رۆژا دووشەمبی هێژا ناجی پاشا سوێدی سەرۆك وەزیرێن بەرێ و هێژا تەوفیق بەگ سوێدی سەرۆكێ جڤاتا نوونەرێن نۆكە بۆ گەریان و بێنڤەدانێ هاتنە باژێرێ مووسل (ام الربیعین).. و دوهی نیڤرۆ سەرەدانا جهێ خورسەباد كرن.. و ژ تلكێفێ قەستا زاخۆ كرن و شەڤەكێ ل وێرێ مان و ئەڤرۆ ئێڤاری دێ ڤەگەرینە مووسل[60].

هەڤدەم رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٣ خزیرانا ١٩٣٠ێدا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (هەردو وەزیر سەرەدانا قەزا زاخۆ دكەن) و تێدا هاتییە: (ئەڤرۆ سپێدێ هێژا جەمیل بەگ مەدفەعی وەزیرێ ناڤخۆ و هێژا جەمال بەگ بابان وەزیرێ داد ژ مووسلێ دەركەڤتن و قەستا زاخۆ كرن بۆ ئاگەهداربوونا كاروبارێن وێ قەزایێ)[61]، هەروەسا رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ١٠ خزیرانا ١٩٣٠ێدا دیاركریە كو وەزیرێ ناڤخۆ جەمیل مەدفەعی و وەزیرێ داد جەمال بابان سەح وسوییا بنگەهێن سەربازی یێن زاخۆ ژی كرینە[62]، وێ رۆژنامەیێ د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ١٦ خزیرانا ١٩٣٠ێدا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (مووسل ل پێشییا ویلایەتێن عیراقێ یە) ژ رۆژنامەیا (العراق)[63] ڤەگوهاستییە و تێدا هاتییە: (رۆژنامەیا العراق ب هەلكەڤتنا ڤەگەریانا هێژا وەزیرێ ناڤخۆ و هێژا وەزیرێ داد بۆ پایتەختی (بەغدا) گۆتییە (هەردو هێژایان سەرەدانا قەزایێن دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ و ئاكرێ كرینە و سەح وسوییا كاروبارێن كارگێری، گرتیخانەیان، فەرمانگەهێن پۆلیسان، داد، تاپۆ، خواندنگەهـ و نەخۆشخانەیێن وان قەزایان كرینە[64]، هەر د بابەتێ سەرەدانان دا بۆ زاخۆ و دەڤەرێن دەردۆر، رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٢٣ تیرمەها ١٩٣٠ێدا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (هێژا شاهزادە ل دهۆك و زاخۆ) و تێدا هاتییە: (ئەڤرۆ سپێدێ كەژاوەیا هێژا

شاهزادە غازی دگەل دوو زرێپۆش و کۆمەکا پۆلیسان ژ مووسل دەرکەڤت و قەستا هەردو قەزایێن دهۆك و زاخۆ کر، هەروەسا کەسانێن هێژایێن نێزیکی وی و هێژا موتەسەرف تەحسین بەگ عەلی و فەرمانداری دەڤەرا باکوور زەعیم عەبدللەتیف و رێڤەبەرێ پۆلیسێن لیوایێ حوسامەددین بەگ و نۆشدارێ باژێرڤانیا مووسل دکتۆر عەبدلئەحد عەبدلنوور دگەل چووینە هەردو قەزایان[٦٥].

وەسا دیارە ژی ل سالا ١٩٣٠ێ جێنشینێ شاهزادە غازی بڕیاردایە سەرەدانا دەڤەرێن کوردی ژ وانا زاخۆ ژی بکەت بۆ هاویشکرنا رەوشێ و پشتڕاستکرنا خەلکی کو مافێن وان دێ دپاراستی بن ژ بەرکو پەیمانا عیراقی ـ بەریتانی یا ١٩٣٠ ێ مافێن کوردان پشتگوهڤە هاڤێتبوون[٦٦]، نەخاسمە ژی پشتی سەرۆکێن دەڤەرێن بەهدینان ـ د ناڤ وان دا سەرۆك عەشیرەتێن دەڤەرا زاخۆ زاخۆ ژی (سندی و گولی) ـ داخوازیەك پێکێشی حکۆمەتا بەریتانی و نوینەرێ بلند و کۆمەلا گەلان و پەرلەمانێ بەریتانی و لیوایێ سلێمانیێ کریوو بۆ پشتەڤانیکرنێ ل داخوازێێن خەلکێ سلێمانیێ بۆ پێکئینانا حکۆمەتەکا کوردی یا خۆسەر[٦٧].

## ب ـ ئاگەهداری (ریکلام):

سەربارێ بەلاڤکرنا دەنگ و باسان، رۆژنامەیا الموصل گرنگی ب بەلاڤکرنا ئاگەهدارییان ژی دایە نەخاسمە یێن بازرگانی (ریکلام) ل زاخۆ، گرنگییا پێداچوونا ڤان جۆرێن ئاگەهدارییان ژی د هندێدایە رۆناهیێ دئێخنە سەر بزاڤا بازرگانی و بیناسازی ل زاخۆ کو ژێدەرێن دیرۆکی خۆ ژ ڤی لایەنی بێ دەنگ کریە.

رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٢٥ ئادارا ١٩٢١ێدا ئاگەهداریا ل سەرێککێمکرنێ بۆ چێکرنا پیادەرێیەکێ ل زاخۆ بەلاڤکریە و تێدا هاتیە: (ئەوێن بڤێن پیادەرێیەکێ ل بازارێ زاخۆ چێ کەن، درێژیا وێ ١٨٦ مەتر و پانیا وێ ٥ مەترە، ئەو پیادەرێ دێ وەکی یا مووسل بیت و ل نیڤێ یا بلند بیت دگەل هەبوونا ئاڤرێژێ بۆ چوونا ئاڤێ ل هەردو رەخان، هەروەسا گەلەك بەر ژی ل دەڤەرا ناڤبری هەنە و دڤێت ل سەرێککێمکرن پێشکێشی فەرمانگەها شیرەتکارێ لیوایێ ل مووسل بێنەکرن و گرەنتی نینە کێمترین ل سەرێککێمکرن یان یەك ژ وان بێتەپەژراندن ، دڤێت پێگیری ب وێ چەندێ ژی بێتە کرن کو ئەو پیادەرێ هەتا نیڤا هەیڤا تەباخا بهێت بێتە چێکرن)[٦٨]، هەروەسا د ئاگەهداریا د هژمارەیا رۆژا ٣٠ خزیرانا ١٩٢ێدا ل سەر رێیا زاخۆ هاتییە بەلاڤکرن، رۆژنامەیێ دەنگ و باسەك بەلاڤکریە و تێدا هاتییە گۆتن کو بەری نیڤرۆیا رۆژا سێ شەمبیا بهێت رێکەڤتی ١٤ ی خزیرانێ سەعەت نەهی فرەنگی ل فەرمانگەها شیرەتکارێ لیوایێ حەوالەکرنا ڤەبڕ یا چێکرنا پیادەرێیا بازارێ زاخۆ دێ هێتەکرن، ژ بەر هندێ، داخوازێ ژ ل سەرێککێمکەران دکەین ل دەمێ دەسنیشانکری ل وێ فەرمانگەهێ ئامادە بن[٦٩]، رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٣٠ ئیلۆنا ١٩٢١ێدا ئاماژەکریە وێ چەندێ کو ل سەرێککێمکرن ل سەر دەهـ ماددە (کەرەستە)یێن زاخۆ یێن هەر شەش هەیڤێن داوییێ هاتییە کرن[٧٠].

د هژمارەیا رۆژا ١٤ چریا ئێکێ ١٩٢١ێدا رۆژنامەیێ دیار کریە کو هەر ژ رۆژا حەفتی ڤێ هەیڤێ دێ ل سەرێکزێدەکرن ل سەر دەهـ دەرامەتێن هاڤینێ یێن زاخۆ هێتە کرن و پلا ڤەبڕینێ (الدرجة او الاحالة القطعية) دێ ل رۆژا بیستی وێ هەیڤێ بیت، ڤێجا هەر کەسێ حەزا پێگیریکرنێ هەبیت، سەرەدانا قائیمقامی یا قەزا ناڤبری ل ڤی باژێری بکەت[٧١].

هەروەکی دهێتە تێبینی کرن کو ئەڤ ئاگەهداری یێن سڤك یێن د رۆژنامەیا (الموصل) دا ل سەر زاخۆ هاتینە بەلاڤکرن، نیشانێ هندێیە کو حکۆمەتا بەغدا وەك پشکەك ژ ئاخا عیراقێ بەرێ خۆ ددا ڤێ قەزایێ ئەڤە ل وی دەمێ هێشتا مەسەلە ل ناڤبەرا هەردو حکۆمەتێن عیراقێ و ترکیا نەهاتبوو ئێکلا کرن، چونکی هەروەکی دهێتە زانین ئەڤ کێشەیە ل ب بڕیارەکا کۆمەلا گەلان ل داوی یێن سالا ١٩٢٥ ێ هاتبوو ئێکلا کرن.

رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆ یا رۆژا ٢٦ ی كانوونا دووێ یا ١٩٢٩ یدا ئاگەهدارییەك بەلاڤ كربوو و تێدا هاتییە: (پشكێن عەزیز ئاغا كورێ یەعقوب ئاغا موختارێ گوندێ پێشابیرێ ژ عەردێن ل هەردو گوندێن باجد كەندال و كانی عەرەبێ ل ناحیا سلێڤانەیی ل قەزا زاخۆ گەرەنتی (تأمینات) دانابنە بەرامبەری دەستەبەریا هێژا تاهر ئەفندی نڤیسەر و باجوەرگرێ ناحیا گولی، ڤێجا هەر كەسێ پەیوەندی ب وان پشكێن ناڤهاتی ڤە هەبیت، سەرەدانا قائیمقامێ قەزا زاخۆ بكەت و بەلگەنامە دگەل بن پشتەڤانییا ئاخڤتنێن وی بكەن بەری بۆرینا ٣١ رۆژان ژ رۆژا بەلاڤكرنا ڤێ ئاگەهدارییێ)[٧٢]، هەروەسا د هژمارەیا رۆژا ١٨ ئادارا ١٩٢٩ ێ یا وێ رۆژنامەیێدا ئاگەهدارییەك ل سەر باج و كرێ یێن پارچێن عەردی یێن نەئاڤاكری تاكێن وان و قەرێن وان یێن كەڤن(مفرداتها و بدلاتها السابقة) یێن بهێت و یێن قەزا زاخۆنە، ل جهێ ل سەرنكزێدەكرنێ هاتینە دانان و كو دەمێ وێ ل سەرنكزێدەكرنێ ژ رۆژا ١٩٢٩/٣/١ هەتا ١٩٢٩/٣/٢٠ ێ بیت و و پلا ڤەبرینێ ژی دێ ل ناڤبەرا ٢١-٣١ ئادارا ١٩٢٩ێ بیت، ڤێجا ئەوێ حەز دكەت، سەرەدانا جڤاتا كارگێرییا قەزا زاخۆ بكەت:

هەروەسا هندەك ئاگەهداری یێن دی یێن وەسا ژی و هەر ب وی ئاوایی د وێ رۆژنامەیێدا هاتینە بەلاڤكرن[٧٤].

هەروەسا د هژمارەیا رۆژا ٣ خزیرانا ١٩٢٩یدا رۆژنامەیا (الموصل) سێ ئاگەهداری ل سەر زاخۆ بەلاڤكرینە، د یا ئێكێدا هاتییە كو (كانزایێ نەفتێ ب گوزمێ ٧٠٠٠ رپییان دێ ژ گوندێ تاوكێ یێ ل ناحیا سندی ل قەزا زاخۆ هێتە دەرئێخستن و پارەیێ پێشینێ (البدل الاسبق)یێ ڤی كانزای ١٥٠٠٠ رپییە، ڤێجا هەر كەسێ بڤێت پشكدارییێ تێدا بكەت، بلا سەرەدانا جڤاتا كارگێرییا قەزا زاخۆ بكەت و گەرەنتییێن فەرمی دگەل خۆ بینیت)، لێ د ئاگەهدارییا دووێدا هاتییە دیار كرن كو (بڕیار هاتییە دان بهایێ كەلەكێن قەزا زاخۆ ٦٤٥٠ رپییە بیت و پلا ڤەبرینێ ل رۆژا ٩ خزیرانا ١٩٢٩ێ دێ هێتەكرن، ڤێجا هەر كەسێ بڤێت پشكدارییێ تێدا بكەت، سەرەدانا ژمێرپارییا لیوایێ و قائیمقامییا قەزا زاخۆ بكەت)، لێ د ئاگەهدارییا دوێدا هاتییە كو دەلالی یا باژێرڤانییا زاخۆ (قد اخذت تحت السموم) ب ٣٠٠ رپییان، ڤێجا هەر كەسێ بڤێت پشكدارییێ تێدا بكەت، سەرەدانا قائیمقامییا قەزا زاخۆ بكەت)[٧٥].

د هژمارەیا رۆژا ١١ خزیرانا ١٩٢٩ ێ یا وێ رۆژنامەیێدا ئاگەهدارییەك هاتییە بەلاڤكرن و تێدا هاتییە: (ل

| عانه | ربی | جۆرێ باجێ | |
|---|---|---|---|
| ٠ | ٥٠٠ | دەهێكا كەرەستەی | |
| ٠ | ٧١٠٠ | باجا كەلەكێ | |
| ٠ | ١٥٥٠ | دەهێكا زەرزەواتی | |
| ٠ | ١٥٠٠٠ | كانزایێ نەفتێ | |
| ٠ | ١٠٠ | دەهێكا گێچێ | |
| | | باجا ڤەكوشتنێ ل گوندێ شەرانشا مووسلمانان مەلبەندێ ناحیا سندی نینە. | |
| | | باجا ڤەكوشتنێ ل گوندێ دیمكا مەلبەندێ ناحیا گولی نینە. | |
| | ٥ ٠ | كرێیا بیستانێ ل گوندێ باستكا ژێری یا یێ میری. | |
| | ١٧ ٠ | كرێیا بیستانێ ل گوندێ خوالش یێ میری | |
| | ٤٥ ٠ | كرێیا كناری ل نك پرا كەڤن بۆ چابخانێ ل رۆژانێن هاڤینێ... | |
| | | موتەسەرفێ لیوا مووسل[٧٣]. | |

سەر بنەمایێ ئەنجامدانا پلا ڤەبڕینێ یا بەروەخت بۆ چوار هزار و هەشت سەد و نۆت و شەش پشكان ژ كۆما سێ هزار و هەشت سەد و بیست و چوار پشكان ژ بیستانێ ل تاخێ فەلەیان ل زاخۆ كو یێ دەیندار سەعید حەجی مستەفایە و حەجی خدر كوڕێ حەجی عەبدلقادر داخوازا وی بیستانی دكەت هەر ژ رۆژا بەلاڤكرنا ڤێ ئاگەهداریێ و هەتا بۆرینا پازدە رۆژان دێ پلا ڤەبڕینێ بۆ داخوازكەرێ وێ هێتە كرن، ڤێجا هەر كەسێ بڤێت بكڕیت، سەرەدانا فەرمانگەها پێڕابوونێن زاخۆ و ٥٪ ژ گەرەنتییان دگەل خۆ بینیت، هەر بۆ هندێ ژی ئەڤ ئاگەهدارییە هاتییە نڤیسین...)[٧٦].

راگەهاندنەكا دی یا د هژمارەیا رۆژا ١٩ تەباخا ١٩٢٩یدا هاتییە بەلاڤكرن ئاماژە كریە وێ چەندێ كو: (كرێگرتنا سەد و چل مێترێن چوارگۆشەیێن عەردێ حكۆمەتێ یێن ل خەندەكا باژێركێ زاخۆ كو بۆ ئاڤاكرنا ئاشەكی هاتییە تەرخان كرن، بۆ ل سەرێكزێدەكرنێ بۆ ماوێ سێ سالان هاتییە دانان هەر ژ رۆژا وەرگرتنا پلا ڤەبڕینێ هەتا رۆژا ١٣ ئادارا ١٩٣٢ێ، ب مەرجەكی، ئەو ئاڤاهیێ ل وی جهی دهێتە ئاڤاكرن و جۆتك وشەقلێن بانی و دەرگەهێن عمبارێ، پشتی ب داویهاتنا دەمێ كرێگرتنێ، دەمێ سەرێكزێدەكرنا وان بیست رۆژ و پلا ڤەبڕینێ دەه رۆژ بیت[٧٧].

ئەڤە هندەك نموونەیێن وان ئاگەهدارییان بوون یێن ل سەر زاخۆ د رۆژنامەیا (الموصل) دا هاتین، تشتێ دهێتە تێبینیكرن ژی كو پشتی سالا ١٩٣٠ ێ ئەو رۆژنامە ژ بەلاڤكرنا ئاگەهدارییان ل سەر زاخۆ راوەستیایە و ئەگەرێ وێ چەندێ نەهاتییە زانین.

## ج ـ كرێ یێن ڤەگوهاستنێ:

هەرچەندە زانیاری ل سەر ڤی بیاڤی دكێمن، لێ تشتەكێ گرنگە رۆناهیێ بێخینە سەر، ژ بەركو ئەڤ زانیارییە قەبارێ كرێیا هاتن وچوونێ ل ناڤبەرا زاخۆ و دەڤەرێن دی یێن نێزیكی وێ دیاردكەن، هەر بۆ نموونە، رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆیا رۆژا ٩ ئادارا ١٩٢١یدا ئاماژەكریە بهایێ هاتن و چوونێ ب ترۆمبێلێ ژ مووسل بۆ زاخۆ كو ٥٠ رپی بوو[٧٨]، ئەڤە ل وی دەمێ رۆژنامەیێ د هژمارا خۆیا رۆژا ٢٢ ئادارا ١٩٢٤یدا دیاركریە كو كرێیا هاتن وچوونێ ژ مووسل بۆ زاخۆ ب (عەرەبە باشقە) ٦٠ رپیە و ب (عەرەبە بابلی) ٦٠ رپییە بوویە، هەر د وێ هژمارێدا هاتییە كو كرێیا ڤەگوهاستنێ ب ترۆمبێلێ ژ مووسل بۆ زاخۆ ٥٥ رپییە بوویە، لێ كرێیا هاتن و چوونێ ل ناڤبەرا هەردوان ١٠٠ رپییە بوویە[٧٩].

## د ـ سەقا (باران، بەفر، برووسی):

ئێك ژ بابەتێن سەرنجراكێشێن وی دەمی و رۆژنامەیا (الموصل) پشتگوهڤە نەهاڤێتینە، بەلاڤكرنا دەنگ و باسێن سەقایە كو رۆژنامە ژێدەرێ سەرەكیێ وان دەنگ و باسان بوون بوو، ژ وان دەنگ و باسان دیار دبیت كو رەوشا سەقایێ زڤستانا لیوا مووسل ژ وانا یا زاخۆ ژی یا وی دەمی گەلەك یا دژوار بوویە، رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆیا رۆژا ٢٧ چریا دووێ ١٩٢٨یـدا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (دژواربوونا سەرمایێ ل مووسل) و تێدا هاتییە: (ل چیایێن زاخۆ و ئاكرێ و زێبار بەفر كەڤتییە سەرێك و سڕوسەرما كەڤتییە هندەك دەڤەرێن قەزایێن باكوور، بارۆڤەیەكا دژوار ل مووسل دایە و سڕەكا مەزن دگەل خۆ ئینایە و مە هەست ب بارگرانییا سڕێ كریە هەروەكی ئەم ل نیڤا زڤستانا ب سڕوسەقەم بین[٨٠]، هەروەسا رۆژنامەیا (الموصل) د هژمارەیا خۆیا رۆژا ١٨ ئادارا ١٩٢٩یدا دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (سڕوسەقەم ل مووسل) بەلاڤكریە و تێدا هاتییە: (هەرچەندە وەرزێ بهارێیە، لێ ژ بەر سڕا بەردەوام و بەفر و بارانێن بۆش ل قەزا زاخۆ، ڤان رۆژێن داویێ گەلەك سار بوویە [٨١]، هەروەسا ل رۆژا ٣٠ چریا ئێكیا ١٩٢٩ێ، رۆژنامەیا (الموصل) دەنگ و باسەكێ دی ب ناڤ و نیشانێن (باران ل لیوایێن باكوور) ل سەر بەربەرێن خۆ بەلاڤكریە و تێدا هاتییە: (بەری سێ رۆژان تەڤێن بارانێ بارینە، هەروەسا دەنگ و باسان ژی بۆ مە

دیار كرینە كو بارانەكا بۆش ل لیوایێن سلێمانیێ و كەركوك و قەزایێن شنگال، دهۆك، ئاكرێ و زاخۆ باریبە[٨٢]. سەرباری هندێ ژی، رۆژنامەیا (الموصل) دەنگ و باسەك ب ناڤ ونیشانێن (لێدانا برووسییان ل تەلەعفەر و زاخۆ) بەلاڤكربە و تێدا هاتییە: (سپێدەیا رۆژا ٢٠ ئیلۆنا ١٩٣٠ێ، برووسییەكێ ل قەزا زاخۆ ل گوندێ بەركەڤەرێدایە[٨٣] و بوویە ئەگەرێ كوشتنا دوو كەسان و برینداربوونا كەسەكێ دی ژ وی گوندێ ناڤبری)[٨٤].

## داوی:

دشیاندایە گرنگترین ئەنجامێن ڤێ ڤەكۆلینێ د ڤان خالێن خوارێدا كورت بكەین:

١- رۆژنامەیا (الموصل) ب پلا ئێكێ رۆژنامەیا دەنگ و باسان بوویە، ژ بەركو رۆژنامەیەكا فەرمی یا زمانحالێ حكۆمەتا نوویا عیراقێ بوویە یا ژ ئالیێ حكۆمەتا بەریتانی ڤە هاتییە پێك ئینان، ئانكو ئەو ل بن سیاسەتا هەردو حكۆمەتێن عیراقی و بەریتانی بوویە، ژ بەر هندێ، ژ هێلا گشتی دەرنەكەڤتییە كو بەحسێ بابەتێن هەستیار بكەت یێن خەلكێ ویلایەتا مووسل ب گشتی و زاخۆ ب تایبەتی ژ بەر دنالین، ئانكو وێ رۆژنامەیێ بەهرا پتر گرنگی دایە كارێن ئەرێنی یێن حكۆمەتێ بێی هندێ دیاردەیێن نەرێنی دەسنیشانبكەت، هەروەسا وێ رێبازەكا دژوار و ئێكسەر نەبوویە بۆ رەخنەگرتنێ ل رەوشا گشتی، هەر بۆ نموونە، رۆژنامەیا (الموصل) بەحسێ رەوشا خرابا ئابووری و كێمیا خزمەتگوزاریێن وی دەمی نەكریە یێ خەلكێ زاخۆ ژ بەر دنالی، دیار نەكریە ژی كا زاخۆ چ هەلویست بەرامبەری حوكمێ دەولەتا عیراقێ و سیاسەتا بەریتانی ل كوردستانا باشوور (عیراقێ) هەبوویە، ئەڤە سەرباری رووداتێن دزی و كوشتنێ و رووداتێن دی كو وی دەمی ل زاخۆ دبەربەلاڤ بوون و ژ ئالیێ رۆژنامە یێن دی یێن وەكی (البلاغ) و (نصیر الحق) ئاماژە پێ دهاتە كرن، ئانكو رۆژنامەیا (الموصل) ژ وی چارچۆڤەیێ فەرمی دەرنەكەڤتیبە یێ حكۆمەتا عیراقێ و بریتانی بۆ دانای.

٢- رەخنەیا ل رۆژنامەیا (الموصل) دهێتە گرتن ئەوە كو ئەو رۆژنامە یا بێلایەن نەبوویە و یا راستبێژ و رۆهن نەبوویە د ڤەگوهاستنا وان دەنگ و باسێن سیاسی دا یێن پەیوەندی ب مەزنە دەولەتمەدارێن سیاسی ڤە هەین ژ وانا شاهـ و شاهزادە و وەزیرێن دەولەتێ دەمێ سەرەدانا زاخۆ دكرن كو سەرەدانێن وان بۆ زاخۆ و بازێرێن باشوورێ كوردستانێ ب مەسەلەیەكا كارگێرێ قەلەم دایە ئەڤە ل وی دەمێ كو ئارمانجا سەرەكییا وان سەرەدانان مەسەلەیەكا سیاسی بوویە، هەر بۆ نموونە: سەرەدانا شاهزادە غازی بۆ زاخۆ پشتی گرێدانا پەیمانا ١٩٣٠ ێ دگەل بریتانیا بوویە كو د چ ماددێن وێدا بەحسێ مافێن نەتەوەیی یێن گەلێ كورد نەهاتییەكرن، شاهزادەی ڤیایە ب ڤێ سەرەدانا خۆ ئاگەهداری رەوشا دەڤەرێ بیت و ڤیان و دۆستینییا كوردان بۆ حكۆمەتا عیراقێ ب دەستڤە بینیت، ژ بەر هندێ، دیار دبیت كو جۆرێ دەنگ و باسێن رۆژنامەیێ بەلاڤ دكرن ل پلا ئێكێ د بەرژەوەندییا حكۆمەتا عیراقێ و بریتانی و سیاسەتا وان بەرامبەری كوردستانێدا بووینە، د چ بەرپەرێن وێدا دەنگ و باس ل سەر پێكئینانا كۆمەلەیەكێ یان پارتەكا سیاسی یان هەتا كۆمەلەیەكا جڤاكی یا كوردی نەهاتییە بەلاڤكرن، ئەڤە ل وی دەمێ كو وی دەمی چەندین كۆمەلە و پارتێن كوردی ل كوردستانا باشوور دهاتنە پێكئینان، هەروەسا چ دەنگ و باس ل سەر مافێن نەتەوەیی یێن كوردان بەلاڤ نەكرینە كو وی دەمی گەلەك داخوازیا وان مافان دهاتە كرن.

٣- دگەل هندێ ژی، دشیاندایە رۆژنامەیا (الموصل) ب ئێك ژ ژێدەرێن دیرۆكی یێن دەگمەنێن گرنگ بێتە ل قەلەمدان یا بەحسێ دیرۆكا خۆجهییا زاخۆ دكەت ل سەردەمەكێ وەسا هەتا رادەیەكی چ ژێدەرێن نڤیسكی ل سەر دیرۆكا وێ دەڤەرێ

نەبن، دشیاندایە بێژین ژی كو ئەڤە رۆژنامەیا ئێكێ بوویە یا ب ئاوایەكێ بەرفرەه و ب درێژی ل سەر گەلەك بەرپەرێن خۆ بەحسێ زاخۆ كری، نەخاسمە ژی وەكی بەلاڤكرنا دەنگ و باسێن فەرمی ب ئاوایەكێ هوور و ب درێژی و باوەرپێكری و تۆماركری ب رۆژ هەیڤ و سال خۆ هەتا دیاركرنا سەعەتێ ژی ل سەر دامەزراندنان، خزمەتگوزاریێن حكومی، چالاكی یێن رەوشەنبیری (گۆتار و شانۆگەرییان)، سەرەدانێن مەزنە فەرمانبەرێن دەولەتێ، كارەساتێن سروشتی و چەندین دەنگ و باسێن دی یێن دشیاندایە ب ئاوایەكێ باشتر مفا ژێ بێتە وەرگرتن دەمێ د پاشەرۆژێدا ڤەكۆلین ل سەر دیرۆكا ڤێ دەڤەرێ دهێنە كرن، دەمێ ئەڤ زانیاری یێن تێدا هاتین دگەل هندەكێن دی دهێنە هەڤبەر كرن، ل سەر بنەمایێ وان زانیارییان ئەنجامەك ب دەست دكەڤیت.

## ژێدەر:

١. فەرە بێژین كو قەزا زاخۆ دكەڤیتە دوورترین دەڤەرا باكووری رۆژئاڤایێ هەرێما كوردستانا عیراقێ و ل دۆرێن ١١٤ كیلۆمێتران ل باكووری باژێرێ مووسل و ٥٨ كیلۆمێتران دووری سەنتەرێ پارێزگەها دهۆكێ یە، قەزا زاخۆ گرنگییەكا تایبەت هەیە ژ بەركو دكەڤیتە سەر توخیبێ عیراقێ - تركیا - سوریا، كو تنێ دوو میلان دووری باشووری تركیا و ١٢ میلان دووری رۆژهەلاتێ سوریایە، ب ڤی جهێ خۆیێ جۆگرافی، دبیتە ئێك ژ دەرگەهێن سەرەكی یێن رێیا نێڤدەولەتی ل ناڤبەرا عیراقێ ژ لایەكی و هەر ئێك ژ تركیا و سوریا ژ لایەكێ دیڤە، هەروەسا كلیل و دەرگەهێ كوردستانا باشوورە، بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: وصفیە محمد شیخو السندی، زاخو فی العهد الملكی ١٩٢١-١٩٥٨: دراسە تاریخیە فی اوجاعها العامە، دهوك، ٢٠١٤.

٢. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٣٥٣)، ٣٠ ئادارا ١٩٢١ێ.

٣. ئەو مەحمود فەخری ئەفندی یە یێ ل ناڤبەرا ١٩٢٤/١٠/٥-١٩٢٧ ێ پۆستێ قائیمقامێ زاخۆ وەرگرتی، بنێرە: رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٨٨٤)، ٢ چریا ئێكێ یا ١٩٢٤ێ، تووماری فەرمانبەرێن (یێن ل ناڤبەرا سالێن ١٩٢١-١٩٥٨ێ ل عیراقێ ل قەزا زاخۆ و ناحییێن وێ كار دكرن)، ناڤێن وان د رۆژنامەیا فەرمی دا هاتینە بەلاڤ كرن.

٤. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٨٨٤)، ٢ چریا ئێكێ یا ١٩٢٤ێ.

٥. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٨٨٩)، ١٣ چریا ئێكێ یا ١٩٢٤ێ.

٦. مستەفا ئەلعومەری: ژ بنەمالا ناڤدارا (العمری) ل مووسل، سالا ١٨٩٠ێ ژ دایكبوویە و دەرچوویێ خواندنگەها ئایینی یا مزگەفتا (الرابعیە) یە سالا ١٩٠٧ێ، خواندنا خۆ یا ئامادەیی ل مووسل داویئینایە و چوویە خواندنگەها حقوق ل بەغدا و دەرچوویێ سالا ١٩٢١ یێ وێ خواندنگەهێ یە، چەندین كار كرینە، ژ وانا: قائیمقامێ تەلەعفەر، قائیمقامێ زاخۆ، موتەسەرفێ دیوانیێ، موتەسەرفێ عمارە، پاشی بوویە وەزیرێ ناڤخۆ، بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: بان غانم احمد الصائغ، مصطفی العمری و نشاطە الاداری والسیاسی فی العراق حتی عام ١٩٥٨، نامەیا ماجستێرێ یا ل سالا ١٩٩٦ێ پێشكێشی پشكا دیرۆكێ یا كولیژا ئادابێ یا زانكۆیا مووسل هاتیە كرن.

٧. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٤١)، ١٣ كانوونا ئێكێ یا ١٩٢٨ێ.

٨. دادگەها مەزن یا هەمی بادەكان چارە دكەت و هەر سزایەكا د یاسایێ دا هاتی دسەپینیت، ژ سێ دادگاران پێكدهێت كو ب كێمی ئێك ژ وان حوكمدارێن پلە ئێكە و ئەڤ دادگەهە دەملدەست حوكمێن خۆ بلند دكەتە دادگەها لێزڤرینێ(تێهەلچوون) و دادگەها تەمییزێ، هەروەسا ئێك ژ دەستهەلاتێن دادگەها مەزن نێرینا بادەكێن لێزڤرینێ بوو یێن ژ لایێ دادگەهێن باژێران ڤە بۆ دهاتنە بلند كرن. بنێرە، البرت م. منتشاشفیلی، العراق فی سنوات الانتداب البریطانی، وەرگێرانا: هاشم صالح التكریتی، بەغدا، ١٩٧٨، بپ ١٩٣.

٩. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٦٦٩)، ١٦ ی كانوونا دووێ یا ١٩٣٠ێ.

١٠. ئانە: عانە Anna دراڤەكێ كانزایی یێ هندییە ژ مادێ نیكلی دهاتە چێكرن بەرامبەری ١٦/١ ژ رپی بوو، هەر ئانەیەك بەرامبەری چوار پیزان Pice بوو كو ئەڤا داویێ ژی دراڤەكێ كانزایی یە و ژ سفری دهاتە چێ كرن، ل داویێ ژ پایە هەبوو كو ئەو ژی دراڤەكێ كانزایی بوو و بەرامبەری ٣/١ ی پیزەی بوو، (ئانە) ل ناڤ خەلكی ب (عانە) ناڤدار بوو، بنێرە، علی حمزە

عباس الصوفی، العلاقات التجاریه بین العراق وترکیا (١٩٢٦ - ١٩٥٨) ، نامەیا ماجستێرێ یا پێشكێشی پشكا دیرۆكێ یا كولیژا ئادابێ یا زانكۆیا مووسل هاتییە كرن، ٢٠٠٤، بپ ٨٥.

١١. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٦٨)، ٢٧ ئادارا ١٩٢٩ێ.

١٢. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٤٢٦)، ٢٢ ئیلۆنا ١٩٢١ێ.

١٣. عەبدلموحسن سەعدون: ل سالا ١٨٧٩ ێ ل ناسریێ ژ بنەمالەكا ناڤدار ژ دایكبوویە كو وێ بنەمالێ چەند سەدسالیەكان حوكم ل (منتفق) كریە، خواندنا خۆ ل ستەنبۆلی داویئینایە، موارڤقێ سولتان عەبدلحەمیدێ دووێ بوو ب پلا موقەددەمێ پیادە، وەك نوینەرێ (منتفق) د جڤاتا مەبعوسێن ئۆسمانی دا هاتییە هەلبژارتن، سالا ١٩٢٩ ێ پۆستێ وەزارەتا داد د حكۆمەتا ئێكێ یا عەبدلرەحمان نەقیب دا وەرگرتییە، پۆستێ سەرۆكاتییا جڤاتا دامەزرێنەر وەرگرتبوو و هەتا دەمێ خۆكوشتنێ ل سالا ١٩٢٩ێ، سێ جاران بوویە سەرۆك وەزیر، بنێرە: لطفی جعفر فرج، عبد المحسن السعدون، دوره في تاريخ العراق السياسی المعاصر، بەغدا، ١٩٨٨.

١٤. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٦٦٧)، ٦ ی كانوونا دووێ یا ١٩٣٠ێ.

١٥. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٦٩٦)، ١٤ ئیلۆنا ١٩٣٠ ێ.

١٦. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٧٥٠)، ٣ چریا ئێكێ ١٩٣٠ێ.

١٧. وەقف: الوقف: لغة الحبس يقال وقفت الدار وقفا ای حبستها فی سبيل الله، اما اصطلاحا فهو حبس العين على حكم ملك الواقف والتصدق بالمنفعة ولو بالجملة. ينضر: وميج سرحان ذياب، موجات الاوبئة والقحط والكوارث الطبيعية في العراق ١٨٣٠ – ١٩١٧، رسالة ماجستير مقدمة الى قسم التاريخ ،كلية التربية، جامعة المستنصرية، ٢٠١٠، ص١٦١.

١٨. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٣٩٠)، ٢٧ خزیرانا ١٩٢١ێ.

١٩. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٥٧)، ١٠ شواتا ١٩٢٩ێ.

٢٠. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٦٣٣)، ٣٠ ئیلۆنا ١٩٢٩ێ.

٢١. هەر ئەو هژمارە.

٢٢. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٧٤٧)، ٢٢ ئیلۆنا ١٩٣٠ێ.

٢٣. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٨٤٦)، ٣٠ تیرمەها ١٩٢٤ێ.

٢٤. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٤٤)، ٢٨ كانوونا ئێكێ ١٩٢٨ێ.

٢٥. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٧١٢)، ١٠ خزیرانا ١٩٣٠ێ.

٢٦. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٧٢٣)، ١٤ تیرمەها ١٩٣٠ێ.

٢٧. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٧٧٢)، ٨ كانوونا ئێكێ یا ١٩٣٠ێ.

٢٨. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٧٧٥)، ١٨ كانوونا ئێكێ یا ١٩٣٠ێ.

٢٩. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٨٨)، ٥ خزیرانا ١٩٢٩ێ.

٣٠. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٦٨٢)، ٢٧ شواتا ١٩٣٠ێ.

٣١. بۆ زانیاری پێن زێدەتر بنێرە: عبدالرزاق الحسنی، تأريخ الوزارات العراقيه، بەغدا، ١٩٨٨، بەرگێ ١، بپ ٦٥، عبدالرحمن البزاز، العراق من الاحتلال حتى الاستقلال، لەندەن، ١٩٩٧، بپ ٩٧.

٣٢. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٤١٢)، ٢٢ تەباخا ١٩٢١ێ.

٣٣. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٧٧٣)، ١٩ شواتا ١٩٢٤ێ.

٣٤. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٧٧٤)، ٢١ شواتا ١٩٢٤ێ.

٣٥. بۆ زانینا ناڤێن نوونەرێن دی پێن سەركەفتی و هژمارا دەنگێن وان، بنێرە: رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە ٧٧٩، ٤ ئادارا ١٩٢٤ێ.

٣٦. احمد رفيق البرقاوی، العلاقات السياسيه بين العراق و بريطانيا ١٩٢٢ – ١٩٣٢، بەغدا، ١٩٨٠، بپ٩٥.

٣٧. رەوشا نەئاسایی (الاحكام العرفية): ئەو رێكارن پێن حكۆمەت ب كار دئینیت دەمێ گرفتاری و ئالۆزی پێن سیاسی دهێنە رووودان داكو ب وان رێكاران بشێت رەوشێ كۆنترۆل بكەت و ب ڤان رێكاران یاسا و رێسایێن كارگێری دهێنە ژ كار ئێخستن و

کارگێڕی ئاوایەکێ سەربازی ب تنێ ب خۆڤە دگریت، بنێڕە: الاوضاع الادارية في الموصل خلال العهد الملكي ١٩٢١-١٩٥٨، زانکۆیا مووسل، ٢٠٠٨، بپ ٢٥٧.

٣٨. عەبدلعەزیز قەساب، سالا ١٨٨٦ێ ل بەغدا بوویە، خواندنا خۆ ل وێرێ داویئینایە ، پاشی خواندنگەها شاهانە ل ستەنبۆلێ هاتییە وەرگرتن و ل سالا ١٩٠٥ ێ ژێ دەرچوویە، پاشی بوویە قائیمقامێ سامەڕا پاشی بوویە قائیمقامێ سەماو، پاشی بوو زنبار هاتییە ڤەگوهاستن، پشتی دامەزراندنا حکۆمەتا عیراقێ، وەك قائیمقامێ کوت پاشی وەك موتەسەرفێ کەربەلا، پاشی یێ (منتفق) هاتییە دامەزراندن، پاشی وەك وەزیرێ ناڤخۆ ل کابینا ویزاریا دووێ و سێێ یا سەعدون دا هاتییە دامەزراندن، هەروەسا دو جاران ل دووڤ ئێك وەك سەرۆکێ جڤاتا نوونەران هاتییە هەلبژارتن، بۆ زانیارێن زندەتر بنێڕە وزاره الداخليه، الدليل الحقوقي الرسمي لسنه ١٩٣٦، بەغدا، ١٩٣٦، بپ ٩٠٥.

٣٩. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٨٧٤)، ١٥ ئیلۆنا ١٩٢٤ێ.

٤٠. هەر ئەو هژمارە.

٤١. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٨٧٧)، ٢٠ ئیلۆنا ١٩٢٤ێ.

٤٢. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٨٨١)، ٢٧ ئیلۆنا ١٩٢٤ێ.

٤٣. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٨٨٥)، ٤ چریا ئێکێ یا ١٩٢٤ێ.

٤٤. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٨٨٩)، ٣ چریا ئێکێ یا ١٩٢٤ێ.

٤٥. هەر ئەو هژمارە.

٤٦. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٩٠٩)، ١٧ چریا دووێ یا ١٩٢٤ێ.

٤٧. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٩١٦)، ٢٦ چریا دووێ یا ١٩٢٤ێ.

٤٨. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٩١٦)، ٢٩ ی چریا دووێ یا ١٩٢٤ێ.

٤٩. ئەو پەیمان ژ سێ پشکان پێك دهێت: پشکا ئێکێ بەحسێ توخیبێ ل ناڤبەرا هەردو دەولەتان و پشکا دووێ بەحسێ سیاسەتا هەڤسوییاتییەکا خۆش ل ناڤبەرا هەردو دەولەتان و پشکا سێێ ژی بەحسێ حوکمێن گشتی دکەت، بۆ زانینیا دەقێ پەیمانێ و پشك و ماددێن وێن بنێڕەك رۆژنامەیا (الوقائع العراقيه)، هژمارە ٤٤٨، ٣٠ ی خزیرانا ١٩٢٤ ێ، عبدالرزاق الحسنی، ژندەرێ بەرێ، بەرگێ ٢، بەرپەرێ ٦٦ و پشتی وی بەرپەری.

٥٠. جاسم محمد خضير الجبوري، سعيد الحاج ثابت نشاطه الوطني و القومي، نامەیا ماجستێرێ یا ل سالا ٢٠٠٠ێ پێشکێشی پشکا دیرۆکێ یا کولیژا ئادابێ یا زانکۆیا مووسل هاتییە کرن، بپ ٦٦.

٥١. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٣٣)، ٢٤ ی چریا دووێ یا ١٩٢٨ێ.

٥٢. هەر ئەو هژمارە.

٥٣. هەر ئەو هژمارە.

٥٤. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٨٤)، ٢٤ گولانا ١٩٢٩ێ.

٥٥. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٨٨)، ٥ خزیرانا ١٩٢٩ێ.

٥٦ رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٦٣٩)، ١٦ چریا ئێکێ یا ١٩٢٩ێ.

٥٧. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٦٤٤)، ٣٠ چریا ئێکێ یا ١٩٢٩ێ.

٥٨. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٣٩٠)، ٢٧ خزیرانا ١٩٢١ێ.

٥٩. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٧٩١)، ٧ خزیرانا ١٩٢٤ێ.

٦٠. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٦٩٩)، ٢٣ نیسانا ١٩٣٠ێ.

٦١. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٧١٠)، ٣ خزیرانا ١٩٣٠ێ.

٦٢. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٧١٢)، ١٠ خزیرانا ١٩٣٠ێ.

٦٣. (العراق)، رۆژنامەیەکا رۆژانەیا ئەدەبی، سیاسی و ئابوورییە، خودانێ وێ حکۆمەتا داگیرکەرا بەریتانی بوو، پاشی خودانێ وێ رەزوق غەننام بوو، ل ٣١ تیرمەها ١٩٢٠ێ دەرکەڤتییە، نەخاسمە پشی دانانا حوکمێ نیشتمانی ل ٢٣ تیرمەها ١٩٢١ێ و ل

داویێن سالا ١٩٣٢ێ راوەستیایە، پاشی دوبارە ل ٧ شواتا ١٩٣٤ێ دەرکەڤتییە، ل ١٧ کانوونا ئێکێ ١٩٥٤ ێ ئمتیازا وێ هاتییە هەلوەشاندن، بنێرە: زاهدە ابراهیم، دلیل الجرائد والمجلات العراقیە ١٨٦٩-١٩٧٨، بەغدا، ١٩٨٢، بپ ١٧٨.

٦٤. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٧١٤)، ١٦ خزیرانا ١٩٣٠ێ.

٦٥. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٧٢٦)، ٢٣ تیرمەها ١٩٣٠ێ.

٦٦. بۆ ڤی بابەتی، بنێرە: وصفیە محمد شیخو السندی، بەرپەرێن ٤٢٦-٤٢٧.

٦٧. بۆ نێرینا بابەتێ وێ داخوازیێ بنێرە: ئەحمەد خواجە، چیم دی. سلێمانی، ٢٠٠٣، بەرگێ ٣، بپ ٨٠. سروە اسعد صابر، کوردستان الجنوبیة ١٩٢٦-١٩٣٩، دراسة تأریخیة سیاسیة، سلێمانیێ ٢٠٠٦، بەرپەرێن ١١٧-١١٨.

٦٨. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٣٧٧)، ٢٥ ئادارا ١٩٣٠ێ.

٦٩. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٣٨٣)، ٣٠ خزیرانا ١٩٢١ێ.

٧٠. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٤٢٩)، ٣٠ تیرمەها ١٩٢١ێ.

٧١. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٤٣٦)، ١٤ چریا ئێکێ یا ١٩٢١ێ.

٧٢. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٥٢)، ٢٦ کانوونا دووێ ١٩٢٩ێ.

٧٣. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٦٥)، ١٨ ئادارا ١٩٢٩ێ.

٧٤. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٨٠)، ٤ گولانا ١٩٢٩ێ.

٧٥. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٨٧)، ٣٠ خزیرانا ١٩٢ێ.

٧٦. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٩٠)، ١١ خزیرانا ١٩٢٩ێ.

٧٧. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٦١٦)، ١٩ تەباخا ١٩٢٩ێ.

٧٨. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٣٤٥)، ٩ ئادارا ١٩٢١ێ.

٧٩. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (٧٨٧)، ٢٢ ئادارا ١٩٢٤ێ.

٨٠. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٣٧)، ٢٧ چریا دووێ ١٩٢٨ێ.

٨١. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٥٦٥)، ١٨ ئادارا ١٩٢٩ێ.

٨٢. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٦٤٤)، ٣٠ چریا ئێکێ ١٩٢٩ێ.

٨٣. بەرکەڤری: گوندەکێ ناحیا سلێڤانەیی یە ل قەزا زاخۆ.

٨٤. رۆژنامەیا (الموصل)، هژمارە (١٧٤٨)، ٢٠ ئیلۆنا ١٩٣٠ێ.

# سەرێ ئامێدیێ Ser Amadia چەند وێنەک ژ کەمپا هاڤینێ یا هێزێن ئاسمانی یێن مەلکی ل کوردستانا عیراقێ *

پ.د. برگێت ئامان
وەرگێران: حازم جاسم

هێزێن ئاسمانی یێن شاهێ بریتانی (راف RAF) ل ناڤبەرا سالێن ۱۹۳۱ تا ۱۹٥٤ جهەکێ بێهنڤەدانێ بوو خۆ د ناڤ چیایێ مەتینیێدا، ل هنداڤ باژێرێ بچویکێ ئامێدیێ ل باکوورێ عیراقێ دانابوو[1]. ئەڤ کەمپا هەنێ ب ناڤێ سەرێ ئامێدیێ بوو، ب تنێ د سالێن شەرێ جیهانێ یێ دوێ دا ژ سالێن ۱۹٤۰ هەتا ۱۹٤۳ هاتبوو گرتن؛ و ب نەمانا هێزێن تیپێن لیڤی دسالا ۱۹٥٥ دا ئەڤ کەمپە ب داویهات و هاتە گرتن.

وێنەکێ هاتییە گرتن ژ لایێ ئەندامێ راف، ئێرست هولمس، ژهێزین لیڤی ب جلکێن وانە، یێن سەیر د دەمێ بەرهەڤیێ دا، ئەڤ وێنەیە د سالا ۱۹۳۰ێ دا هاتیە گرتن (وێنە ۱).

ژ لایەکیڤە چەکدارێن بریتانی ل عیراقێ د هەیڤێن گەرمدا ژ نیسانێ هەتا چریا یەکێ ل ڤێرە بێهنا خۆ ڤەددا، ژ بەر هیناتییا دەڤەرێ، ژ لایەکێ دیڤە هێزێن دگوتنێ تیپێن لیڤی، یێن کو چەکدارێن وانە ژ خەلکێ وەلاتی بوون ل ڤێرە دمان و کار دکرن وەک پاسەوان یان کۆمکرنا زانیاریا. ل سالا ۱۹۱۹ چەندین هێزێن ناڤخۆیێ وەلاتی(پێکهاتبوون ژ عەرەبان، مارش عەرەبان، کوردان، تورکمانان و ئاشۆریان)، یێن ژ سالا ۱۹۱٥ هاتبوون دامەزراندن بۆ پشتگیریا هێزێن بریتانی و هندی، هاتنە کۆمکرن ل ژێر ناڤێ لیڤی یێن عیراقێ، و ل ۱۹۲۲ کەتنە بن فەرمانا هێزێن ئاسمانی یێن شاهی راف RAF. هەر دڤێ سالێدا چەکدارکرنا عەرەبان بۆ ڤان هێزا هاتە راوەستاندن، دا کو چەکدارێن لەشکەرێ عیراقێ یێ نوی ژوانە بهێتە دانان. ژمارا فەلان دناڤ هێزێن لیڤی بەردەوام زێدە دبوو و شیان سەربەخۆیا خۆ ب پارێزن هەتا گولانا سالا ۱۹٥٥ دەمێ هێزا لیڤی نەمای پترین ژوانە کەتنە ناڤ هێزێن لەشکەرێ عیراقێ.

هێزا لیڤی بۆ جارا ئێکێ هاتە ب کارئینان بۆ دەستەسەرکرنا سەرهلدانا کوردان ل ۱۹۱۹ێ ل ئامێدیێ، ئەڤ سەرهلدانە هەتا نهو د چ دوکومێنتێن بریتانی نە هاتییە بەحسکرن[2]. ژمارەکا مەزن ژ کومپانییا هندی ل ژێر فەرمانا بریتانی بوونە قوربانیێن ڤان شەران، دەمێ کەتینە کەمینا کوردان ل گەلیێ مزویرکا[3].

سەرێ ئامێدیێ ناڤەکێ کوردییە، دبێژنە سەرێ چیایێ(لوتکە) یێ ب رەنگ وەکی زینەکێ ل بلنداهییا گەلیێ شەریفا و گەلیێ مزویرکا. وێنەکێ

(وێنە ١)
لیڤی د بەرهەڤیێدا ل سەرێ ئامێدیێ، ١٩٣٨-١٩٣٩



(وێنەگر ئێرنست هولمس، ژ راف حەبانیێ، هولمس ١١٢.

(وێنە ٢)
كەمپا سەرێ ئامێدیێ، ل سنگی گولێن مەلەڤانیێ، نێزیک ١٩٣٧ ـ ١٩٣٩





(وێنە فیل كوپكوت، ژ راف بنگەهێ حەبانی‌یێ، كوپكوت ١٦).

فیل کوکپوت پارچەکێ ژ کەمپێ دیار دکەت. دڤی وێنەیدا ب بەرێن سپی هاتییە نڤێسین سەر ئامێدیا و هەرهوسا وێنێ هەلوی و تاجێ یێن کو سمبۆلێ هێزێن ئاسمانی یێن شاهینە، ئەڤ وێنە ل داوییا سالێن ۱۹۳۰ان هاتییە گرتن.(وێنە ۲)[٤].

دویراتییا جهی ژ باژێری سێ کیلومەترێن ئەسمانینە ژ لایێ رۆژئاڤایڤە. ئەڤ بلنداهییە دکەڤیتە سەر دارستاناندا ب بلنداهییا ۱۸۵۰ مەتران و عەردێ وی ژ کەڤرییە. دەوروبەر دبرن ژ گیایی داروباری و هوسا یا ئاسێیە ژ دارێن بەری یێن کەڤری و چلی و مازیان. ئەڤ دەڤەرە پرە ژ ئاڤێ و ل زڤستانا سارە و ل هاڤینا گەرمە.

سەرباز ژ ناڤەراست و باشووری عیراقێ ژ کەمپێن حەبانیێ، هنێدی، شەعبا و هتد دفرین بۆ مووسلێ و ژ وێرێ ب رێیا ٥ کاتژمێران ب ترومبێلێ دچوون هەتا گوندێ فەلان بێبادێ، یێ ئەڤرۆ نەمایی. ژ وێ ژی سەرباز دو هەتا دو کاتژمێر و نیڤا بەرەڤ بلنداهی دسەرکەفتن ب پێیا دناڤ گەلیێ شەریفا دا[٥]. بێبادێ پەیوەندییەک تایبەت هەبوو، ئەوژی ژ بەر وێ چەندێ، کو ژ سالا ۱۹۱۱ بنگەهێ مسیونارا ئاشووری یا ئێرتسبیشوفێ کونتەربوری ل وێرێ بوو و سەربازان ژی ژ خۆ رە ئاڤا کربوو و ل وێرێ دمان[٦].

وێنەکی دی یێ ئەندامێ لیڤی روبەرت نۆرمان، کو ل سالا ۱۹٤۸ هاتییە کێشان، جادا سیلاڤێ دیاردکەت، ئەو جهێ هەرێ خۆشێ سەیرانا دناڤ بێبادێ و ئامێدیێدا (وێنە ۳). ل پشتا وی باژێرێ ئامێدیێ ل سەر کەڤری دیاردکەت. د سنگێ وی ژیدا کەپرەک دیار دکەت، یێن کو ئەڤرۆ ژی ل هەمی

**(وێنێ ۳)**

**جادا سیلاڤێ دگەل جهەکێ سەیرانێ، ل پشت باژێرێ ئامێدیێیە.**



(وێنێ نورمان روبرتس ژ بنگەهێ راف حەبانیێە، روبرتس ۲٤٦)

(وێنێ ٤)
ستافێ بریتانی یێ نەخۆشخانێ و نەخۆشێن خەلکی دەڤەرێ ل بەرامبەر خیڤەتێ ل سەرێ ئامێدیێ، ١٩٥٤.



(وێنێ داڤید هاریسون ژ ژ بنگەهێ راف حەبانییە، هاریسون ٤٢٨)

دەڤەری دهێنە ئاڤاکرن[٧]. و هوسا دیار دبیت، کو ڤێرە ژوی سەردەمی هەتا ئەڤرۆ جهێ سەیرانایە.

جهێن سەیرانییا و ئەندامێن هێزێن لیڤی، یێن سەرپرشتییا کەمپێ دکرن ل دو جهێن ژهەڤجودا بوون. ل جهێ پشتێ نەخۆشخانەک هەبوو، تێدا نەخۆشێن مەدەنی ژی دهاتنە دەرمان دان. سوپاس بۆ داڤید هاریسون،

ئەو دختورێ سەربازی یێ بریتانی یێ حەز ژ ئاژەلا دکر، ئەو ل سالا ١٩٥٤ ل وێرێ ژیایە و پەرتووکەک نڤێسییە و ل سالا ١٩٥٩ ئەڤ پەرتووکە پەلاڤکرییە، دڤێ پەرتووکێدا وی نە بتنێ گەلەک بەحسێ کەمپێ کرییە، بەلکو بەحسێ دەڤەرێ و دەوروبەرێن کەمپێ ژی کرینە[٨]. ئێک ژ وێنێن ل ڤێرە هاتینە بەلاڤکرن ژی یێن وی نە، تێدا کارکەرێن نەخۆشخانێ، دیارن ژ جلکێن وانە دگەل ئاشوورییێن فەلە ل بەر دەرگەهێ خیڤەتا هاریکارییا نۆشداری (وێنە ٤).

ل ڤێ کەمپێ برەخ سینەمایەکێ ڤە، جهێ سەرشیشتنێ، وجهێ یاریا تەنسێ و گوڵێن مەلەڤانییا ژی هەبوون، ئەڤە ژی گەلەک د باڵکێش بوون بۆ خەلکێ دەڤەرێ، یێن کو تشتێ هوسا نەدزانین. وێنەیێن فیل کوپکوت و روی شێرلوک، هەردو ئەندامێن هێزا لیڤی ل حەبانیێ چەند دیمەنێک جودا یێن ڤان گولان ژ داویا سالێن ١٩٣٠ دا و دەستپێکا سالێن ١٩٥٠یاندا (وێنێن ٥ و ٦)

(وێنە ٥)
كەمپا سەرێ ئامێدیێ. لپێشیێ گۆلا مەلەڤانیا، نزیكی ١٩٣٩-١٩٣٧.



وێنەیێ پیل كوپكوت ژ ئەرشیڤا حەبانیێ.

(وێنێ ٦)
گولێن مەلەڤانییا ل سەر ئامیدیێ، یولی ١٩٥٢.



(وێنە، روی شورلوك ژ بنگەهێ راف حەبانیێ، شورلوك ٨)

(وێنێ ٧)
خواندیێن داوەتێ ل نێزیکی سەرێ ئامێدیێ، نێزیک ١٩٤٨ ـ ١٩٥٠،



رەنگە ١٩٤٨ێ (وێنە، نورمان روبەرتس ژ بنگەهێ راف حەبانیێ، روبەرتس ٢٥٠)

(وێنێ ٨)
پرا بلبل ل سەر زێیێ مەزن



(وێنە: دکتور موریس ژ بنگەهێ راف حەبانیێ، جونس)

(وێنەیێ ٩)
بنکەهێ پولیسی ئامێدیێ، نێزیک ١٩٣١ ـ ١٩٣٣



(وێنە جوهن رولف ژ بنکەهێ راف حەبانیێ، رولف ٣٨)

(وێنەیێ ١٠)
عەسکەرەکێ لیڤی د گەل دو زارۆکان. نیزیکی سالا ١٩٣٣-١٩٣١.



وێنەیێ جون رولف ژ ئەرشیفا حەبانیە. رولف ٣٦.

دیاردکەن.

وێنەکێ ئەندامێ راف ێ نورمان روبەرت داوەتیێن داوەتەکا ئاشوریا دیاردکەت دگەل بویکا دبن پێچێ ڤە هەر وەکی رەوشت ل وی دەمی. دیارە ئەڤ وێنەیە د سالا ١٩٤٨ێ دا هاتییە گرتن (وێنە ٧).

ئێک ژ جوانترین وێنێن سروشتی هاتیە گرتن ژ لایێ فەرمانبەرەکێ حەبانیێ، ناڤێ وی جونسە، تێدا پرا دبێژنێ (پرا بلبل) سەر زێیێ مەزنڕا دیاردبیت (وێنە ٨).

وێنەکێ دی یێ جوهن رولف، ئێک ژ ئەندامێن هێزا هنەیدی ژ دەستپێکا سالێن ١٩٣٠ان، کومەکا مرۆڤێن ب جل وبەرگێن فەرمی ل بەر دەرگەهێ بنکەهێ پولیسا یێ وی دەمی، کۆچکا ب رەخ دەرگەهێ دگۆتنێ دەرگەهێ سیمەرخا (وێنە ٩). وێنەکێ دی هەر یێ وی ئێک ژ ئەندامێن لیڤی دیاردکەت دگەل دو زارۆکان، رەنگە زارۆکێن وی بخۆ بن (وێنە ١٠).

(وێنێ ١١)
كومەكا ئاشوریا ژ بنكەهێ راف حەبانیێ یاریا تەپا دەستی (كرە الطائرە) دگەل خواندەڤانێن كوردێن ئامێدیێ دكەن ، گولانا ١٩٤٤



(وێنە ئەنڤیا وەردا ژ بنكەهێ راف حەبانیێ، وەردا ٥٨)

ئەو وێنێن ئەنڤیا وەردا (ڤەردا) یێ ئاشووری ژ سالا ١٩٤٤ێ گەلەك دگرنكن ب بهایێ خۆ وەك ژێدەرەك مێژوویی بۆ باژێرێ ئامێدیێ: وێنێ ١١ێ چەند سەربازێن ئاشووری دیاردكەت، یێن كو دگەل گەنجێن خواندنگەهێ یێن كورد یاریا باسكێن بال دكەن. (وێنێ ١٢ێ دگەل مامۆستا وخوێندكارێن خواندنگەهێ ئامادەیی)، كو هەمی بجلكێن رۆژئاڤاینە. وێنێ ١٣ێ وێنەكە ژ جادێ ل جهێ ئەڤرۆ نەخۆشخانە لێیە، ل پشت چیایێ مەتینی دیاردكەت، وێنێ ١٤ێ هاتییە گرتن بۆ بازارێ دگەل بەلكێن دارا ل سەر هەردو لایێن جادێ. دهەردو وێناندا جلو بەرگێن زەلامێن دەڤەرێ ب ئاشكەرایی دیاردبن. وێنەكێ دی گۆرستانا وی سەردەمی یا ئۆسمانی دیاردكەت، یاكو ئەڤرۆ نەمایە، و لوتكا بشێش ژ چیایێ مەتینی ل پشتە[٩]. وێنێن ١٥ و١٦ سەركەتنێ بۆ ناڤ باژێری دیاردكەن، د دەرگەهێ رۆژئاڤاییرا، ئەو دەرگەهێ ل سەدسالییا ١٣ێ هاتییە ئاڤاكرن. وێنێ ١٥ێ ئێكە ژ تنێ دو وێنێن نیاس بۆ دەرگەهێ رۆژهەلاتی، یێ كو ئەڤرۆ بەرزەبوی[١٠] دگەل هندەك زارۆكێن دەڤەرێ. وێنەكێ دی یێ وەردا كاڤلێن مەدرەسا ئیسلامی ل بن ئامێدیێ دیاردكەت، یا ژوی ڤە ئەڤە كاڤلێن دێرەكێنە[١١].

وێنەك مێژویی یێ پر گرنگ ئەو وێنێ هاتییە گرتن ژ لایێ جوهن رولف ڤەیە، یێ مە بەحس كری، ل سالا ١٩٣١. ئەڤ وێنەیە شێخ مەحمودی دیاردكەت، دەمێ خۆ دایە دەست بریتانییا (وێنە ١٨).

(وێنێ ١٢)
كاركەرێن ئاشوری دگەل قوتابی‌یێن كورد ل ئامێدیێ



گولانا ١٩٤٤ (وێنە ئەنڤیا وەردا ژ بنكەهێ راف حەبانیێ، وەردا ٧٤)

(وێنێ ١٣)
بازارا ئامێدیێ، گولانا ١٩٤٤



(وێنە ئەنڤیا وەردا ژ بنكەهێ راف حەبانی‌یە، وەردا ٦٠)

(وێنێ ١٧)
دەرگەهێ رۆژهەلاتی یێ ئامێدیێ، گولانا ١٩٤٤



(وێنە ئەنڤیا وەردا ژ بنكەهێ راف حەبانی‌یە، وەردا ٦٦)

(وێنێ ١٤)
بازارا ئامێدیێ، گولانا ١٩٤٤



(وێنە ئەنڤیا وەردا ژ بنگەهێ راف حەبانیە، وەردا ٦١)

(وێنێ ١٥)
دەرگەهێ رۆژئاڤایی یێ ئامێدیێ، گولانا ١٩٤٤



(وێنە ئەنڤیا وەردا ژ بنگەهێ راف حەبانیە، وەردا ٦٥)

(وێنێ ١٦)
سەرکەتن بۆ دەرگەهێ رۆژئاڤایی یێ ئامێدیێ، گولانا ١٩٤٤



(وێنە ئەنڤیا وەردا ژ بنگەهێ راف حەبانی‌یە، وەردا ٥٨)

(وێنێ ١٨)
شێخ مەحمود خۆ ددەتە دەست بریتانی‌یا. ئیلونا ١٩٣١



(وێنە جون رولف ژ بنگەهێ راف حەبانیێ، رولف ٥٤)

د سالێن پشتی شەرێ جیهانی یێ ئێكێ دا ئێک بۆ ژ مەزنترین كەسێن سیاسی یێن كورد دناڤ كوردێن عیراقێ و ئیرانێدا. پشتی پتر ژ ١٥ سالێن شەری و دانوستاندنا دناڤبەرا كورد و عەرەب وبریتانیيان‌دا وی دەست ژ وێ شۆرشا ب ناڤێ وی بەردا و هەروسا دەست ژ سیاسەتێ و ژناڤ وێنێ سیاسی بەرزەبوو.

چاڤكانی:

Amman, Birgit 2005/2005: kleine Geschichte der Stadt Amadiya. "Vom Streitbaren Fuersten, kurdischen Juden und grausamen Zeiten". Kurdische Studien 4 +5, S. 175 – 226.

Harrison, David Lakin 1959: Footsteps in the sand. London: Benn.

Wigram, William Ainger & Edgar Thomas Ainger Wigram 1922: The cradle of mankind. Life in eastern Kurdistan. 2. Auflage- London: Black.

## ژێدەر

☆ ئەڤ بابەتە حازمێ جاسم، ژ ئەلمانی كرییە كوردی، ژ ژێدەرێ كوڤارا «Kurdische Studien» هژمارا ٤ و ٥ (٢٠٠٤ - ٢٠٠٥)، بپ.٢٢٧ - ٢٣٨، بەلاڤبوویە.

١. بنگەهێ راف حەبانییە RAF Habbaniya Associaton یێ ل سالا ١٩١٧ هاتییە دانان گەلەک وێنەیێن ڤی سەردەمی دئەرشیڤێ خوەدا هەنە. ئەڤ جڤاكە ماڵپەرێ <http:www.habbaniya.org> برێڤە دبەت و ب بەردەوامی ب ئێككەفتنا سەربازێن بریتانی و ئاشوری و یان ژی پاش هاتی یێن وانە ساز دكەت. ئەڤ وێنە یێن ل ڤێرە هاتینە بەلاڤكرن هاتینە هەلبژاردن ژ وان وێنێن كو بۆ بۆ كەمپێ و دەوروبەرێن وێ هاتینە گرتن. سوپاسی‌یەكا تایبەت ژ بۆ دكتور كریستوفەر موویس، رێڤەبەرێ شەرەفی یێ ڤی بنگەهی، كو وی ئەڤ وێنێن ل ڤێرە هاتینە بەلاڤكرن ب مەرا داینە و ژبۆ هەر وێنەكی گەلەک زانیاریێن گرنگ و گۆتنێن دیرۆكی ل بارێ كەمپا سەرێ ئامێدیێ داینە. هەرهوسا سوپاسی بۆ ئەندامێن هێزا لیڤی یێن ئەڤ وێنە كێشاندین و بۆ میراتێن وانە یێن كو ئەڤ وێنە پاراستین و بەلاڤكرنا وانە د جڤاكا حەبانی‌یێدا.

٢. Wigram & Wigram ١٩٢٢: ٣٩٤

٣. Harrison ١٩٥٩: ١٨٧.

٤. بنێرە وێنێن و. كروس ژ هێزا حەبانیێ، سالا ١٩٣٩ێ. ل ئامەن ٢٠٠٤\٢٠٠٥: ١٨٤. وێنێ ٨.

٥. Harrison ١٩٥٩: ١٦٧.

٦. Wigram & Wigram ١٩٢٢: ٣٢١,٣٩٥.

٧. Harrison ١٩٥٩: ١٧٠.

٨. Harrison ١٩٥٩: ١٦٥ – ٢٠٠.

٩. بنێرە ئامان ٢٠٠٤\٢٠٠٥: ١٨٣، وێنێ ٧.

١٠. وێنەیێ دی ئەوە یێ ل سالا ١٨٩٧ هاتییە گرتن ژ لایێ لورد واركوورت، كو هێشتا دەرگەهـ دهاتە ب كارئینان. بنێرە ئامان ٢٠٠٤\٢٠٠٥: ١٨٣، وێنێ ٦.

١١. بنێرە ئامان ٢٠٠٤\٢٠٠٥: ١٨٣، وێنێ ٢٠.

# ژیانا ئایینی ل دەڤەرا بەهدینان*

**پ. د فەرسەت مەرعی**
**وەرگێران: سالح یوسف سوفی**

بێ گومانە عەشیرەتێ و پێکهاتێن وێ کاریگەرییەکا مەزن د بنەمایێ هزری و جڤاکی و سیاسیێ خەلکێ کوردستانێ ب گشتی و جڤاکێ بەهدینان ب تایبەتی هەیە، ژبەرکو دەڤەرا بەهدینان(بەهدینان) بابەتێ ڤێ ڤەکۆلینێ یە و تایبەتمەندییا خۆ د ڤی واری دا هەیە، جڤاکێ وێ ژ گەلەك عەشیرەتێن جودا جودا پێکدهێت کو هەر ئێك ژ وان تووماره‌کا مەزن د هەمی بیاڤێن جودا جوداییێن ژیانێ دا هەیە، ڤێجا ئەڤ عەشیرەتە ب درێژیا ب دەهان سەدسالییان ب رێیا رێکخستنا عەشیرەتی شیاینە پێکهاتەیا جڤاکی یا جڤاکێ کوردی بەرامبەری داگیرکەران بپارێزن و ئەڤە بوو ئەگەرێ وێ چەندێ ئەو بها و رەوشت و ستوون بهێنە پاراستن یێ هەر جڤاکەکێ مرۆڤایەتیێ یێ بزاڤا پێشکەڤتنێ دکەت ژێ دڤالا نینن، ژبەر هندێ، تشتەکێ ئاسایی یە بێژین کو جڤاکێ کوردی ل دەڤەرا بەهدینان یێ ژ لایێ جوگرافی ڤە ژ توخیبێ عیراقی - تورکی ژ باکوور هەتا رووبارێ دیجلە ل باشوور و ژ رووبارێ زێ یێ مەزن ل رۆژهەلات هەتا توخیبێ عیراقی - سوری ل رۆژئاڤا درێژ دبیت، ژ بەر هندەك تایبەتمەندییێن تێدا هەین ئەڤ جڤاکە جڤاکەکێ کێم وێنەیە د جۆرێ خۆ دا ژ بەرکو ئەو تایبەتمەندی د چ جڤاکێن عەشیرەتی یێن کوردی یێن هەڤسوو دا نینن، هەر بۆ نموونە، ئایین و ریتوالێن (شعائرێن) ئیسلامی د ناڤ ڤی جڤاکی دا رهێن خۆ کوور داهێلاینە، هەر ژ بەر هندێ ژی هزرەکا ئیسلامییا هەڤسەنگ و ناڤنجیخواز (ل دووڤ تێگەهێ هەڤچەرخ) یا دوور ژ توندرەویێ ل نك پەیدا بوویە و ئەڤ هزرە رەسەنییا ئیسلامییا دووری لادان ژ ئایینی و کارێ جهێ رازیبوونا خودێ و لایەنێ رۆحیێ دووری فێلبازی و دووری سەختەچیاتیێ هەتا توخیبەکی لێك خرڤە دکەت.

هەرچەندە ژی هژمارەکا رێبازێن سۆفیاتیێ(سۆفیگەراییێ) ل ناڤ هەنە، وەکی رێبازا (قادری) کو سەنتەرێن خۆ ل جهێن خوارێ هەنە: ل گوندێ بریفکا کو گۆرێ شێخ نورەددین بریفکی لێ هەیە، ل گوندێ رۆڤیا (ل باشوورێ ئاکرێ) ژی گۆرێ شێخ (اسماعیل الولیانی) لێ هەیە، هەروەسا گۆرێ

*- ئەڤ هەردو ڤەکۆلینێن دڤێ پشکێ دا هاتین بریار ئەو بوو د گەل مژارێن پێکهاتێن ئاینی و نەتەوەی ل بەرگێ داویێ جهێ خو بکرن، بەلێ ژبەر زێدەبوونا بەرپەرێن وی بەرگی و ب مەرەما راگرتنا هەڤسەنگیێ دناڤ بەرگێن ئینسکلۆپیدیایێ دا د داوی قوناغێن دیزاینێ دا مە ب باش دیت ڤان دو ڤەکۆلینان د گەل ڤی بەرگی بەلاڤ بکەین.



مەزارێ شێخولئیسلام عەلی کورێ ئەحمەدی کورێ یوسفێ هەکاری

شێخ عەبدولعەزیز کورێ شێخ عەبدولقادر گەیلانی ل گەلیێ ئاکرێ یە، ئەڤە سەرباری رێبازا نەقشبەندی کو دو سەنتەرێن سەرەکی ل تەکیا بامەڕنێ یا دکەڤیتە (رۆژئاڤایی ئامێدیێ) و ل تەکیا بارزان هەنە، لێ هزرا سۆفیاتیێ سەرانسەری دەڤەر نەڤەگەرت ژبەرکو نێزیکی باژێڕێ مووسل بوو کو چەندین خواندنگەهێن ئایینی لێ هەبوون و د پرۆگرامێن خۆ دا پشتا خۆ ب (قورئان و سوننەتێ) گەرم دکرن، هەروەسا ژ بەرکو پتریا قەزایێن بەهدینان ژ لایێ کارگێڕی ڤە ب درێژیا سەردەمێ شاهاتی و کۆماری هەتا ٢٧ی گولانا سالا (١٩٦٩)ێ سەر ب مووسلێ بوون، ئانکو هەتا دەمێ بڕیارا جڤاتا سەرکردایەتیا عیراقێ(مجلس قيادة الثورة العراقي) دەرکەڤتی کو باژێڕێ دهۆك ببیتە سەنتەرێ پارێزگەهەکێ یا پێکدهێت ژ پتریا قەزایێن کوردی یێن بەرێ سەر ب پارێزگەها مووسل ڤە.

ڤەرە ئاماژێ ب وێ چەندێ ژی بکەین کو پەیوەندییەکا موکم ل ناڤبەرا شێخێن سۆفیاتیێ و عەشیرەتێ هەیە، چونکی زۆرینەیا زانایێن ئایینێ ئیسلامێ(مەلا) ل باژێڕ و باژێڕك و گوندان دووڤکەڤتییێن شێخێن سۆفیاتیێ بووینە، لێ یێن دی یێن خودان هزرا سەلەفی ئەوێن کاریگەر بووین ب ڤێ پێلا ژ باژێڕێ مووسل یان ژ بەر گەلەك ئەگەران ژ سوریا هاتی، ئەو د حەزکری نەبوون، چونکی شێخان مەترسی ژێ هەبوو و ژ بەر دەستەلاتا خۆ ژ وێ پێلێ دترسییان.

ژ زانایێن پێشەنگێن رۆلەکێ دیار د بەلاڤکرنا مەزهەبێ محەمەد ئیدریسێ شافعی دا (ئەوێ ل سالا ٢٠٤مش/ ٨١٩ز وەغەرا داویێ کری) ل ناڤ کوردێن دەڤەرا بەهدینان دا هەین ئەڤێن خوارێ بوون:

(هەکاری)یێ شێخێ ئیسلامێ کو ئەو ژی شێخێ خودێناس (ابو الحسن علی بن احمد بن یوسف القرشي الهكاري) بوو یێ رەهـ ورڤشتێن وی دگەهنە

(عتبه بن ابی سفیان الاموی) (٤٠٩-٤٨٦مش/١٠١٨-١٠٩٣ز).

ئەو مرۆڤەکێ چاك و ژ خودێ ترس و خودێناس بوو، ئەو هاتە وەلاتێ کوردان و ل گوندێ (دارش ــ دێرەش) کو دکەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ بازێرێ ئامێدیێ ل وەلاتێ هەکاری (بەرێ گارەی) ئاکنجی بوو، ل وێرێ هندەك بنگەهـ و جهێن ڤەحواندنێ بۆ هەژار و قەنجان ئاڤاکرن و وی ل سەر رێبا شۆپپارێزان(سەلەفییان) هزرا خۆ دکر، د بابەتێن فیقهیدا ئانکو شەرعیدا (فەرعان) دا ل سەر مەزهەبێ شافعی بوو، وی گرنگی ددا دەستنڤیسان و خودان پەرتووك بوو، هەروەسا ژ بەرکو فەرمووده و ڤەگێران کارێ وی نەبوو، بەلکی پتر یێ نێزیکی خودێناسینێ بوو، سەنەدێن وێ بۆ ڤەگێرانا فەرموودەیان د لاوازبوون، ژ بەر هندێ، زانایێن فەرموودەیان (الجرح و التعدیل)* تەئکید ل سەر قەبوولنەکرنا ڤەگێرانێن وی بۆ فەرموودەیانکرن و گۆتن کو ئاخڤتنێن وی ناڤەرۆکێن پێکڤەنانە ل سەر ئەسانیدێن راست هاتینە چێکرن[1].

گەلەك قوتابییان ل بەر دەستێ وی خواندییە و هژمارەکا کەسانێن خودان زانست ژی ژ پەرتووکێن وی ڤەگوهاستینە، هەروەسا پێشنڤێژێن وەکی شێخێ ئیسلامێ (ابن تیمیه) و (الامام الشافعی) دەستخۆشی لێ کرینە و پەسنێ وی کرینە.

وی ماوەیەکێ درێژێ ژیانا خۆ ل ناڤ کوردان بوراندییە و پشتی وی کورێن وی بووینە کورد و بووینە فەقی و میر و هندەکان ژێ خۆ نێزیکی سولتان و شاهێن (بنی ایوب) کرینە، هەروەسا ئەو خواندنگەها ل گوندێ دێرەشێ دامەزراندی رۆلەکێ مەزن د بەلاڤکرنا مەزهەبێ شافعی ل ناڤ کوردێن بەهدینان دا هەبوو، نەخاسمە ژی کو وی دەمی (و نها ژی) خەلکێ دەڤەرێ ب چاڤەکێ مەزن و رێزگرتنێ لێ دنێرن و وەك وەلییەکێ چاکخوازێ خودان کەرامەت و زانا ل قەلەم ددەن.

شێخێ دووێ یێ دیارێ شافعی یێ رۆلەکێ مەزن د بەلاڤکرنا وی مەزهەبی دا ل ناڤ کوردان هەی (تاج العارفین ابو الفضل عدي بن مسافر الاموي الهكاري) (٤٦٧-٥٥٥ مش/ ١٠٧٥-١١٦٠ ێ زایینی) بوو، ناڤبری ل وەلاتێ شامێ ژ دایك بوویە و پێگەهشتییە، پاشی بۆ ب دەستڤەئینانا زانستی ل وەلاتی گەڕیایە و چوار سالان ل بازێرێ (شامێ) مایە، پاشی هاتییە بەغدا و دگەل خودێناسێن وێ یێن وەکی شێخ عەبدولقادر گەیلانی، (عقیل المنبجی)، (ابی محمد الشنبکی الکردی) کۆمبوویە و ماوەیەکی ژی ل مووسل و هەولێرێ بنەجهـ بوویە، پاشی قەستا چیایێن هەکاری (دەڤەرا بەهدینان) کرییە و بۆ خۆ خواندنگەهەك ل نیڤا دۆلەکا کوور یا ب ناڤێ (لالش) چێ کرییە و دەست ب رێنیشادان و وانەبێژیێ کرییە، ئینا کوردێن دەڤەرێ لێ خڕڤەبووینە و گەلەك باوەرییا خۆ پێ ئینانە[2].

شێخ عودەی هەروەکی د پەیاما وی (أعتقاد أهل السنة والجماعة) دا دیار دبیت باوەری ب رێبا شۆپپارێزان (سەلەفییان) هەبوو، وی شارەزایی د تایێن مەزهەبێ شافعی دا هەبوو، دووڤکەڤتی و شاگردێن وی ژی هەر ل سەر وێ رێچکێ چاڤ لێ کرینە کو پاشی ب (عەدەوی) و داویێ ژی (ئێزدی) هاتینە نیاسین... گەلەك مەزنە شێخێن سوننی پەسنێ وی کرینە، ژ وانا: شێخ عەبدولقادرێ گەیلانی (یێ ل سالا ٥٦١مش/ ١١٦٦ز وەغەرا داویێ کری)، شێخولئیسلام ئیبن تەیمیە (یێ ل ٧٢٨مش/ ١٣٢٨ز وەغەرا داویێ کری)، الامام الذهبي (یێ ل ٧٤٨مش/ ١٣٤٧ز مالئاڤایی یا داویێ کری)، الحافظ ابن کثیر الدمشقي (یێ ل سالا ٧٧٤مش/ ١٣٧٢ز مالئاڤایی یا کری) و... هتد.

ئەڤ هەردو شێخێن هەکاری، هەرچەندە ژ تەخا فەقییان نەدهاتنە هژمارتن، لێ (بێ گومان) رۆلەکێ مەزن د بەلاڤکرنا مەزهەبێ شافعی دا د ناڤ دووڤکەتییێن خۆ یێن کورد دا هەبوون، ئەڤە ژی ب رێبا هەردو جهێن خۆ یێن خواندنێ ل دێرەشێ و لالشێ کو وەکی دو خواندنگەهان بوون بۆ بەلاڤکرنا زانست و خودێناسی و رەفتارکرنێ، هەروەسا ب رێبا وان فەقی و زانایێن ژ خێزانێن وان هاتین.

ژ لایەکێ دیڤە، هەر ژ سەردەمێ عەباسی

خواندنگەهێن خۆسەر و یێن سەر ب مزگەفتان ڤە ل پتریا باژێر و باژێرك و هەتا ل گوندێن ڤەدەرێن کوردستانێ ب گشتی و دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی بەلاڤ ببوون و پتریا ڤان خواندنگەهان ژی یێن ئەهلی بوون و ب ئاوایەکێ خۆبەخش ژ لایێ زانا و شێخێن کورد (و یێن دی) ڤە دهاتنە دانان و ب رێڤەبرن یێن بۆ ب دەستڤەئینانا زانستی ل وەلاتان دگەریان و بەرەڤ ئاسۆیێ دچوون کو ئەو ژی پێشنڤێژێن ناڤدارێن وەلاتێن ئیسلامی یێن وەکی بەغدا و مسرێ و شامێ و حیجازێ و یێن دی بوون، هەتا پێگەهشتین و مۆلەتێن زانستی وەرگرتین، ئینا ڤەگەریانە وارگەهێن خۆ و هندەك جاران ب هاریکاریا میرێن چاکخواز و پتریا جاران ژی ب هاریکاریا کەسانێن خێرخواز و خەلکێ ئاسایی خواندنگەهـ دامەزراندن و هژمارێن زۆرێن زانستخوازان لێ خڕڤەبوون و ژ زانست و رەوشەنبیریا وان ڤەخوارن و مۆلەت و باوەرنامە ژێ وەردگرتن، هەروەسا پەرتووك و پشك ژێ وەردگرتن داکو پاشی ئەو ژی وەکی وان ل دووڤ وێ رێچکێ بچن، ب ڤێ چەندێ، وان خواندنگەهان ب درێژیا چەندین سەدسالیان رۆلەکێ مەزن یێ زانستی و رەوشەنبیری و جڤاکی د ناڤ جڤاکێ کوردی دا هەبوون.

وەسا دیارە ژی خواندنگەهێن کوردی هەر ژ دەسپێکێ گەلەك ب ئاوایێ وانەبێژیێ یێ وان خواندنگەهێن فەرمی کاریگەر بووینە یێن سولتانێ سەلجۆقی نظام الملك (یێ ل سالا ٤٨٥مش/ ١٠٩٢ز وەغەرا داویێ کری) دامەزراندین، نەخاسمە ژ لایێ ژێگرتنا مەزهەبێ ابو الحسن اسماعیل الاشعری ڤە (یێ ل سالا ٣٢٤ێ مالئاڤاییا داویێ کری) بۆ وانەگۆتنا ماددەیێن وەکی بنەمایێن ئایینی (اصول الدین) و بۆ هندێ کو ئەو مەزهەب ب مەزهەبێ (أهل السنة والجماعة) بێتە ل ڤەلەمدان، هەروەسا ژێگرتنا مەزهەبێ شافعی بۆ وانەگۆتنێ وەك ماددەیەکێ بنەما ئوسولی و تایێن فیقهێ، ئەڤە سەرباری گرنگیدانەکا مەزن ب رێزمان و پەیڤسازیێ (النحو والصرف) و رەوانبێژیێ بۆ ئامادەکرنا زانایێن باشێن کورد کو زمانێ عەرەبی بزانن و بشێن د دەقێن شەرعی یێن د زمانێ عەرەبی دا بگەهن، ژ بەر هندێ، زانایێن مە ئەڤ زانستێن هاریکار بۆ تێگەهشتنا زانستێن شەرعی ب (علوم الاله) ناڤ دکرن.

ئەگەرێ ئێکسەرێ کاریگەربوونا خواندنگەهێن کوردی ب خواندنگەهێن فەرمی، ژ بەر هندێ بوو چونکی پتریا زانایێن کوردێن ئەڤ خواندنگەهە دامەزراندین و مۆلەت داینە قوتابییان، ل بەر دەستێ وان شێخان خواندینە یێن ل خواندنگەهێن فەرمی خواندین و ئەڤە ژی ژ زنجیرا مۆلەت و باوەرنامەیێن زانایێن کورد دیارە و مۆلەتێن پتریا وان بۆ زانایێن وەکی: امام الحرمین الجوینی (یێ ل ٤٧٨مش/ ١٠٨٥ز وەغەرا داویێ کری)، ابی حامد الغزالی (یێ ل ٥٠٥مش/ ١١١١ز مالئاڤاییا داویێ کری)، الفخر الرازی (یێ ل ٦٠٦مش/ ١٢١٠ز وەغەرا داویێ کری) ڤەدگەرێن، ئەڤە ئەو بوون یێن د زانستێ ئاخڤتنێ (علم الکلام) دا کار کرین و دووڤکەڤتییێن هەردو مەزهەبێن ئەشعەری بوون د بنەما دا و شافعی بوون د فروعان دا.

ئەڤە ژی مەسەلا بەلاڤبوونا ڤان هەردو مەزهەبان ل ناڤ زانایێن کورد و ل خواندنگەهێن کوردی وەك مەسەلەیەکا میتۆدی هەر ژ سەدسالییا ٦مش/ ١٢ز بۆ مە دیار دکەت، بۆ زانین ژی، ئیمامێ شافعی (خودێ ژێ رازی بیت) د بنەما دا نە یێ ئەشعەری بوو، بەلکی ل سەر رێیا شۆپپارێزان (سەلەفییان) دچوو هەروەکی زانایێن ڤەکۆلەر ئەڤ چەندە پشتراست کری.

ژبەر هندێ، خواندنگەهێن فەرمی و نەفەرمی یێن ل دەڤەرێن کوردستانێ ب گشتی و ل دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی بەلاڤبووین، نێزیکی نەهـ سەدسالییانە پشتا خۆ ب مەزهەبێ شافعی وەك مەزهەبەکێ فەرمی گەرم کرینە، هەروەسا ژ بەرکو پەرتووکێن فیقهی ل دووڤ ڤی مەزهەبی هاتینە نڤیسین و ل ناڤ ڤان خواندنگەهان هاتینە خواندن، هەروەسا ژ بەرکو زانا و دادوەر و موفتی یێن ل وەلاتێن جیهانا ئیسلامی بەلاڤبووین دەرچوویێن ڤان خواندنگەهانە

و دگەل خۆ ئەڤ مەزهەبە بەلاڤكرییە، د هزرا موسلمانان دا ناڤێ كوردان ب مەزهەبێ شافعی ڤە هاتییە گرێدان.

هەروەسا دەمێ پێداچوونێ ب پەرتووكێن ل سەر دیرۆكا مەزهەبێ شافعی دكەین، هەروەكی هندەك پەرتووكێن (ئوسول و فەرعان) ژی بەحس كرین، دێ ناڤێن گەلەك پەرتووكان بینین كو خودانێن وان كوردن یان ئەون یێن ل وەلاتێ كوردان ئاكنجی بووین و دەرچوویێن خواندنگەهێن وێ نە، رامانا ڤێ ژی ئەوە كو شوونتبلێن زانایێن كورد د ڤی چارچوڤەی دا دیار و بەرچاڤن، ل ڤێرە ژی من پێخوشە ئاماژەیەكا سەرپێ بكەمە ناڤێن هندەك زانایێن ناڤدار كو هندەك ژ وان دكەڤن و هندەك ژی دنوونە، هەر بۆ نموونە، ژ وان زانایێن شوینوار (پەرتووك و دەستنڤیس) د ئوسولێن فیقهێ شافعی و تایێن وێ دا هەین ئەڤێن خوارێ نە:

شرۆڤەكەر شهابەددین ئەحمەد كورێ ئەحمەدێ هەكاری (ل سالا ٧٦٤ مش/ ١٣٤٥ ز وەغەرا داویێ كرییە.

شێخێ شێخێن عیراقێ مەلا یەحیایێ مزووری (ل سالا ١٢٥٢ مش/ ١٨٣٦ ز مالئاڤایی یا داویێ كرییە).

## ئێك: تەكیایێن سۆفیاتیێ ل دەڤەرا بەهدینان:

هەكە خواندنگەهێن زانستی ئەو بن كاری بۆ پەروەردەكرنا ئاقلی و چاككرنا دەروونی و ئاراستەكرنا مرۆڤی بۆ باشیێ بكەن، سۆفیخوازی نەلڤین و تەمبەلی و خاڤیێ د دەروونێ مرۆڤی دا پەیدا دكەت، هەروەسا گیانێ خۆ هێلانێ ب هیڤییا ئێكێ دی ڤە و گیانێ خۆڕادەستكرنێ ژی تێدا هەیە، ئانكو ئەو كەس د ژیانا خۆ دا دبیتە كەسەكێ نیڤ ئیفلیج بووی.

ژ بەركو كورد گەلەك حەز ژ ئایینی دكەن و زوو ب پرۆپاگەندەیێن مۆرەكا ئایینی هەین دهێنە سەركێشیكرن، بازارا سۆفیخوازیێ ل نك كوردان بازارەكا گەرم بوو، زانا ژی ل ناڤ كوردان هندی خودان زانستەكێ بەرفرەهـ و رەوانبێژ و هندی هێزا رازیكرنێ ل نك هەبیت، نەشێت وەكی خودان رێبازەكێ یێ ب ئاماژەیەكا نەدیار كۆنترۆلێ ل سەر هەستێن ب هزاران مرۆڤان دكەت، كۆنترۆلێ ل سەر هەستێن مرۆڤەكی بكەت، ژ بەر هندێ، سەركەڤتنا بانگخوازییا شێخان یا مسۆگەر بوو، بێی هندێ پێدڤی زاستەكی یان تێگەهشتنەكێ د ئایینی دا هەبن، بەلكی ئەو پێدڤی هندەك ئاوایان بوون كو ئەو تێدا دشارەزا بوون و ئاستێ سەركەڤتنا وان ژی ل دووڤ شارەزایی یا هەر ئێك ژ وان شێخان بوو.

ل دەڤەرا بەهدینان سێ تەكیایێن سۆفیاتیێ پەیدا بوون، یا ئێكێ: تەكیا بریفكا یا قادری[٣]، یا دووێ: تەكیا بامەڕنێ یا نەقشبەندی[٤]، یا سێێ: تەكیا بارزان، دشێین بێژین ئەڤ تەكیایە نێزیكی نیڤا سەدسالیا نوزدەی زایینی پەیدا بووینە و ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان چ ژێ نەهاتییە زانین و بەهدینانییان ل سەردەمێ میرگەها خۆ ناڤتێدانا وان تەكیان نەكرییە.

### تەكیا بریفكا یا قادری:

ئێكەمین كەسێ پێ رابووی كەسەكێ چاكخواز و دیندار بوو ناڤێ وی ناڤێ شێخ نورەددین بوو[٥].

خەلكی باوەرییەكا وەسا مەزن پێ هەبوو ب زەحمەتە بێتە سالۆخدان، ئەو ژ بنەمالەكێ یە یا خۆ ب (سەید) ل قەلەم ددا و ژ بازێرێ خەلاتێ (اخلاط)یێ باكوورێ كوردستانێ هاتییە، ناڤێ باپیرێ وێ بنەمالێ (شیخ شمس الدین قطب)ە كو چ ژ راستییا وی یان ژ ژیاناما وی نەهاتییە زانین، هەروەسا نەهاتییە زانین ژێ كا بۆچی ژێ ئەو هندە دوور مشەخت بوویە و بۆچی ل ڤی جهی ئاكنجی بوویە، وی پێنج كوڕ هەبوون، یێ نەخری شێخ زەینەددین بابێ شێخ نورەددین بوو، ڤی زەلامی بانگخوازییەكا بەرفرەها ئایینی ل چیایێن عەشیرەتا مزووری كر و خەلك ب دووڤ كەڤتن و باوەرییەكا باش پێ هەبوون، وان گەلەك كەرامەت و تشتێن سەیر و نەبەرئاقل ل سەر ڤەدگێڕان، تشتێ ئەم ژێ دزانین ئەوە كو وی دووڤكەڤتیێن خوونگەرم



تەكیا شێخ عەبدولعەزیزێ گەیلانی ل ئاكرێ

دديتن هەتا وێ پلێ خۆگۆریكرنێ د رێیا وی دا بكەن، وی هندەك سیستەمێن تایبەتی بۆ بەلاڤكرنا رێبازا خۆ دانان و هەتا ل مووسل ژی بۆ خۆ جێنشین (خلیفە) دانان، ل وێ باوەرێینە كو ئەو دوور بوویە ژ ناكوكیێن دەروونی یێن ل نك هندەك بانگخوازان هەی، ئەڤە ژی نیشانێ نەرمییا وی یە د رێباز و رەفتارێ خۆ دا و كەسێ تان لێ نەدایە و بوویە جهێ رازیبوونا خەلكی و خودان پێگەهـ ل ناڤ وان، لێ ڤێ رێبازا وی مەترسییەكا مەزن ل سەر جڤاكی هەبوو، هەكە كێمترین لادان ژێ چێ ببا.

ڤەكۆلەرەك دبێژیت: ڤان رێبازان، ب هەمی ناڤونیشان و حەز و پەیوەندی و تەكیا و مۆر و خەلوەتگەهـ و پاڕان و ستایشكرنێن خۆڤە، ژ ئالیێ بەلاڤكرنا شارستانییا ئیسلامێ و باژێڕیاتییا وێ و پاشی ژی د بەلاڤكرنا ئایینێ ئیسلامێ دا، هند كاریگەرییا خۆ ل سەر ئیسلامێ نەبوویە هندی شاندەكێ بازرگانی كاریگەرییا خۆ د (كانتۆن) و (كاشغر) و (گزیرتەیێن هندستانێ) دا هەی[1].

شێخ نورەددین نێزیكی ٤٠ سالان ل بریفكا ل سەر رێنیشادانا خەلكی یێ بەردەوام بوو هەتا سالا ١٢٦٣مش/ ١٨٤٧ز ێ وەغەرا داویێ كری، لێ پشتی مرنا وی و چوونا جێنشینێن وی، ئەو پەلا شێخی د هناڤان د هەلكری ڤەمریا، لێ نەڤیێن وی نەهێلان ئەڤ (كەلتۆرە)یێ باپیرێ وان بۆ هێلای بەرزە ببیت، ڤێجا ل گەلەك دەڤەرێن بەهدینان بەلاڤەبوون و تەكیا لێ دانان و دەست ب رێنیشادانێ كرن، ئینا هندەك ژێ وەك سەید دیار بوون و هندەكان ژی داخوازا شوونگرتنا وی كرن، هندەكێن دی ژی رێیا خرابیێ گرتن و ل سەر كیسێ وان زەنگین بوون، لێ خەلك هەتا نها ژی رێزێ لێ دگریت و چاڤێ خۆ ددەنێ ژ بەركو وان وەك سەید و بنەمالا پێغەمبەری و نەڤیێن (شێخ نورەددین) ل قەلەم ددەن، تەكیا بریفكا ژی دێ پێگەهێ خۆ د دلێ كوردان دا مینیت، هندی گومبەتا قۆچەیا وێ ل سەر پا ڤیت بیت!.

## تەکیا نەقشبەندی:

تەکیا نەقشبەندی ل سالا ١٨٧٣ز ێ ژ لایێ شێخ محەمەد کورێ شێخ تاهرێ نەقشبەندی هاتییە ئاڤاکرن و ئەو کرییە سەنتەرەك بۆ بانگخوازی و ڕێنیشادان و بەلاڤکرنا ڕێبازا نەقشبەندی ل دەڤەرا بەهدینان و دەردۆرێن وێ، ئەو ب خۆ ژی ب بنیات خەلکێ گوندێ (بەنستان) یێ ناحیا نێروە ڕێکانە، وی ڕێبازا نەقشبەندی ژ شێخ خالدێ نەقشبەندی[٧] وەرگرتییە دەمێ د ڤان چیایان ڕا دەربازبوویە گوندێ (نەهری) کو ل وێرێ تەکیا نەقشبەندی دانابوو و شێخ عوبەیدوللایێ نەهری کربوو جێنشینێ خۆ.

ڕێبازێن سۆفیاتیێ ژی وی دەمی ئەو ڕێکخستن و پێکهاتە و خواندنگەهـ و تەکیا(خانەقا) نەبوون یێن پشتی هنگی هەین، خودانێ ڕێبازێ ژی تنێ سۆفییەك بوو خودێپەرێسی ل خلوەتگەهـ یان ل خواندنگەها خۆ دکر و مریدێن خۆ هەبوون و هندەك ژێ د خزمەتا وی دا بوون، لێ دەمێ حەز ل سەر سۆفیخوازیێ زێدە بووی و مریدێن وان زێدە بووین، تەکیا دامەزراندن و خۆ ب مەزناهیێ ئینانەدەرێ و دەسەلاتا وان بەرفرەهـ بوو و پێگەهێ وان مەزن بوو و بوونە خانەدان، لێ مالا (شێخێ بامەڕنێ) ب ڕەفتارباشی و ناڤ ودەنگباشی و چاکخوازیێ هاتنە نیاسین و کەسێ خرابی نەگەهاندە ناڤداریا وان نە ل سەردەمێ شێخ تاهر و نە ل سەردەمێ شێخ محەمەدێ کورێ وی نە ژی ل سەردەمێ شێخ بەهائەددین کو شێخاتیا وی نێزیکی ٦٠ سالان ڤەکێشابوو، ڤێ مالێ نە بۆ ئایینی ب تنێ، بەلکی بۆ سەرۆکاتیێ ژی کار و خەبات دکر و ل ناڤ کوردان و ل ناڤ ناڤەندێن حکومی بوو خودان دەسەلاتەکا ب هێز، حکومەتێ ژی ئەو بلند دکر و بۆ چارەکرنا گەلەك ئارێشەیێن کارگێری یێن نەدشیا چارە بکەت مفا ژ دەسەلاتا وی یا ئایینی دیت، ژ بەر هندێ، حکومەتێ پشتا خۆ پێ گەرم دکر و وی ژی بۆ دەمەکێ درێژ هەتا سەردەمێ مە ژی پشتا خۆ ب حکومەتێ گەرم دکر!.

رێ یێن بانگخوازیێ ل نك نەقشبەندیێ، گەلەك ب ساناهیتر بوون ژ رێ یێن بانگخوازیا ل نك ڕێبازێن دی هەی، هەروەسا وان بانگخوازی بۆ خۆدەرئێخستن و خۆ دیارکرنێ نە دکر و هەکە ئارمانجا ڕێبازێن سۆفیاتیێ بلندکرنا گیانێ سەرفەرازی و روومەتێ و خۆ ڤیانێ ل نك مرۆڤی بیت و وەلێ بکەت کو یێ هەست ب چالاکیا خۆ دکەت و ڕێبەرێ خۆ وەسا بلند و سەرکەڤتی ببینیت کو کەس ناگەهیتە پێگەهێ وی، ڤی تشتی ل نك ڤێ مالێ نابینین و ئەز دشێم د پەسنا واندا ڕێبازا وان ب سۆفیاتییەکا ئەرستۆکراتی ل قەلەم بدەم و شوینوارێن خانەدانیا وان ل سەر کارێن وان یێن ئاسایی و خودێپەرێسیێ ددیار و بەرچاڤن، ڕێبازێن سۆفیاتیێ ژی، چ نەقشبەندی یان یێن دی بن، نەشێن پێگەهەکی بۆ خۆ بنەجهـ کەن، هەکە ڕێبەرییەکا دنیایی ل سەر ڕێبەریا خۆ یا ئایینی زێدە نەکەن، هەکە نە، دێ پێگەهێ وان یێ لاواز بیت.

دەولەتا ئۆسمانی ب چاڤێ گومان و هشیاریێ بەرێ خۆ ددا سۆفییان و تەکیایێن سۆفیاتیێ و ب گەلەك مەترسیدار ددیتن[٨]، هەروەك دهاتەگۆتن ما دەولەتا (سەفەوی) ل کیرێ پەیدا بوویە، ئەرێ ما ژ خواندنگەها (شیخ صفی الدین الاردبیلی) ل ئەردەبیل پەیدا نەبوویە؟[٩] ما کی دبێژیت هەکە (العدویە) یا ئومەوی ل بەرامبەری شیعەتیێ یا (بدرالدین لؤلؤ) سەرکردایەتیا وێ دکر نەشکەستبا، ئەرێ دا دەولەتەکا خودان پێگەهـ د دیرۆکێ دا هەبیت؟ ژ بەر هندێ، مە دیت دەمێ ڤێ دەولەتێ بریاردای چاکسازییان د وەلاتێ ژێردەستێ خۆ دا بکەت ئەڤە ژی پشتی ڕێکخراوێن خێرخواز هاتینە راگەهاندن و حوکم ژێ ستاندی، وەسا ددیت زانا و خودان ڕێباز دەرەبەگێن ئایینی بن و ڕێکارێن وان پشکەکا مەزن ژێ ڤەگرت، سولتان مەحموودێ دووێ (ل سالا ١٨٣٩ز ێ وەغەرا داویێ کرییە) فەرماندا کۆمەك ژ زانا و دەروێشێن خودان تەکیا د رووداناژ ناڤبرنا ئینکیشاریێ (یەنیچیری Yeniçri) دا ل ستەنبۆل بهێنە کوشتن، ڤیا ژی ئەڤ کریارە ل دەرڤە ژی بێتەکرن، ڤێجا پشتی محەمەد پاشا ئینجە بەیرەقداری والیێ مووسلێ ڕێکارێن خۆ ل مووسل و

تەلەعفەر و شنگالێ تمام کرین و ئامێدیێ ستاندی کو ستاندنا وێ بۆ وی یا ب زەحمەت بوو، زۆری ل کوردان کر و کورد ئێشاندن، وی وەسا ددیت خودان رێبازێن سۆفیاتیێ کورسیێن دەسەلاتێ یێن هەین و دڤێت ئەو کورسی بێنە پەلخاندن، ئینا شێخ تاهرێ نەقشبەندی خودانێ تەکیا بامەڕنێ و شێخ نورەددین خودانێ تەکیا بریفکا ڤەخواندنە گوندێ(گرعەرەب) ل سەر رووبارێ خازری کو ل وێرێ رێبەرێن یەنیچیری و ئاغایێن کورد ڤەدکوشتن(ژ وانا: عەلی بەگێ میرێ ئێزیدخانێ یێ ژ کوشتارا میرێ رواندز رزگار بووی) و سەرێن وان دهاڤێتنە د رووبارێ خازری دا، بەیرەقدار ل بەریوو چارەنڤیسێ شێخێ بامەڕنێ و شێخێ بریفکا ژی وەکی یێن دی لێ بکەت، لێ ژ بەر ئەگەرەکێ نەدیار گەردەنا هەردووان ئازا کر.

## دو: روودانێن پەیوەندی ب زانایێن بەهدینان ڤە هەین:

ل سالا ١٧٨٤ز ێ ئیسماعیل پاشایێ میرێ بەهدینان بڕیاردا خەلاتەکێ دراڤی بدەتە هەر کەسێ زانایێ ئایینی مەلا ئەحمەدێ زێباری بکوژیت، ڤێجا دەمێ مەلایێ ناڤبری بوویە مێڤانێ گوندەکێ ئێزدییان ل بنیا چیایێ مەقلووبی دەمێ ژ مووسل قەستا جهێ ژ دایکبوونا خۆ ل دەڤەرا زێبار دکر، خودانێ مالێ زانی ئەو کەسەکێ داخوازکرییە، لێ مەلایێ غەدرلێکری هەست ب غەدرا خودانێ مالێ کر و زانی هەر دێ هێتە کوشتن، ئینا د پەراوێزا پەرتووکەکا دگەل خۆدا کو ژ پەرتووکخانەیەکا مووسل کری بوو، نامەیەک بۆ حەسەن ئاغایێ سەرۆکێ عەشیرەتا زێبارییان نڤیسی و تێدا بەحسێ هۆیێن کریارا وێ غەدرێ کر و داخواز کر تۆلا وی ژ وی ئێزدیێ خایین بێتە ڤەکرن، ب راستی ژی وەسا چێ بوو و ئێزدیێ خودانێ مالێ ب هاریکارییا خێزانا خۆ، مەلایێ زێباری و یێ دگەل وی رەڤاندن ب وێ هیڤیێ داکو وی خەلاتێ دراڤی ب دەستڤە بینیت، وی ئێزدی پەرتووکێن ژ مەلایێ زێباریێ غەدرلێکری ب دەستڤەئینایین فرۆتنە پەرتووکخانەیەکا بازێرێ مووسل، لێ تشتێ باش ئەو بوو پەرتووک ژ لایێ رەوشەنبیرەکێ بازێرێ مووسل ڤە هاتبوو کڕین و پشتی نامەیا مەلایێ زێباری خواندی، ل بەر رۆناهیا وێ نامەیێ نامەیەک بۆ حەسەن ئاغایێ سەرۆکێ عەشیرەتا زێبارییان نڤیسی، ئینا ئاغای تۆلا مەلایێ زێباری ژ وێ مالا ئێزدی ڤەکر و گونەهبار کوشتن و خانیێ وان ژی سۆت[١٠].

ل سالا ١٨٧٨ ێ زایینی شێخ محەمەد کوڕێ شێخ عەبدوللایێ برایێ شێخ نورەددینێ بریفکی بەری ماوەیەکێ کێم ژ مرنا خۆ ژ گوندێ خۆ ژ بریفکا قەستا بازێرێ دهۆکێ کربوو و هژمارەکا باش یا زانایان ل بەر دەستێ وی دەرکەڤتبوون، دەمێ وەغەرا داویێ کری تەرمێ وی ل بازێرێ دهۆکێ ل دەڤەرا هنداڤی رووبارێ دهۆک هاتبوو ڤەشارتن و گومبەتەک ل سەر گۆڕێ وی هاتبوو ئاڤاکرن و هێشتا مایە و ناڤێ (تاخێ شێخ محەمەد) یان (تاخێ مەزاری) ل سەر جهێ ڤەشارتنا وی هاتییە دانان.

ل رۆژا ١٨٨٣/١١/١٦ ێ پەتریك ئیلیایێ دوازدێ (عبو الیونان) نامەیەك بۆ شەماشە یوسف دەلال ل سەر ئنیەتا (تاهر ئاغای) نڤیسی کو ل بەرە دەستێ خۆ دانیتە سەر دێرا کەڤن یا ل بەرامبەری مزگەفتا دهۆك یا مەزن، د وێ نامەیێ دا هاتبوو کو وی داخواز ژ شەماشە یوسف دەلال کرییە هەمی شیانێن خۆ بۆ مافێن دێرێ ب کار بینیت و دەست ژ بهۆستەکا وێ بەرنەدەت[١١].

ل سالا ١٨٩٩ێ دەسەلاتا ئۆسمانی شێخ محەمەد کوڕێ شێخ عەبدلسەلامێ بارزانی ژ گرتیخانا بازێرێ بەدلیسێ ئازاد کر و ل بازێرکێ بامەڕنێ بۆ مێڤانێ شێخ بەهائەددینێ نەقشبەندی، ل وێرێ ماقوول و ریهسپی و کۆمەکا مرید و دەروێشێن ژ تەکیا بارزان یا نەقشبەندی هاتین پێشوازییا وی کرن، ب ڤێ هەلکەڤتێ، شێخ بەهائەددین نامەیەك بۆ زانا مەلا عەبدلهادی ئەفندی مزووریێ ئاکنجیێ ناحیا ئەتریش هنارت، فەرە بێژین کو شێخ محەمەدێ بارزانی بابێ رێبەرێ کوردێ وەغەرکری مەلا مستەفایێ بارزانییە[١٢].

## سێ: هندەك زانایێن ناڤدارێن بەهدینان:

**١- حەجی مەلا ئەحمەد ئەفندی ئەتریشی:**

نەڤیێ مەلا یەحیا مزووری یە، زانایەکێ بەرکەڤتی بوو و د ئێك دەمدا کارێ سیاسی و قەنجیکاری دکر، باوەرنامەیا خۆ یا زانستی ژ بابێ خۆ یێ زانا مەلا عەبدلهادی ئەفندی ئەتریشی وەرگرتیە، ل مزگەفتا ئەتریش ل قەزا شێخان وانەبێژی و پێشنڤێژی کریە، سالا ١٣٦١مش/ ١٩٤١ز ل ئەتریش وەغەرا داویێ کریە[١٣].

**٢-مامۆستا مەلا ئەحمەد ئەفندی ئاکرەیی:**

ئێك بوو ژ مەزنە زانایێن سەردەمێ خۆ، خواندنا خۆ ل هەولێر و کەرکووك و کۆیە تمام کریە و باوەرنامەیا زانستی ژ مەلا محەمەد ئەفندی یێ کۆیی وەرگرتیە[١٤]، ل بارزان وانەبێژی و پێشنڤێژی کریە، پاشی ل ئامێدیێ د شەرێ جیهانیێ ئێکێ دا، پاشی ل گوندێ سپینداری ل ناڤ بەرواری ژێریا ل داویێ ل زاخۆ ئاکنجی بوویە، زانایێن دیار ل بەردەستێ وی رابووینە کو هژمارا وان ژ پێنجی زانایان زێدەتر بوو، ل سالا ١٣٧٨مش/ ١٩٥٨ز مالئاڤاییا داویێ کریە[١٥].

**٣- شێخ ئەحمەد بەرۆشکی:**

ئێك بوو ژ باشترین زانایێن دگەل برایێن خۆ ل گوندێ بەرۆشکێ پشکداری د وانەبێژیێ دا کری، هەر ل وێرێ پێشنڤێژی ژی کریە هەتا ل سالا ١٣٢٤مش/ ١٩٠٥ز وەغەرا داویێ کری[١٦].

**٤- مەلا ئەحمەد عەباسی:**

زانایەکێ بەرکەڤتی و کەسەکێ گەلەك خودێ نیاس بوو، وانەبێژی و پێشنڤێژی ل مزگەفتا زاخۆ کریە، سالا ١٣٣٣مش/ ١٩١٤ز) ل زاخۆ وەغەرا داویێ کریە[١٧].

**٥- مەلا ئەحمەد خێرەددین مەلا ئیسحاق**، ئێکە ژ زانایێن ئامێدیێ، شارەزایی د زانستێن جودا جودا دا هەبوویە، کار د وانەبێژی و پێشنڤێژیێ دا کریە[١٨].

**٦- مەلا ئیسماعیل ناڤشکی:**

ئێکە ژ زانایێن زیرەکێن ب رێیا خواندنا تایبەت باوەرنامەیا زانستی وەرگرتی، وەك پێشنڤێژ و وانەبێژ ل مزگەفتا زاخۆ هاتە دامەزراندن و قوتابییان مفا ژێ دیت، پشتی مرنا مەلا محەمەد عەبدولخالق ئاکرەیی، وەك پێشنڤێژ و وانەبێژ بۆ مزگەفتا مەزن یا دهۆك هاتە ڤەگوهاستن، سالا ١٩٨٨ێ هاتیە خانەنشینکرن و سالا ١٩٩٤ێ ل دهۆك مالئاڤاییا داویێ کریە[١٩].

**٧- شێخ حەسەن خۆرانی:**

ب هندێ ناڤدار بوویە کو هەمی زانستان ژ بەر دکەت، یێ نابینا بوو لێ ب باشترین ئاوا وانەبێژی دکر و ل ناڤ قوتابییان یێ ب ناڤ ودەنگ بوو، ل گوندێ (ئەرمشتێ) ل دەردۆرێن زاخۆ ئاکنجی ببوو، باوەرنامەیا خۆ یا زاستی ل سەردەستێ زانایەکێ کوردستانا ترکیا وەرگرتیە[٢٠]، ل دۆرێن سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٦ز وەغەرا داویێ کریە[٢١].

**٨- مەلا حسێن کورێ ئەحمەد سپینداری:**

هەر ژ دەسپێکا پێگەهشتنا خۆ حەزا ب دەستڤەئینانا زانستێن شەرعی یێن(نەقلی و عەقلی) ل نك هەبوو، یێ پێگۆتی بوو ب رحسڤکی و خودێناسیێ، بۆ ب دەستڤەئینانا زانستان ل ناڤەندێن ناڤدارێن زانستی ل باشوورێ کوردستانێ گەریایە، تبابەکا مەزن یا زانستان ل بازێرێ ساوبلاغ(مەهاباد) ل رۆژهەلاتێ کوردستانێ و ل باشوورێ کوردستانێ ب دەستڤەئینانە و باوەرنامەیا زانستی ژی ژ زانا حەجی مەلا ئەحمەد ئەفندی ئەتریشی وەرگرتیە، ل گوندێ زاویتە وەك پێشنڤێژ و وانەبێژ هاتیە دامەزراندن، قوتابی ژ کوردستانا ترکیا و سوریا و قوتابیێن عەرەبێن عیراقی دهاتنە نك وی، ب درێژیا ژیێ خۆ کار د وانەبێژیێ دا کریە و باوەرنامە داینە هژمارەکا قوتابییان پشتی هنگی بووینە زانا، ل سالا

١٣٨٣مش/ ١٩٦٣ز مالئاڤاییا داویێ كرییە و تەرمێ وی ل گوندێ زاویتە ل دەردۆرێن دهۆك هاتییە ڤەشارتن، وی حەز ژ سۆفیاتیێ كرییە، ل دووڤ گۆتنا (محەمەد زەكی)یێ كورێ وی[٢٢].

**٩- مەلا حەیدەر چەلی:**

خەلكێ گوندێ (چەلێ) یا ل توخیبێ باكوور و باشوورێ كوردستانێ ژ لایێ باكوورڤە، كەسەكێ زانا و ڤەنج و خودێنیاس بوو، ل گوندێ خۆ وانەبێژی و پێشنڤێژی كرییە، شیانێن چارەكرنا ئارێشەیێن ل ناڤبەرا موسلمانان هەبوون، هەتا فەلەیێن ل رەخ وروویێن گوندێ وی ژی بۆ چارەكرنا ئارێشەیان دهاتنە نك وی و ب حوكمێن وی رازی دبوون، تشتێ سەیر ژی ل نك وی ئەو بوو وی ب شەڤ و رۆژ جارەكێ ب تنێ خوارن دخوار، وی ب خۆ ل دۆرێن سالا ١٣٢٣مش/ ١٩١٤ ز گۆڕێ خۆ كۆلایە و سالا مرنا وی ب دروستی نەهاتییە زانین[٢٣].

**١٠- شێخ حەسەن خوركی:**

یێ نابینا بوو و قورئانا پیرۆز ژبەركربوو، ل گوندێ ئەرمشتێ و ل گوندێن زاخۆ وانەبێژی كرییە و ئەو ب خۆ ژی ب بنیات خەلكێ باكوورێ كوردستانێ یە، ل سالا ١٣٢٧ مش/ ١٩٠٩ ز مالئاڤایی یا داویێ كرییە[٢٤].

**١١- مەلا حسێن مووسا گویزی (الكوزی - الجوزی):**

مۆلەتا زانستی ژ زانا مەلا حسێن سپیندارى وەرگرتییە، ژیانا خۆ بۆ وانەبێژی و پێشنڤێژی و گۆتارخوونیێ تەرخان كربوو، سالا ١٩٩٩ێ ل بازێڕێ دهۆك وەغەرا داویێ كرییە[٢٥].

**١٢- مەلا خەلیل عومەر دێرگژنیكی:**

زانایەكێ خودێنیاس بوو، مۆلەتا خۆ یا زانستی ل سەر دەستێ مەلا حسێن سپیندارى وەرگرتییە، ژیانا خۆ د وانەبێژی و رێنیشادانێ دا بۆراندییە، ل سالا ١٩٧٥ێ ل دهۆكێ وەغەرا داویێ كرییە[٢٦].

**١٣- مەلا سەلیم ئەفندی كوڕێ مەلا عەبدلرەحمان زاویتەیی:**

خودان ناڤدارییەكا زانستی بوویە د زانستێن جودا جودا دا، ل مزگەفتا رێكان ل دهۆك وانەبێژی كرییە و ل سەردەمێ ئۆسمانی وەك دادوەرێ شەرعی ل ناحیا ئەتریش هاتییە دامەزراندن، گەلەك پەرتووكێن دەستنڤیس هەنە، گەلەك كەسانێن دیار ل بەردەستێ وی رابووینە، ژ وانا: مامۆستا (علی الجمیل الموصلی)، سالا ١٣٣٥مش/ ١٩١٦ز وەغەرا داویێ كرییە و ل گوندێ بریفكا هاتییە ڤەشارتن[٢٧].

**١٤- شێخ سالح دەرگەلی:**

ئێك بوو ژ بەركەڤتیێن ڤەنجێن خودێپەرێسێن خودێنیاس، ل گوندێ (ئێتووتێ) یا ب رەخ دهۆكێ ڤە وانەبێژی كرییە، پاشی ل سالێن داویێ یێن سەردەمێ حكۆمەتا ئۆسمانی وەك پێشنڤێژ و وانەبێژ ل مزگەفتا دهۆك هاتییە دامەزراندن، ل دۆرێن سالا ١٣٢٧مش/ ١٩٠٨ز وەغەرا داویێ كرییە، تەرمێ وی ل بن گومبەتا شێخ محەمەد ل دهۆك هاتییە ڤەشارتن[٢٨].

**١٥- حەجی مەلا تەها ئەفندی دهۆكی:**

زانایەكێ زیرەك بوو، وانەبێژ و پێشنڤێژ و دو سالان ژی بریكارێ وەقفێ بوو، پاشی بوو نڤیسەر ل دادگەها شەرعی، سالا ١٣٤٧مش/ ١٩٢٨ز ل دهۆك مالئاڤایی یا داویێ كرییە، زانایەكێ بیرتیژ بوو د فەریزەزانیێ(علم الفرائض) دا[٢٩].

**١٦- شێخ تەهایێ مایی:**

دادوەرێ دەڤەرا بەرواری بالا بوو، وانەبێژی و بانگهلدێری كرییە و ل دووڤ پەیڕەوێ نەقشبەندی جێنشین بوو، پاشی بوویە رێنیشاندەرێ ئایینی و شیرەتكار(واعز)، ئەو خودانێ پەرتووكێن (قلائد الفرائد فی علم العقائد) و (منهاج الوصول فی علم الاصول) و پەرتووكێن دی یێن سۆفیاتیێ، ل

سالا ١٣٣٧مش/١٩١٩ز ل دهۆك مالئاڤایی یا داوییێ کرییە[٣٠].

**١٧- مەلا تاهر خرومی:**

ئێکە ژ زانایێن بلیمەت، گەلەك زانایێن بەهدینان ل بەر دەستێ وی دەرکەفتینە، ژ گوندێ (خروە)یێ مزووریان قەستا زاخۆ کرییە و ل وێرێ مایە هەتا سالا ١٣٠٠مش/ ١٨٨٢ز وەغەرا داوییێ کری[٣١].

**١٨- شێخ تەها بریفکی:**

زانایەکێ ژێهاتی بوو و حەز ژ سۆفیاتیێ دکر، ل سەردەمێ ئۆسمانی وانەبێژی و پێشنڤێژی ل مزگەفتا حەجی مستەفا ل دهۆك کرییە هەتا ل سالا ١٣٣٦مش/ ١٩١٨ز ێ ل دهۆك مالئاڤایی یا داوییێ کری.

**١٩- مەلا شێخ زیائەددین:**

ئێك بوو ژ زانایێن سەردەمێ خۆ، کەسەکێ خودێنیاس و خودێپەرێس بوو، لێڤەگێرەك بوو بۆ فەتوادانێ ل دەڤەرێن هەردو عەشیرەتێن دۆسکی و گولی، ل گوندێ باتیفا ل قەزا زاخۆ وانەبێژی و پێشنڤێژی کرییە و هژمارەکا زۆر یا قوتابییان مفا ژێ دیتییە، ل سالا ١٣٨٢مش/ ١٩٦٢ز ێ ل ناحیا باتیفا ل قەزا زاخۆ وەغەرا داوییێ کرییە[٣٢].

**٢٠- مەلا عەبدلهادی ئەفندی ئەتریشی نەڤیێ مەلا یەحیا مزووری:**

زانایەکێ ڤەکۆلەر بوو و مۆلەتا زانستێن پێشینان (علوم الاولین) وەرگرتبوو، ڤی زانای ل خواندنگەها ئەتریش دەست ب وانەبێژیێ کرییە، گەلەك شاندێن ئێك ب دووڤ ئێکڤە یێن زانا و قوتابیێن زیرەك دهاتنە نك وی داکو ژکانیێن زانست و رەوشەنبیریا ئیسلامی ڤەخۆن، گەلەك زانایێن دەڤەرا بەهدینان ل خەلەکێن وانەگۆتنێن وی پێکەهشتینە و باوەرنامەیێن زانستی ل سەردەستێ وی وەرگرتینە، ل خواندنگەها ئەتریش ل سەر وانەبێژیێ بەردەوام بوو کو ئەو خواندنگەهـ ببوو پێشکەڤتیترین خواندنگەها ئایینی، ل سالا ١٣٣١مش/ ١٩١٢ز ل ئەتریش وەغەرا داوییێ کرییە و گۆرێ وی ل وێرێ یە، وی چەندین کۆمێنت (تعلیق) و پەراوێز ل سەر گەلەك دەستنڤیسان د زانستێن جودا جودا دا هەنە[٣٣].

**٢١- شێخ عەبدلرەحمان کورێ شێخ محەمەد عەلی ئەتریشی:**

ئێك بوو ژ شێخێن ل دووڤ رێبازا قادری دچوو، بۆ رێنیشادان و شیرەتکاریێ ل هەمی دەڤەرێ دگەریا و شیایە تبابەکا باش یا زانستێن شەرعی ب دەست خۆ بێخیت، ل خواندنگەها ئەتریش یا ناڤدار وانەبێژی کرییە، ل سالا ١٣٦٨مش/ ١٩٤٨ز ل مووسل وەغەرا داوییێ کرییە[٣٤].

**٢٢- حەجی عەبدوللا ئەتریشی:**

ئێکە ژ نەڤیێن مەلا یەحیا مزووری، زانایەکێ خودێنیاس بوو، ل سالێن داوییێ یێن ژیێ خۆ بۆ وانەبێژی و رێنیشادانێ ل ناڤبەرا (بامەرنێ، مەمانێ، بریفکا، دهۆك) دگەریا، قەستا دیمەشق کرییە و ل وێرێ ل سالا ١٣٣٣مش/ ١٩١٤ز مالئاڤاییا داوییێ کرییە[٣٥].

**٢٣- شێخ عەبدوللا بەرۆشکی:** ب بەرفرەهییا زانستێ خۆ و رەوشت بلندی و جوامێرییا خۆ هاتییەنیاسین، ماوەیەکی وانەبێژی کرییە، سالا ١٣٣٨مش/ ١٩١٩ ز وەغەرا داوییێ کرییە[٣٦].

**٢٤- مەلا مووسا و مەلا عیسا هەردو برا (دولی) ژ گوندێن زاخۆ:** دو زانایێن پرباوەر بوون، هەردووان پێکڤە باوەرنامەیا زانستی ژ مامۆستا مەلا ئەحمەد عەباسی ل مزگەفتا زاخۆ وەرگرتینە و وانەبێژی کرینە، د ژیانا خۆ دا مفا گەهاندینە قوتابی و موسلمانان، یێ ئێکێ دەمەکێ کێم پشتی ل سالا ١٩١٨ێ ئنگلیزی عیراق داگیر کری وەغەرا داوییێ کرییە، لێ یێ دووێ هەر وێ هەیامێ ب دەمەکێ کێم بەری برایێ خۆ وەغەرا داوییێ کرییە[٣٧].

**٢٥- مەلا عیسا ئیسماعیل گەلی رمانی،** ل سالا ١٩١٥ێ ل گوندێ گەلی رمانێ عەشیرەتا مزووریا ژ دایك بوویە، ل خواندنگەهێن کوردستانێ زانستێن خۆ وەرگرتینە و خواندنا خۆ ل سەر دەستێ مەلا حسێن سپینداری تمام کرییە و مۆلەتا خۆ یا زانستی ژێ وەرگرتییە، ماوەیێ ٥٠ سالان وانەبێژی و پێشنڤێژی و گۆتارخوونی ل مزگەفت و خواندنگەهێن مووسل و دهۆك کرییە، ل سالێن داویێ یێن ژیێ خۆ ل مزگەفتا مزووری بوو ل بازێرێ دهۆك، سالا ٢٠١٠ێ هەر ل دهۆك مالئاڤایا داویێ کرییە[٣٨].

**٢٦- مەلا عەبدلکەریم جزیری :** زانایەکێ سەرخۆ و تبعەت رحەت بوو، مۆلەتا زانستی ژ زانایێ مەزن مەلا حسێن سپینداری وەرگرتییە، وانەبێژی و پێشنڤێژی و گۆتارخوونی ل گوندێن دەردۆرێن بازێرێ دهۆك کرییە هەتا وەغەرا خۆ یا داویێ ل دۆرێن سالا ١٩٧٥ێ و هەر دهۆك هاتییە ڤەشارتن[٣٩].

**٢٧- مەلا عیسا شێخ محەمەد دێرگژنیکی،** ل سالا ١٩٤٣ ێ ل گوندێ (دێرگژنیکێ) یا دکەڤیتە دەڤەرا دۆسکی ژێری ژ دایك بوویە، زانست ل نك مەزنترین زانایێن کوردستانێ خواندینە، نها وانەبێژیێ ل خەلەکێن مزگەفتان و پێشنڤێژیێ و گۆتارخوونیێ ل مزگەفتا (الاعمار) دکەت[٤٠].

**٢٨- عەلی سەید ئیسلام شێخ یاسین،** ل سالا ١٩٣٦ێ ل گوندێ (باکرمە) ل قەزا زاخۆ ژ دایك بوویە، باوەرنامەیا خۆ یا زانستی ل سەر دەستێن مامۆستایێ مەزن مەلا ئەحمەد ئاکرەیی ل مزگەفتا زاخۆ و مەلا ئیسماعیل ناڤشکی وەرگرتییە، نها وانەبێژی و گۆتارخوونی و پێشنڤێژیێ ل مزگەفتا حەجی حەلیمایێ ل زاخۆ دکەت[٤١].

**٢٩- مەلا عەبدلرەحمان سالح،** ل سالا ١٩٢٠ێ ژ دایك بوویە، مۆلەتا زانستی وەگرتییە، ئێکە ژ لێڤەگێرێن فەتوادان و دادوەریا شەرعی ل بازێرێ زاخۆ، ل مزگەفتا حەجی عەبدولقادر ل زاخۆ وانەبێژیێ ل خەلەکێن زانستی یێن مزگەفتان دکەت[٤٢].

**٣٠- سەید عەلی سەید عەبدلحەمید شیلانی،** ل سالا ١٩٤٧ێ ل گوندێ (شیلان) یا دکەڤیتە بەر قەزا زاخۆ ژ دایك بوویە، خواندنا خۆ یا زانستی ل سەر دەستێ مەلا ئیسماعیل ناڤشکی تمام کرییە، کارێ وەرگێرانێ دکەت و وانەبێژی و گۆتارخوونی و پێشنڤێژیێ ل مزگەفتا مەلا ئەمین ل زاخۆ دکەت، نها موفتیێ بازێرێ زاخۆیە و شوینوارێن ناڤێن وان ل خوارێ هەنە:

١- (تفسير مختصر باللغة الكوردية)، ل بن چاپێ یە و ئێك بەرگە.

٢- تفسير مطول للقران باللغة الكوردية)، چەند پشکەکە د چەند بەرگەکان دا (دەستنڤیسە).

٣- وەرگێرانا پەرتووکا (الفتح القريب في الفقة الشافعي) (ب کوردی).

٤- پشکەکا (منهاج الطالبين في الفقةالشافعي) (قسم العبادات) (ب کوردی) [٤٣].

**٣١- مەلا ئۆسمان کورێ عەلی کەرافی،** ل سالا ١٩٢٧ێ ژ دایك بوویە و زانستێن خۆ ژ شێخێن کوردستانێ وەرگرتینە، ژ وانا: شێخ مەمدوح بریفکی، مەلا عەبدلرەحمان بارۆدی و مەلا حسێن سپینداری مۆلەتا خۆ یا زانستی ژی ژ زانا مەلا عەبدولهادیێ موفتی پێشنڤێژ و گۆتارخوونێ مزگەفتا حەجی مستەفای ل دهۆك وەرگرتییە، ل دواناوەندیا ئیسلامی و ل خواندنگەها ئایینی و ل مزگەفتا عەباسی ل بازێرێ زاخۆ وانەبێژیێ دکەت و چەندین شوینوارێن دەستنڤیس د رێزمان و پەیڤسازیێ (النحو والصرف) دا هەنە[٤٤].

**٣٢- مەلا عەبدولحەمید تاهر خرۆەیی،** باوەرنامەیا زانستی ژ عەبدوللا ئەفندی یێ چەلی ل لیوا ئەربیل وەرگرتییە، زانایەکێ ژێهاتی بوو و گەلەك زانست دزانین، نەخاسمە زانستێن ئایینی، وەك وانەبێژ و

پێشنڤێژ ل مزگەفتا (رێکان) ل دهوك كار كرییە، ل سالا ١٣١٦مش/ ١٨٩٨ز یێ ل دهوك مالئاڤاییێ یا داویێ كرییە.

**٣٣- شێخ غیاسەددین نەقشبەندی،** كورێ شێخ بەهائەددین نەقشبەندی رێبەرێ رێبازا نەقشبەندییە ل بەهدینان، سالا ١٣٠٧مش/١٨٩٠ز یێ ل بامەرنێ هاتییەسەردنیایێ، ل بامەرنێ سەر دەستێ سەیدا و زانایێن وێرێ دەست ب خواندنا ئایینی كرییە، پاشتر ل ئامێدیێ و مووسلێ خواندییە باوەرناما زانایێ ژ دەستێ مفتیێ ئامێدیێ محەمەد شوكری ئەفەندی و شوكری ئەفەندی وەرگرتییە، دەستوریریا شێخایەتیێ ژ بابێ خۆ شێخ بەهائەدینی وەرگرتییە، سالا ١٩٣٠ێ وەك نوونەرێ قەزا ئامێدیێ د جڤاتا نوونەرێن عیراقێ دا هاتییەهەلبژارتن و بەردەوام بوویە ل سەر ڤی ئەركی هەتا سالا ١٩٤٤ێ وەغەرا داویێ كری. زێدەباری زانایێ د وارێ ئایینی و شێخایەتیێ ل سەر رێچكا نەقشەبەندی كەسەكێ شاعر و رەوشەنبیر و خێرخوازبوویە، پشتەڤانی ل خواندنێ بەلاڤكرنا خواندنگەهان ل دەڤەرێ كرییە [٤٥].

**٣٤- شێخ فازل شۆشی،** زانایەك بوو جهێ رێزگرتنا هەمییان بوو، ل تەكیا بریفكا كارێ وانەبێژی و فەتوادانێ كرییە، هەتا سالا ١٣٢١مش/ ١٩٠٣ز وەغەرا داویێ كری و هەر ل تەكیا بریفكانی هاتییە ڤەشارتن [٤٦].

**٣٥- مەلا قاسمێ مایی (یێ نابینا)،** شاگردێ مەلا یەحیا مزووری یە، پشكداری د خەلەكێن وانەبێژیێ دا كرییە، ب فەتوایێن خۆ دژایەتیا ئیسماعیل پاشایێ میرێ بەهدینان دا كرییە، ئینا پاشای چاڤێن وی قۆقلاندن [٤٧].

**٣٦- مەلا محەمەد كورێ مەحمودێ بالەتەیی،** شارەزایی د گەلەك زانستاندا هەبوو، چوار زمانێن عەرەبی، كوردی، فارسی و توركی دزانین و هۆزان دگۆتن و ماوەیەكێ درێژ وانەبێژی كرییە، ل سالا ١٣٨٤مش/ ١٩٦٤ ز مالئاڤاییا داویێ كرییە [٤٨].

**٣٧- مەلا محەمەد ئەفندی كورێ عەبدولخالق ئاكرەیی،** شارەزاترین زانا و توێژەرێن سەردەمێ خۆ بوویە، خودان شیان بوویە د زانستێن عەقلی و نەقلی دا، باوەرنامەیا خۆ ژ زانا مەلا محەمەد ئەفندی جەلی ل خواندنگەها كۆیە وەرگرتییە، ل سالا ١٩٣٧ وەك وانەبێژ و پێشنڤێژ و گۆتارخوون ل مزگەفتا دهوك هاتییە دامەزراندن، ل سەر كورسییا وانەگۆتنێ روینشتییە و شاندێن قوتابییان ژ سەرانسەری دەڤەرێ هاتینە نك داكو ترارێن خۆ د كانیێن زانستێ وی بهەلینن، كۆمەكا مەزن یا زانایان ل بەر دەستێ وی دەركەڤتینە و باوەرنامە دایە گەلەكان، ل سالا ١٣٧٩مش/ ١٩٦٩ێ زایینی ل دهوكێ وەغەرا داویێ كرییە [٤٩].

**٣٨- محەمەد سالح كورێ ئەحمەد شەوقی كورێ سویغەتوللا ئەفندی،** هەر سێیان پۆستێ فەتوادانێ ل دهوك گرتییەدەست، سەرباری وانەبێژیێ، وەرگێرەكێ ماقوول و بەركەڤتی كەسانەكێ ئاقلمەند و زیرەك بوو و ل وی پۆستێ فەتوادانێ ما هەتا سالا ١٣٥١مش/ ١٩٣٢ز مالئاڤاییێ یا داویێ كری [٥٠].

**٣٩- مەلا محەمەد شەریف بەگێ بامەرنی،** ئەو ژ مالەكا زانست پەروەر بوو، ل گوندێ كێستە ل ناڤ بەرواری بالا ئاكنجی ببوو، زانایەكێ ژێهاتیێ نابینا و قورئانا پیرۆز و (الفیة)یا ابن مالك و (الكافیة و التلخیص) ژبەركربوون و گرنگی ددا زانستێن شەرعی و شارەزایی د زانستێن جودا جودا دا هەبوو، ل بامەرنێ وانەبێژی د خەلەكێن مزگەفتان دا كرییە و ب شیرەت (وەعز) و رێنیشاندانێن خۆ مفا گەهاندییە قوتابییان، ب سەر دیرۆكا وەغەرا وی یا داویێ هەلنەبووم [٥١].

**٤٠- مەلا محەمەد سەعید بامەڕنی،** وی د ئێك دەمدا گرنگی ب زانست و خودێنیاسیێ ددا، وانەبێژی و پێشنڤێژی ل بامەڕنێ کرییە، ل سالا ١٣٣٦مش/ ١٩١٧ز مالئاڤایی یا داویێ کرییە و تەرمێ وی ل بامەڕنێ هاتییە ڤەشارتن(٥٢).

**٤١- محەمەد شوکری موفتیێ ئامێدیێ،** زانست ل سەر دەستێ بژارەیەکا زانایان خواندییە، فەتوادان و گۆتارخوونیا مزگەفتا مەزن یا ئامێدیێ و وانەبێژی ل خواندنگەها ناڤدارا (قوبەهان) ل ئامێدیێ ب وی هاتینە راسپاردن، وی پەرتووکخانەیەکا مشتی پەرتووکێن گرانبها و دەستنڤیسێن دەگمەن هەبوو کو دیرۆکا وێ پەرتووکخانەیێ ڤەدگەڕێتە سەردەمێ سولتان حسێن وەلی یێ ل سالا ٩٨١مش/ ١٥٧٣ێ زایینی وەغەرا داویێ کری، ل سالا ١٣٢٤مش/ ١٩٠٦ز مالئاڤاییا داویێ کرییە(٥٣).

**٤٢- مەحموود ئەفندی ئامێدی،** ئێکە ژ نەڤیێن مەلا یەحیا مزوری، مۆلەت ژ حەجی عەبدوللا کۆیی وەرگرتییە، ناڤدارییەکا مەزن د زانستیدا پەیداکرییە، وی مەسەلێن مژەوی رۆن دکرن و چارە بۆ مەسەلێن تاری و نەبەرچاڤ ددیتن، وانەبێژی ل خواندنگەها نوویا ئامێدیێ کرییە، ل سالا ١٣٢١مش/ ١٩٠٣ز وەغەرا داویێ کرییە(٥٤).

**٤٣- مەلا مەحموود نهێلی،** خەلکێ (نهێلێ)یە کو سەر ب ڤەزا ئامێدیێ یە، تشتێ سەیر ل سەر ئەوە کو وی پشتی ژیێ ٣٠ سالیێ زانست وەرگرتییە و بوویە خودان مۆلەتا زانستی و وی دەمی بوویە زانایەکێ وەسا تبل بۆ بێتە درێژکرن، وانەبێژی کرییە و رێبازا قادری و پەروەردەکرنا دەروێشان ل دەڤەرا بەرواری ژێری بەلاڤ کرییە هەتا سالا ١٣١٦مش/ ١٨٩٨ز مالئاڤاییا داویێ کری(٥٥).

**٤٤- حەجی محەمەد پێشنڤێژێ دهۆکی،** زانایەکێ شارەزا بوو د زانستێن بیرکاریێ دا و تێدا دەستهەل و پێگەهشتبوو، مۆلەتا خۆ یا زانستی ژ زانا (عبدالله افندی العمری الموصلی) وەرگرتییە، وەرگێڕ ژ زانایێن ئینسکلۆپیدیایی بوو و شاندێن قوتابی و فەقییان قەستا وی دکرن، وانەبێژی و پێشنڤێژی و گۆتارخوونی ل مزگەفتا دهۆك کرییە، ل سالا ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز د رێیا حەجێ دا مالئاڤایی یا داویێ کرییە(٥٦).

**٤٥- شێخ محەمەد تاهر مایی،** ئێکە ژ مەزنە ژێهاتی و زانایان، وانەبێژی و بەلاڤکرنا رەوشەنبیریێ د هەمی زانستاندا ل ناڤ قوتابیێن خواندنگەها ئایینی یا مایێ کرییە کو ئێکە ژ گوندێن ئامێدیێ، یێ پڕ گەڕیان و پڕ هەڤدیتن بوو دگەل زانا و خودانێ گەلەك ڤەکۆلینێن زانستی بوو و تووژاندن د مەسەلەیێن ڤەکۆلینان دا کر، دەمەکێ کێم بەری سالا ١٩١٨ز وەغەرا داویێ کرییە و هۆزان ب عەرەبی و فارسی و کوردی دڤەهاندن(٥٧).

**٤٦- محەمەد تاهرێ بریفکی،** زانایێ ژێهاتی ئێکە ژ شێخێن رێبازا قادری، ل دەڤەرا ئەتریش و مزووری و هەر حەفت عەشیرەتان (العشائر السبعە) رێنیشاندەری کرییە، باوەرنامەیا زانستی ژ شێخ (محمد افندي الرضواني الموصلي) وەگرتییە، خەلەکێن وانەبێژیێ ل مزگەفتا (الرضوان) ل مووسل پاشی ل مالا خۆ کرینە، ل سالا ١٩٦٧ ێ وەغەرا داویێ کرییە(٥٨).

**٤٧- شێخ محەمەد ئەمین ئەتریشی،** ئێکە ژ شێخێن رێنیشاندەرێن رێبازا قادری، وی وانەبێژیا زانستێن شەرعی و عەرەبی دکر و شیرەتکارەکێ گەڕۆك بوو ل ناڤبەرا عەشیرەتێن دووڤکەڤتیێن شەریعەتی و رێبازا قادری هەتا مالئاڤایی یا خۆ یا داویێ ل سالا ١٣٣٥ ێ(٥٩).

**٤٨- مەلا محەمەد سەعید یاسین بریفکی،** ل کوردستانا عیراقێ و ترکیا و ئیرانێ ل دووڤ زانستی گەڕیایە هەتا زانستێن عەقلی و نەقلی ب دەستخۆڤە

ئینایین و مۆلەت ژ زانا مەلا ئەحمەدێ ئاكرەیی وەرگرتی، وانەبێژی ل مزگەفتا مەزن یا دهۆك كرییە و ب دەهان سالان قوتابی ل بن دەستی دەركەڤتینە، كەسەكێ گەلەك خودێنیاس و خودێپەرێس بوو، ل سالا ١٩٧٦ێ وەغەرا داویێ كرییە و ل دهۆكێ هاتییە ڤەشارتن، خودانێ گەلەك پەرتووكێن دەستنڤیسە، ژ وانا: (فضلاء بهدينان) یا ئەم ژێ هندەك ژ ڤان ژیاننامەیان وەردگرین[٦٠].

**٤٩- شێخ محەمەد بەرۆشكی،** ئێك بوو ژ زانایێن ناڤدار، گەلەك یێ زیرەك و تێگەهشتی بوو و هورببینییەكا مەزن د چارەكرنا كێشەیێن زانستی دا هەبوو، ئەو لێڤەگێرەكێ وانەبێژیێ و لێڤەگێرەك بوو بۆ قوتابیێن زیرەك، وی كۆمێنت ل سەر پەراوێزێن دەستنڤیسێن جودا جودا یێن د پەرتووكخانەیا خۆ دا هەنە، دەمەكێ كورت بەری سالا ١٣٢٤مش/ ١٩٠٥ز مالئاڤاییا داویێ كرییە[٦١].

**٥٠- شێخ مەمدوح بریفكی،** زانستێن ئایینی ل وارگەهێ خۆ ل گوندێ (بریفكا) خواندینە و بۆ ب دەستڤەئینانا زانستی قەستا دەڤەرا ئەربیل و كۆیە و كەركوك كرییە، باوەرنامەیا زانستی ژ مامۆستا ئەحمەد ئەفندی ئاكرەیی وەرگرتییە، ل تەكیا (النوریە) دەست ب وانەبێژیێ كرییە و قوتابیێن دەردۆر لێ كۆم بووینە، كەسەكێ خودان شیان و زیرەك و ئاقلمەند و دووربین بوو و پەرتووكخانەیەكا گرانبهایا دەستنڤیسان هەبوو، ببوو رێنیشاندەرێ رێبازا قادری ل كوردستانا تركیا و عیراقێ و پەرتووكەكا مەزن وەك فەرهەنگا كوردی هەیە كو هێشتا دەستنڤیسە، هۆزان ب زمانێن كوردی و عەرەبی ڤەهاندینە و چامەیێن جوان هەنە، ل سالا ١٩٧٦ێ وەغەرا داویێ كرییە و ل دهۆك هاتییە ڤەشارتن[٦٢].

**٥١- شێخ مەعروف دەرگەلی،** ئەو ل سەردەمێ خۆ ب زیرەكی و شیانێن زانستی و هووركاریێ د وان زانستان دا یێ ناڤدار بوو، ل گەلەك جهان ل دووڤ زانستی گەریایە پاشی ل خواندنگەها ئەتریش یا ئایینی یا ناڤدار ئاكنجی بوویە، مۆلەتا خۆ یا زانستی ژ زانا مەلا عەبدلهادی ئەتریشی وەرگرتییە، پاشی قەستا وارگەهێ خۆ كرییە و ل مزگەفتا گوندێ (دەرگەلێ) كو ئێكە ژ گوندێن زاخۆ كار كرییە، هژمارەكا زۆر یا زانستخوازان هاتینە نك وی و گەلەك مفا گەهاندییە موسلمانان و ئەو ژ سەیدێن گوندێ (گەلیێ رمان)ە كو ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا مزووری، ژ پسمامێن خێزانا بریفكییە و خێزانا وی بەری (١٠٠) سالان ژ (گەلیێ رمان) هاتبوو، ناڤبری ل سالا ١٣٢٤مش/ ١٩٠٦ز وەغەرا داویێ كرییە و تەرمێ وی هەر ل وی گوندی هاتییە ڤەشارتن[٦٣].

**٥٢- مەلا نەجمەددین كورێ مەلا ئەحمەد بابەكێ بامەرنی،** وەرگێر وانەبێژ بوو ل تەكیا نەقشبەندی ل بامەرنێ، ب چاكخوازی و خودێناسییا خۆ بەرنیاس بوویە، گەلەك مفا گەهاندییە قوتابیێن ل بەر دەستێ وی دەركەڤتین، ل سالا ١٣٦٩مش/١٩٤٠ز مالئاڤایی یا داویێ كرییە[٦٤].

**٥٣- هەیبەتوللا ئەفندی موفتیێ ئاكرێ،** ئێكە ژ نەڤیێن مەلا یەحیا مزووری، ژ مەزنە زانایان بوو، زانایێن دیار وانە گۆتینێ و ل دەسپێكێ وانەبێژ كرییە، ل سالا ١٣٢٤ مش/ ١٩٠٦ز وەك سەرۆكێ (مەعارف) هاتبوو دامەزراندن، ل سالا ١٣٤٣مش/ ١٩٢٤ز وەك موفتیێ ئاكرێ و وانەبێژێ مزگەفتا وێ یا مەزن هاتییە دامەزراندن، پاشی چوار جاران هەر ژ سالا ١٣٤٤مش/ ١٩٢٢ێ زایینی هەتا سالا ١٣٥٣مش/ ١٩٣٤ز وەك نوونەر هاتییە هەلبژارتن، ل داویێ ژی وەك ئەندامێ جڤاتا ریهسپیان (مجلس الاعیان) هاتییە هەلبژارتن و ل سالا ١٣٧٥مش/ ١٩٥٥ز وەغەرا داویێ كرییە و ل ئاكرێ هاتییە ڤەشارتن[٦٥].

**٥٤- مەلا یاسین بریفكی،** زانستێن عەقلی و نەقلی باش خواندینە، وانەبێژی ل مزگەفتا دهۆك كرییە و قوتابی و شاندان ژ دەڤەرێن ڤەدەر قەست

کرین، ب هوورکاریێ د شەریعەت و فیقە و فەتوادانێ دا یێ ناڤدار بوو، د هەمی قووناغێن ژیانا خۆ دا وانەبێژی و پێشنڤێژی دکر و فەتوا ددان و داخــوازا خێرێ و لێبۆرینێ ژ خودێ دکر، ل سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٦ز ل بازێرێ مووسل مالئاڤایی یا داوییێ کرییە و مۆلەتا زانستی ژ زانا مەلا عەبدوللا کۆیی وەرگرتییە[٦٦].

**٥٥- مەلا یاسین هیلالی گۆیی**، ل باشووری کوردستانێ ل سەر دەستێ هژمارەکا زانایێن زیرەك خواندییە و وەرگێر د زانستێن عەرەبی دا پێشەنگ بوویە و خواندنا خۆ د زانستان دا ل سەر دەستێ زانایێ مەزن مەلا حسێن سپینداری تمام کرییە و باوەرنامەیا زانستی ژێ وەرگرتییە، ل گەلەك خواندنگەهان وانەبێژی کرییە و ژ باشووری کوردستانێ مشەخت بوویە وارگەهێ خۆ یێ رەسەن ل باکووری کوردستانێ و هێشتا یێ پێشنڤێژی و وانەبێژیێ ل وێرێ دکەت[٦٧].

**٥٦- مەلا یوونس تەها زاخۆیی**، باوەرنامەیا زانستی وەرگرتبوو، د فیقهێ دا یێ زانابوو و د گەلەك زانستێن ئایینی دا یێ شارەزا بوو، د هەردو سەردەمێن ئۆسمانی و نیشتمانی دا دەمێ هەردوو ئەحمەدان (یێ عەباسی) و (یێ ئاکرەیی)[٦٨] وانەبێژی و پێشنڤێژی و فەتوادان ل زاخۆ دکر، وی وانەبێژی ل زاخۆ کرییە، ل سالا ١٣٤٧ مش/ ١٩٢٨ز وەغەرا داوییێ کرییە[٦٩].

**٥٧- مەلا محەمەد شەریف تاهر بانەسۆری**، سالا ١٩٤٩ێ ل گوندێ بانەسۆرا- ناحیا مانگێشێ هاتییە سەر دنیایێ، دەسپێکا خواندنێ ل خواندنگەهێن ئایینی دەسپێکرییە، پتریا خواندنێن وی ل مزگەفتا مەزنا زاخۆ و مزگەفتێن دهۆکێ خواندییە، سالا ١٩٧٤ێ ل زانکۆیا ئیسلامی ل بازێرێ مەدینێ- عەرەبستانا سعودی هاتییەوەرگرتن و سالا ١٩٧٨ێ خواندنا زانکۆیێ ب داوی ئینایە و وەك پێشنڤێژ ل مزگەفتا سەرسنکێ هاتییە دامەزراندن، پشتی ڤەکرنا مزگەفتا ئازادیی یا نها ل دهۆکێ ل دەسپێکا سالێن هەشتییان هاتییەڤەگوهاستن بۆ ڤێ مزگەفتێ و بەردەوامی ب ئەرکێ خۆیێ ئایینی دایە هەتا ل سالا ١٩٩٥ێ وەغەرا داوییێ کری و ل گورستانا شاخکێ ل دهۆکێ هاتییەڤەشارتن.

سەیدایێ مەلا محەمەد شەریف ل سالێن هەشتییان سەرۆکێ لیژنا هشیارکرنا ئایینی (اللجنة التوعیة الدینیة) بوو ل دهۆکێ، پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ بوویە ئەندامێ یەکەمین خولا پەرلەمانێ کوردستانێ خولا ئێکێ بوو و کەسایەتییەکێ ناڤداری دەڤەرێ و جهێ رازیبوونا خەلکێ بازێری بوو و رۆلەك گرنگ د چارەکرنا ئاریشەیێن جڤاکیدا هەبوو.

**٥٨- مەلا عەلی مەلا نەبی گەرماڤی**،سالا ١٩٥٣ ل گوندێ گەرماڤا- سەعید ئاغای هاتییەسەردنیایێ، ل بەر دەستێ بابێ خۆ مەلا نەبی رابوویە، د مالەکا مەرد و ناندەهـ و رەوشتبلند و کوردپەروەردا هاتییەپەروەردەکرن، دەسپێکا خواندنا سەرتایی ل خواندنگەها گوندێ پیرۆمەرا خواندییە و پاشتر ل دهۆکێ بەردەوامی پێدایە هەتا ل رێزا پێنجێ سەرەتایی دەست ژ خواندنا رەسمی بەردای و دەست ب خواندنا خۆیا ئایینی ل مزگەفتا رێکانییان کرییە، پشتی ئەزموونەکێ ل رێزا سێ ناڤنجی دواناڤنجییا ئیسلامی هاتییەوەرگرتن و هەتا ل سالا ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ خواندنا دواناڤنجی ب داوی ئینای پاشتر ل زانکۆیا ئیسلامی ل بازێرێ مەدینێ- عەرەبستانا سعودی هاتییەوەرگرتن و سالا ١٩٧٩- ١٩٨٠ێ ئەڤ زانکۆیە ب داوی ئینا و زڤریڤە وەلاتی و ل مزگەفتا مالتا ژێری وەك ئیمام هاتییەدامەزراندن، پاشتر هاتەڤەگوهاستن بۆ مزگەفتا گرێ باسێ و ل سالا ٢٠٠٠ێ باوەرناما ماستەرێ ل سەر زانایێ ناڤدار مەلا خەلیلێ سێرتی ژ زانکۆیا دهۆکێ وەرگرتییە و بۆ خواندنا دکتورایێ ل زانکۆیەکا لبنانێ هاتییەوەرگرتن و بەرهەڤی بۆ نڤیسینا ناما خۆیا دکتورایێ ل ژێر ناڤێ (الانفال بین الشریعة و القانون ) دکر، بەلێ نەشیا ب داوی بینیت وهەتا ل رۆژا ٢٩ حزیرانا ٢٠٠٦ێ ل دهۆکێ وەغەرا داوییێ کری، پشتی سەرهلدانا

۱۹۹۱ێ رۆلەکێ گرنگ د چالاکیێن ئایینی و نەتەوەیی ل دهۆکێ گێرایە و بۆ چەند سالان بەرپرسێ لیژنا ناڤخۆیا دهۆکێ یا ئێکەتیا زانایێن ئایینێ ئیسلامێ ل کوردستانێ بوو، هەوەسان ئەو د ڤان سالاندا دامەزرێنەرێ خواندنگەها ئایینی یا مزگەفتا گرێ باسێ بوو[۷۰].

## ٥۹- مەلا حەمدی عەبدولمەجید سەلەفی

مەلا حەمدی کورێ عەبدولمەجید کورێ عومەر کورێ ئیبراهیمێ سەلەفییە، بنەکۆکا وی ژ عەشیرەتا (حەلاجی)یە و باپیرێ وی ئاکنجیێ گوندێ (ئەنکەسۆر) بوو کو نێزیکی حەفت کیلۆمەتران ل باشوورێ باژێرێ تەتوان یێ ویلایەتا بەدلیسێ یە، د شەرێ جیهانیێ ئێکێ دا پشتی هێزێن رۆسیا ئەو دەڤەر داگیر کری، خێزانا وی ژ وی گوندی مشەخت بوو و بابێ وی دگەل برایێ خۆ مەلا قاسم هاتبوونە گوندێ (مستەفاویێ) یێ دکەڤیتە بەر قەزا مالکیێ (دێریکێ).

مەلا حەمدی ل رۆژا ۱۳٤۹/۱۲/۳ مشەختی (۱۹۳۱/٤/۲۱) ل گوندێ مستەفاویێ ل قەزا مالکیێ (دێریکێ) ل پارێزگەها حەسەکە (جزیرێ) ل سوریا ژ دایکبوویە، ل سالا ۱۹٤۰ێ زایینی چوویە خواندنگەهێ و هەتا پۆلا پێنجێ دەستپێکی تمام کری پێشەنگێ هەڤالێن خۆ بوو، پاشی خواندنگەهـ هێلا، ل سالا ۱۹٤۸ێ زایینی وەکی هەر کوردەکی قەستا خواندنگەها ئایینی یا گوندێ (کورتبان) یا نێزیکی گوندێ خۆ کر، پاشی بۆ ب دەستئێخستنا زانستی قەستا خواندنگەهێن دی کر و وی زانست ژ گەلەك زانایێن کوردێن پارێزگەها حەسەکێ وەرگرتییە و ل سالا ۱۹٥٤ێ زایینی وەکی هەر زانایەکێ دی یێ کورد باوەرنامەیا خۆ یا زانستی ژ شێخێ خۆ ئیسماعیل کورێ ئلیاسێ کوردی (خودێ ژێ رازی بیت) وەرگرتییە و وی شێخی کاریگەریا خۆ ل سەر هەبوویە کو د گەلەك مەسەلان دا ل سەر رێبازا شۆپیارێزان (مذهب السلف) دچوو.

ل پاییزا سالێن ۱۹٥٤، ۱۹٥٥ و ۱۹٥٦ێ چوویە دیمەشق و د هەر گەشتەکا خۆ دا چەند رۆژەکان ئامادەی رونشتنێن شێخ محەمەد ناسرەددینێ ئەلبانی بوویە و گەلەك پێ کاریگەر بوویە، ل پاییزا سالا ۱۹٥٦ێ ژی ژ بەر ئەگەرێن ئێمناهیێ و ژیارێ هاتییە کوردستانا عیراقێ.

مەلا حەمدی ل گوندێ خۆ ل سوریا و ل عیراقێ ژی وانە دگۆتنە خویندکاران و ل مووسل ژی دگەل زانایێن وێ یێن وەکی شێخ عەبدوللا ئەلحسو، شێخ عومەر ئەلنعمە و شێخ عەبدوللا ئەربیلی روونشتییە.

هەروەسا ل سالا ۱۹٥۷ێ زایینی ئەو و مەلا ئیسماعیل کوردی (کۆمێ سۆر)ێ شێخێ وی ل تەلەعفەر هاتنە گرتن دەمێ بۆ بانگخوازیێ سەرەدانا وێرێ کرین، لێ شێخەکێ عەرەبێن شەمەر ب ناڤێ عەلی دوێشێ سۆفی ب هەجەتا شیۆعی بوونێ شکیات لێ کر و هاتنە گرتن، لێ پشتی درەوا هەوالدەری (مخبر) ئەشکەرابووی هاتنە ئازاد کرن.

ل سالا ۱۹٦۱ێ زایینی حکومەتا عیراقێ فەرمانا گرتنا وی دا، ئینا قەستا چیایێن کوردستانێ کر و پەنابرە نك مەلا مستەفایێ بارزانی و وی ژی رێز لێ گرت و هاریکاریا وی کر و هاتە ناڤ رێزێن هێزێن پێشمەرگەی.

پشتی ب داویهاتنا شۆرشا کوردی ب ئەگەرێ پیلانگێریا نێڤدەولەتیا سالا ۱۹۷٥ێ زایینی و دەرکەڤتنا لێبۆرینێ بۆ کوردێن پشکداری د وێ بزاڤێ دا کرین، ڤەگەریا عیراقێ و بۆ ماوێ دو سالان بۆ باژێرێ (هیت) یێ پارێزگەها ئەنبار هاتە دوورئێخستن و پشتی دەمێ دوورئێخستنا وی تمام بووی ڤەگەریا گوندێ خۆ سەرسنکێ کو خێزانا وی ل وێرێ یا ئاکنجی بوو.

زانایێ کورد مەلا عەبدولهادی موفتیێ دهۆك ژی باوەرنامە دایە مەلا حەمدی، پاشی باوەرنامە ل دووڤ ئاوایێ نووخوازان ژ شێخێن ناڤێن وان ل خوارێ وەرگرتینە: شێخ عوبەیدوللا رەحمانی هندی، شێخ موحیبوللا شاهـ پاکستانی، شێخ بەدیعەددین شاهـ پاکستانی، شێخ حەبیبولرەحمان ئەعزەمی

هندی، شێخ عەبدوللا تلێدی مەغربی و شێخ زوهێر شاویش دیمەشقی.

وی هندەك نامە داناینە و گۆتار د گەلەك كۆڤارێن ئیسلامی و سیاسی دا بەلاڤ كرینە.

## گرنگترین پەرتووكێن داناین و تووژاندین:

١- (مقالات حمدي عبدالمجيد السلفي) ل پەرتووكخانەیا (الاصالة والتراث) ل شاریقە هاتییە چاپكرن.

٢- (الطلاق في الاسلام) ل سالا ١٩٦٠ ێ زایینی ل چاپخانەیا (الهدف) ل مووسل هاتییە چاپكرن.

٣- (مقالة في الرد على الضابطة والرابطة) ل سالا ١٩٥٧ ێ زایینی ل بەغدا هاتییە چاپكرن.

٤- (مرشد المحتار) ب سێ بەرگان ل (عالم الكتب) هاتییە چاپكرن.

٥- (حول نسب الشيخ عدى بن مسافر) دگەل مامۆستا تەحسین دۆسكی ل چاپخانەیا هاوار ل دهۆك هاتییە چاپكرن.

٦- (عقد الجمان فى تراجم علماء الكرد والمنسوبين إلي قري ومدن كردستان) دگەل مامۆستا تەحسین دۆسكی ل سەر كیسێ پەرتووكخانەیا (الأصالة والتراث) ل شاریقە هاتییە چاپكرن.

٧- (معجم الشعراء الكرد) دگەل مامۆستا تەحسین دۆسكی ژ لایێ دەزگەهێ سپیرێز ڤە هاتییە چاپكرن.

هەروەسا مەلا حەمدی تووژاندن بۆ گەلەك پەرتووكان كریە، ئەوێن چاپكری:

١- (المعجم الكبير) یا تەبەرانی دو جاران ل عیراقێ د بیست بەرگان دا هاتییە چاپ كرن و چەند بەرگەك ژی هاتینە دزین و چاپ كرن، نۆكە ژی چاپا سێ دگەل هندەك زێدەكرنێن دی یێن تویژەری ب دەست خۆ ئێخسین، ل سەر كیسێ پەرتووكخانەیا (الاصالة والتراث) ل شاریقە هاتییە چاپكرن.

٢- (مسند الشاميين) یا تەبەرانی ب چوار بەرگان ل دەزگەهێ (الرسالة) هاتییە چاپكرن.

٣- (مسند الشهاب) ب دو بەرگان ل دەزگەهێ (الرسالة) هاتییە چاپ كرن.

٤- (فتح الوهاب فى تخريج أحاديث الشهاب) یا ئەحمەد ئەلغەمماری ب دو بەرگان ل (عالم الكتب) ل بەیرۆت هاتییە چاپكرن.

٥- (بغيه الملتمس) یا عەلائی ل (عالم الكتب) پاشی ل (دار النوادر) هاتییە چاپكرن.

٦- (جامع التحصيل فى أحكام المراسيل) یا عەلائی ل عیراقێ پاشی ل (عالم الكتب) هاتییە چاپكرن و نۆكە ژی ل (الاصالة والتراث) ل شاریقە دهێتە چاپكرن.

٧-(موافقة الخبر للحافظ ابن حجر) یا (حافظ ابن حجر) دگەل شێخ سوبحی سامەرائی ب دو بەرگان ل پەرتووكخانەیا (الرشد) هاتییە چاپكرن.

٨-(الرد على الرافضة واليزيدية) یا (جبی) دگەل مامۆستا تەحسین دۆسكی ل پەرتووكخانەیا (البخارى) ل مسرێ هاتییە چاپكرن.

٩- (الرد على الرافضة) یا حەیدەر كورێ ئەحمەدێ كوردی ل پەرتووكخانەیا (البخاري) ل مسرێ هاتییە چاپكرن.

هندەك پەرتووكێن دی ژی هەنە و كار د تووژاندنا وان دا دهێتەكرن.

ل رۆژا ١٤٣٣/١١/١٨ ێ مشەختی (٢٠١٢/١٠/٤ ێ زایینی) پشتی نڤێژا ئێڤاری وەغەرا داویێ كرییە و تەرمێ وی پشتی نڤێژا عەیشا ل گورستانا سەرسنكێ ب ئامادەبوونا هژمارەكا زۆر یا زانا و زانستخواز و خەلكێ ئاسایی هاتییە ڤەشارتن.

## چوار: مزگەفتێن دەڤەرا بەهدینان

دشیاندایە بێژین توخیبێ پارێزگەها دهۆك توخیبێ دەڤەرا بەهدینانە و پارێزگەهـ ژی ب رێز ژ حەفت

قەزایێن: دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ، ئاکرێ، سێمێلێ، شێخان و بەردەڕەش پێکدهێت.

ژیا بۆری دیار دبیت کو دەڤەرا بەهدینان هەر ژ وان قەزایێن ناڤهاتی پێکدهێت.

ل پارێزگەها دهۆك (هەتا دەسپێکا سالا ٢٠١٧ێ) ١٩٦٨مزگەفت هەنە و نڤێژا رۆژا ئەینی ل ٩٣٤ مزگەفتان ب تنێ دهێتە کرن و ب ڤی ئاوایێ خوارێ:

- ١٦٤ مزگەفت ل قەزا دهۆك هەنە، نڤێژا رۆژا ئەینی ل ٧٣ مزگەفتان ب تنێ دهێتە کرن.
- ٣٠٢ مزگەفت ل قەزا زاخۆ هەنە، نڤێژا رۆژا ئەینی ل ١٠٨ مزگەفتان ب تنێ دهێتە کرن.
- ٢٠٨ مزگەفت ل قەزا ئامێدیێ هەنە، نڤێژا رۆژا ئەینی ل ٨٢ مزگەفتان ب تنێ دهێتە کرن.
- ٥٢٥ مزگەفت ل قەزا ئاکرێ هەنە، نڤێژا رۆژا ئەینی ل ٢٠٣ مزگەفتان ب تنێ دهێتە کرن.
- ١٥٨ مزگەفت ل قەزا سێمێلێ هەنە، نڤێژا رۆژا ئەینی ل ٧٥ مزگەفتان ب تنێ دهێتە کرن.
- ٢٨٣ مزگەفت ل قەزا بەردەڕەش هەنە، نڤێژا رۆژا ئەینی ل ١٠٥ مزگەفتان ب تنێ دهێتە کرن.
- ٣٢٨ مزگەفت ل قەزا شێخان (ئینسفنی) هەنە، نڤێژا رۆژا ئەینی ب تنێ ل ١٣٤ مزگەفتان دهێتەکرن.

## ١- مزگەفتا دهۆك یا مەزن:

مزگەفتا دهۆك یا مەزن ژ مزگەفتێن دیرۆکی یێن شوینواری یێن باشووری کوردستانێ دهێتە ل قەلەمدان، مزگەفت ل سالا ١٠٩٥مش/ ١٦٨٤ێ زایینی ژ لایێ حەجی ئەبوبەکر کورێ محەمەدێ ئامێدی ڤە هاتیە ئاڤاکرن، دکەڤیتە سەنتەرێ بازێرێ دهۆکێ د ناڤ جەرگێ بازارێ سەرەکیێ دهۆکێ، رووبەرێ وێ ٢٥٠٠ مەترێن چوارگۆشەیە، ئاڤاهیێ وێ یێ بەرێ ژ لایێ هۆنەرێ بیناسازیێ ڤە وەکی ئاڤاکرنا مزگەفتا حەیدەرخانەیا بەغدا بوویە، ل سالا ١٣٩١مش/ ١٩٧١ ێ زایینی دوبارە ژ لایێ وەزارەتا ئەوقافا عیراقێ ڤە هاتیە نووژەنکرن و سەخبێرکرن، ل سالا ٢٠١٠ێ ژی سەرژنوو هاتیەنوژەنکرن، نڤێژا رۆژا ئەینی و هەر پێنج نڤێژ لێ دهێنەکرن، مزگەفت وەك خواندنگەهـ و ناڤەندەکا ئایینی بۆ خواندنا زانستێن فیقهی و شەرعی دهێتە ل قەلەمدان.

ناڤدارترین زانایێن پێشنڤێژی لێ کرین:

- پێشنڤێژ مەلا حەجی محەمەد کورێ مەلا عومەرێ دهۆکی: ئەو ل هەیڤێن داویێ یێن سالا ١٣٠٠مش/١٨٨٣ز مامۆستا و پێشنڤێژ و گۆتارخوونێ مزگەفتا دهۆك بوو، ل سالا ١٣١٢مش/ ١٨٩٤ز د رێیا حەجێ دا مالئاڤاییا داویێ کرییە.
- مەلا داود کەرکووکی: دگەل خالێ خۆ هاتیە دهۆك کو رێڤەبەرێ دارایی بوو، ئینا مەلا داود وەك زانستخواز کارکرپاشی وەك مامۆستایێ خواندنگەها سەرەتایی یا فەرمی هاتە دامەزراندن، ئەو دبیتە ئێکەمین مامۆستایێ ل سەردەمێ ئۆسمانییان ل دهۆك هاتیەدامەزراندن، پاشی کەرتێ فێرکرنێ هێلا و ژ لایێ فەرمانگەها ئەوقافێ ڤە وەك پێشنڤێژێ مزگەفتا دهۆك هاتەدامەزراندن، وی زمانێن تورکی و عەرەبی ب ئاخفتن و نڤیسین باش دزانین، ل سالا ١٣٣٧مش/ ١٩١٨ز وەغەرا داویێ کرییە[٧١].
- پێشنڤێژ تەها کورێ حەجی مەلا محەمەد کورێ مەلا عومەرێ دهۆکی: ئەو پێشنڤێژ و وانەبێژ بوو ل مزگەفتا دهۆك و چەند سالەکان بریکارێ وەقفێ بوو، ئەو زانا بوو د زانستێ فەریزان(دابەشکرنا میراتەی) دا، پاشی وەك نڤیسەر ل دادگەها شەرعی ل دهۆك هاتە دامەزراندن، ئینا ب درێژیا ماوێ ڤی کارێ خۆ ل هەردو سەردەمێن ئۆسمانی و عیراقی وانەبێژی هێلا، سالا ١٣٤٧مش/ ١٩٢٨ز مالئاڤاییا داویێ کرییە.
- مەلا محەمەد عەبدولخالق ئاکرەیی: ئێك بوو ژ زاناترین و تووژەرێن سەردەمێ خۆ، خودان شیان بوو د زانستێن عەقلی و نەقلی دا، باوەرنامەیا خۆ ژ زانا مەلا محەمەد ئەفەندی جەلی ل خواندنگەها کۆیە وەرگرتییە، ل سالا ١٩٣٧ز وەك وانەبێژ و پێشنڤێژ و گۆتارخوون ل مزگەفتا دهۆك هاتبوو دامەزراندن، ل سەر کورسیا وانەبێژیێ روونشتییە و شاندێن قوتابییان ژ سەرانسەری دەڤەرێ هاتینە نك داکو ترارێن خۆ د کانیێن زانستێ وی بهەلینن و کۆمەکا

مەزن ژ زانا ل بەر دەستێ وی رابووینە و مۆلەت دایە گەلەكان، ل رۆژا ١٩٦٩/٦/٢٦ز/ ١٣٨٩مش ل دهۆكێ وەغەرا داویێ كرییە.

- مەلا ئیسماعیل نعمەتوللا ناڤشكی دۆسكی.

- مەلا عەبدلحەمید عەبدولخالق نەبی بێزەلی رێكانی خودانی شروڤەكرنا پەرتووكا (جامع احكام الصغار- للاسروشنی).

## ٢- مزگەفتا زاخۆ یا مەزن:

ئێكە ژ مزگەفتێن شوینواری یێن كەڤن و ل سالا ٢٠مش/ ٦٤١زایینی ل دەسپێكا هاتنا ئیسلامێ بۆ عیراقێ هاتییە ئاڤاكرن، ل ناڤ بازێرێ زاخۆیە، رووبەرێ مزگەفتێ ٤٥٠٠ مەترێن چوارگۆشەیە و ئاڤاهیێ وێ ژ جهەكێ بەرفرەهـ یێ نڤێژان پێكدهێت كو تێرا پتر ژ هزار نڤێژكەرایە، گومبەتەكا كەسك یا كەڤن دگەل منارەیەكا بلند كو نوو هاتییە ئاڤاكرن ل سەر ئاڤاهیێ مزگەفتێ هەنە.

ل مزگەفتێ نڤێژا رۆژا ئەینی و نڤێژا جەژنێ و هەر پێنج نڤێژ لێ دهێنەكرن، هەروەسا مزگەفت ژ ئاڤاهیێ خواندنگەهەكا ئایینی ژی پێكدهێت و گەلەك زانایێن كوردستانێ لێ خواندینە.

ڤوتابیێن بازێرێن دەردۆرێن وەكی ئامەدێ (دیاربەكرێ) و بازێرێن دی قەست دكرنێ و وی دەمی ئەو جهـ مشتی زانستخوازان دبوو، پاشی جهێ خواندنگەهێ بۆ جهەكێ دی یێ نێزیكی مزگەفتا جۆدی ب رەخ رووبارێ خابووری ڤە هاتە ڤەگوهاستن.

ل سالا ١٣٩٠مش/ ١٩٧٠ز مزگەفتا كەڤن هاتە هەرفاندن و هەر وێ سالێ دوبارە هاتە ئاڤاكرن، هەروەسا خواندنگەهەك ژی ب مزگەفتا وێ یا مەزن ڤە هەبوو[٧٢]، ژ شوینوارێن دەستنڤیسێن وێ یێن گەهشتینە مە، پەراوێزەكە ل سەر پەرتووكا (مختصر التفتازانی) ل سەر كورتكرنا (المفتاح) یا قەزوینی یە كو ژ لایێ ئیبراهیم كورێ مەلا جندی كورێ حسێن كورێ ئیبراهیم هاتییە كۆپی كرن (ل بەر هاتییە نڤیسین)، هەروەسا كۆمێنت و پەراوێز د چەندین زانستاندا ژ لایێ زانا مەحمود بەهوسی (محمود البهوسی) یێ شاگردێ حەیدەر ماوەرانی هاتینەدانان كو وانەبێژ بوو ل وێ خواندنگەهێ و ل دۆرێن سالا ١١٠٠مش/ ١٦٨٩ز وەغەرا داویێ كرییە[٧٣].

ئەحمەد بەگێ عەباسی (ل سالا ١٣٣٣مش/ ١٩١٤ز وەغەرا داویێ كرییە) ب درێژیا ژیێ خۆ وانەبێژی ل مزگەفتێ كرییە[٧٤]، مەلا شەریف سلێڤانەیی ژی وانەبێژی ل مزگەفتەكا زاخۆ كرییە[٧٥].

ژ وانەبێژێن وێ یێن داویێ ژی ئەڤێن خوارێ نە: (مەلا ئەحمەدێ عەباسی): پێشنڤێژ و وانەبێژێ مزگەفتا زاخۆ بوو، زانایەكێ بەركەڤتیێ خودێناسیێ پڕ باوەر بوو، ل سالا ١٣٣٣مش/ ١٩١٥ز ل زاخۆ وەغەرا داویێ كرییە.

مەلا یوونس سلێڤانەیی زاخۆیی: ماوەیەكێ كورت پێشنڤێژێ مزگەفتا زاخۆ بوو، ل سالا ١٩٢٣ ێ هەر ل زاخۆ مالئاڤایی یا داویێ كرییە.

پشتی وی مەلا ئەحمەد عەبدولخالق ئاكرەیی ژ گوندێ سپیندارێ یا بەرواری ژێری یا هات و پێشنڤێژی و گۆتارخوونی و وانەبێژی ل وێ مزگەفتێ كر پشتی خەلكێ زاخۆ رژدی ل سەر وێ چەندێ كری، ئەو ژ مەزنە زانایێن سەردەمێ خۆ بوو و خواندنا خۆ ل هەولێر و كەركووك و كۆیە تمام كرییە و باوەرنامەیا خۆ یا زانستی ژ مەلا محەمەد ئەفندی كۆیی وەرگرتییە، وانەبێژی و پێشنڤێژی ل بارزان پاشی د شەرێ جیهانیێ ئێكێ دا ل ئامێدیێ، پاشی ل گوندێ سپیندارا بەرواری ژێری كرییە، ل داویێ ژی ل زاخۆ ئاكنجی بوویە و ل دۆرێن ٥٠ زانایان ل بەر دەستێ وی دەركەڤتینە، ل سالا ١٣٧٨مش/ ١٩٥٨ز ل زاخۆ مالئاڤاییا داویێ كرییە.

پشتی وی هەر ژ سالا ١٩٥٩ ێ هەتا ١٩٧٥ ێ زایینی مەلا ئیسماعیل نعمەتوللا ناڤشكی دۆسكی پێشنڤێژی و گۆتارخوونی و وانەبێژی ل مزگەفتێ كرییە و پاشی بۆ مزگەفتا دهۆك هاتییە ڤەگوهاستن.

پشتی وی مەلا ئەحمەد ئەسیمان ئەحمەد، پاشی مەلا محەمەد شەمسەددین سندی پێشنڤێژی و گۆتارخوونی و وانەبێژی ل وێ مزگەفتێ كرینە.

ژ شوینوارێن مزگەفتا ئامێدیێ



## ٢- مزگەفتا ئامێدیێ یا مەزن:

ئێکە ژ گرنگترین جهێن شوینواری یێن دیرۆکی ل باشوورێ کوردستانێ و ل سەنتەرێ باژێرێ ئامێدیێ، ل سالا ٥٣٧مش ل سەردەمێ عیمادەددین زەنگی هاتییە ئاڤاکرن و ل سالا ١١٥٣مش دوبارە هاتییە ئاڤاکرن، ژ بەر بهایێ وێ یێ شوینواریێ گرنگ گەشتیار ل سەرانسەری دەڤەرێن جیهانێ قەست دکەنێ، هەروەسا منارەیەکا دیرۆکی لێ هەیە کو بەری شەش سەدسالییان ل سەردەمێ سولتان حسێن وەلی هاتییەئاڤاکرن و بلندیا وێ ٣٠ مەتر و فرەهیا بنکێ وێ سێ مەترە، دەرگەهێ وێ ب درێژیا مەتر ونیڤایە و هژمارەکا پەنجەرەیێن بچووك لێ هەنە، ١٠٣ پایە بۆ سەرکەڤتنێ ب دیوارێ منارێ ڤە هاتینە ئاڤاکرن، رووبەرێ گشتیێ مزگەفتێ دو هزار مەترێن چوارگۆشەیە، حەرەمەکا مەزن لێ هەیە کو ژ شەش کڤان و گومبەتێن ژ بەر و گێچێ و هەڕیێ هاتینە ئاڤا کرن، حەرەم بۆ دو پشکێن سەری و بنی دهێتە دابەش کرن، پشکا سەری ل سەردەمێ سولتان حسێن وەلی هاتییەئاڤاکرن، ل حەرەمێ جهەکێ تایبەت بۆ نڤێژکرنا ژنان هەیە.

مزگەفتێ خواندنگەهەك ب ناڤێ (خواندنگەها قوباد) هەیە کو وی دەمی ئێك بوو ژ مەزنترین خواندنگەهێن دەڤەرێ و هەمی جۆرێن زانستێن ئایینی و فیقهی و زانستێن زمانێ عەرەبی لێ دهاتنە خواندن، سولتان حسن وەلی ئاڤاهیێ وێ نووژەن کرییە و پێنج ژوورێن نڤستنێ بۆ قوتابییان و دو ژوور بۆ مامۆستایان ل سەر زێدە کرینە، ل باشوورێ وێ ژی مزگەفتەك ب ئەندازەیەکا کڤانەیی و گومبەتی ئاڤاکرییە.

هەروەسا پەرتووکخانەیەك تێدا چێکرییە کو گەلەك ژێدەر و پەرتووکێن فیقهی ب خۆڤە دگریت، پشتی ژیەکێ نێزیکی ٦١٥ سالان، هێشتا خواندنگەهـ ب ئەندازەیا خۆ یا جوان یا بیناسازی مایە.

مەزگەفتا مەزنا ئاکرێ



## ٤- مزگەفتا ئاکرێ یا مەزن:

ب ئێك ژ مزگەفتێن کەڤنێن دیرۆکی دهێتە ل قەلەمدان کو پشتی ڤەکرنا عیراقێ و بەلاڤبوونا ئیسلامێ ل سالا ٢٠مش ل سەردەمێ خەلیفە عومەرێ کورێ خەتتابی هاتبوو ئاڤاکرن، هەروەسا خواندنگەهەکا ئایینی ژی ل نێزیك مزگەفتێ هاتبوو ئاڤاکرن.

رووبەرێ مزگەفتێ ژ سێ هزار مەترێن چوارگۆشە زێدەترە و چەندین جاران هاتیە ئاڤەدانکرن و نووژەن کرن کو جارا داویێ ل سالا ١٩٦٥ ێ زایینی ب چاڤدێریا وەزارەتا ئەوقافا عیراقێ و ب هاریکاریا خەلکێ ئاکرێ بوویە. شێخ ئیبراهیم کورێ حەجی محەمەد رەشکە ناڤدارترین زانا بوو پێشنڤێژی و گۆتارخوونی لێ کری.

ل دووڤ زانیاریێن ل بەردەست، مەلا تەهایێ خەتیب ل دۆرێن سالا ١١٨٨مش/ ١٧٧٤ز و پشتی هنگی پێشنڤێژێ مزگەفتێ بوویە، ئەڤ مەلا تەهایە بوو یێ دگەل گەرۆکێ کورد (تەها یەحیا کورێ میر سلێمان بالیسانیێ خۆشناوەیی بالیسانی) چوویە جڤاتا یەحیا بەگێ میرێ شووشێ، دبیت ژی وی دگەل عەلی یێ کەتخودا بربیتە جهێن پیرۆز ل حوجازێ.

وی دەمی مەلا محەمەدێ موفتی موفتیێ باژێرێ ئاکرێ بوو، بالیسانی ئاماژە ب وی و بابێ وی دایە، هەروەسا ب دەستەپەیڤەکێ سالۆخەتدایە کو دیار نینە دەرهەقێ وی یان بابێ وی دا بوویە، گۆتیە: «عەیشا چووینە گوندێ شێخێ چاکێ مەردێ زانا، بابێ موفتیێ ئاکرێ، زانایێ ژێهاتی، خودێ ژێ رازی مەلا محەمەد)، هەروەسا گۆتیە کو ل ل سالا ١٢٠١ مش/ ١٧٨٦ ێ زایینی ل (البقیع) وەغەرا داویێ کریە.

هەروەك ژ گەرۆکێ کورد بالیسانی دیاردبیت ئەوی دو جاران سەرەدانا ئاکرێ کریە، جارەکێ ل سالا ١١٨٨مش/١٧٧٤ز و یا دیتر ل سالا ١٢٠١مش/١٧٨٦ز.

ل سالا ١٩٠٣ ێ ژی مەلا محەمەد کورێ مەلا

ئەحمەد كورێ مەلا محەمەد كورێ مەلا ئەحمەد كورێ مەلا یاسین كورێ مەلا ئیبراهیم رەشكە مۆلەتا خۆ یا زانستی ل سەر دەستێ مەلا محەمەد كورێ عەبدوللا جەلی زادە كو نازناڤێ وی (محەمەد كۆیی)یە ل مزگەفتا مەزن یا بازێرێ كۆیە وەرگرتییە و هەر وێ سالێ ل دووڤ فەرمانا سولتانێ ئۆسمانی عەبدلحەمیدێ دووێ وەك پێشنڤێژ و وانەبێژێ مزگەفتا ئاكرێ یا مەزن هاتییە دامەزراندن.

ل سالا ١٩٤١ێ ژی پێشنڤێژێ ئاكرەیی مەلا محەمەد كورێ مەلا ئەحمەد ل ئاكرێ وەغەرا داویێ كر و كورێ وی مەلا ئەحمەد وەك پێشنڤێژ و وانەبێژێ مزگەفتا مەزن یا ئاكرێ هاتە دامەزراندن و هەتا وەغەرا خۆ یا داویێ ل رۆژا ٢٠١٣/١/٩ ێ زایینی ل سەر وی كاری بوویە.

ژ وانەبێژێن وێ یێن داویێ ژی ئەڤێن خوارێ بوون: موفتیێ ئاكرێ هیبەتوللا كورێ محەمەد سەعید كورێ عەبدلرەحمان كورێ بەحیایێ مزووری (١٢٩٧-١٣٥٧ مش/١٨٧٩-١٩٥٥ ێ زایینی)، ئەو مامۆستایێ فەرمیێ وەقفێ بوو ل وێ مزگەفتێ بەری ل وێرێ دەست ب فەتوادانێ بكەت[٧٦]، هەروەسا مەلا ئەحمەد كورێ مەلا عەبدولخالق ئاكرەیی (ل سالا ١٣٧٧ مش/ ١٩٥٨ز وەغەرا داویێ كرییە) كو ئێك بوو ژ مەزنە زانایێن وێ یێن وانەبێژ[٧٧].

نها ژی مزگەفتێ خواندنگەهەكا ئایینی یا فەرمی هەیە و ژ لایێ هێژا مونیب ئەحمەدێ ئیمام رێڤەبەریا وێ دكەت و ب رەخڤە ژی پەیمانگەها زانستێن ئیسلامی هەیە و باوەرنامەیێن دیپلۆمێ ددەتە دەرچوویان و ژ لایێ شێخ عەبدوللا ئەحمەد محەمەد ڤە دهێتە ب رێڤەبرن.

مزگەفتا ئاكرێ ناڤدارییەكا جیهانی هەیە و گەلەك زانا و زانستخواز سەرا ددەن، ئەڤە سەرباری هندێ كو هێمایەكا شارستانیا كەڤنە و دیرۆكا وێ ڤەدگەرێتە بەری چواردە سەدسالییان و نها نڤێژا رۆژا ئەینی و نڤێژا هەردو جەژنان و هەر پێنج نڤێژ لێ دهێنە كرن.

## ٥- مزگەفتا رێكان:

مزگەفتەكا كەڤنە ل بازێرێ دهۆك، ب دروستی دیرۆكا ئاڤاكرنا وێ نەهاتییە زانین، مەلا عەبدلحەمید تاهر خروەیی وانەبێژی و پێشنڤێژی لێ كرییە، كو ل سەردەمێ ئۆسمانی ئەندام بوو د دادگەها دهۆك دا و باوەرنامەیا زانستی ژ عەبدوللا ئەفندی جەلی ل لیوا ئەربیلێ وەرگرتییە، زانایەكێ ژێهاتی بوو و گەلەك زانست نەخاسمە زانستێن ئایینی دزانین، سالا ١٣١٦مش/ ١٨٩٨ز مالئاڤاییا داویێ كرییە و ل گۆڕستانا دهۆك هاتییە ڤەشارتن، پشتی وی مەلا یاسین بریفكی هاتییە وێ مزگەفتێ، وی ژی ل سالا ١٩٠٦ ێ زایینی وەغەرا داویێ كرییە.

پشتی وی ژی مەلا سەلیم ئەفندی زاویتەییێ ئێمەری هاتییە مزگەفتا رێكان كو ل سالا ١٣٣٥مش/ ١٩١٦ز ل دهۆك مالئاڤاییا داویێ كرییە و ل دووڤ وەسیەتا وی، تەرمێ وی بۆ گوندێ بریفكا هاتییە ڤەگوهاستن و ل گۆڕستانا سەیدان هاتییە ڤەشارتن، پشتی وی مەلا سالح بابۆخكی هاتییە و ماوەیەكێ درێژ پێشنڤێژی ل مزگەفتێ كرییە، هەتا ل سالا ١٩٨٠ ێ زایینی ل بازێرێ دهۆك وەغەرا داویێ كری.

## ٦- مزگەفتا حەجی مستەفای:

ل سالا ١٣٢٠ مش/ ١٩٠٢ ێ زایینی حەجی مستەفایێ دهۆكی مزگەفتەك ل سەنتەرێ بازێرێ دهۆك ل پشكا باكوورێ رۆژهەلاتێ بازێری ل نێزیك مەزارێ شێخ محەمەد بریفكی یێ دهۆكی ئاڤا كر، ناڤبری سۆزدا بوو مزگەفتەكێ بۆ خودێ ئاڤا كەت هەكە خودێ ژ نەخۆشییەكا گران یا تووشبوویێ چاك بكەت، نها دبێژنە وێ مزگەفتێ مزگەفتا حەجی مستەفای و دكەڤیتە جادا سەرەكی ل سەنتەرێ بازێری، مەلا تەها بریفكی پێشنڤێژی لێ كرییە و ل سالا ١٣٣٦مش/ ١٩١٨ز مالئاڤاییا داویێ كرییە، پشتی وی مەلا عەبدولهادی موفتی پێشنڤێژی ل وێ مزگەفتێ كرییە و ل سالا ١٩٩٤ ێ زایینی وەغەرا داویێ كرییە.

## ٧- مزگەفتا موفتی:

ل ناڤ بازێرێ دهۆكە و ژلایێ مالا موفتیێ دهۆك ڤە هاتیە ئاڤاكرن، مەلا محەمەد كورێ عەبدولرەحمان بەرۆشكی یێ ل سالا ١٣٧٠مش/ ١٩٥١ز وەغەرا داویێ كری پێشنڤێژی لێ كریە، پشتی وی مەلا سالح كەمەكی، پاشی مەلا سهام سلێڤانەیی، پاشی مەلا عسمەت ناڤشكی دۆسكی پێشنڤێژی ل وێ مزگەفتێ كرینە.

## ٨- مزگەفتا ئەتریش:

ئێكە ژ ناحیێن سەر ب قەزا شێخانڤە، دشێین بێژین ژ سەدسالییا یازد مش/ هەڤدێ زایینی ژیانا رەوشەنبیری لێ گەش بوویە و دو خواندنگەهە ئێك یا زانستی ل سالا ١١٧٥مش/ ١٧٦١ زایینی و ئێك یا سۆفیاتیێ لێ هاتینە ئاڤاكرن، وی گوندی ناڤدارییەكا بەرفرەهە پەیدا كر ژ بەركو زانا مەلا یەحیا مزووری یێ ل سالا ١٢٥٠مش/ ١٨٣٤ز وەغەرا داویێ كری وانە لێ گۆتینە كو ئەڤە ئێك بوو ژ مەزنە زانا و وانەبێژێن سەردەمێ خۆ هەتا هندەك هەڤچەرخێن وی ئاماژە كرینە وێ چەندێ كو ئەو زاناترین زانایێ سەردەمێ خۆ بوویە، زانایێن تێگەهشتی وانەبێژی ل خواندنگەها وێ یا زانستی كریە كو پتریا وان ژ مالباتەكێ بووینە كو عەبدولحەمیدێ باپیرێ وانێ ئێكێ ژ گوندێ بریفكا مشەخت ببوو و هاتبوو ئەتریش و ل وێرێ كار د زانست و وانەبێژیێ دا كربوون، هەر ژ زانایێن ڤی گوندی: زانا حەجی مەلا ئەحمەد ئەتریشی نەڤیێ زانا مەلا یەحیا مزووری و ل وێرێ كۆمەكا زانستخوازان شاگردێن وی بوون، هەروەسا قوتابییان ژ گەلەك دەڤەران قەست كربوونێ هەتا ئەتریش بوویە پەیمانگەهەك بۆ فێربوونا زانستان، پشتی وی عەبدولهادیێ كورێ وی وانەبێژی لێ كر و ژ بەر بەرفرەهیا زانستێ وی و كۆمێنتێن وی پەراوێزێن وی ل سەر گەلەك دەستڤنیسێن زانستێن جودا جودا ناڤدارییەكا مەزن پەیدا كر و نێزیكی ٥٠ سالان وانەبێژی ل وێ خواندنگەهێ كر هەتا سالا ١٣٣١مش/ ١٩١٣ز وەغەرا داویێ كری.

ب ڤی رەنگی ئەڤ مزگەفتە وەك خواندنگەهەكێ بوو هەمی زانست و پێشكەڤتیترین زمانێ عەرەبی و رەوانبێژی و زمانی و لۆژیكێ و فەلسەفێ و الكلام و فەلەكناسی و شەریعەتێ ئیسلامێ و فەرموودە و سوننەتێ (الحدیث والسنة) لێ دهاتنە خواندن، هەروەسا محەمەد عەلی ئەتریشی (ل سالا ١٣١٨ مش/ ١٩٠٠ ێ زایینی وەغەرا داویێ كریە) و محەمەد ئەنوەر ئەتریشی كو هەردو كورێن عەبدولحەمیدێ ناڤبری بوون.

هەروەسا ئەڤێن خوارێ ژی زانایێن وی گوندی بوون: عەبدوللا ئەتریشی نەڤیێ مەلا یەحیا مزووری كو زانایەكێ خودێناس بوو و سالا ١٣٣٣ مش/ ١٩١٥ ێ زایینی وەغەرا داویێ كریە، محەمەد ئەمین كورێ محەمەد سەعید ئەتریشی (ل سالا ١٣٣٥مش/١٩١٧ز وەغەرا داویێ كریە) كو وی تەكیایەك ل وێرێ هەبوو و زانستێن ئایینی و فەرموودە و شرۆڤە لێ دگۆتن، عەبدولرەحمان كورێ محەمەد عەلی ئەتریشی (ل سالا ١٣٦٨مش/ ١٩٤٩ز وەغەرا داویێ كریە) كو هەیامەكێ وانەبێژی لێ دكر، عەبدلحەمید كورێ عەبدولرەحمان ئەتریشی یێ زانستی ژ وانەبێژێن گوندێ خۆ وەرگرتبوون پاشی پلە ب پلە د كارێن شەرعی دا بلند بوو هەتا بوویە دادوەرێ بەغدا.

هەروەسا شێخێ خودێناس نورەددین بریفكی (١٢٠٤-١٢٦٧مش/ ١٧٨٩-١٨٥٠ز) ئێك بوو ژ وان زانایێن هاتینە ئەتریش و پشتی سالا ١٢٣٩مش/ ١٨٢٣ز ماوەیەكێ ژیانا خۆ ل وێرێ بۆراند، مەلا مەحمود نهێلی (١٣١٦مش/ ١٨٩٨ز) یێ ل وێرێ وانەبێژیا چەندین جۆرێن زانستان كری.

ژ پەرتووكێن ڤی گوندی یێن وەك شوینوارێن زانستی گەهشتینە مە پەرتووكەكە د لۆژیك(منطق)ێ دا ب دەستخەتێ محەمەد ئەمین كو چ دیرۆك ل سەر نینن و (شرح المحرر) یا (الرافعي) ب دەستخەتێ (محمود اورامي بن ابي الغار) سالا ١٠٧١ مش/ ١٦٦١ ێ زایینی (شرح نظم الكافي) یا (البیتوشي) سالا ١١٧٩ مش/ ١٦٧٤ ێ زایینی و هندەكێن دی

## ٩- مزگەفتا بەرۆشکێ:

گوندێ مەزن یێ عەشیرەتا دۆسکی یە، دکەڤیتە بەر ناحیا مانگێشکێ، ل وێرێ خواندنگەهەك ب هاریکاریا خەلکێ گوندی هاتبوو ئاڤاکرن، عەبدوللا ئەفندی بەرۆشکی (یێ ل سالا ١٣٣٩مش/ ١٩٢٠ز وەغەرا داویێ کری) وانە لێ گۆتینە[٧٨]، وی کۆمێنت ل سەر پەراوێزێن وان پەرتووکان هەنە یێن ل پەرتووکخانا خێزانێ هەین، هەروەسا هەردو برایێن وی ژی شێخ محەمەد بەرۆشکی (یێ بەری سالا ١٣٣٩مش/ ١٩٠٥ز وەغەرا داویێ کری) و شێخ ئەحمەد بەرۆشکی (یێ ل سالا ١٣٣٩مش وەغەرا داویێ کری) وانەبێژی لێ کرینە[٧٩]، ژ شوینوارێن زانستی یێن مزگەفتێ یێن گەهشتینە مە نامەیا (حاشیة الفناري) یا (لۆژیکێ)یە کو ل سالا ١٣٠٥ مش/ ١٨٨٨ ێ زایینی ب دەستخەتێ ئەحمەد کورێ مەلا محەمەد هاتییە نڤیسین[٨٠].

## ١٠- مزگەفتا هێتووتێ:

گوندەکێ مەزنە سەر ب ناحیا زاویتەڤە بوو، نها بوویە تاخەکێ دهۆکێ، شێخێ تەریقەتێ نورەددینی بریفکی (١٢٠٤-١٢٦٧مش/ ١٧٨٩-١٨٥٠ز) بۆ خۆ کربوو ئاکنجیگەهەك و ل دۆرێن هەشت سالێن ژیانا خۆ کربوو پەناگەهەك بۆ چالاکیێن خۆ یێن زانستی و ل وێرێ ل سالا ١٢٣٣مش/ ١٨١٧ز پەرتووکا (ابراز الدقائق في شرح القصيدة الحائية) و ل سالا ١٢٣٨مش/ ١٨٢٢ز پەرتووکا (البدور الجلية) نڤیسینە[٨١]، شێخ سالح دەرگەلی ژی (یێ سالا ١٣٢٧مش/ ١٩٠٩ز وەغەرا داویێ کری) ئێك بوو ژ وانەبێژێن وێ و ماوەیەکێ ژیانا خۆ ل وێرێ بوویە[٨٢]، هەروەسا ژ وان پەرتووکێن ل وی گوندی هاتینە کۆپیکرن(ب مەرەما ل بەر دانەیەکا دی هاتینەنڤیسین) پەرتووکا (الظروف) ب دەستخەتێ محەمەد ئەمینێ کورێ مەلا محەمەد ل خواندنگەها هێتووتێ ل سالا ١٢١٢مش/ ١٧٦٧ز[٨٣].

## ١١- مزگەفتا سپینداری:

هژمارەکا گوندان ب ڤی ناڤی هەنە، لێ یێ ژ هەمییان دیارتر گوندەکە دکەڤیتە ناحیا چەمانکێ ل ناڤ بەرواری ژێریان ل قەزا ئامێدیێ، خواندنگەهەکا ئایینی ل مزگەفتا وێ هەبوو کو چەندین زانا لێ دەرچووینە و خەلکێ گوندی ب خۆ خەرجیێن قوتابیێن وێ ب ستۆیێ خۆڤە گرتبوون، ل وێ مزگەفتێ عەبدولعەزیز دۆلانی (پەرتووك و دەستنڤیس) کۆپیکرینە .

## ١٢- مزگەفتا باتیفا:

باتیفا گوندەکێ دەڤەرا (گولی)یانە ل پارێزگەها دهۆك، ئێك ژ وان یێن وانەبێژی ل خواندنگەها وێ کری شێخ زیائەددین بوو (کو ل سالا ١٣٨٢مش/ ١٩٦٢ز وەغەرا داویێ کرییە)، ئەو ئێك بوو ژ زانایێن سەردەمێ خۆ و ماوەیەکێ درێژ ل خواندنگەها وێ وانەبێژی کرییە ئەڤە ژی پشتی پشکا ئێکێ یا ژیانا خۆ ب وانەبێژیێ ڤە ل گوندێن هەردو دەڤەرێن دۆسکی و گولی بۆراندی[٨٤]، هەروەسا ئەو لێڤەگێرەك بوو بۆ فەتوادانێ[٨٥].

## ١٣- مزگەفتا ئەرمشتێ:

گوندەکێ کەڤنە دکەڤیتە پشت چیایێ سپی ل ناحیا رزگاری ل قەزا زاخۆ، د پەرتووکێن جوگرافیێن ئیسلامیدا ب ناڤێ (اردمشت) هاتییە نیاسین، ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان سەر ب ئامێدیێ بوو، کەلایەك هەیە ل سەر کۆپا چیایێ سپی یە و ل هنداڤی رووبارێ خابوورە، ب خواندنگەها خۆ یا زانستی ناڤدار بوویە یا ل سالا ١١١٣-١١٢٦مش/ ١٧٠٢-١٧٠٤ز ل دەسپێککا سەدسالیا یازدێ مش ژ لایێ زوبێر پاشایێ میرێ ئامێدیێ ڤە هاتییە نووژەن کرن.

ژ شوینوارێن وێ یێن دەستنڤیس ژی پەرتووکا (شرح رسالة الاستعارات) یا ئیبراهیم کورێ محەمەد کورێ عیسامەددینە و ب دەسخەتێ حەسەن عەلی ئەلمانی مزووری هاتییەنڤیسین، وی دەمی ئەو ل گوندێ ئەرمشتێ ل نك مامۆستایێ خۆ

پێ زانا مەلا تاهر بوو، د وێ سالێدا (سالا ١٠٤١مش/ ١٦٣٢ز) حوكمدارێ دادپەروەر سەعید خان بەگێ سولتانێ ئامێدیێ پێ وەغەرا داویێ كریە، وەك د دەستڤیسێدا هاتی مخابن و هزار مخابن بۆ مرنا وی، ئەو بابەكێ دلۆڤان بوو بۆ ڤوتابی و هەژاران.

هەروەسا ژ وان یێن پاشی گۆتارخوونی و وانەبێژی ل مزگەفتا وی گوندی كرین، شێخ حەسەن خۆرانی بوو یێ ژ جزیرا بۆتان هاتییە ئەرمشتێ و وی وانەبێژی د هەمی زانستان كرییە و ل سالا ١٣٢٥مش/ ١٩٠٦ز مالئاڤایا داویێ كرییە.

## ١٤- مزگەفتا ئەرزێ:

ئەرزێ كەلایەكە ل چیایێ مەتینایە ل رۆژئاڤایێ ناحیا بامەرنێ، تایەكێ مالباتا حوكمداری ل بەهدینان كری (كو پایتەختێ وێ ئامێدیێ بوو) حوكم ل وێ كەلێ كرییە، میر بەكرێ ئەرزی (بەكر بەگێ ئەرزی) (١١٧٩- ل سالا ١٢٢٠مش/١٨٠٥ز یێ زیندی بوو) ئێك بوو ژ وان ئەدیبێن ژ وی گوندی رابووین، ئەو هۆزانڤانەكە هۆزانێن وێ هاتینە چاپكرن و د هندەك هۆزانێن خۆ دا روودانێن سەردەمێ خۆ یێن میرگەها بەهدینان توومار كرینە، ئەڤە سەرباری كو وێنەكێشەك و نموونەیەكێ دیار و بەهرەمەند بوو[٨٦].

## ١٥- دەرگەلێ:

گوندەكێ ناحیا مانگێشكێ یە، ل نیڤا سەدسالیا ١٢مش/ ١٨ز خێزانەكا زانستپەروەر یا سەیدێن گەلێ رمان هاتییە وێرێ و زانایێن مەزن ژێ پەیدا بووینە، ژ وانا: شێخ مەعروف كورێ ئیسماعیلێ دەرگەلی (ل سالا ١٣٢٤مش/ ١٩٠٦ز وەغەرا داویێ كرییە) وی ل وێرێ خۆ بۆ وانەبێژیێ تەرخان كر هەتا (هژمارەكا زۆر یا زانستخوازان ژ هەر جهەكی ڤەست كرین)[٨٧]، شێخ نوری كورێ شێخ مستەفا (سالا ١٣٠٩مش/ ١٨٩١ز وەغەرا داویێ كرییە)، زانا مەلا سالحێ موهاجر، هەروەسا ژ وان یێن ل سەر دەستێ وی خواندین شێخ عەلی سلێڤانەیی (١٣٢٤-١٤١٤مش/ ١٩٠٦-١٩٩٣ز) بوو[٨٨]، ژ شوینوارێن وێ یێن زانستی یێن گەهشتینە مە، كۆمەكا هۆزانێن (محمد الخطي)یە كو ل سالا ١٢٦٠مش/ ١٨٤٤ز ب دەستێ نورەللا كورێ عەبدال خانێ عەباسی هاتینە نڤیسین[٨٩]، نە تنێ زانا ژ وی گوندی دەرچووینە، بەلكی نوشدارێن مەزن و ب ناڤ دەنگ ژێ ژێ رابووینە، ژ وانا: عەبدولرەحمانێ دەرگەلی یێ بەرواری، (ئەو نوشدارەكێ شارەزا بوو و وی پەرتووكەك ژێ ب زمانێ فارسی ل سەر نوژداریێ هەیە)[٩٠].

## ١٦- مزگەفتا شەعبانیێ:

دیارە ئەو كەلا شەعبانیێ یە ل نێزیك گوندێ باتیفا یا ل ناحیا دەركارێ ل ڤەزا زاخۆ، ل دەڤەرێ ب شابانیێ دهێتەناڤكرن، د ژێدەرێن سەدسالیا ٨مش دا ئاماژە پێ هاتییەدان[٩١]، هەروەسا ناڤێ وێ د دەستنڤیسا (فرائض منهج الطلاب) دا هاتییە كو دەستنڤیسا داویێ یا (زكریا الانصاری)یە (سالا ٩٢٦مش/١٥٢٠ز وەغەرا داویێ كرییە) كو (محەمەد خۆشناو ئیسماعیل سالح)ی ل (جڤاتا دەروێش) لبەر نڤیسییەڤە لێ سال ل سەر نەنڤیسینە[٩٢]، هەروەسا دەستنڤیسەكا دی هەیە نڤیسەرێ وێ حسێن كورێ خالد سندی رووداێن جودا جودایێن دیرۆكی یێ دەڤەرێن رۆژئاڤایێ بەهدینان تێدا توومار كرینە و رووداێن داویێ ژێ یا سالا ١٠٠٠ مش/ ١٥٩١ز یە و ل گوندێ شەعبانیێ ل سەردەمێ (میرێ پشتەڤانێ زانستی، سولتانێ دادپەروەر (سیدی خانێ عەباسی) ب داوی ئینایە[٩٣].

## ١٧- مزگەفتا شیلان:

گوندەكە دكەڤیتە ناحیا گولی ل نێزیك توخیبێ تركیا، خواندنگەهەك ل وێرێ هەبوو و مە دەستنڤیسەك ب ناڤێ (خلاصة الشباب) وەك شوینوارەكێ چالاكیێن وێ یێن زانستی دیت كو ل سالا ١١٢٤ مش/١٧١٣ ێ زایینی ژ لایێ عەلی كورێ موحسنێ شیلانی ڤە هاتییە نڤیسین[٩٤].

## ١٨- مزگەفتا بریفکا:

گوندەکێ ناحیا مزوورییە ل قەزا شێخان، ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان سەر ب ئامێدیێ ڤە بوو، سولتان سیدی خان قوباد بەگێ عەباسی یێ میرێ بەهدینان (ژ ٩٩٣ - ١٠٣٩مش/ ١٥٨٥ - ١٦٢٩ز حوکمکرییە) خواندنگەها شێخ شەمسەددین قوتب کورێ سەید عەبدولکەریم کورێ مووسا حوسێنیێ بریفکی (سالا ١٠٨٥مش/ ١٦٧٤ز وەغەرا داویێ کرییە) کو وی دەمی ئێك بوو ژ مەزنە شێخێن رێبازا خەلوەتیێ لێ دامەزراند، هژمارەکا زانایێن شارەزا ژ خواندنگەهێ دەرچووینە، ژ وانا: شێخ نورەددینێ بریفکی (ل سالا ١٢٦٨ز/ ١٨٥١ز وەغەرا داویێ کرییە) کو ئەڤە زانا و ئەدیب بوو و چەندین پەرتووکێن گرنگێن سۆفیاتیێ، دیوانێن هۆزان ب هەر سێ زمانێن عەرەبی و کوردی و فارسی هەنە، هەروەسا زانایێن دیار ژ مالا وی پەیدا بوون و وانەبێژی دکرن و فەتوا ددان و چالاکیێن گشتی یێن رەوشەنبیری ل وارگەهێ خۆ دکرن، ژ وانا: زانا شێخ عەبدولحەمید کورێ شێخ شەمسەددینێ بریفکیێ ئەتریشی (سالا ١٣٠٥ مش/ ١٨٨٧ز وەغەرا داویێ کرییە)، نور محەمەد کورێ عەبدولقادر (سالا ١٣١٨ مش/ ١٩٠٠ ێ زایینی وەغەرا داویێ کرییە)، شێخ عەبدولقەهار بریفکی (ل سالا ١٣٣٦مش/ ١٩١٧ز وەغەرا داویێ کرییە)، شێخ تەها بریفکی (١٣٣٦مش/ ١٩١٧ز)، مەلا عەبدوللا ئەتریشی (سالا ١٣٣٨مش/ ١٩١٩ز وەغەرا داویێ کرییە)[٩٥]، شێخ مەمدوح بریفکی (سالا ١٩٧٦ز وەغەرا داویێ کرییە) کو ئەڤە زانایەکێ ئەدیبێ هۆزانڤان بوو و گرنگی ب کۆمکرنا دەستنڤیسێن جودا جودا ددا و پەرتووکخانەیەکا گرانبها ژێ چێ کربوو و دەمەکی ل بریفکا و زانستخوازان قەست دکرێ[٩٦]، هەروەسا شێخ فازل شۆشی (ل سالا ١٣٢١مش/ ١٩٠٣ز وەغەرا داویێ کرییە) ئێك بوو ژ زانایێن وێ و دەمەکێ درێژ وانەبێژی ل تەکیا بریفکا کرییە و وانە د هەمی زانستان دا گۆتینە[٩٧]، شوینوارێن زانستی یێن ڤی گوندی یێن گەهشتینە مە پەرتووکا (رسالە بنان البیان)ە یا ژ لایێ ئەبو بەکر میروستەمی هاتییە دانان و ل سالا ١٣٢٠مش/ ١٩٠٢ز تەها کورێ سەید عەبدوللا ل گوندێ بریفکا د خزمەتا مامۆستا شێخ محەمەد فازل دا نڤیسییە[٩٨].

## ١٩- مزگەفتا شۆشێ:

گوندەك و کەلایەکا قەزا ئاکرێ، ل سەردەمێ مەغۆلێن ئیلخانی بنکەهەکێ میرگەها مازنجانی بوو، پاشی هۆزا زێبار کۆنترۆل ل سەر کر و بوو پشکەك ژ میرگەها بەهدینان و بوو ئێك ژ دەڤەرێن دکەڤنە بەر ئامێدیێ و میرێن مالا بەهدینان حوکمداری لێ کرن، شێخ شەمسەددین شۆشی یێ ناڤدار ب رێبەرێ سەردەمی (مرشد العصر) ئێك بوو ژ زانایێن وێ یێن سەدسالیا دەهـ مش/ شەشێ زایینی[٩٩]، هەروەسا شێخ یونس شۆشی و برایێ وی عەبدوللا شۆشی[١٠٠]، عەبدلرەحمان شۆشی یێ ناڤدار ب شێخێ ئیسلامی[١٠١] و ئیسلامێ کورێ وی کو زانایەکێ زیرەك و نڤیسەرەکێ باش بوو و چەندین پەرتووك دانایینە[١٠٢]، تاهر شۆشی کو زانایەکێ هۆزانڤان و ئەدیب بوو و پەرتووکەك د ژیانناما پێغەمبەری دا هەیە و چەندین کەسێن دی زانایێن وی گوندی بوون.

## ٢٠- مزگەفتا ربەتکێ:

گوندەکە دکەڤیتە ناحیا ئەتریش، ب خواندنگەها خۆ ناڤدارە و شێخ ئەحمەد کورێ حەسەن ربەتکی و کورێ وی زانا عەبدوللا ربەتکی یێ عەباسی زانایێن وێ نە و یێ داویێ ل سالا ١١٥٩مش/ ١٧٤٦ز ب وانەبێژ دهاتە نیاسین و ئێك بوو ژ ناڤدارترین زانایێن وی دەمی یێن عیراقێ و خودانێ گەلەك پەرتووکێن فیقهی و عەقیدە و مەنتقێ یە، ژ وانا: (نهج المهج) د فیقهێ شافعی دا، (منظومة الاشکال) د مەنتقێ دا، (المنهاج فی بیان العشر و الخراج) و یێن دی[١٠٣]، هەروەسا مەلا حەسەن بلوتی (ل سالا ١٩٤٣ ێ زایینی وەغەرا داویێ کرییە) ئێك بوویە ژ وانەبێژێن وێ[١٠٤].

## ٢١- مزگەفتا بێسكێ:

گوندەكێ ناحیا زاویتەیە دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ باژێرێ دهۆك، خواندنگەهەك لێ مزگەفتا وێ هەیە ژ لایێ سەید نوری ئەفندی ڤە هاتییە چێ كرن و وانەبێژی لێ كریە[١٠٥]، هۆزانڤان ئیبراهیم كورێ سەید ئەحمەد بێسكی ئێك بوویە ژ زانایێن وێ و وی كۆبەرهەمەكێ هۆزانان ب زمانێ كوردی هەیە[١٠٦].

## ٢٢- مزگەفتا چرە:

گوندەكە دكەڤیتە ب رەخ رووبارێ خازری ڤە ل ناحیا قەسرۆكێ یە، ل سەدسالیا سێزدێ چالاكییا خۆ یا زانستی هەبوو، ژ شوینوارێن وێ یێن بەردەست دەستنڤیسا (الفرائض)ە ل سالا ١٢٧٨مش/ ١٨٦١زب دەستخەتێ مستەفایێ كورێ مەلا حەمەد عومەر خیلافەتی هاتییە نڤیسین[١٠٧].

## ٢٣- مزگەفتا بجیلێ:

ناحیەكا قەزا ئاكرێ یە و سەنتەرێ عەشیرەتا سوورچییە، خواندنگەهەك ل مزگەفتا وێ هەبوو و دكتۆر داود جەلی گۆتییە كو وی ٩٠ پەرتووك لێ هژمارتینە[١٠٨].

## ٢٤- مزگەفتا بێتاسێ:

گوندەكێ ناحیا رزگاری یە ل قەزا زاخۆ، ژ بەرهەمێن وێ یێن گەهشتینە مە دەستنڤیسا (شرح عصام الاسفرائینی لرساله البیان فی الاستعاره) یا (ابی القاسم اللیثي السمرقندی) ب دەستخەتێ سەعید كورێ ئەحمەد، لێ دیرۆك ل سەر نینە[١٠٩].

## ٢٥- مزگەفتا بەندا:

بەندا گوندەكێ ناحیا مانگێشكێ یە، مەلا ئەحمەد بەندی (سالا ١٣٤٤مش/ ١٩٢٥ز وەغەرا داوییێ كریە) ئێكە ژ وان یێن وانەبێژی لێ كری[١١٠].

## ٢٦- مزگەفتا زیناڤا:

گوندەكێ ناحیا مانگێشكێ یە، چالاكییەكا رەوشەنبیری لێ هەبوویە، ژ شوینوارێن وێ یێن داویێ یێن ب دەست مە كەڤتین پەرتووكا (تصریفات الكردی) یا مەلا یۆنس ئەرقەتینی یە كو ب دەستخەتێ حسێن كورێ نعمان ناڤشكی هاتییە نڤیسین و (ل سالا ١٣٦٤مش/١٩٤٥ز ل مزگەفتا گوندێ زیناڤا نڤیسییە)[١١١].

## ٢٧- مزگەفتا زەنتە:

گوندەكێ ناحیا دینارتەیە ل قەزا ئاكرێ، هندەكان ژێ ل سالا ١١٨٩مش/ ١٧٧٥ز پەرتووكا (رفع الخفا) د ژیاننامەیا پێغەمبەری دا یا (ابن الحاج) كۆپی كریە[١١٢].

## ٢٨- مزگەفتا باڤیا:

گوندەكێ ناحیا سلێڤانەیی یە ل قەزا زاخۆ، خواندنگەهەك ل مزگەفتا وێ هەبوو و زانا مەلا یوسف سلێڤانەیی ێ باڤی (سالا ١٣٣٧مش/ ١٩١٩ز وەغەرا داویێ كریە) ئێك بوو ژ وان یێن وانەبێژی لێ كری[١١٣].

## ٢٩- مزگەفتا زێوكا شێخا:

هەروەسا دبێژنێ زێوەكان و زێوكا شێخا، ژ بەركو شێخێن وێ تایەك بوون ژ مالباتا حوكمدارا میرگەها بەهدینان[١١٤]، گوندەكێ كەڤنە و دكەڤیتە بەر ئامێدیێ، لێ نها سەر ب ناحیا دێرەلۆكێ یە، دشێین بێژین ژ سەدسالیا یازدە مش/هەڤدێ زایینی ژیانا زانستی لێ چالاك بوویە و ژ شوینوارێن وێ یێن گەهشتینە مە ئەڤێن خوارێ نە: دەستنڤیسا (تحریر القواعد المنطقیة في شرح الشمسیة) یا رازی سالا ١١٠٨مش/ ١٦٨٦ز)، دەستنڤیسا (خلاصة الوضع) ب دەستخەتێ حسێن كورێ یەعقوب یا سالا ١٢٣١مش/ ١٨١٥ز[١١٥]، دەستنڤیسا (شرح تصریف الزنجانی) ب دەستخەتێ یوسف كورێ محەمەد، دەستنڤیسا (الوغ بك) ب دەستخەتێ

محەمەد کورێ عەبدوللا کورێ رەسول کورێ عەبدوللا ئاغا رۆستانی یا سالا ١٢٦١مش/ ١٨٤٥ز و دەستنڤیسا (سعدالدین التفتازانی) ب دەستخەتێ عەبدوللا کورێ محەمەد کورێ مەلا عەبدوللا کورێ مەحمود یا سالا ١٢٩٥مش/ ١٨٤٩ز (١١٦).

## ٣٠- مزگەفتا شەرانش:

گوندەکێ ناحیا دەرکار عەجەم (سندی)ە ل زاخۆ، ل دەسپێکا سەدسالیا نەهێ مش وەك سەنتەرێ میرگەها سندی ئاماژە پێ هاتییە دان، پاشی ل ٩٤٠ مش/ ١٥٣٤ز(١١٧) میرێن میرگەها بەهدینان همبێز کریە میرگەها خۆ یا ل ئامێدیێ و سولتان حەسەنێ میرێ بەهدینان (کو ل سالا ٨٧٥-٩٤٠مش/ ١٥٣٤ز حوکمداری کریە) خواندنگەهەك لێ دانایە و ل دەسپێکا سەدسالیا ١٢ مش ژ ئالیێ زوبێر پاشایێ میرێ بەهدینان (یێ هەر ژ سالا ١١١٣-١١٢٦ مش/ ١٧٠٢-١٧١٤ز حوکم کری) هاتییە نووژەنکرن(١١٨).

هندەك زانایێن وێ دناڤدار بوون، ژ وانا: زانا شێخ محەمەد شەرانشی یێ ل دەسپێکا سەدسالیا یازدێ مش شەرەفخانێ بەدلیسی بەحسێ زانستێ وی کری، ژ شوینوارێن وی (تعلیقات علی کتاب الجامي) و (شرح الشمسیة فی المنطق)(١١٩)، مەلا تەها شەرانشی و شێخ ئەحمەدێ شەرانشی، وان وەقفەك بۆ بەردەوامیدانا خەرجی لێکرنا خواندنگەهێ هەبوو، لێ ل دەسپێکا سەدسالیا بیستێ خواندنگەهـ تووشی وێرانبوونێ هات و هاتە بەردان و عەردێ وێ بوو ملکەکێ ئازاد(١٢٠)، شوینوارێن زانستی یێن ژ ڤی گوندی ماین پەرتووکا (موصل الطلاب الی صناعة الاعراب)ە ب دەستخەتێ ئەبوبەکر کورێ عەلی یا سالا ١٢٠٤مش/ ١٧٩٩ز(١٢١) و (حاشیة قاسم علی النسبة التامة الجبرية) کو دیرۆك ل سەر نینە(١٢٢).

## ٣١- مزگەفتا رەزۆك:

گوندەکێ نێزیکی ئاکرێ یە، چالاکیێن زانستی لێ هەبوون، پێشنڤێژێ مزگەفتا وێ محەمەد کورێ سەلیم چەلکی یێ خەلکی دەڤەرا مزووری ژووری پەرتووکا (شرح المقدمة الحضرمیه) لێ کۆپی کرییە(١٢٣).



شوینارێ مزگەفتا شەهیدا ل قومریێ

## ٣٢- مزگەفتا حەجی توو:

مزگەفتەكا باژێرێ ئاكرێ یە، ئێكە ژ مزگەفتێن ل سەدسالییا ١٢مش پشكداری د بزاڤا زانستی یا ئاكرێ دا كری، ژ شوینوارێن وێ یێن زانستی یێن گەهشتینە مە دەستنڤیسا (موصل الطلاب على صناعة الاعراب)ە ب دەستەختێ ئەحمەد كورێ عەلی یا سالا ١٢٣٠مش/ ١٨١٤ز[١٢٤].

## ٣٣- مزگەفتا بێزەلێ:

گوندەكە دكەڤیتە دەڤەرا نێروە رێكان، خواندنگەها ئایینی لێ هەبوو و خەلیفە عەبدولخالق خەلیفە نەبی وانەبێژی و پێشنڤێژی لێ كرییە.

## ٣٤- مزگەفتا كەڤلەسنێ:

گوندەكێ ناحیا زاویتەیە، میر ئیسماعیل پاشایێ دووێ یێ میرێ بەهدینان (١٢٥١-١٢٥٨مش/ ١٨٣٥-١٨٤٢ز) پێشكێشی مەلا ئیسماعیلێ كورێ شێخ عەبدولقادرێ كەڤلەسنی كربوو، میری داخواز ژ وی و برایەكێ وی یێ ب ناڤێ عیسا كربوو وانەبێژیێ ل ئامێدیێ بكەن، مەلا ئیسماعیل مزگەفتەك ل ڤی گوندی ئاڤا كربوو و زانستخوازان قەست دكرنێ[١٢٥].

## ٣٥- مزگەفتا قومریێ:

گوندەك و كەلایەكا بلندە ل دەڤەرا بەرواری، سەردەمێ میرگەها بەهدینان بنكەهێ میرگەها بەرواری بالا بوو، زانایێن مەزن ژێ پەیدا بووینە، ژ وانا: زانا حەسەن كورێ نوحێ قومریێ بەرواری (ل سالا ٨٦٢مش/ ١٤٥٧ز مالئاڤاییا داویێ كرییە) یێ پەرتووكا (مصطلحات الطب) دانای[١٢٦]، میر سەیف محەمەد بەگێ كورێ سەعید بەگ (سەدسالییا ١٢مش/ ١٨ز) یێ ئێكەمین پەرەشۆت، یان فرۆكا چارۆكەدار داهێنای و پێ ژ كەلا خۆ خۆ دادایە كووریا گەلیێ ب رەخ ڤە، ئەڤە سەرباری هندەك داهێنانێن دی یێن گرنگ[١٢٧].

## ٣٦- مزگەفتا گرشینی:

گوندەكێ ناحیا سلێڤانەیی یە ل قەزا زاخۆ ل پارێزگەها دهۆك، خواندنگەهەك ل مزگەفتا وێ هەبوو و مەلا یوسف سلێڤانەیی یێ باڤی (ل سالا ١٣٣٧ مش/١٩١٩ز وەغەرا داویێ كرییە) ئێك بوو ژ وان زانایێن وانەبێژی لێ كری[١٢٨].

## ٣٧- مزگەفتا گرگاشێ:

گوندەكە دكەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ ئامێدیێ، ژ وان زانایێن وانەبێژی لێ كرین: محەمەد كورێ ئەحمەدێ گرگاشی (ل سالا ٧٤٣ مش/ ١٣٤٢ ی زایینی وەغەرا داویێ كرییە) خودانێ پەرتووكا (الزیج والهیئە)، مەلا مەنسوور گرگاشی، یێ ل داوییا سەدسالییا ١١مش/ ١٧ز ژیای و وی هۆزان ب زمانێ كوردی هەنە[١٢٩].

## ٣٨- مزگەفتا گەلیێ رمان:

گوندەكێ مزووریان یێ قەزا شێخانە، ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان سەر ب ئامێدیێ بوو، ژ لایێ شێخ ئەحمەدێ گەلیێ رمانی (ل ١١٥٠مش/ ١٧٣٧ز وەغەرا داویێ كرییە) هاتییە دامەزراندن و ئەو نەڤیێ (شێخ شەمسەددین قوتب)ە و دەمێ نڤشێ وی لێ ئاكنجی بووی، ژیانا زانستی ل وێرێ پێشكەڤتییە، ئەو دەست بۆ دەستی ب زانست و وانەبێژیێ ناڤدار ببوون و هاتبوونە نیاسین[١٣٠]، ل سالا ١١٩٢مش/ ١٧٧٨ز شێخ عەبدلقەهار ل وێ مزگەفتێ پەرتووكا (ملخص الهیئە) یا مەحمود جەغمینی یا (علم الهیئە) كۆپی كربوو[١٣١].

## ٣٩- مزگەفتا كەمەكا:

گوندێ ناحیا دۆسكی یە ل قەزا دهۆك، ژ وان یێن داویێ زانستێن ئایینی (شرۆڤەیا قورئانێ، فەرموودە، فیقهـ و زمانێ عەرەبی) لێ گۆتین مەلا عیسا كەمەكی بوویە (ل سالا ١٣٤٧مش/ ١٩٢٨ز مالئاڤایی یا داویێ كرییە) و وی ب هووری و شارەزایی پشكێن فیقهێ ژ بەركربوون[١٣٢].

## ٤٠- مزگەفتا کێستە:

گوندەکێ دەڤەرا بەرواری بالایە ل قەزا ئامێدیێ، خواندنگەهەکا گرنگ لێ هەبوو و ب پەرتووکخانەیا خۆ یا پڕ پەرتووك ناڤدار بوویە و ژ لایێ سولتان حسێنێ عەباسی یێ میرێ بەهدینان هاتبوو دانان (ئەو حوکمدار بوو ٨٧٥-٩٤٠مش/ ١٤٧٠-١٥٣٣ز)، ل دەسپێکا سەدسالیا ١١مش/ ٧ زایینی ژ لایێ زوبێر پاشایێ میرێ بەهدینان (ژ سالا ١١١٣-١١٢٦مش/ ١٧٠٢-١٧١٤ز حوکم کرییە) هاتبوو نووژەن کرن[١٣٣]، هژمارەکا زانایان ژ ڤێ خواندنگەهێ دەرچووینە[١٣٤] و ژ وان زانایێن وانەبێژی لێ کرین: ئیبراهیم کێستەیی خودانێ کۆمێنتێن جودا کۆمێنتێن جودا جودا د پتریا زانستان دا و شرۆڤەیا پەیرەوێ فیقهێ، مەحمود کێستەیی[١٣٥]، هەروەسا ل کێستە پەرتووکخانەیەکا مشتی پەرتووك هەبوو و دهاتە گۆتن کو یا خێزانەکا زانستپەروەر بوو و ل وی گوندی ئاکنجی ببوو، دبیت ژی تایەکێ خێزانا حوکمدارا میرگەها بەهدینان بیت، پاشی مشەخت بوویە و پەرتووکخانە ژی بۆ خواندنگەها گوندێ مایێ یا عەشیرەتا بەرواری بالا هاتییە ڤەگوهاستن[١٣٦].

## ٤١- مزگەفتا لیفۆ:

گوندەکێ ناحیا باتیفایە ل قەزا زاخۆ ، مەلا عیسا دۆلی (ل دۆرێن سالا ١٣٣٧مش/ ١٩١٨ز وەغەرا داویێ کرییە) ئێك بوو ژ وان زانایێن وانەبێژیا فیقهێ شافعی و یێن دی لێ کری[١٣٧].

## ٤٢- مزگەفتا مایێ:

گوندەکێ بەرواری بالایە ل قەزا ئامێدیێ، ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان، بەرواری بالا میرگەهەك بوو ب میرێن ئامێدیێ ڤە هاتبوو گرێدان و مالا مەلکایێزی یا دێرین حوکم لێ دکر، میرێ بەهدینان قوباد بەگێ کوڕێ سولتان حسێنێ (٩٨١-٩٩١مش/١٥٧٣-١٥٨٣ز) خواندنگەهەك لێ ئاڤا کر و هەر زوو زانستخوازان قەست کرێ، هەروەسا میر زوبێر پاشایێ کوڕێ سەعید پاشای (١١١٣-١١٢٦مش/١٧٠١-١٧١٤ز) نووژەنکر و مشتی زانا و قوتابی بوو هەتا سالا ١٣٤٣مش/ ١٩٢٤ز گوند و مزگەفتا وێ هاتییە سۆتن دەمێ ئاشووریان ب دروستی ژی عەشیرەتا تیاری هێرش کرییە سەر گوندی، ل خواندنگەهێ دۆلابەکا پەرتووکان هەبوو و د وێ سۆتنێ دا ژناڤچوو[١٣٨]، ژ زانایێن ڤی گوندی: مەلا عەبدلرەحمان مایی دادوەرێ بەرواری بالا، کوڕێ وی شێخ تەها مایی (١٢٥٩-١٣٣٧مش/ ١٨٤٣-١٩١٩ز) کو ئێك بوو ژ ناڤدارێن سەردەمێ خۆ و هۆزان ب هەر سێ زمانێن کوردی و عەرەبی و فارسی دڤەهاندن و دیوانێن هۆزانان ب هەر سێ زمانان هەبوون ئەڤە سەرباری پەرتووکێن دی یێن وی د زانستێن ئیسلامی دا، هەروەسا مەلا محەمەد تاهرێ مایی یێ برایێ وی (ل سالا ١٣٣٣مش/ ١٩١٥ز وە غەرا داویێ کرییە) وەکی وی هۆزانڤانەکێ دیار بوو و نامەیەك د (مرقاة الطلاب في علم الاداب) دا هەیە کو ڤەکۆلینە د ڕێبازێن ڤەکۆلین و چاڤپێکەڤتنێن روو ب روودا[١٣٩]، ڤان هەردو زانایان پێکڤە کار د وانەبێژی و بەلاڤکرنا ڕەوشەنبیریێ د هەمی زانست و هونەران دا ل ناڤ قوتابیان کرییە[١٤٠]، مەلا عومەر مایی کو زانا بوو د بیرکاریێ دا و ل پێشگۆتنا کۆمێنتێن خۆ دا ل سەر (خلاصة الشباب) دا یا (بهاء الدين العاملي) د بیرکاریێ دا گۆتییە کو دەمەکە ئەو ب ڤێ نامەیێ ڤە مژوولە، سەرباری هندێ، وی ڕەخنە ل ڕەوشا زانستی یا سەردەمێ خۆ گرتییە[١٤١]، ئەڤ ژی نیشانێ بلندیا پایا وی یە د ڤی زانستی دا ب هەڤبەرکرن دگەل هەڤچەرخێن دی یێن وی، هەروەسا ئەحمەد مایی ژی زانایەکێ دی یێ ڤی گوندی بوو، هەر ل ڤی گوندێ بچویك دۆلابێن پەرتووکان هەبوون و مشتی گەلەك دەستنڤیس بوون، دبێژن ژ گوندێ کێستەیا هەڤسوو بۆ هاتبوونە ڤەگوهاستن.

## ٤٣- مزگەفتا ناڤشکێ:

ناڤشکێ گوندەکێ ناحیا دۆسکی یە ل قەزا دهۆك، ب ناڤێ مالەکا خەلکێ وێ هاتییە نیاسین کو دەستە بۆ دەستەیێ گرنگی ب زانست و

وانەبێژیێ داینە، نەخاسمە ژی د شرۆڤەیا قورئانێ و فەرمووده و فیقهـ و زانستێن شەرعی دا، مەلا حسێن ناڤشکی ئێك بوو ژ زانایێن وێ ێێن بەرێ و مەلا ئیسماعیل ناڤشکی (ل سالا ١٩٩٤ێ وەغەرا داویێ کرییە) ئێك بوو ژ زانایێن وێ ێێن ڤێ داویێ و وی وانەیێن زانستی گۆتینە مامۆستاییێن دەڤەرا دۆسکی، بەری ل سالا ١٩٥٩ێ ل زاخۆ و بەری ل سالا ١٩٧٥ێ ل دهۆك دەست ب وانەبێژیێ بکەت[142].

## ٤٤-مزگەفتا نسرا:

نسرا گوندەکێ ناحیا ئەتریشە ل قەزا شێخان، خواندنگەهەك لێ هەبوو و زانا مەلا حەسەن بلوتی وانەبێژی لێ کرییە و شێخ عەلی کورێ شێخ محەمەد سلێڤانەیی (١٣٢٤-١٤١٤ مش/ ١٩٠٤-١٩٩٤ ێ زایینی) ئێك بوو ێێن ل سەر دەستێ وی خواندین[143].

## ٤٥-مزگەفتا شێخان یا کەڤن:

ل سالا ١٩٦٥ێ هاتییەئاڤاکرن، ل نیڤا سالێن هەشتییان مەلا حسێنی و پشتی وی ژی مەلا سەعدێ زێباری و مەلا رێبوار بەرواری پێشنڤێژی و خوتبەخوینی ل ڤێ مزگەفتێ کرییە.

-مزگەفتا عومەر کورێ خەتابی ل ناڤ بازێرێ شێخان ل سالێن هەشتییان هاتییەئاڤاکرن

-مزگەفتا سەروکانی هەر ل ناڤ شێخان

-مزگەفتا سمریت ل کۆمەلگەهی

-مزگەفتا گوندێ شکەفت هندی

-مزگەفتا گوندێ گەلی خودێدا

-مزگەفتا گوندێ مەمان

-مزگەفتا گوندێ کیس قەلعە

-مزگەفتا گوندێ مەغارا

-مزگەفتا گوندێ میسکا

-مزگەفتا گوندێ شێڤ شرینێ

ئەڤە هندەك بوون ژ مزگەفتێن پارێزگەها دهۆکێ ێێن زانیاری دەربارێ وان دەست مەکەتین.

# ژێدەر و پەراوێز:

* الجرح والتعدیل( لحدیث ): بریاردانە ل سەر ڤەگێرێ فەرموودەیێن پێغەمبەری(س)کا چەند یێ راستگۆیە و پلا دادوەریا وی .

١. تحسین دوسکی: کیف انتشر المذهب الشافعي بین الکرد، مدارات کرد.

٢. تحسین دوسکی: هەمان ژێدەر.

٣. ژ ناڤێ دامەزرێنەرێ وێ شێخ عەبدولقادر گەیلانی (ل سالا ١١٦٥ێ زایینی وەغەرا داویێ کریە) هاتییە.

٤. ژ ناڤێ دامەزرێنەرێ وێ بەهائەددین محەمەد کورێ محەمەد یێ ناڤدار ب نەقشبەندی یێ نازناڤێ وی بوخاری هاتییە کو سالا ١٣١٧ێ ل بازێرێ بوخارا ل ئاسیا ناڤین ژ دایکبوویە.

٥. مەبەست ژێ شێخ نورەددین بریفکی یە، ئێکە ژ زانایێن رێبازا نەقشبەندی، ل سالا ١٧٩٠ ێ زایینی ژ دایکبوویە و ل سالا ١٨٥١ێ زایینی وەغەرا داویێ کریە.

٦. صدیق الدملوجي: امارة بهدینان، بث ٢٣.

٧. ئەو (ضیاء الدین ابو البهاء خالد بن حسین الشهرزوري الشافعي) نووکەرێ رێبازا نەقشبەندی یە ل عیراقێ و ب (مەولانا خالد) دهێتە نیاسین و ل سالا ١٨٢٧ ێ ل دیمەشق وەغەرا داویێ کریە.

٨. دگەل دەمەلۆجی نینین د هەلسەنگاندنا وی دا بۆ هەلویستێ دەولەتا ئۆسمانی ل دۆر رێبازێن سۆفیاتیێ دەمێ دبێژیت کو دەولەتێ (ب چاڤێ گۆمان و هشیاریێ بەرێ خۆ ددا سۆفییان و ب مەترسییەکا مەزن ل قەلەم دادان)، چونکی پەیوەندیا ئۆسمانییان ب رێبازێن سۆفیاتیێ ڤە ڤەدگەرینتە دەمەکێ زوو ژ دیرۆکا ئاڤابوونا دەولەتا وان، هەروەسا ئۆسمانییان ژی ژ بەر ئەگەرێن سیاسی چاڤدێریا رێبازێن سۆفیاتیێ کریە، هەر بۆ نموونە، دەولەتا ئۆسمانی رێبازێن سۆفیاتیێ ێێن ل عیراقێ هاندانە، ئێك، بۆ روو ب رووبوونا وەهابیێ، دو: بۆ ب دەستڤەئینانا پشتەڤانیێ بۆ ئۆسمانییان، ئۆسمانییان گرنگیدایە گۆڕ و

دیمەنێن (رێ ورەسمێن) ئایینی و خودان رێبازێن سۆفیاتیێ نێزیکی خۆ کرینە، لێ پێدڤییە ئاماژە ب وێ چەندێ ژی بێتەکرن کو سولتان مەحمودێ دووێ (١٨٠٨-١٨٣٩ز) پشتی ل ١٨٢٦ێ زایینی ئینکیشاری ژ ناڤبرین، هندەك رێکار دژی بەگتاشییان ئەنجام دابوون، چونکی پەیوەندییەکا موکم ل ناڤبەرا ئینکیشاریێ و بەگتاشیێ هەبوو.


٩. ئەردەبیل باژێرەکە ل هەرێما ئازەربایجانێ ل باکوورێ رۆژئاڤایێ ئیرانێ.

١٠. غیاس خالد زێباری، ژ دیرۆکا زانایێن زێباری، کوڤارا سپیە، هژمار ٥٦ شبات – ٢٠١٤، بپ ٢٠- ٢١.

١١. بطرس حداد، حیاة البطریرك مار یوسف اودو، مجلة بین النهرین، العدد٤٢، الموصل، ص

١٢. الشیخ انور الشیخ ابراهیم الشیخ عبدالرزاق، قریة بامرني في عهد مشایخ الطریقة النقشبندیة بین ١٨٥٣- ١٩٥٨، مخطوطة بحوزة الدکتور نوري عبدالرحمن.

١٣. بنێرە: ملا محمد سعید یاسین البریفکانی الدهوکی، اعداد مسعود محمد سعید یاسین البریفکانی: فضلاء بهدینان، دهوك، ١٩٩٧م، ص ١١٦ و محفوظ العباسی.

١٤. کۆیی: ژ ناڤێ باژێرێ کۆیە(کویسنجەق) هاتییە کو ل کوردستانا عیراقێ یە، ژێدەرێ بەرێ ص ١٨٢.

١٥. الملا سعید یاسین: ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢، محفوظ العباسی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٣.

١٦. الملا سعید یاسین: ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٥.

١٧. هەر ئەو ژێدەر: بپ ١٠٤ و محفوظ العباسی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٨.

١٨. محفوظ العباسي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٠.

١٩. الملا سعید یاسین: ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢١.

٢٠. پەیوەندییەك ل ناڤبەرا زانایێن کوردستانا عیراقێ و زانایێن کوردستانا ترکیا هەبوویە و شێخی مفا ژ ئەنجامێن ڤێ پەیوەندیێ وەرگرتییە.

٢١. هەر ئەو ژێدەر: بپ ١١٧.

٢٢. هەر ئەو ژێدەر: بپ ١٣٢.

٢٣. الملا سعید یاسین: ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٨، محفوظ العباسي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٨.

٢٤. هەر ئەو ژێدەر: بپ ١٧٩.

٢٥. هەر ئەو ژێدەر: بپ ١٧٧.

٢٦. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.

٢٧. محفوظ العباسي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٨.

٢٨. ملا سعید یاسین: ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٧.

٢٩. هەر ئەو ژێدەر: بپ ١٠٣، محفوظ العباسي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨١.

٣٠. هەر ئەو ژێدەر: بپ ١٠٦، محفوظ العباسي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٠.

٣١. ملا سعید یاسین: ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٨.

٣٢. هەر ئەو ژێدەر: بپ ١١٩، محفوظ العباسي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٤.

٣٣. ملا سعید یاسین: ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١٧، ژێدەرێ بەرێ محفوظ العباسي.

٣٤. ملا سعید یاسین: ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٨.

٣٥. محفوظ العباسي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٧.

٣٦. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٨١.

٣٧. ملا سعید یاسین: ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٣.

٣٨. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.

٣٩. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.

٤٠. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.

٤١. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.

٤٢. ڤەکۆلینەکا مەیدانی.

٤٣. ڤەكۆلینەكا مەیدانی.
٤٤. ڤەكۆلینەكا مەیدانی.
٤٥. مصطفى نوری بامەرنی، ئەڤەیە بامەرنێ، دهۆك- ٢٠٠٤) بپ ١٠٤- ١٠٦؛ سادق بەهائەدین ئامێدی، هۆزانڤانێت كورد (بەغدا- ١٩٨٠).
٤٦. (تەكیا بریفكا) ژ ناڤێ گوندێ بریفكا هاتییە كو دكەڤتیە باشووری كوردستانێ، ب دووریا دەهـ كیلۆمێتران ل رۆژهەلاتێ باژێرێ دهۆك، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٦.
٤٧. ملا سعید یاسین؛ ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٥.
٤٨. محفوظ العباسي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٤.
٤٩. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٨٤.
٥٠. ملا سعید یاسین؛ ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١٨، ژێدەرێ بەرێ محفوظ. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٣.
٥١. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٨٢.
٥٢. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٨٠.
٥٣. ملا سعید یاسین؛ ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٧، ژێدەرێ بەرێ محفوظ. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٨.
٥٤. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٧٦.
٥٥. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٧٦.
٥٦. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٧٥.
٥٧. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٧٤ و ملا سعید یاسین، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٤.
٥٨. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٧٤.
٥٩. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٢١
٦٠. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٩٧.
٦١. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٧٤.
٦٢. ملا سعید یاسین؛ ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٦.
٦٣. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١١٩.
٦٤. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٨٦.
٦٥. هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٨٢.
٦٦. الدلیل العراقي لسنة ١٣٥٣ه ١٩٣٦م، بث ٩٤٤؛ محفوظ العباسي، ژێدەرێ بەرێ، بەریەرێن ١٨٢-١٨٣.
٦٧. ملا محمد سعید یاسین؛ ژێدەرێ بەرێ، بەریەرێن ٩٦ و٩٧.
٦٨. ڤەكۆلینەكا مەیدانی.
٦٩. (احمد العباس) و (احمد العقری) یێن بەری نۆكە مە داینە نیاسین.
٧٠. مجله دهوك، شخصیه العدد، العدد ٣١- تموز ٢٠٠٦.
٧١. محمد سعید البریفكانی، بەریەرێن ٢٣-٢٤.
٧٢. مخطوطات الموصل، بەرگێ٥، بپ ٥٧ و محفوظ، ص ١٥٩.
٧٣. المائی، بپ ١٩١ و پەرتووكا وی: الفردوس المجهول، كاغەزا ٣٠.
٧٤. فضلاء بهدینان، بپ ١٦ و محفوف، بپ ١٧٨.
٧٥. فضلاء بهدینان، بپ ٩٧.
٧٦. فضلاء بهدینان، بپ ١٦.
٧٧. فضلاء بهدینان، بپ ٤١.
٧٨. المائی، بپ ١٨٦.
٧٩. فضلاء بهدینان، بپ ١٩.

٨٠. في المركز الوطني للمخطوطات، قرةداغي، بەرگێ ٤، بپ ١٥.
٨١. الكزني، محمد احمد: الشيخ نورالدين البريفكاني، القاهرة، ١٩٨٣، بەریەرێن ٧-٥٤ و محمد زكي حسين: اسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الاسلامية، اربيل، ١٩٩٩، بپ ٣١٨.
٨٢. فضلاء بهدينان، بپ ٢٤.
٨٣. في المركز الوطني للمخطوطات، قرةداغي، بەرگێ ٢، بپ ١٣.
٨٤. فضلاء بهدينان، بپ ٩١.
٨٥. محفوظ، بپ ١٨٤.
٨٦. المائی، بپ ٢٣٦.
٨٧. فضلاء بهدينان، بپ ٨٦.
٨٨. فضلاء بهدينان، بپ ١١٢ و بشير عبدالرحمن: بهدينان وعشائرها، بپ ٣٤٤.
٨٩. قەرەداغی، محمد علی: بایەخدانی میرانی ئامێدی، هەولێر، ٢٠٠٦، بپ ٢٣.
٩٠. المائی، الاكراد فی بهدينان، بپ ٢١٨.
٩١. العمري، ابن فضل الله العمري: مسالك الابصار، مخطوط مصورة، اصدره فؤاد سزكين، بەرگێ ٣، بپ ٢٦٣.
٩٢. المخطوطات الفقهية، بپ ٣٠٧.
٩٣. في مكتبة السيد احمد البغدادي الشخصية في بغداد.
٩٤. مە ئەو دەستنڤیس ل پەرتووكخانا تایبەتییا هندەك زانایان ل مووسل دیت.
٩٥. فچلاو بهدينان، بپ ٢٢.
٩٦. بنێرە: المائی، بپ ٨٢ و العباسي: ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٩، هەروەسا بنێرە: الكزنی، محمد احمد: الشیخ نورالدين البريفكانی، بپ ٤٦ و فضلاء بهدينان، بپ ٨٥.
٩٧. فضلاء بهدينان، بپ ٣٤.
٩٨. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٣٠٣.
٩٩. علماؤنا، بپ ٣٠٣.
١٠٠. العمري، محمد امين: منهل الاولياء، تحقيق سعيد الديوةجي، مووسل ١٩٦٨، بەرگێ ١، بپ ٢١١ و محفوظ، بپ ١٧٠.
١٠١. هەروەكی د دەستنڤیسا سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان دا هاتی، قەرەداغی، بەرگێ ٣، بپ ١٩٢.
١٠٢. الكزني، محمد احمد: الشيخ نورالدين البريفكاني، بپ ٢٦.
١٠٣. المائی، بپ ١٥٩، محمد امين زكی: مشاهير الكرد، بەرگێ ٢، بپ ٤١.
١٠٤. فضلاء بهدينان، بپ ٣٤.
١٠٥. المائی، بپ ١٥٩.
١٠٦. ل پەرتووكخانا مەلبەندییا زانكۆیا دهۆك، هژمارە ٨١.
١٠٧. ل سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان، قەرەداغی، بەرگێ ٢، بپ ٢٧.
١٠٨. دەستنڤیسێن مووسل، بپ ٢٥٠.
١٠٩. ل سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان، قەرەداغی، بەرگێ ٣، بپ ١١.
١١٠. فضلاء بهدينان، بپ ١٠٣.
١١١. ل پەرتووكخانا مەلبەندییا زانكۆیا دهۆك، هژمارە ٧٣.
١١٢. ل سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان، قەرەداغی، بەرگێ ٣، بپ ٥٦.
١١٣. فضلاء بهدينان، بپ ٩٨.
١١٤. محفوظ، بپ ٣٠.
١١٥. ل سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان، قەرەداغی، بەرگێ ٥، بپ ١٠.
١١٦. ل سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان، قەرەداغی، بەرگێ ٢، بپ ٣٧.

١١٧. المقرزي: السلوك، ج٤ ق١، ص ٢٩٣.
١١٨. المائی، بپ ١٨٦.
١١٩. المائي، بپ١٩ و پەرتووكا وی: الفردوس المجهول، كاغەزا ٣٠.
١٢٠. دەستنڤیسێن مووسل، بپ ٣٥١.
١٢١. ل سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان دا هاتی، قەرەداغی، بەرگێ ٢، بپ ٤٥.
١٢٢. ل سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان دا هاتی، قەرەداغی، بەرگێ ٤، بپ ٣٢.
١٢٣. ل سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان دا هاتی، قەرەداغی، بەرگێ ٢، بپ ٣٦.
١٢٤. عماد عبدالسلام: مراكز ثقافیة مغمورة، بپ ٦٧
١٢٥. عماد عبدالسلام: المعجم التاريخی لاماره بهدينان، بپ ٣١١.
١٢٦. المائی: الأكراد فی بهدينان بپ ١٨٩
١٢٧. عماد عبد السلام: محمد بك بن سعيد بك مخترع البراشوت، كۆڤارا (الصوت الاخر)، هەولێر، هژمارە ١٢٨، ئادارا ٢٠٠٧، بپ ٢٢.
١٢٨. فضلاء بهدينان، بپ ٩٨.
١٢٩. المائي، بپ ٢٠٤ و محفوظ، بپ ١٦٥.
١٣٠. فضلاء بهدينان، بپ ٨٧.
١٣١. ل سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان، قەرەداغی، بەرگێ ٤، بپ ١٥٩.
١٣٢. فضلاء بهدينان، بپ ١٠٦.
١٣٣. المائی، بپ ١٨٦.
١٣٤. المائی، بپ ٨٢.
١٣٥. المائي، بپ ١٩١ و پەرتووكا وی: الفردوس المجهول، كاغەزا ٣٠ و محفوظ، بپ ١٨٦.
١٣٦. فضلاء بهدينان، بپ ٢١.
١٣٧. فضلاء بهدينان، بپ ١٠٠.
١٣٨. دەستنڤیسێن مووسل، بپ ٢٥٤.
١٣٩. المائی، بپ ٢١٠.
١٤٠. فضلاء بهدينان، بپ ٢٠.
١٤١. ئەڤ دەستنڤیسە د ل سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان، قەرەداغی، بەرگێ ٢، بپ ١٠٢ و المائی: الفردوس المجهول، كاغەزا ٣٠.
١٤٢. فضلاء بهدينان، بپ ٩٧.
١٤٣. بشير سعيد: بهدينان وعشائرها، بپ ٣٣٤.

# بەلاڤبوونا مەسیحییەتێ ل دەڤەرا بەهدینان

**پ.د. فەرسەت مەرعی**
**وەرگێران: سالح یوسف سوفی**

(مەسیحییەت) یان (نەسرانییەت) ئێکە ژ هەر سێ ئایینێن ئاسمانی یێن ب هژمارە ژ یێن دی زێدەتر و پشتی جوهیانیێ یا مووسا پێغەمبەرێ خودێ مزگینی پێدای (سلاڤ ل سەر بن) و بەری ئیسلامێ یا محەمەد پێغەمبەرێ خودێ یێ بانگخوازی بۆ کری (سلاڤێن خودێ ل سەر بن) دهێت، پتریا جاران ژی لێڤکرنا (نەسرانییەت) ب هەڤواتایا لێڤکرنا (مەسیحییەت) دهێت، هەرچەندە ژی گەلەك نڤیسەر و ئوسقوفێن وێ خۆ ب نەسرانی ناڤ دکەن لێ نۆکە لێڤکرنا (مەسیحییەت) ناڤدارتر و بەربەلاڤترە، هندەك رۆژهەلاتناس ژی وەسا دبینن کو لێڤکرنا نەسارا (نصاری) د بنیات دا ژ پەیڤا سریانی (نەسرایا) Nasraya هاتییە و بۆ مەسیحیێن رۆژهەلاتێ دهێتە گۆتن، هەروەسا هندەك دیرۆکنڤیس ژی وەسا دبینن کو ڤێ لێڤکرنێ پەیوەندی ب باژێرێ ناسرە(ناصرە) ڤە هەیە[1] کو سەید مەسیح ب خۆ ژی (سلاڤ لێ بن) ژ وی باژێرییە، هەر بۆ نموونە، دهێتە گۆتن: یەسوعێ ناسری، یان پەیوەندی ب (ناسریان) ڤە هەیە کو ئێکە ژ تیمێن سەرکەفتیێن جوهیانی[2].

مەسیحییەت ژی پشتی بلندکرنا عیسای (مەسیح) بۆ ئاسمانی، ل پێشیێ ل فلەستین پاشی ل هەمی دەڤەرێن جیهانێ بەلاڤ بوو، لێ تشتێ بۆ ڤەکۆلینا مە گرنگ بیت ئەوە کو ل داوییا سەدسالیا ئێکێ و دەستپێکا سەدسالیا دووێ زایینی ل دووڤ دیتن وبۆچوونا کەنیسەیێ و نڤیسەرێن وێ و ل دەستپێکا سەدسالیا سێ یێ زایینی ل دووڤ بۆچوونا رۆژهەلاتناس و زانایێن ئەورۆپا یێن بسپۆر د کاروبارێن سریانییەتێ دا سەرتیرێن مەسیحییەتێ گەهشتییە وەلاتێ ل ناڤبەرا دو رووباران (میزۆپۆتامیا - Mesopotamia) و کوردستانێ و بانییا ئیرانێ.

مەسیحییەت ژی وەسا ڤەدگێڕیت کو مار ئادی (یان ئادی شێر) مزگینی ب مەسیحییەتێ دایە و ل دۆرێن سالا ۹۹ ێ زایینی شیایە زەلامەکێ ب ناڤێ فقیزا (فقیژا) مۆر بکەت و بکەتە نەسرانی کو ژ خێزانەکا هەژارا هەولێر (ئەربیل) بوو و ژ خێزانا خۆ رەڤی بوو و گەهشتبوو مار ئادی یێ پێنج سالان ل ناڤ وەلاتێ کوردان ل میرگەها حەدیاب (ئەدیابین) ب ئنجیلێ مزگینی ب مەسیحییەتێ ددا، پاشی ئەو کرە ئوسقوف و ل سالا ۱۰٤ ێ زایینی هنارتە هەولێر، مەتران ئادی شێر ژی[3] لیستەك ب ناڤێ دەە ئوسقوفان ئینایە یێن هەر ژ سالا ۱۰٤ ێ هەتا سالا ۳۱۲ ێ زایینی ل سەر کورسییا ئوسقوفییا باژێرێ هەولێر روونشتین کو ئەڤە ژی زنجیرا ناڤێن وان و

دەمێ روونشتنا وانە ل سەر کورسیا ئوسقوفییا وی باژێری:

| ز | ناڤ | ماوێ ئوسقوفیێ و دەمێ وان |
| --- | --- | --- |
| ١ | بقیدا | ١٠ سال (١٠٤-١١٤ ز) |
| ٢ | شەمشۆن | ٣ سال (١٢٠-١٢٣ ز) |
| ٣ | ئیسحاق | ١٣ سال (١٢٣-١٣٦ ز) |
| ٤ | ئیبراهام | ١٥ سال (١٥٠-١٦٥ ز) |
| ٥ | نوح | ١٦ سال (١٦٥-١٨١ ز) |
| ٦ | هابیل | ٧ سال (١٨٤-١٩١ ز) |
| ٧ | عەبید مەشیحا | ٢٥ سال (١٩١-٢١٦ ز) |
| ٨ | حەیران | ٢٣ سال (٢١٦-٢٤٩ ز) |
| ٩ | شحلوپا | ١٥ سال (٢٤٩-٢٥٤ ز) |
| ١٠ | ئاحادابوی | ١٨ سال (٢٥٤-٢٧٢ ز)[٤] |

هەر د وی چارچۆڤەی دا مەسیحییەت وەسا ڤەدگێرێت کو مار ئادی و مار ماری[٥] ئێکەمین هنارتی بوون مزگینیا مەسیحییەتێ ل باژێرێ بێت سلوخ (کەرکوك) و دەڤەرێن دەردۆرێن وێ دای[٦].

ئادی شێر د ڤەگێرانێن خۆ دا پشتا خۆ ب دیرۆکا هەولێر (تأریخ اربیل) یا مەشیخا زخا گەرم دکر و ئەڤ دیرۆکە بۆ جارا ئێکێ ل سالا ١٩٠٧ ێ زایینی ژ لایێ ئەلڤۆنس مەنکنا[٧] ب ناڤ ونیشانێن دیرۆکا هەولێر (تأریخ اربیل) Choroniqued Arbele هاتییە بەلاڤ کرن کو وی پێکۆل دکر ناڤێ مەشیخا زخا دانیتە سەر ڤێ پەرتووکێ هەروەکی (عەبد یەشوع سوباوی)یێ دیرۆکنڤیسێ سریانی د دەهمەنا خۆ دا گۆتی کو مەشیخا زخا دیرۆکەکا دروست ل سەر کەنیسەیێ هەیە[٨] و ێ پەرتووکێ بکروڤەکێشەکا مەزن ل ناڤ ڤەکۆلەر و کەسانێن گرنگێ ب دەستنڤیس و ژێدەرێن سریانی ددەن پەیدا کر، هەر بۆ نموونە، ئەدوارد ساخو Edward Sachau رۆژهەلاتناسێ ئەلمانی وەك ژێدەرەکێ گرنگ بۆ دانەنیاسینا چەندین بەرپەرێن تاری و نەدیارێن دیرۆکا مەسیحییەتێ ب گشتی و کەنیسەیا رۆژهەلاتێ ب تایبەتی ل قەلەمدایە و ل سالا ١٩١٥

ێ زایینی وەرگێرایە زمانێ ئەلمانی، لێ فرانس زۆریل وەرگێرایە لاتینیێ، هەروەسا مەتران پەتروس عەزیز ژی وەرگێرایە سەر زمانێ عەرەبی و ل سەر بەرپەرێن کۆڤارا (النجم) یا ل مووسل ب چاڤدێریا مەتران (سلیمان الصایغ) ل سالێن ١٩٢٩-١٩٣١ ێ زایینی دەردکەڤت بەلاڤ کریە[٩].

لێ مار پۆل پەتروس p. paul peeters گومان ل سەر سەنگ و لاوازیا ڤی دەقێ دیرۆکی هەبوون و رەخنە ل سەر هەبوون[١٠] و د ڤێ چەندێ دا (ئۆرتیزدی ئۆربینا)یێ مەسیحی ئەوێ ل دژی مەنگەنا و دەقێ وی یێ بەلاڤکری بوو پشتەڤانیا پەتروس کر، لێ مەسیحی یێ دی (مەسینا) بەرەڤانی ژ مەنگەنا کر[١١]، بۆ دەرکەفتنێ ژی ژ ڤێ گرفتاریێ، زانایێ دەستنڤیسان (ئەسالفج) تاقیکرن ل سەر نڤیسینا د ڤێ دەستنڤیسێ دا کر و گەهشتە وی ئەنجامی کو نڤیسینا ڤێ دەستنڤیسێ یا سەردەمەکێ نوویە، پاشی دیرۆکنڤیسێ ناڤدارێ دۆمەنیکی (جان مۆریس فیێ) د وی ڤەکۆلینەکا خۆ دا یا سالا ١٩٦٧ ێ د بەلاڤکری، بابەت ئێکلا کر و گۆت: دشیاندا نینە وەك ژێدەرەکێ دیرۆکی پشت ب ڤی دەقی بهێتە گەرمکرن، چونکی ل بەر رۆناهیا ژێدەرێن دی نەبیت، ئەم نەشێین برگەیێن رەسەن و سەختەیێن ڤی دەقی ژێکجودا بکەین، ژ بەر هندێ، باشترە بهێتە پشتگوهڤەهاڤێتن، هەروەکی نەبیت[١٢].

ڤەرە بێژین کو رەخنەگرێن رەخنە ل دەقێ بەلاڤکریێ مەشیخا زەخا گرتین گەهشتنە وی ئەنجامی کو دەستنڤیسا رەسەن یا مەنگەنا ل سالا ١٩٢٧ ێ زایینی ب ٣٥٠٠ فرەنکان فرۆتییە پەرتووکخانەیا بەرلین و ب هژمارا ٣١٢٢٦ ل وێ پەرتووکخانەیێ هاتییە تۆمار کرن، نەیا سەردەمەکێ کەڤنە، بەلکی یا سەردەمەکێ نوویە و ژ لایێ قەشە ئۆراها شکوانایێ ئەلقۆشی (١٨٥١-١٩٣١) هاتییە نڤیسین و پێکۆل کریە سەختەکاریێ تێدا بکەت و ب دووکێلا تەنوورێ دویدایە، هەروەکی ئەسفالج شارەزایێ دەستنڤیسان گەهشتییە وی ئەنجامی، هەروەسا قەشە ئۆراها شکوانا بۆ هەڤالەکێ

خۆ دانپێدان کر کو مەنگەنا ئەو رێ نیشادایە کا چەوان ئەو دەستنڤیس دێ کەڤن دیار بیت[١٣]، ب پشتگەرمییا ڤان هوورکاریێن دیرۆکنڤیسێ کەنیسێ یێ دۆمەنیکی فیێی Fiey کەس ب سەر دەستنڤیسا (ئەڤرور) یا کەڤن هەلنەبوویە یا مەنگەنە پرۆپاگەندا وێ چەندێ کری کو ئەو شیایە ب دەست خۆ بێخیت[١٤]، ل ڤێرە (یوسف حبی) ڤەکۆلەرێ کلدانیێ عیراقی پرسیارێ دکەت و دبێژیت: بۆچی قەشە مەنگەنا ب ڤێ خاپاندنێ رابوویە و ژ نك خۆ پێڤەنایە و ل سەر دەڤێ رەسەن زێدە کریە؟ لێ هەر ئەو بەرسڤا خۆ ددەت وپشتراست دکەت کو رەخنەگر گەهشتینە وێ ئەنجامی کو ئارمانجا مەنگەنا ژ ڤی کاری نە مادده بوویە، بەلکی ئارمانجا وی پتر ب درەودەرئێخستنا گۆتگۆتکێن سریانیێن نوو (ئانکو رۆژهەلاتناسان) بوویە[١٥]، ئەوێن ئەو چیڤانۆك و سەرهاتیێن سریانی ب درەو دەرئێخستین یێن پشتراستدکەن کو مەسیحییەت ل دەستپێکا بەلاڤبوونا مەسیحییەتێ ل وەلاتێ ناڤبەرا دو رووباران و ئیرانێ ل سەر دەستێ هنارتییان یان شاگردێن وان بوویە و کارێن تۆما و مار ئادی و ماری تنێ هندەك چیرۆك و سەرهاتی بن، پتر ژ هندێ رووداێن یێن دیرۆکی بن.

بۆ رێککەڤتنێ ژی ل ناڤبەرا ڤان دیتن وبۆچوونێن هەڤدژێن نڤیسەرێن کەنیسێ و رۆژهەلاتناسان، وەسا دیارە مەسیحییەت ژ باژێرێ رهایێ هاتبیتە باکوورێ وەلاتێ دو رووباران[١٦] و ل پێشییێ گەهشتییە هەرێما حەدیاب (ئەدیابین - ئەربیل) و بێت کرمای و نۆهدرا (بەهدینان)، پاشی گەهشتییە پشت چیایێن کوردستانێ (زاگرۆس) و سال بۆ سالێ گەلەك ژ خەلکێ ڤان دەڤەران بووینە مەسیحی و جڤاك و ئاکنجیگەهێن بچووك یێن مەسیحی ژێ پێکهاتینە یێن ل داوییا دەولەتا پریی(ئەشکانی - شاهێن تیرەیان) و ل دەستپێکا پەیدابوونا دەولەتا ساسانی ل سالا ٢٢٤ ێ زایینی چ گرنگییا خۆ نەبووینە، ئارسەر کریستنسن رۆژهەلاتناسێ ئەلمانی تەکەزێ ل سەر ڤی لایەنی دکەت و دبێژیت: چیڤانۆك سانت تۆما (مار تۆما) دکەتە مسیۆنێر ل پاریا(رۆژهەلاتێ ئیرانێ)، د سەختەکارێن تۆماس ژی دا دبینین کو وی پەیاما خۆ گەهاندییە هندستانێ ژی، لێ کارێن وی ژ لایێ دیرۆکی ڤە دراست ودروست نینن[١٧]، هەروەسا دەمێ بەحسێ وی رۆلێ سیاسیێ ژێکۆتی دکەت یێ دبیت مەسیحییان د دەولەتا (پاریی) دا هەبیت، دبینین دبێژیت: نەسرانییان چ رۆلێ سیاسی ل سەردەمێ ئەشکانییان نەبوویە.. و پلەیا جاسلیق(جاپلیق) ل سەردەمێ ئەشکانییان نەبوویە[١٨]، هەر ل سەر وێ مەسەلێ مەتران ئادی شێر ئاماژێ دکەتە وێ چەندێ کو هنارتی ماری: دەست ب گەریانێ ل وەلاتێ حەدیاب و کەرکوك کریە.. هەتا وی دەمێ ل سالا ٨٢ ێ زایینی ل مەداین وەغەرا داویێ کری، ئەو ٣٣ سالان ل رۆژهەلاتێ یێ ئاکنجی بوو و ل وێرێ کورسیا پەترەکی یێ ل مەداین (مەدائن - سەلمان پاك) دانایە و ئەو بوویە ئێکەمین ئوسقوفێ کورسییا پەترەکی[١٩].

نەسرانی یێن ئیرانێ و وەلاتێ هەردو رووباران و کوردستانێ د تەناهیێ دا دژیان ژ بەرکو هژمارا وان یا کێم بوو و هزرێن وان کاریگەرییا خۆ ل سەر پلانا گشتییا دەولەتا ساسانی نەبوو، لێ هەلویست هاتە گوهۆرین دەمێ ل دەستپێکا سەدسالییا چوارێ مشەختی ئیمپراتۆرێ رۆمانی کوستانتین Costantin (٣٠٦-٣٣٧) ێ زایینی ل سالا ٣١٣ ێ زایینی مەرسوما ناڤدارا میلان دەرئێخستی و دانپێدان کری کو مەسیحییەت ئێکە ژ ئایینێن دەستووردای ل ناڤ ئیمپراتۆرییا رۆمانی[٢٠]، ڤێجا دڤیا مەسیحی یێن ئیمپراتۆرییا فارسییا ساسانی خۆ ل بەر ئەنجامێ ڤی کاری بگرن ژ بەرکو دەولەتا ساسانی ئەو وەك کرێگرتییێن (بەتالیۆنا پێنجێ یا Fifth Campagain ) دەولەتا رۆمانی ل قەلەم ددان[٢١].

تشتێ ئەڤ ئارێشە بەرفرەهتر لێ کری ئەو بوو دەمێ ئەرمەنستان دەولەتا توخیبی یا ل ناڤبەرا فارس و بیزەنتە بوویە نەسرانی(مەسیحی)، ئەڤە ژی دەمێ شاه تیرداتێ سێێ Tradt III ل سالا ٣٠١ یان ٣١٤ ێ زایینی ب فەرمی نەسرانیبوونا

ئەرمەنستانێ راگەهاندی[22]، تشتێ پشتەڤانییا ڤێ ئاخڤتنێ دکەت ئەو نامەیە یا شاهێ فارسی شاپۆرێ دووێ (٣٠٩-٣٧٩)ێ ئاراستەی میرێن ئەرمەن کری و تێدا دبێژیت: دەمێ هوون ئاگەهداری ڤێ فەرمانا مە یێن خوداوەند دبن کو مە دگەل نامەیێن دی بۆ وە هنارتییە، دڤێت هوون سیمۆنێ سەرۆکێ نزارییان دەستەسەر بکەن و نەبەردەن هەتا وی دەمێ ڤێ بەلگەنامەیێ مۆر دکەت و رازی دبیت دوقات زێرەسەرێ و سزایێن دارایی کۆم دکەت و ئەڤ چەندە بۆ مە ژ هەمی نزاری یێن ل وەلاتێ مە و ل سەر ئاخا مە دژین بهێتە پشتراست کرن، چونکی ئەم وەك خوداوەند مە چ نینە ژ بلی دەردەسەریێن شەڕی، لێ وان چ نینە ژ بلی رحەتیێ و خۆشییا خۆ! ئەو ل وەلاتێ مە د ئاکنجی نە، لێ ب هەستێن خۆ دگەل قەیسەری نەیارێ مەنە[23].

هۆسا، سال بۆ سالێ خرڤەبوونێن مەسیحییان ل دەڤەرێ زێدە بوون و ل ناڤ ئیمپراتۆرییا ساسانی بوونە خرڤەبوونێن دەستنیشانکری و پەژێکا ڤان ڤێکنەکرنێن تیۆلۆژی یێن کەنیسەیا مەسیحی ڤەگرتی، بوو ئەگەرێ وێ چەندێ مەسەبێ مەنۆفستی(یەعقۆبی) ببیتە مەسەبێ هەڤڕکێ مەسەبێ نەستۆری یێ بەربەلاڤ ل ناڤ ئیمپراتۆرییا ساسانی.

ئەڤ روودانە دەستپێکا ئێکەمین تەپەسەرییا (ئەشکەنجەدانا) دژی مەسیحییان ب گشتی و کوردێن مەسیحی ب تایبەتی بوو و وێ تەپەسەریێ ژ سالا ٣٣٩ ێ زایینی دەست پێ کر هەتا مرنا شاه شاپۆرێ دووێ ل سالا ٣٧٩ ێ زایینی ڤەکێشا کو ژێدەرێن سریانی ناڤێ (تەپەسەرییا چل سالی)[24] دانابوو سەر ژ بەرکو تەپەسەرییەکا گەلەك دژوار و توندوتیژ بوو و دەمەکێ درێژ ڤەکێشا بوو، مار (ئەلبێر ئەبونا) بەحسێ ڤی لایەنی دکەت و دبێژیت: قەلەم نەشێت دەربڕینێ ژ وان دەردەسەرییان بکەت یێن وی دەمی ب سەرێ مەسیحییان هاتین و وان قوربانیێن مەزن یێن د رێیا باوەرییا خۆ دا داین، ناڤێن گەلەك ژ وان د دیرۆکێ دا نەهاتینە، گەلەکێن دی ژی دیرۆکێ ژ بلی هندەك زانیارێن کێم، چ زانیاری یێن دی ل سەر نەداینە[25].

ئارسەر کریستنسن مامۆستایێ زانکۆیا کۆپنهاگن یادانیمارکی ئەو تەپەسەری پشتراستکریە یا ب سەرێ کوردێن مەسیحی هاتی، دەمێ دبێژیت: ئەو تەپەسەری ب تایبەتی ل ویلایەتێن باکوور و رۆژهەلاتێ دەڤەرێن نێزیکی توخیبێ ئیمپراتۆرییا رۆمانی (کوردستانا باکوور) هاتینە روودان، ل وێرێ کوشتار و کۆمکوژی، هەروەسا دەربەدەری هاتینە روودان، ل سالا ٣٦٢ ێ زایینی ژی پشتی شۆڕشەکێ نەه هزار مەسیحی دگەل ئوسقوف هیلیۆدۆر ژ کەلها فنك[26] ل بەزابدە(جزیرا بۆتان) بۆ خوارەزم (رۆژهەلاتێ ئیرانێ)[27] هاتینە دوورئێخستن[28].

ژ لایەکێ دیڤە ژێدەرێن سریانی بەحسێ گەلەك مەسیحی یێن کورد و نە کورد کریە یێن ل سەردەمێ تەپەسەرییا فارسی هاتینە کوشتن و ژ ناڤچووین و گەلەك ژ وان ناڤێن خۆ یێن کوردی پاراستینە هەرچەندە گەهشتبوونە پێگەهێن بلندێن پەییسکا کەهنۆتییا مەسیحی وەکی پێگەهێ جاسلیق(جاپلیق)[29] شاهدۆست یێ ناڤێ خۆ یێ کوردی پاراستی کو رامان ژێ (هەڤالێ شاهی)یە[30] و وەك جاسلیق هاتبوو هەلبژارتن، لێ مەسەلا وی دیار بوو و فارسان ئەو و ١٢٨ هزار ئوسقوف و رەبەن گرتن و پێنج هەیڤان زیندانیکرن و ل دەمێ زیندانکرنێ بەرهنگاری دژوارترین جۆرێن ئەشکەنجەدانێ بوون، هەروەسا دەمێ دەست ژ بیروباوەرێن خۆ بەرنەداین، مەرزبانێ مەداین ١٢٠ ژێ کوشتن و جاسلیق شاهدۆست و یێن دی یێن دگەل ماین هنارتنە نك شاه شاپۆرێ دووێ و وی ژی دلەی دلێ وان دا داکو وان بینیتە ناڤ زەردەشتیێ، لێ دەمێ وی و هەڤالێن وی ئەو چەند رەت کری، ل رۆژا ٢٠ ێ شواتا سالا ٣٤٢ ێ زایینی هاتنە کوشتن[31].

ل سالێن ئێکێ یێن حوکمێ شاهێ فارسی بەهرامێ پێنجێ (٤٢٠-٤٣٨ ێ زایینی) میر شاپۆر و فەیرۆز و نڤیسەر یەعقۆب هاتنە کوشتن [32]،

لێ ناپینالێ شارەزووری ل نسێبینێ خواند و گرنگی ب خواندنا شرۆڤەکرنێ کر و ژ لایێ شاه کیسرایێ دووێ ڤە (٥٩٠-٦٢٨ ێ زایینی) هاتە زیندان کرن، پاشی کوشت ژ بەرکو کۆمەلا ل بن فەرمانا وی سەرکردەیەکێ فارسی ل وی باژێری کوشتبوو ب بەهانا هەرڤاندنا کەنیسا وی[٣٣].

بەرێ ژی ئانکو ل سالا ٣٥٨ ێ شاه شاپۆرێ دووێ فەرمانا سێدارەدانا قەشە مار ئیپالاهایێ نۆهدری ل میرگەها حەدیاب(دەڤەرا ئەربیل) دابوو پشتی دەست ژ پرەنسیپێ خۆ بەرنەدای، دێرەك ژی بۆ ساخکرنەکا بیرهاتنا وی ل دەڤەرا نۆهدرا(دهۆك) هاتە ئاڤاکرن و هەتا نۆکە مایە[٣٤].

(نرسای المفان) ژی ئێکەمین کەس بوو یێ گۆتارەك ل سەر تەپەسەرکرنا مەسیحیان و یێن دی ب دەستێ ساسانییان ل سەردەمێ شاه شاپۆر نڤیسی کو حوکمێ ڤی شاهی ٧٠ سالان ڤەکێشابوو و بزاڤ دکر مەسیحییەتێ ژ رەه وریشال ژ شاهنشینیا خۆ هەلکێشیت کو ببوو مەترسییەکا مەزن ل سەر پەرستنا ئاگرێ زەردەشتی، نرسای سروودەك کو دیالۆگەکە ل ناڤبەرا شاه شاپۆرێ دووێ و شەهیدێن مەسیحییەتێ هەڤپێچ کر[٣٥]*.

ژ لایەکێ دیڤە ژی، بەلگەنامەیێن دیرۆکی یێن ئاماژێ دکەنە (ئیسحاق) ئوسقوفێ نۆهدارا یێ ل بن دەستهەلاتا (دانیال)ێ مەترانێ حەلەب - ئەربیل (کانتۆنا کەنەسیا پێنجێ)، پشکداری د کارێن کولیژا(کۆرا) ئیسحاق دا کریە یا ب سەرۆکاتییا (مار ئیسحاق) جاسلیقێ دێرا رۆژهەلاتێ و (مار مارۆسا) ئوسقوفێ میافارقین(باژێرێ سلیڤان) هنارتیێ دێرا رۆژئاڤا ل باژێرێ سلۆقیا و ڤەتەیسەفۆن(تەیسەفۆن - مەدائن) ب دەستووریا یەزدگردێ ئێکێ (٣٩٩-٤٢٠ ێ زایینی) ل رۆژا شەشی کانوونا دووێ یا سالا ٤١٠ ێ زایینی ل جەژنا دەنح(کو ئەو رۆژ وی سەردەمی رۆژا ژ دایکبوونێ ژی بوو) هاتییە گرێدان[٣١].

ل سالا ٤٢٤ ێ زایینی ژی ئانکو ل سالا چوارێ یا حوکمێ شاه بەهرامێ پێنجێ (٤٢١-٤٣٨ ێ زایینی) کولیژا سێ (کولیژا مار دادیشوع) ب چاڤدێریا (مار دادیشوع) جاسلیقێ دێرا رۆژهەلاتێ ل (مرکبیا گیایی) ئانکو پایتۆنا عەرەبان (مرکبه العرب) هاتە گرێدان کو هندەك وەسا حەز دکەن ئەو (حیره)یا پایتەختێ مەنازیرە بیت و نعمان کورێ مونزر (٤٠٥-٤٣٤ ێ زایینی) حوکم ل یا داویێ دکر و مار (قیرس) ئوسقوفێ داسنێ سەر ب مەترانێ حەدیاب(ئەربیل) ژ دەڤەرا داسن(ئامێدیێ) لێ ئامادەبوو[٣٧].

هەروەسا ل سالا ٤٨٥ ز کولیژا باعەدرێ (بارەگەهێ نهایێ سەرۆکێ تیرەیا ئێزیدییان) ل هەیڤا تەباخێ یان ئیلۆنێ هاتە گرێدان و (مار ڤاڤا) جاسلیقێ دێرا رۆژهەلات و (مار بەرسۆسا) ئوسقوفێ باژێرێ نسێبین و هندەك ئوسقوفێن دی لێ ئامادە بوون و گرنگترین ئەنجامێن ڤێ کولیژێ ئەو بوو ئوسقوف بەرسۆسا گوهداریا جاسلیق ڤاڤا بکەت و خۆ بۆ بچەمینیت، پشتی کو د کولیژا بێت لافات(ئەهواز) دا ل سەر یاخی ببوو کو ئەو کولیژ ل ل هەیڤا نیسانا سالا ٤٨٤ ێ زایینی هاتبوو گرێدان[٣٨].

پشتی ئاشتی و تەناهی ل ناڤبەرا دەولەتا فارسی یا ساسانی و دێرا رۆژهەلات بنەجە بووی، کولیژەك ل هەیڤا چریا دووێ یا سالا ٤٩٧ ێ زایینی ل باژێرێ سلۆقیا(ل نێزیك تەیسەفۆن) ب چاڤدێریا (مار بابی) هاتە گرێدان و ٣٩ ئوسقوف و نوونەرەکێ هندەك ئوسقوفێن سەرپەرشتێن ئەبرەشیان لێ ئامادە بوون، هەروەسا هژمارەکا ئوسقوفێن ڤێ دەڤەرێ یا بابەتێ ڤەکۆلینێ یە ل ڤی کولیژێ ئامادە بوون، ژ وانا: یۆحەننا ئوسقوفێ مەعلەپایا(مالتا)، مار رەحمیە ئوسقوفا داسن(ئامێدیێ)، بابی ئوسقوفێ شوشێ(ل رۆژئاڤایێ ئاکرێ) و سلێمان ئوسقوفێ نۆهدرا(دهۆك + زاخۆ)[٣٩].

وەسا دیارە ژی ئامادەبوونا نەمازەیا مەسیحیێن دەڤـــەرا بەهدینان ژ بـەر زێدەبوونا بەلاڤبوونا مەسیحییەتێ بوویە ل دەستپێکا سەدسالیا شەشێ زایینی، بەرۆڤاژی کولیژا ئێکێ یا ل داوییا سەدسالیا چوارێ زایینی هاتییە دانان.

ل سالا ٥٤٤ ز کولیژا مار ئابا ب چاڤدێریا جاسلیق (مار ئابا) ل هەیڤا شەهریوەر (کانوونا

ئێكێ یان دووێ ل سەردەمێ خێرچێكەر شاهنشاه كیسرا(ئەنوشێروان) هاتە گرێدان و ئەوێن ژ دەڤەرا بەهدینان ئامادەی ڤێ كولیژێ بووین ئەڤێن خوارێ بوون: (مار كسری) ئوسقوفێ شوشێ(گوندەكە ل رۆژئاڤایێ ئاكرێ)، (مار شەمعۆن) ئوسقوفێ مەعلەپایا(مالتا)[40].

ل هەیڤا كانوونا دووێ یا سالا ٥٥٤ ز ژێ كولیژا (مار یوسف) ب چاڤدێریا جاسلیق (مار یوسف) ل سەردەمێ كیسرا ئەنوشێروانێ شاهێ ساسانی ل باژێرێ سلۆقیا هاتە گرێدان و چوار مەتران و سێزدە ئوسقوف لێ ئامادە بوون، پاشی دو مەترانێن دی و هەژدە ئوسقوفان پشتەڤانی لێ كر و ژ دەڤەرا بەهدینان (یەزدفنا) ئوسقوفێ مەعلەپایا(مالتا) لێ ئامادە بوو[41].

هەروەسا ل هەیڤا شواتا سالا ٥٧٦ ێ زایینی كولیژا مار حەزقیال ب چاڤدێریا پەترەك مار حەزقیال ل سەردەمێ شاهـ كیسرا ئەبرویز هاتە گرێدان و ل دۆرێن ٣٠ مەتران و ئوسقوفان لێ ئامادە بوون و یێن دەڤەرا بەهدینان ئەڤێن خوارێ بوون: قامیشۆع ئوسقوفێ داسن، بەرشبیا ئوسقوفێ مەعلەپایا، بەرسەهدی ئوسقوفێ ئێسڤنێ[42].

ل سالا ٥٨٥ ز ژێ كولیژەكا دی ب چاڤدێریا جاسلیق و پەترەك مار ئیشۆ عیابێ ئێكێ ل سەردەمێ شاهێ فارسی هورمزدێ چوارێ هاتە گرێدان و ژ دەڤەرا بەهدینان هەر ئێك ژ كویشۆع ئوسقوفێ نۆهدرا و بەرشبیا ئوسقوفێ مەعلەپایا لێ ئامادە بوون[43].

ل نیسانا سالا ٦٧٦ ێ ژێ كولیژەك ب چاڤدێریا جاسلیق پەترەك مار گریگۆر ب دەستپێشخەریا شاهێ فارسێن ساسانی كیسرایێ دووێ(ئەبرویز) هاتە گرێدان و ٢٩ مەتران و ئوسقوف لێ ئامادە بوون و یێن دەڤەرا بەهدینان ئەڤێن خوارێ بوون: كلیلیشۆع ئوسقوفێ مەعلەپایا، بورزمهر ئوسقوفێ داسن و یۆحنان ئوسقوفێ نۆهدرا[44].

هەڤركیا زەردەشتی - مەسیحی و رەنگڤەدانا وێ ل سەر دەڤەرا بەهدینان:

گەلەك نڤیسەرێن نوو ئاماژێ دكەنە وێ چەندێ كو زەردەشتی ببوو ئایینێ فەرمیێ هەر سێ ئیمپراتۆرێ یێن ئەخمینی پربی (ئەشكانی) و ساسانی، لێ دیرۆكنڤیسێ ئیرانی حەسەن بیرینا و دیرۆكنڤیسێ ئەلمانی كریستنسن ئاماژە كرینە ڤێ لایەنی و گۆتینە كو ساسانییان زەردەشتی كریبوو ئایینێ فەرمیێ ئیرانێ و هەتا وێ چ ئایینێن فەرمی لێ نەبوون و گەلێن سەر ب ئیرانێ د ئازاد بوون بچنە سەر وێ ئایینێ هەر ئێك ژ وان گەلان پێ رازی دبیت.

هەروەسا ژ وێ دەمێ ئەردەشێرێ ئێكێ (٢٢٤-٢٤١ ز) چوویە سەر كورسیا دەستهەلاتا ساسانی، فەرماندا (هربدان هربد تنسر) هەمی دەڤێن بژالەیێن ئاڤێستا ئەشكانی كۆم بكەت كو بەری هنگی لغاشێ ئێكێ (٥١-٧٨ ز) كۆم كربوون و داخواز ژێ كر ژ وان دەڤان دەڤەكی بنڤیسیت، پاشی ئەڤ دەڤە ژێ هاتە كورتكرن و وەك پەرتووكەكا پیرۆز هاتە ل قەلەمدان[45].

هەر چەوان بیت، ل پێشیێ شاهێن ساسانی چ پویتە ب ئایینێ مەسیحی نەكرن پێ هێدی هێدی ب ناڤ هەرێمێن ئیرانێ كەڤتی هەروەكی مە بەری نۆكە گۆتی، لێ دەمێ شاە شاپۆرێ دووێ (٣٠٩-٣٧٩ ێ زایینی) داخواز ژ دەولەتا رۆمانی كری وان ویلایەتێن دەولەتا ساسانی رادەست بكەت یێن ل سەردەمێ شاهێ خۆ نرسی (٢٩٣-٣٠٢ێ زایینی) رادەستی وان كرین[46]، شەڕی دەست پێكر و سیاسەتا وی بەرامبەری وەلاتیێن وی یێن مەسیحی هاتە گوهورین و هەوەكا تەپەسەرنێ دژی وان دەست پێ كر هەروەكی مە بەری نۆكە رۆنكری، مەسیحی بەركو خودان باوەرییەكا موكم بوون ب دلێری بەرەڤانی ژ بیروباوەرێن خۆ دكرن و خۆ بۆ پەرستنا رۆژێ و ئاگری نەدچەماندن، هەرچەندە دا ژ ئەشكەنجەدان و مرنێ رزگار بن، رەوش ب ڤی ئاوایی ب رێڤە چوو هەتا وێ دەمێ شاهێ ساسانی یەزگردێ ئێكێ (٣٩٩-٤٢٠ز) هاتی پێ سەرەدەرییەكا باش دگەل مەسیحییان دكر، ژ بەر هندێ، دینداریێن زەردەشتی ب (خرابكار) ددا نیاسین، ل سەردەمێ وی كەنیسەیێن مەسیحی

هاتنه دانان و گەلەك خێزان چوونە سەر ئایینێ مەسیحی[٤٧]، لێ دوباره ئارێشەیێن بەرێ بەرهنگاری مەسیحییان بوون و ڤێ جارێ خۆ ژ دیندارێن مەسیحی ژی نه ددانەپاش و ئەو ژی بەرهنگاری وان ئارێشەیان دبوون، کریستنسن ژی ڤێ ئێکێ دکەتە بناسێن مەسیحییان ب خۆ و دبێژیت: وان (ئانکو مەسیحییان) خۆ دفنبلند کرن و قەبێن رایا گشتی خواستن هەتا وەلێ هاتین نەشیاین بەرەڤانیێ ژ خۆ بکەن و بەرسینگێ ئارێشەیان بگرن، هەر بۆ نموونە، ل بازێرێ هورمزد - ئەردەشێر ل خۆزستان(عەرەبستانا نۆکە) قەشەیەکی کو ناڤێ وی (هاشو)یە ب دەستووریا دیار یان نەدیارا ئوسقوف (عەبدا) رێ دا خۆ ئاتەشگەدەیەکا (ئاگردانەکا) نێزیکی کەنیسەیا نەسرانییان بهەرفینیت، لێ قەشە و ئوسقوف و یێن دی هاتنە گرتن و هەمی بۆ مەدائن هاتنە هنارتن، شاهی ب خۆ ژی پرسیار ژ (عەبدا) کر، لێ وی هەر رێککەڤتنەکا (جینائی) رەت کر، لێ هاشۆ دانپێدان کر کو وی ب خۆ ئەو ئاگردان هەرفاندییه و وی ئەڤ دانپێدانه ب هندەك دوژمنکاری گۆتن و ب خرابی بەحسێ ئایینێ زەردەشتی کر، ئینا وی دەمی شاهی فەرماندا عەبدا دوباره پەرستگەهێ ئاڤا بکەت، لێ وی ب رژدی ئەو فەرمان رەت کر، ئینا حوکم دانا سەر و کوشت، تیۆدۆرت دیرۆکنڤیسێ ئایینی ژی ئاماژە کریە رەفتارێ ڤی ئوسقوفیێ رژدی ل سەر پلانا خۆ کری و وی ب خۆ ژی هەرفاندنا پەرستگەهێ ب کارەکێ نەئاقلداری ل قەلەمدا[٤٨].

هەمی هەڤرکیا هزری ل ناڤبەرا زەردەشتی - مەسیحی بەرژەوەندیێن تەخا ساسانیا حوکمدارا تەخا دیندارێن زەردەشتییێن موبدان و مەغان و هەربەزی پشتەڤانی لێ دکر و ل ناڤبەرا بەرژەوەندیێن تەخێن دی یێن د بیروباوەرێن مەسیحییەتێ و ئایین و مەسەبێن دی یێن بەرهنگارێن وەکی مانەوی و مەزدەکی و دیسانی و مەندایی دا وەك رێ بۆ خۆ دیتین بۆ رزگاربوونێ ژ زۆر و ستەما تەخا حوکمدار ل پشت دڤەشارتی بوون، ژ بەر هندێ، تشتەکێ ئاسایی بوو هەردولا (دەولەت و ئایین) هاریکاریا ئێك بکەن دژی بەرهنگاران، نەخاسمە کو هەردوو جێمکێن ئێکن ل دووڤ گۆتنا ئەردەشێرێ دامەزرێنەرێ دەولەتێ٤٩، لێ حوکمێ زەمانی و وەرارێ دەست ب دارزاندن و پێتکرنا زەردەشتیێ کر و هێدی هێدی هێزا وێ کێم کر، ئەڤ چەندە ژی ب ئاوایەکێ بەرچاڤ ل سەردەمێ شاه کیسرا ئەنوشێروان (٥٣١- ٥٧٩ێ زایینی) باش دیار دبیت کو ئەڤ شاهە ژی ل دەستپێکا خۆ گرنگییەکا مەزن ددا زەردەشتیێ[٤٩]، لێ ئەو ئێك بوو ژ هاندەرێن گەنگەشەیێن ئێکسەر(دبیێت)ێن هزری و ئایینی ل ناڤبەرا دیندارێن زەردەشتی و ئۆسقۆفێن مەسیحی، ژ لایەکێ دیڤە ژی، وی هاندانا زانست و فەلسەفەیێ دکر و هەتا مەسەلە گەهشتیە وێ رادەی ئالۆزی بکەڤیتە پێگەهێ زەردەشتیێ و هندەك مەزنە دیندارێن وێ بخرپێن و ژ ئایینێ خۆ لادەن وەکی موبدان موبد بزر جمهر، هەروەسا ئەوێن زەردەشتی هێلاین ئالۆزی و شەپرزەییەك پەیدا کرن و بوونە کەسانێن رەشبین ب چاڤەکێ رەش بەرێ خۆ ددانە ژیانێ، ئەڤە ژی ب ئاوایەکێ بەرچاڤ ل نك فەیلەسوڤێ ئیرانی و دینداری زەردەشتی (بەرزەوێ) د وان رێزان دا دیار دبیت یێن ل سەر ئایینێ زەردەشتی و وی پێگەهێ د دەروونێ وان هزرڤانان دا گەهشتیێ دیار دبیت: دەمێ ئەو تشت ل نك من پەیدا بووی بۆ من گومان ل سەر ئایینی پەیدا بوو، لێ پەرتووکێن نوژدارێ من چ بەحسێ ئایینان تێدا نەدیت بۆ من بنە رێنیشاندەر ل سەر بچم و باشتر ببینم.. رێبازا ئایینی و سێ جوینە: مللەتەکە ئایین ژ بابێ بۆ مایە، هندەکێن دی ژی ب زۆری چووینە سەر وی ئایینی و چووینە د ناڤ دا و یێن دی ژی ل دووڤ دنیایێ دچن و هەر ئێك ژ وان پرۆپاگەندا وێ چەندێ دکەت کو ئەو یێ راستە و ئەو دەستپێك و داویە و تشتێ دی یێ هۆسا[٥٠].

هەروەسا ئێك ژ پیڤەرێن لاوازبوونا زەردەشتیێ ل سالێن داویێ یێن دەولەتا ئۆسمانی، بەلاڤبوونا مەسیحییەتێ بوو ل ئیرانێ و بەرفرەهبوونا کەنیسە و ئوسقوفییێن وێ بوو، هەتا وەلێ هاتی نازناڤێ شاهێ نەسرانی ل سەر شاهێ فارس کیسرایێ

دووێ ئەبرویز (٥٩٠-٦٢٨ێ زایینی) بهێتە دانان ژ بەركو وی هاندنا وان دكر و ئازادییەكا تمام دابوویێ[٥١].

كێم مابوو ژی مەسیحییەت ل سەردەمێ كیسرا ئەبرویز ژ هەر دەمەكێ دی پتر سەركەڤتنێ ب دەستڤە بینیت و هژمارەكا زۆر یا كەس وكارێن شاهی بوونە مەسیحی كو ئەو ب خۆ ئیرانی یێن رەسەن بوون، هەروەسا كیسرا ئەبرویز نەچار بوو پەنایێ ببەتە بەر نەیارێ خۆ یێ ب هێز مۆریكیۆسێ شاهێ بیزەنتی پشتی سەركردەیێ ناڤدارێ ساسانی (چوبین) كۆدەتا ل سەر كری.

## پەیدابوونا كەنیسەیێن نوو یێن مەسیحی:

ل دەستپێكا سەدسالیا شازدێ هەڤركییەكا دژوار ل ناڤبەرا دەولەتا ئۆسمانیا سوننی ژ لایەكی و دەولەتا سەفەویا شیعی ژ لایەكێ دیڤە سەرا دەڤەرێن دەستهەلاتێ ل ئەنادۆل و ئازەربایجان و كوردستانێ پەیدا بوو و ئەو هەڤركی د شەرێ چالدێران یێ سالا ١٥١٤ێ زایینی دا گەهشتە گۆپیتكێ و ئەو شەر بوو ئەگەرێ وێ چەندێ دەولەتا سەفەوی د شەری دا بشكێت و كوردستان بۆ دو پشكان (پشكا ئۆسمانی و پشكا سەفەوی) بهێتە لێكڤەكرن و ژ وی دەمی وەرە سەرانسەری دەڤەرێ بوویە خودان دیرۆكەكا نوو.

ژ وی دەمی پەیوەندیێن ئیسلامی - مەسیحی ل كوردستانێ و ویلایەتێن دی یێن دەولەتێ ئاراستەیەكێ دی ب خۆڤە گرتییە، هندی دەولەتا ئۆسمانی بوو د هەڤركییەكا بەردەوام دابوو دگەل رۆسیا سیزەری (قەیسەری) و دەولەتێن ئەوروپی ئەڤە ژی ژ بەر هۆكارێن هەڤركیا ئایینی كو كاریگەریا خۆ ل سەر پەیوەندیێن نێڤدەولەتیێن وی دەمی هەبوو هەرچەندە هندەك سەخلەتێن وێ هەڤركیێ مۆرەكا سیاسی یان ئابووری.. هتد. ژی ب خۆڤە دگرت.

ل سەر بابەتێ ڤەكۆلینا مە ژی، وی دەمی مەسیحییەتێ ل دەڤەرا بەهدینان فۆرمەكێ رۆژهەلاتیێ كەڤن (كەنیسەیا رۆژهەلات) ب خۆڤە دگرت و ل دووڤ بریارێن كولێژا ئەفسس، ل سالا ٤٣١ ێ زایینی نەستۆری، هەروەسا ل دووڤ بریارێن كولێژا خەلقیدۆنی ل سالا ٤١٥ ێ سریان ژ وێ كەنیسەیێ پەیدا بوون، هەروەسا تیرەیا ئەرمەنی ب رەخ كوردان ڤە هندەك جاران ژی د ناڤ وان دا دژیان كو وی دەمی هێشتا كەنیسەیێن ئێككرتی پەیدا نەببوون هەر چ نەبیت ل دەڤەرا كوردستانێ، هەر بۆ نموونە، بەری وێ دیرۆكێ مارۆنی یێن لبنانی دگەل كەنیسەیا كاسۆلیكی ئێككرتبوون[٥٢].

## گەهشتنا شاندێن میسۆنێری یێن كاسۆلیكی بۆ كوردستانێ:

بریارێن كولیژا تریدانیتنی (١٥٤٥-١٥٦٣ێ زایینی) دەرئێخستین و كەسایەتیا ب هێزا هندەك پاپایان وەكی پاپا گریگۆرێ هەشتێ (١٥٧٢-١٥٨٥ێ زایینی) و دانانا رەبەنیێن یەسوعی (١٥٤٠ێ زایینی) و دامەزراندنا كولیژا مزگینیدانێ ب باوەریێ (The Collge for the propagation of he Faith) ژ لایێ پاپا گریگۆری یێ كەنیسەیا كاسۆلیكی ڤە ل سالا ١٦٢٢ێ زایینی كو ئەو كولیژ د دیرۆكا كەنیسەیێ دا ب ناڤێ پرۆپاگەندا Propaganda ناڤدار بوویە، ئەڤە سەرباری سەرمافێن دی یێن دەولەتا ئۆسمانی داینە فرەنسا و دامەزراندنا تۆرەكا خواندنگەهان ل رۆما یێن تایبەت ب خویندكارێن رۆژهەلاتێ و دانانا پەرتووكێن ئایینی یێن كاسۆلیكی و ڤەگوهاستنا وان بۆ سەر زمانێن گەلێن مەسیحی ل هەمی دەڤەران (وەكی زمانێن: یۆنانی، عەرەبی، قوبتی، سریانی، ئەرمەنی و كوردی) د فێركرن و مزگینیدانێ(مەسیحیكرنێ) دا، ئەڤە ژ بلی هەمی رێ یێن دی یێن چ پەیوەندی ب ڤان كاروباران ڤە نەبن وەكی فتنەگێران و پێزەڤەنگی(فەسادی) و مایتێكرن د كاروبارێن ناڤخۆیی یێن كەنیسەیێ دا و ب كارئینانا دەستەلاتا بیانی یان ئۆسمانی، ئەڤە هەمی بۆ هندێ بوون گوهورین د رەوشان دا بهێتەكرن

ب ئاوایەکی وەسا د بەرژەوەندییا مەزنە زانایێن ئایینی یێن تێکدەر دا نەبن هەروەکی ڤەکۆلەرێ کەنیسێ یێ فرەنسی (ئەستیرۆیۆس ئەرجیریۆ) دەربرین ژ وێ چەندێ کری[٥٣].

لێ ژ لایەکێ دیڤە ئەڤ کارە (هنارتنا هنارتییان - بۆ رۆژهەلاتێ) د مفایێ تیرەیێن مەسیحیێن ل بن حوکمێ ئۆسمانییان دا بوو یێن کو چ رێ یێن پێتڤی بۆ دابینکرنا پێکەهاندنەکا رەوشنبیری و ئایینی و رۆحی نەبوون، ژ بەر هندێ، ڤان هنارتییان(مسیۆنێران) ب رێ یێن خۆ پشکداری د خورتکرنا ڤەژاندنا باوەرییا مەسیحی ل نك مەسیحییان دا کر و لایەنێ رەوشنبیری و ئاستێ وان یێ رۆحی ژی بلند کرن و هندی وان ئەڤ کارە ب هووربینی و نەرمی کریا سوپاسی و دەستخۆشی ل وان دهاتەکرن، ئەڤە ژ لایەکی، لێ ژ لایەکێ دیڤە ژی گەلەك نەیارییا وان دهاتە کرن و کارڤەدانێن دژوار ژێ پەیدا دبوون و دژایەتییا هەلویستێ وان دهاتە کرن و ئەو ب دەرزاندنا ئێکەتییا کەنیسێ و مایتێکرنێ د کاروبارێن وێ دا دهاتنە گونەهبارکرن، هەکە وان کار و لڤینێن خۆ ب دەمارگیری و ب حەزەکا کۆرە بۆ بەلاڤکرنا مەسیحییەتێ ئەنجامدابان، ژ بەر هندێ، شاندێن مسیۆنێری یێن کاسۆلیکی ئێك ل دووڤ ئێك قەستا رۆژهەلاتا نێزیك ژ وانا قەستا کوردستانێ ژی کرن، ب ڤی ئاوایی شاندێن مسیۆنێری یێن کبوشی[٥٤] و کەرمەلی[٥٥] و دۆمەنیکان[٥٦] گەهشتنە دەڤەرێ.

ل سەر کوردستانێ ژی ڤەکۆلەرەکێ دۆمەنیکی دبێژیت: ل سالا ١٥٥١ ێ زایینی کارڤەدانەك ل سەر نەکامییەکێ یا سالا ١٤٨٠ ێ زایینی ل ناڤ نەستۆرییان بەلاڤ بووی پەیدا بوو ئەو ژی ئەو بوو کو پۆستێ پەترەکیێ ویرسییە و ژ مامی بۆ برازای دهێتە رادەست کرن، ئینا سێ ئۆسقوف و هندەك باوەرداران پەترەکێ ویرسێ هاتییە دەستنیشان کرن رەتکر و ل مووسل کۆمبوون و ل شوونا وی سەرۆکێ دێرێ رەبەن هورمز (سولاقا) هەلبژارتن کو ئەو ژی تاگرێ ئێکەتیێ بوو دگەل رۆما، ئینا پەترەکێ نوو دگەل شاندەکێ تاگران چوو قودسێ پاشی قەستا رۆما کر و ل رۆژا ١٥ چریا دووێ ١٥٥٢ز گەهشتنە وێرێ، ل رۆژا ٢٠ ێ شواتا سالا پاشتر سولاقا باوەرییا خۆ یا کاسۆلیکی راگەهاند، ئینا پاپا (جۆلیانسێ سێیێ) ل رۆژا ٢٨ ێ نیسانا سالا ١٥٥٣ز مەتالێ پەترەکیێ رادەستی وی کر و ئێکەمین (پەترەکێ کلدان) دگەل دو رەبەنێن دۆمەنیکانێن مالتایی (ئەمبروسیۆس بودجاج و ئەنتۆنیۆس زەهرە یێ پشتی هنگی بوویە مەتران ڤەگەریا رۆژهەلاتێ و پەترەکی خۆ ب (شەمعۆن) ناڤ کر و بارەگەهێ خۆ دانا ئامەدێ(دیاربەکرێ) و ل رۆژا ١٢ چریا دووێ ١٥٥٣ز گەهشتە وێرێ[٥٧].

ل وی دەمێ پەترەکێ نوو مژوولی دانانا پێنج مەترانان بوو، نەیارێ وی شەمعۆنێ هەشتێ دنخا (١٥٥١-١٥٥٨ز) پەترەکێ ئەلقوش یێ نەستۆری پێزەڤەنگی (فەسادی) ل سەر کر، ئینا پاشایێ ئامێدیێ بۆ دەمەکی زیندان کر، پاشی پشتی هنگی ل کانوونا دووێ ١٥٥٥ز ل ناڤ دەریاچەیەکا دکەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ بازێرێ ئامێدیێ ل نێزیك دێرا مار ساوە(گوندێ دێرەشێ) ل دەڤەرێ بەرێ گارەی هاتە کوشتن[٥٨].

هەژیبە بێژین کو شاندێن مسیۆنێری یێن لاتینی شیابوون پشکەکا سریانێن رۆژهەلاتی (نەستۆرییان) یێن بووینە پەنابەر ل گزیرتێ قوبرس رازی بکەن دگەل کەنیسەیا کاسۆلیکی ئێك بگرن، ئینا ئۆسقوفێ وان تیمساوس ل سەر دەستێ ئەندراوسێ سەرۆکێ ئۆسقوفێن رۆدس یا دۆمەنیکی باوەرییا خۆ یا کاسۆلیکی راگەهاند، پشتی ڤێ چەندێ پاپا ئۆجیسێ چوارێ ١٤٣٩-١٤٤٧ ێ زایینی دانپێدان ب ڤێ تیما نوو کر و ناڤێ (کلدان) دانا سەر وان وەك بیرئینان بۆ (کلدۆ) یا کەڤن و کورسییا (مار ماری) دامەزراند ل دووڤ دەربڕینا ڤەکۆلەرێ دۆمەنیکی جان مۆریس فێی[٥٩].

## ئێك: شاندێ مسیۆنێری یێ کەبۆشی:

ل سالا ١٦٣٦ێ زایینی دەزگەهێ شاندێ مسیۆنێریێ کەبۆشی ل مووسل هاتە دامەزراندن بۆ راکێشانا نەستۆرییان (ئاشووری یێن نۆکە) بۆ ناڤ

کەنیسەیا رۆما و هەر زوو ئەڤ پەیامە شیا ببیتە خالا دەستپێکێ بۆ بەلاڤبوونا کاسۆلیکیێ ل مووسل و کەبۆشی شیان جاسلیق (مار ئیلیایێ نەهێ) رازی بکەن کو ل سالا ١٦٥٧ز وێنەیێ باوەریا خۆ بۆ پاپا ئەنوگنسیۆسێ دەهێ (١٦٤٤-١٦٦٠ز) بهنێریت و داخوازا ئێکبوونێ ژ قەداسەتا وی بکەت بێی هندێ دەست ژ ریتوالێن خۆ یێن ئایینی و نڤێژێن کەنیسەیا خۆ بەردەت و داخواز ژ تیرەیا وی کر کەنیسەیەکێ ل رۆما دانیت[٦٠].

ژ لایەکێ دیڤە ل سالا ١٦٦٣ز کولیژا پرۆپاگەندا (کولیژا مزگینیدانێ ب باوەریێ) هندەك هنارتی ژ رەگەز و رەبەنی یێن جودا جودا هنارتنە وەلاتێن رۆژهەلاتێ، ژ وانا: پەیاما کەبۆشییان بۆ ئامەدێ (دیاربەکرێ) و مێردینێ، هەروەسا ئەباتی شمۆئێل تلکێفی سەرۆکێ رەبەنییا هورمزدی د پەرتووکا خۆ یا ب ناڤێ (العلاقات بين الكرسي الرسولي والسريان المشارقة اي الكنيسة الكلدانية) پشکەکا وان نامەگوهۆرینان بەلاڤ کرینە یێن کەنیسەیا رۆما و هنارتی و جاسلیقێن رۆژهەلاتێ بۆ ئێك ودو دهنارتن، تشتەك هەیە جهێ ئاڤریدانێ یە ئەو ژی ئەوە کو ئەباتی شمۆئێل جەمیل تلکێفی د نامەیەکێ دا یا ژ بادەکێن کولیژا (پرۆپاگەندا) ڤەگوهاستی، زانیاریێن گرنگ ل سەر (پەترس جیسی) بەلاڤکرینە کو نازناڤێ فارسی ل سەرە و ئەو ب خۆ کوردە و دەیبابێن وی موسلمانن و خەلکێ ئامێدیێ یە و هاتییە ناڤ مەسیحییەتێ و تۆمارا سالنامەیا کولیژا پرۆپاگەندا د بەرگێ ئێکێ یێ کۆما بەلگەنامەیێن سالا ١٦٣٣-١٧٥٣ز د کاغەزا (٥١)ێ دا بەحسێ وی دکەت و دبێژیت: (پەترس جیسی یێ فارسی کو خەلکێ ئامێدیێ یە ل رۆژا ١٧ تیرمەها ١٦٤٧ز ل کولیژا پرۆپاگەندا هاتییە وەرگرتن و وی دەمێ ژیێ وی نێزیکی ٢٤ سالان بوو و ل رۆژا سێی خزیرانا وێ سالێ ژ لایێ کاردینال بەربرینۆ و ب بریارا کولیژێ هاتییە کاندید کرن و دەیبابێن وی موسلمانن و سالا ١٦٤١ ێ زایینی پرۆپاگەندا وێ چەندێ کریە کو ئەو ژ لایێ خودێ ڤە هاتییە داخواز کرن بهێتە رۆما داکو ببیتە مەسیحی، ل رۆژا ٧ ئیلۆنا ١٦٤٢ ز ژی ل دێرا خانما چییان (سيدة الجبال) ل سەر دەستێ مۆنسنیۆر (سکنا رۆلا) بوویە مەسیحی و هەروەسان وی دیدار دگەل کورێ بالیۆزێ شاهێ (فرەنسی) ل کوستەنتینیێ(ئستانبۆل)[٦١].

پشتی رێ ورەسمێن مەسیحیبوونا خۆ مار پەترس جیسی ڤەگەریا کوردستانێ و گەلەك کار د پەیام و وەعزان دا کر نەخاسمە ژی ل باژێرێ ئامەدێ (دیاربەکرێ)، کو وەسا دیار بوو هاتنا وی بۆ جهێ ژ دایکبوونا وی ل ئامێدیێ، دا ئارێشەیان ئازرینیت کو کەنیسێ خۆ ژ وان ئارێشەیان دپاراست، هەر چەوان بیت ئەو کەسەکێ خەمخۆر بوو د بەلاڤکرنا ڤەکۆلینێن کاسۆلیکی و بەرەڤانی ژێکرنێ دا ل دژی نەستۆری یێن هێشتا د ناڤ دووڤکەڤتیێن کەنیسەیا رۆژهەلاتێ دا زۆرینە بوون.

مار پەترس جیسی چەند سالەکان ل ئامەدێ ما، پاشی چوو باژێرکێ ئەلقۆش بۆ دیدارا پەترەك مار ئەبلیایێ هەشتێ (١٦١٧-١٦٦٠ز) یێ ب هاتنا وی کەیفخۆش بووی و وەسا دیت مرۆڤەکێ خەمخۆرە د بەلاڤکرنا باوەریێ دا و گەلەك حەز ژ کەنیسەیێ و ئێککرتنا وێ دگەل هەمی کەنیسەیێن دی دکەت، نەخاسمە ژی دگەل کەنیسەیا رۆما کو هەیامەکێ ل وێرێ ژیا بوو و هەر ل وێرێ فێری زمانێ ئیتالی ببوو و بەرپرسێن فەرمانگەهێن رۆمانی نیاسیبوون، هەر ژ بەر هندێ ژی ئەو هەلبژارت دگەل دو کەسێن دی (ئەب مەرقس و شەماشە تیمساوی) بچیتە رۆما داکو بۆ بەرپرسێن رۆمان بەحسێ رەوشا مەسیحی یێن ل وەلاتێن رۆژهەلاتێ نەخاسمە یێن ل کوردستانێ بکەت، پەترەکی نامەیەك ل سەر ڤێ چەندێ بۆ کولیژا مزگینیدانێ ب باوەریێ (پرۆپاگەندا) نڤیسی و تێدا هاتبوو: (شاگردێ وە مار پەترس جیسی دهنێرمە نك وە ل رۆما، من ئەو هنارت، چونکی ئەو خویندکارێ وەیە، هیڤیخوازم ئەو ببیتە بەرگەرەك (ناڤگینەك) ل ناڤبەرا مە و هەوە و ئەو ئاگەهداری نڤیسارێن مەیە و باش شارەزای ریتوالێن مە یێن رۆژانەیە، هیڤی ژ وە دکەم پشتا خۆ ب ئاخڤتنێن وان

گەرم نەکەن یێن دبێژن کو ئەو ژ لایێ مەڤە هاتییە هنارتن، کو ب راستی وەسا نینە)، د کۆمێنتەکێ دا ل سەر ڤێ نامەیێ (مار بەتتا کەبۆشی) بەرپرسێ پەیاما کەبۆشییان ل کوردستانێ د نامەیەکا خۆ دا بۆ کولێژا پرۆپاگەندا دبێژیت: پەترەکی مار پەترس جیسی دگەل دوو کەسێن دی هنارتییە و ئەو زمانی دزانیت داکو بزانیت چ بۆ مەزنییا خودێ و رزگارکرنا هژمارەکا زۆر یا خەلکی بهێتە کرن[١٢].

ل سەر تشتێ مایی ژ ژیانا پەترس جیسیێ فارسی یێ ئامێدی، سالنامەیێن پرۆپاگەندا تنێ ئاماژەیێ دکەنە وێ چەندێ کو ئەو ل حەبەشە د رێیا باوەرییا کاسۆلیکی دا شەهید بوویە، بێی هندێ سالا شەهیدبوونا دەستنیشان بکەت[١٣].

## دوو: پەیاما دۆمەنیکی:

دەمێ مەسیحی یێن کاسۆلیکێن مووسل نەشیاین دوبارە دەزگەهەکی بۆ شاندێ مسیۆنێرێ کەبۆشی ڤەکەن کو ل سالا ١٧٢٤ز مووسل ب جە هێلابوو، قەشە خدرێ کلدانیێ مووسلی (خضر الكلدان الموصلي) کو وی دەمی ل رۆما یێ ئاکنجی بوو و ژ پەترەکێ نەستۆری رەڤی بوو، داخواز ژ پاپا بنیدیکتسێ چواردێ کربوو بۆ دەزگەهەکی ل ڤی بازێری ڤەکەت، پشتی دوودلییەکێ پاپای داخواز ژ دۆمەنیکان کر دوبارە دەست ب چالاکییا خۆ ل وەلاتێ دو رووباران و کوردستانێ بکەت، ئینا ئەو دەزگەه ل سالا ١٧٤٨ێ زایینی هاتە ڤەکرن و ل رۆژا ١٧ کانوونا دووێ ١٧٥٠ز هەردوو هنارتی یێن ئیتالی فرانسیس تۆریانی (Tarriani) و عەبدلئەحد کۆدیلنشینی گەهشتن و ژ بەرکو زمانێ عەرەبی دزانی و شارەزای جە و دەڤەران بوو و ڤێ پەیامێ د رەوشێن جودا جودا دا هەتا سالا ١٨١٥ێ زایینی بۆ دەمەکێ درێژ کارێ خۆ کر، پاشی ل سالا ١٨٤٠ێ زایینی هاتە دوورئێخستن و ل سالا ١٨٥٩ێ زایینی هنارتی یێن ئیتالی ب یێن فرەنسی هاتنە گوهورین[١٤].

ڤان هەردو هنارتییان ب هاریکارییا کارێ خۆ یێ نوژدارییێ، سەرکەڤتن د کارێ خۆ یێ ئایینی ژی دا ب دەستڤەئینان، نەخاسمە کو کاسۆلیکێن مووسل ژی پشتەڤانییا وان دکرن، هەروەسا دەمێ دەنگ و باس گەهشتییە بەهرام پاشایێ ئێکێ کورێ سەعیدخان بەگێ دووێ یێ میرێ بەهدینان (١٧١٤-١٧٦٨ز) کو یێ نەخۆش بوو، داخوازییەك بۆ مار فرەنسیس تۆریانی یێ نوژدار هنارت داکو بهێت وی چارەسەر بکەت، دەمێ یێ داویێ د کارێ خۆ دا سەرکەڤتی، میر بەهرام رێ دایێ ل سالا ١٧٥٩ێ زایینی تایەکێ دەزگەهێ مسیۆنێرێ دۆمەنیکی ئامێدیێ ڤەکەت[١٥].

پشتی مرنا مار عەبدلئەحد کۆدیلیۆ، مار ئیبولۆد یێ زیرەك و شارەزا د کاروبارێن ئەندازیاری و نوژداری دا بوو جهێ رێزگرتنا میر بەهرام پاشای و (کەنیسەیا عەبد یەشوع) یا ل گوندێ (دێرێ) یا چەند کیلۆمەترەکان ل باکوورێ رۆژهەلاتێ ئامێدیێ بە پێشکێشی دۆمەنیکان کر، هەروەسا میری داخواز ژ نەستۆرییان (خەلکێ رەسەنێ دەڤەرێ) کر بهێنە سەر رێبازا کاسۆلیکی، مار والین ل سالا ١٧٧٥ێ ل زاخۆ مر و هەر ل وێرێ هاتە ڤەشارتن و ئەو هنارتیێ ئێکێ بوو ئامێدیێ هاتییە ئامێدیێ، ل سالا ١٨٤٠ ێ زایینی ژی پشتی شاندێ مسیۆنێرێ دۆمەنیکی ڤەگەریایە کوردستانێ، مار (ئەسکا فهوسەر) و هەڤکارێ وی (ئۆگستین) ل سالا ١٨٤١ێ زایینی تایەکێ وی دەزگەهی ل دێرا (مار یاقۆ - قەشەفرێ) یا دکەڤیتە رۆژئاڤایێ دهۆك ڤەکر و کەنیسەیەك ل وێرێ ئاڤا کر، ل سالا ١٨٤٢ێ ژی خواندنگەهەك ل وێرێ ڤەکر و بوو سەنتەرەکێ بەلاڤبوونا هزرێ ل سەرانسەرێ دەڤەرێ و خویندکارێن گوندێن مەسیحی قەست دکرنێ وەکی گوندێن: ئەرەدنا، مانگێشکێ، بێرسڤێ، ئاشیتا، پێشابیرێ و بێدارێ، هەروەسا پشکەکا ناڤخۆیی ژی بۆ حەواندنا خویندکارێن ژ گوندێن دوور دهاتن هاتە ئاڤاکرن، دێرێ پەرتووکخانەیەکا مەزن لێ هەبوو و ب هزاران پەرتووك تێڤە هەبوون، سەرباری هندێ، دێرێ ب هەروە پێشوازییا نەساخێن دەڤەرێ یێن ژ هەمی ئایینان دکر و ئەڤ دەزگەهێ مسیۆنێری ل سالا ١٩٦١ێ ب دەمەکێ کێم پشتی هەلبوونا شۆرشا

کوردی ب سەرۆکاتییا ڕێبەر مەلا مستەفایێ بارزانی زایینی هاتە دائێخستن[٦٦].

هەر چەوان بیت، کەنیسەیێن ئیتیحادی (ژ فەرمانا اتحد to unite) (اتحادی union) کو ئەو ژی هندەك کۆمەل بوون و ل دەم و رەوشێن جودا جودا ژ کەنیسەیا مەسیحی یا رۆژهەلاتی جودا ببوون و چووبوونە د ناڤ (ئیتیحادەکا کەنەسی) (عەقیدی) دا، دگەل کەنیسەیا رۆمانی - کاسۆلیکی - کو ئەو ب خۆ ب گشتی ل بن دەستەلاتا بلندا پاپایێ رۆما و ڕێبەرییا کەنیسێ یا کاسۆلیکی یا ڤاتیکان بوو و دانپێدان ب بیروباوەرێن کاسۆلیکی دکر کو هەڤدەم خۆسەرییا خۆیا ناڤخۆیی (وەکی ئۆتۆنۆمییەکێ - هەکە ئەڤ دەربڕینە یا دروست بیت) و ڕێکخستنا خۆ یا کەنیسەیێ و ریتوالێن خۆ یێن کلاسیکی و زمانێ نیشتمانیێ لیتورجیکی Liturgic(ریتوال) دپاراستن و رێ ورەسمێن پەرستنێ و خزمەتکرنا ئایینی ئەنجام ددان[٦٧].

ل کوردستانێ کلدانێن ئێککرتی یێن کەنیسەیا کلدان پێك ئیناین کو مەسیحی یێن کاسۆلیك سەر ب وێ کەنیسەیێ نە، ژ کەنسیەیا نەستۆری جودا بوون.

ئەڤ جودابوونەیێن کەڤتینە کەنیسەیێ بوونە ئەگەرێ وێ چەندێ هژمارا تیرەیێن مەسیحی ل دەولەتا ئۆسمانی ب گشتی و ل کوردستانێ ب تایبەتی زێدە ببیت و نۆکە هژمارا کەنیسەیێن مەسیحییان ل دەڤەرا بەهدینان ب ڤی ئاوایی لێ هاتییە:

١- کەنیسەیا نەستۆری (ئاشووری).
٢- کەنیسەیا نەستۆری یا جاسلیقی یا کەڤن.
٣- کەنیسەیا کلدانی.
٤- کەنیسەیا سریانێن ئەرسەدۆکس.
٥- کەنیسەیا سریانێن کاسۆلیك.
٦- کەنیسەیا ئەرمەنێن گریگۆری (ئەرمەنێن کەڤن).
٧- کەنیسەیا پرۆتستانتی (ئنجیلی).

کەنیسەیا کلدانی ژی ب مەزنترین کەنیسەیا وان تیرەیان دهێتە ل قەلەمدان هەر چ نەبیت ل کوردستانێ ب گشتی و ل دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی، ئەو پشکا مەزن یا مەسیحیی یێن کوردستانێ نە ئانکو ٨٠٪ ێ نە[٦٨].

کەنیسەیا کلدانی زۆرینەیا گوند و باژێرکێن مەسیحی یێن دەڤەرا بەهدینان یێن ناڤێن وان ناحیێن ل خوارێ ب خۆڤە دگریت: مانگێشکێ، کانی ماسێ، ئەلکویش (ئەلقۆش)، ئەڤە سەرباری گۆندێن: بێرسڤێ، لیفۆ، پێشابیرێ، دێرەبوونێ، بەندەوایا، کانێ، ئەرەدنا فەلان، ئێنیشکێ، داودیێ، تنێ، دێریشکێ، جدیدکێ، دۆرێ، ئاڤزەرۆکێ.

## دەستپێکا پەیدابوونا گەرشونی یێ کوردی ل دەڤەرا بەهدینان:

گەرشونی: تێرمێ گەرشونی (Garshuni) د بنەڕەت دا ئاماژەیە بۆ وان دەقێن عەرەبی یێن ب ئەلفبایا سریانی هاتینە نڤیسین، تشتێ سەیر ژی ئەوە کو فۆرمێ نڤیسینا سریانی یا گەلەك بەربەلاڤ هندەك کاریگەری ل سەر ئەدەبێ جڤاکێن نەسامی یێن ل دەڤەرێ ژی هەبوو، هەر بۆ نموونە ل سەر ئەدەبێ: فارسی، ئەرمەنی، تورکی، کوردی کو ئەو ژی ب کارئینانا ئەلفبایا سریانییە د نیگارکرنا زمانێن دی دا، ب دەربڕینەکا دی، نڤیسینا سریانی ب پیتێن زمانێن دی[٦٩].

گەرشونی یێ عەرەبی ل سەدسالیا ئێکێ مشەختی/ حەفتی زایینی پشتی هێزێن ئیسلامی ل سەردەمێ خەلیفەیێ دووێ عومەرێ کوڕێ خەتاب وەلاتێ شامێ ڤەکری پەیدا بوو، ب دروستی ژی ل وان دەڤەران دەست پێ کر یێن خەلکێ وێ ب سریانی دئاخڤتن و وی دەمی باشتر دیتن پیتێن وان یێن سریانی بۆ نڤیسینا زمانێ عەرەبی ب کار بینن، ئەڤە ژی پشتی دەڤەرێن دەولەتا ئۆسمانی بەرفرەه بووین و زمانێ عەرەبی (زمانێ قورئانا پیرۆز) ب سەر زمانێن دی یێن وەکی سریانی و قوبتی و یۆنانی و پەهلەوی دا زال بووی [٧٠].

لێ گەرشونی یێ كوردی، ئانكو نڤیسینا سریانی ب پیتێن كوردی، ب دروستی خالا دەستپێكرنا وێ نەهاتییە زانین، ئانكو راستتر ژی بێژین ب ئێكجاری چ هەبوونا خۆ نەبوویە هەروەكی وەسا دهێتە باوەر كرن، لێ پشتی پەیدابوونا دەستنڤیسا (دەستنڤیسا ئەرەدنا - مخطوطة ارادن) قەشە فرەنسیس داود قەشەیێ گوندێ ئەرەدنا فەلەیان ل قەزا ئامێدیێ ل پارێزگەها دهۆك ل رۆژا ١٩٧٥/١٢/٩ێ پێشكێشی پەرتووكخانەیا مۆزەخانا عیراقێ كری، ئەڤ مەسەلە ژ بنی گوهوری[٧١].

گرنگییا ڤێ دەستنڤیسێ د هندێ دایە كو ئەوێن ب سریانی دئاخڤن، نەخاسمە ژی كلدانان پتر ژ زمانەكی ب پیتێن خۆ یێن سریانی نڤیسینە، بەرێ وەسا دهاتە باوەر كرن كو نڤیسین ب پیتێن سریانی و لێڤكرن ب زمانەكێ دی یێ نەسریانی كو دگۆتنێ ڤێ چەندێ (گەرشونی) تنێ د زمانێ عەرەبی دا هەبوویە، لێ پشتی ڤەدیتنا ڤێ دەستنڤیسێ دیار بوو كو ئەوێن ب سریانی دئاخڤتن، لێڤكرنا زمانێن دی یێن نەعەرەبی وەكی كوردیێ (هەروەكی مە بەری نۆكە گۆتی) نڤیسینە و ئەڤ دەستنڤیسە ژ دانانا رەبەن قەشە عەبدلئەحد عەودیش كورێ خۆشابا بەقالێ ئەلقۆشی یە كو ئێكە ژ رەبەنێن دێرا رەبەن هورمزدە و ل سالا ١٨٨٨ێ زایینی دانایە[٧٢].

فەرە بێژین كو رەبەن قەشە عەبدلئەحد عەودیش وەك كاهن (قەشە) ل هژمارەكا گوندێن مەسیحی یێن دەڤەرا بەهدینان خزمەتكریە، هەر ژ بەر هندێ ژی باش فێری زمانێ كوردی بوویە، ئەڤە سەرباری كو شارەزاییەكا زۆر د زمانێ سریانی دا هەبوو، ئەو شیا ڤێ دەستنڤیسا بابەتێ ڤێ ڤەكۆلینێ دانیت و ناڤێ دەستنڤیسا ئەرەدنا (مخگوگە ارادن) دانا سەر[٧٣].

دەستنڤیس ژ ٣٤١ بەرپەران پێك دهێت و دوو پشكە: پشكا ئێكێ ١٨٦ بەرپەرە و بەحسێ پەیڤسازییا پەیڤێن كوردی و پەیڤ دارێتنێن وێ و رامانانێن وان ب زمانێ سریانی دكەت، لێ پشكا دووێ هندەك پەرەگرافن ژ هەر چوار ئنجیلان ب زمانێ كوردی - دیالێكتا بەهدینان (دیالێكتا كرمانجییا باكوور) و چەوان د ئنجیلێ دا هاتینە، وەسا هاتینە رێز كرن[٧٤].

ڤەكۆلەرێ ئیرانی (مستەفا دەهقان) د گۆتارا خۆ دا (دەستنڤیسەكا سریانی كوردی ژ بەغدا) كو ژ پێرستا پەتروس حەدداد و جاك ئیسحاق یا دەستنڤیسێن سریانی ڤەگوهاستییە هۆسا وێ دەستنڤیسێ سالۆخ ددەت: دەستنڤیسا بەغدا یا ب ناڤێ (كتابا د-تەوراش ماملا كرتۆایا)، ئانكو پەرتووكەك د رێزمانا كوردی دا، ب رێنڤیسا سریانی ب دیالێكتا بەهدینی یا كوردی یا كرمانجی ل ئەرەدنا ساپنا (ئامێدیێ) هاتییە كۆپی كرن، دەستنڤیس ژ ١٧٢ بەرپەران پێك دهێت و قەبارێ هەر بەرپەرەكی ٢٢,٥×١٦,٠ سانتیمێترە، هەر ١٩ رێز ل بەرپەرەكی نە و بەرگەكێ مقاوەیێ هەیە، دانەرێ وێ مار عەبدلئەحد ئەلقوش كورێ عەبدیشۆیە ژ سەدسالییا ١٩ێ یە، ئەو ب خۆ رەبەنە و مار هورمزد یێ ل سالا ١٨٩٧ێ زایینی پەیامەكا دی ب ناڤێ (وەعزێن ئایینی) دانای، دانەر د بەرپەرێ (٢ف) دا ئارمانجا دانانا وێ پەرتووكێ شرۆڤە دكەت و دیرۆكا وێ ژی دەستنیشان دكەت: «ئەز یێ پەرتووكا رێزمانا كوردی دنڤیسم یا ژ لایێ مار رەبەن و قەشە عەبدلئەحد ئەلقۆش كورێ عەبدیشۆ كۆرێ خۆشابا بەقالا ڤە هاتییە دانان كو ئەو ئێكە ژ رەبەنان و مار هورمزد ل سالا ١٨٨٨ێ زایینی دەمێ ئەو د ئەركەكێ مزگینیدانێ دا بوو ل چییان...»[٧٥].

پاشی كار بەردەوام دبیت داكو دووڤچوونا بنەمایێن زمانێ كوردی بهێتە كرن، د بزاڤا خۆ دا ژی بۆ پێشكێشكرنا ناڤێن كوردی، عەبدلئەحد هۆسا دەست ب رێزمانێ دكەت: ئێك: ناڤێن پرسیاركی یێن تاك و كۆ و بەرسڤان كو حالەتێن رەها و دەستنیشانكری و فۆرمێن كۆمكرنێ ب خۆڤە دگرن، بۆ تاكان ژی، دانەر یان پاشی خواندەڤانێ دەقی د دەهمەنێ دا ئاماژێ دكەتە هژمارەكا پەیڤێن سریانی یێن هەڤپشك ل ناڤبەرا هەردوو زمانێن سریانی و كوردی.

لێ ل بەرپەرێ (٩ف) دەست ب بابەتەكێ دی دهێتە

کرن کو ئەو ژی جهناڤێن سەربخۆ و بەیڤسازیا کار (فەرمان)ایە، ل دووڤ گۆتنا وی، ئەڤ پشك هوورکاریێن ل خوارێ ب خۆڤە دگریت:

(بەیڤسازیا بۆری و نۆکە و پاشەرۆژێ و کارێ بکەرێ نەدیار و حالەتێ ژێدەری).

پشکا دووێ بەریەرێ (٨٠ر ف ف) سەرەدەریێ دگەل گۆتنێن مەزنان (گۆتنێن پێشینان) یێن کوردی و تشتێ پەیوەندی ب فولکلۆرێ کوردی ڤە هەی دکەت، عەبدلئەحد هندەك پرسیار و مامکێن کوردی ب رێنڤیسا سریانی دگەل وەرگێڕانا وان بۆ زمانێ سریانی ئازراندینە، دابەشکرنا سەرەکی و لاوەکی یا گونجای بۆ دەقێ هەر گۆتنەکا مەزنان ب زمانێ سریانی کورتتر ژ کوردی یا زەلال ئینایە، هەر بۆ نموونە بنێرە ڤان نموونەیان:

گۆتنا مەزنان (یا کوردی): دوو مەلە ب شاشکێ نە (پێکۆلەکە بۆ ترانەپێکرنێ ب زانایێن ئیسلامێ، نەخاسمە ژی یێن کورد)، دوازدە پەروانە (ناعورە) د ئاشەکی دا، پێنجی و ئێك پێ د کەتەکا پێلاڤێ دا.

شرۆڤە (یا سریانی): رۆژ و هەیڤ ل عەسمانی، ١٢ مەهێن سالێ، پێنجی و ئێك حەفتی د سالەکێ دا.

ئەڤە ژی تێبینیا پێشگۆتنێ یە ل بەریەرێ (٩٩ف): پاشی ب بزاڤ و هێزا خودێ مە، دێ هندەك پشکێن خودانێن هەر چوار ئنجیلان هەر ب وی زمانی نڤیسین، مەبەستا من پێ ئنجیلێن مەتتی، مەرقس، لۆقا و یۆحەننانە، کو ژ وەرگێڕانێن عەبدلئەحدێ ناڤبری نە .

رژدییەکا دیار و بەرچاڤ د ئارمانج و مەرەمێن وی یێن ژ دل دا هەیە داکو پێگەهەکێ مەزن بۆ ڤەکۆلینا ئنجیلێ ل نك خواندەڤانێن کورد پەیدا بکەت (پێکۆلا مەسیحیکرنا کوردان).

هەروەسا هەر ژ بەریەرێ (١٠٠ر) هەتا بەریەرێ (١٥٧ف) مار عەبدلئەحد وەرگێڕانا کوردی بۆ هندەك پشکێن یۆحەننا و لۆقا و مەتتی، هەروەسا چەند پشکەکێن نامەیێن پۆلس پێشکێش دکەت، د ناڤەرۆکان دا، د بەریەرێ(١٥٧ف) دا، شیایە گیانێ هندەك سروودێن ئایینی یێن رابوونا مەسیح یێن وەرگێڕاینە سەر زمانێ کوردی ڤێدەت و وەرگریت[٧٦].

بەریەرێ (١٦٨ر) پاشگۆتنەکا هوورتر پێشکێش دکەت و خواندەڤانی زێدەتر نێزیکی دیرۆکا ب راستایا نڤیسینا ڤان رێسایان دکەت: ل هەیڤا تەباخێ، رۆژا ٢٨ێ، ل سالا ١٨٨٨ ێ یا خودێ مە، ل سەردەمێ قەداسەتا پاپایێ مەزن لیۆ(لیۆنێ سێزدێ ١٨١٠-١٩٠٣ ێ زایینی) پاپایێ هەمی جیهانێ و قەشە ئیلیا(مار ئیلیایێ سیێ عەبو الیونان ١٨٧٨-١٨٩٤ز) پەترەکێ کاسۆلیك ل بابل، قەشە گیوارگیس(گۆرگیس) قەشە - مەترانێ ئامێدیێ. هەروەسا ژ پاشگۆتنی دیار دبیت کو کۆپیکەر(ل بەرنڤیسەر) شەماشە ئلیاس هۆمۆ خەلکێ ئەلکویش(ئەلقۆش)ە و وی دەستنڤیس نڤیسییە، لێ ب سەرپەرشتیا مار عەبدلئەحد ب خۆ[٧٧].

ژ لایەکێ دیڤە، کار و خەباتێن قەشە یەعقوب کورێ قەشە کانون بارزانی ئالنەجار د نڤیسینا گەرشونی یێ کوردی دا ئێکەمین کار بوو د ڤی بیاڤی دا هاتییە کرن هەر چ نەبیت ل کوردستانا باشوور، هەتا وی دەمێ هندەك دەستنڤیسێن دی یێن ژ بیرکری دهێنە ڤەدیتن[٧٨].

ئەو دەستنڤیسێن ب گەرشونی یێ کوردی هاتینە نڤیسین دگەل دەستنڤیسێن ئەبرەشیا ئاکرێ هاتبوونە پاراستن کو ئەڤ ئەبرەشییە ل سالا ١٨٥٢ ێ هاتییە دانان دەمێ مەتران(پەترەك) یۆسف ئۆدۆ (١٨٤٧-١٨٧٨ز) ئەبرەشیا بەرفرەها ئامێدیێ کریە سێ ئەبرەشی: ئامێدیێ، ئاکرێ و زاخۆ و مار ئیلیا سەفرۆ ژ بنەمالا (ال ابونا)یا ئەلقۆشی ل سەردەمێ مامێ وی پەترەکێ بەرێ (یۆحەننا هورمزد) وەك مەترانێ ئەبرەشیا ئامێدیێ هاتە دامەزراندن، ئەڤە ژی پشتی ڤێکنەکرنەك ل ناڤبەرا وی و مەتران ئۆدۆ (بەری وەك پەترەك بهێتە هەلبژارتن) پەیدا بووی[٧٩].

رۆژهەلاتناس مار جاك ماری فۆستی یێ دۆمەنیکی سەرەدانا ئاکرێ کربوو و هەر ژ رۆژا ٢٨ ی چریا ئێکێ هەتا رۆژا سیێ چریا دووێ یا سالا ١٩٣٨ ێ ل وێرێ ئاکنجی ببوو و ب هاریکاریا مار میخائیل ئیشۆع

بریكارێ وی دەمی یێ پەترەكییا ئاكرێ و قەشە پۆلس یۆنان شاگردێ پەیمانگەها مار یۆحەننا ئەلحەبیب ل مووسل شیا پێرستەكێ بۆ دەستنڤیسێن ئۆسقوفیا ئاكرێ دانیت، نەخاسمە ژی وان دەستنڤیسێن ل كەنیسەیا ئاكرێ و ل كەنیسەیا گوندێ خربە (ل رۆژئاڤایێ ئاكرێ) دپاراستی بوون كو دێرا مار یەعقۆب یا ناڤدار ب دێرا (بێت عابی - دیر الغاب) ب رەخ وی گوندی ڤە بوو[٨٠].

رۆژهەلاتناس مار فۆستی دەرئەنجامێ كارێ خۆ د كۆڤارا پەیمانگەها رۆژهەلاتێ یا ل رۆما بەلاڤ كر و هژمارا وان دەستنڤیسێن فۆستی دیتین و پێرست بۆ دانایین گەهشتە ٦٧ دەستنڤیسان، لێ ئەوێن ماردكتۆر یۆسف حەببی نڤیسین گەهشتە ٩٦ دەستنڤیسان و گرنگترین دەستنڤیس ژی ئەڤێن خوارێ بوون: دەستنڤیسا پەیمانا كەڤن (نڤیسینێن بەری عیسا پێغەمبەر)، دەستنڤیسا پەیمانا نوو(نڤیسینێن پشتی عیسا پێغەمبەر)، نڤێژێن داخوازیێ(باعۆسا) و دەستنڤسێن دی یێن گەلەك كەڤنێن دێرا مار یەعقۆب(بێت عابی)[٨١].

لێ دەستنڤیسێن دێرا قەشەیێن دۆمەنیكان ل مووسل هژمارەكا دەستنڤیسێن گەرشونی یێن قەشە (داود كورێ یۆحەننان كورێ نیسان كوركو قەرداحیێ بارزانی) ب خۆڤە دگرن، داود ل گوندەكێ دكەڤیتە سەر زێ یێ مەزن ل نێزیك بارزان ل داوییا سەدسالییا هەژدێ ژ دایكبوویە و ل بارزان دەست ب كارێ خۆ یێ ل بەرنڤیسینا(كۆپیكرنا) پەرتووكان كریە، ل سالا ١٨٢٧ێ زایینی نەساخییا تاعۆنێ ل دەڤەرا زێبار بەلاڤبوویە و گەهشتییە مووسل و ب سەدان كەسان گیانێ خۆ ژ دەستدان، ژ وانا ژی مامێ وی قەشە حزیران كو وی ب خۆ ژی پەرتووكێن گەرشونی یێن كوردی هەبوون و ل دووڤ زانیاریێن من، ب ئێكەم نڤیسینا گەرشونی یێ كوردی دهێنە هژمارتن و گرنگترین دەستنڤیس ژی ئەڤە بوون:

١- مەدحا قەشە داودێ بارزانی بۆ تۆبەكرنێ ب زمانێ كوردی (گەرشونی).

٢- مەدحەك ب كوردی یا گەرشونی ل سەر چاڤپێنەرابوون و ڤیان و ملك ومالی و نێزیكبوونا هاتنا عیسای(مەسیح).

مدراش(پێگۆتن) ل سەر مرنا ئەنتوانێ كورێ وی ل گوندێ كانیفلا(رۆژئاڤایێ ناحیا مزێبا) ل رۆژا نەهی تەباخا ١٨٦٥ز[٨٢].

لێ گرنگترین و جوانترین دەستنڤیس یا ئەلقۆشی یە، ئەڤە ژی نە تشتەكێ سەیرە، چونكی باژێرۆكێ ئەلقۆش باژێرێ نڤیسینا سریانییا رۆژهەلاتییە و خودان گەنجینەیەكا زۆر یا دەستنڤیسایە.

## دێر و كەنیسەیێن ل دەڤەرا بەهدینان

دەمێ ڤەكۆلین ل سەر دۆرهێلێ جۆگرافی و دیرۆكی یێ دەڤەرا بەهدینان دهێتە كرن دیاردەیەكا بەرچاڤ دهێتە دیتن كو ئەو ژی زۆرییا دێر و كەنیسەیێن مەسیحی و كێمییا پەرستگەهێن ئاگری یێن زەردەشتی نە، نەخاسمە ژی ل دەڤەرێن رۆژئاڤا و نیڤا كوردستانێ، ئەڤ چەندە ژی ڤەكۆلەرێ بسپۆرێ دیرۆكا كوردی بەرهنگاری گەلەك كێشە و ئالۆزییان دكەت، چونكی پترییا ژێدەران بەحسێ زەردەشتیبوونا كوردان دكەن كو بەری وەلاتێ وان ژ لایێ ئیسلامێ ڤە بهێتە ڤەكرن، ئەو زەردەشتی ئایینێ وان یێن سەرەكی بیت، بەرۆڤاژی مەسیحییەتێ كو تنێ كێمەكا كوردان باوەری پێ ئینایە، ئەڤە ل وی دەمێ ژێدەرێن مەسیحی هەتا یێن ئیسلامی ژی دبێژن كو هژمارەكا زۆر یا دێر و خلوەتگەهان(ناوسكان) ل دەڤەرێن چیایی یێن كوردی نەخاسمە ل دەڤەرا بەهدینان هەبووینە.

ڤەكۆلەری چاڤخشاندنەك ل سەر دۆرهێلێ جۆگرافیێ دەڤەرێن نەكوردی كر یێن زەردەشتی ئایینێ سەرەكیێ وان دەڤەران بوو، وەكی: هەرێما فارس، خۆزستان(عەرەبستان) و كا چەوان هژمارەكا مەزن یا پەرستگەهێن ئاگری لێ هاتینە پاراستن خۆ هەتا دەمەكێ درێژ پشتی ڤەكرنا ئیسلامی ژی بۆ وان دەڤەران، بەرۆڤاژی دەڤەرێن كوردی[٨٣] یێن وەختە بێژین ژ وان پەرستگەهان دڤالانە ژ بلی هندەك پشكێن هەرێما چییان و ئازەربایجانێ، نەخاسمە ژی

رۆژهەلات و باکووری رۆژهەلاتی کوردستانێ کو هژمارا پەرستگەهێن ئاگری یێن ئاگرپەرێسان(مەجۆسییان) ژ هژمارا تبلێن هەردو دەستان نابۆرن، ئەرێ یا ئەو پەرستگەهـ چ لێ هاتینە؟ ئەرێ مەسیحییەتێ یا سیبەرا وێ هەمی پشکێن رۆژئاڤایێ باکوور و ناڤەراستا کوردستانێ ب گشتی و بەهدینان ب تایبەتی ڤەگرتی، د رێیا خۆ دا بۆ بەلاڤکرنا مەسیحییەتێ ل دەڤەرێن ئیرانێ و پشکێن دی یێن ئاسیا ناڤین[٨٤]، ب سەر زەردەشتیێ دا گرتبوو؟ د ڤێ چەندێ دا ژێدەر د هەوارا مە ناهێن، بۆ دەرکەڤتنێ ژ ڤێ کێشەیێ، ڤەکۆلەر ل وێ باوەرێیە کو بەرسڤدانا ڤان پرسیاران ژ هژمارەکا ئەگەران دەرناکەڤیت:

ئێك: گەلەك دێر ل سەر هەرڤتە و کاڤلێن پەرستگەهێن زەردەشتییان هاتینە ئاڤا کرن یێن پشتی ڤەکرنا ئیسلامی بۆ دەڤەرا کوردی هاتینە ژ ناڤبرن، پالدەرێ ڤێ چەندێ ژی ئەو بوو کو ژ بەرکو مەسیحی ژ لایێ دەستهەلاتێن فارسی یا ساسانی ڤە ژ بەر گازندەیێن دیندارێن زەردەشتی هاتبوونە تەپەسەر کرن و راهێلان، دەلیڤە بۆ وان هەلکەڤتبوو تۆلا خۆ ڤەکەن، ئینا مەسیحییان ژ بەرکو وەك ئایینێن ئاسمانی پەیوەندی دگەل موسلمانێن ڤەکەر هەبوون، داخواز ژێ کرن پەرستگەهێن زەردەشتییان یێن ئاگر پیرۆز دکرن بهێنە ژ ناڤبرن، دەمێ هاتینە ژ ناڤبرن دێر و خلوەتگەهێن خۆ ل سەر هەرڤتە و کاڤلێن وان ئاڤا کرن، وان (ئانکو مەسیحییان) گەلەك پەرستگەهێن ئاگری ژ ناڤبرن خۆ ل وی سەردەمێ دەولەتا ساسانی گەلەك یا ب هێز و دەستهەلات ژی بوو، ئەڤە ژی ژ بەر هندێ بوو کو مەسیحییان باوەریەکا ب هێز ب بیروباوەرێن خۆ هەبوو و ژ مرنێ نەدترسیان، ئەڤە ژی ژ سڤکاتیکرنا وان ب دیندارێن زەردەشتیێن ئاگرپەرێس و رۆژپەرێس دیار دبیت[٨٥]، ڤێجا رەوش دێ چەوان بیت پشتی ئیمپراتۆریا فارسی یا ساسانی هاتیە ژ ناڤبرن کو زەردەشتی ئایینێ وێ یێ فەرمی بوو، گرۆڤە ژی ب ڤێ چەندێ ئەوە کو دێرا مار گۆرگیس ل ناحیا مانگێشکێ ل سەر هەرڤتە و کاڤلێ پەرستگەهەکا کەڤن یا ئاگرپەرێسان(مەجۆسییان) هاتیە ئاڤا کرن هەروەکی د پەرتووکا (مانکیش) دا هاتی یا ژ لایێ (د. عبدالله مرقص رابی) ڤە هاتییە دانان[٨٦].

دوو: مەسیحی یێن ژ تیرەیا نەستۆری ژ بەر پەیوەندیێن وان یێن تێکچووی دگەل دێرا بیزەنتی (یا مەلەکانی) کو بارەگەهێ وێ ل کۆستەنتینیەیە و ل دووڤ بریارێن کولێژا ئەفسس یا سالا ٤٣١ ز ب خرپانێ هاتبوونە ل قەلەمدان، ئەو نەستۆری دگەل بیروباوەرێن خۆ یێن ئایینی رەڤی بوونە دەڤەرێن کوردی ب گشتی و یا بەهدینان ب تایبەتی کو عەردێ وێ هەتا پلەیەکێ ل ناڤبەرا هەردو دەولەتێن ساسانی و بیزەنتی بوو، ئینا وان مفا ژ تۆپۆگرافیا عەردێ وێ یێ ئاسێ و زۆریا روویێ وێ چیایی دیت و دێر و خلوەتگەهێن خۆ لێ ئاڤا کرن[٨٧].

ئەڤە ژی دو لیستن ب ناڤێ دێر و کەنیسەیێن ل دەڤەرا بەهدینان ل دووڤ ژێدەرێن مەسیحی و ئیسلامی:

**ناڤێن دێران:**

| ژ | ناڤێ کەڤن یێ دێرێ | ناڤێ نوو یێ دێرێ | جهێ جۆگرافی | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | دێرا ئەبون | دێرەبوون | دکەڤیتە بەتەنا چیایێ بێخێرێ ل هنداڤی لایێ رۆژهەلاتێ یێ رووبارێ دیجلەی ل نێزیک توخیبێ عیراقێ — سوریا. | ئەڤ دێرە ل سالا ١٩٣٩ ێ زایینی ژ لایێ شاندێن مسیۆنێرێن کاسۆلیکی(دۆمەنیکی) ڤە هاتییە ب کار ئینان. |
| ٢ | دێرا مار یەعقۆب | دێرا ماقو (مار ئیشۆ عیاب) | | |
| | دکەڤیتە بەتەنا چیایێ سپی ل نێزیک گوندێ قەشەفرێ یان ل دەرگەهێ گوندێ شیزێ ل باکوورێ باژێرێ سێمێلێ. | | | |
| ٣ | دێرا مار ئیپ ئالاها | دێرا بەرانی | دکەڤیتە دەستپێکا باژێرێ دهۆک بەرامبەری زانکۆیا دهۆک. | مار ئیپ ئالاها ئێک بوو ژ دینداریێن مەسیحی یێن سالا ٣٥٨ ێ زایینی ژ لایێ دەولەتا فارسی ڤی هاتییە سێدارەدان و هەر سال ل وەرزێ بهارێ ئاهەنگەک (شانەدێرەک) بۆ دهێتە گێران و مەسیحی یێن دهۆک قەست دکەنێ. |
| -٤ | دێرا (الکلب) | دێر عەبدا (عودا) | دکەڤیتە باشوورێ گوندێ مالتایێ (مەعلەپایا ب سریانی) پێنج کیلۆمێتران ل رۆژئاڤایێ باژێرێ دهۆک. | |
| ٥ | دێرا مار دانیال | دێر جندی | ل نێزیک ناحیا فەیدیێ ل باشوورێ باژێرێ دهۆک | ئاهەنگەکا (شانەدێرەکا) سالانە ل وەرزێ بهارێ بۆ دهێتە گێران و مەسیحیێن دهۆک قەست دکەنێ |

| ٦ | دێرا مار قرياقۆس | دێرکوم (دێرا کانێ) | باکووری رۆژهەلاتێ ئامێدیێ. | هژمارەکا دێران ب خۆڤە دگریت و هەر سال ل هەیڤا نیسانێ شانەدێرەك بۆ دهێتە گێران. |
|---|---|---|---|---|
| ٧ | مار تۆما | مار تۆما | ناحیا مانگێشکێ | |
| ٨ | دێر کشنیك | دێرگژنیکێ (دێرا ژنان) | دکەڤیتە بەتەنا دی یا چیایێ بەرامبەری ناحیا مانگێشکێ. | |
| ٩ | دێرا رەبەن یۆسف | دێرا رەبەن یۆسف | ل گوندێ ئێنیشکێ دکەڤیتە بەتەنا چیایێ مەتینا | |
| ١٠ | دێرا صیاری | دێرا صیاری | ل نێزیك گوندێ داودیێ ل باشووری رۆژئاڤایێ باژێرکێ بامەرنێ ل دۆلا سینەی. | |
| ١١ | دێرا مار ساوا | دکەڤیتە دەستپێکا گوندێ دێرەشێ ل بنیا چیایێ گارەی. | | |
| ١٢ | دێر مار سلیبا | دێر مار سلیبا | دکەڤیتە باکووری گوندێ قەسرۆکێ ل دەڤەرا سندییان (زاخۆ). | |
| ١٣ | دێرا مار سەبریشۆع | دێرا مار سەبریشۆع (الغاب الجمیل) | دکەڤیتە گوندێ سناتێ ل نێزیك توخیبێ عیراقێ ــ ترکیا. | |
| ١٤ | دێرا مار جەرجیس | دێرا مار گورگیس | گوندێ دورێ ل رۆژهەلاتێ ناحیا کانی ماسێ | کەڤنترین دێرا دەڤەرا بەرواری بالایە و |
| ١٥ | سولتان مادۆخت | سولتان مادۆخت | ل گوندێ ئەرەدنا ژێری (مەسیحییان) ل بنیا چیایێ مەتینا | هەر سال ل وەرزێ بهارێ شانەدێرەك بۆ دهێتە گێران، ئێکە ژ دێرێن مەزنێن د بەری هاتییە هەلکۆلان. |
| ١٦ | دێرا مار قەیۆما | دێرا مار قەیۆما | ل گەلیێ دۆرێ یە ل سەر توخیبێ عیراقێ ــ ترکیا. | |

| ١٧ | دێرا عومەر زەعفەران | دێر زەعفەران دێرا رەبەن هورمزد | پێنج کیلۆمێتران ل رۆژئاڤایێ گەلیێ زاخۆیە ل دەشتا سلێڤانەیی یان. | چەند دێرەك ب وی ناڤی ل دەڤەرێن عەنکاوە، خەتارێ، مێزێ، بێبۆزی، خردس هەنە. |
|---|---|---|---|---|
| ١٨ | دێرا رەبەن هورمزد | دکەڤیتە بەتەنا چیایێ ئەلقۆش ل باکوورێ باژێرێ مووسل | ئێکە ژ دێرێن کەڤن و هژمارەکا مەزن یا رەبەنان دەرچوویێن وێ دێرا دێرینن. | |
| ١٩ | دێرا مار یەعقۆب | دێرا بێت عابی | دکەڤیتە هژمارەکا دەڤەرێن کوردستانا عیراقێ. | |
| ٢٠ | دێرا ئشمۆنی | دێرا بێت تۆری (دەڤەرا چییان) | دکەڤیتە گوندێ خربە ل پشت سرتا چیایێ ئاکرێ. | |
| ٢١ | دێرا عومەر ئەحویشا | دێرا مار عەبد یەشوع | دکەڤیتە دەشتا دینارتە ل پشت ئاکرێ. | |
| ٢٢ | دێر بەرقوم | | هەمی دکەڤنە دەڤەرا نەحلە(نەهلە) ل قەزا ئاکرێ. | |
| ٢٣ | دێرا مار مەتی | دێرا مار مەتی | دکەڤیتە بەتەنا چیایێ مەقلۆبی ل رۆژهەلاتێ باژێرێ مووسل. | دێرەکا کەڤن و شوونوارییە و سەر ب تیرەیا سریانێن ئەرسەدۆکسە، دیرۆکنڤیس (ابن العمری) ل وێرێ هاتییە ڤەشارتن. |

## ناڤێن کەنیسەیان:

| ژ | ناڤێ کەنیسێ | جهـ |
|---|---|---|
| ١ | مار ئیب ئالاها | دهۆك |
| ٢ | مار یوسف | دهۆك |
| ٣ | الانتقال | دهۆك |
| ٤ | مار یوسف | رمتا/ باگێرا |
| ٥ | مار گورگیس | مانگێشکێ |
| ٦ | قلب یسوع الاقدس | ئەرەدنا/ سەرسنکێ |
| ٧ | مار گورگیس | باردش/ سەرسنکێ |
| ٨ | مارت شمۆنی | ئێنیشکێ/ سەرسنکێ |
| ٩ | انتقال مریم العڗراو | تلا/ بامەرنێ |
| ١٠ | مار یۆحەننا | داودیا/ بامەرنێ |
| ١١ | مار گورگیس | تنێ/ بامەرنێ |
| ١٢ | مریم العڗراو | کومانێ/ ئامێدیێ |
| ١٣ | مار یوسف | هەمزیکێ/ ئامێدیێ |
| ١٤ | مریم العڗراو | بینایا/ ئامێدیێ |
| ١٥ | قدیسە ترازیا | هرماشی/ ئامێدیێ |
| ١٦ | مار گورگیس | ئازەخ/ ئامێدیێ |
| ١٧ | مارت شمۆنی | بێبۆزی/ ئامێدیێ |
| ١٨ | مارت شمۆنی | شەرانش/ زاخۆ |
| ١٩ | مریم العڗراو | پێشابیرێ/ زاخۆ |
| ٢٠ | مار یوسف | باجدە/ زاخۆ |
| ٢١ | مریم العڗراو حافڤە الزروع | قەرەولا/ زاخۆ |
| ٢٢ | مار گورگیس | شکفدلی/ زاخۆ |
| ٢٣ | مار گورگیس | بێرسڤێ/ زاخۆ |
| ٢٤ | مریم العڗراو | هیزاوە/ زاخۆ |
| ٢٥ | مار ئۆراها | لیڤو/ زاخۆ |
| ٢٦ | مار ئۆراها | مێرگەسۆر/ زاخۆ |
| ٢٧ | مار یوسف | مار یوسف/ ناڤکەندالا/ زاخۆ |
| ٢٨ | مارت شمونی | بێرکا/ زاخۆ |
| ٢٩ | مریم العڗراو | زاخۆ/ عەباسیکێ |
| ٣٠ | مریم العڗراو | دتشاخ/ زاخۆ |
| ٣١ | قلب یسوع الاقدس | بێدار/ زاخۆ |
| ٣٢ | مار گورگیس | زاخۆ/ تاخێ فەلەیان |
| ٣٣ | قلب یسوع الاقدس | دێرەبوون/ زاخۆ |
| ٣٤ | مار منصور | ئاڤزەرۆك/ زاخۆ |
| ٣٥ | مار گورگیس | شیوز/ سێجێ/ سێمێلێ |
| ٣٦ | العڗراو ام الرحمە | سێمێلێ |
| ٣٧ | مارت شمۆنی | بەخلوجا/ سێمێلێ |
| ٣٨ | مار یۆسف | شێخان |
| ٣٩ | مار گورگیس | شێخان |
| ٤٠ | مار ساوە | ملا براون/ ئاکرێ |
| ٤١ | مار ماری | هزار جۆت/ ئاکرێ |
| ٤٢ | مار سەرکیس | ئاکرێ |
| ٤٣ | مار یۆسف | بانە سۆرێ/ ئاکرێ |
| ٤٤ | مریم العڗراو | نوهاوا/ ئاکرێ |
| ٤٥ | مار بکرس و یۆلس | دهۆك |
| ٤٦ | مار دانیال | مسێریکێ/ سێمێلێ |
| ٤٧ | مار گورگیس | باختمێ/ سێمێلێ |
| ٤٨ | بصریبون | ربەتکێ/ ئاکرێ |
| ٤٩ | مار گورگیس | هیزانێ/ ئاکرێ |
| ٥٠ | مارت شمۆنی | کەشکاوا/ ئاکرێ |
| ٥١ | مار ئەبرام | مێروکێ/ ئاکرێ |
| ٥٢ | نیرست شنور های | دهۆك |
| ٥٣ | مریم العڗراو | زاخۆ |

| ٥٤ | فارتان | ئاڤزەرۆك/ زاخۆ |
|---|---|---|
| ٥٥ | هاوریسك | هاوریسك/ زاخۆ |
| ٥٦ | مریم العزراو | دهۆك |
| ٥٧ | مار نرسی | دهۆك |
| ٥٨ | مار گورگیس | دهۆك |
| ٥٩ | مار یۆسف | بابلۆ/ زاویته |
| ٦٠ | مارت شمۆنی | كورێن گاڤانا/ زاویته |
| ٦١ | مریم العزراو | باكیرات/ باگێرا |
| ٦٢ | بصر بیون | كوند كۆسا |
| ٦٣ | مار زیا | سردراو/ سەرسنكێ |
| ٦٤ | مارت شمۆنی | سەرسنكێ |
| ٦٥ | مارت شمۆنی | دهێ/ بامەرنێ |
| ٦٦ | مار گورگیس | دهێ/ بامەرنێ |
| ٦٧ | مار یوسف | بلیجانێ/ ئامێدیێ |
| ٦٨ | مار گورگیس | بێبادێ/ ئامێدیێ |
| ٦٩ | مارت شمۆنی | بێبادێ/ ئامێدیێ |
| ٧٠ | مریم العزراو | ئامێدیێ |
| ٧١ | مار عودیشو | دێرێ/ ئامێدیێ |
| ٧٢ | مار خەننا | دێرەلۆكا ئێكێ |
| ٧٣ | مار زكا | دێرەلوكا ئێكێ/ مەزار |
| ٧٤ | مار گورگیس | دیرەلوكا دووێ |
| ٧٥ | مار قریاقۆس | دیرەلوكا دووێ/ مەزار |
| ٧٦ | مریم العزراو | كانی بەلاڤێ/ بەرواری بالا |
| ٧٧ | مار یۆحننا | بازێ/ بەرواری بالا |
| ٧٨ | مار یوسف | موسكا/ بەرواری بالا |
| ٧٩ | مارت شمونی | تشیشێ/ بەرواری بالا |
| ٨٠ | مار قریاقۆش | تشیشێ/ بەرواری بالا(مەزار) |
| ٨١ | مار ئۆراها | جدیدێ/ بەرواری بالا |

| ٨٢ | مار مۆشێ | چەلكێ/ بەرواری بالا |
|---|---|---|
| ٨٣ | مارت شمۆنی | بشێمیایی/ بەرواری بالا |
| ٨٤ | مار قریاقۆش | مایێ/ بەرواری بالا |
| ٨٥ | مار گورگیس | ایت/ بەرواری بالا |
| ٨٦ | مار عەودیشۆ | مەركجیا/ بەرواری بالا |
| ٨٧ | مار بپیو | هیز (دبیت هێسێ بیت (ص)/ بەرواری بالا |
| ٨٨ | مار گورگیس | دورێ/ بەرواری بالا |
| ٨٩ | مار ساوا | دورێ/ بەرواری بالا |
| ٩٠ | مار یوحەننا | كانی ماسێ/ بەرواری بالا |
| ٩١ | مریم العزراو | اقرێ/ بەرواری بالا |
| ٩٢ | الشهداو | صۆریا/ زاخۆ |
| ٩٣ | الشهداو | سێمێلێ |
| ٩٤ | مار گورگیس | صورکا/ سێمێل |
| ٩٥ | بصریون | ربەتكێ/ ئاكرێ |
| ٩٦ | مار گورگیس | هێزانێ/ ئاكرێ |
| ٩٧ | مارت شمۆنی | كەشكاوا/ ئاكرێ |
| ٩٨ | مار ابرم | مێرۆكێ/ ئاكرێ |
| ٩٩ | النصاری الأنجیلیه | دهۆك |
| ١٠٠ | نهجه القداسه (الأنجیلیه) | دهۆك |
| ١٠١ | الأتحاد الأنجیلیه | دهۆك |
| ١٠٢ | مریم العزراو الكاپولیك | زاخۆ/ تاخێ فەلەیان |
| ١٠٢ | هەمی | |
| | | |

